# فیقهی سیرەی پێغەمبەر

دروودی خوای لەسەربێ

لەگەڵ کورتەیەك لە مێژووی خەلیفەکانی راشدین



نووسینی

محمد سعید رمضان البوطي

وەرگێڕان و بەکوردی کردنی

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی







الهداية
العراق - أربيل

# فیقهی

# سیرەی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێ

## لەگەڵ کورتەیەك لە مێژووی خەلیفەکانی راشدین

نووسینی:

د. محمد سعيد رمضان (البوطي)



وەرگێڕان و بەکوردی کردنی:

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

چاپی یەکەم - ٢٠١١م



العراق - أربيل - شارع المحكمة

ت: ٠٩٦٤٦٦٢٢٣١١٦٦

موبايل: ٠٩٦٤٧٥٠٤٦٨٥٦٥٣

e-mail:erbil200@yahoo.com
e-mail: hedaya_12000@yahoo.com

---

**فیقهی سیرەی پێغەمبەر (د.خ)**

---

**وەرگێڕانی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**

**چاپ: یەکەم**

**ساڵی چاپ : ٢٠١١**

**دیزاین و هەڵەبڕی: روبار حسین**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردن: (٨٤) ساڵی ٢٠١١بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان**



**الباركود:** ISBN 978-9933-10-269-2

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ

سیرەو ژینامەی پێغەمبەر ﷺ لێکۆڵینەوەو نووسین تێیدا، کارێکی پیرۆزو پڕ بایەخە، چەندێکی تێدا بنووسرێ‌و توێژینەوەی تێدابکرێ‌و لایەنەکانی ژیانی ئەو زاتە پیرۆزەی تێدا ڕوون بکرێتەوە، هێشتا کەمە، چونکە سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەریایەکە تەی ناکرێ، عەترو میسکێکە تا بیجوڵێنی‌و ڕایوەشێنی بۆن‌و بەرامی پتر بڵاو دەبێتەوەو دەمارەکانی جەستە دەشێلێ‌و هێزو توانا بەمێشك دەڵەکان دەبەخشێ‌و دەروون ئاوەدان‌و زەنوێردەکا.

ئەو ڕەحمەتە بۆ عالەم‌و ژیان‌و وتەو کردارو ڕەفتارو بێدەنگی، شەریعەت‌و یاساو خۆری پڕتەو بەخشی ڕێگای ژیانە، سەرمەشق‌و ڕێ نیشاندەری موسوڵمانانە، پێغەمبەرەو هەڵبژاردەی پەروەردگارە، ئەخلاق‌و ڕەوشتی ڕەنگدانەوەی قورئانە. بەئیعترافی دۆست‌و دوژمن نموونەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتییە. چی لە وەصفی دا بگوترێ بەکۆتانایەو لەتەعریف بەدەرە. کەس نەیتوانیوەو ناتوانێ نوسینێك بخاتەڕو پڕاو پڕ ئاوێنەی بالانمابێ بۆژیانی پڕ سەروەری حەزرەتی موحەممەدﷺ! چۆن وانیە ئەی ئەوە نیە پەروەردگار دەرحەقی دەفەرموێ: {وإنك لعلى خلق عظيم} یان دەفەرموێ: (وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين). یان دەفەرموێ: (محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم ....).

ڕەحمـەت لـەخاوەنی قەصـیدەی (بـردة المـدیح)، شـێخی بویـصیری کەدەڵێ:

فمبلغ العلم فیه أنّه بشر        وأنه خیر خلق الله کلهم

حـەزرەتی نـالی خۆشمـان کاتـێ هەسـت بەدەسـتکورتی خـۆی دەکـا لەوەصفی دا بەناچاری دەڵێ:

بـــەقوربانی عولـــومی ئـــەووەڵین و ئاخیرینـــت بم
لەگەڵ ئەسراری قورئانت کـەوا ئـەلطافی ڕەحمانـە
مـورادم ذیللـەت و پاڕانـەوەی حاڵـە نـەوەک نەعتـە
بەچەند بەیتێکی کوردانە، کە قورئانت ثـەناخوانـە

وێڕای ئەم واقیع و حەقیقەتە بەحوکمی یاسای (مالا یدرك کله لایترك کله) ئەوەی هەمووی دەستەبەر نەبێ واز لەهەمویشی ناهێندرێ مەحوی گوتەنی:

فەقەت نابێ کە دەرکی کول نـەبوو یـەکبارە تـەرکی کـول
بەباغێکـە لـەکن بولبـول گـوڵێ لـەوباغ و بوسـتانە

هـەر لـەدێر زەمانـەوە زانایـان و مێـژوو نووسـان و سـیرە نووسـان هەریەکـەیان لەعاسـت خۆیـەوە هـەوڵی داوە موسـوڵمانان بـە لایـەنێکی ژیـانی حـەزرەتی موحەممـەد ئاشـنا بکـا لەهـەموو چـاخ و زەمانێکـا و بەهـــەموو زاراوەو زمانێـــك لەســـەر ژیـــانی پـــڕ بەرەکـــەتی ئەوزاتـــە موجەلـــەدات و کتێبـــی مـــام ناوەنـــدی و نامیلکـــە نووســـراون بەچـــاپ گەیاندراون!!

زانایـانی کـوردیش لـەم مەیدانـەدا ئـەوڵاش کـەمییان نەنوانـدوەو کەمتەر خەم نەبوون هەرلەم سی چل ساڵەی رابوردودا نووسەرانی کورد چـەند کتێبێکـی بـەنرخیان بەنووسـین یـان بـەوەرگێڕان خـستۆتە

کتێبخانەی کوردییەوە، هەیانە لەماوەیەکی کەم دا زیاد لەجارێك و دووجار بەتیراژێکی زۆرو بەرچاو چاپکراون و بڵاو بوونەوەو خوێنەرانی کورد زوبانیان بەژیانی سەروەری عالەم ئاشنا کردوە.

بەندەش وەکوو کوردێکی موسوڵمان و خۆ بەنووسەر حیسابکردو ویستم دەستە چیلەی خۆم بخەمە سەر خەرمانی پڕ بەرەکەتی ژیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان، ئەوەبوو ساڵی ٢٠٠٧ زایینی کتێبی (السیرة النبویة)ی مامۆستای خوالێخۆشبوو (أبو الحسن الندوي)م وەرگێڕایە سەرزمانی کوردی و بەچاپم گەیاند، لەماوەیەکی کورت و قیاسی دا جێگای خۆی لەلای خوێندەواران کردەوە نوسخەی لەکتێبخانەکان دا نەماو لەسەرداوای گەنجانی رۆشنبیرو ئیسلامخواز بۆجاری دووەم لەبێروت چاپم کردەوەو برەوێکی باشی پەیداکرد، ئەم دیاردەو تینوایەتییەی موسوڵمانانی کورد زوبان بۆ ئاگاداربون بەسەر ژیانی پێغەمبەردا هەڵینام بۆ وەرگێڕان و بەکوردیکردنی کتێبی (فقه السیرة النبویة)ی مامۆستای بانگخوازی ئیسلامی، دکتۆر (محمد سعید رمضان البوطي) سوپاس بۆ خودا کارەکەم بەکۆتا هێناو مانگی دوانزەی ساڵی ٢٠١٠ لەوەرگێڕانی بوومەوە تەمەننام لەپەروەردگار ئەوەیە بەعەمەلی صالح بۆم حیساب بکاو وەکوو ئەصلە عەرەبیەکەی برەوی پێ بدا. هەڵسەنگاندنی کارەکەشم دەخەمە ئەستۆی خوێنەرانی بەڕێزی کورد زوبان، هیوادارم ئەگەر کەم و کوڕییەکم هەبێ بەرەخنەی بنیاتنەر هاوکاریم بکەن، خودا پشتیوانی هەموو لایەکمان بێ.

✍ وەرگێڕ

## بەشی یەکەم

# چەند دیباجەو پێشەکییەك

## گرنگی ژینامەی پێغەمبەر ﷺ لەڕوانگەی تێگەیشتنو تێڕوانینی ئیسلامەوە

پێویستە ئەوە بزاندرێ کە مەبەست لە لێکۆڵینەوەو تێگەییشتن لە ژینامەی پێغەمبەر ﷺ بریتی نییە لە ئاگاداربوونی روداوە مێژووییەکانو گێڕانەوەی سەرگوزشتەو روداوە سەرنج راکێشەکانو بەس! بۆیە نابێو ناگونجێ: کە ئێمە لێکۆڵینەوەو تێگەییشتن لە ژینامەی پێغەمبەر ﷺ بخەینە پێڕی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانەوە، واتە: ژینامەی پێغەمبەر ﷺ وەکوو ژینامەی خەلیفە یان پاشایەك لە قەڵەم بدەین، یان بەسەردەمو قۆناغێکی مێژوویی رابردووی حیساب بکەین.

بەڵکوو مەبەست لە دیراسەی ژینامەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە: کە موسوڵمان تەصەووری حەقیقەتی ئیسلام بە تێکڕاییو سەرجەم بەشێوەیەك بکا کە لەژیانی پێغەمبەردا وێنا بکرێو رەنگ بداتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی کە موسوڵمان موفرەداتو یاساو ئەحکامەکان لەزەینی خۆیدا تاوو توێ بکاو تێیان بگا.

واتە: لێکۆڵینەوەی ژینامەی پێغەمبەر عەمەلیەیەکی تەطبیقییەو مەبەست لێی وێنا کردنی ئیسلامی راستەقینەیە لە نموونەی هەرە بەرزو باڵایدا کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ.

کاتێك بمانەوێ ئەم مەبەستە بەشبەش بکەین و بەشەکان ڕیزبەند بکەین ئەوە دەگونجێ: کە لەم چەند هەدەفانەدا چڕیان بکەینەوە:

١. تێگەیشتن لەکەسایەتی پێغەمبەر لەڕوانگەی پێغەمبەرایەتیەوە، بەتێڕوانین لەژیانی ئەو زاتە پیرۆزەو ئەو بارودۆخەی تێیدا ژیاوە، ئەمەش بۆ دڵنیابوون و سەلماندنی ئەو راستییە: کە حەزرەتی موحەممەد تەنها لێهاتوو عەبقەرییەك نەبووە کە لێهاتووییەکەی لەناو گەل و هۆزەکەیدا بەرزی کردبێتەوە، بەڵکوو ئەو پێش ئەوەی مرۆڤێکی لێهاتوو عەبقەریەکی بێ وێنەی رۆژگار بێ، پێغەمبەری خودا بووەو خودا بەنیگا بۆکردن و توفیقدانی بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی پشتگیری کردوەو یارمەتیدەری بووە.

٢. دەبێ مرۆڤی موسوڵمان لەپێش چاوی خۆی هەمیشە وێنەی نموونەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی کە لەکەسایەتی حەزرەتی موحەممەددا رەنگی داوەتەوە وێنا بکا و لەهەموو بوارەکانی ژیانی سەرکەوتوو بەختەوەردا بیکاتە پێوەرو تەرازو. بۆئەوەی دەستورو پرۆگرامێك لەژینامەی ئەو نموونە بەرزە هەڵێنجێ و بیکاتە بەرنامەو یاسای ژیانی و پێیەوە پابەند بێ و لەسەری بڕوا. ئاشکراشە مرۆڤ چەندێك هەوڵبدا بۆ دۆزینەوەی نموونەی بەرزو میثالی لەهەر بوارێك لە بوارەکانی ژیانی سەرکەوتوو بەختەوەردا، ئەوە بێگومان لە ژینامەی حەزرەتی موحەممەددا ئەو بەها و سەروەرییانەی بەوپەڕی تەواوی و ئاشکراییەوە بۆ دەستەبەر دەبێ.

بۆیە پەروەردگار ئەو زاتەی کردووە بەرابەرو پێشەنگ و نموونە بۆ هەموو مرۆڤایەتی. ئەوەتا پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەو راستییەی چەسپاندووەو فەرموویەتی {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ — الأحزاب/٢١}.

٣. دەبێ مرۆڤ لە لێکۆڵینەوەی ژینامەی پێغەمبەردا زانیاری وا بەدەست بێنێ: کە یارمەتیدەری بێ بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆزو چەشکردنی مەبەستەکانی و ڕێنماییەکانی، چونکە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان تەنها لەڕوانگەی ئەو ڕوداوانەی بەسەر پێغەمبەردا تێپەڕبون و ئەو هەڵوێستانەی ئەو لە بەرامبەریاندا نواندونی، دەتواندرێ تەفسیر بکرێن و ڕاڤەی ڕاست و دروستیان بۆ بکرێ.

٤. دەبێ لەمیانەی لێکۆڵینەوە لەژیانی پێغەمبەردا ئەندازەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیری و زانیاری ئیسلامی ڕاست و دروست لای موسوڵمان کۆببێتەوە، چ دەربارەی بیروباوەڕ، یان ئەحکام و یاسا و ڕێسا و ئەخلاق و ڕەوشت، چونکە گومان لەوەدا نییە: کە ژیانی پێغەمبەر ﷺ وێنەیەکی لەبەرچاوو زیندوو پرشنگدارە بۆ تێکڕای بنەماکانی ئایینی ئیسلام و حوکم و یاساکانی.

٥. پێویستە مامۆستا و بانگخوازانی ئیسلامی نمونەیەکی زیندو پڕشنگداری بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن بن. چونکە گومان لەوەدا نییە: کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ مامۆستایەکی دڵسۆزو ئامۆژگاریکارو پەروەردەکارێکی گەورەو نموونەیی بووە چونکە بەتایبەتی لە ژێر چاودێری خودا دا پەروەردە بووە. بەدرێژایی ژیانی پڕ فەڕو بەرەکەتی بانگخوازیی و ڕاگەیاندنی پەیامەکەی چی لەتوانایدا بووە خەرجی کردووە بۆ دۆزینەوەی شێوەو شێوازی گونجاوو بەسوود لەهەموو بوارەکانی پەروەردەو فێرکردندا.

بێگومان گرینگترین ئەو شتانەی ژینامەی پێغەمبەر وا لێ دەکەن هەموو ئەم مەبەستانە بپێکێ، ئەوەیە: کە ژینامەی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی لەخۆگرتووە، ئەو بوارانەی لە مرۆڤدا بەرجەستە دەبن لە ڕوانگەی ئەوەی کە تاکێکی سەربەخۆیە یان لە ڕوانگەی ئەوەوە کە ئەندامێکی کارای کۆمەڵگایە.

کەوابوو ژیانی پێغەمبەر ﷺ چەند نموونەیەکی بەرزو شکۆدارمان دەخاتە بەردەست چ وەکوو گەنجێکی رەوشت بەرزو خاوەن هەڵوێستو دەستپاکو ئەمین لەناو گەلو هۆزەکەیدا. هەروەکوو چۆن نمونەیەکی سەرنج راکێشو بێ وێنەمان بۆ دەست نیشان دەکا وەکوو مرۆڤی بانگخواز بۆ رێبازی خودا بەشێوەیەکی حەکیمانەو ئامۆژگاریکردنی جوانو پەسەند، کەهەموو هێزو توانای خۆی بەخشیوە لەپێناو گەیاندنی پەیامەکەیدا. چ وەکوو سەرۆکی وڵات کە کاروباری وڵاتی بەو پەڕی لێزانیو لێهاتوییەوە بەڕێوە بردووە.

چ وەکوو هاوسەرێکی نمونەیی لە رفتار جوانیو هەڵسو کەوت کردنیدا لەگەڵماڵو خێزاندا. یان وەکوو باوکێکی دڵسۆزو خاوەن سۆز، بە بەرچاو گرتنی جوداوازی تەواو لەنێوان مافو ئەرك بۆ هەریەك لە هاوسەرو منداڵ. یان وەکوو سوپا سالارو فەرماندەی جەنگ کەڕاهاتبێو قاڵ بووبێ. لە گۆڕەپانی جەنگدا. یان وەکوو سیاسەت مەدارێکی خاوەن ئەزمونو راستگۆ.

هەروەکوو چۆن ژیانی زاتی پیرۆزی سەر مەشقە بۆ موسوڵمانێك کەزۆر بەوردیو راستاڵی لایەنی خودا پەرستیو بەندایەتی کردنو لێبڕان بۆ عیبادەت جۆش بدا لەگەڵ لایەنی هەڵسو کەوتو رابواردنی نەرمو نیانو قسەی خۆشو دەم بەپێکەنین لەگەڵ خێزانو هاوەڵانیدا.

کەوابێ هیچ شكو گومان لەوەدا نیە: کە لێکۆڵینەوە لە ژینامەی پێغەمبەر ﷺ بەدەرخستنو زەقکردنەوەی ئەو لایەنە جۆراو جۆرە مرۆڤانەیە. کە هەموویان تێکڕا لە بەرزترین نموونەی مرۆڤایەتیداو بەجوانترین وێنە لە ژینامەی زاتی پیرۆزی دا رەنگیان داوەتەوە.

# ژینامەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ چۆن گەشەی کردو لێکۆڵینەوە تێیدا چۆن پێشکەوتو ئەمڕۆ دەبێ چۆن تێی بگەین‌و وێنای بکەین:

## ژینامەی پێغەمبەرو بەراوردکردنی بە مێژوو:

گومان لەوەدانیە کە ژینامەی پێغەمبەری ئازیزمان حەزرەتی موحەممەد ﷺ بناغەی سەرەکی پێك دێنێ لەبواری ئەو مێژووە پرشنگدارە گەورەی کە موسوڵمانان بەهەموو جوداوازی نێوانیان لەبارەی وڵات‌و زمان‌و کلتورەوە شانازی پێوە دەکەن‌و خۆیانی پێ هەڵدەنێنەوە. چونکە موسوڵمانان بە بۆنەی ژینامەی پێغەمبەرەوە مێژوویان نووسیەوەو لەناو کتێباندا تۆماریان کرد.

لەسەر بنەمای ئەم ژینامە پیرۆزە موسوڵمانان مێژوویان تۆمار کردووە، چونکە یەکەم شت کە نووسەرە موسوڵمانەکان تۆماریان کرد لەبواری روداوی مێژووییدا بەسەرهات‌و رووداوەکانی ژینامەی پێغەمبەر بوو ﷺ ئەمجار لەسەر ئەم بناغەوە بەسەرهات‌و روداوەکانی تری مێژوویان بەزنجیرە تۆمارکردن‌و پەرەیان پێدان تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ. تەنانەت مێژووی سەردەمی نەزانی لەدەرەوەی بازنەو شورای ئیسلام لەنیوە دورگەی عەرەبیدا بڵاو بوبوەوە موسوڵمانان «بە عەرەب‌و ناعەرەبەوە» فێری بوون‌و دەستیان کرد بە سەرنج لێدانی‌و تۆمارکردنی... لەبەر رۆشنایی ئیسلام‌و تێڕوانینی بۆ ڕوداوەکان پێناسەی مانای جاهیلیەتیان کرد، لەبەر تیشکی ئەو زانستە مێژووییە گەورەو ئەو دیاردەو نیشانە مێژووییە کە لەهاتنە دونیای حەزرەتی موحەممەدو ژینامەی پیرۆزیدا رەنگ دەداتەوە، دەستیان کرد بەمێژوو نووسین.

کەوابوو ژینامەی پێغەمبەر ﷺ جەمسەرو تەوەرەیەك پێك دێنێ: کە حەرەکەی نووسینی مێژووی ئیسلام لەنیوە دورگەی عەرەبیدا بەدەوریدا دەخولێتەوە، بەڵکوو دەتوانین بڵێین: ژینامەی پێغەمبەر هۆکارو پاڵنەری سەرەکی بووە کە راستەوخۆ کاریگەری هەبووە لەروداوەکانی نیوە دورگەی عەرەبی و پاشان لەهەموو روداوو بەسەرهاتەکانی جیهانی ئیسلامی بەگشتی.

بێگومان زانستی ریوایە بۆ رووداوەکانی مێژوو لەلای عەرەب و موسوڵمانەکان مەنهەج و رێبازێکی زۆر وردو زانستانەی لەخۆ گرتووە بۆ زانین و تیشك خستنە سەر روداوەکان و جیاکردنەوەی راست و ناراست تێیاندا. جگە لە موسوڵمانان کەسێکی تر دارای ئەم جۆرە زانستە نەبووە، وەلێ ئەگەر سیرەی پێغەمبەر نەبوایە لەوانەبوو موسوڵمانان ئەو زانستەیان دانەهێنایە، یان وێدەچوو سەرکەوتوو نەبوونایە لەخستنە گەڕی و پابەندبوون پێیەوە لە نووسینە مێژووییەکانیاندا. کەوابوو سووربوونی موسوڵمانان لەسەر نووسینەوەو تۆمارکردنی ژینامەی پێغەمبەر بەشێوەیەکی راست و دروست و زانستیانە وەکوو ئەرکێکی ئایینی سەر شانیان، وای لێ کردن کە ئەو زانستە دەگمەنە دابهێنن و بەسەرکەوتوویش بەکاری بێنن، ئەمەش لەو روانگەوە بوو: کە زانا موسوڵمانەکان ئەو راستییەیان زانی کە ژینامەی حەزرەتی موحەممەدو فەرموودەکانی بەجوتە کلیلی یەکەم و راستەقینەن بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز. ئەمجار هەر ئەو دوو روبارە پاك و خاوێنە «ژینامەو فەرموودە» نموونەی هەرە بەرزن بۆ چۆنیەتی تەطبیق و کارپێکردنی. ئەوەبوو داینەموی یەقین بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو بڕوای تەواو بەوەی کە قورئان کەلامی خودایەو ئەرکی سەرشانیانە کاری پێ بکەن و بیکەنە پرۆگرامی کاری

ڕۆژانەیان و یاسای ژیانیان، وێڕای بڕوای تەواویان بەوە کە پەروەردگار ڕۆژی قیامەت حیسابی وردیان لەگەڵ دەکا و سزاو پاداشیان بەگوێرەی بیرو باوەڕو کردەوەیان دەداتەوە، ئا ئەم بیرو باوەڕە پتەوەیان هەڵێنان بۆئەوەی تا ئەوپەڕی وزەو توانایان هەوڵ بدەن و تێبکۆشن بۆ وەدەستهێنانی مەنهەجێکی زانستی زۆر توندو تۆڵ کەبەهۆیەوە بتوانن حەقیقەتی ڕوداوەکانی ژینامەی پێغەمبەرو فەرمودەکانی لەدرۆو شتی پڕو پووچ بپارێزن.

ئەوەشم لەیاد نەچێ کەمن لێرەدا مەبەستم بە مەنهەجی زانستی و تۆکمە یاساکانی موصطەلەحی حەدیث و زانیاری جەرح و تەعدیلە کە عیلمێکی ناوازەی داهێنراوی عولەمای ئیسلامە.

شتێکی ئاشکراو حاشا هەڵنەگرە: کە ئەم یاسا و قاعیدە تۆکمانەی موصطەلەحی حەدیث و یاساکانی جەرح و تەعدیل، کە سەرەتا داهاتون و دانراون بۆ خزمەت کردن بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ خراونە گەڕ، کەبەشێوەیەکی گشتی سیرەی پێغەمبەر بنەماو جەمسەری ئەو فەرمودانەن! پاشان ئەم بنەما زانستیانە بوون بە پەیڕەوو پڕۆگرام بۆ خزمەتکردن بە مێژوو بەگشتی و پێوەرو تەرازوی لێك جیاکردنەوەی حەقیقەتەکانی مێژوو لەشتە بێ بنەما و پوچەکانی کە بەڕواڵەت وێدەچێ تێکەڵ بە یەکتربن.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە نووسینەوەی ژینامەی پێغەمبەر دەروازەیەکی پان و پۆڕو گرنگ بووە کە موسوڵمانان لێیەوە چونە ناو گۆڕەپانی نووسینەوەی مێژوو تۆمار کردنی بەگشتی.. ئەو قاعیدەو یاسا زانستیانەی کە موسوڵمانان پشتیان پێ بەستوون بۆ تۆمارکردن و کۆنترۆڵ کردنی ریوایات و هەواڵەکان و بەتەتڵەڵە کردنیان، هەمان قاعیدەو یاسابوون کە سەرەتا عەقڵ و بیری تیژی موسوڵمانان

دایانهێنان و کارایان کردن لە روانگەی هەست کردنیان بە پێویستییەکی زۆر بۆ پاراستنی سەرچاوەکانی ئیسلام لەوەی کە خشت و خاڵ و خاشاکیان تێکەڵاو بێ قوڕاوی بن لێڵی و تەڵخییان پێوە دیاربێ.

## نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) چۆن دەستی پێ کردو پاشان چۆن گەشەی کرد؟

نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ لەڕوی مێژووییەوە بە بەراورد بە فەرموودەی پیرۆزەوە بە پلەی دووەم دێ.

چونکە ئەوەی کە گومانی تێدا نییەو حاشا هەڵنەگرە ئەوەیە نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر بەشێوەیەکی گشتی پێش نووسینەوەی سیرە ئەنجامدراوە. ئەوەبوو نووسینەوەی حەدیث وەکوو زاندراوەو چەسپاوە لەسەردەمی پێغەمبەردا دەستی پێ کراو، هێشتا زاتی پیرۆزی لەژیاندا بوو: کەبرێ لە هاوەڵان دەستیان کرد بە تۆمارکردنی حەدیث، دوای ئەوەی ئیزنیان لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت، یان بڵێین: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن کە ئەوکارە پیرۆزە ئەنجام بدەن، ئەمەش دوای ئەوەی کەزاتی پیرۆزی دڵنیابوو لەوەی کە هاوەڵانی گەییشتونە ئاستێك، جودا وازیی تەواو دەکەن لەنێوان هەردوو شێوازی قورئان و حەدیث، کە یەکەمیان لە پلەی ئیعجازو سەر ئاسادایەو دووەمیان پلەی رەوانبێژی تەواوی بەدەست هێناوە، دڵنیابوو لەوەی کە هاوەڵانی دەق و رستەی قورئان و حەدیثیان لێ تێکەڵاو نابن و بەهەست و چێژی خۆیان دەزانن ئەوە قورئانەو ئەمە حەدیثە.

وەلێ نووسینەوەی ژینامەی پێغەمبەرو غەزەواتەکانی بەشێوەیەکی گشتی لەدوا دەست کردن بە نووسینەوەی حەدیث و تۆمارکردنی، دەستی پێ کرا، هەرچەندە هاوەڵان لەناو خۆیاندا گرنگییان دەدا بە

گێڕانـەوەی ژینامـەی پێغەمبـەرو غەزاواتـەکانی بەشـێوەی دەمـا و دەم، بەڵام لەڕوی نوسینەوەوە ئەم کارە هەندێ دواکەوت.. وا پێدەچێ یەکەم کـەس کـە گرنگـی دابـێ بـە تۆمـارکردنی سیرەی پێغەمبـەر بەشـێوەیەکی گشتی و سـەرەتایی عـوروەی کـوڕی زوبـەیر بووبـێ کـە لەسـاڵی «٩٢»ی کۆچـی دا لـەژیان دەرچـووە. پاشـان «ئـەبان»ی کـوڕی عوسمـان لـەدونیا دەرچـووی سـاڵی «١٠٥» کۆچـی، پـاش ئـەو «وەهـب»ی کـوڕی «منبـه» لـەدونیا دەرچـووی سـاڵی «١١٠»ی کۆچـی. ئـەمجار «شـورەحبیل»ی کـوڕی «سـعد» لـەدونیا دەرچـووی سـاڵی «١٢٣»ی کۆچـی پاشـان «ابـن شهاب الزهري» لەدونیا دەرچووی ساڵی «١٢٤»ی کۆچی. ئەم زاتانـە بـە نووسـەرە سـەرەتاییەکانی سیرە دەژمێردرێن و لەسـەر دەسـتی ئـەمان و بـە هـەوڵ و تێکۆشـانی بێوچـانیان زانـستی سـیرەو تۆمـارکردنی، سـەری هەڵـداو گەشـەی کـرد. هـەروەکوو چـون نووسـینەکانیان بـە پێـشەتاو پێـشەنگی ئـەم کـارە پـیرۆزە گەورەیـە دەژمێـردرێ، بـەڵکوو بـە یەکـەم هەنگاوی نووسینەوەی مێژوو بەگشتی و گرنگی پێدانی حسێب دەکرێ. ئـەوەشمان لـەیاد نەچـێ زۆرێـك لـەروداوەکانی سیرە لـەناو ئایەتـەکانی قورئاندا بڵاو بۆنەوەو لەناو کتێبەکانی حەدیثدا تۆمارکراون، بەتایبـەتی ئـەو کتێبـە حـەدیثـانـەی کـە گرنگـی دەدەن بـە گوفتـارو کردارەکـانی پێغەمبەر ﷺ نەخاسمە ئەو فەرمودانەی پەیوەندییان بە تەشریعەوە هەیە.

وەلێ هـەموو نووسـینی ئـەو زاتانـەی باسمـان کـردن لەگـەڵ ڕۆژگـارو روداوەکـانی دا فـەوتاون و لەناوچـون و ئێمـە هـیچ کامـێ لـە نووسـینی ئەوانمان پێ نەگەیشتووەو لەبەر دەستماندا نین.. جگە لـەبڕێ زانیـاری پەرت و بڵاو کە خاوەنی مێژووی طەبـەری رایگواستون بۆناو دوو تـوێی کتێبەکـەی. دەشـگوترێ بڕێکـی تـر لـەو زانیارییـە پـەرت و بڵاوانـە کـە

بەشێکی نووسینەکانی وەهبی کوڕی «مُنَبِّه» پێك دێنن ئێستا لە یەکێك لە کتێبخانەکانی شاری «هایدلبرج»ی ئەڵمانیا دا پارێزراوە.

لەدوای چینی ئەو نووسەرە بەڕێزانەی سیرە، گۆڕەپانی هەوڵ و تێکۆشان لەبواری ژینامەی پێغەمبەردا چۆڵ نەبوو. بەڵکوو کەسانێکی دڵسۆز بەسیرە، هاتنە مەیدان و هەرچی چینی پێشوو نووسیبوویان، ئەمان لە نووسینەکانی خۆیاندا کۆیان کردنەوە و چەسپاندیانن، کە ئێستا ئێمە خۆشبەختانە زوربەی نووسینەکانی ئەمانمان پێگەیشتووە...

پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەدونیا دەرچووی سناڵی «١٥٢»ی کۆچی پێشەنگ و رابەری ئەم چینەی سیرە نووسانەیە.

بێگومان لێکۆڵەرەوە و مێژوو نووسان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوەی کەهەرچی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق نووسیویەتی بەڕاسترین و دیکۆمەنترین نووسراوی سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەژمێردرێ لەو سەردەمەدا«١».

جا ئەگەر «بەداخەوە» کتێبی «المغازي» دانراوی ئیبنول ئیسحاق فەوتابێ و خودی کتێبی ناوبراومان بەدەست نەگەییشتبێ، ئەوە خۆشبەختانە «ئەبو محمد، عبدالملك» ناسراو بە ئیبنو هیشام کە لەدوا ئیبنو ئیسحاق هاتووە، هەموو ناوەڕۆکی کتێبی «المغازي» بە پوختەیی بۆ راگواستوین بۆناو کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی «السّيرة النبوية لأبن هشام» لەکاتێکا ماوەی زەمەنی نێوان نووسینەکەی ئیبنو ئیسحاق و راگواستنی ئیبنو هیشام لەپەنجا ساڵ تێپەڕی نەکردبوو. ئەوەتا ئیبنو

---

١ - بروانە ئەو نووسینەی کە ـابن سيد الناس ـ لە پێشەکی کتێبی ـعيون الأثر ـ دەربارەی ئیبنو ئیسحاق نووسیویەتی.

خەلەکان دەربارەی ئیبنو هیشام دەڵێ: ئەم ئیبنو هیشامە ئەو کەسەیە کە سیرەی پێغەمبەری لەکتێبی «المغازي و سیرەی ئیبنو ئیسحاق» کۆکردۆتەوەو پوختەی کردووەو کورتی کردۆتەوە. ناوی ناوە «ألسیرة النبویة لأبن هشام» ئێستا وا لەبەر دەستی خوێنەراندایە.

هەرچۆنێك بێ سەرچاوەکانی سیرەی پێغەمبەر ﷺ ئەو سەرچاوانەی کە باقی نووسەران پشتیان پێ بەستوونو بەهەموو چینەکانیانەوەو لەهەموو سەردەمەکاندا لەم سەرچاوانەدا خۆ دەنوێننو کورت هەڵدەهێندرێن:

یەکەم: قورئانی پیرۆز: کە سەرچاوەی یەکەمو بڕوا پێکراوە بۆ زانینی هێڵە گشتییەکانی ژیانی پێغەمبەرو ئاگاداربوون بەسەر قۆناغەکانی سیرەی پیرۆز دا بەشێوەیەکی کورت، ئەمە وێڕای شێوازی قورئان لە دەربڕینی مەبەستەکانو تیشك خستنەسەر روداوەکان بەو شێوە سەر ئاسایە رەوانو بەلیغە.

دووەم: سەرچاوە بۆ سیرەی پیرۆز، کتێبەکانی سونەنن.. ئەو کتێبانەی کە زانا گەورەو ناسراوەکانی بواری فەرموودە فەرموودەیان تێدا نوسیونەوە کە گومان لە راستگۆییو دڵسۆزیو دەست پاکییاندا نییەو هەموویان بەهەڵگری ئەو رەوشتە بەرزانە ناسراون. وەکوو شەش کتێبە پیرۆزەکەی فەرموودە «الکتب السنة»و کتێبی «ألموطأ»ی ئیمام مالیكو «ألمسند»ی ئیمام ئەحمەدو کتێبی تر. هەرچەندە ئەم کتێبانە کاری سەرەکیو گرنگیان رودەکاتە گفتارو کرداری پێغەمبەر ﷺ لەم روەوە کە سەرچاوەی شەریعەتو یاسان، نەك لەو روەوە کە مێژووەو تۆمار دەکرێ، بۆیە زوربەی زۆری فەموودەی ناو ئەو کتێبە پیرۆزانە بەگوێرەی سەرەباسو بابەکانی فیقهی رێزبەند کراون. یان هەندێ لەو کتێبانە فەرموودەکانی ناویان بەگوێرەی ناوی ئەو صەحابانەوە ریز

کراون کە حەدیثەکەیان ریوایەت کردون، بەبێ ئەوەی زنجیرەی روداوەکان بەرچاو بگیرێ.

سێیەم: سەرچاوە، ئەو راوی‌و حەدیث گێڕەوانەی کە بەشێوەیەکی گشتی گرنگیان بە ژیان‌و سیرەی پێغەمبەر داوە، چونکە بێگومان لەناو هاوەڵاندا زۆر کەس هەبوون گرنگیان بەو لایەنە داوەو کاریان تێدا کردووە. بەڵکوو هیچ هاوەڵێك نەبووە لە هاوەڵان لەخزمەت پێغەمبەردا بووبێ مەشهەدو روداوێکی لە پێغەمبەر دیتبێ بۆ هاوەڵانی تری نەگێڕابێتەوە، نەك جارێك‌و دووجار بەڵکوو زۆر جاریش بۆ چینی خۆیان‌و چینی تازە پێگەیشتوویان گێڕاوەتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی یەکێك لەو هاوەڵانە لەسەرەتادا گرنگی بەسیرە دابێ‌و تەدوینی کردبێ.

پێم خۆشە لێرەدا سەرەنجی خوێنەر رابکێشم بۆ جوداوازیی نێوان ئەوەی بەگشتی پێی دەگوترێ نووسین‌و یادداشتکردن‌و ئەوەی پێی دەڵێن: تەئلیف‌و تەدوین. بێگومان حاڵەتی یەکەم هەر لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا دەستەبەر بوو وەکوو لەوەپێش ئاماژەی پێکرا. وەلێ حاڵەتی دووەم کە بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری‌و رێکخستنی‌و نووسینەوەی لەناو ئامێری لەسەر نووسیندا وەکوو کتێب، ئەم حاڵەتە لەوە دواو لە قۆناغەکانی سەردەمی ئەمەوییەکانداو بەگوێرەی داخوازی کۆمەڵگای جیهانی ئیسلامی ئەوکاتە هاتەدی‌و کەوتە بواری پراکتیڤەوە.

## پەیڕەوو پڕۆگرامی زانستیانە لە گێڕانەوەی سیرەدا:

ئاشکرایە: کە نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ بەگشتی دەچێتە چوار چێوەی ئەو زانیارییەی پێی دەگوترێ مێژوو. هەرچەندە سیرەی پێغەمبەر «وەکوو رونمان کردەوە» یەکەم هەنگاوو هاندەر بوو بۆ سەرنجدان لە روداوەکانی پێشوو ئەو روداوانەی بە زنجیرە بەدوو

یەکدا هاتن. ماوەتەوە ئەوە بزانین ئاخۆ ژینامە نووسەکان، چ مەنهەج و ڕێبازێکیان پەیڕەو کرد لەنووسینی سیرەو تەدوینکردنیدا؟! بێگومان ئەو مەنهەجەی پشتیان پێ بەستوەو پەیڕەویان کردووە، مەنهەجێکی تۆکمەو زانست ئامێز بووە، ئەو جۆرە مەنهەجە بووە: کە ئەمڕۆ ئێمە بە مەنهەجی مەوضوعی ناوزەدی دەکەین بۆ نووسینەوەی مێژوو پەیڕەو دەکرێ.

ئەو زاتانە لە نووسینەوەی سیرەدا چەند یاساو ڕێسایەکی زانستیانەیان پەیڕەو کردووە: کە بەتەواوی مانا یاسای زانستی بوون و تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ زانایان لە ڕێبازی زانستی جۆراو جۆردا پەیڕەوییان دەکەن، خودا یاربێ لەمەدووا ئاماژەیان بۆدەکەین.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە نووسەرانی سیرەو زانایانی، ئەرکی سەرشانیان لەبەرامبەر ڕوداوەکانی سیرەدا چڕبۆتەوە لەوەدا کە ڕوداوەکان بە پێوەرێکی زانستی تۆمار بکەن و لە نووسینەکانیاندا بیچەسپێنن. ئەو پێوەرە زانستییە پەیڕەوی کراوە، بریتی بووە لەسەرجەم قاعیدەکانی موصطەلەحی حەدیث کە پەیوەندیان بەهەریەك لەسەنەدی حەدیثەکەو مەتنی حەدیثەکەوە هەیە. هەروەها یاساو ڕێساکانی جەرح و تەعدیل «متمانە پێ نەکردن و متمانە پێ بەخشین» کە پەیوەستن بە حەدیث گێڕەوەو ژینامەو حاڵ و وەزعیان.

جا هەرکاتێ ئەم یاساو ڕێسایەیان بەسەر هەواڵ و ڕوداوەکاندا ڕابنواندایە، هەڵوێستەیان لە ئاست کردوون و وەکوو خۆیان بەبێ زیادو کەم تەدوینیان کردون، بەبێ ئەوەی هیچ کام لە تەصەوراتی فیکری خۆیان و ڕەنگدانەوەی دەروونییان و شتە ئولفەت پێوە گیراوەکانی بیئەو دەروبەریان بەکارهێنابێ بۆ دەستکاری کردن و یاری پێکردنی ڕوداوەکان.

بێگومـان ئـەو زانـا لێکۆڵـەرەوەو سـیرە نووسـانە پێیـان وابـوو هـەر روداوو حادیثەیەکی مێژوویی کە دەکەوێتە ژێر تیشکی زانیارییان و لـە کلاو رۆژنـەی ئـەو یاساو رێسایانە سـەر هەڵدەدا حەقیقەتێکی پیرۆزەو نابـێ هـیچ تـەلاعوب و دەسـکاری تێدا بکـرێ، پێویـستە وەکـوو خـۆی بخرێتـە بەرچـاوو بەسـەر عـەقڵ و ئـاوەزدا رانوێنـدرێ و تـەدوین بکـرێ. هـەروەکوو چـۆن پێیـان وابـوو، کـە کێـشکردنی روداوەکـان بـۆ ژێـر تەحلیلاتی شەخصی و ئارەزووەکانی نەفسی «کەزۆرجار رەنگدانەوەی بیئـەو بـەروبومی رەگـەز پەرسـتی و دەمـارگیرین» خییانـەتی حاشـا هەڵنەگرن و نابێ بەهیچ شێوەیەك پابەندیان بین و بیانکەین بە حاکمی بـالاّ دەسـت بـۆ لابردنـی هەنـدێ لـەو شـتانەی دەیـەوێ لایانبـا یـان گۆڕانکاری کردن تێیدا.

لە چوارچێوەی ئـەم پارێزگاریکردنـەی حادیثـەو روداو بـەهۆی ئـەو قاعیـدە زانـستیانەی دایانهێنـابوون و لەسـەر ئـەو بنـەما تۆکمانـەی کـە خۆیـان لـە تێڕوانینـی مـەوضـوعـی بـۆ مێـژوودا دەدۆزییـەوە سـیرەی پێغەمبـەرمان پێگـەییوە بەهـەموو قۆناغەکانیـەوە، هـەر لـەرۆژگاری لەدایکبونیەوە بە بنەچەو بنەماڵەیەوە، تاسەردەمی منداڵی و لاویـەتی و گەنجی، وێڕای ئەو دیاردەو ئیرهاصات و روداوە سەرنج راکێشانەی کە بەسـەریدا هـاتوون لەسـەردەمی منـداڵی و گەنجییـەتی دا تـا دەگاتـە رۆژگـاری نیگـا بـۆکردن و دیـاردەی هـاتنی وەحـی بـۆلای کـە لەژیانیـدا گەشـەی کـرد. هـەروا لایـەنی رەوشـت بـەرزی و راسـتگۆیی و دەستپاکی ئەمینداریەتی تا دەگاتە ئەو خاریقەو موعجیزاتانەی پەروەردگار لەسـەر دەسـتی ئـەو هێنانیـە کایـە، هـەروا قۆناغـەکانی دەسـتکردنی بـە بانگەوازیکردن و راگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی، ئەمجار بەرگریکردن لە پەیام و هەڵگرانی، پاشان جیهادی سەر تاسـەری، بەگوێرەی بارودۆخی بانگەوازییەکەی و روبەڕو بوونەوەی لەگەڵ سـەر رەقانی کوفرو ئیلحاد.

هەروا راگەیاندن و رونکردنەوەی ئەو ئەحکام و بنەما شەرعیانەی بە نیگا بۆی رەوانە کرابوون کە لە دووتوێی قورئانێکی موعجیزە ئاسای خوێندراوو فەرموودەی رونکەرەوەو شیکەرەوە بۆ ئایەتەکانی قورئاندا خۆیان نیشان دەداو رەنگیان دەدایەوە.

بێگومان کاری مێژوویی «العمل التأريخی» بە نیسبەت ئەم زنجیرەیە لە سیرەتی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە:

گواستنەوەی ئەو زنجیرە روداوانە بە پارێزراوی، لە چوار چێوەی ئەو یاساو رێسایە زانستیانەی کە بەرچاو گیراون و بە قاعیدەی زانستی ناوزەد دەکرێن... بە پەیرەوی کردنیان دەتواندرێ لەرووی ئیسنادو زنجیرەبوونی سەنەدەکان و ئەو زاتانەی فەرموودەو روداوەکانی سیرەیان گێڕاوەتەوەو ژینامەی یەك بەیەکی ئەو راویانە، هەروا لەرووی مەتن یان روداوەکەو ئەو دیاردە شازو نەگونجاوەی تێکەڵیان دەبن.

بەڵام کاری وەرگرتن و دەرهێنانی حوکم و بنەماو مەعانی لەو روداوە مێژووییانە کارێکی زانستی ترەو پەیوەندی بە مێژووەوە نیەو نابێ بەهیچ شێوەیەك تێکەڵ بەیەك بکرێن و دووکاری لێك جوداوازن. چونکە ئەم کارە واتە: عەمەلیەی ئیستنباطو وەرگرتنی ئاکام و حوکم و بنەماو مەعانی لە زنجیرەکانی سیرەی پیرۆزی پێغەمبەر کارێکی زانستی جودا وازەو سەربەخۆیەو مەنهەج و یاساو رێسای تری هەن، دەتواندرێ وەرگرتنی حوکم و بنەماو ئاکامەکان لە چوارچێوەیەکی زانستی وەها دا ئەنجام بدرێن کە دووری بخاتەوە لە کاریگەری دەسەڵاتی وەهم و ئارەزوی ئیرادەی دەرونی بۆسەریان ئەو ئیرادەیەی کە «ولیم جیمس»و هاوەڵانی بە ئیرادەی ئیعتیقاد ناوزەدی دەکەن.

هەندێ لەو قەواعیدو یاسایانەی بۆ وەرگرتنی ئاکام و ئەحکام و بنەماو مەعانی پەیڕەوییان دەکرێ قیاسی ئیستیقرائی و قانونی

ئیلتیزامــە بەهــەموو جۆرەکانیـــەوە، دەلالات و نیـــشانەیە بەهـــەموو شێوازێکەوە.

بێگومـان لـە چوارچێوەی ئـەم قەواعیدانـەدا ئـەحکامی زۆرو جـۆراو جـۆر لـە روداوەکانی سیرە دەرهێنـدراون، هەنـدێکیان پەیوەنـدن بـە بیرو باوەڕەوە. بڕێکیـان پەیوەنـدن بـە شـەریعەت و سـلوکەوە. ئـەوەی گرنگـە لێرەدا ئێمە بیزانین و ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە: ئەم ئەحکامی تەشریع و سلوکە، کە لـەروداوەکانی سیرە وەرگیراون و دەرهێنـدراون جوداوازن لـە مێژوو لە نووسینەوەی مێـژوویی، مانـاو ناوەڕۆکیـان لەگـەڵ عەمەلییـەی تـاریخی عاسمـان و رێـسمانە، بـەڵکوو ئەوانـە ئاکـامی موعانـات و ژان و هەژانێکی زانستی ترن و یاسا و رێسایەکی تریـان هەیـەو لەسـەر بنـەمای مێژوویی سەریان هەڵداوەو بەگوێرەی ئەو قەواعیدو یاسا زانستیانەی ئاماژەمان بۆ کردن هاتوونە کایەوە.

## سیرەی پێغەمبەر لەژێر رۆشنایی رێبازە تازەکانی نووسینی مێژوو:

لەسـەدەی نۆزدەهـەمی زایینیـدا بیرو بـاوەڕو رێبـازی جـۆراو جـۆر دەربارەی نووسینی مێژوو تەدوینکردنی سەریان هەڵداو هاتنـە کایـەوە، ئەمە وێڕای ئەو رێبازە زانستییەی کە بە «الطريقة الموضـوعية» نـاوزەد دەکرێ و پێی دەگوترێ: رێبازی زانستی «المذهب العلمی». زوربەی ئەو رێبازو مەزاهیبە جۆراو جۆرانە لەژێر چەتری رێبازێکدا خۆیان بینیەوە: کە نـاوی «المذهب الذاتي»یـان لێ نـابوو، هـەوادارانی ئـەم رێبـازە بەچڕی بانگەشەیان بۆ دەکرد، هەوڵی چەسپاندن و بڵاو بونـەوەیان دەدا، هـەموو هێـزو توانـای خۆیـان خـستبووە گـەڕ بـۆ گەشـەپێدانی و سەرخـستنی. ئاشکراشە «فروید» بە گەورەترین بانگەشەکەرو داکوکیکەری ئەم رێبازە دەژمێردرێ.

مامۆستاو رابەرانی ئەم رێبازە بەلایانەوە شتێکی ئاساییە، کە مێژوونووس بیرو بۆچوونی خودی خۆیو رێچکەو رایەڵەی فیکرییو ئایینیو رامیاری خۆی بکاتە تێکەڵکێشی تەفسیرو شیکردنەوەی رووداوی تاریخیو پاساو هێنانەوەو بڕیاردان بە پوچیو بەتاڵی رووداوێك لە رووداوە مێژووییەکانو سڕینەوەی.... بەڵکوو ئەم گرۆهە بەناو رابەرو مامۆستایانە پێیان وایە ئەوە ئەرکی مێژوو نووسەو دەبێ پێیەوە پابەندبێ. واتە: ئەرکی مێژوو نووس ئەوەنیە هەر هەواڵ بگێڕێتەوەو رووداوەکان کۆبکاتەوەو تۆماریان بکا، بەڵکوو دەبێ کاریگەری کەسایەتی خۆیو هێزی فیکرییو رامیارییو ئایینی خۆی بخاتە گەڕو رووداوەکان شی بکاتەوەو بەگوێرەی ئەو رایەڵە فیکرییو سیاسیو ئایینیانە رووداوە مێژوەییەکە لە کەوو بێژینگ بداو ئەوجار تۆماری بکا.

بێگومان ئەم رێبازەو پەیڕەوکردنی کاری نووسینی مێژوو تەدوینکردنی دەخاتە قاڵبی کارێکی فەننی روتەوەو بەرگی زانستی لێ دادەڕنێو بواری ئەوە نادا کارەکە بەکارێکی زانستیانەی ورد بژمێردرێ.

ئێمە لێرەدا هەرچەندە بواری ئەوەمان نییە باسی ئەو رێبازو قوتابخانە مێژووییانە بکەینو لە بۆتەیان بدەینو رەخنەیان لێ بگرینو هەڵیانسەنگێنین. چونکە ئەوە باسو خواسێکی دوورو درێژەو هەوێرێکە زۆر ئاو دەبا. بەڵام نابێ ناڕازیبوونی خۆمان بشارینەوە لەوەی کە لەم سەردەمی پێشکەوتنی عیلمو زانستییەداو شانای کردن بە زانستو بە مەنهەجییەتی زانست، کەسانێك هەبن بانگەشە بۆ ئەو جۆرە مەزهەبو قوتابخانە نازانستیانە بکەنو بڕوایان پێ بێ! چونکە لەڕاستیدا پەیڕەو کردنی ئەم رێبازو قوتابخانەیە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ سەر لەبەری

مێژوو بشێوێنێ. هەموو ئەو حەقائیق و رووداوانەی کە رۆژگار لە پەیکەری پیرۆزی خۆیدا لە ئامێزی گرتون و خۆیان لە ئاوێنەی مێژوودا بەرامبەر چینەیەك لەدوا یەکەکانی ئادەمیزاد رادەنوێنن. بە دەغدەغەی خەیاڵ و ئارەزۆی فەردی و دەمارگیری نەفس و ئارەزۆی سەرکەش هەموویان لێك هەڵوەشێن و تێك بروخێن و کەرت و پەرت بن.

ئاخۆ لەسایەی دەسەڵاتی ئەم دادگایەوە همیە ستەمکارەدا، لەژێر کاریگەری و پەیڕەوکردنی ئەم جۆرە مەزهەب و قوتابخانە بەناو زانستییەدا، چەند حەقیقەت سڕاونەوە، چەند رووداو هەڵەو گێڕ کراون، چەند شکۆمەندی و پیاوەتی و مەردایەتی ژێر خاك کراون و بزربون، چەند بێتاوان سزا دراون و ستەمیان لێ کراوە؟!

دەی بابزانین ئاخۆ ئەم مەزهەب و قوتابخانە تازەیە کاریگەری هەبووە لەسەر نووسینی سیرەی پێغەمبەرو شیکردنەوەی رووداوەکانی یان نا؟

لەڕاستیدا ئەم رێبازە تازەیە لە نووسینەوەی مێژوودا «بەداخەوە» لای هەندێ نووسەرو لێکۆڵەرەوە بووە بە ئەساس و بناغەی قوتابخانەیەکی تازە لە نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەردا.

ماوەتەوە بزانین ئەم رێبازە تازە چۆن سەری هەڵدا؟ هۆکارەکانی دروستبوونی ئەم قوتابخانە چین؟ ئەمڕۆ بەچ ئاکام و سەرەنجامێك گەیشتووە؟

سەرهەڵدانی ئەم مەدرەسە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکردنی وڵاتی میصر لەلایەن بەریتانیاوە. بێگومان میصر لەو رۆژگارەدا مینبەرو دوانگەی جیهانی ئیسلامی بوو، هەرکەسێ بیویستایە فێری زانیاری بێ و عەقڵ و بیرو هزری خۆی گەشەدار بکا، ڕووی دەکردە زانکۆو خوێندنگاکانی میصر بەتایبەتی زانکۆی «الأزهر». هەروەکوو چۆن

کەسێك بیەوێ حەج بکا یان نوێژ بکا رودەکاتە کابەی پیرۆزو ماڵی خودا لەشاری مەککە.

لەبەردەوامبوونی ئەم دەنگە زوڵاڵەی زانکۆی ئەزهەرو برەوی زانست تێیدا لە لایەكو بەردەوامبوونی جیهانی ئیسلامی بۆ گوێڕادێریو بەگرنگ تەماشاکردنی وەکوو مەرجەع. لەلایەکی ترەوە، وای کردبوو کە هەلی ئارامیو پشودان بۆ داگیرکاری بەریتانیا والآ نەبێ، هەرچەندە ئەو زلهێزە داگیرکارە بیەوێ بەهێزی ئاسنو ئاگر دۆڵی نیل بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو داگیری بکا، ئەم داگیرکردنە کاتییەو بەریتانیا پشتی پێ نابەستێو دڵنیا نابێ لەمانەوەو بوونی خۆی لەو دەڤەرە مادامێکی رابەرایەتیکردنی زانکۆی ئەزهەر بۆ جیهانی ئیسلامی بەو شێوە زیندوییە بەردەوام بێ. بۆیە بەریتانیای داگیرکار بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانی، کە یەکێ لەدوو رێگا چارە پەیڕەو بکاو جگە لەو دوو رێگایە رێگای سێیەمی لەبەردەمدا نییە.

رێگا چارەی یەکەم هەوڵ بدەن پەیوەندی نێوان زانکۆی ئەزهەرو جیهانی ئیسلامی بپچڕێننو نەهێڵن چیدی زانکۆی ناوبراو رابەرایەتی روحیو رۆشنبیری جیهانی ئیسلامی بکا.

رێگا چارەی دووەم هەوڵ بدەن بەهەر نرخێك بێ، خۆیان بگەیەننە مەرکەزی سەرۆکایەتی خودی زانکۆو وابکەن سەرۆکایەتی زانکۆو دەست رۆییشتوانی، بە ویستو ئیرادەی داگیرکار هەڵسو کەوت بکەن، یان لانی کەم وایان روپێ لێ بکەن، کە بەرژەوەندی داگیرکار بپارێزنو جمو جوڵە فیکریو رۆشنبیرییەکانیان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لێك هەڵنەبەزنەوە، بەمەش هۆکاری جێگیربونو دڵنیابوون لەمانەوەیان لەمیصر دا بۆ دەستەبەر بێ.

بێگومان بەریتانیا هیچ دوو دڵ نەبوو لە هەڵبژاردنی ڕێگا چارەی دووەم لەم ڕووەوە کە بەئاسانیتر بۆی جێبەجێ دەبوو، دوریش بوو لەوەی هەستی پێ بکرێو پێی بزاندرێو جەماوەری لێ بەئاگا بێتەوە لەخەوی غەفڵەت رایان پەڕێنی«١».

هەڵبەتە تاکە ڕێگا بۆ دزەکردنو گەیشتنی بەریتانیەکان بۆ سەنتەری بڕیاری زانکۆی ئەزهەر دۆزینەوەی خاڵی لاوازو ئەو کەلەبەرانە بوون کە ئازاری هەستو شعوری نەتەوەی موسوڵمانی دەدا بەگشتیو گەلی میصری بەتایبەتی. ئەو خاڵە لاوازەش ئەو بارودۆخە دواکەوتوییو پەرتەوازەییو هەژارییە بوو، کە وەکوو مۆتەکە جیهانی ئیسلامی داپۆشی بوو. لەبەرامبەریشدا ئەو پێشکەوتنو نەهضە زانستییەی خۆرئاوا لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەدەستی هێنابوو، بەئاشکرا موسوڵمانان وێڕای دواکەوتویی خۆیان دەیان بینی خۆرئاواییەکان لەهەموو بوارەکانی فیکریو زانستیو پیشەسازیدا سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەست هێناوە!.

بۆیە موسوڵمانان لەناخەوە چاوەڕوانی ڕۆژێك بوون بتوانن خۆیان لەو بارودۆخە نالەبارە ڕزگار بکەن، ئەو کۆتو پێوەندەی بۆتە هۆی دواکەوتنیان بپسێننو هەنگاو بەرەو پێشەوە بهاون بۆئەوەی هاوشانی گەلانی خودا پێداو بکەونە گەڕو هاوبەشی کاروانی پێشکەوتنو پیشەسازیو گەشەکردنی شارەستانیەتو زانیاری تازە بکەن.

لەم ڕوانگەوە دەغدەغەو خوتە خوت، یان بڵێ فێڵی داگیرکار دزەی کرد بۆ سینەی هەندێ لەقادەی فیکرو رابەرانی ڕۆشنبیریو مامۆستایانی عیلمو زانست لە وڵاتی میصر. پوختەی ئەم دەغدەغەو

---

١ - بڕوانە یاداشتی «اللورد کرومر» هەروا کتێبی «الإتجاهات الوطنیة في الأدب الحدیث» دانراوی دکتۆر محمد محمد حسین.

خوتە خوتە، یان بڵێ ئەو سرتەو بەگوێدا چرپاندنە ئەوەبوو کە خۆرئاوا کاتێك لەزنجیرو کۆتی دواکەوتوویی رزگاری بوو کە ئاینی گەردنکەچ کرد بۆ پێوەرەکانی زانست، وتیان: ئاین شتێکەو زانست شتێکی ترەو پێکەوە گونجانیان زەحمەتەو پێکەوە هەڵناکەن، مەگەر ئاین ملکەچی زانست بکەین. جا ئەگەر جیهانی ئیسلامی دەیەوێ پێش بکەوێو سورە لەسەر ئەوەی لە کۆتو زنجیری دواکەوتوییو هەژاریی رزگاری بێ، پێویستە هەمان رێبازی خۆرئاوا بگرێتە بەر، دەبێ لە جیهانی ئیسلامیو لێرەدا وا لەئیسلام تێبگەین کە خۆرئاواییەکان لە خۆرئاوا لە ئایینی نەصرانی تێگەیشتوون. ئەمەش دەستەبەر نابێ، مەگەر بەروتکردنی فیکری ئیسلامی لەهەموو ئەو غەیبیاتو شتە پەنامەکییانە کە پەییان پێ نابرێو ملکەچی مەقاییسو پێوەرەکانی زانستی تازە نابن. زۆری پێ نەچوو، کە ئەم دەغدەغەو بەگوێدا چرپاندنە رۆڵی خۆی گێراو ئەوانەی راستی ئیمان بەخودا لەدڵو دەروونیاندا بەباشی نەرسکابوو، چاویان بە دیمەنە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا بەزەندەق وەستابوونو پێشکەوتنی خۆرئاوا سەرسامی کردبوون، ئەو بەگوێدا چرپاندنە هەڵوێستەیەکی پێ کردنو لەناو خۆیاندا کەوتنە بانگەشە کردن بۆ خۆرزگار کردن لەهەر بیرو باوەڕێکی غەیبی کە زانستی تازە کەشفی نەکردبێو نەچێتە ژێر دەسەڵاتو کونترۆڵی تەجرەبەو تاقیکردنەوەو موشاهەدەی مرۆڤانە.

ئەوەبوو دەستیان کرد بە چاکسازی کردن لە ئاییندا، ئەمەش چەند ئەرکێکی جۆراو جۆری خستە سەر شانیان، یەکێك لەو ئەرکانە سەرلەنوێ نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەرو گەشە پێکردنیو تێگەیشتنی بوو، پشت بەستن بە مەنهەجو رێبازی تازە بۆ شیکردنەوەو شیتاڵ کردنی، بەجۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ بەرژەوەندیو

مەبەستی بێگانەو داگیرکار. ڕاستو دروست ئەوەی بەریتانیا مەبەستی بوو لەگەڵ ئەو چاکسازی کردنەی کە هەندێ ڕابەرو مامۆستای ڕۆشنبیریو زانست لە میصر هێنابوویانە ئاراوەو بانگەشەیان بۆ دەکرد، یەکیان گرتو هەموو ئەو غەیبییاتو موعجیزەو خەواریقانەی کە زانیاری تازە تێی ناگاو قبوڵی ناکا خرایە چوارچێوەی چاکسازیی تێداکردنەوە.

بێگومان ئەو داگیرکارانە لە پەیڕەوکردنی ڕێبازی خودی «ألطریقة الذاتیة» لە نووسینی مێژوودا باشترین پەناگەو هۆکاریان دەستکەوت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

زۆری پێ نەچوو کتێبو نامیلکەو نووسینی زۆرو بەربڵاو لەبواری سیرەی پێغەمبەردا پەیدابوو، ئەو قاعیدەو پێوەرە زانستیانەی زانایانی ئیسلام لەرابردودا پەیڕەویان دەکردن ئەمان پاشگوێیان خستن، میزانی ریوایەو سەنەدو قاعیدەکانی حەدیث گێڕانەوەو حەدیث وەرگرتنو مەرجەکانیان گۆڕین بەڕێبازی «الإستنتاج الشخصي» و «میزان الرضا النفسي» و «منهج التوسم» کە لەژێر کاریگەری حەزو ئارەزوی نووسەرەکەو مەبەستە شاراوەکانیو بیرو بۆچونەکانیدا ئەنجام دەدرا.

بە پشت بەستن بەم ڕێبازە نوێیەو پەیڕەوکردنی، نووسەرەکان کەوتنە گۆڕانکاری کردن لەسیرەدا، هەرچی عەقڵ پەی پێ نەبردایەو لەو شتانەی کە دەکەونە چوارچێوەی موعجیزاتو خەواریقەوە بەشتێکی نەسەلمێنراوو دوور لە واقیعیان لە قەڵەم داو کەوتنە خۆ بۆ ڕەواجدان بەوەی صیفەتی عەبقەریو عەظەمەتو پاڵەوانیەتیو ئەم جۆرە ڕەوشتانە پاڵ پێغەمبەر بدەن، بۆئەوەی خوێنەر لەوە بێ ئاگا بکەن کە حەزرەتی موحەممەد دارای صیفاتی وەکوو «نبوەت»و نیگاو پەیامبەرییە، کە ئەم صیفاتانە تێکڕا بناغەو کەسایەتی پێغەمبەر پێک دێنن.

کتێبی «حیاة محمد» دانراوی حوسین هەیکەل دیاریترین نموونەیە بۆ ئەو ڕێباز تازەیەی کە سیرەی پێغەمبەری لەژێر کاریگەریدا پێ نووسرایەوە. ڕاشکاوانە دانەری کتێبی ناوبراو مەنهەج و ڕێبازی خۆی لەدانانی کتێبەکەیدا بە شانازییەوە دەردەبڕێ، کاتێک کە دەڵێ: «بێگومان من لەم نووسینەمدا نەهاتووم ئەوەی کتێبەکانی سیرەو فەرمووده تۆماریان کردووە وەری بگرم و پەیڕەوی بکەم، چونکە من وام بەباشتر زانی لەم نووسینەمدا ڕێبازی زانستی پەیڕەو بکەم».

هەروا لە نموونەی ئەم ڕێبازە تازەیەی نووسینی سیرەو شیکردنەوەو تێگەییشتن لێی، ئەو زنجیرە نووسینە بوو کە خوا لێخۆشبوو موحەممەد فەرید وەجدی لە گۆڤاری «نور الإسلام» لەژێر عینوانی «السيرة المحمدية تحت ضوء العلم والفلسفة»دا بڵاوی کردنەوە. ئەمیش بەئاشکرا مەبەستی خۆی لە هەندێ نووسینیدا دەردەبڕێ و دەڵێ: «بێگومان خوێنەرانمان هەستیان بەوە کردووە، کە ئێمە لەم نووسینانەماندا کە دەربارەی سیرە دەینووسین سورین لەسەر ئەوەی کەتا بۆمان بکرێ و بتوانین پاسا و بهێنینەوە، زۆر زێدەڕەوی بەلای بواری ئیعجازدا نەکەین و هەوڵ بدەین تەنانەت ئەگەر بە تەکەللوف و سەپاندنیش بێ ڕووداوەکان بەهۆکاری عادی و ئاسایی بژمێرین».

هەر لەنموونەی ئەم ڕێبازو قوتابخانەیە، ئەو نوسینە زۆرو بەربڵاوانەی هەندێ لە ڕۆژهەڵات ناسەکان کە دەربارەی سیرەو ژینامەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەچوارچێوەی نووسینە مێژوویيەکانیانداو لەسەر بنەمای مەنهەجی زاتی و تەریقەی مەوضوعی ئامارژە پێکراو ئەنجامیان داوە. تۆ دەبینی ئەوانە بەکەسایەتی حەزرەتی موحەممەددا هەڵدەڵێن و ئامارژە بە گەورەیی و ڕەوشتە بەرزەکانی دەکەن، بەڵام دوور

لەهەر ماناو دیاردەیەك كە سەرنجی خوێنەر رابكێشێ بۆلای مانای «نبوة»و نیگاو موعجیزە لە ژیانی پیرۆزیدا. هەروا دوور لە گرنگیدان بە سەنەدو ریوایەتو ئەو یاسایانەی زانایانی ئیسلام لە رابردودا لەبواری سیرەدا پێوەی پابەندبوون! چونكە گرنگیدان بەو یاساو رێساو قاعیدە تۆكمانە ئەگەر پەیرەویان بكەن وادەبێ ناچاریان بكەن بە بڕواهێنان بەروداوو دیاردەی وا كە گرنگیدانەكەیان بەو شتانە لە بەرژەوەندی وان نەبێ.

ئاواو بەو جۆرە رابەرانی ئەم قوتابخانە تازەیەو شوێنكەوتووی رێبازی خودی «ألمذهب الذاتي» لە نووسینی مێژوودا رێگایان بۆ خۆش بوو، گۆرەپانی بەرفراوانیان بۆ دەستەبەر بوو: كە بتوانن بە ئارەزووی خۆیان هەرچی بەلایانەوە پەسەند نەبێ لە حەقائیقو روداوەكانی سیرە هەرچەندە بەڵگەی زانستیو یەقینیش پشتگیری بكەن، وەلای نێنو هێڵی راستو چەپی بەسەردا بێنن. لەهەواو هەوەسو حەزو ویستی كەسیەتی خۆیانو ئامانجە دوورەكانیان دادوەرو دەسەڵاتدارێكی رەهایان كردبووە دەست رۆییشتوو بەسەر هەموو حەقائیقە مێژووییەكانداو توێژینەوەو شیكردنەوەی ئەودیو پەردەی هۆكارەكانیان، كردبووە حەكەمو ناوبژیكار بۆ پەسەندكردنو وەلانان، بۆ قبوڵكردنی ئەوەی بەلایانەوە پەسەندەو سڕینەوەی ئەوەی بە پێویستیان زانیوە بیسڕنەوە.

بێگومان ئێمە دیمانو خوێندومانەتەوە. هەموو روداوێكی «خارق العادة»و موعجیزەی پێغەمبەرایەتی لەوانەی لە حەدیثی موتەواتەردا ریوایەت كراون، تەنانەت هەندێ جار قورئان بە ئاشكرا ئامارەی پێ كردوون، ئەم بەناو زانستخوازانە هاتوون «بە تەكەللوف» تەئویلیان بۆ دۆزیوەتەوەو لەگەڵ واقیعی ئولفەت پێوە گیراو گونجاندویانن، بۆئەوەی

لەگەڵ مەبەستی خوازراویان بگونجێ. هەر بۆ نموونە روداوی «طیراً أبابیل» وێڕای رونی مانای ئایەتەکە، ئەوان بە نەخۆشی ئاوەڵەو مێکوتەی تەئویل دەکەن!! روداوی «الإسراء» شەوڕەوی پێغەمبەر ﷺ بۆ قودس و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمانەکان بەگیان و بەجەستە، کە قورئان بە ئاشکراو رون باسی دەکا. تەئویلی دەکەن بەگەشتی گیانی و جیهانی خەوو خەوبینین.

ئەو فریشتانەی پەروەردگار کردنی بە یارمەتیدەری موسوڵمانان لە غەزای بەدردا، بە یارمەتی مەعنەوی تەئویل دەکەن. وەکوو رێز لێنانێک بۆ موسوڵمانەکان ئاراستەی دەکەن و بەبڕوای ئەوان یارمەتیدانی فریشتەو هاوکاری کردنیان بۆ موسوڵمانان شتێکی نامەئلوفەو عەقڵ وەری ناگرێ!

دواکاری گاڵتەجار ئامێزو سەر سوڕهێنەریان کەزادەی قوتابخانەی بەناو زانستی و رێبازی خودی «الطريقة الذاتية»ی سەردەمیانەیان بوو، ئەوەبوو هاتن شیکردنەوەو تەفسیریان بۆ مانای «نبوة» لەژیانی پێغەمبەرداو ئیمانهێنانی هاوەڵان بەو پەیامەو هەموو فوتوحاتی ئیسلامی و گیانبەختکردنی سوپای ئیسلام لەپێناو بڵاوبوونەوەو چەسپاندنی ئایینی خودادا، تەفسیریان بەوە کردەوە کە هەموویان بریتی بوون لە راپەڕینی چینی چەوساوەو هەژار دژی چینی دەرەبەگ و فیودال. پێیان وایە هەموو ئەو فتوحاتانەی جەنگاوەرانی ئیسلام لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەرداو پاشان لە رۆژگاری خولەفای راشیدیندا ئەنجامیان دا، پاڵنەرو هۆکارەکانی باری ئابوری و هەڵپەی دەوڵەمەندبون و پاوانخوازی و فراوانکردنی روبەری وڵات بوو، پێیان وایە ئەو شۆڕش و راپەڕینە، هەڵگەڕانەوەی هەژارەکان بوو، دژی دەوڵەمەندو دەرەبەگ هەڵیان گیرساند.

بەکورتی ئەم قوتابخانە تازەو رێبازە زانستییە کە پەیرەو کرا لە لێکۆڵینەوەی سیرەی پێغەمبەردا ﷺ بەتایبەتی و لە مێژووی ئیسلامی دا بەگشتی، فێڵێکی خەتەرناك و پیلانێکی گەورە بوو، چاوی رەشە خەڵکی موسوڵمان لە ئاستیا شەو کوێربوو هەستیان پێ نەکرد، لەهەمان کاتدا لای کۆمەڵێکی تر لە رۆشنبیرو دوو روویی بە ناو موسوڵمان بە دڵفراوانی وەرگیراو پێشوازی گەرمی لێکرا.

بێگومان رەشە خەڵکی موسوڵمان بەوەیان نەزانی کە ئەو دەغدەغەو چپاندنەی داگیرکەر، کە بانگەوازی موسوڵمانان دەکا بۆ شۆڕشی چاکسازی لەبواری بیرو باوەڕی ئیسلامی دا بۆ چاکسازیی نیە لە راستیدا بۆ لێك هەڵتەکاندنی ئەو بیرو باوەڕەیە لە رەگ و ریشەوەو خزمەتکردنی ئایینەکە نییە.

ڕەشە خەڵکی موسوڵمان ئەوەیان نەزانی: کە بەتاڵکردنی ئیسلام لە حەقائیقی غەیبی، داگرتن و هاخنینیەتی بە مەوادی تەقینەوەی سامناك و سڕینەوەی لەوجود. چونکە نیگای خودایی کە سەرچاوەو کانی ئیسلامە بە لوتکەی خاریقەو حەقائیقی غەیبی دەژمێردرێ، گومانیش لەوەدا نیە کەسێك بێ پێچ و پەنا هەرچی روداوی نا ئاسایی و «خارق العادة»یە لە سیرەی پێغەمبەر دا رەتی بکاتەوە یان تەئویلی بۆ بدۆزێتەوە، بەبیانوی ئەوەی کە پێچەوانەی یاسای بەرچاوی سروشتەو لەگەڵ زانستی تازەدا ناگونجێ، بێگومان ئەو جۆرە کەسە خێراترو بێ پێچ و پەنا دیاردەی نیگای خودایی رەت دەکاتەوە، هیچ لەوە سڵ ناکاتەوە کە راشکاوانە دیاردەی وەحی و هەموو ئەو مانایانەی لەخۆی گرتوون لە هەواڵی حەشرو نەشرو قەبرو قیامەت و زیندو بوونەوەو سزاو پاداشی خودا بۆ بەندەکانی و هەبوونی دۆزەخ و بەهەشت و دیمەنەکانیان رەت بکاتەوە بە بیانووی خودی سروشت.

هەروەها موسوڵمانان لەوەش بێ ئاگابوون کە ئاینێك خۆی لەخۆیدا گونجاو بێ بۆ مرۆڤ، پێویستی بەوە نیە کە لەرۆژگارێکدا یەکێك یان کۆمەڵێك چاکسازی تێدا بکەن و گۆڕانکاری لە کرۆکی ئایینەکەدا ئەنجام بدەن.

بەڵێ موسوڵمانان تێکڕا ئەو راستیانەیان لێ گوم بوون، هەرچەندە پێ زانین و هەستکردن بەو فێل و تەڵەکە بازیەی داگیرکەرو بە پیرەوە چوونی بڕی رۆشنبیرو دوڕوو چڵکاوخۆر بۆ وەدی هێنانی ئامانجی داگیرکار ساکارترین داخوازی زانستەو دەبوایە زۆر زوو هەستیان پێ بکردایەو لە دژی هەڵوێستیان وەرگرتایە.

ئەگەر جەماوەری موسوڵمانان تا ئەندازەیەك دارای زانیاری راست و دروست بوونایە، ئەو راستییەیان لێ گوم نەدەبوو. وەلێ بەداخەوە چاویان بەدیمەنە پێشکەوتووەکانی خۆرئاواو گەشەکردنی زانیاری تازەو هەڵگرتن و رانواندنی شیعاراتی زانست و زانیاری بە ملۆق وەستاو لە حەقائیقی مەنطیق و عیلم تەنها شیعارو عینوانەکانیان بینی و بەس. لەکاتێکدا ئەوان زۆر پێویستیان بەوە هەبوو ژیرانە بڕواننە مەبەستە شاراوەکانی ئەودیو شیعارو عینوانەکانەوە. دەبوایە زۆر باش و بەشێوەی دروست هەزمی مانای ئەو شیعاراتانەیان بکردایە. بەڵام ئەوان هیچ شتێك لە خەیاڵیاندا نەبوو جگە لە دیاردەی پێشکەوتنی خۆرئاوا لەهەموو بوارەکانی ژیانداو لە خولیای چاکسازیی ئایینی دابوون و ئەو چمکەیان دووبارە دەکردەوە باچاکسازیی بکەین لەبواری بیرو باوەڕدا لە وڵاتی ئیسلامیدا وەکوو چۆن خۆرئاوا لەبیرو باوەڕی مەسیحیدا چاکسازی کردو پێشکەوتنی بەدەست هێنا.

بەوجۆرە بناغەو پایەی ئەم قوتابخانە تازەی بەناو زانستییەی لەوەپێش ئاماژەمان بۆکرد، گێژاوێکی دەروونی بوو نەك حەقیقەتێکی

زانستی توێژینەوە تێدا کراو، کەف و کوڵێکی نەفسی بوو سواری عەقڵ بوو نەك بنەمایەکی زانستی دیراسە کراو چەواشەکردنی ئایین بوو نەك چاکسازیی کردن تێیدا.

## سەرەنجامی ئەم قوتابخانە بەناو زانستییە لە ئەمڕۆدا:

لەڕاستیدا گرنگی دان بەم قوتابخانەیە لە نووسینەوەی سیرەداو تێگەییشتن لێی و هەزمکردنی و سووربوونی بڕی تاقم و گرۆی رۆشنبیرو بەناو زانا لەبواری سیرەدا، بە قۆناغێکی دواکەوتوو دەژمێردرێ لە بواری مێژووداو تێپەڕی. بیانوی ئەوانەی کە ئەم نشێوی و دواکەوتوییەیان بەسەردا تێپەڕی یان بڵێین ئەوان بەو نشێوی و بەرەو خوار بوونەوەدا تێپەڕین، بیانوەکەیان ئەوەیە ئەوان ئەوکاتە پاش ماوەیەکی زۆر لەبێ ئاگایی و چاو قوچاندنیان. کە چاویان هەڵهێناو وەئاگا هاتنەوە، دیمەنی پێشکەوتنی سەر سوڕهێنەری خۆرئاوایان کەوتە بەرچاوو بەهەواڵی پێشکەوتنی زانست و گەشەسەندنی تەکنۆلۆژیای سەیرو سەمەرە گوێچکەیان کرایەوە. کارێکی سروشتیشە کە چاوی خەواڵو کاتێك روناکی لێی دەدا حەقائیقی شتەکان نابینی، یان ئەگەر بیشیان بینی حەقیقەتیان باش نابینی و شتەکانی بۆ لێك جیاناکرێنەوە. تا ماوەیەك بەسەرچوو چاوەکان کاریگەری تیشکی روناکییەکەیان لەسەر نەماو ئاسایی بوونەوە، ئەمجار وردە وردە شتەکانیان بەدی کردو لێکیان جیا کردنەوەو حەقیقەت و واقیعیان زانی و شك و گومان رەوینەوە، پەردەو تەم و مژ نەمان و هۆکاری دیتن صاف و بێگەرد بوون، چینێك مرۆڤی گەنجی رۆشنبیری زاناو حەق ویست حەق بێژ هاتە گۆڕێ، بڕیاریدا هەڵس و کەوتی زانستانە لەگەڵ حەقیقەتی عیلم و جەوهەری زانستدا ئەنجام بدا، پێچەوانەی چینی

پێش خۆیان کە بەشیعارات و عەناوین هەڵخەڵەتان، ئەمان بەچاوی تیژو دڵی وریا و بە تێڕوانینی لێکۆڵەرەوەو زانا و بیرمەندی ئازاد، قۆڵیان لێ هەڵماڵی و کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان و توێژینەوەو گەڕان بەدوا حەق و راستیدا، تا گەییشتنە ئەو حەقیقەتەی کە ئەو شتانەی بەخەواریق و موعجیزە ناوزەد دەکرێن ناگونجێ کە لە جەوهەرو کرۆکی خۆیاندا دژی حەقائیقی عیلم و تەرازوی زانست بوەستن و پێکەوە هەڵنەکەن، چونکە ئەو شتانەی پێیان دەگوترێ «ألخوارق»، واتە: شتی لە عادەت بەدەرو نامەئلوف، بۆیە ئەم ناوەیان لێ نراوە، چونکە لەدەرەوەی بازنەی شتی نا ئاساییدا خۆیان دەبیننەوەو پێچەوانەی شتی پێوە راهاتوو مەئلوفن، ئاشکراشە خو پێوەگرتن و عادەت ناتواندرێ بکرێنە پێوەرو قیاسی زانستانە بۆ شتێك مومکین بێ ببێ یان نەبێ. زۆریش بەدووری دەزانین کە رۆژێك زانست بڕیاری ئەوە بدا هەر شتێك چاو پێی رابێ و ئولفەتی پێوە بگیرێ هەر ئەو دەشێ ببێ، هەر شتێکیش چاو پێی ئاشنا نەبێ، لەو شتانە بێ ئولفەتیان پێوە نەگیراوبێ بونیان نامومکین بێ!.

بێگومان هەموو لێکۆڵەرەوەو رۆشنبیرێك ئەمڕۆ ئەوەی بۆ دەرکەوتووەو دەزانێ: کە تازەترین زانیاری بەدەستهاتوو بۆ زانایان لەم بارەوە، ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەو پەیوەندییەی ئێمە دەیبینین لەنێوان ئەسباب و موسەبەباتدا جگە لەپەیوەندی جوتایەتی «اقتران مطرد» هیچی تر نیە. ئەو عەلاقەو پەیوەندییە بۆخۆی بۆتە شیکارو پاشان هۆکارو ئەمجار ئەو قانونەی لێ دەرهێندراوە کە شوێنکەوتەو تابیعە بۆ پەیدابوونی ئەو پەیوەندییە نەك بە پێچەوانەوە.

ئەگەر تۆ بچی پرسیار لە قانون و یاسای زانستی بکەی، ئاخۆ رای چیە دەربارەی روداوێکی «خارِق» یان موعجیزەیەکی خودایی بەزوبانی حاڵ «کە هەموو زانا و رۆشنبیرێکی ئەمڕۆ لێی تێدەگا» پێت دەڵێ:

براڵە! روداوی خەواریق و موعجیزات ناخرێنە چوارچێوەی باس و لێکۆڵینەوەی منەوە و ناتوانم هیچ بڕیارێکیان دەربارە بدەم، وەڵێ ئەگەر ئەمڕۆ روداوێکی خاریق لە بەرچاوم رویدا ئەوە لەم کاتەدا دەبێتە مەوضوع و باسی هەنوکەییم و تێی دەفکرم و شی دەکەمەوە، پاشان شەرح و پاساو بۆ هێنانەوە و دۆزینەوەی هۆکار، ئەمجار روداوە خاریقەکە بە قانونی شوێنکەوتەی خۆی هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرێ!!!

بێگومان ئەو سەردەمە رۆیی کە بڕێ لە زانایان پێیان وابوو کاریگەری ئەسبابە سروشتیەکان لەوەدی هاتنی موسەبەباتەکانیاندا کاریگەرییەکی حەتمییە و نابێ دواکەوتن و گۆڕانی تێدابێ، هەر لەگەڵ سەبەب بوو، دەبێ موسەبەب بێتە دی. بەڵێ ئەم مەقولەیە بەسەرچوو، ئەو راستی و حەقەی ژێر لێو خرابوو، هەمیشە زانایانی موسوڵمان داکۆکییان لێ دەکردو سەرنجی مرۆڤیان بۆلا رادەکێشا، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. رای زانایانی موسوڵمان بەگشتی و ئیمامی غەزالی بەتایبەتی بەڕاست دەرچوو، بوو بە حەقیقەتی عیلمی: کە دەیانگوت: پەیوەندییەکانی نێوان ئەسباب و موسەبەبات جگە لە پەیوەندی جوتیەتی روت «اقتران مجردة» هیچی تر نیە. عیلمیش لە حوکم و قانوونەکانیدا دیوارێکە لەسەر ئەو جوتیەتە روتە هەڵچندراوە و بەس، وەڵێ نهێنی ئەم بەیەکەوە بون و جوتیەتە ئەوە هەر خودا دەزانێ چۆنە و ئێمە پەی پێ نابەین.

بێگومان ئێمە زانیمان کە زانای ئەزمونگەری و لەبۆتە دان «العالم التجريبي» دافید هیوم، چۆن ئەم حەقیقەتە بە بەڵگەی زانستیانە روون دەکاتەوە و تیشك دەخاتە سەری و راستی دەردەخا.

بەڵێ پێویستە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ: کەرێزی عەقڵ و حەقیقەت دەگرێ «پێویستە لەسەری بۆ وەرگرتنی هەر هەواڵ و روداوێك روداوو

هەواڵەکە خاریق و نا عادەتی بێ یان ئاسایی و ئولفەت پێوە گیراو بێ»
یەك مەرج بەرچاو بگرێ ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەو هەواڵەی لەرێگای
عیلمی و راستەوە پێ گەیشتبێ، لەسەر بنەمای یاسا و قەواعیدی
زانستی ریوایەو ئیسنادو پێویستیاتی جەرح و تەعدیل هەواڵەکەی
بەدەست هێنابێ، بەجۆرێك جەزم و یەقین دەستەبەر بکا.

درێژەدان و باسکردن و لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم پێوەرو تەرازوو
یاسا و رێسا زانستیانە باسێکی دورو درێژە زۆری دەوێ. نامانەوێ
لێرەدا ئەو دەرگایە بکەینەوە.

لە راستی دا مرۆڤی زانستخوازو رێزگر لە عیلم، توشی سەر
سوڕمان دەبێ و شۆك دەیگرێ، کاتێك لەبەردەم ئەو فەرمایشتەی
پیاوێکی وەکوو حسین هەیکەل رادەوەستێ: کە لەپێشەکی کتێبی
«حیاة محمد»دا دەڵێ:

«بێگومان من لەم نووسینەمدا بەهیچ شێوەو کلۆجێك گوێ نادەمە
ئەوەی کتێبەکانی سیرەو فەرموودەی پێغەمبەر تۆماریان کردووە!
چونکە من دەمەوێ ئەم نووسین و بەحثەم بەپێی رێبازی زانستی ئەنجام
بدەم»!.

واتە: مامۆستا حسین هەیکەل، تۆ دڵنیا دەکا لەوەی کە تەنانەت
کتێبەکانی صەحیحی بوخاری و موسلیمیش ناکا بەسەرچاوەو شتیان
لێ نەقڵ ناکا! ئەمەش بۆ پاراستنی کەرامەتی عیلم!... کەوابوو بە قسەی
ئەم زاتە زانستخوازە، ئەوەی ئیمامی بوخاری ریوایەتی دەکا لە
چوارچێوەی ئەو هەموو مەرج و خۆپارێزییە لە هەڵەو درۆو بوختان، ئەو
هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی داویەتی بۆ وەدەستهێنانی هەواڵی راست و
بێ غەل و غەش لەبواری ریوایەتی وشەو هەواڵدا، لادانە لە شەقامە رێی
عیلم... لەکاتێك رێبازی نەتیجە وەرگرتن و حەدس و مەزندەکردن و

ئەوەی پێی دەڵێن «منهج التوسم» بە ڕێبازی زانستی سەردەمانەی لەقەڵەم دەداو شانازی دەکا بەوەی کە پابەندی دەبێ! ئەمەش بە مەبەستی پارێزگاری لە کەرامەتی زانستو پابەندبوون بە تەرازوی ڕێبازی زانستی!!.

دەتوخوا بە ویژدانەوە بڕیاربدەن ئایا ئەمە کاریثەی گەورەو بەڵای گورچکبڕنیە تووشی زانستو زانیاری بووە؟

**سەرەنجام: دەبێ ئێمە چۆن دیراسەی سیرەی پێغەمبەر بکەین لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لە ڕابردودا ئاماژەمان پێ کرد:**

ئاشکرایە حەزرەتی موحەممەد ﷺ کاتێك لەنیوە دورگەی عەرەبی دا پەیدابوو، خۆی وانیشانی جیهاندا کە پێغەمبەرەو لەلایەن خوداوە ڕەوانە کراوە بۆسەر ئادەمیزاد بەگشتی، بۆئەوەی ئەو ڕاستییەیان بۆ دوبارە بکاتەوە کە پێغەمبەرانی پێش خۆی بانگەوازییان بۆ کردووە، ئەو پەیامەیان بۆ روون بکاتەوە کە پێغەمبەرانی ڕابردوو بە گەلو نەتەوەی خۆیانیان گەیاندووە. بۆئەوەی هەمان ئەو ئەرکانەی پێغەمبەرانی پێشوو خستوویانەتە سەر گەلەکانیان ئەمیش بیخاتە سەر ئەو گەلو نەتەوانەی کەبۆ سەریان ڕەوانە کراوە. ئەوەی بۆ رونکردنەوە: کەدوا پێغەمبەرە لەزنجیرەی یەك لەدوایەکی پێغەمبەران، ئەمجار زیاتر خۆی پێ ناساندنو ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە ئەو بەشەرێکە لە گرۆی ئادەمیزادو هەموو دیاردەو نیشانەیەکی ئادەمیزادانەی وەکی خواردنو خەوو نەخۆشیو لەشساغی....هتد تێدا بەرجەستەیە، وەلێ خودا هەڵی بژاردوەو کردویە بە پێغەمبەرو نیگای بۆ کردوەو ئەرکی بانگخوازی بۆ ئیسلامو گەیاندنی بە مرۆڤەکانی خستۆتە ئەستۆ، بۆئەوەی ئادەمیزاد کەسایەتی خۆیان بدۆزنەوەو حەقیقەتی خۆیان بزانن، ئاگاداریان دەکا

لەپلەو پایەی ئەم ژیانی دونیایە لە نەخشەی بەرفراوانی مەملەکەتی خودایەتی دا، چ لەڕوی زەمانەوە چ لەڕوی مەکانەوە. سەرنجیان رادەکێشێ بۆ ئەو سەرەنجامەی روبەڕویان دەبێتەوە دوا مردن، لەزیندو بوونەوەو حیساب و لێکۆڵینەوە لەگەڵیان و ئەمجار سزاو پاداش بەگوێرەی کردەوەکانیان. هەروەکوو چۆن سەرنجیان رادەکێشێ بۆ پێویستییەکی زۆر پێویست ئەویش ئەوەیە: کە بە سلوکی ئیختیاری خۆیان گونجاوبن لەگەڵ هەوییەو حەقیقەتی خۆیان. واتە: پێویستە لەسەریان بە ویستو ئیختیاری خۆیان بەندایەتی خودا بکەن و ملکەچی فەرمان و نەهیەکانی بن، وەکوو چون ئەوان بەناچاری بیانەوێ و نەیانەوێ بە واقیع بەندەی خودان. ئەمجار لەزۆر موناسەبەو میانەدا ئەوەی بۆ دووبارەو سێ بارە کردونەوە، کە ئەو دارای ئەوە نییە هیچ زیادی و کەمی و گۆڕانکارییەك لە ناوەڕۆکی ئەم پەیامە پیرۆزە دا بکا کە پەروەردگار ئەرکی راگەیاندنی و بڵاو کردنەوەی خستۆتە سەر شانی و فەرمانی پێ کراوە بەهەموو جیهانی رابگەیەنێ. تەنانەت بەیانی خودایی بە ئاشکرا ئەم راستییەی جەخت کردۆتەوە دەفەرموێ: {وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ – سورة الحاقة/٦٩/٤٤-٤٧} .

کەوابوو حەزرەتی موحەممەد ﷺ خۆی وا بەجیهان نەناساندووە کە سەرکردەیەکی سیاسییە، یان رابەرێکی نیشتمانی، یان پیاوێکە خاوەنی فیکرەو مەزهەبێکی فەلسەفی، یان موصلیحێکی کۆمەڵایەتییە... بەڵکوو لەماوەی ژیانیدا هیچ هەوڵێکی وای لێ نەبیندراوە کە مەبەستی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی تێدا بووبێ.

جا کەئەمە واقیعی حاڵ بێ، بێگومان ئەوەی مەنطیقی خۆی بەسەر ئێمە دا فەرز دەکا لەکاتی توێژینەوە لەژیانی پیاوێکی ئاوەها، ئەوەیە

کە ئێمە دیراسەی ژیانی گشتی ئەو زاتە بکەین لەچوارچێوەی ئەو پێناسەی خۆی پێ بەجیهان ناساندووە، بۆئەوەی لەمیانەی ئەوەدا بەڵگەی راستو ناڕاستمان دەست بکەوێ لەسەر ئەوەی دەیفەرموێ!!.

بێگومان ئەمە ئەوەمان دەخاتە ئەستۆ کە هەموو لایەنەکانی ژیانی کەسایەتیو مرۆڤایەتی ئەو زاتە دیراسە بکەین. بەڵام بەمەرجێك ئێمە ئەو توێژینەوە هەمە لایەنەی ژیانی پیرۆزی بکەینە مەشخەڵی رێ نیشاندەری وەها کە بە بەڵگەی زانستیو مەوضوعی حەقیقەتی ئەو کەسایەتیو پێناسەیەمان بۆ روون بکاتەوە کە خۆی پێ بەجیهان ناساندووە.

بەڵێ پێدەچێ پەسەندبێ ئێمە وابزانین کە ئێمە ناچارنین فیکرو عەقڵی خۆمان بەوە هەڵەوگیر بکەین کە پێغەمبەر ویستوویەتی ئادەمیزادی پێ مەشغول بکا لە نموونەی مانای «نبوة» و «ریسالة» لە کەسایەتی خۆیدا. بەڵێ، ئەمە وایە ئەگەر شتەکە پەیوەست نەبێ بەسەرەنجامی خۆمانو کارنەکاتە سەر ئازادیو سلووکمان. بەڵام قەضیەکە پەیوەستە بە خودی خۆمانەوە، زانیاری پێویستو سلووکمان بۆ دیاری دەکا، ئەگەر هەوڵ نەدەین بۆ دەستەبەر بوونیو ئاگاداریمان بەسەریدا نەبێ دەکەوینە ئەوپەڕی ناخۆشیو چورتمو هیلاکەتو فەلاکەتەوە! کەوابوو مەسئەلەکە زۆر لەوە خەتەرترە کە ئێمە وابزانین مانای «نبوة» و «ریسالة» پەیوەندی بەئێمە نیەو گوێی پێ نەدەینو بەسەریدا رابورینو لای لێ نەکەینەوە.

بەڵێ، هەل لەدەستدانە، تەمەن بەفیڕۆ دانە: کە ئێمە پشت هەڵکەین لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی ئەو هەویەو کەسایەتیەی حەزرەتی موحەممەد خۆی پێ بەجیهان ناساندووە، لەجیاتی ئەوە خۆمان هەڵەوگیر بکەین بەشتی لاوەکی تری ئەو کەسایەتیە کە هیچ پەیوەندی

بە ئێمەوە نییە، لەهەمان کاتدا ئەو شتە لاوەکیانە هیچ پەیوەندییان بەو هەویەو کەسایەتیەوە نییە کە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێ بەجیهان ناساندووە.

بەڵێ، دەبێ چ هەل لەدەستدان و تەمەن بەفیڕۆ دانێك لەمە ئاشکراتر بێ، کە ئەم زاتە پیرۆزە «موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا» کەسایەتی خۆیمان بۆدەربخا، ئەمجار بەهەموو هەست و بڕوابوون و دڵسۆزییەکەوە بمان ترسێنێ و پێمان بفەرموێ: «والله لتموتن كما تنامون ولتُبْعَثُنَّ كَمَا تستيقظون و والله انها لجنة أبداً أو لنار أبداً» سوێندم بەخودا چۆن خەوتان لێ دەکەوێ ئاوا دەمرن، چۆن بەخەبەر دێن ئاوا زیندوو دەکرێنەوە، سوێند بەخوا لەو دونیا سەرەنجامتان یان بۆ بەهەشت و ژیانی جاویدانییە، یان بۆ دۆزەخ و سزای بە ئێشیەتی. کەچی وێرای ئەم پێڕاگەیاندنە بەهێزە، ئێمە هیچ شلوێ نەبین و سەرنج نەدەینە کەسایەتی و ئاخاوتنەکەی، تەنهاو تەنها سەرنج بدەینە لایەنی زمانڕەوانی و عەبقەرییەت و عەقڵ و حیکمەتی.

ئایا ئەم حاڵە لەوەناچێ تۆ لەسێ ڕێیان و چوار ڕێیانێك دا بێ و نەزانی کامیان بکەیە ڕێڕەوی خۆت... ئا لەوکاتەدا پیاوێك بەرەو روت بێ و ڕێگای ڕاست و مەبەستت نیشانبداو لە کەندو لەندی ڕێگا و دزو جەردەو روداوی نەخوازراو ئاگادارت بکاتەوە، کەچی تۆ هیچ گوێ بۆ ئامۆژگاری و ڕەهنومایيەکانی نەگری و سەرنج بدەیە دیمەنی و ڕەنگی پۆشاك و شێوەی قسەکردنی، ئەمجار بێنی ئەم شتە لاوەکیانە بکەیە بابەتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو تێیدا قوڵ ببیەوە!!؟.

بێگومان عەقڵ و مەنطیق ئەوەمان لێ دەخوازی و فەرمانمان پێ دەکا، کە لەهەموو رویەکەوە ژینامەو سیرەی حەزرەتی موحەممەد بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، پەروەردەو پێگەیشتنی، ڕەوشت و ئەخلاقی، ژیانی

کەسایەتی و ناو خێزانی، پشوو درێژی و کیفاح و هەوڵ و تێکۆشانی، شەڕو ئاشتی، مامەڵەکردنی لەگەڵ دۆست و دوژمنی، هەڵوێستی لەبەرامبەر جیهان و نازو نیعمەتی دا... دیراسەو لێکۆڵینەوەیەکی وەها کە مەبەستی دەرخستنی راستی و دروستی بێ، لەسەر بنەمای رێبازی زانستی و بە پەیڕەو کردنی یاسا و قەواعیدی ریوایەو ئیسنادو بەرچاوگرتنی مەرجی راستی و شیاو تێیان دا.

دەڵێم: بەڵێ عەقڵ و مەنطیق ئەوەمان لێ دەخوازێ کە ئێمە هەموو ئەو لایەنانەی سیرەو ژیانی پێغەمبەر دیراسە بکەین، وەلێ بەمەرجێ ئێمە لەم لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا پەیژەو پلیکانە هەڵبەستین تا کۆتایی باسەکە بۆ گەییشتن بە مەبەستێك کە دڵنیابوونە لە «نبوة»ی پێغەمبەر ﷺ سەلماندنی حەقیقەتی وەحیی لەژیانی پیرۆزیدا، بۆ ئەوەی کاتێك لە ئاکامی بەحث و لێکۆڵینەوەی مەوضوعی و دوور لەهەر مەبەستێکی ئارەزۆو هەواو دەمار گیریی، زانستانە راستی و دروستی حەقیقەتی «نبوة» و «وەحی»یمان بۆ رونبۆوەو دڵنیابوونمان بەدەست هێنا، ئەمجار ئەوە بزانین و دڵنیابین کە پێغەمبەر بەهیچ کلوجێ لەلایەن خۆیەوە شەریعەت و ئەحکامی دانەهێناوە، چی پێ راگەیاندوین و فەرمانی پێ کردوین لەخوداوەیەو ئەو زۆر بە ئەمانەتەوە ئەو پەیامە پیرۆزەی بە ئێمە گەیاندووە، شەریعەت و یاسای خوداوەندەو ئەو بە ئەمانەتەوە بە ئێمەی گەیاندەوە. ئیتر ئەوکاتە دەزانین و ئاگامان لەوە دەبێ کە ئەرکی سەرشانمان چەندە گەورەو گرانە بەرامبەر ئەو شەریعەت و ئەحکامە پیرۆزە ئاسمانییە، چ لەڕوی چاودێری کردنەوە چ لەڕوی جێبەجێ کردنەوە.

پاشان دەبێ ئەوە بزانین هەرکەسێك لەمیانەی دیراسەو توێژینەوەی سیرەی پێغەمبەردا گرنگی بدا بەلایەنی ئینسانییەکەی و بەس، هەر

لایەنــە ئادەمیزادییـــە روتەکـــەی بەرچـــاو بگـــرێ‌و لێکۆڵینـــەوەو توێژینـــەوەکانی لەســـەر بنـــەمای ئـــەو هەویـــەو کەســـایەتیە نـــەبێ کـــە حـــەزرەتی موحەممـــەد خـــۆی پـــێ بـــەجیهان ناســـاندووە، هـــەوڵ بـــدا توێژینەوەکەی لەو ئاراستەیە بەدوور بگرێ، ئیلا دەبێ خۆی قەتیس بکا لـــەناو کۆمـــەڵێك لـــوغزو مەتـــەڵ‌و گـــرێ کوێرکـــەی وەهـــا کـــە بـــەهیچ شیکردنەوەو توێژینەوەیەك ناتوانێ خۆی رزگار بکا.

دەبێ بەسەرسامییەوە بڕوانێتە مەتەڵ‌و لوغزی فتوحاتی ئیسلامی کە لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە هەڵگرانی شمشێرو رمبی کول‌و کۆن: کە لەوەپێش زوربەی کات لەناو خۆیاندا سەرگەرمی خۆ خۆری‌و یەکتر کوشتن بوون، قەڵاو دژەکانی حەضارەتی فارس‌و هێزو جەبەروتی رۆمان «کەدوو زلهێزی ئەو رۆژگارە بوون» تێك روخان‌و دەستیان بەسەردا گیراو کەوتنە ژێر دەستی ئەو شمشێرە کۆن‌و ژەنگاوییانەوە، ئەمە چ دەســەڵاتێکی سیحری بوو بەچ هاوکێشەیەکی سەربازی ئەمە شی دەکرێتەوە!

هەروا کابرا دەبێ بە ئەوپەڕی سەرسامی حیرەتەوە لەبەردەم لوغزو مەتەڵی ئەو قانوونەدا رابوەستێ کە لەنیوە دورگەی عەرەبیدا تەکامولی کردو جێگیر بوو، پێش ئەوەی چڵە نەمامێکی روشنبیری تێدا چەکەرە بکاو پێ بگا، پێش ئەوەی هیچ بوارێکی حەضارەت‌و شارەستانی بگاتێ‌و پێشکەوتن لەو بوارەدا بەخۆیەوە ببینێ. شەریعەت‌و قانونێك کامڵ‌و پڕ لە عەداڵەت: کە بووە تاج‌و سیمای نیوە دوورگەی عەرەبی، کەهێشتا ئەو دەڤەرە لە قۆناغی منداڵی بێشکە نشینیدا بوو لەڕوی هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی زانیاری‌و رۆشنبیری‌و ژیانی کۆمەڵایەتی پڕ لەگرێ کوێرکە. چۆن ئەمە دەگونجێنی لەگەڵ ئەو راستییەی کە لای زانایانی کۆمەڵناسی، بەدیهی‌و ئاشکرایە کە پەیدا بوون‌و پێگەییشتنی

قانونی کامڵ لەژیانی هەر گەل و نەتەوەیەکدا بەروبووم و سەرەنجامی پێگەیشتن و گەشەکردنی باری رۆشنبیری و حەضارەتە و ئاکامی پێکهاتە کۆمەڵایەتیە پێشکەوتووەکەیەتی، دەی دەبێ کابرا چۆن پاساوی ئەمە بداتەوە و چۆن ئەم مەتەڵە هەڵدێنێ؟!.

بەڵێ زۆر لوغزو مەتەڵ و گرێ کوێرکە دێنە پێش و ناگونجێ بۆ کەسێك «نبوة»ی پێغەمبەر ﷺ بەرچاو نەگرێ و حیسابی واقیع و راستی خۆی بۆنەکا «ناگونجێ هیچ حەل و پاساوێك لە چوارچێوەی ئەسباب و تەعلیلات و پاسا و هێنانەوەی مادە ئامێزو ئولفەت پێوە گیراو بدۆزیتەوە».

زۆرمان لێکۆڵەرەوە و نووسەر لەم جۆرە کەسانە دیون بیرو باوەڕی خۆیان دێنن و دەبەن بەڕاست و چەپدا دەیانهاوێن و حەلوەلای دەرویەکی رۆنن لە حیرەت و سەرسامی رزگاریان بکا، پاش ماندوبونێکی زۆر بەمایە پوچی دەگەڕێنەوە. لەکاتێکدا رێگای رزگاری لەم حیرەتە ئاشکراو نمایانە. رێگای رۆشن و گەێینەر بە قۆناغ ئەوەیە ئێمە مەنطیقیانە و مەوضوعیانە لێکۆڵینەوە لە سیرەی پێغەمبەردا بکەین، ئەو هەویە و کەسایەتیەی حەزرەتی موحەممەد خۆی پێ بەجیهان ناساند، بیکەینە جەمسەرو میحوەری دیراسەی سیرەو ژیانی پیرۆزی بەگشتی هەتا ئەو دیراسە و لێکۆڵینەوە دەمانگەیەنێتە یەقین: کە ئەو زاتە پێغەمبەری رەوانەکراوە لەلایەن خودای مەزنەوە. «نبوە» و پێغەمبەرایەتیەکەی بەدەوری خۆی دەمانگەیەنێ بە رێگای رزگاربون لەسەر سامی و حیرەت، ئاگادار دەبین بەسەر نهێنی ئەو لوغزو مەتەڵانەدا. بێگومان پێغەمبەری راستگۆ لە پێغەمبەرایەتیەکەیدا دەبێ پشتگیری بکرێ لەلایەن ئەو خودایەی رەوانەی کردووە، دەبێ قورئانیش کەلامی ئەو خودایە بێ و بەنیگا بۆی ناردبێ، کەوابوو

قانوونی کامڵو تۆکمە شەریعەتی خودایەو نازڵی کردووە بۆسەر دڵی پێغەمبەرو ئەویش بە ئەوپەڕی ئەمانەتەوە گەیاندویەتی بە مەردوم. ئەو قانوونە کامڵو تۆکمەیە، دانراوی گەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەواری وەکوو عەرەبی ئەوسای مەککەو مەدینە نیە تا ببێتە هۆی سەر سوڕمانو حیرەت.

ئەو خودایەی قورئانی نازڵ کردووە لە کتێبی پیرۆزی خۆیدا بە موسوڵمانان دەفەرموێ: {وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ - آل عمران/ ١٣٩}.

هەروەها دەفەرموێ: {وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ - القصص/٥}.

یان دەفەرموێ: {إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ - الأنفال/ ٩-١٠}.

بێگومان لەژێر ڕۆشنایی ئەم چمکانەدا نا مەعلوم ڕوون دەبێتەوە، حەلو پاساو بۆ ڕوداوەکان دەردەکەون، هەوری تەمو مژاوی دەڕەوێنەوە. کارەکە دەبێتە شتێکی طەبیعی، چونکە ئەوە خودای باڵا دەستو خاوەن دەسەڵاتە بەندە موسوڵمانەکانی خۆی سەردەخا کۆمەکییان پێ دەکا سەرکەوتنو باڵا دەستیان بۆ دێنێتە دی.

بەڵکوو حیرەتو سەرسامی ئەو کاتە دەبێ کە خودا وادەی سەرکەوتن بۆ پێغەمبەرەکەی ڕابگەیەنێو پشتگیری بەندە موسوڵمانەکانی بکا، بەڵام موعجیزە نەیەتە دیو سەرکەوتنو پشتگیری نەبیندرێ.

## تایبەتمەندییەکانی هەڵبژاردنی نیوە دوورگەی عەرەبی بە لانکەی سەرەتایی بۆ سەرهەڵدانی ئیسلام:

پێویستە پێش ئەوەی بچینە ناو باس و خواسی سیرەی پێغەمبەرەوە، هەروا باسی نیوەدورگەی عەرەبی کە بێشکەی یەکەمی پەیدابوونی ئایینی ئیسلامەو خودا ئەو دەڤەرەی هەڵبژاردووە بۆئەوەی ببێتە لانکەی سەرەتایی ئایین. پێویستە پێش ئەو جۆرە باسانە هەوڵ بدەین بزانین ئاخۆ حیکمەتی خودایی چییە لەوەدا کە ئەم دەڤەرەی هەڵبژاردووە بۆئەوەی ببێتە بێشکەی سەرەتایی بۆ پەیدابوونی ئیسلام و ئەم سەروەرییە بەشوێنی تری جیهان نەبرا؟ هۆی چی بوو سەرەتای بانگەوازی ئیسلام لەسەر دەستی نەتەوەی عەرەب بوو؟ دەسپێکی ئەم سەروەرییە بەوان برا؟

بۆ وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانەو رونکردنەوەی ئەو باسە پێویستە ئێمە سەرەتا تایبەتمەندی گەلی عەرەب و تەبیات و داب و نەریتیان پێش هاتنی ئیسلام بزانین. تەصەوری ئەو پارچە جوگرافییە بکەین کە ئەوکاتە عەرەبەکان تێیدا ژیاون و بیخەینە بەر هێزی خەیاڵ و بیهێنینە بەرچاومان، گرنگی مەوقیعی جەزیرە بە نیسبەت دەوروبەرییەوە بەرچاو بگرین، لەبەرامبەر ئەوەدا تەصەوری ئەو حاڵ و وەزع و بارودۆخە بکەین کە گەل و نەتەوەکانی تری وەکوو فارس و رۆم و یونان و هیندییەکان تێیدا دەژیان، بزانین داب و نەریت و سروشت و تەبیات و تایبەتمەندی حەضارییان چۆن بووەو لە چ ئاستێکدا بووە.

با سەرەتا دەست بکەین بە رانواندنێکی کورت دەربارەی ئەو بارودۆخەی گەل و نەتەوەکانی دەوروبەری نیوە دورگەی عەرەبی: کە پێش هاتنی ئیسلام تێیدا دەژیان.

بێگومان ئەو سەردەمە دوو دەوڵەتی گەورە، دوو زلهێز، دوو ئیمپراتۆریەتی دەسەڵات رەها جیهانی شارەستانیەتیان بەسەر خۆیان

دابەش کردبوو ئەو دوو دەوڵەتە زلهێزە ئیمپراتۆریەتی فارس و رۆم بوون، دوای ئەوان بە پلەی دووەم یونانیەکان و هیندییەکان دێن.

وڵاتی فارس کێڵگەی وەساویسی ئایینی و فەلسەفی جۆراو جۆری دژ بەیەك بوو. ئایینی زەردەشتی: کە ئایینی دەوڵەت و فەرمانڕەواکان بوو، کیسراکان و پیاوانی ئیمپراتۆرو دەربار هەڵگری ئەم ئایینە بوون و پەیڕەوییان دەکرد. لە فەلسەفەی ئەم ئایینەدا پیاو دەیتوانی دایکی خۆی کچی خۆی خوشکی خۆی بکاتە هاوسەری خۆی، بەڵکوو ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەی بە پەسەند دەزانی و بانگەشەی بۆ دەکرد. تەنانەت «یەزدو جوردی دووەم» کە لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی زایینی دا کیسرای فارس بوو، کچی خۆی مارە کرد. ئەمە وێڕای چەند دیاردەی ناشیرینی تری رەوشتی و کۆمەڵایەتی جۆراو جۆر کە وەکوو خمخۆر کە لەناو جەستەی ئەو ئیمپراتۆریەتە بڵاو بوبوەوە، ئاماژە بۆ کردنیان و رێز کردنیان لێرەدا جێگایان نابێتەوە.

یەکێکی تر لە ئایینەکانی ئەم ئیمپراتۆرییەتە، ئایینی مەزدەکی بوو ئەم ئایینە، بەگوێرەی قسەی ئیمامی شەهرستانی سیستەم و فەلسەفەیەکی تری لەخۆ گرتبوو، لەسەر بنەمای بەرەڵڵایی لە ئافرەت و ملك و ساماندا دروست بوو بوو، بە پێی ئەم ئایینە ئافرەت و ماڵ و سامان هاوبەشی بوو، وەکوو هاوبەشی بوونیان لە ئاوو ئاگرو لەوەڕدا، بێگومان بانگەوازی ئەم ئایینە لە ئیمپراتۆرییەتی فارسدا پێشوازییەکی بەرفراوانی لێکرا، بە تایبەتی لەلایەن سەر سەری و هەوەسبازو خوێڕی و هەتیومچەکانەوە، زۆر بەگەرمی باوەشیان پێدا کردو جەماوەرێکی زۆری لێ کۆبۆوە.

رۆمانەکانیش گیانێکی ئیستیعماری باڵی رەشی بەسەردا کێشابوون و کەوتبوونە ململانێی ئایینی لەگەڵ نەصرانییەکانی شام و

میـصر، وێـڕای هـەبوونی نـاکۆکی ئـایینی نێـو خۆیـان، کـە بوبـوە کێشەیەکی ڕەگـە داکـوتراوی شـیر پەنجـە ئاسـا بـەناو جەسـتەی وڵاتـدا تەشەنەی کردبوو، ئەم زلهێزو ئیمپڕاتۆرییەتە پشتی بەهێزی سەربازیو تەماعکارییـە ئیـستعمارییەکەی بەسـتبوو، بـۆ چـوونە نـاو گێـژاوو موغامـەراتی سـەیرو سـەمەرە. بـە مەبەسـتی گەشـەپێدانی ئـایینی مەسیحیو ئاڵو گۆڕ تێداکردنی بەگوێرەی بەرژەوەندی هەوەسبازانەو تەماعکارانەیان هێزی سەربازیی بەکار دەهێنا.

ئـەم ئیمپراتۆرییەتـە زلهێـزە لەوسـەردەمەدا بـارودۆخی فەسـادو گەندەڵی، دیاردەی ڕووخانی ئەخلاقو ڕەوشت تێیدا لەهی وڵاتی فارس باشتر نەبوو ئەگەر خراپتر نەبووبێ.

بێگومان ژیانی بەرەڵڵاییو بەد ڕەوشتی باڵی بەسەر دانیشتوانیدا کێشابوو، ستەمی ئابوری پشتی چینی فەلاو وەرزێری چەماندبوەوە، زیـادکردنی بـاجو گـومرگو زەریبـەو بـەرتیلو بـەرتیلکاری بڕسـتی لـە تێکڕای گەل بڕیبوو.

یۆنـانیش لـەلای خۆیـەوە تـا بینـەقاقای نـوقمی خـەڕافاتو چیرۆکە کۆنو پڕو پوچەکانیان بووبوون بەبێ ئـەوەی هـیچ بـەروبومو سـودێکیان لەو هەموو خەڕافاتو چیرۆکە ئەفسانەو خەڕافاتانە دەست بکەوێ.

وڵاتی هیندیش وەکوو مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوی دەفەرموێ: وەزعو حاڵیان لەوپەڕی داوەشانو گەندەڵی دابوو.

نەدەوی دەڵێ: مێژوو نووسان هاوڕاو یەك دەنگن لەوەدا: کە گەندەڵ تـرینو داوەشـاو تـرین ڕۆژگـار لـە مێـژووی هینـددا لـەڕووی ئـایینیو کۆمەڵایـەتیو ئەخلاقـەوە ئـەو سـەردەمو ڕۆژگارەیـە کـە بەسـەرەتای سـەدەی شەشـەمی زایینـی دەسـت پـێ دەکـا. بێگومـان لـەم سـەردەمەدا

هیند وەکوو هەموو وڵاتانی هاوسێ و هاوچەرخ بەشدارییەکی گەورەی هەبوو لە تێکڕوخانی ئەخلاق و پایەکانی کۆمەڵایەتیدا.«[١]»

ئێمە پێویستە ئەو ئەندازە هاوبەشە بزانین کە ئەو گەل و نەتەوانەی خستبووە ئەو مەرگەسات و داوەشاوییەوە، ئەو بەڵا و نەگبەتی و لێکترازانە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیانەی توش هێنابوون. بێگومان هۆکاری سەرەکی بۆ ئەو هەموو بەد بەختیانەیان حەضارەت و شارەستانییەك بوو کە لەسەر قییەمی مادی روت بنیات نرابوون، بەبێ ئەوەی دارای کەمێك لە موثولی بەرزو ئەخلاقی مرۆڤانە بن، کە بەهۆوی ئەو «مَثَل»ە بەرزانەو ئەخلاقی مرۆڤانەیان، بتوانن حەضارەت و شارستانیەتیەکەیان بە رێگای راستی سود بەخشدا ئاڕاستە بکەن. چونکە حەضارەت و پێشکەوتن بە بنەما و مەظاهیریەوە وەسیلە و هۆکارن، ئەگەر ئەو گەل و نەتەوەیەی خاوەنیەتی بیرو بۆچوونی راست و موثولی بەرزی نەبوو، حەضارەت و پێشکەوتنی لەدەستیاندایە دەبێتە هۆکاری بەقوڕا بردنیان و نزم کردنەوەیان بۆناو قوڵایی چاڵی نەگبەتی و چەواشەکاری. وەلێ ئەگەر گەلی خاوەن شارستانی، کەمێك عەقڵی رەشیدیان هەبێ «بە دەگمەنیش نەبێ ئەم جۆرە عەقڵە هەر لەڕێگای ئایین و وەحیی خودایی دەستەبەر دەبێ» ئەوە قییەمە حەضاری و شارەستانیەکەیان هەموو دەبنە هۆکاری جوان و ئاسان بۆ بەختەوەریی تەواویان، بەهەموو جۆرو دیاردەیەکەوە.

ئەمەی گوتراو بەکورتی ئاماژەی پێکرا، بارودۆخی وڵاتانی دەوروبەری جەزیرەی عەرەبی بوو. ناو جەزیرە تا ئەندازەیەك ئارام بوو، دوور بوو لەو حاڵ و وەزعەی وڵاتانی دەوروبەر تێی کەوتبوون، بەڵکوو بە تەواوی دابڕابوو لە دیاردەی ئەو چەواشە کارییەی یەخەی گەل و

---

١ - ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين. ص٢٨

نەتەوەکانی دەوروبەری گرتبوو. دانیشتوانی نیوە دورگەی عەرەبی وەکوو فارسەکان تەرەف و خۆش رابواردن و شارەستانییان نەبوو، تاوایان لێ بکا هۆکاری روخێنەری رەوشت و داوەشانی کۆمەڵایەتی جۆراو جۆر دابهێنن، فەلسەفەی دیاردەی بەرەڵلایی و داڕوخانی رەوشتی بخەنە ناو قاڵبی ئایینەوەو بانگەشەی بۆ بکەن. هەروا وەکوو رۆمانەکان دارای هێزی سەربازیی نەبوون کە بەهۆیەوە پەلاماری هیچ وڵات و دەڤەرێك بدەن لە دەوروبەری خۆیان داگیری بکەن. وەکوو یۆنانەکانیش لە فەلسەفەو جەدەلدا رۆنەچوو بوون تا ببنە نێچیری خەرافات و چیرۆکە کۆنی ئەفسوناوی.

ئەوان لەنیوە دورگەی خۆیاندا خەریکی بەخێوکردنی ئاژەڵ بوون و بەدوا ئاوو لەوەڕدا دەگەڕان، بۆ پێداویستی کالاو شتومەك کاروانی شام و یەمەنیان دەکرد. تەبیات و سروشتیان وەکوو مادەیەکی خام وابوو هێشتا نەتوێندرابووەوەو لە بۆتە نەدرابوو. دیاردەی فیترەتی ساخلەمی مرۆڤایەتییان پێوە دەبیندرا، حەزو نەزعەی بەهێزیان هەبوو بۆ لایەنەکانی مرۆڤایەتی پەسەند. دارای رەوشتی بەرزی وەکوو وەفاو ئەمەك و بەهاناوە چوون و فریا کەوتنی لێقەوماوو سەخاوەت و داکۆکی لەبەها پیرۆزەکان و دەست پاکی و داوێنپاکی بوون. وەلێ ئەوان پێویستیان بە مەعریفەو زانستێك هەبوو شارەزاییان بکا بۆ هەموو ئەو بەها پیرۆزانەو رۆشناییان بداتێ و بەرەو بەختەوەری ئاراستەیان بکا. چونکە عەرەبەکان لەو رۆژگارەدا لە تاریکی نەزانی بەسیت و حاڵەتی فیتری سەرەتاییدا دەژیان. بەو هۆیەوە گومرایی و نەشارەزایی لە دۆزینەوەی رێگای راست بۆ بەدەست هێنانی ئەو بەها پیرۆزانە بالا دەست بوو بەسەریاندا. ئەوەبوو باوك منداڵ و جگەر گۆشەی خۆی دەکوشت، بە بیانوی شەرەف و عیفەت. ماڵ و سامانی پێویستی خۆی بەفیرۆ دەدا بەناوی کەرەم و سەخاوەتەوە. شەڕو ئاژاوەیان

هەڵدەگیرساند، بە بیانوی داکۆکی و فریاکەوتنی لێقەوماوو داڵدەدانی راوەدونراو. ئا ئەم دیاردەو حاڵەتە بوو: کە پەروەردگار بە گومڕاو سەر لێ شێواو تەعبیری لێ داوەتەوەو وەصفی ئەوانی پێ کردووە کە دەفەرموێ: {وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّآلِّينَ – البقرة/١٩٨}.

ئێوە ئەی نەتەوەی عەرەب پێش هاتنی پێغەمبەرو ئایینی ئیسلام لە گومڕایی دابوون. بێگومان ئەم صیفەتی «ضلال»ە ئەگەر نیسبەت بدرێ بۆ حاڵ و وەزعی گەل و نەتەوەی تری ئەو رۆژگارە زیاتر دەلالەت دەکا لەسەر پاساو بۆ هێنانەوە تا لەکەدار کردن و بە کاڵفام کردنیان. چونکە گەل و نەتەوەکانی تر ئەو لادان و بەقوڕا چوونەی تووشی هاتبوون بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەخەیاڵی خۆیان شوێن رۆشنایی حەضارەت و شارەستانیەت کەوتبوون لێیان هەڵەو گێڕبوو بوو کەوتبوونە ئەو قوڕە رەشەی فەسادو گەندەڵی و بەرەڵڵاییەوە. بەدەستی خۆیان لە ئاکامی پلان و بیرکردنەوە، خۆیان خستبووە ئەو بارودۆخە نالەبارەی کە جێگای بەزەیی بوون.

ئەمجار نیوە دوورگەی عەرەبی بەپێی باری جوگرافی کەوتبووە خاڵی ناوەڕاستی نێوان ئەو گەل و نەتەوە جۆراو جۆرانەی دەوروبەریان. کەسێك ئەمڕۆ بڕوانێتە مەوقیعی جوغرافی ئەو دەڤەرە «وەکوو مامۆستا محمد المبارك» دەڵێ: دەبینێ رێك کەوتۆتە نێوان دوو حەضارەتی دژ بەیەك. یەکێکیان حەضارەتی خۆرئاوای مادە پەرست: کە وێنەیەکی شێواوی ناڕاستی دەربارەی ئادەمیزاد پێشکەش کرد، بە هیچ کلوجێك حەقیقەتی نەپێکاوەو لایەنێکی کەمیشی ناگرێتەوە. ئەویتریان حەضارەتی گیانی خەیاڵاوی چەواشە بووی ئەوپەڕی خۆرهەڵاتە کە لەوڵاتی هیندو چیندا گەشەی کردبوو.

جا ئەگەر تەصەوری بارودۆخی عەرەب بکەین لەسەردەمی پێش ئیسلامداو حاڵ و وەزعی گەل و نەتەوەکانی دەوروبەری جەزیرە بێنینە

پـێش چـاوی خۆمـان، بەئاسـانی ئـەو حیکمەتـە خوداییـەمان بـۆ روون دەبێتـەوە: کـە داخـوازی ئـەوە بـووە، ئـەو دەڤـەرە شـەرەفیاب بکـا بـە لـەدایکبوونی حـەزرەتی موحەممـەد تێیـداو پاشـان نـازڵکردنی نیگـا و بەخشینی پلەو مەقامی پێغەمبەریی بە ئەو زاتەو رەوانەکردنی بۆسەر هەموو مرۆڤ بەگشتی و هەڵبژاردنی گەلی عەرەب! کە ببنە هەڵگری ئەو پەیامەو یەکەمجار لەناو ئەواندا سەرهەڵداو بڵاوبێتەوەو هەرئەوانیش بەجیهانی رابگەیەنن و بانگەوازی گەلانی جیهان بکەن بۆ ئیمان هێنان بەو پەیامە لەم سەری دونیاوە بۆ ئەوسەری دونیا بەهەموو گەل و نەتەوە جیاجیاکانەوە.

ئـەوەش وانیـە «وەکـوو هەنـدێ وا گومـان دەبـەن» گوایـە ئەوانـەی هـەڵگری ئـایینی بـەتاڵ و خـاوەنی حـەضـارەتـی گەنـدەڵ و پوچـن زۆر زەحمەتـە بتوانـدرێ چارەسـەری نەخۆشـییان بکـرێ و بـەرەو ئـایینی راسـت و حـەق ئاراسـتە بکـرێن، چـونکە شـانازی دەکـەن بـەو فەسـادو گەندەڵییەی خۆیان لەسەر مەلاس داوەو پێیان وایە ئەوەی لەسەرنی لە بیروبـاوەڕی پـوچ، شـتێکی راسـت و دروسـتە. ئەوانـەیش کـە هێـشتا لەسـەردەم و قۆنـاغی لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەدا دەژیـن ئینکـاری نـەزانی خۆیـان ناکـەن و لافـی شـتێك لێ نـادەن کـە نیانـە لـە حـەضـارەت و شارەستانی و زانست، ئـەوە ئەوانە سـەر نـەرم تـرن بـۆ چارەسـەرکردن و ئاراستە کردن. دەڵێین نەخێر ئەوە حیکمەتی هەڵبژاردنی نیوە دورگـەی عـەرەبی نییـە بـۆ سـەرهەڵدانی ئـایینی ئیـسلام لـەو دەڤـەرەدا، چـونکە نموونـەو وێنـە شـیکردنەوەی لـەم جـۆرە بەرامبـەر بەکەسـێك راسـت دەردەچێ کە دەسەڵاتی سنوردار بێ و هێزو توانای مەخلووق بێ، بێنـی جوداوازیی بکـا لـەنێوان شـتێك ئاسـان بـێ و شـتێك قـورس بـێ، یەکـەم هەڵبـژێرێ و دووەم وازلێبێنـێ، بەتـەمای دەسـتەبەربوونی راحـەت و دوورکەوتنەوەی لە ماندوویەتی!!.

چونکە ئەگەر ویستو ئیرادەی پەروەردگار وای بڕیار بدایە کە وڵاتی فارس یان ڕۆم یان هیند بکاتە بێشکەی یەکەمی بانگەوازی ئیسلامی ئەوە بێگومان هۆکاری سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر دەکرد، وەکوو چۆن لەنیوە دوورگەی عەرەبیدا هۆکاری سەرکەوتنی بۆ مەیسەر کرد. چۆن ئەوە لەخودا عاسی دەبێ لەکاتێك خۆی بەدیهێنەرو دروستکەری هەموو هۆکارو وەسیلەو ئەسبابێکە؟؟!.

بەڵام حیکمەت لەم هەڵبژاردنە لەجۆری ئەو حیکمەتە یە: کە داخوازی ئەوە بووە پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بێ نە بخوێنێتەوە نە بنووسێ. بۆئەوەی خەڵکی گومان نەخەنە سەر پێغەمبەرایەتییەکەی، هەروا بۆئەوەی هۆکاری شكو گومان لایان پەزمەندە نەبن بۆ ڕەتدانەوەی بانگەوازییەکەی.

بێگومان لە تەواوکاری ئەم حیکمەتە خودایییەیە: کە ئەو بیئەو دەڤەرو وڵاتەی پێغەمبەری تێدا ڕەوانە دەکرێ بیئەیەك بووە نەخوێندەواریی تێیدا باڵا دەست بووە، بەگوێرەی وڵاتانی دەوروبەری بە وڵاتێکی نەخوێندەوارو دواکەوتوو بژمێردرێ، هیچ حەضارەتو شارەستانیەتی وڵاتانی دەوروبەر بۆی نەکشابێ و ڕەنگدانەوەی ئەو حەضارەتانەی تێدا بەدی نەکرێ. هزرو فکرو بۆچوونو بیرو باوەڕیان لەسەر بنەمای ئەو فەلسەفە چەوتو عەمبارەپۆو سەرلێ شێواوییە دانەمەزرابوو. چونکە وەکوو چۆن ترسی ئەوە هەیە شكو گومان بچێتە ناو دڵو دەروونی خەڵکییەوە، کاتێك ببینن پێغەمبەر لای یەکێك دەخوێنێ و ئاگادار دەکرێ بەسەر نووسراوی کۆنو مێژووی نەتەوە پێشینو لەناوچووەکانو بەدەرس باسی حەضارەتی دەوڵەتو گەلانی دەوروبەر دەخوێنێ و فێر دەکرێ، هەمان ترسو بیم هەیە لەوەی کە شكو گومان بچێتە دڵی خەڵکەوە، ئەگەر بانگەوازی ئیسلامی لەناو گەلو نەتەوەیەکدا سەری هەڵبدایە کە دارای جۆرە حەضارەتو

شارەستانیو فەلسەفەو مێژوو بونایە. بۆ نموونە ئەگەر دەعوەی ئیسلامی لەناو نەتەوەیەکی خاوەن ژیاری وەکوو دەوڵەتی فارس یان یۆنان یان رۆمان پەیدا بوبایە، وێدەچوو زۆر لەوانەی بەتاڵ خوازو گومان پەیداکەرن وا گومان بەرن ئەم بانگەوازییە بۆ ئیسلام زنجیرەیەك تەجرەبەو ئەفکاری فەلسەفی، پاش تاوو توێکردنو گۆڕانکاری، ئەم حەضارەتە پێشکەوتووەو شەریعەتە کامڵەی داهێنابێ.

بێگومان قورئانی پیرۆز بەدەقێکی روونو ئاشکرا بێ پێچو پەنا ئەو حیکمەتەی روون کردۆتەوەو دەفەرموێ: {هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ – الجمعة/٢}.

بەڵێ حیکمەتی خودا وا داخواز بوو کە پێغەمبەرەکەی نەخوێندەوار بێ، ئەو گەلو نەتەوەیەش کە یەکەمجار ئەو پەیامەیان ئاراستە دەکرێ زۆربەی هەرە زۆریان نەخوێندەوار بن، بۆئەوەی موعجیزەی «نبوە»و شەریعەتی ئیسلام لە زەینیاندا ئاشکراو نمایان بێ، هیچ چەواشەکاریو تێکەڵ بوونێکی لەگەڵ ئایینی تری دەستکردو جیا جیا لێ روونەدا.

ئەمەش رەحمەتێکی گەورەی خوداییە بۆ بەندەکانی. چەند حیکمەتێکی تر هەن لێکۆڵەرەوەو توێژەر دەتوانێ هەستیان پێ بکاو ئێمە دەتوانین لەچەند خاڵێکدا ئاماژەیان پێ بکەین.

١. ئاشکرایە پەروەردگار بەیتولحەرامی کردووە بەشوێنی ئارامیو دڵنیایی بۆ ئادەمیزادو گێڕاویەتی بەیەکەم خانوێك کە دانراوە بۆ خودا پەرستی تێیداو ئەنجامدانی شەعائیری ئایینی. لەو دۆڵەدا دووعای حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل هاتەدیو دڵی مرۆڤی پێوە نووسا، لە لەوازیمو تەواوکەری ئەم رێز لێنانو ئارامی تێدا دەستکەوتنەیە، کە ئەو

دەڤەرە پیرۆزە خودی خۆی ببێتە بێشکەی بانگەوازی ئیسلامی کە لەبنەڕەتدا ئایینی بابە گەورەمان حەزرەتی ئیبراهیمە، هەروا لەدایکبوونی دوا پێغەمبەرو رەوانەکردنی بۆسەر ئادەمیزاد لەهەمان خاكو وڵات بێ. بەتایبەتی کە ئەم پێغەمبەرە خاتەمە لە وەچەی حەزرەتی ئیبراهیمە.

٢. ئەو پارچە جوگرافییەی نیوە دوورگەی عەرەبی خۆی خۆی کاندید دەکا بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەرکە قورس و پیرۆزە، بەهۆی ئەوە کە ئەو دەڤەرو وڵاتە «وەکوو وتمان» دەکەوێتە خاڵی ناوەڕاستو ناوەندی هەموو دەوڵەتو گەلو نەتەوەکانی دەوروبەری جەزیرە. ئەمەش وادەکا بەئاسانی تیشکی بانگەوازی ئیسلامی بەناو گەلو نەتەوەکانی دەوروبەردا بڵاوبێتەوەو بەهەر چوار لادا پەل بهاوێ، ئەگەر تۆ بگەڕێیتەوە بۆ رۆژگاری سەردەمی پێغەمبەرو سەردەمی جێ نشینەکانیو چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، بەئاشکرا راستی ئەوەت بۆ روون دەبێتەوە.

٣. حیکمەتی خودا وا داخواز بوو کە زوبانی عەرەبی زوبانی بانگەوازی ئیسلامی بێ، هەر ئەو زوبانەش ببێتە ئامێری راستەوخۆو یەکەم زوبان بۆ شیکردنەوەی کەلامی خوداوەندو گەییشتنی بەئێمە لەقاوغی ئەو زوبانەدا.

ئەگەر ئێمە سەرنج بدەینە تایبەتمەندیی زوبانەکانو موقارەنەیەك لەناویان دا بکەین، بۆمان دەردەکەوێ: کە زوبانی عەرەبی زۆر تایبەتمەندیی تێدا هەن: کە لەزوبانەکانی تردا نین، کەوابوو زوبانی عەرەبێ زۆر شیاو بوو کە ببێتە زوبانی یەکەمی موسوڵمانان لەهەموو ناوچەو دەڤەرو وڵاتێکیاندا.

# حەزرەتی موحەممەد (درووودی خوای لەسەربێ) سەرخەتمی پێغەمبەرانە

## پەیوەندی بانگەوازی ئەو زاتە بە بانگەوازییە ئاسمانییەکانی پێشوو:

حەزرەتی موحەممەد ﷺ سەرخەتمی پێغەمبەرانە، هیچ پێغەمبەر نابن لەدوا ئەو، ئەمە کۆڕای موسولمانانی لەسەرەو زاندراوێکی ئایینیەو چەسپاوەو سەلمێندراوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مثلي ومثل الأنبياء من قبلي كمثل رجل بنى بنياناً فأحسنه وأجمله الاموضع لبنة من زاوية من زواياه، فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له ويقولون هلاّ وضعت هذه اللبنة؟ فأنا اللبنة وأنا خاتم النبيين}.«١»

نموونەی منو پێغەمبەرانی پێشوو وەکوو ئەوە وایە پیاوێك باڵەخانەیەك دروست بکاو دیکۆرو نەقشی جوانی تێدا بڕازێنێتەوە، بەڵام جێگای خشتەیەکی لە سوچێکیدا بە بۆشی مابێتەوە، خەڵکی بەدەوریدا بێنو بچنو تەماشای بکەنو زۆریان بەلاوە جوان بێو لەبەر خۆیانەوە بڵێن: ئەوە بۆچی ئەو شوێنە بە بۆشی ماوەتەوە بۆچی ئەو خشتەیە دانەنراوە؟ من ئەو خشتەیەمو بینای پێغەمبەرایەتی بەمن تەواو بووەو من خاتەمو دواکەسم لە زنجیرەی پێغەمبەراندا.

بانگەوازی کردنی پێغەمبەرو پەیوەندی بانگەوازییەکەی بە بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشوو پەیوەندی جەخت کردنەوەو تەواوکردنو پڕکردنەوەی بۆشاییو راستکردنەوەیە. حەدیثەکەی باسمان کرد بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ. چونکە بانگەوازی هەموو

---

١ - حديث متفق عليه ولفظ لسلم.

پێغەمبەرێك لەسەر دوو بنەما دامەزراوە، بنەمای یەکەم عەقیدەیە بنەمای دووەم تەشریعو ئەخلاقە.

لەڕووی بنەمای یەکەم کە عەقیدەیە ئەوە ناوەڕۆکی هەموو ئایینەکان یەکێکەو هیچ جوداوازیو گۆڕانکاری تێ نەکەوتووە، هەر لە پێغەمبەرایەتی ئادەمەوە تا پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ هەموویان بۆ یەك واتاو مانا بانگەوازییان کردووەو یەك چەمكو حەقیقەتیان دوبارەکردۆتەوە ئەویش: بڕوابوونە بە تاكو تەنهایی خوداو بەدوور گرتنی لەهەموو شتێك کە شیاوی زاتی پاکی نەبێ لەڕووی صیفاتەوە. هەروا ئیمان بەڕۆژی قیامەتو حیسابو لێکۆڵینەوەو بەهەشتو دۆزەخ، هەموو پێغەمبەرو فرستادەیەك گەلو نەتەوەی خۆی بانگ کردووە بۆ بڕوابوون بەم چەمکانە لەناخی دەروونداو ئیقرار پێکردنیان بەزوبان. هەموویان بە زنجیرە یەك لەدوا یەك بانگەوازی پێغەمبەری پێش خۆی بەڕاست زانیوەو تەصدیقی کردووەو موژدەی بەهاتنی پێغەمبەری دوای خۆی داوەوئاوا بەو جۆرە زنجیرەو کاروانی پیرۆزیان درێژەی کێشاو یەك لەدوایەك رەوانەکران بۆسەر گەلو نەتەوەی جیا جیا بۆئەوەی هەموویان یەك حەقیقەتو راستی دووپات بکەنەوە، کە فەرمانیان پێکرابوو بە راگەیاندنیو هەڵنانی هەموو ئادەمیزاد بۆ ملکەچ بوونو بڕوا بوونیان پێی، ئەویش بڕوابوونو داننانە بە تاكو تەنهایی خودا لەزاتو لە صیفاتیدا. وەکوو خودا بۆخۆی لە قورئانی پیرۆزدا ئەم حەقیقەتە دەدرکێنێو دەفەرموێ: {شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ - الشورآ/١٢}.

بەڵکوو تەصەور ناکرێت: کە دەربارەی عەقیدە لە بانگەوازیی پێغەمبەران دا، هیچ ئیختیلافو جوداوازیەك سەرهەڵبداو بیرو باوەڕی

پێغەمبەرێك لەو بوارەدا لەگەڵ هی پێغەمبەرێکی تر جیاوازی تێدا پەیدا ببێ، چونکە چمکەکانی عەقیدە لەجۆری هەواڵن، هەواڵدانیش لەشتێك نابێ جوداوازی تێدابێ لەنێوان ئەم هەواڵدەر تا ئەو هەواڵدەر. چونکە ئەگەر لە فەرضی مەحاڵدا ئێمە هەواڵی هەردوولا بەڕاست بزانین، ئەوکاتە عەقڵ ڕێگە نادا پێغەمبەرێك ڕەوانە بکرێ بانگەشەی سێ خودایی بکا «اسْتغفرالله..؟» پاشان پێغەمبەرێکی تر ڕەوانە بکرێ داوا لەخەڵك بکا کە خودا تاكو تەنهایە لە زاتو لە صیفاتداو هیچ شەریكو هاوبەشی نین. هەردوکیشیان ڕاستگۆبن لە تەبلیغەکەدا ئەمە ناگونجێ و مەعقول نییە.

ئەمەی گوترا دەربارەی بواری عەقیدە بوو. وەلێ لەبواری تەشریعدا کە مەبەست لێی تەنظیمو ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگەو خێزانو تاکە. ئەوە بێگومان جوداوازی ڕوودەدا، لە چەندییەتو چۆنیەتدا، لەنێوان پەیامی ئەم پێغەمبەرە تا ئەو پێغەمبەر «صەلاتو سەلامی خودا لەسەر هەموانیان بێ».

هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حەقیقەتە: کە بواری تەشریع لەجۆری «الإنشاء»ە نەك هەواڵ، ئەوەی لەبواری عەقیدەدا تەصەور دەکرێ لێرەدا وارید نییە. زیاد لەوە وا چاوەڕوان دەکرێ کە تەطەوری ڕۆژگارو گەشەکردنی بواری ژیانو جوداوازی گەلو نەتەوەکان کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبێ لە تەطەورکردنی تەشریعو جوداوازی حوکمو یاساکان بەپێی بارودۆخو ڕۆژگارو ڕوداوەکانو کاتو شوێنیان. لەم ڕووەوە کە فیکرەی تەشریع لەسەر بنەمای داخوازییەکانی بەرژەوەندی ئادەمیزادە لە دونیاو قیامەتیاندا. وێڕای ئەوەش ڕەوانەکردنی هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی پێشوو تایبەت بووە بە نەتەوەیەكو پێغەمبەرایەتیەکەی گشتی نەبووە بۆ سەرجەم گەلو

نەتــەوەکان. کــەوابوو ئەحکامــە تەشــریعیەکان لــە چوارچــێوەیەکی بەرتەسکدا بووەو بەگوێرەی تایبەتمەندیو داخوازی حاڵو وەزعی ئەو نەتەوەیە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

بـۆ نموونـە حـەزرەتی مووسـا کـراوە بـە پێغەمبـەرو رەوانـە کـراوە بۆسەر نەتەوەی جولەکە، حاڵو وەزعی ئەوانیش ئەوکاتە داخوازی ئەوە بووە شەریعەتەکەیان تا ئەندازەیەکی زۆر توندو تیژی تێدا بێو لەسەر بنەمای عەزیمەتو چالاکوانی دابمەزرێو ئاسانکاری تێدا نەبێ.

بە تێپەڕبوونی رۆژگاری دوورو درێـژ دوای رەوانـەکردنی حـەزرەتی مووسا. پەروەردگار حەزرەتی عیسای کردە پێغەمبەریانو شەریعەتێکی تازەی بۆناردن: کە زۆر لە شەریعەتی حەزرەتی مووسا ئاسانتر بوو.

بڕوانە پەروەردگار لەسەر زوبانی عیسا کە پەیامی خۆی ئاڕاستەی نەتەوەی جوولەکە دەکاو دەفەرموێ: {....وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّـوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ - آل عمران/ ٥٠}.

ئەوەتا حەزرەتی عیسا لەبواری عەقیدەدا تەصدیقی ئەو چمکە دەکا کـە لـەوەپێش لـە تەوراتـدا چەسـپاوە، جـەخت لەسـەر ئـەو پەیامـە دەکاتـەوەو بانگـەوازی بـۆ ئەوە تـازە دەکاتـەوە. بـەڵام بەنیسبەت بـواری تەشـریعو ئـەحکامی حـەڵاڵو حـەرام، ئـەوە رادەگەیـەنێ کـە هەنـدێ گۆڕانکـاریو بـڕێ ئاسـانکاری ئـەنجام دەدا، تەنانـەت هەنـدێ حـوکم دەسڕێتەوەو باری سەرشـانی ئەو گەلـە کـەمێك سـووك دەکـا. کـەوابوو لـەناردنی هـەر پێغەمبەرێکـدا دوو چـمكو دوو بـوار خۆیـان دەنـوێنن، بواری عەقیدەو بواری تەشریع.

هـەموو پێغەمبـەرەکان «صـەلاتو سـەلامی خودایـان لێ بـێ» لـەبواری عەقیـدەدا جـەخت کردنـەوەو دووبـارە کردنـەوەی پـەیامی پـێش خۆیـان راگەیاندووەو هیچ گۆڕانکاریو جوداوازییان تێدا نەکردووە.

وەڵێ لەبارەی تەشریعەوە، ئەوە دەبینین شەریعەتی هەموو پێغەمبەرێك سڕینەوەی شەریعەتی پێشوو بووە مەگەر شەریعەتە تازەکە پشتگیری هەندێ لە شەریعەتە کۆنەکەی کردبێ یان لێی بێ دەنگ بووبێ، ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو قاعیدە ئوصولییەی کە دەڵێ: «شریعة من قبلنا شريعة لنا اذا لم يرد ما يخالفها» شەرعو یاسای پێغەمبەرانی پێش ئێمە دەبێتە شەریعەت بۆ ئێمە بەمەرجێ لە شەریعەتی ئێمەدا دەقێك نەهاتبێ دژی ئەو شەریعەتە بێ.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە ئایینی ئاسمانی جۆراو جۆر نین، بنەمای هەموو ئایینەکان یەکێکەو یەك پەیامە، وەڵێ شەریعەتی ئاسمانی جیا جیا هەن، بەگوێرەی رۆژگار شەریعەتەکان گۆڕاون، شەریعەتی تازە شەریعەتی کۆنی سڕیوەتەوە، تا سەرەنجام لەسەر دەستی حەزرەتی موحەممەد: کە خاتەمی پێغەمبەرانە پەروەردگار شەریعەتی خۆی بۆ هەتا هەتایە چەسپاندو رەزامەندی خۆی راگەیاند، کە رازییە شەریعەتی ئیسلام شەریعەتی هەموو گەلو نەتەوەکان بێو هەموویان پێیەوە پابەند بن.

بەڵام ئایینی حەقو پەسەند لای خودا یەك ئایینەو نابێ بەدوو هەموو پێغەمبەرانی رەوانە کردوون بۆ بانگەوازی کردن بۆیو فەرمانی پێکردوون خۆیانو گەلەکانیان «هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە تا حەزرەتی موحەممەد» ملکەچی ئەو ئایینە بنو پەیڕەوی بکەن ئەویش ئایینی ئیسلامە. حەزرەتی ئیبراهیم «یعقوب» ئیسماعیل «صەلاتو سەلامی خودایان لەسەر بێ» بەو پەیامە پیرۆزە رەوانە کراونو بانگەوازییان بۆ ئەو عەقیدەو بیرو باوەڕە کردووە. بڕوانە چۆن پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم راستییە دەچەسپێنێو بە گوێچکەی گەردوونی دا دەداو دەفەرموێ: {وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي

الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ – البقرة/ ١٣٠ – ١٣٢}.

حەزرەتی موساش بەهەمان پەیامو دەستوور رەوانەکرا بۆسەر بەنی ئیسرائیلو هەمان دەستەواژەی دووپات کردەوە، ئەوەتا پەروەردگار لەبارەی ساحیرەکانی فیرعەونەوە دەفەرموێ: {قَالُواْ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلاَّ أَنْ آمَنَّا بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءتْنَا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ – الأعراف/ ١٢٥ – ١٢٦}.

حەزرەتی عیساش بەهەمان پەیامو بۆ تازەکردنەوەی هەمان دەستەواژەی پێغەمبەری پێش خۆی رەوانەکرا، ئەویش پابەندبوونی خۆی بە ئاینی ئیسلامەوە راگەیاندو ملکەچی خۆی بۆ ئەو ئایینە دوپات کردەوە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەم حەقیقەتەی چەسپاندوەو دەفەرموێ: {فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ – آل عمران/٥٢}.

وێدەچێ بگوترێ: دەی کەوایە بۆچی ئەوانەی شوێنکەوتووی حەزرەتی مووسانو لافی ئەوە لێ دەدەن کە پەیڕەوی پەیامی ئەو دەکەن، عەقیدەیەکی تایبەتییان هەیەو جوداوازە لە عەقیدەی یەکتا پەرستی پێغەمبەرانی تر، یان بۆچی ئەوانەی ئیدیعای ئەوە دەکەن کە لەسەر ئایینی حەزرەتی عیسان عەقیدەیەکی تایبەتی تریان هەیە لەهەموو عەقیدەو بیروباوەڕی پێغەمبەرانی تر جوداوازە، لە وەڵامدا دەڵێین: پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارە دەداتەوەو دەفەرموێ: { إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ، وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ ، وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ – الشورى/١٤}.

پێغەمبەران هەموویان رەوانەکراون بە پەیامێك کە ئیسلامەو هەر ئەو ئایینی پەسەندی خودایە، ئەهلی کیتاب «جولەکەو مەسیحی» ئەو راستییە دەزانن، دڵنیان لەوەی ئایینی خودا یەك ئایینە، دەزانن کە پێغەمبەران هەموویان رەوانەکراون بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەو حەقیقەتەو پشتگیری کردنی هەر یەکێکیان بۆ ئەوی تریان لە پەیامەکەیدا. نەدەبوو ئەهلی کیتاب ئاوایان بەسەربێ و ئاوا دابەش بن بۆ عەقیدەی جیا جیاو تەفرەقەیان لە ئەصڵی ئاییندا تێ بکەوێ، بەڵام ئەوەتا بەهۆی یاخی بوون و سەرکەشییان لەناو خۆیاندا کێشەیان تێکەوت و لەبنەمای عەقیدەدا لێك ترازان و درۆو بوختانیان بەدەم پێغەمبەرەکانیانەوە هەڵبەست، هەرچەندە لەو بارەوە ئەوان زانیارییان بۆ هات و داوایان لێکرا کە ئەو رێبازە چەوتە نەگرنە بەر، بەڵام یاخی بون و سواری گای هار بوون، خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بون و کەوتنە بەر نەفرینی خوداو پێغەمبەر.

## سەردەمی پێش ئیسلام و مانەوەی دیاردەی ئایینی (اَلْحَنَفِیَّةَ)

ئەم لایەنەش پێشەکیەکی گرنگەو پێویستە توێژینەوەی تێدا بکەین پێش ئەوەی بچینە ناو باسی سەرەکی سیرەو لێ تێگەیشتن و فیقهو ئامۆژگارییەکانی، چونکە ئەم سەردەمە واتە سەردەمی پێش ئیسلام حەقیقەتێکی گرنگی لەئامێز گرتووە، تا ئێستا دوژمنانی ئەم ئایینە ژێر لێوی دەخەن و دەیشارنەوە، بەچەند جۆر وەهم و شتی پڕو پوچ دەیشێوێنن.

پوختەی ئەو حەقیقەتەش ئەوەیە: کە ئیسلام جگە لە درێژە پێدان و ئیمتیدادی ئایینی «الحنفیة السمحة» کە ئایینی بابە گەورەی پێغەمبەرانە هیچی تر نییە، هەمان پەیام و حەقیقەت دووپات دەکاتەوە.

پەروەردگار لەزۆر ئایەتی قورئان دا ئەوەی راگەیاندووەو تەصریحی پێ کردووە. یەکێ لەو ئایەتانە ئەمەیە: کە دەفەرموێ:

{وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ – الحج/٧٨}.

یان ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {قُلْ صَدَقَ اللّهُ فَاتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – آل عمران/٩٥}.

تۆ دەزانی عەرەبەکان وەچەو نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلن، چین لەدوای چین ئایینی یەکتا پەرستی باوە گەورەی پێغەمبەرانیان وەرگرتووەو پەیڕەویان کردووە، ئەو پەیامو پەیڕەوو پرۆگرامو ئایینەی ئەوی پێ رەوانە کراوە لە یەکتا پەرستیو عیبادەتی خوداو پابەندبوون بە ناوەڕۆکی ئەو ئایینەو لانەدان لێیو بە پیرۆز راگرتنی، ئەمان بە میراتی بۆیان مابوەوەو پەیڕەوییان کردووە. بەتایبەتی بەگەورە زانینو رێزدانان بۆ کەعبەو تەقدیس کردنیو ئیحترام گرتنی شەعائیری حەجو پارێزگاریکردنی ماڵی خوداو خزمەتکردنی لەڕیزی پێشەوەی پەیڕەویکردنەکەیانو پابەند بوونیان بەو ئایینە دەژمێردرا.

جا کە رۆژگار درێژەی کێشاو ماوەی زۆر بەسەر ئەو ئایینەدا تێپەڕی. وردە وردە دەستیان کرد بە تێکەڵکردنی ئەو ئایینە حەقەی لە حەزرەتی ئیبراهیمەوە بۆیان مابۆوە بەشتی بەتاڵو پووچ کە خزابووە ناو رێوڕەسمی ئایینەکەیانەوە. راستو بەتاڵیان لێ تێکەڵاو بوو، حەقو ناحەقیان لێ بوو بەئایینو پەیڕەوییان کرد. وەکوو هەموو گەلو نەتەوەیەکی تر، کاتێ جەهلو نەزانی وەکوو هەوری رەش دای پۆشینو رۆژگاری دوورو درێژ بەسەریاندا تێپەڕی، ئەفسانە خوازو شەعوەزە چی

خۆیـان خزانـده نـاو چین و توێژەکانیانـەوە، سـاڵ دوای سـاڵ دیـاردەی هاوبـەش پەیـداکردن بـۆ خـوداو بتپەرسـتی لەناویانـدا سـەری هەڵـدەداو تەقالیدی بەتاڵ و رەوشتی بەدو ناپەسەندیان لـەناودا تەشـەنەی دەکـرد، بەوە لەروناکایی یەکتا پەرستی دوور کەوتنەوەو لە شەقامە رێی ئایینی «الحنفية»ی پاك و خاوێن لایانداو، نەزانی و سەر لێ شێواوی دایپۆشین و ماوەیەکی زۆر لەم تاریکستانەدا مانەوە تا پەروەردگار بە رەحم و بەزەیی خۆی بـەناردنی حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ ئـەو هـەورە رەشـەی لەسـەر راماڵین و بەختەوەری دونیا و قیامەتیان بۆ دەستەبەر بوو.

یەکەم کەس کە دیاردەی بت بتپەرستی هێنایە نـاو عەرەبەکانـەوەو هـەڵینان بـۆ بتپەرسـتی عـەمری کـوڕی «لحـی» کـوڕی «قمعـە» بـاپیرە گەورەی هۆزی خوزاعە بوو.

ئیبنـو ئیسحاق لـە موحەممـەدی کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی «الحـارث التيمی»یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ «أبو صالح السمان» بۆی گێڕامـەوە کـە لە ئەبو هورەیرەی ژنەوتووە فەرموویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خـودا ﷺ بە ئەکثـەمی کوڕی جـەونی «ألخزاعـی» فـەرموو: ئـەی ئـەکثـەم مـن شەوی میعراج عەمری کوڕی لوحەی کوڕی «قمعة»م بینـی لـەناو ئـاگری دۆزەخدا ریخۆڵەی خۆی رادەکێشان، کەسم نەبینیوە بە ئەندازەی تۆ لەو بچێ و ئەو لەتۆ بچێ. ئـەکثـەم وتـی: ئـەی پێغەمبـەر خـودا! دەترسم ئـەم لێکچوونەی من بە ئەو زیـانم پـێ بگەیـەنێ، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: نـەخێر ئـەوە چ زیـان بـەتۆ ناگەیـەنێ تـۆ موسـوڵمانی و ئـەو کـافرە، بتپەرسـتە، ئـەو بەدبەختـە یەکـەم کـەس بـووە کـە ئـایینی حـەزرەتی ئیسماعیلی گۆڕیوە، بتی دانان بۆ پەرستن دیاردەی قوربانی «بحيرة»و «سائبة»و «وصيلة»و «حامی» داهێنا.[١]

---

١- سيرة ابن هشام ج١/٧٦. وروى الشيخان عن ابي هريرة ان رسول الله قال: رأيت عمرو بن لحي بن قمعة بن خندف يجر قصبه في النار. الحديث بألفاظ متقاربة.

ئیبنو هیشام چۆنیەتی داهێنانی دیاردەی بتپەرستی لەلایەن عەمری لوحەیەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: عەمری کوڕی لوحەی لە مەککەوە چوو بۆ شام، بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاری خۆی، کە گەیشتە ئەو شوێنەی کە پێی دەگوترێ «مآب» لە خاکی بەلقا: کە ئەوکاتە عەمالیقەی تێدا نیشتەجێ بوونو ئەولادی عیملاق یان عەملیقی کوڕی لاوزی کوڕی سامی کوڕی نوح بوون. عەمر بینی ئەو قەومە بت دەپەرستن پێی گوتن ئەم بتانە چین ئێوە دەیانپەرستن؟ وتیان ئەم بتانە دەپەرستین داوای باران بارین دەکەین بارانمان بۆ دەبارێنن، داوای کۆمەکییان لێ دەکەین یارمەتیمان دەدەن، وتی ئەوە بۆ لەو بتانە یەکێکیانم نادەنێ بیبەمەوە بۆ وڵاتی عەرەبو ئێمەیش وەکوو ئێوە بتپەرستی بکەینو ئەو بەهرانەمان دەستگیر ببێ. بتێکیان بەدیاری دایە پێیان دەگوت «هوبەل» ئەویش هێنایەوە بۆ مەککەو لەشوێنێکی بەرچاو دایمەزراندو فەرمانی بە خەڵکەکە کرد عیبادەتی بۆ بکەنو رێزی لێ بگرن.[1]

ئاوا بەوجۆرە دیاردەی بتپەرستی لەنیوە دورگەی عەرەبیدا بڵاوبۆوەو دانیشتوانەکەی ملیان لە شیرکو هاوەڵدانان بۆ خودانا. بەمە لە عەقیدەی یەکتا پەرستی خۆیان دارنیو ئایینی ئیبراهیمو

---

بحیرة: حوشترێکە گوێی دەقڵیشێندرێتەوەو دیاری دەکرێو جگە لە دەرەبەگو میوان نەدەبوو کەس شیرەکەی بخواتەوە.

سائبة: وشترێکە دوای دە وشتری مێ هاتبێتو ملکی بتەکانیان بووەو کەس بۆی نەبووە سواری بێ.

وصیلة: حوشترێکە بەرەڵا دەکرێو باری لێ ناندرێو بەمەرجێ یەکەم سکی مێینە بێو سکی دووەمیشی مێ بێ تایبەت دەبوو بە پیاوی دەرەبەگ نەدەبوو ئافرەت لێی بخوا.

١ - سیرة ابن هشام ج٧٧/١. هەروا کتاب الاصنام لأبن الکلبی ص٨-٩.

ئیسماعیلیان گۆڕی بە ئاینی بتپەرستی، سەرەنجامیان بەو حاڵە گەیشت کە پێی گەیشتن لە گومڕایی و عەقیدەی بەتاڵ و کرداری بەد!!
گرنگترین هۆکارێك کە هەڵینان بۆ بتپەرستی، نەزانی و نەخوێندەواری و چاولێکەری لە گەل و نەتەوەی دەوروبەریان و تەقلیدی کوێرانەیان بوو.

وەلێ وێڕای ئەم حاڵەش کەسانێکیان تێدا مابوون «هەرچەندە بە مروری رۆژگار بەرەو کەمی رۆیشتن» لەسەر عەقیدەی یەکتا پەرستی مابوونەوە، پەیڕەوی رێبازی ئەو ئایینەیان دەکرد کە لە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە بۆیان مابوەوە، بڕوایان بە زیندوبوونەوە و حیساب و لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەت هەبوو. یەقینیان بەوە هەبوو کەخودا پاداشی چاکەکارو فەرمانبەردار دەداتەوە و سزای سەرپێچیکار دەدا. دژی دیاردەی سەرهەڵدانی بتپەرستی بوون، زۆریان هەوڵدا عەرەبەکان لە بتپەرستی ژێوان بکەنەوە، بەلام نەیانتوانی بەری ئەم لافاوە بگرن و بتپەرستی تاهات پەرەی سەندو بلاوبووە.

لەو زاتانەی لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم مابوونەوە قوسسی کوڕی «الساعدة» و «رئاب الشنّي» و «بحيرا الراهب» و زۆری تر.

هەرەکوو چۆن هەندێ داب و نەرێتی پاشماوەی سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم و بنەمای ئایینی حەنیف و شیعاراتی مابوەوە، هەرچەندە شان بەشانی رۆژگارو بە تێپەڕبوونی ماوەی زۆر بەسەریاندا کاڵبونەوە و گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و لاوازییان توش هاتووە. هەرچۆنێك بێ سەردەمی نەزانی عەرەبەکان بەڕواڵەت رەنگێکی دیاردەی شەعائیری ئایینی ئیبراهیمی پێوە دیاربوو، بنەما و تارمایی ئەو ئایینەی لێ دەبیندرا، بەلام تێکڕا شەعائیرو مەبادیئەکان لەژیانی عەرەبەکان دا بەچەواشەیی و گۆڕدراوی دەبیندران و وەکوو خۆیان نەمابوونەوە. بۆ نموونە رێزگرتنی کابە و تەواف و حەج و عومرە و راوەستانی کێوی

عەرەفەو قوربانی کردن، بنەمای ئەمانە هەموویان لە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمدا هەبوونو ئەنجام دراون، بەڵام بەدرێژایی مێژوو وردە وردە گۆڕانکاریو کەمو زیادییان تێدا کراوەو بەهەڵەو چەواشەکاری تەنفیذ کراون، زۆر دابو نەریتیان کردونە ئایینو تێکەڵاو بەئاینیان کردوون، بۆ نموونە: کە ئیهلالیان بە حەجو عومرە دەکردو تەلبیەیان دەکرد دەیانگوت: {لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك الا شريك هو لك تملكه وما ملك} ئەوان لە تەلبیە کردنەکەیاندا یەکتا پەرستییان رادەگەیاند، کەچی لەهەمان کاتدا بتەکانیان دەکردنە هاوشانی خودا.

بەکوردیو کورتی پەیدابوونی مێژووی عەرەبی لەژێر باڵی ئایینی «الحنفية السمحة»دا بووەو گەشەی کردووە، بەڵکوو دەتوانین بڵێین: مێژووی عەرەبی لەگەڵ ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم شان بەشانی یەك رۆژگاریان بەسەر بردووە، سەرەتا بیرو باوەڕی یەکتا پەرستیو نوری ئیمانو هیدایەت ژیانی داپۆشیبوون، پاشان ئەو عەرەبانە وردە وردە لەو ئایینە دوورکەوتنەوە، بە تێپەڕبوونی ماوەی زۆرو دوورکەوتنەوەی سەردەمیان لە رۆژگاری زێڕینی حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل، لە ئایین پاشگەز بوونەوەو بە پێچەوانەوە تاریکی گومڕاییو نەزانی ژیانی داپۆشینو هیچ شەعائیرو عیبادەتێکیان وەکوو خۆی نەهێشتەوە. پاشماوەی مەعالیمی ئایینەکەیانو مەبادیئە کاڵبۆوەکانی بە پەلە کوتەو هەنگاوی سست، لەگەڵ مێژوودا رۆژگاری بەسەر بردو تادەهات باری ئاینییان پتر لاواز دەبوو زیاتر کاڵ دەبووەوەو لایەنگری کەم دەبوونو ساڵ بەساڵ خۆزگە بەپار دەبوو.

کاتێك سەرلەنوێ چرای ئایینی حەق هەڵکرایەوە، حەزرەتی پێغەمبەر بانگەوازی ئیسلامی راگەیاندو تیشکی خۆری نیگای خودایی

تاریکی کوفرو نەزانی چرو پرو کۆبوەوەی رادا، بارانی رەحمەتی ئایینی حەق دڵی مرۆڤی لە چڵك‌و ژەنگی شیرك‌و بتپەرستی خاوێن کردەوە.

دیاردەی کوفرو بێدینی قەڵاچۆ کردو پرشنگی ئیمان‌و باوەڕو یەکتا پەرستی جیهانی روناك کردەوە، بنەماکانی عەداڵەت‌و حەق‌و راستی جێگیربوون، ئەمجار رویکردە ئەو پاشماوەو بنەما ئایینیانەی رۆژگاری حەزرەتی ئیبراهیم: کە خۆیان راگرتبوو وەکوو خۆیان مابوونەوە پەسەندی کردن‌و بە بەشێك لە ئایینی پەسەند قبوڵی کردن‌و سەرلەنوێ بانگەوازی بۆ کردن.



شك‌و گومانی تێدانیەو قسەیەکی زێدەیە پێ لەسەر ئەوە داگرین: کە ئەوەی ئێمە لەم نووسینەماندا دەیچەسپێنین شتێکی ئاشکراو نمایانەو پێویستی بە تێفکرین نیە بۆ کەسانێك کە شارەزای مێژوو بن، هەروا شتێکی چەسپاوە بۆ کەسێك دیراسەی ئایینی ئیسلامی کردبێ. وەلێ ئێمە لەم رۆژگارەدا ناچارین کە زۆر لەکاتی خۆمان بەفیڕۆ بدەین لە جەختکردنەوەی شتی بەدیهی‌و ئاشکرا کە حەوێجەی جەختکردنەوەی نیە. ئەمەش دوای ئەوەی ئێمە بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن هەندێ کەس عەقیدەو بیرو باوەڕی ملکەچی ئیرادەو ویستی خۆی دەکا. کە لەڕاستیدا ئەمە کارەساتە. بەڵێ ئەم جۆرە کەسانە بونیان هەیەو لەناو کۆمەڵگەدا کاریگەرن، گوێ نادەن بەوەی کە لەڕاستیدا ئەمانە بەم کارەیان عەقڵ‌و فیکری خۆیان بەزنجیری تۆکمە پێوەند دەکەن، عەقڵی خۆیان لەکار دەخەن‌و هیچ نرخێکی بۆدانانێن.

ئای چەند جوداوازو لێك دوورن، چەند نێوانیان بەر فراوانە کەتۆ ئیرادەت شوێنکەوتەی بیرو باوەڕت بێ، یان بیرو باوەڕت شوێنکەوتوی

ئیرادەت بێ، فەرقی ئەم دووحاڵەتە چەند گەورەو بەرچاوە؟ ئەمیان چەند بەرزەو ئەویان چەند سوكو بێ نرخە؟ ئەمیان چەند شكۆمەندی لەخۆ گرتووەو ئەویان چەند پەستو بێ نرخە؟.

بێگومان ئێمە كەسانێكمان بینی «وێڕای راستیو دروستی ئەوەی وتومانەو بەهێزیی بەڵگەكانمان» دەڵێن: بێگومان سەردەمی جاهیلی، پێش رەوانەكردنی پێغەمبەرو دەستكردنی بە بانگەوازیكردن، بەهۆش خۆی هاتۆتەوەو خۆی خڕ هەڵداوە بۆ رزگاربوون لەو بارودۆخە نالەبارەی تێیدابووە، هەروا دەڵێن: پێش هاتنی ئیسلام فكری عەرەبەكان كەوتۆتە خۆسازدان بۆ بەرەنگاربونەوەی دیاردەی شیركو بتپەرستیو دابو نەریتی ناشیرینی ناو كۆمەڵگەی عەرەبی. ئەم وەئاگاهاتنەوەو خۆسازدانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی كوفرو بتپەرستی، لە رەوانەكردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ رەنگی داوەتەوە.؟! بەقسەی ئەمانو بەپێی بۆچونیان «وەكوو ئاشكرایە» مێژوو سەردەمی نەزانی عەرەبەكان وردە وردە بەرەو كرانەوە بەسەر حەقائیقەكانی یەكتاپەرستیو نوری هیدایەتدا هەنگاوی ناو لەگەڵ درێژبوونەوەی رۆژگارو تێپەڕبوونی زەمان تا بهاتایە ئەمان زیاتر ئامادەباشی بۆ رزگاربونیان لەو بارودۆخە نالەبارە نزیك دەبوونەوە. واتە ئەوان چەندێك لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم دووركەوتبنەوەو مەسافەی نێوانیان فراوانتر بووبێ زیاتر لە مەبادیئەكانی ئایینی ئەو زاتە نزیكبوونەوە بەپیر بانگەوازییەكەیەوە چوون، تا ئەم نزیكبوونەوەیان بەپایین گەیشتو لەكاتی رەوانەكردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ گەیشتە تۆپەڵاكو پرشنگی داو جیهانی رۆشن كردەوە.

ئایا دەبێ مێژوو ئاوا بنووسرێتەوەو بچەسپێندرێ، یان دەبێ بە پێچەوانەوە بێ؟

هەموو باحیثو خاوەن فیکرو بۆچوونی ئازاد ئەو راستییە دەزانێ کە ئەو سەردەمەی حەزرەتی موحەممەدی تێدا کرا بە پێغەمبەرو رەوانەکرا دوورترین سەردەمی جاهیلی بوو لەنزیکبوونەوەی لە بەرنامەی ئیسلام، هیچ خۆ سازدانو ئامادە باشی خودی عەرەبەکان لەئارادا نەبووە بۆ پێشوازی کردنی زاتی لە ئیسلام.

ئەو دیاردەو مەعالیمو پاشماوانەی لای عەرەبەکان هەبوو کاتی رەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە بنەماو مەعالیمی ئایینی کە لەکونو کەلەبەردا جار جار روناکایی دەداو نیشانەی ئەوەی لێ دەخوێندرایەوە کەدژی بتپەرستینو خۆیان بەدوور دەگرن لە پەرستش بۆکردنیانو سەرهەڵدانی ویستو حەزیان بۆ بڕی فەضائیلو قییەمو شکۆمەندی: کەدوایی ئیسلام پەسەندی کردن، ئەم دیاردەو تروسکە ئایینیانە لەبەرامبەر ئەو هەموو تاریکوستانەی کوفرو بتپەرستییەی کە لەپێش چەند سەدەیەکەوە کەڵەکە بووبوون رۆژدوا رۆژ قەبارەیان زیادی کردبوو هیچ نمودێکیان نەبوو.

خۆئەگەر مانای «نبوة»و پێغەمبەرایەتی بەگوێرەی تەصەورو بۆچوونی ئەوجۆرە کەسانە بێ، دەبوایە حەزرەتی موحەممەدو پێغەمبەرایەتیەکەی زۆر پێش ئەو رۆژگارە بوایە کە تێیدا کراوە بە پێغەمبەر، واتە دەبوایە پێغەمبەر پێش چەند سەدەیەك لەسەردەمی خۆی لەژیاندا بویایەو ئەرکی پێغەمبەرایەتی بخرایە ئەستوو بۆسەر ئادەمیزادی ئەو رۆژگارە دێرینەش رەوانە بکرایە؟!

نووسەرو کەسانی تریش هەن وایان پێ خۆشەو دەیانەوێ ئەوە بسەپێنن: کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ کاتێك نەیتوانی قەڵاچۆی زۆربەی دابو نەریتو طقوسو بیرو باوەڕی غەیبی «کە لەناو عەرەبەکاندا باوبوو» بکا ناچار رەنگی ئایینی بەسەردا کردنو بە

دەستەواژەی ئایینی لە قەڵەم دان و وەکوو بەشێك لە پەیامی ئاسمانی و ئەرکی ئایینی ناساندنی. بە تەعبیرێکی تر حەزرەتی موحەممەد ﷺ بۆیە رەوانەکراوە رەقابەیەکی خودایی پاڵ ئەو کۆمەڵە بیرو باوەڕە بدا کە لای عەرەبەکان هەبووە، واتە: بەقسەی ئەم جۆرە کەسانەبێ، عەرەبەکان کۆمەڵێك بیرو باوەڕیان لەناودا باوبوو پەیڕەوییان دەکردن، بڕوایان بەهەندێ غەیبیات هەبوو، حەزرەتی موحەممەد تەنها ئەرکی ئەوەبوو، هات خاوەن و داهێنەرو دانەری بۆ ئەو بیرو باوەڕو داب و نەریتانە دیاریی کرد، گوایە ئەوانە هی خودای باڵا دەستن. دەڵێن: هەر بۆیەشە عەرەبەکان دوای هاتنی ئیسلام بەردەوامبون لەسەر بڕوا بوونیان بە سیحرو بە جنۆکەو باقی بیروباوەڕی لەوجۆرە. هەروەکوو چۆن بەردەوام بوون لەسەر پەیڕەویکردنی ئەو شەعائیرانەی لەوەپێش لەسەری بوون لە تەوافی کەعبەو بەگەورە زانینی و پیرۆز راگرتنی و ئەنجامدانی طقوسە ئاینییەکان و چەند شەعائیرێکی دیاریکراو.؟

بێگومان ئەم جۆرە کەسانە کەئاوا بیردەکەنەوەو بەم گیانە سیرە دەنووسن و ژینامەی پێغەمبەر شی دەکەنەوە، لەدوو فەرەضیەو ئەگەرەوە هەنگاو دەنێن و نایانەوێ بەهیچ کلوجێك گریمانەکانیان هەڵە رووی تێبکا.

گریمانەی یەکەم ئەوەیە بڕوایان وایە حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەر نیەو نیگای بۆ نەهاتووە.

گریمانەی دووەم ئەوەیە، پێیان وایە ئەوەی لای عەرەبەکانی سەردەمی جاهیلی باوبووە، لە دیاردەی ئایینی و طقوسی ئایینی و شەعائیری حەج و عومرەو شتی تر، زادەی فکرو بیرو بۆچوونی عەرەبەکان خۆیانەو لەگەڵ رۆژگار بەرە بەرە دایانهێناون، لەرەحەمی کۆمەڵگەی خۆیان لەدایك بوون. دەڵێن: رێزگرتنی کەعبەو تەقدیس

کردنی دیاردەیەك نیە لە ئاساری بانگەوازی حەزرەتی ئیبراهیم‌و باقی ماندەی ئەو پەیامە نیە، بەڵکوو شتێکە بیئەو کۆمەڵگەی عەرەبی تان‌و پۆی لێکداوەو چنیویەتی، تەقلیدو داب‌و نەرێتێکە عەرەبەکان خۆیان دایانهێناوە.

جا لەپێناو پارێزگاری کردنی ئەم دوو گریمانەو مسۆگەر کردنی ئەوە کە پوچ نەکرێنەوەو لەکەدار نەبن، ئەو جۆرە نووسەرانەی کەخاوەنی گریمانەکانن چاوی خۆیان دەقوچێنن لەئاست ئەو هەموو بەڵگەو روداوە مێژووییانەی کە بەئاشکرا ئەو جۆرە گریمانانە بەپاشدا دەبەنەوەو پەردە لەسەر پوچی‌و بێ بنەمایی راو بۆچونی نازانستیان لادەدەن.

ئاشکرایە: کە لێکۆڵینەوە لە حەقیقەت‌و هەوڵدان بۆ گەییشتن پێی‌و دەرخستنی، پێویستی بە بنەمای زانستییە نەك گریمانەی هەڵە. کەوابوو ناگونجێ توێژەرەوە بگاتە مەبەست‌و بە ئامانج بگا، لەکاتێکا خیطەی لێکۆڵینەوەکەی لەچوار چێوەی ئەو گریمانە هەڵەیەدابێ کەپێش وەخت لەزەینی خۆیدا بڕیاری داوە، ئاشکرایە لێکۆڵینەوەی لەوجۆرە وێنەیەکە لە وێنەی گاڵتەجاڕی‌و کاری پێکەنین ئامێز.

چونکە ئێمە کاتێك بمانەوێ لە لێکۆڵینەوەدا بگەینە حەقیقەت‌و راستی، دەبێ بەچاوی ئیعتیبار هەموو بەڵگەیەکی عەقڵی‌و روداوی مێژوویی بەرچاو بگرین، بۆئەوە خودی حەقیقەتەکە بدۆزینەوە. مادام ئێمە نامانەوێ درۆ لەگەڵ خۆمان بکەین‌و مەبەستمانە بەحتی حوڕو ئازاد بێنینە کایەوە، نامانەوێ بەزۆرە ملێ‌و چەواشەکاری کەسانی دی بخەینە سەر فیکرەو گریمانەکەمان‌و گوێ نەدەینە ئەوە چەندێك باسەکەمان پەیوەندی بە حەقیقەت‌و واقیعەوە هەیە، دەبێ زانستیانە هەوڵی دۆزینەوەی حەقیقەت‌و راستی بدەین!.

بەڵێ ئێمە بەهیچ حاڵ و کلۆجێك ناتوانین چاوی خۆمان بنوقێنین و فیکری خۆمان کول بکەین لەو مێژووەی ئەوە دەچەسپێنێ کە حەزرەتی ئیبراهیم کەعبەی بنیات ناوە، لەخۆیەوەنا بەڵکوو بەفەرمانی خوداو بەنیگای خودا ئەو ماڵەی لەو شوێنە بنیات ناوە، هەروا نابێ چاوی خۆمان بنوقێنین لە تێکڕای پەیامی پێغەمبەران کە یەك لەدوای یەك بانگەوازییان کردووە بۆ ڕێزگرتنی کەعبەو خودا بە یەکناسین و بڕوا بە غەیبییاتی پەیوەست بەڕۆژی حەشرو سزاو پاداش و سەرەنجام دابەشبوونی ئادەمیزاد یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ و گەلێ شتی تر لەوانەی نامە ئاسمانییەکان دەیگەیەنن و مێژوو تەصدیقی کردووەو رۆژگارو زەمانەو چینەکانی ئادەمیزاد لەخۆیان گرتوون و دانیان پێداناون. دەی باشە دەگونجێ ئێمە ئەو هەموو حەقائیقە مێژوویی و روداوە دان پیانراوانەی نامە ئاسمانییەکان وەلانێین و چاویان لێ بقوچێنین، تەنها لەبەر بەڵگەیەکی نازانستی: کە ئەویش بریتییە لە گریمانەی ئەوە گوایە ئەو دیاردە ئایینیانەی پێیان دەڵێین پاشماوەی ئایینی ئیبراهیم: کە لەسەردەمی جاهیلیدا باویان هەبووەو پەیڕەو کراون تەنها تەقالیدو داب و نەریتێك بووە بیرو بۆچوونی عەرەبەکان دایهێناوەو حەزرەتی موحەممەد ﷺ کە هاتووە بەڕەنگی ئایینی بۆیەی کردوون!!

پێویستە کە بزانین: ئەوکەسانەی ئەو جۆرە زەعم و بۆچونەیان هەیەو پێیان خۆشە راوو بۆچونی لەوجۆرە بڵاوبکەنەوە، ناتوانن نە لەپێش و نە لەپاش، تاقە بەڵگەیەکیش لەهەر جۆرێك بێ لەسەر بۆچونەکانیان، بخەنە روو؟! ئەوانە مەبەستیان تەنهاو تەنها چەنە بازی و چەواشەکارییە.

لەوانەیە تۆ داوای نموونەیەکم لێ بکەی لەو بابەتە. بەسەرچاو. نموونە زۆرن. دەتۆ بۆخۆت کتێبی «بنية الفكر الديني» دانراوی

ڕۆژهەڵات ناسی ئینگلیزی ناسراو بە «جیب» بخوێنەوە، ئەوکاتە دەبینی دەمارگیریی کوێرانە چی بەوخەڵکە کردووە؟! ئەو دەمار گیرییە سەیرو سەمەرەی زۆرجار خاوەنەکەی هەڵدەنێ کەخۆی ڕوت بکا لەهەموو بەهاو نرخێکی زانستی، تەنانەت واز لە «مقومات»ی کەرامەتی خۆیشی بێنێ، خۆی گێل‌و ئەحمەق بکا، چاوی خۆی لەو هەموو بەڵگانەی وەکوو کێوی حەقیقەت خۆیان دەنوێنن، بقوچێنێ‌و ملکەچیان نەبێ.

بێگومان پێکهاتەی فیکری ئایینی لە ئیسلامدا بە تێڕوانینی «جیب»، بریتییە لەو عەقیدەو فکرە غەیبییانەی لای عەرەبەکان هەبوون لەپێش هاتنی ئیسلامدا، حەزرەتی موحەممەد ﷺ هاتووە تێیان فکریوە، ئەوەی توانیویەتی بیگۆڕێ گۆڕیویەتی، ئەوەیشی نەیتوانیوە بیگۆڕێ‌و خۆی لێ ڕزگار بکا، هاتووە بەرگی ئیسلامی بەبەردا کردووە، ئەمجار دەڵێ: موحەممەد ئەوەی لەبیر نەچووە کە دەعمی فکرەکەی بکا بە پەیکەرێك لە ئەفکارو هەڵوێستی ئایینی گونجاو، کە ئەم کارەی ئەنجام داوە، ئەمجار لێرەدا موشکیلەیەکی تری گەورەی هاتۆتە پێش، چونکە ئەو ویستویەتی ژیانی ئایینی دابمەزرێنێ نەك تەنیا بۆ عەرەب بەڵکوو بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەی سەر ڕووی زەمین، ئەمەش لەچوار چێوەی ئەو فکرە غەیبی‌و بیرو باوەڕەی لای عەرەبەکان باو بوو جێگای بۆ نەکرایەوە ناچار ئەم ژیانە ئایینییەی لە چوارچێوەی مەنهەجی قورئاندا دامەزراند.

ئەمە پوختەی ئەفکاری «مامۆستا جیب!» بوو لە کتێبەکەیدا... ئەتوو ئەم ئەفکارانەی دەخوێنیەوە، هەر لەسەرەتای کتێبەکەیەوە تا کۆتایی، نابینی یەك بەڵگەیەك بێنێتەوە لەسەر ئەوەی دەیڵێ. ئەگەر تۆ لە نووسینەکەی وردبیتەوە، هیچ گومانت نامێنێ لەوەدا: کە ئەم کابرایە عەقڵ‌و ئاوەزی خۆی لەشوێنێکی دوور داناوەو لە شوێنێکی تر

دانیشتووە ئەم وڕێنەو خەڕافیاتو خەیاڵاتە دەنووسێو توڕەهاتو قسەی بێ سەروبەر لە خەیاڵی خۆیەوە رادەگوێزێو حوکمو بڕیار دەردەکا!.

وادیارە ئەو کابرا رۆژهەڵاتناسە ئەوکاتەی دانیشتووە بۆئەوەی پێشەکی بۆ تەرجەمە عەرەبیەکەی کتێبەکەی بنووسێ، ئەوەی بەبیردا هاتووە: کە لەداهاتوودا خوێنەران نووسینەکەی رەتدەکەنەوە، بەسوکایەتی پێکردنەوە ئەفکارەکانی تووڕدەدەن، بۆیە هاتووە پێشوەخت پاساو بۆ نووسینەکانی دێنێتەوە. پاساو دێنێتەوەو دەڵێ: ئەو ئەفکارانەی ئەم نووسینەمی لەسەر بنیات نراوە، زادەی مێشکی خۆم نین، بەڵکوو کەسانی دی پێشم کەوتوون، کۆمەڵێك لەبیرمەندو خاوەن فکر لە گەورە زانایانی موسوڵمانان کە ژمارەیان زۆرەو ژماردنیان زۆری دەوێ، پێش من ئەم راستییەیان درکاندوە، تەنها بۆ نموونە ناوی یەکێکیان دێنم، ئەویش شێخی گەورە «شاە ولي الله الدهلوي»یە، ئەمجار دەقێکی «شاە ولی الله دهلوی» راگواستووەو ئاماژەی کردووە بۆ «ج١، لاپەڕە/١٢٢» لە کتێبی بەناوبانگی ناوبراو کەناوی لێناوە «حجة الله البالغة».

وادیارە مامۆستای توێژەرەوەو رۆژهەڵاتناس دڵنیابووە لەوە کەکەس لە خوێنەران ئەرکی گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی ناوبراو ناخاتە ئەستۆی خۆی، ئەو ئەزیەتە بەرخۆی ناداو ناچێ بۆ دڵنیابونی خۆی لە دەقەکە سەیرێکی کتێبی ناوبراو بکا، بۆیە هاتووە نا ئەمینانە لەسەر زوبانی «شاە ولي الله» بە ئارەزووی خۆی گۆڕانکاری کردووە، ئەوەی لەگەڵ مەبەستیدا بگونجێ قۆستویەتیەوەو گۆڕیویەتی، مانایەکی لە دەقەکە ناوە کە هەڵی ناگرێ، شتێکی لەسەر زوبانی «شاە ولی الله» گوتووە کە ئەو نەیگوتووە.

ئەمەی دەیخەمە نێوان کەوانەوە، دەقی نووسینەکەی «جیب»ە کە لەکتێبی «شاه ولي الله»وە رایگواستووە «دایتاشیوە». دەڵێ: «بێگومان پێغەمبەر ﷺ بە پەیامێکەوە نێردراوە کە پەیامێکی تری لەخۆ گرتووە، پەیامی یەکەم ئەو پەیامەیە کە بۆ ئەولادی ئیسماعیل نێردراوە، ئەم پەیامە وادەخوازێ: کە مادەی شەریعەتەکەی ئەو شەعائیرو شێوە عیبادەتەیە کەلای عەرەبەکان باوبوو، چونکە شەرع بریتییە لە چاکسازی کردن لەوەی لایانە نەك تەکلیف کردنیان بێ بەشتێك کە هیچ ئاگاداری نین»[١].

وەلێ لەڕاستیدا دەقە نووسراوەکەی کتێبی «حجة الله البالغة» زۆر جوداوازە لەوەی «جێب» دایتاشیوەو گۆڕانکاری تێداکردووە. «شاه ولي الله» دەڵێ:

ئەتو بزانە کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ رەوانەکراوە بە ئایینی «الحنفية الإسماعيلية» بۆئەوە هێڵە خوار بووەکانی راست بکاتەوە، نورو پڕتەوی بڵاوبکاتەوە. قورئان ئەمە دەچەسپێنێ و دەفەرموێ: «ملة أبيكم ابراهيم». جا کەوابێ پێویستە کە بناغەکانی ئەو ئایینە ئیسلامی بێ. سونەتەکانی دامەزراو بن چونکە پێغەمبەر رەوانە کراوە بۆسەر گەل و نەتەوەیەك دیاردەو پاشماوەیەکی ئایینی تێدامابوو، پێویست نەبوو سەر لەبەری ئەو بنەماو پاشماوە ئایینیانە بگۆڕێ، بەڵکوو پێویست بوو بیانهێڵێتەوەو تەقریریان بکا، چونکە پێوەی راهاتبون و بەئاسانی بەدڵیاندا دەچوو، پاشتر لەسەریان دەچەسپا لەکاتی بەڵگە هێنانەوە. نەوەکانی حەزرەتی ئیسماعیل چین لەدوا چین پەیڕەوو پیرۆگرامی حەزرەتی ئیسماعیلی بابە گەورەیان بەمیراتی بۆمابووەوە، لەسەر ئەو شەریعەتە بەردەوام بوون و پەیڕەوییان دەکرد، تا عەمری

---

١ - بڕوانە کتێبی .بنية الفكر الديني لجيب ص٥٨..

کوڕی لوحەی پەیدابوو، دیاردەی بتپەرستی داهێنا. هەندێ راوو بۆچونی پوچی خۆی خستە ناو ئایینەوە، بۆخۆی گومڕابوو خەڵکی تریشی گومڕا کرد. داب‌و نەریتی بتپەرستی داهێنا، یاسای «سائیبة» و «بحیرة»ەی هێنایە ئاراوە. لێرەوە بەتاڵکردنەوەی ئایینی ئیسماعیل پەرەی سەند، راست‌و گەندەڵ تێکەڵ بەیەك بوون، نەزانی‌و کوفرو بێ دینی بوو بەهەوری رەش‌و دایپۆشین. ئیتر پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی کردە پێغەمبەرو رەوانەی کرد بۆئەوەی خوارو خێچی داب‌و نەریتیان راست بکاتەوە. ئیصلاحی فەسادی‌و گەندەڵی بیرو باوەڕو کۆمەڵایەتییان بکا، ئەوەبوو حەزرەتی موحەممەد ﷺ زۆر بەوردی بنەما شەریعەتە بۆماوەکەیانی تاوو توێ کرد، ئەوەی دەگونجا لەگەڵ مەنهەجی حەزرەتی ئیسماعیل، یان بەشێك بوو لە شەعائیری خودا، دانی پیاناو ئیقراری کردو هێشتیەوە. ئەوەی گۆڕانکاری تێدا کرابوو، یان هەر گەندەڵ‌و فەساد بوو، یان لەپێڕی شەعائیری شیرك‌و کوفر بوو پوچی کردەوەو قەڵاچوی کرد»[١].

گومانیشت لەوەدا نەبێ کە ئێمە نووسینی ئەم زاتە لێکۆڵەرەوەیە ناخەینە سەر تاوڵەی موناقەشەو رەتدانەوە، چونکە موناقەشە کردنی نووسینێکی وا پوچ‌و بێهودەو نازانستی‌و وڕێنە ئامێز، خۆماندوو کردنێکی بێهودەیەو کات بەفیڕۆ دانە. وەڵێ ئێمە مەبەستمان لەم ئاماژە کردنە ئەوەیە خوێنەر بزانێ تاچ ئەندازەیەك دەمارگیری کوێرانە خاونەکەی بەرەو کەمپی نەزانی بردووە، هەروەکوو چۆن دەمانەوێ خوێنەر ئاگادار بێ بەسەر ئەو حەقیقەتەی هەندێ کەس لەزانا خۆرئاواییەکان بە ناڕەوا لافی مەنهەجیەت‌و مەوضوعیەت لێ دەدەن.

---

١ - ئەمە دەقی نووسینە .شاه ولي الله الدهلوی.یە بۆ خۆت بڕوانە کابرای خۆرهەڵاتناس چۆن گۆڕانکاری تێداکردووە.

لەهەمان کاتدا بزاندرێ تەقلیدو شوێنکەوتنی کوێرانەی هەندێ لە نووسەرانی موسوڵمان بۆ زانا خۆرئاواییەکان چەند جێگای سەرنجەو چەند نازانستییە.

کەوابوو تۆی خوێنەر دوای ئەم روونکردنەوانەی لەوەپێش ئاماژەی بۆکرا، هەستت بە حەقیقەتو راستیو چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئیسلامو فیکری جاهلی کرد کە لەپێش هاتنی ئیسلامدا لای عەرەبەکان باوبوو.

هەروا زانیت پەیوەندی نێوان سەردەمی جاهیلیو ئەو ئایینە پاکو خاوێنەی کە حەزرەتی ئیبراهیمی پێ رەوانە کرابوو چۆنەو چییە؟..

ئەوەشت بۆ دەرکەوت، بۆچی حەزرەتی موحەممەد ﷺ زۆر لەدابو نەریتو بنەمای باوو پەیڕەو کراوی سەردەمی نەزانی عەرەبەکانی جێگیر کردو هەندێکی وەلانانو لەغوی کردنەوەو قەڵاچۆی کردن.

بەمەیش دێینە کۆتایی رانواندنی ئەم پێشەکیانەی کە پێویست بوو پێش چونە ناو لێکۆڵینەوەی زانستیمان دەربارەی سیرەی پێغەمبەرو دەرهێنانی فیقهو ئامۆژگاریی جۆراو جۆر: کە دەبوایە ئەنجام بدرێن!.

دڵنیاشبە لەوە بەولاوە لەچوارچێوەی باسەکانماندا زۆر بەڵگەو بورهانت دەست دەکەوێ جەخت لەراو بۆچونەکانمان دەکاو تەپو تۆزی سەر روداوەکان دەتەکێنێو حەقیقەتەکان دەردەخا.

## بەشی دووەم

# لەکاتی لەدایکبوونەوە تا پێغەمبەرایەتی

## نەژادی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێ ، لەدایکبوونی، شیرخواردنی

### نەژادی پێغەمبەر:

زاتی پاکی ناوی موحەممەدە کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب پێشی دەگوترێ: «شیبە الحمد» کوڕی هاشم کوڕی عبدالمناف «ناوی المغیرە» بووە. کوڕی قوصەی پێی گوتراوە «زەید» کوڕی کیلاب کوڕی «مُرَّة» کوڕی کەعب، کوڕی لوئەی کوڕی غالب کوڕی فیهری کوڕی «مالیك»ی کوڕی «النضر»ی کوڕی کەنانە کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودریکەی کوڕی «ئەلیاس»ی کوڕی موضەری کوڕی نزاری کوڕی مەعەدی کوڕی عەنان.

تائێرە نژادی پێغەمبەر کۆڕای لەسەرە، لەوەبەرەو ژوور راجیایی تێدایەو جێگای مشتو مڕەو ناتوانی لێی دڵنیابی. وەلێ ئەوەی جێگا متمانەیەو گومانی لێ ناکرێ، ئەوەیە عەدنان لەنەوەو ئەولادی حەزرەتی ئیسماعیلە: کە پێغەمبەرێکی ئولولعەزمەو کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە «صەلاتو سەلامی خودایان لەسەر بێ». هەروا شكو گومانیش لەوەدانیە کە پەروەردگار پێغەمبەری خۆی لەپاکترین هۆزو گەورەترین

بنەماڵـەو پـاکترین نـژاد هەڵبـژاردوە. تۆزقـاڵێکیش چـڵکی کـوفرو بتپەرستی سەردەمی نەزانی لە نژادی نیە.

ئیمامی موسلیم بە شەرت و سەنەدی خۆی فەرموودەیەك ریوایەت دەکا لە پێغەمبەرەوە کە فەرموویەتی {ان الله اصطفى كنانة من ولد اسماعيل واصطفى قريشاً من كنانة واصطفى هاشماً من قريش واصطفاني من بني هاشم}.

رۆژگـاری لـەدایکبوونی رێکـەوتی سـاڵی روداوی «فیـل»ی کـردووە، ئـەو سـاڵەی ئەبرەهـەی حەبەشـی هـەوڵی روخـانی کەعبـەی دا، لەشـکری زۆرو جـەراری تێـدا هێنایـە سـەر مەککـەو فیلـی ئامـادە کردبـوون بـۆ روخـانی مـاڵی کەعبـە. بـەڵام خـودا پیلانەکـەی لـەناو بـردو ئاواتەکـەی زیندەبەچـاڵ کـردو طـەیـرەن ئەبابیلـەی کردنـە ئـامرازی لەناوچـونی ئەبرەهەو لەشکرەکەی.

لـەدایکبوونی حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ بـەگوێرەی راسـتترین سەرچاوە رێکەوتی رۆژی دووشەممەی دوانزەی مـانگی رەبیعـول ئـەوەڵی کردووە.

بە هـەتیوی لـەدایکبوو، کاتێـك بـاوکی لـەدونیا دەرچـوو ئـەم هێـشتا کۆرپەلەی دوو مانگانە بوو لەسکی دایکیدا، بۆیە کە لەدایك بـوو باپیری «عبدالمطلب» لە ئامێزی خـۆی گـرت و تـەدارەکی لـەدایکبوونی لـەئەسـتۆ گـرت. دایـەنی بـۆ گـرت. ئـەوەبوو لەسـەر داب و نـەریتی عـەرەب، دایـە دەست ئافرەتێك لەهۆزی بەنی سەعد: کە پێیان دەگووت حەلیمەی کچی ئەبو ذۆیب. ژینامە نووسانی پێغەمبەر ﷺ کۆراپیان هەیە لەسەر ئەوە کـە دەڤـەرو ناوچـەو لادێیـەکانی هـۆزی بـەنی سـەعد لـەو سـەروبەندەدا تووشـی کێـشەو گرفتـی وشـکە سـاڵی و گرانـی و قـات و قـری هـاتبوون، ئاژەڵیان شیریان تێدا نەبوو، کشت و کـاڵ و گیـا و گـژیان وشـك بـوو بـوو. هـەر ئەوەنـدە حـەزرەتی موحەممـەد «منـداڵی تـازە لـەدایکبوو» لـە مـاڵ و

منزڵی حەلیمەدا جێگیربوو، لە باوەشی حەلیمەدا ئارامی گرتو گۆی مەمکی ئەو دایکە شیردەرەی مژی. بە بەرەکەتی ئەو زاتە ساوایە، هۆبەی حەلیمەو دەڤەرو ناوچەی دەوروبەریان هەرزانی تێکەوت، بارانی رەحمەتی لێ باری، شیوو دۆڵو دەشتو سارای ئەو دەڤەرە سەوز بووە، لەوەڕ زۆر بوو، ئاژەڵیان بەیانی ئاڕاستەی لەوەڕگا دەکراو ئێوارە بە تێریو گوانی پڕ لەشیرەوە دەگەڕایەوە.

هەر لەسەردەمی منالیو مانەوەی لەناو هۆزی بەنو سەعددا روداوی لەتکردنی سینگی بەسەردا هات«١»، دوای ئەوە هێنرایەوە بۆلای دایکی ئەوکاتە تەمەنی پێنج ساڵانە بوو.

کەتەمەنی پیرۆزی گەیشتە شەش ساڵانە، خاتوو ئامینەی دایکی کۆچی دوایی کرد. ئەمجار حەزرەتی موحەممەد کەوتە باوەشی عەبدولموتەلیبی باپیرییەوە، بەڵام زۆری نەبرد باپیرەی دڵسۆزیشی کۆچی دوایی کرد، ئەوکاتە حەزرەتی موحەممەد ﷺ تەمەنی هەشت ساڵانە بوو، ئیتر ئەبوتالیبی مامی گرتیە لای خۆیو سەرپەرشتی کرد.

## پەندو ئامۆژگاری لەم روداوانە:

لەم چەند روداوانەی باس کران لە سیرەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ کۆمەڵێك بنەماو پەندو ئامۆژگاری گرنگمان دێنە بەرچاو، دەتوانین لەم خاڵانەدا چڕیان بکەینەوە:

١. لە رونکردنەوەی نژادی پیرۆزیدا بەڵگەی ئاشکراو بەرچاو هەن لەسەر ئەوەی پەروەردگار گەلی عەرەبی پاساو داوە بەسەر گەلانی تردا. هۆزی قورەیشیشی رێز لێناوە بەسەر باقی هۆزو عەشیرەتەکانی تردا،

---

١ - بڕوانە باسی شیرخواردنی حەزرەتی موحەممەد لەناو خێڵی بەنو سەعدداو شەقبوونی سینگی لەکتێبی سیره ابن هشام ج١/٦٤ هەروا بڕوانە صحيح مسلم ج١/١٠١ — ١٠٢.

ئـەم بەڵگـەو دەلائیلانـە بەئاشـکرا لـەو فـەرموودەی ئیمـامی موسـلیمدا دەردەکـەون: کـە لـەوەپێش تۆمارمـان کـرد. هـەر بـەو مانایـە فـەرموودەی تری زۆرو زەبەندە هەن. یەکێك لەوجۆرە فەرموودانە ئەو فەرموودەیە کە تیرمیذی ریوایەتی کردووەو دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەسـەر دوانگـە راوەسـتاو فـەرمووی: «مـن انـا» مـن کـێم؟ هـاوەڵان عـەرزیان کـرد: تـۆ پێغەمبەری خودای «صـەلاتو سـەلامی خـودات لەسـەر بـێ». فـەرمووی: {أنا محمد بن عبدالله بن عبد المطلب. ان الله خلق الخلق، ثم جعلهم فرقتين فجعلني في خيرهم فرقة، ثم جعلهم قبائل فجعلني في خيرهم قبيلةً. ثم جعلهم بيوتاً فجعلني في خيرهم بيتاً وخيرهـم نفسـاً}. مـن موحەممـەدی کـوڕی عەبدوڵڵای کـوڕی «عبـد المطلـب»م. پـەروەردگار ئـادەمیزادی خـەلق کـرد، دوایـی کردنـی بەدوو بەش، منـی خسـتە نـاو باشـترین بەشـیان. ئـەمجار کردنـی بەچـەند هـۆزو عەشـیرەتێك منـی خسـتە نـاو باشـترین هـۆزو عەشـیرەتەوە پاشـان ئـادەمیزادانی کردنـە چـەند بنەماڵـەو خێـزان، منـی خسـتە نـاو باشـترین خێزانو بنەماڵەوە.

ئەوە بزانە: کە خۆشەویستی پێغەمبـەر داخـوازی ئەوەیـە ئـەو گـەلو هۆزەی ئەو زاتـەی تێـدا هەڵکـەوتووە خۆشـمـان بـوێ، نـەك لـەڕووی تـاكو رەگـەزەوە، بـەڵکوو لـەڕووی حەقیقـەتی روتـەوە، چـونکە حەقیقـەتی عەرەبیو قوڕەیشـی بـەهۆی پێغەمبـەرەوە ﷺ شـەرەفمەند بـوون. ئەمـە هـیچ دژایـەتی نابـێ لەگـەڵ ئـەو خراپەکارییـەی عـەرەبێکی قوڕەیـشی ئـەنجامی دەدا، بـەوە لەڕێگـەی راسـتی پێغەمبـەر لادەداو لادانەکەشـی زیـانی بـۆ خـودی خـۆی هەیـە، لەئاسـتی پلـەی کەرامـەتی ئیـسلامی دایدەبـەزێنێ، چـونکە ئـەو لادانو پلـە دابەزینـە وادەکـا ئـەو خراپـەکارە پەیوەنـدی نێـوان خـۆیو پێغەمبـەر بپـچڕێنێ و ئـەو ئیعتیبـارە لـەغو دەکاتەوە، خۆشەویستی ئێمەش لەدەست دەدا.

٢. لەشێوەی موصادەفەو رێکەوت نیە: کە پێغەمبەر ﷺ بە هەتیوی لەدایك ببێ، هێشتا تەمەنی دوو مانگانە بێ لەسکی دایکیدا، باوکی بمرێ، ئەمجار زۆری پێ نەچێ باپیریشی لەدەست بدا، پەروەردەی سەرەتایی ژیانی بەبێ باوکی دەست پێبکا، بەبێ بەخێوکردنو چاودێری کردنی باوکیو سۆزی دایکانەی دایکی سەردەمی منداڵی بەسەر بەرێ.

بێگومان پەروەردگار ئەم شێوە ژیانە ناخۆشو پرچەورتەمەی بۆ پێغەمبەری خۆی هەڵبژاردووە، پەروەردە بوونی دوور لەچاودێری باوکی دڵسۆزو سۆزی دایکانەی دایکی، حیکمەتێکی یەزدانی بووە، پێدەچێ بەشێك لەو حیکمەتە خوداییە ئەوەبێ دەمبەستی ئەوانە بکا، کەبێ باوەڕنو رێگایان لێ بگرێ لەوەی شكو گومان بخەنە دڵی خەڵکەوە، یان سەرنجی خەڵکی رابکێشن بۆئەوەی حەزرەتی موحەممەد لەژێر چاودێری باوكو باپیریدا بەشیرە خۆریو منداڵی، فێری ئەوە کراوە بانگەوازیی پێغەمبەرایەتی بکا.

چۆن ئەم گریمانە سەرهەڵناداو ئەم بۆچوونە لەئارادا نابێ؟! بەتایبەتی عەبدولموتەلیبی باپیری، پیاو ماقوڵی هۆزی قورەیش بوو، لێپرسراوی دووکاری گرنگی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی هۆزی ناوبراوی لەئەستۆ بوو کە «ألرفادة والسقاية» بووە[١]. ئاشکراشەو شتێکی سروشتییە: کە باوكو باپیر، منداڵو نەوەی خۆیان وا ئاراستە بکەنو پەروەردەی بکەن: کە هەڵگری ئەو میراتو بەها سەروەریانەبێ کە خۆیان شانازی پێوە دەکەن.

---

١ - الرفادة: دابو نەریتێك بوو لەناو قورەیشییەکاندا باوبووە کە بریتی بوو لەوەی هەر مرۆڤێك بە گوێرەی توانای خۆی پیتاك بکەنو ماڵو سامان گردبکەنەوە خۆراكو مێوژو سرکەی پێ بکرنو دەرخواردی حاجیانی بدەن.

**السقاية**: دابینکردنی ئاوبووە بۆ حاجیان لەکاتی مەوسیمی حەجدا.

بەڵێ، حیکمەتی خودا واداخواز بوو: کە ڕێگا لە ئەوانە بگرێ کە پەیامەکەیان رەتکردەوە، ڕێیان لێ بگرێ کە نەتوانن ئەو شكو گومانە ببەنو ئەو تۆمەتە ئاڕاستە بکەن. بۆیە حیکمەتی خودا وابوو حەزرەتی موحەممەد لە ناسکترین قۆناغی ژیانیدا، بەبێ باوکی ئەمجار بەبێ دایکی پەروەردە ببێ، مەحرووم بێ لەچاودێری باوکانەو سۆزی دایکانە تەنانەت هێشتا تەمەنی لەهەشت ساڵی تێ نەپەڕیبوو کە «عبدالمطلب»ی باپیریشی کۆچی دوایی کرد. هەروا ویستی خودا وابوو کە حەزرەتی موحەممەد قۆناغی منداڵی لەناو هۆبەی خێڵی بەنی سەعددا، دوور لەهەموو بنەماڵەو خێزانی بەسەربەرێ.

کاتێك حەزرەتی موحەممەد لەتەمەنی هەشت ساڵی دابوو، باپیری مردو ئەبو طالیب کە مامی بوو گرتیە لای خۆی، ئەمیش زۆر بەدڵسۆزیو لێ بڕانەوە، سەرپەرشتی کرد، بە ماڵو بەگیان یارمەتیدا، ئەم کۆمەکیو پاڵپشتی کردنەی ئەبو طالیب درێژەی کێشا تاپێش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە بە سێ ساڵ. ئەبو طالب وێڕای ئەو هەموو داکۆکیکردنەی لە پێغەمبەر ﷺ کەچی بۆ خۆی ئیمانی پێ نەهێنا، بەمەش تۆمەتی ئەوە ناکرێ کە ئەبو طالیب هیچ دەستێکی هەبووبێ لە پەیامی پێغەمبەرداو واگومان ببرێ مەسئەلە مەسئەلەی هۆزو بنەماڵەو زەعامەتو پلەو پایەی دونیایی بێ.

بەڵێ بەو شێوە ویستی پەروەردگار وابوو، کە پێغەمبەرەکەی بەهەتیوی پەروەردە ببێ، تەنیا چاودێریی خودا سەرپەرشتی کرد، هیچ هێزو توانایەکی تر دەستی نەبوو لەچاودێریو سەرپەرشتیکردنیدا، نەماڵو سامان، نەچاودێرو رابەر، هیچ رۆڵێکیان لە پەروەردەکردنی پێغەمبەر دانەبووە، بۆئەوەی نەفسی مەیلی ماڵو جا هو پلەو پایەی دونیایی نەکا. بۆئەوەی کاریگەریی بیئەو دەوروبەری لەسەر نەبێ،

خەڵکی قودسییەتی «نبوة»و پلەو پایەی دونیایان لێ تێکەڵاو نەبێ. یان وابزانن یەکەم دەکاتە هۆکار بۆ گەییشتن بەدووەم.

٣. ئـەو هـەرزانی و خۆشـگوزەرانییەی کەوتـە هۆبـەی حەلیمـەی «السعدیة»وە بەهۆی ئەوەی کە حەزرەتی موحەممەد بەشیرە خۆرەیی کەوتە ناو خێزانی حەلیمەوە، کە «وەکوو ئامارژەمان پێکرد ئەو دەڤەرە» لەوەپێش توشی تەنگژەی وشکە ساڵی و قاتو قڕی بوو بوو، زەوی بێ ئاوو لەوەڕ، ئاژەڵ بێ شیرو بەروبووم، بە بردنی حەزرەتی موحەممەد لەلایەن حەلیمەوە بۆ ئەو هۆبەو دەڤەرە، باران باری و وڵات سەوز بۆوەو ئاژەڵی برسی تێربوونەوەو شیریان ژیایەوە، ئەمانە هەموویان بەڵگەی بەرزی و پیرۆزی شانو شکۆی پێغەمبەرن ﷺ نیشانەی ئەوەیە: کە پلەوپایەی چەند لای خودا بەرزو بڵندە، تەنانەت لەوکاتەشدا کە منداڵێکی شیرە خۆرە بووە!! بێگومان لەدیارترین دیاردەی رێزلێنانی خودا بۆ ئەو زاتە ئەوەیە کە پەروەردگار بە سایەی ئەوەوە خێزانی حەلیمەی خستە خۆشگوزەرانییەوە، کە بەلەخۆ گرتنی و شیرپێدانی شەرەفیاب بوو، ئەمەش شتێکی عەجایەبو سەرسوڕهێنەر نیە، ئەوەتا شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامیمان فێری ئەوەی کردووین کە لەکاتی بێ بارانی و وشکە ساڵیدا داوای بارینی باران بکەین بە بەرەکەتو پاڕانەوەی پیاوچاکان بەهیوای قبوڵبوونی دووعاو پاڕانەوەکانمان خودا ئەو ناخۆشیەمان لەسەر لابەرێ«١». دەی کەوابێ دەبێ چۆن بێ ئەگەر شوێنێك بەخودی پێغەمبەر شەرەفیاب بێ لەکاتێکدا کە شیرە خۆرەیەو لەباوەشی حەلیمەدا ئارامی گرتووەو مەمکەکانی دەمژێ؟

---

١ - جەماوەری زانایانی ئیسلام دەفەرموون واباشە لەکاتی وشکە ساڵیو کەم بارانی ئەهلی صەلاحو تەقوا، ئالو بەیتی پێغەمبەر بکرێن بەتکاکار بۆ لابردنی بەڵای وشکە ساڵیو ناخۆشی تر. بڕوانە فتح الباری ج٢/٣٣٩ ونیل الأوطار ٧/٢ وسبل السلام ١٣٤/٢ والمغنی لابن قامة ٢٦٥/٢.

بێگومان زۆر شیاوترە کە پێغەمبەر ببێتە هۆکاری سەوزبوونەوەی زەوی‌و کەوتنەوەی هەرزانی‌و خۆشی بۆ ئەو دەڤەرە لەوەی بەهۆی باران بارینەوە زەوی سەوز بێتەوە.

مادام هەموو شتێك بەدەست خودا بێ، خۆی ڕێکخەری هۆکارەکان بێ، زۆر لایەق‌و گونجاوە کە خودی پێغەمبەر لەڕیزی پێشەوەی هۆکاری بەرەکەت‌و فەرو ئیکرامی خودایی بێ، خۆ بە صەریحی قورئان پێغەمبەر ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان: {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ – الأنبياء/١٠٧}.

٤. ڕوداوی شەقکردنی سینگی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ لەتەمەنی منداڵیدا لەوکاتەدا کە لەهۆبەی بەنو سەعددا ژیانی بەسەر دەبرد، بە نیشانەو ئیرهاصاتی «نبوة»و بەڵگەی ئەوە دەژمێردرێ کە خودا هەڵی بژاردووە بۆ کارێکی گەورەو ئەرکێکی پیرۆز.

بێگومان ڕووداوی شەقکردنی سینگی لەچەند ڕیوایەت‌و بەچەند ڕێگای صەحیحەوەو لەسەر زاری ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان ڕیوایەت کراوە، یەکێك لەو هاوەڵانە ئەنەسی کوڕی مالیکە، کە ئیمامی مسلیم لە صەحیحەکەیدا لێیەوە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵانیدا یاری دەکرد، حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای‌و خستیە سەر زەوی‌و سینگی شەق کرد، دڵی دەرهێنا‌و خاڵێکی ڕەشی تێدا بوو لێی جیاکردەوە وتی ئەمە بەشی شەیتانە، ئەمجار لە تەشتێکی زێڕیندا بەئاوی زمزم شۆشتی‌و ئەمجار خستیەوە شوێنی خۆی... لەوکاتەدا منداڵەکانی کە یارییان لەگەڵ دەکرد بە هەڵەداوان ڕایانکردەوە بۆ ماڵی حەلیمە. دایکە شیردەرەکەی بە هاوارو گریانەوە هاواریان دەکرد کە محمد کوژرا، کاتێك حەلیمەو دەرو دراوسێ بەپیر هاوارەکەوە چوون‌و حەزرەتی محمدیان بینی ڕەنگی گۆڕابوو«[١]».

---

١ - صحيح مسلم ج١/١٠١ و ١٠٢.

حیکمـەتیش لـەم روداوە «والله أعلـم» دەرهێنـانی غـودەی شـەڕنیە لـەناو دڵـی پێغەمبـەر ﷺ چـونکە ئەگـەر شـەڕو کـوفرو خراپـەکاری سەرچاوەو کانی غودەیەك بێ یان پارچە گۆشتێك بـێ لـەناو شـوێنێکی جەسـتەدا، دەکـرا مرۆڤێکـی خـراپ‌و گـومڕا بـە عەمەلییـەکی جەراحییـە بکرایە بە مرۆڤی صالح‌و باش. وەلێ وا دەردەکەوێ حیکمەتەکە ئەوەبێ پەروەردگار پێش وەخت ئیعلانی ئەوە بکا کە ئەم زاتە کارێکی گرنگـی دەخرێتـە سـەر شـان‌و ئامـادە باشـی ئـەوەی بکـا کەهـەر لـە مندالّییـەوە بەوەسائیلی مادی بەرچاو، حازرو ئامادەبکرێ بۆ عیصمەت‌و وەرگرتنـی نیگا، بۆئەوەی ئەو ئامادەکارییە شیوە مادییە ببێتە هۆکار بۆ ئیمان پـێ هێنـانی لـە داهـاتووداو بەڕاسـت زانینـی پێغەمبەرایەتییەکـەی لـەکاتی ئـیعلان کردنیـدا. کـەوابوو دەگونجـێ بڵـێین: ئـەو سـینگ لەتکردنـەی کـە نووسـەرانی سـیرە کۆڕایـان هەیـە لەسـەر رودانـی، پاککردنەوەیـەکی مەعنەوی بووە وەلێ شێوەی ماددی‌و حسسی وەرگرتووە، بۆئـەوەی ئـەو ئیعلانە خودایيە لـەخۆی بگـرێ کە لـەوەپێش ئامارژەمـان بۆکرد، خـەڵکی روداوەکە ببیسن‌و ببینن.

حیکمەتەکـە هەرچـییەك بـێ، پێویـست ناکـا «چـونکە هەواڵەکـە چەسپاوەو بە صەحیح دانراوە» هەوڵی ئەوە بدرێ مانای ئەم حەدیثە لـە ظاهیری خۆی لابدرێ‌و حەقیقەتی روداوەکە داپۆشرێ‌و هـەوڵی تـەئویل کردنی بۆ بدرێ، تەئویلی دورو نامەعقول‌و تەکەلووف ئامێز. هەرکەسێك هـەوڵی لـەوجۆرە بـدا «بەتایبـەتی کـە خەبەرەکـە صـەحیح‌و چەسـپاوە» هیـچی دەسـت ناکـەوێ جگـە لـەوەی کـە هەوڵدانەکـەی نیشانەی لاوازی ئیمان‌و باوەڕیەتی بەخوداو بە دەسەڵاتی رەهای.

پێویـستە ئێمـە بـزانین: تـەرازوو پێـوەری قبـوڵ کردنمـان بـۆ ئـەو روداوە، راسـتی روداوەکـەو صـەحیحی ریوایەتەکەیـە، کـە ریوایەتەکـە

مەرجی صەحیحی و راستی هاتنەدی و ثابت بوو، ئیتر ناچارین دەبێ قبوڵی بکەین و بیخەینە سەر سەرو سەرچاو، ئەوجار تەرازو پێوەرمان بۆ تێگەیشتن لەمانای دەقەکە، دەلالاتی زوبانی عەرەبی و ئەحکامەکانیەتی، ئەصڵیش لە کەلامدا حەقیقەتە، هەتا بتواندرێ مانای حەقیقی لێ بدرێتەوە، پەنا بۆ حاڵەتی مەجازو شتی وانابرێ، خۆ ئەگەر رێگای ئەوە بدرێ، هەر لێکۆڵەرەوەو توێژەرەوەیەك بە ئارەزوی خۆی، کەلام لەمانای حەقیقی خۆی لابداو پەنا بۆ جۆرەها دەلالاتی مەجازی بەرێ و چۆنی بوێ ئاوا دەقەکە ئاراستە بکاو مانای لێ بداتەوەو مەبەست دیاری بکا، ئەوە ئەوکاتە نرخی زوبان شلە پەتە دەبێ، دەلالاتی خۆی لەدەست دەداو خەڵکی سەریان لێ دەشێوێ و لە چۆنیەتی لێ تێگەیشتنی. پاشان دەڵێین: گەڕان بەدوا تەئویل و هەوڵدان بۆئەوەی حەقیقەت رەتبکەینەوە لەپای چی و بۆچی؟ هەڵبەتە ئەم جۆرە کارو هەڵوێستە لە ئاکامی ئیمان لاوازی بەخوداو لاوازی بڕوابوون بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو راستی پەیامەکەی دێتەدی. ئەگینا چەند ئاسانە مرۆڤ یەقینی هەبێ بەهەر روداوێك، گێڕانەوەکەی راست بێ و ریوایەتەکەی مەرجی وەرگرتن و قبوڵی تەواوی تێدابێ. جا حیکمەتەکەی بزانی یان نەیزانی.

## گەشتی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ
## بۆ وڵاتی شام پاشان هەوڵدانی بۆ دابینکردنی بژێوی خۆی و ماندوبوونی لەو بوارەدا

کاتێك حەزرەتی موحەممەد تەمەنی گەیشتە دوانزە ساڵی، ئەبو طالیبی مامی بە مەبەستی بازرگانیکردن بە کاروانێك بەرەو وڵاتی شام بەڕێ کەوت و لەتەك خۆیدا حەزرەتی موحەممەدیشی برد، کاتێك کاروانەکە گەیشتە وڵاتی «بوصرا» بەلای راهیبێکی ئەو دەڤەرەدا تێپەڕین. کەناوی «بوحەیرا» بوو، راهیب هاتە لایان و رێزی لێنان. ئەم راهیبە شارەزای ئینجیل و ئاگاداری کاروباری ئایینی نەصرانی بوو، حەزرەتی موحەممەدی بینی و زۆری لێ وردبۆوە، بە سیفەتەکانی پێغەمبەری ناسی و پاشان رویکردە ئەبو طالیب و لێی پرسی ئەم کوڕە گەنجە چیتە! ئەبو طالیب وتی: کوڕمە. «ئەبو طالیب لەبەرئەوەی زۆری حەزرەتی موحەممەد خۆش دەویست دەیگوت: محمد کوڕمە».

بوحەیرا پێی گوت ئەمە کورت نیەو نابێ باوکی ئەم کوڕە ئێستا لەژیاندا بێ. ئەمجار ئەبو طالیب وتی برازامە، وتی ئەی باوکی چی لێ هات؟ وتی: کۆچی دوایی کرد هێشتا ئەم لەسکی دایکیدا بوو. بوحەیرا وتی راست دەکەی. ئامۆژگاریت دەکەم چی زووە بیگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆی، زۆر ئاگاداری بکە جولەکە زەفەری لێ نەهێنن، سوێندم بەخودا ئەگەر لەم دەڤەرو وڵاتە، چاویان پێ بکەوێ، زیانی پێ دەگەیەنن... بێگومان ئەم برازایەی تۆ کاری گەورەو گرنگ لەسەردەستی پەیدا دەبێ. ئیتر ئەبو طالیب زۆر بەپەلە هێنایەوە بۆ مەککە«١».

---

١ - باختصار عن سيرة ابن هشام: ١٨٠/١ ورواه الطبري في تأريخه: ٢٨٧/٢ ورواه البيهقي في سننه وأبو نعيم في الحلية. ويوجد بين هذه الروايات بعض الخلاف في التفصيل، وانفرد الترمذي بروايته مطولاً على نحو آخر، ولعل في سنده بعض اللين، فقد قال هو نفسه بعد

پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ کەوتە قۆناغی گەنجییەوەو دەستی کرد بەکاسبی کردن‌و هەوڵدان بۆ بژێوو رزقی رۆژانەی. سەرەتا بوو بەشوانی مەڕو بزن بۆ مەککەییەکان. پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە دەفەرموێ: {کنت ارعی الغنم علی قراریط لأهل مكة}«١».

پەروەردگار پێغەمبەری خۆی پاراست لەهەرشتێك گەنج‌ولاو حەزی لێ بکەن لە دیاردەی گاڵتەو کەپ‌و رابواردن. پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی دەربارەی خۆی دەفەرموێ: «بەلای هیچ کارێکی بێهودەو نەشیاودا نەچوم لەوشتانەی لەسەردەمی جاهلیدا باوبوون جگە لەدووجار، ئەو دووجارەش خودا پاراستمی‌و لەمپەری خستە نێوان من‌و ئەو ئیشە نەشیاوەدا. ئیتر هەرگیز نیازیشم نەکردووە بەلای کاری لەهو لەعب دا بگەڕێم. هەتا پەروەردگار پەیامی بۆناردوم‌و پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیم...!!

جارێکیان شەوبوو بە هاوەڵە شوانەکەمم گوت: کە لەپشت مەککەوە لەگەڵمدا مەڕی دەلەوەڕاند: ئەگەر ئاگات لە مەڕەکانم بێ ئەمشۆ دەچمە ناو شاری مەککەو تۆزی وەکوو گەنجەکان رادەبوێرم‌و کەمێ بای باڵی خۆم دەدەم، هاوەڵەکەم وتی باشە بڕۆ. منیش دابەزیمە خوار بۆناو شار

---

ان رواه: ـهذه حديث حسن غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه.. وفي سنده عبد الرحمن بن غزوان قال عنه في الميزان: له مناكير، ثم قال: أنكر ماله حديثه عن يونس بن أبي إسحاق، في سفر النبي (ص) وهو مراهق مع أبي طالب الى شام. وقال عنه ابن سيد الناس: في متنه نكارة ـراجع عيون الأثر: ٤٣/١.. والغريب أن الشيخ ناصر الدين الألباني قال عنه ـرغم هذاـ في تخريجه لأحاديث ـفقه السيرة للغزالي: إسناده صحيح... ولم ينقل من تعليق الترمذي عليه إلا قوله: هذا حديث حسن. ومن عادته أن يضعف ماهو أصح من هذا الحديث بكثير. هذا وأما القدر المشترك من القصة فثابت بطرق كثيرة لايلحقها وهن.

١ - رواه البخاري.

تاگەیشتمە لای یەکەم ماڵی مەککەو گوێم لە بلوێرو سازو سەمتوور بوو وتم ئەوە چییە؟ وتیان ئەوە زەماوەندی بووك گواستنەوەیە، منیش دانیشتم گوێ لەشایی و زەماوەند بگرم، خودا گوێچکەی هاخنیم و خەوم لێ کەوت، بەتینی هەتاوی چێشتەنگاو بەخەبەر هاتم، گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکەم و پرسیاری لێ کردم منیش راستی روداوم بۆ گێڕایەوە. شەوێکی تریش هەمان داخوازیم لە هاوەڵە شوانەکەم کردەوەو ئەویش رێگای دام هاتمەوە بۆناو شاری مەککە بۆ یاریکردن و رابواردن هەمان حاڵەتی جاری پێشووم بەسەرهاتەوە. ئیتر بڕای بڕای جارێکی تر خەیاڵی لەوجۆرە بکەم»[١].

## پەندو ئامۆژگاریی:

حەدیثی بوحەیرا دەربارەی تێبینییەکانی لەسەر پێغەمبەر کە حەدیثێکە زوربەی زانایانی سیرەو راویانی ژینامەی پێغەمبەر گێڕاویانەتەوە، هەروا تورموذی بەدورو درێژی لە حەدیثی ئەبو موسای ئەشعەری دەری هێناوەو کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە کە ئەهلی کیتاب «جولەکەو مەسیحی» پێشوەخت زانیارییان هەبوو دەربارەی ناردنی پێغەمبەر ﷺ و نیشانەکانی هاتنی ئەو زاتەیان دەناسین ئەوەش بەهۆی ئەو زانیاری و نیشانانەی لە تەورات و ئینجیلدا هاتبوو دەربارەی هەواڵی رەوانەکرانی پێغەمبەری ئاخر زەمان و نیشانەو ئەوصافەکانی.

بەڵگە لەسەر ئەم راستییانە زۆرو زەبەندەن. یەکێك لەو بەڵگانە ئەو واقیعەیە کە راویانی سیرەو زانایانی ژینامەی حەزرەتی موحەممەد ریوایەتیان کردووە: کە جولەکەکان شانازییان بەسەر هۆزی ئەوس و

---

١ - رواه ابن الاثیر و رواه الحاکم عن علی بن ابي طالب وقال عنه صحیح علی شرط

خەزرەجـــدا دەکـــرد «دەیـــانگوت» ئێمـــە پێمـــان راگەیەنـــدراوە کـــە رەوانەکردنی پێغەمبەری ئاخر زەمان نزیکبۆتەوە، هەر لەگەڵ رەوانەکرا ئێمە نیشانەکانی دەزانین و خێرا دەست پێشخەری دەکەین ئیمانی پێ دەهێـنین، لەگـەڵی دەکـەوین بـۆ شـەڕکردن دژی نـەیارەکانی، هاوکـاری دەبـین بـۆ کوشـتنی ئێـوە وەکـوو کوشـتنی گـەلی عـادو ئیرەم دەکەوینـە وێزەتـان. جـا کـە حـەزرەتی موحەممـەد کـرا بـە پێغەمبـەرو رەوانـەکرا، جولەکەکان لەو بەڵێنەی خۆیان پاشگەزبوونەوە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کە دەفەرموێ: {وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِنـدِ اللّـهِ مُـصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَـرُواْ فَلَمَّـا جَـاءهُم مَّـا عَرَفُـواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ – البقرة/٨٩}.

ئیمامی قورطبی و هی تریش ریوایەتیان کردووەو دەڵێن: کە ئایەتی {الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَـاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقـاً مِّـنْهُمْ لَيَكْتُمُـونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ – البقرة/١٤٦}، نازڵ بوو ئیمامی عومەر لە عەبدوڵلای کوڕی سەلامی پرسی «کەلەوەپێش ئەهلی کیتاب بوو موسوڵمان بوو بوو» ئەرێ عەبدوڵڵا تۆ موحەممەد ﷺ وەکوو کوڕی خۆت دەناسی؟ وتی بەڵێ باشتریشی دەناسم، خودای مەزن ئەمینداری نیگای خۆی لە ئاسمانەوە ناردە لای ئەمینی خۆی: کە حەزرەتی موحەممەدە لەسەر زەوی، بەهەمان ئەو رەوشت و نیشانانەی کە لەکتێبی ئێمەدا چەسپاوەو گومانم لێی نیەو باش باش دەیناسم، وەڵێ کوڕەکەم نازانم ئاخۆ دایکی ڕاست دەکا هی منە یان نا. بێگومان هۆی سەرەکی ئیمان هێنانی سەلمانی فارسی بەشوێندا چوونی هەواڵ و رەوشتی پێغەمبەر بوو لەناو ئینجیل و پرسیار لە راهیبەکان و زانایان و شارەزایانی بە تەورات و ئینجیل.

ئەمە چ دژایەتیەکی نیە لەگەڵ ئەوەدا: کە زۆر لە ئەهلی کیتاب ئینکاری ئەم راستییە دەکەن‌و ئەو ئینجیلانەی ئێستا لەبەر دەستدان هیچ ئاماژەیان بۆ ناوی حەزرەتی موحەممەدو پێغەمبەرایەتی تێدانیە، چونکە ئاشکرایەو دەزانرێ، ئینجیل‌و تەورات چ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا هاتووە، چەندجار دەستی گۆڕان‌و لێ زیادکردن‌و لێ کەمکردنیان گەیشتۆتێ. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزیدا دەفەرموێ: {وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ – البقرة/٧٨ – ٧٩}.

دەستکردنی پێغەمبەر بەشوانی مەڕو بزن بۆ مەککەییەکان بە مەبەستی پەیداکردنی رزق‌و رۆژی، سێ دەلالەت‌و مەغزای گرنگی لەخۆ گرتوون.

١. یەکەم زەوقی بەرزو هەستی ناسك کەخودا پێغەمبەری خۆی پێ رازاندبوونەوە. بێگومان ئەبو طالیبی مامی لەخۆی گرتبوو، بەوپەڕی لێبڕانەوە سەرپەرشتی دەکردو تا ئەوپەڕی توانا وەکوو باوکێکی دڵسۆز پێداویستی ژیانی بۆ دابین دەکرد، بەڵام حەزرەتی موحەممەد ئەوەندە نەفس بەرزبوو، هەر لەگەڵ هەستی کرد دەتوانێ کاسبی بکاو هەوڵی دابینکردنی رزق‌و رۆژی بدا، دەستی کرد بەکاسبی کردن بۆئەوەی ئەوەندەی بتوانێ ئەرکی ئەبو طالیبی مامی کەمێ سوك بکا، وێدەچێ ئەو دەستکەوتەی کە حەزرەتی موحەممەد بەدەستی هێناوە لە ئاکامی کارکردنی، ئەوەندە گرنگ نەبووبێ و بە نیسبەت ئەبو طالیبەوە داهاتێکی کەمی بووبێ، وەلێ بەهەموو مانا تەعبیرێکی ئەخلاقی بەرزبوو، نیشانەی شکۆمەندی‌و شەهامەت بوو، هەستکردن بوو بە بەرپرسیاریەتی‌و هەوڵدان بۆ چاکەدانەوەی مامی.

٢. دەلالەتو مەغزای دووەم پەیوەندی بەجۆری ئەو ژیانەوە هەیە کە پەروەردگار بۆ بەندە راستاڵو صاڵحەکانی خۆی هەڵی دەبژێرێ لەدونیادا. بێگومان بۆ دەسەڵاتی یەزدان زۆر ئاسان بۆوە: کە هۆکارەکانی گوزەرانی خۆش بۆ حەزرەتی موحەممەد برەخسێنێو پێویست نەکا ئەو لەو تەمەنە گەنجییەدا بۆ دابینکردنی بژێوی، یان کەمکردنەوەی ئەرکی گوزەران لەسەر ئەبو طالیبی مامی، ناچاری ئەوە ببێ شوانی بزنو مەڕ بکا.

وەلێ حیکمەتی خودا وادەخوازێ لەئێمەی ئادەمیزاد، کە بزانین: باشترو پاکترین ماڵو سامانی مرۆڤ ئەوەیە ئادەمیزاد بە عەرەقی ناوچەوانو رەنجی شانی بەدەستی بێنێو لەبەرامبەر خزمەتێکدا بێ کە پێشکەشی دەکا بە کۆمەڵگاو نەتەوەکەی. لەهەمان کاتدا خراپترین ماڵو سامان ئەو ماڵو سامانەیە کە دەست مرۆڤ دەکەوێ بەبێ ماندوبوونو رەنج کێشان بەبێ ئەوەی هیچ خزمەتێك لەبەرامبەردا پێشکەش بە کۆمەڵگا بکا.

٣. دەلالەتو مەغزای سێیەم ئەوەیە: کە هەرکەسێك خاوەنی بانگەوازییەك بێ، بانگەوازییەکەی هیچ نرخی نییەو چ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێ ئەگەر کاسبیو رزقو رۆژییەکەی قورسایی بخاتە سەر دەعوەتو بانگەوازییەکەی، یان بژیوو پێداویستی ژیانی لەخێرو صەدەقەی خەڵکی دابین بکرێ. کەوابوو خاوەنی بانگەوازی ئیسلامی «پێغەمبەری ئیسلام» شیاوترین مرۆڤی سەر رووی زەمینە: کەبۆ دابینکردنی بژێوی خۆی، پشت بەهەوڵو کۆششی شەخصی خۆی ببەستێو لەبەری رەنجی شانی خۆی پێداویستی ژیانی دابین بکا. یان داهاتێکی شەرەفمەندانەی هەبێو قنیاتی پێ بکا. نەك ببێتە بار بەسەر خەڵکەوەو لەرێی سوالو صەدەقەوە بژێوی دابین بکرێ. بەڵێ دەبێ

بانگخوازی ئیسلامی پێداویستی ژیان و بژێوی خۆی بەرەنجی شانی دەستەبەر بکا. بۆئەوەی کەس نەتوانێ منەتی بەسەردا بکا و خۆی بەخاوەن فەضل بزانێ بەسەریداو ئەمە وای لێ بکا راشکاونەبێ لە گوتنی قسەی حەق و رونکردنەوەی حەقیقەت. نەتوانێ بوێرانە روبەڕوی بەرامبەر بێتەوە، دەبێ لەحاڵێك دا بێ هیچ موبالات بە پلەو مەقامی بانگکراوو ئامۆژگاری کراو نەکا.

هەرچەندە ئاشکراو عەیانە ئەم مانایە ئەوکاتە بەسەر دڵی حەزرەتی موحەممەدا رانەبردوە، چونکە ئەکید ئەو دەمە نەیزانیوە کە ئەرکی بانگخوازی و پەیامبەری و «نبوة»ی دەخرێتە ئەستۆو لە داهاتوودا دەبێتە هەڵگرو گەیەنەری کەلامی خوداو پەیامی ئیسلام. وەڵێ ئەم مەنهەج و رێبازەی ژیان کە پەروەردگار بۆ پێغەمبەری خۆی هەڵی بژاردووە ئەو حیکمەتە بەرزەی لەخۆ گرتووە، ئەوە روون دەکاتەوە کە پەروەردگار ویستی وابووە حیکمەتی واداخواز بووە، کە هیچ شتێکی ژیانی پێغەمبەر پێش پێغەمبەرایەتی نەبێتە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم بانگەوازییەکەیدا، یان کاریگەری سەلبی لەسەر بانگەوازییەکەی هەبێ.

لەو سەرگوزشتەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە کە پەروەردگار لەتەمەنی منداڵی و گەنجیدا لەهەموو کارێکی لەهوو لەعب پاراستوویەتی و تووشی هیچ هەڵەیەك و کات بەفیڕۆدانێك نەبووە دوحەقیقەتمان بۆ روون دەکاتەوە کە هەریەکەیان لەوی تر گرنگترە.

١. حەقیقەتی یەکەم ئەوەیە حەزرەتی موحەممەد ﷺ هەموو خەصائیص و تایبەتمەندییەکی ئادەمیزادانەی تێدا بووە، هەموو حەز و ئارەزۆیەکی فیتری وەکوو هەرگەنجێکی تر لەخۆیدا هەستی پێ کردووە. بە سروشتی ئادەمیزادانە و تەمەنی لاوییەتی، حەزی لەسەمەرو رابواردن و لەهوو لەعب بووە، هەستی کردووە بەلەزەت و خۆشی کە لەو

یاریو شاییەی گەنجانی مەککە شەوانە ئەنجامیان دەدا. بە سروشتی ئادەمیزادانەی حەزی لێ بووەو پێی خۆش بووە وەکوو گەنجانی تر بۆی دەستەبەر ببێ.

٢. حەقیقەتی دووەم ئەوەیە: خودا پاراستوویەتیو نەیهێشتووە هیچ جۆرە مەظهەرێکی لادان لەو رێبازەی داخوازی ئەو دەعوەتو پەیامەیە کە خودا بۆی ئامادە دەکا، بەخۆیەوە ببینێ، یان بۆی دەستەبەر بێ. تەنانەت ئەو لەوکاتەشدا کە پێغەمبەر نیەو شەریعەتی بۆ نەهاتووەو نیگایەکی بۆ نەکراوە کە لەوجۆرە حەزو ئارەزۆیانە بیگێرێتەوە نەهێڵێ نەفسی ئیستیجابەی ئەو جۆرە حەزانە بکا، ئا لەوکاتەشدا خودا پارێزەرێکی تری نادیاری بۆ رەخساندووە، کە ببێتە لەمپەڕ لەنێوان ئەوو ئەو شتەی نەفسی ئارەزۆی دەکا: کەشیاوی کەسێك نین دەستی قودرەت ئامادەی دەکا بۆ تەواوکردنی ئەخلاقو رەوشتو چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلام لە داهاتوودا.

لە کۆبوونەوەی ئەم دوو حەقیقەتە گرنگە لەلای حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەڵگەیەکی ئاشکراو عەیان هەیە لەوەدا کە ئەم زاتە لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیدا چاودێری خودایی تایبەتی لەگەڵیدایەو رێنمونی دەکا، دەستێکی غەیبی لەپشتیەتیو ناهێڵێ لە رێبازی نەخشە بۆ دانراوی لابدا، بەبێ ئەوەی چ هۆکارو وەسیلەی پەروەردەو رێنمونی مادی لەگۆڕێ بن. یان بزانێ کێ ئاڕاستەی دەکا بۆ ئەو رێبازەو کێ لەلادان لێی دەیپارێزێ؟ لەکاتێکدا هەموو ئەو شتانەی لەدەوروبەرینی بە بنەماڵەو خێزانو نەتەوەو جیرانو هۆزیەوە بەم رێبازە ئاشنا نینو نازانن هەیە یان نا، چۆنەو چۆن نیەو بەتەواوی مانا لێی بێ ئاگانو بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە.

کەوابوو هیچ شك و گومان لەوەدا نییە کە ئەو جۆرە چاودێرییە خودایییە رێگایەکی باریکی لە روناکی بۆ حەزرەتی موحەممەد کردەوە، دەریای تاریکوستانی جاهیلی بڕی، ئەوەش گەورەترین نیشانەیێ بوو لەسەر مانای ئەو «نبوة»و پەیامەی خودا پێغەمبەری بۆ ئامادە دەکردو هێزی تێدا دەخولقاند بۆ گرتنە ئەستۆو هەڵگرتنی، هەروا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مانای «نبوة»و پێغەمبەرایەتی بنەمای ئەساسی و سەرەکی بووە لە پێکهاتەی کەسایەتی پێغەمبەرو هەموو ئیتجاهاتە دەرونی و فیکری و سلووکییەکانی ژیانی.

بێگومان شتێکی ئاسان بوو کە حەزرەتی موحەممەد بەجۆرێك لەدایکبوویایەو بهاتایە کۆڕی ژیانەوە: کە ئەو حەزو ئارەزووە غەریزییە ئادەمیزادییەی تێدا نەبێ و هیچ مەیلی لەزەت وەرگرتن لە شەهەوات و هەوەسیدا نەبێ و حەوێجەی بەوە نەبێ داوا لە هاوەڵە شوانەکەی بکا و مەڕەکانی بە ئەمانەت لا جێ بێڵێ و بۆخۆی بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزووە گەنجانەکەی دابەزێتە ناو ماڵەکانی مەککەو بگەڕێ بەدوا ئەو کۆمەڵە گەنجانەی کە هەندێ جار شەوانە شای و زەماوەندیان ساز دەکردو بای باڵی خۆیان دەداو لەهوو لەعبیان ئەنجام دەدا. بەڵێ ئاسان بوو کە حەزرەتی موحەممەد وا لەدایك بوویایە ئەم غەریزانەی تێدا نەبونایە، بەڵام ئەمە تەنها دەلالەتی ئەوەی تێدا دەبوو کە شذوذی نەفسانی لە پێکهاتەیدا بووەو بەس! ئەمەش دیاردەیەکە نموونەی لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکداو لەهەموو رۆژگارو سەردەمێکدا هەیە. ئیتر ئەوکاتە شتێك نەدەبوو کە نیشانەی ئەوە بێ چاودێری خودایی و دەستێکی نادیار حەزرەتی موحەممەد لادەدا لەهەموو ئەوشتانەی کەشیاوی ئەو نین. بەڵکوو دەگوترا: بۆخۆی لەناخیدا ئەو حەزو ئارەزوەی تێدا نیەو نەبووە. وەلێ حیکمەتی یەزدانی واداخواز بوو: کە ئەو جۆرە چاودێرییە خوداییەی بەسەر پێغەمبەرەوە بوو لەتەمەنی سەرەتای گەنجی و

لاویەتیدا بۆ خەڵکی دەربکەوێ: بۆئەوەی لەدوا رۆژدا هۆکاری ئیمان هێنانیان بە پەیامەکەی بۆ دەستەبەر بکاو عەوامیلی شكو گومان لەراستی پەیامەکەی لە فیکریان دوور بخاتەوە.

## بازرگانیکردنی حەزرەتی موحەممەد بەماڵی خاتو خەدیجەو پاشان مارەکردنی خەدیجە لەلایەن حەزرەتی موحەممەدەوە:

وەکوو ئیبنولئەثیرو ئیبنو هشام ریوایەتیان کردووە خاتو خەدیجە ئافرەتێکی بازرگانی سامانداری خاوەن پلەو پایەبوو، پیاوی بەکرێ دەگرتن بۆئەوەی بازرگانی بە ماڵو سامانەکەیەوە بکەن، بەشێوەی موضارەبەو قازانج بەشەریکی، ماڵو سامانی بۆبخەنە گەڕو ئاڵو وێری بۆ پێوە بکەن، جا کاتێك هەواڵی دەستپاکی و راستگۆیی حەزرەتی موحەممەدی پێگەیی ناردی بەدوی دا بۆئەوەی ماڵو سامانی پێویستی بۆدابین بکاو بە مەبەستی بازرگانیکردن بەو ماڵو سامانە بچێ بۆ شام، لە بەرامبەریشدا بەشی باشترو زیاتریشی بۆ دیاری بکا لە قازانج لەوەی لەوەپێش دەیدا بە بازرگانی تر.. بۆ یارمەتی و هاریکاریشی مەیسەرەی رەنجبەریشی لەگەڵدا بنێرێ، حەزرەتی موحەممەد ﷺ داواکەی خاتوو خەدیجەی قبوڵ کرد، لەگەڵ مەیسەرەدا بەرەو شام بەپارەو پولی تەواوو کاڵای پێویستەوە کەوتەڕێ. حەزرەتی موحەممەد لەم سەفەرەیدا سەرکەوتوو بوو قازانجی باشی بەدەست هێنا، زۆر لە بازرگانەکانی تر: کە لەوەپێش بەماڵی خەدیجە چوبوونە شام لێ وەشاوەتر بوو. قازانجی دوو چەندانەی هێنایەوەو بەوپەڕی ئەمانەتو دەستپاکی و رەوشت بەرزییەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا. مەیسەرە لەمیانەی ئەم سەفەرەدا زۆر تایبەتمەندی پێغەمبەرو رەوشتی بەرزو دەستپاکی و مەردایەتی لە حەزرەتی موحەممەد بەدی کردو پێیان سەرسام بوو،

بەدورو درێژی هەموو ئەو ئەخلاق و ئاکارو رەفتارانەی پێغەمبەری بۆ خەدیجە گێڕایەوە.

خاتوو خەدیجە شەهامەت و رەوشت بەرزی حەزرەتی موحەممەدی چووە دڵەوەو پێی سەرسام بوو، بەتایبەتی کە ئەو هەموو خێرو بەرەکەتەی لە بازرگانیەکەوە بۆ گەڕابووەوە. ئیتر پێشنیاری ئەوەی کرد: کە پێغەمبەر بیخوازێ، ببێتە هاوسەری، ئەم پێشنیارەشی لەڕێگەی دەستە خوشکێکیەوە بەناوی «نفیسە»ی کچی «مُنیّە» بە پێغەمبەر گەیاند، پێغەمبەر پێشنیارەکەی خاتو خەدیجەی پەسەند کردو لەو بارەوە پرسی بەمامەکانی کردو داوای لێ کردن بۆی بچنە خوازبێنی، ئەوانیش چوونە خوازبێنی کردن لەمامی خەدیجە: کەناوی عەمری کوڕی ئەسەد بوو، رەزامەندی هەموو لایەك وەرگیراو پێغەمبەر خەدیجەی مارەکردو گواستییەوە، ئەوکاتە حەزرەتی موحەممەد تەمەنی بیست و پێنج ساڵ و خاتو خەدیجە بێوەژنێکی تەمەن چل ساڵ بوو.

خەدیجە پێش ئەوەی شوو بە پێغەمبەر بکا دوو شوی تری کردبوو، یەکەمجاری شوی بە «عتیق»ی کوڕی «عائز التمیمی» کردبوو، کە ئەو کۆچی دوایی کردبوو ئەمجار شوی بە پیاوێکی تر کردبوو بە «أبو هالة»ی تەمیمی و ناسرابوو ناوی هیندی کوڕی زرارە بوو[(١)].

## پەندو ئامۆژگاریی:

بێگومان بازرگانی کردنی حەزرەتی موحەممەد بە ماڵ و سامانی خەدیجە، درێژەدان بوو بە هەوڵ تێکۆشانی بێ وچانی کە سەرەتا بە

---

١ - رواه ابن سيد الناس فى عيون الأثر وابن حجر في الاصابة وغيرهما وقد جرى الخلاف في الأول منهما والذى رجحه ابن سيد الناس و رواه قتادة وابن اسحاق ان الأول منهما هو عتيق بن عائذ والثانى هند بن زرارة.

شوانە وێڵەیی دەستی پێکردوو دەیەویست بەرەنجی شانو عارەقی ناوچاوان پێداویستی ژیانی دابین بکا... لەوەپێش بڕێکمان ئاماژە پێداو هەڵوێستەیەکمان لەسەر کرد.

لەبارەی فەزلو پلەو پایەی خاتو خەدیجەو کاریگەری لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ چی بڵێین هێشتا کەمە. بێگومان مەکانەتو کەسایەتی خاتو خەدیجە بەدرێژایی ژیانی لەلای پێغەمبەر ﷺ لە ئاستی هەرە بەرزو لوتکەی بڵنددا بوو... وەکوو لە حەدیثی صەحیحی هەردوو پیری فەرموودە بوخاریو موسلیمدا چەسپاوە: خەدیجە ڕێزدارترینو باشترین ئافرەتی ئافرەتانی رۆژگاری خۆی بووە.

بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە: کە ئیمامی عەلی لە پێغەمبەری ژنەوتووە فەرمویەتی: {خير نسائها مريم بنت عمران وخير نسائها خديجة بنت خويلد}«١». باشترین ئافرەت بەنیسبەت ئاسمانەوە یان بەنیسبەت رۆژگاری دێرینەوە حەزرەتی مەریەمی کچی عیمرانە، باشترین ئافرەت بە نیسبەت زەوییەوە یان بەنیسبەت ئومەتی ئیسلامەوە خاتو خەدیجەی کچی خویلیدە.

دوبارە بوخاریو موسلیم لە عائیشەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن: کە فەرموویەتی: {ما غِرت على نساء النبيّ {صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ} إلاّ على خديجة، واني لم أدركها، قالت: وكان رسول الله {صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ} اذا ذبح الشاة فيقول أرسلوا بها الى أصدقاء خديجة قالت فأغضبته يوماً فقلت: خديجة! فقال رسول الله {صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ} انى قد رزقت حُبّها}«٢».

---

١ - الضمير في نسائها عائد — كما تدل رواية مسلم — الى السماء بالنسبة لمريم والى الأرض بالنسبة لخديجة. وقال الطبي: الضمير الأول راجع الى الأمة التى كانت فيها مريم، والثانى الى هذه الأمة وانظر فتح البارى ٩١/٧.

٢ - متفق عليه.

هەرگیز من حاڵەتی غیرەم دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر لەلا پەیدا نەبووە، مەگەر لەسەر خەدیجە، هەرچەندە من ئەم دیوەو پێی نەگەیشتوم. پێغەمبەر کە مەڕێکی سەر دەبڕی دەیفەرموو: بەشی دەستە خوشکەکانی خەدیجە بنێرن. ئەمجار وتی: ڕۆژێك پێغەمبەرم توڕە کرد، پێم گوت: خەدیجە خەدیجەی چیتە؟ ئەوە چیتە ئەوەندە باسی دەکەی؟ پێغەمبەر فەرمووی خۆشەویستی خەدیجە لەدڵم چەقیوە، بەدەست خۆم نیە خۆشەویستی ئەو لەخوداوە لەدڵما چەسپیوە.

ئەحمەدو طەبەرانی لەڕێگەی مەسروقەوە لە عائیشەوە ریوایەت دەکەن، فەرموویەتی: پێغەمبەر هەردەم ناوی خەدیجەی لەسەر زوبان بوو، نەمدیوە لەماڵ بچێتە دەرەوە ئیللا ناوی خەدیجەی لەسەردەم بوو مەدح و ثەنای دەکرد. ئەوەبوو ڕۆژێك لەڕۆژان غیرە گرتمی و گوتم ئەوە چیە پیرەژنێکت خێزان بووە خودا لەجیاتی ئەو خێزانی باشتری پێداوی: ئیتر پێغەمبەر رقی هەڵسا و توڕە بوو، پاشان فەرمووی نەبەخوا خودا چاکتری نەداومێ، هەرگیز هاوسەری باشترم لە خەدیجە نەبووە، ئیمانی پێ هێنام، لەکاتێکدا خەڵکی بڕوایان پێ نەکردم، ئەو تەصدیقی کردم، بەماڵ و سامانی خۆی یارمەتیدام لەکاتێکدا خەڵکی لەهەموو شتێکی خۆیان بێ بەشیان دەکردم. سەرەڕای ئەوەیش منداڵم لێی هەبوو. جگە لە ئیبراهیم هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە خەدیجەن.

چیرۆکی هاوسەرگیری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەدیجە، بێگومان یەکەم شتێ کە مرۆڤ لەم هاوسەرگیرییە هەستی پێ دەکا ئەوەیە: کە پێغەمبەر ﷺ هیچ گرنگی نەداوە بەلایەنی لەزەتی جەسەدی و پێداویستیەکانی. چونکە ئەگەر پێغەمبەر ئەو لایەنەی بەرچاو بگرتایە، وەکوو هاوەڵە گەنجەکانی بیروانیایە ژنهێنان و هاوسەرگیری، هەوڵی دەدا ئافرەتێك مارەبکا لەتەمەنی خۆی پچوکتربێ یان بەلانی کەمەوە لەخۆی بەتەمەنتر نەبێ.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەمارەکردنی خاتو خەدیجەدا پاڵنەرو دافیعی، خانەدانیو وەجاخزادەییو رەنگ ژنیو سەلاری خەدیجە خۆی بووە، لەناو عەشیرەتو بنەماڵەکەیدا بەژنێکی داوێنپاکو رێزدار ناوبانگی دەرکردبوو، تەنانەت لەسەردەمی پێش ئیسلام دا نازناوی «العفيفة الطاهرة»ی پێدرابوو.

بێگومان وێرای ئەوەی خاتو خەدیجە لە تەمەندا پانزە ساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بوو، هاوسەرگیری نێوانیان بەردەوام بوو، هەتا خاتو خەدیجە لەتەمەنی شەصتو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. پێغەمبەریش تەمەنی گەیشتبووە پەنجا ساڵ. بەبێ ئەوەی حەزرەتی موحەممەد لەم ماوەدا بیر لەوەبکاتەوە ئافرەتێکی تر مارەبکا! ئاشکراشە تەمەنی نێوان بیستو پێنج ساڵیو پەنجا ساڵی تەمەنێکە حەزی پیاو تێیدا بەهێزە بۆ ئافرەتو مەیلی فرەژنی.

وەلێ حەزرەتی موحەممەد ئەم تەمەنە هەستیارەی بەسەر برد بەبێ ئەوەی بیر لەوەبکاتەوە ئافرەتێکی تر بەسەر خەدیجە بێنێ، خۆ ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ژنی تر بهێنێ، یان هیچ نەبێ ئەمەتە بۆ خۆی زۆربکا. خۆ ئەگەر ئافرەتی مارە بکردایە، یان ئەمەتەی بکڕینایە لەدابو نەریتی کۆمەڵگا دەرنەدەچوو، هیچ کەس سەرزەنشتی نەدەکرد. ئەوەشمان لەبیرنەچێ: کە خەدیجە بێوەژن بووە، جوداوازیی نێوان تەمەنیان پانزە ساڵ بووە.

ئەمەش قوڕ بەدەمی هەموو ئەوانەدا دەدا کە لەناخەوە رقیان لە ئیسلامو هێزو دەسەڵاتیەتی، تۆپەوانە دەخاتە دەمی هەموو ئەو رۆژهەڵاتناسو موبەشیرو ئالقە لە گوێو قوتابیە خۆ فرۆشو دڵسۆزەکانیان، ئەوانەی نازانن چۆن دەزەڕنو چۆن داخی دڵی خۆیان

بڕێژن. بێگومان ئەوانە بەخەیاڵی خۆیان لە پرۆسەی ژنهێنانی حەزرەتی موحەممەددا، سەنگەرێکی باشیان دەسکەوتووە بۆئەوەی لێیەوە تیری ژەهراوی ئاڕاستەی ئیسلام‌و رابەرەکەی بکەن. پێیان وابوو دەتوانن لەم روانگەوە سومعەو کەسایەتی پێغەمبەر چەواشە بکەن‌و لەکەداری بکەن، وایان بە خەیاڵدا هات ئەوان دەتوانن پێغەمبەر وابخەنە بەرچاوی خەڵك: کە پیاوێکی هەوەسبازو شەهوانی بووە، ژیانی خێزانی‌و بەرنامەی گشتی تابینە قاقای نقومی لەزەت‌و شەهوەتبازی بووە!! بەڵام سوپاس بۆ خودا سەرکەوتوو نەبوون‌و نەیانتوانی ئامانجی گڵاوی خۆیان بپێکن. کوردی گوتەنی بەری خۆر بە بێژینگ نەگیرا، دەریا بەدەم تێخستنی سەگ گڵاو نابێ.

شتێکی ئاشکراو نمایانە کە موبەشیرە مەسیحیەکان‌و زوربەی زۆری خۆرهەڵاتناسەکان دوژمنی بابەکوشتەو سەرسەختی پەیامی ئیسلام‌و کەسایەتی پێغەمبەرەکەینی... وەکوو دەگوترێ: «دوژمنی موحتەریفی ئیسلامن». هەموو هەوڵێکیان بۆ چەواشەکاری‌و لەکەدارکردنی ئاینی ئیسلام‌و سیرەی پێغەمبەرەو نەکەم‌و نەزۆر مەبەستیان دەرخستنی راستی‌و گەشەکردنی زانست نیە. ئەوانەیش کە بەئەوان هەڵخەڵەتاون‌و شوێن ئەوان کەوتوون، زۆربەیان دژایەتی ئیسلام دەکەن لەڕوانگەی بیستن‌و لاسایی کردنەوەی کوێرانە، هیچ هەوڵی ئەوە نادەن زیهنی خۆیان بکەنەوە بۆ لێکۆڵینەوەو تێگەیشتن، هیوایەت‌و ئارەزوی ئەوان لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانەیە، دوژمنایەتییان بۆ ئیسلام وەکوو جۆرە ئارم‌و شارەیەك وایە: کە هەندێ کەس بەشان‌و بەرۆکی خۆیدا دەکا تەنها بۆئەوەی خەڵکی بزانن، ئەم کابرایە سەر بەلایەنێکەو بەس. ئاشکراشە ئارم‌و شارە رەمزە. کەوابوو دژایەتی ئەم جۆرە کەسانە بۆ ئیسلام جگە لەو رەمزەی کە بەهۆیەوە لایەنگیری خۆیان بۆ دوژمنی

ئیسلام دەردەبڕن هیچی ترنیە. ئەوانە بەهیچ کلوجێك لەمێژووی ئیسلام حسێب ناکرێن، ئەوانە وەلائو لایەنگیرییان بۆ ئەو فیکرە ئیستیعمارییەیە کە بانگخوازانی وەکوو موبەشیرە مەسیحیەکانو خۆرهەڵاتناسەکان بانگەشەی بۆدەکەن. ئەوە ئیختیارو هەڵبژاردنی خۆیانە بەبێ ئەوەی لێکۆڵینەوەیان تێدا کردبێ و هەوڵی تێگەیشتنو گەیشتن بە حەقیقەتیان دابێ!! بەڵێ دژایەتیکردنی ئەم کلکە ئیستیعمارییانە تەنها ئارەو شارەیە کە خۆیانی پێ لەناو نەتەوەو قەومی خۆیاندا دەناسێننو کلکایەتیو جاشایەتی خۆیانی پێ دەردەبڕن، کارەکەیان کارێکی فیکریو زانستی نیە، مەبەستیان لێکۆڵینەوەو زانست نیە.

ئەگینا مەوضوعی ژنهێنانی پێغەمبەر ﷺ ئاسانترینو ئاشکراترین باسێکە موسوڵمانی بەرچاو روونو تێگەیشتو، شارەزا لە ئایینی خۆیدا، ئاگادار بەژینامەو سیرەی پێغەمبەر، بیکاتە بەڵگەو بە پێچەوانەی بیرو بۆچونی دوژمنانی ئیسلام ئاراستەی بکا.

ئەوان دەیانەوێ وێنەی پیاوێکی شەهوانی هەوەسبازو نقوم لە لەزەتو رابواردندا بە پێغەمبەرەوە بلکێنن! وەکوو کابرایەکی شەهوەتباز وێنای بکەن، لە کاتێکدا مەوضوعی هاوسەرگیرییەکەی خۆی لەخۆی دا بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی ئەو حاڵەتەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن! پیاوی شەهوانیو هەوەسباز لە بیئەو کۆمەڵگایەکی وەکوو کۆمەڵگای عەرەبی پێش ئیسلامدا، ناتوانێ بە پاك داوێنیو عیفەتی نەفسەوە ژیان بەسەر بەرێ بەبێ ئەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەریی شەپۆلی فەسادو بێ رەوشتی: کە لەدەورووبەریدا تێکیانەوە دەهاویشتو جیهانی تەنی بوو. پیاوی شەهوانیو هەوەسباز چۆن رازی دەبێ لەتەمەنی بیستو پێنجساڵیدا، ئافرەتێك مارەبکا بێوەژن

بێ و نزیکەی دوو تەمەنی ئەوی هەبێ، ئەمجار لەگەڵی هەڵبکاو ژیانی لەگەڵ بەسەر بەرێ بەبێ ئەوەی چاوی بۆ دەوروبەر گێڕابێ و هەوڵی شتی تری دابێ، کە بێگومان زۆر ڕێگاو هەلی بۆ دەڕەخسان ئەگەر بیویستایە، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەم بێوەژنە بەتەمەنەدا تەمەنی گەنجی و تەمەنی کەمالی پیاوەتی خۆی بەسەر بردو کەوتە قۆناغی پیرییەوە. ئەمما دوای ئەو تەمەنەو دوای مردنی خاتو خەدیجە: کە خاتو عائیشەی مارە کردووە، یان ژنی تری هێناوە، ئەوە هەریەکێ لەو ژنانەی سەرگوزشتەی خۆی هەیەو هەر هاوسەرگیرییەکی بەستویەتی لەدوای تەمەنی پەنجا ساڵی و لەدونیا دەرچوونی خاتو خەدیجەی خێزانی، حیکمەت و هۆکاری خۆی هەیەو دەبنە نیشانەی گەورەیی حەزرەتی موحەممەدو شکۆمەندی و ڕەوشت بەرزی ئەو زاتەو پتەوبوونی بڕوای موسوڵمان و زیادبوونی ئیمانی.

حیکمەت و هۆکاری فرە ژنی پێغەمبەر ﷺ لەدوای تەمەنی پەنجا ساڵی هەرشتێك بێ، مومکین نیە تەنها لە چوارچێوەی جێ بەجێکردنی ئارەزۆی جینسیدا قەتیسی بکەین و رای بنوێنین. چونکە ئەگەر مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە فرەژنی جێ بەجێکردنی ئارەزۆی جینسی بووبێ، دەبوایە لەکاتی گەنجیەتی و هەرەتی پیاوەتیدا ئیستیجابەی ئەو ڕەغبەتەی ببوویایە.

بەتایبەتی کە ئەو لەتەمەنی گەنجی و هەرەتی پیاوەتیدا فکرو بیری مەشغووڵی بانگەوازی دەعوەی ئیسلامی نەبووە، کارێکی وای نەبووە لە پێویستیاتی فیتری و سروشتی گەنجانەی بێ ئاگای بکاو وای لێ بکا نەیپرژێتە سەر بیرکردنەوەو هەوڵدان بۆ دەستەبەر بوونی.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ وەکوو هەندێ لێکۆڵەرەوە درێژە بە بەرگری و پاساو هێنانەوە بۆ فرەژنی پێغەمبەر بدەین، چونکە پێمان وایە ئەمە

موشـكيلەو باسـێك نيـە پێويـستی بـە لێكۆڵينـەوە هـەبێ، هەرچـەندە دوژمنـانی ئيسلام پێيـان وابـێ كـە ئەمـە گـرێ كوێركەيـەو پێويـستی بـە لێكۆڵينەوە هەيە.

دەبێ ئەوە بزانين كـە زۆر شـتی حـەق هەيـە لـە حـەقائيقی ئيسلامی، دوژمنـان تـەماعی پوچـەڵكردنەوەيان نيـە چونكە لێيـان مەعلوومـە بۆيـان ناچێتە سەر، بەڵام كە لێی دەدوێن بۆئەوەيە موسوڵمانان كێش بكـەن بـۆ موناقەشەو بەرگريكردنو مەشغول بوون پێوەی.

## هاوبەشيكردنی پێغەمبەر لە دروستكردنەوەی كەعبەدا:

كەعبـەی پـيرۆز يەكـەم خانوێكـە لەسـەر زەوی لەسـەر نـاوی خـودا بنيـات نـراوە بـۆ خواپەرسـتی تێيـداو خـودا بەيەكناسـين. حـەزرەتی ئيبراهيم «باوكی پێغەمبـەران» بنيـاتی نـاوە. ئـەم زاتـە دوای ئـەو كێشەو هەرايەی بەرەوڕووی بۆوە لەشەڕ لەگەڵ بتو شـكاندنی بتـەكان بەدەسـتی خـۆیو وازهێنـان لەزێـدو نيـشتمانی خـۆی، بـە فـەرمانو نيگـای خـودا لـەدۆڵی مەككـە كابـەی بنيـات نـا. قورئـان دەفـەرموێ: {وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ – البقرة/١٢٧}.

يادی ئەو ڕۆژگارە بكـەرەوە: كـە حـەزرەتی ئيبراهيم بناغـەی ديـواری كابـەی بـەرز دەكـردەوە، حـەزرەتی ئيسماعيلی كوڕيشی يارمـەتی دەدا، لـەخودا دەپاڕانـەوە دەيـانگوت خودايـە ئـەم كۆشـشو ماندوبونـەمان لێ وەربگرە، بێگومان زاتی پاكت شنەواو ئاگاداری هەموو شتێكە.

بێگومـان كابـەی پـيرۆز لەدوائـەوەی حـەزرەتی ئيبراهيم بنيـاتی نـاوە چەند جارێك بەهۆی لافاوو شتی واوە توشی روخانو داڕمان هـاتووە...

یەکێك لەوجارانە ئەوەبوو پێش پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بەچەند ساڵێکی کەم، لافاوێکی گەورەو بەهێز شاری مەککەی وێران کرد. دیوارەکانی کەعبەی بن هەڵۆڵ کردن و درزی پێ بردن، قورەیش ناچاربوون دیوارەکانی بڕوخێنن و سەرلەنوێ دروستی بکەنەوە، ئەمەش لەڕوانگەی پێزانین و سوربونیان لەسەر ڕێزداریی کابەو قودسیەت و پیرۆزی و نەمری. بێگومان ڕێزگرتن و بەگەورە زانین و پیرۆزی کابە پاشماوەی بەها پیرۆزەکانی شەریعەت و ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم بوو لای عەرەبەکانی سەردەمی پێش ئیسلام مابوەوە هەرچەندە هەندێ گۆڕانکاری و شێواوی تێکەوتبوو. بێگومان حەزرەتی موحەممەد پێش پێغەمبەرایەتی هاوبەشی دروستکردنەوەی کابەی کرد، بەشان بەردی بۆ دەگواستەوە، ئەو کاتە تەمەنی پیرۆزی سی و پێنج ساڵ بوو.

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا فەرموودەیەك لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: کاتێ کەعبە سەرلەنوێ نۆژەن دەکرایەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەباسی مامیدا بەردیان دەگواستەوە بۆ دیوارەکانی، عەبباس بە پێغەمبەری گوت: ئیزارەکەت «پەشتەماڵەکەت» بخەرە سەر شان و لاملت.......

بێگومان حەزرەتی موحەممەد کاریگەری بەرچاوی هەبوو لە حەلکردنی ئەو تەنگژەی کەوتە نێوان هۆزەکانی قورەیشەوە، تەنگژەکە لەوەدابوو ئاخۆ کامیان شایانی ئەوەیە: کە بەردە ڕەشەکە بخاتەوە شوێنی خۆی. ئەوەبوو هەموویان ملکەچی پێشنیارەکەی پێغەمبەر بوون دەربارەی تەنگژەکە، ئەمەش لەڕوانگەی ئەوەوە بوو کە ڕێزو خۆشەویستی لای هەموو هۆزو بنەماڵەکان هەبوو، هەموویان بە ئەمین و دەستپاك و ڕادروستیان دەزانی.

**پەندو ئامۆژگاری:**

ئێمە لەم مەقطەعەی سیرەدا چوار تێبینیمان هەیە:

یەکەمیان: گرنگی کەعبەو ئەو رێزو قودسییەت و پیرۆزییەی خودا لەسەر زەوی بۆ ئەوماڵەی داناوە. هەرئەو بەڵگەیە بەسە بۆ چەسپاندنی گەورەیی و پیرۆزی کەعبە، کە ئەو کەسەی یەکەمجار بنیاتی ناوە حەزرەتی ئیبراهیمەو بە فەرمانی خودا دروستی کردووە بۆئەوەی ببێتە یەکەم خانووی خودا پەرستی و یەکتا پەرستی و شوێنی ئارام تێداگرتن و ئەمن و ئەمان.

وەلێ ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە کەعبە خۆی کاریگەری هەبێ لەسەر ئەوانەی تەوافی دەکەن و بەدەوریدا سوڕ دەخۆن و ئەوانەی تێیدا دەمێننەوەو خودا پەرستی تێدا دەکەن. کەعبە «بە بەردە رەشەکەشیەوە» وێڕای ئەو قودسییەت و پیرۆزییەی لاخودا هەیەتی، دارو دیوارێکی بێ گیانەو نە قازانج دەگەیەنێ نە زیان. وەلێ پەروەردگار کاتێك حەزرەتی ئیبراهیمی کردە پێغەمبەرو بتەکانی شکاندن و خانوو تاقەو رەفەی روخاندن و دیاردەی بتپەرستی سڕییەوەو دژی وەستا، حیکمەتی خودا واداخواز بوو، کە لەسەر زەوی بینایەك رابەستێ، ببێتە شیعارو نیشانەی یەکتا پەرستی و خودا پەرستی. ئیتر بە درێژایی رۆژگار نیشانەی مانای راست و دروست بێ بۆ ئایینی پەسەندو پەرستشکردنی پەروەردگارو بەتاڵی و پوچی هاوەڵ دانان بۆ خوداو بتپەرستی.

بێگومان ئادەمیزاد رۆژگارێکی دورو درێژی بەسەر برد، سەرگەرمی بتپەرستی و داتاشینی بەردو دارو کڕنووش بۆ بردنیان بوو، سەرگەرمی ملکەچ کردن بوو بۆ دیکتاتۆرو طەواغیت و دروستکردنی پەرستگا بۆیان.

بێگومان ئێستا کاتی ئەوە هاتووە مرۆڤایەتی بەخۆیدا بچێتەوە، هەست بەوەبکا ئەو داروبەرد پەرستییە بەتاڵو پوچە، کاتی ئەوە هاتووە مرۆڤایەتی لەجیاتی بەردو دار پەرستن، ئەم رەمزە تازەیە کە کەعبەیە بیکاتە رۆگەو پەرستگا، ئەم پەرستگایەی بنیات نراوە بۆ خودا پەرستی بۆ یەکتا پەرستی. ئادەمیزاد بچێتە ناوی بەسەر بەرزیو شکۆمەندی مل بۆ هیچ شتێك کەچ نەکا جگە لەخودای باڵا دەست. تەنها گەردنکەچی بۆ بەدیهێنەری بونەوەر دەربېڕێو بەس!

جا کە پێویست بێ بۆ یەکتا پەرستانو ئیسلام خوازان شتێك پێکیانەوە ببەستێو کۆیان بکاتەوەو یەکتری تێدا بناسنو ئارامی تێدابگرنو روی تێبکەن، وێڕای جوداوازیی وڵاتو نژادو دورییان لەیەکتریو جوداوازیی زمانو شێوازو رەنگیان، دەڵێین: کەشتێکی ئاوها بۆ مرۆڤایەتی پێویست بێ، ئەوە هیچ شتێك بۆ ئەو مەبەستە لەکابە شیاوترنیە کە خودا کردویەتی بەرەمزی یەکتا پەرستیو خودا پەرستیو رەتدانەوەی بەتاڵخوازانو بتپەرستان. کەوابوو ماڵی بەیت، کەعبەی پیرۆز، رەمزی یەکێتییە، شوێنی روتێکردنو ئارام تێدا گرتنە، شوێنی کۆبوونەوەو یەکتر تێدا ناسینو بە یەکگەییشتنە لەسەر حەقو راستییەك کە ئەوکابەیە بۆیە بنیات نراوە تا تەعبیر لەو حەقە بکاتەوە. ئەوە ئارمو شیعارێکە، یەکیەتی موسوڵمانانی سەر زەوی لەهەر کونو قوژبنێك بن تێیدا رەنگ دەداتەوە. تەعبیر لەخودا پەرستیو یەکتا پەرستی دەکا، نیشانەی تاكو تەنهایی پەروەردگارە، چەندێك خودا درۆزنەو بتو صەنەم ریزبکرێنو شتی ناحەق بکرێن بەخودا، یان خۆیان بەخودا بزانن ئەو حەقیقەتە ناشاردرێتەوەو ئەو راستییە کپ نابێ!. هەر ئەوەشە مانای ئایەتی {وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى – البقرة/١٢٥} ئەوە ئەو مانایەیە کە ئەوکەسەی تەوافی کەعبە دەکا لەناخەوە هەستی پێ دەکا، ئەمەیش دوا

ئەوەی دڵو دەروونی پڕدەبێ لەمانای بەندایەتی بۆ خوداو هەوڵدانو نیازکردن بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا لەم ڕوەوە کە ئەم بەندەی خوایەو موکەلەفو فەرمان پێکراوە بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی لەسەر شانیەتی. ئالێرەوە پیرۆزی کەعبەو گەورەیی و مەقامی لای خودا دەردەکەوێو پێویستبوونی حەجکردنی و سوڕانەوە بەدەوریدا خۆی دەنوێنێ.

**دووەم تێبینی:** رونکردنەوەی گرنگترین ئەو روداوانەی بەسەر کەعبەدا هاتووە لە روخانو ئاوەدان کردنەوەدا. کەعبەی پیرۆز لەهەموو مێژووی کەوناراپدا، بە یەقین چوارجار بیناکراوەتەوە — راجیایی و شكو گومان بۆ زیاتر لەو چوارجارە لە ئارادایە.

**جاری یەکەم:** ئەوەیە کە حەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی ئیسماعیل بە فەرمانی خودا بنیاتیان ناوە. ئەمە بە دەقی قورئانو بە صەحیحی سوننەت چەسپاوە، قورئان دەفەرموێ: {وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ — البقرة/١٢٧}.

فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر لەم بارەوە زۆرو زەبەندەن یەکێك لەو فەرموودانە ئەوەیە: کە ئیمامی بوخاری بەڕشتەی خۆی لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردووەو فەرموودەکە درێژە، تێیدا هاتووە { ثُمَّ قَالَ: أى إِبْرَاهِيمُ – يَا إِسْمَاعِيلُ ، إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِى بِأَمْرٍ . قَالَ فَاصْنَعْ مَا أَمَرَكَ رَبُّكَ . قَالَ وَتُعِينُنِى قَالَ وَأُعِينُكَ . قَالَ فَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِى أَنْ أَبْنِىَ هَا هُنَا بَيْتًا . وَأَشَارَ إِلَى أَكَمَةٍ مُرْتَفِعَةٍ عَلَى مَا حَوْلَهَا . قَالَ فَعِنْدَ ذَلِكَ رَفَعَا الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ ، فَجَعَلَ إِسْمَاعِيلُ يَأْتِى بِالْحِجَارَةِ ، وَإِبْرَاهِيمُ يَبْنِى}.«١»

ئیمامی زەرکەشی لە تاریخی مەککە دا نووسینی ئەزرەقی دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەزرەتی ئیبراهیم دیواری کابەی حەوت زیراع

١ - صحیح البخاری، کتاب احادیث الانبیاء، باب قوله تعالی ،واتخذ الله ابراهیم خلیلا..

بەرزکردەوە، درێژی دیوارەکەی سی زیراع و پانیەکەی بیست و دوو زیراع ئەنجامدا. هەڵاشی بۆنەکرد. سوهەیلی دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەرزی دیوارەکەی نۆ زیراع بووە«١» وێدەچێ ئەم ریوایەتە لە راستی و واقیعەوە لە ریوایەتی ئەزرەقییەوە نزیکتر بێ.

جاری دووەم: ئەوجارەیە کەپێش ئیسلام قورەیشییەکان بنیاتیان نایەوەو پێغەمبەر ﷺ بەشداری تێداکرد، وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کرد. ئەمجارەیان هەژدە زیراع بەرزیان کردەوە، لەباری درێژی شەش زیراع و شتێکیان لێ کەم کردەوە لەلای حیجرەوە«٢».

لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ وەکوو عائیشە لێوەی دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: { يَا عَائِشَةُ لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ لأَمَرْتُ بِالْبَيْتِ فَهُدِمَ ، فَأَدْخَلْتُ فِيهِ مَا أُخرِجَ مِنْهُ وَأَلْزَقْتُهُ بِالأَرْضِ ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ بَابًا شَرْقِيًّا وَبَابًا غَرْبِيًّا ، فَبَلَغْتُ بِهِ أَسَاسَ إِبْرَاهِيمَ }.

جاری سێیەم: لەزەمانی یەزیدی کوڕی معاویەدا، کە سوپای شام بەفەرمانی یەزید هێرشیان بردە سەر مەککەو کەعبە سوتا.

پوختەی روداوەکە ئەوەیە سوپای هێرشبەری شام لەناو مەککەدا گەمارۆی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیریاندا. سوپای گەمارۆدەر بە سەرۆکایەتی «الحصين بن نمير السكوني» بوو، لەکۆتایی ساڵی سی و شەشی کۆچی، بە فەرمانی یەزید بە مەنجەنیق و قۆچەقانی ماڵی کەعبەیان ئاگر باران کرد، لەئاکامدا دیوارەکانی روخان و ئاگری تێ بەربوو سوتا. ئیتر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر کەعبەی بەو شێوە

---

١ - بڕوانە کتێبی اعلام الساجد للزركشي/٤٦.

٢ - بوخاری لە کیتابی حەجدا لەبابی .فضل مكة.دا ئەمەی ریوایەت کردووە. هەروا بڕوانە .اعلام الساجد للزركشي.، ص٤٦.

روخاوییە هێنشتەوە تا وەرزی حەج و کۆبونەوەی موسوڵمانان، ئەوکاتە مەشورەتی پێ کردن و فەرمووی خەڵکینە! رای خۆتانم بۆ دەربڕن دەربارەی کەعبە، کەوا روخاوەو سوتاوە، ئایا لە بێخ لێکی هەڵوەشێنم و سەرلەنوێ بنیاتی بنێمەوە، یا پینەو پەڕۆی بکەم و کەلەبەرو روخاوەکانی چاك بکەمەوە؟ ئیبنو عەبباس فەرمووی: من وای بەباش دەزانم کون و کەلەبەرەکانی چاك بکرێتەوە دەست نەبەی بۆ خانوێك خەڵکی لەسەر موسوڵمان بووە، دیوارو بەردێك هەڵوەشێنی خەڵك لەسەری موسوڵمان بوون. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ئەم رایەی پێ پەسەند نەبوو، وتی: ئەگەر یەکێ لەئێوە ماڵەکەی بسوتێ رازی نابێ و وازناهێنێ تا سەرلەنوێ نۆژەنی نەکاتەوە. دەی چۆن بۆ ماڵی خودای خۆتان هەڵوێستی وانانوێنن؟ ئەمن سێ‌جار نوێژی «الاستخارە» دەکەم و داوا لەخودای خۆم دەکەم رێگای پەسەندم بخاتە دڵەوە، چی خستە دڵمەوە ئەوە جێبەجێ دەکەم.

پاش سێ رۆژ دەستی کرد بەهەڵوەشاندنی، تا دیوارەکانی لەگەڵ زەوی تەخت کرد. ئەمجار کۆڵەکەی بە دەوری کەعبەدا چەقاندن و پەردەی بەسەردا دان، پاشان دەستیان کرد بە بنیاتنانەوەی دیوارەکانی، ئەو شەش زیراعەی لێی کەم کرابوەوە زیادی کردەوە، بەرزییەکەشی گەیاندە «دە» زیراع. دوو دەرگای بۆ کردن یەکیان بۆ چوونە ژورەوەو ئەویتریان بۆ چوونە دەرەوە. ئەوەی کە جورئەتی دایە عەبدوڵڵا بۆ لێ زیادکردنەکە حەدیثەکەی عائیشە بوو کە لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کرد.»[١]

---

١ -بڕوانە: عیون الأثر لابن سید الناس ٥٣/١ واعلام الساجد للزرکشی/٤٦ والحدیث رواه مسلم ٦٩/٢ باب نقض الکعبة وبنائها. وفي روایة للطبری وغیره انها انما احترقت بشرارة انطلقت الیها من نار کانت توقد حولها. وانظر تاریخ الطبری/٤٩٨.

جاری چوارەم: پاش شەهیدبوونی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر کابە جارێکی تر بنیات نراوەتەوە. ئیمامی موسلیم بەڕشتەی خۆی لە عەطائەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر شەهیدکرا. حەججاج نامەیەکی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان نووسی، تێیدا هەواڵی کوشتنی عەبدوڵلای پێ رادەگەیەنێ، هەروا هەواڵی ئەوەشی پێ دەدا کە ئیبنو زوبەیر «قد وضع البناء على أسٍ نظر اليه العدول من أهل مكة.... ».

عەبدولمەلیك وەڵامی نامەکەی دایەوەو تێیدا نووسی بووی: «إنا لسنا من تلطيخ ابن الزبير من شيء».

ئەوەی لەباری درێژییەوە زیادی کردووە ئەوە قەیناکاو دەستی لێ مەدە. وەلێ ئەوەی لەلای حیجرەوە زیادی کردووە ئەوە بیخەرەوە سەر حاڵەتی پێشووی‌و ئەو دەرگایەی کردویەتیەوە بیگرە، ئیتر کابەی هەڵوەشاندەوە سەرلەنوێ بنیاتی نایەوە لەسەر شێوەی کۆنی.

وتراوە: کە هارون ألرشيد لە رۆژگاری خۆیدا بڕیاریدا ماڵی کەعبە هەڵوەشێنێ‌و سەر لەنوێ بنیاتی بنێتەوە. وەکوو شێوەی دروستکردنەوەی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر. ئیمامی مالیك پێی گوت: بۆخاتری خودا ئەی خەلیفەی موسوڵمانان. کەعبە مەکەنە گاڵتەجاڕ بۆ مەلیك‌و پاشایانی دواخۆتان، هەرچی هاتە سەر حوکم‌و ویستی گۆڕانکاری لە کابەدا بکا بیگۆڕێ، بەو جۆرە سام‌و هەیبەتی لەدڵی خەڵکیدا نەمێنێ: ئیتر وای لەهارونە رەشید کرد ئەو فکرە جێبەجێ نەکا. [١]

---

١ - هذا وفي شرح النووى على مسلم والفتح على البخارى ان الذى همّ بنقض الكعبة هو الرشيد. وذكر في عيون الأثر واعلام الساجد انه ابو جعفر المنصور. ومعلوم ان مالكاً عاراً كلاً من المنصور والرشيد فالاحتمال قائم.

ئەم چوار جارە کەعبە بنیات نراوەو نۆژەن کراوەتەوەو هیچ شك‌و گومانی تێدا نیە.

وەلێ پێنجەم جار کە جێگای گومانەو راجیایی تێدایە. ئەوە پەیوەستە بە دروستکردنی کابە لەپێش رۆژگاری حەزرەتی ئیبراهیم، ئایا پێش ئەو کابە بنیات نراوە یان نا؟. لەهەندێ ئاثارو ریوایاتدا ئەوە هاتووە گوایە یەکەمجار کابە لەلایەن حەزرەتی ئادەمەوە دروستکراوە.

ئیمامی بەیهەقی لە کتێبی «دلائل النبوة» حەدیثێکی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پەروەردگار جوبرائیلی ناردە لای ئادەم‌و حەواو پێی فەرموون خودا فەرمانتان پێ دەکا کە خانوێکی بۆ دروست بکەن بۆ خودا پەرستی تێیدا، ئیتر حەزرەتی جیبریل نەخشەی بۆ کێشان‌و حەزرەتی ئادەم کانگەی بۆ هەڵکەندو دایە حەوا گڵەکەی دەردا تا گەییشتنە ئاو، ئەمجار بانگیان لێکرا ئەی ئادەم بەسیەتی هیچی تر کانگەکەی قوڵ مەکە. جا کەدیوارەکانیان تەواو هەڵچنین خودا نیگای بۆ کرد کە تەوافی بکا، پێی وترا: تۆ یەکەم کەسی سەرزەمینی‌و ئەم خانوەش یەکەم خانووە...! ئەمجار رۆژگار هات‌و رۆیی‌و سەدەو چەرخەکان تێپەڕین، حەزرەتی نوح «عَلَيْهِ السَلاَمْ» لەرۆژگاری خۆیدا حەجی کەعبەی کرد. دوائەو چەند سەدە تێپەڕین ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم دیوارەکانی بەرزکردنەوەو ماڵی کەعبەی بنیات نا.

پاشان ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: ئەم حەدیثە تەنها ئیبنو لوهەیعە ئاوا بە مەرفوعی ریوایەتی کردووە، ئاشکراشە کە ئیبنو لوهەیعە زەعیفەو ریوایەتەکانی نابنە بەڵگە.

هەر لەم بارەوە، ریوایات‌و ئاساری نزیك لەم مانایەی بەیهەقی زۆر هەن بەڵام هیچیان بێ لەککەو رەخنە نین، یان ضەعیفن یان مونکەرن.

ریوایەتێکی تریش هەیە دەڵێ: یەکەم کەس کە کەعبەی بنیات ناوە حەزرەتی «سیث» بووە ﷺ جا کەئێمە پشت بەم ریوایاتانە ببەستین دەبێ بڵێین: کەعبە پێنج جار بنیات نراوە.

وەلێ واچاکە ئێمە پشت بەوە ببەستین کە بەیەقینی چەسپاوەو بڵێین: کەعبە چوار جار بنیات نراوە.. وەکوو لەوەپێش رونمان کردەوە. هەر خوداش دەزانێ لەنێوانی ئەو چوار جارەدا چەند جار پینەو پەڕۆ کراوەو کونو کەلەبەرو درزو روخاوی تەرمیماتو ئیصلاحاتی تێدا کراوە.

سـێیەم تێبینی: ئەندازەی حیکمەتو دووربینی حەزرەتی موحەممەدە لە روبەڕو بوونەوەی کێشەو گرفتەکانو سیاسەتی بۆ روداوەکانو بنبڕکردنی تەنگژەو کێشەو هەرا. لەنێوان کێدا؟ لەنێوان چەند هۆزو عەشیرەتێکدا کە زۆر کەم وابووە کێشەیان لەنێودا پەیدا ببێو بەبێ خوێن رشتنو بەیەکادان کۆتایی هاتبێ. بەتایبەتی کە کێشەکەیان گەییشتە ئاستێك کە بە شمشێر لێك راکێشن، ئەوەبوو «بەنو عەبدودار» کاسە خوێنێکیان هێنایە پێشەوەو پاشان لەگەڵ «بەنو عدی»دا سوێندو پەیمانیان بەست لەسەر مردنو هەریەکەیان پەنجەی خۆی خستە ناو کاسە خوێنەکەوە. قورەیشییەکان بەم تەنگژەو کێشەیەوە چوار پێنج شەو مانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ئاسۆیەکی رون هەبێ بۆ دامرکانەوەی کێشەکە. هیچ چارەسەرێکی پەسەند یان لەلا بەدی نەدەکرا. تا سەرەنجام دامرکاندنەوەی نیزاعو ئاژاوەکە لەسەر دەستی حەزرەتی موحەممەد تەواو بوو.

پێویستە ئێمە ئەم لێزانییەی حەزرەتی موحەممەدو دۆزینەوەی حەلی پەسەند بۆ کێشەیەکی لەوجۆرە حەواڵەی هەڵبژاردنو ئامادەکاری پەروەردگاری بکەین بۆئەوەی حەزرەتی موحەممەد لە داهاتوودا بتوانێ

قورسایی ریسالەت و «نبوة» بخاتە ئەستۆ. نەك ئەمە بگێڕینەوە بۆ لێهاتویی و عەبقەرییەت و زیرەکی پێغەمبەر خۆی کە گوایە بە شیرەوە خواردونی و بە سروشتی تێیدا بەرجەستە بوون!! دەبێ بڕوامان وابێ بنەمای یەکەم لە تەکوین و پێکهاتەی حەزرەتی موحەممەد ئەوەیە رەوانەکراوو پێغەمبەری خودایەو خودا هەڵی بژاردوە بۆ ئەو ئەرکە قورسە، ئەمجار لەگەڵ ئەم رەوشتە سروشتییە سەرەکییەدا رەوشتی تری وەکوو لێهاتوویی و زیرەکی و عەبقەری و....هتد تێیدا بەرجەستە بوون و لەسەر ئەو ئەساسە پێیانەوە رازاوەتەوە.

**تێبینی چوارەم:** ئەندازە رێزو تەقدیرێك کە پێغەمبەر لەناو قوڕەیشدا «وێڕای تایەفەگەری و دەمارگیری و کێشەو نیزاعی ناو خۆیان» هەیبووە. بێگومان ئەو لەلای هەموو چین و توێژەکان خۆشەویست و بەڕێز بووە، نازناوی «الأمین»یان بۆ داناوەو پێیان گوتووە «محمد الأمین». بە دەستپاك و راستگۆ ناسرابوو، کەسیان گومانی لەوەدا نەبوو کە لەقسەکردنیدا راستگۆیە، لە مامەڵەو هەڵس و کەوتدا رەوشت بەرزو کەریمە. هەرکەسێ هانای بۆبەرێ و پشتی پێ ببەستێ بە ئەوپەڕی دڵسۆزی و ئیخلاصەوە یارمەتی دەدا. ئەم دیاردەو مەظاهیرانە ئەندازەی حیقدو دڵڕەقی و سەر سەختی ئەو عەرەبانەمان بۆ دەردەخەن بەرامبەر ئەو زاتەو پەیامەکەی دوای ئەوەی نیگای بۆهات و لە خوداوە فەرمانی پێکرا پەیامەکەی بگەیەنێ و بڵاوی بکاتەوە. دەبینین چۆن بەدرۆیان خستەوەو دەیان پڕو پاگەندەیان بۆکردو ناوو ناتۆرەیان لێ ناو رەوشتی ناشیرین و نە شازیان پاڵدان.

## گۆشەگیریی حەزرەتی موحەممەد لەناو ئەشكەوتی حیراء دا

كاتێك تەمەنی حەزرەتی موحەممەد نزیك دەبوەوە لەچل ساڵی. لەناخیدا حەزی لە گۆشەگیری بوو، ناو بەناو پێی خۆش بوو لە كۆمەڵگا دابڕێ و بكەوێتە بیركردنەوە. پەروەردگار ئەوەی لەدڵدا خۆشەویست كرد: كە بچێتە ئەشكەوتی حیراء. «حیراء» كەژێكە كەوتۆتە باكوری خۆرئاوای شاری مەككەوە. ئیتر دەچووە ئەو ئەشكەوتەوە تێیدا دەمایەوەو گۆشەگیر دەبوو، جاری وادەبوو چەند شەوێك لەوێدا دەمایەوە، وا رێدەكەوت دەشەو لەسەر یەك و زیاترو وایش دەبوو مانگێك دەمایەوە، ئەمجار دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، زۆر نەدەمایەوە دووبارە تێشووی دەبردەوەو سەرلەنوێ لە ئەشكەوتی حیراءدا دەكەوتە عیبادەت كردن و بیركردنەوە، بەمجۆرە بەردەوام دەبوو، تا سەرەنجام لەیەكێك لەو خەڵوەت گرتنانەی دا لەخوداوە نیگای بۆهات.

### پەندو ئامۆژگاری:

بێگومان لەو گۆشەگیرییەی پێش وەحی كە پەروەردگار لەدڵی حەزرەتی موحەممەددا شیرینی كردبوو، بەڵگەی گەورەو بەهێزی تێدایەو گرنگی خۆی هەیە لەژیانی موسوڵمانان بەگشتی و لەژیانی بانگخوازانی ئیسلام دا بەتایبەتی.

بەكەم ئەوەی لێ وەردەگیرێ و ئەوە روون دەكاتەوە: كە موسوڵمان ناتوانێ ئایینەكەی بە تەواوی ئەنجامبداو ئەركی سەر شانی جێبەجێ بكا چەندێك بەرەوشتی بەرزو جوان رازابێتەوەو هەموو جۆرەكانی عیبادەت بە ئەنجام بگەیەنێ هەتا وێڕای بەرجەستە بوونی ئەو رەوشتانەو ئەنجامدانی ئەركەكانی عیبادەت ناو بەناو چەند سەعاتێك گۆشەگیری هەڵنەبژێرێ و بەتەنیا لەگەڵ خودای خۆیدا موحاسەبەی

نەفسی خۆی نەکاو نەکەوێتە موراقەبەو بیرکردنەوە لە دیاردەو مەظاهیری بونەوەرو تاووتوێکردنیان و ئاراستە کردنیان بەشێوەیەك ببنە نیشانەی گەورەیی خوداو دەسەلاتی رەهای.

ئەمە دەربارەی موسوڵمانێك کە بیەوێ بەڕاستی پەیڕەوی ئیسلام بکاو رێبازی راست بگرێتەبەر، ئەی دەبێ بەنیسبەت کەسێکەوە کە دەیەوێ خۆی وەکوو داعی و بانگخواز بۆ رێبازی حەق وێنا بکا چەند گرنگ و پێویست بێ.؟

حیکمەتی ئەوەو گرنگی خەڵوە بۆئەوە دەگەڕێتەوە دەڵێن: نەفس ئافات و نەخۆشی وای هەن، هیچ چارەسەرێکیان نیە جگە لە خەڵوەو گۆشەگیری لە خەڵك و کۆمەڵگاو موحاسەبە کردنی لە جێگایەکی چۆڵ و بێ چرپەو گرمەو هوڕی ژیان و دیاردەکانی. کیبرو خۆ بەزلزانی و بەخۆ نازین و حەسودی و رییابازی و خۆشویستنی جیهان، هەموو ئەمانە ئافات و پەتای نەفسن، لە توانایاندا هەیە، لە نەفس و دەرووندا خۆیان جێگیر بکەن و بە قوڵایی دڵدا بڕۆنە خوارێ و لەناوەوە کاری تێکدەرانەو روخێنەر ئەنجام بدەن، هەرچەندە دیمەنی ئەو کەسە رازابێتەوە بەکاری چاکەو عیباداتی باش و پەسەندو مەشغوڵی کاری بانگخوازی و ئامۆژگاری بێ، رێنمونی خەڵك بکا بۆ خودا پەرستی. بەڵێ دوبارەی دەکەینەوەو دەڵێین ئەو ئافاتە دەروونیانەی باسکران و هی تریش چارەسەریان نیە جگە لەوەی خاوەنەکەیان ناو بەناو بچێتە خەڵوەو خۆی گۆشەگیر بکاو بەخۆیدا بچێتەوەو تێبفکرێ لە حەقیقەتی ئەو جۆرە نەخۆشیانە وردبێتەوەو بزانێ لەچییەوە سەری هەڵداوەو چەند پێویستی بە یارمەتی خودایی هەیە لەهەموو چرکەو ساتێکی ژیانیدا. پاشان با لەخەڵك وردبێتەوەو بزانێ چەند لاوازو بێ دەسەلاتن لەئاست هێزو دەسەلاتی خودادا. مەدح و زەمیان چەند بێ سودو کەمبایەخە!!

ئـەمجار بـا لـەدیاردەکانی گـەورەیی خـودا ورد بێتـەوە، عـەظـەمـەتو جەبـەڕوتی زاتـی بێـچونی لـەڕۆژی قیامەتـدا بێنێتـە بەرچـاو، بـیر لـە حیـساب و لێکۆڵینـەوەو مـاوەی درێـژو ترسـناکی ئـەو رۆژە بکاتـەوە. بەخۆف و رەجاوە بیر لەبەرفراوانی رەحمەتی خـوداو دژواری عیقاب و عـەزابی بکاتـەوە. لـەکاتی بیرکردنـەوەی دورو درێـژو دوبـارەو چـەندبارە کراوە، ئەم ئافات و نەخۆشیانە یەکە یەکەو جار لـەدواجار هەڵدەوەرن و دەپوکێنەوە، دڵ بەنوری عیرفان و صەفا زیندو دەبێتەوە، ئیتر کاروبـاری دونیایی ناتوانن ئاوێنەی دڵی لێڵ بکەن.

شـتێکی تـر کـە گرنگـی هەیـە لـەژیانی موسـوڵمانانـدا بەگـشتی و بـانگخوازانی ئیـسلامی دا بەتایبـەتی، ئـەویش پـەروەردە کردنـی خۆشەویستی خودایـە لـە دڵـدا. بێگومـان خۆشەویستی خـودا هانـدەرو کـانی فیـداکاری و جیهـادە، بناغـەی هـەموو بانگەوازییـەکی صـەحیح و بەسودە. خۆشەویستی خودا بە ئیمانی روت و عـەقڵی، دەستـەبەر نابێ، کاری عـەقڵ ئامێز بەتـەنیا رۆژێك لـەرۆژان نـەیتوانیوە کاریگـەری لەسـەر سۆزو دڵ و دەروون هەبێ. خۆ ئەگەر وابوایە دەبوایە رۆژهەڵاتناسـەکان «المستشرقون» لە ریزی هەرە پێشەوەی خاوەن باوەڕان بونایە بەخوداو بە پێغەمبەری خـودا... هـەروا دەبوایە لەناخ و دەروونـدا لەهـەموو کـەس زیاتر خوداو پێغەمبەریان خۆش بویستایەو دڵیـان بـەو خۆشەویستییە ئاوەدان و رەنـوێر بوبایـە. ئایا تـا ئێستا بیستراوە، یـەکێك لـە زانایـانی زانیارییـە عەقڵییـەکان گیـانی خـۆی لـەپێناو قاعیدەیـەکی ریاضـی یـان مەسئەلەیەکی جەبریدا بەخشی بێ؟!

بـەڵێ وەسـیلەو هۆکـار بـۆ خۆشەویـستی خـودا دوای ئیمـان پـێ هێنـانی، زۆر بیرکردنەوەیـە لـە نیعمەتـەکانی و وردبوونەوەیـە لـە جـەلال و عـەظـەمـەتی، ئـەمجار زۆر یـادکردن و زیکـر کردنیـەتی بـەدڵ و بـەزوبان،

ئەمەش بەچی دەستەبەر دەبێ بە گۆشەگیری و دابڕانی ناو بەناوو فەترە فەترە لەشەواغیلی دونیایی و پێداویستییەکانی ژیان.

جا ئەگەر موسوڵمان بەم ئەرکانە هەڵسا و ئەم وەظیفەیەی بۆ دەستەبەر بوو، لەئاکامی ئەوەدا لە دڵ و دەروونیدا خۆشەویستی خودا دەڕوێ، هەرکاتێکیش بەڕاستی ئەم خۆشەویستییە لەناخیدا پەیدابوو، ئیتر ورەو هێزێکی دەداتێ جگە لەخودا هەموو گەورەیەکی بەلاوە پچوکە، هەموو موغرەیاتێکی دونیایی بەلاوە حەقیرو بێ نموودە. هەموو ئەزیەت و ناخۆشییەکی لەلا ئاسان و ئاساییە. مل بۆ هیچ چەوساندنەوەو سوکایەتی پێ کردنێك نادا، ئەم حاڵەت و وەزعە کەبۆی دەستەبەر بوو ئەوە توێشوو چەکی روبەڕو بونەوەیە، پێویستە هەموو ئەوانەی بانگخوازی دەکەن و ئەرکی دەعوەی ئیسلامی دەگرنە ئەستۆ، ئەو توێشوو چەکەیان هەبێ. هەر ئەو توێشوو چەکە ئیمانییە بوو: کە حەزرەتی موحەممەد لەلایەن خوداوە پێی ئامادە باش کرابوو، بۆئەوەی بەوپەڕی لێهاتوویییەوە ئەرکی دەعوەی ئیسلامی لەئەستۆ بگرێ و لەپێناویدا هەموو ناخۆشی و ماندوبونێك بە ئاسایی بزانێ.

چونکە دەوافیع و پاڵنەرە ویژدانییەکانی ناو دڵ لە خۆف و رەجا و خۆشەویستی پەروەردگار، کاری وایان لێ دەوەشێتەوە: کە تێگەیشتنی عەقڵی روت بۆی ناکرێ.

بێگومان ئیمامی شاطبی زۆر باشی پێکاوە کاتێك هاتووە جوداوازی خستۆتە نێوان ئەو دەوافیع و پاڵنەرانە لەلای موسوڵمانان بەگشتی کە ئەرکە ئایینییەکەیان لەئەستۆ گرتووە بە شێوەیەکی گشتی و ئەو موسوڵمانە تایبەتییانەی کە ئەرکی بانگەوازیی ئیسلامییان خراوەتە ئەستۆ، کە دەوافیع پاڵنەرەکەیان بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەرکە زۆر بەهێزترە لە تەعەقول و تێگەیشتنی روت.

پێڕی یەکەم حاڵو وەزعی، حاڵی کەسێکە کە بەحوکمی پەیمانی ئیسلامو گرێبەستی باوەڕ کاردەکاو زۆر قوڵ نابێتەوەو زیادەیەك ناخاتە سەر ئەرکەکەی.

پێڕی دووەم حاڵو وەزعی، وەکوو حاڵی کەسێکە کە دەوافیعی خۆفو رەجاو خۆشەویستی خودا کاریگەری تەواویان هەیە لە هەڵسو کەوتیدا. ترسان لەخودا قەمچییەکی لێخوڕو رادەرە، رەجاو هیوا بەڕەحمەتی خودا پێشەنگو حودیە خوێنێکی لێزانو شارەزایە. خۆشەویستی خودا تەییارێکی بەهێزو کاریگەرە. کەسێك ترسی خودای لە دڵدابێ هەرچەند ئەرکەکانی نارەحەتو ناخۆش بن ئەنجامیان دەدا، چونکە ترسانی لەناخۆشیو عەزابی گەورەتر هەڵیدەنێ بۆئەوەی خۆگرو پشودرێژ بێ لەبەرامبەر ئەرکەکانی هەرچەندە قورسو ناخۆشیش بن. کەسێك رەجای بەڕەحمەتی خودا هەبێ چەندێك ئەرکی قورسو ناخۆش بێ ئەنجامی دەدا، چونکە هیواو رەجای بەحەسانەوەی دوارۆژ هەڵیدەنێ بۆ خۆگریو صەبرو ئارامی لەسەر ناخۆشیو ماندو بوون.

کەسێك بەڕاستی خۆشەویستی خودای لەدڵدا جێگیر بوو، هەموو هێزو توانای خەرج دەکا بۆ گەیشتن بە خۆشەویستیو رازیکردنی، هەموو کارێکی قورسی لەو پێناوەدا بەلاوە ئاسانە، هەموو شتێکی دوری بۆ نزیك دەکاتەوە. هەموو هێزو توانای خۆی خەرج دەکا لەپێناو خۆشەویستەکەیداو هێشتا خۆی بەکەمتەرخەم دەزانێو پێی وایە شوکری نیعمەتی بەجێ نەهێناوە.

گرتنەبەری هۆکارە جیاجیاکان بۆ دەستەبەربوونی ئەم دەوافیعە ویژدانیانە لەدڵو دەروندا، کارێکە موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر گرنگیو بە ئەهمیەت زانینی. هەر ئەم حاڵەتو وەزعەیە: کە لەلای

جەماوەری زانایانو لێکۆڵەرەوەکان ناوی «تصوف»ی لێ نراوە، یان هەندێك پێی دەڵێن: چاکەکاریو ئیحسان. یان هەندێ کەسی تر «بۆ نمونە ئیبنو تەیمیە» پێی دەڵێن: «علم السلوك».

ئەو خەڵوەتو گۆشەگیرییەی حەزرەتی موحەممەد پێش بون بە پێغەمبەرو هاتنی وەحی بۆی، ئەنجامی دەدا، یەکێك بوو لەو هۆکارانە بۆ دەستەبەر بوونی هەمان دەوافیعو پاڵنەرو هاندەری کاریگەرانە.

وەلێ پێویستە کە لەمانای خەڵوە وا حاڵی نەبین: کە هەندێ کەس لەچوار چێوەیەکی شاز قەتیسیان کردووە، بەپێی ئەو شازییەتو تێڕوانینە تەسکەی خۆیان لێی حاڵی بوون، بانگەشەی بۆ دەکەن. ئەوانە مانای خەڵوەو گۆشەگیری ناو بەناو: کە وەکوو چارەسەرو دەرمان بۆ ئافاتە دەروونییەکان ئەنجام دەدرێو پێویستە ئەنجام بدرێ. هاتوون گۆڕیویانە بۆ حاڵەتی گۆشەگیریو دابڕانی تەواو لە کۆمەڵگاو خێزان، ئەشکەوتو پەنا پاساری کێوو کەژیان کردووە بەشوێنی خەڵوە کێشانو پێشیان وایە ئەوە عەینی فەضیلەتو هەڵوێستی خودا پەسەندە.

لەڕاستیدا ئەو جۆرە خەڵوەتو دابڕانە سەر لەبەرییە، پێچەوانەی رێبازی پێغەمبەرە، پێچەوانەی ئەو حاڵو وەزعەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەر پەیڕەوییان کردووە. هەرگیز خەڵوەتو دابڕانی هەمیشەیی لە کۆمەڵگاو خێزان، لە ئایینی ئیسلامدا نییەو بە پەسەندی نەزانیوە.

بەڵکوو خەڵوەتو دابڕان وەکوو چارەسەرو دەرمان بۆ چاکسازی ئافاتە دەروونیەکان پەیڕەو دەکرێ، چارەسەرو دەرمانیش بەگوێرەی پێویستو بە ئەندازەی خۆی بەکاردەهێندرێ. ئەگینا ئەو چارەسەرو دەرمانانە دەبنە دەردی کوشندەو پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین. جا ئەگەر تۆ لەژینامەی پیاوچاکانی رابردوودا شتێکی وات بەرچاو بکەوێ

کە فلان یان فلتان سەراپا ژیانی خۆی لە ئەشکەوتو پەنا پاسارو دوور لە کۆمەڵگا بەسەر بردووە، ئەوە حاڵەتێکی تایبەت بووە بەو پیاو چاکەو کارو هەڵوێستەکەی نابێتە بەڵگەو پێویست ناکا کەسانی دی چاوی لێ بکەن.

## دەستپێکردنی دابەزینی نیگا

ئیمامی بوخاری لەخاتو عائیشەوە ریوایەت دەکا دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی دابەزینی نیگا، دەفەرموێ: یەکەم شێوەو جۆری نیگا کەبۆ پێغەمبەر ﷺ دەستەبەر بوو، بریتی بوو لەخەونی راست «الرؤيا الصالحة». هەر خەونێکی دەبینی وەکوو سپێدەی بەیان دەهاتە دیو روشنابوو. پاشان بیری کەنارگیریو خۆ دوورخستنەوەی لە کۆمەڵگای لاخۆشەویست بو بوو، حەزی لەوە بوو لە خەڵك دابڕێ، بۆ خۆی بەتەنهاو لەشوێنی چۆڵدا بیربکاتەوە. ئەشکەوتی حیرائی بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژاردبوو، هەموو جارێك تێشوی لەگەل خۆی دەبردو دەچووە ناو ئەو ئەشکەوتەوە چەند شەوێك دەمایەوە. ئەمجار دەگەڕایەوە بۆ ماڵو سەرلەنوێ توێشووی ساز دەکردەوەو دەچوەوە بۆ ناو ئەشکەوتی ناوبراو. هەتا لە ئاکام دا نیگای حەقی بۆ هاتو لەو ئەشکەوتەدا بۆ یەکەمجار وەحیی بۆ نازڵ بوو، ئەوەبوو فریشتەی تایبەت بەوەحی هاتەلایو پێی گوت بخوێنە، وتی من خوێندەوار نیم ناتوانم بخوێنم. پێغەمبەر دەفەرموێ: ئیتر گرتمیو بەخۆیەوە گوشیمی تا تەواو تێنم بۆهاتو خەریك بوو هەناسەم لێ ببڕێ، ئەمجار بەرەڵلای کردمو وتی بخوێنە، وتم من خوێندەوار نیم نازانم بخوێنم، ئەمجار گرتمیو بەخۆیەوە گوشیمیەوە، پاشان بەرەڵلای کردمەوە وتی: {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ}.

پێغەمبەر ﷺ بەو چەندە ئایەتەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، دڵە لەرزەی پێکەوتبوو، رەنگی زەردببو، هاتەوە بۆلای خەدیجەی خێزانی، وتی دامپۆشن، دامپۆشن، دایانپۆشی هەتا ترسەکەی رەوییەوەو هاتەوە سەرەخۆ. بە خەدیجەی فەرموو: دەبێ ئەم حاڵەتە چی بێ بەسەرم هات؟ ئەمجار بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: بەڕاستی ترسم لێ نیشت شتێکم لێ قەومابێت. خەدیجە فەرمووی: نەخەیر هەرگیز خودا تۆ ریسوا ناکاو سەرت لێ ناشێوێنێ، تۆ پەیوەندی خزمایەتی و صیلەی رەحم بەجێ دێنی. یارمەتی لێقەوماو دەدەیت، هەژار لە برسیایەتی رزگار دەکەیت، رێزی میوان دەگری، بەهانای هەموو کۆست کەوتوو لێقەوماوێکەوە دەچی.

ئەمجار خەدیجە لەگەڵ خۆیدا بردی بۆلای وەرەقەی کوڕی «نەوفەل»ی کوڕی ئەسەدی کوڕی «عبدالعزی» کە ئامۆزای خەدیجە بوو، پیاوێك بوو لەسەردەمی پێش ئیسلام دا ببوە مەسیحی و بەزمانی عیبرانی نامە ئاسمانییەکانی وەکوو «تەورات و ئینجیلی» دەنووسیەوە، پیرەمێردێکی بەساڵاچو بوو، چاوی کوێر بوو بوون. خەدیجە پێی گوت: ئامۆزای بەرێزم! گوێ لەم برازایەت بگرە بابەدەمی خۆی بەسەرهاتی خۆیت بۆ بگێڕێتەوە. وەرەقە وتی: دەی برازای خۆم بۆم بگێڕەوە بزانم چیت دیوە. پێغەمبەری خودا لە هەوەڵەوە تا ئاخر چی دیبوو بۆی گێڕایەوە، وەرقە وتی: ئەوە ئەو «ناموس»ەیە ئەو نیگایەیە کە خودا بۆ حەزرەتی موسای ناردە خوارێ، یان ئەو فریشتەیەیە کە نیگای بۆ حەزرەتی موسا هێناوە. خۆزگە لەو رۆژگارەدا گەنج بومایە خۆزگە زیندو بومایە لەو کاتەدا نەتەوەکەت لە زیدو نیشتمانی خۆت دەرت دەکەن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ گەلەکەم دەریشم دەکەن؟ وەرەقە وتی: بەڵێ هەر پیاوێك پەیامی لەو شێوەی تۆی هێنابێ، هەڵگری پەیامێکی ئاوهابێ، حەتمەن لەلایەن گەلی خۆیەوە ئەوپەڕی دوژمنایەتی

کراوەو ئەزیەتدراوە، ئەگەر من بگەمە ئەو رۆژە پشتگیرییەکی تەواوت دەکەم و بە ئەوپەڕی توانامەوە یارمەتیت دەدەم. پاشان وەرەقە ئەوەندە نەمایەوە کۆچی دوایی کرد، نیگاو پەیامی ئاسمانیش ئەو ماوەیە لە پێغەمبەر بڕا.

راجیایی هەیە دەربارەی ماوەی دابڕان و نەهاتنی نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هەندێك دەڵێن: سێ ساڵ دوای ئەو یەکەم نیگایە پێغەمبەر ﷺ نیگای لێ بڕاوە، هەندێك دەڵێن کەمترە. رای پەسەندو وێچوو ئەوەیە کە ئیمامی بەیهەقی ریوایەتی کردووەو فەرموویەتی: ماوەکە شەش مانگی خایاندووە«١».

ئەمجار ئیمامی بوخاری لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەت دەکا. کە باسی سەردەمی نازڵبوونی نیگا دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: {بینما أنا أمشي} لەکاتێك من بەڕێگاوە دەڕۆیشتم {اذ سمعت صوتاً من السماء} لەناکاو دەنگێکم لە ئاسمانەوە بەر گوێچکە کەوت «فرفعت بصري» کە چاوم هەڵبڕی {فاذا الملك الذي جاءني بحراء جالس على كرسي بين السماء والأرض فرعبت منه} روانیم هەمان ئەو فریشتەیە بوو کە لەئەشکەوتی حراء دیتبووم، لەنێوان ئاسمان و زەویدا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، لێی ترسام، بەرەو ماڵ گەڕامەوە وتم: دامپۆشن، دامپۆشن. ئیتر پەروەردگار ئایەتی {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ }ی نازڵ کرد، دوای ئەوە پەیتا پەیتا نیگا هاتە خوارو بە گەرم و گوڕی نیگام بۆ هاتووە.

---

١ - بڕوانە فتح الباری ٢١/١.

## پەندو ئامۆژگاری:

فەرموودەی دەستپێکردنی نیگا، «حديث بدء الوحي» بناغەی لەسەر دامەزراوی هەموو ئەو حەقیقەت و بنەما ئاینیانەی ئیسلامە بەهەردوو بوارەکانیەوە: «بواری عەقیدەو بواری تەشریع». تێگەییشتن لە نیگاو بڕواکردن پێی، دوو مەدخەل و دەروازەن و زۆر زەرورو پێویستن بۆ پەیدابوونی یەقین و بیرو باوەڕ بەهەموو ئەو هەواڵە غەیبی و فەرمان و نەهیە تەشریعیانەی لە پێغەمبەرەوە بەئێمە گەییشتون. چونکە حەقیقەتی وەحیی تاکە هێڵی جودا کەرەوەو نێوانکارو فەیصەلە، لەنێوان ئادەمیزادێك لەخۆیدا بیربکاتەوەو بەهۆی عەقڵ و رای خۆی قانون و یاسا دابڕێژێ و ئادەمیزادێك لەخوداوە یاساو تەشریع بێنێ و بڵێ ئەمە پەیامی خودایەو لەخوداوە بۆم هاتووە، بەبێ گۆڕانکاری و کەم و زیاد تێداکردن بەمەردومی بگەیەنێ.

لەبەر ئەم حەقیقەت و راستییە، ئەوانەی پیشەیان شك و گومان دروست کردنە بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی. زۆر گرنگی دەدەن بە مەوضوعی «وەحیی» لەژیانی پێغەمبەردا! وزەیەکی فیکری زۆریان سەرف کردووە، زۆر ماندوو بوون و هەوڵیان داوە بە تەکەللوف و سەپاندن، چەواشەکاریی بکەن لە حەقیقەتی وەحیدا، هەوڵیان داوە تێکەڵ و پێکەڵی لەنێوان ئیلهام و قسەی نەفسدا، بەڵکوو لەنێوان ئیلهام و فێ و پەرکەمدا بەرپا بکەن!. چونکە ئەوانە دەزانن: کە مەوضوعی وەحیی سەرچاوەی یەقینی موسوڵمانانەو هەموو بیرو باوەڕێکیان بە پێغەمبەرو پەیامەکەی لەو روبارە رونە سازگارە سەرچاوەی گرتووە. جا ئەگەر بۆیان بلوێ گومان بخەنە سەر حەقیقەتی نیگاو چەواشەکاریی تێدا دروست بکەن، دەتواندرێ هەموو ئەو بیرو باوەڕو حوکمە تەشریعیانەی لەسەری بنیات نراون لەدڵی موسوڵماناندا بسڕێنرێتەوە،

بڕوایان بەهیچ کام لەو عەقائیدو ئەحکامانە نەمێنێ کە ئیسلام لەخۆی گرتون، ئەمجار ریگای ئەو فکرەیە خۆش بکەن: کە هەرچی موحەممەد بانگەوازی بۆ کردووە لەبنەمای بیرو باوەڕو ئەحکامی تەشریعی، لەخوداوە بۆی نەهاتووە بەڵکوو بیرو بۆچونی خۆیەتی، زادەی بیری زیرەکانەی مرۆڤانەی خۆیەتی و بەس!.

لەم روانگەوەو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە موبەشیرو خۆرهەڵات ناسەکان، ئەوانەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردۆتە پیشەو کاری سەرەکییان، بەهەموو جۆرێك هەوڵ دەدەن دیاردەی نیگاو وەحیی تەئویل و تەحریف بکەن. دەیانەوێ ظاهیرەی «وەحیی» لەو ماناو مەسارە لابدەن: کە مێژوو نووسان و سیرە نووسان تۆماریان کردووەو لە کتێبەکانی سوننەی صەحیحدا چەسپاوە. دەیانەوێ نیگا لە حەقیقەتی خۆی دوور بخەنەوە، هەریە کێك لەوانە چۆن خەیاڵی نەخۆشی بۆی وێنا بکا، ئاوا ڕێگایەکی بۆ ئەو مەبەستە گرتۆتە بەر، تەصەوراتی سەیرو سەمەرەو کولفەت ئامێزی خستۆتەڕو.

بۆ نموونە هی واهەیە دەڵێ موحەممەد بەردەوام بیری دەکردەوە تا لەناخیدا وردە وردە بیرو باوەڕێکی وا چەکەرەی کردو دروست بوو: کە پێی وابوو لەڕێگەیەوە دەتواندرێ قەڵاچۆی دیاردەی بتپەرستی بکرێ.

هی وایشیان هەیە پڕوپاگەندەی ئەوەدەکا: کە موحەممەد قورئان و بنەماکانی ئیسلامی لە بوحەیرای راهیب وەرگرتووە!!

هی وایش هەیە خۆی کردووە بە میانەرەوو دەفەرموێ: نەخەیر، واقیعەکە نە ئاوایە نە ئامایە، بەڵکوو موحەممەد پیاوێکی تووڕەو دەمارگیر بووە، نەخۆشی فێ و پەرکەمی لەگەڵدا بووەو وڕێنەی کردووە!!

ئێمە کاتێك دەڕوانینە ئەم جۆرە قسە خەیاڵاویو بێ بناغەو سەیرو سەمەرانە: کە مرۆڤی عاقڵ ناتوانێ هیچ پاساوێکیان بۆ بدۆزێتەوە، دەبینین جگە لە هەڵهاتنو خۆ دزینەوە لەدانانان بە «نبوة»ی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەولاوە هیچی تر نییە، لەهەمان کات دا بە ئاشکرا هەست بەو حیکمەتە خوداییە دەکەین دەربارەی دەست پێکردنی هاتنە خوارەوەی وەحیی بەو شێوەو قۆناغەی لە فەرموودەکەی بوخاریدا رامان نواند.

ئێستا دەتوانین ئەم پرسیارانە ئاڕاستە بکەین:

بۆچی پێغەمبەر ﷺ یەکەمجار حەزرەتی جوبرائیلی بەچاوی سەربینی؟بێگومان دەگونجا لەپاش پەردەوە نیگای ئاڕاستە بکرێ. بۆچی پەروەردگار ترسو بیمی خستە دڵی پێغەمبەرەوەو وای لێکرد لە بەرامبەر ئەو رووداوەدا سەرسامیو دەهشەت بیگرێو کتوپڕ لە حەقیقەتی حاڵی نەبێ؟. بێگومان بەڕواڵەت خۆشەویستی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی ئەوەی دەخواست کە ئارامی بخاتە دڵیەوەو ورەی بەرزبکاتەوەو نەترسێو نەلەرزێ؟ دەی بۆچی حەزرەتی موحەممەد لەنەفسی خۆی ترساو خەیاڵی بۆئەوە چوو ئەو رووداوەی لە ئەشکەوتەکەدا توشی هات لە جندۆکەوە بۆی هاتبێ، بیرو هۆشی بۆئەوە نەچوو کە ئەوەی دیویەتی فریشتەی ئەمینی نیگایەو لەخوداوە نێردراوە.؟

ئەی بۆچی دوای ئەو حاڵەتە ترسناکەی بینی، ماوەیەکی دورو درێژ وەحیی بۆ نەهات، تەنانەت ئەم نیگابڕانە لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ زۆر گران بوو، بە تەواو خەفەتباری کرد، تەنانەت وای لێ هات «وەکوو بوخاری ریوایەتی کردووە» بیری لەوە دەکردەوە بچێتە سەر شاخێکی بەرزو خۆ فڕێداتە خوارو کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێ.

ئەم پرسیارانە تێکڕا پرسیاری سروشتین بە نیسبەت ئەو شێوەو شێوازەی لەهاتنە خوارەوەی نیگا دا ڕوی دا.

جا ئێمە کاتێك بیر لە وەڵامدانەوەیان دەکەینەوە، دەبینین ئەو شێوازو قۆناغەی نیگای تێدا دەست پێکرد، حیکمەتێکی گەورەو باهیری لەخۆ گرتووە، کە بریتییە لەوەی: خاوەن فیکری ئازاد بتوانێ حەقیقەتی پرشنگدار بەدی بکا، حەقیقەتێك بەدی بکا کە بیپارێزێ لە کەوتنە ناو زلکاوی شیرك‌و گومڕایی‌و هەڵخەڵەتان بە بانگەشەی ئەوانەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردۆتە پێشەو شوێن خەیاڵ پلاوی دەروونی نەخۆش‌و پڕکینەی خۆیان کەوتوون.

بەڵێ حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەشێوەیەکی کت‌و پڕو چاوەڕوان نەکراو، حەزرەتی جوبرائیلی هاتە بەرچاو، بەچاوی خۆی ئەو فریشتەیەی بینی کەداوای لێ دەکرد بخوێنێ، ئەمەیش بۆئەوە بوو: کە رون ببێتەوەو ئاشکرا ببێ: کە ظاهیرەی وەحیی کارێکی زاتی‌و داخیلی نیەو ناگەڕێتەوە بۆ وتە وتی نەفس‌و دەرون‌و بەس. بەڵکوو دیاردەی وەحیی پێشوازیکردن‌و وەرگرتنی حەقیقەتێکی دەرەکییە پەیوەندی بە نەفس‌و دەروونەوە نیە. راگوشینی فریشتە: کە سێ جار حەزرەتی موحەممەدی راگوشی‌و بەرەڵای کردەوەو دوای هەموو راگوشینێك داوای ئەوەی لێ دەکرد: کە بخوێنێ، ئەمە بۆ خۆی دادەنرێ بە جەختکردنەوەو تەئکید بۆ ئەو پەیامە خوداییە کە نێردرایە سەر دڵی پێغەمبەرو لە دەرەوەی زاتی خۆی وەری گرت. موبالەغەو جەختکردنە لەسەر پوچانەوەی جۆرە تەصەورو بۆچونێك لەلایەن کەسانێکەوە کەوای بۆ دەچن مەوزوعی وەحیی کارێکی خەیاڵی ناوخۆیی دەروونی پێغەمبەر بووبێ.

بێگومان ترس‌و بیم، دڵ‌و دەروونی حەزرەتی موحەممەدی داگرت لەو دیمەنەی چاوی پێکەوت‌و لەو دەنگەی بیستی، تەنانەت ئەوەندە ترسا خەڵوەت‌و مانەوەی خۆی لە ئەشکەوتەکەدا کۆتا پێ هێنا‌و بە دڵە لەرزەو رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە وە بەرەو ماڵ گەڕایەوە. ئەمەیش بۆئەوەی بۆ هەموو خاوەن فکرو بیرێکی هۆشمەند ئاشکرا ببێ: کە پێغەمبەر ﷺ چاوەڕوانی ئەو ریسالە‌و پەیامە نەبوو کە لەوەدوا خرایە ئەستۆی‌و داوای لێکرا هەڵی بگرێ‌و بەجیهاندا بڵاوی بکاتەوە. هەروەها دیاردەی نیگا بەشێوەیەکی واگونجا‌و نەبوو، یان تەوکەری حاڵەتێك نەبوو کە لەوەپێش تەصەوری کردبێ، یان بەسەر دڵیدا رابوربێ. بەڵکوو کت‌و پڕو لەنکا‌و ئەم حاڵەت‌و دیاردەیە کەوتە سەر دڵ‌و دەروونی‌و لەناخەوە هەژاندی، لەنکا‌و ئەم دیاردەیەی بینی‌و ئەم دەنگەی بیست بەبێ ئەوەی لەوەپێش بەتەمای بووبێ. گومانیش لەوەدا نیە: کە ئەم حاڵەت‌و روداوە وەکوو حاڵەتی کەسێك نیە پلە بە پلە‌و قۆناغ بە قۆناغ لە ئەندیشە‌و فکردا عەقڵ‌و ئاوەزی خۆی بخاتە گەڕو تا لەئاکامدا بەهۆی توێژینەوەی بەردەوام‌و تەدریجی لەناخیدا بیرو باوەڕێك چەکەرە بکا‌و سەر هەڵبدا‌و خۆی بڕوای پێ بهێنێ‌و بانگەوازی بۆبکا.

ئەمجار هیچ شتێك لەحاڵەتی ئیلهام‌و وتە وتی نەفس، یان ئەو دیاردەیەی کە پێی دەگوترێ ئیشراقی گیانی، یان بیرکردنەوە لەجیهانە باڵاکان، داخوازی پەیدابوونی ترس‌و بیم‌و رەنگ هەڵبزڕکان نیە. هیچ گونجان‌و ئاوێتە بونێك نیە لەنێوان پێوە هەڵچون لە بیرکردنەوە‌و تێ راماندا لەلایەك‌و کت‌وپڕ پەیدابوونی ترس‌و بیم لەلایەکی ترەوە. بەهیچ شێوەیەك ئەو دوو حاڵەتە پێکەوە کۆنابنەوە‌و بەیەکەوە نابن، ئەگینا دەبوایە زوربەی زۆری بیردۆزو موفەکیرەکان بببوونایە بە خۆراکی

شەپۆلە یەك لەدوا یەكەكانی ترس و بیم و نێچیری ترسی لەنكاو پەیدابوو.

تۆ دەزانی كە ترس و بیم و جەستە هەڵلەرزین و ڕەنگ هەڵبزڕكان، هەموو ئەم ئینفیعالاتە زۆرە ملێیانە، ناكرێ بەدەستكردو كاری شانۆیی حیسابیان بكەین. هەتا ئەگەر گریمانەی ئەوەش بەخۆمان بدەین: كە دەشێ حەزرەتی موحەممەد هەڵس و كەوتێكی شانۆیی كردبێ، گریمانەی شتێكی مەحاڵیش بكەین و بڵێین ئەو تەبیاتە سروشتە ناسراوەی پێش نیگا بۆهاتنی گۆڕاوە بەو حاڵە نەشازە، هەروەها ڕێگای ئەوەمان ناداتێ قەناعەت بەخۆمان بكەین: كە ئەو ترس و بیم و دڵە لەرزە و ڕەنگ هەڵبزڕكانەی شتێكی دەستكردو شانۆیی بووە و ویستی خۆی لەگەڵدا بووە و بناغەی بۆداناوە.

زێدە موفاجەئە ترسناكەكەی كە ڕوبەڕوی بووەوە لەوەدا خۆی دەنوێنێ و دەردەكەوێ: كە پێغەمبەر وا گومانی برد كە ئەوەی گوشیویەتی و قسەی لەگەڵدا كردووە جندۆكە بووبێ، حاڵەتەكەی بەدەست لێوەشاندنی جندۆكە و شەیاتینی حسێب دەكرد. ئەوەتا كە دوایی هەواڵەكەی بۆ خەدیجەی خێزانی گێڕایەوە، وتی: سوێندبێ ترسام لەخۆم جندۆكە دەستی لێ وەشانبم، بەڵام خەدیجە زوو دڵنەوایی كردو دڵنیای كرد: كە ئەو لەو كەسانە نییە شەیاتینی زیانی پێ بگەیەنن و دەستی لێ بوەشێنن... چونكە ئەو خاوەنی ڕەوشتی بەرزو صیفاتی پەسەندە. بێگومان پەروەردگار دەیتوانی: كە دڵی حەزرەتی موحەممەد وا پتەوو ئارام بكا و دڵنیای بكا لەوەی كە دیویەتی فریشتەی تایبەت بە نیگایە، حەزرەتی جوبرائیلە و هیچ ترسی لێی نەبێ، دەیتوانی بە ئاسانی و بە ئاسایی دڵی پێغەمبەر وارام بێنێ بزانێ كە ئەوەی ئاخاوتنی لەگەڵدا كردووە لە ئەشكەوتدا فریشتەیەكە لە

فریشتەکانی خوداو نیگای خودایی بۆ هێناوەو هەواڵی ئەوەی دەداتێ کە کراوە بە پێغەمبەر بۆسەر ئادەمیزاد بەگشتی!!.

وەلێ حیکمەتی یەزدانی واداخواز بوو: کەلێك جودابوونەوەیەکی تەواو «انفصال تام» بخاتە نێوان کەسایەتی حەزرەتی موحەممەد پێش بوونی بە پێغەمبەرو دوا بوونی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)، ئەوە بەیان بکا: کە هیچ شتێك لە پایەکانی عەقیدەی ئیسلامیو تەشریعو یاسای پێش وەخت لەزەینی پێغەمبەردا پلانی بۆ دانەڕێژراوەو ئامادە باشی بۆ نەکراوەو بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە کە لەوەدوا دەبێتە پێغەمبەرو پەیامی ئاسمانی دەخرێتە ئەستۆی!!. پاشان ئەوەی خودا خستیە دڵی خەدیجەوە لەوەی کە بەبێ سێو دوو لەگەڵیدا بچێ بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەلو گێڕانەوەی روداوەکە بۆ ئەو، جەختکردنەوەیەکی تر بوو: کە ئەو روداوەی تووشی پێغەمبەر بووە لە ئەشکەوتی «حراء»دا نیگای خودایی بووە، لەو جۆرە نیگایەیە کە لەوەپێش بۆ پێغەمبەران نێردراوە. هەروا لابردنی تەمو مژو چەواشە بوونێك کە لەئاکامی روداوەکە دەوری حەزرەتی موحەممەدیان دابوو ترسو بیمی لەلا پەیدا بوو بوو، هەرچەند بیریشی دەکردەوە، نەیدەزانی چۆن تەفسیری بکاتەوە، ئەو دیمەنو دەنگە کتو پڕە ترسناکە بەچی لێك بداتەوە، دابڕانی نیگا دوای ئەو رووداوەو مانەوەی بەو حاڵە شەش مانگ یان زیاتر «وەکوو راجیایی تێدایە» ئەوە موعجیزەیەکی خودایی گەورەی تێدایەو باشترین رەتدانەوەیە بۆ ئەوانەی غەزوی فیکریو هەوڵدان بۆ چەواشەکردنی دیاردەی وەحییو نیگایان کردۆتە پیشەو کاری سەرەکییانو دەڵێن: ئەو نیگایەی موحەممەد لافی پێوە لێ داوە بریتی بووە لە ئیشراقی روحی کە لەئاکامی درێژەدان بە بیرکردنەوەو

تێفکرین دێتەدی، گوایە روداوێکی داخلی بووەو لەناخی دا سەری هەڵداوە.

بێگومان حیکمەتی خودا وایخواست، کە ئەو فریشتەیەی یەکەمجار لە ئەشکەوتی «حراء»دا بینی، ماوەیەکی زۆر لێی گوم ببێ و نەیەتەوە بۆلای، بەهۆی ئەوەوە توشی دڵە راوکێ و خەمو پەژارە ببێ، پاشان ئەو قەلەق و دڵە راوکێیەی لێ ببێتە ترس و خۆفی ئەوە کە خودا وازی لێ هێناوەو دوای ئەوەی ویستویەتی نیگاو سروشی بۆ بنێرێ لێی پەشیمان بۆتەوە، ئەمەش بەهۆی کردەوەیەکی خراپ و ناپەسەند کە ئەنجامی داوە، تەنانەت نارەحەتی و قەلەقی گەیشتە ئاستێك زۆرجار کە بەبەرزایی شاخێکدا دەرۆیی دەیەویست خۆی هەڵدێرێ و کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێ، ماوەیەکی درێژ بەم حاڵە سەراسیمەو پەژموردەیە بە دڵتەنگی و خەفەتباری ژیانی بەسەر برد، تا رۆژێك هەمان ئەو فریشتەیەی لە ئەشکەوتی «حراء»دا لەوەپێش چاوی پێکەوتبوو، بینییەوە شکڵ و شێوەی نێوان ئەرزو ئاسمانی پڕکردبوو، بانگی لێ کرد ئەی موحەممەد! ئەتۆ پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودای بۆلای ئادەمیزاد بەگشتی. ئیتر سەرلەنوێ پێغەمبەر ﷺ بە ترس و بیمێکی زۆرو دڵەکوتەو پەشۆکاوی هاتەوە بۆ ماڵ... ئیتر ئایەتی {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ ...المدثر/١-٢} نازڵ بووە سەردڵی.

بێگومان ئەم حاڵەتەی پێغەمبەر ﷺ پێیدا تێپەڕی، ئەوە دەچەسپێنێ کە تەنها بیرکردنەوەو بەخەیاڵ چونیش بۆ ئەوە: کە وەحیی ئیلهامێکی نەفسی بووە، جۆرێکە لە شێتی، چونکە زۆر ئاشکراو عەیانە، کە خاوەنی ئیلهامی نەفسی و تێفکرین و بیرکردنەوە، ئیلهام و بیرکردنەوەکەی بەم جۆرە حاڵەت و وەزعانەدا تێناپەڕێ و ئەم دیاردانەی لێ دیاریی نادەن.

کەوابوو حەدیثی دەستپێکردنی وەحیی بەو شێوەی لە فەرموودەی صەحیح و چەسپاودا هاتووە، ڕەتدانەوەو روخان و دارمانی هەموو ئەو بیرو بۆچون و هەڵپەو هەوڵ و تێکۆشانی گومان پەیداکەرانی لەخۆ گرتووە، هەرچی ئەوان بە بیری تەسك و خەیاڵی نەخۆشیان وێنایان کردووەو دەیانەوێ مانای وەحیی و «نبوة»ی بەسەردا ببڕن پوچی دەکاتەوە، هەرچی هەڵیان بەستووە دەربارەی ئەو وەحیی و «نبوة»ی خودا ڕێزی پێ لە پێغەمبەر ناوە، دەیانکاتە بڵقی سەر ئاوو بەپاشدا دەچنەوە دەکەونە زبڵدانی مێژووەوە.

جا کەتو ئەمەت زانی و بۆت رون بۆوە ئەو کاتە هەست بە ئەندازەی حیکمەتی خودا دەکەی لەوەدا کەوا داخواز بووە سەرەتای دابەزینی نیگا بەوجۆرە بێ کە ویستی پەروەردگاری لەسەر بووە.

وێدەچێ گومانچی و خۆرهەڵاتناسە داخ لەدڵەکان بابدەنەوەو پرسیاربکەن و بڵێن: بۆچی لەوەدوا کەنیگا بۆ موحەممەد دەهات و زۆر لە هاوەڵانی لە دەوروپشتی بوون و لێیەوە نزیك بوون کەچی جگە لەخۆی کەس لە هاوەڵان فریشتەی نیگا هێنەریان نەدەبینی؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: مەرج نیە هەرچی نەبیندرێ مەوجود نەبێ، چونکە هۆکاری بینین لەلای لەئێمە سنوورێکی دیاریکراوی هەیە، لەو سنووره تێپەڕی توانای دەوەستێ. ئەمە راستیەکی حاشا هەڵنەگرە، ئەگینا ئەگەر وانەبێ دەبێ هەرشتێك لە مەودای بینینی ئێمە دوورکەوتەوەو نەمان توانی ببینین، دەبێ بە نەبووی حسێب بکەین و بڵێین نیە، ئەمەش پێچەوانەی ئەلفبای زانستییە. وێڕای ئەوەش دەڵێین: پەروەردگار «کە هەر خۆی خالیق و بەدیهێنەری چاوو هێزی دیتنیەتی» بەلایەوە ئاسان و ئاساییە هێزی بینینی وابدا بەهەندێ چاو شتی وا ببینێ چاوی تر نەتوانێ ببینێ.

مالیکی کوڕی نەبی دەڵێ: «کوێربوونەوەی ڕەنگەکان حاڵەتێکی نموونەییمان دەخاتە بەرچاو، کە ناگونجێ هەندێ ڕەنگ لەو حاڵەتەدا بەهەموو چاوێك ببیندرێن. هەروا کۆمەڵە تیشکێکی روناکی هەن لەخوار رەنگی سورو لەژوور رەنگی بەنەفسەجییەوەن، چاوی ئێمە ئەو تیشکانە نابینن، شتێکی زانستی چەسپاویش نیە ئەوە بسەلمێنێ کە بۆ هەموو چاوێك ئەو حاڵەتە وایە، دەشێ هەندێ چاو هەبن حەساسیەتی کەمتر یان زیاتر بێ و ئاستی بینیی زیاتربێ»[١].

ئەمجار بەردەوامبوونی وەحیی بۆخۆی بەڵگەی بەهێزی پێیە لەسەر حەقیقەت و راستی وەحی، نیشانەی ئەوەشە کە واقیع وەکوو ئەوەنیە کە گومان پەیداکەران بانگەشەی بۆ دەکەن و دەڵێن: وەحیی دیاردەیەکی نەفسی روت بووە. دەتوانین: ئەو بەڵگە بەهێزەی وەحیی خۆی دەیگەیەنێ لەم خاڵانەدا کورتی بکەینەوە:

١- جوداوازییەکی ئاشکراو روون هەیە لەنێوان قورئان و حەدیثدا، بە نیسبەت قورئانەوە، پێغەمبەر ﷺ هەر لەگەڵ نیگا دادەبەزی، خێرا فەرمانی دەدا بە نووسینەوەو تۆمارکردنی، لەکاتێکدا بەنیسبەت حەدیثەوە هەر بە ئەوەندە کیفایەتی کردووە کە فەرموودەکانی سپاردووە بەزاکیرەی هاوەڵان و فەرمانی نەکردووە بە تۆمارکردنی، ئەمەش نەك لەبەرئەوە کە حەدیث قسەی پێغەمبەر خۆیەتی و پەیوەندی بە پێغەمبەرایەتییەوە نیە، بەڵکوو لەبەر ئەوەبوو: قورئان بەنیگا «بە لەفظو ماناوە» بە واسیتەی حەزرەتی جوبرائیلەوە نازڵ کراوەتە سەر دڵی پێغەمبەر... وەڵێ حەدیث هەرچەندە ماناکەی بە وەحی لەخوداوە بۆ هاتووە بەڵام وشەو رستەکان لەلایەن پێغەمبەرەوە رێك خراون و کراون بەدەق و فەرموودە. هەمیشە پێغەمبەر هۆشداری دەداو هاوەڵانی

---

١ - الظاهرة القرآنية/١٢٧.

دەترساند لەوەی کەلامی خودا «کە بە لەفظو ماناوە» بەهۆی حەزرەتی جوبرائیلەوە بۆی دەهات تێکەڵ بە فەرموودەکانی خۆی بێ.

٢- هەندێ جار پێغەمبەر دەربارەی بڕێ کاروبار پرسیاری لێ دەکراو وەڵامی دەدایەوە، وادەبوو ماوەیەکی درێژ بەسەر وەڵامدانەوەکەیدا تێدەپەڕی، ئەمجار ئایەتێك نازڵ دەبوو وەڵامی پرسیارەکەی لەخۆ دەگرت. وادەبوو پرسیارکەرێك پرسیاری دەکردو پێغەمبەر ئەو ئایەتەی کە دەربارەی پرسیارەکەی هاتۆتە خوارێ بەسەردا دەخوێندەوە. وایش دەبوو بڕێ جار دەربارەی هەندێ کاروبار پێغەمبەر ﷺ هەڵوێست هەڵس‌و کەوتێکی تایبەتی پەیڕەو دەکرد، ئیتر ئایەتی قورئان نازڵ دەبوون لەو هەڵوێست‌و هەڵس‌و کەوتەی لای دەدا، وادەبوو ئایەتەکان جۆرە سەر زەنشت‌و لۆمەیشی لەخۆ دەگرت.

٣- پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بوو... ناگونجێ مرۆڤ بەهۆی موکاشەفەی نەفس‌و ئیشراقاتی روحییەوە فێری حەقائیقی مێژوویی بێ. کێ بەهۆی موکاشەفەی نەفسییەوە توانیویەتی ئاگاداری روداوی مێژویی ببێ، کێ لەو رێگەوە توانیویەتی ئاگاداری روداوی وەکوو سەرگوزشتەی حەزرەتی یوسف‌و داستانی دایکی موسا کە جگەر گۆشەکەی خستە صندوقێکەوەو بە روباری نیلی دادا. هەروا سەرگوزشتەی فیرعەون‌و گەلێ سەر گوزشتەی تری لەوجۆرە ببێ. لە راستی دا ئەمە بەشێکە لەو حیکمەتانەی ئەوە کە پێغەمبەر نەخوێندەوار بووە. {وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ – العنكبوت/٤٨}.

٤- بێگومان راستگۆیی پێغەمبەر لەماوەی چل ساڵی تەمەنی پێش پێغەمبەرایەتی‌و ناوبانگ دەرکردنی بەو رەوشتە بەرزەو گەلێك رەوشتی جوانی تر، داخوازی ئەوەیە کە حەزرەتی موحەممەد لەپێش ئەوەی ببێ

بــە پێغەمبــەر، راســتگۆ بــووە لەگــەڵ نەفــسی خــۆی. بۆیــە دەبــێ لەبیرکردنــەوەو دیراســەی دیــاردەی وەحیــدا هــەموو شــكو گومــانێکی رەواندبێتەوەو قەڵاچۆی کردبن کە بەخەیاڵیدا هاتوونو لەپێش چاوی خۆیان نواندووە.

هەر دەڵێی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: {فَإِن كُنتَ فِي شَـكٍّ مِّمَّـا أَنزَلْنَـا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَاءَكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ – يونس/٩٤}.

بـۆ رەتدانــەوەی دیراســەو هەڵــسەنگاندنی یەکــەمجاری دەربــارەی شــەئنی خــۆی لەگــەڵ دیــاردەی وەحــی نــازڵبوون. بۆیــە لــە پێغەمبــەرەوە ریوایەت کراوە کەدوای نازڵبوونی ئەم ئایەتە فەرموویەتی «لا أشك ولا أسأل» نانا گومانم نیەو پرسیاریش ناکەم«١».

## بەشی سێیەم

# لەرۆژی بوون بە پێغەمبەرییەوە تا کۆچکردنی بۆ مەدینە

## قۆناغەکانی بانگەوازی ئیسلامی لەژیانی پێغەمبەردا

بانگەوازی ئیسلامی لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ لە ساتەکانی نازڵبوونی یەکەم سروش تا دوا رۆژی ژیانی پیرۆزی، بەچوار قۆناغدا تێپەڕیوە.

**قۆناغی یەکەم:** بانگەوازی نهێنی کە سێ ساڵی خایاند.

**قۆناغی دووەم:** بانگەوازی ئاشکرا بەڵام بەبێ شەڕو بەگژدا چوونەوەی کافرەکان، ئەم قۆناغە تا کۆچکردنی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینەی خایاند.

**قۆناغی سێیەم:** بانگەوازی ئاشکراو شەڕکردنیش لەگەڵ دەست درێژی کاران و ئەوانەی دەست پێشخەری دەکەن بۆ شەڕ. ئەم قۆناغەش تا ساڵی ئاشتینامەی حودەیبییە «صلح الحديبية» بەردەوام بوو.

**قۆناغی چوارەم:** بانگەوازی بەئاشکراو بە شەڕکردنیش لەگەڵ هەرکەس و لایەنێك لەبەردەم بانگەوازییەکەدا بوەستێ، یان وێڕای بانگەوازیکردن بۆی، ملنەدا بۆ ئیمان هێنان و ئەهلی کیتابیش نەبێ، چونکە ئەهلی کیتاب دەتوانن ئیمان نەهێنن و سەرانە بدەن.

ئەم قۆناغە بووەتە حوکمێکی گشتی و کاروباری تەشریعی ئیسلامی لەسەر دەمەزراوە، حوکمی جیهادی ئیسلامی لەسەر واقیع و شێوەی ئەم قۆناغە چەسپاوە.

# قۆناغی بانگەوازیی کردن بەنهێنی

پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی فەرمانی پێکرا دەست بکا بە بانگەوازی خەڵك، کەوتە خۆو دەستی کرد بە بانگەوازیی کردنی خەڵك بۆ بەندایەتیکردن بۆ خوداو یەکتا پەرستیو وازهێنان لە بتپەرستی، وەلێ زۆر بەنهێنیو وریاییەوە ئەم ئەرکەی بەجێ هێنا، چونکە حەزەری ئەوەی دەکرد لەگەڵ قورەیشییە سەر رەقو دەمار گیرەکاندا موفاجەئەو روداوی چاوەڕوان نەکراوی بۆ پەیدا ببن.

ئەوەبوو پێغەمبەر لەم قۆناغەدا پەیوەندی دەکرد بە تاکەکانی کۆمەڵگەی قورەیشەوەو بەتایبەتی ئەوانەی لەوەپێش ناسیاوی باشی هەبوو لەگەڵیاندا، یان خزمی نزیکی بونو پەیوەندی بەهێزی لەگەڵیاندا هەبوو، هەرگیز نەدەچووە کۆڕو کۆمەڵی قورەیشییەکانەوە بانگەوازی بڵاو بکاتەوە، لە نادیو دیوە خانەکانیاندا دەعوەی نەدەکرد.

لەوانەی سەرەتاو هەوەڵجار موسوڵمان بوون خەدیجەی کچی خوەیلید، عەلی کوڕی ئەبو طالیب، زەیدی کوڕی حاریثە، ئەبو بەکری صدیق. عوسمانی کوڕی عەففان. زوبەیری کوڕی عەوام. «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوف. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصو هی تریش. «خودا لەهەموویان رازی بێ». ئەم زاتانە بەنهێنی پەیوەندییان بە حەزرەتی موحەممەدەوە دەکردو نەصیحەتو ئامۆژگارییان لێ وەردەگرت. ئەگەر یەکێکیان بیویستایە عیبادەتێك ئەنجام بدا، خۆی دەدزییەوەو دەچوو بۆ شیوو دۆڵەکانی مەککە بەدزی کافرەکان عیبادەتی خۆی ئەنجام دەدا.

پاشان کە ژمارەی موسوڵمانەکان لەژنو پیاو لە سی کەس تێپەڕین پێغەمبەر ﷺ ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبولئەرقی بۆ دیاریکردن بۆئەوەی

لەوێ چاویان بە پێغەمبەر بکەوێ نەصیحەتو ئامۆژگاری پێویستی لێ وەربگرن.

تەواوی ئەوانەی لەم سەرو بەندەدا موسوڵمان بوو بوون بە ئافرەتو پیاوەوە نزیکەی چل کەس بوون، زوربەیان لەچینی هەژارو کۆیلە بوون لەناو قورەیشدا چ پێگەیەکی وایان نەبوو»[١].

**پەندو ئامۆژگاری:**

## ١- هۆی ئەوەی کە لەسەرەتادا بانگەوازی بەنهێنی بووە:

گومان لەوەدا نییە کە شاردنەوەی بانگەوازی لەلایەن پێغەمبەرەوە لەسێ ساڵی سەرەتای دەعوەی ئیسلامیدا بەهۆی ئەوە نەبووە لەترسی خۆی بووبێ، لەوە ترسابێ زیانی پێ بگا. تەشریفی کاتێك ئەرکی بانگەوازی خرایە ئەستۆیو ئایەتی {یَا أَیُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ....} نازڵبووە سەری، لێی یەقین بوو، کە پێغەمبەرەو رەوانەکراوە بۆسەر ئادەمیزاد. ئیتر لەوە دڵنیابوو کە ئەو خودایەی کردویەتی بە پێغەمبەرو ئەرکی دەعوەی خستۆتە ئەستۆ. دەتوانێ لەدەستی ناحەزان بیپارێزێو توانای ئەوەی هەیە نەهێڵێ کەس زیانی پێ بگەیەنێ. لەلایەکی ترەوە ئەگەر پەروەردگار فەرمانی پێ بکردایە لە یەکەم رۆژی بانگەوازییەوە بە ئاشکرا دەعوە بکاو خەڵکی بانگ بکا بۆ ئیمان هێنان بەخوداو وازهێنان لە بتپەرستی. ئەگەر خودا فەرمانی ئەوەی پێ بکردایە، بێ شك ساتە وەختێك خۆی ماتڵ نەدەکرد، یەکسەر فەرمانی خودای بەجێ دێنا. تەنانەت ئەگەر سور بیزانیبا ئەوە دەبێتە هۆی تێداچوونی گیانی خۆیشی، چرکە ساتێك خۆی دوا نەدەخست.

---

١ - بڕوانە سیرەی ئیبنو هیشام ج١/ ٢٤٩ — ٢٦١.

وەلێ پەروەردگار ئیلهامی وای خستە دڵیەوە کە لەسەرەتادا بە نهێنی بانگەوازی بکا، ئیلهامیش بۆ پێغەمبەر جۆرێکە لەوەحی و سروش.

ئەوەشی خستبووە دڵەوە: کە سەرەتا بانگەوازییەکەی ئاراستەی ئەوانە بکا کە پێی وایە داواکەی رەت ناکەنەوەو ئیمانی پێ دێنن. بۆئەوەی لەوەدواش بانگخوازانی ئیسلام چاو لە پێغەمبەر بکەن و بزانن چۆن بانگەوازی خۆیان ئاراستە دەکەن و ئاراستەی کێی دەکەن، هەروا بۆ رێنمونی بانگخوازانە کە بزانن ترس و وریایی و گرتنەبەری هۆکاری جۆراو جۆر بۆ گەیشتن بە مەبەست رەوایە. هەرشتێك عەقڵی راست فکری راست بیسەلمێنێ کە گونجاوە پەیرەو بکرێ دەبێ پەیرەو بکرێ بۆ گەیشتن بەئاکام و ئامانجی دەعوەی ئیسلامی، بەمەرجێ ئەو هۆکارە پەیرەو کراوانە هاوشان بن لەگەڵ پشت بەستن بەخودا، بەڵکوو دەبێ لایەنی پشت بەستنەکە بەخودا هۆکاری سەرەکی بێ و نابێ مرۆڤ وابزانێ کە هۆکارەکانی تر کاریگەری و فەعالییەتیان هەیە هەر دەبێ بڕوای وابێ، هۆکارەکانی تر ئەسبابی رواڵەتین و ثانەوین، کاربەدەست و کاریگەر لەهەموو شتێك دا دەسەڵاتی خودایە، بۆیە بانگخوازی ئیسلامی نابێ ئیعتیمادی لەسەر خودا لاوازبێ.. چونکە ئەمە زیان بەخودی ئیمان دەگەیەنێ و لەقی دەکا، جگە لەوە ئەمە لەگەڵ سروشتی دەعوەی ئیسلامی ناگونجێ. لێرەوە دەزاندرێ کە شێوازی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ لەم قۆناغەدا لە هاوشێوەی «ألسياسة الشرعية»یەو لەم روانگەوە کە پێغەمبەر رابەرو پێشەوابێ و لەوەدوا بانگخوازانی ئیسلامی چاوی لێ بکەن. نەك لەکارە تەبلیغییەکانی بێ لە پەروەردگارەوە بەو صیفەتەی کە پێغەمبەرە. لەسەر ئەم بنەمایە، شیاوو دروستە بۆ بانگخوازانی ئیسلامی لەهەموو رۆژگارو سەردەمێکدا کە لەشێوازی دەعوەو بانگخوازیدا نەرم و نیانی بنوێنن یان توندیی! بەگوێرەی بارودۆخ و

بیئەو کۆمەڵگا، شێوازی نهێنی یان ئاشکراو خۆ دەرخستن. نەرمی نواندن یان بەکارهێنانی هێزو توانا چییان بەباش زانی چۆن سەرکەوتوو دەبن ئاوا هەڵس و کەوت بکەن.

نەرم و نیانی نواندن لەبواری بانگخوازیدا نەرمی نواندنێکە شەریعەتی ئیسلامی بەپشت بەستن بە واقیعی سیرەو ژینامەی پێغەمبەر سنووورداری کردووە، لە چوارچێوەی ئەو چوار قۆناغەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا بە زنجیرە پەیڕەوی کرد. دەبێ ئەوەش بەرچاو بگرین کە لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە شێوازێك لە شێوازەکانی بانگخوازی ئیسلامی دا، دەبێ بڕوانینە بەرژەوەندیی موسوڵمانان و بەرژەوەندیی دەعوەی ئیسلامی، کامیان لەبارو گونجاوە ئەوە بگرینە بەر.

لەبەرئەوە فوقەهای ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە هەرکاتێك موسوڵمانان کەم بوون یان لاوازو بێ کەرەسەو تفاق بوون بەجۆرێك ظەننی غاڵبیان هەبوو کە ئەگەر خۆیان دەرخەن دەکوژرێن لەناو دەبرێن زیاد لە ئەندازە زیانیان پێ دەگەیەندرێ، ئەوە پێویستە بەرژەوەندی پارێزگاری گیان پێش بخەن لە بەرژەوەندی پارێزگاری ئایین.

گەورە زانای موسوڵمان «العِزّ»ی کوڕی «عبدالسلام» دەفەرموێ: هەرکاتێك جیهادو تێکۆشان لەبارو دۆخێك دابوو کە ئەنجامدانی و پەیڕەوکردنی بە ظەننی غاڵب ئاکامەکەی تێداچوونی موسوڵمانان بوو، ئەو جیهادە نابێ بکرێ و ئەنجامدانی حەرامە. دەڵێ «فاذا لم تحصل النکایة وجب الانهزام» لەهەر شەڕو ڕووبەڕونەوەیەکدا نەتوانی زیان بەدوژمن بگەیەنی و سەرکەوتن بەدەست بێنی، هەڵاتن و خۆ قوتارکردن لەدەست دوژمن واجب و پێویستە. چونکە لەخۆ ڕاگری و بەردەوامبوون لەڕوبەڕوبونەوەدا بە ظەننی غاڵب گیان لەدەستدانی موسوڵمانانی تێدایە و دڵخۆشی و بەمراد گەیشتنی کافرانی لێدەکەوێتەوەو سەر شۆڕی بۆ ئەهلی ئیسلام دێتەکایە. لەبارودۆخی ئاوادا مانەوە لە

گۆڕەپانی روبەڕوبونەوەدا، مەفسەدەیەکی ئاشکراو نومایانە، هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نابینرێ. دەتوانین بڵێین: پێشخستنی بەرژەوەندی گیان بەسەر بەرژەوەندی ئاییندا لە روانگەی رواڵەت‌و ظاهیرەوەیەو بەس! ئەگینا لە واقیع‌و لە ئاکامی دووردا هەر دەبێتەوە بەرژەوەندی ئایینی، چونکە بەرژەوەندی ئایینی لەم حاڵانەدا وا دەخوازێ گیانی موسوڵمانان پارێزراوبێ‌و تێدانەچێ بۆئەوەی پێشکەوتن بەدەست بێنن‌و لەبواری تردا، لەشوێنی تری کراوەدا پەرە بەجیهادو تێکۆشانی خۆیان بدەن. دەنا لەناوچونی موسوڵمانان بە زیانکەوتن لەخودی ئایین دەژمێردرێ‌و دەبێتە مەجال کردنەوەو رێگا چۆڵ کردن لەبەردەم کافراندا، بۆئەوەی ئەو بەربەستەی لە پێشیانە رایماڵن، ئەو رێگایانەی لێیان داخرابوون ئاوەڵایان بکەن.

بە کورتی‌و پوختی ئاشتیخوازی یان بەنهێنی بانگەوازی کردن لەکات‌و شوێن‌و بارودۆخی وادا: کە ئاشکراکردنی دەعوە یان شەڕکردن لە پێناویدا زیانبەخش بێ بە موسوڵمانان، ئا لەبارودۆخی ئاوادا واجبە دەعوەکە بەنهێنی ئەنجام بدرێ. هەرکاتێکیش بانگەوازیکردن بەئاشکرا لەتوانادا بوو، بەرژەوەندی ئیسلامی داخوازی دەنگ هەڵبڕین‌و بە ئاشکرا کردنی دەعوە بوو، دەبێ لەحاڵەتی نهێنییەوە بچێتە حاڵەتی ئاشکرایی‌و سام‌و هەیبەتی خۆی بنوێنێ. هەروا ئاشتیخوازی لەگەڵ ستەمکاران‌و دوژمنانی دەست درێژیکار دروست نیە، ئەگەر ئەسباب‌و هێزی بەرگری کردن لەلای موسوڵمانان دەستەبەر ببێ. دانیشتن‌و پاڵدانەوە لەچون بۆ جیهادی کافران حەرامەو هەڵوێستی ناپەسەندە، بەمەرجێ ئەسبابی جیهادو هۆکارەکانی دەستەبەر بوبن‌و بەرژەوەندی ئیسلام‌و موسوڵمانان لەچون بۆ جیهاددا بێ.

## ٢- ئەوانەی سەرەتا موسوڵمان بوون و حیکمەتی خێرا موسوڵمان بوونیان لەپێش خەڵکانی ترەوە:

سیرەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: کە ئەوانەی لە قۆناغی سەرەتایی بانگەوازی ئیسلامیدا موسوڵمان بوون زۆربەیان هەژارو بێ دەسەڵات و کۆیلە بوون، دەبێ حیکمەت و نهێنی ئەم دیاردەیە چی بێ؟ دەبێ چ سرێك لەپشت ئەوەوەبێ دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێ لەسەر دەست و بازوی کەسانی لەوجۆرە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەجێیە ئەوەیە، دەڵێین: ئەو دیاردەیە ئاکام و بەروبومێکی سروشتی بانگەوازی پێغەمبەرانە لە قۆناغی یەکەم بانگەوازییەکەیاندا، هەر پێغەمبەرێك بانگەوازی ئایینی خودای بڵاو کردبێتەوە ئەوانەی سەرەتا بەپیر بانگەوازییەکەیەوە چون چینی هەژارو لاوازو چەوساوە بووە.

بۆ نموونە: بڕوانە گەلی نوح چۆن حەزرەتی «نوح»یان بەوە لەککەدار دەکرد، کە شوێنێکەوتوانی چینی هەژارو بێ دەسەڵات و بۆرە پیاون. قورئان لەسەر زمانی ئەوان، دەفەرموێ: {مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ – هود/٣٧}.

بڕوانە فیرعەون و دارو دەستەکەی چون دەیانڕوانییە حەزرەتی موسا و نەتەوەکەی؟ چەند بەچاوی سوك سەیریان دەکردن! بەهیچ و پوچ لاوازو بێ دەسەڵاتیان دەزانین!. تەنانەت پەروەردگار دوای ئەوەی سەرگوزشتەی بەهیلاکچونی فیرعەون و دارو دەستەکەی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: {وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا – الأعراف/١٣٧}.

هەروا قەومی ثەمود کە خودا حەزرەتی «صالح»ی کردە پێغەمبەرو ناردیە سەریان، ئەوانەی دەوڵەمەندو خاوەن دەسەڵاتبوون، پشتیان لێ

هەڵکردو ئیمانیان پێ نەهێنا، ئەوانەی بڕوایان پێ کردو شوێنی کەوتن لەچینی هەژارو چەوساوە بوون... قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ: {قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ – الأعراف/ ٧٥ – ٧٦}.

حیکمەتو نهێنی لەم دیاردەیەدا ئەوەیە: حەقیقەتی ئەم ئایینەی خودا گشت پێغەمبەرانی خۆی پێ ناردوە ئەوەیە، مرۆڤ لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤ رزگار بکاو بیانخاتە ژێر حوکمو دەسەڵاتی خوداوە، تەنها ئەو بپەرستن‌و شەریعەتی ئەو پەیڕەو بکەن. ئەمەش حەقیقەتێکە یەکەم کەس کە چڕنوکی لێ دەدرێ‌و زیانی دونیایی لێ دەکەوێ‌و بەرژەوەندییەکانی نامێنن، چینی خۆ بەخودا زان‌و دەرەبەگ‌و فەرمانڕەواو خۆ بەپاشا زانەکانە، ئایینەکە لەبەرژەوەندی ئەوان دەداو چنگ‌و نینۆکی ئەوان دەقرتێنێ، لەهەمان کاتدا موناسیب‌و گونجاوە لەگەڵ حاڵ‌و وەزعی چینی چەوساوەو هەژارو کۆیلە.

ئیتر بۆیە «رد الفعل»و بەرپەرچدانەوەو لەمپەڕ دروستکردن لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامداو گەردنکەچی بۆ شەریعەتی خوداو پابەندبوون بە یەکتا پەرستییەوە لەپیاو ماقوڵ‌و گەورە گەورەکانی قوڕەیشەوە سەری هەڵداو ئەوان ملیان نەداو لوتبەرزییان نواند. بە پیرەوە چون‌و موسوڵمان بوون لەچینی هەژارو چەوساوەدا رەنگی دایەوەو ئەوان بوونە دەستەی یەکەم لە موسوڵمان بووندا. بێگومان ئەم حەقیقەت‌و راستییە بە ئاشکرا لەو گفت‌و گۆیەی رۆستەم «سەرکردەی سوپای فارس لە جەنگی قادسیەدا» لەگەڵ «رەبعی کوڕی عامیر» سەربازێکی ئاسایی‌و بەسیط لە سوپای سەعدی کوڕی وەقاصدا. دەردەکەوێ‌و خۆی دەنوێنێ.

روستەم بەرەبعی کوڕی عامیری گوت: چی ئێوەی هەڵنا شەڕمان لەگەڵ بکەنو هێرش بێننە ناو خاكو وڵاتمانەوە!

رەبعی کوڕی عامیر لە وڵامدا وتی هاتووین بۆئەوەی مرۆڤەکان لەژێر دەستی ملهوڕەکان رزگار بکەین، هاتووین هەرکەسێ بیەوێ لە بەندایەتی کردن بۆ عیباد رزگاری بێو تەنها بەندایەتی بۆ خودا بکا، رزگاری بکەینو ئازادیی پێ ببەخشین. ئەمجار سەیری ئەو ریزە خەڵکانەی کرد کە لەراستو چەپی رۆستەمەوە بەمل شۆڕیو سەرنزمی راوەستابونو روحیان لەبەر نەبوو لەترسو سامی رۆستەم. بەسەر سوڕمانەوە پێی گوتن: ئێمە لەوەپێش هەواڵو باسو خواسی ئێوەمان وا پێگەیشتبوو کە عاقڵمەندو ژیرن، وەلێ ئێستا من وادەزانم هیچ کەس لەئێوە گێلتر نیە. ئێمەی کۆمەڵی موسوڵمانان هەرگیز کەسمان بەندایەتی کەسمان ناکەین، پێم وابوو ئێوەش وەهان. نەمزانی کە هەندێکتان بوونە خودای هەندێکی ترتان! باشتر لەو هەڵوێستەی نواندتان ئەوەبوو بتانگوتایە ئێمە هەندێکمان خودای هەندێکمانین.

ئیتر هەژارو بێ نەوایەکان سەریان هەڵبڕیو بەگوێی یەکترییاندا چرپاندو وتیان: «والله» کاکی عەرەب راست دەکا. بەڵام سەرۆكو پیاو ماقوڵەکان لە وتەکەی رەبعی کوڕی عامیر دا تووشی شۆك بوون، وەکوو هەورە بروسکەو شریخەی هەور لێی دانو روخاندنی. هەندێکیان بە هەندێکیان گوت: «بەڕاستی ئەم کابرا عەرەبە قسەیەکی وەهای فڕێدا بۆ هەتا هەتایە کۆیلەو خزمەتکارەکانمان پەنای بۆ دەبەن»[١].

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە هەژارو کۆیلەو لاوازەکان پەلەکردنیان بۆ چونە ناو ئیسلام پێش کەسانی تر، موسوڵمان بوونەکەیان بەحەزو

---

١ - بڕوانە درێژەی ئەم چیرۆکە لە کیتابی ـاتمام الوفاء في سيرة الخلفاء/ محمد الخضری ص١٠٠..

رەغبەت نەبوەو، بەڵکوو مەبەستیان ئەوە بووە لە چەوسانەوە رزگاریان ببێ و دەسەڵات و فەرمانی ملهوڕەکانیان لەسەر لابچێ، نەخەیر نابێ ئەم بۆچوونە قبوڵ بکرێ، بۆچونێکی هەڵەیەو مێژوو دژی دەدوێ، چونکە ئەوە شتێکی چەسپاوو حاشا هەڵنەگرە کە ئیمان بەخوداو بەڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ئەندازەی هاوبەش بوو لەنێوان سەرانی قوڕەیش و چەوساوەو هەژارەکانیاندا. هیچ کام لەوانە گومانی لەوەدا نەبوو کە حەزرەتی موحەممەد راست دەکاو پێغەمبەری خودایە، وەلێ زوعەماو پیاو ماقوڵانی قوڕەیش ترسی لەدەستدانی پلەو پایەی خێڵەکی و لوتبەرزییان وای لێکردن بە پیر بانگەوازی پێغەمبەرەوە نەچن و شوێن پەیامەکەی نەکەون. ئاشکراترین نموونە لەسەر ئەم راستییە ئەبو طالب و ئەمثالی ئەون. وەلێ هەژارو چەوساوەکان هیچ شتێکی وانەبوو ببێتە لەمپەڕو لەئیمان هێنان بیانگێڕێتەوە. زیاد لەوە ئەو هەژارو چەوساوانە کە یەکێکیان ئیمانی دەهێنا بە تاک و تەنهایی خودا، جۆرە عیززەت و شکۆمەندییەکی لەخۆیدا دەبینی، جگە لە دەسەڵاتی خودا هیچ دەسەڵاتێکی تری بەلاوە گرنگ نەبوو، جگە لەهێزی خودا لەهیچ هێزێکی تر نەدەترسا. ئەم هەستەی کە بەرووبوومی ئیمانهێنان بەخودایە، هێزو پێزی زیاتری دەدا بە دڵ و دەروونیان و وای لێ دەکردن هەست بە بەختەوەری و گەشەو نەشە بکەن و پاشا بە سەپانی خۆیان بزانن.

لێرەوە دەزانین: کە ئەو بوختانەی خۆرهەڵاتناس و گومان پەیداکەران و دوژمنانی ئیسلام هەڵی دەبەستن چەند بوختانێکی گەورەیەو چەند بێ ویژدانانە لەم رۆژگارەدا غەزوی فیکریمان دەکەن. چەند نەزانن یان بڵێین چەند بێ ویژدان و دەروون نەخۆشن کاتێک کەپێیان وایە دەعوەی ئیسلامی: کە حەزرەتی موحەممەد بانگەوازی بۆ کردو بڵاوی کردەوە، زادەی بیئەی عەرەبی بووە، وەحی و هەڵقوڵاوی

ئـەو کۆمەڵگایـە بـووەو لـە واقیعـدا دەعوەکـەی هـیچ پەیوەنـدی بـە ئاسمانــەوە نــەبووەو نیگــای خــودایی نیــە، بــەڵکوو بانگەوازییەکــەی تەمثیلی جمو جوڵو گەشەکردنی فکری عەرەبی ئەو کاتەی کردووە.!!

جـا ئەگـەر ئـەم بۆچـوونە راسـتبوایە نـەدەبوو رەصـیدی ئـەم دەعـوە ئیـسلامییە دوای سـێ سـاڵ بانگـەوازی چـل کەسـبن بـەژنو پیـاوەوە، زۆربەشــیان لەچــینی هــەژارو بینــەواو کۆیلــەو بــێ پــشتو پــەنابن، تێکەڵەیــەك بــن لــە عــەرەبو ناعــەرەبو صــوهەیبیو رۆمــیو بــیلالی حەبەشییان تێدا بێ.

لـەوە بـەولاوە لـە باسـەکانی داهاتومانـدا دەبینـی هـەر ئـەو بیئـە عەرەبیـەی «کـە ئـەوان پێیـان وایـە ئیـسلام فکرەیەکـە هـەڵقولاوی ئـەو کۆمەڵگایەیـە» ئـەو بیئـەو کۆمەڵگەیـە بـوو شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەریان ناچـارکردن بــە هــەلاتن بــۆ ولاتــی حەبەشــە، پاشــان بــۆ مەدینــەو لەوەپێـشیش ئەزیەتـدانو چەوسـاندنەوەیان بەهـەموو جۆرێـك، بـەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەو بەهانەیەکیان بەدەستەوەبێ بۆ ئەم دژایەتیکردنەو نوانـدنی ئـەم هەڵوێـستە، جگـە لـەوەی کـە لەناخـەوە رقیـان لـەو پـەیامو فکرەو دەعوەیە بوو: کە ئەو موسوڵمانانە هەڵگری بوون!! ئەمڕۆش داخ لەدڵانی رەگەز پەرستو دوژمنانی ئیسلامو نۆکەرو چڵکاو خۆرەکانیـان دەڵـێن: پـەیامی موحەممـەد زادەو هـەڵقولاوی بیئـەو کۆمەڵگـەی عـەرەبی بووە!! «استغفر الله».

# بانگکردنی بەئاشکرا بۆ موسوڵمانبوون

ئیبنو هیشام دەڵێ: ئەمجار خەڵك پۆل پۆل لە پیاوو ئافرەت موسوڵمان دەبوون، هەتاوای لێهات دەنگ‌و باسی ئیسلام لەناو مەککەدا بڵاوبۆوەو خەڵك قسەو باسیان لێ دەکرد. ئیتر پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کرد کە ئیعلانی دەعوەکەی بکاو بەئاشکرا بانگەوازی ئیسلامی بەخەڵکی رابگەیەنێ. پەیوەندی بە خەڵکییەوە بکاو بانگیان بکا بۆ موسوڵمان بوون. ماوەی نێوان سەرەتای بانگەوازی ئیسلامی بەنهێنی‌و ئیعلان کردنی سێ ساڵی خایاند، دوای تێپەڕبوونی ئەم سێ ساڵە پەروەردگار ئایەتی {فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ – الحجر/٩٤} نازڵ کرد.

هەروا ئایەتی: {وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ – الشعراء/ ٢١٤ – ٢١٥}. ئیتر دوای نازڵبونی ئەم دوو ئایەتە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا، ئەوەبوو دوابەدوای نازڵبوونی ئایەتی {فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ} تەشریفی چووە سەرکێوی «الصفا»و بانگی هەڵداو بەدەنگی بەرز فەرمووی: ئەی بەنی فەهر، ئەی بەنی عەدی، هەتا خەڵکێکی زۆر لەدەوری گردبوونەوە، تەنانەت ئەوانەی کە بۆیان نەکرا ئامادەبن بریکارێکیان نارد بۆئەوەی بزانێ حەزرەتی موحەممەد چ هەواڵێکیان دەداتێ‌و بۆچی بانگیان دەکا. کە خەڵکەکە لێی کۆبوونەوە، فەرمووی: ئەرێ خزمینە! ئەگەر من هەواڵتان بدەمێ: کە لەشکرو ئەسپ سوار لەدوا ئەو کێوە خۆیان ئامادە کردووە بۆئەوەی هێرش بێننە سەرتان، ئایا ئێوە بڕوام پێ دەکەن؟ هەموو وتیان: ئێمە درۆمان لێ نەدیوی چۆن بڕوات پێ ناکەین. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبزانن من دەتانترسێنم‌و هۆشداریتان دەدەمێ لەوەی عەزابی سەخت چاوەڕێتانە

پێش ئەوەی تووشی ئەو سزایە بن داواتان لێ دەکەم ئیمانم پێ بێنن‌و سەرفرازی دونیاو قیامەت بن. ئەبو لەهەب وتی: دەك خودا لەناوت بەرێ ئەوە بۆئەوە ئێمەت کۆکردەوە؟ ئیتر ئایەتی {تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ.......} نازڵ بوو.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی «الصفا» دابەزیو بۆ جێبەجێ کردنی ئایەتی {وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ} ئەوەبوو هەموو هۆزو بنەماڵەو خزم‌و کەس‌و کاری خۆی کۆکردنەوەو روی تێکردن فەرمووی: ئەی «بنی کعب بن لؤی» خۆتان لەسزای ئاگر رزگار بکەن. ئەی «بنی مرة بن کعب» خۆتان لەسزای ئاگر رزگار بکەن. ئەی «بنی عبد شمس» خۆتان لەسزای ئاگر رزگار بکەن. ئەی «بنی عبد المطلب» خۆتان لەسزای ئاگر رزگار بکەن. ئەی «فاطمة» نەفسی خۆت لە ئاگر بپارێزە، چونکە من دەسەڵاتی هیچم نیەو لەئاست پەروەردگارداو لەبەردەم خوادا هیچم بەدەست نیە، تەنها ئەوەیە ئێوە خزمن‌و منیش ئەو پەیوەندییە خزمایەتییە زیندوو دەکەمەوە.

رەتدانەوەی قورەیشییەکان لەبەرامبەر ئیعلانکردنی بانگەوازی لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەوەبوو پشتیان تێکرد، گوێی خۆیان لە ئاستی هاخنی‌و بیانوی ئەوەیان دەهێنایەوە کە ئەوان ناتوانن ئایینی باوك‌و باپیریان واز لێ بێنن، ئەوان ئایینی بت پەرستییان لە باوك‌و باپیرانەوە بەمیرات بۆماوەتەوەو بۆوەتە عادەت‌و خو لەژیانیاندا، ناتوانن لێی دەست بەرداربن، ئیتر ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ کەوتە ئامۆژگاری کردنیان‌و هۆشیارکردنەوەیان کەبیرو فکری خۆیان عەقڵ‌و ئاوەزی خۆیان رزگار بکەن لە عیبادەتکردنی بت‌و صەنەم‌و وازهێنان لە لاسایی کردنەوەو تەقلید. داوای لێ کردن عەقڵ‌و مەنطیق بەکاربێنن، ئەوەی بۆ رونکردنەوە: کە ئەو بت‌و صەنەم‌و خودا درۆزنانەی ئەوان پەرستشیان

بۆ دەکەن‌و لە بەرامبەریان خۆیان کوشمەڵە دەکەن نەسودیان هەس نەزەرەر، هیچیان بەدەست نیە. پێشی راگەیاندن کە بیانو هێنانەوەیان بەوە کە ئەم بتپەرستییەیان لە باوک‌و باپیرانیان بۆماوەتەوە نابێتە پاساو و عوزرێکی بێ بنەمایەو لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەیە هیچ دادیان نادا. پەروەردگار هەڵوێستی قورەیشییەکان بەرامبەر ئیعلانی دەعوەو ئاشکرا کردنی بانگەوازی رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: {وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ – المائدة/١٠٤}.

رۆژگار تێپەڕین‌و پێغەمبەر ﷺ سوربوو لەسەر پەرەپێدانی بانگەوازییەکەی بە ئاشکراو لەناو کۆڕو کۆبونەوەکانیاندا. رەخنەی لەبتەکانیان دەگرت‌و گاڵتەی بە عەقڵ‌و فکریان دەکرد، بیانوو پاساوەکانیانی بەلاسایی کردنەوەی کوێرانەو گێلانە لە قەڵەم دەدا. تەنانەت کە ئەوان دەڵێن: ئێمە ئەم ئایینی بتپەرستییەمان لە باوک‌و باپیرانەوە بۆ ماوەتەوە، بابزانن باوک‌و باپیریشیان لەمان گێل ترو بێ عەقڵ تر بوون، ئیتر قورەیش بەم هەڵوێستەی پێغەمبەر تەواو شێلگیر بوون‌و چاکی دوژمنایەتی‌و بەرپەرچدانەوەیان لێ بەلادا کردو کەوتنە دژایەتیکردنی‌و بوختان بۆ هەڵبەستن بۆی، جگە لەوانەی لێیان موسوڵمان بوو بوون‌و جگە لە ئەبو طالب کە بەدافیعی مام‌و برازایی پشتگیری لێ کردو نەیدەهێشت قورەیشییەکان دەست درێژی بکەنەسەر، ئەگینا قورەیشییە کافرەکان هەموویان توانا و وزەی خۆیان خستە گەڕ بۆ رەتکردنەوەی پەیامی پێغەمبەر ﷺ.

## پەندو ئامۆژگاری:

لەم بەشەی ژیانی پێغەمبەردا سێ نیشانەو دەلالەت هەن، لێرەدا چرِیان دەکەینەوە:

یەکەم: پێغەمبەری خودا کاتێك بانگەوازییەکەی ئاشکراکردو بە عەلەنی داوای کرد لە قورەیشییەکان بەتایبەتی و هەموو عەرەب بەگشتی، داوای لێ کردن: کەواز لە بتپەرستی بێنن و چیدی لاسایی کوێرانەی باوك و باپیریان نەکەنەوە، لەم میانەدا موفاجەئەی کردن بەشێوەیەك کە چاوەڕوانیان نەدەکردو لەوەپێش پێی ئاشنا نەبوون، هەرگیز بە تەمانەبوون پێغەمبەر ئاوا بوێرانەو بەو شێوە زەقە بکەوێتە غەیبەتکردنی خوداکانیان، ئەمەش بە ئاشکرا لە ڕەتدانەوەکەی ئەبو لەهەبدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەکوو چۆن لە گەلەکۆمەکێ و خڕبونەوەی سەرانی قورەیش و یەك هەڵوێستییان لەسەر دژایەتی و بەرەنگاربوونەوەی پەیامی پێغەمبەر ﷺ ئاستی سەرسامی و تەنگەتاوییان بە تەواوی دەردەکەوێ...

ئەم هەڵوێستەی سەرانی قورەیش و ئەبو لەهەبیش ڕەتدانەوەیەکی دەمکوتکەرانەی تێدایە بۆ هەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن ئەم پەیامەی پێغەمبەر ﷺ «بە شەریعەت و ئەحکامیەوە» واوێنابکەن کە ئاکام و بەروبوومێکە لە بەروبوومەکانی نەتەوەیی عەرەب و لافی ئەوە لێ دەدەن: کە حەزرەتی موحەممەد بەم بانگەوازییەی کە بڵاوی کردۆتەوە لەو ڕۆژگارەدا تەمثیلی ئامانج و مەطامیحی عەرەبی کردووە!

توێژەرەوە و باحیث پێویست بەوەناکا خۆماندوبکا بۆ ڕەتدانەوە، یان موناقەشەکردنی دەعوایەکی لەم جۆرە گاڵتە ئامێزە: کە لە سیرەی پێغەمبەردا بەرچاو دەکەوێ نوسەرێك لەو نەتەوە پەرستانە بۆی تۆمار کردوین. لەڕاستیدا ئەوانەی تەرویجی گوتاری ئاوا دەدەن و هەوڵ دەدەن

لەناو خەڵکدا بڵاوی بکەنەوە، بۆ خۆیان پێش هەموو کەسێکی تر دەزانن قسەکەیان چەند بێ بنەماو گاڵتەجارە، بەڵام بەو حاڵەشەوە دەعوایەکەو لە دیدی ئەواندا پێویستە ئاراستە بکرێ بۆئەوەی ئایین لە مەسارو ڕێرەوی خۆی لابدەنو سوڵتانو دەسەڵاتی نەهێڵنو چەواشەکاری تێدابکەن. ئەوان بەلایانەوە گرنگ نیە داواو بۆ چونەکەیان راستەو صەحیحە ئەمجار تەرویجی بۆ بکەن. بەڵکوو گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندیو ئامانجەکانیان داخوازی ئەو جۆرە تەرویجەبێو خزمەتی مەبەستەکانیان بکا. هیوادارم ئەوەت لەیاد مابێ کە بەدرێژی لەبەشی پێنجەمی پێشەکییەکەدا سەبارەت بەم باسە نووسیومانە.

**دووەم**: دەکرا: کە پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەری خۆی نەکا کە هۆشداری بدا بە عەشیرەتو هۆزە نزیکەکانی، لەم ڕووەوە ئایەتی {فاصدع بما تؤمر}: کە پێغەمبەر جێبەجێی بکا خزمو عەشیرەتەکەشی لەوانە دەبن کە پێغەمبەر بانگەوازییان ئاڕاستە دەکا، کەوابوو حیکمەتو سڕی ئەوە چیە بەتایبەتی فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە خزمو عەشیرەتەکەی بترسێنێ.؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە ئاماژەیە بۆ پلەی بەرپرسیاریەتی هەموو موسوڵمانێك بەگشتیو بانگخوازانی ئیسلام بەتایبەتی. نزیکترین پلەی بەرپرسیاریەتی، بەرپرسیاریەتی شەخصە لەخودی خۆی. پێش هەموو شتێك مرۆڤ بەرپرسیارە لە نەفسی خۆی. جا بۆئەوەی ئەم پلەو دەرەجەیە مافی خۆی بدرێتی، قۆناغی سەرەتاو دەستپێکردنی وحیی ئەوماوە درێژە بەردەوام بوو کەزانیمان، ئەمەش بۆئەوەی دڵو دەروونی حەزرەتی موحەممەد دابمەزرێو جێگیرببێو بزانێ کە پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودایەو ئەو پەیامەی بۆی نازڵ دەبێ وەحییە لەخوداوە بۆی دێ، ئیتر بۆ خۆی بڕوای بە نەفسی خۆی بێو دڵو دەروونی خۆی

ئامادە باش بکا بۆ وەرگرتنی ئەوەی لە خوداوە بۆی دێ لە ئەحکامو یاساو بنەمای بیروباوەڕ.

پلەی دووەم بەرپرسیارییەتی موسوڵمانە بەرامبەر خاوو خێزانو خزمو کەسوکار، لەڕوانگەی ئەم بەرپرسیاریەتیەوە پەروەردگار بە ئایەتی {وأنذر عشيرتك الأقربين} خزمو عەشیرەتی پێغەمبەری خودای تایبەت کردن بە ترساندنو دەعوە ئاڕاستە کردنو پەیام پێڕاگەیاندن، ئەمەش دوای ئەوەی بە ئایەتی {فاصدع بما تؤمر......} پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە پەیامەکەی ئاشکرا بکاو بەگشتی بەهەموو کەسی رابگەیەنێ. ئەم پلەی بەرپرسیاریەتیە، کە بریتییە لە بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بەرامبەر خزمو کەسو کاری، هەموو موسوڵمانان تێیدا هاوبەشنو ئەرکەو لە ئەستۆی هەموو موسوڵمانێکی خاوەن خزمو خاوو خێزاندایە. هیچ فەرقو جوداوازییەك نیە لەنێوان بانگەوازی پێغەمبەر لەناو گەلو نەتەوەکەیداو بانگەوازی موسوڵمان لەناو خاوو خێزانو نەتەوەکەیدا. تەنها ئەوەندە هەیە پێغەمبەر بانگەوازی دەکا بۆ شەرعێکی تازەو نازڵ کراو لەلایەن خوداوە، بەلاّم موسوڵمانەکە بانگەوازی دەکا بە شەریعەتی پێغەمبەرەکەی، پەیامی ئەو دەگەیەنێ و لەزمانی ئەوەوە تەبلیغ دەکا. جاوەکوو دروستو رەوانیە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە پاڵی لێ بداتەوەو تەبلیغ نەکاو پەیامی بۆ نێردراوی نەگەیەنێ، هەروا دروست نیە بۆ گەورەی خێزان کە پاڵی لێ بداتەوەو پەیامی ئیسلام لەناو خێزانو نەتەوەکەیدا بلاّونەکاتەوە. بەڵکوو واجبە لەسەری و ئەرکی سەرشانیەتی کە هەڵیان بنێ بۆ خودا پەرستی و بەجێهێنانی ئەرکەکانی ئیسلامو پابەندبوون بە رەوشتە جوانەکانی ئایین.

پلەی سێیەم لە بەرپرسیارییەتی مرۆڤ بریتییە لە بەرپرسیاریەتی عالمو زانا لەشارو هۆبەو ولاّتی دەوروبەری. بەرپرسیاریەتی حاکمو

پارێزگارو فەرمانڕەوایە لە دەوڵەتو نەتەوەی خۆی ئەم دوو بەرپرسە لە تەبلیغو گەیاندنی پەیامی ئیسلامدا جێنشینی پێغەمبەرن، میراتگری شەرعی حەزرەتی رەسولن. چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ: {ألعلماء ورثە الأنبياء} زانایانی ئیسلام میراتگری پێغەمبەرانن.

زیادلەوە عیلمو زانین پێویسیاتی فەرمانڕەواو حاکمو خەلیفەو سەرۆك دەوڵەتە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، هیچ جوداوازییەك نیە لەنێوان سروشتی بەرپرسیاریەتییەك: کە خراوەتە سەرشانی پێغەمبەر ﷺ و بەرپرسیاریەتی عولەماو فەرمانڕەوایانی ئیسلام لەڕوی گشتگیریو بەرفراوانیدا. تەنها جوداوازی نێوانیان «وەکوو گوتمان» ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ شەرعی تازە دەگەیەنێو بەوەحیو نیگای خودا راستەو خۆ کاردەکا وەلێ عولەماو فەرمانڕەوا شوێن پێی پەیامی پێغەمبەر دەکەونو پابەندی سوننەتو سیرەتی حەزرەتی پێغەمبەرن لەوەی کەدەیکەنو دەیگەیەنن.

کەوابوو حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ لەلایەکەوە بەرپرسیاریەتی خودی خۆی لەسەر بووە، لەم روەوە کە موکەللەفو ئەرك لەسەرشانە، لەهەمان کاتدا بەرپرسیاریەتی خاوو خێزانو خزمو عەشیرەتی لەئەستۆ بووە، لەم روەوە کە خاوەن خێزانو خزمو کەسوکار بووە، ئەمجار بەرپرسیاریەتی هەموو خەڵکی لەئەستۆدا بووە بە صیفەتی ئەوە پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودابووە بۆسەر هەموو جیهان.

لەبەرپرسیاریەتی جۆری یەکەمدا هەموو موکەللەفێك لەگەڵ پێغەمبەر هاوبەشە لەوەدا کە بەرپرسیارە لەخودی خۆی.

لەبەرپرسیاریەتی جۆری دووەمدا هەموو خاوەن خێزانو خاوەن کەسوکارێك هاوبەشی پێغەمبەرە لەبەرپرسیاریەتی لێیان... لە جۆری بەرپرسیاریەتی سێیەمدا عولەماو فەرمانڕەوا هاوبەشی حەزرەتی

«رەسول اللە»ن، وەکوو ئەو ئەرکیان لەسەر شانە لە گەیاندنی پەیامی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی خوو رەوشتی بەرز.

**دەلالەتی سێیەم:** پێغەمبەری خودا رەخنەی لە قەومەکەی گرت لەوەدا کەخۆیان کردۆتە بەندەو کۆیلەی تەقلیدو لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باوك و باپیریان، بەبێ ئەوەی بیربکەنەوە ئاخۆ ئەو رێبازە راستە یان چەوتە، خراپە یان چاك. بە دڵسۆزیو لێ بڕانەوە بانگی نەتەوەکەی خۆی کرد. کە عەقڵ و ئاوەزی خۆیان رزگار بکەن لە شوێنکەوتنی کوێرانەو دەمارگیری تایەفەگەری: کە هیچ بنەمایەکی فیکری و مەنطیقی نایانگرێتەوە.

ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەرئەوە بنەمای ئەم ئایینە «بە عەقیدەو ئەحکامەوە» لەسەر عەقڵ و مەنطیق دامەزراوەو، مەبەست لە پابەندبوون پێیەوە تەنها بۆ بەرژەوەندی بەندەکانە لە دونیا و لە قیامەتدا. بۆیە لە گرنگترین مەرجەکانی ئیمان بەخوداو هەرشتێك پەیوەندی بە عەقیدەوە هەبێ ئەوەیە لەسەر بناغەی یەقین و فیکری ئازاد دابمەزرێ و هیچ کاریگەری عورف و لاسایی کردنەوەی پێوە دیارنەبێ. تەنانەت خاوەنی نامیلکەی «جوهرة التوحيد» لەم نامیلکە شیعریە بەناوبانگەدا دەڵێ:

«فكل من قلّد في التوحيد ايمانه لم يخلُ من تريد»

هەرکەسێك لەبواری یەکتا پەرستیدا لاسایی کەرەوەبێ و لە یەقینەوە ئەو بڕوایەی بۆ پەیدا نەبووبێ، ئەوە بیروباوەڕو ئیمانی خاڵی نیە لەڕاڕایی و دودڵی.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئایین خۆی شۆڕشە لەسەر تەقلیدو لاسایی کردنەوەی کوێرانەو قەتیسمانی بیروهۆش لە چوارچێوەی لاسایی کردنەوەدا، چونکە ئایین لەهەموو بنەما و حوکم و یاسایەکیدا

لەسەر بناغەی عەقڵ و مەنطیقی سەلیم دامەزراوە، لەکاتێکدا تەقلید لاسایی کردنەوەی کوێرانەیەو شوێنکەوتنی بێ بیرکردنەوەو تێڕامان و لێ وردبوونەوەیە. چونکە وشەی تەقلید لەزمانی عەرەبیداو بەگوێرەی زاراوەی زانایانی کۆمەڵناسی، بریتییە لە کۆمەڵێك داب و نەریت باوکان لە باپیرو منداڵ لە باوکان بەمیراتی بۆیان دەمێنێتەوە، یان بەهۆی نزیکی و تێکەڵاوی کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەیەکی تر، یان کاریگەری وڵاتێك لەسەر وڵاتێکی تر دەتەنێتەوە، بەمەرجێك عامیلی تەقلیدەکە شارەگی سەرەکی درێژەوە بووی نێوان کۆمەڵگەکان و پەیڕەوی کردنەکەبێ، مەبەست ئەوەبێ درێژەدان بە مانەوەو بەردەوامی ئەو داب و نەریتەبێ. هیچ داب و نەریتێك کە خەڵك خوی پێوە گرتبێ لەشێوەو شێوازی ژیان لە کۆمەڵگەو گەڕەك و شارو هۆبەیاندا هەرچی پەیڕەوی دەکەن لەدیاردەی شین و شایی و تەعزییەو خۆشی و ناخۆشییان دا. کە هۆکاری بۆماوەیی و وەرگرتنی کوێرانەو کاریگەری جیرانەتی و لێك نزیکی و تێکەڵاوی وەدی دەهێنن، یان دەیگوازنەوە، هەموو ئەم دیاردانە لەزاراوەی زمانی عەرەبی و لەزانستی کۆمەڵایەتیدا پێیان دەگوترێ «تقالید» کە کۆی «تقلید»ە.

جا کەتو ئەمەت زانی، بۆت روون و ئاشکرا دەبێ: کە ئیسلام ناگونجێ شتێکی لەخۆ گرتبێ ناوی تەقلید بێ یان مانای تەقلید بگەیەنێ. جا چ لەبواری عەقیدەدابێ یان لەمیانەی نیظام و ئەحکامدا بێ. چونکە عەقیدە لەسەر بناغەی عەقڵ و مەنطیق دادەمەزرێ و ئەحکام و یاسا لەسەر بنەمای بەرژەوەندی دنیا و قیامەت بنچ بەست دەبێ. هەڵبەتە بەرژەوەندی و مەصالیح بە لێوردبوونەوەو تێڕامانی زاتی دەرك دەکرێن، هەرچەندە هەندێ عەقڵ و ئاوەز بەهۆی بوونی هەندێ «عوارض» و هۆکار ئەو بەرژەوەندی و مەصالیحانە دەرك ناکا.

کەتۆ لەم لێکۆڵینەوەیە حاڵی بووی، ئەمجار هەست بەترسناکی هەڵەی ئەوانە دەکەی کە نە زانانە یان فێڵبازانە تێی کەوتون، کە ڕێگە بەخۆیان دەدەن وشەی «ألتقالید الاسلامیه» بەسەر هەموو ئەو شتانەدا ببڕن کە ئیسلام لەخۆی گرتوون لە عیبادات و ئەحکامی تەشریعی و ئەخلاقی.

ئاشکراشە دانانی ئەو عینوانە ستەمکارییە بۆ عیبادات و ئەحکامە ئیسلامییەکان و ڕەواجدان پێی، وادەخاتە زەینی مرۆڤەوە: کە نرخی سلوك و ڕەوشتی ئیسلامی بەهۆی ئەوەوە نیە کە مەبدەئێکی خوداییەو نهێنی بەختەوەری ئادەمیزادی لەخۆ گرتووە، «کە ئەمە حەقەو حاشا هەڵنەگرە» بەڵکو بەهۆی ئەوەوەیە: کەهەموو نیظام و یاسای ئیسلامی و ئەخلاقی ئیسلامی داب و نەریتی کۆنینەیەو لە باوك و باپیرانەوە بۆ چینی تازە بەمیرات ماوەتەوە. هیچ گومانیش لەوەدانیە کە ئاکام و نەتیجەی قەطعی بۆ ئەو ئیحا و زەین ڕۆییشتنەو بڕوا بوونە، ببێتە هۆی ناڕازیبوونی زۆربەی خەڵك بەهۆی سەپاندنی ئەم داب و نەرێتە کۆنە بۆماوەو میراتییە کەناوی ئایینیان لێ ناوە، لە کۆمەڵگا و ڕۆژگارێکدا هەمووی پێشکەوتن و تازەگەرییە.

لە واقیعدا دانان و سەپاندنی ئەم شیعارە «التقالید الاسلامیة» بەسەر ئەحکام و نیظامی ئیسلامیدا لەسەرچاوەکەی خۆیەوە هەڵەیەکی عەفەوی و بێ مەبەست نیە، بەڵکوو ئەڵقەیەکە لەزنجیرەی شەڕکردن دژی ئیسلام بەچەکی شیعارات و ئارمی بەتاڵ و چەواشەکاری.

مەبەستی یەکەم بە ڕەواجدان بە وشەی «التقالید الاسلامیة» ئەوەیە زوربەی یاسا و نیظامی ئیسلام بهێنن و بەشیعاری «ألتقالید» دایانپۆشین، ئەمجار کە ڕۆژگارێك تێپەڕی و مانای «ألتقالید» لەزەین و فیکری خەڵکدا تێکەڵ بە نیظام و ئەحکامی ئیسلامی بوو، ئەوە لەبیر

خەڵکی موسوڵمان چۆوە: کە ئەم ئەحکامو یاسایانە لە حەقیقەتو واقیعدا چەند بنەماو مەبادیئو حەقیقەتێکن لەسەر بناغەیەك دامەزراون کە عەقڵی سەلیمو داخوازیەتی، بەڵێ کە ئەم حەقیقەتەیان لەیاد چۆوە، ئەوکاتە ڕێگا بۆ دوژمنانی ئیسلام ئاچوغ دەبێ کە لەم کەلێنو سەنگەرەوە تیرو ڕمبەکانیان ئاڕاستە دەکەن، شەڕی لەگەڵ بکەنو زەبری کوشندەی لێ بدەنو بە ئامانجی گڵاوی خۆیان بگەن.

ئەوەی پێویستە ئێمەی موسوڵمان بیزانینو لە دڵو زەینماندا بچەسپێ ئەوەیە: کە هەرچی یاساو نیظامێك ئیسلام هێناویەتی مەبادیئو بنەمان. مەبدەئیش ئەوەیە لەسەر بناغەی تەفکیرو عەقڵ دابمەزرێو بۆ مەبەستێکی تایبەتیو دیاریکراو هاتبێ. جا ئەگەر مەبادیئی مرۆڤ، جار جارە هەڵە بکاو ڕاستی نەپێکێو ئامانج ببوێرێ، بەهۆی پشێوی بیرو بۆچونی دانەری مەبدەئەکانو کورت بینیو هەبوونی شذوذ لە فیکریاندا. ئەوە بێگومان مەبدەئەکانی ئیسلام هەرگیز ڕێگای صەوابو حەق هەڵە ناکەن، چونکە ئەو کەسەی داینانوکردونی بە شەریعەتو یاسا بۆ مرۆڤو جیهان، خودای زاناو بەدیهێنەری عەقڵەکانو داڕێژەری فیکرەکانە. هەر ئەمە بۆ خۆی بەتەنیا بەڵگەیەکی عەقڵی تەواوە بۆ دڵنیابوونو بڕوا هێنان بەم بنەمایانەو دڵنیابوون لەڕاستیو سودبەخشییان.

چونکە هیچ شكو گومان لەوەدا نیە موسوڵمانان، ئەگەر لەخەوی غەفڵەت وەئاگا هاتنەوەو زوربەی مەبادیئو ئەحکامی ئیسلامی وەکوو دابو نەریتی مارەکردنو دەست لێك بەردانو تەلاقو بالاپۆشی ئافرەتو پارێزگاری لێ کردنو دابین کردنی نەفەقەو بژێو بۆی، هەروا لایەنی سلووكو ئەخلاق بەگشتیو گەلێ مەبادیئی تری ئیسلامی، جا کە موسوڵمانان دوا بەئاگا هاتنەوەیان ئەم مەبادیئو بنەمایانەیان بینی: کە

پۆشاکی «التقالید»یان لەبەرکراوە، شتێکی زۆر سروشتییە کەپاش ماوەیەك کەسانێك راست ببنەوە بانگەشەی فڕێدانی تەقلیدو لاسایی کردنەوە بکەنو کۆتو زنجیری دابو نەریتی کۆن بشکێننو خۆیانی لێ رزگار بکەن، بەتایبەتی لەم رۆژگارەی ئێمە کە سەردەمی ئازادیو دیموقراطییەو بانگەشە بۆ بیری ئازادو فیکری ئازاد دەکرێ.

بەڵام ئەوەی حەقیقەتو حاشا هەڵنەگرە ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام لاسایی کردنەوەو تەقلیدی تێدانیە. بەڵکوو بۆ خۆی لەخۆیدا تاکە ئایینە کە هاتووە بۆ رزگارکردنی عەقڵ لە لاسایی کردنەوەو رەواندنەوەی تارمایی رەشی لەسەر دڵو دەروونی پەیڕەوکارانیدا. وەکوو چۆن بینیمان حەزرەتی رەسول لەسەرەتای بانگەوازییەکەیدا چۆن هەنگاو بەهەنگاو دژی تەقلیدو لاسایی کردنەوە وەستاو بەهەموو هێزو توانای هەوڵیدا خەڵکەکە لەو دێوەزمە رزگاربکا.

تەقالیدو لاسایی کردنەوە بریتییە لە تەیاراتی سلووکی وا کەراستەوخۆ لەڕووی چاو لێکەرییەوە مرۆڤ لەگەڵ خۆی رادەپێچێ.

مەبادیئ: بریتییە لە تەناف و هێڵێك کە پێشکەوتنو رەوڕەوەی رۆژگاری پێ زەبت دەکرێ نەك بە پێچەوانەوە.

کەوابوو دەتوانین بڵێین «تەقالید کۆمەڵێك دابو نەریتی هەڵتۆقیونو راستەو خۆ لەناو دێبەری فکری کۆمەڵگا دەروێن، وەکوو گیاکەڵە زیانبەخشن، پێویستە لەرەگو ریشەوە هەڵکێشرێنو رێرەوی فکرو رای سەلیمی لێ بژاربکرێ».

## الإيذاء: ئەزیەتدانی پێغەمبەر لەلایەن قورەیشەوە

پاش ئاشکراکردنی پێغەمبەر بۆ پەیامەکەی، قورەیشییەکان کەوتنە خۆ بۆ دژایەتیکردنی حەزرەتی موحەممەدو هاوەڵانی بۆ ئەزیەتدانیان‌و بەگژاچوونەوەیان. پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی جۆرەها ئەزیەت‌و نارەحەتی لەدەست قورەیش چەشت. نموونەیەك لەو جۆرە ئەزیەت‌و ناخۆشیانە، عەبدوڵلای کوڕی عەمری عاص دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەری خودا لەو شوێنەی کابەدا: کە پێی دەگوترێ «حیجری ئیساعیل»، نوێژی دەکرد، بینیمان عوقبەی کوڕی ئەبو «معیط» هات پەڕۆیەکی لەملی پێغەمبەر خست‌و تاتوانی جەڕاندی، حەزرەتی ئەبوبەکر خێرا شانی ئەبو «معیط»ی گرت‌و دووری خستەوەو لە پێغەمبەری تەکاندەوەو فەرمووی: «أتقتلون رجلاً أن يقول رَبِّيَ الله؟»«١». ئێوە چۆن پیاوێك دەکوژن هەر لەبەر ئەوەندە کە دەڵێ: خودام «الله»یە هەر ئەو دەپەرستم.

هەروەها ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەیگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خودا چووبووە سوژدە بۆ خوداو کۆمەڵێك لە قورەیش لەو دەوروبەرە بوون، عوقبەی کوڕی ئەبو «معیط» هات پزدانە ئاژەڵێکی هەڵدایە سەرپشتی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر سەری لەسوژدەکە هەڵنەبڕیبوو فاطیمە هات ریخۆڵەو پزدانەکەی لەسەر پشتی پیرۆزی لابردو دوعای نەگبەتی‌و تێداچوونی لەو کەسەکرد کە ئەوکارە ناشیرینە قێزەونەی ئەنجامداوە«٢».

هەروەها ئەو هەموو گاڵتە پێکردن‌و ئەشکەنجەدانەی بەرەو ڕویان دەکردەوە لەهەموو کات‌و ساتێکی شەوو ڕۆژدا، هەر کاتێ پێغەمبەریان

---

١ - رواه البخاري.

٢ - هەمان سەرچاوە.

بدیبایە گاڵتەیان پێ دەکردو درۆیان پاڵدەداو جنێویان پێ دەدا، بە شایەرو جادوگەرو شێتو سەرگەردان ناویان دەبردو لەنادیو کۆڕو کۆمەڵیاندا لەسەر ڕێگاو کۆڵانو پەنا دیواریاندا، چۆنیان بۆ بلوایەو بگونجایە لە ئەزیەتدانو دژایەتی پێغەمبەر بەکۆتا نەدەهاتنو سرەوتنیان نەبوو.

هەر لەم بارەوە نموونەیەکی تر هەیە: کە طەبەریو ئیبنو ئیساق ریوایەتیان کردووە دەڵێن: یەکێك لە قورەیشییەکان چنگێکی خۆڵ هەڵگرتو لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ بەناو هەندێ کۆڵانی مەککەدا دەڕۆیشت ئەو کابرایە چنگە خۆڵەکەی بەسەری پێغەمبەردا هەڵپرژان. سەروسیمای خۆڵاوی کردو پێغەمبەر ﷺ بەسەری خۆڵاویو روخساری تۆزاوی گەڕایەوەماڵەوە، یەکێك لە کچەکانی بە کوڵی گریانەوە سەری بۆشتەوەو تەپو تۆزی سەری پاك کردەوە، پێغەمبەریش پێی دەفەرموو: کچەکەم مەگری خودا باوکت دەپارێزێ.

هاوەڵانیشی بەهەمان شێوە، جۆرەها ئەزیەتدانو ئەشکەنجەیان چەشت، روبەڕوی لێدانو سوکایەتی پێکردن بوونەوە، تەنانەت هەیانبوو لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانی لەدەست دا. هەیانبوو چاوی کوێر بوو، کەم ئەندامو جەستە شێواو بوون، بەڵام هەموو ئەو ئازارو ئەشکەنجە دانە نەیتوانی بڕوای هاوەڵان بە ئایینەکەیان لەق بکاو لە هەڵوێستی خۆیان بیانگێڕێتەوە. ئەگەر نموونەی هەموو ئەو عەزابو ئەشکەنجانەی تووشی هاوەڵان بووە تۆماریان بکەین باسەکەمان زۆر درێژە دەکێشێو لێرەدا جێگای نابێتەوە. وەلێ ئێمە لێرەدا دەمانەوێ ئەو حەدیثەی بوخاری لە خەبابی کوڕی «ئەڕەت»ەوە ریوایەتی کردووە، راگوێزی ئێرەی بکەین. خەباب دەڵێ هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەسێبەری کەعبەدا عەباکەی کردبووە سەرین، لەو سەرو بەندەدا ئێمە

لەلایەن موشریکەکانەوە تووشی ئازاری سەخت بوو بوینەوە. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی بۆمان لەخودا ناپاڕێیەوە لەم حاڵە رزگارمان بێ؟ پێغەمبەرﷺ خێرا راستبۆوەو دانیشت روخساری سورهەڵگەڕابوو، فەرمووی: سوێندم بەخودا ئیماندارانی پێش ئێوە بە شانەی ئاسن گۆشتو ئێسقانو رەگی جەستەیان لێك جیادەکرایەوە، کەچی لەبیرو باوەڕی خۆیان پاشگەز نەدەبوونەوە. وەڵڵاهی خودا ئەم ئایینە سەردەخاو فەرمانڕەوایی دەکەوێتە دەست موسوڵمانانو ئەوانیش بەوپەڕی عەداڵەتکاری فەرمانڕەوایی دەکەن، تەنانەت سوار بەتاقە سوارە لە صەنعاوە سەفەردەکا بۆ حەضرەموت جگە لەخودا ترسی لەکەسی تر نابێ«١».

## پەندو ئامۆژگاری:

یەکەم پرسیارێك کەبەسەر دڵو دەروونی بیردۆزو لێکۆڵەرەوەدا رادەبووری، کاتێك چیرۆکی ئەشکەنجەو ئازاردانی قوڕەیش بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی دەخوێنێتەوە، ئەوەیە: ئەو هەموو عەزابو چەرمەسەرییەی تووشی پێغەمبەرو هاوەڵانی هات لەپای چی؟ لەکاتێکدا ئەوان لەسەر حەقو راستی بوون، بۆچی خودا نەیپاراستن؟ خۆ ئەوان سەربازی ئاینی خودا بوون. پێغەمبەر کە خۆشەویستی خودا بوو لەناویانا بوو، بانگەوازییان دەکرد بۆ ئایینی خوداو لەرێگای ئەودا تێدەکۆشان؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە. دەگوترێ: یەکەم رەوشتی مرۆڤ لە جیهاندا ئەوەیە: کە موکەللەفو بەرپرسیارە. واتە: لەخوداوە داوای لێکراوەو فەرمانی پێ کراوە، بە هەڵگرتنو شاندانە بەر کاری قورسو گران. کاروباری بانگەوازی بۆ ئیسلامو جیهادو تێکۆشان لەپێناو

١ - بڕوانە: مالقی رسول الله واصحابه من المشرکین فی سیرة ابن هشام.

بەرزکردنەوەی شیعاری «لا اله الا الله محمد رسـول الله» لەگرنگترین کاری پەیوەسـت بـە تەکلیفەوەیـە، تـەکلیفیش لـەگرنگترین هۆکـارو موستەلزەماتی بەندایـەتیکردن بـۆ خودایـە، چـونکە هـیچ مانایـەك بـۆ بەندایـەتی و «عبودیـە» بـۆ خـودا نیـە ئەگـەر تـەکلیف وجـودی نـەبێ. بەندایـەتیکردنی مـرۆڤیش بـۆ خـودا ضـەرورەتێکـە لـە ضـەروراتـی خودایەتی خوداو یەکتا پەرستی، چونکە هیچ مانایەك بۆ ئیمان و باوەڕ بەخودا نابیندرێ ئەگەر ئێمە هەست بە بەندایەتی و «عبودیەتی» خۆمان بۆ خودا نەکەین.

کـەوابوو «عبودیـة» تـەکلیف و ئـەرکی لێ وەدی دێ تـەکلیف و بەرپرسـیاریەتیش هـەڵگرتنی قورسـایی ئـەرکی لەسەرشـان گـران و بـەر بەرەکانی نەفس و ئارەزۆی لێ وەدی دێ.

لەبەرئـەوە ئـەرکی سەرشـانی بەنـدەکانی خودایـە لـەم جیهانـەدا دووشت دەستەبەر بکەن:

١- یەکـەم پابەنـدبوون بـە ئیـسلام و دامەزرانـدنی کۆمەڵگایـەکی ئیسلامی راست و صەحیح.

٢- دووەم پـەیڕەوکردنی رێگـەی پڕکەنـدو لەنـدو بـازدان بەسـەر کۆسـپ و تەگـەرەو چـونە نـاو مـەخاطـیرو بەخـشینی گیـان و مـاڵ بـۆ چەسپاندن و دەستەبەرکردنی حکومـەتێکی ئیـسلامی راست و دروست. واتە: خودا فەرمانی پێکردوین و ئەوەی خستۆتە ئەستۆمان: کە بڕوامان بە غایەو مەبەست هەبێ. ئەمجار تەکلیفی ئەوەی لێ کردووین کـە رێگـای سـەخت و هۆکـاری قـورس و گـران بگرینەبـەر بـۆ دەسـتەبەر بـوونی ئـەو غایـەت و ئاکامـە کـە دامەزرانـدنی کۆمەڵگەیـەکی ئیـسلامی صـەحیحە، ئـەمجار بـەدڵ و بـەگیان بەندایـەتی خـودا بکـەین و هـەوڵی بەختـەوەریی دونیاو قیامەتمان بدەین!.

خـۆ ئەگـەر خـودا بیویـستایە، وای دەکـرد رێگـاو هۆکـار بـۆ دروستکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی «دوای ئیمان هێنان پێی» رێگایەکی ئاسان‌و بێ کەندو لەند بوایەو چ چورتم‌و ناخۆشی تێدا نەبوونایە. وەلێ رێگایـەکی وا ئاچـوغ‌و بـێ کۆسـپ‌و ناخۆشـی ئـەوە ناگەیـەنێ کـە رێبوارەکەی بەندەیەکی ملکەچی فەرمانی خودایەو ماڵ‌و گیانی خۆی لەپێناوی ئایینی خودادا دەبەخشێ‌و هەموو حەزو ئارەزۆیەکی پابەندو ملکەچی ئەو پەیامەیە کە پێغەمبەر هێناویەتی.

ئیتر ئەوکاتـە لـەم رێگەیـەدا موسـوڵمان‌و دووڕوو درۆزن‌و راسـتگۆ، شان بەشانی یەکدی دەڕۆیشتن‌و بۆمـان لێك جیا نەدەکرانـەوە. کەوابێ ئـەو ناخۆشـی‌و ئەزیـەت‌و چـورتمەی موجاهیـدو بـانگخوازانی ئیـسلام لــەپێناو دروســتکردنی کۆمەڵگایــەکی ئیــسلامیدا توشــیان دەبــێ، سوننەت‌و داب‌و نەرێتیکی خودایيە لە بوونەوەرداو لەوەتای دونیا هەیە ئـەم ســوننەتە خودایيــە نـەگۆڕاوەو لەبـەرە بـەیانی مێژووشـەوە ئـەم سوننەتە خودایيە داخوازی سێ شتە.

یەکــەم: صـیفەتی بەندایـەتی کـە بەتـەك مرۆڤەوەیـەو هەمیـشە لەگەڵیدا بە.

پـەروەردگار بۆیـەی ئادەمیزاد بـەدی هێنـاوە کـە ئـەو ئەرکـە گرنگـە بەجێ بێنێ وەکوو دەفـەرموێ: {وَمَا خَلَقْـتُ الْجِـنَّ وَالْـإِنسَ إِلَّـا لِيَعْبُـدُونِ — الذاريات/ ٥٦}.

دووەم: صـیفەتی تـەکلیف: کـە لـە صـیفەی عبودیـەت‌و ملکەچی بۆ خوداوە پەیدا دەبێ.

هەرپیاوو ئافرەتێك باڵغ بێ‌و بگاتە تەمەنی رەشیدی‌و بەخۆ چاران، ئـیللا لەلایـەن خـوداوە ئـەرکی جێبـەجێ کردنـی شـەریعەتی ئیـسلامی

لێداواکراوەو دەبێ بیهێنێتە کایەوەو شەریعەتی خودا پەیڕەو بکا. دەبێ ئامادە باشی تەواوی تێدابێ لەو پێناوەدا هەموو تاڵی و ناخۆشییەك بچێژێ، ئەمەش بۆئەوەی مانای تەکلیف بێتەدی.

٣- سێیەم: دەرکەوتنی راستی راستگۆیان و درۆزنی درۆزنان.

ئەگەر ئادەمیزادەکان بەوەندە وازیان لێ بهێنرایە کە بەدەم بڵێن موسوڵمانین و خودامان خۆش دەوێ و بەس! ئەوکاتە راستگۆو درۆزن یەکسان دەبوون. وەلێ فیتنەو بە تاقیکردنەوەو چورتم و کۆسپی سەر رێگای خودا پەرستی تەرازوی یەکالا کەرەوەو جودا کردنەوەی راست و ناڕاست و چاك و خراپ و ئیمان پتەوو بڕوا لەقۆکن. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم راستییە دەخاتە رۆو دەفەرموێ: {الٓمٓ. أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ - العنكبوت/ ١-٣}.

جا ئەگەر ئەمە سوننەت و داب و نەریتی خودابێ بۆ بەندەکانی، ئەوە بزانە گۆڕان بەسەر سوننەت و داب و نەریتی خودادا نایە، تەنانەت بەنیسبەت پێغەمبەران و خۆشەویستانیشی!! کەواتە لەم روەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەزیەتدراوەو لەپێناو گەیاندنی پەیامەکەی دا تاڵی و سوێری چەشتووە، هەروا پێغەمبەرانی پێش ئەویش ئەزیەتدراون، توشی جۆرەها ئەزیەت و ناڕەحەتی بوون. هەر لەم روانگەشەوەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ئەزیەتدراون و توشی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجە بوون، تەنانەت هی وایان هەبووە لەژێر ئەشکەنجەداندا گیانی لەدەست داوە، هەیانبوە چاوی لەدەست داوە، کەمئەندام بووە. وێڕای رێزو قەدریان لای خودا ئەو هەموو ناخۆشی و چەرمە سەرییەیان تووش هاتووە.

جا کەتۆ تەبیعەت و سروشتی ئەو عەزاب و نارەحەتیەت زانی: کە تووشی موسوڵمانی ڕێبواری ڕێگای ئیسلامی دەبێ: کە هەنگاو دەنێ بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی ئەوەت بۆ دەردەکەوێ کە لەحەقیقەتدا ئەوانە کۆسپ و تەگەرەو بەربەست نین کە بانگخوازو موجاهیدان لە مەبەست بگێڕنەوە، وەکوو هەندێ کەس وایان گومان بردووە، بەڵکوو لەڕاستیدا ئەوە ڕێکردن و پێدا ڕۆیشتنی ڕێگایەکی سروشتییە: کەخودا دیاریی کردووە لەنێوان موسوڵمان و مەبەست و ئامانجیدا، ڕێگایەکە خودا فەرمانی پێ کردووە پێیدا بڕوا بۆ گەیشتن بە ئاکام و ئامانجی. واتە: موسوڵمانان لەو غایەو مەبەستە نزیك دەبنەوە کە خودا فەرمانی پێ کردوون پێی بگەن، بە ئەندازەی ئەو عەزاب و سزایەی لە ڕێبازی بەرەو ئەو مەبەستانە دەیچێژن، بەرێژەی ئەو قوربانی و شەهیدانەی لەو پێناوەدا دەیدەن. ئەوەندە لەئامانج و هەدەف نزیك دەبنەوە. بۆیە نابێ موسوڵمان هەرکاتێ ناخۆشی و چەرتمی تووش هات، نائومێدی ڕوی تێبکا، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەو ئازارو ناخۆشی و تاڵی و سوێرییەی کارێکی گونجاوە لەگەڵ ئایین و سروشتی ئایین. واتە: پێویستە موسوڵمانان هەرکاتێ تووشی تێشکان و ناخۆشی هاتن نائومێدی نەبێتە پەردەی ڕەش و دابانپۆشێ، بەڵکوو دەبێ ئەو ئازارو نارەحەتیە بە یەکەم هەنگاوی سەرکەوتن دابنێن و چاوەڕوانی ئاکام و سەرەنجام بن و بە ورەی پۆڵاییەنەوە هەنگاو بەرەو گەیشتن بە ئامانج بهاوێن. ئەمە ڕاستییەکەو قورئان بەروونی ئاماژەی بێ کردووە کە دەفەرموێ: {أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ – البقرة/٢١٤}.

بێگومان ئەم ئایەتەو ئایەتی تری لەم وێنە وەڵامی ئەوانە بوو کە هێشتا لە سروشتی کاری ئیسلامی حاڵی نەبوو بوون. وایاندەزانی ئەو ئەزیەتو تێشکانو ناخۆشییانەی دەهاتە ڕێیان نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە کە لەسەرکەوتن دوردەکەونەوەو بەرەودوا دەگەڕێنەوە، بەڵام وەڵامی ئاشکراو رونو بێ پێچو پەنا ئەوەبوو کە فەرمووی: {أَلا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ}.

بەڵگەی ئەم راستییە بە ئاشکرا لەو حەدیثەی لە خەبابی کوڕی «الأَرَتَ»ەوە ئاماژەمان پێکرد خۆی دەنوێنێ، ئەوەبوو کە خەباب هاتە لای پێغەمبەرﷺ هەموو لەشی بریندارو ئەشکەنجەدراو، شکاتی وەزعی خۆی لای پێغەمبەر کردو داوای لێکرد لەخودا بپاڕێتەوە یارمەتی موسوڵمان بداو لەو ناخۆشییە رزگاریان بکا، وەڵامی پێغەمبەر بەشێوەیەك بوو لەمانای ئەم ئایەتەدا رەنگی دەدایەوە. ئەگەر تۆ سەرت سوڕ بمێنێ لەو سزاو ناخۆشیانەی تووشی پێغەمبەرو هاوەڵانی بوو، بەلاتەوە سەیربێ ئەوانە لەرێگای خودادا توشی ئەو نارەحەتیانە بن، ئەوە تۆ بزانەو دڵنیا بە ئەوە رێبازی حەقیقیو سروشتییە، ئەوە سوننەتو دابو نەریتی پەروەردگارە دەربارەی بەندە راستاڵو بڕوا دارەکانی. مێژووی کەوناڕای ئادەمیزاد پڕە لە نموونەی جۆرەکانی سزاو ئەشکەنجەدان، زۆر لە بڕواداران و بانگخوازانی رێگای ئایین بەشانەی ئاسن گۆشتو رەگو ئێسقانیان لێك جیاکراوەتەوەو ونجڕ ونجڕ کراون، بەڵام هیچ جۆرە سزاو ئەشکەنجەدانێك نەیتوانی لە هەلوێستی خۆیانیان بگێڕێتەوە، لەبڕواو ئیمان بەخودا پاشگەز نەبوونەوە. جا ئەگەر تۆ لە سزادانی بڕواداران نیشانەی نائومێدیو یەئس لەسەرکەوتن بەدی بکەی ئەوە تۆ بەهەڵە چووی، بەڵکوو حەقو راستی ئەوەیە: کەتۆ لەسزادانی ئەوانو روبەڕوبوونەوەیان بەرامبەر

ملهوڕو ستەمکاران، ئەوە بەدی بکەی کە ئەوان بە ڕێبازی سروشتی خۆیاندا ڕەودەکەن و لە میلی سەرکەوتن نزیکبوونەوە. بێگومان خودا یارمەتی ئایینی خۆی دەداو هەڵگرانی ئەم دینە بەسەر ناحەزانیدا سەردەخا، ولآت لەژێر سایەی شەریعەتی خودادا ئارام دەبێ، تەنانەت کابرا سواری حوشتری خۆی دەبێ لە صەنعاوە تا «حضرموت» بەتاقە سوارە سەفەردەکاو جگە لەخودا لەکەس ناترسێ. تەنانەت خاوەن مەڕو بزن ترسی ئەوەی نابێ گورگ زیانیان پێ بگەیەنێ. هەر ئەم مانایە خۆی نهێنی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ موژدەی بە هاوەڵانیدا: کە لەوەدوا خودا لەسەر دەستی ئەوان هەردو ئیمپراتۆڕی فارس و ڕۆم دەخاتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو وڵاتە پان و پۆڕە ئەم دوو زلهێزو خاوەن دەسەڵاتانە تا ماوەیەك دوا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ رزگار نەکران. بەگوێرەی ڕواڵەت و ڕێزو شکۆمەندی پێغەمبەر لای خوداو خۆشەویستی خودا بۆی، وا دەخوازرا ئەم وڵاتانە لەسەردەمی پێغەمبەرو لەژێر سەرکردایەتی و ئیشرافی ئەودا فەتح بکرانایە، لەجیاتی ئەوەی مێژوو ئەم سەروەرییە بۆ یەکێ لە خەلیفەکانی تۆماربکا بۆ خودی پێغەمبەری تۆمار بکردایە.

بێگومان بەدیدی ئێمەی مرۆڤ ئەوە لەگەڵ خۆشەویستی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی گونجاوە: کە فەتحکردنی ئەو ئیمپراتۆریەتانە بەسەرکردایەتی پێغەمبەر خۆی بوایە. وەلێ سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج پابەندە بە ئەوقانون و یاسایەی خودا دایناوە بۆ سەرکەوتن.

بەڵێ، موسوڵمانان لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا پەلیان نەهاویشتبوو بۆ وڵاتی شام و عێراق، هێشتا ئەوان نرخ و بەهای سەرکەوتنیان لە وڵاتی شام و عێراق دەفع نەکردبوو. باج و خەراجی ئەو فەتحە گەورانەیان نەدابوو، ئامادە باشی گیانی و مادییان بۆ ئەو

مەبەستە تێدا نەبوو، هەڵبەتە هەموو سەرکەوتنێك باج و نرخی خۆی هەیەو دەبێ پێش وەخت دەفع بکرێ. ئەمە شتێکی حەتمییەو سروشتی جیهادو سەرکەوتن وایە، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش خۆی لەناو هاوەڵانیدا بوایەو لەژیانا بمایە.

مەسەلەکە ئەوە نیە: کە سەرکەوتنەکان و فتوحاتەکان پەیوەست بن بەناوی پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەرکردایەتی ئەوو لەژێر ئیشرافی شەخصی ئەودا دەستەبەر بن لەبەرئەوەی خودا زۆری خۆش دەوێ. بەڵکوو مەسئەلەکە ئەوەیە موسوڵمانان بیسەلمێنن کە ئەو عەهدو مامەڵەیەی لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا ئەنجامیان داوە، ئەو پەیمانەی داویانە: کە گیان و ماڵیان لەرێگای خودادا بەخت بکەن بەڕاستی بگێڕن و بیخەنە بواری پڕاکتیکەوەو بە عەمەلی ئەنجامی بدەن، راستگۆبن بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی داویانە بە پەروەردگاریان کە بەگیان و ماڵیان داکۆکی لەو ئایینە بکەن و هیچ ترس و ئازارو ناخۆشییەك لەو مەبەستە نەیانگێڕێتەوەو لەو هەڵوێست و ملکەچ بوونەیان بۆ خودا پاشگەزنەکاتەوە، ئەو قەبوڵ و رەزامەندییەی نیشانیان دا لەبەر رۆشنایی ئایەتی: {إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ – التوبة/١١١}. لێی پەشیمان نەبنەوە.

## سیاسەتی دانوسان

ئیبنو هیشام لە ئیبنو ئیسحاقەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە «کە پیاوماقوڵێکی قوڕەیش بوو» جارێك لەیانەی قوڕیشدا، وتی: ئەرێ ئەی هۆزی قوڕەیش! من بۆ نەچم بۆلای موحەممەدو قسەی لەگەڵدا بکەم و هەندێ پێشنیاری بخەمە بەردەستی، بەڵکوو بەهەندێکیان ڕازی بێ و چی ویست دەیدەینێ و وازمان لێ بێنێ.

ئامادەبووانی مەجلیسەکە وتیان: زۆر بەجێیە ئەی ئەبو وەلید بچۆ بۆلای و بیدوێنە بزانە دەڵێ چی.

عوتبە چوو بۆلای و لەتەنیشتییەوە دانیشت، وتی: ئەرێ برازای خۆم! تۆ بۆخۆت دەزانی چ پلەو پایەیەکت لەناو خێڵ و خزمانتدا هەیە، تۆ کارێکی گەورەو سەرەنج ڕاکێشت هێناوەتە ناو نەتەوەکەت و بەو هۆیەوە دووبەرەکی و دژایەتیت خستۆتە ناویانەوە، گاڵتە بەعەقڵ و هۆشیان دەکەی، ئایینی باوك و باپیرانیانت لەکەدار کردووە . ئێستا گوێم لێ بگرە، هەندێ پێشنیار دەخەمە بەردەستت تا لێیان وردبیتەوە، بەڵکوو هەندێکیانت بەدڵ بن و قبوڵیان بکەی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەبو وەلید چ پێشنیارێکت لایە بیڵێ و گوێت لێ دەگرم بزانم چییە.

عوتبە وتی: ئەی برازای خۆم! ئەو شتەی تۆ هێناوتە ئەگەر مەبەستت پێی ماڵ پەیداکردنە، ئەوە بەهەموو لایەکمان ئەوەندەت ماڵ و سامان بۆ کۆدەکەینەوە ببیتە ساماندارترین کەسی ناو ئێمە. ئەگەر دەسەڵات و گەورەییت دەوێ، دەتکەینە گەورەی خۆمان و هیچ کارێك بەبێ پرس و ڕا بەتۆو ڕەزامەندیت، ناکەین. ئەگەر دەتەوێ ببیتە مەلیك و پاشا ئەوە دەتکەینە مەلیکی خۆمان و نازناوی پاشایەتیت بۆ هەڵدەدەین. ئەگەر ئەوشتەی بۆت دێ شتێکە ناتوانی لەخۆتی

دووربخەیتەوە، ئەوە پزیشکت بۆ دێنین چارەسەرت بکا، هەرچی ماڵو سامانمان هەیە خەرجی دەکەین تاچاك دەبێتەوە. عوتبە لە قسەکانی بووەوە پێغەمبەر گوێی لێ گرتبوو. ئەمجار فەرمووی: ئەبو وەلید لەقسەکانت بویتەوە؟ وتی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بسم الله الرحمن الرحيم، تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ، وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ، قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ - فصلت/ ١-٦}.

ئیتر پێغەمبەر ﷺ درێژەی بەخوێندنەکەی داو عوتبە گوێی بۆ گرتبوو هەتا پێغەمبەر گەیشتە ئایەتی {فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ} خوێندنەکەی پێغەمبەر هێندە کاریگەر بوو عوتبەی خستە دەهشەتەوە، داوای لە پێغەمبەر کرد کە چیدی درێژە بە خوێندنی قورئانەکە نەدا بیبڕێتەوە، چونکە زۆر ترسا لەم ڕووەوە کە ئایەتەکان هەڕەشەیان تێدابوو.

ئەمجار عوتبە هەڵسا هاتەوە بۆ یانەکەو بۆ ناو هاوەڵانیو لەناویاندا دانیشت، لێیان پرسی دەی بزانین ئەبو وەلید چیت پێیە؟ وتی: من کەلامێکم گوێ لێ بوو هەرگیز کەلامی وام نەبیستووە. سوێندم بەخودا ئەو کەلامە نەشیعرە نەسیحرە نەقسەی کاهینو کوڵەوەنانییە. ئەی هۆزی قورەیش وەرن پیاوی چاك بنو بەقسەم بکەنو ئەمە بخەنە ئەستۆی منو واز لەو کابرایە بێننو خۆتانی لێ کەنارگیر بگرن، وەڵلاهی ئەو کەلامەی من لێم بیست لەداهاتوودا هەواڵێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە شەوکەتێکی لێ پەیدا دەبێ. ئەگەر عەرەب لەناوی بەرن ئەوە بەغەیری خۆتان لەکۆڵتان دەبێتەوە. ئەگەر بەسەرعەرەبدا زاڵ بوو ئەوە

موڵکی ئەو موڵکی ئێوەیشە. سەربەرزی‌و شکۆمەندیی ئەو سەربەرزی‌و شکۆمەندیی ئێوەیە.

ئیتر ئامادەبوان وتیان: وەڵڵاهـی ئەبو وەلید وادیارە موحەممەد بەزمانی لوسی سیحری لێ کردی‌و تۆشی فریودا.

عوتبە ووتی: ئەمە ڕاوو بۆچونی منە دەربارەی ئەو پیاوەو بانگەوازییەکەی، ئێوەیش بۆ خۆتان چیتان پێ باشە ئەوە بکەن.

طەبەری‌و ئیبنو کەسیرو هی تریش ڕیوایەتیان کردووە دەڵێن: کۆمەڵێك لە پیاوانی قورەیش: کە وەلیدی کوڕی موغەیرەو «العاص»ی کوڕی «وائل»یان تێدابوون هاتنە لای پێغەمبەرو پێشنیاری ئەوەیان بۆ پێغەمبەر کرد، ئەگەر واز لە لەککەدارکردنی خوداکانمان بێنی ئەوەندە ماڵ‌و سامانت بۆ خڕ دەکەینەوە ببیتە دەوڵەمەندترین کەس لەناوماندا، جوانترین ئافرەتت لێ مارە دەکەین، بەس تۆ واز لە خوداکانمان بێنەو بەسوکایەتی ناویان مەهێنە.

جا کە پێغەمبەر ﷺ ئەم پێشنیارەی ڕەتکردەوە و سوور بوو لەسەر ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەی خراوەتە ئەستۆی، وتیان: دەی باشە با ڕێکەوتنێکی تر بکەین، ئەتۆ ڕۆژێك پەرستشی خوداکانی ئێمە بکە، ئێمەیش ڕۆژێك خودای تۆ دەپەرستین. پێغەمبەر ئەم پێشنیارەشی ڕەتکردنەوە، زۆری پێ نەچوو لەم بارەوە سورەتی «الكافرون» نازڵ بوو: {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ،، ، وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ}.

ئەمجار جارێکی تر پیاوماقوڵانی قورەیش بەکۆمەڵ چوونەوە لای پێغەمبەرو هەمان پێشنیارو داخوازی عوتبەیان بۆ دووبارە کردەوە، پێشنیاری ئەوەیان کردەوە ماڵ‌و سامانی بۆ کۆبکەنەوە، بیکەنە پاشاو مەلیکی خۆیان، ئەگەر دەزانێ ئەو شتەی بۆی دێ دەستی جندۆکەو

شەیتانی تێدایە دکتۆری حاڵزان بێنن چارەسەری بکا. پێغەمبەر پێی فەرموون: ئەوەی ئێوە خەیاڵتان بۆی چووە لەو جۆرە نەخۆشییە من پێمەوە نیە، من نەهاتووم داوای سامان و مڵك و ماڵ بکەم و پێی دەوڵەمەندبیم. نامەوێ ببمە مەلیك و پاشا بەسەرتانەوەو داوای شتی وا ناکەم، من خودا کردوومی بە پێغەمبەرو نامەی ئاسمانی بۆ نازڵ کردووم و فەرمانی پێ کردووم مژدەدەرو ترسێنەر بم بۆتان نامەی خودام پێ ڕاگەیاندن، ئامۆژگاری پێویستم کردن، ئەگەر بەپیر پەیامەکەمەوە بێن و ئەوەی بۆم هێناون قبووڵی بکەن ئەوە بەختەوەری دونیاو قیامەتتانە، سەرفرازی هەردوو جیهان دەبن، خۆ ئەگەر پەیامەکەم ڕەتبکەنەوە، ئەوە صەبر دەگرم چاوەڕوان دەبم ئاخۆ خودا چۆن حوکمی نێوان من و ئێوە دەکا.

ئەمجار پێیان گوت: ئەگەر تۆ هیچ کامێ لەم پێشنیارانەمان قبوڵ ناکەیت. ئەوە تۆ دەزانی کەس بەئەندازەی ئێمە شارو وڵاتی تەنگەبەرو بێ ئاوو بەروبووم نیە، کەس بەئەندازەی ئێمە گوزەران تەنگ و دەسکورت نیە، دەبۆمان لەخوداکەت بپاڕێرەوە ئەو خودایەی دەڵێی: منی کردووە بە پێغەمبەرو ڕەوانەی کردووم بۆ سەر ئادەمیزاد، داوای لێ بکە با ئەم کێوانەمان بۆ بڕەوێنێتەوەو وڵاتمان دەشت و سارای تێ بکەون و ئەمجار چۆم و کانیاوی لێ هەڵقوڵێنێ وەکوو چۆم و ڕووباری شام و عێراق. ئەمجار باوك و باپیرانی ڕابوردوومان بۆ زیندو بکاتەوەو لەناویاندا «قوصەی کوڕی کیلاب»یان تێدابێ چونکە ئەو پیرەمێردێکی عاقڵ و ڕاستگۆ بووە، ئیتر ئێمە پرسیاری دەربارەی تۆ لێ دەکەین بزانین ئاخۆ ئەمەی تۆ دەیڵێی حەقە یان بەتاڵە. هەروا داوات لێ دەکەین خوداکەت لەم وڵاتەدا باخ و باخات و باڵەخانەو گەنج و خەزەێنەی زێڕو زیوت بۆ دابین بکا بێ ئاتاج ببێ لەوەی پێمان وایە هەوڵی بۆ دەدەی. جا ئەگەر ئەم داخوازییانەت بۆ جێبەجێ کردین بڕوات پێ دەکەین و

بۆمان ئاشکرا دەبێ کە تۆ لای خودا ڕێزت هەیەو ڕاست دەکەی کە پەیامی بۆ ناردوی و پێغەمبەری. وەکوو دەڵێی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: من داوای لەو جۆرە لە خودا ناکەم و شتی وا ئەنجام نادەم.

ئەمجار پاش کێشەو قسەو گوفت و گۆیەکی زۆر پێیان گوت: ئێمە چوینە بنج و بناوانی ئەم بانگەوازییەی تۆو بۆمان مەعلوم بووە پیاوێکی یەمەنی ناوی «الرحمن»ە ئەو تۆی فێری ئەم لاف و گەزافە کردووە. سوێندمان بەخودا ئێمە هەرگیز ئیمان بە «الرحمن» ناهێنین و ڕێگاشنادەین چیدی ئەم بانگەشە پەرەپێ بدەی، کاسەمان پڕبوو لێی ڕژا، یان ئێمە یان تۆ. ئەمجار بەم هەڕەشەو گوڕەشانەوە هەڵسان ڕۆیشتن.

## پەندو ئامۆژگاری:

لەم مەشهەدەی ڕامان نواند لەسیرەی پیرۆز ﷺ سێ دەلالات و نیشانە هەن هەریەکەیان بۆخۆی گرنگی خۆی هەیە:

### دەلالەتی یەکەم:

زۆر بەوردی و ڕونی حەقیقەتی بانگەوازی حەزرەتی موحەممەدمان بۆ وێنا دەکاو جیای دەکاتەوە لەهەر مەبەست و غەرەزێك کە عادەتەن خاوەنی فیکرەو بانگەوازیی تازەو ڕابەری شۆڕش و ئیصلاح و چاکسازی لەدڵی خۆیان دا دەیشارنەوە. هەموو ئەگەرو گریمانەیەکی کە بەڕواڵەت خاوەن بەرنامەو ڕابەرانی شۆڕش لەودیو نیازو مەبەستیان پەردەی پێدا دەدەن پوچ و وەلادەنێ.

ئایا پێغەمبەر دەیەویست بەم بانگەوازییە ببێتە مەلیك و پاشا؟ یان لەوانەبوو ویستبیەتی بەهۆی ئەم پەیامەوە ماڵ و سامان کۆبکاتەوەو

ببێتــە دەوڵەمەنــدو دەســت ڕۆیــشتوو قــسە پەســەندو گــەورەی هــۆزو عەشیرەت. یان لەوانـە بـوو بـێ تووشـی خـەیاڵپڵاوو دەسـت لێوەشـاندنی جندۆکەو شتی وابووبێ، بەناچاری لەژێر کاریگەری ئەو نەخۆشییەدا ورێنەی کردبێ!!

هەموو ئـەم گریمانەو ئیحتیمالاتانە هۆکارو بیانون دەشێ ئەوانـەی غەزوی فیکری موسوڵمانانیان کردووە بەپیشەو کاری سەرەکی خۆیـانو دوژمنـانی ئاینی ئیسلام بیانکەنـە چەکی دەسـتی خۆیـانو بـەکاریان بێنن بۆ چەواشەکاریی. بەڵام کوا بەری خۆر بە بێژنگ دەگیرێ؟! لەکوێ نوری خودا بەفوی بێ هێزی ئەو جۆرە نەفامانە دەکوژێتـەوە... ئای لـەو نهێنیانــەی خــودای بونــەوەر لــەژیان دا بــۆ پێغەمبەرەکــەی دەســتەبەر کردبــوون. ســەیرەو جێگــای سەرســوڕمانە بێگومــان پــەروەردگار ژیــانی پێغەمبــەری خۆی پڕکردبـوو لەهەڵوێـستی مەردانـەو مـەظاهیری سـەرنج ڕاکێش: کە هەموو گریمانەو ئەگـەرێکی لـەو جۆرە بـەپاش دا دەباتـەوەو هــەموو ئیحتیمــالێکی ئــاوا بنبڕدەکــا. ڕێگــا لەهــەموو دەغدەغکــەرێکی وەسوەسە خەرەوە دەگرێ.

ئەوانەی پیشەیان غەزوی فیکری موسـوڵمانانو جیهـانی ئیـسلامییە نازانن چ ڕێبازێك بگرنە بـەرو چۆن پیلانەکـەیان جێبـەجێ بکـەن، شـەڕی فیکریو دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چۆن پـەیڕەو بکـەن. تـا کونێك پینە دەکەن دە کونی تریان تێ دەبن.

بەڵێ حیکمەتی گەورەی خودا وا داخوازی کرد: کە کۆمـەڵێك لـەپیاو مــاقوڵو ســەرانی قــوڕەیش زنجــیرەی موفــاوەزاتو دانوســان لەگــەڵ پێغەمبەردا سازبدەن، ئەمـەش دوای ئـەو ئەگـەرو ئیحتیمالاتانـەی لـەدڵی خۆیان دا مەزەندەیان کردبوون، خۆ ئەوان ئەو کاتە لەهەموو کەس زیاتر شـارەزای سروشـتی بانگەوازییەکـەی بـونو دەیـانزانی ئاکـامی پـەیامو ریــسالەکەی چــەند مەودایــەکی قــوڵو دووری هەیــەو هــەرگیز بــەو

پێشنیارانە هەڵناخەڵەتێ‌و واز لە پەیامی خۆی ناهێنێ، وەلێ ئیرادەی پەروەردگار واداخواز بوو کەمێژوو بکەوێتە قسەو هەموو ئەوانە بەدرۆ بخاتەوە کە لەسەردەم‌و رۆژگاری جیا جیادا بەخۆیان رادەپەرمون کەشك‌و گومان بخەنە سەر پەیامی پیرۆزی‌و بیانەوێ غەزوی فیکری عالەمی ئیسلامی بکەنە پیشەی سەرەکی خۆیان‌و هەموو شتێکی لەپێناودا خەرج بکەن.

بێگومان نموونەی داخ لەدڵی وەکوو «کریمر»و «فان فلوتن» زۆریان بیر کردۆتەوە شت بدۆزنەوە بۆ گومان خستنە سەر پەیامی حەزرەتی موحەممەد ﷺ پاشان هیچیان دەست نەکەوت بیکەنە گومان‌و شك‌و لەرێیەوە غەزوی فیکری موسوڵمانان بکەن، جگە لەوە چاوی خۆیان بقوچێنن وا خەیاڵ بکەن‌و بانگەشەی ئەوە بکەن: کە حەزرەتی موحەممەد کەمەبەست‌و هەدەفی سەرەکی لەم بانگەوازی‌و پەیامە ئەوەبوو دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی چنگ بکەوێ، ببێتە رابەرو پاشای وڵات‌و ماڵ‌و سامانی زۆری دەست بکەوێ. هەرچەندە ئەم داخ لەدڵانە بەم فڕو فیشاڵ‌و قسە بێ ڕێ‌و جێیانەیان سەریان لەبەردی داوە‌و لەباتی بەرەو پێشەوە چون چەند مەوداو مەسافە پاشەو پاش گەڕانەوە.

ئەوەتا پەروەردگار زۆر پێش ئەوان عوتبەی کوڕی رەبیعەو ئەمثالی ئەوی موسەخەر کردووە: کە ئەو پێشنیارو دەوافیع‌و ئارەزۆیانە هەڵبگرێ‌و بەپێی خۆی بچێتە لای پێغەمبەرو بە ئیلحاحەوە داوای لێ بکا بەئارەزۆی خۆی چی هەڵدەبژێرێ ئەو لەجیاتی قورەیش بۆی مۆردەکا و چۆنی بوێ ئاوا ئارەزۆکانی بۆ دەستەبەر دەکەن. قورەیش هەموویان تێکڕا گەردنکەچی دەبن‌و چەکی ئازارو ئەشکەنجە لەروی خۆی‌و هاوەڵانیدا فڕێی دەدەن، چی بوێ لەماڵ‌و سامان‌و دەسەڵات بەرەهایی بۆی دابین دەکەن!! دەی بۆچی پێغەمبەر نەرمی نەنواندو

پێشنیارێکی لەو پێشنیارانە هەڵنەبژاردو ئەم دەسکەوتە چەورەی لەکیس خۆی دا کەخرایە بەردەستی؟ مادام دافیعو پاڵنەرو مەبەست لەپەیامەکەی دەسەڵاتو ماڵو سامان بوو، بۆ رەتی کردەوە؟ ئایا دەگونجێ کەسێك عەودالی دەسەڵاتو مڵكو سەرکردەیی بێ، بە ئیلحاحەوە لەمیانەی دانوسانو لێ پاڕانەوەو هەڕەشە لێکردندا هەموو ئەو ئارەزۆو دەستکەوتانەی بۆ بخەنە سەر سینییەك بیخەنە بەردەمی کەچی رەتی بکاتەوەو لەکۆتاییدا پێیان بڵێ: من نەهاتووم داوای ماڵو سامانی ئێوە بکەم، نامەوێ ببمە پاشاو فەرمانڕەوا بەسەرتانەوەو مەبەستم ئەو نیە بمکەنە گەورەی خۆتانو گوێ بیستم بن. وەلێ من خودا کردومی بە پێغەمبەرو بۆسەر ئێوەی رەوانە کردووم نامەی ئاسمانی بۆناردووم بۆئەوەی پێتانی رابگەیەنمو کاری پێ بکەنو بیکەنە بەرنامەی ژیانتان.

فەرمانی پێ کردووم کە موژدە دەربم بۆ ئەوانەی بە پیر بانگەوازییەکەمەوە دێنو ترسێنەری ئەوانە بم کە بەدرۆم دەخەنەوە. جا ئەگەر ئێوە ئەوەی بۆم هێناون قبوڵتان کردو شوێنم کەوتن ئەوە بەختەوەریی دونیاو قیامەتتان بۆ خۆتان دەستەبەر کردووەو بەشی خۆتانە، خۆئەگەر پەیامەکەم رەتبکەنەوە ئەوە من صەبر دەگرمو چاوەڕوانی حوکمو بڕیاری پەروەردگارم دەکەم بزانم چی بڕیار دەدا لەنێوان منو ئێوەدا.

لەلایەکی ترەوە گوزەرانی ژیانی دەقاو دەق هاوشانی ئەم قسەو هەڵوێستەی بووە، هەرگیز ئەو بەرواڵەتو قسەی دەمی پشتی لە زەعامەتو ماڵو سامان هەڵنەکردووەو بەکردەوەو پێچو پەنا هەوڵی دابێ پێیان بگا. بەڵکوو تا ئەوپەڕی سنوور لەبارەی خواردنو خواردنەوەدا بەسیتو سادە بووە، ژیانی لەئاستی ژیانی فەقیرو

هەژاراندا بووە. خاتو عائیشە «وەکوو بوخاری ریوایەت دەکا» دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کرد ئەوەی گیانلەبەر پێی بژی لەرەفەکەما نەبوو هەنێ جۆ نەبێ، جا هەرلێم دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو تا ماوەیەکی زۆری خایاند، لەپاشان چوم پێوام، ئیتر پیت‌و بەرەکەتەکەی نەما و تەواو بوو«١».

ئەنەس لەبارەی گوزەرانی پێغەمبەرەوە «وەکوو هەمدیسان بوخاری لێوەی ریوایەت دەکا» دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ژیانی تاوەفاتی کرد لەسەر مێزی رازاوە نانی نەخواردووە، هەرگیز تا لەدونیا دەرچوو نانی تیری تەنك‌و دروستکراو لەئاردی بێژراوو بێ سۆی نەخواردووە«٢».

لەبارەی پۆشاك‌و کالای ناو ماڵەوە تا بڵێی سادەبوو، راخەری باشی حەصیربوو کە شوێنکەی حەصیرەکە بەلا کەلەکەیەوە دیاربوو. نەبیستراوەو نەزاندراوە لەژیانیدا لەسەر دۆشەك‌و شتی نەرم نوستبێ. تەنانەت رۆژێك خێزانەکانی بەکۆمەڵ هاتنەلای، خاتو عائیشەشیان لەناودا بوو. شکوای هەژاری‌و بێ بژێوی خۆیان کردو داوایان لێکرد بژێوی باشتریان بۆ دابین بکا، پۆشاك‌و پێداویستی ناوماڵیان بۆ دابین بکا بەجۆرێك لەدەستە خوشکانی خۆیان کەمتر نەبن. پێغەمبەر ﷺ کەئەم پێشنیارەی لێ بیستن ماوەیەك بەرق هەڵساوی سەری داخست‌و وەلامی نەدانەوە. پاشان ئایەتی {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا، وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا — الأحزاب/ ٢٨ – ٢٩} نازڵ بوو.

---

١ - بوخاری/ ٦٤٥١.

٢ - بروانە فتح الباری ج١٠/ ٦٦٥ – ٦٦٦.

ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە، پاشان سەرپشکی کردن لەنێوان ئەوەی رازی بن بەو ژیانەی تێیدان و لەگەل پێغەمبەر ژیان بەوشێوە بەسەر بەرن یان ئەگەر سوربن لەسەر داواکەیان بیانەوێ بژیوو پۆشاکیان بۆ زیادبکا و ناومالی رازاوەیان بۆ بکا، ئەوە ئەوکاتە پێغەمبەر لێیان جیادەبێتەوە و بێ قیرەی کێشە تەلاقیان دەدا. ئیتر خێزانەکانی کە ئەمەیان بیست لە هەلوێستی خۆیان ژێوان بوونەوە و ژیانی کولە مەرگی و هەژارییان هەلبژاردو دەستبەرداری پێغەمبەر نەبوون.

دەی چ عەقلێك دوای دەرخستنی ئەم راستیانە گومانی لەراستی پێغەمبەرایەتی ئەو زاتەدا دەبێ. کەی رەوایە و بەچ عەقلێك گومانی ئەوە دەبرێ کە پێغەمبەر ﷺ بەدافیعی حەزو ئارەزۆی زەعامەت و تەماعی دەولەمەندی ئەو هەول و تێکۆشانەی داوە و بانگەشەی ئیسلامی کردووە. ئەمە پوختەی دەلالەتی یەکەم بوو کەلەم دیمەنەدا رامان نواند.

**دەلالەتی دووەم:**

**مانای ئەو حیکمەتەمان بۆ روون دەکاتەوە کە پێغەمبەری خودا پێیەوە رازابۆوە و پەیرەوی دەکرد.**

ئایا حیکمەت ئەوەیە ئەتۆ بۆ خۆت سیاسەتی رێرەوی دەعوە و بانگەوازی دابنێی و چۆن دەبێ بابێ!؟ ئایا خودا دەسەلاتی ئەوەی پێ بەخشیوی: کەتۆ هەر رێبازو وەسیلەیەك بگرییەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانج مادام مەبەستی تۆ بۆ حەق بێ و پێکانی حەق بێ؟

نەخەیر.. بێگومان شەریعەتی ئیسلامی چۆن غایەت و ئامانجی بە عیبادەت بۆ حیساب کردوین بەو جۆرەش گرتنەبەری هۆکارو وەسیلەی بۆ داناوین و دەبێ بەو هۆکارو وەسائیلانە ئاکامەکان بێنینە دی. تۆ

ناتوانی و بۆت نیە کەهەر ڕێگەیەك بگرییەبەر بۆ گەیشتن بە غایەو ئاکام جگە لەو ڕێگە دیاریکراوەی خودا کردوویەتی بە وەسیلەو هۆکار بۆ گەیشتن بە مەبەستو غایە.

بەڵێ حیکمەتو سیاسەتی شەرعی مانای موعتەبەرو پەسەندی هەن، وەلێ لە سنووری هۆکارو وەسیلەی ڕێگە پێ دراوو مەشروعدا.

بەڵگەمان لەسەر ئەم بۆچونەمان ئەو روداوو ریوایەتانەن کە لەوەپێش ئاماژەمان پێ کردن. بێگومان بەدیدی مرۆڤانەی ئێمە واتەصەور دەکرێ بەگوێرەی حیکمەتو سیاسەت: کە پێغەمبەر رازی بوایە بەوەی بیکەنە زەعیمو مەلیکی خۆیان ئەمجار ئەو دەسەڵاتەی کە پێیان داوە بیکردایە وەسیلەو هۆکار بۆ ئەنجامدانی دەعوەو بانگەوازییەکەی، لەو ڕێگەوە مەبەستو غایەی خۆی بچەسپاندایە، بەتایبەتی کە دەسەڵاتو پاشایەتی کاریگەری بەهێزیان هەیە لەسەر نەفسو دەروون. ئەی ئەوە نییە ئەوانە هەڵگری فیکرەو دەعوەو مەزهەبن چاوەڕوانی هەلی گرتنە دەستی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی دەکەن بۆئەوەی بەهۆی دەسەڵاتو هێزەوە فیکرەو دەعوەی خۆیان بەسەر خەڵکی دا فەرزبکەن بیسەپێنن!

وەلێ پێغەمبەر ﷺ رازی نەبوو ئەم سیاسەتو هۆکارە پەیڕەو بکا بۆ گەییشتن بە ئامانجو چەسپاندنی دەعوەکەی. چونکە گرتنەبەری ڕێگای لەوجۆرە لەگەڵ بنەمای خودی دەعوەو پەیامەکەیدا گونجاو نەبوو.

ئەگەر بەکارهێنانی شێوازی ئاوا رەوابێ و جۆرێك بێ لە حیکمەتو سیاسەتی رەشید، ئەوکاتە فەرقی مرۆڤی راستگۆی صەریح لە راستگۆیی خۆیدا لەگەل درۆزنێك کە فرتو فێڵ دەکا لەدرۆکردنەکەیدا «نامێنێ، هەروەها مرۆڤانی راستگۆ لە بانگەوازیو پەیامیاندا لەگەڵ فێڵبازو جادو بازاندا لەرێگایەکی پانو پۆڕدا کە ناوی حیکمەتو

سیاسەتە» یەکیان دەگرت‌و فەرقی راستگۆو درۆزن، دڵسۆزو فێڵباز نەدەبوو.

بێگومان فەلسەفەی ئەم ئایینە لەسەر بنەمای شەرەف‌و راستگۆیی لەهۆکارو ئامانجدا دامەزراوە، هەروەکوو چۆن غایەو ئامانج دانامەزرێ‌و پەسەندنیەو هیچ شتێك راگیری ناکا جگە لەراستی‌و شەرەف‌و وشەی حەق، بەو جۆرە وەسیلەو هۆکار بۆ ئەو غایەو ئامانجە نابێ جگە لەبنەمای راستی‌و شەرەف‌و وشەی حەق هیچ شتێکی تر هێڵەکەی بکێشێ ئا لێرەوە خاوەنی پەیام‌و بانگخوازانی ئیسلامی لە زۆربەی کات‌و بارو دۆخیاندا پێویستیان بە خۆبەختکردن‌و جیهادە، چونکە ئەو رێبازەی ئەوان گرتوویانەتە بەر قورت‌و پێچی تێدانیەو راست‌و چەپ‌و ئەمبەرەو بەری نییە.

هەڵەیەکی گەورەیە کەتۆ وابزانی بنەمای حیکمەت لەبواری بانگەوازیی دا بۆیە دانراوە تا ئەرکی لەسەر شانی بانگخواز ئاسان بێ، یان بۆئەوەی لە چورتم‌و ئەزیەت‌و ئازار پارێزراوبێ. بەڵکوو نهێنی لە رەوابوونی بەکارهێنانی حیکمەت لەبواری دەعوەو بانگەوازی دا ئەوەیە تۆ بزانی بەکارهێنانی چ هۆکارێك زووترو باشتر بانگەوازییەکەت دەگەیەنێتە دەروونی خەڵك‌و دەچێتە ناو فیکرو هزریانەوە. واتە ئەگەر بارودۆخەکان لەبەردەم بانگەوازییەکەدا جۆراو جۆر بوون، کۆسپ‌و تەگەرەو چورتمەکان لەسەر رێگای دەعوە زۆرو هەمە جۆربوون حیکمەت‌و هەڵوێستی راست ئەوەیە کەرەسەی جیهادو خۆبەختکردن بەماڵ‌و بەگیان ئامادەبکرێ، هەل‌و فرسەت لەدەست نەدەی، واتە حیکمەت ئەوەیە هەرشتە لەشوێنی خۆی دابنێی‌و بەگوێرەی بۆلوان‌و بارودۆخ هەنگاو بنێی.

ئەمەیە جوداوازی نێوان حیکمەت‌و فێڵبازی، نێوان حیکمەت‌و موسالەمە لەگەڵ دوژمن.

تۆ ئاگاداری‌و دەزانی پێغەمبەر کاتێك موژدەی خۆشی کەوتە دڵیەوە بەوەی کە بینی برێ لەپیاو ماقوڵانی قورەیش واخەریکە لە ئایینەکەی حاڵی دەبن‌و رویان لەوەیە ئیمان بێنن، ئەویش بەهەموو خۆشی‌و لێبڕانێکەوە کەوتە قسە لەگەڵیان‌و بیرو باوەڕی بۆ روون دەکردنەوە، تەنانەت هێندە بەو دیمەنە دڵخۆش بوو، هێندە تەماعی تێیاندا بوو کە ئیمان بهێنن، هێندە سەرگەرمی وت‌و وێژبوو لەگەڵیان. کە عەبدوڵڵای کوڕی «أم مكتوم» بەلایاندا تێپەڕی‌و لایدایە ناو کۆڕەکەو گوێی لەوت‌و وێژی نێوانیان بوو، ئەویش بەدەوری خۆی هەندێ پرسیاری لە پێغەمبەر کرد. پێغەمبەر بۆئەوەی هەلی لەکیس نەچێ‌و لەکاتێکی تردا وەڵامی پرسیارەکەی عەبدوڵڵای کوری «أم مكتوم» بداتەوە، لەوکاتەدا وەڵامی نەدایەوەو روی لێ وەرگێڕاو هەندێ روگرژیشی لێ دیارییداو پێی ناخۆش بوو کەئاوا عەبدوڵڵا خۆی خستە نێو دانوسانەکەوەو لەوکاتە ناسکەدا: کە بەدیدی پێغەمبەر زۆر گرنگ‌و چارەنووساز بوو، هەلێکی زێڕین بوو بۆی رەخسابوو.

پەروەردگار سەرزەنشتی پێغەمبەری کردو ئیجتیهادو هەڵوێستەکەی رەتکردەوە، هەرچەندە مەبەست‌و غایەی پێغەمبەر لەو روو وەرگێڕان‌و دەم‌و چاو گرژییەی بەدیدی پێغەمبەر مەشروع بوو، وەلێ لە واقیعدا لای پەروەردگار پەسەند نەبوو، بۆیە نیگای بۆ نازڵ کردو فەرمووی: {عَبَسَ وَتَوَلَّى أَن جَاءَهُ الْأَعْمَى..../ عبس ١-٢}.

خودا عیتابی لە پێغەمبەری خۆی گرت چونکە ئەو وەسیلەو هەڵوێستەی پێغەمبەر گرتیەبەر لە هەوڵدان بۆ ئیمانهێنانی سەرانی قورەیش، دڵی موسوڵمانێکی راستاڵی تێداشکاو لەجیاتی ئەوەی

وەڵامی پرسیارەکەی بدرێتەوە رووی لێ وەرگێڕدراو پرسیارەکەی پاشگوێ خرا، ئەمەش بەگوێرەی بنەمای ئیسلام پەسەند نییە.

بەکورتی جگە لەخودا کەس بۆی نییە شتێك لەئەحکامو بنەمای ئاینی ئیسلام بگۆڕێ، یان سنورێکی ببەزێنێ، یان سوکایەتی بە بنەمایەکی بکا بەناوی شوێنکەوتنی حیکمەت لە بانگەوازیو ئامۆژگاریدا. چونکە حیکمەت بەحیکمەت ناژمێردرێ ئەگەر لەچوارچێوەی سنوری شەریعەتو بنەمای ئیسلامو ئەخلاقی ئیسلامیدا نەبێ.

**دەلالەتی سێیەم:**

کەئێمە لە هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر داواکاریو پێشنیارەکانی سەرانی قورەیش وەری دەگرینو ئیستیفادەی لێ دەکەین. ئەو پێشنیارانەی قورەیشییەکان کردیانە مەرج بۆ ئیمان پێ هێنانی، پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەی رەتکردەوەو پەروەردگاریش هەڵوێستەکەی پێغەمبەری پەسەندکرد، وەکوو زوربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان ایە ئەم ئایەتانە لەم بارەوە نازڵ بوون، کە دەفەرموێ:
{وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الأَرْضِ يَنبُوعًا أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الأَنْهَارَ خِلالَهَا تَفْجِيرًا، أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاء كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ قَبِيلاً، أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاء وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إَلاَّ بَشَرًا رَّسُولاً – الإسراء/ ٩٠ – ٩٣}:

هۆکاری ئەوەش کەخودا ئەم داواکاریو پێشنیارانەی سەرانی قورەیشی وەکوو موعجیزە بۆ پێغەمبەر نەهێنانە دی، هۆکارەکە ئەوە

نەبووە: کە هەندێ کەس واگومان دەبەن پێغەمبەر جگە لە موعجیزەی قورئان موعجیزەی تری نەدراونێ، بۆیە ئەم داواکارییانەیان بۆ جێبەجێ نەکران. نەخەیر هۆکارەکە ئەوەنییە کە ئەو جۆرە کەسانە گومانیان بۆ چووە بەڵکوو هۆکارەکە ئەوەبووە: کەخودای باڵادەست زانیویەتی کە ئەوانە ئەم پێشنیارانەیان لەروانگەی کوفرو رکەبەریو قوڵبوونەوەو توندرەوی لەگاڵتە پێکردن بەئایینی ئیسلامدا خستنە روو «وەکوو لەشێوازی داواکردنەکەیان جۆری داواکەیان دەرکەوێ» خۆئەگەر پەروەردگار بیزانیایە نیاز پاكو راستگۆن لە داواکارییەکەیاندا، بیزانیایە ئەوان ئەگەر داواکارییەکان بێتەجێ ئیمان دەهێنن، بەبێ گومان خودا «وەکوو موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەر» پێشنیارەکانیانی بۆ دێنانەدی. وەلێ حاڵی سەرانی قورەیش لەم پێشنیارانەیاندا دەق وەکوو ئەو حاڵە وایە، کە پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاء فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ لَقَالُواْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ – الحجر/ ١٤ – ١٥}.

جا کەتۆ ئەمەت زانی بۆت دەردەکەوێ: کەهیچ موونافات نیە لەنێوان ئەم حاڵەو ئەوەی چەسپاوە لەرێزگرتنی خودا بۆ پێغەمبەری خۆی لەوەدا کە موعجیزەی جۆراو جۆری پێ بەخشیوە وەکوو لەشوێنی خۆیدا بەم نزیکانە بەدرێژیی لێی دەدوێن.

## قورمتینەی ئابوری «ألحصار الاقتصادي»

بەچەند رشتەی جیا جیا لەمووسای کوڕی عوقبە ئەویش لەئیبنو ئیسحاقەوە، بەرشتەو ریوایاتی تریش ریوایەت کراوە: کە کافرەکانی قورەیش بە بانگەوازی پێغەمبەر تەنگەتاو بوون، هەر هەوڵێکی دایان بۆ وازهێنانی پێغەمبەر لە راگەیاندنی پەیامەکەی بێهودەوە، بۆیە بەکۆڕا

هاتنە سەرئەوە کە چارەسەر ئەوەیە پێغەمبەر بکوژن و لەکۆڵ خۆیانی بکەنەوە. لەمبارەوە قسەیان لەگەڵ بەنو هاشم و بەنو موطەلیب کرد کە ئەمان خزمی نزیکی پێغەمبەر بوون، وەلێ ئەمان داواکەی قورەیشیان رەتکردەوە و رازی نەبوون پێغەمبەریان تەسلیم بکەن بیکوژن.

جا کەلەوە نائومێد بوون بتوانن پێغەمبەر بکوژن ئەمجار بەیەك دەنگ بڕیاریاندا بەربەرەکانی بکەن و بەربەرەکانی هەر کەسێکیش بکەن کە پشتگیری لێ دەکا، لە موسوڵمان و لەبنەماڵەی هاشم و بنەماڵەی بەنو موطەلیب. بۆ ئەم مەبەستە هاتن پەیماننامەیەکیان نووسی کە بەتەواوی مانا لەخۆیانیان دابڕن، نەژن و ژنخوازییان لەگەڵ بکەن، نە کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ بکەن، بەهەموو جۆرێك قوڕمتێنە بخەنە سەریان و نەهێڵن هیچ بژێوێکیان پێ بگا بەهیچ شێوەیەك ئاشتەواییان لەگەڵدا نەکەن و بۆ هەتا هەتایە لەخۆیانیان جیابکەنەوە و گۆشەگیریان بکەن هیچ بەزەییان پێدانەیەنەوە. هەتا وایان لێدێ بەنو موطەلیب بەناچاری پێغەمبەریان رادەست دەکەن بۆئەوەی بیکوژن، ئەم پەیماننامە ستەمکارییەیان لەناو کەعبەدا هەڵواسی.

کافرەکانی قورەیش سێ ساڵی تەواو ئەم گەمارۆ ئابوری و هەمە لایەنەیان خستە سەر پێغەمبەرو موسوڵمانان و بەنو هاشم و بەنو موطەلیب. گەمارۆکە لەمانگی موحەرەمی ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرێتییەوە دەستی پێکرد درێژەی کێشا تاساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتی، هەندێکیش دەڵێن: ماوەی گەمارۆکە دووساڵ بووە. ریوایەتی موسای کوڕی عوقبە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم ئابڵوقەیە پێش ئەوە بووە کە پێغەمبەر فەرمانی بەهاوەڵان کرد کۆچ بکەن بۆ حەبەشە. لەکاتی ئابڵوقەدانەکەدا فەرمانی پێکردن بچن بۆ حەبەشە. ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق ئەوە دەگەیەنێ کە نووسینی پەیمان نامەکەی قورەیش

دوای کۆچکردنی هاوەڵان بووە بۆ حەبەشەو دوای موسوڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتاب بووە.

بەنو هاشمو بەنو موطەلیبو موسوڵمانەکانیش لەگەڵیاندا لەشیوی «بەنی موطەلیب»دا گەمارۆیان خرایەسەر «مەککە وا هەڵکەوتووە شوێنەکەی شیوو دۆڵی زۆرن».

لەشیوی بەنو موطەلیبدا بەنو هاشمو بەنو موطەلیب چ ئەوانەی موسوڵمان بوو بوون چ ئەوانەی کافر بوون جگە لەئەبو لەهەب یەکیان گرتو کەوتنە بەرەی دژ بە قورەیشو گەمارۆیان خرایە سەر، هەڵبەتە بەنو هاشمو بەنو موطەلیب ئەوانەی کافربوون لەروی تایەفەگەریو دەمارگیری خزمایەتیەوە پشتگیری پێغەمبەریان کرد.

پێغەمبەرو موسوڵمانەکان لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا زۆر تینیان بۆهات، برسیایەتی برستی لێ بڕین، تەنانەت بەریوایەتی صەحیح هاتووە ئەوەندەیان زۆر بۆهات ناچاربوون کەوتنە خواردنی گەڵای درەختو چەرمو شتی وا.

سوهەیلی ریوایەتی کردووە دەڵێ کە کاروانێك خوراكو کاڵا دەگەیشتە شاری مەککە، یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر بچویایە شتێك بکڕێ بۆ بژێوی خۆیو خێزانی، ئەبو لەهەب دەهات بەدەنگی بەرز بە بازرگانەکانی رادەگەیاند کە شتەکانیان لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر ئەوەندە گران بکەن بۆیان نەکڕدرێ، ئەوانیش نرخەکەیان چەند چەندانە لەسەر گران دەکردن، ئیتر زۆرجار هاوەڵان ناچار بەدەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە بۆلای ماڵو منداڵە برسییەکانیان کە هەمیشە لەبرسان دەکڕوزانەوە. جارجارە بەنهێنیو قاچاغی دەیانتوانی شتو مەك لەو کاروانانە بکڕن کە دەهاتنە مەککە ئەویش زۆر بەکەمیو بەنرخی گران.

بەم شێوەیە بەنوهاشم و بەنو موطەلیب ماوەی سێ ساڵ لەو شێوەدا مانەوە، بەتەواوی لە کۆمەڵگای عەرەب دابڕابوون، بەدزی و قاچاخی نەبوایە هیچیان پێ نەدەگەیی، هەرکەسێك بیویستایە لەگەل قورەیشییەکان پەیوەندی هەبێ، دەبوو بەتەواوی پشتگیری گەمارۆکە بکا و هیچ پەیوەندییەکی بەوانەوە نەبێ کە لەشیوی بەنو مەتەلیبدا بوون.

دوای تێپەڕینی سێ ساڵ بەسەر ئەم گەمارۆدانەدا تێپەڕێ، هەندێ لەڕیش سپیانی خێڵی «قصی» ویژدانیان جولاو کەوتنە لۆمەکردنی یەکتری، کە بۆچی لەئاست برسی کردنی ماڵ و خێزانی بەنو هاشم و بەنو موتەلیب بێدەنگ بوون ویژدانیان ناجولێ؟ دوای قسەو باسی زۆرو هەڵبەزو دابەزو لێك زێت بوونەوە، بڕیاریاندا پەیماننامەی گەمارۆ هەڵبوەشێننەوە، هەر لەوسەرو بەندەدا پەروەردگار مۆرانەی خستبووە سەر پەیمانە نووسراوەکە هەمووی هەلا هەلا کردبوو، جگە لەو رستانەی کەناوی خودای تێدابوو شڕو وڕ بوو بوو.

پێغەمبەر ﷺ لەوەپێش هەواڵی ئەو مۆرانە لێدانەی پەیماننامەکەی بەئەبو تالیبی مامی راگەیاند، فەرمووی سیپارەکە مۆرانە لێی داوەو هەلا هەلابووە. ئەبو طالیب کە ئەمەی لە پێغەمبەر بیست، وتی: ئەوە پەروەردگارت ئەو هەواڵەی پێدای؟ فەرمووی: بەڵێ: ئیتر ئەبو طالیب لەگەڵ کۆمەڵێك لەپیاوانی نزیکی چوو بۆلای قورەیش و داوای لێ کردن کە سیپارەکەیان هێنا پێچرابووەوە، هێشتا بلاویان نەکردەوە ئەبو طالیب وتی: موحەممەدی برازام هەواڵی داومێ، قەتیش درۆی لەگەڵ نەکردووم. هەواڵی دامێ کە خودا مۆرانەی ناردووە بۆسەر سیپارەکەتان و هەمووی شڕو وڕکردووە، جا ئێستا ئێوە بڕوانن، ئەگەر قسەکە وابوو وەکوو بەمنی گوتووە. ئەوە ئێوە لەڕای ناجۆرو نارەوای خۆتان پەشیمان ببنەوە و دڵنیابن کە ئێمە موحەممەد رادەستی ئێوە

ناکەین‌و دیفاعی لێ دەکەین تا دوا کەسمان گیانی تێدابێ ناهێڵین کەس دەستی لێ بووەشێنێ. خۆئەگەر ئەوەی ئەو بەمنی گوتووە راست دەرنەچوو ئەوە بێ سێ‌و دوو موحەممەد رادەستی ئێوە دەکەین‌و چی لێ دەکەن لێی بکەن. قورەیشییەکان وتیان: ئێمە بەوە رازین‌و قبوڵمانە. کە سیپارەکەیان لێك کردەوە بینییان روداو بەوجۆرەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بە ئەبو تالیب دابوو، ئیتر لەجیاتی ئەوەی پابەندی وادەی خۆیان بن، هەموویان تێکڕا وتیان ئەمە سیحرو جادوبازی برازاکەتە! ئیتر کەوتنە بەربەرەکانی‌و زوڵم‌و دەستدرێژی‌و پتر شوڵیان لێ هەڵکێشا.

ئەمجار پێنج لەسەرانی قورەیش کەوتنە هەوڵ‌و تەقەڵلا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی گەمارۆو کۆتایی پێ هێنانی. ئەم پێنجە: هیشامی کوڕی عەمری کوڕی «الحاريث»و زوهەیری کوڕی ئومەییەو «ألمطعم»ی کوڕی عەدی‌و أبو البختري کوڕی هیشام‌و «زمعة»ی کوڕی «الأسود» بوون.

یەکەم کەس کە بەئاشکرا داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی کرد زوهەیری کوڕی ئومەییە بوو. ئەوەبوو لەلای کەعبە روویکردە قورەیشییەکان‌و وتی: ئەی ئەهلی مەککە، ئەوە چ ویژدانێك قبووڵی ئەوەدەکا؟ ئێمە بەئارەزوی خۆمان بخۆین‌و بخۆینەوە، پۆشاکی جوان بپۆشین لە حاڵێکدا بەنو هاشم‌و بەنو موتەلیب بە گەورەو پچوك‌و بە پیاوو ئافرەتەوە نزیکە تێدابچن کەس شتیان لێ ناکڕێ‌و پێ نافرۆشێ، سوێندم بەخودا من دانانیشم تا ئەم سیپارە رەشە پڕ لەستەمە ونجڕ ونجڕ نەکەن!!

ئەمجار باقی پێنج کەسەکان کەوتنە قسەو پشتگیری زوهەیریان کرد، پاشان «المطعم»ی کوڕی عەدی پەلاماری سیپارەکەیدا بیدڕێنێ، کە دەستی لێدا مۆرانە خواردبووی‌و هەلا هەلا بوو بوو. ئیتر ونجڕ

ونجریان کرد، ئەمجار ئەم پێنج کەسەو کۆمەڵێکی تر لەگەڵیان رۆیشتن بۆناو شیوی بەنو موتەلیب و داوایان لێکردن بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و حاڵی خۆیان و چیدی گەمارۆیان لەسەر نییە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەم پەیماننامە ستەمکارییە کەلەو سیپارە رەشەدا نووسرابوو ئەوپەڕی ئازارو ناڕەحەتی وێنادەکا کە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەدەست قوڕەیشییە بتپەرستەکان لەماوەی سێ ساڵی رەبەقدا چەشتیان. ئەوەشمان زانی کە بەنو هاشم و بەنو موتەلیب هەرچەندە بتپەرست بوون هاوبەشی موسوڵمانەکانیان کرد لەڕووبەڕو بوونەوەی ئەو ئازارو ناڕەحەتیەداو رازی نەبوون دەست لە پێغەمبەر بەربدەن، ئێمە باسی هەڵوێستی ئەو بتپەرستانەو هۆکاری ئەو هەڵوێستە مەردانەیان ناکەین، چونکە ئەوانە لایەنی دەمارگیری و تایەفەگەری و خزمایەتی پاڵی پێوەنان بۆئەوەی ئەو هەڵوێستە مەردانە بنوێنن، واتە: ئەوان پەیڕەوی داب و نەریتێکی عەشیرەتی خۆیان کرد. چونکە ئەوان لەروی عەشائیرییەوە ئەگەر پشتی پێغەمبەریان بەربدایە حەیاچوون و سوکایەتی بوو بۆیان و دەکەوتنە بەر تانەی ئەم و ئەو. کەوابوو ئەم دوو بنەماڵەیە «بەنو هاشم و بەنو موتەلیب» لەدڵی خۆیاندا بەم کارەیان دوو نیشانەیان پێکاو دوحەزی خۆیان بەجێ هێنا.

أ- بەردەوامبوون لەسەر بتپەرستی و ملهوڕی نواندن بەرامبەر ئەو پەیامە حەقەی پێغەمبەر بۆی هێنابوون.

ب- پابەندبوون بۆ حەمییەو دەمارگیری هۆزایەتی کە داخوازی ئەوەیە داکۆکی لەخزم و عەشیرەت بکەی و نەهێڵی بێگانە زیانی پێ

بگەیەنێ و ستەمی لێبکا، لەسەر حەق و ناحەق پشتی خزمەکەی بگرێ و دەستی لێ بەرنەدا.

بەڵام موسوڵمانەکان لەپێش هەمووشیانەوە پێغەمبەر ﷺ: یان بڵێین: پێغەمبەرو هاوەڵانی: کە لەبەرامبەر ئەو گەمارۆ ستەمکارانەیە خۆیان راگرت و بەصەبرو ئارام بوون، دافیع و پاڵنەر بۆ ئەو هەڵوێستە مەردانە پابەندبوونیان بوو بە فەرمانی خوداو هەڵبژاردنی ژیانی قیامەت بەسەر ژیانی دونیاداو هیچ و پووچی دونیابوو لەدیدی ئەواندا، چونکە مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی لای ئەوان بەدەستهێنانی رەزامەندی خودابوو، هەر ئەم لایەن و دیاردەیەیە کە ئێمە دەمانەوێ لێی بدوێن و بەلامانەوە گرنگە.

بێگومان وادەبێ بەتاڵخوازو دڵکرمێ گوێیان لەوەبێ کە موبەشیرو زانا خۆرهەڵاتناس و ئەوانەی هەمیشە خەریکی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامین دەڵێن:

دەمارگیری بەنو هاشم و بەنو موتەلیب لەپشت بڵاوکردنەوەی بانگەوازیی موحەممەدەوە بوو، بەیاسای داب و نەریتی تایەفەگەری و خێڵەکی پارێزگارییان لە پێغەمبەر کردو بەهەموو هێزو توانایانەوە یارمەتییاندا، بەڵگەش لەسەرئەوە هەڵوێستی نەریتیان بوو بەرامبەر موشریکەکانی قورەیش کە گەمارۆیان خستە سەر موسوڵمانەکان، تەنانەت بەفیعلی خۆیان خستەناو دۆزەخی گەمارۆکەوەو سێ ساڵ لەگەڵ موسوڵمانەکان ئازاری ئابلوقەکەیان چەشت.

بێگومان ئەمە بە هەڵەبردن و چەواشەکارییەکی روون و ئاشکرایە، هیچ مەنطیق و عەقڵێك بەرواڵەتیش وەری ناگرێ و هیچ پەردەیەك نیە بیشارێتەوە.

چونکە ئەمە شتێکی سروشتی و ئاشکرایە: کە حەمییەت و دەمارگیری جاهیلی بەنو هاشم و بەنو موطەلیب هەڵنێ بۆئەوەی

پارێزگـاری لـە ئـامۆزای خۆیـان بکـەن و نـەهێڵن بێگانـە دەسـتی لێ بوەشێنێ.

دەمـارگیری و حەمییـەتی جـاهیلی کـەخزم و کـەس وکار هەڵـدەنێ بۆئـەوەی هەڵوێـستی لـەوجۆرە بنـوێنن بەرامبـەر هەرکەسـێك بیـەوێ بەنیازی خراپ لـەخزمێکیان نزیـك بێتـەوەو خراپـەی دەرحـەق بکا، هیچ بنـەماو یاسـایەك بەرچاو نـاگرێ و ناڕوانـێ ئـاخۆ داکۆکیکردنەکـەی لـەو خزمەی حەقە یان ناحەقە، تەنها پاساوو پاڵنـەرێك کە هەڵیدەنێ بۆ ئەو کۆمەکیکردنە دەمارگیرییەو بەس!

بۆیە دەتوانین بڵێین: دوو صیفەتی دژبەیـەك و نـاکۆك لـەو خزمانـەی پێغەمبەردا کۆبۆتەوە:

**یەکەم:** ملهوڕی و لوتبەرزی بەرامبەر بانگەوازییەکەی و ڕەتکردنەوەی.

**دووەم:** یارمەتیـدانی و پارێزگـاری کـردن لێـی دژی بـاقی موشـریکە قوڕەیشییەکان.

بـەڵام وێـڕای ئـەوە ئـەوان چ سـوودو قازانجێکیـان بـۆ پێغەمبـەر دەستەبەر کرد لەپشت ئەو هەڵوێست و هاوکاری گۆشەگیرییە؟ بێگومان هـەردوو بنەماڵـەی بـەنو هاشـم و بـەنو مـوطـەلیب ئەزیـەت و نارەحـەتیان چەشـت وەکـوو ئەزیـەت و نارەحـەتی پێغەمبـەرو هـاوەڵانی، ئـەو ئەزیەتدان و گـەمارۆ خستنەی قوڕەیش خستیانە سـەر موسـوڵمانەکان، بەنو هاشم و بەنو موطەلیب نەیانتوانی هیچ قورساییەك لەسـەر خۆیـان و موسوڵمانەکان سووك بکەن.

گرنگ ئەوەیـە کـەتۆ بزانـی پارێزگـاریکردنی خزمـەکانی پێغەمبەر لـە پێغەمبەرو هاوەڵانی پارێزگاریکردن نەبوو لەپەیامی ئیسلام و بەرنامـەی پێغەمبـەر ﷺ بـەڵکوو پارێزگـاریکردن بـوو لەشەخـصی پێغەمبـەر لەدەسـتی بێگانـەو ناحـەز، جـا ئەگـەر موسـوڵمانان توانییـان ئـەم جـۆرە پارێزگارییە بۆ قازانجی خۆیـان ئاڕاسـتە بکـەن و هـەل بقۆزنـەوەو بیکەنـە

وەسیلەو هۆکاری جیهادو زاڵبوون بەسەر کافرو رەتدانەوەی فرتو فێڵیانو چەسپاندنی مەبەستو ویستی خۆیان. ئەوە هەوڵدانێکی باشەو هەلێکی زێرینەو هەق وایە بقۆزرێتەوەو رێرەوێکی پیرۆزەو دەبێ پەیرەو بکرێ.

بەڵام پێغەمبەرو هاوەڵانی چی وای لێکردن خۆلەبەر تەوژمی ئەو برسیایەتیو گەمارۆ هەمە لایەنە رابگرن؟ چ مەبەستو غایەیەکیان هەبوو لەپشتی ئەو خۆڕاگرییەیان لەسەر ئەو نارەحەتییە لەوماوە درێژەدا.؟

دەبێ ئەوانەی تەئویلاتو بیانو دەدۆزنەوە بۆ پەیامی پێغەمبەرو دەڵێن: پەیامو ریسالەتی موحەممەد شۆڕشێك بوو دژی دەرەبەگ، شۆڕشی چەپڕەو بوو دژی فیۆداڵو ئەقطاع، شۆڕشی هەژارو چەوساوە بوو دژی دەوڵەمەندو گوزەران خۆش، دەبێ خاوەنی ئەم راوبۆچوونە سەیرو سەمەرانە چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بدەنەوە؟ چ پاساوێك بۆ خۆراگری پێغەمبەرو هاوەڵانی لەبەرامبەر ئەو گەمارۆ کوشندەو درێژخایەنەدا بهێننەوە؟

تۆ بۆخۆت جارێکی تر زەینی خۆت ئاڕاستەی ئەو زنجیرە رووداوانە بکە کەئێمە لەوەپێش رامانوواندن. دەربارەی ئەزیەتدانی پێغەمبەرو هاوەڵانی لەلایەن کافرەکانی قورەیشەوە، ئەمجار لەبەر رۆشنایی ئەوە وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە!!

چۆن دەگونجێ بانگەوازیو پەیامی ئیسلام شۆڕشێکی ئابوری بێو تەوژمی برسیایەتی هەڵی گیرساندبێو رقو قین لەبازرگانو دەوڵەمەندەکانی مەککە سەروکاریو رابەرایەتی کردبێ؟ راپەڕینی چینو هەژار چەوساوە بێ دژی فیودالو دەرەبەگ؟

بێگومان موشریکەکان بە ئیلحاحو پاڕانەوەوە پلەی پاشایەتیو دەسەڵاتو ماڵو سامانی زۆریان خستە بەردەم پێغەمبەر ﷺ

بەمەرجێ واز لە بانگەوازیی خۆی بێنێ و پەیامی ئیسلام ڕانەگەیەنێ.
دەی بۆچی پێغەمبەر ﷺ بەم پێشنیارە چەورانەی قوڕەیش ڕازی نەبوو ڕەتی کردنەوە؟ یان بۆچی هاوەڵ و شوێنکەوتوانی لەدژی ڕانەپەڕین و زەختیان لێ نەکرد کە پێشنیارو عەرضەکانی قوڕەیشی قبوڵ بێ، ئەگەر مەبەستیان تێرو تەسەلی دوای برسیایەتی بووبێ؟ ئایا شۆڕشگێڕانی چەپڕەو چ تەماعێکی تریان هەیە جگە لەوەی فەرمانڕەوایی بەدەست خۆیان بێ و ماڵ و سامان لە صندوق و قاسەو گەنجینەیاندا بێ؟

بێگومان حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا گەمارۆی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتییان خرایەسەر هەموو دەروێکی بژێوو ژیانیان لێ گیرا، بەهۆی ئەوەوە خزمە بتپەرستەکانیشی «بەنو هاشم و بەنو موتەلیب» کەوتنە ناو ئەو ئابلۆقەوە، هیچ کالاَّو شتومەکێکیان پێ نەدەگەیی، هیچ خۆراک و بژێوێکیان دەست نەدەکەوت، تا کارگەیشتە ئەوە گەڵای درەخت و چەرمە وشکەڵ بخۆن، کەچی ئەوان لەسەر ئەو حاڵەو بۆماوەی سێ ساڵی تەواو صەبریان گرت، ئایا کەسێك نیازو مەبەستی لەپشت شۆڕشەکەیەوە ماڵ و سامان و دەستەبەربوونی بژێوبێ، ئاوا هەڵس و کەوت ەکا.؟

کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، پێش ئەوەو دوائەوەش هاوەڵانی کۆچیان کرد، ماڵ و منداڵ و سامان و زەوی و زارو خان و بەرەی خۆیان جێ هێشت و بەسەڵتی و گیرفانی خاڵی بەرەو مەدینە کەوتنەڕێ، هەرچی تەماعی لێ بکرێ لەماڵ و سامان و ژن و منداڵ وازیان لێ هێنا و جێیان هێشت و لەپێنا و ئیمان بەخودا ئەو شتانە چ نرخێکیان نەبوو لەلایان. هیچ وەزن و نرخێکیان دانەنا بۆ ئەو ملك و ماڵەی لەکیسیان چوو بەجێیان هێشت. ئایا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە پەیامی ئیسلام و بانگەوازی حەزرەتی موحەممەد ﷺ شۆڕشی

یەساریی بـووە لـەپێناو پارویـێـك خـۆراك؟ راپـەڕینی چـینی هــەژارو چەوساوە بووە دژی فیودالٌ و دەرەبەگ و تەلارنشین؟

وێدەچێ ئـەو نووسـەرو رۆشـنبیرانەی بـەو شـێوە نەرێنیـە دەڕواننـە سیرەو پێغەمبـەرو پـەیامی ئیسلام و لـەزەینی خۆیانـدا وێنـای دەکـەن بەڵگەینان لەسەر بۆچوونەکەینان ئەم دوو تێبینییەی دوایی بێ.

یەکـەمیان: بڵـێین کۆمـەڵی یەکـەم لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر ئەوانـەی سـەرەتا ئیمانینـان پـێ هێنـاوە لـە مەککـەدا زوربـەیان لەچـینی هــەژارو چەوسـاوە بـوون، ئەمــەش نیـشانەی ئەوەیــە ئەوانــە لەشـوێنکەوتنی پێغەمبـەردا دەرویـەکی رزگـاربوون لەهـەژاری و چەوسـاندنەوەیان بـەدی کردبێ، بەتـەمابوون لـەژێر سـایەی ئـایینی تـازەدا دوا رۆژێکـی ئـابوری باشتریان دەست بکەوێ بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان.

تێبینـی دووەم: ئـەو هاوەڵانـەی پێغەمبـەر ﷺ دوای قبـوڵ کردنـی ئایین و شوێنکەوتنی پێغەمبەر هێندەی پێ نەچوو جیهانیـان لەبەردەمـدا کرایەوە، ماڵ و سامان رووی تێکردن. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە پلانـی موحەممەد بۆئەوە داڕێژرابوو ئەو ئامانجە بپێکێ!!

ئــەتۆ ئەگــەر بــەوردی ســەرنجی تێبینــی و بەڵگــەکانیان بــدەی، لــە تەصەورو وێناکردنی زەینیـان وردبـبیـەوە، دەزانـی چـەند خـەیاڵ و وەهـم زاڵـە بەسـەر عـەقڵ و تەفکیریانـدا، بەشـی خـەیاڵ و وەهـم چـەند زۆرە لـە عەقڵ و پرۆگرامی بیرکردنەوەیاندا.

بەڵێ شتێکی ئاشکرایە کۆمەڵی یەکەم و ئەوانەی سەرەتا ئیمانیان بە پێغەمبەر هێنـا زوربـەیان لەچـینی هـەژارو کۆیلـە و چەوساوە بوون، وەلێ لـەنێوان ئـەم حەقیقەتـە و ئـەو وەهـم و گومانـەدا هـیچ پەیوەنـدی و لێـك نزیکی و نەسەبێك نیە.

بێگومـان شـەریعەت و یاسـایەك جـەخت لەسـەر دانـانی تـەرازوی عەداڵەت وچەسپاندنی لـەنێو کۆمەڵدا بکات، دەسـتی هـەموو سـتەمکارو

ملهوڕو موستەکبیریك ببڕێو نەهێڵێ درێژە بەکاری چەوساندنەوە بدەن، شتێکی ئاساییە کە ئەو ستەمکارو ملهوڕانە پشت لەو شەریعەتو یاسایە هەڵبکەنو بە پیریەوە نەچن، بەڵکوو دژی بوەستنو شەڕی لەگەڵ بکەن بانگخوازانی ئەزیەت بدەن، چونکە ئەو شەریعەتە زیاتر زەرەرو زیان دەخاتە ئەستۆیان تا دەسکەوتو مەغانیم. هەروەکوو چۆن شتێکی ئاساییو موسەللەمە: کە هەموو چینی چەوساوەو فەقیرو هەژار پێشوازی لەشەریعەتو یاسایەکی ئاوابکەن، تەنانەت هەر مرۆڤێك لەبازاری زوڵمو ستەمو چەوساندنەوەدا بەشی نەبێ پێشوازی لێ بکاو ئارەزۆمەندانە قبوڵی بکا. چونکە دەسکەوتی زیاتر کێش دەکا تا ئەرکو زیان. یان بڵێ: بەلانی کەمەوە ئەمانە لەگەڵ خەڵکدا موشکیلەو کێشەیان نیە وایان لێ بکا تەکلیفو ئەرکەکانیان لەسەر قورس بن ئەگەر ئەو شەریعەتە وەربگرن. بێگومان زوربەی ئەوانەی بەدەوری پێغەمبەرەوە بوون دڵنیابوون لەوەی کەئەوان لەسەر حەقنو حەزرەتی «محمد»یش پێغەمبەری خودایەو رەوانەکراوە. وەلێ سەرانی قورەیشو ملهوڕو ئارەزۆمەندانی پاوانخوازیو دەسەلات لەبارودۆخی خۆیانو سروشتی شێوەی ژیانو هەڵسو کەوتیاندا حاڵەتێکیان بۆ دروست بوو بوو ببوە لەمپەڕو کۆسپ لەبەردەمیانو نەیدەهێشت ملکەچی ئەم پەیامە حەقە بننو تەفاعولی لەگەڵدا بکەن، بەلام خەڵکانی تر ئەم بەربەستو تەگەرەیان لەرێگەدا نەبوو کەئیمانی پێ بێننو ئیمانەکەیان لەناخی دڵیان بنج بەستوو ببێ.

دەی باشە پەیوەندی چیە لەنێوان ئەم حەقیقەتەی کە هەموو لێکۆڵەرەوەو رۆشنبیرێك لێی حاڵی دەبێ، لەگەڵ ئەو وەهمو گومانەی ئەو گومانبەرانە هەیانە؟

ئەمما ئەو قسەیەی کە دەڵێن: نەخشەو پلانی بانگەوازیی ئیسلامی کە پێغەمبەر ﷺ پەیرەوی کرد مەبەستو ئامانجی پشت پەردەوەی

دەست بەسەراگرتنەکانی سەروەتو سامانو کۆنترۆڵ کردنی دەسەڵاتو زاڵبوون بەسەر کورسی پاشاو مەلیکەکانی فارسو رۆمداو وەرگرتنی فەرمانڕەوایی لێیان، بە بەڵگەی ئەوەی بە فیعلی موسوڵمانان پاش ماوەیەك ئەم ئامانجانەیان هاتە دی... دەڵێم وەڵلاهی ئەم بیرو بۆچونەشیان ئەوەندە ناقۆڵاو نابەجێیە وەکوو ئەوە وایە هەوڵبدەی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا بخەیە پەنایەکەوەو کۆیان بکەیەوە!!

ئایا ئەگەر موسوڵمانان توانیان لەماوەیەکی کەمدا فەتحی وڵاتی فارسو رۆم بکەن دوای ئەوەی موسوڵمانبوونو لە موسوڵمانبوونەکەیاندا راستگۆبوون، ئایا ئەمە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوان بۆ ئەوە موسوڵمانبوون تەختو تاراجی فارسو رۆم بگرنە دەست؟! کەی ئەمە دەبێتە بەڵگەی ئەوە؟!

ئەگەر ئەوان لەپشت موسوڵمانبوونەکەیان مەبەستیان گەیشتن بەئارەزووە دونیاییەکانیان بوایە هەرگیز بۆیان دەستەبەر نەدەبوو تەنانەت بەشێکی کەمیش لەو فتوحاتەیان بۆ ئەنجام نەدەدرا.

بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەگەر عومەری کوڕی خەتتاب لەوکاتەدا سوپای قادسیەی رێکدەخستو سەرلەشکری ئەو سوپایەی بەڕێ دەکرد کە سەعدی کوڕی وەقاص بوو، دەڵێم ئەگەر تەماعی لەگەنجو خەزینەی کیسرابوایەو دەمی ئاوی تێ بزیایە بۆئەوەی ئەو نازو نیعمەتەی کیسرای دەستکەوێو لەسەر کورسییەکەی دابنیشێ ئەکید سەعد بەکۆمەڵێك تێشکانو ناهومێدییەوە دەگەڕایەوە بۆلای.

بەلام بەڕاستیو لەرێگای خودادا جیهادیان کردو مەبەستیان سەرخستنی ئاینی خودابوو، خوداش سەرکەوتنی ئاوای بۆ رەخساندنو فارسو رۆمی خستنە ژێر دەسەڵاتیانو گەنجو خەزینەو دەسەڵاتێکی وای بۆ دەستەبەر کردن کە بەخەیاڵیشیاندا نەهاتبوو! ئەگەر ئەو ئاواتەی لەشەڕی قادسیەدا لە دڵو دەروونی موسوڵمانەکاندا

جنگڵـی دەدا، گەیـشتن بـەماڵو سـامانو دەسـتەبەر بـوونی گـوزەرانی خۆش بوایـە، دەبـوو ئەوکاتـەی رەبعـی کـوڕی عـامیر ﷺ کەچووە نـاو وتـاغی رۆسـتەم گاڵتـەو سـوکایەتی بـەو دیـاردە خۆشـگوزەرانییەی رۆسـتەمو دارودەسـتەی تێیـدا دەژیـان نەکردایـە، بـەنوکی رمبەکـەی فـەرشو کەرەویتـەو قەنەفـەکانی ونجـڕ ونجـڕ نەکردایەو بەرۆستەمیشی نەگوتایە ئەگەر موسوڵمان بن ئێمە هیچمان لەئێوە ناویو خاكو ماڵو سامانی خۆتان هی خۆتانە. ئایا کەسێك بێ بۆتالانو بڕۆکردن قسەو کفتوگۆی ئاوادەبێ؟

بێگومـان خـودا رێـزی هـاوەڵانی گـرتو فـەرمانڕەوایی جیهـانی ئـەو سەردەمەی پێ بەخشین، چونکە ئـەوان هـەرگیز بیریـان لەوەنەکردۆتـەوە، بـەڵکوو ئـەوان هـەموو بیرو هۆشـیان ئاراسـتەی دەسـتەبەربوونی رەزای خودا کردبوو.

ئەگــەر لــە واقیعــدا ئــەوان مەبەسـتیان لــەجیهادو تێکۆشـان ئـەو دەسـتکەوتە مادییـە دونیاییانـە بوایـە، بەتەئکیـد ئـەو سـەرکەوتنانەیان بەدەست نەدەهێنا.

بـەکورتی مەسـئەلەکە بەهـەموو لایەنێکیـەوە جگـە لـە چەسـپاندنو دەسـتەبەربوونی ئـەو قـانوونو یاسـا خودایيـە بـەولاوە هیـچی ترنیـە کـە دەفەرموێ: {وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ – القصص/ ٥}.

بێگومـان تێگەیـشتن لـەم قانوونـە ئاسمانییـە ئاسـانترین قانونـە بۆئـەوەی عـەقڵ وەری بگـرێ هـەر عـەقڵێك بـێ، وەلێ بەیـەك مـەرج ئـەویش ئەوەیـە خـاوەنی عەقڵەکـە ئازادبـێ لەبەندایـەتیکردن بـۆ هـەر رەغبـەتو مەبەستێکی دونیایی.

# یەکەم کۆچ لە ئیسلام

پاشان کە پێغەمبەر ﷺ بینی موسوڵمانان ئەزیەت دەدرێن لەناو شاری مەککەدا، ناشتوانێ هیچ بەرگرییان لێ بکاو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەیان لەسەر لابەرێ، پێی فەرموون: ئەگەر بچن بۆ وڵاتی حەبەشە شتێکی باشە، چونکە لەوێ مەلیکێکی لێیە دادپەروەرو مرۆڤ دۆستە کەس لای ستەمی لێ ناکرێ، بچن بۆئەوێ تابزانین خودا چمان بۆ بڕیاردەدا، هومێد وایە خودا دەرووی خێرمان لێ بکاتەوەو لەم بارودۆخەی تێیداین رزگارمان ببێ.

ئیتر لەوکاتە بەدواوە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، بۆئەوەی لەو فیتنەو چەورتمە رزگاریان ببێ و بتوانن بەسەربەستی ئایینی خۆیان پەیڕەو بکەن. ئەمەش یەکەم کۆچکردن بوو لەپێناوی ئیسلامدا.

دەستەی یەکەمی ئەو کۆچکەرانە عوسمانی کوڕی عەففان و روقیەی خێزانی «کە کچی پێغەمبەر بوو» و ئەبو حوزەیفەو خێزانی، زوبەیری کوڕی عەوام و موصعەبی کوڕی عومەیرو عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف بوون. ئەمجار موسوڵمانان یەك بەدویەکدا کۆچیان کرد تا ژمارەیان گەیشتە هەشتاو ئەوەندە پیاوە«١».

جا کە قورەیشییەکان دڵنیابوون لەوەی موسوڵمانە کۆچکارەکان لەخاکی حەبەشەدا جێگیربوون و حەوانەوە. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو رەبیعەو عەمری کوڕی العاص «ئەوکاتە موسوڵمان نەبوو بوو» ناردیانن

---

١ - ئەمە رای راستو دروستە وەکوو ئیبنو هشام لەسیرەکەیدا باسی کردووە. ج١/٣٣٠، بڕوانە فتح الباری: ١٣٠/٧.

بۆلای نەجاشی و کۆمەڵێ دیاری نایابیشیان نارد بۆ خودی نەجاشی و بیطریق و داروودەستەکەی، بەئومێدی ئەوەی نەجاشی ئەو موسوڵمانانە رادەستی قورەیش بکاتەوەو لەخۆیان نەگرێ.

جا کەشاندی قورەیش قسەیان لەگەڵ نەجاشی کرد، هەڵبەتە لەوەپێشیش قسەیان لەگەڵ بیطریق و کاربەدەستەکان کردبوو دیارییەکانیشیان دابوونێ. نەجاشی داواکەی رەتکردنەوەو وتی من کەس لەو پەناهەندانە تەسلیم ناکەمەوە بەئێوە هەتا دەربارەی ئایینی تازەیان قسەیان لەگەڵ نەکەم. ئیتر هەندێکیان لەو کۆچکەرانە هێنا بۆلای نەجاشی و دوشالیارەکەی قورەیشیش لای بوون، نەجاشی بەکۆچکەرەکانی گوت: ئەم ئایینە تازەی ئێوە چییە ئێوە لەپێناویا وازتان لەزێدو نیشتمان و گەلی خۆتان هێناوە، ئایینی منتان وەرنەگرتووەو نەچوونە ژێر سایەی ئایینی تریشەوە.؟

ئەوەی لە کۆمەڵی موسوڵمانەکان هەڵسایە سەرپێ و کەوتە قسە وتی: جەنابی پاشا ئێمە نەتەوەیەکی نەفام بووین بت و صەنەممان دەپەرست، مردارەوەبوومان دەخوارد، صیلەی رەحمەمان دەپچڕاند، هێرشمان دەکردە سەر دراوسێ و بەهێز بێ هێزی دەچەوساندەوە، ئێمە لەو بارودۆخەدا بووین هەتا خودا لەخۆمان پێغەمبەرێکی بۆسەر رەوانەکردین، بنەماڵەو ریشەو نژادی دەناسین، راستگۆو ئەمین و داوێن پاک و رەوشت بەرزە، بانگەوازی کردین بۆلای خودا بۆئەوەی یەکتاپەرستی بکەین تەنها خودا بناسین و بەندایەتی هەر بۆئەو بکەین، واز لەو عیبادات و ئایینە بهێنین کە ئێمەو باوك و باپیرمان لەوەپێش پابەندبووین پێوەی، داوای لێ کردین واز لەبتپەرستی بێنین و خودا بپەرستین، فەرمانی پێکردین بەراستگۆیی و پارێزگاری ئەمانەت و بەجێ گەیاندنی صیلەی رەحم و جیران دۆستی و خۆپاراستن لەکارو ئاکاری

حەرامو خوێنڕشتنی بەناحەق، نەهی لێکردین لەکاری فاحیشە ئامێزو قسەی بوختانو درۆ، نەی لێکردین لەخواردنی مالی هەتیوو بوختانکردن بەئافرەتی داوێنپاك. فەرمانی پێ کردووین کەتەنها بەندایەتی خودا بکەینو کەس نەکەین بە هاوەڵو هاوبەشی، ئێمەیش کەبینیمان ئەم پێغەمبەرە ئەوە پەیامو ئەوە ئەخلاقو رەوشتییەتی، بڕوامان پێکرد ئیمانمان پێ هێنا، شوێن پەیامەکەی کەوتین، خودا پەرستیمان کرد، تەنها بۆ خودا عیبادەت دەکەین کەس ناکەینە هاوەڵو هاوشانی، خودا چی بۆ حەلاڵ کردوین بەحەلاڵی دەزانین، ئیتر لەپای ئەمە، نەتەوەکەمان عەشیرەتو کەسوکارمان دژایەتییان کردین، ئەزیەتیان داین، لەسەر پابەندبونمان بە ئایینەکەمانەوە جۆرەها گێچەڵو بیانوویان پێ گرتین، هەوڵیاندا لە ئایینەکەمان ژێوانمان بکەنەوە، بگەڕێینەوە بۆسەر بتپەرستیو واز لەخوا پەرستی بهێنن... جا کەئاوا شکاندیانین ستەمیان لێ کردین تەنگیان پێ هەڵچنین، ویستیان لەئایین پەشیمانمان بکەنەوە، پەنامان هێنا بۆ وڵاتی ئێوەو بووینە پەنابەر لای ئێوەی خاوەن شکۆ، لای ئێوەمان هەڵبژارد، حەزمان لەوەبوو بێینە ژێر سایەی تۆوە هومێدەوارین لای ئێوەی خاوەن شکۆ ستەممان لێ نەکرێ!!

ئەمجار نەجاشی داوای لێکرد شتێك لەو کەلامەی پێغەمبەر لەخوداوە هێناویەتی بۆی بخوێنێتەوە. جەعفەر سەرەتای سوورەتی «مریم»ی بۆخوێندەوە نەجاشی گریاو فرمێسك بەڕیشیدا هاتەخوار، پاشان وتی: بێگومان ئەم کەلامەو ئەوەی عیسا هێناویەتی روناکی یەك چران، ئەمجار رووی کردە دوو نەفەرە نێردراوەکەی قوڕەیش وتی: ئێوە بگەڕێنەوە سوێندم بەخودا من هەرگیز ئەوانە رادەستی قوڕەیش ناکەمەوە، لەگەڵ ئێوەدا نایان نێرمەوە، بەخەیاڵیش بەتەما ئەوە مەبن.

بۆجاری دووەم عەمری کوڕی عاص و هاوەڵەکەی ڕۆژی دوایی چوونەوە لای نەجاشی، وتیان جەنابی پاشا ئەو هەڵاتوانەی ئێمە بوختانی گەورە بە عیسای کوڕی مەریەم دەکەن، بنێرە بەدویاندا پرسیاریان لێ بکە لەوبارەوە بزانە چی دەڵێن. نەجاشی بەدویدا ناردون و لەوبارەوە پرسیاری لێ کردن. جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب وتی: ئەوە دەڵێین: کە پێغەمبەرەکەمان بۆی هێناوین ئەویش ئەوەیە: عیسا بەندەی خودایە روحی پەروەردگارە، وشەی پەروەردگارە ئاڕاستەی مەریەمی کچە شونەکردوی پاك داوێنی کرد. ئیتر نەجاشی دەستی لەزەوییەکەی بەردەمی گێڕا چیلکۆڵەیەکی دۆزییەوە ئەمجار وتی: دە سوێندم بەخودا عیسای کوڕی مەریەم بۆ خۆی بە ئەنازەی ئەم چیلکۆڵە لەوەی ئێوەی زیاتر نەگوتووە. پاشان دیارییەکەی پێدا ناردنەوەو پتر سوربوو لەسەر پەنادانی موسوڵمانەکان و پارێزگاری کردن لێیان، نوێنەری قوڕەیشییەکانیش بەنائومێدی گەڕانەوە بۆ مەککە. پاش ماوەیەك موسوڵمانە پەنا هێندەکان هەواڵیان پێگەیی کە دانیشتوانی مەککە موسوڵمانبوون، ئەوانیش لەخۆشی ئەوە گەڕانەوە، کە نزیکی مەککە بوونەوەو لەوبارەوە پرسیاریان کرد بۆیان دەرکەوت ئەوەی دەربارەی موسوڵمان بوونی دانیشتوانی مەککە پێیان گەیشتووە ڕاست نییە، ئیتر نەوێران بەئاشکرا بێنە ناو شارەوە هەندێکیان بەدزی و قاچاغی خۆیان کرد بەناو شارداو هەندێکیشیان بەیاسای جیوارو داڵدەدانی کەسانێکی ناو مەککە هاتنە ناو شارەوە، ژمارەی موسوڵمانە گەڕاوەکان سی و سێ پیاوبوو، یەکێك لەوانەی بەیاسای جیوار هاتە ناو شارەوە عوسمانی کوڕی مەظعون بوو بەجیواری «الولید» کوڕی «ألمغیرة» هاتەوە. ئەبو سەلەمە بەجیواری ئەبو طالیب هاتە ناو شارەوە.

**پەندو ئامۆژگاری:**

لــەباس و روداوی کۆچــکردنی موســوڵمانەکان بــۆ حەبەشــە ســێ دەلالەت وەردەگرین:

**دەلالەتی یەکەم:**

دەزانین کە ئایین و پابەنـدبوون پێیـەوە بناغـەو سەرچاوەی هـەموو هێـزو توانایەکـە. شـوراو سـیاجێکی پتـەوە بـۆ پارێزگـاری لەهـەموو حـەقێك چ ملْك و ماڵ و زەوی و زاربێ یان ئازادی و کەرامەتی مرۆڤی بێ.

بۆیە ئەرکی سەرشانی بانگخوازانی ئیسلامی و موجاهیدانی رێبـازی خودایە: کەهەموو هێزو توانایەکیان بخەنە گەڕ بۆ پارێزگـاری لـە ئایین و مەبادیئەکانی، نیشتمان و ماڵ و گیـانی خۆیـان بکەنـە هۆکـارو وەسـیلەی پارێزگـاری عەقیـدەو چەسـپاندنی، تەنانـەت ئەگـەر کـار گەیـشتە ئـەوە داخوازی ئەوەبوو هەموو ئەوانە لەپێنا و ئاییندا بەخت بکا، پێویستە بێ سێ و دوو بـەختیان بکـا. چونکە ئەگـەر ئـایین نـەما و پێـشێل کـرا، ماڵ و نیـشتمان هـیچ سـودێکیان نییـە، بـەڵکوو ئـەوانیش زوو بـەدوا فـەوتانی ئاییندا لەکیس دەچن، وەلێ ئەگەر بیرو باوەڕ بەهێزبوو، کۆمەڵگە لەسـەر بنــەمای ئــایین دامــەزرابوو، بـیرو بـاوەڕ لــەدڵ و دەروونـدا جـێگیر بـوو، هەرچی لەپێناویا ببەخشی لـەماڵ و سامان و نیـشتمان زۆر زوو دێتـەوە دەسـت و قـەرەبوو دەکرێتـەوە، بـەڵکوو باشـترو زۆرتـرو بـەهێزتر دێنـەوە دەسـت، چونکە ئەوکاتـە شـوراو سـیاج و پـەرژینێك لـە کەرامـەت و هێـزو بەصیرەت دەیپارێزێ.

بێگومـان سـوننەتی خـودا بەدرێـژایی مێـژوو وا رێـچکەی بەسـتووە لەبونـەوەردا کـەهێزی مەعنـەوی پـارێزەری دەسـکەوت و هێـزە مادیـەکان بێ، چەندێك گـەل و نەتـەوە لـەبارەی ئـەخلاق و بیروبـاوەڕی سـاخ و بنـەما کۆمەلآیەتیـە دروسـتەکانەوە دەوڵەمەنـدبێ، ئـەوە بێگومـان دەسـەڵاتە

مادییەکەی زیاتر یەکدیگیرو پێکەوە گونجاوو پتر داکوتراوو خۆڕاگرو پارێزراو دەبێ، بە پێچەوانەوە گەل‌و نەتەوە چەندێك لەڕووی ئەخلاقەوە هەژارو لەعەقیدەو بیرو باوەڕدا چەواشەو سەرگەردان بێ، یاساو نیظامی کەم‌و کورتی تێدابێ، ئەوەندە دەسەڵاتە مادییەکەی لە فەوتان‌و توانەوەو تێداچوون نزیکەو دەسکەوتە مادییەکانی خێران بۆ تڕیلبون‌و فەوتان.

ڕێ دەکەوێ تۆ گەل‌و نەتەوەیەك دەبینی لەبواری عەقیدەو باوەڕدا سەر لێ شێواوەو لەڕووی ئەخلاقییەوە روخاوەو ئاستی کۆمەڵایەتی تابڵێی نزمە، کەچی لەڕووی هێزو دەسەڵاتی مادییەوە باڵا دەست‌و خۆڕاگرە، ئەمە تۆ وای دەبینی، وەلێ لەواقیع‌و حەقیقەتدا ئەو گەل‌و نەتەوە بەخێرایی بەرەو شیوی نەمان‌و فەوتان دەڕوا، هۆی ئەوەش کەتۆ هەست بەو رۆیشتنە خێرایە ناکەی کە ئەو نەتەوە ئەخلاق روخاوە باوەڕ شێواوە ملی لێ ناوە کورتی تەمەنی مرۆڤە لەبەرامبەر درێژی تەمەنی مێژوودا. ئەم جۆرە جم‌و جوڵ‌و رەوکردنە بەرەو چاڵی تێداچوون‌و فەوتان چاوی دوربین‌و بەئاگای مێژوو دەیبینێ نەك چاوی ئینسانی غافڵ‌و بێ ئاگا. هەروا ڕێ دەکەوێ گەل‌و نەتەوەیەك دەبینی هەرچی هێزو موقەویماتی مادی لە ماڵ‌و سامان‌و نیشتمان لەدەستیداوە لەپێناو پارێزگاری کردنی بیرو باوەڕی ساخ‌و راستی، لەپێناو دروستکردنی کۆمەڵگایەکی رەوشت بەرزو یاسایەکی کۆمەڵایەتی دروستدا، دەبینی ئەم گەلە کەهێزی مادی هەموو لەو پێناوەدا لەدەست داوە، زۆری پێ ناچێ ئەم گەلە خاوەن بیرو باوەڕە راستە کەدارای رەوشتی بەرزو یاسای کۆمەڵایەتی دروستە نیشتمانی خۆی ئازاد کردووە، ماڵی داگیرکراوی خۆی ستاندۆتەوە هێزو دەسەڵاتی مادی خۆی بەدوو چەندانەو چەند چەندانە بۆ گەڕاوەتەوە.

دڵنیابە ئەتۆ وێنەی صەحیح و راستت دەربارەی کەون و ئادەمیزادو ژیان دەست ناکەوێ مەگەر لەبیرو باوەڕی ئیسلامیدا کە ئایینی هەڵبژاردەی خودایە بۆ بەندەکانی لەسەر زەوی. یاسا و نیظامی کۆمەڵایەتی عادڵانەو ساغت وەگیر ناکەوێ مەگەر لەیاسا و نیظامی ئیسلامی و شەریعەتیدا دەستت بکەوێ. بۆیە لایەنێکی گرنگی بنەمای بانگخوازیو دەعوەی ئیسلامی بەختکردنی ماڵ و سامان و زێدو نیشتمان و گیانە.

لەبەرئەوە بنەمای کۆچکردن لەئیسلامدا دانراوەو بەڕەوا زانراوە. پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی بینی هاوەڵانی لەلایەن موشریکەکانەوە ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن و ئازارەکە ئەوەندە کوشندەیە لەوانەیە خۆی بۆ نەگرن و لەئایین پەشیمان ببنەوە. ئاماژەی بۆکردن کە مەککە بەجێ بێڵن و کۆچ بکەن.

تۆ دەزانی ئەم کۆچکردنە خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لەسزاو ئەشکەنجە لەپێنا و ئاییندا. چونکە کۆچکردن لە حەقیقەتدا خۆدزینەوە نییە لەسزاو ئازار، بەڵکوو گۆڕینی جۆری میحنەت و ئازارە لەجۆرێکە بۆ جۆرێکی تر. بەهیوای هاتنی رۆژی رزگاریو سەرکەوتن.

ئەتۆ ئەوەش دەزانی کە مەکە لەو رۆژگارەدا وڵاتی ئیسلام «دار الإسلام» نەبوو هەتا بگوترێ: بۆچی ئەو هاوەڵانە «دار إسلام»یان جێ هێشت و بەمەبەستی سەلامەتی گیانیان رویان کردە وڵاتێکی کافر! ئەوکاتە مەککەو حەبەشەو شوێنەکانی تریش هەموویان وڵاتی کوفربوون، چ وڵاتێك بۆ هاوەڵان گونجاوتر بێ لەبارەی ئەنجامدانی کارە ئایینیەکان و بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام ئەوە ئەوجێیە شیاوترە بۆ تێدا نیشتەجێ بوون.

ئەمما کۆچکردن لە «داراسلام»ەوە ئەوە جاری واهەیە واجبە، جاری وادەبێ دروستە، کاتی وایش هەیە حەرامە. کاتێك موسوڵمان نەیتوانی بەئازادی ئەرکە ئیسلامییەکان ئەنجام بدا، ڕێگری لێ دەکرا لەنوێژو ڕۆژو بانگو حەج ئەوە پێویستە ئەو وڵاتە جێ بێڵێو کۆچ بکا بۆ شوێنێك بتوانێ بە ئازادی ئەو ئەرکانە بەجێ بێنێ. کاتێکیش لە وڵاتیکدا تەنگی پێ هەڵچندراو تووشی چورتمو کێشە دەبوو ئەوە بۆی ڕەوایە کۆچ بکا بۆ وڵاتێکی ئیسلامی تر، ئەگەر بەهۆی کۆچکردنی ئەوەوە واجبێکی ئیسلامی پاشگوێ دەخراو بەبێ ئەو لەو وڵاتەدا ئەنجام نەدەدرا ئەوە کۆچکردن بەنیسبەت ئەوە حەرامە«١».

**دەلالەتی دووەم:**

لەم بڕگەیەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ حەقیقەتێك وەردەگرین کە بریتییە لە پەیوەندیی نێوان پەیامی پێغەمبەرو پەیامی حەزرەتی عیسا «صەلاتو سەلامی خودا لەسەر هەردووکیان». بێگومان نەجاشی لەسەر ئایینی عیسا بوو موخلیصو ڕاستگۆبوو لەبیرو باوەڕی مەسیحیدا ئەم ئیخلاصو دڵسۆزییەی بۆ ئایینەکەی داخوازی ئەوە بوو کە بەمو لەبنەماکانی ئایینەکەی لانەدا. یارمەتی کەسێك نەدا کەبیرو باوەڕی جوداوازە لەوەی کە ئینجیل لەخۆی گرتووەو حەزرەتی عیسا ڕای گەیاندووە.

دەی ئەگەر قسەو پڕو پاگەندەی ئەوانەی خۆیان پاڵ حەزرەتی عیسا دەدەنو گوایە پابەندی ناوەڕۆکی ئینجیلن، ئەگەر قسەکەیان ڕاستبێ کە عیسا کوڕی خودایە یا سێیەمی سێ خودایە، ئەوە ئەوکاتە

---

١ - بڕوانە تەفسیری قورطوبی: ٢٥/٥، احکام القرآن: ٢/٨٨٧.

نەجاشی کە دڵسۆزترین ئادەمیزادە بۆ ئایینی مەسیحی دەبوایە یەکسەر ڕەتی ئایەتەکەی قورئانی بکردایەوەو قسەی موسوڵمانەکانی قبوڵ نەبوایە پشتگیریی شاندی قوڕەیشی بکردایەو داخوازییەکەیانی جێبەجێ بکردایە.

وەلێ ئێمە دەبینین نەجاشی دوای ئەوەی کە گوێی گرت بۆ خوێندنی سەرەتای سورەتی مەریەمو بیرو باوەڕی موسوڵمانەکان دەربارەی ژینامەی حەزرەتی عیسا، دەکەوێتە قسەکردنو دەڵێ سوێندم بەخودا ناوەڕۆکی ئەم دەقەی گوێم لێ بوو لەگەڵ ئەو پەیامەی حەزرەتی عیسا هێناویەتی سەرچاوەکەیان یەك ڕۆشنایی و چرایەکە بەمو جوداوازیی لەنێوانیاندا نییە، ئەم فەرمایشتە دەڵێ بەئامادەبوونی هەموو بطریقەکانو زانایانی ئەهلی کیتاب کە لەوکاتەدا لەدەورو بەری بوون.

ئەم هەڵوێستو پشتگیرییەی نەجاشی جەخت لەسەر شتێك دەکاتەوە کە چەسپاوو ئاشکراو حاشا هەڵنەگرە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەران هەموویان یەك عەقیدەو بیرو باوەڕیان هەیەو پەیامەکەیان لەبواری بیرو باوەڕدا بە ئەندازەی تاڵە موویەك جوداوازی تێدانییە. هەروا جەختی ئەوەمان بۆ دەکاتەوە: کە ڕاجیایی و خیلافی نێوان ئەهلی کیتاب کاتێك هاتە کایەوە کە قورئان نازڵ بوو بیرو باوەڕی ڕاستو دروستی دەربارەی حەزرەتی عیسا بۆ روون کردنەوە، ئەوان لەجیاتی ئەوەی بڕوای پێ بکەن، لەلایەن خۆیانەوە بەناحەقو سەرپێچی ئەم بیرو باوەڕە شێواوو نەگونجاوەیان لەناو خۆیاندا بڵاوکردەوە.

**دەلالەتی سێیەم:**

ئەوەیە دروستە بۆ موسوڵمانان لەکاتی پێویستدا پەنابەرنە بەر ناموسوڵمانو خۆیان بخەنە ژێر حیمایەو سێبەریانەوە. جا ئەو

پەنادەرە لەئەهلی کیتاب بێ. وەکوو نەجاشی کە ئەوکاتە مەسیحی بوو دوایی موسوڵمان بوو. یان موشریك‌و بتپەرست بن وەکوو ئەو بتپەرستانەی داڵدەی موسوڵمانەکانیان داو بەیاسای «جیوار» موسوڵمانە گەڕاوەکانی حەبەشەیان خستە ژێر حیمایەی خۆیانەوە. وەکوو لەوەپێش ئامارەمان بۆکرد ئەبو سەلەمە چووە ژێر حیمایەو جیواری ئەبو طالیبەوە، عوسمانی کوڕی مەظعون چووە ژێر حیمایەی «ألولید بن المغیرة»وە.

ئەمەش بەو مەرجە کە داڵدەدان‌و حیمایەکە زیان بەبانگەوازی ئیسلامی نەگەیەنێ، یان نەبێتە هۆی گۆڕینی هەندێ ئەحکامی ئایین، یان بێدەنگ بوون لە ئەنجامدانی هەندێ شتی حەرام. ئەگینا دروست نییە بۆ موسوڵمان بچێتە ژێر حیمایەی ناموسوڵمانەوە. بەڵگەی ئەمەش هەڵوێستی پێغەمبەرە ﷺ کاتێك ئەبو طالیب داوای لە پێغەمبەر کرد کەخۆی نەخاتە چورتم‌و کێشەوەو ئەرکێکی واش نەخاتە سەرئەو کە نەتوانێ هەڵی بگرێ‌و چیدی دژی خوداکانی قورەیش نەدوێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بڕیاری ئەوەی دا کە لەژێر حیمایەی مامی بچێتەدەرو رازی نەبوو بەهیچ شێوەیەك لەحەندای خودا درۆزنەکانیان بێدەنگ بێ‌و ئەوەی واجبە لەسەری نەیگەیەنێ.

## یەکەم وەفدێك کەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ

لەگەرمەی ئەو ئازارو ئەشکەنجەدانەی یەخەی پێغەمبەرو هاوەڵانی گرتبوو لەشاری مەککە وەفدێك لەدەرەوەی مەککەوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام، وەفدەکە سی‌و ئەوەندە پیاوەبوون لە مەسیحیەکانی حەبەشە، لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبو طالیبدا هاتبوون بۆ مەککە، چونکە لەوکاتەدا جەعفەر گەڕابووەوە بۆ

مەککە. جا کە وەفدەکە هاتن و لەلای پێغەمبەر دانیشتن و رەوشت و ئەخلاقی ئەویان بینی، گوێیان لەو قورئانە بوو کە بەسەریدا خوێندن، هەموویان ئیمانیان پێ هێنا، کاتی ئەم هەواڵە گەیشتە ئەبو جەهل هات بۆلایان و پێی وتن ئێمە تائێستا کۆمەڵی لەئێوەمان گێلتر نەبینیوە!!

لای خۆی گەلەکەتان ئێوەی ناردووە هەواڵی ئەو پیاوە بزانن، کەچی هێشتا بەتەواوی لای دانەنیشتن وازتان لەئایینی خۆتان هێناو بڕواتان پێکردو ئیمانتان پێ هێنا!!

ئەندامانی وەفدی نەصرانییەکان وتیان سەلاّوتان لێ بێ ئێمە وەلاّمی قسە نەفامیەکەتان نادەینەوە، ئایینی خۆمان بۆ خۆمان و ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، ئێمە هەلمان بۆ هەڵکەوتووە لەکیس خۆمانی نادەین. ئیتر دەربارەی ئەمانە نیگای خودایی دابەزی کە دەفەرموێ:

{الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ، وَإِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ، أُوْلَئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَؤُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ – القصص/ ٥٢ – ٥٥}.

## پەندو ئامۆژگاری:

پێویستە روداوی هاتنی ئەم وەفدە دوو سەرنج بۆ ئێمە بخاتە روو:

یەکەم: لەهاتنی ئەم وەفدە بۆ شاری مەککە بەمەبەستی کۆبونەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و شارەزابوون لە ئیسلام لەو رۆژە تەنگانەو ناخۆشانەدا: کە موسوڵمانان لەسەر دەستی قورەیشییەکان تووشی ئەزیەت و تەنگ پێ هەڵچنین و گەمارۆدانی هەمە لایەنە بوو بوون، بەڵگەی بەهێزو پتەو هەن لەسەر ئەوەی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی

بانگخوازان و هەڵگرانی دەعوەی ئیسلامی تووشی دەبن لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیاندا، بەهیچ شێوەیەك نابێ مانای تێکشکان و سەرنەکەوتن بگەیەنێ، نابێ لاوازی و نائومێدی لەگەیشتن بەمەبەستی لێ بکەوێتەوە، بەڵکوو عەزاب و چورتم «وەکوو وتمان» رێبازێکە بەرەو سەرکەوتن و گەیشتن بەئامانج دەبێ بگیرێتەبەرو ئەو رێگایە ببردرێ، دەبێ رێبوارانی رێگای دەعوەو بانگەوازی پێیدا برۆن.

بەڵێ ئەو وەفدە لەوڵاتی حەبەشەوە هاتن ژمارەیان لەسی پیاو زیاتر بە ریوایەتێك چل پیاوی مەسیحی بوون، دەریای قوڵ و رێگای دووریان بڕیبوو هاتبوون بۆئەوەی بەخزمەت پێغەمبەر بگەن و وەلائو پشتگیری خۆیان بۆ ئایینی تازە رابگەیەنن، بەزوبانی حاڵ ئەو حەقیقەتە ئیعلان بکەن کە دوژمنانی دەعوەی ئیسلامی ناتوانن ئەو ئایینە بکوژێننەوە، چەندێك گەمارۆی هەمە لایەنی بخەنە سەرو ئەزیەتی هەڵگرانی بدەن، هەوڵی گۆشەگیر کردنیان بدەن، بیانەوێ نوری پرتەوبەخشی بڵاونەبێتەوە بەروبومی خێری بەرهەم نەیە، ئەوە جگە لەماندوبوون و سەر لەبەرد دان هیچی تریان دەست ناکەوێ، ئایین بڵاودەبێتەوەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەگرێتەوە. هەردەڵێی ئەبو جەهل ئەم حەقیقەتەی زانیوە، بۆیە وابە هەڵەداوان هات و ئەو وشە ناشیرین و پڕ لەکینەو بوغزەی پڕماندن و ئاوا بەوجۆرە روبەڕوی وەفدی لەدوورەوە هاتووی میوان بۆوە. وەلێ ئەبو جەهل بەتەمای چییە بیکا؟ چی پێ دەکرێ؟ بێگومان هەرچی ئەوو ئەمثالی ئەو دەتوانن بیکەن ئەوەیە درێژە بە ئەزیەتدانی موسوڵمانان بدەن، شێوەی ئازارو ئەشکەنجە بگۆڕن و توندتری بکەن، ئەگینا ناتوانن بانگەوازی ئیسلامی لەگۆڕنێن یان لەشوێنی خۆی قەتیسی بکەن و نەهێڵن بەچواردەوردا پڕتەو بەخش بێ، ئەمە لەتوانای ئەبو جەهل و هاوەڵانیدا نییە.

دووەم: جـۆری ئـەو ئیمانـەی شـاندەکە وەریـان گـرتو چـووە ناخیانـەوەو جێگیربـوو چ ئیمانێـك بـوو؟ ئایـا ئیمانێـك بـوو لـە تـاریکی کوفرو گومڕایی رزگاری کردنو خستنیە جیهانی نورو روناکیو بەرچاو رونییەوە؟

واقیـعو روداوەکـە ئـاوا ئامـاژە دەکـا کـە ئیمـان هێنانەکـەیان تـەنها درێژەپێدانی ئیمـانی پێشوویان بـووە، تـەنها سلوكو پەیوەنـدی کـردن بووە بە پێغەمبەرەوە بەپێی ئەو بیرو باوەڕەی لەوەپێش لەسەری بـوون. بێگومـان ئـەو وەفـدە «وەکـوو راویو لێکۆڵـەرەوانی سـیرە وتویانـە» هەڵگری پەیامی ئینجیل بوونو ئیمانیان پێی بووە بەگوێرەی ناوەڕۆکی ئەو کتێبە ئاسمانییە رەفتاریان کردووە. جا لەکاتێکدا ئینجیل فەرمان دەکا کە هەرکاتێ پێغەمبەری دوا عیسا پەیدابوو ئیمانی پـێ بهێـنن، لەهەمان کاتدا ناوو نیشانەو رەوشتی ئەو پێغەمبەرەشی باسکردووە. دیـارە دەبـێ بـە موقتـەضـای درێـژەدانیان بـە ئیمانەکـەیان ئیمـان بـە پێغەمبەری ئاخر زەمان بێنن کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ.

کـەوابوو ئیمانهێنانیـان بـە پێغەمبـەر ﷺ وەرگـەڕان نـەبوو لـە ئایینێکەوە بۆ ئایینێکی تر، بەهۆی ئەوەی ئەم ئایینە لەو ئایینە باشترو گەورەترە. بەڵکوو ئیمانهێنانەکەیان درێژەدان بوو بە حەقیقەتو بنـەمای ئـەو بـیرو بـاوەڕەی لـەوەپێش بـە حـەزرەتی عیـسایان هـەبووەو پابەنـدبوونیان بـوو بـەناوەڕۆکی ئـەو نامـە ئاسمانییـەی بـۆ سـەری نـازڵ بـوو، ئەمەیـە مانـای راسـتو دروسـتی ئـەو وتـە پیرۆزەیـان: کـە قورئـان لێیانەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{وَإِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَـا إِنَّـا كُنَّـا مِـن قَبْلِـهِ مُـسْلِمِينَ – القصص/٥٣}.

ئەمــە هەڵوێــستی هــەموو مرۆڤێکــە کەبەڕاســتی پابەنــدی پــەیامی ئینجیـل بووبـێ: کـە حـەزرەتی عیـسا هێناویـەتی و رایگەیانـدووە، یـان پابەندی ئەو پەیامەبێ کە حەزرەتی مووسا هێناویەتی.

چونکە ئیمان بە ئینجیل و تەورات سەردەکێشێ بە ئیمان هێنان بە قورئــان و بــە پێغەمبەرایــەتی حــەزرەتی موحەممــەد ﷺ هەربۆیــە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کردووە کە لەبانگەوازیکردنی ئــەهلی کیتابـدا تــەنها داوای ئـەوەیان لێبکـا کـە نـاوەڕۆکی تــەورات و ئینجیل تەطبیق بکەن، چونکە ئەگەر ئەوان بەڕاستی پابەندی ناوەڕۆکی ئـەو دوو نامـە ئاسمانییـە بـن، ئـەوە بـێ سـێ و دوو پابەندبوونەکـەیان سەردەکێشێ بۆ ئیمان هێنان بە ئیسلام. ئەوەتا خودا دەفەرموێ:
{قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَى شَيْءٍ حَتَّىَ تُقِيمُواْ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ – المائـدة/ ٦٨}.

ئەمەش جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە دەکاتەوە کە لەوەپێش رونمان کردەوە و بریتییە لەوە کە ئایینی حەق یەك ئایینە و زیاتر نییە، هەر لــەرۆژگاری حــەزرەتی ئادەمــەوە تــا دەگاتــە رۆژگــاری پێغەمبەرایــەتی حــەزرەتی موحەممــەد ﷺ هــەموو پێغەمبــەران پــەیرەوی یــەك ئاینیــان کـردووە کـە ئـایینی ئیـسلامە، هـەموو پێغەمبـەرەکان بانگـەوازییان بـۆ ئیسلام کـردووە و پابەنـدی ئـەو ئایینـە حەقەبوون کـەلای خـودا پەسـەند بووە {ان الدين عند الله الاسلام...}. کەوابوو ئەو قسەیەی بەسەر زمانی خەڵکەوەیــە و دەڵــێن: «ألأديــان الــسماوية» وشــەیەکی بــێ مانایــە و لەبناغەدا هەڵە بووە و نابێ ئێمە بەکاری بێنین چونکە ئایینی ئاسمانی یەك ئایینە و ئەویش ئایینی ئیسلامە.

بـەڵێ شـەریعەتی ئاسمـانی جـۆراو جـۆر هـەن هـەموو شـەریعەتێك کەهاتووە شەریعەتی پێش خۆی هەمووی یان زوربەی نەسخ کرۆتەوە.

وەلێ پێویستە ئێمە دین: کە بریتییە لە عەقیدەو بیرو باوەڕ تێکەڵاوی نەکەین بە شەریعەتەوە کە بەزۆری و هەمیشە بۆ ئەحکامو سلوك «کە پەیوەستن بە عیباداتو معامەلاتەوە» بەکاردی، دەتوانین بڵێین: «شرائع سماوية» بەڵام ناتوانین بڵێین: «أديان سماوية».

## ساڵی خەمو پەژارە «عام الحزن»

پێغەمبەرو موسوڵمانەکان لەگەمارۆی قورەیش رزگاریان بوو، هەرکەسەو هاتەوە سەر ماڵو حاڵی خۆی، پێغەمبەر ﷺ دەستی کردەوە بە بانگەوازی خۆی، زۆری پێ نەچوو لەوساڵەدا کە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بوو، دوو کۆسپی گەورە روویان لە پێغەمبەر کرد، دوو پشتیوانو یارمەتیدەری دڵسۆزی لەکیس چوون، ئەوەبوو لەوساڵەدا خاتوو خەدیجەی خێزانی رضي الله عنها کۆچی دوایی کرد. هێندەی پێ نەچوو ئەبو طالیبی مامیشی لەدونیا دەرچوو.

ئیبنو سەعد لەکتێبی «الطبقات»دا دەڵێ: ماوەی نێوان وەفاتی خەدیجەو ئەبو طالیب مانگێكو پێنج رۆژبوو.. بێگومان خاتو خەدیجە «وەکوو ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە» پاڵپشتی راستگۆو دڵسۆزی پێغەمبەر بوو، خەمڕەوێنو هاوسەرو هاودەمی بوو، پێغەمبەر سکاڵای خۆی لادەکردو ئەویش دڵخۆشی دەدایەوەو بەقسەو پشتگیری کردنەکەی ئارامی دەگرتو ناخۆشی لەبیر دەچوونەوە. ئەبو طالیب هەرچەندە موسوڵمان نەبوو بوو، بەڵام لەڕوی مامو برازایەتییەوە پشتی گرتو هەموو تاڵیو سوێریو ناخۆشییەکی لەپێناودا چەشتو یارمەتیدەرو پەنایەکی بەهێزبوو بۆی. قورەیش حیسابی تایبەتییان بۆدەکرد.

ئیبنو هیشام دەڵێ: کە ئەبو طالیب مرد، قورەیش بەربەستیان لەبەردەمدا نەماو کەوتنە ئەزیەتدانی پێغەمبەر بەجۆرێك کە لەوەپێش‌و لەژیانی ئەبو طالیبدا نەدەوێران ئەو جۆرە ئەزیەت‌و ئەشکەنجەیەی بدەن، تەنانەت رۆژێکیان هەتیوە خوێڕییەکی قورەیش بەری رێگای پێ گرت‌و مستە گڵ‌و خۆڵێکی بەسەردا کرد پێغەمبەر بەسەری تەپ‌و تۆزاوییەوە گەڕایەوە ماڵەوە، یەکێك لەکچەکانی ئاوی بەسەریدا کردو گڵ‌و خۆڵەکەی لێ پاك کردەوە، ئەو کچە بەدیمەنەکە ئەوەندە ناڕەحەت بوو دەستی کرد بەگریان، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێ: کچەکەم مەگری بێگومان خودا پارێزگاری باوکت دەکا.

پێغەمبەر ﷺ بەمردنی خاتوو خەدیجەی خێزانی‌و مردنی ئەبو طالیبی مامی هێندە ناڕەحەت بوو ساڵەکەی ناونا ساڵی ماتەمی «عام الحزن».

## پەندو ئامۆژگاری:

دەبێ حیکمەتی یەزدانی چیبێ لەوەدا کە قەضاو قەدەری وای خواست کە پەلەبکا لەگیان کێشانی ئەبو طالیب، بۆچی پێش ئەوەی شان‌و شەوکەتی موسوڵمانان بەهێزبێ‌و بتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن ئەبو طالیب مرد؟! بێگومان ئەو بەحوکمی پلەی عەشائیری‌و بە ئەندازەی توانای خۆی لەزۆر چورتم‌و ناڕەحەتی پێغەمبەری پاراست.

ئەمجار دەبێ حیکمەت لەوەدا چیبێ کە قەزاو قەدەری خودا واداخوازبێ خاتوو خەدیجەی خێزانیشی وەفات بکا، لەکاتێکدا پێغەمبەر هەموو ئارامییەکی لەلای خەدیجە دەست دەکەوت، بەهۆی پشتگیری‌و کارامایی ئەوەوە زۆر ناڕەحەتی‌و ئازاری لەسەر سووك دەبوو.

لێرەدا دیاردەیەکی گرنگ خۆی دەنوێنێ کە پەیوەستە بە بنەمای عەقیدەی ئیسلامییەوە. ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەبو طالیب مردنی دوابکەوتایەو پشتگیری و برازاکەی بکردایە تا ئەوکاتەی دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرا لەمەدینەی پیرۆزو رزگاری بوو لەئازاری موشریکەکان، لەوانەبوو وا گومان ببرایە کە ئەبو طالیب لەپشت ئەو بانگەوازییەوەیەو ئەو هانی دەدا بۆ درێژەدان بە بانگەوازی و بە حوکمی پلەی عەشائیری و دەسەلاتی لەناو هۆزەکەیدا دەیپارێزێ، بابە ظاهیری ئیمانی پێ نەهێنابێ و نەچوبێتە ژێر ئالاکەی.

لەوانەبوو کەسانێکی زماندرێژو چەقە چەنا و بیانگوتایە ئەو شانس و بەخت و سەرکەوتن و بالادەستییەی بۆ پێغەمبەر رەخسا لەکاتی بانگەوازییەکەیدا بەهۆی پشتگیری و یارمەتی مامیەوە بوو. لەکاتێك ئەو شانس و بەختە بۆ غەیری پێغەمبەر لە موسوڵمانەکان دەستەبەر نەبوو، هاوەلانی ئەزیەتدەدران، پێغەمبەر پارێزراو بوو، خەڵك ئەشکەنجە دەدراو ئەو دڵ ئارام و بێ ترس.

بێگومان حیکمەتی خودا وای خواست لەوکاتە ناسکەی بانگەوازیی حەزرەتی موحەممەددا: کەزۆری پێویست بە پشتگیری و یارمەتیدان هەبوو ئەبو طالیبی مامی و خاتو خەدیجەی خێزانی کۆچی دوایی بکەن و بەمەش دوو کۆڵەکەی پشتگیری و پاراستنی لەکیس بچن. بۆئەوەی دوو حەقیقەتی گرنگ خۆیان دەربخەن:

**حەقیقەتی یەکەم ئەوەیە:** کە پارێزگاری و چاودێری و سەرکەوتن تەنها بەدەست خودایەو بەس. بێگومان پەروەردگار بۆ خۆی بەر عودەی پارێزگاری کردنی پێغەمبەرەکەی بووەو وادەی داوە کە لەشەڕی موشریك و دوژمنان بیپارێزێ. جا کە بەڕواڵەت کەسانێك هەبن لە ئادەمیزاد پارێزگاری بکەن یان نەبن ئەوە یەکسانەو چ لەمەوزوعەکە

نـــاگۆڕێ. چـــونکە ئـــەو لەلایـــەن خـــوداوە پارێزگـــاری دەکـــرێ و بانگەوازییەکەی بەئاکام دەگا و سەرکەوتن بەدەست دێنێ.

**حەقیقـەتی دووەم:** دەڵێین: مانـای عیـصمەت و پارێزگـاری لەدەسـتی کەسـانی ناحـەزو دوژمـن ئـەوە ناگەیـەنێ: کـە پێغەمبـەر ﷺ هـیچ ئەزیـەت و ئـازارو چەوسـاندنەوەیەکی تـووش نەیـە، بەڵکوو مانـای ئـەو پارێزگاریکردنـەی خودا وادەی داوەو فەموویـەتی: {وَاللَّـهُ يَعْـصِمُكَ مِـنَ النَّاسِ – المائدة/ ٦٧}. پارێزگاریکردنە لـەوەی بکوژرێ، یـان لابردنـی ئـەو کۆسپ و تەگەرانەی کە ببنـە بەربەسـت لەبـەردەم بڵاوبوونـەوەی دەعـوەی ئیـسلامی، بێگومـان حیکمـەتی خـودا واداخـواز بـوو: کـە پێغەمبـەران بەشێکی زۆریـان لـە ناڕەحـەتی و ئـازارو ئەشـکەنجە بەربکـەوێ، کۆسـپ و تەگـەرەیان بێتـە رێ، ئەمـە هـیچ موونافـات و دژایـەتی نییـە لەگـەڵ ئـەو پارێزگاری و عیصمەتەی خودا وادەی داوە بە پێغەمبەرانی.

هەربۆیـە پـەروەردگار کـە فـەرمان بـە پێغەمبـەر دەکـا و دەفـەرموێ: {فَاصْدَعْ بِمَـا تُـؤْمَرُ وَأَعْـرِضْ عَـنِ الْمُـشْرِكِينَ، إِنَّـا كَفَيْنَـاكَ الْمُـسْتَهْزِئِينَ} پێـی دەفـەرموێ: {وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ، وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ – الحجر/ ٩٧ – ٩٨}.

بەشێك لەحیکمەتی گەورەی پەروەردگار کەوا داخواز بووە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لـەپێنا و بانگەوازییەکـەیدا تووشـی ئەزیـەت و ناڕەحەتی ببێ، دەڵێین بەشێك لـەو حیکمەتـە جەلیلـەی خـودا ئەوەیـە کـە موسـوڵمانان بـانگخوازانی ئیـسلام ئەوانـەی بەرپرسـیاریەتی دەعـوەی ئیـسلامییان دەخرێتـە ئەسـتۆ ئـازارو نارەحـەتی ئـەو رێبازەیـان بـەلاوە ئاسـان و ئاسـایی بـێ و بـە ورەیـەکی بـەرزو بـڕوای پتـەوەوە روبـەڕوی کۆسپ و تەگەرەکانی سەر رێیان ببنـەوە. خۆئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ بـەبێ ناڕەحـەتی و کۆسـپ و تەگـەرە لـە بانگـەوازی پەیامەکـەیدا سـەرکەوتنی

بەدەست بهێنایە، هاوەڵانی و موسوڵمانانی دواخۆی تەماعی ئەوەیان دەبوو ئەوانیش بەبێ ئارەق، بێ ئەزیەت و ناڕەحەتی ژیان بەسەربەرن ئەو بەلاو چورتم و کۆسپ و تەگەرانەی دەهاتنە رێیان لەکاتی دەعوەو بانگەوازیدا زۆریان بەلاوە ئەستەم و ناخۆش بوایە.

ئەمما کە حاڵەکە ئێستا بەوجۆرە بووە، بێگومان ئەوەی کاریگەری قورسی عەزاب و میحنەت لەسەر موسوڵمانان و بانگخوازانی رێبازی ئیسلامی سووك دەکا ئەو هەست و شعورەیە: کە ئەوان شوێنکەوتووی پێغەمبەرن و ئەو ناڕەحەتی و ئازارەی لەپێناو ئیسلامدا تووشیان دەبێ تووشی پێغەمبەرەکەشیان بووە، ئەوانیش رێبواری هەمان رێگان کە پێغەمبەری تێدا تووشی ئازارو چورتم بووە. چەندێك گاڵتەیان پێ بکرێ و ناحەزان دژیان بن و سوکایەتییان پێ بکەن، ناتوانن لەهەنگاو نان بەرەو پێشەوەو سووربوون لەسەر هەڵوێستیان بیان وەستێنن و ژێوانیان بکەنەوە و لایان بدەن، بەتایبەتی کە دەبینن پێغەمبەر ﷺ لەو پێناوەدا لەو رێبازە دا بە بەرچاوی خەڵکەوە گڵ و خۆڵی بەسەردا کراوە، بەجۆرێك ناچاربووە بگەڕێتەوە ماڵەوە بۆئەوەی یەکێك لەکچەکانی بەئاو سەری بۆ بشواتەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە زاتی پاکی خۆشەویست و هەڵبژاردەی پەروەردگار بوو.

لەرووداوی کۆچکردنیشی بۆ طائیف و ئەو ئازارو بەردە بارانکردنەی تووشی بوو لەو رۆژە سەختەدا موسوڵمانان والێدەکا هەموو میحنەت و عەزاب و ناڕەحەتیەکیان بەلاوە ئاسان و ئاسایی بێ، بۆئەوەی ببنە چاولێکەری پێغەمبەری خوداو بەشێك لەو ئازارو ئەشکەنجەیەی تووشی ئەو هاتووە ئەمانیش لە رێبازی خودادا بیچێژن! ئەمە شتێکەو شتێکی تر کە پەیوەندی بەم لایەنەی ژیانی پێغەمبەرەوە هەیە، ئەوەیە هەندێ کەس واگومان دەبەن و پێیان وایە: کەهۆی ناونانی پێغەمبەر

ﷺ ئەم ساڵە بە «عام الحزن» لەبەر ئەوەبووە: کە لەوساڵەدا ئەبو طالیبی مامی و خەدیجەی خێزانی لەدەست داون، هەندێ جار ئەو کەسانە لەم بۆچوونەیانەوە ئەوەیان بەڕەوا زانیوە کە نیشانەی حوزن و تازیەباری بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ مردووەکانیان دابنێن!

لەواقیعدا ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیەو تێگەییشتنێکی نەشیاوەو مەزندەکردنێکی خوارو خێچە. پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەو بەو ئەندازەیە بۆ مردنی مامی و لەدەستدانی خێزانی وا دڵتەنگ و خەفەتبار نەبووە. ئەو ساڵەشی بۆیە ناونەنا «عام الحزن» لەبەر پەرۆشی و دڵتەنگی بۆ مردنی خزمی و خێزانی. بەڵکوو هۆی ناونانی ساڵەکەی بەو ناوە ئەوەیە بە مردنی ئەو دووانە زوربەی دەرگای بانگەوازیو دەعوەی لێ داخران و بانگەوازییەکەی تووشی تەنگژەو چورتمی ئەستەم هات. پێغەمبەر ﷺ بەهۆی پشتگیری مامییەوە زۆر دەرگای بۆ کرابوونەوە، ڕێگای زۆری لەبەردەمدا هەبوون بۆ ڕێنمومایی و ئامۆژگاری و فێرکردن و بڵاو کردنەوەی دەعوەی ئیسلامی، ئەو لەم پشتگیریی کردنەی مامیدا هەندێ سەرکەوتنی خۆی دەبینی. بەڵام دوای مردنی ئەو خزمە دڵسۆزەی ئەو دەرگایانەی لێ داخران، ئەو ڕێگایانەی لێ گیران، هەرچەندە هەوڵی دەدا لەمپەرو کۆسپی دەخرانە پێش و دوژمنایەتی دەکرا. بۆ هەر شوێنێک بچوبا دەیبینی ڕێگای لێ گیراوەو دەرگای لێ داخراون، چۆن چوو بوو بەدەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە، کەس گوێی بۆ نەدەگرت و کەس ئیمانی پێ نەدەهێنا، بەڵکوو هەموو ئەوانەی پەیوەندی پێوە دەکردن یان گاڵتەو سوکایەتییان پێ دەکرد یان بە شەڕو ئەزیەتدان ڕوبەڕوی دەبوونەوە، یان بەلاقرتێ و سوکایەتی پێکردن ڕویان لێ وەردەگێڕا، ئیتر بەو حاڵە زۆر دڵ تەنگ و خەفەتبار دەبوو، دەیڕوانی ئەو وەظیفەو ئەرکەی پێی سپێردراوە، ئەو ماندو بوون و هەوڵ و تەقەڵلایەی دەیدا بێ بەرووبووم و

فائیدەو بێ نەتیجەیە، بۆیە ئەو ساڵەی ناونا ساڵی خەمو خەفەت، ساڵی دڵتەنگی.

بەڵکوو نارەحەتی و دڵتەنگی بەهۆی ئەوەی کە کەس ئیمانی پێ ناهێنێ و کەس بەپیر بانگەوازییەکەوە نایە بەتەواوی دڵ و دەروونی داگرت و بەتەواوی خەفەتبارو شپرزە بوو. بۆیە بۆ سوککردنی ئەو هەموو خەمو خەفەتەی ئایاتی تەسەللا هێنەرو دڵخۆشکەرەی بۆسەر نازڵ دەبوون و ئەوەیان دەخستە زەین و دڵیەوە: کە ئەو زیاد لەڕاگەیاندنی پەیامەکەی بەرپرسیاری شتی تر نییە. ئیتر پێویست ناکا بە خەمو خەفەت نەفسی خۆی لەناوبەرێ و بەو ئەندازەیە خۆی دڵتەنگ بکا، بەهۆی ئەوەی کە بەپیر بانگەوازییەکەوە نایەن و ئیمانی پێ ناهێنن. گوێ بگرە بۆ ئەم ئایەتانە: کە دەفەرموێ:

{قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ، وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ وَلَقدْ جَاءكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ، وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاء فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ—الأنعام/ ٣٣ – ٣٥}.

## کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ شاری طائیف

وەکوو گوتمان لەدوای مردنی ئەبو طالیب ئەزیەتدان و دژایەتی قورەیشییەکان پەرەی سەندو گەیشتە تۆپەڵاك، لەهەمان کاتدا گوێیان بۆ ئامۆژگاری و بانگەوازی نەدەگرت و هیچ لایان لێ نەدەکردەوە، پێغەمبەر بیری لەوەکردەوە داڵدەو پەنایەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، کەسانێك بدۆزێتەوە گوێی بۆ بگرن و بەپیر بانگەوازییەکەیەوە بێن. بۆ ئەم

مەبەستە لەشاری مەککە دەرکەوت بەرەو شاری طائیف کەوتەرێ بەهیوای ئەوەی هۆزی ثەقیف پشتگیری بکەن و بەپیر پەیامەکەیەوە بێن و موسوڵمان ببن. کە گەیشتە شاری طائیف، چووە لای کۆمەڵێك لەهۆزی ثەقیف: کە لەو ڕۆژگارەدا ئەم هۆزە پیاو ماقوڵ و قسە ڕۆیشتووی ئەوشارە بوون. لایان دانیشت و بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنان و پەیامی خۆی بۆ ڕوونکردنەوە و هۆی چونەکەی بۆلایان ئاشکرا کرد.

بەڵام ئەوان زۆر بەتوندی پەیامەکەیان ڕەتکردەوە، زۆر بەناشیرین و چاوەڕوان نەکراو بەگژیدا چوونەوە و بەڕوویدا هەڵشاخانەوە. پێغەمبەر لەلایان هەڵسا بڕوا، تەنها داوای ئەوەی لێ کردن کە هەواڵی هاتنی بۆ طائیف بە قورەیشییەکان ڕانەگەیەنن، ئەوەشیان بەگوێ نەکردو ئەم یارمەتیەشیان نەدا. بەوەندەش ڕازی نەبوون، هەتیوو کۆیلە و منداڵ و مەزنیان لێ هاندا، جنێوی پێ بدەن و لێی بکەنە هەڵلا و بەقاوو قیژو هەراو هۆریا دوای کەوتن و بەردەبارانیان کرد. تەنانەت قاچی موبارەکی خوێناوی لێ دەتکا، زەیدی کوڕی حاریثە خۆی دەخستە بەر ئەوبەردو دارەی تێیان دەگرت. لەهەموو لایەکەوە بەردیان تێدەگرت، تەنانەت زەیدیش سەری بەچەند جێ شکابوو«١». بەوحاڵە شپرزەیە پێغەمبەر هات تاگەیشتە باخێك کەهی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بوو، ئیتر عوتبە هەتیوو خوێڕی هۆزی ثەقیفی لێ تەکاندنەوە و نەیهێشت چیدی بەردی تێبگرن و سوکایەتی پێ بکەن. پێغەمبەر ﷺ لایدایە بن سێبەری درەختێکی مێو ماندوو شەکەت و بریندار، پاڵی دایەوە، کوڕەکانی ڕەبیعە تەماشایان دەکرد. جا کە پێغەمبەر ﷺ لەبن سێبەری مێوەکە کەمێك حەسایەوە، سەری بۆلای ئاسمان بەرزکردەوە و دوو دەستی هەڵبڕین و ئەم دوعایەی خوێند:

---

١ - طبقات ابن سعد ١٩٦/١.

{أللهم اليك أشكو ضعف قوتي وقلة حيلتي وهواني على الناس ياأرحم الراحمين! أنت رب المستضعفين، وأنت ربي الى من تكلمني! الى بعيد يتجهمني! ام الى عدو ملكته أمري! ان لم يكن بي غضب علي فلا أبالي غير أن عافيتك هي أوسع لي، أعوذ بنور وجهك الذي أشرقت له الظلمات وصلح عَلَيْهِ السَّلاَمْ أمر الدنيا والآخرة، من أن تنزل بي غضبك، أو يحل عليّ سخطك، لك العتبى حتى ترضى ولا حول ولا قوة الا بالله}.

خودایە! من زەعیفی و بێ دەرەتانی و بێ فێڵی و بێ نرخیم لای خەڵك بۆ تۆ دەدرکێنم، ئەی ئەو کەسەی لەهەموو کەس بەبەزەیی تری، ئەتۆ خودای بێ هێزانی، ئەتۆ خودای منی و تاك و تەنها و بێ هاوەڵی، بەکێم دەسپێری! بەبێگانەیەك کە بەرووی گرژو مۆنەوە سەیرم بکا؟ یان دەمسپێری بە دوژمنێك و کاروبارم دەخەیە ژێر دەستییەوە! سەرباری ئەمانەش هەموو ئەگەر تۆم لێ رازی بی هەموو شتێك دەخەمە لاوە، تۆم لێ نەرەنجێی باکم نییە، ئەوەندە هەیە خۆشنودی تۆ بۆ من لەهەموو شتێك فراوانترە، پەنا دەگرم بەروناکی رووت کەهەموو تاریکیەك لادەبا، بەختەوەری دونیا و قیامەت لەسەر رەزامەندی تۆ بەندەو پەیوەستە بەروناکی روت. پەنا دەگرم لەوەی کە قارو قینی خۆتم بەسەردا برێژی، یان لێم زویر ببی و ناڕازی بی لێم. هەموو کەس شایانی سەر زەنشتکردنە تاتۆی لێ رازی دەبی هیچ پەنا و هێزێك نییە جگە لەپەنا و پشتگیری تۆ!!.

پاشان دوو کوڕەکانی رەبیعە «خاوەنی باخەکە» ویژدانیان جوڵا و بانگی نۆکەرێکی خۆیان کرد ناوی عەداس و مەسیحی بوو بەئەودا چەند هێشووە ترێیەکیان بۆ نارد. کە عەداس ترێیەکەی لەبەردەم پێغەمبەردا دانا وتی: فەرموو: بخۆ، پێغەمبەر ﷺ دەستی بۆ ترێیەکە بردو وتی: «بسم الله» ئەمجار دەستی کرد بەخواردنی، عەداس بەسەر سوڕمانەوە

وتی: واللە دانیشتوانی ئەم شارو دەڤەرە قسەی ئاوایان بەسەر دەمدا نایە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ خەڵکی چ ولاتێکی؟ لەسەر چ ئاینێکی؟ عەداس وتی: من مەسیحیم‌و خەڵکی ولاتی نەینەوام «گوندێکە لەنزیك موصڵ». پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکی گوندی پیاوە صاڵح‌و چاکەکەی «یونس»ی کوڕی مەتی. عەداس وتی: جەنابت چۆن یونسی کوڕی مەتی دەناسی؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە برامە، پێغەمبەرێك بووە منیش وەکوو ئەو پێغەمبەرم. ئیتر عەداس خۆی بەسەر پێغەمبەردا داو دەست‌و قاچی ماچ کرد»[١].

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەطائیفەوە گەڕایەوە بۆ مەککە، لەڕێگا کە گەیشتە «نخلة» لەنیوە شەودا نوێژی کرد، بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند، کۆمەڵێك جندۆکە بەلایدا تێپەڕین‌و گوێیان لێ گرت، کە لەنوێژەکەی بووەوە جندۆکەکان گەڕانەوە بۆلای قەوم‌و نەتەوەی خۆیان، بۆ خۆیان ئیمانیان پێ هێنابوو، ئیتر دەستیان کرد بە ئامۆژگاری کردنی قەومی خۆیان. پەروەردگار هەواڵی گوێگرتنی جندۆکە لە قورئان‌و ئیمانهێنانیان پێی بۆ پێغەمبەر دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

{وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ، يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ – الأحقاف/ ٢٩}.

هەروا ئایەتی: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا – الجن/١}.

---

١ - بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: سیرەی ئیبنو هیشام ج١/٤٢٠.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ویستی بێتەوە ناو شاری مەککەو زەیدی کوڕی حاریثەی لەخزمەتدا بوو. زەید عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەوێری بچیەوە ناو قوڕەیش لەکاتێکدا ئەوان دەریان کردوی؟ فەرمووی: ئەی زەید! خودا دەروی لێ کردوینەوەو یارمەتی پێغەمبەری خۆی دەداو ئایینی خۆی سەردەخاو بڵاوی دەکاتەوە. ئەمجار پیاوێکی خوزاعەی نارد بۆلای «مطعم»ی کوڕی عەدی‌و هەواڵی دایە: کە پێغەمبەر ﷺ بەنیازە لەسەر جیوارو داڵدەدانی ئەو داخڵی مەککە ببێ ئاخۆ رازییەو وادەی ئەوەی دەداتێ؟ کە موطعیم پێشنیارەکەی پێغەمبەری پێگەیی رازی بوو وتی بەڵێ: داڵدەی دەدەم. ئیتر پێغەمبەر گەڕایەوە ناو مەککە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەم کۆچەی پێغەمبەر ﷺ بۆ طائیف‌و ئەو عەزاب‌و چورتمەی تووشی بوو لەلایەن هەتیوو خوێری‌و کۆیلەو منداڵ‌و مەزنی هۆزی ثەقیفەوە، ئەمجار لەشێوەی گەڕانەوەیدا بۆ مەککە، دەتوانین چەند خاڵێك بخەینەڕو.

١- ئەو ئازارو ناڕەحەتیەی تووشی پێغەمبەر ﷺ هات بەتایبەتی ئەوەی لە طائیف تووشی هات دەچێتە چوارچێوەی کاری راگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی بەخەڵك، هەر دەڵێی هاتووە عەقیدەی صەحیح‌و راستمان پێ رادەگەیەنێ دەربارەی بونەوەرو بەدیهێنەری، موسوڵمانان فێری ئەحکامی عیبادات‌و رەوشت‌و معامەلات دەکا. هەروا ئەوەیان فێردەکا چۆن خۆڕاگرو پشوو درێژ دەبن لەئاست ئەو ئەرکانەی خودا دەیخاتە ئەستۆیان. پێیان رادەگەیەنێ چۆن پراوەی صەبرو روبەڕو بوونەوەی کۆسپ‌و تەگەرەکان دەکەن، چۆن ناوەڕۆکی ئایەتی: {یَا أَیُّهَا

الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - آل عمران/ ٢٠٠} لەخۆیاندا جێبەجێ دەکەن.

بێگومان ئێمە زانیمان پێغەمبەر ﷺ چۆن بەشێوەی پراوەو تەطبیق کردن عیباداتی فێری هاوەڵانی کردووە، ئەوەتا لەپێش چاوی هاوەڵانی نوێژی دەکرد دوایی دەیفەرموو: {صلوا كما رأيتموني أصلي} من چۆن نوێژدەکەم ئێوەش ئاوا نوێژەکانتان ئەنجام بدەن. یان دەفەرموێ: {خذوا عني مناسككم} من چۆن کارەکانی حەج و عومرە بەجێ دێنم ئێوەش ئاوا لەمنی وەربگرن و بەو شێوە ئەنجامی بدەن. لەسەر ئەم بنەمایە خۆی، پێغەمبەر ﷺ لەڕێبازی دەعوەو بانگەوازیدا ناخۆشترین ناڕەحەتی و عەزاب و تاڵی و سوێری چەشتووە. تا بەزمانی حاڵ بە بانگخوازانی رێبازی ئیسلامی بڵێ لەهەموو چەرخ و رۆژگارێك، پێیان بفەرموێ: لەپێناو دەعوەو بانگەوازی حەقدا چاو لەمن بکەن و خۆڕاگرو پشو درێژبن. هەروەها بۆئەوەی بۆیان روون بکاتەوە کە صەبرو پشوو درێژی و روبەڕو بوونەوەی چورتم و ئەزیەت و ناخۆشی گرنگترین بنەمای پەیامی ئیسلامە کە ئەو تەشریفی پێی نێردراوە بۆلای سەرجەم ئادەمیزاد.

وێدەچێ کەسانێك هەبن کەئەم روداوە دەخوێننەوە ئاگاداری ظاهیری ئەم کۆچکردنەی پێغەمبەر دەبن بۆ طائیف واگومان بەرن کە پێغەمبەر بەو ئەزیەتدان و بەردە باران کردنە بەتەواوی تێك شکا و خەم و ناڕەحەتی کاریان لەناخی کردو ئەوەندە هەڵوێستەکەیانی بەلاوە ناخۆش بوو تێك روخا و خەریك بوو صەبرو ئارامی لەدەست بدا! بۆیە دوای ئەوەی لەناو باخەکەی کوڕەکانی رەبیعەدا پشویداو منداڵە وردکەو هەتیوو کۆیلەکانیان لێ تەکاندنەوە ئەو دوعا و پاڕانەوە بەسۆزەی کردو ئاوا بێدەسەڵاتی خۆی راگەیاند. نەخەیر باگومانی

وانەبڕێ، چونکە لە حەقیقەت و واقیعدا پێغەمبەر ﷺ بە ئەوپەڕی ڕازیبوون بە قەزاو قەدەری خودا ڕوبەڕوی ئەو ناخۆشیانە بووە، ئەو ئازارو چورتم و سوکایەتی پێکردنەی بەدڵێکی پڕ لەصەبرو ئارامەوە چەشت و لەناخەوە بەهیوای پاداش و ڕەحمەتی خودابوو، ئەگینا دەیتوانی ئەوکاتە تۆڵەی گورچکبڕو فەوتێنەر لەهەموو ئەو منداڵ و هەتیوو کۆیلەو بێ عەقڵانە بکاتەوە کە بەبەردە بارانکردن ڕاویان ناو ئەوانەیش کەقسە ڕۆیشتوو پیاو ماقوڵی شاربوون و ئاوا بەوشێوە پەیامەکەیان ڕەتکردەوەو ئەوانەشیان هاندا بۆ سوکایەتی پێکردنی!!.

بەڵگەی ئەم حەقیقەتە ئەو فەرموودەیەیە کە بوخاری و موسلیم لەخاتوو عائیشەوە ریوایەتی دەکەن، دەفەرموێ: عەرزمکرد وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەژیانتدا ڕۆژی ناخۆشترت لەڕۆژی غەزای ئوحود دیوە؟

فەرمووی: بێگومان من لەم قەومەی تۆ زۆر شتی ناخۆشم تووش هاتووە، ناخۆشترین و کاریگەرترین ڕەتدانەوەو بەدرۆ خستنەوەی پەیامەکەم لەڕۆژی «العقبە»دا ڕەنگی دایەوە. ئەوەبوو بانگەوازی خۆم ئاڕاستەی کوڕی «عبدیالیل»ی کوڕی «عبدکلال» کرد هیچ کاری تێ نەکردو بەپیرمەوە نەهات و پەیامەکەمی ڕەتکردەوە. لەوێ ڕۆیشتم و خەم و خەفەت دایگرتبوم، تا نەگەیشتمە «قرن الثعالب» بەهۆش خۆم نەهاتمەوە. لەوێ کەسەرم هەڵبڕی هەورێك سێبەری لێ کردبووم سەیرم کرد حەزرەتی جوبرائیلی تێدایە، بانگی کردم وتی: پەروەردگار گوێی لەگوتەی گەلەکەت بوو کەپێیان گوتی و ئاگای لێ بوو چۆن بەرەو ڕووت بوونەوە. ئەوەتا پەروەردگار فریشتەی تایبەت بەکێوەکانی ناردووە بۆلات بۆئەوەی چی پێ بسپێری بۆت ئەنجام بدا! پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەمجار فریشتەی تایبەت بەکێوەکان بانگی کردم و سڵاوی لێ

کردم پاشان وتی: ئەی موحەمەد خودا قسەو ڕەتدانەوەی قەومەکەتی بیست، ئەمن فریشتەی تایبەت بەکێوەکانم، خودا منی ناردووە چیت بوێ بۆت جێبەجێ بکەم، ئەگەر دەتەوێ ئەو دوو کێوەینان بەسەردا دەهێنمەوە یەك و هەموانیان لەناودەبەم جیقیان دەردێنم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر من ئەوەم ناوێ، بەڵکوو ئومێد دەکەم خودا لەپشتی ئەمانە نەوەیەك بخاتەوە یەکتاپەرست بن و هیچ کەسێك و هیچ شتێك بەهاوەڵی خودا نەزانن.

کەوابوو پێغەمبەری خودا بەم هەڵوێستە بێ وێنەیەی بەم دڵسۆزییەی بۆ گەل و نەتەوەو مرۆڤایەتی کە لەڕەوشتی بەرزییەوە هەڵقوڵاوە ڕەوشتەکە ئەوەندە بەرزە دەرك بەسنوری ناکرێ. ویستویەتی هاوەڵانی و ئوممەتەکەی دوای خۆی فێری صەبرو ئارامگرتن بکا، بەڵکوو فێری فەننی صەبریان بکا لەسەر هەموو ناخۆشی و چورتمێك کە لەپێناو ئایینی خوادا تووشیان دێ!!

وێدەچێ یەکێك بڵێ دەی باشە کەوایە بۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەو دوعا بەکوڵەی کردو ئەم نزاو پاڕانەوەی بەرزکردەوە؟ بۆچی ئەم دوعایەی کرد کە وشەکانی و شێوازەکەی مانای ماندوو بوون و شەکەتیەکی زۆری لێ فەهم دەکرێ. تێکڕای ئەوە دەگەیەنێ کە زۆری هەوڵداوەو زۆر ماندو بووە بەڵام نەتیجەو ئاکامی جگە لەماندوو بوون و ئەزیەت و عەزاب هیچی تر نەبووە.

وەڵاممان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە دەڵێین: نزاو پاڕانەوە لەخودا عیبادەتە. لالانەوەو کڕوزانەوە لەبەر قاپی خودا تاعەت و خۆنزیك خستنەوەیە لە پەروەردگار. بەڵاو کارەسات و ناخۆشی حیکمەت و سڕڕی خۆیان هەیە، هەرە گرنگیان ئەوەیە خاوەنی بەڵاو ناخۆشییەکە بەرەو قاپی خودا دەبەن و عەباو پۆشاکی بەندایەتی لەبەردەکەن.

کەوابوو چ دژایەتییەك نیە لەنێوان صەبرو خۆڕاگری لەسەر بەڵاو ناخۆشی لەگەڵ شکواو پاڕانەوەو لالانەوە بۆلای خودا، هەردوکیان تاعەتو خودا پەرستین.

بەڵکوو واقیع ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ لەژیانی پڕ بەرەکەتیدا هەردوو حاڵەتەکەی فێرکردوین، بەو صەبرو خۆڕاگرییە بێ وێنەی لەسەر بەلا و کارەسات ئەوەی فێرکردوین: کە ئەمە ئەرکی موسوڵمانانە بەگشتیو بانگخوازانی ئیسلام بەتایبەتی. بەو دوعاو پاڕانەوەو لالانەوەیەو پەنا بردنەی بۆبەر قاپی خودا ئەرکی بەندایەتیو داخوازییەکانی ملکەچی بۆ پەروەردگارمان فێردەکا.

سەرباری ئەوە نەفسی ئادەمیزاد چەندێك بەرزبێتەوە لەسنووری ئادەمیزادییەتی خۆی دەرناچێ ئادەمیزاد ئادەمیزادە. ئادەمیزاد بەسروشت وا خولقاوە هەستو شعوری هەیە، هەست بەخۆشی نازو نیعمەت دەکاو هەست بەئازاری عەزاب دەکا. بەسروشت حەزی لەیەکەمەو لەدووەم دەترسێ.

ئەمەش مانای ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ تەنانەت لەوکاتەدا: کەنەفسی خۆی ئامادە دەکا بۆ روبەڕو بوونەوەی هەموو ئەزیەتو سزاو ناخۆشییەك لەپێناو ئایینی خودادا «بەشەرەو ئازارو ئەشکەنجەی پێ ناخۆشەو بەنازو نیعمەت دڵشادو کەیف خۆشە».

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ژیانی نارەحەتی هەڵبژاردووە بەسەر لەزەتو خۆشیدا بە مەبەستی بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا، هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە هەڵوێستە یاساو مەناطی وەدەستهێنانی پاداشو دەرکەوتنی مانای بەرپرسیاریەتی ئادەمیزادە.

٢- ئەگەر تۆ بەوردی سەرنجی رووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر بدەی: کەچۆن لەگەڵ قەومەکەی هەڵی کردووەو چۆن لەناویاندا ژیاوە، دەبینی

ئەو ئەزیەتو چەرمەسەریو ناخۆشیانەی لەگەلەکەیەوە تووشی هاتووە، لەهەندێ مەشاهیدو روداودا ئەزیەتدانەکەی زۆر توندو تیژو گورچکبڕ بووە، وەلێ لەهەمان کاتدا بەرامبەر هەر مەشهەدو روداوێك کە ئێشی بە پێغەمبەر گەیاندووە، ئەتۆ رەددێکی خودایی ئاشکرا دەبینی: کە ئاڕاستەی ئەوبێ عەقڵو کاڵفامانەی دەکا لەسەر دژایەتیو هەڵوێستی سەلبییان بەرامبەر پەیامی پێغەمبەر بۆتە سەللاو سوکنایی دڵی. لەو ئازارو ئەشکەنجەیەی تووشی بووە. ئەتۆ مەظهەری ئەو حەقیقەتە لە هەڵسو کەوتی ئەو پیاوە نەصرانییە کەناوی «عداس»بوو بەئاشکرا دەبینی، کاتێك بەدەورییەك ترێوە هاتە خزمەت پێغەمبەرو دوایی بەسەر دەستو قاچیدا کەوتو کەوتە دەست ماچکردنی بەتایبەتی کە حەزرەتی موحەممەد پێی گوت من پێغەمبەرم. وابزانم گونجاوەو جێی خۆیەتی: کەبۆ وێناکردنی مەشهەدی ئەم عوزر هێنانەوەو تەسەللادانەوە کە لەهەڵوێستی «عداس» دەردەکەوێ بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ لەئاکامی ئەزیەتدانو بەردە بارانکردنی هەتیومچەو منداڵو کۆیلەی طائیف کە ئەنجامیاندا بەرامبەر پێغەمبەر. وابزانم گونجاوە کە بڕگەیەك لەوتە بەنرخەکەی مامۆستای خوا لێخۆشبوو مصطفى صادق الرافعي ڕاگوێزی ئێرە بکەم، خوالێخۆشبوو دوای گێڕانەوەی روداوەکە دەفەرموێ:

ئای رەمزەکانی قەدەر لەم روداوەدا چەند سەر سوڕهێنەرن. خێرو کەرامەتو ڕێزلێنان بەپەلە رویان لە پێغەمبەر کرد عوزریان بۆ هێنایەوە لەو بێ ئەدەبیو خراپەکارییەی بەرامبەری کرا، دوای دژایەتیو بەردەبارانکردن، دەستو قاچ ماچکردن هاتەدی!

دوو کوڕەکەی رەبیعە «عوتبەو شەیبە» لەهەرە دوژمنی سەر سەختی ئیسلام بوونو لەو کەسانەبوون کەچوون بۆلای ئەبو طالیب

«مامی پێغەمبەر» لەپیاو ماقوڵانی قورەیش بوون و داوایان لەئەبو طالیب کرد کەیان وابکا پێغەمبەر واز لەخوداکانیان بێنێ و بەخراپە باسیان نەکا، یان پشتگیری لێ نەکاو بۆ خۆیان چاری بکەن، یان ئیعلانی شەڕدەکەن لەگەل پێغەمبەرو ئەبو طالیب و هەموو ئەوانەی پشتگیری لێ دەکەن تا لایەکیان لایەکیان لەناو دەبا. دەی ئەم غەریزە وەحشییەی ئەوان هەڵەوگێڕبوو بۆ ئەو مانا ئینسانییەی کە ئایینی ئیسلام هێناویەتی، چونکە داهاتوی ئایینی بۆ فیکرو هۆشە نەك بۆ غەریزە.

ئایینی نەصرانی هات دەستەملانی ئایینی ئیسلام بوو پشتگیری لێکرد. چونکە ئایینی راست لەگەڵ ئایینی راست وەکوو برا وایە بۆبرا. وەلێ نەسەبی برایەتی خوێنە، نەسەبی ئایین عەقڵە.

پاشان قەدەر لەم چیرۆکە رەمزی خۆی تەواوکرد بەڕنینی چەند هێشووە ترێیەکی شیرین و تام خۆش و بەلەزەت.

بەناوی خودا هێشووە ترێیەکان لێ کرابوونەوەو پێشکەش بە پێغەمبەر کران وەکوو رەمزێکی کۆمەڵگای ئیسلامی گەورەو پیرۆز کەپڕە لەبۆڵە ترێ و هەموو بۆڵێکی مەملەکەتێك«١».

٣- لەهەڵس و کەوتی زەیدی کوڕی حاریثە کە بەجەستەو گیانی خۆی پێغەمبەری دەپاراست، خۆی دەخستە بەرئەو بەردانەی کە خوێڕییەکانی طائیف لە پێغەمبەریان دەگرت، تەنانەت بەچەند جێ سەری شکا، نموونەو وێنەیەکە کە پێویستە حاڵی موسوڵمانی لەسەربێ و لە هەڵس و کەوتی موسوڵماندا بەنیسبەت پێشەوای دەعوەو بانگخوازان رەنگ بداتەوە، پارێزگاری لەبەرپرس و داعی ئیسلامی بکا بە

---

١ - وحي القلم/٢/٣٠.

ماڵو بەگیان، دیفاعی لێ بکا بەهەموو نرخێك تەنانەت ئەگەر بە خۆبەخت کردنیش بێ.

بەڵێ هەڵسو کەوتی هاوەڵان بەنیسبەت پێغەمبەرەوە بەو جۆرە فیداکارییە بوو. جا ئەگەر ئەمڕۆ پێغەمبەر ﷺ بەگیان زیندو نییە لەناو ئێمەداو تەصەوری داکۆکیکردن لەو بەو شێوەی هاوەڵان لێیان دەکرد ناکرێ. ئەوە بێگومان ئەو داکۆکیکردنە دەتواندرێ بەشێوەیەکی تر ئەنجام بدرێ، ئەویش ئەوەیە کە لەڕێگای دەعوەو بانگەوازی ئیسلامیدا ئەزیەتو عەزابمان بەلاوە ئاسایی بێو چاو لە پێغەمبەری خودا بکەین. بۆ پشوو درێژیو خۆڕاگری لەبەرامبەر ئەرکو ناڕەحەتی چورتمی ڕێبازی دەعوەی ئیسلامی.

وێڕای ئەوەش پێویستە هەمیشە چەند بەرپرسی دەعوەی ئیسلامی هەبن جێ نشینو شوێنکەوتەی پێغەمبەر بن لەبواری دەعوەی ئیسلامیدا، لەسەر موسوڵمانانیش پێویستە سەربازی دڵسۆزو بوێربن بەدەوری ئەو بەرپرسە بانگخوازانە بەگیانو بەماڵ داکۆکییان لێ بکەن وەکوو لەوەپێش موسوڵمانان بەگیانو بەماڵ پێغەمبەریان دەپاراست.

٤- لەو ریوایەتەی ئیبنو ئیسحاق گێڕاویەتیەوە دەربارەی گوێگرتنی چەند نەفەرێکی جندۆکە لە قورئان خوێندنی پێغەمبەرو لەشەو نوێژدا لەکاتی گەڕانەوەی بۆ مەککە لەشوێنێك کەپێی دەگوترێ «نخلة» بەڵگەیە لەسەرئەوە کە جندۆکە هەنو موکەللەفیشن بە ئیمانهێنانو خودا پەرستی وەکوو ئادەمیزاد. هەروا بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە هەندێ لە جندۆکە ئیمانیان هێناوەو هەندێکیان کافرنو ئیمانیان نەهێناوە. ئەم بەڵگەیە گەیشتۆتە پلەی قەطعیو ثبوت، چونکە قورئان بەصەراحەتو بێ پێچو پەنا ئامارە بەو روداوە دەکاو بۆمانی دەگێڕێتەوە وەکوو ئەو ئایەتانەی لەسەرەتای سورەتی «ألجن»دا

ئاماژەمان پێ کردن هەروا وەکوو ئەو ئایەتانەی لە سوورەتی «الأحقاف»دا باسی ئەو روداوە دەکەن و دەفەرموێ:

{وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ، يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ – الأحقاف/ ٢٩ – ٣١}.

ئەتۆ ئەوە بزانە ئەم روداوە ئیبنو ئیسحاق ریوایەتی کردووە ئیبنو هیشام لەوەوە گێڕاویەتیەوە، ئیمامی بوخاری و موسلیم و تورموذی بەشێوەی جیا و هەندێ درێژتر ریوایەتیان کردووە.

ریوایەتی بوخاری کە بەسەنەدی خۆی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردووە بەم جۆرەیە «وا رێکەوت پێغەمبەری خودا لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی رویان لەبازاڕی عوکاظ کرد، ئەوکاتە لەمپەڕ خرابوونە نێوان شەیاتینی و هەواڵی ئاسمان، هەر شەیاتینییەك بیویستایە گوێ لە هەواڵی ئاسمان بگرێ تیر ئەستێرەیەکی ئاڕاستە دەکرا. ئیتر شەیاتینی لەبیستنی هەواڵی ئاسمان بێبەش بوون، هەموویان گەڕانەوەو وتیان: دەبێ هۆی چی بێ ئاوا لەمپەڕ دانراوە لەنێوان ئێمەو هەواڵی ئاسمانی و هەر یەکێکمان بیەوێ بچێ گوێ لەهەواڵێك بگرێ ئاوا بەتیر ئەستێرە دەرەتێندرێ؟ وتیان دەبێ روداوێك رویدابێ بۆیە وا بیستنی هەواڵی ئاسمانمان لێ قەدەغە کراوە. هەڵسن بڕۆن بە خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەویدا بگەڕێن بزانن ئەو روداوە چییە کەبۆتە هۆی قەدەغەکردنی ئێمە لە بیستنی هەواڵی ئاسمانی؟.

ئەو دەستەیەی رویان لەوڵاتی «توهامە» کرد هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە «نەخلة». لەوکاتەدا تەشریفی دەیەویست بچێ بۆ بازاڕی عوکاظ. کاتەکە کاتی نوێژی بەیانی بوو، جەنابی پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکردو نوێژی بەیانیان بەجێ دێنا، جا کە جندۆکەکان

گوێیان لەخوێندنی قورئان بوو، گوێی خۆیان هەڵخستو گوێیان لێ گرت، وتیان ئەمەیە بۆتە هۆی ئەوەی کە هەواڵی ئاسمان لەئێمە قەدەغە کراوە. ئەمجار گەڕانەوە بۆلای قەومەکەیانو وتیان: «ئەی قەومەکەمان ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرنج ڕاکێش بوو، ڕێ نیشاندەرە بۆ بەختەوەری هەردوو جیهانو ئیمانمان پێ هێناو ئیتر کەس ناکەین بە هاوەڵو هاوشانی خودای خۆمان، ئیتر پەروەردگار نیگای نازڵکردە سەر پێغەمبەری خۆیو فەرمووی: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ}. ئەوەی نیگای بۆکرا بریتی بوو لەقسەی جندۆکەکان کە لەناو خۆیاندا کردیان»[١].

ئەو لەفظەی موسلیمو تورموذی ریوایەتیان کردووە وەکوو لەفظی بوخاری وایە، تەنها ئەوەنەبێ لە سەرەتای حەدیثەکەدا ئەم چەند رستەیان لێ زیادکردووە کە دەڵێ: {مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ «صلى الله عليه وسلم» عَلَى الْجِنِّ وَلاَ رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ «صلى الله عليه وسلم» فِي طَائِفَةٍ ... الحديث}.

خاوەنی فەتحولباری دەڵێ: وادیارە بوخاری بە ئەنقەست ئەم لەفظەی قرتاندووە. چونکە ئیبنو مەسعود ئەوەی چەسپاندووە کە پێغەمبەر ﷺ قورئانی بەسەر جندۆکەکاندا خوێندووە، ئەم چەسپاندنەی ئیبنو مەسعود پێش نەفی کردنەکەی ئیبنو عەبباس دەخرێ. ئیمامی موسلیم ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە، چونکە دوای حەدیثی ئیبنو عەبباس حەدیثی ئیبنو مەسعودی هێناوە کە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە، دەفەرموێ: {أتاني داعي الجن فانطلقت معه فقرأت عَلَيْهِ القرآن}. دەتوانین بڵێین ڕوداوەکە چەند جارێك دوبارە بۆتەوەو هەر ریوایەتەی بۆ جارێکیانە. ئەمجار ئەوەی بوخاریو

---

١ - البخاري/٦/٧٣.

موسلیم‌و تیرمیذی ریوایەتیان کردووە جوداوازە لەوەی ئیبنو ئیسحاق ریوایەتی کردووە. جودا وازییەکەیان لەدوو خاڵدایە:

١- ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق ئاماژەی ئەوەی تێدانیە کە پێغەمبەر پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی کردبێ، بەڵکوو ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەتەنها نوێژی کردووە. لەکاتێکدا ریوایەتەکانی تر ئەوە دەگەیەنن کە نوێژی بەکۆمەڵێك لە هاوەڵانی کردووە.

٢- ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق نوێژ کردنەکەی تایبەت نەکردووە بەنوێژی بەیانی. بەڵام ریوایەتەکانی تر دەستنیشانی نوێژی بەیانی دەکەن.

ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق هیچ ئیشکالێکی تێدانیە. بەڵام ریوایەتەکانی تر دوو ئیشکالیان لێ دەکەوێتەوە:

١- پێغەمبەر ﷺ لەرۆیشتنیدا بۆ طائیف‌و گەڕانەوەی لەوێوە جگە لەزەیدی حاریثە کەسی تری لەهاوەڵان لەگەڵدا نەبووە وەکوو لەوەپێش زانیمان. دەی کەوابێ چۆن مانای ئەوە بزانین: کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی کرد.

٢- نوێژی پێنج فەرزە تاشەوی میعراج فەرزنەکراون، روداوی میعراجیش دوای چون‌و گەڕانەوەی لە طائیف رویداوە، پێش میعراج نوێژ واجب نەبووە، وەکوو زۆر لێکۆڵەرەوەو باحثێن چەسپاندویانە. دەی چۆن مانای ئەوە دەگونجێ کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد؟

وەڵامی ئیشکالی یەکەم ئەوەیە دەڵێین: دەگونجێ پێغەمبەر ﷺ کاتێ گەیشتۆتە «نەخلة» تووشی هەندێ لە هاوەڵانی بووبێ، بەتایبەتی «نەخلة» شوێنێکە نزیك شاری مەککەیە لەوێ نوێژی بەیانی بەجەماعەت بۆ هاوەڵانی کردووە.

وەڵامی ئیشکالی دووەم ئەوەیە دەڵێین: روداوی گوێگرتنی جندۆکە لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر زیاد لەجارێك رویدابێ. ئەو روداوە جارێك لەئیبنو عەبباس ریوایەت کراوە، بەشێوەیەکی تریش لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتکراوە، هەردوو ریوایەتەکەشی راستو صەحیحن. ئەمە رای جەماوەری توێژەرەوەو لێکۆڵەرەوانی فەرموودەن. ئەمە کاتێك دەبێتە ئیشکال کە بڵێین: روداوی ئیسراو میعراج پاش کۆچکردنی پێغەمبەر بووە بۆ طائیف. ئەمما ئەگەر روداوی ئیسراو میعراج پێش چوونی بۆ طائیف بووبێ ئەوە ئیشکالی تێدانییە.

ئەوەی کە بەلامانەوە گرنگە دوای ئەو رونکردنەوانە ئەوەیە کە پێویستە موسوڵمان بڕوای بەهەبوونی جندۆکە هەبێ، بڕوای وابێ ئەو رەگەزە زیندون عاقڵو بەهۆشن پەروەردگار ئەرکی عیبادەتی خستۆتە سەر شانیان. ئەوانیش وەکوو ئادەمیزاد موکەلەفنو هەیانە ئیماندارەو هەیانە بێ ئیمان. جا ئەگەر هەستو شعوری ئێمە دەرکیان ناکا ئەوە لەبەر ئەوەیە پەروەردگار بوونی ئەوانی بەوجۆرە نەخولقاندووە هێزی بینینی ئێمە بتوانێ دەرکیان بکا. ئاشکراشە چاوی ئێمە چەند جۆرێکی موجودات دەبینێو بە ئەندازەیەکی دیاریکراو بەمەرجی تایبەتی دەرکیان دەکا هەرشتێك ئەو مەرجو ئەندازەیەی تێدا نەبوو نایبینێ.

جا لەکاتێکدا هەبوونی ئەم مەخلوقاتە پشت بەستووە بە هەواڵی یەقینیو موتەواتەرو لە قورئانو حەدیثدا چەسپاوەو بوونیان لەئایین زانراوێکی زەرورییەو کۆڕای موسوڵمانان لەسەر ئەوەیە ئینکاریکردنی جندۆکە یان پەیداکردنی گومان لەبوونیاندا بەهەڵگەڕانەوە لەئایین حیساب دەکرێو دەرچوونە لەئایین. چونکە ئینکاریکردنی بوونیان ئینکاریکردنی شتێکە لە ئاییندا چەسپاوەو بێ خیلافە، سەرباری ئەوەش ئینکاری کردنی هەبوونیان بەدرۆخستنەوەی

هەواڵی راستو موتەواتەرە کە لەخوداو پێغەمبەرەوە بەئێمە گەیشتووە ئینکاری کردنی هەواڵی لەوجۆرە کوفرو لە ئیسلام دەرچوونە.

نابێ مرۆڤی عاقڵ بکەوێتە زلکاوی غەفڵەتو نەزانییەوە بەجۆرێك خۆئەوەندە گێل بکا بڵێ من بڕوام بەهیچ نییە لەگەڵ زانستدا یەك نەگرێتەوە، ئیتر لەمەوە دەست بکا بە «تبجّحُ» قسەی گێلو کەزابانە فڕێ بداو بڵێ: کەمن بڕوام بە هەبوونی جندۆکە نییە، لەم روەوە کە جندۆکە نابیندرێو هەستیان پێ ناکەین هەرچی ئاوابێ نییە.

بێگومان ئاشکرایە ئەم نەزانینە: کە بەزانینی لەقەلەم دەدەن یان ئەم جەهلە کەناوی زانستیان لێ ناوە ئەگەر پەیڕەو بکرێ سەردەکێشێ بۆ ئینکاری کردنی زۆر لەمەوجوداتی یەقینی تەنها لەبەر هۆیەك کە گوایە نابیندرێن. قاعیدەی زانستی مەشهورو سەلمێندراویش دەڵێ: دەست نەکەوتنی شتێك نابێتە نیشانەی نەبوونی، واتە: ئەگەر تۆ لەشتێك گەڕای دەستت نەکەوتو نەتبینی ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەو شتە خۆی لەخۆیدا نەبێ.

**پێنجەم**: دەبێ ئەو روداوانەی پێغەمبەر ﷺ لەگەشتی چوون بۆ طائیفدا بینینی لەسەر دڵو دەروونی پیرۆزی چ کاریگەرییەکیان هەبێ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە جەوابی زەیدی کوڕی حاریثەی دایەوە بەئاشکرا دەردەکەوێ. ئەوەبوو زەید بەسەرسوڕمانەوە پرسیاری ئاراستەی پێغەمبەر کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ چۆن دەوێری بچیەوە مەککە، لەکاتێکا ئەوان دەریان کردیو دوژمنی سەرسەختی تۆن؟ پێغەمبەر بە ورەیەکی بەرزو بڕوا بەخۆبوونەوە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: «ئەی زەید! دڵنیابە خودا دەروی رەحمەتی لەم پەیامی منە کردۆتەوەو رێگای رەهابوونی فراوان

کردووە. ئایینی خۆی سەردەخاو پێغەمبەری خۆی بەسەر ناحەزانیدا بالاّ دەست دەکا.

کەوابوو هەموو ئەو ناڕەحەتیو سوکایەتی پێکردنەی تووشی هات لەگەشتی طائیفدا، دوای ئەو ئەزیەتدانو عەزابەی لە مەککەدا لەسەر دەستی قوڕەیشییەکان روبەڕوی بۆوە، تۆزقاڵێك کاریگەریی نەبوو لەسەر بتمانەی پتەوی بەخوداو هێزی عەزیمەتی پۆزەتیفانە لەدڵو دەروونیدا.

سوێند بەخودا ئەوە ورەو عەزیمەتی ئادەمیزادێك نییە: کە زێدە خۆڕاگریو هێزی ئیرادەی بەسروشت بێ.

بەڵکوو ئەوە هێزی یەقینی پێغەمبەرێتییە کە لەدڵی پیرۆزیدا چەسپابوو. ئەو هێزو ورە بەرزی بتمانە بەخۆیو داهاتووی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو: کە دەیزانیو یەقینی هەبوو ئەو فەرمانی خودا خۆی جێبەجێ دەکا، بەو رێبازەدا دەڕوا کەخودا فەرمانی پێ کردووە پێیدا بڕوا. هیچ گومانیش لەوەدا نییە: کە پەروەردگار ویستی خۆی سەردەخاو بۆ هەموو شتێکیش ئەندازەی خۆی بۆ داناوە.

فائیدەی فێربوونو پەروەردەیی بۆ ئێمە لەم کارەدا ئەوەیە نابێ بەلاّو ناڕەحەتیو کۆسبو تەگەرە لەسەر رێبازی دەعوەی ئیسلامی ئێمە بگێڕنەوە یان حەوقمان بکەنو نەهێڵن بەرەوپێش بڕۆین. هەروا نابێ رێگە بدەین مۆتەکەی گیانی تەمبەڵیو پاڵدانەوە لەناوماندا بلاّوبێتەوە. مادام ئێمە لەسەر رێگای هیدایەتی خودا دەڕۆینو بتمانەمان بە تەفیقو یارمەتی پەروەردگار هەیە. کەسێك هێزو توانا لەخودا وەربگرێ شیاوی ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێك نەهێڵێ نائومێدیو تەمبەڵی روی تێبکا. کە مادام خودا خۆی فەرمان بکا بەشتێك گومان لەوەدانییە هەر خۆی یارمەتیدەرە بۆ سەرخستنی ئەوشتە.

ڕیسوایی و تەمبەڵی و نائومێدی: کە تووشی تاك و کۆمەڵی موسوڵمان دەبێ، بەهۆی کۆسب و تەگەرەو بەڵاو چورتمێکەوەن کەدێنە پێش هەندێ ڕێبازو بنەمای تر: کە خودا فەرمانی نەکردووە ئێمە بیانگرینە بەر، ئاشکراشە لە حاڵ و وەزعی ئاوەهادا تێکۆشەران پشت بەهێزی تایبەتی و تێکۆشانی خۆیان دەبەستن ئەم هێزو توانایەش سنوردارەو لە چوارچێوەی هێزی ئادەمیزادی تێپەڕ ناکا. شتێکی سروشتیشە کە هەموو هێزو توانا و ورەو سوربوونێك لە ئاکامی درێژە کێشانی عەزاب و ناڕەحەتی هەڵەوگێڕبێن و ببن بەنائومێدی و ڕیسوایی، بە لەبەرچاوگرتنی پێوەری هێزو توانای سنوورداری مرۆڤانەیان.

## موعجیزەی شەو ڕەوی میعراج

مەبەست بە «ئیسرا» شەوڕەوی: ئەو گەشتەیە کە خودا ڕێزی بێ پایانی پێ لە پێغەمبەر خۆی گرت و لە مەسجیدولحەرامەوە لە مەککە بەسواری بوراق لەشەوێکدا بردی بۆ مەسجیدولئەقصا لە قودس.

مەبەست بە میعراج بەرزکردنەوەی پێغەمبەرە لە مەسجیدولئەقصاوە بۆ طەبەقات و ئاسمانە بەرزەکان و گەیاندنی بەشوێنێك زانستی مەخلووقات «فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکە» پەی پێ نابا و نایگاتێ. هەموو ئەم گەشت و بەرزکردنەوە لەبەشێکی کەمی شەوێك دا ئەنجامدرا.

بێگومان ڕاجیایی پەیدابووە لە دیاریکردنی مێژووی ئەم ڕێزلێنانە خودایییە، ئایا ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بووە، یان دوا ئەو مێژووە بووە؟ بەگوێرەی ڕیوایەتی ئیبنو سەعد لە طەبەقاتی کوبرادا ئەم ڕوداوە سەرنج ڕاکێشە بەهەژدە مانگ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە ڕویداوە.

جەماوەری موسوڵمانان پێیان وایە ئەم گەشتە بە جەستەو بەگیان بووە پێکەوە. بۆیە ئەم گەشتە بە موعجیزەیەکی گەورە دەژمێردرێ کە خودا کردی بەمایەی ڕێزلێنانی بێ پایانی لە پێغەمبەر!

چیرۆکی ئەم ڕوداوە بەدورو درێژی، تییایدا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ بۆراقی بۆهات بۆراق وڵاغێکە لە گوێدرێژ گەورەترو لەهێستر پچوکترە. چەندێك چاوی تیژی بربکا هەنگاوی دەگاتە ئەو شوێنە، بەهەر هەنگاوێکی مەودای بینینی چاوی دەبڕێ. هەروا لە چیرۆکەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ چووە ناو مەسجیدولئەقصاوە دوورکات نوێژی کرد. پاشان جوبرائیل قاپێك شەراب و قاپێك شیری بۆ هێنا، پێغەمبەر ﷺ پیاڵە شیرەکەی هەڵبژارد، حەزرەتی جوبرائیل پێی فەرموو بەڕاستی شتە باشەکەت هەڵبژارد.

هەروا باسی ئەوەی تێدا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ ئاسمان دوا ئاسمان بەرزکراوەتەوە تا گەیشتۆتە «سدرة المنتهى» کەشوێنێکە کەس پێی ناگاو هەرخودا دەزانێ چۆنە. لەوێدا خودا نیگای بۆکرد بەو نیگایەی خودا بۆ خۆی دەزانێ چۆنە. هەرلەوێدا پێنج فەرزەی نوێژ لەسەر موسوڵمانان دیاریکرا لە شەوو ڕۆژێکدا، لە بناغەدا پەنجا نوێژ بووە[١].

بۆ بەیانی دڕۆژی دوایی پێغەمبەر ﷺ بەسەرهاتی ئیسراو میعراجی بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە، ئیتر موشریکەکان کەوتنەخۆ بانگی یەکتریان کردو کۆمەڵ کۆمەڵ گردبوونەوە بۆئەوەی ئەم هەواڵە سەیرە

---

١ - ئەگەر دەتەوێ بەدرێژی چیرۆکی ئیسراو میعراج بخوێنیەوە بگەڕێوە بۆ صەحیحی بوخاری‌و موسلیم یان سەرچاوەیەکی تری فەرموودەی صەحیح. نەکەی پشت بەکتێبی «میعراج ابن عباس»و سەرچاوەی لەوجۆرە ببەستی. بەڕاستی ئەو کتێبە پڕە لەدرۆو دەلەسەو نووسینی ئیبنو عەبباس نییەو ئەو لێی بێ بەرییە.

بۆیەکتر بگێڕنەوەو پێی پێبکەنن و گاڵتەی پێ بکەن، بەلایانەوە سەیرو سەمەرە بوو. هەندێکیشیان بەدەم پێکەنین و گاڵتە پێکردنەوە، وتیان: دە ئەگەر راست دەکەی چویتە بەیتولمەقدیس و نوێژت تێداکردووە بۆمان باس بکە ئاخۆ شێوەی چۆنە. پێغەمبەر ﷺ ئەو چرکەساتەی چووە ناو مەسجیدولئەقصا بەخەیاڵیدا نەهاتبوو سەرنجی دارو دیواری بداو کۆڵەکەو پایەکانی بژمێرێ و شێوەی گشتی لەزەینی خۆیدا خەزن بکا. ئیتر پەروەردگار شێوەی بەیتولمەقدیسی هێنایە بەرچاوی ئەویش بەجوانی بۆی وەصف کردن و هەر پرسیارێکیان لەبارەی ئەو شوێنە پیرۆزە لێ دەکرد وەڵامی دەدانەوە.

بوخاری و موسلیم فەرموودەیەکیان لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کردووە، فەرموویەتی: { لَمَّا كَذَّبَتْنِي قُرَيْشٌ قُمْتُ فِي الْحِجْرِ، فَجَلاَ اللَّهُ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ }.

ئەمما حەزرەتی ئەبوبەکر، هەندێ لەبتپەرستەکان بە پەلە ئەم هەواڵەیان بۆبرد بەهیوای ئەوەی بەلایەوە شتێکی نامەعقول بێ و بڵێ درۆیە، بەڵام کەچۆن هەواڵەکەیان پێ راگەیاند فەرمووی: ئەگەر تەشریفی ئەو قسەی فەرمووبێ راستە، من ئەگەر ئەو لەوەش زیاتر بڵێ بڕوای پێ دەکەم.

هەر لەسەرەتای رۆژی شەوی ئیسراو میعراجدا حەزرەتی جوبرائیل هات پێغەمبەری فێری چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژەکان کردو کاتەکانی بۆ دیاری کردن.

لەپێش واجب بوونی پێنج نوێژەکاندا پێغەمبەر ﷺ هەموو رۆژی بەیانی دوو رکات و ئێوارە دوو رکات نوێژی دەکرد وەکوو چۆن حەزرەتی ئیبراهیم وای کردووە.

**پەندو ئامۆژگاری:**

بڕێ توێژەرەوەو باحیث ئارەزۆیان لەوەیە زێدەڕەوی و موبالەغە بکەن لەوێناکردنی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ و جەختکردنەوەی لەسەرئەوە کە ژیانی پیرۆزی ژیانێکی ئادەمیزادانەی ئاسایی بووە، ئەمەش لەمیانەی درێژەدان بەباسکردنی ئەوە کەژیانی موعەقەد نەبووە لەپشت خەواریق و موعجیزاتەوە، ژینانێکی ئاسایی ئادەمیانە بووە. بەڵکوو پێغەمبەر بۆ خۆی ئینکاری ئەوەی کردووە کە موعجیزەی هەبێ و هیچ گرنگی پێ نەداوەو هیچ ئاوڕی لەوانە نەداەتەوە کە داوای موعجیزەیان لێ کردووە. هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە موعجیزەو خەواریق لەئیشی ئەو نییەو هیچ دەسەڵاتێکی تێیاندا نییە. ئەمجار ئەو باحیث و توێژەرەوانە بەڵگە لەسەر بۆچونەکەیان دەهێننەوە بەنموونەی ئایەتی «قل انما الآيات عند الله» بەشێوەیەك کەوا دەخەنە خەیاڵی بیسەرو خوێنەرەوە: کە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بەتەواوی مانا دووربووە لە موعجیزات و نیشانەو ئایاتێك کە خودا پشتگیری پێغەمبەرانی خۆی پێ کردووەو لەسەر دەستی ئەوان ئەو موعجیزەو خەواریقانەی هێناوەتە دی.

ئەگەر ئێمە لەسەرچاوەی ئەم تیۆرە دەربارەی پێغەمبەر وردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ ئەو تیۆرە لە بناغەدا فیکرەو بۆچوونی هەندێ رۆژهەڵاتناس و لێکۆڵەرەوەی بێگانەن لەوێنەی غوستاف لۆبون، وأوجست کۆنت، وهیوم، وجۆڵدزیهرو هی تریش بناغەی ئەو تیۆرەو هۆکاری سەرهەڵدانی لای ئەو کۆمەڵە هەر لەیەکەمجارەوە بڕوا نەبونیانە بە خالیقی موعجیزەو خەواریق، چونکە ئیمان بەخودا هەرکاتێ لەدڵ و دەرووندا جێگیر بوو ئیتر دوا ئەوە بڕوابوون بەهەموو شتێك ئاساییە. شتێك نامێنێ لەدونیادا بەحەقیقەت ناوی موعجیزەی لێ بنێین.

پاشان چەند کەسێك لەنووسەری موسوڵمان ئەم تیۆرەیان لە نووسەرە بێگانانە وەرگرت و قۆستیانەوە. لەبەدبەختی جیهانی ئیسلامی ئەو کۆمەڵە نووسەرە موسوڵمانە هەموو هێزو توانای خۆیان خستەگەڕ بۆ رەواجدان بەبیرو بۆچونی ئەو بێگانانە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەو پشتگیرییەکیان لاهەبێ جگە لە هەڵخەڵەتان بە بریق باقی فرت و فێڵیان و حەبەسان و سەرسام بوونیان بەدیاردەی پێشکەوتنی بواری زانستی کەهەموو ئەورووپای گرتەوە.

لەو نووسەرە موسوڵمانانەی کە بەم بریق باقە هەڵخەڵەتان مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدەو موحەممەد فەرید وەجدی و حوسەین هەیکەل بوون.

ئەمجار ئەو موبەشیرو خۆرهەڵاتناسە گومانخەرەوانە، ئەو بەناو زاناو زانست خوازە بێگانانە تێفکرین لە وەزع و حاڵی ئەو نووسەرە موسوڵمانانەو ئەو بیرو باوەڕەی دەری دەبڕن دیتیان ئەوەی هەندێ موسوڵمان دەیڵێن دەرگاو ئاسۆو گۆڕەپانی تازەیان بۆ دەکەنەوە بۆئەوەی باش بتوانن غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامی بکەن و شك و گومان لای موسوڵمانان دەربارەی ئایینەکەیان پەیدابکەن، ئیتر ئەم ئاسۆو گۆڕەپانە تازانەی کەبۆیان ئاچوغ بووە بێ ئاتاجی کردوون لەشێوازو وەسیلە کۆنەکانیان، هیچ پێویست ناکا ئێستا بانگەشەی شەڕی راستەوخۆ دژی عەقیدەی ئیسلامی رابگەیەنن و هەوڵ بدەن ئەفکاری ئیلحادی لەمێشکی خەڵکیدا بڕوێنن... ئیتر لەم روانگەوە ئوسلوب و شێوازی خۆیان گۆڕی رێگای تازەو شێوازی تازەیان گرتەبەر، ئیتر کەوتنە رەواجدانی چەند صیفاتێکی دیاریکراو بۆ پێغەمبەر وەکوو رەوشتی «بطولة = پاڵەوانیەتی» و عەبقەری و قیادەو سەرۆکی و ئەم جۆرە صیفاتانە ئەمەش لەمیانەی عیباراتی پێدا هەڵگوتن و رازاوەدا. لەهەمان کاتدا زێدەڕۆیی دەکەن لەوێناکردنی ژیانی گشتیدا، دوور

لەهەموو شتێك: كە عەقڵ دەركی نەكا لە موعجیزات‌و خەواریقی عادەت. بۆئـەوەی وێنـەو صـورەتێكی تـازە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لـەذیهنـی موسـوڵمانانـدا دروسـت بكـەن‌و بـە تێپـەڕینی رۆژگـار بەسـەریاندا پێـی ئاشـنابن وادەبـێ وێنـەو صـورەتەكە صـورەتی «محمـد العبقـری» یـان صورەتی «محمد القائد» یان صورەتی «محمد البطل» دەبێ.

بەڵام نابێ بەهیچ حال‌و كلوجێك صورەتی «محمـد النبی والرسـول» بـێ! چـونكە هـەموو حـەقائیقی پێغەمبـەرێتی‌و ئـەو مانـاو بنەمایانـەی لـەخۆیان دەگـرێ لـەنیگاو شـتە غـەیبی‌و پەنامەكییـەكان «بـەهۆی ئـەو رەواجدانە بە نازناوی عەبقەری‌و پاڵەوانیـەتی‌و ئـەو جۆرە صیفاتانە دە دوورن لـــەمانای مـــوعجیزەو خـــەواریق» هـــەموو حەقائیقـــەكانی پێغەمبـەرێتی‌و نیگـا فـڕێ دەدەنـە جیهـانی «میثـولۆجیـا» ئەفسـانەو ئەسـاطـیر. لـەم روەوە كـە «وەحـی‌و نبـوە» لەبەشـی هـەرە گرنگـی موعجیزەن.

ئیتر كە ئەمـەیان بـۆ چووەسـەر ئیتر ئەوكاتـە «بـە طـەبیعـەتی حـاڵ» پێویست ناكا هیچ هۆكارێك تەصەور بكرێ بۆ زۆری گردبونەوەی گەل‌و نەتەوەی جیاجیا لەدەوری پێغەمبەرو چونە ژێر ئاڵای‌و رەگەڵ كەوتنیان بۆ كاروانی نەپساوەی دەعوەو بانگەوازی جگە لەكاریگەری‌و موتەئەثیر بوون بە عەبقەرییـەت‌و ئـەو بنـەماو موقەویماتانـەی تێیدا كۆبوونـەوە بـۆ قیـادەو سـەركردایەتی لەژیانیـدا. بەمـەش مانـای «نبـوة» و «وحـی» دەسڕنەوەو پلەو پایەی پێغەمبەرێتی لە حـەزرەتی موحەممـەد دادەڕنن. ئەمجار جوان تێبفكرەو لەمەبەستەكە وردبەرەوە!!

بێگومان ئەم مەبەستەی كە هـەوڵی بـۆ دەدەن بەئاشكرا لـە بانگەشـە بـۆكردن‌و بڵاوكردنـەوەی وشـەی «محمـدیین» «وەكـوو عینـوان‌و نـاوێكی تازە» لەجیاتی «مسلمین» خۆی دەنوێنێ‌و دەردەكەوێ.

بەڵام ئاخۆ دەبێ مەوقیعی ئەم تەخەییول‌و تەصەورە لەچ ئاستێکدا بێ دەربارەی حەقیقەتی پەیامی حەزرەتی موحەممەدو شەئن‌و حاڵی، ئەگەر ئێمە هەوڵ بدەین حەقیقەت دەربخەین لەژێر رۆشنایی لێکۆڵینەوەی مەنطیقی‌و مەوضوعیدا؟

یەکەم: ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تێفکرین لەدیاردەی وەحی‌و نیگا کە بەئاشکرا لەژیانی پێغەمبەردا خۆی دەنوێنێ «لەوەپێشیش بەدرێژی باسمان لێوەکرد» دەبینین دیاریترین صیفەت کەخۆی دەنوێنێ لەژیانی پڕ فەڕو بەرەکەتیدا «نبوة = پێغەمبەرایەتییە». ئەمە هیچ شك‌و گومانی تێدا نییە. «نبوة»یش لەمانا پەنامەکی‌و غەیبییەکانە نایەتە ژێر کۆنترۆڵی پێوەرە مەحسوسەکانی ئێمە.

کەوابوو مانای موعجیزەو خەواریق ئاوێنەی کیانی پێغەمبەر بووەو لە ئەصڵی کیانیدا بەرجەستە بووە. کەواتە ناگونجێ دیاردەی موعجیزەو خەواریق لە پێغەمبەر دوور بخەینەوە مەگەر بەروخاندنی خودی مانای «نبوة»و سڕینەوەی لەژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش یەکسانە بە ئینکاریکردن‌و رەتکردنەوەی خودی ئایین خۆی. جا ئەگەر برێ لە لێکۆڵەرەوە خۆرهەڵاتناسەکان ئەم ئاکامەیان نەدرکاندووە هەر بەوەندە ئیکتیفایان کردووە کە هاتوون باسی زیرەکی‌و عەبقەریەت‌و ئازایەتی‌و سیاسەتمەداری‌و کاربەجێیی پێغەمبەر بکەن، هاتوون پێشەکی‌و سەرەتایی‌و «مقدمات»یان داناون لەئاکامەکان بێدەنگ بوون. چونکە نەتیجەو ئاکام «دوای سەلماندنی موقەدیمات» بەشێوەیەکی سروشتی دێنەجێ.

ویڕای ئەمەش زۆرێك لەو خۆرهەڵاتناسانە نەتیجەو ئاکامەکانیان درکاندون‌و نەیانتوانیوە لەسینەی خۆیاندا مەبەستی گڵاویان بشارنەوە.

بۆ نموونە وەکوو «شبلی شمێل» کاتێك لە نووسینێکیدا بڕوا بەئایینی ناونا بڕوا بە موعجیزەی محاڵو وەدی نەهاتوو«١».

**دووەم:** ئەگەر ئێمە لەسیرەی پێغەمبەر ﷺ وردبینەوەو سەرنج بدەینە روداوەکانی ژیانی پیرۆزی. دەبینین پەروەردگار چەند موعجیزەیەکی لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەدی کە ناتواندرێ قبوڵ نەکرێنو هیچ مەجالێك نیە بۆ رەتکردنەوەیان، چونکە ئەو روداوە سەر ئاسایانە ئەو موعجیزانە بەڕشتەی صەحیحو موتەواتەر نەقڵ کراونو بەئێمە گەیشتوون، بەجۆرێك عەقڵو فکر بەرزدەکەنەوە بۆ پلەی قەطعو یەقین. یەکێك لەو موعجیزەو روداوانەی کە پلەی قەطعییان وەرگرتووە روداوی هەڵقوڵانی ئاوە لەناوانی پەنجەی پیرۆزی.

بوخاری لە «کتاب الوضوء»دا موسلیم لە «کتاب الفضائل»دا ئیمامی مالیك لە موطأدا لە «کتاب الطهارة»دا فەرمودەزانانی تریش بەڕشتەو ڕێگای جیا جیا ئەم روداوەیان گێڕاوەتەوە تەنانەت ئیمامی زەرقانی لە قورطوبییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بێگومان هەڵقوڵانی ئاو لەنێو پەنجەی پێغەمبەر ﷺ چەند جارێكو لەچەند شوێنێكو لەمەشاهیدی گەورە گەورەدا دووبارەو سێبارە بۆتەوە. لەچەند ڕێگەو روشتەیەکەوە ریوایەتکراوە کە تێکڕاو سەرجەم موفیدی زانستی قەطعییە لەتەواتوری مەعنەوییەوە سەرچاوەی گرتووە. هەروا روداوی لەتبوونی مانگ لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ کاتێك موشریکەکان داوایان لێکرد وەکوو بەڵگەیەك لەسەر راستی پەیامەکەی بتوانێ مانگ شەق بکا، ئیمامی بوخاری لە «کتاب أحادیث الانبیاء»دا ئیمامی موسلیم لە

---

١ - دکتور شبلی شمیل لەپێشەکی تەعریب کردنی کتێبی ،بوکنز، ئەم مەبەستەی خۆی درکاندووە.

«كتاب صفة القيامة»دا هەروا زوربەی زانایانی فەرمووده ئەم روداوەیان گێڕاوەتەوە.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: بێگومان چەند حەدیثی موتەواتەر بەڕشتەو سەنەدی صەحیح دەربارەی ئەم روداوە ریوایەت کراون... ئەمە شتێکی چەسپاوو بڕیار لەسەردراوە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوەو یەکڕایی بەدەست هێناوە: کە لەسەردەمی پێغەمبەردا مانگ دوو لەتبووەو ئەمە یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی پێغەمبەری ئیسلام«[1]».

روداوی ئیسراو میعراج: کە ئێمە ئەم باسەمان بەوبۆنەوە هێناوە، ئەو حەدیثەی روداوەکەی تێدا نەقل کراوە حەدیثێکی صەحیحو «متفق علیە»و چەسپاوییەکەی ئینکار ناکرێو ثابتو جێگیرە، بەکۆڕای موسوڵمانان لە موعجیزە گەورەکانی پێغەمبەرە.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوانەی سەرگەرمی بەرەواجدانی صیفەتی «عەبقەری»ن بۆ پێغەمبەرو تەنها صیفەتی عەبقەریو لێهاتوییو ئەو جۆرە صیفەتانەی بۆ هەڵدەدەنو، ناوی موعجیزەو خەواریق لەژیانیدا دوور دەخەنەوەو لە کولەکەی تەریشدا باسی ناکەن، چاوی خۆیان دەنوقێننو گوێچکەیان دەهاخنن لەئاست ئەو هەموو حەدیثە موتەواتەرانەی لەڕاستیو چەسپاویدا گەیشتوونە پلەی قەطعیو فەرامۆشکردنیان بەهیچ پێوەرێك کاری زانستی نییە. بەهیچ کلۆجێك نەبە ئاو نە بەنا نە بەچاكو نە بەخراپ باسیان ناکەن، هەر دەڵێی سەرچاوەکانی حەدیث پڕیان نییە لەو حەدیثانە. لەکاتێکدا بۆ هەر حەدیثێك لەو حەدیثانە زیاد لە «دە» ڕێگای ڕشتە هەیە.

---

١ - تفسیر ابن کثیر ٢/٢٦١.

بەڵێ ئاشکراو روونە هۆی ئەم تەجاهول و خۆگێل کردنە خۆدزینەوەو هەڵاتنە لە تەنگژەو ئیشکالێکی قوڵ کەڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەکاتی تێڕوانین و تێفکرین لەم فەرموودانە. چونکە مانای ئەو فەرموودانەو ناوەڕۆکیان بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا دژدەوەستێ لەگەڵ ئەو تیۆرەی لەمێشکی ئەواندا سوڕدەخوا«١».

سێیەم: موعجیزە وشەیەکە چەندێك لێی وردبیەوەو سەرنجی بدەینێ مانایەکی زاتی دەست ناکەوێ، ئەوەی لێی فەهم دەکرێ و لێی وەدی دێ جگە لەمانایەکی نیسبی روت بەولاوە هیچی ترنییە. موعجیزە بەگوێرەی زاراوەو ئیصطیلاحی خەڵك بریتییە لەهەرکارێك خاریجی عادەت بێ و ئولفەتی پێوە نەگیرابێ، هەموو شتێکی ئولفەت پێوەگیراو بەگوێرەی چەرخ و رۆژگار تەطەور دەکاو پێشکەوتن بەدەست دێنێ، بەگوێرەی جوداوازی ئاستی رۆشنبیری و هەست و زانیارییەکان و گەل و نەتەوەکان جوداوازی تێدا دێتەجێ، زۆر کاری واهەیە پێش ماوەیەك بە موعجیزە زاندراوە، ئەمڕۆ بۆتە کارێکی ئاسایی و ئولفەت پێوەگیراو، زۆر کاری واهەیە لەبیئەیەکی شارەستانی و پێشکەوتودا شتێکی ئاسایی و پێوەراهاتوو مەئلوفە لەناو نەتەوەیەکی دواکەوتوو بە موعجیزە دەژمێردرێ!

بەڵکوو حەق و راستی ئەوەیە بڵێین: ئولفەت پێوە گیراوو ئولفەت پێوە نەگیراو، پێوە راهاتوو پێوە رانەهاتوو لە ئەصڵ و بنەمادا هەردوکیان موعجیزەن.

ئەستێرەکان موعجیزەن، جم و جوڵی فەلەك موعجیزەیە، یاسای هێزی کێشندە «قانون الجاذبیة» موعجیزەیە، کۆمەڵەی ئەعصاب لە

---

١ - یەکێ لە هەوادارانی ئەم کۆمەڵە خاوەنی کتێبی -حیاة محمد- کە هەمیشە دەیەوێ خۆی لەم فەرمودانە گێل بکا تا مەنهەجە....

ئادەمیزاددا موعجیزەیە. سوڕانەوەی خوێن لەجەستەیدا موعجیزەیە، روح موعجیزەیە، ئادەمیزاد بۆ خۆی موعجیزەیە. ئای کەئەو زانا فەرەنسییە «شاتوبریان» چەند وردبین و عاقڵ بووە کە هاتووە ناوی «الحیوان المیتافیزیقی» بڕیوە بەسەر ئادەمیزاددا: کەمانا کوردییەکەی «حەیوانی غەیبی و نەزاندراو»ە.

وەڵێ ئادەمیزاد «بەهۆی درێژی ماوەی پێوە راهاتن و بەردەوامبوونی عادەو دوبارەو چەندبارە بوونەوەی شتەکان» لایە موعجیزییەکەی و گرنگییانی لەبیر دەچێتەوە. لەڕوی نەزانی و بوغڕا بوونەوە واگومان دەبا موعجیزە ئەوەی کە لەنکاوێك رودەداو گۆزو گوممەت بە پێچەوانەی پێوە راهاتنی خەڵك و داب و نەریتیان دێتەکایەوە. ئەمجار دێ هەموو ئەوشتانەی پێیانەوە راهاتووەو بوونە شتێکی ئاسایی لەلای، دەیانکاتە پێوەر بۆ بڕوابوونی بەشتەکان یان رەتکردنەوەیان!! ئەمەش خۆی لەخۆیدا جەهل و نەزانییەکی سەیرو سەمەرەیە لە مرۆڤدا چەندێك لەبواری شارەستانی و زانیاریدا پێشکەوێ!...

مرۆڤ بەتێفکرین و تێڕوانینێکی کەم بۆی دەردەکەوێ ئەو خودایەی ئەم بونەوەرەی هێناوەتە دی، هیچ بەلایەوە گران نییە کە موعجیزەیەکی تری تێدا زیادبکا، یان هەندێ گۆڕانکاری و تاوو توێ لەبڕێ ئەو یاسا و نیظامانەدا بکا: کە بونەوەری لەسەر داڕشتووە. بێگومان خۆرهەڵاتناسی ئینگلیزی ئەم تێڕوانین و تێبینییەی لەلا دروست بووە بەم تێفکرینەوە دەڵێ: «ئەو دەسەڵاتەی بوونەوەری هێناوەتەدی، دەسەوسان نییە لەوەدا شتێکی لێ لابەرێ یان شتێکی بخاتە پاڵ و لێی زیادبکا. ئاسانە کە بگوترێ ئەو زیادکردن و لابردنە عەقڵ وێنای ناکا و ناچێتە ناو تەصەورەوە، وەڵێ ئەوەی کە دەگوترێ تەصەور ناکرێ، تەصەور نەکردنەکەی ناگاتە پلەی هەبوونی بونەوەر.

مەبەست ئەوەیە ئەگەر ئەم بونەوەرە وجودی نەبێ، ئەمجار بەیەكێك لەوانەی ئینكاری موعجیزاتو خەواریق دەكەن، تەصەوری بونیان ناكەن بگوترێ: عالەمێكی ئاوا دێتەجێ، یەكسەر دێتە جوابو دەڵێ: ئەمە تەصەور ناكرێ، نەفیی كردنی بۆ تەصەوری عالەم زۆر توندتر دەبێ لەنەفیی كردنی تەصەوری موعجیزەو خەواریق.

ئەمە وردكارییەكە پێویستە هەموو موسوڵمانێك بیزانێ دەربارەی پێغەمبەرو ئەو موعجیزانەی خودا پێی بەخشیونو كردونی بەمایەی رێز بۆی.

**دووەم:** مەوقیعو كاریگەری موعجیزەی ئیسراو میعراج لەو روداوانەی بەسەر پێغەمبەردا تێپەڕین لەو سەردەمەدا. بێگومان پێغەمبەر ﷺ ئەشكەنجەو ناڕەحەتی جۆراو جۆرو زۆری لەدەست قوڕەیشیەكان چەشت، ناڕەحەترینیان ئەو سزاو عەزابە بوو كە ناچاریان كرد بچێ بۆ طائیف. وەكوو لەوەپێش ئاماژەمان پێكرد.

لەو دوعاو پاڕانەوەی ئەنجامیدا دوای ئەوە لە طائیف گەڕایەوە لەژێر سێبەری درەختی باغی دوو كوڕەكانی رەبیعە دانیشتو حەسایەوە، لە دوعاو پاڕانەوەكەی ئەوە دەردەكەوێ كە وەكوو هەموو ئادەمیزادێك هەستی بەلاوازی خۆی كردووەو زانیویەتی چەندە پێویستی بەیارمەتیو كۆمەك هەیە. ئەوەش نیشانەو دیاردەی بەندایەتیكردنی ئادەمیزادە بۆ خودای باڵا دەست.

لەپاڕانەوەكەیدا جۆرێك لەمانای شكواكردن لای خوداو بەتەمابوونی یارمەتیو لێ رازیبوونی پێوە دیارە، لەوانەیە ترسی ئەوەی بووبێ كەئەو ئەزیەتدانو چەرمە سەرییەی تووشی بووە بەهۆی جۆرێك لە غەضەبی خودابێ لێیو لەسەر تاوانێك بێ كە لێی رودرابێ. بۆیە لەمیانەی پاڕانەوەكەیدا دەفەرموێ: {ان لم یكن بك غضب عليّ فلا أبالي} ئەگەر ئەم

ئازارو ئەشکەنجەیە غەضەبی تۆنەبێ لەسەر من ئەوە من هیچ بەلامەوە گرنگ نییە.

ئیتر میوانداری کردنی لەلایەن خوداوە «پاش ئەو هەموو ناڕەحەتیانە» کە لەئیسراو میعراجدا رەنگی دایەوە ڕێزلێنان و تەکریمکردنێك لەخوداوە بۆ ئەو. تازەکردنەوەی عەزیمەت و ثەباتی بوو لەسەر پەیامەکەی. بەڵگەبوو لەسەر ئەوە: کە ئەو ناڕەحەتیەی لەگەڵ و نەتەوەکەیەوە تووشی دەبێ، هۆکارەکەی ئەوەنییە خودا پشتی بەردابێ یان غەضەبی لێ گرتبێ. بەڵکوو ئەو ئازارو چورتمانە داب و نەریتی خودایە لەگەڵ خۆشەویستانی خۆی و ئەوە سوننەتی بانگەوازی و دەعوەی ئیسلامییە لەهەموو کات و سەردەمێکدا.

سێیەم: مانای شەورەوی پێکردنی پێغەمبە ﷺ بۆ بەیتولمەقدیس و بەرزکردنەوەی بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمانەکان، بەڵگەی ئاشکراو رون هەن لەسەر ئەندازەی ئەو ڕێزو حورمەت و پیرۆزییەی ئەو مزگەوتە لای خودا هەیەتی. هەروا بەڵگەی ئاشکرای تێدایە لەسەر پتەوی پەیوەندی نێوان ئەو پەیامەی هەریەك لەعیسای کوڕی مەریەم و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای پێ ڕەوانەکراون. وێڕای نیشانەی پەیوەندی توندو تۆڵی ئایینی کەخودا هەموو پێغەمبەرانی بەو تاقە ئایینە ناردووە هەموویان یەك لەدوایەك ئەو ئایینە خودا پەسەندە کەناوی ئیسلامە جەخت کردۆتەوە.

هەروا ئاماژەی ئەوەی تێدایە چەند پێویستە موسوڵمانان لەهەموو چاخ و سەردەمێکدا پارێزگاری لەوخاکە پیرۆزە بکەن، ببنە پەرژینی و بیپارێزن لەدەستی چەپەڵی دوژمنانی ئایین. هەردەڵێی حیکمەتی خودایی موسوڵمانانی ئەم چەرخ و سەردەمە هەڵدەنێ کە ورەیان نەڕوخێ و ترس دایان نەگرێ و خۆیان شەرمەزار نەکەن لەبەرامبەر

دەستدرێژیکردنی جولەکە بۆسەر ئەو خاکە پیرۆزەو هەوڵ بدەن پاکی بکەنەوە لەو ستەمکارە خودا نەناسانەو بیگێڕنەوە بۆژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان.

کێ دەزانێ، لەوانەیە واقیعو روداوی ئەم شەوڕەوییە گەورەو شکۆدارە بێ کە صەلاح الدینی هەڵنا بۆئەوەی پاڵەوانانە ئەو سەروەرییە گەورەیە تۆماربکاو، هەرچی تواناو هێزی خۆی هەیە بیخاتە گەڕ بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشە یەك لەدوا یەکەکانی خاچپەرستان بۆسەر ئەم وڵاتە پیرۆزەو لەئاکاما بیانشکێنێو پاشەو پاش بیانگێڕێتەوە، ئەو سەروەرییە بێ وێنە لەلاپەڕەکانی مێژوودا بەوشەی زێڕین بنووسێتەوە.

دەبێ موسوڵمانان بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی شانازی بەکەڵە پیاوی ئاوا بکەن، هەمیشە بەرێزەوە ناوی بهێنن.

خودایە بۆخاتری ناوە جوانەکانی خۆت جارێکی تر ئەو سەروەرییە بەگەلی کوردی موسوڵمان ببەخشییەوەو سەرلەنوێ قیبلەی یەکەمی موسوڵمانان لەژێر قیادەی کەڵە پیاوێکی کوردی وەکوو صلاح الدین دا رزگار بکرێتەوە. «وما ذلك على الله بعزيز».

**چوارەم:** لەشیر هەڵبژاردنی پێغەمبەر ﷺ بەسەر شەرابدا لەوکاتەدا کە حەزرەتی جوبرائیل هەردوکی خستنە بەردەستی بەڵگەیەکی رەمزی هەیە لەسەرئەوە کە ئایینی ئیسلام ئاینێکی سروشتیو گونجاوە لەگەڵ فیترەتی ئادەمیزاد واتە دینێکە گونجاوە لە عەقیدەو ئەحکامدا لەگەڵ نەوازیعو سروشتی ئەصڵی مرۆڤدا هەڵدەکا. لەئایینی ئیسلامدا شتێك نییە دژایەتی سروشتی بنەڕەتی لە ئینساندا بکا. ئەگەر سروشت قەبارەیەکی خاوەن طولو ئەبعاد بوایە ئایینی ئیسلام پۆشاکی باڵاپۆشی بەباڵا براوی دەبوو. واتە: کاڵا بەقەد باڵا دەبوو!

ئەمە بەشێکە لەنهێنی بەرفراوانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام‌و خێرا بڵاوبوونەوەیی‌و پێشوازیکردنی خەڵك لێی. چونکە مرۆڤ چەندێك لەبواری حەضارەتدا پێشکەوێ‌و هۆکارە مادیەکانی بەختەوەریی دابپۆشن، ئەوە هێشتا لەناخەوە هەست دەکا بەوەی لایەنێکی پێویستیەکانی پڕنەکراونەوەو داخوازییە سروشتییەکانی نەهاتوونەدی‌و حەزدەکا حەزەکانی فیترەتی دابین بکرێن. پێی خۆشە لە کۆت‌و زنجیری تەکەلووفات‌و گرێ کوێرکەی دوورو نەگونجا‌و لەگەڵ سروشتی، رزگاری ببێ. ئایینی ئیسلامیش تاقە ئایینێکە وەڵامی قوڵترین داخوازی سروشتی ئادەمیزاد دەداتەوەو حەزەکانی دابین دەکا.

پێنجەم: شەوڕەوی پێغەمبەرو بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمانەکان‌و گەشتکردنی بەناو مولك‌و مەلەکوتدا بەگیان‌و بەجەستە بووە پێکەوە. جەماوەری موسوڵمانان لەکۆن‌و نوێدا بە پێشین‌و پاشینیانەوە کۆڕایان لەسەرئەوە هەیەو سەلماندویانە.

ئیمامی نەوەوی لەشەرحی موسلیمدا دەفەرموێ: «ئەوەی حەق‌و راستە لەبارەی ئیسراو میعراجەوەو موسوڵمانان بەگشتی‌و زوربەی زانایانی سەلەف‌و گشت زانایانی موتەئەخیرین لە فوقەها‌و موحەدیثین‌و موتەکەلیمین. پێیان وایە شەوڕەوییەکەی بەجەستەو بەگیان بووە، ئاثارو ئەقوالی زۆرهەن ئەو روداوە بەو شێوە دەچەسپێنن‌و بەڵگەن لەسەرئەوە کە حەزرەتی «محمد» بەجەستەو گیان ئەو گەشتە بێ وێنەی پێ ئەنجام دراوە، لە ظاهیری مانای ئەو حەدیث‌و ئاثارانە لانادەین مەگەر بەڵگە هەبێ‌و ناچاربین، هیچ ناچاری‌و محاڵ‌و نەگونجانێك بەدی ناکەین لەوەی مانای ظاهیر لەدەقەکان بەرچاوبگرین، کەوابوو پەنا نابەینە بەر تەئویل‌و گونجاندن»[١].

---

١ - النووی علی صحیح مسلم ٢/٣٩٠.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: بێگومان ئیسراو میعراج لەیەك شەودا رویان داوەو لەحاڵەتی بەخەبەریداو بەجەستەو گیان بووە، جەماوەرێکی زۆر لە زانایانی حەدیثو فیقهو کەلام ئەم رایەیان پەسەند کردووە، ظاهیری ئەحادیثی صەحیح لەسەری گەییشتوونە ئەندازەی تەواتورو دەیچەسپێنن، پێویست ناکا لە ظاهیری ئەو ئەخبارانە لابدەین، چونکە بەمحاڵی نازانێ تاناچاری تەئویلکردن بین[1].

بەهێزترین بەڵگە لەسەرئەوەی ئیسراو میعراج بەجەستەو گیان بووە ئەوەیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ باسی شەوڕەوی خۆی بۆ قوڕەیشییەکان کرد هەندێ لەوانە موسوڵمان بوو بوون کەوتنە گومانەوەو لەئایین هەڵگەڕانەوە، قوڕەیشییەکانیش سەر لەبەر بەهەواڵەکە سەریان سوڕماو کەوتنە گاڵتە پێکردنیو بەدرۆ خستنەوەی، دەی ئەگەر شەوڕەوییەکەی تەنها بەگیان بوایە، یان خەونی ببینیایە ئەوە هیچ بەلایانەوە جێگای سەرسوڕمان نەدەبوو، یان ئەوەندە بەزەقیو بەتوندی بەدرۆیان نەدەخستەوە، چونکە نەك پێغەمبەر بەڵکوو زۆر ئادەمیزادی ئاسایی بەخەون شتی وەها دەبینێ کە لەگەل واقیعدا ناگونجێو یان بەخەیاڵی کەسدا رانابورێ. هەر لەکۆنەوە لەهەموو کاتو شوێنێکدا ئادەمیزاد راهاتووە خەونی سەیرو سەمەرە ببینێو کەسیش نەهاتووە ئەو جۆرە خەونە خەیاڵیانە بەدرۆ بخاتەوە. چونکە دیتنی شت لەخەوندا سنووری نییە. بەڵکوو بینینی خەونی سەرنج راکێشو خەیاڵی بۆ موسوڵمانو کافردەبێ تایبەت نیە بەکەسانێکەوەو بۆ کەسانێکی تر نەگونجێ. خۆئەگەر روداوەکە بەخەون بینین بوویایە، قوڕەیشییەکان داوایان لێ

---

١ - فتح الباری علی صحیح البخاری: ج ٧/ ١٣٦ — ١٣٧.

نـەدەکرد کـە وەصـفی بەیتولمەقـدیس و دیـوارو کۆڵەکـەو دەرگاکانیـان بۆبکا بەمەبەستی بۆڕدان و تەحەدا.

ئەمما ئـەم موعجیزە چۆن هاتـەدی و عـەقڵ چۆن وێنـای دەکا؟ ئـەوە وەکوو هەموو موعجیزەیەك کە موعجیزەیەکی تری بونەوەرو ژیـان تـەواو دەکا! ... بێگومان ئێمە لەوەپێش ئاماژەمان بۆئەوە کردو وتمان: هـەموو دیاردەی ئەم کەونە لە حەقیقەت و راستیدا مـوعجیزەن و سەرئاسـان، جا چۆن عەقڵ بەئاسانی و ئاسایی وێنـای ئـەو موعجیزانـە دەکـاو دێنـە ژێـر رکێفی تەصەوریەوە ئاوا مومکینـە بـۆ عـەقڵ تەصـەوری روداوی ئیسراو میعراجیش بکا بەئاسانی و ئاسایی.

شەشەم: وریابە لەکاتێکدا تـۆ لـەروداوی ئیسـراو میعـراج دەکۆڵیـەوە پـشت نەبەسـتی بـەو پـەراوەی کـەپێی دەگـوترێ: «معـراج ابـن عبـاس» چـونکە لەڕاسـتیدا ئـەوە کتێبێکـە لەکۆمـەڵێك حـەدیثـی بـێ بناغـەو بـێ رشتەو سەنەد پێك هاتووەو هـیچ ئەصـڵ و بنەمایـەکی راستـی نیـەو ئـەو کەسـەی ئـەو پـەڕاوە پـڕ لەدرۆیـەی هەڵبەسـتووە ویـستویەتی پـاڵ ئیبنـو عەبباسی بدا، هەموو رۆشنبیرێك بەڵکوو هـەموو مرۆڤێکی عـاقڵ دەزانـێ کـە ئیبنـو عـەبباس بـەریئو بـێ تاوانـە لـەو درۆ هەڵبەسـراوانەو ئیبنـو عـەبباس هـیچ پـەراوێکی لـە میعراجـی پێغەمبـەردا نەنووسـیوە، بـەڵکوو مێـژوو شـاهیدە حەرەکـەی کتێـب نووسـین و تـەئلیف لەکۆتاییـەکانی سەردەمی خەلافەی ئەمەویدا دەستی پێکرد.

کاتێـك بـانگخوازانی داخ لـەدڵ و دوژمـن بـە ئیـسلام ئـەو کتێبـەیان بینی و ئەو حەمکە درۆو دەلەسەیەیان تێدا دەستکەوتن کەپاڵ پێغەمبەر دراون و بـەر عـۆدەی شـێواندنی ئیمـانی خـەڵکێکی زۆر دەبـێ، کەوتنـە رەواج پێدانی و بانگەشە بۆکردنی!

یەکێك لەوانەی دەربارەی ئەم کتێبە نووسینی بڵاوکردەوەو پێیدا هەڵگوتو مەدحی کرد، «دکتور لویس عوض» بوو خۆزگە دەتزانی «لویس عوض کێیە». هەرچەندە ئەو نووسەرە داخ لەدڵانە پێش کەسانی تر دەزانن ئەو کتێبە سەرلەبەری درۆیەو بەدەم ئیبنو عەبباسەوە هەڵبەستراوەو هەموو ئەو حەدیثانەی لەخۆی گرتوون درۆی شاخدارو بەتاڵو پوچن، وەڵێ درۆ لای ئەوان خێرا دەبێتە کەلامی راستو صەحیح، چونکە ئامانجی ئەوان دەپێکێو فیکرو بیروباوەڕی موسوڵمانان چەواشە دەکاو ئایینیان دەشێوێنێ.

## پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) پەیوەندی بەهۆزەکانەوە بۆ ئیمانهێنان

### سەرەتای ئیمانهێنانی ئەنصار:

پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ئەم ماوە هەمووی، پەیوەندی بەهۆزەکانەوە دەکرد، لەوەرزی حەجدا ساڵانە خۆی بەو هۆزانە دەناساند: کەدەهاتن بۆ حەجی کەعبە، قورئانی بەسەردا دەخوێندنەوە، بانگەوازی دەکردن بۆ ئیمانهێنان، وەڵێ کەس بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەدەهات.

ئیبنو سەعد لەکتێبی «طبقات»ەکەیدا دەڵێ: «پێغەمبەری خودا هەموو ساڵێ وەرزی حەجی بەهەل دەزانیو لەو وەرزەدا بەشەوو بەڕۆژ لە هەوڵو تێکۆشاندا دەبوو، دەچووە سەر رێگای حاجیان، دەچووە ناو خێمەو مەنزڵو شوێنی کۆبوونەوەیان، لەبازاڕی «عوکاظ»و لە «مجنة» و «ذی المجاز»دا پەیوەندی پێوە دەکردنو بانگی دەکردن بۆ

ئیمانهێنان و داوای لێ دەکردن یارمەتی بدەن و پشتگیریی بکەن و نەهێڵن بانگەوازی لێ قەدەغە بکرێ و ئەزیەت بدرێ، بۆئەوەی بتوانێ پەیامی خودا بڵاوبکاتەوە و خەڵکی ئیمانی پێ بهێنن، پێی دەفەرموون ئیمانم پێ بهێنن و یارمەتیم بدەن بەهەشتتان بۆ مسۆگەرە، بەڵام کەس وەڵامی نەدەدایەوە و کەسی دەست نەدەکەوت بەڵێنی یارمەتیدانی پێبدا. دەچووە ناو جەماوەرو بەشداربوانی وەرزی حەجەوە، پەیوەندی بەهۆزو خێڵەکانەوە دەکردو دەیفەرموو: {یاأيُّها النَّاسَ قُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ تفلحـوا} ئەی خەڵکینە بڵێن: هیچ خودایەك نییە جگە لە «الله» شیاوی پەرستن بێ و لەناخەوە بڕوا بە تاك و تەنهایی خودا بکەن سەرفرازی دونیا و قیامەت دەبن. {و تملكوا بها العرب وتـذلَ لكـم العجـم} ئێوە بەهۆی ئیمانهێنان و گوتنی «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ» دەبنە فەرمانڕەوای عەرەب و هەموو گەلانی ناعەرەب ملکەچی ئێوە دەبن. {واذا آمنتم كنتم ملوكاً في الجنة} ئەگەر ئیمان بێنن دەبنە پاشا لەبەهەشتدا. ئەبو لەهەب لەدواوەی هەڵی دەدایە و دەیگوت: خەڵکینە بڕوای پێ مەکەن عەقڵی تێکچووە و درۆزنە. ئیتر ئامادەبوان و گوێگران بە ناشرینترین شێوە قسەکانی پێغەمبەریان ڕەت دەکردەوە و ئەزیەتیان دەدا[١].

ئیبنو ئیسحاق لە «الزهري»یەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای خێڵی بەنی عامیری کوڕی صەعصەعە، بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان و خۆی پێ ناساندن، «پیاوێکیان کەناوی «بیحرة بن فراس» بوو وتی: وەڵڵاهی ئەگەر پشتگیری ئەم کوڕەی قوڕەیش بکەم هەموو عەرەبی پێ قوت دەدەم! یان رویکردە پێغەمبەرو پێی گوت: دەڵێی چی ئێمە پشتگیریت بکەین لەسەر بڵاوکردنەوەی پەیامەکەت و

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد ج ١/٢٠٠ – ٢٠١ وروى ابن اسحاق نحوه انظر سيرة ابن هشام ٤٢٣/١.

بەڵێن و پەیمانت لەگەڵدا ببەستین، پاشان ئەگەر خودا سەری خستی بەسەر نەیارەکانتدا، ئایا دەسەڵات و فەرمانڕەوایی دوای تۆ بۆ ئێمە دەبێ؟ فەرمووی: کاروبار بۆ خودایە، ویستی لەسەر کێ بوو دەیدا بەئەو.

ئەمجار «بیحرة» بە پێغەمبەری گوت: ئایا ئێمە خۆمان بکەین بە پارێزەری تۆو گەردنی خۆمان بخەینە بەر شمشێری عەرەب لەبەرخاتری تۆ، ئەمجار کەخودا سەریخستین ئێمە نەبینە فەرمانڕەواو بۆ کەسانی تربێ؟ دەبڕۆ ئێمە پێویستمان بەم پەیامەی تۆ نیە«١».

لەساڵی یانزەهەمی پێغەمبەرێتیداو لەوەرزی حەجدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەکوو عادەتی خۆی هەوڵ و تێکۆشانی خۆی زیاتر چڕو پڕ کردەوەو پەیوەندی کرد بەو شاندانەی دەهاتن بۆ حەج. جا لەکاتێکدا تەشریفی لای «العقبة» بوو «شوێنێکە لەنێوانی «منی»و مەککەداو حاجیان لەوێ رەجمی شەیتان دەکەن» لەوێ تووشی کۆمەڵێك پیاوی هۆزی خەزرەج بوو«٢» خودا ویستی خێرو فەڕیان تووش ببێ. پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کردن، ئێوە کێن و لەچ هۆزو خێڵێکن؟ وتیان: چەند کەسێکین لەهۆزی «ألخزرج».

فەرمووی: ئێوە لە هاوپەیمانەکانی جولەکەن؟

وتیان: بەڵێ، فەرمووی: بۆ دانانیشن هەندێ قسەتان لەگەڵدا بکەم؟ وتیان باشە. هەموویان لەنزیك پێغەمبەر ﷺ دانیشتن و بانگی کردن بۆ خودا پەرستی و خودا بەیەکناسین پێناسەی ئایینی ئیسلامی بۆ کردن، هەندێ قورئانی بەسەردا خوێندن. ئەوەی کەوا رێخۆشکەرە بوو بۆیان

---

١ - سیرة ابن هشام ٤٢٥/١ وتاریخ الطبری ٢٥٠/٢.

٢ - شەش کەس بوون ئەسعەدی کوڕی زرارة – عەوفی کوڕی الحارث – رافیعی کوڕی مالیك – قەحطەبەی کوڕی عامر – عوقبەی کوڕی عامر – جابیری کوڕی عەبدوڵلا.

بۆئەوەی دڵیان بکرێتەوە بۆ ئیمانهێنان، ئەوەیە: ئەم هۆزی خەزرەجە جیرانی جولەکان بوون لەناو شاری مەدینەدا، زۆرجار گوێیان لێ بوو بوو جولەکەکان باسی هاتنی پێغەمبەرێکیان دەکرد کەنزیکە رەوانە بکرێ. هەروا زۆرجار کە ناخۆشیو کێشەو هەرا دەکەوتە نێوان ئەمانو جولەکەکان، جولەکەکان پێیان دەگوتن: بەم زووانە پێغەمبەرێك رەوانە دەکرێو رۆژگاری رەوانەکردنی سەری لەسوێ ناوە. هەر لەگەڵ رەوانەکرا خێرا ئێمە شوێنی دەکەوینو یەکسەر ئیمانی پێ دەهێنین، ئەمجار لەگەڵ ئەودا دەکەوینە وێزەتان لەناوتان دەبەینو وەکوو گەلی عادو ئیرەم قەلاچۆتان دەکەین.

جا کە پێغەمبەر ﷺ کەوتە قسەکردن لەگەڵ خەزرەجیەکانو بانگی کردن بۆ ئیمانهێنان، هەندێکیان بەهەندێکیانیان گوت: وەڵلاهی هەبێو نەبێ ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان هەڕەشەیان پێ لێ دەکردین، خزمینە بائەو جولەکانە پێشمان نەکەون، ئێمە دەست پێشخەری خۆمان بکەین.

ئیتر هەموویان تێکڕا موسوڵمان بوونو ئەمجار وتیان: بەخودا خزمەکانمان: «ئەوسو خەزرەج» بەجێ هێشتووە، هیچ کۆمەڵێك نیە بە ئەندازەی ئەوان دژایەتیو ناکۆکی لەناویاندا بێ. هێوامان وایە خودا بە سۆنگەی تۆوە تەباییو برایەتی راستەقینە بخاتە ناویانەوە. ئێمە ئەگەر چوینەوە بۆ مەدینە دەچینە لایانو ئەم ئایینەیان بۆ روون دەکەینەوەو بانگیان دەکەین بۆ ئیمانهێنان، سا بەڵکوو خودا بکا بەدەنگمانەوە بێن، خۆئەگەر بێتو خودا لەسەر دەستی تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! ئاشتیان بکاتەوەو یەکیان بخاتەوە، دڵنینابە کەس لەتۆ بەدەسەلاتتر نابێ.

ئەمجار هەڵسان رۆییشتن، بەڵێنیان بە پێغەمبەردا کەساڵی داهاتوو بێنەوە لایو پەیوەندی پێوە بکەنەوە.

# پەیمانی یەکەمی عەقەبە

لەدوای گەڕانەوەی وەفدی خەزرەجییەکان بۆ شاری مەدینە ئایینی ئیسلام لەوێدا بڵاوبۆوە، کە ساڵ تێوەر سوڕایەوەو کاتی حەجکردن هاتەوە پێشەوە، دوانزە کەس لە موسوڵمانەکان بەناوی حەجکردنەوە هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە «العقبە»ی یەکەمدا چاویان بە پێغەمبەر ﷺ کەوت، پەیمانیان لەگەل بەستو بەیعەتیان پێ کرد.

بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد لەسەر ئەو شێوەی کە لەگەڵ ئافرەتان بەیعەتی دەدانێ، واتە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر شەڕو جیهاد بەیعەتی لەگەڵ نەکردن، پەیمانیان لەگەل بەستو بەیعەتیان پێ کرد، منداڵ زیندە بەچاڵ نەکەن. لەهەموو کارێکی چاکە فەرمانبەرداربن.

بەیعەت وەرگرتنی پێغەمبەر لە ئافرەتان ڕۆژی دووەمی فەتحی مەککە بوو لەسەر کێوی صەفا دوای تەواوبوونی بەیعەتی پیاوان.

لەو پیاوانەی لە عەقەبەی یەکەم بەیعەتیان بە پێغەمبەردا «أسعد»ی کوڕی «زرارة»و «رافع»ی کوڕی «مالك»و «عبادة»ی کوڕی «الصامت»و «أبو الهيثم»ی کوڕی «التيهان» بوون.

عوبادەی کوڕی صامت بۆ خۆی هەواڵی ئەم بەیعەتکردنەی گێڕاوەتەوە، دەڵێ: ئێمە دوانزە پیاو بووین، پێغەمبەر ﷺ پێی گوتین: {تَعَالَوْا بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا ، وَلاَ تَسْرِقُوا ، وَلاَ تَزْنُوا ، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ ، وَلاَ تَأْتُونَ بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ ، وَلاَ تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ لَهُ كَفَّارَةٌ ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ ، إِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ ، وَإِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ}.

جا عوبادەی کوڕی «الصامت» دەڵێ: ئیتر ئێمەیش لەسەر ئەو خاڵانە بەیعەتمان بە پێغەمبەر دا.

جا کەوەفدەکە ویستیان بگەڕێنەوە، پێغەمبەر ﷺ موصعەبی کوڕی عومەیری لەگەڵدا ناردن و فەرمانی پێکرد: کە قورئانیان بۆ بخوێنێ فێریان بکا، ئایینی ئیسلامیان بۆشی بکاتەوە، ئایینیان تێبگەیەنێ. ئیتر لەوەدوا بە موصعەبیان دەگوت: قورئان خوێنی مەدینە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئایا بینیت چۆن گۆڕانکاری لەو ئازارو ئەشکەنجەیەی بەرەو روی پێغەمبەر دەبوو لە ساڵانی رابردودا، چۆن وردە وردە ئەو گۆڕانکارییە سەری هەڵدا؟!

صەبرو خۆڕاگری بەری گرت، تێکۆشان و هەوڵدان هاتە بەرگرتن، درەختی بانگەوازی قەدی ئەستور بوو رەگی داکوتان و بە پێوە وەستاو بەروبومی باشی دا.

بەڵام بائێمە جارێکی تر ئاوڕبدەینەوە، پێش ئەوەی باسی بەروبوم و مژدە بکەین بابڕوانین بۆ سروشت و شێوەی صەبری گەورەی پێغەمبەرێتی لە بەرامبەر ئەو هەموو ئازارو ناڕەحەتیەی دەهاتنە رێی.

بێگومان ئێمە بینیمان پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی خۆی کورت هەڵنەهێنا بوو لەسەر نەتەوەی قورەیش و دانیشتوانی مەککە، ئەوانەی هەرچی توانا و دەسەلاتیان هەبوو خستیانە گەڕ بۆ ئەزیەتدانی پێغەمبەر بەهەموو شێوازو بە ئەوپەڕی توندو تیژی بەڵکوو پەیوەندی دەکرد بەهەموو ئەو هۆزو شاندانەی لەوەرزی حەجدا رویان دەکردە مەککە، پەیوەندی پێوە دەکردن و خۆی پێ دەناساندن و بانگی دەکردن بۆ

ئیمانهێنان و یەکتاپەرستی. بەناو ئەو هۆزو خێڵانەدا دەهاتوو دەچوو بانگەوازی دەکردن، بەڵام کەس نەبوو بەپیر بانگەوازییەکەوە بێ و ئیمانی پێ بێنێ.

ئیمامی ئەحمەدو خاوەنانی کتێبەکانی سونەن و حاکیم ریوایەتیان کردووە، دەڵێن: پێغەمبەری خودا لەوەرزی حەجدا خۆی بەخەڵکی دەناساندو بانگەوازی خۆی ئاراستە دەکردن و دەیفەرموو: ئایا پیاوێک هەیە پەیامی من بەرێ بۆلای گەل و هۆزەکەی، کەسێك هەیە داڵدەم بداو بمبا بۆناو نەتەوەکەی تا پەیامی خۆمیان پێ رابگەیەنم، ئەوە قورەیش مەنعیان کردووم لەوەی پەیامی خودایان پێ بگەیەنم.

یانزە ساڵی رەبەق پێغەمبەر ﷺ ژیانی پڕ ئێش و ئازارو ناڕەحەتی و دەربەدەری و بێ هەدادان، هەموو کات و ساتێك قورەیش بۆی لەکەلێن دان و هەوڵی لەناوبردنی دەدەن و هەمیشە دژایەتی و ئازاردانی بێ برانەوەو پسانەوە، بەجۆرەها عەزاب و میحنەتی بەسەردا دەڕێژن، ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەو دژایەتیکردنە جۆراو جۆرو بەردەوامە تۆزقاڵێك لە عەزیمەت و ورەی پۆڵایینی کەم نەکردەوە هەوڵ و کۆششی هێزو توانای لاواز نەبوو.

یانزە ساڵی رەبەق پێغەمبەر عەزابی دەنگ دابڕین و گەمارۆو ناڕەحەتی دەچێژێ لەناو گەل و هۆزو خزم و جیران و هۆزو قەبیلەی دەوروبەردا بەبێ ئەوەی ناهومێدی و رەشبینی و ضەجەری لێ دیاری بدا، هیچ کامێ لەناڕەحەتی و ئازاری نێوخۆیی و دەرو دراوسێ کارناکاتە سەر ئیمان و باوەڕی و پەیوەندی بەندایەتی و ئونسی بەخودای خۆیەوە.

یانزە ساڵ تێکۆشان و جیهادو صەبرو خۆڕاگری بێ پسانەوەو بێ حەسانەوە لەڕێبازی خوداداو بەمەبەستی بەدەستهێنانی رەزامەندی

پەروەردگاری و بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانی و گەیاندنی پەیامی خۆی بەوپەڕی سوور بوون لەسەر مەبدەئی خۆی.

نرخی ئەم ماندو بوون و ئازارو ئەشکەنجە بەردەوامە، بڵاوبونەوەی رۆژی پرشنگداری ئیسلام بەناو خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلامی بەچڕی و پڕی، تا سەرەنجام هێزی زەبەللاحی رومانی تێك روخاندو ئیمپراتۆریەتی فارسی زلهێزی تەفرو توونا کردو، حەضارەت و قەوارەو رژێمی دەوروبەری هەموو توانەوە.

نرخی جیهادو صەبرو ماندوبوون و روبەروو بوونەوەی بەڵاو کارەسات و دەردی سەری و ناخۆشی سەرکەوتن و بەدەستهێنانی سەروەریی بوو. لای پەروەردگار ئاسان و ئاسایی بوو کەبەبێ ماندو بوون و ناڕەحەتی پایەی کۆمەڵگای ئیسلامی دابکوتێ و دەسەڵاتی موسوڵمانان پایەدار بکا. بەڵام ئەوە سوننەت و داب و نەریتی پەروەردگارە لە بوونەوەرداو دەرحەق بەبەندەکانی. ویستی خودا وابوو گیانی «تعبّد»یان تێدا بێتەدی و بەویستی خۆیان لەپێناو ئایینی خودادا ئازارو ناڕەحەتی بکێشن. وەکوو چۆن بەناچاری صیفەتی بەندایەتییان تێدا بەرجەستە بووە، چونکە ئەوان بیانەوێ و نەیانەوێ عەبدی خودان و چ ئیختیارێکیان لەوەدا نییە.

هەڵبەتە صیفەتی «تعبّد» بەبێ ئەرك و ماندو بوون نایەتەجێ. کەسێك ئازارو ئەشکەنجەو ناڕەحەتی لەپێناو خودادا نەکێشێ مانای «تعبّد»ی تێدا نایەدی. بەبێ عەزاب و گیانبەخشین راستگۆو دووڕو لێك جیانابنەوە، هیچ عەدالەت و دادپەروەری نیە مرۆڤ بەبێ ماندو بوون دەستکەوتی دەست کەوێ، بەپێی ئەم یاسا تۆکمەو نەگۆڕە، پەروەردگار دوو ئەرکی سەرەکی خستۆتە ئەستۆی ئادەمیزاد:

١- دامەزراندنی کۆمەڵگای ئیسلامی و پەیڕەوکردنی شەریعەتی خودا تێیدا.

٢- هەنگاونان بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەو چەشتنی هەموو ئازارو ناڕەحەتی و ماندوبونێك لەو پێناوەدا.

ئێستا با وردبینەوە لەو بەروبومو نەتیجەو ئاکامەی پاش پانزە ساڵ ماندوبوونو ناڕەحەتی لە بانگەوازی حەزرەتی موحەممەد هاتنەدی، سروشتو تەبیعەتی ئەو بەروبوومەو چۆنیەتی گەشەکردنو بەرفراوانبوونیان.

یەکەم: ئەو بەروبوومە چاوەڕوانکراوە لە دەرەوەی مەککەو هۆزی قوڕەیش هاتەدیو دوور لەقەومو هۆزی پێغەمبەر بەرجەستە بوو هەرچەندە پێغەمبەر خۆی لەناو مەککەداو لەنێو هۆزی قوڕەیش زۆر هەوڵو تێکۆشانو ماندوبوونی چەشتو هەمیشە لەناویانداو هەردەم لەگەڵیان خەریك بوو، کەچی بەروبومو بەرهەمی لەدەرەوەی ئەو شارەو ئەو هۆزە سەری دەرهێنا، بۆچی و لەبەرچی؟

ئێمە لەسەرەتای ئەم پەڕاوەدا وتمان حیکمەتی خودا واداخوازبوو کە بانگەوازی ئیسلامی بەرێگایەکدا بڕواو بەشێوەیەك بڕوا، مەجال نەدا ئەو کەسەی وردبێتەوە لە سروشتو سەرچاوەی، گومانی بۆ دروست بێ، دەبێ وا هەنگاو بنێ هەموو گومانێك بڕەوێنێتەوە، تا ئیمانهێنان پێی ئاسان بێ. هیچ پشێویو تێکەڵاویو چەواشەیی نەکەوێتە نێوان ئەمو نێوان بانگەوازییەکانی تر، بۆیە پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بوو، نەیدەزانی بخوێنێتەوە نەیدەتوانی بنووسێ.

هەربۆیەش لەناو گەلو هۆزێکی نەخوێندەواردا کرا بە پێغەمبەرو بۆسەریان رەوانەکرا. لەناو گەلو هۆزێکدا سەری هەڵدا تروسکایی حەضارەتیان نەبینیوەو نەیانزانیوە شارەستانی و رۆشنبیری چییە.

بۆیە حیکمەتی خودا واداخواز بوو کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکاتە نموونەی رەوشتی بەرزو پیاوی دەست پاكو رابەری رەوشتی ئەمانەتو نەزاهەت هەر ئەو حیکمەتە یەزدانییە داخوازی ئەوە بوو کە دەستە سەرەتاییەکانی هاوەڵانی لەدەرەوەی نەتەوەکەیو لەدەرەوەی بیئەکەی بێ، بۆئەوەی گومانکارێك واگومان نەبا: کە بانگەوازی حەزرەتی موحەممەد لە حەقیقەتو راستیدا بانگەوازییەکی نەتەوەییو هۆزایەتییە. حەزو ئارەزۆی گەلەکەیو بارودۆخی بیئەو دەوروبەری ئەم تەونەی چنیوەو هێناویەتە کایەوە.

ئەمەلە واقیعدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەن: کەبۆ سەرنجدەرو بیردۆز کەشفی ئەوەدەکا: کە دەستێکی خودایی پارێزگاری لەژیانی بانگەوازی پێغەمبەرایەتیو بارودۆخی کردووەو لەهەموو رویەکەوەو بەهەموو شێوەیەك پاراستویەتیو لەهەموو لایەکەوە بووەتە پەرژینی تۆکمە بۆی، تاوەکوو لەهیچ لایەکەوە تانەو تەشەردەر کەلەبەرێکی دەست نەکەوێ زەبری خۆی لێ بوەشێنێ. یان گومانبەرو هەموو ئەوانەی سەرگەرمی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامین نەتوانن گۆمانێکی بخەنە سەر. ئەم حەقیقەتو واقیعە هێندە ئاشکراو رونە، یەکێك لە لێکۆڵەرەوە بێگانەکان دانی پێدا ناوەو نەیتوانیوە بیشارێتەوەو ژێرلێوی بخا. ئەوەتا لەکتێبی «حاضر العالم الاسلامي»دا: کە لە «دیتە» نەقڵ دەکا هاتووە دەڵێ:

بێگومان ئەو خۆرهەڵاتناسانەی هەوڵیان داوە رەخنە ئاراستەی سیرەی پێغەمبەر بکەن ﷺ بەم شێوازە ئەوروپاییە، سێ چارەکە سەدە لەبێنەو بەرەدا بوون، بەخەیاڵی خۆیان لێکۆڵینەوەو وردبینیو پێداچونەوە دەکەنو سیرەی پێغەمبەر لەکەوو بێژنگ دەدەن، بەمەبەستی ئەوەی بتوانن ئەو زانیارییەی جەماوەری زانایانی

موسوڵمان کۆڕایان لەسەر هەیە بیروخێنن! دەی دەبوو دوای ئەم هەموو هەوڵ و تێکۆشان و گردو کۆیە، دوای ئەو حەمکە لێکۆڵینەوەو بەراورد کردن و وردبینییە بەرفراوانانە بگەیشتنایە مەبەستی خۆیان و بیانتوانیایە ئەو راوبۆچوونە چەسپاوانەی زانایانی ئیسلام بن هەڵۆل بکەن و سەرەنجام هاڕەیان پێ بکەن، ئەو ریوایاتە مەشهورو بەربڵاوو بەناوبانگانەی سیرە لەبێخ دەربێنن و بیانپوچێننەوەو نرخی زانستیان لێ دابڕنن. دەی ئایا ئەمانەیان بۆکرا؟ توانییان لەم بوارەدا شتێك بەدەست بهێنن؟ لەوەلامدا بەدڵنیاییەوە دەڵێین: نەخەیر، تەنانەت نەیانتوانی کەمترین زانیاری تازە لەو بوارەدا بەدەست بێنن، هیچیان بۆ نەکراو رەنج بەخەسار بوون. بەڵکوو ئەگەر ئێمە بەوردی سەرنج بدەینە ئەو راوبۆچونە تازانەی ئەو خۆرهەڵاتناسە فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و بەلجیکی و هۆڵندیانە خستویاننە روو بەخەیاڵی خۆیان کاری زانستییان ئەنجامداوە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان کردووە دەڵێم: ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە راوبۆچونەکانیان، جگە لەتێکەڵی و پێکەڵی و پەلەکوتەی کوێرانەو رای نادروست و بۆچوونی نازانستیانە بەولاوە هیچی ترمان دەست ناکەوێ! بۆیە تۆ دەبینی هەریەکێ لەوان شتێك دەڵێ و هەوڵی چەسپاندنی راوبۆچونێك دەدا کە یەکێکی تریان هەڵی وەشاندووە«[١]».

**دووەم**: بەتێفکرین لەوەی گێڕامانەوە دەربارەی چۆنیەتی دەست پێکردنی موسوڵمان بوونی ئەنصارەکانی مەدینە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پەروەردگار ژیانی مەدینەو بیئەکەی سازاندبوو بۆ قبوڵکردنی دەعوەی ئیسلامی و بەپیروە چوونی بانگەوازییەکەی. وە لەناخی دانیشتوانی مەدینەدا ئامادە باشییەکی دەروونی هەبوو بۆ قبوڵکردنی ئەم ئایینە. دەی بابزانین مەظاهیرو دیاردەی ئەم ئامادە

---

١ - حاضر العالم الاسلامی ٣٣/١.

باشییه دەرونییه چی بوو؟ هۆکارەکانی ئەم ئامادە باشییه لەکوێوه سەرچاوەیان گرتبوو؟

بێگومان دانیشتوانی مەدینه تێکەڵ بوون لەدانیشتوانه رەسەنەکانی: کە عەرەبه بتپەرستەکان بوون. لەگەڵ ئەو دانیشتووه جولەکانەی لەدەوروبەری نیوه دورگەی عەرەبییەوه کۆچیان کردبوو بۆئەوێ. عەرەبه موشریکەکان کە دانیشتوی ئەصڵی و رەسەن بوون بەسەر دوو هۆزی گەورەدا دابەش بوو بوون یەکیان هۆزی «الأوس» ئەوی تریان هۆزی «ألخزرج». جولەکەکانیش سێ هۆز بوون «بنو قريظة، بنو نضير، بنو قينقاع».

بێگومان جولەکەکان «وەکوو عادەتی هەمیشەییان» زۆریان فرتو فێڵ کردبوو، زۆریان فیتنەیی و ئەمبەرو ئەوبەریان کردبوو لەنێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجدا توانیبوویان بوغزو کینەو دوژمنایەتیان لەناودا بچێنن، لێکیان کردبوون بەدوژمنی بابە کوشتەی یەکتری. زۆرجار شەڕی خوێناوی لەنێوانیاندا بەرپا دەبوو چنگیان دەخستە خوێنی یەکتری و یەکتریان بەفتارە دەبرد. موحەممەدی کوڕی عەبدولوهاب لەکتێبی خۆیدا «مختصر سيره الرسول» دەڵێ: شەڕی خوێناوی نێوان دوو هۆزی ئەوس و خەزرەج سەدو بیست ساڵی درێژەی کێشا«١».

لەمیانەی ئەم دوژمنایەتیه درێژخایەنەدا هەریەك لەهۆزی ئەوس و هۆزی خەزرەج پەیمان و سوێند خۆرییان لەگەڵ هۆزێکی جولەکە بەستبوو. هۆزی ئەوس لەگەڵ بەنو قورەیظەو هۆزی خەزرەج لەگەل بەنو نەضیرو بەنو قەینوقاع پەیمانیان بەستبوو.

---

١ - مختصر سيرة الرسول ص١٢٤.

دوایین شەڕو پێکدادانی خوێناوی نێوان ئەوس و خەزرەج جەنگی «بعاث» بوو: کە بەچەند ساڵێك پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە رویدا. ئەم شەڕە شەڕێکی خویناوی بوو، زوربەی سەرکردەکانی هەردولای تێدا کوژرابوو.

لەم سەروبەندانەدا، هەر کە گرژیو ناخۆشییەك بکەوتایە نێوان عەرەبەکان و جولەکەکانەوە، جولەکەکان هەڕەشەیان لە عەرەبەکان دەکرد بەوە کە پێغەمبەرێك نزیکە رەوانە بکرێ، دەیانگوت: هەر لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە پەیدابوو ئێمە یەکسەر ئیمانی پێ دەهێنین و دەبینە شوێنکەوتووی ئەو، جا ئەوکاتە بەهەموو هێزو توانامانەوە دەکەوینە وێزەتان و وەکوو گەلی عادو ئیرەم قەلاچۆتان دەکەین.

ئەم بارودۆخەی ناو مەدینە وای لەدانیشتوانەکەی کرد چاوەڕوانی ئەو ئایینەبن کە جولەکەکان باسیان لێوە دەکرد. هیوای زۆریان لەسەر هەڵچنیبو، ئومێدیان زۆربوو کە بەسایەی ئەو ئایینەوە ریزەکانیان یەکبگرێتەوەو یەکیەتیو تەبایەی بکەوێتە ناویانەوە، شەڕی ماڵ وێرانکەری برا کوژییان کۆتایی پێ بێو هۆکاری دوو بەرەکیو دوژمنایەتی نێوانیان بنبڕببێ چیدی خوێنی یەکتر نەڕێژن.

ئەم رێ خۆشکردنەو ئەم ئامادە باشییە نەفسییە، خودا بۆ پێغەمبەری خۆی رەخساندی «وەکوو ئیبنولقەیم دەڵێ» بۆئەوەی رێگا بکاتەوە بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە، ئەوشارەی حیکمەتی خودا واداخواز بوو ببێتە پایتەخت و پێگەی لێوە بڵاوبونەوەی ئایینی ئیسلام بەهەموو کون و قوژبنێکی زەویدا.

سێیەم: لە بەیعەی عەقەبەی یەکەمدا کۆمەڵێك لەپیاو ماقوڵانی دانیشتوی مەدینە ئیمانیان هێنا، وەکوو لەوەپێش ئاماژەی پێکرا. دەی بزانین موسوڵمان بوونەکەیان چۆن بوو؟ ئەو ئەرکانە چی بوون و چۆن بوون کە ئایین خستیە ئەستۆیان؟!.

بێگومان ئێمە زانیمان: کە موسوڵمان بوونی ئەوانە، تەنها وتنی وشەی شایەتومان نەبوو بەس! بەڵکوو ئیسلامبون و ئیمان هێنانەکەیان جەزم و بڕوای دڵ و دان پیانانی زوبان بوو. ئەمجار پابەندبوونیان بوو بەو بەیعەتەی دابوویانە پێغەمبەر ﷺ کە سلووکیان بەرەنگی ئیسلامی رەنگ بکەن، بەم رەنگە پابەندی نیظام و ئەخلاق و بنەماکانی ئیسلام بن بەگشتی. بەڵێنی لێ وەرگرتن: کە هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن. کەس نەکەن بە هاوشان و هاوتای، دزی نەکەن، زینا نەکەن، منداڵی خۆیان نەکوژن، بوختان بۆیەکتر هەڵنەبەستن. سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر نەکەن لەهیچ شتێك دا هەرچی فەرمانیان پێ دەکا لەچاکە خێرا بێ راوەستان تەنفیذی بکەن.

ئەمە گرنگترین نیشانەو دیاردەی کۆمەڵگەی ئیسلامییە کە خودا پێغەمبەری ناردووە بۆ دروستکردنی و پێکهێنانی. ئەرك و موهیمەی پێغەمبەر ئەوەنەبوو وشەی شایەتومان فێری خەڵك بکا و ئیتر وازیان لێ بێنێ بەزوبان وشەکە بڵێنەوەو بەکردەوەش لەسەر رەفتاری خوارو نالەباری خۆیان بمێننەوەو بەغیی و فەسادی رابوردویان واز لێ نەهێنن.

بەڵێ راستە مرۆڤ بەوتنی دوو کەلیمەی شایەتومان ناوی موسوڵمانی بەسەردا دەبڕێت، بەمەرجێ شایەتومانەکەی بەڕاستی بێ و حەڵاڵ بە حەڵاڵ بزانێ و حەرام بە حەرام بزانێ و ئەرکە ئیسلامیەکان و فەرزو واجباتەکان جێبەجێ بکا، چونکە بڕوابونی دڵ بەتاك و تەنهای خوداو پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەمەد ﷺ کلیل و هۆکارە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و مرۆڤایەتی و چەسپاندنی یاساو نیظام و مەبادیئەکانی. بڕیاردانی حاکمیەت و فەرمانڕەوایی لەهەموو کاروبارێکدا بۆ پەروەردگار. لە هەرشوێنێك بڕوا بەتاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەمەد ﷺ بەرجەستە بوو، دەبێ یەکسەر

بڕوا بە حاکمیەتی خوداو پێویستی شوێنکەوتنی شەریعەتو دەستوری بەشوێندا بێ.

لەهەموو شتێك سەیرو سەمەرەتر ئەوەیە: کەهەندێ کەس لەوانەی یاساو قانوونی وەضعی «دانراوی مرۆڤ» پێوەندیان کردووە، نایانەوێ بەئاشکرا یاسای ئیسلام رەتبکەنەوەو پاشکوێی بخەن، هەوڵی ئەوە دەدەن کە لەگەڵ بەدیهێنەری بونەوەر دانوسان بکەن، واتە هەڵسو کەوتەکەیان وادەگەیەنێ وەکوو بڵێی: صوڵحو دانوسان لەگەڵ خاوەنو بەدیهێنەری بونەوەر دەکەن. چۆنیەتی دانوسان لەگەل خودا لەلایەن ئەو کەسانەوە لەوەدا خۆدەبینێتەوە: کەدێن مەظاهیرو دیاردەی کۆمەڵگە لەنێوان خۆیانو ئیسلام دابەش دەکەن، دەڵێن: مزگەوتو جومعەو جەماعەتو باقی مەظاهیرە عیبادیەکان بۆ ئیسلامو با بەگوێرەی یاساو دەقەکانی ئەنجام بدرێن: ئەوشتانەی پەیوەندی بە یاساو قانونو تەشریعاتو ئەحکامو ئەخلاقەوە هەیە بۆ ئەوان بێ چۆنی دەگۆڕنو چاکسازی تێدا دەکەنو تاووتوێی دەکەن بە ویستی خۆیان بابیکەنو ئیسلام چ رۆڵێکی نەبێ لەو بوارانەداو خۆی تێهەڵنەقورتێنێ!!

خۆ ئەگەر طاغوتو ملهورو خۆ بەخودا زانەکان، ئەوانەی پێغەمبەرانیان بۆسەر نێردراونو بەرویاندا هەڵتەقیونەوە بەدرۆیان خستونەوە، ئەم حەلە سەیرەیان بەزەیندا بهاتایە لەبەرامبەر بانگەوازی کردنیان بۆ موسوڵمان بوون، ئەوە بێ سێو دوو دەچوونە ناو ئایینەوەو ملکەچی دەبوون، چونکە مادام ئایین داوایان لێ ناکا، لە حاکمیەتو فەرمانڕەوایی خۆیان دابەزنو واز لەقانونو یاسای دەسکردی خۆیان بێنن بەکەیفی خۆیان کۆمەڵگەو وڵات بەڕێوە بەرنو گۆڕانکاری تێدابکەن، ئیتر لەپای ئەمەدا بەخیلو رژد نەدەبوون، کەچەند

وشـەیەکی عیبـادەت ئـامێزو طقـوس ئـایینی ئـەنجام بـدەن. وەلێ ئەوانـە ئەوەیان دەزانی: کە ئـەم ئایینـە یەکـەم شتێك کـەداوایان لێ دەکا ئەوەیـە دەبێ پابەندی نیظامو حوکمی ئایینی تازەبێ: کە تەشریعو حوکم تێیدا تەنها هی خودایەو کەس شیاوی ئەوە نییە قانونو یاسا دابنـێ. بۆیە ئەوانە ملیان نەداو روبەڕوی پێغەمبەران بوونەوەو بەلایانەوە زەحمـەتو ئەستەم بوو: کە ئەو ئایینـە قبوڵ بکـەنو ئیعلانـی ملکەچی خۆیـان بۆ دەعوەو پەیامی رابگەیەنن.

لەڕوانگـەی رونکردنـەوەی ئـەم حەقیقەتـەو وریاکردنـەوە لـەوەی وا لەئیـسلام حـاڵی بـبن: کـە گـوتنی چـەند وشـەیەكو ئەنجامـدانی هەنـدێ عیباداتو طقوسی ئایینو بەس!

لەڕوانگـەی ئـەم حەقیقەتـەوە خـودا دەفـەرموێ: {أَلَـمْ تَـرَ إِلَـى الَّـذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَـاكَمُواْ إِلَـى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيـدُ الـشَّيْطَانُ أَن يُـضِلَّهُمْ ضَـلاَلاً بَعِيـدًا — النساء/٦٠}.

چـوارەم: هـیچ گومـان لـەوەدا نییـە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەربێ) بەرپرسیار بوو بەهەڵگرتنی ئەرکی قورسـی بانگـەوازی بۆڵای ئـایینی خـودا. چـونکە ئـەو پێغەمبـەرو رەوانـەکراوە بۆسـەر هـەموو ئادەمیزاد کەوابوو گەیاندنی پەیامی خودا بە ئادەمیزاد بە پلەی یەکەم لەئەستۆی ئەودا بووە.

بـەڵام چـی لەسەرشـانی ئەوانـە بـوو: کـە دەهاتنـە نـاو ئایینـەوەو پەیوەندییان بە قورسایی ئەم ئایینەوە چییە؟!

بێگومان تۆ وەڵامـی ئـەم پرسـیارەت دەسـت دەکـەوێ لەرەوانـەکردنی موصعەبی کوڕی عومەیر لەلایەن پێغەمبەرەوە لەگەڵ ئەو دوانزە کەسەی

کە ئیمانیان هێنابوو بۆ مەدینە. بۆئەوەی بانگەوازی دانیشتوانی ئەوشارەبکا بۆ ئیمانهێنان هاتنیان بۆژێر چەتری ئیسلام، هەروا هەوڵبدا قورئانیان فێربکاو ئەحکام یاساو تەوجیهاتەکانییان بۆ روون بکاتەوەو چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژیان فێربکا.

ئەوەبوو لەسەر داوای پێغەمبەرو تەنفیذکردنی فەرمانەکەی موصعەبی کوڕی عومەیر بەوپەڕی دڵخۆشی کامەرانییەوە لەگەڵ شاندەکەی مەدینە بەڕێ کەوتو گەیشتە ئەوێو لەماڵی ئەسعەدی کوڕی «زرارة» دابەزیو بەلێبڕانێکی کەم وێنەو دڵسۆزییەوە دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەناو خەڵکی مەدینەدا. قورئانی بەسەردا دەخوێندن، ئەحکامو شەریعەتی خودای پێ رادەگەیاندن. وا رێکەوتووە پیاو بە شمشێرەوە چووە بۆ کوڕی ئامۆژگاری ئەوو بە مەبەستی کوشتنی، بەڵام کە گەیشتۆتە لای دای نیشاندوەو هەندێکی قورئان بەسەردا خوێندوەو هەندێ حوکمو یاسای ئیسلامی بۆ شیکردۆتەوە، شمشێرو حەربەی فڕێ داوەو موسوڵمان بوونی خۆی راگەیاندووە، بۆتە یەکتاپەرستو خەریکی فێربوونی قورئانو ئەحکامی ئیسلام بووە، هەتا بەشێوەیەکی بەربڵاو ئایینی ئیسلام لەناو ماڵەکانی مەدینەدا بڵاوبۆوە. لەهەموو ماڵێكو هەموو کۆڕو کۆبونەوەیەکیاندا باس هەرباسی ئیسلام بوو.

ئایا دەزانی موصعەبی کوڕی عومەیر کێیە؟

بێگومان موصعەب گەنجێکی مەککەیی بوو لەهەموو کەس زیاتر بەنازو نیعمەت پەروەردە بوو بوو، جوانترین گەنجو شۆخو شەنگترین لاوی پێگەیشتوو بوو، لەناو گەنجەکانی مەککەدا بە پەنجە ئاماژەی بۆدەکرا. کاتێك موسوڵمان بوو هەموو خۆش رابواردنێکی بەلاوەناو وازی لەهەموو لەزەتو خۆشییەك هێنا. کەوتە هەوڵو تێکۆشانو

بانگەوازی لەپێناو ئاییندا، هەموو نارەحەتیو ئازارێکی تووشی دەهات لەرێبازی خودادا بەلایەوە شتێکی ئاسایی و خۆش بوو، هەموو تاڵی و سوێرییەکی بەلاوە شیرین بوو هەتا لەغەزای ئوحوددا بەشەهیدی سەری نایەوە، ئەوکاتە جگە لە کراسێك کە لەبەریدا بوو هیچی کەی نەبوو، ویستیان بەو کفنی بکەن، کەلای سەریان پێ دادەپۆشی لای قاچی بەدەرەوە دەبوون. کە کراسەکەیان لەلای قاچییەوە دەپێچا لای سەری دەردەکەوت. ئەم حاڵەیان عەرزی پێغەمبەر کرد ﷺ دەستی کرد بەگریان بۆی بەتایبەتی کەیادی ئەو نازو نیعمەتەی کردەوە کە لەسەرەتای ژیانیدا تێیدا دەگوزەراند. پاشان فەرمووی: بەکراسەکەی لای داپۆشن و قاچەکانی بەگیای «إذخر» بشارنەوە»[١].

ئەرك و موهیمەی دەعوەی ئیسلامی تەنها لەسەرشانی پێغەمبەران نییەو کەسی تر لێی بەرپرس نەبێ، یان تەنها لەئەستۆی جێنشین و خەلیفەکانیان یان ئەو عولەمایانەی لەدوا ئەوان دێن، نەخەیر بانگەوازی بۆ ئیسلام و هەوڵدان بۆ بڵاوبوونەوەو جێگیربوونی و کارپێکردنی و پەیرەوکردنی تەنها وەقف نیە لەسەر پێغەمبەران و زانایانی ئایین و کەسی تر لێی بەرپرسیار نەبێ. بەڵکوو دەعوەی ئیسلامی بەشێکە لە حەقیقەتی ئیسلام و لێی جیانابێتەوە، هەموو موسوڵمانێك بەپێی خۆی لەهەر پلەو پایەیەکدا بێ، ئەرکی دەعوەی لەئەستۆدایەو دەبێ بە واجبی خۆی هەڵسێ. چونکە حەقیقەتی دەعوەی ئیسلامی بریتییە لە «فەرمان بەچاکەو نەیکردن لەخراپە» ئەمەش خۆی لەخۆیدا کۆکەرەوەی مانای جیهادە بەهەموو شتێکییەوە. ئەوەش دەزانین کە جیهاد فەرض و واجبێکە لە فەرضەکانی ئیسلام و ئەرکی سەرشانی هەموو

---

١ - صحیح مسلم ٤٨/٣ ء الاصابة لابن حجر ٤٠٣/٣.

موسوڵمانێکەو پاشگوێ خستنی تاوانێکە هەموو دەچێتە ئەستۆی هەموو موسوڵمانێکەوە.

ئالێرەوە دەزانین کە وشەی «رجال الدین» پیاوانی ئایینی، لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هیچ مانایەکی نیەو بەکارهێنانی هەڵەیەو لەئایینی جولەکەو مەسیحییەوە تەشەنەی کردووە بۆناومان. بەڵێ بەکارهێنانی «رجال الدین» بۆ تاقمێکی دیاریکراو لە موسوڵمانان کارێکی نابەجێیە، چونکە هەرکەسێك هاتە ناو ئایینی ئیسلامەوە ئەو بەیعەتی داوە بەخوداو بە پێغەمبەر لەسەر جیهادو تێکۆشان لەپێناو ئاییندا، جا ئەوکەسە پیاوبێ یان ئافرەت بێ، زانابێ یان نەخوێندەوار بێ، لەهەر پلەو پایەیەك دابێ، لەروانگەی ئیسلامەوە موسوڵمانان هەموویان «رجال الدین»ن خودا ماڵو گیانی لێ کڕیون بەوەی بەهەشتیان دەداتێ. واجبە لەسەریان هەموو هێزو توانای مادیو مەعنەوییان بخەنە گەڕ لەپێناو بەرقەرار بوونی ئایینی خوداو سەرخستنی شەریعەتو یاسایدا.

ئاشکرایە کە ئەمە هەمووی پەیوەندی نییە بەوەی کەوا هەندێ کەس لە موسوڵمانان زۆر شارەزای ئاینن و تێیدا قوڵبوونەوەو گەیشتوونە پلەی ئەوە دەتوانن بەحث لێکۆڵینەوە لەبوارە جیا جیاکانی ئاییندا بکەن ئەحکامی شەرعو ئایین بۆ موسوڵمانان رون بکەنەوەو لەژێر رۆشنایی دەقەکانی قورئانو حەدیثدا رێگا چارە بۆ موشکیلەو تەنگژەی ژیانیان بدۆزنەوە بە گوێرەی رۆژگارو گۆڕانی بارودۆخ شەریعەتی خودا بخەنە گەڕو لەگەڵ ژیانی موسوڵمانان بیگونجێنن.

## بەیعەی دووەمی عەقەبە

لەساڵی داهاتوودا موصعەبی کوڕی عومەیر گەڕایەوە بۆ مەککە، ژمارەیەك لە موسوڵمانە یاریدەدەرەکان «الأنصار». لەگەڵ حاجیانی تری ئەوس و خەزرەج هاتن بۆ حەج، بەڵام موسوڵمانەکان مەبەستی خۆیان بۆ حاجییە موشریکەکانی ئەوس و خەزرەج ئاشکرا نەکردبوو.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: کە گەییشتینە مەککە پێغەمبەر وادەی پێداین کە لەناوەڕاستی رۆژانی «تەشریق»دا لە عەقەبە یەکتر ببینین. جا کە لەحەج تەواو بووین، ئەو شەوەی بڕیاربوو لەگەڵ پێغەمبەر کۆببینەوە، سەر لەئێوارەکەی لەناو خێمەو خۆبەی خۆمان لەگەڵ خەڵکەکە نووستین تاسێیەکی شەو رۆیی، ئەمجار لەناو کاروان و خەڵکەکەدا خۆمان دزییەوە و بەوریاییەوە وەکوو باڵندەی قەتێ خۆمان گەیاندە شوێنی دیاریکراو لەوێ هەموومان لە شیوی لای «العقبە» کۆبوینەوە، ئێمە ژمارەمان حەفتاو سێ پیاو بوو. دوو ئافرەتیشمان لەگەڵ بوون. یەکێکیان نەسیبەی کچی کەعب و ئەوی تریان ئەسمائی کچی عەمری کوڕی عەدی بوو.

کەعب دەڵێ: ئێمە لەشیوەکەدا کۆبووینەوە چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەرمان کرد تا تەشریفی هات و عەبباسی مامیشی لەخزمەتدا بوو، قورئانی بەسەردا خوێندین ئامۆژگاری کردین، بانگی کردین بۆ خودا پەرستی و خودا بەیەکناسین و هەڵینایین بۆ پابەندبوون بە ئایینی ئیسلامەوە. پاشان فەرمووی:

{أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ تَمْنَعُونِي مِمَّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ نِسَاءَكُمْ وَأَبْنَاءَكُمْ} ئەمن بەیعەتتان لەگەڵ دەبەستم لەسەرئەوەی چۆن پارێزگاری و بەرگری لەخۆتان و ماڵ و خێزانی خۆتان دەکەن ئاوا بەرگری لەمن بکەن.

«البراء»ی کوڕی مەعرور دەستی هێناو وتی: بەڵێ سوێندم بەوکەسەی تۆی بەڕاستی کردووە بە پێغەمبەر بەرگریت لێ دەکەین وەکوو چۆن بەرگری لەخۆمان دەکەین، ئەی پێغەمبەری خودا! پەیمانمان لەگەڵ ببەستە، سوێندمان بەخودا ئێمە کوڕی جەنگو سیلاحین پشتاو پشت بەو شێوە هاتووین. «أبو الهیثم»ی کوڕی «ألتیهان» قسەکەی بە «ألبراء» بڕیو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەنێوان ئێمەو جولەکەدا بەڵێننامەیەك هەیە، ئەگەر ئەوان پچڕاندیان ئێمەش لەگەڵ تۆداین ئایا ئەگەر خودا سەری خستی بەجێمان ناهێڵیو بگەڕێیەوە بۆ خزمەکانت؟

پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی هاتیو پاشان فەرمووی: خوێن خوێن، وێرانکاری وێرانکاری، من لەئێوەمو ئێوەش لەمنن، جەنگ دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کەئێوە جەنگی لەگەڵدا دەکەن، ئاشتی دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کەئێوە لەگەڵی ئاشت دەبن.

ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) داوای هەڵبژاردنی دوانزە سەرۆکی کرد لێیان، بۆئەوەی ببنە نەقیبو چاودێر بەسەر کەسەکانیانەوە، جا کەهەڵیان بژاردن پێغەمبەر بە هەڵبژێردراوەکانی فەرموو: ئێوە بەرعودەی گەلەکەتان بونو دەبنە کەفیلیان وەکوو کەفالەتکردنی حەوارییەکانی عیسای کوڕی مەریەم، منیش کەفیلی ئومەتەکەی خۆمم. واتە من کەفیلو بەرعۆدەبووی هەموو موسوڵمانانم.

یەکەم کەس لەو پەیمان بەستنەدا دەستی خستە ناودەستی پێغەمبەرەوە «ألبراء»ی کوڕی مەعرور بوو، ئەمجار ئامادەبوان هەموویان پەیمانیان پێدا.

کەعب درێژە بەگێرانەوەکەی خۆی دەداو دەڵێ: جا کە بەیعەتمان لەگەڵ پێغەمبەر تەواوکرد، پێی فەرموویین بگەڕێنەوە بۆناو

کاروانەکەتان و عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەفلة وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی کردووە بە پێغەمبەر، ئەگەر دەفەرمووی و ڕێگەمان دەدەی سبەینێ بە شمشێرەکانمان پەلاماری ئەهلی مونا دەدەین چی خراپە ئەوەیان پێ دەکەین. پێغەمبەر فەرمووی: ئێمە هێشتا فەرمانی ئەوەمان پێ نەدراوە. ئێستا ئێوە بگەڕێنەوە بۆ ناو کاروانەکەتان.

ئێمەیش گەڕاینەوە بۆ مەنزڵگای خۆمان و ئەو شەوە تابەیانی لێی نووستین، کە ڕۆژمان لێ بۆوە شاندێکی پیاو ماقوڵ و سەرانی قوڕەیش هاتنە لامان، وتیان ئەی هۆزی خەزرەج! ئێمە هەواڵمان پێ گەییشتووە: کە ئێوە هاتوون بۆلای ئەو پیاوەی خزمی ئێمە دەتانەوێ لەژێر دەستی ئێمە دەری بکەن و پەیمان و عەهدی لەگەڵ ببەستن بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئێمەدا، سوێندمان وابێ هیچ خێڵێکی عەرەب نیە بە ئەندازەی ئێوە پێمان ناخۆش بێ دوژمنایەتی بکەوێتە ناومانەوە.

لێرەدا کۆمەڵێك لە موشریکەکانی خەزرەج کەوتنە وەڵامدانەوەی قوڕەیشییەکان و سوێندیان خوارد کە هەرگیز شتی وانەبووە و ئاگامان لەپەیمانی لەوجۆرە نیە. قوڕەیشییەکانیش پێیان باوەڕکردن، ئێمەیش لەناو خۆماندا سەیری یەکترمان دەکرد هەڵبەتە موشریکە خەزرەجییەکان ئاگایان لەوت و وێژو کۆبوونەوەکەی نێوان پێغەمبەرو موسوڵمانە خەزرەجییەکان نەبوو چونکە لەکەش و هەوایەکی زۆر نهێنیدا ئەنجام درابوو.

پاشان کە کاروباری حەج تەواوبوو حاجی مینایان جێ هێشت و هەرکەسە بەرەو زێدی خۆی گەڕایەوە، قوڕەیشییەکان کەگەڕانەوە بۆ مەککە بڕوایان کردبوو کە هەواڵەکە درۆبووە، بەڵام لەهەمان کاتدا هەر سوسەیان دەکردو بەشوێنیدا دەگەڕان، تابۆیان دەرکەوت کە هەواڵی

روداوەکە راستەو عەهدو پەیمانەکەش بەفیعلی بووە، لەوکاتەشدا ئێمە مینامـــان جـــێ هێـــشتبوو بـــەرەو مەدینــــە کەوتبووینــــە رێ، ئـــیتر قورەیشییەکان کەوتنە شوێنمان، لەشوێنێك کە پێی دەگوترێ «أذاخر» گەییـــشتنە ســـەعدی کـــوڕی عوبـــادەو «المنـــذر»ی کـــوڕی عـــەمر هەردوکیـشیان لـە هەڵبـژێراوەکانی بەیعەتەکـە بـوون. «المنـذر»تـوانی هـەڵبێ و خـۆی لەدەسـتیان قوتاربکـا بـەڵام سـەعدیان گـرت و بەتیلمـە چەرمی بارەکەی یان بڵێ بە حەبلی بارو بارگەنەی وڵاخەکەی دەستیان بەملیەوە بەستن، ئەمجا بەرەو مەککە هێنایان و دەستیان کرد بە لێدان و پێدادانی و قژ راکێشانی. سەعد قژی سەری زۆر پڕو چڕبوو.

سـەعد بـۆ خـۆی دەڵـێ سـوێندم بـەخودا مـن بەکەلەبچەکراوی لـەناو خۆیاندا رایاندەکێشام و دەیانهێنام دەیـانبردم. پیاوێکیـان هاتـە بـەردەمم وتی: ماڵوێران ئەوە تۆ خۆت لەگەڵ یەکێك لەهۆزی قورەیش هیچ عەهدو پەیمان و جیوارێکت نیە؟ وتم: بەڵێ من یارمەتیدەرو پەنادەری هەریـەك لـە «جوبـەیری کـوڕی مـوطعیم»و «الحـارث»ی کـوڕی ئومەییـە بـووم بـەرعودەی کـاڵای بازرگانییـان بـووم و نەمدەهێـشت کـەس لەسـنووری وڵاتی خۆماندا دەست درێژی بکاتەسەر قافڵەو کاڵای بازرگانییان، وتی: ماڵوێران دە بانگیان لێ بکە بابێن فریات بکەون. منیش خێرا هاوارم لێ کردن، هێندەی پێ نەچوو «موطعیم» و «الحارث» هاتن منیان لەدەست قورەیشییەکان رزگارکرد.

ئیبنو هیشام دەڵێ: پەیماندانی ئەنصارەکان بە پێغەمبەر دەربارەی شەڕ «لەوکاتـەی پـەروەردگار رێگـای شـەڕکردنی بـە پێغەمبـەردا» چەند مـەرجێکی تـری تێـدابوون کـە لـە بەیعـەتی «العقبـة»ی یەکەمـدا نـەبوون، چونکە لە بەیعەتی «العقبة»ی یەکەمدا باسی شەڕو جیهاد نەکرابوو، لەم روەوە ئەوکاتـە پـەروەردگار ئیزنـی بـە پێغەمبـەرو موسـوڵمانان نـەدابوو

شەڕ لەگەڵ کافرەکاندا بکەن، کە خودا ڕێگەی بە پێغەمبەردا بۆ شەڕکردن و جیهاد لەپێنا و ئاییندا پێغەمبەر لە بەیعەتی «ألعقبة»ی دووەمدا پەیمانی ئەوەی لێ وەرگرتن کە لەخۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵی بن و شەڕی لەسەربکەن لەگەڵ سوور و ڕەشی خەڵکدا، هەرکەسێك دژی پێغەمبەرو پەیامەکەی بێ ئەمان دژی بن و بەهیچ شێوەیەك دەستی لێ بەرنەدەن. لەپای ئەوەدا خودا بەهەشتی بەرینیان دەداتێ.

عوبادەی کوڕی «ألصامت» دەڵێ پەیمانمان لەگەڵ پێغەمبەر بەست و بەڵێنی ئەوەمان پێدا: کە شەڕی خۆمانی لەپێناودا بەخت بکەین، گوێ بیستی فەرمان و ئامۆژگارییەکانی بین و لەخۆشی و ناخۆشیماندا زەرەرمان بێ و قازانجمان بێ پێمان خۆش بێ و پێمان ناخۆش بێ، بەهەموو بارێك و لەهەموو حاڵێکدا «سەمع و طاعەمان» هەبێ. لەهەر شوێنێك بین حەق و ڕاستی بڵێین و لەپێنا و ئایینی خودادا لەسەر زەنشتی هیچ سەر زەنشتکارێك نەترسین.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەم پەیمانی دووەمی «ألعقبە» لە کرۆك و جەوهەردا لەگەڵ بەیعەتی «ألعقبە»ی یەکەم یەك دەگرنەوە، هەردو پەیمانەکە لەبەردەم پێغەمبەردا پەیماندەران ئیعلانی موسوڵمان بوونی خۆیان دەکەن. پەیمانی گوێڕاوێڕی و دڵسۆزی بۆ ئایینی خوداو ملکەچی بۆ فەرمانی پێغەمبەری لەخۆگرتووە.

وەلێ ئێمە دوو جوداوازی گرنگ لەنێوان بەیعەتی یەکەم و دووەمدا دەبینین و شیاوی ئاماژە پێکردن و لێکۆڵینەوەن:

**جوداوازی یەکەم:** دەبینین ژمارەی پەیماندەران لە ئەهلی مەدینە لەجاری یەکەمدا دوانزە کەس بوون. وەلێ لە جاری دووەمدا ژمارەکەیان بەرزبۆتەوە بۆ حەفتا و ئەوەندە کەسە لەنێوانیاندا دوو ئافرەت هەن.

لەدوای پەیمانی یەکەمی عەقەبە ئەو دوانزە کەسەی پەیمانیان دابوو گەڕانەوە بۆ مەدینە، موصعەبی کوڕی عومەیریان لەگەڵ نێررا، نەك بۆئەوەی هەرکەسە بچێتەوە ماڵی خۆیو گۆشەگیربێ، بەڵکوو بۆئەوەی هەرکەسەیان بەرێنمونی موصعەبی کوڕی عومەیر لەئاست خۆیەوە موژدەی هاتنی ئیسلام بدا بە دەوروبەری خۆیو هەوڵ بدا پیاوو ئافرەتی دەوروبەری خۆی موسوڵمان بکا. موصعەب کە گەیشتە مەدینە پاڵی لێ نەدایەوە، بەڵکوو بێ هەدادان کەوتە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام، قورئانی بەسەردا دەخوێندن، ئەحکامو یاسای ئیسلامی بۆشی دەکردنەوە. بەم هۆیەوە ئایینی ئیسلام لەوساڵەدا بەناو مەدینەدا بڵاوبووە بە بڵاوبونەوەیەکی بەرچاو، تەنانەت لەناو مەدینەدا ماڵێك نەما ئایینی ئیسلامی نەچێتە ناو، قسەو باسی دانیشتوانی زوربەی کات دەربارەی ئیسلامو تایبەتمەندییەکانیو ئەحکامەکانی بوو.

لەراستیدا ئەوە وەظیفەو ئەرکی موسوڵمانە لەهەموو سەردەمو کاتو شوێنێکدا.

**جوداوازی دووەم:** ئەو خاڵانەی لەپەیمانی یەکەمدا نووسرابوون خاڵی بوون لەوەی ئامارژەی شەڕیان تێدابێ، باسی ئەوەیان تێدانەبوو کە پێویستە جیهاد بکەنو بەرگری لە پێغەمبەر بکەنو بەهەموو وەسیلەیەك هەوڵی بڵاوبوونەوەی ئایین بدەن.

هۆی ئەم جوداوازییە یان بڵێ ئەم ئامارژە پێ نەکردنە ئەوەیە پەیماندەرانی پەیمانی یەکەم کە گەڕانەوە مەوعیدیان لەگەڵ پێغەمبەر هەبوو کەساڵی داهاتوو لەوەرزی حەجدا بە ژمارەیەکی زۆرترەوە بێنەوە لەهەمان شوێن لەگەڵ پێغەمبەردا پەیمان تازەبکەنەوە، ئیتر بە پێویست نەزاندرا لەو پەیمانەدا باسی شەڕو جیهادو بەرگری بکرێ مادام ئیزن بەشەڕ نەدراوەو ئەو بەڵێندەرانەش دوای ساڵێك جارێکی تر بەخزمەت پێغەمبەر دەگەنەوە.

کەوابوو پەیمانی یەکەمی عەقەبە پەیمانی کاتی بووە نەك کۆتایی، بۆیە هەر ئەو خاڵانەی لەخۆ گرتبوون کە هەمان ئەو بەندو خاڵانەبوو کە لەدوا پێغەمبەر ﷺ لەپەیمان وەرگرتن لە ئافرەتان ئامـاژەی پـێ دەکردن.

ئەمما پەیمانی دووەم ئەوە بۆخۆی ئەساس و بناغەیەك بوو: کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر رۆشنایی ئەو خاڵانەی تێیدا ئاماژەیان پێ کرابوو کۆچی کرد بۆ مەدینە. بۆیە پەیمانەکە گشتی تربوو بۆ ئەو بنەمایانەی کە لەدوای کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی تەشریع دەکرێن و دەبنە کرۆکی ئایین، لەپێش هەمووشیانەوە جیهادو بەرگری کردن لەدەعوەی ئیسلامی بەهێزی چەك و روبەروبونەوەی سەربازی. ئەمە حوکم و بڕیارێك بوو هەرچەند ئیزن نەدرابوو بە شەرعییەت و پەیڕەوکردنی لەپێش کۆچدا وەلێ پەروەردگار بە ئیلهام خستبوویە دڵی پێغەمبەرەوە کەئەم ئەرکە لە داهاتوویەکی نزیکدا تەشریع دەکرێ.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە مەشروعیەتی جیهادو رێگەدان بە موسوڵمانان بۆ شەڕکردن لەپێناو بەرگری لەئایین تادوای کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە لەئارادا نەبووە. ئەوەی لە کەلامی ئیبنو هیشام وەردەگیرێ کە گوایە رێگەدان بەشەڕکردن و ئەرکی جیهادو ئەنجامدانی لەرێگەی هێزی سەربازییەوە لە پەیمانی دووەمی عەقەبەدا پێش کۆچ تەشریع کراوە قسەیەکی راست نیەو بیرو بۆچونێکی هەڵەیە، چونکە لە خاڵەکانی ئەو پەیمانەدا خاڵێکی تێدا نییە ئاماژە بەوەبکا کە ئەوکاتەی پەیمانەکە بەستراوە شەڕکردن مەشروع بووە. چونکە پێغەمبەر ﷺ کە پەیمانی جیهادکردنی لە ئەهلی مەدینە وەرگرت ئەوە بەتێڕوانین بۆ داهاتوو بووە، مەبەست ئەوە بووە کاتێك پێغەمبەر کۆچ دەکا بۆ ناویان و لەمەدینەدا جێگیر دەبێ ئەوکاتە دەبێ بەهێزی سەربازی و بەماڵ و

بەگیان بەرگری لە پێغەمبەرو پەیامەکەی بکەن. بەڵگە لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە لەوەپێش باسمان کرد وتمان «ألعباس»ی کوڕی عوبادە دوای پەیمانەکە بە پێغەمبەری گوت: سوێند بەو کەسەی تۆی کردووە بە پێغەمبەر بەحەق‌و راستی رەوانەکردوی بۆسەر ئادەمیزاد، ئەگەر ئارەزۆ بکەی‌و رێگامان پێ بدەی ئێمە بەیانی بە شمشێرو رمبەکانمانەوە هەڵدەکوتینە سەر قورەیشییەکان کە لەدەشتی مینادا کۆبونەوە تەفرو تونایان دەکەین. پێغەمبەر فەرمووی: نا هێشتا ئێمە فەرمانی ئەوەمان پێ نەکراوە شەڕبکەین، ئێوە بگەڕێنەوە بۆ مەنزڵگاو ناو کاروانی خۆتان.

لەوشتانەی کە موسوڵمانان ئیتیفاقیان لەسەریەتی‌و هیچ راجیایی تێدانیە ئەوەیە کە یەکەم ئایەتێك نازڵبووبێ دەربارەی جیهادو رێگە پێدان بە شەڕکردن ئایەتی: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ - الحج/٣٩} تیرمیذی‌و نەسائی‌و هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێ کاتێك پێغەمبەر ﷺ ناچارکرا شاری مەککە جێ بێڵێ‌و کۆچ بکا بۆ مەددینە، ئەبوبەکر وتی: قورەیش پێغەمبەریان لەمەککە دەرکرد، «انا لله وانا اليه راجعون» ئێمە هەمووەمان هی خوداین‌و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، سوێندم وابێ بەسەلامەتی نایخۆن‌و هەموویان تێدا دەچن! ئیتر پەروەردگار ئایەتی: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ}ی نازڵ کرد. ئەبوبەکر فەرمووی: من دەمزانی لەوە بەولاوە رێگەی شەڕکردنی بە موسوڵمانان دەدرێ‌و شەڕ لەنێوان موسوڵمانەکان‌و کافراندا دەقەومێ«[1]».

دەی باشە بۆچی رێگەدان بە موسوڵمانان بۆ جیهادکردن لەڕێگەی هێزو بەکارهێنانی چەکەوە تا ئەوکاتە دواخرا؟

---

١ - سنن النسائی ٥٢/٢ وتفسير ابن كثير ٢٤٤/٣.

لەوەڵامدا دەگوترێ لەبەر ئەم حیکمەتانە:

١- موناسیب و گونجاو بوو کەپێش ڕێگەدان بەشەڕ پێ ناساندنی ئیسلام و بانگەوازی بۆ کردنی و بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاستی و پێویستی ئەنجام بدرێ، حەل و چارەسەر بدۆزرێنەوە بۆ ئەو تەنگژەو موشکیلانەی دێنە ڕێگای و ناهێڵن خەڵك تێی بگا. گومانیش نیە لەوەدا: کەئەمانە قۆناغە سەرەتاییەکانی جیهادن، بۆیە هەوڵدان بۆ جێبەجێ کردنی فەرزی کیفایەیەو هەموو موسوڵمانان لێی بەرپرسیارن و ئەگەر ئیهمال بکرێ هەموویان تاوانبارن و ئەگەر لەلایەن هەندێکیانەوە ئەنجام درا ئیتر تاوان لەسەر هەموویان لادەچێ.

٢- ڕەحمەت و حیکمەتی خودا واداخواز بوو کە ئەرکی پێویستبوونی شەڕنەخاتە ئەستۆی بەندەکانی تا «دار السلام»یان بۆ دەستەبەر دەبێ و دەیکەنە پێگەو شوێنی حەوانەوەو تێدا هەڵکردن و پەل هاویشتن، ئاشکراشە شاری مەدینە یەکەم شاری ئیسلام و داری ئیسلامە.

## وشه گەلێکی گشتی دەربارەی جیهادو بەڕەوا زانینی

مادامەکی باسەکە لەئێستاوە ئێمە بەرەو باسی جیهادو شەڕکردن لەگەڵ کافران دەبا، دەشێ لێرەدا کەمێك هەڵوێستە بکەین، بۆئەوەی فیکرەیەکی ڕاست و دروست دەربارەی جیهادو مەشروعییەتی و قۆناغەکانی ڕون بکەینەوە.

بێگومان قسەکردن لەجیهاد ئێستاشی لەگەڵدا بێ گرنگترین سەکۆیە کە «چەواشەکاران و ئەوانەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردۆتە پیشەو حەق و بەتاڵ تێکەڵ دەکەن» پشتی پێوە دەدەن، هەموو

هەوڵ و تێکۆشانی ئەو دڵ کرمێ و دوژمنانە ئەوەیە کەلەبەرو درز بخەنە شوراو قەڵای ئەم ئایینە پیرۆزە، بەمەبەستی گومان خستنە سەری و زەفەر لێ بینینی.

بەلاتەوە سەیرنابێ کە دەوافیع پاڵنەر زۆرن بۆ چڕکردنەوەی هەموو هێزو تواناییان دەربارەی مەشروعییەتی جیهاد بەتایبەتی.! دەڵێم هەبوونی ئەو دەوافیعانەت بەلاوە سەیرنابێ ئەگەر ئەوەت زانی کە خەتەرترین روکنێك لەروکنەکانی ئیسلام لەدیدی دوژمنەکانیەوە بۆ ترسان لێی و خەو لێ زڕانیان پڕۆژەی جیهادە، ئەوان دەزانن: کە ئەم روکنە ئەگەر لەدڵ و دەروونی موسوڵمانانیدا بەئاگا بێتەوەو بوروژێ، وای لێبێ کاریگەری هەبێ لەژیانیانداو لەهەر عەصرو رۆژگارێکدا بێ، هیچ هێزو دەسەڵاتێك نیە چەندێك گرینگ و ستراتیجی بێ بتوانێ لەبەردەم تەوژمی ئیسلامیدا بووەستێ! بۆیە بەلایانەوە پێویستە کارکردن بۆ راگرتنی بڵاوبونەوەی ئیسلام یەکەم جار لەم خاڵەوە دەست پێ بکا.

ئێمە لەم نووسینەماندا یەکەمجار مانای جیهادو مەبەستی لە ئیسلامداو ئەو قۆناغانەی پێیدا تیپەڕیوەو ئەمجار ئەو قۆناغەی تێیدا گەیشتە چڵە پۆپەو لەسەری وەستاو جێگیربوو رون دەکەینەوە، ئەمجار ئەو هەڵانە رون دەکەینەوە کە خزێندراونە ناو ماناو مەفهومی جیهادەوە، هەروا ئەو دابەشکردنە ناڕەوایەی بۆ جیهادیان کردووەو بەزۆرە ملێ و تەکەللوف بەسەریاندا سەپاندووە.

مانای جیهاد بەکارهێنانی هێزو تواناو صەرفکردنی وزەو تاقەیە لەپێناو بەرزکردنەوەی کەلیمەی خوداو پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی. بەکارهێنان و صەرفکردنی وزە لەڕێگای شەڕو بەکارهێنانی چەکەوە جۆرێکە لەجیهاد، ئامانج و غایەی جیهادیش بریتییە

لەدروستکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامیو پێکهێنانی دەوڵەتی راستو دروستو عەداڵەتکاری ئیسلامی.

ئەمما ئەو قۆناغانەی پرۆسەی جیهادی پێدا تێپەڕیوە وەکوو لەوەپێش ئاماژەی پێکرا سێ قۆناغی سەرەکین.

قۆناغی یەکەم: ئەوەبوو جیهاد لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامیدا «وەکوو زانیمان» لە چوارچێوەی دەعوەیەکی نەرمو نیانو بێ توندو تیژی لەگەڵ خۆڕاگری لەبەرامبەر ئەزیەتو نارەحەتی میحنەتی جۆراو جۆردا. پاشان لەگەڵ دەست پێکردنی کۆچکردنی هاوەڵان بۆ مەدینە رێگەدرا بە موسوڵمانان کە شەڕی دیفاعی بکەنو بەگوێرەی توانا رەدی دەست درێژیکار بدەنەوە. پاش کۆچکردنی پێغەمبەرو موسوڵمانان بۆ مەدینەو جێگیربوونیان قۆناغی سێیەم دەستی پێکردو رێگەدرا بە موسوڵمانان کەشەڕ بکەن لەگەڵ هەرهێزو دەسەڵاتێك ببێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامیو نەهێڵن ئایینی خودا بڵاوبێتەوەو شەریعەتی ئیسلام کاری پێ بکرێ. بە بەرچاو گرتنی ئەوەش کە بەهیچ جۆرێك جگە لە ئیسلام بوون لەپێڕی مولحیدو بتپەرست هیچ شتێکی تریان لێ قبوڵ ناکرێ، چونکە پێکەوە ژیانو گونجان لەگەڵ ئەو دوو پێڕەدا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا مومکین نیە بەهۆی بیروباوەڕی خەتەرناکیانەوە کە ئیلحادە یان بتپەرستییە. بەڵام ئەهلی کیتاب «جولەکەو مەسیحی» ئەوان ئەگەر موسوڵمانیش نەبن دەتوانن سەرانە بدەنو ملکەچی دەوڵەتی ئیسلامی بنو تێکەڵاوی کۆمەڵگەی موسوڵمان بن. لەئاستی ئەم قۆناغی سێیەمەدا حوکمی لەئیسلام دا جێگیربوو، بووە حوکمێکی دامەزراوو چەسپاو، ئەم شێوە جیهادەش ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە لەهەموو چەرخو رۆژگارێکدا، بەمەرجێ هێزو ئەسبابی جیهادبن، وەکوو پێویست دارای چەكو

پێویستیاتی جیهادیان هەبێ. دەربارەی ئەم قۆناغە پەروەردگار دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ – التوبة/١٢٣}.

پێغەمبەریش دەربارەی ئەم قۆناغە دەفەرموێ: {أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ . فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّى مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ}«[١]».

لێرەوە دەزانی: کە دابەشکردنی جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا بۆ حەربی دیفاعی و حەربی هجومی هیچ مانایەکی نییە، چونکە بناغەو جەمسەری تەشریع کردنی پرۆسەی جیهاد بۆ داکۆکیکردن لەخودی جیهاد یان هجوم کردن بۆ خودی جیهاد نییە، بەڵکوو بناغەو مەناطی جیهاد بریتییە لە پێداویستی و ئاتاجی بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەهەموو بنەما و یاسا و نیظامیەوە، ئەمجار جیهادەکە جیهادی هجومییە یان دیفاعییە ئەوە چ ئیعتیبارێکی نییە. بەڵام شەڕی دیفاعی رەوا وەکوو شەڕی دیفاعی موسوڵمان کە لەماڵ و نامووس و ژیانی خۆی دەیکا، ئەوە جۆرێکی ترە لەشەڕو پەیوەندی بەجیهادی ئیصطیلاحی زانراوو پێناسەکراوی ناو فیقهی ئیسلامی نییە. ئەو پێی دەگوترێ: «قتال الصائل» شەڕ دژی دزو جەردەو رێگرو ئەو جۆرە شتانە، هەرلەم روانگەوە کە جیهاد لەگەڵ «قتال الصائل» دوو دەستەواژەن فوقەهای ئیسلام لەکتێبە فیقهییەکانیاندا بابێکی سەربەخۆیان بۆ «قتال الصائل» داناوە. کەچی هەندێ باحیث و توێژەرەوە لەم رۆژگارەدا شەڕی داکۆکیکردن لەماڵ و ناموس و خوێن لەگەڵ جیهادی ئیصطیلاحیدا تێکەڵ بەیەك دەکەن.

---

١ - متفق عليه.

ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی جیهادو غایەو مەرامی لە شەریعەتی ئیسلامیدا.

ئەمما موغالەطەو چەواشەکاری و شێواندن کە دەربارەی جیهاد گوتراوە، ئەوە لەدوو تیۆری بە ظاهیرو رواڵەت دژ بەیەك و لە واقیعدا پێکەوە گونجاو خۆیان دەبیننەوە، چونکە لەهەردوو تیۆرەکە یەك وەسیلەو هۆکار پەیدادەبێ کە ئامانجی سەرەکی ئەوەیە پڕۆسەی جیهاد لەبناغەوە هەڵتەکێنێ.

**تیۆری یەکەم:** ئەو دەنگە نەشازو چەواشەکارەیە: کە بانگەشە بۆئەوە دەکا کە ئایینی ئیسلام بەزەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە، پێغەمبەرو هاوەڵانی هەمیشە رێگای توندوتیژو بەزۆر سەپاندن و زەبرو زەنگیان گرتۆتەبەر بۆ بڵاوبوونەوەی ئایین، ئەو پڕۆسەی کە ناوی لێ نراوە: فەتحی ئیسلامی لەواقیعدا فەتحی جەڕاندن و هەڵمەت و توندوتیژی و زەبرو زەنگ بووە نەك فەتحی قەناعەت پێکردن و فیکرو ئیمانهێنانی ئارەزۆمەندانە«١».

**تیۆری دووەم:** ئەو دەنگەیە کە بەپێچەوانەی دەنگی یەکەمەو بانگەشەی ئەوە دەکا کە ئیسلام ئایینی ئاشتی و خۆشەویستییە، جیهاد بەڕەوا نازانێ مەگەر بۆ رەتدانەوەی دەستدرێژی و پەلاماردان و هێرشکردنە سەری. موسوڵمانانیش شەڕناکەن و پڕۆسەی جیهاد ئەنجام نادەن مەگەر ناچاربکرێن و شەڕیان پێ بفرۆشرێ.

هەرچەندە ئەم دوو تیۆرە «وەکوو گوتمان» دژ بەیەکن و تەناقوضیان لەنێواندایە. بەڵام کەسانی خاوەن برۆسەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامی و هەڵگرانی ئەو شیعارو فیکرە جەهەنەمییە، ویستویانە لەو دوو تیۆرو فکرە دژبەیەکانە، غایەو مەرامێکی موعەیەن دەستەبەرکەن،

---

١ - ئەمە تیۆری «فان ملوتن»ە لەکتێبێکیدا بەناوی «السیادة العربیة»، ص٥ بەدواوە طبعة النهضة المصریة.

کەهەر ئەوەیان مەبەستە لەو دوو ئەطروحەیە، فەرموو بابۆت روون بکەمەوە.

بێگومان ئەوانە سەرەتاو یەکەمجار ئەوەیان رەواجداو بانگەشەیان بۆکرد: کە ئیسلام ئایینی هەڵمەتو پەلاماردانو حیقدو کینەیە بۆ بەرامبەرو زەبرو زەنگو قەلاچۆکردنو ژێربار کردنی بەکارهێناوە. ئەمجار ماوەیەك چاوەڕوانییان کرد، تا ئەو بانگەشەو پڕوپاگەندە بەروبومی خۆیدا: کە بریتی بوو لە بەرپەرچدانەوەو ئینکاریکردنی موسوڵمانان بۆ ئەو بوختانەی پاڵ ئیسلام دراوەو ئەو زوڵمو ستەمەی دەرحەقی دەکرێ.

جا لەکاتێکدا موسوڵمانان سەرگەرمی دۆزینەوەی بەڵگەو وەڵامدانەوە بوون، دەیانەویست ئەم بیرو بۆچوونە بەتاڵە رەت بکەنەوە. هەمان ئەو خاوەن پڕۆسەی کە ئەرکی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان لەئەستۆ گرتووە، هەڵسان خۆبەخشانە دوای لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە بەناوی دیفاع لەئیسلام رەدی ئەو توهمەو بوختانەیان دایەوەو فەرموویان: نەخەیر ئیسلام وەکوو دەڵێن: ئاییني شمشێرو رمو هەڵمەتو پەلاماردانو پڕواندنو حیقدو کینەیە، وانییەو پێچەوانەی ئەو وێناکردنەیە. فەرموویان ئیسلام ئاییني خۆشەویستیو ئاشتییە، جیهاد بەڕەوا نازانێ مەگەر لەکاتی ضەرورەتو رەتدانەوەی دەستی پەلاماردەری هێرش هێن بۆسەری. هەرگیز موسوڵمانان هەڵنانێ بۆ شەڕو غەزا هەتا رێگای ئاشتی بەدەست بکەوێ!

ئیتر ماوەیەکی زۆر موسوڵمانی گێلو بەسیت لەمیانەی پێناخۆش بوونیانو خەفەتبار بوونیان بەهەڵوێستی پێشوو چەپڵەی پێ خۆشبوونیان بۆ لێدانو سوپاسی ئەم داکۆکیکردنە پیرۆزەیان کردنو بەدڵێکی فراوان رەتدانەوەکەیان قبوڵ کردو کەوتنە پشتگیری کردنیان!!

جەختکردنـەوەو بەڵگـە هێنانـەوە لەسـەرئەوەی کـە «فیعلـەن» ئیـسلام ئەوەیـــە کـــە ئەمانـــە فەرموویانـــەو بەڕاســـتی ئـــایینی ئاشـــتەوایی و دۆسـتایەتییەو گـوێ ناداتـە هـیچ کـەس مەگـەر هێـرش بکەنـە سـەری و لـەماڵی خۆیـدا پـەلاماری بـدەن و بـەزەبری شمـشێر لەخـەوی راسـت بکەنەوە!!!

بەڵام بەداخەوە ئەو موسوڵمانە گێل و بەسیتانەی کە ئەو خۆشی و پێ رازیبونەیان دەربڕی بۆ ئەو بەناو داکۆکیکارانە – ئەوەیان لەیادچوو کە ئەمەی کردیان بۆ پێشوازیکردن و پێدا هەڵگوتن و پشتگیری کردنیـان لـەتیۆری دووەم ئـەو نەتیجـەو ئاکامـە بـوو کـە مەبەسـت بـوو بێتـەدی. خودی ئەو غەرەضە بوو: کە بەنهێنی و لەژێرەوە هەردوو تـاقم لەسـەری یـەکتریان گرتبـوو، ئـەو ئاواتـە بـوو کـە رەواجـدەرانی شـائیعەی یەکـەم و بانگەشەکەرانی شائیعە ناوبۆشەکەی دووەم بەنیازبوون بێتـەدی و بۆیـان هاتە دی.

ئـــەوان مەبەســـتیانە پـــەیڕەوی چـــەند رێبازێـــك بکـــەن و چـــەند موقەدیمات و هۆکاری دیراسەکراوی جوێ جوێ بخەنە گـەڕ بـۆ هاتنـەدی یـەك مەبەسـت ئـەویش سـڕینەوەی فیکـرەی جیهـادە لـەدڵ و دەروونـی موسوڵمانانداو مراندنی گیانی طموح و هیوایە لەناخیاندا.

ئێمـە نووسـینێکی «د. وهبـة الزحیلـی» دەکەینـە شـایەتی ئـەوەی ئامـاژەمـان پێکـرد نـاوبراو لـەکتێبێکی بـەناوی «آثـار الحـرب في الفقـه الاسـلامی»دا لەسـەر زوبـانی خۆرهەڵاتناسـێکی ئینگلیـزی ناسـراو بـە «أندرسـن» ئـەم باسـەمان بـۆ شـیدەکاتەوەو دەڵـێ: «خۆرئاواییـەکان بەتایبـەتی ئینگلیزەکـان ترسـیان هەیـە لـە وروژانـدنی فیکـرەی جیهـادو بەرجەستە بوونی لەناو موسـوڵمانان دا، هـەموو هـەوڵێکیان خەفەکردنی فیکرەی جیهادەو سڕینەوەیەتی لەمێشکی موسوڵمانان دا بۆئەوەی لە

یەکدیگیر نەبن و نەبنە هێزێکی یەکگرتوو لەبەردەم دوژمندا، بۆیە هەمیشە ئەو خۆرئاواییانە هەوڵی سڕینەوەی فیکرەی جیهاد دەدەن.
چەند وێنەکێشانێکی راست و پڕمانایە کە خودا دەرحەق بەوانەی ئیمانیان نییە دەفەرموێ:
{فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ}.

د. وهبة الزحيلي: دەڵێ من بۆخۆم رۆژی هەینی «١٩٦٠/٦/٣» دانیشتنم لەگەڵ خۆرهەڵاتناسی ئینگلیزی «أندرسن» ئەنجامداو پرسیارم لێکرد ئاخۆ رای چۆنە دەربارەی جیهاد؟ ئامۆژگاری ئەو بۆ من ئەوەبوو: کەوتی جیهاد ئەمڕۆ واجب نیە، ئەمەش بەپێی قاعیدەی «تتغير الأحكام بتغير الأزمان» چونکە بەرای من ئەمڕۆ جیهاد لەگەڵ بارودۆخی تازەی نێودەوڵەتی ناگونجێ، چونکە موسوڵمانان ئەمڕۆ پەیوەندی جۆراوجۆریان بەرێکخراوە جیهانی و نێو دەوڵەتیەکانەوە هەیە و پابەندی عەهدو پەیمانی نێو دەوڵەتین. هەم لەبەرئەوە کە جیهاد وەسیلەو ئامێرە بۆ بەزۆر موسوڵمانکردنی خەڵك و ناچارکردنیان بۆ قبوڵی ئیسلام، بارودۆخی پرۆسەی ئازادی رادەربڕین و گەشەکردنی عەقڵ و چاوکرانەوە قبوڵی فیکرەیەك ناکا بەزۆر بسەپێندرێ[١].

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ باسی سەرەکیمان کە بەڵێننامەی دووەمجاری «العقبة»یە.

دەڵێین: پەروەردگار لە بەرحیکمەتێك کەخۆی دەیزانێ وای رەخساند هەواڵی پەیمانی نێوان مەدینەیەکان و پێغەمبەر بگاتە

---

١ - آثار الحرب في الفقه الاسلامي ص٥٩.

گوێــچکەی موشــریکەکانی مەککــە، بەتــەواوی بەســەر نــاوەڕۆکی پەیمانەکەدا ئاگاداربن.

وێدەچێ بەشێك لەحیکمەتی ئەو سوسەکردنو بەرگوێ کەوتنی هەواڵی بەستنی پەیمانو گەیشتنەوەی بە قوڕەیشییەکان رەخساندنو ئامادەکردنی هۆکاربێ بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە. لەوە بەولاوە دەبیــنن گەییــشتنەوەی هەواڵەکــە چــەند کاریگــەری هــەبوو لەســەر قوڕەیشییەکان بۆ تەنگ پێ هەڵچنینی پێغەمبەرو یەکدیگیرکردنی رایان لەسەر هەوڵدان بۆ فەوتاندنی پێغەمبەرو لەناوبردنی بەهەر نرخێك بێ.

هەرچــۆنێك بــێ پــەیمانی دووەم جــاری «العقبــة» رێ خۆشــکەرەی یەکەم بوو بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینەی مونەوەرە.

## ئیزندانی پێغەمبەر بۆ هاوەڵانی بەکۆچکردن بۆ مەدینە

ئیبنــو ســەعد لــە طــەبەقاتەکەیــدا لــە عائیــشەوە ریوایــەت دەکــا دەفەرموێ: کاتێك حەفتا کەسەکە لەلای پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەدینە گەڕانەوە پێغەمبەر زۆر کەیفی خۆش بوو بەوەی کەخودا شوێنی قایمو پتــەوی بــۆ رەخــساندووە، نەوەیــەکی بــۆ کــردووە بــە یارمەتیــدەرو خانەخوێ: کە پیاوی شەڕو بەفریاکەوتن مەردو مەردایەتین. ئەزیەتدانی قوڕەیش بۆ موسوڵمانان پەرەی سەندو بەتەواوی تەنگیان پێ هەڵچنین، چونکە دەیانزانی مانای کۆچکردنو چونە دەرەوەی موسوڵمانەکان لەمەککە چ کاریگەرییەکی دەبێ. بۆیە زۆر لەجاران زیاتر لە قاقۆزەیان پێــچانو کەوتنــە جنێــو پێــدانو ئەزیەتــدانی زیــاترو ســوکایەتی پێکردنیان.. هاوەڵان شکوای حاڵی خۆیان لای پێغەمبەر کردو داوایان لێکرد رێگەیان پێبدا بۆ کۆچکردن، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئەمن هەواڵی ئەو وڵاتەی کۆچی بۆدەکەن پێم راگەیەندراوە شاری یەثریبە

کەسێك دەیەوێ لەمەککە دەربچێ با بۆئەوێ کۆچبکا. ئیتر هاوەڵان کەوتنە خۆرێکخستن و خۆئامادەکردن بۆ کۆچکردن پۆل پۆل و تاقم تاقم تاق و جووت بەدزییەوە مەککەیان جێ دەهێشت. یەکەم کەسێك لە هاوەڵان گەیشتە مەدینە ئەبو سەلەمەی کوڕی عبدالأسد بوو پاش ئەو عامیری کوڕی رەبیعە لەگەڵ خێزانیدا کەناوی «لیلی»ی کچی ئەبو حەشمە بوو. ئەم ئافرەتە یەکەم ئافرەت بوو لەکەژاوەدا گەیشتە مەدینە. ئەمجار هاوەڵان یەك لەدوا یەك و بەزنجیرە گەیشتنە مەدینەو بوونە میوانی ئەنصارەکان، هەرکەسە لەعاست خۆیەوە پێشوازی لێ کردن و لەماڵی خۆیاندا میوانداریيان کردن، دڵخۆشییان دانەوەو یارمەتییان دان»[١].

هەڵبەتە کەس لەهاوەڵان بەئاشکرا کۆچی نەکرد جگە لە عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه ئەو بەئاشکرا کۆچی کرد، ئیمامی عەلی رضي الله عنه دەفەرموێ: کاتێك عومەر بڕیاری کۆچکردنی دا شمشێرەکەی لەشان کردو قەوسەکەی کردە شانی و چەند تیرێکی خستە ناو دەستیەوەو چوو بۆلای کەعبە، سەرانی قورەیش لەحەوشەی کەعبەدا بوون، بەبێ ترس و لەسەرەخۆ تەوافی کەعبەی کردو ئەمجار هاتە لای مەقامی ئیبراهیم نوێژی کرد، ئەمجار راوەستاو وتی: خودا ئەم لوتبەرزانە سەرشۆڕ دەکا، دەك رویان رەش بێ ئەمجار وتی: کەسێك دەیەوێ دایکی شینی بۆبکاو منداڵی هەتیوبن و ژنی بێوەژن بێ بابێ لەودیو ئەو شیوەوە پێشم پێ بگرێ و بێتە سەر رێم!!».

عەلی کوڕی ئەبو طالب فەرمووی: ئیتر عومەر کەوتەڕێ و کەس نەیوێرا بچێتە سەر رێی.

---

١ - طبقات ابن سعد ٢١٠/١ وتاريخ الطبری ٢١٧/١.

ئیتر بەرودوا موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە هەتا کار گەییشتە ئەوە کەس لەهاوەڵان لەمەککە نەمایەوە، جگە لە پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عەلی، یان موسوڵمانێك لەلایەن قورەیشییەکانەوە کۆت و زنجیر کرابێ یان نەخۆش بێ یان بێهێزو لاوازبێ نەتوانێ سەفەربکا.

## پەندو ئامۆژگاری:

ژیانی موسوڵمانەکان لەمەککەدا ژیانێکی پڕ ناسۆرو ناخۆش بوو، هەمیشە لەناو فیتنەو عەزاب و چەورتمدا بوون، موشریکەکان بەجۆرەها شێوەی گاڵتە پێکردن و سوکایەتی پێکردن و لێدان و حەبس و گەمارۆدان تەنگییان پێ هەڵدەچنین و بەهەموو ئەوشتانە بەتاقی دەکرانەوە. کە پێغەمبەر ﷺ ئیزنی دان بۆ کۆچکردن، ئەمجار تاقیکردنەوەکەیان کەوتە بارێکی ترەوە، بەوازهێنان لەزێدو نیشتمان و ماڵ و خانوو کاڵا بەتاقی کرانەوە. بێگومان هاوەڵان وەفاداربوون بۆ ئایینەکەیان و موخلیص و راستاڵ بوون بۆ خودا، لەبەرامبەر فیتنەو بە تاقیکردنەوەی یەکەم و دووەم خۆڕاگر بوون، بەپێشوو درێژی ورەی بەرزەوە روبەڕوی ئەو هەموو میحنەت و چەورتمە بوونەوە. جا کەپێغەمبەر ﷺ ئامارەی بۆکردن کە دەتوانن کۆچبکەن، بێ سێ و دوو کەوتنەخۆ بۆ کۆچکردن و بەرودوا رویان لەمەدینە کردو لەدوا خۆیان زێدو نیشتمان و ماڵ و منداڵ و کالای بەنرخ و کەم نرخیان جێ هێشت و چونکە ئەوان بەدزی و بەسەڵتی لەمەککە دەرچوون، ئاشکراشە ئەم شێوە ولات جێهێشتنە ئەوە دەخوازێ کابرای کۆچکەر ماڵ و سامانی خۆی بەجێ بێڵێ لەپێناو سەلامەتی ئایینەکەیدا. ماڵ و سامان و کالایان جێ هێشت لەجیاتی ئەوە لەمەدینە پێشوازی گەرمیان لێکراو بەخێرهاتنیان لێکرا. بەڕاستی

یارمەتیدەران «الأنصار» بەدڵسۆزی قەرەبووی مادیو مەعنەوییان بۆ کۆچکەران کردەوە، حەواندنیانەوە، یارمەتییان دان.

ئەمەش نموونەی بەرزو صەحیحە بۆ هەموو موسوڵمانێك موخلیصو راستاڵ بێ بۆ ئایینی خوداو باکی لەوەنەبێ کە لەپێناو ئاییندا ماڵو سامانو کالاٌو زێدو نیشتمانی لەکیس دەچێ یان نا.

ئەمە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەمەککە.

ئەمما دانیشتوانی مەدینە ئەوانەی پێشوازییان لە کۆچکەران کردو لەئامێزیان گرتنو لەماڵی خۆیاندا حەواندنیانەوە، نموونەی برایەتی ئیسلامی راستەقینەیان بەرجەستەکرد، تەنانەت کۆچکەرانیان کردنە برابەش لە ماڵو سامانیاندا، ئەمەش رەنگە لەمێژوودا وێنەی دووبارە نەبوبێتەوە.

تۆ دەزانی: کە پەروەردگار پەیوەندی برایەتی ئایینی لەپەیوەندی برایەتی نەسەبو نژاد بەهێزتر کردووە بۆیە لەسەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا میرات وەرگرتن لەسەر ئەساسو بنەمای پەیوەندی ئایینیو برایەتی خستنەوە لەسەر ئەساسی کۆچکردن لەپێناو ئاییندا. حوکمی میرات لەسەر ئەساسی پەیوەندی خزمایەتی جێگیر نەبوو نەچەسپا ئیللا دوای ئەوەی کە ئیسلام لەمەدینەدا بەهێز بوو، ئەرکانی فەرمانڕەوایی داکوتاو مەدینە بوو بە «دار إسلام» دەوڵەتی ئیسلامی تێدا دادەمەزراو بەهێز بوو دەیتوانی دیفاع لە موسوڵمانان بکاو لەدەست درێژیی کافران بییان پارێزێ.

پەروەردگار دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ أُوْلَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ، وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ، مَا لَكُم مِّن وَلاَيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُواْ – الأنفال/ ٧٢}.

ئەمجار لەپرۆسەی کۆچکردن و مەشروعیەتیدا دوو حوکمی شەرعی وەردەگرین:

## ١- واجب بوونی کۆچکردن لە «دار الحرب» بۆ «دار الاسلام»:

قورطوبی لە ئیبنولعەرەبی ریوایەت دەکا: کە کۆچکردن لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ فەرزبووە بەوشێوە ئەم حوکمە بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت. هیجرەت لە «دار الحرب»ەوە بۆ «دار الاسلام» هەرکاتێ مەرجەکانی هاتنەجێ، واجبە ئەنجام بدرێ، ئەو کۆچکردنەی بە فەتحی مەککە کۆتایی هاتووە هیجرەت کردن بووە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئەگینا کۆچکردن کۆتایی نەهاتووە پرۆسەکە بەردەوامە. تەنانەت ئەگەر لە «دار الحرب» مایەوەو کۆچی نەکرد تاوانبارە»[١].

هەرشوێنێك موسوڵمان نەیتوانی شەعائیری ئیسلامی بەجێ بێنێ، رێگەی نوێژکردن و رۆژوو گرتن و جەماعەت و جومعەو بانگ و شتی وای لێ گیرا، ئەوە ئەو شوێنە حوکمی «دار الحرب»ی هەیەو پێویستە موسوڵمان جێی بێڵێ، بڕێ لەو بەڵگانەی لەسەر ئەم حوکمە دەهێندرێنەوە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيرًا، إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً – النساء/ ٩٧ – ٩٨}.

## ٢- پێویستی و واجبی یارمەتیدانی موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی:

ئەمەش حوکمێکە لە پرۆسەی هیجرەت وەردەگیرێ، موسوڵمانان چەندێك وڵات و مەملەکەتیان لێك جوداوازو لێك دوربن مادام بتوانن

---

١ - تفسیر القرطبی ج ٥/٢٥٠.

یارمەتی یەکتر بدەن پێویستە درێغی نەکەن‌و بەگوێرەی بۆ لوان‌و توانا یارمەتی یەکتر بدەن.

بێگومـان فوقـەهاو زانایـانی ئیـسلام کۆڕایـان هەیـە لەسـەرئەوە هەرکاتێ موسوڵمانان توانایان هەبوو لەسەر رزگارکردنی موسوڵمانانی دیل‌و بێ دەسەڵات‌و ستەم لێکراو لەهەر شوێنێکی سەرزەوی بن‌و نەیان کـرد ئـەوە تاوانبـارن. ئەبوبـەکری ئیبنولعـەرەبی دەڵـێ: هـەرکاتێك لـە موسـوڵمانان دیـل‌و بـێ دەسـەڵات هـەبوون، ئـەوە یارمەتیـدانیان ئـەرکی سەرشـانی هـەموو موسـوڵمانانە بـەگیان‌و بـەماڵ. پێویـستە خـەویان لێ نەکـەوێ تـا رزگاریـان دەکـەن‌و لـەو میحنەتـە قوتـاردەبن، ئەگـەر ژمـارەو توانامان تەحەمولی ئەوەی دەکرد، ینان هەموو ماڵ‌و سامان خەرج بکەین بـۆ رزگارکردنیـان تەنانـەت تـا دیرهـەمێکمان هـەبێ دەبـێ خـەرجی بکەین«١».

جاوەکوو پێویستە موسوڵمانان لەناو خۆیاندا یارمەتی یەکتربدەن ئەوە پێویستە یارمەتیدانەکە لەناو خۆیان دەرنەچێ نابێ بەهیچ جۆرێك ئـەو موالاتـە ئیـسلامییە هـەمووی یـان بەشـێك لەولایـەو یارمەتیـدان‌و برایەتییـە بتەنێتـەوە بۆ نێوان موسوڵمانان‌و ناموسوڵمانان وەکوو ئەم تەصریحی پێ دەکاو دەفەرموێ:

{وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ — الأنفال/ ٧٣}.

ئیبنولعەرەبی دەڵێ: پەروەردگار وەلایەو موناصەرەی نێوان کافرو موسـوڵمانی لێـك پـچڕاندووە، موسـوڵمانان هەنـدێکیان ئـەولیاو یارمەتیـدەری هەنـدێکیانن. کافرەکـان هەنـدێکیان وەلی‌و یارمەتیـدەری

---

١ - أحكام القرآن ٢/٨٧٦.

یەکترن، لەچوار چێوەی ئەحکامو یاسای ئایینی خۆیاندا یارمەتی یەکتر دەدەن، بەگوێرەی بیرو باوەڕی خۆیان مامەڵە دەکەن«١».

گومانیش لەوەدانیە کە جێبەجێ کردنی ئەم تەعالیمە خوداییيانە ئەساسو بنەمای هاوکاری کردنی موسوڵمانانە بۆ یەکتری لەهەموو چەرخو رۆژگارێکدا. هەروەکوو چون پاشگوێ خستنی ئەم تەعالیمانە لەلایەن موسوڵمانانەوەو رو وەرگێڕانیان بۆ حاڵە پێچەوانە بنەماو ئەساسی ئەو حاڵەتە نەخوازراوەیە: کە ئەمڕۆ موسوڵمانان تێی کەوتون لەلاوازبوونو پەرتەوازە بوونو بێ دەسەڵاتییان بەرامبەر هێرشو پەلاماری دوژمنانیان کە لەهەموو لایەکەوە پەلامار درابوونو دوژمنانیان دەمیان ژەنیوەتە کیانو ماڵو سامانو وڵاتیانەوەو خەرجو پیتاکو داهاتیان بەفیڕۆ دەبەن.

## کۆچکردنی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) بۆ مەدینە

وەکوو لەکتێبە صەحیحەکانی سوننەدا هاتووەو چەسپاوە هەروا زانایانی سیرە گێڕاویانەتەوە، دەڵێن: حەزرەتی ئەبوبەکر: کە دەیبینی موسوڵمانان بەرودوا کۆچ دەکەن بۆ مەدینەو پرۆسەکە رێبازی سروشتی خۆی گرتۆتەبەر، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد رێگای بدا ئەویش کۆچبکاو مەککە جێ بێڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نا، پەلەمەکەو دان بەخۆتا بگرە. منیش بۆ خۆم چاوەڕێی ئیزنم. ئەبوبەکر عەرزی کرد: ئایا «دایکو باوکم بەقوربانت بن» تۆیش چاوەڕێی ئیزن دانی؟ فەرمووی بەڵێ. ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر خۆی هێشتەوە بەو هیوایەی لەخزمەت ئەودا کۆچبکا، ئیتر دوو وڵاخی

---

١ - أحكام القرآن ج ٨٧٦/٢.

بەکاری ئامادەکردن و ماوەی چوار مانگ ئالیك و جۆی باشی پێدان و خزمەتی کردن.

لەلایەکی ترەوە قورەیشییەکان زانییان کە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا یارمەتیدەرو شوێنکەوتوی بۆ پەیدابوون دەسەلاتیشیان بەسەر مەدینەدا ناشکێ. زۆر لەوەترسان پێغەمبەر کۆچ بکا بۆ ئەوێ و هێزو لەشکر پێکەوە بنێ بۆ شەڕکردن دژیان. بۆیان دەرکەوت ئەگەر بێت و ئەوە روبدا ئیتر بەتەواوی دەکەونە تەنگژەوە و کارەکەیان لێ قورس دەبێ.

بۆیە خێرا کۆبونەوەی نائاساییان راگەیاندو لە «دار الندوة»: کە ماڵی قوصەی کوڕی کیلاب بوو کۆبوونەوە. قورەیشییەکان داب و نەریتیان وابوو بۆ هەموو کارێکی گرنگ لە «دار الندوة» کۆدەبوونەوە. هەموو بڕیارێکیان لەوێدا دەدا. پیاو ماقوڵانی قورەیش لەو ماڵەدا کۆبوونەوە بۆئەوەی بڕیاربدەن دەربارەی پێغەمبەر چی بکەن و چی نەکەن.

دوای راوێژو لێکۆڵینەوە هاتنەسەر ئەو بڕیارە کە لەهەر بنەماڵەو هۆزێك کوڕێکی گەنجی ئازاو چاو نەترس دەست نیشان بکەن هەریەکەیان شمشێرێکی تیژی بدرێتە دەست لەشەوێکدا بە کۆمەڵ هێرش بکەنە سەر پێغەمبەرو لەناوی بەرن. بۆئەوەی خێڵی بەنو عەبدولمەناف نەتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو خێڵەکانی قورەیش بکەن. خوێنەکەشی دەکەوێتە سەر هەموو هۆزەکان و بکوژێکی دیاریکراوی نابێ. ئەمەیان بڕیارداو رۆژێکی دیاریکراویشیان دانا بۆ ئەنجامدانی پیلانەکەیان. حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای چۆنیەتی پیلانەکەی پێراگەیاندو فەرمانی پێکرد کە کۆچ بکاو ئەو شەوەش لەجێگای پێشووی نەخەوێ«[١]».

---

١ - سیرة ابن هشام ج ١/١٥٥ وطبقات ابن سعد ٢١٢.

ئیمامی بوخاری لەخاتوو عائیشەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: لەکاتێکدا ئێمە لەماڵی ئەبوبەکردا دانیشتبوین، جەنگەی گەرمای نیوەڕۆ بوو، یەکێك هات بە ئەبوبەکری گوت: ئەوە پێغەمبەرە دەمو چاوی خۆی شاردۆتەوە، بەردەماخی کردووە، لەساتێکدا بوو کە لەوەپێش لەو دەمانەدا نەدەهات بۆ ماڵمان. ئەبوبەکر وتی: دایكو باوکم بەقوربانت بێ، وەڵڵاهی هاتنی ئەو لەم کاتەدا بێ سیڕنیە. عائیشە درێژە بەقسە گێڕانەوەکە دەداو دەڵێ: پێغەمبەر هاتو ئیزنی وەرگرت، روخصەتی هاتنە ژوورەوەی درایەو هاتە ژوورەوە ئەوجا پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو ئەبوبەکر ئیشم پێتە بابچینە دەرێ. ئەبوبەکر وتی: قوربان! ئەمانە خاوو خێزانمن پێویست ناکا شتەکە لەوان بشاریەوە دایكو باوکم بەقوربانت بن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیزنم پێدراوە بۆ کۆچکردن دەبێ لەمەککە دەربچین، ئەبوبەکر وتی: فەرموو لەو دوو وڵاخە جڵەوی یەکیان بگرە دەست، پێغەمبەر ﷺ دەبێ پارەی خۆی حیساب بکەی دوایی دەتدەمێ.

عائیشە دەڵێ: ئیتر بەباشترین شێوە تێشووی پێویستمان بۆ پێچانەوە، تێشووەکەمان بۆ کردنە ناو هەمبانەو، توێشودانەوە، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر پارچەیەکی لە پشتێنی خۆی بڕیو دەمی هەمبانەکەی پێ بەست، بۆیە نازناوی «ذات النطاق»ی درایە[١].

پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای عەلی کوڕی ئەبو طالیب، فەرمانی پێکرد کە ببێتە وەکیلی تا سپاردەو شتی: کە لای دانراوە هی خەڵکی مەککە بۆیان بگێڕێتەوە، چونکە دانیشتوانی مەککە زۆریان بتمانە پێ بوو،

---

١ - في طبقات ابن سعد: انها شقت نطاقها فأوكأن بقطعة منه الجاب وشدت ضم الجران بالباقى فسميت ذات النطاقين.

هەرکەسێکیان شتێکی بەنرخی هەبوایەو ترسی لێی بوایە لای پێغەمبەر بەئەمانەت دایدەنا.

ئەبوبەکریش عەبدوڵلای کوڕی راسپارد کە بچێتە ناو خەڵکەوە گوێی خۆی هەڵبجا ئاخۆ دەربارەیان چی دەڵێن و چۆن باسیان دەکەن. بەڕۆژ بچێتە ناو کۆڕو کۆمەڵیان و بەشەو بێ بۆلایان چی هەواڵێکی دەست کەوت پێیان رابگەیەنێ. ئەمجار فەرمانی بەعامیری کوڕی فوهەیرە «نۆکەرەکەی» کرد کە بەڕۆژ مەڕو بزنەکانی بۆ بلەوەڕێنێ دەمەو ئێوارە بیان هێنێ بۆلای ئەشکەوتی ثەور شیریان لێ بدۆشێ و بۆیان بەرێ بیخۆنەوە، فەرمانی بە ئەسمائی کچیشی کرد کەهەموو ئێوارەیەك خواردنیان بۆ بکاو بۆیان بەرێ.

ئیبنو ئیسحاق و ئیمام ئەحمەد هەردوکیان لە یەحیای کوڕی عوبادی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکر دەگێڕنەوە: گوتوویەتی: کە پێغەمبەر لەگەڵ ئەبوبەکر رۆیشتنە دەرەوە ئەبوبەکر هەرچی پارەو پولێکی هەیبوو هەمووی لەگەڵ خۆی برد پێنج هەزار یان شەش هەزار دیرهەم بوو هەمووی لەگەڵ خۆی برد.

عائیشە دەفەرموێ: ئەبو قوحافەی باپیرم هاتە لامان «چاوی کوێر بوو بوو» وتی: وابزانم، باوکتان ماڵی وێران کردون و هیچی بۆ نەهێشتونەوە، چی هەبووە لەگەڵ خۆی بردویەتی، وتم: نەخەیر وانیە ماڵ و سامانێکی زۆری بۆ جێهێشتوین، ئەمجار دەفەرموێ: کۆمەڵێکم بەرد خڕکردنەو بردمن لەو شوێنە دامنان کەکاتی خۆی باوکم پارەو شتی وای لێ دادەنا، ئەمجار قوماشێکم پێداداو پاشان دەستیم گرت بردم بۆ شوێنەکەو وتم: باپیرە دەستت بخەرە سەر ئەوماڵە، دەستی خستە سەر کۆمەڵەکە وتی: ئەگەر ئەوەندەی بۆ جێهێشتبێ باشەو شتێکی باشی کردووە. عائیشە دەفەرموێ: من ویستم ئەو پیاوە پیرە کوێرە بێ دەنگ بکەم، ئەگینا هیچی بۆجێ نەهێشتبووین.

ئەو رۆژەی پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرچو بوو، کەشەو داهات موشریکە قورەیشییەکان لەدەوری ماڵی پێغەمبەر کۆبونەوە، چاوەڕێی ساتی سفریان دەکرد بۆئەوەی هەلیان بۆ هەڵبکەوێ، پێغەمبەر شەهید بکەن. وەلێ پێغەمبەر ﷺ بەناویاندا هاتەدەرو خودا وەنەوزی خەوی بەسەردا هێنابوون بەسەلامەتی لەوان رزگاری بوو، عەلی کوڕی ئەبو طالیبی لەشوێنی خۆی جێ هێشتبوو، لەشوێنی خۆی بنوێ، دڵنیاشی کردبوو: کەهیچ زیانی پێ ناگا.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵی بەڕێزیدا حەزرەتی ئەبوبەکردا بەرەو ئەشکەوتی «ثەور» رۆیشتن بۆئەوەی ماوەیەك لەوێدا بۆماوەیەك بمێننەوە، ئەمەش رێکەوتی رۆژی مانگی رەبیعولئەولی بەرامبەر بە «٢٠ ئەیلوولی ساڵی/٦٢٢م» بووە، سیانزە ساڵی تەواو دوای هاتنی یەکەم پەیام بۆ پێغەمبەر ﷺ کە گەیشتنە بەردەرگای ئەشکەوتەکە ئەبوبەکر پێش پێغەمبەر چووە ناوەوە بەتاقی کردەوە بۆئەوەی دڵنیابێ لەوەی ناو ئەشکەوتەکە هیچ دڕندەو مارو دوپشکی تێدانییە، خۆئەگەر شتێك هەبێ با زیانەکەیان روبکاتە ئەبوبەکر خۆی، بەم جۆرە حەزرەتی ئەبوبەکر بەگیانی خۆی پارێزگاری لە پێغەمبەر بکا.

پێغەمبەرو هاوەڵەکەی سێ رۆژ لەوێدا مانەوە، شەوانە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر دەهاتە لایان‌و هەواڵی مەککەو مەککەییەکانی پێ رادەگەیاندن‌و لایان دەمایەوە تاشەو بەرەو کۆتایی دەڕۆیی، ئەمجار لەکۆتایی شەودا دەگەڕایەوە، لەکاتی کازیوەی بەیاندا دەگەیشتەوە مەککەو وای خۆپیشان دەدا کەشەو لە مەککەدا بووە. عامیری کوڕی فوهەیرە هەموو شەوێ مەڕو بزنەکانی دەبردنە دەوری ئەشکەوتەکە، کە عەبدوڵڵا لەلای پێغەمبەرو هاوەڵی دەردەچوو ئەو مەڕو بزنەکانی بەو رێگایەی عەبدوڵڵا پێی دەگەڕایەوە دەئاژوت بۆئەوەی شوێن پێی عەبدوڵڵا بشارنەوە.

قوڕەیشییەکان موشریکەکان لەلایەن خۆیانەوە کەبیستیان پێغەمبەر لەمەککە دەرچووەوە، کەوتنە خۆو بەهەڵە داوان بەهەموو ئەو ڕێگایانەی لەمەککەوە دەردەچن بڵاوبوونەوە بەتایبەتی ئەو ڕێگایەی بەرەو مەدینە دەچێ، هەر شوێنێك گومانیان بۆچوو پشکنیانو کێوو ماڵیان کرد تا سەرەنجام گەییشتنە ئەشکەوتی ثەور، پێغەمبەرو هاوەڵی گوێیان لەدەنگی قاچی موشریکەکان بوو: کە بەدەوری ئەشکەوتەکەدا دەهاتنو دەچوون. ترسو دڵەکوتەکە حەزرەتی ئەبوبەکری گەیاندە حاڵەتێك عەرزی پێغەمبەری کرد، وتی: ئەگەر یەکێکیان بڕوانێتە ژێر قاچی خۆی ئێمە دەبینێ، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر ترست نەبێ، ئەتۆ رات چییە بەدوو کەس خودا سێیەمیان بێ. ئێمە خودامان لەگەڵە.

ئیتر پەروەردگار چاوی موشریکەکانی لەدیتنیان لادا، تەنانەت هیچیان ئەوەی بەخەیاڵدا نەهات سەرنجی ئەشکەوتەکە بدەن، ئاخۆ چی تێدایەو کەسیان پرسیاری لەوە نەکردو ئەوەیان بەخەیاڵدا نەهات.

جا کەگەڕانی قوڕەیشییەکان بەکۆتا هاتو دڵنیابوون لەوەی دەستیان بیانگاتێ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەط «ئەوکاتە موشریك بوو» بەپارە بەکرێیان گرتبوو بۆئەوەی چاوساغی ڕێگەیان بێو بتوانێ بەڕێگەی قاچاغەڕێدا بیانبا بۆ مەدینە، هەڵبەتە پێش وەخت قسەی لەگەڵدا کرابوو لێشی دڵنیابوون کەراستییان لێ ناڵێو موشریکەکانیان لێ ئاگادار ناکا. لەسەر وادەی دیاریکراو بەهەردوو وڵاخی لەوەپێش ئامادەکراوە وە لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە ئامادە بوو، بەچاو ساغی عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەط بەڕێگای کەنار دەریادا کەوتنە ڕێ.

موشریکەکان خەڵاتی گەورەو چەوریان دانابوو بۆ هەرکەسێك بتوانێ پێغەمبەرو ئەبوبەکریان بۆ دەستگیر بکاو تەسلیمیان بکا، هەندێ

کەس دەڵێن: خەڵاتەکەی بریتی بووە لەسەد حوشتر لەبارتەقای گرتنی هەریەکێکیان.

ڕۆژێك لەکاتێکدا هۆزی بەنو مودلیج لەیانەی خۆیان دانیشتبوون، «سوراقەی کوڕی جەعشەم»یش لەوێ بوو، کابرایەکیان هات وتی: من پێش ئێستا تارماییەکم بینی لەکەنار دەریا دەڕۆیشتن، پێم وابێ ئەوە موحەممەدو هاوەڵەکانی بوون. سوراقە زانی کە ئەوە ئەوانن. بەڵام ویستی کەسانی دی تەماعی ئەوە نەیانگرێ شوێنیان بکەوێ، بۆیە وتی: کوڕە لەوانەیە تۆ فلان و فلانت دیبن کە ئاژەڵ و شتی وایان لێ گومبووە بەشوێنیاندا گەڕابن، پاشان زۆر لەکۆڕەکەدا نەمایەوە، تەماعی خەڵاتە چەورەکە گرتبووی هاتەوە ماڵەوە بەدزی خەڵکەکە سواری ئەسپەکەی بوو دەستی کرد بە ئاوزەنگی لێدان و ئەسپی تاودا، لەشوێنێك پێیان گەیشت و لێیان نزیك بۆوە، ئەسپەکەی نسکۆی بردو سوراقە گلا، هەرخێرا هەڵسایەوە سواربۆوە کەوتە شوێنیان و سووربوو لەسەر ئەوەی بیانگێڕێتەوە، ئەوەندەیان لێ نزیك بۆوە گوێی لەقورئان خوێندنی پێغەمبەر بوو هیچ ئاوڕی نەدەدایەوە، بەڵام ئەبوبەکر زۆری ئاوڕ دەدایەوە. دوبارە ئەسپەکەی نسکۆی بردو سوراقە گلایەوە، خێرا هەستایەوە سواربۆوە سوور بوو لەسەر شوێنکەوتنیان، کاتێ چاویان پێکەوت و پێغەمبەرو ئەبوبەکریش دیتیان ئیتر لەنکاوێك هەردوو دەستی ئەسپەکەی تا ئەژنۆیانی بەزەویدا ڕۆچون و لەسەر پشتی گلا، پاشان تێی راخوڕی و هەڵسایەوە، کە دەستەکانی دەرهێنانەوە لەشوێنی دەستەکانی تەپ و تۆزێکی زۆر بەرز بۆوە وەکوو دوکەڵ وابوو، سوراقە کە ئەم دیاردەی بینی بۆی ئاشکرابوو کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە و خودا پارێزگاری دەکا، ترسێکی گەورە چووە دڵیەوە و بانگی لێ کردن و داوای ئەمانی کرد.

پێغەمبەرو هاوەڵانی راوەستان هەتا گەیشتە لایان، عوزری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنایەوەو داوای لێکرد داوای لێخۆشبوونی بۆ لەخودا بۆبکا. ئەمجار وتی ئەگەر توێشوو کەل و پەلتان پێویستە تابۆتان دابین بکەم، وتیان پێویستمان بەهیچ نیە وەلێ لێمان لەهەرا مەدەو هەواڵی ئێمە بەکەس مەڵێ. وتی: بێ خەمبن.

پاشان سوراقە بەرێگای خۆیدا گەڕایەوە بۆ مەککە تووشی هەرکەسێك بوایە هەواڵی پێغەمبەرو ئەبوبەکری بە چەواشەیی و پێچ و پەنا پێ دەگوت و راستی لێ دەشاردەوە. بۆئەوەی کەس شوێنیان هەڵ نەکاو نەزانێ رویان لەکوێ کردووە. ئابەم جۆرە بەیانی بەغاردان چوو بۆ کوشتنی پێغەمبەرو هاوەڵەکەی، ئێوارە دەگەڕایەوە پارێزگاری لێ دەکردن شوێنە هونی لێ دەکردن شوێن و رێگای لەخەڵکی دەشاردنەوە.

## گەیشتنی پێغەمبەر بە قوبا

پێغەمبەر ﷺ گەییشتە قوبا، دانیشتوانی پێشوازییان لێ کردو چەند رۆژێك لەوێ مایەوە میوانی کلثومی کوڕی هەدم بوو، لەوێ عەلی کوڕی ئەبو طالب پێی گەیشتەوە، دوای ئەوەی لەمەککە سپاردەکانی پێغەمبەری دابوونەوە بە خاوەنەکانیان، پێغەمبەر ﷺ لەوێ مزگەوتی قوبای بنیات نا: کە مزگەوتێکی پیرۆزەو یەکەم مزگەوتە کە لەسەر دەستی پێغەمبەر دروستکراوە، ئەو مزگەوتەیە کەخودا لە قورئاندا وەصفی کردووەو دەفەرموێ: {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ — التوبة/١٠٨}.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ درێژەی بە سەفەرەکەیداو دوانزەی مانگی رەبیعولئەوەل وەکوو مەسعوودی دەڵێ: چووە ناو شاری مەدینەوە«١».

---

١ - مرج الذهب ج ٢٧٩/٢.

دانیشتوانی مەدینە پێشوازییەکی بێ وێنەیان لێکرد، لەناو ئاپۆرەی جەماوەردا جڵەوی وڵاخەکەی شل کردبوو دەڕۆیی، هەریەکەو هەوڵی دەدا جڵەوی وڵاخەکەی بگرێو پێغەمبەرو هاوەڵانی میوانی بن‌و شەرەفمەندی خانە خوێی ئەو زاتەی پێ ببڕێ. بەڵام پێغەمبەر هەر دەیفەرموو لێی بگەڕێن بابڕوا ئەو فەرمانی پێکراوە. ئیتر وڵاخەکە بەناو کۆچەو کۆڵانی مەدینەدا ڕۆیشت تاگەیشتە «مربد»«١». کە مڵکی دوو هەتیوی هۆزی بەنو نەجار بوو، لەپێش دەرگای ماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری. پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە شوێن‌و مەنزڵمانە خوا حەزبکا. ئیتر ئەبو ئەییوب هات بارو بارگەنەکەی بردە ماڵی خۆیان، گەنج‌و لاوی بەنو نەجار هەموویان لەماڵەکانیان هاتنەدەرو دەستیان کرد بە هوتاف کێشان‌و دەربڕینی کەیفخۆشی. وەکوو ئیبنو هیشام ڕیوایەتی کردووە دەڵێ ئافرەتە گەنجەکانی هۆزی بەنو نەجار بوو، ئەوەندەیان پێ خۆش بوو کە پێغەمبەر بووەتە جیرانیان بەدەنگی بەرز ئەم نەشیدەیان دەخوێندەوە:

«نحن جوار من بنى النجار          ياحبذا محمداً من جار»

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئەوە ئێوە منتان خۆش دەوێ؟ وتیان بەڵێ. فەرمووی: {ألله يعلم أن قلبي يحبكنّ} خودا ئاگادارە دڵم ئێوەی خۆش دەوێ.

## وێنەیەك لەشوێن‌و جێگای پێغەمبەر لەماڵی ئەبو ئەییوب

ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبەو ئیبنو ئیسحاق‌و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەچەند ڕێگای جیا جیاو بە وشەو ڕستەی لێك نزیك

١ - زەوییەك بوو خورمای لێ وشك دەکرایەوە.

ریوایەتیان کردووە. دەڵێن ئەبو ئەییوبی ئەنصاری باسی ئەو رۆژگارەی دەکرد کە پێغەمبەر لەماڵی ئەواندا بووە. دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ میوانی ماڵی ئێمە بوو، لەماڵی ئێمەدا نیشتەجێ بوو، خانووەکەمان دوو نهۆم بوو. پێغەمبەر لەنهۆمی ژێرەوەو منو «أم ایوب» لەقاتی سەرەوە بووین. عەرزی پێغەمبەرم کرد «باوكو دایکم بەقوربانت بن» من پێم ناخۆشەو بەلامەوە گرانە ئێمە لەنهۆمی سەرەوە بینو تەشریفت لەنهۆمی ژێرەوە نیشتەجێ بێ. تەشریفت تۆ وەرە نهۆمی سەرەوە، ئێمە دەگوێزینەوە بۆ نهۆمی ژێرەوە. پێغەمبەر فەرمووی: ئەی ئەبو ئەییوب بۆ ئێمەشو بۆ ئەوانەی لەگەڵمدانو بۆ ئێوەش کە لەسەرەوەمانن وا گونجاوەو لەبارە ئێمە لەقاتی خوارەوە بین.

ئەبو ئەییوب دەڵێ: رۆژێك کۆپە ئاوەکەمان شکا ئاو بڵاوبۆوە، لێفەو پێخەفمان نەبوو جگە لەپارچە قەدیفەیەك، منو ئوم ئەییوب پارچە قەدیفەکەمان هێنا ئاوەکەمان وشك دەکردەوە لەترسی ئەوەی نەبادا ئاوەکە دایداتە خوارەوەو دڵۆپە ئاو بەر پێغەمبەر بکەوێو ئازاری توش بێ، ئیتر دابەزیمە خزمەتیو بەترسو شەرمەوە داوام لێکرد کە بگوێزێتەوە بۆ نهۆمی سەرەوە. ئیتر وازم نەهێنا تا رازیم کرد بگوێزێتەوە بۆ سەرەوە.

دەڵێ ئێمە نانی ئێوارەمان بۆ دروست دەکردو دەماننارده خزمەتی، جا ئەگەر سینیو قاپەکانی دەناردەوە بۆمان منو ئوم ئەییوب دەمانەویست بزانین پێغەمبەر دەستی لەکوێی قاپو جامەکان کەوتووەو لەکوێوەی خواردووە، بۆئەوەی ئێمە لەو بەرماوە بخۆینو خێرو بەرەکەتمان دەست بکەوێ. شەوێك خواردنمان بۆ نارد لەناو خواردنەکەدا پیيازو سيری تێدابوو، پاش ماوەیەك خواردنەکەی ناردەوە نەمبینی دەستی بۆ بردبێ. بە ترسەوە چومە خزمەتیو عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! «بەدایكو باوکەوە بەقوربانت بم» خواردنەکەت

ناردۆتەوە دیاردەی ئەوەی پێوەنەبوو کەلێت خواردبێ ئێمە وامان خو پێوە گرتبوو هەموو جارێ کە خواردنەکەت دەناردەوە من و ئومو ئەیووب بەشوێنی شوێن دەستی تۆدا بگەڕێین و لەو بەرماوە بخۆین و فەڕو بەرەکەتمان دەست بکەوێ.

پێغەمبەر فەرمووی: من لەناو خواردنەکەدا بۆنی ئەو رووەکەم کرد، منیش شەوانە لەگەڵ خودای خۆمدا موناجات و پاڕانەوەم هەیە. ئێوە بیانخۆن. ئەبو ئەییوب وتی: ئیتر ئێمە خواردنەکەمان خوارد، پاشان ئێمە بەهیچ جۆرێك سیرو پیوازمان تێکەڵ بەو خواردنە نەدەکرد کەبۆ پێغەمبەرمان سازدەکرد.

## پەندو ئامۆژگاری:

لەبەشێکی پێشووی ئەم نووسینەدا لەکاتی تەعلیقمان لەسەر کۆچکردنی موسوڵمانەکان بۆ حەبەشە، قسەمان لەمانای کۆچکردن لەئیسلامدا کرد، پوختەی قسەکەمان ئەوەبوو:

وتمان: پیرۆزیی و قودسییەتی ئایین و عەقیدە لەژوور هەموو شتێکەوەن. زێدو نیشتمان و ماڵ و سامان و جاهو پلەو پایە هیچ بەهاو نرخێکیان نامێنێ ئەگەر لەو شوێنەدا بیروباوەڕو شەعائیری ئایین لەمەترسیدا بن و گەمارۆ بدرێن، رێگە نەدرێ وەکوو پێویست ئەنجام بدرێن. بۆیە پەروەردگار بەپێویستی داناوە کە موسوڵمانان هەموو شتێك بکەنە قوچی قوربانی لەپێناو ئاییندا. لەکاتی پێویستدا هەموو شتێك بەلاوە بنێن.

هەروەها گوتمان: داب و نەریتی خودا لە بونەوەردا واجاری بووە: کە هەمیشە هێزە مەعنەوییەکان: کە لەبیرو باوەڕی ساخ و ئایینی راستدا بەرجەستە دەبن «پارێزەرو هۆکاری بەردەوامبوونی مەکاسیبی مادی و هێزە مادییەکانن. چەندێك نەتەوەو گەل لە ئەخلاقدا دەوڵەمەند

بن‌و پابەندی ئایینی راست‌و صەحیح بن. ئەوەندە دەسەڵاتی مادییان کە بریتییە لە وەتەن‌و ماڵ‌و شکۆمەندی» بەهێزو یەکگرتوو رەگە داکوتراوو خۆگرو بەردەوام دەبن. چەندێك لەبارەی رەوشت‌و ئەخلاقەوە لاوازو هەژاربن، بیرو باوەڕیان چەواشەکاری تێدابێ ئەوە بێگومان دەسەڵاتە مادییەکانیان لاوازو نزیك لەتوانەوەو نەماندا خۆیان دەبیننەوە. هەروەها وتمان: مێژوو باشترین شایەتە لەسەر ئەو راستیانە.

بۆیە پەروەردگار بنەمای قوربانیدان بەماڵ‌و سامان‌و زێدو نیشتمانی لەپێناو عەقیدەو ئاییندا. ئەگەر پێویست بوو «کردووە بەمەرجی سەرەکی بۆ پایەداربوون‌و لەدەست نەدانی دەسەڵاتی مادی‌و زێدو ماڵ‌و سامان» بەو جۆرە قوربانیدانە موسوڵمانان دەتوانن ماڵ‌و سامان‌و زێدو نیشتمان‌و ژیانیان بپارێزن، هەرچەندە جار جار وابێتە بەرچاو کە ئەوان روتکراون لەو هێزە مادییانەو لەدەستیان داون.

باشترین بەڵگەمان لەسەر ئەم حەقیقەت‌و راستییە هیجرەتی پێغەمبەرە ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە. بێگومان بەگوێرەی ظاهیرو رواڵەت هیجرەتەکە بەجێهێشتنی وڵات‌و لەدەستدانی بوو، بەڵام لە واقیعدا پارێزگاری لێ کردن‌و ضەمان بوو بۆی. زۆر دیاردەو مەظاهیری پارێزگاری لە وڵات وادەبێ لەشێوەی بەجێهێشتن‌و وازهێنان لێی خۆی دەنوێنێ. ئەوەتا پێغەمبەری مەزن دوای چەند ساڵێك لە کۆچکردن‌و زێدو نیشتمان بەجێهێشتن. بەهۆی ئەو ئایینەی کە شکۆمەندی‌و دەسەڵات‌و دەوڵەتی بۆ دامەزراندبوو گەڕایەوە بۆ ئەو وڵاتەی لێی دەرکرابوو، چۆن گەڕانەوەیەك سەر بەرزانەو پشت ئەستورو بێ باك، بەبێ ئەوەی یەکێك بتوانێ لەوانەی تەنگیان پێ هەڵچنیبوو لەهەل

دەگەڕان دەستیان کەوێ بیکوژن بتوانێ بەمەبەستی زیان پێگەیاندن لێی نزیك بێتەوە.

بائێستا بگەڕێینەوە بۆ تێفکرین لەوەی گێڕامانەوە لەسیرەی پیرۆزی بۆئەوەی دەلالاتو ئەحکامی گرنگی لێ هەڵگوێزینو بۆ موسوڵمانانی بخەینەڕو.

١- دیاریتر مەظهەرێك کە بۆمان دەردەکەوێ لەم بەشەی چیرۆکی کۆچکردنیدا هێشتنەوەی حەزرەتی ئەبوبەکرە، کە ئیزنی نەدا پێش خۆی کۆچ بکا، بۆئەوەی ببێتە هاوەڵو هاوڕێی سەفەری کۆچی.

زانایان لەم چیرۆکە ئەندازەی زۆر خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ ئەبوبەکریان دەرهێناوە. ئەوەیان چەسپاندووە کە ئەم زاتە خۆشەویستترین کەسە لەهاوەڵانیو شیاوترین کەس بووە دوای خۆی ببێتە خەلیفەو جێنشینی. ئەوەی کەئەم دەلالەتە بەهێزدەکا چەند بەڵگەیەکن وەکوو ئەوە کە لەکاتی نەخۆشییەکەیدا کردی بە جێنشینی خۆی بۆئەوەی پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان بکاو رازی نەبوو جگە لە ئەبوبەکر کەسێکی تر ببێتە پێشنوێژ بۆیان. هەروا ئەو حەدیثە صەحیحەی کە فەرموویەتی: {وَلَوْ كُنتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً} «١».

بێگومان حەزرەتی ئەبوبەکر «وەکوو زانیمان» لەئاستی ئەم تایبەتمەندییەدا دابوو: کەخودا رێزی لێ نابوو، شیاوی ئەو پلەو پایە بوو، نموونەی هاوڕێی راستو خۆبەختکەرو گیانفیدا بوو بۆ پێغەمبەر، ئامادەبوو گیانو ماڵی خۆی لەپێناو پێغەمبەردا بەخت بکا. بینیمان کاتی گەیشتنە ئەشکەوتی «ثەور» چۆن پێش پێغەمبەر چووە ناو

---

١ - مسلم ١٠٥/٧.

ئەشکەوتەکەو نەیهێشت پێغەمبەری پێشی بکەوێ ئەمەش لەم روانگەوە نەبادا لەناو ئەشکەوتەکەدا دڕندەو مارو دوپشك و شتی وای تێدابێ زیانی پێ بگەیەنن. هەروا بینیمان چۆن لەکاتی کۆچکردنەکەدا کوڕو کچ و بەندەو شوانی مەڕو بزنی و هەموو ماڵ و سامانی خۆی خستبووە گەڕ لەپێناو خزمەتکردنی پێغەمبەر ﷺ لەم سەفەرە پڕ نارەحەتی و درێژخایەن و ناخۆشەدا.

بەڕاستی ئەم هەڵوێست و رەوشتانە ئەوانەن کە پێویستە لەهەموو کەسێکی موسوڵماندا رەنگ بداتەوەو خۆی پێ ئارایش بدەن بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ: {لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَـدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ}«[١]».

وێدەچێ بێتە دڵی موسوڵمانەوە کە بەراوردێك بکا لەنێوان کۆچی عومەری کوڕی خەطاب و کۆچی پێغەمبەرداو پرسیاربکا بۆچی عومەر ئاوا بەئاشکرا کۆچی کردو بەبێ ترس و بیم تەحەددای موشریکەکانی کرد، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ بەو هەموو ئیحتیاتکردن و دزییەوە کۆچی کرد؟ تۆ بڵێی عومەری کوڕی خەتتاب لە پێغەمبەر ئازاتر بووبێ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: عومەری کوڕی خەتتاب یان هەر موسوڵمانێکی تر جگە لە پێغەمبەر هەڵس و کەوتی هەڵسوکەوتێکی شەخصی خۆیەتی و نابێتە بەڵگەی تەشریع، کەوابوو بۆی هەیە بە ئارەزۆی خۆی رێبازو وەسیلە هەڵبژێری و چی گونجاوە لەگەڵ ئازایەتی و بوێری خۆیدا ئەوە رەچاو بکا.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ موشەریعە، واتە هەموو هەڵس و کەوتێکی کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێ بۆ ئێمە دەبێتە شەرع و یاسا و پێویستە

---

١ - متفق عليه.

شوێنی بکەوین. بۆیە سوننەتی ئەو کە «قسەو کردارو رەوشت و تەقریر»ە هەموویان بوونە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت. جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وەکوو عومەری کوڕی خەتتاب کۆچی بکردایە، خەڵك وایدەزانی کەهەر ئەو شێوە واجبەو وریایی و حیطەو حەزەرو خۆشاردنەوە لەکاتی ترسدا دروست نییە. وێڕای ئەوەش پەروەردگار شەریعەت و یاسای خۆی لەم جیهانەدا بەگوێرەی داخوازیی هۆکارو موسەببەبات دامەزراندووەو رێکی خستووە. هەرچەندە هەموو شتێك بەدەست خودا خۆیەتی و خۆی هۆکارەکان دەرەخسێنێ و هەموو شتێك بە ویست و ئیرادەی ئەو دێتەجێ.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەموو شێوازو هۆکارێکی مادی لەم جۆرە کارانەدا کە عەقڵی ئادەمیزادی پەی پێ بەرێ رەچاوکردووە. تەنانەت هیچ هۆکارێکی لەم هۆکارانە پاشگوێ نەخستووەو بەوپەڕی وریایی و لێ زانییەوە رەچاوی کردووەو بەکاری هێناوە. ئەوەتا بۆ نموونە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی لەشوێنی خۆی دانا بۆئەوەی لەجێگا نوستنی ئەو بخەوێ و بوردەی ئەو بەخۆیدادا. یەکێك لە موشریکەکانی بەکرێ گرت «کە لێی دڵنیا بوو» تا چاو ساغییان بکاو بەرێگایەکدا بیانبا کەس زەینی بۆنەچێ. کوێرە رێگایەك بگرێتەبەر کافرەکان بەخەیاڵیاندا نەیە. سێ رۆژ لە ئەشکەوتی ثەوردا خۆی حەشارداو گەلێ رەچاوکردنی هۆکاری ترو گرتنەبەری ئیحتییات و هۆکاری مادی کە عەقڵ لێیان ورد دەبێتەوەو بەباشیان دەزانێ.

ئەمەش بە مەبەستی رونکردنەوەی حەقیقەتێك کە بریتییە لەوەی بڕوابوون بەخوداو پشت پێ بەستنی دژایەتی نییە لەگەڵ بەکارهێنانی هۆکاری مادی و کەخودا خۆی دەیانڕەخسێنێ و بە حیکمەتی خۆی دەیانکاتە ئەسباب.

ئەم هەموو حیطەو حەزەرەی کە پێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی کرد هۆکارەکەی ئەوە نەبوو لەخۆی بترسێ، یان گومانی هەبێ لەوەی پێش ئەوەی بگاتە مەدینە بکەوێتە ژێر چنگی قورەیشییەکان هەرگیز نەلەوە ترساوە نەگومانی لەوە هەبووە، بەڵگەمان لەسەر ئەو بۆچوونە ئەوەیە: پێغەمبەر دوای ئەوەی هەموو هۆکارە مادییەکانی پەیڕەوکردن، موشریکەکان بەدەوری ئەشکەوتەکەدا دەسووڕانەوەو پێغەمبەریش لەناویدا بوو ئەوەندەیان لێ نزیك بوونەوە ئەگەر یەکێکیان تەماشای قاچی خۆی بکردایە پێغەمبەرو ئەبوبەکریان دەبینی، حەزرەتی ئەبوبەکریش بەمە ترسی لێ نیشت دڵەکوتەی پێکەوت، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ دڵنەوایی دەکردو ترسی لێ دەڕەواندەوە بە ئەبوبەکریشی فەرموو: ئەی ئەبوبەکر! ئەتۆ گومانی چی بەدوو کەس دەبەی خودا سێیەمیان بێ؟ دەی ئەگەر بەگوێرەی ئەو هەموو حیطەو حەزەرەی کردیو بەرچاوگرتنی ئەو هەموو هۆکارە مادییانەی باسمان کردن دەبوایە لەوکاتەدا ترس‌و خۆفێکی بەسەردا بهاتایە!!

بێگومان ئەوەی ئەنجامیدا لە ئیحتیات‌و خۆ پەناگرتن‌و خۆشاردنەوە وەظیفەو ئەرکێکی تەشریعی بوو ئەنجامیدا کە تەواوی کرد، ئەمجار دڵی پەیوەست بوو بەخوداوە، پشتی بەپارێزگاری کردن‌و تۆفیقی ئەو بەست. بۆئەوەی ئەوە فێری موسوڵمانان بکا: کە لەهەموو شتێك دەبێ پشت بەستن بەخودا بێ و تەوەککول لەسەر ئەوبێ، بەڵام چ دژایەتیەك نیە کە رێزی ئەو هۆکارو ئەسبابانە بگیرێ کەخودا لەم بونەوەرەدا کردونی بە ئەسباب.

ئاشکراترین بەڵگە لەسەر ئەوەی گوتمان وەزع‌و حاڵی بوو لەوکاتەدا کە سوراقە لێی نزیك بووەو دەیەویست بیکوژێ، بێگومان ئەو حیطەو حەزەرەی تەشریفی ئەنجامی دابوو داخوازی ئەوەبوو لەوکاتەدا بترسێ، بترسی لە دوژمنێك کە شمشێری روتی بەدەستەوەیەو ئەسپەکەی

تـاودەدا بیگاتـێ دەسـتی خـۆی لێ بوەشـێنێ و خـەڵاتی چـەور بەدەسـت بهێنێ. بەڵام بە پێچەوانەوە هیچ دیاردەی ترسی لێ دیاری نـەدا، بـەڵکوو بەهێواشـی و لەسـەرەخۆ سـەرگەرمی قورئـان خوێنـدنی خـۆی و پاڕانـەوە لـەخودا بـوو، چـونکە ئـەو دڵنیـابوو لـەوەی ئـەو خودایـەی فـەرمانی پـێ کـردووە بـە کـۆچـکردن، دەسـتی دوژمنـی لێ دوور دەخاتـەوە و لـە ئازاری خەڵکی دەیپارێزێ. شەڕی ئەوانی لێ لادەدا.

٣- لە دانانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب لەجێگەی خۆی بۆ گەڕاندنـەوە سپاردەکانی لای دانرابوون بۆ خاوەنەکانیان بەڵگەیەکی بەهێزو رەوشەن هەیە لەسەر ئەو هەڵوێستە دژ بەیەکانەی قوڕەیشییەکان تێـی کـەوتبوون کەتا بڵێـی سـەیرو سـەر سوڕهێنەرە. چونکە ئـەوان لەکاتێکدا بـەدرۆیان دەخـستەوە و بــە درۆزن و ســاحیریان لەقەڵــەم دەدا بوختــانی شــێتی و فێڵبازییان بۆ هەڵدەبەست، پێیان وابوو لەو دەوروبەرە کەسێکی تر نییە لەو باشترو ئەمینترو راستگۆتر بێ، وایان خـوو پێوەگرتبـوو هەرشـتێکی بـەنرخیان هەبوایـە ترسـیان لێبایـە لێیـان بـدزرێ، هـەرلای ئـەو بەئـەمان دایـان دەنـا. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە بڕوانـەکردنیان بە پەیامەکـەی بـەهۆی لوتبـەرزی و پـشت هـەڵکردنیان بـوو لـە حـەق و راسـتی و ترسـی ئەوەیان هەبوو بەرژەوەندییەکانیان لەکیس بچێ.

ئــەمجار لەنیــشات و هاتوچــۆی عەبــدوڵڵای کــوڕی ئەبوبــەکر: کــە ئـەنجامی دەدا لــەنێوان ئەشـکەوتی ثــەورو شــاری مەککــەداو دەهــات و دەچوو. گوێی بۆ هەواڵ هەڵدەخست و چی پێویست بوایە بۆ پێغەمبـەرو بــاوکی دەگێڕایــەوە. هــەروا لــەو هەڵــسوڕان و توێــشو ئامادەکردنــەی ئەسمائی کچی ئەبوبـەکر سـەرگەرمی بـوو ولاخـی ئامـادەکردو توێشوی ســاز دەکـردو کەرەسـەی رێکدەخـستن بـۆ سـەفەرەکە، ئامـاژەی ئـەوەی تێدایـە کـە پێویـستە گـەنجی موسـوڵمان بـەنێرو مێیانـەوە ئـەو هـەوڵ و

تێکۆشانەیان تێدا رەنگ بداتەوە لەپێناو پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و چەسپاندنی بنەماکانی ئیسلام تێیدا.

هەرئەوەندە بەس نییە مرۆڤ خەریکی خودا پەرستی بێ و بەس! بەڵکوو پێویستە هەموو هێزو توانای خۆی خەرج بکا لەپێناو ئایینی خودادا، ئەمە ئەرکێکی تایبەتی سەرشانی گەنجانە لەژیانی ئیسلام و موسوڵماناندا لەهەموو چەرخ و رۆژگارێکدا.

ئەگەر تۆ سەرنج بدەیە ئەو هاوەڵانەی بەدەوری پێغەمبەرەوە بوون لەسەرەتای بانگەوازی و جیهادیدا، دەبینی زوربەی زۆریان گەنج و لاوبوون، لە قۆناغی یەکەمی گەنجییان تێنەپەری بوون، هەمیشە ئامادەبوون هێزو توانای خۆیان لەپێناو سەرخستنی ئیسلامدا خەرج بکەن، هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەبوو کۆمەڵگەی ئیسلامی پێك بهێنن.

٥- ئەوەی کە لەسوراقەو ئەسپەکەی رویدا لەوکاتەدا کەدەست بە شمشێر ئەسپەکەی هەلینگ دەدا بگاتە پێغەمبەرو هاوەڵەکەی موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەر بوو ﷺ، زانایانی فەرمووده کۆڕایان هەیە لەسەر راستی روداوەکەو گێڕانەوەی دەماودەمی بەشێوەی صەحیح و بێ خەوش، لەپێش هەمووشیانەوە ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم. دەی کەوابێ ئەمەش بخەرە ریزی موعجیزەکانی.

٦- دیاریترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ لەچیرۆك و بەسەرهاتی کۆچکردنیدا، دەرچوونی بوو لەماڵەوە لەوکاتەدا قورەیشییەکان دەورییان دابوو بە وریاییەوە چاوەڕوانی هەڵکەوتنی هەل بوون بۆئەوەی دەستی لێ بووەشێنن و پیلانی پێش وەخت داڕێژراویان جێبەجێ بکەن، ئەوەبوو خەو چاوی هەموو ئەوانەی دەوری ماڵی پێغەمبەریان دابوو خستە حاڵەتی خەواڵویی و بێ ئاگاییەوە، پێغەمبەر بەسەلامەتی و بێئەوەی موشریکە گەمارۆ دەرەکان هەستی پێبکەن لەماڵ هاتەدەر.

هـەربۆ تـەواوکردنی گاڵتـەکردن بـە پیلانـی نـەزۆکیان بـۆ تیرۆرکردنـی پێغەمبەر ئەو حەمکە گڵو خۆڵەبوو کە پێغەمبەر بەسەروچاویدا کردنو سەرو قژیانی لێ پڕبوو. کاتێك بەناویاندا هاتەدەرو ئایەتی:

{وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ – يس/٨} خوێند.

بێگومان ئەم موعجیزە ڕاگەیاندنێکی ئاشکرابوو بۆ ئەو موشریکانەو غـەیری ئـەوانیش لەهـەموو کـاتو زەمانێکـدا کـە ئـەوەی ڕووبـەڕوی پێغەمبـەرو هـاوەڵانی دەبێتـەوە لـە جۆرەهـا شـێوەی چەوسـاندنەوەو عەزاب لەسەر دەستی ئەوان لەماوەیەکی زەمەنداو لەپێناو ئاییندا، ئەوە ناگەیـەنێ کـەخودا پـشتی لـە پێغەمبـەرو هـاوەڵان کـردووەو سـەرکەوتن دوور کەوتۆتـەوە لێیـان. دەی بـا موشـریكو بـاقی دوژمنـانی ئـایین بـەوە کەیفخۆش نەبنو بە موژدەی نەزانن.

دڵنیـابن یارمەتیـدانی خـودا بـۆ خۆشەویـستانی نزیکـە بێتـەدی، هۆکارو ئەسبابی ئەم سەرکەوتنە نزیکە لەهـەر ئانو سـاتێکدا بێنـەدیو سەرهەڵدەن.

٧- ئـەو شـێوە پێـشوازییەی دانیـشتوانی مەدینـەی منـەوەرە لـە پێغەمبـەریان کـرد ئەنـدازەی خۆشەویـستی چەسـپاو لـەناخو سـەر ڕێـژکردو بەسـەر دڵـی ئەنـصارەکانی مەدینـەدا بـەپیاوو ئـافرەتو پـیرو گەنجـەوە دەردەخـاو وێنـای دەکـا. بێگومـان ئـەوان بـە تاسـوخەوە چاوەڕوانی گەیشتنی پێغەمبـەریان دەکـرد، هـەموو ڕۆژێ دوای نوێـژی بـەیانی دەچـوونە دەرەوەی شـاری مەدینـە، چـاوەڕوانی گەییـشتنی پێغەمبەریان دەکرد تا گەرمایان لێ دەهاتو ناچار دەبوون خۆ بکوتن بۆ ژێـر سـێبەر، ئـەوجا دەگەڕانـەوە بۆنـاو شـارو کاتەکـەش کـاتی هـاوینو

گەرمابوو، دەگەڕانەوە بۆئەوەی بەیانی ڕۆژی دوایی بێنەوە هەمان شوێن بۆ هەمان چاوەڕوانی.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە خەڵکە چاوەڕوان کەرەکان لەبەر گەرما گەڕابوونەوە ماڵەوە، یەکەم کەس کە پێغەمبەری لەمەدینە بینی پیاوێکی جولەکە بوو خێرا هاواری کردو یاریدەدەرانی لە گەیشتنی ئاگادار کردەوە، ئیتر هەموویان لەماڵ هاتنەدەرو راجمین، کە پێغەمبەریان لێ دەرکەوت سۆزو خۆشییان لەناخدا سەر ڕێژی کردو کەوتنە هوتاف کێشان و شیعر خوێندنەوەو نەیاندەزانی چۆن خۆشی و شادی خۆیان دەرببڕن، پێغەمبەریش سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕین. تەنانەت کە سەیری کچەکانی بەنی نەجاری کرد سرودی خۆشییان دەخوێندەوە روی تێکردن و فەرمووی: {أتحبنني؟ والله ان قلبي ليحبكنّ}.

هەموو ئەمانە ئەوەمان تێدەگەیەنن: کە خۆشویستنی پێغەمبەر تەنها شوێنکەوتنی نییەو بەس! بەڵکوو خۆشویستنی ئەوەیە: کە هەڵنەرو بناغەی شوێنکەوتنی بێ. ئەگەر سۆزو عاطیفەی ئەو زاتە لەدڵدا جێگیر نەبووبێ وازیع و هاندەرێك نیە مرۆڤەکە هەڵنێ بۆ شوێنکەوتنی وپەیڕەوی کردنی پەیامەکەی.

بێگومان ئەوانەی کە پێیان وایە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە شوێنکەوتنی و بەس! سەریان لێ تێکچووە ئەوەیان نەزانیوە کە شوێنکەوتن بۆ کەسێك بەبێ هاندەرو وازیع نابێ، هیچ وازیع و هاندەرێکیش نیە مرۆڤ هەڵنێ بۆ شوێنکەوتن جگە لە خۆشەویستییەك کە هەستەکان بهەژێنێ و سۆزو عاطیفەکان بۆلای کێش بکاو کۆنترۆڵیان بکا. بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێوەرو میقیاسی بڕوا بەخودای کردووە بە پڕبوونی دڵ و دەروون لە خۆشەویستی زاتی بەڕێزی بەجۆرێك

خۆشەویستییەکەی لە خۆشویستنی مرۆڤ بۆ منداڵو دایكو باوكو هەموو کەسێکی تر زیاتربێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە خۆشویستنی پێغەمبەر لە جینسی خۆشویستنی باوكو دایكو منداڵە. سەرچاوەی خۆشویستنی هەردوکیان سۆزو عاطیفەی دڵە ئەگینا پێکگرتنو پاساو دانەوەی نێوان خۆشویستنی پێغەمبەر لەگەڵ خۆشویستنی منداڵو باوكو دایك دروست نەدەبوو.

٨- ئەو وێنەو شێوەو شێوازەی کە بینیمان لەکاتی مانەوەو نیشتەجێ بوونی پێغەمبەر لەماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری دیاردەو مەظهەرێکی ترمان بۆ دەردەخا لە ئەندازەی خۆشەویستی پێغەمبەر لەلای هاوەڵانی.

ئەوەی کەلێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەین ئەو گەڕانو لێ وردبوونەوەی ئەبو ئەیووبو خێزانیەتی: کە ویستویانە بزانن پەنجەی پێغەمبەر لەکوێی خواردنی ناو قاپەکە کەوتووە بۆئەوەی لەو شوێنە بخۆنو بەرەکەتی شوێنی پەنجەکانی ئەویان بەنسیب ببێ. کەوابوو تەبەروك بەئاثاری پێغەمبەر کارێکی مەشروعەو پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی پێی رازی بووە. بێگومان ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیم زۆر نموونەو وێنەی تریان لە بە تەبەروك زانینی هاوەڵان بۆ ئاثاری پێغەمبەر ریوایەت کردووە، کە تەوەسولیان پێ کردون بۆ شیفای نەخۆشیو پارێزگاریو توفیقو ئەو شتانە.

لەو نمونانە ئەوەی بوخاری لە کیتابی «اللباس»دا لە «باب مایذکر في الشیب»دا ئەوەی ریوایەت کردووە کە ئوممو سەلەمە خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەندێ تاڵە مووی پێغەمبەری لە قوتوێکدا هەڵگرتبوو، هەرکەسێك لە هاوەڵان چاوەزار لێی بدایە یان تووشی نەخۆشی ببوایە، پیاڵە ئاوێکیان دەنارده خزمەتی ئەویش تاڵە مووەکانی تێهەڵدەکێشانو

ئەمجار پیاڵە ئاوەکەیان دەبردەوە دەیاندایە نەخۆشەکە بیخواتەوە بە مەبەستی تەبەڕوك‌و شیفا.

هەروەها ئەوەی ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە لە «کتاب الفضائل – باب طیب عرقه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ». پێغەمبەر رۆژێك چووە ماڵی ئوممو سولەیم، لەماڵ نەبوو. چوو لەسەر جێگاکەی ئوممو سولەیم نوست. ئوممو سولەیم هاتەوە بینی پێغەمبەر ﷺ ئارەقی زۆری کردبوو، ئارەقەکەی کەوتبووە سەر پارچە چەرمێکی سەرجێگاکە، ئوممو سولەیم ئارەقەکەی هەڵگوشییە ناو کل‌و کولتورەکەیەوە ناو صندوقی شتە تایبەتیەکانی خۆیەوە«١»، پێغەمبەر بەخەبەر هات‌و فەرمووی: ئەوە چی دەکەی ئەی ئوممو سولەیم! وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمەوێ ئەم ئارەقە هەڵبگرم بەهیوای ئەوە ببێتە بەرەکەت‌و فەڕ بۆ منداڵەکانمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشت کرد.

هەروا ئەو ریوایەتانەی لە صەحیحەیندا هاتوون‌و ئەوە دەگەیەنن: کە هاوەڵان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئەوەی ئاوی دەستنوێژی بخۆنەوە، یان تەبەروك بکەن بەپۆشاك‌و پیاڵەی ئاو خواردنەوەی«٢».

---

١ - صەحیحی موسلیم ٨٣/١.

٢ - شێخ ناصرالدین ئەلبانی پێی وایە ئەم جۆرە حەدیثانە لەم رۆژگارەدا سودیان نیە، باسی ئەمەی کردووە کاتێك رەخنەی لەو فەرمودانە گرتووە: کە مامۆستا محمد المنتصر الکتانی. هەڵیبژاردبوون بۆ قوتابیەکانی کۆلێجی شەریعە.

ئێمە پێمان وایە ئەم قسەیەی ئەلبانی قسەیەکی خەتەرەو نابێ موسوڵمان بیڵێ. چونکە هەموو گوفتارو کردارو ئیقراری پێغەمبەر تەشریعەو تەشریعیش بەردەوام‌و باقییە تا رۆژی قیامەت، مادام بەدەقی قورئان یان سوننەت نەسخ نەکرابێتەوە، گرنگترین فائیدەی تەشریع‌و دەلالەتی ناسینی حوکم‌و بیرو باوەڕە بەپێی ئەو تەشریعە، ئەو حەدیثە صەحیح‌و چەسپاوانە نە بەقورئان نەسخ بوونەوە نە بەحەدیث مانا تەشریعییەکەیان باقییە تا رۆژی قیامەت. ئەمەش مانای ئەوەیە: کە هیچ مانیعێك نیە

جا کەئەمە حاڵی تەوسسول کردن بێ بە ئاثارە مادییەکانی ئەی دەبێ چۆن ڕەوا نەبێ «توسل» بکرێ بەپلەو پایەی لای خودا؟ ئەی دەبێ چۆن تەوسسول نەکرێ بەوەی کە ڕەحمەتی گشتییە بۆ عالەم.

تۆ واگومان نەبەی ئێمە قیاسی تەوەسسول دەکەین بۆسەر تەبەروك‌و مەسەلەکە لەوە دەرناچێ کە بەڵگەمان تەنها قیاسەو بەس. چونکە تەوسسول‌و تەبەڕروك دوو وشەن بۆیەك مانا کە بریتییە لە داواکردنی خێرو بەرەکەت لەڕێگای ئەو کەسەوە کەتۆ تەوەسسولی پێ دەکەی. هەریەك لە تەوسسول بەجاهی پێغەمبەر لای خوداو تەوسسول بە ئاثارو پۆشاك‌و ئارەق‌و مووی جەستەی‌و شتی وا تاك‌و ئەجزان بۆ مەفهوومێکی گشتی کە بریتییە لە «مطلق التوسل» کە حوکم‌و ڕەواییەکەی بە حەدیثی صەحیح چەسپاوە.

هەر صورەت‌و وێنەیەك لە جوزئیاتەکانی «توسل» دەچێتە ژێر مانای گشتی دەقەکەو فەردێکە لە ئەفرادی عموم بە قاعیدە «تنقیح المناط»ی ئوصولی فیقهی ئیسلامی.

بائێستا بەمەندە کۆتایی بهێنین بەباسی تەعلیق‌و شیکردنەوەی کۆچی پیرۆزی لەمەککەوە بۆ مەدینە. بۆئەوەی بچینە سەرباس‌و لێکۆڵینەوەی ئەو کارە گرنگ‌و بەسوودانەی لە مەدینەدا دەستی پێکردن‌و ئەنجامی دان‌و سەرکەوتوو بوو لەپێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەمەدینەی منەوەرەدا.

---

لەوەی تەوەسول‌و تەبەروك بکرێ بە ئاثارو بەرماوەی پێغەمبەر چ جایی تەوەسسول کردن بەخودی خۆی‌و بەجاهو ڕێزی لای خودا، ئەمە حەقیقەتەو ثابیتە بەدرێژایی ڕۆژگار، ئیتر چۆن دەگوترێ: ئەوە بۆ ئەم ڕۆژگارە کەڵکی نەماوە؟

وێدەچێ شێخی ئەلبانی کە ئیلغای فائیدەی تەوسسول دەکا لەبەرئەوە بێ پێچەوانە ڕێبازیەتی ئەو بڕوای بە .توسل.نیە ئەمەش بەتەنیا نابێتە بەڵگەی نەسخ بوونەوەی‌و نەبوونی فائیدەی بۆ ئەم ڕۆژگارە.

---

## بەشی چوارەم

# بناغەکانی کۆمەڵگەی تازە

### بناغەی یەکەم/ دروستکردنی مزگەوت:

بێگومـان کۆچـکردنی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـە، واتـە پێکهێنـانی یەکـەم «دار إسـلام» لەسـەر روی زەوی لـەو رۆژگـارەدا. کۆچـکردن واتـە: پەیدابوون‌و سـەرهەڵدانی دەوڵـەتی ئیسلامی لـەژێر چاودێری سـەرۆکی دەوڵەت: کە خودی حەزرەتی موحەممەد بوو.

بۆیـە یەکـەم ئیش کـە پێغەمبـەر ﷺ گرنگـی پێـداو دەسـتی پێکـرد دارشتنی بنەما گرنگەکانی ئەو دەوڵەتە بوو، بێگومان ئەم بنەما گرنگانە لەسێ خاڵی سەرەکیدا خۆیان نواند:

١. دروستکردنی مزگەوت.
٢. برایەتی خستە ناو کۆچکاران‌و ئەنصارەکان.
٣. نووسـینی دیکۆمێنـت‌و وەثیقـەو دەسـتورێك، بـۆ رێکخسـتن‌و دیـارێکردنی شـێوە ژیـانی موسـوڵمانان لـەناو خۆیانـدا، هـەروا چۆنیەتی پەیوەندی نێوان موسوڵمانان‌و غـەیری خۆیـان بەتایبـەتی نێوان موسوڵمان‌و جولەکە بەشێوەیەکی تایبەتی.

### سەرەتا باسی دروستکردنی مزگەوت دەکەین:

لـەوەپێش گوتمـان ئـەو حوشـترەی کـە پێغەمبـەری بەسـواری پێـی گەیشتە مەدینە، بەناو کۆڵانـەکانی مەدینـەدا رۆیـی تـا گەیـشتە شوێنێك

ملکی دوو کوڕی ئەنصاری بێ باوك بوو لەوێ حوشترەکە چۆکی دادا. ئەو شوێنە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەسعەدی کوڕی زرارە کردبویە شوێنی نوێژکردنی خۆیو هاوەڵانی. ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد لەو شوێنە مزگەوتێك بنیات بنێن. بانگی دوو هەتیوەکانی کرد: کە لەژێر سەرپەرشتی ئەسعەدی کوڕی «زرارة»دا بوون، پێغەمبەر ﷺ ویستی لێیان بکڕێ، دوو منداڵە وتیان بەڵکوو ئێمە بەتۆی دەبەخشین، بەڵام پێغەمبەر قبووڵی نەکرد دوایی بە دە دینار لێی کڕین.

زەوییەکە درەختی زەرقەدو دارخورمای تێدابوو، هەندێ گۆڕی کۆنی موشریکەکانی تێدابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد گۆڕەکانیان هەڵدانەوە درەختەکانیان بڕینو لەلای رۆگەی مزگەوتەکەوە بەڕیز دانران. درێژی لای قیبلەی سەد زیراع بوو. لە هەردوو لاکەی تریەوە ئەوەندە یا شتێك کەمتر.

ئەمجار بەخشت دیوارەکانیان هەڵچنی، پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی هاوکاری هاوەڵانی دەکردو لەگەڵیان بەردو کەرەسەی دەهێنایە پێشەوە. قیبلەی مزگەوتەکەیان کردە لای بەیتولمەقدیس، کۆڵەکەکانی قەدە دارخورما بوون هەلاشی بەلقە دارخورما داپۆشرا.

عەرزی پێغەمبەر کرا ئەرێ هەلاش بۆ مزگەوتەکە دروست بکەین! فەرمووی: کەپرێك وەکوو کەپری موسا. کەمێك چیلکەو دارو گیا ئەمام دەخەینە سەری. کارەکە لەوە بەپەلەترە وەڵێ زەمینەکەی لەو چەو بوو.

بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر ﷺ لەهەر شوێنێ بۆی رێ بکەوتایە نوێژی دەکرد، تەنانەت نوێژی لەحەوشەو گەوەی بزنو مەڕدا دەکرد. دەڵێ: ئەمجار فەرمانی کرد بەدروستکردنی مزگەوت، ناردی بۆلای کۆمەڵێك پیاوی بەنو نەجار، ئەوانیش هاتنە خزمەتی فەرمووی: ئەی بەنی نەجار ئەو

زەوییەم پێ بفرۆشن نرخەکەی دیاری بکەن. وتیان نەخەیر ئێمە لە بارتەقای ئەوە پارەمان ناوێ، داوا لەخودا دەکەین بەهاکەیمان بداتێ.

ئەنەس دەڵێ: لەو زەویەدا ئەم شتانەی تێدابوو، هەندێ گۆڕی موشریکەکانی تێدابوو، هەندێ کەلاوەی تێدابوون هەندێ درەختی خورمای تێدابوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هەڵوەشاندنو تێکدانی گۆڕەکانو هەڵدانەوەیان. کەلاوەکان تەخت کرانو دارخورماکان بڕدران. ئەنەس گوتی: درەختە بڕاوەکان لەلای قیبلەوە ریزکرانو خرانە سەر یەك. هەردوو پایەکەی لەبەردبوو. خەڵکەکە پێغەمبەریش لەگەڵیاندا بەحەماسەوە خشتو بەردو کەرەسەیان نزیك دەکردنەوە خەلکەکە شیعری حەماسەت خولقینیان دەخوێندنەوەو پێغەمبەریش دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَةِ فَانْصُرِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةَ}«١».

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی خەلافەتی ئەبوبەکر بەم شکڵو شێوەیە مایەوە بەبێ لێ زیادکردنو گۆڕانکاری کردن تێیدا. ئیمامی عومەر هەندێ نۆژەنکردنەوەی تێدا ئەنجامدا، بەڵام هەر لەشێوەی بینای سەردەمی پێغەمبەر هێشتییەوە. دیوارەکانی بەخشتو هەلاشەکەی بەلقی دارخورماو کۆڵەکەکانی لەقەدی دارخورما بیناکردەوە، پاشان ئیمامی عوسمان گۆڕانکاری بەرچاوی تێدا ئەنجامدا، زۆری لێ زیادکرد، دیوارەکانی بە بەردی نەخشێندراوو بەگەچ دروستکردنەوە«٢».

## پەندو ئامۆژگاری:

لەم بڕگەی پێشوو چەند بەڵگەیەکی گرنگمان دێنە بەرچاو لەچەند خاڵێکدا بەکورتیو بەچڕی ئاماژەیان بۆدەکەین.

---

١ - البخاری ١/١١١.

٢ - اعلام المساجد/ ٢٢٤ — ٢٢٥.

**١- ئەندازەی گرنگی مزگەوت لە کۆمەڵگەی ئیسلامیو دەوڵەتی ئیسلامیدا:**

بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ هـەر لەگـەڵ گەیـشتنی بـۆ مەدینـەو جێگیربـوون تێیـدا، دەسـتی کـرد بـەپێکهێنانی کۆمەڵگەیـەکی ئیـسلامی یـەکگرتووی ریـشە داکوتراو: کـە پێکهـاتبوو لـە موسـوڵمانانی ئەنـصارو کۆچکەران، کە شاری مەدینە گرتبونیە خۆی، یەکەم هەنگاوێك کەبۆ ئەم کارە گرنگە هەڵی هێنایەوە دروستکردنی مزگەوت بوو.

ئەمەش هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە کە پێغەمبـەر یەکـەم هـەنگاوی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی بە بنیاتنانی مزگەوت دەست پێکرد. چـونکە بنیاتنـانی مزگـەوت یەکـەم پایـەو رەکیزەیـە لـە بنیاتنـانی کۆمەڵگـەی ئیـسلامیدا، چـونکە کۆمەڵگـەی موسـوڵمان صـیفەتی یەکدگیریو رەگە داکوتانی خۆی لەپابەند بوون بە یاسای ئیسلامو بیرو باوەڕی ئیسلامیو ئادابی ئیسلامی بەدەست دەهێنێ. ئەمـەش لـەروحی مزگەوتو وەحیی مزگەوتەوە هەڵدەقوڵێ.

بێگومان بەشێك لـەنیظامـی ئیـسلامو ئـادابی ئیـسلام، بڵاوبوونـەوەی پەیوەنـدی برایـەتیو خۆشەویـستی نێـوان موسـوڵمانانە، وەلێ بڵاوبوونـەوەی ئـەم پەیوەندییـە بـە شێوەی خـوازراو لـە مزگەوتـدا نـەبێ دەستەبەر نابێ.

مـادام موسـوڵمانان رۆژانـە چـەند جارێـك لـەخانوێك لـە خانوەکـانی خـودادا کۆنەبنـەوەو فـەرقو جیـاوازیی پلـەو پایـەو مـاڵو سـامانو ئیعتیبـارات وەلا نـەنێو هـەموویان بەیـەك ریـزو یـەك ئاسـت هـەڵسو کەوت نەکەن، مومکین نیە گیانی ئولفەتو برایەتی بکەوێتە ناویانەوە.

ئاشـکرایە یاسـای ئیـسلامو ئـادابی ئیـسلامی داخـوازی ئـەوەن کـە گیـانی یەکـسانیو عەدالـەت لـەنێو موسـوڵماناندا بڵاوبێتـەوە لـەجۆرەها شوێنی ئـیشو کاریـان دا، لەهـەموو وەزعو حـاڵی جیـا جیایانـدا، بـەڵام بڵاوبوونـەوەی ئـەم گیانـە مـومکین نیـە بەرجەسـتە ببـێو بێتـەدی، ئەگـەر

موسوڵمانان هەموو ڕۆژێ لەمزگەوتدا بە یەکڕیزی ڕونەکەنە خودای خۆیان و لەسەر پارچە زەوییەکی هاوبەش و حاڵەتێکی هاوبەش لەبەندایەتیکردن بۆ خودا دڵ پەیوەست بوو بەخوداوە کۆنەبنەوەو ڕونەکەنە قیبلەی خۆیان. چەندێك موسوڵمانان لەماڵەوە ڕوبکەنە خوداو نوێژبکەن و سوجدە بۆ خودا بەرن، بەمەرجێ دیاردەی هاوبەشی و کۆبونەوە لە عیبادەتیان تێدا بەرجەستە نەبێ، ئەوە مانای عەداڵەتکاری و یەکسانی باڵا دەست نابێ لە کۆمەڵگەدا بەسەر مانای خۆپەرستی و خۆبەزلزانی و ئەنانیەتدا.

بێگومان لەیاسای ئیسلام و ئادابیەتی کەهەموو فەردو کۆمەڵ و چین و توێژێکی موسوڵمانان لە بۆتەی یەکیەتی چەسپاو و دامەزراودا بتوێنەوە ببنەیەك دەست و یەك هێزو دەسەلات لەژێر سایەی یاسای ئیسلام و شەریعەتی پیرۆزیدا دەست بەئایینی خودا بگرن و بەرەو بەختەوەری دونیا و قیامەت هەنگاو هەڵێنن. بەڵام ئەگەر لەناو شارو گەڕەك و هۆبەو گونددا مزگەوت بنیات نەنرێن و موسوڵمانان تێیدا کۆنەبنەوە بۆ فێربوونی حوکم و شەریعەتی خودا بۆئەوەی بە بەرچاو ڕونی و زانستەوە پەیڕەوییان بکەن و عیبادات و ئادابە ئیسلامییەکان زانایانە ئەنجام بدەن ئەوە بێگومان یەکیەتی و کۆمەڵیان سەردەکێشێ بۆ پەرتەوازە بوون و خێرا تەوژمی هەندێ شەهوەت و ئارەزۆ لێکیان دەپچڕێنێ و دەبنە چەند تاقم و گرۆیەکی دژ بەیەك و هیچ لەدەست نەهاتوو.

جابۆ دەستەبەر کردنی ئەو مەعنا بەرزو شکۆدارانە لە کۆمەڵگەی موسوڵماناندا و بەرجەستە بونیان لە دەوڵەتی تازە ڕسکاوی ئیسلامیدا، پێغەمبەر ﷺ پەلەی کردو پێش هەموو کارێکی، بەگەیشتنی بۆ شاری مەدینە مزگەوتی بنیات نا.

**٢- حوکمی مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤی نەباڵغ و منداڵ و هەتیو:**

شەرعزان و فوقەهای ڕێبازی حەنەفی ئەم فەرموودەیەی بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە، کردویانە بە بەڵگە لەسەرئەوەی کە تەصەروفی مرۆڤی ناباڵغ دروستەو دادەمەزرێ، لەم ڕوەوە کە پێغەمبەر ﷺ «مەربەدی» لەدوو منداڵی هەتیو کڕی و مامەڵەی لەگەڵ کردن، ئەگەر تەصەروفیان دروست نەبوایە ئەو زەویەی لێ نەدەکڕین.

جەماوەری زانایانیش پێیان وایە تەصەروفی مرۆڤی ناباڵغ و هەتیو دانامەزرێ و نادروستە، بەڵگەیان ئایەتی قورئانە کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ – الأنعام/ ١٥٢}.

حەدیثی کڕینی «مەربەد» کە پێغەمبەر لەدوو هەتیوەکەی کڕی و حەنەفی کردویەتی بەبەڵگە پشتی پێ بەستووە ئەو دوو وەڵامی دەدرێتەوە، یەکەم وەکوو لە ڕیوایەتی ئیبنو عویەینەدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ مامیاندا «کە سەرپەرشتیاریان بوو» مامەڵەی کردوەو بەواسیتەی ئەوەوە لێی کڕیون[١] کەوابوو نابێتە بەڵگە بۆ ئەبو حەنیفە.

**دووەم:** دەگوترێ: پێغەمبەر ﷺ لەم جۆرە حاڵانەدا ویلایەتی هەیەو ئەو زەوییەی کە لەهەتیوەکان کڕی بەو صیفەتە لێی کڕین کە وەلی گشتی موسوڵمانانە، نەك بەو صیفەتەی: کە تاکێکە لەوان و کڕیارە.

**٣- دروستە گۆڕی کۆن و ئێسقان رزیو هەڵدرێنەوەو شوێنەکەیان بکرێ بە مزگەوت، بە مەرجێ پاك بکرێتەوەو ئێسقان و گڵی تێکەڵ بوو بە گۆشت و خوێنی مردووەکانی لێ فڕێ بدرێ:**

ئیمامی نەوەوی کە تەعلیق لەسەر ئەم حەدیثە دەنووسێ دەفەرموێ: ئەم حەدیثە ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵدانەوەی گۆڕی کۆنی

---

١ - فتح البتاری: ١٧٥/٨.

ئێسقان رزیو، هەرکاتێك ئەو گڵو خۆڵەی تێکەڵ بووە بەکێمو زوخاوی مردووەکـان لابـراو فـڕێ درا دروسـتە لـەو شـوێنەدا نوێـژ بکـرێو شوێنەکەش بکرێ بە مزگەوت.

هەروەکوو چۆن حەدیثەکە ئەوە دەگەیەنێ هەر زەوییەك مردوی تێدا بنێـژرێو بـڕزێو مـاوەی زۆری بەسـەردا تێپـەڕێ دروسـتە زەوییەکـە بفرۆشـرێ، موڵکیەتیشی بۆ خاوەنەکەی باقییە دوای خۆی بۆ میرات گرەکانیەتی، بەمەرجێ وەقف نەکرابێ«١».

زانایانی سیرە دەربارەی ئەو گۆڕانەی مەربەد فەرموویانە ئەو گۆڕانە گۆڕی کۆنو ئێسقان رزیو بوون. تەصەوری ئەوە ناکرێ کێمو خوێنیان مابێ، لەگەڵ ئەوەشدا گڵو خۆڵە تێکەڵبووەکە بەخوێنو کێمیان لابرد.

دەڵێم: کاتێك دروستە گۆڕی کۆن هەڵبدرێتەوەو گڵە پیسبووەکە لابرێو شوێنەکەی بینـای مزگـەوتی لەسـەر بکـرێ، ئەگـەر زەوییەکـە وەقف نەکرابێ، ئەگەر زەوییەکە وەقف کرابوو دروست نییە گۆڕینی بۆ هیچ شتێکی تر جگە لەوەی بۆی وەقف کراوە.

**٤- حوکمی تەشییدو دروستکردنی مزگەوتو رازاندنەوەو زەخرەفە کردنی:**

تەشیید ئەوەیە بینای مزگەوت بە بەردو بلۆكو شتی وا رابیەسترێ، کە بەجۆرێك بێ بیناو سەقفو کۆڵەکەو پایەکانی پتەوبن. نەقشو زەخرەفە: بریتییە لە هەر رازاندنەوەیەك بکەوێتە دەرەوەی هەیکەلی بیناکەوە.

تەشیید کردن بەلای جەماوەری زانایانەوە دروستەو هیچ لەمپەرێك نیە رێگای ئەوە بگرێ. ئاماژە بەوەی کە حەزرەتی عومەرو حەزرەتی عوسمان کردیان، ئەوەبوو هاتن بینای مزگەوتی پێغەمبەریان نۆژەن

---

١ - اعلام الساجد/ ٢٣٦.

کـردەوە، ئـەم کـارە هەرچـەندە کارێـك بـوو پێغەمبـەر نـەیکردبوو، وەلێ نـەکردنی پێغەمبـەر بـۆ ئـەوکارە «واتـە: بیناکردنـەوەو نۆژەنکردنـەوەی مزگەوت» نابێتە بەڵگەو دەلیل بۆ مەفهومی پێچەوانە. واتـە: مـەنعکردنی نۆژەنکردنـەوە بـەجۆرێك دیـوارو هـەلاشو پایـەو کۆڵەکـەی پتـەوتر بـن لـەحاڵی پێشوی. چونکە تەشییدو بیناکردن وەصفێك ناخولقێنن دژی ئـەو حیکمەتـە بـێ کـە لەبەرئـەو بینـای مزگـەوت دانـراوەو پەسـەندو داخوازبووە.

بەڵکوو لە تەشییدو بیناکردنندا زێدە گرنگی دان بەشەعائیری ئایین بەرجەستە دەبێ... هەروەها زانایان بەڵگەیان بەو ئایەتە هێناوەتەوە: کە دەفـەرموێ: {إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ – التوبـة/١٨}: هەڵبەتـە ئاوەدانکردنـەوە بـە تەشـییدو گرنگـی دان بـەبینا و بـەهێزکردنی دیتەجێ.

بـەلام نـەقش و زەخرەفـەو رازاندنـەوە ئـەوە زانایـان کۆڕایـان هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە کـارێکی ناپەسـەندەو مەکروهـە. نـەك هـەر ئەوەنـدە بەڵکوو زانایانی ئیسلام بەشێکیان پێیان وایە حەرامە. هـەردوو لاشیان چ ئەوانـەی دەڵـێن: مەکروهـە، چ ئەوانـەی دەڵـێن حەرامـە. بەلایانـەوە حەرامە ماڵی وەقف کراو بۆ ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتان خـەرج بکرێ بۆ زەخرەفەو نەخش و نیگار. وەلێ ئەگەر ماڵە خەرجکراوەکە بۆ زەخرەفـەو نـەخش و نیگارەکـە لـەماڵی کـابرای بیناکـار بـوو ئـەوە هـەمان خـیلاف و راجیایی تێدایە، زەرکەشی لە ئیمامی بەغەوییـەوە فتوایـەك نـەقڵ دەکا و دەفەرموێ: دروست نییە رازاندنەوەو نەخش و نیگار بۆ مزگەوت لـەماڵی وەقف بکرێ، ئەگەر سەرپەرشتیارو کاربەدەستی ئەوقاف کارێکی وای کرد دەبێ غەرامە بکرێ و لەماڵی خۆی قەرەبووی وەقف بکاتەوە.

ئەگــەر کابرایــەك لــەماڵی تایبــەتی خــۆی کــردی ئــەوە کــارێکی ناپەسەندەو مەکروهە، چونکە ئەو زەخرەفەو نەخشکردنە دڵی نوێژکەر لەمەبەست لادەداو مەشغوڵی دەکا«١».

جــوداوازی نێــوان عومــومی تەشــبیدو تایبەتمەنــدی زەخرەفــەو رازاندنەوە ئاشکراو روونە:

یەکـەمیان کـە تەشـبیدە: پـەیڕەوکردنی و ئەنجامـدانی وەصـفێکی لێ وەدی نایــە یــان مەعنایــەك ناگەیــەنێ دژی ئــەو حیکمەتــەبێ: کــە لەبــەرخاتری ئــەو بینــای مزگــەوت و مەشــروعەو ئــەنجام دراوە. وەلێ زەخرەفەو رازاندنەوە هەریـەکێك لەوانـە دژایـەتی هەیـە لەگـەڵ حیکمـەتی دروسـتکردنی مزگـەوت. چـونکە زەخرەفـەو نـەخش کردنـی مزگـەوت دەبێتـە هۆی لادانـی دڵـی نوێژکـەر لـە خوشـوع و خضـوع و دڵدانـە مانـای نوێـژ، نوێژکەرەکـە والێـدەکا بـە مـەظـاهـیری دونیـاوە مەشـغوڵ بـێ. لەکاتێکدا مەبەست لەچوونە نـاو مزگـەوت خۆدزینەوەیـە لـە تەصـەوراتی دونیایی و خاڵی بوونی دڵ لەجوانی و رەونەقی جیهان.

ئیمــامی عومــەر ﷛ دەربــارەی ئەمــە رای خــۆی دەربــڕی وەکــوو بوخــاری لــە صــەحیحەکەیدا ریوایــەتی کــردووە، دەڵــێ ئیمــام عومــەر فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوتێك و فەرمووی: {أكنّ الناس من المطر واياك أن تحمرّ أو تصفرَّ فتفتن الناس}.

مزگەوتەکــە وابــێ خــەڵکی لــەباران بپــارێزێ، نەکــەی بیرازێنیــەوە بەسوورو زەرد خەڵکی لەمەبەست لادا کە نوێژدەکەن لەجیاتی ئەوەی دڵ

---

١ - ئەمە رای فوقەهای شافیعیەکانە بەلام حەنەفیـەکان و هـی تـریش بەلایانـەوە رەوایـە ئەگەر بەرژەوەندی تێدابوو.

بدەنە مانای نوێژو روکردنە پەروەردگار، سەیری رەنگ و رازاندنەوەی مزگەوتەکە بکەن.

زانایان کەوتوونە راجیاییەوە دەربارەی نووسینی ئایەتێك یان بەشێك لە قورئان لەڕوی قیبلەی مزگەوتەوە، ئایا دەچێتە چوارچێوەی نەخش و نیگارەوەو مەمنوع بێ یان نا؟

زەرکەشی لەکتێبی «اعلام الساجد»دا دەڵێ: مەکروهە ئایەتێك یان بەشێك لەقورئان لەروی قیبلەی مزگەوتەوە بنووسرێ.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: هەندێ لەزانایان وتویانە دروستەو چ خراپەیەکی تێدانیە، چونکە ریوایەت کراوە کە عوثمان لەکاتی نۆژەن کردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەردا شتێکی وای نووسیوەو کەسیش لەهاوەڵان رەخنەی لێ نەگرت«[1]».

لەمەی باسمان کرد بۆمان دەردەکەوێ: کە چەند هەڵەیە ئەوکارەی هەندێ کەس لەوانەی خەریکی نۆژەن کردنەوەی مزگەوت و بیناکردننی، کەدێن هەموو هێزو توانای مادیو مەعنەوی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ رازاندنەوەی مزگەوت و نەخش و نیگار تێداکردنی و بەخشینی دیاردەی فەخفەخەو بیناسازیو ئوبهە پێی.

تەنانەت تۆ کەدەچیە ناوی هەست بەهیچ مانای بەندایەتیو زەلیلی بۆ خودا ناکەی، لەجیاتی ئەوە سەرنجت بۆ ئەوە کێش دەکا سەیری دەست رەنگینی وەستاکەی بکەیو بەزوبانی حاڵ شانازی دەکاو دەڵێ: بڕوانە فەننی تەلار سازی گەیشتۆتە چ ئاستێك؟ فەننی زەخرەفەو نیگارکیشی عەرەبی چەند پێش کەوتووە؟

لە خراپترین نەتیجەو ئاکامی ئەم گاڵتەو فێڵە شەیتانییە کە بە موسوڵمانی ساویلکە دەکرێ، ئەوەیە هەژارو نەدارای موسوڵمان

---

١ - اعلام الساجد/٢٢٧.

شوێنێکیان دەست ناکەوێ پەنای بۆ بەرن و مەظاهیری هەڵخەڵەتان و ئیغرای دونیاییان لەپێش چاو گوم ببێ. بێگومان لەرابردودا مزگەوتەکان دڵدانەوەی هەژاری تێدا دەبیندرا، بابای نەبوو نەدارا کە دەچووە مزگەوتەوە دڵی تەسەللای دەهات و لەکەش و هەوای فەخفەخە و زەخرەفەی دونیایی دەردەچو دەکەوتە بیرکردنەوە لەقیامەت و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری ئەو دونیایە. بەڵام ئەمڕۆ تەنانەت لەدیاردەو مەظاهیری مزگەوتەکانیشیاندا خۆشی و زەخرەفەی دونیاییان دەخرێتە بەرچاو: کەئەوان لێی بێ بەشن و زیاتر هەست بەباری گرانی هەژاری خۆیان دەکەن.

ئای چەند کارەساتە ئەو حاڵەی موسوڵمانان تێی کەوتوون حەقائیقی ئیسلامیان واز لێ هێناوە و سەرگەرمی دیاردە درۆزنەکانی بوون و بەڕواڵەت دینە و لەناوەڕۆکدا شەهەوات و ئارەزویە!!.

## بنەمای دووەم: لە بنەمای دەوڵەتی ئیسلامی لەمەدینە برایەتی ئیسلامی:

پێغەمبەر ﷺ کاری سەرەکی دوای دروستکردنی مزگەوت، برایەتی خستنەوەی نێوان کۆچکەران و ئەنصارەکان بوو، برایەتی خستە نێوانیانەوە لەسەر حەق و تەسەللا دانەوە، تەنانەت برایەتیەکە بەجۆرێك بوو میراتیش لەیەکتر بگرن، بەجۆرێك کاریگەری برایەتی ئیسلامی زۆر بەهێزتر بوو لەهی برایەتی خزم و خوێن و نژاد.

جەعفەری کوڕی ئەبو طالیبی کردە برای مەعاذی کوڕی جەبەل. حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و زەیدی کوڕی حاریثەی کردنە برا. ئەبوبەکری صدیق و خاریجەی کوڕی زوهەیری کردنە برا. عومەری

کوڕی خەطاب و عوتبانی کوڕی مالیکی کردنە برا. «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوفی کردە برای سەعدی کوڕی رەبیع.

پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم برایەتیەی لەنێو هاوەڵاندا فراوانتر کرد وەکوو لەمەدوا دەیبینین.

ئەم برایەتیە لەسەر بنەمای مادیش دامەزرا. میراتگرتنی هاوەڵان لەیەکتری بڕێکی ئەم دیاردە مادییە بوو. ماف و ئاسەواری ئەم برایەتیە بەردەوام بوو پێش ماف و ئاسەواری برایەتی خوێن و نژاد دەخرا تا غەزای بەدری گەورە رویدا. ئەوەبوو دوای غەزاکە ئایەتی: {وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – الآنفال/٧٥}.

ئیتر ئەم ئایەتە ئەثەری حوکم و یاسای برایەتی نەسخ کردەوە دەربارەی میرات.

هەموو موسوڵمانێك بەگوێرەی خزمایەتی رەحەم میراتیان لەیەکدی دەگرت. بەڵام لەروی ئایینی و هاریکارییەوە موسوڵمانان هەموویان برای یەکتری و هەمئاهەنگی یەکترین.

ئیمامی بوخاری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: کۆچکەران کاتێ هاتنە مەدینە، کۆچکەر میراتی لە ئەنصاری دەگرت بەبێ ئەوەی خزمایەتی رەحەمیان لەنێودابێ، ئەمەش بەپێی ئەو برایەتیەی پێغەمبەر خستیە نێوانیانەوە. جا کە ئایەتی: {وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ} نازڵ بوو ئەو یاسایە نەسخ بۆوە.

ئەمجار فەرمووی: {وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا – النساء/٣٣}:

واتە: ئەوانەی لەگەڵیاندا هاوپەیمان و هاوئاینن بەشی خۆیان بدەنێ لەیارمەتی و ئامۆژگاری ئیتر باسی میرات لەوەپێش رابورد.

**پەندو ئامۆژگاری:**

ئەمە ئەو بنەما سەرەکییەیە پێغەمبەر ﷺ پشتی پێ بەست. لەپێناو دروستکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی، گرنگی ئەم بنەمایە لەچەند خاڵێکی سەرەکیدا رەنگ دەداتەوە:

یەکەم: شتێکی بەڵگە نەویستە کەهیچ دەوڵەتێك مومکین نیە: کە بتوانێ لەسەر قاچ بوەستێ و ئەرکی خۆی جێبەجێ بکا، ئیللا دەبێ لەسەر بنەمای یەکیەتی و تەبایی گەل و هاریکاری یەکتر راوەستابێ. مومکینیش نیە یەکیەتی و هاریکاری گەل و نەتەوە بێنەدی بەبێ هەبوونی گیانی برایەتی و خۆشەویستی لەناو یەکتردا. هەر کۆمەڵ و تاقمێك پەیوەندی خۆشەویستی و برایەتی راستەقینەیان لەناودا نەبێ مومکین نیە لەسەر بنەمایەك، لەسەر مەبدەئێك کۆببنەوە، مادام یەکیەتی حەقیقەت و راستەقینە لەناو گەل و کۆمەڵدا نەبێ مومکین نیە دەوڵەت و دەسەڵاتی کارای لێ دروست بێ.

وێرای ئەوەش برایەتی دەبێ لەسەر عەقیدەو بیروباوەڕ دابمەزرێ، دەبێ ئەو عەقیدەو باوەڕەی برایەتیەکەی لەسەر دادەمەزرێ پێش یاسای برایەتیەکەی جێگیر بووبێ، برایەتی نێوان دوو کەس: کە هەریەکەیان بڕوایەکی دژی ئەوی ترهەبێ خەرافەو وەهەم و خەیاڵە، بەتایبەتی ئەگەر فیکرەو عەقیدەکە وابوو خاوەنەکەی هەڵبنێ بۆ پەیڕەوی سلوکێکی دیاریکراو لەژیانی عەمەلیدا.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ عەقیدەی ئیسلامی کردە بناغەی ئەو برایەتیەی خستیە نێوان هاوەڵانیەوە. ئەو بیرو باوەڕەی لەخوداوە بۆی هێنابون و کەهەموو ئادەمیزادەکان دەخاتە رێزی بەندایەتی بۆ خوداو زیادو کەمی پلەوپایەیان تەنها لەڕوی تەقواو کاری صاڵحەوە بەرجەستە دەبێ. ئەم بیرو باوەڕەی کردە بنەمای برایەتی نێوان هاوەڵانی چونکە چاوەڕوان

ناكرێ برایەتی و هاریكاریو ئیثارو خۆنەویستی بەرجەستە ببێ لەنێو كەسانێكدا بیروباوەڕی جیاوازو راوبۆچوونی جیاوازیان هەبێ و هەریەكەیان بەندەی هەواو هەوەسی خۆیو چاوچنۆكیو خۆویستی خۆی بێ.

**دووەم:** بێگومان كۆمەڵگە «هەر كۆمەڵگەیەك بێ» جوداوازییان لە كۆمەڵە خەڵكێكی پەرتەوازەو بڵاو بەیەك شت دەبێ، ئەویش بەرجەستەبوونی بنەمای هاریكاریو هەمئاهەنگیو یارمەتیدانی یەكتر لەنێوان تاكەكانی ئەو كۆمەڵگەیە لەهەموو بوارەكانی ژیانو بنەماكانیدا. جا ئەگەر ئەو هاریكاریو هەمئاهەنگیو یارمەتیدانەی یەكتری بەگوێرەی تەرازوو پێوەری عەدالەتكاریو یەكسانی لەنێوانیاندا بەرجەستە بوو ئەوە كۆمەڵگایەكی عادڵو سەلامەتو بەختەوەرە. خۆ ئەگەر هاریكاریو هەمئاهەنگییەكە لەسەر بنەمای ستەمو ناعەدالەتی بوو ئەوە كۆمەڵگایەكی ستەمكارو لەڕێ لادەرو نەگبەتە.

جا ئەگەر كۆمەڵگای سەلامەت لەسەر بنەمای عەدالەت نەبێ دانەمەزرێ، دەبێ چ شتێك ببێتە زامنی بەرجەستەبوونی عەدالەتو كارپێكردنی بە باشترین شێوە؟

بێگومان تاكە زامنو بەرعودە بووی سروشتی بۆئەوە، برایەتی و خۆشەویستی نێوان تاكەكانی كۆمەڵە. دوای ئەو ضەمانەتی دەسەڵاتو یاسایە.

دەسەڵات چەندێك هەوڵبدا بنەمای عەدالەت لەناو تاكەكانی كۆمەڵگەدا بچەسپێنێ، بێگومان ئەو عەدالەتە نایەتەدی ئەگەر لەسەر بنەمای برایەتی و خۆشەویستی نێوانیان بنیات نەنرێ. بەڵكوو ئەم بنەمایانە ئەگەر بەوشێوە دانەمەزرێن، دەبنە سەرچاوەی حیقدو كینەو

بەناو تاکەکانی کۆمەڵدا بڵاودەبنەوە، ئاشکراشە ئەو حیقدو کینەیە تۆوی زوڵم و ستەمکاری دەچێنێ!

لەبەر ئەو هۆیانە پێغەمبەر ﷺ حەقیقەتی ئەو برایەتییەی خستیە نێوان کۆچکاران و یاریدەدەران کردیە بنەما و ئەساس بۆ دامەزراندنی عەدالەتی کۆمەڵایەتی: کە لەئاکامی تەطبیق کردنیدا گەورەترین نیظامی کۆمەڵایەتی لێ وەدی هات لەسەر ئاستی هەموو جیهان. بێگومان بنەمای ئەم عەدالەت و نیظامە لەوەدوا گەشەی کردو کەوتە چوارچێوەی ئەحکام و قەوانینی شەرعی پەیڕەوکراوو ئەرکێکی پێویست، بەڵام هەموو ئەمانە لەسەر زەمینەی یەکەم بنج بەست بوون، ئەویش برایەتی راستەقینەی ئیسلامی بوو، ئەگەر ئەو برایەتییە راستەقینە رەسەنە نەبوایە: کە ئەویش لەسەر بناغەی بیرو باوەڕی ئیسلامی دامەزرا، هیچ کاریگەریەکی تەطبیقی و ئەرێنی نەدەبوو بۆ پتەوکردنی پشتێنەی کۆمەڵگەی ئیسلامی و یارمەتیدانی کییانەکەی!

## سێیەم بنەمای: تەفسیری و خستنەگەڕی پڕاکتیزە کردنی شیعاری برایەتی:

ئەو برایەتیەی پێغەمبەر ﷺ خستیە نێوان هاوەڵانی لە مەدینەدا تەنیا هەڵدانی شیعارێك نەبوو بەدەم بگوترێ و بەس! بەڵکوو حەقیقەتێکی کارپێکراوو بەگەڕ خراو بوو لەواقیعی ژیانیان بەهەموو جۆرێك، هەموو جۆرەکانی پەیوەندی نێوان کۆچکەران و یاریدەدەرانی گرتبووەوە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەرپرسیاریەتی حەقیقی بەرجەستە کردو بەناو هاوەڵانیدا بڵاوی کردەوە. ئەم بەر پرسیاریەتیە بەباشترین شێوە لەناویاندا جێگیر بوو بوو. باشترین بەڵگە لەسەر ئەوە هەڵوێستی

سەعدی کوڕی رەبیع بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەنێوان ئەوو «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوفدا برایەتی خستبوەوە، سەعد هات بەشێوەیەکی یەکسان ماڵو سامانو خانوو زەویو زاری کردە دوبەشو بەشێکی دایە عەبدوررەحمان. بەڵام عەبدوررەحمان سوپاسی کردو داوای لێکرد رێگای بازاڕی مەدینەی نیشانبدا بۆئەوەی ئیش بکاو بەئارەقەی ناوچاوانو رەنجی شانی خۆی بژیو دابین بکا. جا وەنەبێ سەعدی کوڕی رەبیع تاکە یارمەتیدەر بووبێ: کە هەڵوێستی ئاوا بنوێنێو پێشنیاری لەوجۆرە بخاتە بەردەم برای کۆچکاری، بەڵکوو ئەمە شەئنو حاڵی هەموو هاوەڵان بووە لەناو مەدینەدا، بەتایبەتی دوای کۆچکردنو برایەتی خستنە نێوان موهاجیرو ئەنصارەوە.

هەر بۆیەشە پەروەردگار مافی میراتی پەیوەست کردووە بەهەبوونی ئەم برایەتییەوە. نەك بەبرایەتی خوێنو نژادەوە... حیکمەتی تەشریعی یەزدان لەمسەرو بەندەدا وا داخوازبوو کە برایەتی ئیسلامی وەکوو حەقیقەتێکی مەحسوس لەزەینی موسوڵماناندا خۆی بنوێنێو بزانن ئەوەی لەنێوان موسوڵماناندا باوە لە برایەتیو خۆشەویستی، شیعارێك نیە هەڵبدرێو قسەیەك بێ بگوترێو بەس! بەڵکوو حەقیقەتێکی بەرجەستەو کارپێکراوو خاوەن بەروبومو سودو قازانجی کۆمەڵایەتی هەست پێکراوە کە گرنگترین بنەمای کۆمەڵایەتی لێ پێکدێن بۆ نیظامو یاسای عەدالەتی کۆمەڵایەتی.

حیکمەتی نەسخ کردنەوەو سڕینەوەی میراتگرتن لەسەر بنەمای برایەتی ئیسلامی لەوەدوا ئەوەیە: یاسای میرات کەلەوەدوا چەسپاو جێگیربوو هەمان یاسابوو کە لەسەرەتادا لە مەدینەدا پەیڕەو کرا لەنێوان میراتگرو میرات لێ گیراو لەسەر بنەمای «الأخوة الاسلامية»، چونکە ئێستاشی لەگەڵدابێ میراتگرتن لەنێوان دوو کەسی ئایین

جوداوازدا نیە. وەلێ ئەوەندە هەیە لە فەترەی سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامیدا لەمەدینە موهاجیرو ئەنصار کەوتبوونە بەر تەوژمی بەرپرسیاریەتیەکی تایبەتی لەبواری یارمەتیدان و هاریکاری کردنی یەکتری و پێکەوە گونجان و ئیثارو خۆنەویستیدا، ئەمەش بەهۆی دوورکەوتنەوەی کۆمەڵی کۆچکەران «مهاجرین» لەزێدو ماڵ و سامان و خاوو خێزانیان و بەسەڵتی و گیرفانی بەتاڵەوە مەککەیان جێهێشتبوو بوو بوونە میوانی یارمەتیدەران، ئەو یاسای برایەتیەی پێغەمبەر لە مەدینەدا دایمەزراند لەنێوان کۆچکەران و یارمەتیدەران ضەمانەتێك بوو بۆ چەسپاندن و کاراکردنی ئەو بەرپرسیاریەتیە. بێگومان ئەم بەرپرسیاریەتیەش داخوازی ئەوەبوو ئەم برایەتیە لە حەقیقەت و کاریگەریدا لەبرایەتی نژادی و رەحەم بەهیزتر بێ.

جا کەئیش و کاری موهاجیرەکان لە مەدینەدا جێگیر بوو دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراو هێزی پەیداکرد، گیانی ئیسلامی ببوە شارەگی سروشتی بۆ کۆمەڵگەی تازەی مەدینەو هۆکاری پێکەوە بەستنەوەیان گونجاو بوو کە ئەو قاڵبەی لەوەپێش نیظامی پەیوەندی نێوان کۆچکەرو یارمەتیدەری تێدا داڕێژرا بوو هەڵوەشێتەوەو بەجۆرێکی تر داڕێژرێتەوە. چونکە تازە ترسی لێکترازان و هەڵوەشانەوەی قەوارەی بنج بەستوی ئیسلام نەماوە، توانەوەو شل بوونەوەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵی ئیسلامی لەژێر سایەی برایەتی ئیسلامی گشتیدا رۆژگاری بەسەرچووەو کۆسپ و لەمپەری رامالیون و رەگەو ریشاڵی خۆی داکوتاون. ئیتر هیچ زیانێك نابیندرێ کە کاریگەری خزمایەتی رەحەم لەنێوان موسوڵماناندا بگەڕێتەوە لەم روەوە کە زێدە کاریگەری هەیە بەسەر برایەتی ئیسلامی و خزمایەتی ئیسلامیدا.

ئەمجار ئەم برایەتیەی کە پێغەمبەر لەنێوان موهاجیرو ئەنصاردا بەستی شتێکی تازە قەڵلا نەبوو، بەڵکوو لەوەپێش پێغەمبەر ﷺ لەمەککە لەنێوان موهاجیرینەکانیشدا بەستبووی. ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: یاسای «مؤاخات» دووجار پەیڕەوکراوە، جارێکیان لە مەککە لەنێوان «مهاجرەکان»دا جارێکیش لەمەدینە لەنێوان کۆچکەران و یاریدەدەراندا«[١]».

ئەمە ئەو راستیەمان بۆ جەخت دەکاتەوە کە مەناطو جەمسەری برایەتی و بنەمای پەیوەندی، عەلاقەو پەیوەندی ئیسلامییە، تەنها ئەوەندە هەیە ئەم برایەتیە دوای کۆچ بەهۆی بارودۆخی تایبەتی موهاجیرو ئەنصارەوە پێویستی بەتازە کردنەوەو جەختکردنەوە هەیە. کەوابوو ئەو برایەتیە لە حەقیقەت و واقیعدا جگە لەبرایەتی دامەزراو لەسەر بنەمای کۆمەڵی ئیسلامی و یەکیەتی عەقیدە هیچی ترنیە، برایەتی نێوان موهاجیرو ئەنصار جەختکردنەوەی ئەو برایەتیە گشتییەیە لەڕێگەی تەطبیق و کاراکردنی.

## بنەمای سێیەم نووسینی وەثیقەو دەستوور لەنێوان موسوڵمانان و کەسانی دیکەدا

ئەم بنەمایە گرنگترین بنەمایەك بوو کە پێغەمبەر ئەنجامی دا لەو شتانەی پەیوەندییان هەیە بەنرخ و بەهای دەستوورییەوە بۆ دەوڵەتی تازە رسکاو.

ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە دەڵێ: ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی بەسەر مانەوەی پێغەمبەر لە مەدینەدا هەتا بەگشتی عەرەبی

١ - فتح الباری ١٩١/٧.

دانیشتوانی مەدینە ئیمانیان هێنا خێزانێك نەما لە ئەنصارەکان ئایینی ئیسلام نەچوبێتە ناوی‌و ماڵێك نەبوو موسوڵمان نەبووبێ، جگە لەچەند کەسێکی هۆزی ئەوس کە بەکافری مابوونەوە، پێغەمبەر ﷺ قەباڵەو بەڵگە نامەیەکی نووسی لەنێوان موهاجیرو ئەنصاردا، عەهدو پەیمانی لەنێوان خۆی‌و جولەکەکاندا نووسی‌و لەسەر ئایینی خۆیان هێشتنیەوە لەسەر ماڵ‌و سامانی خۆیان مانەوەو چەند مەرجێکی بۆ دانان‌و چەند مەرجێکیشی لێ وەرگرتن«١».

ئێمە لەبەر درێژی هەموو دەقی وەثیقەو دەستوورەکە راگوێزی ئێرە ناکەین، بەڵکوو ئێمە هەندێ خاڵی گرنگی لێ هەڵدەبژێرین، بەدەقی خۆیان لێرەدا تۆمار دەکەین. بۆئەوەی لەپشت ئەو بەندانەوە ئەندازەی نرخی دەستور بۆ کۆمەڵگە بزانین. بزانین ئەو دەستورەی پێغەمبەر ﷺ دایرشت بۆ دەوڵەتە تازە رسکاوەکەی چەند بەنرخ بوو چەند بەهادار بوو بۆ رێکخستنی کۆمەڵگای ئیسلامی. ئەمەش دەقی بەندەکانن بەگوێرەی ریزبەندییان لەدەقی دەستوورەکەدا:

١. موسوڵمانان لە قورەیش‌و یەثریبەکان‌و ئەوانەی لەگەڵیاندا جیهادو تێکۆشانیان ئەنجامداوە هەموویان یەك نەتەوەن‌و یەکدەست‌و یەك گیانن.

٢. ئەو موسوڵمانانە هەموویان وێرای جوداوازی هۆزو خێڵیان خوێنی یەکتر دەدەن، فیدیەو بارتەقای گیراوو دیلەکانیان دەدەن.

٣. موسوڵمانان هەرکەسێکیان تێدا پەیدابوو قەرزدارو خاوەن منداڵی زۆر بوو نابێ پاشگوێی بخەن، دەبێ یارمەتی بدەن.

---

١ - بڕوانە: مسند الامام احمد ١٠/٢١.

٤. موسوڵمانانی تەقواکار، هەموویان یەك هەڵوێستو یەك دەست دژی ئەوانە بوەستن کە هێرش دەکەنە سەریان، یان کەسێك داوای بەرگریو لابردنی زوڵمێك بکا، دەبێ موسوڵمانان هەموویان یارمەتی بدەن. تەنانەت ئەگەر دەستدرێژکار کوڕو خزمی نزیکی خۆیان بێ.

٥. موسوڵمان لەجیاتی کافر ناکوژرێتەوە، یارمەتی کافر نادرێ دژی موسوڵمان.

٦. ئاشتی موسوڵمانان یەکێکە، نابێ موسوڵمانێك ئاشتی بکاو ئەوی تر رەتی بکاتەوە، نابێ یەکێك شەڕبکا لەپیناو ئایینی خوداداو ئەوی تریان نەیکا، مەگەر هەموویان بەیەکەوە دادپەروەرانە لەناو خۆیاندا رێك بکەون بۆ ئەنجامدانی.

٧. ذیمەو عەهدی خودا یەکێکە، هەموو موسوڵمانێك دەتوانێ لەسەر ذیمەی خۆی پەنای لێقەوماوبدا، موسوڵمانان هەندێکیان مەوالی هەندێکیانن.

٨. دروست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك دانی نابێ بە ناوەڕۆکی ئەم دەستورەداو بڕوای بەخوداو رۆژی دوایی هەبێ، کە پەنای موشریکێك بداو بیحەوێنێتەوە. کەسێك یارمەتی موشریکێکی دا یان حەواندیەوە. نەفرینی خودای لێ بێ تووڕەیی خودای لەسەربێ. رۆژی قیامەت هیچ وتەو شایەتێکی لێ وەرنەگیرێ.

٩. جولەکە هاریکاری جولەکە دەکات مادام «محارب» بن.

١٠. جولەکەی بەنو عەوف بەشێکن لە ئومەتی موسوڵمان. جولەکە ئایینی خۆیان بۆ خۆیانو موسوڵمان ئایینی خۆیان بۆ خۆیان، مەگەر کەسێك ستەم بکاو تاوان ئەنجامبدا ئەوە خۆیو خاوو خێزانی تووشی هیلاکەت دەکا.

١١.جولەکە بژێوی خۆیان لەسەر خۆیانە، موسوڵمانان بژێوی خۆیان لەسەر خۆیانە. لەنێوان جولەکەو موسوڵماناندا هاریکاریو یارمەتیدان هەیەو هەرکەسێك شەڕی دژی ئەوان ڕاگەیاند کە ئەم دەستوورەیان واژۆکردووە، دەبێ هەردوو لا جولەکەو موسوڵمان دژی بوەستن.

١٢. هەر گرژیو کێشەیەك کەوتە ناو واژۆکەرانی ئەم دەستوورەو ترسی ئاکامی خراپی لێکرا، ئەوە چارەسەرەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆلای خوداو پێغەمبەری خوداو حەل کردنیان بەگوێرەی شەریعەتی خودا دەبێ.

١٣. هەرکەسێك لەمەدینە بچێتەدەر ئەمینە، کەسێك دابنیشێ ئەمین دەبێ، مەگەر ستەم بکاو تاوانی لێ ڕوبدا.

١٤.خودا ئاگاداری تەواوە بەسەر ڕاستی ئەوەی کە لەناو ئەم سیپارەدا نووسراوە. خودا پەنایە بۆ هەموو کەسێك چاکەکاربێ و تەقوابکا.

## پەندو بەڵگە:

ئەم سیپارەیەی پێغەمبەر ﷺ وەکوو دەستوورێك بۆ دەوڵەتە تازە ڕسکاوەکەی نووسیو واژۆکرا نیشانەی گرنگو هەمە جۆری لەخۆگرتوون.

١- بێگومان وشەی دەستوور گونجاوترین ناوە بۆ ئەو سیپارەی پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیدا نووسی. بەگوێرەی زاراوەی سەردەمی تازە گونجاوترین ناو بۆ ئەم وەثیقەیە وشەی دەستوورە، چونکە لەواقیعدا ئەم وەثیقەیە چارەسەری هەموو شتێکی وەهای دەکرد: کە ئەمڕۆ دەستوور چارەسەری دەکا. واتە: هێڵی گشتی ئاشکرای دادەنان بۆ نیظامی دەوڵەت بەناو خۆییو

دەرەکییەوە. واتە: هێڵی سەرەکی دانابوون بۆ چۆنیەتی پەیوەندی تاکەکانی دەوڵەت لەگەڵ یەکترداو پەیوەندی دەوڵەت لەگەڵ قەوارەی ترو کەسانی تردا.

بەسە بۆ ئەم دەستوورە کە پێغەمبەر ﷺ بەگوێرەی نیگا لەخوداوە داینا و بۆ هاوەڵانی نووسیەوەو پاشان کردی بە ئەساس و بنەمای پەسەند لەنێوان موسوڵمانان و هاوسێ جولەکەکانیانداو هەردوولا پێی رازی بوون و واژۆیان کرد.

بەسە بۆ ئێمە لەڕوی بەڵگەوە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە یەکەم پێکهاتنی و دروستبونیەوە لەسەر بنەمای دەستووری و یاسایی دامەزراوە. دەوڵەتی ئیسلامی لەیەکەم رۆژی دامەزرانیەوە لەسەر تەواوترین بنەما و «مقوماتی» ئیداری و دەستووری دامەزراوە، ئەوەی کە دەوڵەت پێویستییەتی بۆ دامەزران لەبنەمای دەستووری ئیداری لە دەوڵەتی تازەی ئیسلامیدا بەوپەڕی تۆکمەیی و گشتگیرییەوە دەستەبەر بوو بوو.

ئاشکراو بەڵگە نەویستە: کە ئەم «مقومات»و بنەمایانە بناغەی پێویست بوون بۆ پراکتیزە کردنی ئەحکامی شەریعەی ئیسلامی لە کۆمەڵگەی تازە رسکاودا. چونکە ئەم «مقومات»انە تێکڕا لەسەر فیکرەی یەکیەتی نەتەوەی ئیسلامی و چەند بەندێکی تر کەپەیوەندی بەلایەنی تەنظیمییەوە هەبوو، بەرجەستە بوو بوون. مومکین نیە ئێمە زەمینەیەك بدۆزینەوە حوکمی ئیسلامی تێدا جێگیر ببێ و شەریعەتی پەیڕەو بکرێ بەبێ رێکخستنی ئەو دەستوورەی پێغەمبەر ﷺ هێنایە کایەوە، هاوەڵانی پێ بەڕێوە بردن. لەهەمان کاتدا ئەو دەستوورە بۆخۆی بەشێك بوو لەئەحکامی شەرع.

لێرەوە هەموو داواو بانگەشەو بیرو بۆچوونی ئەوانەی چاوی خۆیان دەنوقێنن و دڵی خۆیان دادەخەن لەئاست ئەم حەقیقەتە ئاشکرایە

هەڵدەوەرن و دەکەونە زبڵدانی مێژووەوە. ئەوانەی چاوی خۆیان دەنوقێنن و پاشان واگومان دەبەن کە ئیسلام ئایینێکە جگە لە پەیوەندی ئادەمیزاد بەخودای خۆیەوە هیچی تر نییە. دەڵێن: ئیسلام هیچ «مقومات»ی دەوڵەت و تەنظیم و ئیدارەی تێدانییە. بێگومان ئەمە یارییەکی کۆنەو قاوانێکی سواوە. ئەوانەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردووە بە پیشەی سەرەکیان و دارو دەستەی ئیستعمارن پشتی پێ دەبەستن و دەیانەوێ بەم قسە پوچ و بێ بنەمایانە ئیسلام کۆت و زنجیر بکەن بۆئەوەی پەل نەهاوێ و کاری خۆی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا پەرەپێنەدا، دەسەڵاتێك پەیدا نەکا بتوانێ زاڵ ببێ بەسەر کۆمەڵگە لەڕێ دەرچوو هەڵوەشاو لەروی ئەخلاقەوە.

هەڵبەتە وەسیلەو داردەستی دوژمنانی ئیسلام بۆئەوەی قەتیسی بکەن و کۆت و زنجیری بکەن، لەوەدا خۆی دەنوێنێ وای نیشان بدەن: ئیسلام دینە دەوڵەت نیە عیباداتی روت و پەیوەندیکردن بەخوداوەیە لەڕێگەی چەند طقوس و نوێژو رۆژویەکەوە، تەشریع و قانون نیە. تەنانەت بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەتیش بێ لە واقیعدا پێویستە هەڵەوگێڕ بکرێ بە یاسای کۆمەڵ و تەنظیمی ژیانی پێ بکرێ، تەنانەت ئەگەر بە بوختان بۆکردن و درۆ هەڵبەستنیش بێ. بەڵام وەکوو دەڵێن پەتی درۆ کورتەو بەری خۆر بەبێژنگ ناگیرێ. هەرزوو بۆ نەگبەتی ئەو خۆرهەڵاتناس و بەناو باحیث و لێکۆڵەرەوەو ئەکادیمیانەی کە غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردووە بە پیشە پەتی درۆیان پسا و قەلای پڕو پاگەندەیان روخا و قسەکردنی بەوجۆرە لەلای خەڵك بووە قسەی بێ بنەما و نیشانەی حیقدو کینەی دڵیان بۆ ئیسلام و کەس باوەڕیان پێ ناکا.

وەڵێ هەرچۆنێك بێ «لەکاتێکدا ئێمە خەریکی شیکردنەوەی بەندەکانی ئەم وەثیقەیەین» پێویستە ئەوە بڵێین: کە لەدایکبوونی

کۆمەڵگەی ئیسلامی خۆی: لە چوارچێوەی پەیکەرێکی تەواو بووی دەوڵەتدا هاتەکایەوە، تەشریعاتو یاساکانیشی لە چوارچێوەی چەند قاڵبێکی تۆکمەی تەنظیمی کۆمەڵایەتی پێکەوە گونجاو لەهەموو بوارەکانیەوە نازڵ بوون، ئەم وەثیقەیەش بۆخۆی گەورەترین شایەتی ئەو واقیعو حەقیقەتەیە.

ئەمەش بەچاو پۆشی کردن لەنرخی ئەحکامە تەشریعیەکان خۆیان کەچەند پارچەیەکی پچڕ پچڕن ئەگەر بخرێنە پەنا یەکتر تەنظیمیکی تۆکمەو تەواویان لێ پێکدێ بۆ بیناکردنی دەسەڵاتێکی دەستووریو ئیداری گەورەو بێ وێنە.

٢- ئەم وەثیقە ئەندازەی عەداڵەتکاری پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنێ لەمامەڵەکردنی لەگەڵ جولەکەکان، بێگومان لەوانەبوو ئەم مەسەلە عەداڵەت تێدا رەچاوکراوە بەروبوومی خۆی بدایە لەنێوان موسوڵمانانو جولەکەکاندا ئەگەر سروشتی فێڵبازیو باشقول گرتنو غەدرکاری جولەکەکان سەر رێژی نەکردایەو پابەندی بەڵێنو عەهدی خۆیان بونایە. ئەوەبوو زۆری نەبرد ئەوان بەناوەڕۆکی بەندەکانی وەثیقەکە: کەخۆیان واژۆیان کردبوو پێی رازی بوو بوون، تەنگەتاو بونو ژێوان بوونەوە، سەرپێچی پێغەمبەریان کرد بەجۆرەها فرتو فێڵو خیانەت «کە لەشوێنی گونجاوی خۆیدا بەدرێژی باس دەکرێ» بەوەش موسوڵمانان لەو ئیلتیزاماتو پابەند بوونەیان بەرامبەر جولەکەکان کە لەناوەڕۆکی وەثیقەکەدا هەبوو بەرپرسیار نەمان ئەو پابەندبوونەیان لەسەرشان لاچوو.

٣- ئەم وەثیقەیە چەند ئەحکامێکی گرنگی شەریعەتی لێ وەردەگیرێ لەو حوکمانە:

أ- بەندی یەکەم لە وەثیقەکە ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە تەنیا ئایینی ئیسلام دەتوانێ یەکیەتی بخاتە نێو موسوڵمانانەوە، هەر ئیسلام

دەتوانێ بیانکاتە یەك نەتەوە «أمة واحدة». وەهەموو جوداوازیو تایبەتمەندەکانی نێوانیان دەتوێتەوەو پوچ دەبنەوە لە چوارچێوەی ئەو یەکیەتییە سەر تاسەرییەدا. ئەم مانایە بە ئاشکرا لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا کە دەفەرموێ:

{المُسلمون مِنْ قُرَيْشٍ وَيَثْرِبَ وَمَنْ تَبِعَهُمْ فَلَحِقَ بِهِمْ وَجَاهَدَ مَعَهُمْ، أُمَّةٌ وَاحِدَةٌ مِنْ دُونَ النَّاسِ} خۆی دەنوێنێ. ئەو مانایە یا بڵێ ناوەڕۆکی ئەم دەقە، ئەساسو بناغەی هەرە پێویستو زەرورییە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی یەکگرتووی ساغو پتەو.

ب- بەندی دووەمو سێیەم ئەوەمان تێدەگەیەنێ: کە گرنگترین نیشانەی کۆمەڵگەی ئیسلامی دەرکەوتنو گەشەکردنی گیانی هەمئاهەنگیو یارمەتیدانە لەنێوان موسوڵماناندا بەجوانترین شێوەو شێواز. ئەوان هەموویان بەرپرسیارن بەرامبەر بەیەکتر لەکاروباری دونیاییو قیامەتیدا. زوربەی ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامیش لەسەر بناغەی ئەم بەرپرسیاریەتیە دامەزراونو ڕێبازو چۆنیەتی جێبەجێ کردنیان لەبواری بنەمای تەکافولو بەرعۆدە بوونو هەمئاهەنگی نێوانیان دیاری دەکاو سنووریان بۆ دەکێشێ.

ج- بەندی حەوتەم ئەندازەی وردیو قوڵبونەوەی یەکسانی نێوان موسوڵمانانمان بۆ روون دەکاتەوە. پێمان دەڵێ ئەمە دروشمی بریقەدار نیە بۆ جوانیو رازاندنەوە رانوێندرێ. بەڵکوو ئەمە پایەیەکە لەپایەکانی شەریعەتو زۆر گرینگە بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامیو پێویستە بەوردترین شێوەو بە تەواوترین صورەت تەطبیق بکرێو بخرێتە بواری پڕاکتیزەکردنەوە.

بەسە بۆ نیشانەی گرنگی پێدانو دەرخستنی دیاردەی یەکسانیو پڕاکتیزەکردنی لەناو موسوڵماناندا ئەو برگەیەی کە پێغەمبەر ﷺ لەم

بەندەدا چەسپاندی: کە دەفەرموێ: {ذمة الله واحدة یجیر علیهم أدناهم} مانای ئەم دەقە ئەوەیە ذیمەتی موسوڵمان لەهەر پلەو پایەیەکدابێ رێزی لێ دەگیرێو فەرامۆش ناکرێ. جیوارو داڵدەدانی پارێزراوەو نابێ پێشێل بکرێ. ئەگەر موسوڵمانێك کابرایەکی خستە جیواری خۆیەوەو داڵدەی دا بۆ کەسێکی ترنیە فەرمانڕەوابێ یان مرۆڤێکی ئاسایی: کە رێزی ئەو جیوارو داڵدەدانە نەگرێو پێیەوە پابەندنەبێ. ئافرەتی موسوڵمان لەم جیواردانەدا هیچ جوداوازییەکی لەگەڵ پیاودا نییە، ئەگەر ئافرەتێك جیواری کەسێکی دا رێزو نرخی هەیە، هیچ کەسێك ناتوانێ هەڵی وەشێنێتەوە، هەر پلەو پایەیەکی هەبێ. ئەمە رای هەموو زانایانی ئیسلامو ئیمامی مەزهەبەکانە. وەلێ چەند مەرجێ بەمەرج گیراون فوقەها باسیان لێوەکردوەو ئەو مەرجانەی دیاری کردوون، وەکوو ئەوە دەبێ داڵدەدانو جیوارەکە زیان بە موسوڵمانان نەگەیەنێ، بۆ نمونە داڵدەدراوەکە جاسوس بێ. هەروا دەبێ داڵدانەکە بۆ چەند کەسێکی دیاریکراو بێو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بێ نابێ لەچوار مانگ تێپەڕێ«١».

بوخاریو موسلیمو هی تریش ریوایەتیان کردووە: کە ئوممو هانی کچی ئەبو طالب ساڵی فەتحی مەککە چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی برام دەیەوێ شەڕ لەگەڵ کەسێك بکا کەمن جیوارم داوەتێو داڵدەم داوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئوممو هانی ئێمە جیواردانەکەت قبوڵ دەکەین هەرکەسێك تۆ جیواری بدەیە ئێمەیش جیوارمان داوەتێ!

تۆ دەتوانی لەم چیرۆکە وردبیتەوە، ئەمجار بزانی ئافرەت چ پلەو پایەیەکی بەرزو شکۆداری دەست کەوتووە. چۆن ئافرەت لەسایەی

---

١ - مغنی المحتاج — ٢٣٨/٤.

ئیسلامەوە هەموو مافێکی مرۆڤی و کۆمەڵایەتی وەکوو پیاو بەدەست هێناوەو شان بەشانی یەکتر وەستاون، بەجۆرێك: کە لەمێژوودا ئەوە وێنەی نەبیندراوە لای هیچ گەل و نەتەوەیەك.

بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆ فەرق و جوداوازی بکەی لەنێوان ئەم یەکسانییە رائیعەی کە شەریعەتی ئیسلام رواندویەتی لەگەڵ ئەم ظاهیرە لاسایی کردنەوەی کە هەوادارانی شارەستانی تازەی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەن. بزانی شەریعەتی ئیسلام ئەو شەریعەتە یەکسانییە وردەیە: کە لەسەر بنەمای فیکرەی ئادەمیزادی رەسەن دامەزراوەو بەختەوەری ئادەمیزادی «بە پیاوو ژنەوە» لەخۆ گرتووە، تاك و کۆمەڵ تێیدا بەختەوەرن، بەڵام ئەم یاسا دەستکردەی ئەمڕۆ ئەو هەموو ئیعلامەی خراوەتە خزمەت یەکسانی نێوان پیاوو ئافرەت نیە بەڵکوو ئارەزۆیەکی حەیوانی رەگە داکوتراوە، بەکاردەهێندرێ بۆئەوەی ئافرەت بکەنە مادەی رابواردن و روفاهیەتی پیاو، بەشێوەیەکی بەربڵاو، تابۆیان بلوێ ئافرەت دەکەنە هۆکاری دامرکاندنەوەی ئارەزوی پیاو بەبێ بەرچاوگرتنی هیچ لایەنێکی تر.

٤- بەندی دوانزەهەم لە وەثیقەکە ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە حوکمی عەداڵەت ئامێزو گونجاو بۆ سروشتی ئادەمیزاد کە دروست نییە موسوڵمانان وازی لێ بێنن و پەنا بۆ یاسای تر بەرن لەهەموو کێشەو نێزاع و کاروبارێکیاندا تەنهاو تەنها حوکمی ئیسلامەو بەس، هەر شەریعەتی خوداو حوکمی خودا: کە لەقورئان و حەدیثدا خۆیان دەنوێنن بەکەڵکی ئەوە دێ موسوڵمانان کاروباری قیامەتی و دونیایی لەهەموو بوارەکانی ژیاندا پێ بەرێوە بەرن، چەندێك بەحث و لێکۆڵینەوە بکەن بۆ دۆزینەوەی چارەسەری تەنگژەو چورتمیان لە غەیری ئەو سەرچاوە پاك و بێگەردە بەولاوە کە شەریعەتی خودایە خۆیان تووشی چورتم و نەگبەتی ژیانی دونیاو قیامەت دەکەن. لە دونیادا ئاژاوەو

نارەحەتی جەستەیی و گیانی بۆ خۆیان دەخولقێنن و لە قیامەتدا عەزابی سەختی دۆزەخ «خودا پەنامان بدەی».

ئەوەی ئاماژەی پێکرا چوار حوکمی سەرەکی بوون کە ئەم وەثیقە لەخۆی گرتبوون و پێغەمبەر ﷺ کردبونیە پایەو ئەساس و دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر دامەزراندبوون و کردبونیە وەثیقەو دەستوور بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو مینهاج و ڕێباز بۆ پەیڕەو کردنی لە کۆمەڵگەی ئیسلامی تازە ڕسکاودا. بێگومان وەثیقەکە حوکمی گرنگی تری لەخۆ گرتوون لەسەر لێکۆڵەرەوەو بیرکەرەوە شاراوەنین.

لەئاکامی پراکتیزە کردنی ئەم وەثیقەیەو پەیڕەوکردنی ناوەڕۆکی و پابەندبوون بە حوکمەکانی حوکومەتی ئیسلامی لەسەر پتەوترین پایەو ئەساس دامەزرا، پاشان بەوپەڕی بەهێزیو ڕەگە داکوتراوییەوە لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهاندا بڵاو بۆوەو جوانترین و پێشکەوتووترین حەضارەت و شارەستانییەتی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد.

## بەشی پێنجەم

# قۆناغی شەڕی بەرگری

**پێشەکی:**

ئەم غەزەوات و شەڕانەی لێرەدا باسیان دەکەین و خستوومانننە ژێر عینوانی «قۆناغی شەڕی بەرگری». بەفیعلی غەزای بەرگری و دیفاعی بوون و هەموویان بەگشتی یان بۆ رەتدانەوە و پوچەڵکردنەوەی پیلانێک بووە، یان بۆ بەگژاچوونەوەی دەستدرێژییەکی موشریکەکان بووە. بۆیە ئەم قۆناغە تەمثیلی قۆناغێك لە قۆناغەکانی دەعوەی ئیسلامی دەکا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تەعبیر لە حوکمێك ناکا کە بناغە و یاسای جیهادی لەسەر دامەزرابێ و جێگیر بووبێ. ئەم غەزاو شەڕە دیفاعیانە جگە لەدەورێك لەدەورەکانی بانگەوازی ئیسلامی کە لەوەپێش باسمان کردن هیچی تر نییە، قۆناغێك بوو لە قۆناغەکانی بانگەوازی ئیسلامی وەکوو قۆناغی دەعوەی نهێنی و قۆناغی دەعوەی ئاشکرا. لەوە بەولاوە وێنەی قۆناغی کۆتایی و ئەخیر دەبینین کە لەگەڵ قۆناغی پێشەوەیدا تێکڕای حوکمی ئیسلامی پێك دێنن، ئەم قۆناغەش لە روداوەکانی دوا صولحی حودەیبییەدا خۆدەنوێنێ. بێگومان پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە غەزای بەنو قورەیظە گەڕایەوە «وەکوو بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە» ئامارەی بۆ ئەم قۆناغە کردو فەرمووی: {الآنَ نَغْـزُوهُمْ وَلاَ يَغْزُونَنَا}: لە ئێستا بەولاوە ئێمە دەچینە سەریان و غەزویان دەکەین ئەوان ناتوانن غەزومان بکەن.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە رووداوەکانی ئەم قۆناغەی تەمەنی دەعوەی ئیسلامی باس بکەین. تەنها باسی ئەو رووداوانە دەکەین کە حوکم و یاسایان لێ وەردەگیرێ، یان پەندو دەرزییان تێدایە. بەبێ ئەوە پەل بهاوین بۆ درێژە پێدان و رانواندنی راجیایی فوقەها تێیانداو هەوڵدانی پەسەندکردنی رایەك بەسەر رایەکی تردا، کە باسەکەمان لێ درێژ دەبێتەوە و سودیشی لێ نابینین.

## شەڕ دەست پێکردن لەنێوان موسوڵمانان و موشریکەکاندا

### یەکەم غەزایەك کە پێغەمبەر ﷺ کردی:

لەوەپێش گوتمان: صەحیح ترین راو بۆچوون کە فەرموودەو ئاثار ئاماژەی پێ دەکەن ئەوەیە کە رێگە بەشەڕ دەست پێکردنی نێوان موسوڵمانان و کافرەکان دوای کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بووە بۆ مەدینە. ئەم شەڕ بە رەوازانینە خرایە بواری تەنفیذو جێبەجێ کردنەوە لەمانگی صەفەردا دوای تێپەڕبوونی دوانزە مانگ بەسەر کۆچکردن بۆ مەدینە. پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا بۆ یەکەمجار لە مەدینە دەرچوو بەمەبەستی غەزاکردن دژی قورەیش و بەنو حەمزە، بەڵام شەڕەکەی تووش نەبوو، بەنو حەمزە صولحیان لەگەڵدا کردو پێغەمبەرو هاوەڵانی گەڕانەوە بۆ مەدینە.

### غەزای بەدری گەورە

هۆکاری ئەم غەزایە ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بیستی کە کاروانێکی بازرگانی قورەیش بە سەرۆکایەتی ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لەشامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە. ئیتر پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی

هەڵنان بۆئەوەی بچنە سەر ڕێی کاروانەکەو کاڵاکەی داگیربکەن لەبارتەقای ئەو ماڵو سامانەی لە مەککەدا جێیان هێشتووە. هەندێك لە هاوەڵان پێیان خۆشبوو هەندێکیان بەلایانەوە قورس بوو. هاوەڵان کەخۆیان بۆ ئەم ڕێگرییە ئامادەکرد ئیشەکەیان لەسەر شان خۆش بوو چونکە بە خەیاڵیاندا نەدەهات تووشی شەڕو کوشتاربن. ئەبو سوفیان کە بەم وەزعەی زانی و لە ڕێگەدا بوو بەرەو مەککە لێی مەعلوم بوو کە موسوڵمانان خەریکی خۆئامادەکردنن بۆ ڕێگری لە کاروانەکەی و روتکردنی، خێرا ضەمضەمی کوڕی عەمری غەففاری نارد بۆ مەککە بۆئەوەی هەواڵ بدا بە قوڕەیشییەکان بەهانایەوە بێن و کاڵا و شتو مەکی خۆیان رزگار بکەن.

هەواڵەکە بە قوڕەیش گەیشت، خێرا خۆیان سازکردو سەر لەبەریان لەمەککە دەرچوون بەمەبەستی شەڕکردن. تەنانەت پیاو ماقوڵەکانیان هەموویان هاوبەشییان کردو کەسیان دوانەکەوت نزیکەی هەزار شەڕکەر بوون.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لە مەدینە دەرچوو، لەوکاتەدا چەند شەوێك لە رەمەزان تێپەڕی بوو. ژمارەی موسوڵمانەکان بەگوێرەی ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق سێصەدو چواردە پیاو بوون، ژمارەی حوشترەکانیان حەفتابوو، بەنۆرە دوو دوو سێ سێ لە هاوەڵان سواریان دەبوون. هاوەڵان ئاگایان لە بەهانا هاتنی قوڕەیشییەکان نەبوو کەوا لەمەککە دەرچوون و بەو ژمارە زۆرەوە هاتوون نیازی شەڕیان هەیە. لەلایەکی ترەوە ئەبو سەفیان توانی کاروانەکە رزگار بکا، ئەوەبوو ڕێڕەوی دیاریکراوی کاروانەکەی گۆڕی لەکەنار دەریاوە ڕۆیی و ئاوی بەدری خستە لای چەپی خۆیەوەو بەهەڵەداوان کاروانی تاودا بە پەلە پڕوزێ کاروانەکەی لەخەتەری دەست بەسەراگرتن رزگار کرد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەشکر کەشی قوڕەیشییەکانی پێگەیی، ئیتر پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵانی کەوتە راوێژو وەرگرتنی

هەڵوێستی موهاجیرو ئەنصارەکان. کۆچکەرەکان قسەیان مەردانەو موسوڵمانانە بوو، یەکێ لەوان «ألمقداد»ی کوڕی عەمر بوو، ئەوەبوو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بڕۆ بۆ پێشەوە خودا چۆنی فەرمان پێکردوی جێبەجێی بکە، ئێمە لەگەڵتاین و سەرمان لەڕێدایە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ تەماشای حەشاماتەکەی دەکردو دەیفەرموو: خەڵکینە! رای خۆتانم پێ بڵێن. سەعدی کوڕی موعاذ هاتە قسەو وتی: وادیارە مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: بەڵێ. سەعد وتی: بێگومان ئێمە ئیمانمان پێ هێناوی کە پێغەمبەری خودای و پەیامەکەتمان بەراست زانیوە، شایەتیمان دا کە ئەو شەریعەت و یاسایەی تۆ هێناوتە حەقە. لەسەر ئەمە پەیمانمان پێداوی، عەهدو بەڵێنمان پێداوی کە فەرمانبەرداری فەرمانت بین. سوێندم بەوکەسەی بەحەق کردویتی بە پێغەمبەرو ناردوتی بۆسەر ئادەمیزاد، ئەگەر بمانبەیە سەر ئەو دەریایەو خۆی تێ فڕێ دەی ئێمە بەشوێنتا خۆی تێ فڕێ دەدەین. پێغەمبەر ﷺ بە قسەکەی سەعد دڵی خۆش بوو، پاشان فەرمووی: بڕۆنە پێشەوە موژدەو لێ بێ، خودا وادەی پێداوم یەکێك لەم دوو دەسکەوتەمان دەست دەکەوێ سوێندم بەخودا هەر دەڵێی من ئێستا چاوم لەشوێنی گلان و کوژرانی قوڕەیشییەکانە.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ کەوتە سەر ئەوەی بزانێ ژمارەی لەشکری قوڕەیش چەندەو هێزو توانای شەڕیان چۆنەو چۆن نییە. لەڕێگەی چەند کەسێکەوە کە ئامادەی کردبوون بۆ هەواڵگری، بۆی دەرکەوت ژمارەیان لەنێوان نۆسەد بۆ هەزارەو زوربەی سەرانی قوڕەیش و پیاو ماقوڵانیان لەناو لەشکرەکەیان دایە.

لەوکاتەش دا ئەبو سەفیان! سەرۆکی کاروانەکەیان رزگاری بوو بوو، بە سەلامەتی کاڵا و کاروانەکەی گەیاندبووەوە مەککە، پیاوی تایبەتی ناردبوو بۆلای قوڕەیشییەکان داوای لێ کردبوون بگەڕێنەوە بۆ مەککەو

کاروانەکەی بەسەلامەتی گەیاندۆتەوە مەککە. وەلێ ئەبو جەهل کە سەروکاری لەشکرەکەی دەکرد، سوور بوو لەسەرئەوەی کە بڕوا بەرەو پێش‌و وتی: سوێندم بەخودا ناگەڕێینەوە تا نەچینە سەر ئاوی بەدر، خواردن ئامادە دەکەین‌و شەراب دەخۆینەوە دەیکەینە سەیرو صەفاو جاریەو چەتیو گۆرانیمان بۆ بڵێن. عەرەبی دەوروبەرمان هەواڵی ئەم لەشکر کێشییەو کۆبونەوەمان ببیسن‌و بۆ هەتا هەتایە لێمان بترسن.

پاشان موسوڵمانەکان ڕۆیشتن تا لەلای «العدوة القصوی»ی شیوی بەدر لەلای خواروی ئاوەکەوە لەشکر بەزییان کرد. حەبابی کوڕی مونزیر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەم شوێنەی کەواین تێیدا، شوێنێکە خودا فەرمانی پێکردوی لێی بین‌و بۆمان نییە بەرەو پێشتر بچین. یان ئەوە رای خۆتەو شەڕ فرت‌و فێڵە؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر ئەمە رای خۆمەو شەڕ فێڵ‌و پیلانە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شوێنە بەکەڵکی لەشکر بەزی ئێمە نایە، خەڵکەکە راجمێنە بابڕۆین تا دەگەینە لای ئاوەکەو لەوێ بیرە ئاوەکانی دەوروبەر پڕدەکەینەوە حەوزێکی گەورە بنیات دەنێین‌و پڕی دەکەین لەئاو، ئەوکاتە شەڕ لەگەڵ قورەیشییەکان دەکەین و تینومان بوو ئاومان لەپەناوەیە ئاو دەخۆینەوە، ئەوانیش ڕێگای ئاو خواردنەوەیان لێ دەگیرێ. پێغەمبەر ﷺ رایەکەی پەسەند کردو خێرا هەڵساو هاوەڵانی لەتەکیدا راستبوونەوە هاتنە خوار ئاوەکەو خۆیان تێدا لەمەکۆدا. واتە ئەو شوێنەی کە «حوباب»ی کوڕی مونذیر ئاماژەی پێکردبوو«١».

---

١ - روى ابن هشام في سيرته حديث الحباب بن المنذر هذا عن إسحق عن رجال من بني سلمة، فهي فيما رواه ابن هشام رواية عن قوم مجهولين وذكر الحافظ بن حجر هذا الحديث في الاصابة فرواه عن ابن اسحق عن يزيد بن رومان عن عروة بن الزبير وغير واحد في قصة بدر. وهذا سند صحيح والحافظ بن حجر ثقة فيما ينقل ويدوى. راجع الاصابة ج١/٣٠٢.

سەعدی کوڕی موعاذ پێشنیاری ئەوەی کرد کە شوێنێکی قایم و قوڵ بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست بکەن تێیدا پەنا بگرێ و شەڕەکە بەڕێوە بەرێ و قوڕەیشییەکان نەتوانن زەفەری لێ بێنن و گیانی سەلامەت بێ و بە سەلامەتی بگەڕێتەوە بۆ مەدینەو موسوڵمانە بەجێماوەکانی مەدینە بەدیداری شادببنەوە. پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوەش موافیق بوو، ئەمجار دەستی کرد بە ئامۆژگاری هاوەڵانی و دڵنیای کردن کە سەرکەوتن بۆ ئەوان دەبێ و خودا یارمەتی دەداو پشتگیریی لێ دەکا. تەنانەت دەیفەرموو ئێرە شوێنی کوژرانی فلانەو ئەوە شوێنی لەخوێندا گەوزانی فلانە لە قوڕەیشییەکان یەکە یەکە بەدەست ئاماژەی بۆ شوێنەکان دەکرد... لەوەدوا کە شەڕ دامەزرا پێغەمبەر ﷺ چۆنی فەرموو بوو ئاوا هاتەدی. هەریەکەیان لەو جێگایەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێ کردبوو کوژرا«[١]».

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەئێوارەی شەوی هەینی «١٧»ی رەمەزان کەوتە دوعاو پاڕانەوە لەخوداو دەیفەرموو:

{أللهم هذه قريش قد أقبلت بخيلائها وفخرها} خودایە بۆ خۆت ئاگاداری ئەوە هۆزی قوڕەیشە بە لوتبەرزیو شانازی بەهێزی خۆیانەوە هاتوون «تحادّك» تەحەدای تۆ دەکەن «وتكذب رسولك» پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوە {أللهم فنصرك الذي وعدتني} خودایە! ئەو سەرکەوتنەی وادەت پێداوم بیهێنیە دیو پێمان ببەخشی. {أللهم أحِنْهُمُ الغداة} خودایە! بەیانی رقی خۆتیان پێ بڕێژە. ئیتر درێژەی بە پاڕانەوەکەی داو دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردبوونەوە دەپاڕایەوە دەلاڵایەوە تەنانەت ئەبوبەکری صدیق بەزەیی پێداهاتەوە چووە دوایەوەو عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! موژدەبێ، سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە خودا ئەو

---

١ - رواه مسلم — ١٧٠/٦.

وادەی پێی داوی بۆت دێنێتە دی .. موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە دەستیان کردبوو بە پاڕانەوەو لاڵانەوە بە سۆزو کوڵی گریانەوە هاواریان لەخودای خۆیان دەکرد یارمەتییان بداو سەریان بخا«١».

لەبەیانی رۆژی هەینی کە دوو ساڵ بەسەر کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینەدا تێپەڕی بوو. شەڕ لەنێوان موشریکەکان و موسوڵمانەکاندا دەستی پێکرد. پێغەمبەر ﷺ چنگە زیخ و بەردە وردەی هەڵگرتن روبەڕوی موشریکەکان هەڵیدا، فەرمووی: «شاهت الوجوه» خودا روخساریان لەناوبەرێ بە قودرەتی خودا ئەو زیخ و بەردە وردانە چوونە چاوی موشریکەکانەوەو پیاوێکیان نەبوو ئەو چاو پڕبوونەوەی تووش نەهاتبێ. پەروەردگار فریشتەی ناردە یارمەتی موسوڵمانان و لەتەك ئەواندا شەڕیان کرد«٢».

جەنگەکە بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسوڵمانەکان کۆتایی هات. لەو شەڕەدا حەفتا کەس لەسەرانی قوڕەیش و پیاو ماقوڵانیان کوژرابوو، حەفتا کەسیشیان لێ بەدیل گیرا. چواردە کەسیش لە موسوڵمانەکان شەهید بوون.

ئەمجار لاشەی کوژراوەکانی قوڕەیش هەموویان کۆکرانەوەو زوربەی پیاو ماقوڵ و پاڵەوانەکانیانی تێدابوو خرانە بیرێکی بەدرەوە، پێغەمبەر ﷺ لەکەناری بیرەکە وەستاو بەناوی خۆیان بانگی لێ کردن یا فلان، یا فلانی کوڕی فلان، ئایا پێتان خۆش دەبوو بەندایەتی خوداتان کردباو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بونایە؟ ئێمە ئەو وادەیەی خودا پێی دابووین هاتەدی و بۆمان دەستەبەر بوو. ئەرێ ئەوەی خودای خۆتان وادەیی پێدابوون بۆتان هاتەدی؟ حەزرەتی عومەر عەرزی پێغەمبەری کرد وتی:

---

١ - ابن هشام – ٢٠٥/١، زادالعاد – ٧٨/٢ وحديث استغاثة الرسول بربه فی غزوة بدر.

٢ - حديث تأييد للمؤمنين بالملائكة في بدر متفق عليه.

ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ چۆن قسە لەگەڵ چەند لاشەیەکی بێ گیان دەکەی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئێوە لەوان قسەکانم باشتر نابیستن«[١]».

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ راوێژی بە هاوەڵانی کرد دەربارەی دیلەکان، حەزرەتی ئەبوبەکر ئامارژەی بۆکرد بەوە: کە فیدیەیان لێ وەربگرێ و مەرەخەسیان بکا، بەڵکوو خودا هیدایەتیان بدا، ماڵ و سامانێکیشمان لێیان دەست دەکەوێ و دەبێتە مایەی بەهێز بوونی موسوڵمانان.. ئیمامی عومەر ئامارژەی بۆئەوە کرد: کە بکوژرێن لەو روەوە کەئەوان سەرانی کوفرو پاڵەوانی شەرن، بەلام پێغەمبەر ﷺ رای حەزرەتی ئەبوبەکری پەسەند کرد، فیدیەی لێ وەرگرتن و مەرەخەسی کردن. وەلێ دوا ئەوە ئایاتی قورئان نازڵ بوو، سەر زەنشتی تێدا بوو بۆ پێغەمبەرو پشتگیری رای عومەری تێدابوو، ئایەتەکە ئەمە بوو: {مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ، فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا – الأنفال/٦٧}.

## پەندو ئامۆژگاری:

غەزای بەدری گەورە کۆمەڵێك وانەو ئامۆژگاری گەورەو بەنرخی تێدان، لەهەمانکاتدا موعجیزەی ئاشکراو سەرنج راکێشی تێدا هەن: کە پەیوەستن بە پشتگیری کردن و یارمەتیدانی خودا بۆ موسوڵمانان، ئەوانەی کە پابەندن بە مەبادیئو بنەمای ئیمانی راستاڵ و دڵسۆزن بە ئەنجامدانی بەرپرسیاریەتی ئایینەکەیان ئێمە ئەم بەڵگەو وانانە لەم خاڵانەدا کورت دەکەینەوە:

---

[١] - البخاري: ٨/٥ – وروى مسلم نحوها في ١٦٣/٨.

١- ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هۆکارو پاڵنەری ئەصڵی بۆ چوونە دەرەوەی موسوڵمانان شەڕو کوشتار نەبوو، بەڵکوو دافیعی سەرەکی دەستگرتن بوو بەسەر کاروان و کاڵاکەیدا: کە لەشامەوە بە سەرۆکایەتی ئەبو سوفیان دەگەڕایەوە بۆ مەککە. بەڵام پەروەردگار ویستی وابوو دەستکەوتێکی باشترو گەورەتر دەست موسوڵمانەکان بخا. سەرکەوتنێکی کاریگەرتر، کارێکی شەریفانەترو گونجا وتر لەگەڵ ئەو مەبەستەی موسوڵمان لە ژیانیدا پێویستە هەوڵی بۆبدا. بۆیە ئەو کاروانەی مەبەستیان بوو دەستی بەسەردا بگرن و بەو مەبەستە لە مەدینە دەرچوو بوون. خودا لەکیسی دان و لەجیاتی ئەوە شەڕو سەرکەوتن و دەستکەوتی بەنسیب کردن. کە لەواقیعدا ئەوەیان لە خەیاڵدا نەبوو، ئەمەش بۆ خۆی دەلالەت دەکا لەسەر دوو شت:

**یەکەم**: هەموو موڵک و ماڵی کافری حەربی بە نیسبەت موسوڵمانانەوە رێز لێ نەگیراوە و بۆیان هەیە دەستی بەسەردا بگرن و هەرچی دەستیان کەوت لەماڵ و سامانی ئەوان دەبێتە مڵکی ئەمان. ئەمە حوکمێکە کۆڕای زانایانی ئیسلامی لەسەرە. سەرباری ئەوەش کۆچکەران کە لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەرنراون و موڵک و ماڵیان کەوتۆتە ژێر دەستی کافرە قورەیشییەکان پاساوێکی ترە بۆیان کە لەجیاتی ماڵ و سامانی جێماویان لەمەککە، دەست بەسەر کاروانی قورەیشدا بگرن وەکوو تەعویض و بارتەقایەك بۆ موڵك و سامانی دەست بەسەراگیراویان.

**دووەم**: وێڕای مەشروعیەتی ئەم مەبەستە و رەوابوونی ئەم نیازە، پەروەردگار مەبەست و نیازێکی بەرزترو شەریفانەترو گونجا وتر بۆ ئەو ئەرکەی بۆی دروستکراون ویستبوویان بۆی هێنانە دی. ئەویش بریتی بوو لە بانگەوازی بۆلای ئایینی خوداو جیهادو خۆبەختکردن لەو

ڕێبازەدا، قوربانی دان بە ماڵو بەگیان لەپێناو بەرزکردنەوەو بەشکۆ ڕاگرتنی دروشمی «لا إِلهَ إلاَّ اللّهُ محمداً رَسُولُهُ». لێرەوە بە ئەندازەی ئەو سەرکەوتنە گەورەی کە دەست ئەبو سوفیان کەوت بەڕزگارکردنی کاروانەکە بە سەلامەتی، تێکشکانو هەزیمەیەکی گەورەش ڕوی کردە هۆزی قوڕەیش لە گۆڕەپانی جیهادو ڕوبەڕوبوونەوە بە شمشێرو ڕمب لەنێوان ئەوانو موسوڵمانەکاندا. بەڕاستی ئەمە پەروەردەکردنێکی ئیلاهی بوو بۆ دەروونی موسوڵمانەکان بۆئەوەی بە باشترین شێوە لەم ئایەتەدا خۆی وێنا بکاو خۆی ڕانوێنێ. کە دەفەرموێ:

{وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتِيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللّهُ أَن يُحِقَّ الحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ – الأنفال/٧}.

٢- ئێمە کاتێك بیر لەوەدەکەینەوە: کەچۆن پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا ڕاوێژ دەکا دەربارەی ڕوداوێك کە بەشێوەی چاوەڕوان نەکراو ڕوبەڕوی بونەوە: ئەوەتا کاروانیان لەکیس چووە بەڕێگایەکدا ڕۆیشتووە تازە دەستی ئەمانی پێ ناگا. وێڕای ئەوەش لەشکرێکی زۆرو پڕچەکیان ڕوبەڕو بۆتەوە کاتێك بیر لەو دانیشتنو ڕاوێژکردنەی پێغەمبەر دەکەینەوە لەو ساتە وەختەدا. دوو دەلالەتی شەرعی گرنگمان بۆ دەردەکەون هەریەکەیان گرنگی تایبەتی خۆی هەیە:

**دەلالەتی یەکەم:**

پابەندبوونی پێغەمبەر ﷺ بە بنەمای ڕاوێژ لەگەڵ هاوەڵانی، ئەگەر ئێمە ژیانی پیرۆزی بخەینە ڕوو دەبینن: کە لەهەموو کارێکی گرنگو پەیوەست بە تەگبیرو سیاسەی شەرعییەوە، ئەگەر دەقێکی قورئانی پیرۆز نەبووبێ پێغەمبەر ﷺ ئەو بنەمایەی پەیڕەو کردووە، بۆیە موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کە ڕاوێژ لە هەرکارێکدا «دەقێکی «ملزم» لە قورئان یان حەدیثدا دەربارەی نەبوو» بنەمایەکی

شەرعییەو نابێ بەهیچ شێوەیەك پاشگوێ بخرێ. بەڵام ئەوەی قورئان یان حەدیثی پێغەمبەر حوکمەکەی دیاریی کردبێ، ئەوە راوێژکردن تێیدا بێهودەیەو نابێ بەهیچ بەڵگەیەك حوکمی ئەوان وەلا بنرێ.

**دەلالەتی دووەم:**

هەموو حاڵەتێکی غەزو پەیمان بەستن و صوڵح و ئاشتەوایی لەنێوان موسوڵمانان و بەرامبەریاندا دەبێ سیاسەی شەرعی تێدا پەیڕەو بکرێ و خاضعی «حكم الامامة» بێ. واتە: مەشروعییەتی واجب بوونی جیهاد لەڕووی ئەصڵ و بنەماوە حوکمێکی تەبلیغییە هیچ نەسخ و سڕینەوەو گۆڕان رووی تێناکا. هەروەکوو چۆن مەشروعییەتی صوڵح و موعاهەدات چەسپاوەو دروست نییە بەتاڵ بکرێتەوە یان لەناو شەریعەتی ئیسلامیدا لابرێ و ریشەکێش بکرێ. بەڵام هەندێ لەجوزئیات وێنەی پراکتیزە کردن بەگوێرەی بارو دۆخ و شوێن و رۆژگارو حاڵەتی موسوڵمانان و حاڵەتی دوژمنیان، سیاسەی شەرعی تێدا رەچاو دەکرێ و هەڵوێستی گونجاوی تێدا رەچاو دەکرێ، تەرازوی موحکەم لەو حاڵەتانەدا دیدو بۆچوونی ئیمامە، ئیمامی خاوەن ئیمانی عەداڵەت خوازو سیاسەتمەدارو لێزانی فەرمانڕەوای شارەزا لە ئەحکامی ئایین و دڵسۆز بۆ ئایین و خۆنەویست و مەبەست روون و ئاشکرا لە هەڵس و کەوتیدا وێڕای ئەوەش دەبێ پشت بەستوبێ بە راوێژکردن بە موسوڵمانان سوود وەرگرتن لە خیبرەو شارەزاییان و بیرو بۆچوونی جیاوازیان. جا هەرکاتێ فەرمانڕەوا وای بەباش زانی و پێی وابوو بەرژەوەندی موسوڵمانان لەوەدایە بەرەنگاری دوژمن نەبنەوە بەشەڕی بەرامبەری و بەکارهێنانی هێز، لە روانگەی رای پەسەندی خۆی و دان وسان و لێکۆڵینەوە لەگەڵ شارەزایانی وڵات ئەوەی بۆ چەسپا کە شەڕکردن لە بەرژەوەندی موسوڵمانان نییە، ئەوە بۆی هەیە دەستی

ئاشتەوایی درێژبکا، بەمەرجێك لەگەل دەقێك لە دەقەکانی قورئان و حەدیث دژ نەوەستێ و ئەو رایەی پەسەندی دەکا لەگەڵ ثەوابیتی شەرعی تەصادوم نەکا، ئەمە پەیڕەودەکا تا بارودۆخی گونجاو دێنە پێشەوە بۆ شەڕو جیهاد دژی دوژمنان، هەرکاتێ وای بینی کە بەرژەوەندی موسوڵمانان لەوەدایە شەڕبکا و جیهاد دەست پێ بکا، ئەوە بۆی هەیە رەعییەتەکەی هەڵنێ و بۆ رووبەڕووبونەوەی دوژمن و دەست لێوەشاندنی.

ئەمەی گوترا کۆڕای عاممەی فوقەهای ئیسلامەو زۆر بەڵگەو نیشانە لە سیرەی پێغەمبەردا دەست دەکەون لەسەر ئەوەی ئامارژەمان پێکرد. «اللهم» مەگەر دوژمن هێرش بێنێ بۆسەر وڵاتی موسوڵمانان و لەماڵی خۆیان پەلاماریان بدا، ئەوە ئەو کاتە ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە بەهەموو هێزو توانایانەوە بەهەر وەسیلەیەکەوە بێ دوژمن لە وڵات وەدەرنێن، دەبێ لە حاڵەتی وادا موسوڵمانان بەگەنج و پیریانەوە بە ئافرەت و پیاویانەوە هەموویان تێکڕا بکەونە حاڵەتی بەرگری کردنەوە. بەمەرجێك بەهەموویان نەبێ کارەکە ئەنجام نەدرێ.

ئەمجار رای راست و صەحیح: «کە زوربەی فوقەها قبوڵیانە» ئەوەیە: کە ئەم جۆرە راوێژە مەشروع و رەوایە، مولزم نیەو پێویست ناکا فەرمانڕەوا پەیڕەوی بکا، بەڵکوو ئەوەی لەسەر فەرمانڕەوا پێویستە ئەوەیە: رایەکان وەربگرێ و لێیان وردبێتەوەو بیانکاتە رێگە رۆشنکەرەوە. تەنانەت ئەگەر زۆرینەی راوێژ پێکراوەکان رایەکی پێچەوانەی رای فەرمانڕەوایان هەبوو، هەر نابێتە هۆی ئەوە فەرمانڕەوا ناچاربکا رایەکەیان وەربگرێ. لەم بارەوە قورطوبی دەڵێ: راوێژکار دەڕوانێتە راو بۆچوونەکان و تێدەفکرێ کام رایە نزیکترە بە ناوەڕۆکی قورئان و فەرمووودەی پێغەمبەر ﷺ جا ئەگەر خودا دڵی هێنایە سەر

پەیڕەوکردنی رایەك لە رایەکان ئیتر پشت بەخودا دەبەستێ و پەیڕەوی دەکا«١».

٣- بێگومان باحیثو توێژەرەوە بۆی هەیە پرسیار بکا بڵێ: بۆچی رای ئەبوبەکرو عومەرو میقداد لەدڵی پێغەمبەردا کاریگەریی تەواوی نەبوو، بەڵکوو بەردەوام دەیڕوانییە دەمو چاوی خەڵکەکەو پێی دەفەرموون: رای خۆتانم بۆ دەربڕن. هەتا سەعدی کوڕی مەعاذ قسەی کرد، ئیتر بە قسەکانی ئەو دڵی ئاوی خواردەوەو دڵی داسەکنا؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بەجێیە ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ دەیەویست رای ئەنصارەکان وەربگرێ دەربارەی ئەوەی ئایا ئەوان لە دەربڕینی راو حوکمەکانیاندا ئەو موعاهەدە تایبەتییە بەرچاو دەگرن کە لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوویانو پابەندی ئەو پەیمانەن یان نا؟ ئەوکاتە بەپێی ئەو پەیمانە پێغەمبەری خودا مافی ئەوەی نییە زەختیان لێ بکا بۆ شەڕو داکۆکی لێ بکەن لە دەرەوەی مەدینەدا، چونکە پەیمانەکەیان بەدەق ئەوەی تێدایە کە تەنها لەناو مەدینەدا بەرگری لێ بکەن.

یان ئەوان «واتە ئەنصارەکان» لە روانگەی هەستە ئیسلامییەکەیانەوەو پەیمانی گەورەیان لەگەل خودادا، رای خۆیان دەردەبڕنو هەڵوێستی خۆیان دەنوێنن؟ کەوابوو پێویستە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیاندا لەم بارەوە پابەندبێ لەسەر ئەوانیش پێویست بوو مافی ئەو پەیمانو بەڵێنە بدەنو پابەندی بنو ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ بێنن بەتەواوی.

ئێمە کە لە وەڵامەکەی سەعد تێدەفکرین، دەزانین: ئەو بەڵێنو پەیمانەی کە ئەنصارەکان داویانە بە پێغەمبەر ﷺ پێش کۆچکردنی

---

١ - الجامع الاحکام القرآن — ٤/٢٥٢.

بۆ مەدینە، پەیمان بەستن بوو لەگەڵ خودا، ئەوان تەصەوری ئەوەیان کـردووە کاتێـك پێغەمبـەر کـۆچ دەکـا بۆلایـان و دیفـاعی لێ دەکـەن دیفاعکردنەکـەیان دیفـاع دەبـێ لـە ئـاینی خـوداو شـەریعەتی خـودا، کەوابوو قەزیە مەسئەلەی دەقێکی دیاریکراو نیە کە لەگەڵ پێغەمبـەردا لەسەری رێك کەوتوون و زیاد لەوەو بەدەر لەوە پابەندی هیچی تـر نـەبن، بـەڵکوو مەسـەلەکە لـەوە فـراوانترە، ئـەوان بـەو رێککەوتنـە چـوونە ژێـر پابەندبوون بە صەك و کومپیالەیەکی گەورەتر کە ئایەتی:

{إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ}. وێنای گرتووەو لەخۆی گرتووە.

بۆیە وەڵامی سەعد ئەوەبوو وتی: {لقد آمّنا بك وصدّقناك وشهدنا أن ما جئت به هو الحق فامض لما أردت فنحن معك}.

ئێمـە ئیمانمـان پـێ هێنـاوی تەصـدیقی پەیامەکـەتمان کـردووە، شایەتیمان داوە کە ئەو پەیامەی هێناوتـە حەق و راستە، فەرموو بڕۆ بـەرەو ئامـانجی خـۆت ئێمـە سـەرمان لەڕێتایـە. واتـە: لەگـەڵتاین لـە چوارچێوەی پەیمانێکی گەورەترو بەرفراوانتر لەوەی کە ئێمە لـەوەپێش لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا بەڵێنمان پێدابووی.

٤- دروسـتە بـۆ ئیمـام لـە غـەزاو جیهـاددا کـە ئیـستیعانە بکـا بـە جاسـوس و چاودێرو بڵاویـان بکاتـەوە بـەناو هێـزی دوژمنـدا، بۆئـەوەی موسـوڵمانان بتـوانن پـلان و نەخـشەی دوژمنـان بـزانن. حـاڵ و وەزع و ژمارەو هێزو توانایان بزانن. هەروا دروستە هۆکاری جیاوازو هەمەجۆر بگرێتەبەر بۆ زانینی قەبارەی هێزی دوژمن. بەمەرجێك گرتنەبەری ئەو هۆکارانە نەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە بەرژەوەندییەك زۆر گرنگتر بێ لە بەرژەوەندی ئاگاداربوون و بەسەر حاڵی دوژمندا. زۆرجار وا پێویست دەکا هۆکارەکە بەنهێنی پەیڕەو بکرێ، یان فرت و فێڵی تێدا ئەنجام

بدرێ. هەموو ئەمانە رەوان و دروستن لەم رووەوە کە پێویستن بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان و پاراستنیان. کتێب و سەرچاوەکانی سیرە ئاماژە بەوە دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک لەنزیک بەدر دابەزی و لەشکری بەزی کرد. تەشریفی لەگەڵ یەکێك لە هاوەڵانیدا سواربوو رۆیشتن تاتووشی پیرەمێردێکی عەرەب بوون. پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قورەیش و موحەممەدو هاوەڵانی پرسیاری لێ کرد ئاخۆ چی لە هەواڵیان دەزانێ؟ پیرەمێردەکە وتی: پێتان ناڵێم تاپێم نەڵێن ئێوە کێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەواڵمان بدەیتێ ئێمەیش دەڵێین: ئێمە کێین. پیرەمێردەکە وتی: ئەوە بە ئەوە؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ: ئیتر کابرای عەرەب ئەوەی دەیزانی دەربارەی قورەیشەکان و دەربارەی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆی باسکرد. جا کە پیرەمێردەکە لەقسەکانی بۆوە، ئەمجار وتی: دەی باشە ئێوە کێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمە لە دانیشتوانی ئاوین و ئیتر گەڕایەوەو کابرای جێ هێشت. جا پیرەمێردەکە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: لەچ ئاوێکن؟ لەئاوی عێراقن؟

## ٥- چەند جۆرێك لە تەصەروفاتی پێغەمبەر ﷺ:

ئەم حەدیث و گفتوگۆیەی رویدا لە نێوان پێغەمبەرو «الحباب»ی کوڕی «المنذر» دەربارەی شوێنی لەشکر بەزییەکەی پێغەمبەر «حەدیثەکە بۆخۆی بە رشتەیەکی راست ریوایەت کراوە» ئەم حەدیثە ئەوەمان پێ دەڵێ: کە تەصەروفات و هەڵس و کەوتی پێغەمبەر ﷺ هەمووی لەجۆری تەشریع نیەو پێویستبێ شوێنی بکەوین. بەڵکوو زۆرکات تەصەروفاتەکانی تەصەروفی ئادەمیزادانەن و لەبیرو فیکری ئادەمیانەی هەڵقوڵیون، گومانیش لەوەدانیە لە حاڵەتی ئاوادا ئێمە مولزەم نین بە پەیڕەوکردنی: یەکێك لەوشتانەی کە لەهەڵس و کەوتی

ئادەمیانەی هەڵقوڵیوە لەشکر بەزیکردنی بوو لەو شوێنەی کە هەڵی بژاردبوو لەبەردرا، ئەوەتا بینیمان «الحباب» چۆن ئامارژە دەکا بە گواستنەوە لەو شوێنە بۆ شوێنێکی گونجاو ترو موافەقەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بۆچوونەکەی «ألحباب».

ئەمەش دوای ئەوەی کە «ألحباب» چووە بنج و بناوانی ئەوە: کە هەڵبژاردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ لەشکر بەزیکردنی لەو شوێنە بە نیگایەك نییە لەخوداوە بۆی هاتبێ. هەروا لەوشێوە زۆر لە تەصەروفاتی کە دەچنە چوارچێوەی «السياسة الشرعية»وەو پێغەمبەر هەڵس و کەوتی تێداکردون بە صیفەتی ئەوەی کە ئیمام و سەرۆکی دەوڵەتە، نەك بە صیفەتی ئەوەی پێغەمبەرەو لە خوداوە نیگای بۆ هاتووە. وەکوو زۆر لە رێنمویی سەربازی و نەخشەو پلانی سەربازی. کە فوقەهای ئیسلام بە درێژی و بەرفراوانی لێی دواون و ناکرێ ئێمە لێرەدا هەموو ئەو نموونەو باسانە رابنوێنین.

### ٦- گرنگی پاڕانەوەو لاڵانەوە لەخوداو بتمانەو پشت بەستن بەزاتی پاکی:

ئێمە زانیمان چۆن پێغەمبەر ﷺ چۆن هاوەڵانی دڵنیا دەکردن کە سەرکەوتن بۆ ئەوانە، تەنانەت ئامارژەی بۆ شوێنی کوژرانی زۆر لەسەرانی قورەیش کردو دەیفەرموو: ئەمە شوێنی کوژرانی فڵانەو ئەمە جێگای لە خوێندا گەوزانی فلتانە......الخ. چۆنیشی فەرموو بوو ئاوا هاتەدی. هیچ لەو کوژراوانە لەو شوێنەی پێغەمبەر دیاری کردبوو کلانەبووبن، هەریەکەیان ڕێك لەوجێگەیە لەخوێنی خۆی دا گەوزی بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بینیمان پێغەمبەر ﷺ بە درێژایی شەوی هەینی لە سەنگەرو ساباتەکەیدا کەبۆی دروستکرابوو، لەخودا دەپاڕایەوەو دەلاڵایەوەو دەستی بەرزدەکردەوە بۆلای ئاسمان دەکڕوزایەوەو داوای

یارمەتی و سەرکەوتنی لە پەروەردگار دەکرد، ئەوەندەی دەست بەرزکردەوە ریداکەی لەسەر شانی کەوتە خوارو حەزرەتی ئەبوبەکر بەزەیی پیدا هاتەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەسە چیدی مەکڕوزێوە دڵنیابە خودا ئەو وادەی پێی داوی دەیهێنێتە دی. دەی کە پێغەمبەر لە یارمەتیدانی خودا دڵنیابوو بۆ ئەم هەموو پاڕانەوە بەکوڵ و بەسۆزە بۆچی؟ بەتایبەتی دڵنیابوونی پێغەمبەر لەسەرکەوتن گەیشتبووە ئاستێك فەرمووی: دەڵێی یەکە یەکە شوێنی لەخوێندا گەوزانی پاڵەوان و سەرانی قورەیش دەبینم؟

بۆ وەڵامی ئەوە دەگوترێ: دڵنیابوونی پێغەمبەرو بڕوابوونی بە یارمەتی خوداو سەرکەوتنی بەسەر دوژمنانیدا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە خودا وادەی پێدابوو، وادەی خوداش هەردەبێ بێتەجێ. تەنانەت وێ دەچێ خودا نیگای بۆ کردبێ، رووداوی داهاتووی جەنگەکەی پێ راگەیاندبێ.

رۆچوون و قوڵبوونەوە لە پاڕانەوەو لاڵانەوەو دوعاو دەست بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان ئەوە ئەرکێکی بەندایەتیکردن و عبودییەتە: کە ئادەمیزاد بۆئەوە دروستکراوەو لەهەموو حاڵێکدا ئەوە بەهای سەرکەوتنە.

سەرکەوتن «بەهەر هۆو وەسیلەیەك بێتەدی» لە خوداوەیەو بەتەوفیقی خودایە. پەروەردگار ئەوەی لەئێمەی دەوێ ئەوەیە ئێمە بە سروشت و بە ئیختیار بەندەی خوداین و بەندایەتی خۆمان بۆزاتی پاکی رابگەیەنین.

هیچ کەسێك ئەوەندەی بە صیفەتی «عبودیة» لەخودا نزیك دەبێتەوە بەهیچ رەوشتێکی تری ئەوەندە نزیك نابێتەوە. هیچ ئادەمیزادێك دەستپێکی پاڕانەوەی بۆگیرابوونی نزاو پاڕانەوەکانی

هێنــدەی دەســتپێکی صــیفەتی «عبودیــة» رەحــم و بــەزەیی خــودا ناجوڵێنێ.

هـەموو ئـەو بـەڵاو ناخۆشـی و چورتم و تەنگژەو کارەساتانەی دێنـە رێگـای ئـادەمیزادو هەڕەشـەی لەناچـوونی لێ دەکـەن و ژیـانی دەخەنـە خەتــەرەوە، هــەموویان هۆکــارو وەســیلەن بۆئــەوەی مــرۆڤ صــیفەتی بەندایەتی تێدا گەشەبکاو عبودییەت و ملکەچی خۆی بۆ پەروەردگاری زیـاتر قـوڵ بکاتـەوە. ئـارەزۆو ئـەفکاری بـەرەو ئاسـۆی گـەورەیی خـودا وەرچەرخێنێ و بەرەو پـەنای خـودای غاربداو هـەنگاوی خێرا هـەڵێنێ و لەبەردەم خـودای خۆیـدا دوو دەسـتی بەنـدەگی و زەلیلـی پـان بکاتـەوەو زەبـوونی و لاوازی خـۆی بـدرکێنێ و پـەنا بـەزاتی پـەروەردگاری بگـرێ لەهەموو فیتنەو ئاشوب و بەڵا و چورتمێك. جا هەرکاتێك مرۆڤ لەژیانیـدا ویژدانی بۆ ئەم حەقیقەتە بەئاگا هات و سلوك و رەوشتی خۆی پێ رەنـگ کـردن، ئــەوە بێگومــان گەیــشتۆتە ئــەو ئاســتەی خــودا فــەرمانی بــە بەندەکانی کردووە هەوڵ بدەن بیگەنێ و خۆیانی تێدا ببیننەوە.

ئـەم «عبودیـة» و بەندایەتیـەی لـە پاڕانـەوە بەسـۆزەکەی پێغەمبـەردا خۆی نواندو ئەو کڕوزانەوەو لالانـەوەی ئاڕاستەی خـودای خـۆی دەکـرد بۆئەوەی بەسەر دوژمندا سەری بخا، ئەو بـەهاو نرخـە بـوو کە بەهۆیـەوە ئـەو پـشتگیرییە خوداییـەی لـەو شـەڕە نـا بەرامبەریـەدا بەدەسـت هێنـا، بـەڵێ نـرخ و بـەهای پاڕانـەوە بـەکوڵ و درێژەکـەی سـەرکەوتنی گـەورەو سەرنج راکێش بـوو لـە غـەزای بـەدردا: کـە قورئـان بـەدەق گەیاندویـەتی و دەفەرموێ:

{إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ – الأنفال/٩}.

پێغەمبەری خودا لە روانگەی ئەم «عبودییەت»و بەندایەتیە بەسۆزەیەوە، دڵنیابوو لە سەرکەوتن، بتمانەی ئەوەی لەلا دروست بوو بوو کە سەرەنجام و سەروەری بۆ موسوڵمانان دەبێ.

ئەمجار تۆ موقارەنەو پێککگرتنێك بکە لەنێوان دیاردەو مەظهەری ئەو «عبودییەت»ەی لە هەڵوێستی پێغەمبەردا خۆی نواند لەگەڵ دیاردەی ئەو لوتبەرزیو جەبەروتەی لە هەڵوێستی ئەبو جەهل دا خۆی نواند، کاتێك پرماندی وتی: هەرگیز ئێمە ناگەڕێینەوە لەبەدر هەتا حوشتر سەرنەبڕین و چێشت و نان و سفرە نەڕازێنینەوەو شەراب و مەی نەخۆینەوەو ئاهەنگێك نەگێڕین و نەیکەینە شایی و لۆغان و بەزم و گۆرانی، هەموو عەرەب ئەمە ببیسێ و ترس و سامی ئێمە بچێتە دڵی هەموو کەسەوە. دەتۆ سەرنج بدەرە ئاکام و سەرەنجامی ئەم خۆبەزلزانی و جەبەڕوتە بۆشە لاژگە.

**٧- یارمەتیدانی موسوڵمانەکان بە فریشتە لە غەزای بەدر:**

روداوی غەزای بەدر موعجیزەی فرە گەورەی لەخۆگرت، یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی یارمەتیدانی موسوڵمانان، ئەوەبوو پەروەردگار لەو جەنگەدا بە فریشتە کۆمەکی بە موسوڵمانان کرد، راستەوخۆ فریشتە لەتەك موسوڵمانەکاندا دژی کافرەکان شەڕیان کرد. ئەوە حەقیقەتێکی چەسپاوو سەلمێندراوە بەدەقی قورئان و حەدیثی صەحیح ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەژێر ساباتەکەدا ماتبوونێکی بەسەردا هات و پاشان بەئاگا هاتەوەو فەرمووی: موژدە ئەی ئەبوبەکر یارمەتی خودا هات، ئەوە جوبرائیلە رێشمەی ئەسپەکەی گرتووە هەلنگی دەدا. ئیمامی بوخاریش بە دەقێکی نزیك لەو ریوایەتە ریوایەتی کردووە[١].

١ - ولفظه فى البخارى ان النبىَ -صلى الله عليه وسلم- قال هذا جبريل اخذ بزمام فرسه عليه أداة حرب – صحيح البخارى/١٤/٥/.

رونترین بەڵگە لەسەرئەوە کە تەعبیردانەوە لە ئایەتەکەدا بە وشەی «ملائکة» مەبەست هێزی مەعنەوی‌و مەدەدی روحی نیە وەکوو هەندێ کەس وایان گومان بردووە. دەڵێین: رونترین بەڵگە لەسەر بەتاڵ‌و پوچی گومانی ئەوانە دیاریکردنی چەندییەتی فریشتەکانە بە ژمارەیەکی دیاریکراو کە بریتییە لە هەزارو دەفەرموێ: {فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ – الأنفال/٩}.

چونکە ژمارە وەکوو دەڵێن: {من مستلزمات الكم المنفصل في الأشياء} ئەمەش لەشتی مادی‌و هەست پێکراودا بەکاردەهێندرێ.

لێرەوە دەزانین: کە تەقییدکردنی بەیانی ئیلاهی بە نیسبەت وشەی فریشتەوە بەژمارەیەکی دیاریکراو چەند حوکمێکی جوان‌و سەرنج راکێشی لەخۆگرتووە، دیاریترین‌و گەورەترینیان، رێگا برینە لەوانەی کە دەیانەوێ وشەی «ملائکة» لە ئایەتەکەدا بەویستی خۆیان‌و بیرو بۆچوونی خۆیان تەفسیر بکەن کە بریتییە لە پاڵپشتی کردنی مەعنەوی!!

ئەمجار نازڵبوونی فریشتە بۆ شەڕ لەتەك موسوڵمانەکاندا دژی کافرەکان، تەنها دڵنیاکردنی موسوڵمانەکان بوو، وەڵامدانەوەیەکی حیسسی بوو بۆ ئەو پاڕانەوەو لالانەوە بەکوڵ‌و سۆزدارەی پێغەمبەر ﷺ کە یەکەم روبەڕوو بوونەوەی مەیدانییان لەپێناو ئایینی خودادا دژی کوفر داخوازی بوو، روبەڕوو بوونەوەیەکی نابەرامبەر، وەستان دژی لەشکرێك سێ بەرامبەری ئەوان لەژمارەو لە کەرەستەی شەڕدا. ئەگینا سەرکەوتن یلرمەتیدان بەدەست خودایەو بەس. فریشتە هیچ کاریگەریەکی خۆی نییە لەو سەرکەوتنەدا. بۆیە بۆ رونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە پەروەردگار فەرمووی: {وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – الأنفال/١٠}.

## ٨- ژیانی بەرزەخی مردوان:

ئاشکرایە: کە راوەستانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر لێواری بیری قولەیب، بانگکردنی لە موشریکە کوژراوەکانو وتەکەی ئیمامی عومەر لەوساتە وەختەداو وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمامی عومەر، بەڵگەیەکی ئاشکراو روونە لەسەر ئەوە کە مردوو ژیانێکی تایبەتی بەخۆی هەیەو ئێمە حەقیقەتو چۆنیەتی نازانین. ئەوە دەگەیەنێ کە گیانی مردوان دوای مردن لەدەوری لاشەکە دەبێ. لێرەوە مانای عەزابی ناو گۆڕو نازو نیعمەتی تەصەوور دەکرێ، وەلێ هەموو ئەمانە خاضعی پێوەرو تەرازویەکن کە عەقڵو هەستی ئێمە دەرکیان ناکەن، ئەوە جیهانی مەلەکوتەو دوورە لە ئەزمونو دیدو بینینی عەقڵیو مادی ئێمە، ئێمە پێویستە لەسەرمان بڕوامان پێی هەبێو لەبوونی دڵنیابین، بەمەرجێك لەرێگای صەحیحو راستەوە پێمان گەیشتبێ.

٩- پاشان مەسەلەی دیلەکانی شەڕ وێڕای راوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دربارەیانو ئەمجار فیدیە وەرگرتن لێیانو پاشان نازڵبوونی ئایاتی قورئانو سەرزەنشتکردنی پێغەمبەرو هاوەڵان لەسەر رەچاوکردنی ئەو حوکمە، دەڵێین ئەم مەسەلەیە چەند دەلالەتێکی تێدایە هەریەکەیان گرنگی خۆی هەیە.

## یەکەم: دیلو ئیجتیهاد کردنی پێغەمبەر دەربارەیان:

ئەم روداوە ئاماژە دەکا بۆئەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆی هەبووە ئیجتیهاد بکا، ئەمە رای جەماوەری زانایانەو بەڵگەشیان مەسەلەی دیلەکانی بەدرە. جا ئەگەر صەحیح بێ پێغەمبەر ئیجتیهاد بکا، دەگونجێ لە ئیجتیهادەکەیدا هەڵەش بکاو بیشی پێکێ. وەلێ نابێ هەڵەکردنەکەی پایەدار بێ، بەڵکوو دەبێ قورئان نازل بێو هەڵەکەی

ڕاست بکاتەوە. ئەگەر دوای ئیجتیهاد کردنەکەی ئایەت نازڵ نەبوو ئەوە مانای ئەوەیە ئیجتیهادەکەی پێکاویەتی و بەگوێرەی ئەو حەق و ڕاستییەی لەزانیاری خوادا چەسپاوە ئیجتیهادەکەی هاتۆتە دی.

ئەبو ئیسحاقی شیرازی لەکتێبی شەرحی «اللمع»دا دەڵێ: دەشێ پێغەمبەر لەهەندێ هەڵس و کەوت و بڕیاردا هەڵەبکا بەڵام ناگونجێ خودا بێڵێ لەسەر ئەو هەڵەیە بەردەوام بێ. بەڵکوو دەبێ خێرا ئاگادار بکرێتەوە. هەروا دەڵێ: هەندێ لە عولەمایانی مەزهەبی شافیعی فەرموویانە دەشێ پێغەمبەر هەڵەبکا، ئەوە قورئان دەفەرموێ: {عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ – التوبة:٤٣}. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە پێغەمبەر ﷺ هەڵەی کردبێ«١».

ئیمامی ئەسنەوی لە شەرحی مینهاج داو ئامودی و ئیبنو حاجیبیش ئەوەیان پەسەند کردووە و فەرموویانە دروستە پێغەمبەر ﷺ هەڵەبکا بەمەرجێك لەسەری بەردەوام نەبێ. ئیمامی ئامودی ئەم ڕایەی لەزوربەی زانایانی شافیعی مەزهەب و زانایانی حەنبەلی و عولەمای حەدیث نەقڵ کردووە«٢».

ئیمامی بەیضاوی لە ڕاڤەکردنی ئایەتی: {مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – الأنفال/٦٧}: دەفەرموێ: ئایەتەکە واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوە کە پێغەمبەران ئیجتیهاد دەکەن دەشێ لە ئیجتیهاد کردنەکەیاندا هەڵەبکەن بەڵام نابێ بهێڵدرێ لەسەر هەڵەکەیان بەردەوام بن.

---

١ - بڕوانە: .شرح المع لابى اسحق الشيرازى، ص٢٤..

٢ - الأسنوى على شرح المنهاج ٥٣٧/٤.

بێگومان هەندێ کەس بەلایانەوە کارێکی ئەستەمە نیسبەتی هەڵە بۆلای پێغەمبەر بدرێ. واگومان دەبەن هەڵەکردن تاوانە، یان لادانە لە رێگای راستو شتی وا. کە لەگەڵ چەمکی «پێغەمبەران مەعصومن»و صیفەتی عیصمەت بۆ پێغەمبەران ثابیتە یەك ناگرنەوە. بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە مەبەست بە «خطأ = هەڵە» نەپێکانی ئیجتیهادەکەیەتی بۆ ئەو شتە حەقو ثابیتەی لە زانیاری خودادا هەیە، ئەمەش چ دژایەتیەکی لەگەڵ عیصمەتی پێغەمبەردا نییە، بەڵکوو لەسەر ئیجتیهادکردنەکەی پاداشی هەیە. ئادەمیزادیش موکەلەفن بەوەی شوێنی بکەون لەوەدا، بەمەرجێك ئایەتێك نازڵ نەبێتە سەری لەو حوکمە لای بدا بۆ حوکمێکی تر. دەق وەکوو حاکمێك وایە کە ئیجتیهاد دەکا. کەوابوو ئیجتهادی پێغەمبەر ﷺ لەوشتانەدا کە نیگای بۆ نەهاتبێ دوو لایەنەو دوو سەرەیە، لایەنێکی ئیجتیهادەکەی بەنیسبەت لایەنی یەکەمەوە هەرگیز وەصفدار ناکرێ بە «خطأ = هەڵە» چونکە ئادەمیزاد موکەلەفن بەوەی شوێنی بکەونو پەیرەوی بکەن وەکوو شوێنکەوتنیان بۆ باقی «مجتهد»ەکانی تر. چونکە ئەوان هیچ رێگایەکیان نیە بەهۆیەوە بزانن ئاخۆ لە عیلمی خودادا پێکاویەتی یان نا. وەلێ ئیجتهادەکەی بەنیسبەت لایەنی دووەمەوە. واتە بەنیسبەت پەیوەست بوونی بەزانیاری خوداوە، ئەوە خاضعە بۆ هەردوو صیفەتی صیحەتو «خطأ». چونکە لەم رووەوە ئیجتهاد دەگونجێ ئەو واقیعە نەپێکێو لێی لابدا. کەمالی رەها تەنیا بۆ خودایەو بەس.

بێگومان حەزرەتی رەسولی ئەکرەم پلە بە پلە قۆناغی کەمالاتی بڕیو ئەو مەراحیلانەی جێ هێشتن کە بەنیسبەت ئەو قۆناغانەی پێیان گەیشت بە نەقصو تەقصیر حسێب دەکرانو هەردەم «أستغفر الله»ی دەکرد لەو کەمو کوڕیانەی دەهاتنە پێشیو لێیان تێدەپەڕی.

ئەستەغفیروڵڵای دەکرد وەکوو چۆن ئێمە ئەستەغفیروڵا لەتاوان دەکەین. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی دەفەرموێ:

{إنــه ليغــان علــى صــدري فاســتغفر الله في اليــوم والليلــة ســبعين مــرة}. کەمتەرخەمی تەقصیر سواری دڵم دەبێ و لە شەوو رۆژێك دا حەفتا جار داوای لێخۆشبوون دەکەم.

**ب- دووەم:** هەروەکوو چۆن غەزای بەدر یەکەم ئەزمونی موسوڵمانان بوو لەبواری فیداکاریو شەڕکردن لە ڕێگای خودادا وێڕای زەعیفیو لاوازییــان لــەبارەی ژمــارەو کەرەســەی شــەڕەوە، یەکــەم ئــەزمونو تاقیکردنەوەشیان بوو لە بینینی دەستکەوتی جەنگو ماڵو سامانی زۆرو دەست بەسەردا گیراو، کاتێك دوای شەڕەکە ئەو هەموو غەنیمەتو دەستکەوتانەیان لەبەر دەستی خۆیان بینیو خودی خۆشیان لەبارو دۆخێکی وادابوون خێریان پێ دەشیاو لە ئەوپەڕی پلەی هەژاریو ئاتاجیدا بوون. بێگومان حیکمەتی خودایی چارەسەری ئەم کێشەیەی کردو دڵی موسوڵمانەکانی دامەزراوکردو بەهۆی موعجیزەی سەرکەوتن فەرامۆشیان هات.

پاشان حیکمەتی خودایی چارەسەری ئەزمونی بینینی غەنیمەتو دەســتکەوتی زۆرو زەبەنــدەی بــەهۆکاری تەربــەوی دەقیــق لــەکاتی گونجاوی خۆیدا ئەنجامدا. لەراستیدا کاریگەری ئەم ئەزموونە لەدوو مەشهەدی دوا تەواوبوونی جەنگەکەدا خۆی نواند:

**مەشــهەدی یەکــەم:** کاتێك موشریکەکان تێشکانو ئەو هەموو غەنیمەتو ماڵو سامانەیان جێ هێشت، هەندێ لە موسوڵمانەکان پــەلاماری کۆکردنــەوەو گرتنــی غەنیمــەتیان داو، هەنــدێکیان لەگــەڵ هەندێکیان کەوتنە کێشەو مقۆ مقۆوە لەوەدا ئاخۆ کێیان شیاوی ئەو دەستکەوتەیەو نزیکبوو کێشەکەیان بەرەو توندو تیژی بڕواو هێشتا

حوكمی چۆنیەتی دابەشكردنی غەنیمەتو دەسكەوتی جەنگ نازڵ نەبوو، نەیاندەزانی ئەو دەسكەوتانە چۆن بەسەر جەنگاوەرەكاندا دابەش دەكرێ. ئەوەبوو پرسیاریان لە پێغەمبەر دەكردو كێشەكەیان لای ئەو كۆتایی دەهات.

لەوسەرو بەندەدا ئایەتی: {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ – الأنفال/ ١-٢}.

ئەتۆ دەبینی هەردو ئایەتەكە وەڵامی پرسیارەكەیان لەخۆ ناگرێ بەڵكوو ئەوەدەگەیەنێ: كە غەنیمەتو دەسكەوتی جەنگ بۆ هیچ لایەكیان نیە بەڵكوو بۆ خوداو پێغەمبەرە، ئەوەی لەسەر ئەوان پێویستەو ئەركی سەرشانیانە ئەوەیە نیزاعی خۆیان نەهێڵنو فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەری خودابن، خۆیان لە نەهیەكانی بپارێزن، ئەوە ئەركی سەرشانی ئەوانە. غەنیمەتو دەسكەوتی جەنگ با چاوەڕوان بن خوداو پێغەمبەر چۆنی دابەش دەكەنو بۆ كێی دیاریی دەكەن. جا: كە موسوڵمانەكان بەخۆدا هاتنەوەو پابەندی فەرمانو نەهیەكانی ئایەتەكان بوون، وازیان لە موشاجەرەو مقۆ مقۆ هێنا، ئەمجار ئایاتی تر نازڵ بوون چۆنیەتی دابەشكردنی غەنیمەتو دەسكەوتی جەنگیان بۆ دیاریی دەكا. بۆیان روون دەكاتەوە چۆن بەسەر جەنگاوەرەكاندا دابەش بكرێ. ئەمەش جوانترینو نایاب ترین هۆكاری پەروەردەیە كە لەم بوارەداو لەوساتە وەختەدا پەیڕەوكرا.

**مەشهەدی دووەم**: ئەوەیە كاتێك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دیلەكان راوێژی لەگەڵ هاوەڵانی كرد. ئەوان پێیان خۆش بوو فیدیەیان لێ وەربگیرێو ماڵو سامانیان لێ وەربگرنو مەرەخەسیان بكەن، لەمەشدا

رەحم و نەرمی نواندن لەگەڵ دیلەکاندا بەرچاو گیرابوو بەمەبەستی ئەوەی خودا هیدایەتیان بداو ئیمان بهێننو لەهەمان کاتدا ماڵ و سامانیشیان دەست بکەوێ وەکوو تەعویض و بارتەقای ئەو ماڵ و مڵکەی لە مەککەدا جێیان هێشتبوو، بەڵکوو بتوانن هێندی پێداویستی خۆیانی پێ دابین بکەن... ئەم راو بۆچوونە لە دڵی موسوڵمانەکاندا جێی خۆی کردبووەوە و پێغەمبەریش ئەمەی بەلاوە پەسەندبوو ئەوەش خۆشەویستی و دڵسۆزی پێغەمبەری دەگەیاند بەرامبەر هاوەڵانی. هەر ئەم رەحم و شەفەقەتە بوو کە پێغەمبەری والێکرد لەکاتی دەرچوونی موسوڵمانە کۆچکەرەکان بۆ غەزای بەدر کەبینی دیاردەی هەژاری و نەبوونییان پێوە دیارە، دەستی بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان و لەخودا پاڕایەوە و دەیفەرموو: {اللّٰهُمَّ إِنَّهُمْ حُفَاةٌ فَاحْمِلْهُمْ، اللّٰهُمَّ إِنَّهُمْ عُرَاةٌ فَاكْسُهُمْ، وَإِنَّهُمْ جِيَاعٌ فَأَشْبِعْهُمْ}.

واتە: خودایە! ئەم موهاجیرانە پیادەو پێخواسن ولاخی سوارییان بۆ بڕەخسێنە، خودایە روت و رەجاڵن پۆشتەیان بکە، ئەوان برسین تێریان بکە«١».

وەلێ حیکمەتی یەزدانی نەیویست موسوڵمانەکان وا پەروەردە بکرێن کە تێڕوانینیان بۆ ماڵ و سامان ببێتە تەرازوو پیوەر یان بەشێك بێ لە تەرازوو پێوەر بۆ بڕیاردان لە قەضایای گەورەیاندا کە لە بناغەدا ئەو قەضایانە لەسەر بنەمای تێڕوانینی ئایینی بنیات نراون، چەندێك ئاتاج و هەژاربن، حاڵ و وەزعی مادییان هەرچۆنێك بێ نابێ ماڵ و سامان بکرێتە تەرازوی یەکالا کەرەوە بۆیان. چونکە ئەگەر وازیان لێ بهێندرایە بەو بیرو بۆچوونە هەڵس و کەوت بکەن بەو دیدە بڕوانن و یەکەمجاریشیانە لەبەردەم ئەزموونێکی لەو جۆرەدا خۆیان بینیوە،

---

١ - أبو داود عن جمع الفوائد ج٢/٩٠.

لەوانەبوو ئەوە ببێ بە قاعیدەو پێوەری هەمیشەییان و «نظرة»ی مادی بەسەریاندا زاڵ ببێ و لە تەعامول و هەڵس و کەوتیان لەگەڵ نموونەی ئەحکامی لەوجۆرەدا لایەنە مادییەکە کاریگەری خۆی هەبێ لەسەریان، لەکاتێکدا پێویستە ئەو جۆرە حوکمانە دوورە پەرێزبن لە هەموو مەبەست و غەرەزێکی دونیایی و لەبەرزاییدا بمێننەوەو هیچ کاریگەریەکی مادی دەستی پێیان نەگا.

ئاشکراشە زۆر زەحمەتە کەسێك چەند شەوطێك دوا دونیا کەوتبێ لەزەت و خۆشی لێ بینیبێ بەئاسانی واز لەو خۆشییە بێنێ و وەرچەرخێتەوەو نەفسی خۆی لەو دونیا مادییە خو پێوەگیراوە بگرێتەوە.

ئیمامی موسلیم لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەتی کردووە کە دەفەرموێ: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بڕیاری ئەوەیدا کە فیدیە لە دیلەکان وەربگرێ و مەرەخەسیان بکا، چوومە لای پێغەمبەر دیتم تەشریفی لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر دانیشتووە دەگرین. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بڵێ بۆچی تۆو هاوەڵەکەت دەگرین؟ بۆئەوەی ئەگەر گریانم بێ بگریم، ئەگەر گریانم نەهات خۆم بگریەنم بۆ گریانی ئێوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەداخی ئەوە دەگریم هاوەڵانت کە راوێژم پێکردن ئاماژەی ئەوەیان بۆ کردم فیدیە وەربگرم. عەزابەکەیانم بەسەردا رانوێندرا لەو درەختە لێیان نزیکتر بوو «مەبەستی درەختێك بوو لێیەوە نزیك بوو» ئیتر پەروەردگار ئایەتی: {مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ، فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا – الأنفال} نازڵ بوو»[١].

---

١ - مسلم ١٥٨/٥.

## بەنو قەینوقاع

## یەکەم خیانەتی جولەکە بەرامبەر موسوڵمانان

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بەنو قەینوقاعی کۆکردنەوەو پێی فەرموون: ئەی کۆمەڵی جولەکە لەخودا بترسن: کە ئەوەی بەسەر قورەیش هات لەبەڵا و کوشتارو ماڵ و سامان بەفیڕۆ چوون، بەسەر ئێوەش بێ. وەرن ئیمانم پێ بهێنن و موسوڵمان بن، ئێوە باش باش دەزانن من پێغەمبەرم، راستی ئەوەتان لە کتێبی تەوراتی خۆتاندا دەست دەکەوێ، خودا وادەو بەڵێنی لێ وەرگرتون بەوە ئیمان بە پێغەمبەری ئاخرزەمان بێنن. جولەکەکان هاتنە وەڵام و وتیان: ئەی موحەممەد! تۆ پێت وایە ئێمەیش وەکوو قەومەکەت واین؟! تۆ بەوە لەخۆت بایی مەبە کەوا روبەڕوی قەومێك بۆیەوە شارەزای شەڕنین و فرسەتت لێ هێناون. ئێمە وەکوو قورەیشییەکان کەودەن نین ئەگەر شەڕمان لەگەل بکەی ئەوکاتە دەزانی ئێمە چۆنین و چ کەسێکین.

ئیبنو هیشام لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی «المسور»ی کوڕی مەخرەمە لە ئەبو عەوانەوە ریوایەت دەکا. دەڵێ: «ئافرەتێکی عەرەب هەندێ کاڵای هێنابوون بۆ بازاڕ بە مەبەستی فرۆشتن کاڵاکەی لەبازاڕی بەنو قەینوقاعدا فرۆشت چووە لای زەرەنگەرێك دانیشت بە مەبەستی کرینی پارچە زێرێك، جولەکەکان لێی کۆبوونەوە، دەیانەویست روبەندی خۆی لابدا، ژنەکە رازی نەبوو روبەندی خۆی لابدا، کابرای زەڕنگەر هەڵسا بە شێوەیەك ئافرەتەکە هەستی پێ نەکا. لکی کراسەکەی بە پشتیەوە گرێدا. کە ئافرەتەکە هەڵسایە حەوا شەرمگای دەرکەوت و جولەکەکان کەوتنە قاقای پێکەنین پێی.

ئافرەتەکە هاواری کرد، پیاوێکی موسوڵمان پەلاماری کابرای زەڕنگەرەکەی داو کوشتی، جولەکەکان پەلاماری کابرای موسوڵمانیان داو شەهیدیان کرد. خزمی کوژراوە موسوڵمانەکە هاواری موسوڵمانانیان کردو موسوڵمانان رقیان هاتە جۆش‌و شەڕ لەنێوان موسوڵمانەکان‌و بەنو قەینوقاع دا بەرپابوو، ئەو خێڵە جولەکە یەکەم تاقمی جولەکەن عەهدو پەیمانیان نەبردە سەرو پەیمان‌و بەڵێنیان لەنێوان خۆیان‌و پێغەمبەردا پووچ کردەوە«١».

ئەم روداوە وەکوو طەبەری‌و واقیدی فەرموویانە لە ناوەڕاستی مانگی شەشەڵانی ساڵی دووەمی کۆچی بووە«٢».

پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك گەمارۆی دان هەتا خۆیان بە دەستەوەداو لەسەر حوکمی ئەو لە قەڵاو دژەکانیان هاتنە خوارو هەموویان باڵبەست کران، ئەمجار عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول «گەورە دوو رووی مەدینە» هاتە لای پێغەمبەرو پاڕایەوەو داوای لێکرد وتی: ئەی موحەممەد ئەمانە هاوپەیمانی منن‌و چاکبە لەگەڵیاندا. پێغەمبەر ﷺ هیچ روی نەدایەو لەگەڵیدا گەرم‌و گوڕ نەبوو، داواکارییەکەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر روی لێ وەرگێڕا. ئەمجار عەبدوڵڵا دەستی بە ئەڵقەی قەڵغانەکەی پێغەمبەرەوە گرت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەرم بدە، تووڕە بوو دەم‌و چاوی سوور هەڵگەڕان پێی وت: پێت دەڵێم: بەرم بدەو وازبێنە، عەرزی کرد نەبەخوا یەخەت بەرنادەم‌و وازت لێ ناهێنم هەتا لەگەڵ هاوپەیمانەکانمدا چاك نەبی، ئەوانە دۆستی من بوون هەمیشە چوارسەد کەسیان سەرپەتی‌و سێ سەدیان کڵاو خوزە پۆش بەرگرییان لێ کردوم، ئێستا تۆ خەریکی بەبەرە بەیانییەك بیاندورییەوەو لەناویان

---

١ - سيرة ابن هشام ٤٧/٢.

٢ - الطبرى ٤٨٠/٢ وطبقات ابن سعد ج٦٧/٢.

بەریت؟ بەخودا من کابرایەکم دەترسم دونیا بسوڕێ‌و پێویستیم بەمانە ببێ بۆ یارمەتیدانم‌و پشتم بگرن. پێغەمبەر پێی فەرموو: دەی باشە ئەوا هەموویانم بەتۆ بەخشین نایانکوژم، بەڵام دەبێ لە مەدینە دەربچن‌و لە نزیکمەوە نیشتەجێ نەبن. ئیتر هەموویان رەویان کرد بۆ وڵاتی «أذرعات»ی شام‌و لەوێ زوربەیان لەناوچوون.

عوبادەی کوڕی «الصّامت»یش پەیمان‌و بەڵێنی لەگەڵ ئەو جولەکانەدا هەبوو وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول. کە ئەم روداوە رویدا عوبادە چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد من پەیمان لەگەڵ خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان دەبەستم‌و لە هاوپەیمانی ئەم جولەکانە بەریم‌و پابەندی هیچ پەیمان‌و سوێند خۆرییەکیان نابم. ئیتر دەربارەی عەبدوڵڵای دوو روو عوبادەی موسوڵمانی دڵسۆز بۆ ئیسلام ئەم دوو ئایەتە نازڵ بوون کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ، وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ، إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ. فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ ، يَقُولُونَ نَخْشَى أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ. فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُواْ عَلَى مَا أَسَرُّواْ فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ – المائدة/ ٥١-٥٢}.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەم روداوە تێکڕا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سروشتی جولەکە تێکەڵە لە غەدرو خیانەت. هەرگیز ناتوانن لەگەڵ هاوسێکانیاندا بەدڵسافی ژیان بەسەر بەرن، لەگەڵ هەر گەل‌و هۆزێک تێکەڵاوبن هەوڵی ئاژاوە نانەوەو فیتنە جۆیی دەدەن‌و خەریکی تێکدانی ریزەکانیانن. هەمیشە ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە فیتنە بەرپا بکەن‌و شەڕ بنێنەوە، هەموو

کارێـك دەگرنەبــەر بــۆ زیانگەیانــدن بــە هاونیــشتمانی و دراوســێ و کۆمەڵگەیان. ئێمە کە سەرنج دەدەینە ئەم روداوەو دیراسەی دەکەین چەند وانەو مەبادیئو بنەمایەکمان دێتە بەرچاو لەم خاڵانەدا بەکورتی رایان دەنوێنین.

یەکەم: «باڵا پۆشی ئافرەت» ئێمە دیتمان سەرچاوەی روداوەکە داواکردن و ئیلحاحی جولەکەکان بوو لە ئافرەتە عەرەبە موسوڵمانەکە کە چارشێوی خۆی لاداو روخساری خۆی دەرخا. ئەوەش کاتێك کە ئافرەتەکە چووە بازاڕێکی جولەکە بۆ کارێکی پێویستی خۆی. ئەمەش هیچ دژایەتیەکی نییە لەگەڵ ئەو هۆکارەی کە ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووەو زوربەی سیرە نووسان ئاماژەیان پێ کردووە، کە بریتییە لە رق و کینەی جولەکە بەرامبەر موسوڵمانەکان دوای سەرکەوتنی بەدرو هەڕەشە کردنیان لە پێغەمبەر ﷺ کە گوتیان: «انا واللہ لئن حاربتنا لتعلمنّ أنا نحن الناس». وەڵڵاهی ئەگەر شەڕمان لەگەڵ بکەی ئەوکاتە دەزانی ئێمە بەڕاستی پیاوی جەنگین.

واپێدەچێ هەردوو هۆکارەکە پێکەوە هاتوونەدی و هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی دییە. چونکە زۆر دوورە پێغەمبەر ﷺ هەروا لەخۆیەوە پەیمانەکەیان هەڵوەشێنێتەوە بە بیانوی دەرکەوتنی دیاردەی رق لێبونیان لە موسوڵمانان و دەرکەوتنی ئەو رق و کینە لە قسەو گفت و گۆیان. بەڵکوو دەبێ هەڵس و کەوتێکیشیان کردبێ کە دەستدرێژی کردن بێ بۆسەر مافی موسوڵمانان، بەوجۆرەی کە ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە.

روداوەکە ئەوە دەگەیەنێ کە باڵا پۆشی ئافرەت روخساریشی دەگرێتەوە، ئەگینا پێویست نەدەبوو ئەم ئافرەتە موسوڵمانە بە رێگەدا بڕواو دەم و چاوی خۆی داپۆشێ. خۆ ئەگەر روخسار داپۆشینەکەی

جێبەجێ کردنی حوکمێکی ئایینی نەبوایە، جولەکەکان واسوور نەدەبوون لەسەر ئەو کارە ناشرینەی کردیان، چونکە ئەوان مەبەستیان ئازاردانی هەستی ئایینی ئافرەتەکە بوو: کە ئەو هەستە ئایینیە لەشێوەی پۆشاكو هەڵسو کەوتیدا دەردەکەون.

لەوانەیە بگوترێ: ئەم سەرگوزشتەی کە تەنیا ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە ئەوەندە بەهێزنیە حوکمێکی لەو جۆرەی پێ بچەسپێ. بەڵام فەرموودەی زۆر هەنو چەسپاونو تانەیان ئاراستە ناکرێ دەبنە شایەت بۆ چەسپاندنی حوکمەکە.

یەکێك لەو فەرموودانە ئەوەیە کە بوخاری لەخاتو عائیشەوە ریوایەتی کردووە لە «باب ما یلبس الْمُحْرِمُ من الثیاب». عائیشە دەفەرموێ: ئافرەت لە ئیحرامدا دەمو چاوی خۆی داناپۆشێ رۆپۆش «برقع» ناپۆشێ پۆشاکی رەنگ کراو بە وەرسو زەعفەران لەبەرناکا.

هەروا ئەوەی ئیمامی مالیك لەکتێبی «الموطأ»دا لە نافیعەوە ریوایەتی کردووە: کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر فەرموویەتی: ئافرەت لە ئیحرامدا نیقاب ناپۆشێو دەستکێش لەدەست ناکا[١].

دەی نەییکردن لەوەی ئافرەت نیقاب بپۆشێ لەکاتی ئیحرامدا چ دەگەیەنێ؟ بۆچی ئەم نەییکردنە بەتایبەتی رودەکاتە ئافرەتو پیاو ناگرێتەوە. بێگومان نەهیەکە فەرعێکە لەوەی ئافرەت لەوکاتەدا لە غەیری ئیحرامدا پێوەی پابەندبوو لە روخسار داپۆشینو دەستکێش لەدەست کردن، بۆیە لەکاتی ئیحرام بەستندا ئەو حوکمەی لەسەر لابراوە.

---

١ - البخاری ٣/١٤٦، والموطأ ١/٢٢٨.

هەروا ئەو حەدیثەی ئیمامی موسلیم لە فاطیمەی کچی قەیسەوە ریوایەتی کردووە کە تێیدا هاتووە دەڵێ مێردەکەی فاطیمەی تەڵاق داو تەڵاقەکەشی کەوت. پێغەمبەر ﷺ ئەمری پێکرد کە لەماڵی ئوممو شورەیکدا عیدەی خۆی بگرێ، پاشان وەڵامی بۆنارد فەرمووی: ماڵی ئوممو شورەیك هاوەڵان هاموشۆی دەکەنو بۆ تۆ نامەحرەمن، بچۆ لەماڵی ئامۆزاکەت «عەبدوڵڵای ئوممو مەکتوم»دا، عیدە بگرە ئەو کوێرە، ئەگەر روپۆشیشت دابنێی ئەم ناتبینێ.

ئەمە لەروی ئەو بەڵگانەی کە ئەوە دەگەیەنن داپۆشینی ئافرەت بۆ روخساریو باقی جەستەی لەئاست پیاوی نامەحرەمدا واجب بێ.

وەڵێ لەروی ئەو بەڵگانەی: کە ئەوە دەگەیەنن حەرام بێ پیاو بڕوانێتە دەمو چاوو دوو دەستی ئافرەتی بێگانە ئەوە زۆر فەرمودە لەو بارەوە ریوایەت کراون، لەوانە ئەو حەدیثەی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیذی لە «بريرة» ریوایەتیان کردووە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەعەلی فەرموو: ئەی عەلی! ئەگەر چاوت لە ئافرەتێك هەڵەنگوت تێڕوانینەکەت دووبارە مەکەرەوە، سەیرکردنی یەکەمت بۆ هەیە دووەمت بۆ نیە. هەروا ئەو حەدیثەی بوخاری ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژی جەژنی قوربان «يوم النحر» «الفضل»ی کوڕی عەبباسی لەپاش خۆی سوارکردبوو، لەو حەدیثەدا باسی ئەو ئافرەتە جوانەی خوثعەمی تێدایە کە «الفضل» چاوی تێ بڕی بوو سەیری دەکرد. پێغەمبەر ﷺ چەناگەی فەضلی گرتو لەسەیرکردن وەری چەرخاند.

تۆ دەبینی لەم فەرموودانەدا دوو نەهییان تێدایە:

١- نەهییکردن لە ئافرەت کە روخساری خۆی یان بەشێکی تری جەستەی بۆ پیاوی نامەحرەم دەربخا.

٢- نەییکردن لەپیاو کە بۆ روخساری ئافرەتی نامەحرەمو شوێنی تری بڕوانێ. ئەمەش بەڵگەی تەواوە لەسەر ئەوەی روخساری ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە عەورەتەو نابێ دەری بخا مەگەر لەچەند حاڵەتێکی چەرتکراو موستەثنادا نەبێ، وەکوو زەرورەتی پزیشکیو فێرکردنو شایەتیدانو ئەو جۆرە شتانە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ کە لە ئیمامە سەر مەذهەبەکاندا هەیانە بەلایەوە دوو دەستو دەمو چاوی ئافرەت بە عەورەت حسێب ناکرێنو پێویست نیە داپۆشرێن. ئەو فەرمودانەی ئێمە ئاماژەمان پێ کردن دەیانکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی داپۆشینی روخساری ئافرەت لەگەڵ دوو دەستی سوننەت بن نەك واجب. بەڵام هەموو عولەما لەسەر ئەوە کۆکن کە دروست نیە تەماشا کردنی هیچ شوێنێکی ئافرەت ئەگەر تەماشا کردنەکە بەشەهوەتەوە بوو. هەروا فەرموویانە: هەرکاتێك فیسق فجوور زۆر بوو، واجبە لەسەر ئافرەت کە نیقاب بپۆشێو رۆخساری خۆی بشارێتەوە لەهەموو ئەوانەی بە شەهوەتەوە سەیری دەکەنو کەسانێکی فاسقو بێ دینن.

جا کەتۆ ئەمڕۆ لە حاڵو وەزعی موسوڵمانان وردبیتەوە، ئاگاداری ئەو هەموو فیسق فجوورە بێ کە تەشەنەی کردووە، سەیری ئەو بەد رەوشتیو ئەخلاق روخاوییەی خەڵك بکەی، بۆت دەردەکەوێ کەهیچ مەجاڵێك نییە بۆئەوەی فتوا بدرێ. کە دەرخستنی روخساری ئافرەت رەوایەو دروستە دەمو چاوی خۆی بۆ پیاوی بێگانە دەربخا! بێگومان ئەم سەرەو لێژییەی موسوڵمانان پێیدا دەڕۆنو ئەم ئەخلاق روخانەی کۆمەڵگەی ئیسلامی تێی کەوتووە داخوازی ئەوەیە زیاتر حەزەر بکەینو پتر هۆکاری خۆپاراستنو پارێزگاری رەچاو بکەین، تا ئەوکاتەی موسوڵمانان ئەم قۆناغە خەتەرە دەبڕنو دەکەونە حاڵەتێکەوە بتوانن

خۆیان سەروکاری خۆیان بکەن و ئەزمەو تەنگژەی خۆیان بەدەستی خۆیان چارەسەر بکەن.

بە عیبارەتێکی کورتتر دەڵێین: روخصەتدان و ئاسانکاری لە بواری ئاییندا لەوانەیە ببنە جێگای هەڵخلیسکان و سەرەنگری بوونی ئاسان خوازەکان و خاوبوونەوەی گشتی لە پەیرەوی کردنی ئەصڵی واجباتەکان، بەتایبەتی ئەگەر تەییارێکی ئایینی سەلیم لەگۆڕێ نەبوو ئەو روخصەت و ئاسانکارییانە زەبت بکا لە چوارچێوەی مەنهەجی ئیسلامی گشتیداو نەهێڵێ لە سنووری شەرع بچیتە دەر.

سەیر ئەوەیە کەسانێك هەن خۆ هەڵدەواسن بەو قاعیدە فیقهییەی کە دەڵێ: بەگوێرەی گۆڕانی رۆژگار ئەحکامی شەرعیش دەگۆڕێن «تبدل الأحكام بتبدل الأزمان» ئەم قاعیدەیەش پەیڕەودەکەن لە بواری تەخفیف کردنی ئەرك و ئاسانکاری و هەنگاونان لەگەڵ داخوازی خاوکردنەوەو خۆقوتارکردن لە واجبات. وەلێ هەرگیز ئەم قاعیدەیان بیر نایەتەوە کە داخوازی پێچەوانەی ئەو حاڵەبێ!! لە راستیدا من ئەمڕۆ نموونەیەك نابینم: کە پێویست بێ یاسای «تبدل الأحكام بتبدل الأزمان»ی تێدا پەیڕەو بکرێ هێندەی فتوادان بەوەی کە ئەمڕۆ پێویستە ئافرەت روخساری خۆی داپۆشێ، لەبەرئەوەی ئەم رۆژگارەی ئەمڕۆی ئێمە داخوازیەتی و بە پێویستی دەزانێ، وێڕای زۆربوونی خلیسکان و هەڵدێری زۆرو زەبەندەی وەها داخوازی ئەوەیە زیاتر حەزەر بکەین و زۆر بە دیقەت سەیری شوێن پێی خۆمان بکەین، تا ئەوکاتەی پەروەردگار زەمینە دەسازێنێ بۆئەوەی موسوڵمانان کۆمەڵگەی مەنشودی خۆیان پێك بێنن.

**دووەم:** ئەم رووداوەی لە جولەکەی بەنو قەینوقاع رویدا دەلالەت دەکا لەسەر رق و قینێکی شاردراوە لەناو دڵی جولەکەکاندا بەرامبەر

موسوڵمانەکان. دەی بۆچی دەرکەوتنی دیاردەی ئەم حیقدە شاردراوە دواکەوتو بۆ ماوەی سێ ساڵ جولەکە توانییان ئەم رق‌و قینە بەشاردراوەیی بهێڵنەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: دەگوترێ: ئەوەی هەستی جولەکەکانی ورووژاندو وای لێ کردن حیقدو قینی خۆیان بەرامبەر موسوڵمانەکان دەربڕن، ئەو سەرکەوتنە گەورەبوو کە موسوڵمانەکان لە غەزای بەدردا بەدەستیان هێنا. لەراستیدا ئەوە کارێك بوو بەهیچ شێوەیەك جولەکەکان چاوەڕوانی نەبوون‌و تەوەقوعیان نەدەکرد، کە شەڕی بەدر بەو حاڵە بەکۆتا گەیشت، ئیتر حیقدو قینیان سەر ریژی کردو نەیانتوانی چیدی ئەم رقە بخۆنەوەو پێیەوە بتلێنەوە، بۆیە ویستیان بەو کارەی کردیان لەگەڵ ئافرەتە موسوڵمانەکە کەمێك بای سکی خۆیان دەرکەن. بەڵکوو حیقدو رقیان بەرامبەر موسوڵمانەکان بە ئاشکراو بێ پەردە لەقسەو تەعلیقیاندا دەردەکەوت.

ئیبنو جەریری طەبەری ریوایەتی کردووە، دەڵێ: مالیکی کوڕی «الصَّیف»: کە یەکێك بوو لە جولەکەی مەدینە بە هەندێ لە موسوڵمانەکانی گوت: کە لەغەزای بەدر گەڕابوونەوە:

«وادیارە لەخۆتان بایی بوون بەوە تووشی کۆمەڵێك قوڕەیش بوون‌و بەسەریاندا زاڵ بوون! ئەگەر ئێمە بمانەوێ شەڕتان لەگەڵ بکەین‌و دژتان بجەنگین، ئەوکاتە دەزانن: کە ئێوە دەستی شەڕکردنتان نیە لەگەڵ ئێمەدا».

خۆ ئەگەر جولەکە رێزی پەیمان‌و بەڵێنی نێوان خۆیان‌و موسوڵمانەکانیان بگرتایەو پابەندی ئەو بەڵێنانەی خۆیان بونایە، هەرگیز لەلایەن موسوڵمانەکانەوە خراپەیەکیان نەدەدی‌و کەسیان بەتاقە

وشەیەکیش دڵی ئازار نەدەدان و لەشوێن و جێگای خۆیاندا ئیزعاجیان نەدەکردن.

بەڵام جولەکەکان خۆیان ملیان لەشەڕنا و فیتنەو ئاشوبیان بەرپاکردو ئاکامی شەڕەنگیزییان ئەستۆی خۆیانی گرتەوە، چاڵیان بۆ خەڵك هەڵکەندو خۆیان تێی کەوتن.

## سێیەم: مامەڵە کردن لەگەڵ دووڕو لە روانگەی ئیسلامەوە:

ئەم روداوەو روداوەکانی دوای ئەوەش کە بریتی بوو لە داکۆکیکردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول. لە جولەکەکان و ئیلحاح کردنی بەو جۆرەی ئاماژەی بۆکرا. بە تەواوی پەردەی لەسەر دوو روویی ئەو کابرایە هەڵدایەوەو دەرکەوت کە ئەو ئیسلامبوونی خۆی کردووە بە مەتاڵ و ئاینی ئیسلام لە دڵیدا جێگیر نەبووەو دوژمنایەتی و حیقدو شەڕی دژی پێغەمبەرو موسوڵمانان لەناخی دا رەگی داکوتاوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی موسوڵمانی لەگەڵ کردو وای حیساب کرد تاکێکە لە موسوڵمانان. ذیمەی پوچ نەکردەوەو مامەڵەی موشریك و خودا نەناسی بۆ رەچاو نەکرد. بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام و دووڕوو درۆزن لە ئیسلام داینەنا. بەڵکوو وەڵامی داواکەی دایەوەو مەبەستەکەی بەجێ هێنا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ «وەکوو زانایانی ئیسلام لەسەری کۆکن» کە دووڕو لە دونیادا لەلایەن موسوڵمانانەوە حیسابی موسوڵمانی بۆ دەکرێ و بە موسوڵمان حسێبە. با دووڕوییەکەی ئاشکراو عەیانیش بێ. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە ئەحکامی ئیسلامی تێکڕا دوو لایەنی هەیە،

لایەنێکی لە دونیادا تەطبیق دەکرێ و موسوڵمانان بەرپرسن لە پراکتیزەکردنی لەناو کۆمەڵگای خۆیانداو فەمانڕەواو خەلیفەو سەرۆکی وڵات سەروکاری ئەو تەطبیق کردنە دەکا. لایەنەکەی تری لە قیامەت حیسابی بۆ دەکرێ و عائید بە خودای زاناو باڵا دەستە.

لایەنی یەکەمیان تەعامولی لەگەڵ دەکرێ بەگوێرەی بەڵگەی قەضائی و دەلیلی مادی هەست پێکراو بەجۆرێك هەموو حوکم و ئاکامێك بەپێی ئەو بەڵگەو دەلیلانە بێ. بەڵگەی ویجدانی و قەرینەی هەڵکریندراوو «استنساخ» کراو لەم رووەوە هیچ کاریگەرییەکیان نیە.

لایەنی دووەم بەگوێرەی ئەو حاڵەت و واقیعەیە کە لەناخدایەو لە دڵ و دەروونـدا چەسپاوە، بڕیاردان لەم بارەوە عائید بەخودایەو خۆی بڕیاری دەربارە دەدا. بۆ روونکردنەوەی ئەم یاسایە «وەکوو بوخاری لە ئیمامی عومەری ریوایەتکردووە» پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {وَإِنَّمَا نَأْخُذُكُمُ الآنَ بِمَا ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ}.

ئێمە ئێستا لەدونیادا بەگوێرەی ئەو کردەوانەی لێتان دەبینن هەڵس و کەوتتان لەگەڵ دەکەین.

هەروەها بوخاری و موسلیم فەرموودەیەکی تریان ریوایەتکردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا ، فَلاَ يَأْخُذْ ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ}: ئێوە کێشەتان تێدەکەوێ و دێنە لای من، پێدەچێ هەندێکتان باشتر بزانێ داکۆکی لەمافی خۆی بکا و لە بەڵگە هێنانەوەدا زاڵ ببێ بەسەر لایەنی بەرامبەریدا، منیش بەگوێرەی ئەو بەڵگانەی دەیان بیسم بڕیار دەدەم لە نێوانتاندا، جا ئەگەر من شتێکم لەمافی براکەیدا بە ئەو، باوەری نەگرێ، چونکە ئەوە پارچەیەکە لە ئاگر.

حیکمەت لە مەشروعییەتی ئەم قاعیدە ئەوەبوو پرۆسەی دادپەروەری لە تەلاعوب پارێزراوبێ بە رەهایی باڵی خۆی بەسەر خەڵکدا پەخش بکاتەوە. چونکە زۆر جار رێ دەکەوێ بڕێ دادوەر بەڵگەی ویجدانیو «استنتاجی» بەناحەق دەکەنە هۆکار بۆ زیانگەیاندن بەبڕێ خەڵك.

جابۆ پراکتیزەکردنی ئەم قاعیدە شەرعییە، حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ وێڕای ئەوەی زۆر بەوردی ئاگاداری حاڵو وەزعی دوو رووەکان بوو، بەهۆی نیگای خوداییەوە دەیزانی ناودڵیان چی تێدایە، کەچی هەڵسو کەوتی لەگەڵیاندا وەکوو مامەڵەکردنی بوو لەگەڵ باقی موسوڵماناندا بەبێ جوداوازی، واتە: لە ئەحکامی شەرعی گشتیدا تەعامولی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دوو رووەکانو موسوڵماناندا یەك شێوە بوو. ئەمەش چ دژایەتی نیە لەگەڵ ئەوەی کە دەڵێن: پێویستە موسوڵمانان ئەوپەڕی خیطەو حەزەریان هەبێ بەرامبەر دوو رووەکان. هەمیشە بە وریاییەوە سەرنج بدەنە هەڵسو کەوتیانو بیانخەنە ژێر چاودێری وردەوە. ئەمە ئەرکی سەرەتایی موسوڵمانانە واجبێکی هەمیشەییانە لە هەموو کاتو شوێنێکدا.

## چوارەم: ویلایەتی ناموسوڵمان:

ئەگەر ئێمە سەرنج بدەینە ئاکامی تەشریعی ئەم روداوە کە ئایەتی قورئانو دوابەدوای روداوەکە نازڵ بووە وەکوو تەعلیق وایە لەسەر روداوەکە. دەزانین کە بۆ هیچ موسوڵمانێك دروست نیە موسوڵمان ناموسوڵمان بکاتە وەلی خۆیو پەیوەندی لەگەڵدا ببەستێو پەیوەندییەکە بگاتە ئاستی ویلایەتو هاریکاریکردن.

ئەمە بەشێکە لەو ئەحکامە ئیسلامییانەی کۆڕایان لەسەرەو هیچ خیلافێکی تێدا نیەو هیچ موسوڵمانێك پێچەوانەی نەگوتووە. ئایاتی

قورئان لەوەدا زۆرو صەریح و بێ پێچ و پەنان و فەرموودەی پێغەمبەریش تێیدا گەیشتوونە ئاستی تەواتوری مەعنەوی و لەسەر لێکۆڵەرەوە شاراوەنین.

ئەم حوکمە ئیسلامییە هەمیشەییە ئیستثنای تێدانیە مەگەر لەیەك حاڵەتدا نەبێ، ئەویش ئەوەیە موسوڵمانان بەهۆی لاوازی و بێدەسەڵاتییان لاوازبن و ناچاری ئەوەبن دۆستایەتی لەگەڵ ناموسوڵمان بگرن، لەم حاڵەدا پەروەردگار رێگای داوە دۆستایەتی و پەیوەندی لەگەڵ کافردا ببەسترێ، وەکوو دەفەرموێ: {لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ - آل عمران/٢٨}.

پێویستە ئەوەش بزانین کە نەییکردن لە موسوڵمانان لەوەدا کە لەگەڵ ناموسوڵمان دۆستایەتی و پەیوەندی ببەستن، ئەوە ناگەیەنێ حیقدو کینەیان دەربارەیان هەبێ، موسوڵمان نەیی لێ کراوە لەوەی کە رقی لەهیچ کەسێك بێ.

هەروا پێویستە ئێمە بزانین کە جوداوازی گەورەو فراوان هەیە لەنێوان ئەوەدا موسوڵمان ناموسوڵمانی خۆش نەوێ لەبەر خاتری خودایان رقی لە ناموسوڵمان بێ لەبەر غەرەزی تر. ئەم دوو حاڵەتە لێك جودان، سەرچاوەی حاڵەتی یەکەم بیرو باوەڕو کرداری کابرای ناموسوڵمانە کە خودا پێی رازی نییەو پێویستە موسوڵمانیش رقی لێی بێ. سەرچاوەی حاڵەتی دووەم خودی کابرای ناموسوڵمانە بەبێ لەبەرچاو گرتنی بیروباوەڕو کرداری. کەوابوو رق لێبوون لەبەر خاتری خودا لە حەقیقەتدا بەزەیی هاتنەوەیە بە حاڵی کابرای کافرو لەخودا یاخی. چونکە موسوڵمان دەبێ چی بۆ خۆی پێ خۆشبێ بۆ کەسانی تریشی پێ خۆش بێ، هیچ شتێکیش لای موسوڵمان لەوە خۆشەویستتر

نییە کە نەفسی خۆی رزگار بکا لەسزای قیامەتو بەختەوەری هەتا هەتایی بۆ خۆی دەستەبەر بکا. کەوابوو موسوڵمان کاتێ رقی لە کافرو یاخی بووان دەبێتەوە هۆکارەکەی ئەوەیە پێی ناخۆشە کە بەدەستی خۆیان خۆیان تووشی عەزابی خوداو نەگبەتی هەتا هەتایی دەکەن لە قیامەتدا. ئاشکراشە ئەم حاڵەتە ناچێتە چوارچێوەی حاڵەتی حیقدو کینەوە.

ئەمە چ مونافاتو دژایەتی نیە لەگەڵ مەشروعییەتی بەکارهینانی توندو تیژی دەربارەی کافرەکان لەزۆر حالەتدا، زۆرجار وادەبێ بەکارهێنانی توندو تیژی تاقە رێگاو چارەسەرە بۆ چاکسازیو دەستەبەر بوونی بەختەوەری. نەتیجەو ئاکامێکە ناتواندرێ بەرچاو نەگیرێ بۆ وەدیهێنانی شەفەقەتو رەحمەت وەکوو شاعیر دەڵێ:

فقسا لیزدجروا ومن یک راحماً

فَلْیَقْسِ أحیاناً علی من یرحم

هەروەها پێویستە ئەوە بزاندرێ: کە نەیکردن لە موالاتو دۆستایەتی کافرو خواناسان، ئەوە ناخوازێ کە تەساهولو نەرمی نواندن بکرێ لە چەسپاندنی بنەمای دادپەروەریو رێزگرتنی پەیمانی نێوان ئەوانو موسوڵمانان. عەداڵەتو دادپەروەری پێویستە هەمووکاتێ بچەسپێندرێو پەیڕەو بکرێو بەهیچ پاساوێك نابێ پاشگوێ بخرێ. نابێو رەوانیە رق لێ بوونی موسوڵمانو ناخۆشویستنی بۆ کافرو خوانەناسان ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم چەسپاندنو پەیڕەوکردنی عەداڵەت، لەم رووەوە قورئان دەفەرموێ:

{وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ ، اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى – المائدة/٨}:

بەڵکوو مەبەست ئەوەیە بزاندرێ موسوڵمانان بۆ خۆیان ئوممەت‌و نەتەوەیەکی سەربەخۆن‌و لەگەڵ‌و نەتەوەی تر جوداوازن. وەکوو ئەو وەثیقەیەی نێوان موسوڵمانان کە لەسەرەتای کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە پێغەمبەر نووسی‌و کردی بە دەستووری حکومەتی تازە رسکاو‌و ئێمە لەوەپێش ئاماژەمان پێکردو شیکردنەوەمان تێداکرد.

کەوابوو پێویستە وەلائو دۆستایەتی‌و برایەتی موسوڵمانان لەناو خۆیاندا بێ‌و لەو چوارچێوە دەرنەچێ. ئەمجار مامەڵەیان لەگەڵ کەسانی دی‌و نەتەوەی تر دەبێ لەسەر بنەمایەکی وردو ستراتیج ئامێز بنج بەست ببێ‌و بە مەبەستی بەرقەراربوونی خێرو فەڕ بۆ هەموو لایەك‌و دوعاکردن بۆ هەموانیان بە گەیشتن بە بەختەوەری‌و شادی لەدونیاو قیامەت دا.

## غەزای ئوحود

هۆی ئەم غەزایە ئەوەبوو ئەو پیاو ماقوڵانەی لە جەنگی بەدردا نەکوژرابوون، یەکیان گرت‌و بڕیاریاندا تۆڵەی کوژراوەکانی غەزای بەدریان بستێننەوە. ئەو ماڵ‌و سامانەی لە کاروانەکەی ئەبو سەفیاندا هەبوو بە سەلامەتی لەکاتی غەزای بەدردا گەیشتبوەوە مەککە، هەمووی، یان بڕێکی تەرخان بکەن بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی تۆکمەو بەهێز بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ. لەسەرئەمە قسەی خۆیان کرد بەیەك‌و بڕیاریاندا. هەندێ هێزی تری لێرەو لەوێ کەپێیان دەگوتن: ئەحباش هاتنەگەڵیان، هەندێ ئافرەتی قسەزان‌و دەم راستیشیان خستنەگەڵ خۆیان، بۆئەوەی هەرکەسێك لە جەنگاوەرەکانیان هەڵات یان بیری هەڵاتنی کردەوە ژێوانی بکەنەوەو تانوتی لێ بدەن‌و هەڵی نێن بۆ

بەرەو پێشەوە چوون. بەم شێوە سووربوونەو نیازو مەبەستە لە مەککەوە دەرچوون و ژمارەیان سێ هەزار شەڕکەر بوو.

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەم لەشکر کێشییەی قوڕەیشییەکانی پێگەیی و خێرا کەوتە راوێژکردن لەگەڵ هاوەڵانیدا سەرپشکیشی کردن لەنێوان ئەوەدا بڕۆنە دەرەوەی مەدینە روبەڕویان ببنەوە یان لەناو مەدینەدا بمێننەوەو خۆیان دابمەزرێنن و دیفاع بکەن!! رای هەندێ لەپیاو ماقوڵانی موسوڵمان ئەوەبوو کە لەناو مەدینەدا بمێننەوە، ئەگەر قوڕەیشییەکان بۆیان هاتنە ناو مەدینەوە ئەوجا شەڕیان لەگەڵ بکەن، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبو سەلولیش هەر رای وابوو، وەلێ زوربەی موسوڵمانەکان، ئەوانەی لەشەڕی بەدردا بەشدار نەبوو بوون پێیان خۆشبوو بچنە دەرەوەی مەدینە بەرەنگارییان ببنەوە. داوایان لە پێغەمبەر کردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بمانبەرە دەرەوەی شار بالەوێ بەرەنگاری دوژمنمان ببینەوە، با وانەزانن ئێمە لییان ترساوین و لاوازین. پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی چوونە دەرەوەی پێ پەسەند نەبوو، بەڵام ئەو تاقمە کە زۆرینەی موسوڵمانەکان بوون ئیلحاحیان لە پێغەمبەر کرد، تاوایان لێ کرد تەشریفی بڕیاری چوونە دەرەوە بدا، ئیتر چووەماڵەوە زرێی پۆشی و تاوی دایە سیلاحەکەی، لەوکاتەدا ئەوانەی زۆر پێکێشی چوونە دەرەوەیان کردبوو، وایان گومان برد کە ئەوان پێغەمبەریان ناچارکردووە، بۆ چوونە دەرەوە، ئەگینا بۆ خۆی رای وایە نەچنە دەرەوە، ئیتر لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان بوونەوە. کە پێغەمبەر ﷺ بە سیلاحەوە هاتەوە ناویان و زرێی پۆشیبوو، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! وادیارە تۆ بۆخۆت چوونە دەرەوەمانت بەلاوە پەسەند نەبوو بە ئیلحاحی ئێمە ئەو هەڵوێستەت وەرگرت. ئەگەر وایە بەرای خۆت بکەو بفەرموو بائێمە لەمەدینەدا بمێنینەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تازە کارلەکار ترازاوە

دروست نییە بۆ هیچ پێغەمبەرێك زرێ بپۆشێ بۆ شەڕو شەڕەکە نەکا زرێیەکەی دابکەنێ»[١].

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ رۆژی شەممە رێکەوتی حەوتی مانگی شەشەڵان: کە سێ ساڵو دوو مانگ بەسەر کۆچکردنیدا بۆ مەدینە تێپەڕ بوو بوو بە لەشکرێکی هەزار کەسییەوە لەمەدینە وەدەرکەوت»[٢].

لەنێوان مەدینەو ئوحوددا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبو سەلول بەخۆیو بە سێیەکی لەشکرەکەوە کە زوربەیان لە هەوادارانی خۆی بوون ریسوایی بەسەر شانی خۆیدا هێناو گەڕایەوە بۆ مەدینەو وتی: بەقسەی منی نەکرد رای منداڵو مەزنی پەسەندکرد، ئێمە بۆچیو لەپای چی خۆمان بەکوشت بدەین!!؟ ئیتر بە وتنەوەی ئەم قسەو دووبارە کردنەوەی، ئاڵچاغ بوونەوە بۆ مەدینە. عەبدوڵڵای کوڕی حەرام شوێنیان کەوتو لێیان پاڕایەوە کە لەو هەڵوێستەیان پەشیمان ببنەوەو ورەی سوپاکە نەڕوخێننو پشتی پێغەمبەر بەرنەدەن، بەڵام هیچ گوێیان بەقسەکەی نەداو لە هەڵوێستی خیانەتکارانەی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە. سەرۆکی گەڕاوەکان وتی: {لو نعلم قتالاً لاتبعناكم} ئەگەر بمانزانیایە شەڕ روودەدا لەگەڵتان دەبووین.

ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە دەڵێ: موسوڵمانەکان کەوتنە مقۆ مقۆوە دەربارەی ئەوانەی گەڕانەوەو ریسواییان بەسەر خۆیاندا هێنا، کۆمەڵێك وتیان: با پەلاماریان بدەینو شەڕیان لەگەڵدا بکەین. تاقمێکیان وتیان وازیان لێ بێنن. لەوبارەوە ئایەتی:

---

١ - رواه ابن اسحاق والامام احمد، وروى الطبرى قريباً منه وانظر سيرة ابن هشام ٦٢/٢ وتاريخ الطبرى ٥٠٠/٢ وترتيب مسند احمد ٥٢/٢٢.

٢ - طبقات ابن سعد ٨٧/٣ وسيرة ابن هشام ١٢/٢.

{فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُواْ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً – النساء/٨٨} نازڵ بوو.

هەندێ لە هاوەڵان پێشنیاری ئەوەیان کرد داوای یارمەتی لە جولەکەکان بکەن لەسەر ئەساسی ئەو وەثیقەو پەیمانەی لەنێوان موسوڵمانەکان و جولەکەکانی مەدینەدا واژۆکرابوو. بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەیانی رەتکردەوە فەرمووی: {لا نَسْتَنصُرْ بِأَهْلِ الشرك على أَهْلِ الشرك}«[١]».

پێغەمبەرو هاوەڵانی لەدۆڵێکی کێوی ئوحوددا لەشکر بەزییان کرد ژمارەیان لە حەوت سەد جەنگاوەر تێپەڕی نەدەکرد. پشتیان کردە کێوی ئوحودو رویان لەمەدینە بوو. پێغەمبەر ﷺ پەنجا کەسی تیرئەندازی لەسەر کێوەکە دامەزراندو عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە فەرماندەیان، پێی فەرموو: ئێوە لەپشتمانەوە پارێزگاریمان بکەن و بە هیچ شێوەیەك شوێنی خۆتان بەجێ مەهێڵن، تەنانەت ئەگەر دیتان ئێمە سەرکەوتوین هاریکاریمان مەکەن، ئەگەر دیتان ئێمە تیکشکاوین و دەکوژرێین بەرگریمان لێ مەکەن«[٢]».

رافیعی کوڕی خەدیج و سومرەی کوڕی جوندوب دوو گەنجی موسوڵمان بوون تەمەنیان پانزە ساڵ بوو، زۆر ئیلحاح و تکایان لە پێغەمبەر کرد رێگایان بدا هاوبەشی جەنگ بکەن، پێغەمبەر ﷺ لەبەر تەمەن پچوکییان گەڕاندنیەوە، عەرزی پێغەمبەر کرا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! رافیع تیر ئەندازێکی باشە دەست راست و راست هەنگیوە. پێغەمبەر رێگەی پێدا، سومرە هاتە پێشەوە وتی: وەڵڵاهی من

---

١ - صحيح البخاري ٣١/٥.

٢ - طبقات ابن سعد ٨٠/٣، ئبنو اسحاق ٦٥/٢.

بە زۆرانبازی رافیع لەعەرد دەدەم‌و لەو بەهێزترم، بۆ رێگا بەو دەدرێ‌و من دەگێڕنەوە؟ پێغەمبەر ﷺ رێگای بەویشدا.

پێغەمبەر ﷺ شمشێرێکی بەدەستەوە گرت فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێ‌و مافی خۆیشی دەداتێ؟ ئەبو دوجانە هاتە پێشەوە وتی: بیدەرەمن، من مافی خۆی دەدەمێ. پێغەمبەر شمشێرەکەی پێدا، هەرخێرا پەڕۆیەکی سوری دەرهێنا‌و سەری خۆی پێ بەست «ئەوە داب‌و نەریتی ئەبو دوجانە بوو هەرکاتێ بیویستایە شەڕیکا تامردن ئەو پەڕۆیەی بەسەری رادەبەست».

ئەمجار ئەبو دوجانە شمشێرەکەی بەدەستەوە بوو بەناو ریزی جەنگاوەراندا بەخۆبادانەوە دەهاتوو دەچوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم جۆرە رۆیشتن‌و خۆبادانە لەلای خودا قێزەون‌و ناشایستەیە مەگەر لەم جۆرە شوێنانەدا. ئەمجار پێغەمبەر ئالآی لەشکری دا بە موصعەبی کوڕی عومەیر «خوای لێ رازی بێ».

خالیدی کوڕی وەلید سەروکاری لای راستی سوپای قوڕەیشییەکانی دەکردو عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل سەروکاری لای چەپی سوپاکەیانی دەکرد.

هەردوو لەشکر «لەشکری موسوڵمانان‌و لەشکری بتپەرستەکان» کەوتنە شەڕەوە‌و شەڕ گەرم بوو. موسوڵمانەکان تەنگیان بە لەشکری کافرەکان هەڵچنی‌و بە سوور بوون‌و ورەی بەرزەوە زەبری گورچکبڕیان لێدان، ئەبو دوجانە‌و حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب‌و موصعەبی کوڕی عومەیر لەریزی هەرە پێشەوەی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام بوون.

موصعەبی کوڕی عومەیر لەنزیک پێغەمبەرەوە شەهیدکرا، عەلی کوڕی ئەبو طالیب ئالآکەی دەستی موصعەبی هەڵگرت‌و شەڕ تادەهات

گەرمتر دەبوو، هێندەی پێ نەچوو کافرەکان دەستیان بەهەڵاتنو قاچاندن کرد، مەیدانیان جێ هێشتو ئاوڕیان لەهیچ شتێك نەدەدایەوە. ژنە دەف لێدەرو تانەو تەشەر دەرەکانیان بەشینو هاوارەوە بانگیان لێ دەکردنو تانوتیان لێ دەدان.

موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتنو دەستیان کرد بەتاڵان گرتنو کۆکردنەوەی.

تیرئەندازە موسوڵمانەکان: کە تێشکانی کافرەکانیان بینی، وتیان: با ئێمەیش دابەزین تاڵان بگرین. هەندێکیان بەلایانەوە وابوو دابەزینو شوێن چۆڵکردنی سەنگەرەکانیان رەوانیە دژی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرە. زوربەیان پێیان وابوو شەڕ تەواو بووە، بۆیە دابەزینو کەوتنە تاڵان گرتن، بەڵام عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر: کە سەرۆکی تیر ئەندازەکان بوو لەگەڵ چەند نەفەرێکی کەمدا لەشوێنی خۆی مایەوەو وتی: وەڵڵاهی من سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ناکەمو ئەم سەنگەرە چۆڵ ناکەم. خالیدی کوڕی وەلید کە ئەوکاتە هێشتا ئیمانی نەهێنابوو، روانی سەنگەری موسوڵمانەکان چەند کەسێکی کەمیان تێداماوە هێرشی بۆکردنو عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلیش بەشوێنیدا گەمارۆی تیر ئەندازە موسوڵمانەکانی سەر کێوەکەیان داو شەهیدیان کردنو تاقە کەسێکیان لێ دەرنەچوو، ئەمجار لەدواوە پەلاماری موسوڵمانە شەڕکەرەکانیان داو تەنگیان پێ هەڵچنین. ئیتر موسوڵمانەکان ترس دەورەی دانو بەتەواوی پلانی شەڕیان لێ تێکچوو، جڵەوی موبادەرەو باڵا دەستیان لەدەستداو بەبێ شیعارو ئامانج شەڕیان دەکردو سەریان والێ شێوابوو نەیاندەزانی چۆن شەڕدەکەنو بەرەو کوێ هەنگاو دەنێن: کافرەکان زۆریان لێ شەهیدکردنو زەبری گورچکبڕیان لێ دان، تەنانەت هەندێ لە موشریکەکان لەخودی پێغەمبەر نزیك بوونەوەو بەردیان

تێگرت‌و پێکايان، ددانی پەنا ددانی چوارينەی پيشەوەيان شکاندو دەم‌وچاوی زەبری تری بەرکەوت‌و خوێنی لێ جاری بوو، پێغەمبەر ﷺ خوێنی بەدەم‌و چاودا دەهاتە خوارو دەيسڕی‌و دەيفەرموو: دەبێ ئەو قەمە چۆن سەربکەون‌و بەختەوەری بەدەست بێنن روخساری پێغەمبەرەکەيان خوێناوی بکەن، لەکاتيکدا ئەو بانگيان دەکا بۆلای خودای خۆيان؟.

فاطيمە هات خوێنەکەی لێ بشواتەوە ئيمامی عەلی ئاوی پێدا دەکرد، جا کە فاطيمە بينی ئاوەکە خوێنەکە ناوەستێنێ‌و زيادی دەکا، حەصيرێکی سوتاندو خۆڵەکەی لەشوێنی برينەکەداو خوێنەکە وەستا«١».

لەم سەروبەندەدا بەناو خەڵکدا بلاوبۆوە: کە پێغەمبەر ﷺ کوژراوە، ئەم هەواڵە زۆر کاريگەر بوو، ترسێکی زۆری خستە ناو دڵی موسوڵمانەکانەوە. وايکرد هەندێ لەوانەی بيرو باوەڕيان لاوازبوو بڵێن: کە پێغەمبەر کوژرابێ ئيتر ئێمە بۆچی بمێنينەوە؟ بۆچی خۆمان قوتار نەکەين؟ ئەمەبوو کە ئەنەسی کوڕی نەضری هينايە قسەو وتی: دەی ژيان دوای پێغەمبەر بۆچی باشە؟ ئەمجار ئاماژەی بۆ هەندێ دوو روو ئيمان لاوازکرد وتی: خودايە من دوورە پەرێزم‌و بەريم لەوەی ئەوانە دەيڵێن. عوزرو پاساو دەهێنمەوە بۆلات لەوەی ئەوانە دەيڵێن: ئەمجار تاوی دايە شيرەکەی‌و تاشەهيدبوو شەڕی کرد«٢».

لەمکاتەدا ئەوانەی لەدەوری پێغەمبەر بوون نموونەيەکی سەرنج راکێش‌و بەرزييان تۆمارکرد لەبواری فيداکاری‌و گيانبازی‌و خۆبەختکردن دا، دەوری پێغەمبەريان بەرنەداو ديفاعيان لێ کرد تا

---

١ - متفق عليه بالفاظ متقاربة.

٢ - متفق عليه.

زوربەیان شەهیدبوون‌و خۆیان کردە قوربانی لەڕێگەی خوداداو پارێزگاری لەگیانی پێغەمبەر. ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە دەڵێ: کاتێك لەغەزای ئوحوددا موسوڵمانەکان شکان‌و دەوروبەری پێغەمبەریان چۆڵ کرد، ئەبو طەلحە لەپێش پێغەمبەرەوە بوو خۆی کردبوو بە مەتاڵ‌و قەڵغان بۆی. ئەبو طەلحە تیرئەندازێکی باش بوو، هەرتیرێکی بهاویشتایە دەیپێکا. پێغەمبەر ﷺ بۆی دەڕوانییە نیشانەکانی‌و وەکوو «رەصەد» شوێنی تیرەکانی بۆ دیاری دەکرد. ئەبو طەلحە عەرزی کرد باوك‌و دایکم بە قوربانت بن خۆت دەرمەخە باتیرێکی ئەوانت رێ نەکەوێ، گەردنم سوپەری گەردنتە.

ئەبو دوجانە خۆی کردبووە قەڵغان‌و خۆی خستبووە بەر ئەو تیرانەی ئاڕاستەی پێغەمبەر دەکران، لەوکاتەدا کەخۆی بەسەر پێغەمبەردا کۆم کردبوەوە چەند تیرێکی کافرەکانی بەرپشت کەوتبوو.

زیادی کوڕی «السکن» خۆی کردبووە مەتاڵ بۆ پێغەمبەر هەتا خۆی‌و پێنج لە هاوەڵانی شەهیدبوون، دواکەسیان کە شەهیدکرا بەگوێرەی ریوایەتی ئیبنو هیشام «عیمارە»ی کوڕی یەزیدی کوڕی «السکن» بوو بەرگری لە پێغەمبەر کرد تا بەخەستی بریندار بوو لەکارکەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لیمی نزیك بکەنەوە، قاچی پیرۆزی کردە سەرین بۆی، رومەتی لەسەر قاچی پێغەمبەر بوو گیانی دەرچوو. پاشان شەڕ لەنێوان هەردوولایاندا بەرەو کۆتایی رۆیی. موشریکەکان بڕیاری گەڕانەوەیانداو بە سەرکەوتنی خۆیان شاگەشکە ببوون. موسوڵمانەکان خەمبارو ترساو بەهۆی ئەو هەموو جەنگاوەرانەی لێیان شەهید بوو بوون، لەنێو شەهیدەکاندا حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب‌و، الیمان، ئەنەسی کوڕی «النضر»‌و موصعەبی کوڕی عومەیرو ژمارەیەکی زۆری تر دەبیندران.

پێغەمبەر بەکوژرانی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب زۆر خەفەتبار بوو بەتایبەتی کەبینی سوکایەتی بە جەستەی کرابوو، ورگی هەڵدڕابوو لوتو گوێچکەی بڕابوون. ئەمجار پێغەمبەر بڕیاریدا دوو دوو لەیەك کراسدا کفنی کردن، لەکاتی دفنکردندا دەیفەرموو کامەیان قورئانی زیاتر لەبەربوو؟ جا ئەگەر عەرزیان بکردایە ئەمەیان زیاتری لەبەربوو، لەکاتی خستنە ناو لەحددا پێشی دەخستو دەیفەرموو من ڕۆژی قیامەت شاهیدی بۆ ئەمانە دەدەم. ئەمجار فەرمانی کرد کە بەخوێنی خۆیانەوە دفن بکرێن نە نوێژی لەسەرکردن نە شۆردراشن»[١].

جولەکەو دوو ڕووەکان پێخۆشبوونی خۆیان دەربڕی بە سەرەنجامی شەڕەکە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبو سەلولو هاوەڵانی دەیانگوت: ئەگەر بەقسەی ئێمەیان بکردایە ئەو هەموو خەڵکەیان لێ نەدەکوژرانو ئاوا بەو دەردە نەدەچوون. ئەمجار دەیانگوت: کوانێ ئەو سەرکەوتنە خەیاڵییەی بە تەمابوون لەگەڵ پێغەمبەردا بەدەستی بێنن؟ ئیتر پەروەردگار چەند ئایەتێکی لە سورەی آل عیمران ناردە خوار بەشێوەی تەعلیق لەسەر قسەکانی دووڕوو ناحەزانی ئیسلامو ڕونکردنەوەی حیکمەتی ئەوەی لە ئوحوددا ڕوی دا حیکمەتێکی ئیلاهی بوو. ئایەتەکان بە ئایەتی ژمارە «٤٩» دەست پێ دەکا: کە دەفەرموێ: {وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ، الَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَؤُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ – آل عمران/ ٤٩ – ٦٨}.

ئێوارەی شەممە پێغەمبەر ﷺ لە ئوحودەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە خۆیو هاوەڵانی ئەو شەوە لە مەدینە شەویان بەڕۆژ کردەوە، موسوڵمانەکان برینەکانی خۆیان دەرمان کرد، کە پێغەمبەر ڕۆژی

---

١ - البخاري ٤٩/٥.

یەکشەممە نوێژی بەیانی کرد، فەرمانی بە بیلال کرد: کە بانگ رادێرێ بلێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانتان پێ دەکا شوێن دوژمن بکەون نابێ جگە لەوانەی هاوبەشی شەڕیان کردووە کەسی تر هاوبەشی ئەو راونانە بکا، ئەمجار پێغەمبەر دوای خڕبوونەوەی جەنگاوەرەکان داوای ئاڵاکەی کرد کە بەهەڵدراوی مابووەوە و نەپێچرابووەوە، دای بە عەلی کوڕی ئەبو طالیب، ئیتر بەو شەکەتی و برینداری و ماندوییە لە مەدینە دەرچوون رۆیشتن تا گەیشتنە شوێنێك پێی دەگوترێ «حمراء الأسد» کە «دە» کیلومەتر لەمەدینە دوورە، لەوێ موسوڵمانەکان ئاگرێکی گەورەیان کردەوە لەدوورەوە دەبیندراو وادەچووە گومانەوە کە ئاگر کەرەوەکان زۆربن.

مەعبەدی خوزاعی کە ئەوکاتە لە موشریکەکانی «الخزاعة» بوو بەلای لەشکری موسوڵمانەکاندا تێپەڕی و گەیشتە لەشکری موشریکەکان بینی شای و زەماوەندیان بەرپا کردووە و بەسەرکەوتنی ئوحود لەخۆیان بایی بوون، بیریان لەوە دەکردەوە بگەڕێنەوە پەلاماری مەدینە بدەن و قەلاچۆی موسوڵمانەکان بکەن. صەفوانی کوڕی ئومەییە دەیەوێ ژیوانیان بکاتەوە، جا کە ئەبو سەفیان مەعبەدی بینی بانگی کرد ئەرێ مەعبەد! دەنگ و باس چیەو چیت دی؟ مەعبەد وتی کورە ماڵوێران ئەوە موحەممەدو هاوەڵانی بە سوپایەکی زۆرەوە کەتا ئێستا من لەشکری وام نەدیوە لە مەدینە دەرچوون و بۆ ئێوە دین و هەموویان داخ لەدڵ و پڕ قینن، رق و غەزەبیان لێ دەڕژێ و ئاگریان لێ دەبارێ، بەم قسانەی مەعبەد خودا ترس و لەرزێکی بێ شماری خستە دڵی موشریکەکانەوە، خێرا شایی و زەماوەندیان تێکداو پلان و خەیاڵی پەلاماردانی مەدینەیان وەلاناو بەپەلە بەرەو مەککە قاچاندیان: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی رۆژی دوو شەممەو سێ شەممەو چوار شەممە لە «حمراء الأسد»دا مایەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە[١].

---

١ - طبقات ابن سعد وسيرة ابن هشام وتاريخ الطبري.

**پەندو ئامۆژگاری:**

غەزای ئوحود زۆر وانەی گرنگی لەخۆ گرتوون و بۆ هەموو رۆژگارێك بەنیسبەت موسوڵمانانەوە گرنگی تایبەتی هەیە. هەر دەڵێی حیکمەت لەروودانی غەزای ئوحود بەو شێوەی رویدا بۆ ئەوەبوو ئەو وانە تەطبیقییە عەمەلییانەی لێ وەرگیرێن و موسوڵمانان فێری ئەوە دەکەن چۆن لە شەڕو ڕوبەڕوو بوونەوەیاندا لەگەڵ دوژمنانیاندا سەرکەوتن بەدەست بێنن و چۆن خۆ بپارێزن لە هەڵخلیسکان و تێکشکان و فەشەل.

دەی با ئێمە لەسەر ئەم وانانە هەڵوێستە بکەین و لەو وانانە وردبینەوەو یەك لەدوایەك بیانخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

یەکەم: لێرەدا بنەمایەکی گرنگی یاسای ئیسلامی خۆی دەنوێنێ، یاسایەك پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی پێوەی پابەند دەبوو پەیڕەوی دەکرد، ئەویش بریتی بوو لە بنەمای راوێژ لەگەڵ هاوەڵانی لەهەموو کارێکی گرنگدا کە راوێژ هەڵبگرێ و بگونجێ بیروڕای تێدا دەربڕێ. وەلێ ئێمە لێرەدا هەست بەجوداوازییەك دەکەین کە لەراوێژکردنی لەگەڵ هاوەڵانی لە غەزای بەدردا جوداوازە، ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ نەیەویست لەو هەڵوێست و پێڕازیبوونەی خۆی بگەڕێتەوە کە لەسەر پێشنیاری هاوەڵانی بڕیاری دەرچوونی دا بۆ دەرەوەی مەدینە بۆ جەنگان لەگەڵ کافرەکاندا پاش پۆشینی زرێ و خۆ ئامادەکردنی بۆ چوونە دەرەوە، هەرچەندە ئەو هاوەڵانەی پێشنیارەکەیان کردبوو پەشیمان بونەوەو تکایان لێ کرد کە لەناو مەدینەدا بمێنێتەوەو عەرزیان کرد ئەگەر جەنابت بەلاتەوە پەسەندە نەچیتە دەرەوە ئەوە ئێمە لە پێشنیاری خۆمان پەشیمانین. لەکاتێکدا پێش راوێژکردنەکە پێغەمبەر وای دەرخست کە پێی باشە لەمەدینەدا بمێننەوەو لەوێدا روبەڕوی دوژمن ببنەوە. دەی بۆ دوایی پێشنیارەکەیانی قبوڵ نەکرد؟

وێدەچێ حیکمەتی بەرچاو لەوەدا ئەوەبێ: کە باسکردن و پێشنیارکردن دوای خۆئامادەکردن و خۆبەستن بۆ شەڕ و دوای ئەوەی پێغەمبەر زرێی پۆشی و چەکی بەدەستەوە گرت کارێکە لەدەرەوەی سنووری راوێژکردنە، راوێژکردن پێش خۆ ئامادەکردن رۆڵی خۆی هەیە: کە لەکاتی خۆی تێپەڕی ئیتر بەرچاو ناگیرێ. بەتایبەتی لەبواری شەڕی ئاوا چارەنووس سازدا کە پێویستی بە حەزم و عەزم هەیە، لەلایەکی ترەوە نەچوونە دەر لەمەدینە دوای بڕیاردان و زرێ پۆشین و چەك هەڵگرتن مانای زەعیفی و رارایی لە ئیرادە و ترسان لەدوژمن دەگەیەنێ و ئەمەش لە پێغەمبەر ناوەشێتەوە، بۆیە وەڵامی پێغەمبەر بۆ ئەو هاوەڵانە وەڵامێکی یەکالا کەرەوەی ورە بەرزانەی پڕ لە عەزم و حەزم بوو، هیچ گوێی نەدایە مقۆ مقۆی خەڵکەکە و سەر زەنشتکردنیان بۆ یەکتری و فەرمووی: {لاَ يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ لَبَسُ لأَمَتَهُ فَيَضَعُهَا حَتَّى يقاتل}.

ناشێ پێغەمبەر زرێ بپۆشێ و چەك هەڵگرێ بۆ شەڕ پێش ئەوەی شەڕەکە بکا چەکەکەی دابنێتەوە.

دووەم: لەم جەنگەدا دوو رووەکان مەشهەدێکی دیاریکراویان هەس. هەبوونی ئەم مەشهەدەشیان چەند حیکمەت و مەبەستێکی لەخۆ گرتووە. گرنگتریان جیاکردنەوەی موسوڵمانانە لەوەی تێکەڵ بە دوو رووەکان ببن، ئەم جیاکردنەوەش سودو قازانجێکی زۆری هەبوو بۆ موسوڵمانەکان کە لەوەدوا بۆیان بوو بەتێشوو ئەزموون.

ئەوەبوو ئێمە بینیمان چۆن سەرۆکی دوو ڕووەکان بەخۆی و بەسێ سەد کەس لە شوێنکەوتوو هەوادارانی ریسواییان بەسەر شانی خۆیاندا هێنا و لەساتە وەختێکی زۆر ناسکدا لە سوپای پێغەمبەردا گەڕانەوە بەرەو مەدینە. بیانوشیان ئەوەبوو گوایە پێغەمبەر بەقسەی منداڵ و مەزنی کردووە بەقسەی پیاو ماقوڵ و ریش سپی و عاقڵمەندانی

نەکردووە. هەڵبەتە ئەوە بیانو بوو، ئەگینا لە واقیعو حەقیقەتدا ئەوە دەیەویست خۆی لەشەڕ بدزێتەوەو ژیانی خۆی نەخاتە مەترسییەوە. ئەمەش دیاریترین رەوشتی دوو رووەکانە. دەیانەویست لە دەستکەوتو غەنیمەدا شەریك بنو لەشەڕو ماندوبوونا تەریك بن، ئەوەی ئەوانی والێ کردووە بەڕواڵەت خۆیان بە موسوڵمان حسێب بکەن، دەستکەوتو تاڵانی چاوەڕوان کراوە کە بەتەمان دەستیان بکەوێ، بەڵاو ناخۆشییەکە دەیانەوێ خۆی لێ بپارێزن.

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ لەم غەزایەدا نەیەویست یارمەتیو کۆمەکی لە ناموسوڵمان وەربگرێ، هەرچەندە ژمارەیان کەمو نابەرامبەر بوو لەگەڵ ژمارەی موشریکەکان. پێغەمبەر ﷺ «وەکوو ئیبنو سەعد لە طەبەقاتدا ریوایەتی کردووە» لەم بارەوە فەرمووی: {لا نستنصر بأهل الشرك على أهل الشرك} ئێمە یارمەتی لە موشریك دژی موشریك وەرناگرین.

ئیمامی موسلمیش ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بەکابرایەکی فەرموو: کە لەرۆژی بەدردا شوێنی کەوتبوو بۆئەوەی لەشەڕدا پاڵپشتی بکاو یارمەتی بدا ئەتۆ بڕوات بەتاكو تەنهایی خودا هەیە؟ کابرا وتی: نەخەیر. فەرمووی: دەبگەڕێوە من یارمەتیدانی موشریکم ناوێ.

جەماوەرێکی زۆر لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە دروست نییە داوای یارمەتی لەکافر بکرێ بۆشەڕ. بەڵام ئیمامی شافیعی لەم بارەوە تەفصیلی هەیە، دەڵێ: ئەگەر ئیمام وای بۆچوو رای وابوو ئەو کافرەی داوای یارمەتی لێ دەکرێ خیانەت لە موسوڵمانان ناکاو هەڵوێستی باشەو نیازی پاکە، پێویستیش بوو یارمەتی داوا لێ بکرێو

موسوڵمانان ئاتاجی یارمەتییەکەی بوون ئەوە دروستە بۆیان یارمەتی لێ وەربگرن، ئەگەر وانەبوو نا«[1]».

واپێدەچێ ئەم رایەی شافیعی لەگەڵ قەواعیدی شەرعی و تێکڕای بەڵگەکان گونجاو بێ، چونکە وەکوو ریوایەت کراوە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) لە غەزای حونەیندا یارمەتیدانی صەفوانی کوڕی ئومەییەی قبوڵ کرد. مەسەلەکەش وادیارە دەچێتە چوارچێوەی ئەو یاسا ئیسلامییەی کە پێی دەگوترێ: «السیاسة الشرعیة» خوا یاربێ فەرق و جوداوازی نێوان ئەوەی پێغەمبەر لە غەزای حونەیندا کردی و ئەوەی لە هەریەك لە غەزای بەدرو ئوحوددا کردی لەشوێنی خۆی روون دەکەینەوە.

چوارەم: ئەوەی جێگای سەرنجەو دەبێ بەوردی تێی بفکرین. هەڵوێست و حاڵ و وەزعی سومرەی کوڕی جوندوب و رافیعی کوڕی خەدیج: کە هەردوکیان تەمەنیان لە پانزە ساڵیدا بوو، چۆن هاتنە خزمەت پێغەمبەرو لێی پاڕانەوە: کە ڕێگەیان بدا هاوبەشی غەزابکەن و دژی کافرەکان لەگەڵ موسوڵماناندا بجەنگن، چ جەنگێك کەخۆ سازدان بوو بۆ مردن. چونکە هیچ مانایەکی بەرامبەری و یەکسانی لەنێوان دوو لەشکری کوفرو ئیسلامدا نەبوو، موسوڵمانەکان ژمارەیان لە حەوت سەد کەس تێپەڕی نەدەکرد ژمارەی کافرەکان لەسێ هەزار زیاتر بوون!!

سەیر ئەوەیە بڕێ لەوانەی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان کردۆتە پیشە، ئەم دیاردانە لەمێژووی ئیسلامی و سیرەی پێغەمبەردا دەبینن، کەچی کەشییان دەکەنەوە شیکردنەوەکەیان وا ئاڕاستە دەکەن کە عەرەبەکان «موسوڵمانەکان» نەتەوەیەك بوون لەژیانی شەڕو هەرادا

---

١ - مغنی المحتاج ٢٢١/٤.

بوون، هەمیشە لەشەڕو کوشتاردا بوونو لەسێبەری شەڕو جەنگ دا پەروەردە دەکران، بۆیە بەگەنج و پیرو منداڵیانەوە بەشێوەیەکی سروشتی دەیانڕوانیە شەڕو هەراو هەرگیز سڵیان لەشەڕ نەدەکردەوە. ترسیان لێ نەبوو!!

گومان لەوەدا نییە ئەوانەی ئەم جۆرە توێژینەوەو شیکردنەوانە ئەنجام ەدەن، چاوی خۆیان دەنوقێننو سوورن لەسەر ئەوەی کە چاویان نەکەنەوە لەکاتی قسەکردن لە تەخازول و خۆریسواکردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول: کە بەخۆیو سێ سەد لە هەوادارانی لەترسانو سەرەنجامی شەڕەکەو خۆدزینەوە لە روبەڕووبوونەوەی لەشکری بتپەرستەکانو حەزکردن لە پاڵدانەوەو پەیڕەوکردنی یاسای «حیزیو سەلامەتی» لەنیوەی رێگا گەڕانەوە!! هەروا چاوی خۆیان دەقوچێنن لەئاست تەخاذول و خۆریسواکردنی ئەوانەی لەغەزای تەبووکدا خۆیان پاشداو سێبەری ژێر درەختی شاری مەدینەیان هەڵبژاردو گوێیان بە بانگەوازی پێغەمبەر نەداو بۆ دەرچوون بۆ غەزاو دەیانگوت «لا تنفروا في الحرّ» وەکوو قورئان لێیانەوە دەگێڕێتەوە. هەروەها چاوی خۆیان دەقوچێنن لە تێشکانی موشریکەکانی غەزای بەدر وێڕای زۆری ژمارەیانو کەمی ژمارەی موسوڵمانەکانو ئەو هەموو ترسەی کەوتە دڵی کافرەکانەوە ئەمانە هەموو عەرەب بوون، ئەوانەی چون بۆ غەزاو ئەوانەی خۆیان پاشداو ئەوانە سەرکەوتن لە غەزای بەدرو ئەوانەی تێشکان. ئەوانەی ئیلحاحیان دەکرد بچن بۆ غەزاو ئەوانەی خۆیان دەشاردەوە!!!

بەڕاستی زۆر ئەستەمە بۆ مرۆڤی خاوەن ویژدانو توێژەرەوەی زانستخواز: کەخۆی ببوێرێ لەوەی بەداهەتی ئاشکرا دەیچەسپێنێ کە بریتییە لەوەی نهێنی ئەم پێکێشیو ئیلحاحکردنە بۆ چوون بۆ غەزاو

خۆخستنە ناو ئاگری شەڕو روبەڕوو بوونەوەی مردن لەلایەن ئەو دوو گەنجەی کە تەمەنیان لە پانزە ساڵیدا بوو تەنها بیروباوەڕی پتەوبوو: کە دڵی داگیر کردبوون‌و خۆشەویستیەکی بێ سنووری بۆ پێغەمبەر لێ وەدی هاتبوو، چونکە لەهەر شوێنێك‌و هەرکاتێك بیرو باوەڕ بەهێزبوو، ئەو خۆشەویستیە وەدی دێ‌و ئەو سوربوون‌و پێکێشییە بۆناو تونی مەرگ سەر هەڵدەدا، هەرکاتێك ئیمان لاواز بوو خۆشەویستی پێغەمبەر لەدڵدا لاواز دەبێ‌و سوربوون‌و پێکیشی لەچوون بۆ غەزا دەبێتە خۆدزینەوەو خۆپاشدان، ئازایەتی‌و ورە بەرزیی دەبێتە ترسان‌و ورە روخان‌و تەمبەڵی‌و تەوەزلی!!

پێنجەم: ئەگەر تۆ لەحاڵ‌و وەزعی پێغەمبەر ﷺ وردبیتەوە کە سەرگەرمی رێکخستنی ریزەکانی هاوەڵانیەتی‌و باڵەکانی سوپا دادەمەزرێنێ‌و پارێزگاری پێویست لەدواوەی موسوڵمانان دادەنێ‌و ئامۆژگارییان دەکا: کە بەهیچ شێوەیەك سەنگەرو شوێنەکانی خۆیان جێ نەهێڵن، پێیان دەفەرموێ: رەورەوەی شەڕ چۆن بگۆڕێ‌و برا موسوڵمانەکانیان سەرکەون یان تێ بشکێن ئەوان سەنگەری خۆیان چۆڵ نەکەن تا فەرمانی ئەویان پێ نەکرێ ئەو سەرکێوە بەرنەدەن. دەڵێین: ئەگەر تۆ لەم دیمەنە ورد بیتەوە حەقیقەتێکی مەلموس‌و ئاشکرات بۆ دەردەکەوێ‌و دیاردەیەکی گرنگ هەست پێ دەکەی.

حەقیقەتە مەلموس‌و ئاشکرا کە بریتییە لە لێزانی‌و وردبینی پێغەمبەر لەبواری سەربازیدا، بۆت دەردەکەوێ ئەو زاتە لەبواری سەرکردایەتی‌و بەڕێوە بردنی جەنگدا چەند شارەزاو لێزان بووە. بێگومان زاتی پیرۆزی بە پێشەنگی پلان داڕێژەرانی شەڕو شارەزا لە فەن‌و شێوەکانی جەنگ دەژمێردرێ. گومانیش لەوەدا نییە پەروەردگار لێهاتوییەکی نادروست‌و ناوازەی لەم بوارەدا پێ بەخشیوە. وەلێ ئێمە

دەڵێین ئەم لێهاتویی و شارەزاییە بەهۆی «نبوة»و پەیامی ئاسمانییەوە بۆی دەستەبەر بووەو بەروبوومی ئەو پلەو پایەو مەقامەیە. جەمسەرو مەرکەزی «نبوة»و «رسالة» بوو کەوای لێ کردبوو عەبقەری و شارەزاو لێهاتوو بێ لەبواری سەربازی و فنونی شەڕدا. هەروەکوو چۆن صیفەتی «نبوة»و «رسالەت» بوو داخوازی ئەوەبوو کە مەعصوم بێ و دووربێ لە هەڵەو هەڵخلیسکان. لەوەپێش ئەم باسەمان لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا شیکردەوە پێویست ناکا لێرەدا جارێکی تر دوبارەی بکەینەوە.

دیاردە ظاهیرو ئاشکراکەش: کە لەچوار چێوەی ئامۆژگارییە وردەکانی بۆ هاوەڵانی بەگشتی و بۆ تیر ئەندازەکانی سەر کێوەکە بەتایبەتی دەردەکەوێ، بریتییە لە دیاردەیەکی پەیوەندیداری تۆکمە بەو بارودۆخەی دوای بەجێ هیشتنی تیر ئەندازەکان بۆ شوێنی خۆیان و چۆڵکردنی سەنگەرەکانیان و دەرچوون لەو فەرمانەی پێغەمبەر ئاڕاستەی کردبوون. هەر دەڵێی: پێغەمبەر بەفیراسەت و دووربینی پێغەمبەرێتی خۆی یان بەنیگای خودایی پێش وەخت هەستی بەو حاڵەت و وەزعە کردبوو کە دوایی رویدا.

بۆیە بەوجۆرە ئامۆژگارییەکانی خۆی بۆ هاوەڵانی دووبارە کردەوەو فەرمانی پێدەکردن کە بەهیچ شێوەیەك سەنگەرەکانیان چۆڵ نەکەن و کێوەکە جێ نەهێڵن. هەر دەڵێی پێش وەخت زاتی پاکی موناوەرەیەکی زیندوویان پێ دەگا لەگەڵ دوژمنێکیان کە نەفس و ئارەزۆیانە، ئەوەی لەخۆی گرتووە لە تەماع و هەڵپەکردن بۆ دەسکەوت و تاڵانی. موناوەرەکە ئاکام و سەرەنجامی هەرچییەك بێ سوودی گەورەی لەخۆگرتوون، زۆرجاریش ئاکام و سەرەنجامی نەرێنی فائیدەی لەسەرەنجامی ئەرێنی زیاترە.

شەشەم: ئەبو دوجانە، ئەو پیاوەی کە شمشێرەکەی لەدەستی پێغەمبەر ﷺ وەرگرت بەلارو لەنجەو خۆبادان و شێوە ڕۆیشتنێك بەناو ریزی جەنگاوەراندا رۆیشت. پێغەمبەر ئینکاری نەکردو فەرمووی: {ان هذه مشية يكرهها الله الا في مثل هذا الموضع!} ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ هەموو دیاردەیەکی تەکەبوورو لوتبەرزیو بەخۆنازین کە لەبارو دۆخی گشتیدا حەرامن، لەحاڵەتی جەنگ و شەڕ لەگەڵ کافران یاساغییەکەی نامێنێ.

بێگومان لە مەظاهیری تەکەبورو فیزکردنە موسوڵمان بەسەر زەویدا بەخۆ بادان و لارو لەنجە بڕوا، بەڵام ئەم حاڵە لە گۆڕەپانی شەڕدا کارێکی باشەو مەکروهیەتی نامێنێ. هەروا جوانکردنی ماڵ و خانوبەرەو قاپ و قاچاخ بەزێڕو زیو حەرامەو دیاردەی تەکەبوورو لوتبەرزییە، وەلێ جوانکردنی ئامێری شەڕ بەزیو یاساغ نییە. دیاردەی کیبرو لوتبەرزی لەم شوێنانەدا شانازی کردنە بە عیززەتی ئیسلام بەسەر دوژمنانیدا. وێڕای ئەوەش ئەوە مەعنایەکە لە مەعانی شەڕی دەروونی وەها: کە پێویستە موسوڵمانان گرنگییەکەی پاشگوێ نەخەن.

حەوتەم: ئەگەر ئێمە لەماوەی شەڕی نێوان کافرو موسوڵمانەکان ورد بینەوە، دەبینین دابەش دەبێ بۆ دووبەشی سەرەکی:

بەشی یەکەم: کە تێیدا موسوڵمانان پابەندی فەرمانی پێغەمبەر بوون و شوێنی خۆیان بەجێ نەهێشتبوو بزانین ئاکام و بەروبوومی چی بوو؟ بێگومان لەم حاڵەدا سەرکەوتن بۆ موسوڵمانەکان بوو تێشکان و روخان روی لە سوپای موشریکەکان کردبوو، ئەوەبوو ترس و بیم دڵی سێ هەزار نەفەری موشریکەکانی داپۆشی لەبەرەو پێشەوە چوون قەتیس مان و دەستیان کرد بە هەڵاتن و پشت هەڵکردن و قاچاندن. ئەم

بەشەی شەڕەکە کە ئایەتی قورئانی پیرۆز وێنای دەکاو دەفەرموێ: {وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ - آل عمران/١٥٢}.

**بەشی دووەم:** کە تێیدا موسوڵمانەکان دەست دەکەن بە شوێنکەوتنی موشریکەکان بۆئەوەی نەهێڵن لەدەستیان دەرچن‌و قەڵاچۆیان بکەن‌و چەک‌و سیلاحیان لێ وەربگرن‌و تاڵان‌و غەنیمەت بەدەست بێنن، لەوکاتەدا تیر ئەندازەکان لەسەر کێوەکەی سەنگەریان تێدا گرتبوو روانیان وا هاوەڵانیان بەشمشێرەکانیان دوژمنیان هەڵبڕیوەو ناچاریان کردوون بە هەڵاتن‌و دەست بەرداربوون لە گۆڕەپانی شەڕو بەجێ هێشتنی کەل‌و پەلیان‌و دەست بەسەرا گرتنی لەلایەن موسوڵمانەکانەوە. کە ئەم دیمەنەیان بینی، هەندێکیان تەماعی ئەوەیان کەوتەبەر کە لەسەر کێوەکە دابەزن‌و بکەونەگەڵ هاوەڵانیان بۆ تاڵانی گرتن‌و غەنیمەت کۆکردنەوە، وایان زانی یان بڵێین: حەزکردنیان لەتاڵانی گرتن وای خستنە زەینەوە: کە ئەو ماوە زەمەنییەی پێغەمبەر درودی خودای لەسەر بێ» فەرمانی پێ کردبوون لەسەنگەرەکانیاندا بمێننەوە تەواو بووەو ئەرکی فەرمانی خۆیان بەجێ هێناوەو پێویست بەوەناکا چاوەڕوانی فەرمانی پێغەمبەربن بە چۆڵکردنی سەنگەرەکانیان‌و کۆتایی هاتنی ئەرکی پێ سپێراویان، ئیجتیهادێك بوو کردیان، هەندێ لە هاوەڵانیان پێیان وابوو بە هەڵەدا چوون‌و کاتی ئەوە نەهاتووە سەنگەرەکانیان چۆڵ بکەن‌و تا بەرونی فەرمانی پێغەمبەریان پێ نەگا نابێ سەر کێوەکە جێ بێڵن‌و پشتی سوپا چۆڵ بکەن، لەپێشەوەی ئەوانەی دژی چۆڵکردنی سەنگەرەکان بوون، فەرماندەی تیر ئەندازەکان عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر بوو، بەڵام زۆرینەی تیر ئەندازەکان لەسەر راستی ئیجتیهادی خۆیان سوور بوون‌و لە کێوەکە دابەزین‌و کەوتنە تاڵان گرتن‌و کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ. دەی بابزانین ئاکامی ئەمە چی بوو؟!

بەڵێ ئەوەی رویدا پێچەوانە بوو: ئەو ترس و بیمەی لەوەپێش سواری دڵی موشریکەکان بوبوو، بوو بە ئازایەتی و پاڵەوانیەتی و ورە بەرزی. ئەوەبوو خالیدی کوڕی وەلید کە لەوکاتەدا سەرگەرمی هەڵاتن و خۆ رزگارکردن بوو سەیرێکی ئەملاو ئەوەلای خۆی کردو روانی شوێنی سەنگەری تیر ئەندازە موسوڵمانەکان چۆڵ بووە، بەبیری سەربازیانەی خۆی وای بەباش زانی لەودیو کێوەکەوە لەگەڵ ئەو موشریکانەی لەگەڵی بوون پەلاماری سەنگەری تیر ئەندازەکان بدەن و لەوێوە هێرش بێننەوە بۆ سەر موسوڵمانەکان. پلانەکەی خۆی ئەنجامدا، لەدواوە گەڕایەوە بۆسەر سەنگەری تیر ئەندازە موسوڵمانەکان و ئەوانەی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر مابوونەوە لەسەنگەرەکاندا ژمارەیان کەم بوو، نەیانتوانی بەرگری بکەن و پێش بە هێرشەکەی خالیدو هێزەکەی بگرن، تا هەموویان شەهید بوون شەڕیان کرد. کە هەموویان لەلایەن هێزەکەی خالید شەهیدبوون، ئیتر موسوڵمانەکان پشتیان لێ گیراو لەدواوە لەلایەن هێزەکەی خالیدە تیرە باران کران، ئیتر ئەمجار ترس و بیم سواری دڵ و دەروونی موسوڵمانەکان بوو ریزەکانیان شەپرزە بوون و لەهەموو لایەکەوە گەمارۆ دران. ئەم بەشەی جەنگەکە ئەوەیە: کە قورئان وێنای کردووە و دەفەرموێ: {حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ - آل عمران/١٥٢}.

دەی تۆ بڕوانە کاریگەری نەرێنی ئەم هەڵەیەی تیر ئەندازەکان چەند گەورە و گورچکبڕ بوو نەك بۆ خودی تیر ئەندازەکان و بەس بەڵکوو بۆ سوپای ئیسلام بەگشتی.

بەڵێ هەڵەی کۆمەڵێك جەنگاوەری موسوڵمان کارەسات و بەڵاو تێشکانی بەسەر هەموو سوپای ئیسلام هێنا. تەنانەت خودی

پێغەمبەریش ﷺ لەم بەڵایە پارێزراو نەبوو، ئەمە سوننەتی خودایە لە بونەوەردا، بەردەوام لە جەرەیاندایەو نەگۆڕە. تەنانەت بوونی پێغەمبەر لەناو ئەو سوپایەدا، پلەو پایەو ڕێزی لای خودا نەیتوانی تۆزقاڵێك لەو قانوونە خودایيە بگۆڕێ.

دە ئەمجار تۆ وردبەرەوە لە ڕێژەو ئەندازەی هەڵەی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە تیر ئەندازەو بەراوردی بکە بە هەڵەو تاوانە جۆراو جۆرەکانی موسوڵمانانی ئەمڕۆ، کە پەیوەندی هەیە بەهەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانی گشتی و تایبەتیمان. ئەمجار بۆ خۆت تەصەوری لوطف و ڕەحم و بەزەیی خودا بکە دەرحەق بە موسوڵمانانی ئەمڕۆ: کە بەهۆی کردەوە نا پەسەندەکانیان لەناویانا. کردەوەی ناپەسەندو تەمبەڵی کردن لە فەرمانکردن بەچاکەو نەیکردن لەخراپە بۆتە دیاردەیەکی گشتی و سەرتاسەری موسوڵمانان و جیهانی ئیسلامی.

جا ئەگەر تۆ بەوردی سەرنجی ئەوەبدەی ئیتر بەئاسانی وەڵامی ئەو پرسیارەت لەلا گەڵاڵە دەبێ، کە ئەمڕۆ هەندێ لە موسوڵمانان پرسیاردەکەن حیکمەت چییە وڵاتە ئیسلامییەکان و گەل و نەتەوە موسوڵمانەکان ئاوا هەمیشە باریان لارەو ژێر دەستەو یەخسیرو ژیانتاڵن، هەمیشە تێشکاون لە بەرامبەر دەوڵەتە ملهوڕەکانی جیهانەوە، هەرچەندە ئەوانە کافرو ئەمان موسوڵمانن!!!

هەشتەم: وەکوو ئاماژەمان پێکردو دیتمان پێغەمبەر ﷺ لەم غەزایەدا زۆری ئازارو زیان پێ گەیی، کەوت و سەری شکا و ددانی پێشەوەی شکا، خوێن لە ڕوخساری هاتە خوار، هەموو ئەمانەو زۆری تر بەشێك بوو لە ئاکام و نەتیجەی ئەو هەڵەیەی تیر ئەندازەکان کردیان، هەڵەی ئەو موسوڵمانانەی سەرپێچی فەرمان و ئامۆژگاریی سەرکردەکەیان کرد. ئەمجار حیکمەتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی

شەهیدبوونی پێغەمبەر ﷺ چی بوو؟ ئەم هەواڵە ناخۆش و زەندەقبەرە بۆ لەناو ریزەکانی موسوڵمانان‌دا بڵاوبووە؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: دەگوترێ: پەیوەندی موسوڵمانان بە پێغەمبەرەوەو بوونی لەناویاندا هێزو وزەیەکی وای هەبوو بە خەیاڵیاندا نەدەهات و تەصەورییان نەدەکرد لێیان جیابێتەوەو لەناویاندا نەمێنێ، بە خەیاڵیاندا نەدەهات بتوانن دوانەمانی پێغەمبەر ﷺ ژیان بەسەربەرن، بڵاوبوونەوەی هەواڵی شەهیدبوونی پێغەمبەر ﷺ شتێك بوو بە خەیاڵیاندا نەدەهات شتی وا رووبدا، واتە ئەوان بەتەواوی مانا، روداوی لەوجۆرەیان لەزەینی خۆیان سڕی بوەوە. گومانیش لەوەدا نییە هاوەڵان ئەگەر لەم جۆرە بێ ئاگاییەدا بە هەواڵێکی ئاوا بە ئاگا بهاتنایەوەو هەواڵەکە واقیع بویایە دڵیان شەقی دەبردو لە تاوان کیان و بونیان تێك دەڕوخاو بیرو باوەڕیان دەکەوتە حاڵەتی شپرزەییەوە. ئیمانیان لەدڵ و دەروونداتێك دەڕوخا.

بەشێك لەحیکمەتی خودا وای خواست: کە ئەم هەواڵە درۆیە لەو ساتە وەختە ناسکەدا بەناو ریزەکانی موسوڵماناندا بڵاوبێتەوە، وەکوو ئەزموون و تاقیکردنەوەیەك بۆیان. وەکوو وانەیەکی سەربازی و گەورەو کاریگەر، بۆئەوەی بەهۆی ئەم هەواڵە وەحشەت ئەثەرە بەئاگا بێنەوە، لەوساتە وەختەوە حەقیقەتێك بێننە پێش چاوی خۆیان و دڵ و دەروونی خۆیانی بۆ ئامادە بکەن و خۆیانی پێوە رابهێنن، بە ورەیەکی بەرزەوە بەرەو روی کارەساتی ئاوا ببنەوە، نەکەن ئەگەر رۆژێك هات پێغەمبەر لەناویاندا نەما، لە ئایین پاشگەز ببنەوە. بۆ ئەم مەبەستەو رونکردنەوەی ئەم دەرسە گەورە، ئایەتی قورئان نازڵ بوو وەکوو تەعلیق لەسەر ئەو حاڵەتەی تووشی زوربەی موسوڵمانەکان بوو لەساتە وەختی بیستنی هەواڵی شەهیدبوونی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: {وَمَا مُحَمَّدٌ

إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ - آل عمران/١٤٤}.

بێگومان کاریگەریی ئەرێنی ئەم وانە گەورەو بە تاقیکردنەوە دڵ داخورپێنە لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەردا دەرکەوت و خۆی نواند. ئەو شائیعەو هەواڵە درۆیەی ڕۆژی ئوحود بووە سەبەب نزولی ئەو ئایەتەی ئالی عیمران/١٤٤. ئەو ئایەتەی موسوڵمانانی هۆشیار کردەوەو سەرنجی ڕاکێشان بۆلای حەقیقەتێك کەپێش نازڵبوونی ئەو ئایەتە هاوەڵان لەو حەقیقەتە بێ ئاگابوون. ئەوەبوو کاتێك حەزرەتی ڕەسول لە دونیا دەرچوو موسوڵمانان بەدڵی پڕ لەخەمو خەفەتەوە ماڵئاوایی پێغەمبەریان قبوڵ کردو بەخاکیان سپارد، ئەمجار گەڕانەوە بۆ ئەو سپاردەی بۆی جێ هێشتبوون کە ئەمانەتی بانگەوازیو جیهادو تێکۆشانە لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگاردا. بەو پەڕی دڵسۆزیو لێهاتوویی و بڕوای پۆڵایینەوەو پشت بەستوو بەخودا ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێنا.

نۆیەم: بائێمە لەکارەساتی هەواڵی شەهیدبوون و لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ وردبینەوەو بزانین چ کاریگەریەکی توندو گورچکبڕی لەسەر هاوەڵانی هەبوو، چون هەژاندنی و شڵەژاندنی لە کاتێکدا ئەوان بەدەوریەوە بوون و جەستەی خۆیان بۆ کردبوو بە قەڵغان و هەر تیرو زەبرێکی لەلایەن دوژمنەوە بۆ ئاڕاستە دەکرا ئەمان خۆیان بەردێنا و بە جەستەو گیانی خۆیان پێغەمبەریان دەپاراست، یەك لەدوایەك لەدەوری پێغەمبەر گیانیان لەدەست داو شەهید بوون و بەرەو پیری مەرگ دەچوون و تەنیا ئاواتیان ساغ و سەلامەتی پێغەمبەر بوو هیچی تریان

بەلاوە گرنگ نەبوو! دەی پاڵنەر بۆ ئەم فیدارکارییە چی بوو؟ یان بڵێ: سەرچاوەی ئەم خۆبەختکردنە سەر سوڕهێنەرە چی بوو؟

بێگومان سەرچاوەو پاڵنەر بۆ ئەم خۆفیداکردنە یەکەم بڕوا بەخوداو بە پەیامی پێغەمبەر بوو، دووەم خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر بوو، ئەم دوو هۆکارە پێکەوە سەرچاوەی ئەو فیداکارییە سەر سوڕهێنەرە بوون، موسوڵمان هەمیشە پێویستی بەم دوو صیفەتە هەیەو دەبێ هەمیشە لەناخیدا گەشەبکەن و لە کردارو گوفتاری دا رەنگ بدەنەوە. هەڵبەتە بۆ موسوڵمان ئەوەندە بەس نیە ئیدیعای ئیمان بکاو لافی موسوڵمانێتی لێبدا هەتا دڵو دەروونی پڕنەبێ لە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خودا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ}«[١]».

رونکردنەوەی ئەم مانایە ئەوەیە دەڵێین: پەروەردگار لە مرۆڤدا عەقڵو دڵی بەدی هێناون، عەقڵی داوەتێ بۆئەوەی بەکاری بێنێ و بیری پێ بکاتەوە، بەهۆیەوە ئیمان بەوشتانە بێنێ کە واجبە ئیمانیان پێ بێنێ، دڵی پێ بەخشیوە بۆئەوەی بەکاری بێنێ لە خۆشویستنی ئەو شتانەی خودا فەرمانی پێ کردووە خۆشی بوێن، هەروا رق لێبوونی ئەو شتانەی خودا فەرمانی پێ کردووە ناخۆشی بوێن. جا ئەگەر دڵ بە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خوداو بەندە صاڵحەکانی مەشغوڵ نەبوو بەشتی حەرامو هەواو ئارەزۆ مەشغول دەبێ، هەرکاتێکیش دڵ پڕبوو لە خۆشەویستی شەهوەتو ئارەزۆ زۆر زەحمەتە بیرو باوەڕ بەتەنها خاوەنەکەی هەڵبنێ بۆ فیداکاریو خۆبەختکردن.

---

١ - متفق عليه.

ئەمە راستییەکەو بەڵگە نەویستە، حەقیقەتێکە زانایانی بواری پەروەردە سەلماندویانە، زانایانی ئەخلاق بڕوایان پێیەتی. تاقیکردنەوەو ئەزمون چەسپاندویانە. بڕوانە جاك ڕۆسۆ لەم بارەوە چی دەڵێ:!؟ ناوبراو لە کتێبەکەی دا بەناوی «أميل» دەڵێ:

زۆر گوتراوە دوبارە گوتراوەتەوە دەربارەی حەزکردن لە بەرجەستە کردنی فەضیلەو رەوشت بەرزی بەهۆی عەقڵەوە بەتەنها. بەتەنیا لەسەر بنەمای عەقڵ. ئای چ بنەمایەکی پتەوە! ئەمە چ بنەمایەکە؟! بێگومان فەضیلەو رەوشت بەرزیی «وەکوو دەڵێن» یاساو نیظامە.

بەڵام ئایا ئیمان بەیاساو نیظام دەتوانێ بەتەنها بەسەر لەززەتە خۆشییە تایبەتیەکاندا زاڵ ببێ؟! بێگومان ئەم بنەما مەزعومە جگە لەیاری کردن بە وشە بەولاوە هیچی ترنیە، چونکە لەهەمان کاتدا رەزیلەو رەوشت نزمیش خۆشویستنی یاساو نیظامێکە پێچەوانەی فەضیلەیە[١].

بەهۆی گرنگی ئەم حەقیقەتەوەیە: کە حکوومەتی ئەمریکا نەیتوانی پابەندی ئەو بڕیارە بێ کە بڕوای پێ بوو، دەشی زانی پابەندبوون پێیەوە چەند سودی هەیە، ئەوەبوو «ساڵی/١٩٣٣» حکومەتی ئەمەریکا قانوونێکی پەسەندکردو دەری کرد کە عەرەق یاساغەو نابێ لەهیچ نادیو کۆڕو کۆمەڵێکدا بخورێتەوە، پاش ماوەیەکی کورت بەسەر تەطبیق کردنیدا، یاسا دانەرەکان لە بڕیاری خۆیان پاشگەزبوونەوەو نەیانتوانی بێ خواردنەوەی مەی هەڵبەکەن قانوونەکەیان هەڵوەشاندەوە....

---

١ - بۆ رونکردنەوەی ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ کتێبی .تجربة التربية الاسلامية في ميزان البحث..

ئەمە بەراورد بکە لەگەڵ هەڵوێستی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ «کە لەوکاتەدا لەروی رۆشنبیری و شارەستانی و هەستکردن بەسودو زیانی عەرەق بە ئەمریکیەکانی ئەمڕۆ بەراورد ناکرێن» کە هەر بەبیستنی فەرمانی خودا بەوەی عەرەق خواردنەوە حەرامە، خێرا پەلاماری کوپە شەرابەکانیانداو رشتیانن، وەرگەڕانە سەر سینی و پەرداخ و قەدەحەکانی ئارەق خواردنەوە شکاندیانن و بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد دەیانگوت: «انتهینا یارب انتهینا» بڕای بڕای توخنی نەکەوتنەوە....

فەرق و جوداوازی نێوان دوو وێنەو نموونەکان ئەوەیە لێرەدا شتێك هەیە لە دڵدا جێگیربووەو هەواو ئارەزوەکان تابیع و شوێنکەوتەی فەرمانی خوداو حوکمی خودان. ئەم خۆشەویستییەیان بڵێ ئەو هەواو ئارەزوە دڵ و دەروونی هاوەڵانی داگیر کردبوو وای لە هاوەڵان کردبوو گەردنی خۆیان بخەنە بەر شمشێر بۆ پاراستنی گەردنی پێغەمبەر ﷺ. باوەشیان بە مردندا دەکردو دەستەملانی دەبوون لەپێناو پاراستنی گیانی پێغەمبەردا. ئای چەند مەشهەدی سەرنج راکێش لە غەزای ئوحوددا هەن کە کاریگەری ئەو خۆشەویستییە دەردەخەن و ئاماژە بەوەدەکەن کە خۆشەویستی دڵی ئەو هاوەڵانەی چۆن داپۆشیوە.

ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە دەڵێ: رۆژی غەزای ئوحود پێغەمبەر بەهاوەڵانی فەرموو: کێ دەتوانێ بگەڕێ و بزانێ ئاخۆ سەعدی کوڕی رەبیع چی بەسەر هاتووە؟ ئایا شەهیدبووە یان زیندووە؟ دەڵێ: پیاوێك لە ئەنصار وتی: من دەچم ئەوکارە دەکەم و بۆت سەیر دەکەم ئەی پێغەمبەری خوداو عەرزت دەکەم سەعد چی بەسەرهاتووە. کابرا رۆیی سەیری کرد وا سەعد بریندارەو لە گیانەلا دایەو بەحاڵ گیانی تێدا ماوە. کابرای ئەنصاری پێی گوت: ئەوە پێغەمبەر منی ناردووە بزانم

ئاخۆ چیت بەسەرهاتووە زیندوی یان مردوی، سەعد بەدەم برینی سەخت‌و دژواریەوە وتی: من لەریزی کوژراوانم‌و برینەکەم کاریگەرە، سلاوم بگەیەنە بە پێغەمبەرو پێی بڵێ: سەعدی کوڕی رەبیع عەرزت دەکا خودا پاداشی باشت بداتەوە لەسەر رێنمونی کردنی ئێمەو پلەو پایەت بەرزتر بکاتەوە بەباشترین شێوەی پاداش دانەوەی هەر پێغەمبەرێك لەسەر رێنمونی ئوممەتەکەی، ئەمجار سلاوی من بە گەلەکەشت بگەیەنەو پێیان بڵێ: سەعدی کوڕی رەبیع پێتان دەڵێ: رۆژی قیامەت هیچ عوزرو بیانوتان نیە ئەگەر یەکێکتان زیندوبێ‌و بهێڵن دوژمن زەفەر لە پێغەمبەر بێنن. کابرای ئەنصاری دەڵێ ئیتر من سەعدم بەجێ نەهێشت تا گیانی دەرچوو.

ئەو رۆژەی دڵ‌و دەروونی موسوڵمانان بەم جۆرە خۆشەویستییە پڕدەبێ، بەجۆرێك کەمێك واز لە شەهوەت‌و ئارەزۆی خۆیان دینن‌و ئەنانییەت وەلا دەنێن‌و بەسەریاندا زاڵ دەبن. دەڵێم: ئەو رۆژەی ئەم جۆرە خۆشەویستییە لەدڵی موسوڵماناندا پەیدا دەبێ، ئەوە بێگومان دەبنە خەڵکێکی تازەو سەرکەوتن لەناو چنگ‌و کەڵبەی مردن دەردێنن‌و بەسەر دوژمندا سەردەکەون. چەندێك کۆسپ‌و تەگەرە زۆرو هەمەجۆربن رایان دەدەن.

ئەگەر پرسیار بکرێ رێگا چارە چییە بۆ دەستەبەربوونی ئەم جۆرە خۆشەویستییە، دەڵێین: ئەوە بەرێگای زیکری زۆرو صەلاوەتدانی زۆر لەسەر پێغەمبەرو بیرکردنەوە لە نیعمەتە زۆرو جۆراو جۆرەکانی پەروەردگار بەسەرماندا. هەروا تێفکرین لەسیرەی پێغەمبەرو ئەخلاق‌و رەوشتی بەرزی. ئەمانە هەمووی دوای بەردەوامبوون لەسەر عیبادات‌و ترسان لەخوداو هەستکردن بەوەی هەمیشە خودا ئاگادارو خەبەردارە

بەسەر هەموو نهێنیی و ئاشکراییەکدا. ئەمجار بەینا و بەینێك بەخۆیدا بچیتەوەو موحاسەبەی خۆی بکا.

**دەیەم:** وەکوو ئاماژەمان پێکرد بەگوێرەی ریوایەتی بوخاری (خودای لێ رازی بێ)، پێغەمبەر فەرمانی کرد بەدفن کردنی شەهیدەکانی غەزای ئوحود بەبێ شتن و بەجەستەی خوێناوی و جلی خوێنینەوەو بەبێ ئەوەی نوێژیان لەسەر بکا دوو دوو خستنیە گۆڕێکەوە. زانایانی ئیسلام ئەم روداوو واقیعەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی لە گۆڕەپانی شەڕو جیهادا شەهید دەکرێ ناشۆرێ و نوێژیشی لەسەر ناکرێ و بە جەستەو پۆشاکی خوێناوییەوە دفن دەکرێ.

ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بەڕێگای تەواتور بەئێمە گەیشتوون ئەوە دەچەسپێنن کە پێغەمبەر نوێژی لەسەر شەهیدانی شەڕی ئوحود نەکردووە. ئەوەی: کە ریوایەتکراوە گوایە پێغەمبەر ﷺ دەکەس دەکەس نوێژی لەسەر کردوون لەگەڵ هەموو ئەو دە دەیانەدا حەزرەتی حەمزەیان لەگەڵ بووە تا لە ئاکامدا وای لێ هات حەمزە حەفتا نوێژی مردوی لەسەرکرا، ئەو حەدیثە زەعیف و هەڵەیەو لە راستییەوە دوورە"[١].

هەروا زانایان ئەم روداوەیان کردووە بە بەڵگە لەسەرئەوەی لەکاتی زەروری و پێویستیدا دروستە زیاد لە تەرمێك بخرێتە ناو گۆڕیکەوە. وەلێ لەکاتی ئاساییدا نابێ زیاد لە تەرمێك لە گۆڕێکدا دفن بکرێ.

**یانزەهەم:** ئەگەر ئێمە لەو هەڵوێست و بڕیارەی پێغەمبەر وردبینەوە، کە هەر لەگەڵ لە ئوحودەوە گەیشتەوە مەدینە بەبێ ئەوەی جەنگاوەرەکان ماندویان بحەسێتەوەو برینداەرکان برینەکەیان ساڕێژبێن یان بەباشی برینەکانیان تەداوی بکرێن یەکسەر بڕیاریدا بە

---

١ - بڕوانە: مغني المحتاج ٢٤٩/١.

هـاوەڵانی کـە لەمەدینـە دەربـچن و دووی موشـریکەکان بکـەون، وانـەی غـەزای ئوحودمـان بـۆ روون دەبێتـەوەو ئاکـامی ئـەرێنی و نـەرێنی ئـەو شـەڕەمان بۆ ئاشـکرا دەبـێ. ئـەوەشمان بۆ دەردەکـەوێ: کـە سـەرکەوتن لەگەڵ صەبرو پشو درێژیی دایە سەرکەوتن پەیوەستە بە پابەند بوون بە فەرمانی سەرکردەی صالح و هەوڵدان بۆ گەیشتن بـە مەبەست و ئامـانجی ئـاییـنی. بێگومـان ئێمـە بینیمـان پێغەمبـەر ﷺ هـەر لەگـەڵ بـانگی راهێشت بەناو مەدینـەدا بـۆ چوونە دەرەوە بـۆ غـەزاو راونـانی دوژمـن، هێندەی پێ نەچوو هەموو ئەوانەی دوێنێ لە خزمەتیدا بوون وێڕای ئـەم هەموو ماندویی و شەکەتی و برینداریـیـەیان، خڕبوونـەوەو ئامادە باشـی خۆیان راگەیانـد بۆ چوون بۆ غـەزاو بەدوکـەوتنی دوژمـن، بەبێ ئـەوەی یـەکێکیان خـۆ پاشـبداو لەماڵـەوە بمێنێتـەوە بـۆ حەسـانەوە یـان تیمارکردنی برینی، هەموویان کەوتنە خۆ بەدوا پێغەمبەرەوە بۆ روبەڕو بوونـەوەی موشـریکەکان کـە هێشتا نەشـەو تـەڕدەماخی سـەرکەوتنی دوێنێیـان لەسـەردا شـەپۆلی دەدا. ئـەمجارەیان هیـچیان تـەماعی دەستکەوت و تاڵانی یان مەبەستێکی تری دونیاییان لـە مێشکدا نـەبوو، تـەنیا چاوەڕوانی شـەهیدبوون یـان سـەرکەوتنیان دەکـرد لـە رێگـای خـودادا. بـە برینـداری و زەبـر لێـدراوی و ماندوییـەوە ملـی رێگایـان گرتەبەرو بەرەو دوژمن راجمین!!

ئاکامی ئـەم گیـان فیـدایی و خۆنەویستییە چی بـوو؟ بەڵێ نەشـوەی سەرکەوتن و لەزەتی بەمراز گەیشتن دڵی موشریکەکانی سەقامگیر نەکرد بۆئەوەی سەرکەوتنی خۆیان بەسەر موسوڵمانەکاندا بگەیەننـە کۆتـایی، کاریگـەری تێـشکان و ئـازاری برینـی زۆرو مانـدویی موسـوڵمانانیش نـەبووە کۆسـپ و لەمپـەڕو نـەهێڵێ پـێش بکـەون و سـەربکەون. ئـەم سەرکەوتنە چۆن دەستەبەر بوو؟

بێگومان ڕێگا بۆ ئەو سەرکەوتنە موعجیزەیەکی یەزدانی بوو، هاتە دی بۆئەوەی دەرس و ئامۆژگاری بەتەواوی لە موسوڵمانان بگەیەنێ. ئەوەبوو روعب و ترس کەوتە دڵی موشریکەکانەوە و وایان تەصەور کرد وەکوو «معبد» خۆی لەدوورەوە تارمایی لەشکری موسوڵمانانی بینیوە پێی ڕاگەیاندن: کە موحەممەدو هاوەڵانی ئەمجارە خۆیان سازداوە مردنیان هێناوەو دەیانەوێ لەناو ئێوەدا بڵاوی بکەنەوە — ئیتر بە پەلە پڕوزەو هەڵەداوان ڕوی خۆیان لەهاتن بۆسەر مەدینە وەرگێڕاو بەرەو مەککە تێیان تەقاندو ئاوڕیان لەهیچ نەدایەوە.

دەی ئەم ترس و لەرزینە چۆن چووە دڵی موشریکەکانەوە، خۆئەوان پێش چەند سەعاتێك شەوکەتی موسوڵمانەکانیان شکاندبوو، بە شمشێر تێیان کەوتبوون و زەبری گورچکبڕیان لێ دابوون؟ هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئیرادەی یەزدانی: کە حیکمەتی واداخواز بوو ئەم ڕوداوەیان بۆبکا بە دەرس و پەندی کاریگەر. لەیەك کاتدا هەردوو دیاردەی ئەرێنی و نەرێنی لەخۆ گرتبوون. لە کۆتاییدا بۆ تەواوکردنی دەرس و ئامۆژگارییەکە پەروەردگار ئەم ئایەتانەی نازڵ کردن، کە دەفەرموێ:

{الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ، الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللّهِ وَاللّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ – آل عمران/ ١٧٢ – ١٧٤}.

# رۆژی الرجیع، بیری مەعونة

## یەکەم: رۆژی «الرجیع» لەساڵی سێیەمی کۆچیدا:

شاندێکی هۆزی عوضەل‌و «ألقارة» هاتنە خزمەت پێغەمبەرو عەرزیان کرد: کە هەواڵی ئایینی ئیسلامیان پێ گەیشتووەو ئەوان پێویستیان بەکەسێك هەیە کاروباری ئایینیان فێربکا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆمەڵێکی لە هاوەڵان نارد لەناویاندا «مەرثەدی کوڕی ئەبو مەرثەدو خالیدی کوڕی «ألبکیر»و «عاصم»ی کوڕی ثابت‌و خوبەیبی کوڕی عەدی‌و زەیدی کوڕی «ألدثنة»و عەبدوڵڵای کوڕی طاریق»یان تێدابوون عاصیمی کوڕی ثابیتی کردە ئەمیریان.

بوخاری بەرِشتەی خۆی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: ئەم کۆمەڵە هاوەڵە رۆیشتن تاگەیشتنە نێوان عەسفان‌و مەککە. هەواڵی ئەمانەدرا بەهۆزێك لە هوذەیل کە پێیان دەگوترا: «بەنو لەحیان» نزیکەی سەد کەس لەم هۆزە شوێن پێیان هەڵگرتن‌و بەدوایاندا گەڕان تاچوونە مەنزڵێك: لەوێدا چەند دەنکە خورمایان بینی کە هاوەڵانی پێغەمبەر لە مەدینەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوو. ئیتر وتیان ئەم جۆرە خورمایە خورمای مەدینەیە، بەم جۆرە شوێن پێیان هەڵگرتن تا پێیان گەیشتن، عاصم‌و هاوەڵانی پەنایان بە «فەد فەد» برد ئیتر پیاوانی بەنو لەحیان دەوریاندان‌و داوایان لێ کردن خۆیان بەدەستەوە بدەن، وادەی شەرەف‌و بەڵێنی ئەوەیان دانێ ئەگەر خۆیان بەدەستەوە بدەن گیانیان پارێزراو دەبێ، عاصم وتی: من هەرگیز لەسەر وەعدو ذیمەی کافر دانابەزم‌و خۆم بەدەستەوە نادەم! خودایە هەواڵی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە، ئیتر شەڕیان کرد تا عاصم‌و شەش کەسی

تریان شەهید بون. خوبەیب و زەیدو پیاوێکی تریان «کەناوی عەبدوڵڵای کوڕی طاریق بوو» لەسەر شەرەف و وادەی گەمارۆ دەران خۆیان بەدەستەوەدا.

کە خۆیان بەدەستەوەدا ژێی کەوانەکانیان شل کردەوە بەو ژێیانە قۆڵبەستیان کردن «عەبدوڵڵای کوڕی طاریق پێی گوتن ئەمە سەرەتای پەیمان شکێنی و غەدر کردنتانە، رازی نەبوو لەگەڵیان بڕوا شەهیدیان کرد».

خوبەیب و زەیدیان لەگەڵ خۆیان برد بە قوڕەیشییەکانیان فرۆشتن. بەنو ئەلحاریث خوبەیبیان کڕی، لە غەزای بەدردا خوبەیب «ألحارث»ی کوشتبوو. جا خوبەیب بەدیلی لەناو خێڵی بەنولحاریثدا مایەوە تاهەموویان بڕیاریاندا بیکوژن، تەراشێکی لە ئافرەتێکی بەنولحاریث وەرگرت بۆئەوەی هەندێ بەرسمێڵ و مووی زیادەی جەستەی خۆی پێ لێ بکاتەوە.

ئافرەتەکە دەڵێ: منداڵێکی پچکۆلەم هەبوو لێی غافڵ بووم منداڵە چوو بوو بۆلای خوبەیب، ئەویش لەسەر رانی خۆی دایناوبوو کە بینیم ترسام زۆر ترسام بەتایبەتی کە خوبەیب چەقوە تیژەکە «موسەکەی» بەدەستەوە بوو: خوبەیب وتی: ئەوە دەترسی ئەم منالە بکوژم؟ نا مەترسە شتی واناکەم ئافرەتەکە دەڵێ: هەرگیز دیلی باشتر لە خوبەیبم نەدیوە، بەچاوی خۆم دیتم ترێی دەخوارد ئەوکاتە لەمەککەدا ئەو میوەیە دەست نەدەکەوت، کەلەبچەو زنجیریش کرابوو، ئەوە رزق و رۆژییەك بوو خودا پێی دابوو. بەڵێ پاشان خێڵی بەنولحاریث خوبەیبیان بردە دەرەوەی حەرەم بۆئەوەی لەوێ شەهیدی بکەن، کە بردیان داوای کرد مۆڵەتی بدەن دوو ركات نوێژبکا.

دوو رکات نوێژەکەی کرد، ئەمجار رووی کردە خەڵکەکە وتی: ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کەوا بزانن من لەمردن دەترسم نوێژی زیاترم دەکرد. خوبەیب یەکەم کەسە کە کردنی دوو رکات نوێژی پێش لەسێدارەدانی داهێناوە. ئەمجار ئەم شیعرانەی خوێندووە:

ولست أباكي حين أقتل مسلماً[1]
على أي شق كان في الله مصرعي
وذلك في ذات الإله وان يشأ
يبارك على أوصال شلو ممزع

واتە:

لەمەرگ سڵ ناکەم مردن یەکجارە
سەرم شۆڕ ناکەم بۆنەو خوێنخوارە
مادەم بۆ ئیسلام دەمەدەن لەم دارە
بەپێی خۆم دەچمە بەرپێی قەنارە

«نوری فارس»

ئیتر عوقبەی کوڕی ئەلحاریث شەهیدی کرد. ئەمجار قورەیش ناردیان پارچەیەك لە جەستەی «عاصم»یان بۆ ببڕن و بۆیان بنێرن بۆئەوەی دڵنیابن لێی کەئەو کوژراوە عاصمە چونکە «عاصم» لەرۆژی بەدردا یەکێکی لەسەرانی قورەیش کوشتبوو. پەروەردگار کۆمەڵێکی ژەنگە سوورەو زەردەواڵە لەسەر لاشەکەی خڕ کردنەوە دەوریاندا نێردراوی قورەیشییەکان هەرچی هەوڵیدا نەیتوانی لە تەرمەکەی نزیك بێتەوە[2].

---

١ في رواية .أبالي. بدل .أباكي..

٢ - صحيح البخارى ٤١/٥.

ئیمامی طەبەری لەم ریوایەتەی زیادکردووەو لە ئەبو کورەیبەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: جەعفەری کوڕی عەون لە ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیلەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییە لەباوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی پێغەمبەر ﷺ وەکوو جاسوس بەتەنیا ناردمی بۆناو قورەیش، چوم، فرسەتم هێنا بەدزییەوە چومەلای ئەو دارەی خوبەیبی پێوە شەتەك درابوو سەرکەوتم پەتی سێدارەی خوبەیبم شل کردەوە کەوتە سەر زەوی، تۆزێك لێی دوورکەوتمەوە، پاشان ئاوڕم لێ دایەوە هیچ لاشەیەکی خوبەیبم نەبینی وەکوو زەوی قوتی دابێ. هەتا ئێستا کەس نازانێ تەرمەکەی چی لێ هات!!

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: زەیدی کوڕی «الدثنة»، صەفوانی کوڕی ئومەییە کڕی، کە لەحەرەمی مەککە بردیانە دەرەوە بۆئەوەی بیکوژن، ئەبو سەفیان پێی وت بەخودات سوێند دەدەم ئەی زەید ئایا پێت خۆشبوو ئێستا موحەممەد لەشوێنی تۆ بوایەو لە گەردنمان بدایەو تۆ لەناو خاوو خێزانی خۆتدا بوایە؟ زەید وتی: سوێندم بەخودا من پێم خۆش نییە پێغەمبەر ﷺ لەشوێنی خۆی چقڵێکی تێرابچێ و من لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدا بوومایە. ئەبو سەفیان وتی: کەسم نەبینیوە هێندەی هاوەڵانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش بوێ[1].

## دووەم: روداوی بیری مەعونە «ساڵی چوارەمی کۆچی»:

عامیری کوڕی مالیك ناسراو بە نازناوی «ملاعب الأسنة» هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد ئیمان بێنێ بەڵام نە

---

١ - بڕوانە سیرەی ئیبنو هیشام ١٧٢/٢.

ئیمانی هێنا نە ناڕەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر ئیسلام. بەڵکوو وتی: ئەی موحەممەد ئەگەر کۆمەڵێك لە هاوەڵانت بنێری بۆلای دانیشتوانی نەجد بانگەوازییان بکەن بۆ ئیمان هێنان لام وایە بەپیر بانگەوازییەکەتەوە دێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەترسم دانیشتوانی نەجد شتێکیان بەسەر بێنن!! عامر وتی من پەنایان دەدەم، ئەتۆ بیاننێرە با بانگەوازییان بکەن بۆ ئیمان هێنان.

پێغەمبەر ﷺ حەفتا کەسی هەڵبژاردەی لە هاوەڵانی نارد. وەکوو ئیبنو ئیسحاق و ئیبنو کەثیر ریوایەتیان کردووە ئەم شاندە لەمانگی صەفەردا دوای چوار مانگ لەشەڕی ئوحود نێردران. ئەم کۆمەڵە هاوەڵە کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە بیری مەعونە. لەوێ لایانداو یەکێکیان کە ناوی «حرام بن ملحان» بوو ناردیان بۆلای عامیری کوڕی «ألطفیل»و نامەیەکی پێغەمبەری پێ بوو تەسلیم بە عامیری کرد، بەڵام عامیر سەیری نامەکەی نەکردو پەلاماری حەرامی کوڕی میلحانی داو شەهیدی کرد.

ئیمامی بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: «حەرامی کوڕی میلحان» کە بەریندار کراو خوێن لەدەمو چاوی جاری بوو هاواری کردو وتی: «فُزْت ورب الكعبة» واتە: «بەمراز گەیشتم بە خاوەنی کابە».

ئەمجار عامیری کوڕی «ألطفیل» هاواری کردە خەڵکەکە بۆئەوەی پەلاماری هاوەڵانی پێغەمبەر بدەن بەڵام خەڵکەکە وتیان: ئەوانە لەجیواری عامیری کوڕی مالیك دان ئێمە شکۆمەندی و رێزی ئەو ناپۆشینین. ئەمجار عامیری کوڕی «ألطفیل» دەنگی هۆزەکانی: «سولەیم» کە بریتی بوون لە «عوصەییەو روعەل و ذەکوان»ی دا داوای لێ کردن پەلاماری موسوڵمانە رەوانە کراوەکان بدەن، ئەم هۆزانە بەدەنگ

عامیری کوڕی «ألطفیل»ەوە هاتن و گەمارۆی هاوەڵانی پێغەمبەریان داو دەورەیان گرتن. کە موسوڵمانەکان ئەم پەلاماردان و گەمارۆدانەیان بینی تاویان دایە شمشێرەکانیان و شەڕیان کرد تا هەموویان شەهید بوون.

دووکەس لەم هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ ئامادەی ئەم شەڕە نەبوو بوون، یەکێکیان عەمری کوڕی ئومەییەی «ألضمری» بوو بەم روداوەیان نەزانیبوو ئەوانیش هاتنە مەیدان بۆ بەرگری لە هاوەڵانیان، هاوەڵەکەی شەهید بوو عەمر رزگاری بوو بەرەو مەدینە گەڕایەوە، لەڕێگا دوو پیاوی موشریکی بینین وایزانی لەهۆزی بەنی عامین هەردووکی کوشتن! پاشان کە گەیشتەوە مەدینەو چووە خزمەت پێغەمبەرو روداوەکانی بۆ گێڕانەوە دەرکەوت ئەو دوو پیاوەی عەمر لەرێگا کوشتبوونی لە هۆزی بەنی کیلاب بوون و پێغەمبەر جیواری پێدابوون. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو کەست کوشتووە دەبێ من خوێنەکەیان بدەم.

پێغەمبەر ﷺ بەشەهیدبوونی ئەم پۆلە هاوەڵە زۆر دڵگران بوو، ماوەی مانگێك لە نوێژی بەیانیدا قنوتی دەخویندو دوعای لە هۆزەکانی سولەیم دەکرد واتە: «رعل، زکوان، بنی لحیان، عصیّة».

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەم دوو روداوە گرنگ و کاریگەرو سەرنج راکێشە چەند دەلالاتێکی گرنگیان لەخۆ گرتوون. لەم چەند خاڵانەدا رایان دەنوێنین:

یەکەم: هەریەك لە روداوی «ألرجیع» و بیری مەعونە نیشانەی ئەوەن کە بەرپرسیاریەتی بانگەوازی بۆ ئیسلام و رێ نیشاندانی موسوڵمانان بە حەقیقەتی دەعوەو ئەحکامی دەعوە ئەرکی هەموو

موسوڵمانێکەو دەبێ هەرکەسە لە عاست خۆیەوە ئەنجامی بداو پێیەوە پابەندبێ. کەوابوو ئەرکی دەعوەو بانگەوازی تەنیا لە ئەستۆی ئەنبیاو رەسولەکان نیە، تەنها ئەرکی خولەفاو عولەما نیەو کەسانی دیکە لێی بەرپرسیار نەبن.

ئەتۆ دەبینیو هەست بەگرنگی بانگەوازی ئیسلامیو پێویستی دەکەی، هەست بەگرنگی دەعوەی ئیسلامی دەکەی لەمیانەی رەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو هەموو قورئان خوێنو قورئان لەبەرانەی ژمارەیان گەیشتۆتە حەفتا گەنج لە هەڵبژاردەی هاوەڵانی،کەهێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر شەهیدکردنی شەش هاوەڵی قورئان خوێنو قورئان لەبەردا تێنەپەڕی بوو: کە لەپێناو دەعوە کردندا شەهید بوو بوون...

بێگومان پێغەمبەر پێش ئەوەی بڕیاری رەوانەکردنی ئەو حەفتا هاوەڵە بدا هەستی بەوەکرد کە ئەمانە گیانیان دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەوەبوو کە عامیری کوڕی مالیك پێشنیارەکەی بۆکرد ئەو هەستی خۆی دەربڕیو فەرمووی: {انی أخشی علیهم أهل نجدا} بەڵام ئەو کاری بانگەوازی هێندە بەلاوە گرنگ بوو ئەو هەستو مەترسییەی بەلاوە ناو ئەو موغامەڕەیەی کردو پێی وابوو گرنگی بانگەوازیو دەعوەی ئیسلامی ئەوە دەهێنێ موغامەڕەی لەم جۆرەی بۆ بکرێو سەرەنجام چی دەبێ بابێو خودا چی لەچارەی ئەو شاندە نووسیبێ لەپێناو ئەو ئەرکە گرنگەدا بابێتە جێ!!

**دووەم:** ئێمە لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا وتمان دروست نییەو حەرامە موسوڵمان لە «دار الکفر»دا نیشتەجێ بێو بمێنێتەوە ئەگەر نەتوانێ بەئاشکرا ئەرکە ئاینییەکانی جێبەجێ بکا. خۆ ئەگەر رێگریی لێ نەدەکراو دەیتوانی بەئاشکرا ئەرکەکانی ئەنجامبدا ئەوکاتە مەکروهە

لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە. وەلێ ئەوەی ئەم مەشهەدەی سیرە دەیگەیەنێ ئەوەمان بۆ دەردەخا: کە مانەوەی موسوڵمان لە «دار الكفر»دا بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی بانگخوازی بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام، لەو حوکمەی پێشەوە چەرت «إستثناء» دەکرێ‌و دەبێتە واجیب‌و فەرزی کیفایە. چونکە چوونە ناو وڵاتی کوفرو مانەوە تێیدا بە مەبەستی بانگەوازی جۆرێکە لە جۆرەکانی جیهادو لە گەردنی هەموو موسوڵماندایە ئەگەر تاقمێك ئەنجامیان دا ئەرکەکە لەسەر ئەوانی تر لادەچێ. ئەگینا هەموویان بە نەکردنەکەی تاوانبار دەبن.

سێیەم: ئەگەر ئێمە بەچاو پیاخشانێك بەسەر روداوی «ألرجیع»و «بیری مەعونە»دا تێپەڕین‌و بەسەر پێیەکەوە سەیری ئەو بەڵگە ئاشکراو نمایانە بکەین: کە نیشانەی سەر ڕێژکردنی حیقدو کێنەیە لەدڵی موشریکەکاندا بەرامبەر بە موسوڵمانان، تا ئەو ئەندازەی ڕێگەیان بەخۆیاندا بەو شێوە غەدرو خیانەتە ئاگری رق‌و قینی خۆیان بە خوێنی ئەو موسوڵمانانە، بکوژێننەوە - دەڵێم: ئەگەر بەسەر ئەم مەشهەدە غەدرو خیانەت ئامێزەدا رابورین‌و هەڵوێستە لەسەر وێنەو دیمەنێکی رائیع‌و پێچەوانەی ئەو طەبیعەتە بکەین کەلای ئەو موسوڵمانانەی بوونەتە قوربانی خیانەت‌و غەدرەکە بەرجەستە بوو بوو، جوداوازییەکی نیوان کوفرو ئیمانت بۆ دەردەکەوێ: کە تابڵێی سەرنج راکیشە، ئەویش هەڵوێستی خوبەیبە ﷺ ئەوەبوو بینیمان حەزرەتی خوبەیب چۆن بە دیلگیراو لەماڵی بەنی «الحارث»دا بەندکراو چاوەڕوانی ساتە وەختی لەسێدارەدان بوو، چەقۆیەکی لە ماڵەکە وەرگرتبوو بۆئەوەی هەندێ مووی زیادەی جەستەی خۆی بتاشێ‌و خۆ بۆ مردن ئامادە بکا، لە ماڵەکەدا منداڵێکی تیدابوو بەهۆی بێ ئاگایی دایکی لێی، چوبووە لای خوبەیب. بێگومان ئەم ساتەوەختە لە حیسابی کەسێك کەمردن سەد

دەرسەد چاوەڕێی بکاو بیر لەتۆڵە سەندنەوە بکاتەوە هەلێکی زێڕینە بۆ موساوەمە یان غەدر کردن لە بەرامبەر غەدردا. بەبێ شك ئەوە حیساب و دیدو بۆچوونی هەموو بنەماڵەی بەنولحاریث بوو. کە دایکی منداڵەکە بەئاگا هاتەوەو زانی منداڵەکەی چووە بۆلای خوبەیب، بە هەڵەداوان رایکرد بچێ منداڵەکە لەچنگی مردنی موئەکەد رزگاربکا! بەڵام سەرسام ما کاتێك منداڵەکەی بینی لەباوەشی خوبەیبدایە، خوبەیب دای نیشاندووەو وەکوو باوکێکی دڵسۆز هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکا. خوبەیب تەماشای دایکی منداڵەکەی کرد دیتی ترس و پەشۆکاوی سەنتەری تێکداوە. پێی گوت: ئەوە دەترسی منداڵەکەت بکوژم! نانا مەترسە ئەمن کاری واناکەم. خوا یاربێ.

دەی تۆ بڕوانە موعجیزەی پەروەردەی ئیسلامی بۆ مرۆڤ خوبەیب کە ئەمە هەڵوێست و رەوشتیەتی، ئەو موشریکە دڵرەقانەی کە ئاوا بەغەدرو خیانەت خەڵکی بێ تاوان دەکوژن هەموویان عەرەبن و لە خاك و ئاوی وڵاتی عەرەبدا پەروەردە بوون، زادەی یەك نیشتمان و یەك نژادن. بەڵام خوبەیب موسوڵمان بووە، ئیسلام مرۆڤێکی تری لێ دەرهیناوە. ئەو موشریکانەش لەسەر کوفرو گومڕایی خۆیان ماونەوە کوفر سروشتی رەق و بێ ویژان کردوون و بوون بە دڕەندەو لەپێستی مرۆڤ چوونە دەر. ئای کاریگەری ئیسلام چەند گەورەیە لە سروشتی ئادەمیزاد دا؟ چۆن ئەو مرۆڤە تێك هەڵدەشێلێ و سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە؟.

**چوارەم:** ئەو حەقائیقانەی لەوەپێش رابورد دەتوانین بیانکەینە بەڵگە: کە ئەسیری موسوڵمان لەژێر دەستی کوفردا دەتوانێ داوای ئەمان نەکا. ئەمانی دوژمن رەت بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر سەربکێشێ بۆ لەدەستدانی گیانیشی، دەتوانێ سەری خۆیان بۆ نەوی نەکاو نەهێڵێ حوکمی کافری بەسەردا جاری ببێ. وەکوو ئەو هەڵوێستەی عاصم

نواندی. ئەگەر بیەوێ دەتوانێ پەیڕەوی روخصەت بکاو داوای ئەمان بکاو چاوەڕوانی فرسەت بکاو هەر هەلی بۆ هەڵبکەوێ خۆی رزگاربکا وەکوو ئەوەی خوبەیب و زەید کردیان.

بەڵام ئەگەر ئەسیر توانی هەڵبێ، ئەوە لەسەری پێویستە خۆی رزگار بکا، تەنانەت ئەگەر دەشیتوانی بە ئازادی ئەرکی ئایینی خۆی جێبەجێ بکات، چونکە ئەسیری موسوڵمان لەژێر دەسەڵاتی کوفردا بێ نرخ و بێ رێزە، کەوابێ پێویستە ئەو بێ نرخی و بێ رێزییە لەسەر خۆی لابەرێ«١».

پێنجەم: ئەگەر ئێمە لە وەڵامی زەیدی کوڕی «الدثنة» تێبفکرین کە وەڵامی ئەبو سەفیانی دایەوە پێش ساتە وەختێك لە شەهیدبوونی، دەزانین ئەندازەی ئەو خۆشەویستییەی دڵی هاوەڵان لەخۆی گرتبوو بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ چەند قوڵ و ڕەگ داکوتراو بوو، گومان لەوەدا نییە ئەو خۆشەویستیە گرنگترین هۆکارو پاڵنەر بوو کە خۆشەویستی مردنی لەناخدا چاندبوون. ئەو خۆشەویستیەی پێغەمبەر بوو لەدڵیاندا وای لێ کردبوون گیان و ماڵی خۆیان لەپێنا و ئایینی خودادا بەخت بکەن و بەرەو ڕووی مەرگ ببنەوە. موسوڵمان چەندێك ئیمانی پتەوبێ بەبێ هەبوونی ئەم خۆشەویستیە لە دڵدا ئیمانەکەی بە ناتەواو حسێب دەکرێ، ئەمە حەقیقەتێکە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی درکاندویەتی کە دەفەرموێ: {لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ}«٢». ئیمانی یەکێك لەئێوە تەواو نیە تاوای لێ نەیە من لای خۆشەویستتر بم لە باوکی لە منداڵی لەهەموو خەڵك بەگشتی.

---

١ - بڕوانە: نهایە المحتاج للرملی ٧٨/٨.

٢ - متفق علیە.

**شەشەم:** ئەوەی دەربارەی خوبەیب باسمان کرد لەوکاتەدا کە لەمەککەدا ئەسیر بوو لای قورەیشییەکان، نیشانەی ئەوەیە هەرچی بشێ ببێتە موعجیزە بۆ پێغەمبەر دەشێ ببێتە کەرامەت بۆ وەلی. لەگەڵ جوداوازییەکی بنەڕەتیو سەرەکی کە بریتییە لەوەی موعجیزەی پێغەمبەر تەحەددیو دەعوای «نبوة»ی لەگەڵە. وەلێ کەرامەتی ئەولیاو پیاوچاکان تەحەدای تێدا نیەو دەعوای «نبوة»ی لەگەڵ نیە. ئەمە رای جەماوەری ئەهلی سوننەو جەماعەتە. هیچ شتێك نابێتە بەڵگەی بەهێزترو چەسپێنەری ئەو بۆچوونەمان هێندەی ئەو صەبرو خۆگرییەی خوبەیبو شلوێ نەبوونیو بەهەند وەرنەگرتنی مەرگ پێش چەند ساتێکی شەهیدکردنی وەکوو لە بوخاریو ریوایەتی تردا ئامارژەی بۆ کراوە.

**حەوتەم:** وێدەچێ یەکێك پرسیاربکا حیکمەت لەوەدا چییە دەستی غەدرو ستەم بەسەر ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەدا زاڵ بوو ئاوا بەو شێوە نامرۆڤانە هەڵسو کەوتیان لەگەڵدا بکەن؟ خۆ ئەوانە بۆ رەزامەندی خوداو بە فەرمانی پێغەمبەر چوو بوون بۆ ئەو بانگەوازیو ئیسلام راگەیاندنە، بۆچی خودا پشتی نەگرتنو وای نەکرد ئەمان بەسەر کافرەکاندا سەرکەون!؟ وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە وەکوو زۆر جاری تریش وتومانە: پەروەردگار بەندەکانی خۆی تەکلیف کردووە بە عیبادەتو خودا پەرستی بۆ دەستەبەر بوونی دووشت: دروست کردنو پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی، هەوڵدان بۆ ئەو مەبەستە بەرێگای پڕ چورتمو نارەحەتی. حیکمەتیش لەوەدا چەسپاندنو دەستەبەر بوونی بەندایەتی ئادەمیزادە بۆ پەروەردگارو جودا کردنەوەی موسوڵمانی راست لە دوو رووی بەناو موسوڵمان. شەهیدبوونی هەندێ لە موسوڵمانە راستگۆکان بۆئەوەی بەکردەوەو واقیع مانای موبایەعەو

پەیمان بەستنی نێوان خوداو بەندەکانی بچێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، ئەو موبایەعەی قورئان ئاماژەی پێ کردووە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – التوبة/١١١}.

چ مانایەك دەمێنێتەوە بۆ واژۆکردنی ئەم قەباڵەو صەکی ئەو موبایەعە ئەگەر هەرچی لەناوەڕۆکیدایە وەهم و خەیاڵ بێ و نەیەتە بواری تەنفیزەوە؟ یان ئەم تەوقیع و واژۆکردنە چ نرخێکی هەیە تا خاوەنەکەی بەهەشتی دەست بکەوێ و ژیانی بەختەوەری هەتا هەتایی بۆ مەیسەربێ؟

موشکیلەکە لە بناغەا لەمێشکی ئەوانەدا دەسوڕێتەوە: کە زیاد لە ئەندازەی خۆی رێز بۆ ئەم ژیانی دونیایە دادەنێن، زیاد لەپێویست گرنگی بەدونیا دەدەن و لە بەرامبەردا گرنگی دانیان بە قیامەت کەمتر لەپێویست دەبێ.

ئەوەش نیشانەی بێ ئیمانی یان لاوازی ئیمانیانە لە دڵ و دەروونداا. نموونەی ئەم جۆرە کەسانە چاوەڕوانی ئەوەیان لێ ناکرێ گیان و ماڵیان بەخت بکەن.

وەلێ موسوڵمانی راستەقینە ئەو موشکیلەی هەر لەبنەڕەتا نیەو لەزەینیدا وێنای ناکا، ژیان و لەزەتی دونیا لەبیرو باوەڕی ئەودا زۆر لەوە کەمترە بتوانێ ببێتە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم پچوکترین طاعەتێك کە لەخودای نزیك بکاتەوە. گیان بەختکردن لە یەقین و بڕوای ئەوانەدا بەرەڵابوونە لە بەندیخانەی دونیا بۆ بەختەوەری ژیانی جاویدانی و

لەزەتو خۆشی بەهەشتی نەبڕاوە: کە ئاواتی هەموو موسوڵمانێکە بە درێژایی ژیانی دونیای.

ئەم هەستە بە باشترین شێوە لەو چەندە دێرە شیعرەی خوبەیبدا خۆیان دەنوێنن کە لەکاتی شەهیدکردنیدا گوتنی بەتایبەتی لەدوا دێڕدا شیعرەکەیدا: کە دەڵێ:

ولست بمُبْدٍ للعدو تَخَشُّعاً
ولا جزعاً، انی إلی الله مرجعی

## وەدەرنانی هۆزی «بني النضير»ی جولەکە

ئەمە رێکەوتی مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی چوارەمی کۆچی بووە.

ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ رۆژی شەممە لە مەدینە دەرچوو، لە مزگەوتی قوبا لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی «مهاجیرو ئەنصار» نوێژی بەجێ هێنا. ئەمجار هاتە لای جولەکەکانی هۆزی بەنو «النضیر» کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیاندا کە یارمەتی بدەن بۆ خوێنی ئەو دوو کەسەی هۆزی کیلاب: کە عەمری کوڕی ئومەییە «الضمری» کوشتنیو لەلایەن پێغەمبەرەوە عەهدی جیواریان هەبوو، لەنێوان بەنو «النضیر»و بەنی عامیردا پەیمانو سوێند خۆری هەبوو. جاوەکوو ئیبنو ئیسحاقو هی تریش ریوایەتیان کردووە دەڵێن: جولەکەکانی بەنو النضیر بە پێغەمبەریان گوت بەڵێ ئەی ئەبولقاسم تۆچی بڵێی ئێمە ئەوە دەکەین. لەلایەکی ترەوە هەندێکیان پیلانی ئەوەیان دارشت کە پێغەمبەر ﷺ لەناوبەرن، لەوکاتەدا کە پێغەمبەر لەبن دیوارێکدا لایان دانیشتبوو گفتو گۆی لەگەڵ دەکردن، هەندێکیان بەسرتە بەهەندێکیان گوت: جارێکی تر ئێمە موحەممەدمان ئاوا بۆ هەڵناکەوێتەوە، پیاوێکمان دەست بکەوتایە بچوایە سەر بان تاوێرە بەردێکی گەورەی

بەسەر پێغەمبەردا بدایە لە کۆڵی بکردینایەوە، عەمری کوڕی جەحاشی النضری، وتی: من دەچمە سەر دیوارەکەو گاشە بەردێکی بەسەردا دەدەم. ئیبنو ئیسحاق ئەمەشی زیادکردووە دەڵێ: سەلامی کوڕی مشکم «یەکێك بوو لە جولەکەی بەنو نەضیر» پێی گوتن: ئەوە مەکەن، چونکە موحەممەد هەواڵی ئەم پیلانەی دەدرێتێ و ئەمەش نیشانەی هەڵوەشاندنەوەی ئەم عەهدو پەیمانەیە لەنێوان ئێمەو موحەممەددا هەیە.

پەروەردگار بە نیگا پێغەمبەری لەو پیلانە ئاگادار کردەوە، پێش جێبەجێ کردنی پیلانەکە پێغەمبەر ﷺ بەگورجی لەو شوێنە هەڵساو گەڕایەوە بۆ مەدینە، هاوەڵانی دوایکەوتن، عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ واخێرا گۆزو گوممەت لەو شوێنە هەڵسای و ئێمە نەمانزانی؟ فەرمووی: جولەکەکان بەنیازی پیلانێکی غەدر ئامێز بوون، خودا هەواڵی دامێ و خێرا لەو شوێنە هەڵسام.

پاشان پێغەمبەر وەڵامی بۆناردن فەرمووی لە وڵاتی من بڕۆنە دەرێ و نامەوێ لەناو مەدینەدا جیرانی وەکوو ئێوەم هەبێ. دەرۆژ مۆڵەتتان بێ، دوای ئەو دەڕۆژە هەرکەسێ ببینم لەملی دەدەم.

ئیتر دەستیان کرد بەخۆ پێچانەوەو خۆئامادەکردن بۆ ڕەوکردن، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وەڵامی بۆناردن: کە لەشوێنی خۆتان مەجوڵێن و لە قەڵاو شورای خۆتاندا خۆتان قایم بکەن، من دوو هەزار کەسم لەگەڵدایە لەخزم و عەشیرەتی خۆم و کەسانی دیکە شەڕتان لەسەر دەکەم، ئیتر جولەکەکان لە خۆئامادەکردن بۆ دەرچوون لەمەدینە پەشیمان بوونەوەو لە قەڵاکانیاندا خۆیان قایم کرد. ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەهاوەڵانی دا بۆ خۆئامادەکردن بۆ شەڕکردن دژیان و هێرش بردن بۆسەریان.

پاشان پێغەمبەر ﷺ چوو بۆسەریان، جولەکەکان لە قەڵاو دژەکانی خۆیاندا دامەزرابوون، تیرو کەوانو بەردی قۆچەقاینیو شتی وایان لابوو، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ریسوای کردنو وادەو بەڵێنی پێدابوون بەجێی نەهێنا. پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی دانو فەرمانی کرد باخە خورماکانیان ببڕن وێرانیان بکەن، هاواریان لێ هەڵساو وتیان ئەی موحەممەد تۆ بۆ خۆت لەوەپێش نەهیت لە فەسادو وێرانکاری دەکردو رەخنەت لەوکەسانە دەگرت فەسادو ئاشوبیان بەرپا دەکرد، ئەدی ئێستا بۆچی بۆ خۆت ئەوکارە وێرانکارییە دەکەی؟ ئیتر ئایەتی: {مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ – الحشر/٥}.

ئیتر بەناچاری پێشنیاری ئەوەیان کرد کە لەمەدینە دەردەچن. بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر رازی نابم مەگەر بەسەڵتە خێزانی بڕۆنەدەرو رێگایان دەدەم یەکەی باری حوشترێك لەگەڵ خۆیان بەرن جگە لەچەك، بەهیچ جۆرێ نابێ چەك لەگەڵ خۆیان بەرن جولەکەکان بەناچاری بەم مەرجانە رازی بوونو هەریەکەیان باری حوشترێکی لە کاڵای خۆی بارکردو لە قەڵاو شورای خۆیان هاتنەدەر.

ئیبنو هیشام دەڵێ: ئیتر کابرای جولەکە بەدەستی خۆی ماڵی خۆی دەڕوخاندو دەرگاو پەنجەرەو شتی وای لە حوشترەکەی باردەکردو مەدینەی بەجێ دەهێشتو بەرەو وڵاتی شامو وڵاتی خەیبەر بڵاوەیان لێ کرد، تەنها دووکەسیان لێ موسوڵمان بوو «یامینی کوڕی عومەیری کوڕی کەعبو ئەبو سەعدی کوڕی وەهب ئەم دووانە ماڵو سامانیان پارێزراو بوو»[١].

---

١ - بڕوانە: ،طبقات ابن سعد، و ،سیرة ابن هشام، و ،تاریخ الطبری،و تەفسیری ،ابن کثیر، تەفسیری سورەتی الحشر.

پێغەمبەری ماڵو سامانی جولەکەکانی بەسەر موهاجیریندا تەوزیع کرد لەپێری ئەنصار تەنها بەشی دووکەسیدا، ئەویش لەبەرئەوەی ئەم دوانە زۆر هەژارو نەبوو بوون ئەوانیش «سەهلی کوڕی حەنیفو ئەبو دوجانە، سەماکی کوڕی خەرەشە» بوون.

ماڵو سامانی بەنو نەضیر تایبەت بوو بە پێغەمبەر ﷺ بەلاذەری لە کتێبی «فتوح البلدان»دا دەڵێ: لەژێر دارخورما باخەکانیاندا کشتو کاڵ دەکرا، سالانە لەو کشتو کاڵە قوتی ماڵو منداڵی دابین دەکرا، ئەوەی لەوە زیاددەبوو بۆ چەكو پێداویستی جەنگ خەرجی دەکرد. سوورەتی «الحشر» هەمووی دەربارەی دابەشکردنی ماڵو سامانی جێماوی جولەکەی بەنو نەضیر نازڵ بووەو پشتگیری ئەو جۆرە دابەشکردنەی کردووە، دەفەرموێ:

{وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَن يَشَاء وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ – الحشر/ ٦-٧}.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەمە وێنەو نموونەیەکی ترە لە طەبیعەتی غەدرو خیانەتی جولەکە. لەوەپێش دیمان جولەکەی بەنو قەینوقاع چ خیانەتو غەدرێکیان کرد: ئەمە حەقیقەتێکی مێژوویيە واقیع تەصدیقی کردووە نەك واقیعەیەك بەڵکوو وەقائیعی لە ئەژمار نەهاتوو. ئەوەیە نهێنی ئەو لەعنەتە خودایيەی ئاراستەیان کراوەو لە قورئاندا لەسەریان تۆمارکراوەو

دەفەرموێ: {لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ – المائدة/٧٨}.

ئەمجار لەم روداوەدا دەرس و پەندی سەرنج راکێش هەن دەلالاتی گرنگ و پەیوەندیدار بە ئەحکامی شەرعییەوەی لەخۆ گرتوون و ئاماژەیان بۆ کراوە، لێرەدا باسیان دەکەین.

یەکەم: ئەو هەواڵ و خەبەردانەی لەخوداوە هات بۆ پێغەمبەر ﷺ کەشفی پیلانی داڕێژراوی جولەکەی بەنو نەضیری کرد دانەیەکە لەو هەموو موعجیزەو خاریقانەی خودای مەزن ڕێزی پێ لە پێغەمبەر گرتووە پێش پێغەمبەرایەتی و لەکاتی پێغەمبەرایەتیشدا، ئەم موعجیزەیە دەبێ سەرنجمان رابکێشێ و هەڵمان بنێ بۆ زیاتر ئیمان هێنان بە پێغەمبەرایەتی و پەیامی حەزرەتی موحەممەد و دڵنیابوون لەوەی کە کەسایەتییە پێغەمبەریەتیەکەی حەزرەتی محمد بناغەو ئەساسی یەکەمە بۆ وجودو رەوشتە کەسایەتیەکانی تری.

هەندێ لە نووسەرو سیرە نووس و لێکۆڵەرەوە لە سیرەی پێغەمبەردا ئەم هەواڵ و خەبەردانەی خودا بە پێغەمبەریداو کەشفی نیازو پیلانی جولەکەی کرد «بە ئیلهام تەعبیریان لێ داوەتەوە. وشەی «ئیلهام» مەعنایەك دەگەیەنێ تایبەت نیە بە هەندێ کەسەوەو بەهەندێ کەسەوە نا. بەڵکوو هاوبەشە بۆ هەموو ئادەمیزاد. هەستی ئیلهام» لە ڕێگەی ئیشارات و قەرائینەوە هەستێکە سروشتییە تایبەت نیە بەهەندێ کەسەوەو بۆ هەندێ کەس نەبێ. کەوابێ وشەی «ألخبر الالهی»: کە هەندێ زانایانی سیرە بەکاریان هێناوە، دەلالەت دەکا لەسەر مانایەك کە نیشانەو تایبەتمەندی «نبوة»ە ئێمەش دەزانین کەهەر ئەم مانایەیە: کە پێغەمبەری وا لێکرد هەست بە پیلانی جولەکەکان بکا. ئەمە وەفای خودایە بەو وعدە کەداویەتی بە پێغەمبەری خۆی کە دەفەرموێ:

{وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ – المائدة/٦٧}.

جا کەوابێ ئەم لێڵییە لە تەعبیردا بۆچی و لەپای چی؟ بەچ نیازو مەبەستێك لەجیاتی وشەی «وحي» «ئیلهام» بەکاردێنێ. ئایا ئەمە جگە لە دیاردەی ئینکاریکردنی موعجیزە بەولاوە چی ترە؟ لەوەپێش ئەوەت زانی: کە سەرچاوەی ئینکاری کردنی موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ «دوای ئەوەی بە خەبەری موتەواتەر چەسپاون» جگە لەلاوازی ئیمان بەولاوە هیچی تر نییە. واتە: کابرا کە ئینکاری موعجیزاتی پێغەمبەر بکا مانای وایە بڕوای بە «نبوة»و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد نییە.

دووەم: بڕینی دارخورمای بەنو نەضیرو سوتاندنی باخ و باخاتیان روداوێکە واقیع بووەو چەسپاوەو کۆڕای مێژوو نووسانی لەسەرە، بڕیارەکە بڕیاری پێغەمبەر بوو، هەندێکی بڕین و وازی لێ هێنان. سەر لەبەر هەموو دارخورماکانیانی نەبڕین، دوایی ئایەتی قورئان نازڵ بوو بڕیارەکەی پێغەمبەری پەسەندکرد. چ بۆ بڕینەکەیان و چ بۆ نەبڕینی باقی مەندەیان. دەفەرموێ:

{مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ – الحشر/٥}.

لەسەر واقیعی ئەم روداوە زوربەی زانایانی ئیسلام بۆئەوە چوون: کە حوکمی شەرعی دەربارەی بڕینی درەختی بەرداری دوژمن وێرانکردنی باخ و باخاتیان بەستراوەتەوە بەرای ئیمام و سەر لەشکری سوپای ئیسلام ئەگەر بە پێویستی زانی دەتوانێ باخەکانیان وێران بکا یان دەتوانێ وازیان لێ بێنێ.

کەوابوو مەسەلەکە دەچێتە چوار چێوەی سیاسەی شەرعییەوە زانایان فەرموویانە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو تەصەروفەی کردی دەربارەی باخە خورماکانی بەنو نەضیر: کە هەندێکی لەدار خورماکان

بڕین و هەندێکیانی هێشتنەوە. مەبەستەکەی چەسپاندنی بەرژەوەندی و دۆزینەوەی ڕێگای ئەو بەرژەوەندییە بوو بۆئەوەی فەرمانڕەوایانی ئیسلام لێی فێربین و چاوی لێ بکەن لەدوای خۆی.

ئیمامی شافیعی بەم ڕوداوە پاساوی بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر هێناوەتەوە کاتێ خالیدی نارد بۆلای طولەیحەو بەنی تەمیم و فەرمانی پێکرد بە بڕین و سوتاندنی باخەکانیان. هەرچەند حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ خۆی کاتێ سوپاکەی ئیسلامی ڕەوانەکرد بۆ وڵاتی شام نەهی لێ کردن کە درەختی بەردار ببڕن و باخ و باخات بسوتێنن. شافیعی دەفەرموێ: لەوانەیە فەرمانی حەزرەتی ئەبوبەکر بەوەی درەختی بەردار نەبڕن لەبەرئەوە بووبێ لە پێغەمبەری بیستبێ کە وڵاتی شام بۆ موسوڵمانان فەتح دەکرێ و دەبێتە مەملەکەتی ئەوان. جا لەکاتێکدا بڕین و نەبڕین موباح بوون نەبڕینی پەسەندکرد بەهۆی لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی موسوڵمانان«١».

ئەمەی ئاماژەمان بۆکرد لەوەی هەرکاتێ بەرژەوەندی موسوڵمانان لەوەدا بوو درەخت و باخی کافر ببڕدرێن و بسوتێندرێن پەیڕەوی دەکرێ و کارێکی موباحە، ئەوە مەذهەبی نافیع «مولی ابن عمر» و مالیک و «الثوری» و ئەبو حەنیفە شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق و جەماوەری فوقەهایە، لە ئیمامی «اللیث»ی کوڕی سەعدو ئەبو ثەورو ئەوزاعی ڕیوایەتکراوە کە بڕینی درەخت و باخی موشریک دروست نییە«٢».

---

١ - الام للشافعی ٣٢٤/٧. هەروا بڕوانە: ضوابط المصلحة في الشريعة.

٢ - شرح مسلم للنووری ٥٠/١٢ — هەروا بڕوانە: ضوابط المصلحة في الشريعة الإسلامية،

سێیەم: زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەوەدا هەرچی موسوڵمانان لە دوژمنیان دەستیان بکەوێ بەبێ شەڕ کە پێی دەگوترێ: «الفيئ» ئیمام چۆنی بە مەصلەحەت زانی ئاوا دابەشی دەکا. واجب نیە لەسەری بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەشی بکا. واتە: حوکمی «فەیئو غەنیمەت» لێك جوداوازن. غەنیمەتو ماڵی دەست بەسەرگیراوی کافر بەهۆی شەڕو جەنگەوە بەشێکی دیاریکراوی بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش دەکرێ. بەڵام «فەیئ» واجب نیە بەشی جەنگاوەرانی لێ بدرێ، بەڵگەشیان ئەم سیاسەتەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەربارەی ماڵو سامانی جولەکەی بەنو نەضیر پەیڕەوی کرد. ئەوە بوو بەتایبەتی دابەشی کرد بەسەر موهاجیریندا، قورئانیش دوابەدوای ئەوە نازڵ بوو، تەصویبی سیاسەتەکەی کرد. لە سورەتی حەشردا ئایەتی «٦-٧» بخوێنەوە.

ئەمجار فوقەهای ئیسلام دەربارەی ئەو زەویو زارەی سوپای ئیسلام لەرێگای جەنگەوە داگیری دەکا، ئیمامی مالیك رای وایە: ئەو زەوییانە بەهیچ شێوەیەك دابەش ناکرێ بەڵکوو بەروبوومەکەی بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان خەرج دەکرێ، مەگەر ئیمامو فەرمانڕەوا بەرژەوەندی لەوەدا ببینێ کە بەسەر جەنگاوەراندا دابەشی بکا، ئەوکاتە دابەشی دەکا. ئیمامی ئەبو حەنیفەش رای نزیکە لەم رایە.

بەڵام ئیمامی شافیعی بۆئەوە چووە: کە زەوی بەهێزو جەنگ داگیرکراو پێویستە دابەش بکرێ وەکوو دابەشکردنی شتەکانی تری دەستکەوتی جەنگ، مەذهەبی ئیمام ئەحمەدیش هەر رای لەو جۆرەیە.

بەڵگەی شافیعی ئەوەیە: دەفەرموێ: تەصەروفی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ماڵو سامانی بەنو نەضیر بە پێچەوانەی یاسای دابەشکردنی دەستکەوت بەسەر جەنگاوەراندا هۆیەکەی ئەوەبوو هیچ شەڕێك روینەدا ببێتە هۆی پەیدابوونی ئەو سامانە، ئەو سامانە بەجەنگ دەست

نەکەوت، ئایەتەکەی قورئانیش: کە تەعلیلو پاساو بۆ حوکمەکە دێنێتەوە، رونەدانی جەنگو ماندو نەبوون دەکاتە پاساوی حوکمەکەو دەفەرموێ: {وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ – الحشر/٦}.

جا ئەگەر «مناط»و عیلەتو بایسی حوکمەکە ماندو نەبوونو رونەدانی جەنگ بێ بۆئەوەی دروست بێ زەوی «فەیئ» دابەش نەکرێ بەسەر جەنگاوەراندا، شتێکی ئاشکرایە هەرکاتێ عیلەتەکە نەما حوکمەکەش نامێنێ، حوکمە مەنصوصەکە دەربارەی دابەشکردنی دەستکەوت دێتەوە جێی خۆیو کاری پێ دەکرێ. جا دەستکەوتەکە زەویو زاربێ یان شتی تربێ.

بەڵگەی ئیمامی مالیكو ئەبو حەنیفە چەند شتێکن گرنگترینیان بڕیاری ئیمامی عومەرە ﷺ: کە رەشە خاکی عێراقی بەسەر جەنگاوەراندا دابەش نەکرد، بەڵکوو هەمووی وەقف کردو بڕیاریدا خەراجی لێ وەرگیرێو دابەش بکرێ بەسەر موسوڵماناندا لێرەدا هەر بواری ئەوەندە رونکردنەوە هەیەو بەس.

ئەوەی کە گرنگە لەم باسەدا ئاگامان لێی بێ ئەو تەعلیلو بایس هێنانەوەیە کە پەروەردگار لەو دوو ئایەتەی چۆنیەتی دابەشکردنی ماڵو سامانی دەست بەسەردا گیراوی بەنو نەضیر روون دەکاتەوە دەفەرموێ: {كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ }:

واتە: بڕیاری ئەو جۆرە دابەشکردنەمان دا بۆئەوەی ماڵو سامان تەنها لەناو چینی دەوڵەمەندەکانتاندا ئاڵو گۆڕی پێ نەکرێو بەس! بەڵکوو هەژارەکانیش دەستیان لێی گیرببێ.

تەعلیلو بایس هێنانەوە بەو ئاکامو سەرەنجامە ئاماژە بۆئەوە دەکا: کە سیاسەتی شەریعەتی ئیسلامی لەبواری ماڵو ساماندا

بەگشتی و تێکڕایی لەسەر چەسپاندنی ئەم بنەمایە سەرچاوەی گرتووە. هەر باس و خواسێکی لەکتێبە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی نووسراوەو شیکراوەتەوە لە ئەحکامی پەیوەست بەبوارە جیاجیاکانی ئابوری و ماڵ و سامان مەبەست لێی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی عەدالەت تێدا پەیڕەویکراوە، بەجۆرێك چینەکانی کۆمەڵ لەڕوی ئابورییەوە لێك نزیك بن و جوداوازی چینایەتییان تێدا رەنگ نەداتەوە. هۆکاری پەیدابوونی چینایەتی و جوداوازی ئابورییان تێدا قەڵاچۆ بکرێ و نەهێڵدرێ کۆمەڵگا دابەش ببێ بۆ چینی دەوڵەمەندو دەرەبەگ و چینی هەژارو نەبوو: کە عەدالەت لە تەوزیعی دابەشکردنی ثەروەت و ساماندا تێیدا بەرزو نزمی زۆری تێدابێ. ئەگەر ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی و نیظام و یاسای تایبەتی بەبواری ماڵ و سامان تەطبیق بکرایە، پرۆژەی زەکات زیندو بکرایەوە، دیاردەی ریبا و دیاردەی ئیحتیکارو پەزمەندە کردنی سامانی ناڕەوا قەڵاچۆ بکرانایە، خەڵك لە ژیانێکی خۆش و گوزەرانی باشدا دەبوون، دەوڵەمەندی و هەژاری هەردەبێ، ئەوە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و یاسای مولکییەی خاصەیەو سروشتییە، بەڵام دەبێ تەوازونێك هەبێ و کۆمەڵگا تێکڕا هەموویان موکتەفی بن و هەندێکیان نەبنە کۆڵ و بارگرانی بەسەر هەندێکیانەوە، یاسای رەئسمالییان تێدا زەق نەبێتەوە.

گرنگ ئەوەیە تۆ بزانی: کە پەروەردگار بۆیە حیکمەتی شەریعەتی خۆی بۆ دونیا وادناوە: کە کۆمەڵگایەکی لەوجۆرە دابمەزرێ و بەرجەستە ببێ هۆکارو ئەسبابی بۆ داناوەو فەرمانی پێکردوین ئەو هۆکارو ئەسبابانە بەرچاو بگرین و پەیڕەویان بکەین و لێیان دەرنەچین. واتە: پەروەردگار پەیڕەوکردنی وەسیلەو غایەی لەسەر پێویست کردوین و هەردوکی بە عیبادەت بۆ داناوین. کەوابێ ناگونجێ و نابێ

بگوترێ: غایەو مەبەست لە ئیسلام پێکهێنانی کۆمەڵگەی عەدالەت تێدا پەیڕەوکراوە ئێمە بەویستی خۆمان رێبازو هۆکارو وەسیلە بۆ ئەو غایەو ئامانجە دیاری بکەین و پەیڕەویان بکەین، بەڵکوو ئەمە دەرچوونە لە پەیڕەوکردنی غایەو وەسیلە بەیەکەوەو سەرپێچی فەرمانی پەروەردگارو شەریعەتیەتی.

هەرگیز ئەو غایەو ئامانجەی خودا فەرمانی پێکردووین بەدەستی بێنین بەبێ گرتنەبەری ئەو وەسیلەو هۆکارو ئەسبابانەی داینا‌ون بۆمان بۆ گەیشتن بەو غایەو ئامانجە – دەستەبەر نابێ. مێژوو روداو باشترین بەڵگەو نیشانەن لەسەر ئەو راستییەی ئامارەمان پێکرد. ئێستا زۆر شیاوە بۆ تۆ جارێکی تر سەر لەبەری سورەتی «الحشر» بخوێنێتەوە، لە رونکردنەوەو بەیانی یەزدانی وردبیتەوە، دەربارەی ئەو روداوەی کە بریتی بوو لە دابەشکردنی ماڵ و سامانی جولەکەی بەنو نەضیرو تەعامول کردن لەگەڵ جولەکەو دووڕوو، هەروا سیاسەتی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ماڵ و سامان و شتی تریش. ئەم سورەتە لە سەرچاوە گرنگەکانە کە دەتواندرێ لێیەوە بەسەر وانەو پەندی ئەم چیرۆکەدا ئاگاداربین.

## غەزای ذاتوریقاع

ساڵی چوارەمی کۆچی، دوای تێپەڕبوونی مانگ و نیوێك بەسەر دەرکردنی جولەکەی بەنو نەضیردا ئەم غەزایە بەرپابوو، زوربەی زانایانی سیرەو مەغازی ئەم کاتەیان دیاری کردووە، بەلام بوخاری و بڕێ لەزانایانی فەرمووده دەڵێن: ئەم غەزایە دوای غەزای خەیبەر بووە.

سەبەب و هۆکاری ئەم غەزایە ئەو غەدرو خیانەتەیە کە هۆزەکانی وڵاتی نەجد ئەنجامیاندا، ئەو غەدرو خیانەتەی لە بەناحەق

شەهیدکردنی ئەو حەفتا قورئان خوێنەبوو: کە پێغەمبەر ﷺ ناردبوونی بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەو دەڤەرە. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە بە سوپایەکەوە دەرچوو بە مەبەستی دەست وەشاندن و شەڕکردن لەگەڵ هۆزی موحاریب و بەنو ثەعلەب. ئەبو ذەڕی غەففاری کردە بەرپرسیار بەسەر مەدینەوە. پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێکی وڵاتی نەجد لەزەوی غەطەفان کە پێی دەگوترێ: «نخل» لەشکری بەزی کرد. پەروەردگار ترس و دڵەڕاوکێی خستە ناو دڵی ئەو هۆزانەو نەیانتوانی روبەڕوی سوپای ئیسلام ببنەوە.

ئیبنو هیشام دەڵێ: ئەو هۆزانە ژمارەیان زۆر بوو لەشکرێکی بێ شماریان کۆکردبوەوە، بەڵام هیچ روبەڕوو بوونەوەیان نەکردو زوو پەرتەوازە بوون و هیچ شەڕو لێکدان روی نەدا.

وەلێ لە چیرۆکی ئەم غەزایەدا چەند مەشهەدێك هەن شیاوی ئەوەن هەڵوێستەیان لەسەر بکرێ و وانەو پەندیان لێ وەربگیرێ دەی با چیرۆکەکە دابەش بکەین بۆ چەند مەشهەدێك.

یەکەم: لە صەحیحەین دا فەرموودەیەك لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: لەگەل پێغەمبەردا ﷺ لە غەزایەکدا هاوبەشیمان کرد، ئێمە شەش کەس بووین، تەنها یەك حوشترمان پێ بوو بەنۆرە سواری دەبووین. بەهۆی ئەوەی زۆر بە پیادە دەڕۆیشتین قاچمان تووشی بلۆق و برین بوون، قاچی من بلۆق و برینی زۆریان لێ پەیدابوو نینۆکم دەرهاتن، پێڵاو خوفمان شڕو وڕ بوون پەڕۆو پێتاڵمان لە قاچمانەوە دەپێچا. بۆیە ئەو غەزایە ناونراوە غەزای «ذات الرقاع» ئەبو موسا ئەم حەیثەی باسکرد. بەڵام دوایی پێی ناخۆش بوو بڵاوبێتەوە، وەکوو ئەوە بڵێی پێی ناخۆش بوو ئەم کردەوەو ماندوبوونەی لەڕێگای خوادا باسبکرێ.

**دووەم**: بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە: کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای «ذات الرقاع»دا نوێژی ترسی بە هاوەڵان کرد، کۆمەڵێکی لە هاوەڵان لەگەڵ خۆیدا نوێژی پێ دابەستن، کۆمەڵێکیشیانی لەبەرامبەر دوژمن دامەزراندن، ئەوانەی لەگەڵ خۆیدا نوێژیان دابەستبوو رکاتێکی بە جەماعەت پێ کردن پاشان بۆ خۆی لەرکاتی دووەمدا بەپێوە مایەوەو ئەوانە لەدواوەی بوون نوێژی خۆیان تەواوکردو چوون بەرەو روی دوژمن دامەزران ئەمجار کۆمەڵەکەی تر هاتن لەدواوەی نوێژیان دابەست لەگەڵ ئەواندا رکاتی دووەمی تەواوکرد، ئەمجار لە تەحیاتدا دانیشتن تا ئەوان رکاتی دووەمیان تەواوکردو هاتنە تەحیات خوێندنو ئەمجار بەیەکەوە لەگەڵ وەجبەی دووەم سەلامی دایەوە«١».

**سێیەم**: بوخاری دووبارە ریوایەتی کردووە دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای «ذات الرقاع» گەڕایەوە هاوەڵان لەگەڵیدا گەڕانەوە پێش نیوەڕۆیەك «واتە: کاتی قەیلولـة» گەیشتنە شیوێك زۆری درەختی عیضا لێ بوو، پێغەمبەر ﷺ بۆ پشودانو ئیستیراحەت لایداو هاوەڵانیش لەخزمەتیا، هەر یەکەیان چووە ژێر درەختێك بۆ نوستنو ماندو حەسانەوە، پێغەمبەر ﷺ چووە ژێر درەختێکی «سَمُرة»و شمشێرەکەی بەدرەختەکەدا هەڵواسی، جابیر دەڵێ: تۆزێك نووستین،

---

١ - رواه البخاري في ٥٣/٥ باب غزوة ذات الرقاع، رواه مسلم في ٢١٤/٢ باب صلاة الخوف، فروى بعد ذلك عن جابر أنه نودي بالصلاة فصلى بطائفة ركعتين ثم تأخروا وصلى بالطائفة الأخرى. ركعتين، قال: فكانت لرسول الله -صلى الله عليه وسلم- أربع ركعات وللقوم ركعتين. قلت وجه التوفيق بين الحديثين انه عليه الصلاة والسلام -صلى الله عليه وسلم- بأصحابه صلاة الخوف اكثر من مرة، فصلاها مرة على النحو الأول وصلاها مرة أخرى. على النحو الثاني وحديث مسلم يدل على أن المسافر يجوز له أن يتم الرباعية ويقصدها وهو مذهب الشافعي ومالك واحمد، فلافاً للحنفية.

هێندەی پێ نەچوو پێغەمبەر ﷺ بانگی لێ کردین، هاتینە خزمەتی بینیمان کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لە خزمەت دانیشتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم کابرایە لەوکاتەدا کە خەوم لێ کەوتبوو شمشێرەکەمی لە درەختەکە کردبووەوەو لەکالان دەری کێشابوو بەروتی بەدەستیەوە گرتبوو، کە بەخەبەر هاتم پێی گوتم: کێ ئەمڕۆ تۆ لەچنگی من رزگار دەکا؟ منیش پێم گوت: خودا ئیتر شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە، ئەوەتا ئێستا لەلام دانیشتووە. پاشان پێغەمبەر ﷺ هیچی لێ نەکرد«١».

چوارەم: ئیبنو ئیسحاق و ئەحمەد لە جابیرەوە ﷺ دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ غەزای «ذات الرقاع» ئافرەتێکی بێ بڕوا کوژرا. کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە مێردی ئافرەتە کوژراوەکە لە سەفەرێکی خۆی گەڕابووەوە سوێندی خواردبوو دەبێ خوێنی هاوەڵانی پێغەمبەر بڕێژێ و تۆڵەی ژنەکەی بکاتەوە. تاوی دابووە چەك و دوا شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ کەوتبوو بۆئەوەی هەلی بۆ هەڵبکەوێ و تۆڵەی ژنەکەی بستێنێ. پێغەمبەر ﷺ لەشوێنێك دابەزیبوو بۆ پشوودان و ماندوو حەسانەوە فەرمووی: چ پیاوێك ئەمشەو پارێزگاریمان دەکا؟ جابیر دەڵێ: پیاوێکی موهاجیرو پیاوێکی ئەنصاری وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە ئەمشەو دەبینە حەرەس و پارێزگارت. فەرمووی: باشە ئێوە لەدەم شیوەکە حەراسەتمان بکەن، پێغەمبەرو هاوەڵانی لەناو شیوەکەدا لەشکر بەزییان کردبوو.

کە دوو پیاوە حەرەسەکە چووبوونە دەم شیوەکە کابرای ئەنصاری بە هاوڕێ موهاجیرەکەی وت: تۆ کام بەشەی شەوت پێخۆشە حەرەس بی؟ سەرەتای شەو یان کۆتاییەکەی؟ وتی: تۆ نیوەی یەکەمی شەوەکە

---

١ - صحیح البخاری ٥٢/٥ و ٥٣ و ٥٤.

حەرەسی بکە من بەشی دووەمی. کابرای موهاجیر لێی راکشاو کابرای ئەنصاری دەستی کرد بەنوێژ. جابیر دەڵێ: کابرای ژن کوژراو لەدەم شیوەکە نزیك بووە، کابرای ئەنصاری بینی، زانی ئەوە حەرەسە، حەرەسی پێغەمبەرو هاوەڵانە، تیرێکی پێوەناو تێی هەڵچەقی، خێرا تیرەکەی دەرهێناو بەردەوام لەسەر نوێژی خۆی بە پێوە مایەوە، کابرای ژن کوژراو تیرێکی تری ئاراستە کردو هەنگاوتی، دووبارە تیرەکەی لە جەستەی خۆی دەرهێناو بەردەوام بوو لەسەر نوێژی خۆی. کابرا تیری سێیەمی ئاراستە کردو هەنگاوتی، سێبارە کابرای ئەنصاری تیرەکەی لە جەستەی خۆی دەرهێناو پاشان چووە روکوعو سوجدە، ئەمجار هاوەڵەکەی لەخەو هەڵسانو پێی وت هەڵسە، کابرای موهاجیری راپەڕی کابرای ژن کوژراو بینینی، زانی کە پێی زاندراوە، ترسی لێ نیشتو هەڵات، کابرای موهاجیر کەبینی هاوەڵە ئەنصارییەکەی غەڵتانی خوێن بووەو خوێن لەجەستەی رەوان دەبێ، وتی: سوبحان الله، ئەوە بۆ لەگەڵ یەکەمجار تیری پێوەنای بێدارت نەکردمەوە؟ وتی: سورەتێکم دەخوێند پێم ناخۆش بوو واز لەخوێندنی بێنم، جا کەهەر بەردەوام بوو لەسەر تیر تێگرتنم چومە رکوعو تۆم ئاگادار کردەوە. سوێندم بەخودا ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە سەنگەرێکم بەفیڕۆ دەدا کە پێغەمبەر فەرمانی پێ کردبووم بە پاراستنی قیڕوسیام لەگیانی خۆم دەکردو نوێژەکەم نەدەبڕی!!

پێنجەم: بوخاریو موسلیمو ئیبنو سەعد لە طەبەقاتەکەیداو ئیبنو هیشام لە سیرەکەیدا ریوایەتیان کردووە لە جابیرەوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ غەزای «ذات الرقاع» دەرچووم بەسواری حوشترێکی لاواز. کە پێغەمبەر گەڕایەوە، هاوەڵان خێرا دەڕۆیشتنو من دوادەکەوتم، پێغەمبەر ﷺ پێم گەیی فەرمووی: ئەوەچیتە جابیر؟ وتم: ئەی

پێغەمبەری خودا! چی بکەم وشترەکەم لاوازەو ناڕوا، فەرمووی: پیخی بدە پیخم دا، پێغەمبەریش حوشترەکەی خۆی پیخدا. دوایی فەرمووی: دادەی ئەو عەصایەم بدەرێ، عەصایەکەم دایە دەستی و چەند دار عەصایەکی تێوە ژەنی، ئەمجار فەرمووی: دەی سوارییە، سواری بوومو کەوتینەڕێ، سوێندم بەخوا حوشترەکەم پێشبڕکێی لەگەڵ حوشترەکەی پێغەمبەر دەکرد.

جابیر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: حوشترەکەتم پێ نافرۆشی؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵکوو ئامادەم پێت ببەخشم. فەرمووی: نەخەیر پێم بفرۆشە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بڵێ: چەندم دەدەیتێ؟ فەرمووی: بە دیرهەمێك لێت دەکڕم. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بە دیرهەمێك زەرەرمە، فەرمووی: دوو دیرهەمت دەدەمێ، وتم: نەخەیر زەرەرمە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ نرخەکەی بەرزکردەوە تاکردی بە ئۆقیەیەك. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! رازیم بە ئۆقیەیەك بتدەمێ؟ فەرمووی: بەڵێ ئۆقیەیەکی پێ دەدەم عەرزمکرد: باشە ئەوا پێم فرۆشتی، ئەویش فەرمووی: ئەوا قبوڵم کرد. ئەمجار فەرمووی: ئەرێ جابیر ئەتۆ ژنت هێناوە؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! ژنم هێناوە، فەرمووی: بێوەژنت هێناوە یان کچ؟ وتم: قوربان! بێوەژنم مارەکردووە. فەرمووی: باشە بۆچی کچت مارە نەکردووە یاری لەگەڵ بکەی و یاریت لەگەڵ بکا؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو حەوت کچی لەپاش بەجێما، ئەو ئافرەتە بێوەژنەم مارەکرد بۆ ئەوەی بەدونیا دیدەیی خۆی سەروکاری خوشکەکانم بۆبکا، بەڕاستی زۆر باش ئەو ئەرکەی بەجێ هێنا. فەرمووی: باشت کردووە دەستی خۆت وەشاندووە، خوا حەزبکا سەرکەوتووی. فەرمووی: ئێمە ئەگەر هاتینە «صەرار» لەوێ ماینەوە

حوشترێکمان بۆ سەربېڕی، بالیف و سەرین و سەر راخەری باش ڕێزبکەی. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بالیف و سەرینمان نییە فەرمووی: ئینشائەڵلا دەبێ.

جابیر دەڵێ: جا کەهاتینە «صەرار» پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد حوشترێك سەربڕدرا، ئەو ڕۆژە لەوێ ماینەوە کە ئێوارە داهات پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە ئێمە هاتینەوە بۆ مەدینە.

ئەمجار جابیر دەڵێ: بەیانی هەوساری حوشترەکەم ڕاکێشا بردم لەبەردەم ماڵی پێغەمبەر ییخمدا، ئەمجار چووم لەمزگەوت لەنزیك ئەو شوێنەی حوشترەکەم لێ ییخدابوو دانیشتم، هێندەی پێ نەچوو پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە حوشترەکەی بینی، فەرمووی: ئەم حوشترە چیە؟ هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە حوشترەکەی جابیرە پێش تاوێك هێنای لێرە ییخی دا. فەرمووی: ئەی جابیر کوا؟ ئیتر بانگیان کردم بۆلای، فەرمووی: برازای خۆم حوشترەکەت بەرەوە، دامەوە بەخۆت. بانگی هیلالی کرد وتی جابیر بەرە ئوقیە زیوەکەی بدەرێ، لەگەڵی ڕۆیشتم ئۆقیەکەی دامێ و شتێکیشی بۆ زیادکردم. سوێندم بەخودا ئەو پارەیە لام مایەوەو زیادی کردو کاریگەری لەسەر ژیانی ماڵی ئێمە مایەوە»[١].

## پەندو ئامۆژگاری:

لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەم غەزایە:

زانایانی بواری غەزەوات و سیرە «وەکوو لەپێشەوە ئامارەمان بۆکرد» لەسەر ئەوە کۆکن: کە غەزای «ذات الرقاع» لەپێش غەزای

---

١ - سیاق القصة بهذه اللفظ لابن اسحاق كما رواه ابن هشام في السيرة وهي في البخارى ومسلم قريب منه.

خەیبەردا بووە. دوایی زوربەیان ئەوەیان بەلاوە راستە: کە رێکەوتی دوای غەزای بەنو نەضیری کردووەو لەساڵی چوارەمی کۆچیدا رویداوە. هەندێکیان وەکوو ئیبنو سەعدو ئیبنو حیبان پێیان وایە لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە.

وەلێ ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا ئەوەی چەسپاندووە: کە غەزای «ذات الرقاع» دوای خەیبەر بووە، بەلام لە تەرتیبی زنجیرەی ناو کتێبەکەیدا پێش غەزای خەیبەری خستووە!... ئیبنو حەجەری عەسقەلانی تەرجیحی لایەکەی بوخاری داوەو بەڵگەی بۆ هیناوەتەوە بەوە: کە نوێژی ترس «صلاة الخوف» لە غەزای «ذات الرقاع»دا تەشریع کراوە. کەچی پێغەمبەر لەغەزای خەندەقدا نوێژی ترسی نەکرد، دوایی بەقەزا گێڕایەوە. هەروەکوو بەڵگەی بەو ریوایەتە هێناوەتەوە کە لە صەحیحەیندا لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەت کراوە: کە باسی ئەوەدەکا چۆن قاچیان بلۆقی کردبوو پێلاویان دڕابوون‌و پەڕۆو پێتاڵیان تێوە پێچاون‌و بۆیە ناویان نا غەزای «ذات الرقاع»، دەی ئەبو موسای ئەشعەری لە وڵاتی حەبەشە بوو دوای غەزای خەیبەر گەڕاوەتەوە. لەمەوە ئیبنو لقەیم ئیشکالێکی لا دروست بووە، وتوویەتی بەپێی ئەم بەڵگانە، دەبێ غەزای «ذات الرقاع» دوای غەزای خەندەق رووی دابێ«١».

دەڵێم: بەڵکوو وادیارە غەزای «ذات الرقاع» پێش غەزای خەندەق بووبێ، چونکە لە حەدیثی صەحیحدا چەسپاوە جابیر ﷺ لە غەزای خەندەقدا داوای لە پێغەمبەر کرد کە ببێتە میوانی، کاتێك بینی پێغەمبەر ﷺ زۆری برسییە هەواڵی بە ژنەکەیدا بەو حاڵەی پێغەمبەر ﷺ لە ریوایەتەکەدا هاتووە، چۆن پێغەمبەر بانگی هاوەڵانی کرد بۆ ماڵی جابیر بۆسەر ئەو خواردنە، ئەوەشی تێدایە کە تەشریفی بەخێزانی

---

١ - بڕوانە: فتح الباری ٢٩٤/٧ وعیون الاثر ٥٣/٢ و ذاد المعاد ١١١/٢.

جابیری فەرموو: «كلی هذا واهدی فان الناس أصابتهم مجاعة» ئەمە ئەوە دەگەیەنێ پێغەمبەر ﷺ خێزانی جابیری ناسیوەو فەرمانی پێكردووەو ئاخاوتنی لەگەڵدا كردووە.

لەلایەكی ترەوە لە صەحیحەیندا چەسپاوە كە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای «ذات الرقاع»دا پرسیاری لە جابیر كرد ئایا ژنت هێناوە؟ ئەویش وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا!، وەكوو لەپێشەوە بەدرێژی باسی كرا. واتە لە غەزای «ذات الرقاع»دا هێشتا پێغەمبەر نەیزانیبوو ئاخۆ جابیر ژنی هێناوە یان نا. دەئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە غەزای «ذات الرقاع» لەپێش غەزای «الأحزاب»یش بووە چ جای غەزای خەیبەر. كەسیشم نەبینیوە پشتی بەوە بەستبێ و گوتبێتی غەزای ئەحزاب دوا غەزای «ذات الرقاع» كەوتووە.

ئەوەی ئیبنو حەجەر كردویەتی بە بەڵگەو دەڵێ: ئەگەر غەزای ئەحزاب «خەندەق» لەدوا غەزای «ذات الرقاع» بووایە نەدەبوو پێغەمبەر نوێژی ترس «صلاة الخوف» بەجێ نەهێنێ. ئەوە بوو لە غەزای «الأحزاب»ا نوێژی ترسی نەكرد بەڵكوو دوایی نوێژەكەی بەقەزا گێڕایەوە ئەمە مانای وایە غەزای ئەحزاب پێش غەزای «ذات الرقاع» بووە. وەڵامی ئیبنو حەجەر دەدرێتەوە بەوە: كە دەگونجێ هۆی دواكەوتنی كردنی نوێژ لە غەزای ئەحزاب بەردەوام بوونی تیرەباران بوو لەنێوان موشریكەكان و موسوڵمانەكاندا بەجۆرێك بواری ئەوە نەبووبێ بیر لە ئەنجامدانی نوێژ بكەنەوە. یان دەگونجێ لەو شەڕەدا دوژمن لەروی قیبلەوە بووبێ. ئەو نوێژی ترسەی لە غەزای «ذات الرقاع»دا كرا دوژمن لەغەیری لای قیبلەوە بوو.

یان پێغەمبەر ﷺ بۆیە لەغەزای ئەحزابدا نوێژەكەی دواخست بە مەبەستی تەشریع كردنی گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو بەهەر هۆیەكەوە فەوتابێ.

یان وەڵامی بەڵگەکەی ئیبنو حەجەر بە حەدیثی ئەبو موسای ئەشعەری بەوە دەدرێتەوە «وەکوو زۆرێك لە عولەمای مەغازیو سییەر فورموویانە» ئەبو مووسای ئەشعەری مەبەستی بە «ذات الرقاع» غەزایەکی ترە بەهەمان ناو، بە بەڵگە ئەوە: ئەبو موسا دەربارەی ئەو غەزایە فەرموویەتی ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا دەرچووین بۆ غەزا شەش کەس بووین یەك حوشترمان پێ بوو بەنۆرە سواری دەبووین...

غەزای «ذات الرقاع»ی ئێمە باسی لێوە دەکەین موسوڵمانەکان ژمارەیان زۆر لەوە زیاتر بوو.

بێگومان ئیبنو حەجەر هەوڵی داوە رەدی ئەم بۆچوونە بداتەوە، بەڵام لەواقیعدا پێویست بەدرێژەدان ناکا لەو بوارەدا.

بەتایبەتی کە بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر رای زانایانی مەغازیو سییەر چەسپاوە یەکێك لەو بەڵگانە حەدیثەکەی جابیرە لەهەردوو غەزاکاندا کە لێیەوە ریوایەتکراون ئێمە ئاماژەمان پێکرد.

لەوە بەولاوەش لەباسی غەزای خەندەقدا بەدورو درێژی هۆکاری دواخستنی پێغەمبەر ﷺ بۆ کردنی نوێژ لە غەزای خەندەقداو ئەو مەسەلانەی پەیوەستن پێوەی دەخەینە بەرباسو لێکۆڵینەوە.

ئەمجار ماوەتەوە ئەوە بڵێین: لەم غەزایەدا واتە: «ذات الرقاع» موسوڵمانان لەگەڵ هیچ کەسێکی موشریك تووشی شەڕو پێکدادان نەبوون. وەکوو لەوەپێش بەکورتی ئامارەی بۆکرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەش چەند دیمەنێکی تێدایە کە دەلالاتی گرنگیان لەخۆ گرتووەو پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکرێو لێیان ورد ببینەوە. ئێمە پێنج دیمەنمان لێ رانواندون کە پوختەی روداوەکانی لەخۆ گرتووە. با یەکە بەیەکە باسیان بکەین:

یەکەم: لەو فەرموودەیەدا کە شەیخان لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەربارەی ناونانی ئەم غەزایە بە غەزای «ذات الرقاع» ریوایەتیان کردووە وێنەیەکی ئاشکراو نمایانە بۆ دەرخستنی ئەو هەموو ئەزیەتو ماندوبوونەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەپێناو بڵاوکردنەوەی پەیامی خودادا تەحەممولیان کردووەو تێکۆشاون بۆئەوەی ئەو پەیامە پیرۆزە بگەیەنن. لەوەپێش باسی ئەوەم کرد: کە هاوەڵانی پێغەمبەر هەژارو نەدارا بوون تەنانەت وڵاغی سوارییان دەست نەدەکەوت لەرێگا سواری بنو کەلو پەلی خۆیانی لێ باربکەن لەکاتی چونیان بۆ غەزا. بەشەش کەس یان بە حەوت حوشترێکیان هەبوو بەنۆرە سواری دەبوون. ئەو رێگا دورو درێژەیان بەو جۆرە دەبڕی. وەلێ هەژاریو نەداری هەرگیز نەبونە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم ئەنجامدانی گەیاندنی پەیامی ئیسلامو بڵاوکردنەوەی لەپێناو بڵاوکردنەوەی پەیامی خوداو بانگەوازی بۆ رێبازی خودا، هەموو نارەحەتیو ناخۆشییەکیان تەحەممول کردووەو ئامادەی قبوڵکردنی هەموو ئاکام نەتیجەیەك بوون.

لەبەر زۆر رۆیشتن قاچیان بلۆقیان کردو هاوسان، هێندە بەسەر دڕكو دارو بەردا رۆییشتن هەموو قاچیان شەقار شەقار بوون، ئەوەندە لەبەردو دار هەڵەنگوتن نینۆکیان دەرهاتنو هەڵوەرین، قاچیان روتو قووت بوون هیچیان دەست نەکەوت قاچیانی پێ بپارێزن جگە لە پەڕۆو پێتاڵ کە لەقاچی خۆیان هاڵاند!... لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵیان نەداو لەرێگای خۆیان نەگەڕاونەوە. هەموو شتێکیان لەئاست بەجێ هێنانی فەرمانی خودا بەلاوە هیچو پووچ بووە، لە بەرامبەر ئەو بەرپرسیاریەتەی خودا خستبویە ئەستۆیانەوە سڵیان لەهیچ نەدەکردەوە هەموو کۆسپو تەگەرەیەکیان رادەدا.

پڕاوپڕ ئایەتی: {إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ} تیاندا ڕەنگی داوەتەوە.

پاشان تۆ زانیت ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ کەباسی چۆنیەتی بارودۆخی خۆیانی کرد، کەچۆن قاچیان بلۆقیان کردووەو پەڕۆیان تێهاڵاندون یەکسەر لەم هەواڵدانە پەشیمان بۆوە پێی ناخۆش بوو ئەم قسەیەی لەدەم دەرچوو، بۆیە لەم هەواڵدانە پەشیمان بۆوە، چونکە ئەو بەخەیاڵی خۆی شتێکی درکاندوە کە لەپێناو ڕەزامەندی خودادا کردۆیەتی ئەجرو پاداشی لەخودا ویستووەو نەدەبوو باسی بکا. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە «وەکوو ئیمامی نەوەوی دەڵێ» واباشە موسوڵمان کاری باشی بشارێتەوەو ماندوبوونو ئەرکو تێکۆشانی خۆی لەپێناو ئایینی خودادا لای خەڵك باس نەکا مەگەر بەرژەوەندی تێدا بەدی بکرێ، وەکوو بەیانکردنی حوکمی شەرعی ئەو شتەو هەڵنانی خەڵك بۆ پەیڕەوی کردنی. ئەوەی لە هەندێ لە سەلەفی صالح ریوایەتکراوە کە باسی کردەوەی چاکی خۆیانیان کردووە ئەو نیازو مەبەستەیان بۆ بەرچاو دەگیرێ«١».

**دووەم**: ئەو شێوەیەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی پێ لەگەڵ هاوەڵانیدا کرد لەم غەزایەدا، بووەتە ئەساسو بنەما بۆ مەشروعیەتی نوێژی ترسو چۆنیەتی بەجێهێنانی.

نوێژی ترس بەدوو شێوە ئەنجام دەدرێ: شێوەیەکیان تایبەتە بەو حاڵەی: کە دوژمن لەلای قیبلەوە بێ. شێوەی دووەم تایبەتە بە حاڵەتێکەوە دوژمن لە غەیری لای قیبلەوە بێ. شێوەی حاڵەتی دووەم بوو کە پێغەمبەر نوێژی ترسی پێ بەهاوەڵانی کرد لە غەزای «ذات الرقاع»دا. ئەوەبوو کاتی نوێژ هات، کۆمەڵو تاقمی دوژمن لەچەند

---

١ - بڕوانە: نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ١٢/١٩٧ – ١٩٨.

لایەکەوە لە دەوری سوپای ئیسلام سەنگەریان گرتبوو، ترسی ئەوە هەبوو چاوەڕوانی غافڵبوونی موسوڵمانەکان بکەن‌و هەلی ئەوەیان بۆ بڕەخسێ موسوڵمانەکان بەهۆی مەشغوڵبونیان بە نوێژەوە پشت لەدوژمن بکەن‌و ئاگایان لێ نەبێ هەڵبکوتنە سەریان‌و بە شمشێر تێیان بکەون.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانەکانی کردن بەدوو تاقم لەگەڵ تاقمێکیاندا نوێژی دابەست، تاقمی دووەم چاودێری جم‌وجوڵی دوژمنیان دەکرد هەتا تاقمی یەکەم لەگەڵ پێغەمبەردا بە جەماعەت گەییشتنە نیوەی نوێژەکەیان، واتە: رکاتێکیان تەواوکرد، ئەمجار بۆخۆیان بەخێرایی رکاتی دووەمی نوێژەکەیان ئەنجامداو سەلامیان دایەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای رکاتی دووەم چاوەڕوانی ئەوەی کرد تاقمی یەکەم نوێژەکەیان تەواوبکەن‌و تاقمی دووەم بێن لەدوایەوە نوێژ دابەستن، تاقمی یەکەم بۆ خۆیان نوێژەکەیان تەواوکردو رۆیشتن بۆ بەرامبەر دوژمن‌و تاقمی دووەم هاتن لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژیان دابەست، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ رکاتی یەکەمی ئەواندا رکاتی دووەمی نوێژی خۆی تەواوکرد ئەمجار لە تەحیاتدا چاوەڕوانی کردن تا ئەوان رکاتی دووەمیان تەواوکردو هاتنە سەر تەحیات خوێندن‌و ئەمجار دوای تەحیات خوێندن لەگەڵ پێغەمبەردا سڵاوی نوێژیان دایەوە.

ئەوەی کە داخوازی ئەم شێوە بەجێهێنانەی نوێژەکە بوو «هەرچەندە دەتواندرا بەدوو جەماعەت ئەنجامی بدەن» دوو شت بوو، دوو هۆکار بوو:

یەکەم: بۆئەوەی هەموویان شەرەفی نوێژکردنیان بە جەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە بەنسیب بێ. ئەمە فەضیلەت‌و بەرەکەتێکە تا بگونجێ وازی لێ ناهێندرێ.

**دووەم:** ئەوەیە یەکیەتی کۆمەڵی موسوڵمانانە هەتا بکرێ پارێزگاری بکرێ. دابەشبوونی موسوڵمانان بۆ چەند جەماعەتو تاقم بەمەبەستی ئەنجامدانی فەریضەیەك لە فەرائیض بەبێ هەبوونی عوزرێك باش نییە. یان بڵێین مەکروهە.

فوقەهای حەنەفی مەذهەب تەنیا هۆکاری یەکەمیان بەرچاو گرتووە، بۆیە فەرموویانە لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ مەشروعییەتی نوێژی ترس بەو شێوە نەماوەو بەو شێوە ئەدا ناکرێ.

**سێیەم:** چیرۆکی ئەو کابرا موشریکەی توانی لەوکاتەدا: کە پێغەمبەر ﷺ لەژێر سێبەری درەختەکەدا نوستبوو شمشێری پێغەمبەر بەدەستەوە بگرێ .... هتد.

چیرۆکێکە صەحیحو چەسپاوە، ئەم چیرۆکە ئەوەمان بۆ دەردەخا تا چ ئەندازەیەك حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ لەژێر چاودێری خودادا بووەو چۆن خودا لەدەستی هەموو دوژمنێك پاراستویەتی. ئەمجار چیرۆکەکە زێدە یەقینمان پێ دەبەخشێ بەو موعجیزەو خەواریقانەی کە خودا بۆ پێغەمبەری دەستەبەر کردون. کەزیاتر تیشك دەخەنە سەر کەسایەتی پێغەمبەرو پتر بڕوای ئێمە بە پێغەمبەرێتی ئەو زاتە قوڵ دەکەنەوە، بێگومان شتێکی سروشتی بوو بۆ کابرای موشریك کەدەستی گەیشتبووە شمشێرەکەو پێغەمبەریش لەشیرین خەودایە شمشێرەکە بماڵێ بە شوێنی کاریگەری پێغەمبەرو شەهیدی بکا. بەڵام کابرا ئەوەی نەکرد. ئەمجار تۆ دەبینی کابرا چەند بەخۆی شاییەو چەند بەخۆی دەنازێ کاتێ دەبینێ شمشێری پێغەمبەری بەدەستەوە گرتووەو فرسەتی لێ هێناوەو بە لوتبەرزیو بڕوا بەخۆبوونەوە بە پێغەمبەر دەڵێ: {من يمنعك مني} جاکێ ئێستا تۆ لەدەستی من رزگار دەکا؟ دەی چی بوو بەلەمپەڕ لەبەردەم کابراداو بۆی نەکرا پێغەمبەر ﷺ شەهید بکا؟

ئەوەی رووی‌دا لە مەزندەو حیسابی کابرای موشریکدا نەبوو: کە بریتی بوو لە چاودێری‌و پارێزگاری خودا بۆ پێغەمبەری خۆی. ئەوەبوو عینایەت‌و پارێزگاری خودا وای کرد دڵی کابرای موشریك پڕببێ لە ترس‌و شمشێری لەدەست بکەوێتە خوارو ئەمجار بە دەسە وەسانی‌و سەر شۆڕی لەبەردەم پێغەمبەردا بە کەماڵی ئەدەبەوە دابنیشێ‌و چاوەڕوان بێ پێغەمبەر چ بڕیارێك دەردەکا دەربارەی.!!!

گرنگترین شت کە پێویست بێ لەم روداوە ئێمە بیزانین ئەوەیە کەوادەی خودا بۆ پێغەمبەری خۆی: کە دەفەرموێ:

{وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ – المائدة/٦٧}.

راستەو گومانی تێدا نییە. ئەمجار پێویستە ئەوەش بزانین: کە مەبەست بە پارێزگاری کردنی خودا بۆ پێغەمبەری خۆی ئەوە نییە: کە پێغەمبەر تووشی هیچ ناخۆشی‌و چورتم‌و ئەزیەتێك نەبێ، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: کەخودا لەچنگی ئەوانە دەیپارێزێ کە دەیانەوێ ئیغتیالی بکەن پێش تەواوکردنی گەیاندنی پەیامەکەی تیرۆری بکەن‌و شەهیدی بکەن‌و بەمەش بانگەوازی ئیسلامی لەناوبەرن‌و نەهێڵن بەئاکام بگا.

**چوارەم:** ئەوەی لەچیرۆکی جابیری کوڕی عەبدوڵلا باسکرا ئەو وت‌و وێژەی لەنێوان ئەوو پێغەمبەردا لەکاتی گەڕانەوەیاندا بۆ مەدینە رویدا، هەرچەندە پەیوەندی بە غەزایەکەوە نیە، بەڵام وێنەیەکی زۆر وردو تەواومان نیشان دەدا دەربارەی رەوشتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی. بۆمان دەردەخا چەند رەوشت بەرزو خۆش مەشرەب‌و قسە خۆش بووە لەکاتی ئاخاوتن‌و گفت‌و گۆدا. تا چ ئەندازەیەك هاوەڵانی خۆش ویستون.

ئەتۆ ئەگەر بەباشی لەو چیرۆکە وردبێتەوە: کە لەوەپێش گێڕامانەوە بۆت دەردەکەوێ، پێغەمبەر ﷺ موتەئەثیر بوو بەو میحنەتو ناخۆشییەی یەخەی ماڵی جابیری گرت کاتێ باوکی لەغەزای ئوحوددا شەهید بوو ماڵو منداڵێکی زۆری لەپاش بەجێماو جابیر کە کوڕە گەورەی بوو ئەرکی بەخێوکردنیان و سەرپەرشتیانی لەئەستۆ گرتو بە ژیانێکی کولە مەرگیو هەژاری بەخێوی کردن.

دەڵێی پێغەمبەر ﷺ هەستی بەوەکرد: کە دواکەوتنی جابیر لە خەڵکەکە بەهۆی لاوازی حوشترەکەیەوە بوو، هەر ئەو حوشترەشی هەبوو: کە نیشانەی هەژاری ئەو بوو. «عادەتی پێغەمبەر وابوو ئەگەر لەگەڵ هاوەڵانیدا سەفەری بکردایە تاوە ناتاوێك بەسەری دەکردنەوە زوو زوو لە وەزعو حاڵیانی دەکۆڵیەوە» ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ کەمێك خۆی دواخست بۆئەوەی هەلێك بقۆزێتەوەو بکەوێتە گەڵ جابیرو هەواڵی بپرسێو بەو ئوسلوبە نەرمو نیانە لەو ڕێگایەدا کەهەر دوو بەدوو بوونو سێیەمیان لەگەڵ نەبوو پێشنیاری ئەوەی کرد حوشترەکەی لێ بکڕێ، ئەوەشی کرد بەبیانوو بۆئەوەی یارمەتی بداو ڕێزی بگرێو کەمێك ئەرکی قورسایی سەرشانی لەسەر سووك بکا. ئەمجار پرسیاری ژنو وەزعی خێزانی لێ کردو بەو ئوسلوبە ناسكو جوانە. ئەمجار مێردی تازە زاوا دڵنیا دەکا لەوەی کەنزیك مەدینە بوونەوە، چەند سەعاتێك پشوو دەدەن هەتا دانیشتوانی مەدینە هەواڵی گەیشتنەوەیان ببیستنو ژنی جابیریش ئەو هەواڵە بزانێو دەستێك بەخۆیدا بێنێو ماڵو حاڵی خۆی بۆ مێردی لەسەفەر گەڕاوەی ڕێك بخاو ماڵ بەراخەرو پشتی برازێنێتەوە، جابیر لەگەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەر کێش دەبێو دەڵێ: واللە ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەماڵدا

سەرین و پشتی و شتی وامان نیە تا خێزانم ماڵی پێ برازێنێتەوە!!
پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێ: خوا یاربێ دەتان بێ.

وێنەیەکی سەرنج راکێشە قسە خۆشی و نەرم و نیانی پێغەمبەرمان بۆ وێنا دەکا و بۆمان دەردەخا چەند هاوڕێیەتی خۆش و چەند قسە شیرین و سوعبەتچی بووە لەگەڵ هاوەڵانیدا، ئێمە خودا ئەوەی بە نسیب نەکردوین ئامادەی مەجلیسی بین و هاوڕێی رێگای غەزاو سەفەری بین و ئەو رێزو شکۆمەندییەمان دەست بکەوێ، وەلێ ئێمە لەسیرەی پیرۆزی لە هەواڵی عەتر ئامێزی دڵخۆشکەری ئەم روداوو و هەڵوێستانەی دەخوێنینەوە، دەمان هەژێنێ و وامان لێ دەکا حەزمان لێ بێ بەچاو بماندییایە کە بەداخەوە ئێمە لێی مەحروم بوین و نەماندیۆ و دەیخوێنینەوە، ساخودا لەبارتەقای ئەو خەسارەی لێمان کەوتووە، لەشوێنی کەلین و کەم و کوڕییەی هەمانە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کۆمان بکاتەوە، لە دونیادا تۆفیقمان بدا بۆئەوەی پابەندی ئایین و رێبازی ئەو ببین و شوێن پەیامی ئەو بکەوین و وامان لێ بکا تەحەممولی هەموو ناخۆشییەك بکەین لەپێنا و ئایین و شەریعەتی بەرزیدا.

پێنجەم: پێویستە موسوڵمان هەڵوێستەیەکی دورو درێژبکا لەبەردەم هەواڵی ئەو دوو هاوەڵەی کە پێغەمبەر کردنی بە حەرەسی دەم شیوەکەو لە هەڵس و کەوتیان وردبێتەوە بۆئەوەی طەبیعەتی جیهادی ئیسلامی تێبگەین و بزانین هاوەڵانی پێغەمبەر چۆن مومارەسەیان کردووە.

جیهاد لەدیدی هاوەڵانیدا عەمەلییەکی حەرەکی نیە لەسەر بنەمای بەرەنگاری روت و بێ گیان دامەزرابێ، هیچ کامێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر بەو شێوە چەواشە کراویە وێنایان نەکردووە، تەنانەت بۆ ساتە وەختێکیش بەو شێوە تەصەوریان نەکردووە.

بەڵکوو جیهاد وەکوو پێغەمبەر هاوەڵانی خۆی فێرکردووەو وەکوو هاوەڵان لێی حاڵی بوون، عیبادەتێکی گەورەیە کیانی فەردی موسوڵمان پەیوەست دەکا بە پەروەردگاری خۆیەوە، بە حاڵەتی ترسان لە خوداو هاوارکردو پەنا بۆخودا بردو روو لەخودا کردو پشت لەدونیا کردو. هیچ ساتێك نیە مرۆڤ لەخودا نزیکتربێ لەو ساتەی پشت لە دونیا دەکاو بەهەموو روی‌و جەستەی لەبەر خاتری خودا بەرەو ڕوی مردن دەچێ‌و رێگای شەهیدبوون دەگرێتە بەر.

بۆیە بەنیسبەت کابرای ئەنصاری «عوبادی کوڕی بشیر»ەوە شتێکی طەبیعی بوو کە لەنۆرەی حەرەسیاتیەکەیدا لەو شەوەدا مەشغوڵی چەند رکاتێکی نوێژ بێ بەخشوع‌و ملکەچی لەبەردەم خودای خۆیدا راوەستێ‌و بەهەموو هەستەکانیەوە دابڕێ بۆ لەخودا پاڕانەوەو خوێندنی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز.

هەروەها شتێکی ئاسایی بوو: کە گرنگی نەدا بەو تیرەی کابرای موشریکی ژنکوژراو ئاڕاستەی کردو لەجەستەی هەڵچەقێ. هەروا گوێ نەدا بەتیری دووهەمیش کە بەشوێن تیری یەکەمدا ئاڕاستەی کرا. چونکە لەوکاتەدا ئادەمیزادیبەتی خۆی لە چوارچێوەی هەستەکانیدا پێچرابوەوە کە پێیان روی کردبووە پەروەردگارو لە لەزەت‌و خۆشی پارانەوەدا رۆچوو بوو بەتەواوی مانا خۆی لەبیر چوبوەوە.

کاتێك هەست‌و شوعوری بۆ گەڕایەوەو هەستی بەوەکرد: کە پێکراوەو بریندار بووە هاواری کردە هاوەڵە موهاجیرەکەی کە هەڵسێ‌و لەجیاتی ئەو حەرەسیات بگرێ، هاوارکردنەکەی لەبەرئەوە نەبوو کە هەستی بەزێدە ئازار کردبێ، بەڵکوو لەبەر ئەو بەرپرسیاریەتە بوو کە خرابووە ئەستۆیی‌و ترسی ئەوەی لێ نیشت ئەگەر بێدەنگ بێ‌و شەهید بێ سەنگەری پارێزگاری لەکیس دەچێ، ئەم هۆکارە بوو وای لێ کرد

پەنابەرێ بۆئەوەی هاوەڵە نوستووەکەی بێدار بکاتەوەو نۆرە حەرەسیەکەی لێ وەربگرێو سەنگەرەکەی تەسلیم بکاو پارێزراو بێ لەدوژمن.

دەتۆ! ئەی برای موسوڵمان سەرنج بدەرە قسەی ئەم موجاهیدە ئەنصارییە «خودای لێ رازی بێ»: کە دەڵێ: {وَايْمُ اللّٰهِ لَوْلاَ أَنْ أُضَيِّعَ ثَغْراً أَمَرَنِي رَسُولُ اللّٰهِ «صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ» بِحِفْظِهِ لَقَطَعَ نَفْسِي قَبْلَ أَنْ أَقْطَعَهَا أَوْ أُنْفِذَهَا}.

سوێندم بەخودا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم بە پاراستنی ئەو سەنگەرەو بە مردنی من سەنگەرەکە لەکیس دەچوو، گیانی خۆم دەفەوتاندو نوێژەکەم نەدەبڕی.

ئەوە سروشتی ئەو جیهادەیە کەخودا بەرعودە بووە بۆ جەنگاوەرانی لەو جۆرە بە سەرکەوتنو بەمراز گەیشتن، چەندێك دوژمن بەهێزو چەکدارو زۆربێ.

دەی تۆ «بەداخو کەسەرەوە» بەراوردێك کە لەنێوان ئەو جیهادەی هاوەڵانی پێغەمبەرو ئەم جیهادەی ئەمڕۆ ئێمە بەناوو بە شیعار لافی پێوە لێ دەدەین.

بەراورد بکە لەنێوان ئەو جیهادەو ئەم بەناو جیهادە بۆئەوەی بزانی خودا چەند دادوەرو عەداڵەتکارە لەسەر زەوی. هەروەها بۆئەوەی بزانی کەخودا ستەمکارنیەو ستەم لەکەس ناکا، بەڵکوو ئادەمیزادەکان بۆ خۆیان ستەم لەخۆیان دەکەن! ئەمجار هەردو دەست بۆ ئاسمان بەرزبکەرەوەو لێی بپاڕێرەوە: کەخودا بەکردەوەی خراپەکارانمان لەگەڵ نەکاو بەتاوانی ئەوان نەمانگرێ، هەوڵ بدە هەرچۆنێك بێ چەند فرمێسکێك لەچاوت هەڵڕژێنە، سابەڵکوو بەهۆی ملکەچی بەندایەتیو

داماویمان خودا ئەو سزایەی کە بەهۆی کەمتەرخەمی و کردەوەی خراپمان بۆمانی بڕیارداوە بیگێڕێتەوە.

## غەزای «بني المصطلق»

پێشی دەگوترێ غەزای «المریسیع»

ئیبنو ئیسحاق و بڕێ لە زانایانی سیرە دەڵێن: ئەم غەزایە ساڵی شەشەمی کۆچی بووە. رای صەحیح و چەسپا و ئەوەیە کە زوربەی لێکۆڵەرەوە و موحەقیقین بۆی چون و دەڵێن: ئەم غەزایە لەمانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە. ئاشکراترین بەڵگە لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوەیە سەعدی کوڕی مەعاذ لەم غەزایەدا زیندو بووە، لەبارەی چیرۆکی بوختانەوە ناوی هاتووە، «وەکوو لەوە بەولاوە باسی دەکەین».

بێگومان سەعدی کوڕی مەعاذ لە غەزای بەنو قوڕەیظەدا «بەهۆی ئەو برینەوە کە لەغەزای خەندەقدا پێکرابوو» وەفاتی کرد. گومانیش لەوەدا نییە کە غەزای بەنو قوڕەیظە لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە «وەکوو لەمە بەولاوە دێ» کەوابێ چۆن سەعد دوای ساڵێك لەمردنی زیندو دەبێ.؟![١]

هۆی ئەم غەزایە ئەوەبوو هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ گەیی کە هۆزی بەنو المصطلق هێز کۆدەکەنەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەر بە سەرۆکایەتی «الحارث»ی کوڕی ضرار. جا کە پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەی بیست لەشکری سازداو بۆیان چووە دەر تالەسەر ئاوێك کەپێی دەگوترێ «المریسیع» توشیان هات و جەنگ بەرپا بوو، کوشتار کرا،

---

١ - بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: فتح الباری، ٢٠٤/٧. زاد المعاد لابن القیم ١١٢/٢ وعیون الأثر لابن سید الناس ٩٣/٢.

«بنو المصطلق» شكان پێغەمبەر ﷺ چوار بەش لەپێنج بەشی دەستكەوتی ئەو جەنگەی بەسەر جەنگاوەراندا دابەشكرد، بۆ پیادە بەشێك و بۆ سوار دوو بەش«١».

لەم غەزایەدا كۆمەڵێكی زۆر لە مونافیقەكان لەتەك موسوڵمانەكاندا چوبوونە دەر، كە لەوەپێش لە غەزاكاندا خۆیان پاش دابوو، ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو دەیان بینی لەهەموو غەزایەكدا موسوڵمانەكان سەردەكەون و تەماعی دەستكەوتی جەنگیان هەبوو.

بوخاری و موسلیم بەدوو سەنەدی جیاواز «لەدوو رێگەی جیاوازە»وە ریوایەتیان كردووە: كە هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەر كرد دەربارەی «عەزل» ئاخۆ رەوایە یان نا. ئەمەش لەوكاتەدا بوو كە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتە گیراوەكانی بەسەردا دابەشكردن. لە وەڵامی پرسیارەكەیاندا فەرمووی: {مَا عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا ، مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، إِلاَّ وَهِيَ كَائِنَةٌ}.

هیچ تاوانی تێدا نییە ئەگەر بیكەن، هیچ زارۆكێك نیە خودا بڕیاری بوونی دابێ تا رۆژی قیامەت ئیللا دەبێ و دێتە وجود.

ئیبنو ئیسحاق لە طەبەقاتەكەیداو ئیبنو هیشام لە سیرەدا ریوایەتیان كردووە، دەڵێن: غولامێكی عومەری كوڕی خەطاب ناوی «جهجاه»ی كوڕی سەعیدی «الغفاری» بوو لەگەڵ سەنانی كوڕی وەبەری «الجهنی» لەلای ئاوی «المریسیع» لەو كاتەدا كە پێغەمبەر لەوێ بوو بوو بەشەڕیان، خەریك بوو پەلاماری یەكتر بدەن، كابرای جوهەنی هاواری كرد ئەی كۆمەڵی ئەنصار فریام بكەون جەهجاه هاواری كرد ئەی كۆمەڵی موهاجیرین فریام بكەون. عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول گوێی لێ بوو رقی هەڵسا بە تاقمەكەی خۆی گوت: ئەوانە ئەوەیان

---

١ - طبقات ابن سعد ١٠٦/٢ وسيرة ابن هشام ٢٩٠/٢.

لێ دەوەشێتەوە؟ یان «ئەم پەندەشیان دا؟» بە سەڵتە خێزانی هاتنە ناومان، ماڵو حاڵیان لێ داگیر کردینو بوونە برا بەشمان، حاڵی ئێمەو قورەیش وەکوو پەندە مەشهورەکەی لێ هاتووە «سەگەکەت قەڵەوبکە بۆئەوەی بتخوا». سوێندم بەخودا ئەگەر چوینەوە مەدینە، دەبێ عەزیزو بەدەسەڵات کە ئێمەین بێ رێزو زەلیلەکان کە موحەممەدو کۆچکەرانن لەمەدینە دەریان بکەین. وەدەریان نێین.

یەکێك لەوانەی گوێی لەقسەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو زەیدی کوڕی ئەرقەم بوو، چوو بۆ خزمەت پێغەمبەرو روداوی بۆ گێڕایەوە، لەوکاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب لای بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بە «عباد»ی کوڕی «بشیر» بکە با بیکوژێو لە کۆڵمانی بکاتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن شتی وادەبێ؟ پاساوت چی دەبێ کە خەڵك گوتیان ئەوە موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ؟ وەلێ فەرمان بدە با سوپا بکەوێتە رێو چیدی لێرە نەمێنینەوە، ئەمەش لە ساتە وەختێکدا بوو کە لەوەپێش پێغەمبەر ﷺ تێیدا نەدەکەوتە رێ. فەرمانی دا سوپا کەوتەڕێ. ئەو رۆژە رۆیشتن. تا ئێوارەیان لێ هات. شەوەکەشی هەربەردەوام بوون لە رۆیشتن هەتا رۆژ بووە، بەردەوام بوون لەسەر رۆیشتن تا چێشتەنگاوو گەرمایان لێ هات، ئەمجار لایاندا زۆری پێ نەچوو لەبەر ماندوییو شەکەتی خەویان لێ کەوت. پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بۆیە کرد بۆئەوەی خەڵکەکە ئەو گرژیو دەنگ لێك هەڵبەزینەوەی دوێنێیان لەبیر بچێتەوە. سورەتی «المنافقين» نازڵ بوو تەصدیقی قسەکەی زەیدی کوڕی ئەرقەمی کرد کە تێیدا هاتووە دەفەرموێ: {يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ – المنافقون/٨}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دوای گەڕانەوەیان بۆ مەدینە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد: «بیستومە جەنابت بڕیارت داوە لەسەر قسە نابەجێیەکانی باوکم بکوژی، ئەگەر سووری لەسەر بڕیارەکەت فەرمان بەمن بکە دەیکوژم سەرەکەیت بۆ دێنم، سوێندم بەخودا هۆزی خەزرەج دەزانن کەس بە ئەندازەی من بۆ باوکی خۆی باش نییە، وەلێ من ترسی ئەوەم هەیە فەرمان بە یەکێك بکەی بۆ کوشتنی و بیکوژێ، ئەوکاتە غیرەت و نەفسم ڕێگەم نادەن بڕوانمە بکوژی عەبدوڵڵای باوکم بێ و بچێ، دەیکوژمەوە، ئەوکاتە من دەبمە بکوژی پیاوێکی موسوڵمان لە تۆڵەی کابرایەکی کافرو دەچمە دۆزەخ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر بڕیاری کوشتنیم نەداوە و بەهێدی و هێمنی لەگەڵیدا دەجوڵێینەوە، بەباشی هاوڕێیەتی دەکەین تا لەگەڵمان بمێنێتەوە».

لەوە بەولاوە هەرکاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی قسەی بکردایە، خزمەکانی سەرزەنشتیان دەکردو لێی توڕە دەبوون. پێغەمبەر ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتابی گوت: وەزعەکە چۆن دەبینی ئەی عومەر! سوێندم بەخودا ئەگەر ئەو ڕۆژەی پێشنیاری کوشتنی عەبدوڵڵات کرد بمکوشتایە دەمارگیری لەسەر دروست دەبوو، خزمەکانی لوتیان بۆی دەکەوتە لەرزە. بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ فەرمان بەخزمەکانی بکەم بیکوژن دەیکوژن. ئیمامی عومەر وتی: وەڵڵاهی زانیم رای پێغەمبەر ﷺ زۆر بەرەکەت ئامێزتر بوو لەرای من.

## هەواڵی بوختان بەخاتو عائیشە

لە گەڕانەوەی پێغەمبەرو هاوەڵانی لەم غەزایە بوختانکردن بەخاتو عائیشە «حەرەمی پێغەمبەر» بڵاوبووە، ئێمە پوختەی ئەوەی لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە راگوێزی ئێرەی دەکەین.

خاتو عائیشە بۆ خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئەم غەزایە دەرچووم .... ئەمجار دەڵێ: کاتێك لەم غەزایە تەواوبوو، بڕیاری گەڕانەوەیداو فەرمانی کرد سوپا بکەوێتە حەرەکە، بۆ هەندێ پێویستی تایبەتی خۆم تۆزێ دوورکەوتمەوە، کە گەڕامەوە بۆلای کەژاوەکەم دەستم بەسنگی خۆمدا هێنا زانیم ملوانکەکەم لێ پچڕاوەو میرووەکانم لێ کەوتوون، گەڕامەوە بۆ شوێنەکەو دەستم کرد بەگەڕان بەدووی میرووی ملوانکەکەمدا، بەوە مەشغوڵ بووم. دەڵێ: لەکاتی بارکردنی سوپادا بارگە چییەکانی من هاتبوون کەژاوەکەی منیان لە حوشترەکەی خۆم بارکردبوو وایان زانیبوو من لەناو کەژاوەکەدام و حوشتریان دەنگ دابوو کەوتبوونە رێ. میرووی ملوانکەم دۆزینەوەو هاتمەوە بۆ شوێنی بارگەو بارگەنەم روانیم کەس نەماوەو لەشکر بەڕێ کەوتووە. ئیتر لەو شوێنەی لەوەپێش لێی بووم مامەوە، پێم وابوو دوایی بارگەچییەکانم هەست بەوە دەکەن کەمن لەناو کەژاوەکەمدا نیم و دێنەوە بەشوێنمدا، صەفوانی کوڕی «ألمعطل» لەدوا سوپاوە بوو پاش کەوتبوو بەلای مەنزڵی مندا تێپەڕی، تارمایەکی ئادەمیزاد دەبینێ، کاتێك منی بینی بوو ناسیبومیەوە چونکە پێش نازڵبوونی ئایەتی حیجاب دیتوبومی.

من کەهاتمەوە هەواری خاڵی خەو بەسەرچاوەکانمدا زاڵ بوو خەوم لێ کەوت، بەدەنگی «انا لله وانا الیە راجعون»ی صەفوانی کوڕی

«ألمعطل» بەخەبەر هاتم: کە ناسیبومیەوە هەرئەوەی دەگوت ئیتر من خێرا عەباو پەچەم لەخۆمەوە پێچاو خۆم ئامادەکرد وەڵڵاهی نە قسەیەکم لەگەڵ کردو نە قسەیەکی لەگەڵ کردم جگە لەوتنی «انا لله وانا الیە راجعون» حوشترەکەی خۆی هێنا لە نزیکمەوە یخی داو سواری بووم، بەرێ کەوتین صەفوان هەوساری حوشترەکەی گرتبوو هاتین تا گەیشتینە جێگایەك پێی دەگوترا «نحر الظهیرة» لەوێ سوپا لایاندابوو، پێیان گەیشتینەوە، ئیتر ئەوەی خۆی مالۆێران کرد بە بوختان هەڵبەستن بۆمن، ئەوەی سەروکاری ئەم تاوانەی کرد عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو... عائیشە دەفەرموێ: کاتێك گەیشتینەوە مەدینە نەخۆش کەوتم، نەخۆشییەکەم یەك مانگی خایاند، خەڵك لەناو خۆیاندا بوختانەکە بۆیەکتر نەقڵ دەکەن و هەرکەسە بەجۆرێك باسی دەکاو بۆ یەکتری دەگێڕنەوە، منیش بۆخۆم هەستم بەهیچ نەکرد، ئەوەندە نەبێ هەستم دەکرد پێغەمبەر لەگەڵمدا نەختێ ساردەو ئەو لوطف و سۆزەی لەوەپێش هەیبوو لەکاتی نەخۆشبوونم ئەمجارە زۆر کەم بۆتەوە. هەر ئەوەندە دەهاتەماڵەوەو سەلامی دەکردو دەیفەرموو: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ جا کە چاکبوومەوە، شەوێك لەگەڵ «أم مسطح»دا بۆ ئەنجامدانی کارێکی خۆم لەماڵ دەرچووم. کە گەڕاینەوە، ئوم مەسطەح قاچی لەداوێنی خۆی گیراو هەڵەنگوت، جنێوێکی شەڕی بە مەسطەحی کوڕیدا، منیش پێم گوت قسەیەکی خراپت کرد، چۆن جنێو بەکەسێك دەدەی کە هاوکاری غەزای بەدری کردبێ؟ ئوم مەسطەح وتی: ئەی بۆ نازانی و نەتبیستووە چ بوختانێکی بۆ تۆ هەڵبەستووە؟ ئەمجار لەنوکەوە قسەی بوختانکەرەکانی بۆ گێڕامەوە، ئیتر نەخۆشییەکەم لێ گرانتر بوو، لێم بوو بەدوو نەخۆشی. ئەو شەوە تابەیانی هەر گریام و فرمێسکم باراندن و چاوم نەچووە خەو. لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ

راوێژی بەهەندێ لە هاوەڵانی کرد دەربارەی ئەم روداوە، ئاخۆ چ بکاو چ نەکا، هەیانبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە خێزانی خۆتەو ئێمە جگە لەچاکەو داوێنپاکی هیچی ترمان لێ نەدیوە.

هەشیانبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆژن قاتی نین و ئافرەت زۆرن تۆ بیانخوازی و واز لەم بێنی، پرسیار لە کارەکەرەکە بکە واتە: «بريرة» ئەو راستیت پێ دەڵێ. پێغەمبەر ﷺ بانگی «بریرە»ی کردو پرسیاری لێکرد ئاخۆ هیچی خراپەی لە عائیشە دیوە! لە وەڵامدا وتی: کە ئەو جگە لەخێرو چاکە هیچی لێ نەدیوە. ئیتر پێغەمبەر چووە سەر مینبەرو فەرمووی: موسوڵمانینە بۆچی ئەزیەتم دەدەن! قسەو بوختان بۆ خێزانم هەڵدەبەستن؟ کێ هەیە پاساوم بۆ بێنێتەوە دەربارەی پیاوێك کە ئەزیەتی داوم بوختانی بۆ خێزانم هەڵبەستووە؟ «والله» من جگە لەچاکە خراپەم لە خێزانی خۆم نەدیوە. پیاوێکیان گلاندۆتە ئەو بوختانەوە جگە لە خێرو چاکە هیچی ترم لێ نەدیوە، لەگەڵ خۆما نەبێ نەهاتۆتە ماڵی من، سەعدی کوڕی موعاذ هەڵسایە سەرپێ وتی: قوربان! بفەرموو ئەو بوختانچییە کێیە بابیکوژین، ئەگەر لەهۆزی ئەوسە ئەوە خۆمان لەگەردنی دەدەین. ئەگەر لەهۆزی خەزرەجە ئەوە فەرمانمان پێ بکە دەیکوژین، ئیتر هەندێ لەخزمەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دەمارگیری خزمایەتی گرتنی و هەڵیاندایە، خەریك بوو ببێتە شەڕو هەرا لەنێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجدا. وەلێ پێغەمبەر بە حیکمەت و لێزانی خۆی هەرایەکەی کپ کردەوەو بێ دەنگی کردن.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ هاتە لام و باوك و دایکم لام بوون، ئەوان ترسی ئەوەیان هەبوو گریان جەرگم لەت لەتبکا. لەوکاتەشەوە ئەم قسەو باسە هەڵبەستراوە بڵاوبوبوەوە پێغەمبەر ﷺ لەلام دانەدەنیشت و

نەدەمایەوە، ماوەی مانگێك بەو حاڵە مایەوە دەربارەی ئەم مەوزوعەی من وەحیی بۆ نەهات.

عائیشە دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ دانیشت شایەتومانی هێنا، پاشان فەرمووی: یا عائیشە! دەربارەی تۆ ئاواو ئاوا قسەو باس بڵاوبۆتەوە، ئەگەر بێتاوان بێ ئەوە خودا بێتاوانیت دەردەخا، ئەگەر تاوانێکیشت کردبێ ئەوە تۆبە بکەو داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە. دەڵێ: کە پێغەمبەر لە وتارەکەی بووە، فرمێسك لەچاومدا قەتیس ماو فرمێسکێکم نەهاتە خوار، بە باوکم وت: وەڵامی پێغەمبەر بدەرەوە، وتی: بەخودا نازانم بڵێم چی! بەدایکم گوت: وەڵامی پێغەمبەر بدەرەوە، وتی: نازانم چی بڵێم. وتم: من دەزانم: ئێوە ئەو مەوزوعەتان بیستووە، لەدڵ و دەرونتاندا جێگیر بووەو لەلاتان بەڕاست گەڕاوە. ئەگەر بڵێم: من بەریئو بێ تاوانم بڕوام پێ ناکەن، ئەگەر دان بەتاوانێکدا بنێم «خودا دەزانێ لێی بەریئم» بڕوام پێ دەکەن. «واللە» من بۆخۆم و ئێوە نمونەیەکم نیە جگە لەو وتەی باوکی یوسف: کە فەرمووی: {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ}.

عائیشە دەفەرموێ: ئەم قسانەم کردن و لەسەر جێگاکەم وەرسوڕام و ڕاکشام.

دەڵێ: سوێندم بەخودا پێغەمبەر لەشوێنی خۆی نەجولا، کەس لە ئەهلی خانەوادەمان لەشوێنی خۆی نەجولابوو هەتا خودا نیگای خۆی نازل کردە سەر پێغەمبەر ﷺ ئەو دیاردەو حاڵەتەی بەسەردا هات کە لەکاتی نازڵبوونی وەحیدا تووشی دەبوو، تەنانەت لەڕۆژی سەرمای زستاندا کەوەحی بۆ دەهات زەنگوڵ زەنگوڵ عەرەق لێی دەتکا. ئیتر کەیفخۆشی بەسەر پێغەمبەردا هات و پێکەنی، یەکەم قسەی ئەوەبوو فەرمووی: موژدەبێ ئەی عائیشە! خودا بێتاوانی تۆی ڕاگەیاند، دایکم

وتی: هەستە سوپاسی پێغەمبەر بکە، وتم: وەڵلاهی تەنها سوپاسی خودا دەکەم، ئەو پاکداوێنی منی نازڵ کرد. دەڵێ: ئەوەبوو خودای بالاّ دەست نیگای نازڵ کردو فەرمووی:

{إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ - النور/١١}.

عائیشە دەفەرموێ: باوکم لەوەپێش یارمەتی ماڵی مەسطەحی دەدا چونکە هەم خزمی بوو هەم هەژاربوو، دوای ئەم روداوە سوێندی خوارد وتی: وەڵلاهی هیچ باربوێکی ناکەم. ئیتر ئایەتی:

{وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - النور/٢٢}.

ئەبوبەکر فەرمووی: بەڵێ وەڵلاهی من پێم خۆشە خودا لێم خۆشبێ، ئیتر ئەو نەفەقەو باربووەی لەوەپێش دەیدا بە مەسطەح بۆی بڕیاردایەوە.

پاش نازڵبوونی وەحیی، پێغەمبەر ﷺ چووە ناو خەڵکەکەو وتاری بۆ دان و ئایەتەکانی کە نازڵ بوو بوون، بەسەریاندا خوێندنیەوە، پاشان فەرمانیدا داری حەدیان لەهەر یەك لە مەسطەحی کوڕی ئەثاثەو حەسانی کوڕی ثابیت و حەمنەی کچی جەحش دەرکرد چونکە ئەمانە بوختانەکەیان بلاّو کردبووەوە بۆیە داری حەدیان لێ درا.

## پەندو ئامۆژگاری:

لەم غەزایە چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێ:

یەکـــەم: ڕەوایـــی دابەشـــکردنی دەســـتکەوتی شـــەڕ بەســـەر جەنگاوەرانـدا دوای لێ دەرکردنـی پێنجیـەك‌و چـەکی کـوژراو کـەپێی دەگوترێ: «السلب».

السلب: ئەو چەك‌و سیلاحەیە کە بابای کوژراو پێش ئەوەی بکوژرێ شەڕی پێ دەکا. بکوژ بۆی ڕەوایە ئەوە بۆ خۆی هەڵبگرێ، ئاماژە بەو فەرموودەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: {مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ}.

پێنجیـەکی دەسـتکەوتیش وەلا دەنـرێ‌و دەدرێ بەوانـەی قورئـان ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێ: {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ – الأنفال/٤١}.

ئـەو مـاڵ‌و سـامانەی وەکـوو دەسـتکەوتی شـەڕ لـەدوژمن دەسـتتان دەکـەوێ ئـەوە پێنجیـەکی بـۆ خـوداو بـۆ پێغەمبـەری خـوداو بـۆ کـەس‌و کـاری پێغەمبـەرو بـۆ هـەژارو نـەداراو بـۆ ڕێبـوارە. چـوار بـەش لـەپێنج بەشی دابەش دەکرێ بەسەر جەنگاوەرانـدا بۆ پیادە بەشێك‌و بۆ سوار دوو بەش، وەکوو پێغەمبەر دابەشی کرد...

دووەم: حـوکمی عـەزڵ لـەکاتی جیماعـدا «سـنووردارکردنی نەسـل». لـەباربردنی «نوطفـە»و خـوێن پـارەش دەگرێتـەوە پـێش ئـەوەی گیـانی تێبکەوێ. هەروا ئـەم حوکمـە، هـەموو ئـەو شـتانە دەگرێتـەوە: کـە ئـەمڕۆ پێی دەگوترێ: «تەحدیدی نەسل».

ئـەو فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ کـە لـەوەپێش باسـکرا صـەریحە لەوەدا: کە عەزل دروستە، ئەوەبوو کاتێ پرسیاریان لە پێغەمبەرکرد لەو بـارەوە. لـە وەڵامـدا فـەرمووی: {لاَ عَلَـيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُـوا}لـە ڕیوایـەتی موسلیمدا هـاتووە {لاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا ، مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَـةِ إِلاَّ وَهْيَ كَائِنَةٌ}.

چ تاوانێکی تێدا نییە کە عەزل بکەن چونکە وەنەبێ ئەوەی بڕیاری دابێ ببێ بە کردەوەی ئێوە نەیەتەدی.

صەریح تر لەم حەدیثە، ئەو حەدیثەی بوخاریو موسلیم لەجابیرەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێ: {كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رسول الله «صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ}.

بێگومان جەماوەری زانایانی ئیسلام بۆئەوە چوون کە «عەزڵ» رەوایە. وەڵێ بەمەرجێ ئافرەتەکە رازی بێ چونکە وادەبێ زیان بەژنەکە دەگا. بەڵام ئەگەر «عەزڵ» لەترسی هەژاری بوو ئەوە مەکروهەو ناپەسەندە.

ئیبنو حەزم رای پێچەوانەی جەماوەری زانایانە، ئەو دەڵێ «عەزڵ» بەهەموو شێوەیەك حەرامە، بەڵگەشی ئەو فەرموودەیە: کە موسلیم ریوایەتی کردووە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی «عەزڵ» لە وەڵامدا فەرمووی: {ذَلِكَ الْوَأْدُ الْخَفِيُّ} ئەوە زیندە بەچاڵکردنی نهێنییە. هەروا بەڵگەی بە فەرموودەی تر هێناوەتەوە هەموویان رشتەکەیان دەچێتەوە سەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ واتە حەدیثەکان «مەوقوفن». یەکێك لەو فەرمودانە نافیع بەسەنەدی خۆی ریوایەتی کردووە دەڵێ: ئیبنو عومەر «عەزلی» نەدەکرد، دەشیگوت ئەگەر بزانم یەکێك لە منداڵەکانم عەزڵ دەکا پێلاقە ترێنی دەکەم. هەروا یەکێك لەو فەرمودانە ئەوەیە لە رێگەی «الحجاج»ی کوڕی «المنهال» ریوایەتی کردووە دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو طالیب عەزلی بەلاوە ناپەسەند بوو، ئیبنو حەزم دەربارەی حەدیثەکەی جابیر: کە جمهور کردویانە بە بەڵگەی خۆیان دەڵێ: ئەو حەدیثە حوکمەکەی نەسخ بۆتەوە«١».

---

١ - بڕوانە: المحلى لابن حزم ج ٨٧/١٠.

ئیبنو حەجەر لە فەتحولباریدا ئەم رایەی ئیبنو حەزمی هێناوەو پاشان دەڵێ: ئەمەی ئیبنو حەزم گوتوویەتی بەدوو فەرموودە رەتدەکرێتەوە، یەکەمیان تیرمیذیو نەسائی دەریان هێناوە، لەرێگای موعەممەرەوە لە یەحیای کوڕی کثیر تەصحیح کراوە، لە جابیرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: ئێمە کەنیزەکمان هەبوون «عەزل»مان ئەنجام دەدا جولەکە دەیانگوت: ئەو جۆرە زیندە بەچاڵکردنێکە، لەو بارەوە پرسیار لە پێغەمبەر کرا، فەرمووی: جولەکە درۆ دەکەن ئەگەر خودا بیەوێ زارۆك دروست ببێ «عەزل» نابێتە لەمپەڕ. فەرموودەی دووەم لە «ألنسائی» دایە لە رێگایەکی ترەوە لە موحەممەدی کوڕی عەمر لەئەبو سەلەمەوە لە ئەبو هورەیرەوە«[1]».

دەڵێم: پێدەچێو ئاشکرایە: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی عەزڵ: کە دەفەرموێ: {ذَلِكَ الْوَأْدُ الْخَفِيُّ}. مانای تەحریم ناگەیەنێ بەڵکوو وادەردەکەوێ دەتواندرێ فەرموودەکە لەژێر رۆشنایی فەرموودە ثابیتەکاندا حەمل بکرێ بۆسەر نەهیی تەنزیهی وەکوو جەماوەری زانایان بۆی چوون.

دەعواو رای ئیبنو حەزم بەوەی ئەو حەدیثانەی «عەزڵ» بە رەوا دەخەنە روو مەنسوخن، رەتدەکرێتەوە بەو حەدیثەی جابیر: کە جگە لەئەبو داود خاوەنانی «کتب السنة» ریوایەتیان کردووەو حەدیثەکە ئەوەیە کە دەفەرموێ: {كُنَّا نَعْزِلُ وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ}.

ئیمامی موسلیم ئەوەشی زیادکردوە دەفەرموێ: {فَبَلَغَ ذَلِكَ نَبِيَّ اللَّهِ «صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» فَلَمْ يَنْهَنَا}. ئەمە بە پێغەمبەر ﷺگەیشتەوە نەهی لێ نەکردین. دەی ئەگەر حوکمی ئیباحەی «عەزل» بەردەوام نەبووبێ تا

---

١ - بڕوانە: فەتحولباری ج٩/٢٤٥.

پێغەمبەر لەژیاندا بووە، جابیر ئەم قسەی نەدەکرد، ئەگەر گۆڕانکارییەك لە حوکمەکەدا روی بدایە جابیر رونی دەکردەوەو دەیگوت حوکمی ئەوە ئاوا جێگیر بوو.

حوکمی لەباربردنی «نوطفة» پێش روح بە بەراکردنی وەکوو حوکمی عەزڵ وایە. وەڵێ بڕێ لەو زانایانەی فتوایان داوە بەرەوایی عەزل، لەباربردنی «نوطفة»و خوێنپارەو گۆشتپارەیان حەرام کردووە. پێدەچێ قیاسکردنی نوطفەو خوێنپارەو گۆشتپارەیان بۆسەر «عەزڵ کردن» بەلاوە گران بووبێ، پێیان وابووبێ گۆشتپارە نزیکترە لە دروستبوونی شکڵی ئادەمیو گیان بە بەراکردنی لە نوطفە پێش ئەوەی بەدیواری رەحمەوە بنووسێ. وەڵێ ئەم خۆگرتنەوە لە قیاسکردنی ئەوە بۆسەر ئەوە هۆکاری ئاشکرانیە، مەگەر سەرهەڵدانی خۆگرتنەوەو قیاسنەکردنەکە زیانی تەندروستی بێ بۆ ئافرەتە حامیلەکەو بەهۆی لەباربردنەکە تووشی زیان ببێ.

ئەگەر ئەمەت زانی، بۆت دەردەکەوێ ئەو حوکمە شەرعیەی پەیوەستە بە سنووردار کردنی نەسل، پەیڕەوکردنی چارەسەرێکە بۆ مەنعی حەمل لەجیاتی چارەسەری عەزڵ. کەوابێ مەنعی حەمل دروستە ئەگەر بەو رێگا چارەسەریانە ئەنجامدرا کە جەماوەری زانایان بەرەوایان زانیوە، بەمەرجێك گومانی گەیاندنی هیچ زیانێکی تەندروستی بە ژنەکە لێ چاوەڕوان نەکرێو بە رەزامەندی ژنو مێردەکە هەردوکیان بێ. ئەمن پێم وانیە هیچ کەسێك لە زانایانی شەرعزان رای پێچەوانەی ئەم حوکمە بێ جگە لەو قەولەی کە «حافظ ولي الدین العراقی» لە شیخ عیماد «الدین»ی کوڕی یوسفو شێخ «عزالدین»ی کوڕی عبد السلام. ریوایەتی کردووە ناوبراو لەم دوو زاتە قەولێکی ریوایەتکردووە: کە

بەکارهێنانی هەر دەرمانێك بە مەبەستی مەنعی حەمل لەلایەن ئافرەتەوە حەرامە. ئیبنو یونس دەڵێ: ئەگەر مێردەکەشی رازی بێ هەر حەرامە«١».

دەڵێم ئەم رایە رەتدەکرێتەوە بە موقتەضای دەلالەتی فەرموودەکانی پێغەمبەرو بەو بۆچوونەی جەماوەری زانایان لەسەر دەلالەتی ئەو فەرموودانە چەسپاندویانە...

وەڵێ ئەوەی کە گرنگە تۆ بیزانی لەم مەوضوعەدا ئەوەیە: بڕیاردانو حوکم بەرەوایی عەزڵ یان ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ «سنووردار کردنی نەسل» پەیوەستە بەرەزامەندی ژنو مێردەکە هەردوکیان، بەبێ ئەوەی دەسەڵاتێك یان رێنموونیەکی دەرەکی ئەوەیان لەسەر فەرزبکا. چونکە ئەوەی دروستە بۆ تاکی پەیوەندیدار مومارەسەی بکا بۆ خۆی، وادەبێ دروست نەبێ بکرێتە شەریعەتو بەشێوەی ئیلزامی بەسەر هەموو کەس بسەپێندرێ. ئەمە قاعیدەیەکە لە قاعیدەکانی فیقهی کۆڕا لەسەر دامەزراو.

بۆ نموونە تەڵاق بۆتاکی خاوەن ژن لەکاتی پێویستیدا یان بۆ بەرژەوەندییەکی بەرچاو گیراو دروستە پەیڕەو بکرێ، بەڵام دروست نیە بۆ حاکمو فەرمانڕەوا فەرمان بە جەماوەری گەل بکا کە هەموویان ژنەکانیان تەڵاق بدەن، هەروا بۆی دروست نییە رێنمونییان بکا بۆ مومارەسە کردنی ئەو کارەو ئامۆژگارییان بکا بۆئەوەی هەموویان دەست بەرداری هاوسەرەکانیان بن. سنووردار کردنی «نەسل»یش گرنگی و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا و تاك وەکوو کاریگەری تەڵاق وایە، ئەم قاعیدە گرنگە پێویستە بزاندرێو بەباشی لێی تێبگەین، بۆئەوەی یەکێك لەوانەی ئەمڕۆ کارو پیشەیان فتوادانو فتوا داتاشینە نەیە بڵێ:

---

١ - بڕوانە: طرح التثريبو شەرحەکەی کە حافظی عیراقی نووسیویەتی ج ٨/٦٢.

فەرموودەی پێغەمبەر تەحدیدی نەسلی بەڕەوا داناوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە بۆ دەوڵەت ڕەوایە خەڵك وا ئاڕاستە بکاو هەڵیان بنێ بۆ سنووردار کردنی نەسل بەو شێوەی کە بە پەسەندی بزانێ!! لە حەقیقەتدا هیچ پەیوەندییەك نیە لەنێوان ئەو دەلیلەو ئەم مەدلوولە جگە لە چەواشەکاریو تێکەڵو پێکەڵ کردن. بەکورتی مەوزوعی «عەزل»یان بڵێ سنووردار کردنی نەسل ئەگەر لە ڕوانگەی ژنو مێردەوە بۆی بڕواندرێو لەمیانەی پەیوەندی نێوانیان بەرژەوەندی هەردوو لایانو مافو حقوقیان سەیری بکرێ کارێکی ئاسانەو هیچ ئیشکالێکی تێدانیە وەکوو لەوەپێش ئاماژەی بۆکرا.

بەڵام ئەگەر بۆی بڕواندرێ لەسەر ئەو ئەساسە بکرێتە بنەمایەكو بانگەشەی بۆ بکرێو خەڵکی بۆ هەڵبنرێو بکرێتە فەلسەفەیەکی تەوجیهیو وەسائیلی ئیعلامو تەوجیهی بۆ تەرخان بکرێ بۆ بڵاوکردنەوە ئەوە کارێکی خەتەرەو پێویستە موسوڵمانان دژی بوەستنو نەهێڵن ببێتە دیاردەو یاسایەکی گشتی، چونکە ئەوە پیلانێکە دوژمنانی ئیسلام دایان ڕشتووەو دایدەڕێژن بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان پێویستە موسوڵمانان بەوە هەڵنەخەڵەتێن کە بڵاودەبێتەوە کە گوایە تەحدیدی نەسل مەشاکیلی وەبەرهێنانو ئابوری حەل دەکا، ئەگەر تەحدیدی نەسل نەکرێ کۆمەڵگا تووشی گیروگرفتی ئابوری دەبێ، لە ڕاستیدا ئەمە بەشێکە لە پیلانەکەو مەبەست لاوازکردنی موسوڵمانانە.

سێیەم: چارەسەرکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو فیتنەو ئاشوبەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بەرپای کرد، بەو شێوەی ئاماژەمان بۆکرد، شارەزامان دەکاو ئاگادارمان دەکا بەلایەنی لێهاتویی پێغەمبەرو ئەندازەی ئەو هەموو بەراعەتو لێزانییەی خودا پێی بەخشیبو لە ڕووبەڕو بوونەوەی تەنگژەو چورتمی جۆراو جۆرو

پەروەردەکردنی ئادەمیزادەکان بەشێوەیەکی جوانو زاڵبوون بەسەر مەشاکیلو ئاستەنگەکاندا. بێگومان ئەوەی بە پێغەمبەر گەیی لە قسە ناشیرینەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کیفایەت بوو بۆئەوەی بڕیاری کوشتنی دەربکاو لەناوی بەرێ، وەلێ ئەو روبەڕوی کارەکە بووە بە سنگێکی فراوانترو دوور بینانەتر بۆ وەزعەکەی روانی. گوێی لەو لەغوەو مقۆ مقۆیە بوو، ئاگاداری ئەو لێك مۆڕبوونەوەو چاو لێك سورکردنەوە بوو کە لەنێو موهاجیرو ئەنصاردا بەفیتی دووڕووەکان رویدا، دەیزانی سوپای ئیسلام ژمارەیەکی زۆری دوڕوو فیتنەجۆ تێدانو لە هەلێکی وا دەگەڕێنو چاوەڕوانی شتێکی لەو جۆرەن بۆئەوەی زیاتر ئاگری فیتنەو شەڕ خۆش بکەن، لەو ساتە وەختە ناسکەدا پێغەمبەر ﷺ بە عاطیفەو هەڵچون چارەسەری کێشەکەی نەکرد، بەڵکوو خێرا فەرمانی کرد بە بارکردنو کەوتنە گەڕ بۆ رۆیشتن لەکاتێکدا وەختی رۆیشتن نەبوو، بەلام تەشریفی بۆیە ئەم بڕیارەیدا هەتا خەڵکەکە سەرگەرمی رۆیشتنو ماندوبوون بکاو مقۆ مقۆو دەمە قاڵییان لەبیر بەرێتەوە، ئەو شەوو رۆژەو بەشێکی رۆژی دوایش هەر بەرێوە بوون، بۆئەوەی هەل بۆ مونافیقەکان نەڕەخسێ بە حەساوەیی قسەی فیتنە جۆیی خۆیان بکەن، کاتێکیش لایاندا بۆ پشوودان ئەوەندە ماندوو شەکەت بوو بوون یەکسەر خەویان لێ کەوتو چوونە ناو خەوێکی قوڵو مەجالی ئەوەیان نەبوو هیچ قسەیەك بکەن.

خەڵکەکە چاوەڕوان بوو بە گەییشتنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە تەنگ بە دوڕووەکان هەڵچنێو عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیش ئیعدام بکا، بۆیە کوڕەکەی کە ئەویش ناوی عەبدوڵلا بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی کرد کە کوشتنی باوکی بەخۆی بسپێرێو ئەوکارە نەخاتە ئەستۆی یەکێکی تر. وەلێ عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی

ئوبەی کە ئەم پێشنیارەی کرد هەڵوێستێکی لە پێغەمبەر بینی کە هەرگیز چاوەڕوانی شتی وانەبوو، ئەوەبوو پێغەمبەر لەبەرامبەر پێشنیارەکەی عەبدوڵلادا فەرمووی: {بل نترفق بە، ونحن صحبتە ما بقي معنا}.

نەخەیر نایکوژین و بەهێدی و هێمنی لەگەڵیدا دەجوڵێینەوەو بەجوانی هاوڕێیەتی دەکەین تا لەگەڵمان بێ.

ئەمجار بڕوانە پاسا و هێنانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ عومەری کوڕی خەتتاب کە پێشنیاری کوشتنی عەبدوڵلای کردبوو. کە فەرمووی: {فَكَيْفَ يَا عُمَرُ اذا تَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّداً يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ؟}.

بێگومان ئاکامی پەیڕەوکردنی ئەم حیکمەتەو بەرچاو گرتنی ئەم سیاسەتە ئەوەبوو خزمەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی لە عەبدوڵلا لوتەلابون و لەوەدوا هەر قسەیەکی بکردایە لێی تورە دەبون و بەگژیدا دەچونەوەو سەرکۆنەیان دەکرد. ئەتۆ ئەوەش دەزانی کە بەپێی ئەحکامی ئیسلامی و بەڕواڵەت لەدونیادا مونافیق بە موسوڵمان حسێب دەکرێ و حیسابی قیامەتیشی عائید بەخودا خۆیەتی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا واجبە هەمیشە حیطەو حەزەری لێ بکرێ و بە وریاییەوە مامەڵەی دونیایی لەگەڵدا ئەنجام بدرێ.

پێش ئەوەی نقومی بیرکردنەوەبی دەربارەی ئەو هەموو رەوشتە بەرزانەی پێغەمبەر پێیان رازابوەوە لە لێزانی و رادروستی و حیکمەتی روبەڕو بونەوەی تەنگژەو پەیڕەوکردنی سیاسەتی سەرکەوتوو بۆ بەڕێوە بردنی کارەکان. پێویستە جارێکی تر ئەوەت بخەمەوە یادو بۆت دوبارە بکەمەوە: کەهەموو ئەو صیفاتە بەرزانەی حەزرەتی موحەممەد هەیبوون، زادەو ئاکامی صیفەتە سەرەکییەکەی بوون: کە بریتی بوو لە صیفەتی «نبوة» و پێغەمبەرێتی. هەموو ئەو رەوشتانەی لق و پۆپی

پێغەمبەریەتییەکەی بون و لەوە سەرچاوەیان گرتبوو، واتە: ئەو پێش هەموو شتێك صیفەتی پێغەمبەری تێدا بەرجەستەبوو ئەمجار بەکاریگەری تێشکی ئەو صیفەتە سەرەکییە هەموو رەوشتێکی بەرزو جوانی تێدا کۆبوبوەوە.

هەڵەیەکی گەورەیە لێکۆڵەرەوەیەك بۆ ئەو رەوشتانەی شی بکاتەوە بەبێ ئەوەی هەبوونی ئەو رەوشتانە پەیوەست بکا بە سەرچاوە سەرەکییەکەوەی کە «نبوة» و پێغەمبەرێتییە. بێگومان باسکردن و توێژینەوە لە رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر بەبێ بەرچاو گرتنی ئەو سەرچاوە سەرەکییە نەخشەو پیلانێکە دوژمنانی ئیسلام و هەڵگرانی ئاڵای غەزوی فیکری دایان ڕشتووە، بۆ مەشغوڵکردنی موسوڵمانانە لە بیرکردنەوە لە پێغەمبەرایەتیەکەی، کەسانێکیش کوێرانە لاسایی ئەو هەڵگرانەی ئاڵای غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامی دەکەنەوە، تەنانەت لە مەیمون باشتر لاسایی کردنەوەی کوێرانەیان ئەنجام دەدەن!

**چوارەم:** چیرۆکی بوختان هەڵبەستن بۆ خاتو عائیشە ئەوە بۆخۆی چیرۆکێکی ناوازەو تاقانەیە لە زنجیرەی فەنن و شێوازی ئەزیەتدانی پێغەمبەرو ئەو ناخۆشییانەی لە کافرو دوڕوو دوژمنانی ئایین روبەڕوی بوونەوە. بێگومان ئەم ئازارو ئەزیەتدانە لەهەموو ئەزیەتدانەکانی تر کاریگەرتر بوو لەسەر دڵی پێغەمبەرو لەهەموو ناخۆشی و چورتمەکانی رابردوو پتر پێغەمبەری ناڕەحەت کرد. ئەوە سروشتی شەڕو تیری ژەهراوییە کەلەدووڕووەکانەوە ئاراستەی پێغەمبەر کرا، دیارە ئەزیەتدان و نیازی شەڕی موونافیقەکان هەموو کاتێ لەهی دوژمنانی تر جەرگبڕترو کاریگەرترە، فێڵ و پیلان و زیانیان گورچکبڕترە، چونکە ئەوان زیاتر هەلی فیتنە بەرپاکردنیان بۆ دەرەخسێ و وەسیلەو هۆکاری زەبر ئاراستە کردنیان باشتر بۆ دەستەبەر دەبێ. بوختان هەڵبەستن بۆ

حەرەمی پێغەمبەرو لەکەدار کردنی شەرەفی پێغەمبەر نموونەیەکی تاقانەو ناوازە بوو موونافیقەکان ئەنجامیانداو بڵاویان کردەوە.

ئەم روداوو بوختان هەڵبەستنە بۆیە ئەوەندە لەسەر دڵو دەروونی پێغەمبەر کاریگەربوو، چونکە هەموو ئەو چورتمو تەنگژەو ئەزیەتدانەی لەوەپێش روبەڕویان ببوەوەو «لەوەپێش ئێمە بەشێکیمان باسکرد» لەوشتانە بوون کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی چاوەڕوانی دەکردنو دڵو دەروونی خۆی بۆ ئامادە کردبوونو خۆی حازر کردبوو بۆ روبەڕوبونەوەیان، بەڵکوو ئەو ناڕەحەتیو ئەزیەتدانە دیاردەی سروشتی رێگای دەعوەو بانگخوازییە. بەڵام ئەم بوختان بۆ هەڵبەستنە شتێکی فوجائیو چاوەڕوان نەکراو بوو.... لەوەپێش باری پێوە نەگرتبوو خۆی بۆ ئامادە نەکردبوو. بۆیە ئەوەی روبەڕوی بۆوە لەمبارەو شتێکی تازەبوو. شائیعەو هەواڵێك بوو ئەگەر راست بوایە خەنجەرێکی کاریگەرو زەبرێکی گورچکبڕ دەبوو ئاڕاستەی تایبەتمەندترین شتێك کرابوو: کە مرۆڤ شانازی پێوە دەکاو هەوڵی پاراستنی دەدا، ئەویش شەرەفو کەرامەتە، هەواڵو شائیعە بڵاوبۆتەوە بەسەر دەمو زوبانی ئەمو ئەوەوە دەگوازرێتەوە نازاندرێ راستە یان درۆیە؟

لەم رووەوە ئێشو ئازاری ئەم بوختانە لەهەموو ئازارو کێشەو چورتمەکانی تر کاریگەرتر بوو، چونکە ئەم روداوە هەڵبەستراوە هاتە کایەوە، بۆئەوەی کتو پڕ هەستە نەفسانییەکەی پێغەمبەر بخاتە ناو چەواشەکارییەکی سەرنج راکێشەوەو نەتوانێ خۆی لێ بپارێزێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر نیگای ئاسمانی خێرا دابەزیایەو پەردەی لەسەر حەقیقەت هەڵبدایەوەو بوختانی دووڕووەکانی دەربخستایە، دەراوێکی رونی لەم تەنگژەو چورتمە دەکردەوەو شكو گومانی سەرنج راکێشی دەڕەواندنەوە. وەلێ ماوەی زیاتر لەمانگێك بەسەر ئەم کێشەیەدا

تێپەڕی، وەحیی ئاسمانی نەهاتە خوار مەسەلەکە یەکالا بکاتەوە، ئەمەش بوو بەسەرچاوەیەکی تری قەلەق و دڵە راوکێ و شك و گومان! لەگەڵ ئەوەشدا میحنەت و بەلای ئەو بوختانە حیکمەتێکی یەزدانی لەگەڵ خۆی هێنابوو: کە بریتی بوو لە دەرخستنی کەسایەتی پێغەمبەرو نیشاندانی بەشێوەیەکی صاف و بێ لەککەو لەسەنگی مەحەکدراوو پاڵفتە. بێگومان مانای «نبوة»ی صاف و بێگەرد لەژیانی پێغەمبەردا وێدەچوو لە وەهم و خەیاڵی بڕێ موسوڵمان و کافراندا لێڵی و تەم و مژێکی پێوە بمایە، ئەگەر روداوی بوختان بە عائیشەی خێزانی نەهاتایە کایەوە و کەسایەتی حەزرەتی محمدی بەو جۆرە نەهەژاندایەو ئاوا لە بۆتەی نەدایەو ئادەمیزادیە عادییەکەی لەمانای «نبوة» صافییەکەی جیانەکردایەوە! پاشان مشت و ماڵی مانای «نبوة»و وەحیی ئەنجامداو بە پاك و خاوێنی خستیە بەر فکرو ئەندێشەو تێڕوانین. بۆئەوەی هیچ مەجالێك نەمێنێتەوە بۆ تێکەلاوبوون و لێك گۆڕان لەنێوان «نبوة»و نێوان هەر مانایەکی تری نەفسی و شعوری.

بێگومان ئەم شائیعەو بوختانە گوزو گومەت بەر گوێچکەی پێغەمبەر کەوت و وەکوو ئادەمیزادێکی عادی مامەڵەی لەگەڵ کردو بیری لێ کردەوەو خستیە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوە، وەکوو هەر ئادەمیزادێکی تر لە چوارچێوەی ئەو عیصمەت و پارێزراوییەی بۆ پێغەمبەران دەستەبەر دەبێ.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ بەرەو روی ئەو کاریثەو بەلایە بۆوە وەکوو چۆن ئادەمیزادێکی ئاسایی بەرەو روی دەبێتەوەو ئاگای لە غەیب و نهێنی نیەو نازانێ مەبەستی هەڵبەستنی ئەو درۆیە چیەو سەرەنجامی چۆن دەبێ. بەبیستنی پەشۆکا وەکوو چۆن کەسانی ئاسایی پێی دەپەشۆکێن. گومانی بردو کەوتە دەریای گومانەوە وەکوو چۆن کەسانی

دی دەکەونە گومانەوە، کەوتە لێکۆڵینەوەو بیروڕا گۆڕینەوە ئەمدیوو ئەودیو کردنی باسەکە. هانای بۆ راوێژو پرس کردن بە هاوەڵانی برد، دەیەویست رێگا چارەیەك بدۆزێتەوەو لەو موشکیلە رزگاری بێ.

حیکمەتی یەزدانی داخوازی ئەوەبوو ئەم لایەنە مرۆڤایەتیەی حەزرەتی موحەممەد دەربخا بەبێ لەبەرچاو گرتنی صیفەتی «نبوة» تێیدا.

ویستی خودا وابوو نازڵبوونی وەحیی بۆ رونکردنەوەی ئەو کێشە دوابکەوێ‌و زیاد لە مانگێك درێژە بکێشێ. بۆئەوەی دوو حەقیقەت بۆ خەڵکی رون بێتەوە: کە هەریەکەیان گرنگی خۆی هەیە.

حەقیقەتی یەکەم ئەوەیە: حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەهۆی «نبوة»و پێغەمبەرێتییەوە لە رەوشتی ئادەمیزادی نەچووە دەرو وەکوو ئادەمیزادێك لە رەگەزی ئادەمیزاد دا مایەوە. نابێ کەسێك کە ئیمانی پێ هێنابێ وا تەصەور بکا کە حەزرەتی موحەممەد بەهۆی صیفەتی «نبوة»وە لە سنووری ئادەمیزادییەت دەرچووە، ئیتر لەم روانگەوە نیسبەتی شتی وای پاڵبداو پێی وابێ کاریگەری وای هەیە لەسەر روداوو کاروبار: کە تایبەتمەندە بەخودا خۆیەوە.

حەقیقەتی دووەم ئەوەیە: وەحیی ئاسمانی هەستێکی نەفسی نییە لەکیانی پێغەمبەر خۆیەوە پەیدابێ، یان ملکەچ‌و خاضعی ویستی خۆی بێ‌و بەهەوەسی ئەوو بۆ روانینی تایبەتی ئەو پەیدا ببێ. چونکە ئەگەر وابوایە پێغەمبەر ﷺ بەئاسانی دەیتوانی ئەم تەنگژەو موشکیلەیە بەکۆتا بێنێ‌و لەیەکەم ساتی پەیدابوونیدا چارەسەری بکردایەو ئەو خەم‌و نارەحەتیەی لە دڵ‌و دەروونی خۆی دەربهاویشتایە، ئاکام‌و نەتائیجی بنەبڕ بکردایە. چۆنی بەلاوە باش بوایەو لە بەرژەوەندی خۆی‌و خێزانیدابێ ئاوا وەحیی قورئانی بۆخۆی

برەخساندایە، ئیطمئنان و دڵنەوایی بخستایەتە ناو دڵ و دەروونی هاوەڵانی و دەمکوتی ئەوانەشی بکردایە کە رەواجیان بەو بوختانەداو بڵاوکردەوە. بەڵام پێغەمبەر ئەمەی نەکرد، چونکە ئەوە لە دەسەڵاتی ئەودا نەبوو!!

بابۆ رونکردنەوەی ئەم حەقیقەتە قسەکەی دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دەراز راگوێزی ئێرە بکەم: کە لەکتێبی خۆیدا بەناوی «النبأ العظیم» دەڵێ: ئایا دووڕووەکان نەکەوتنە هەلەکە سەماو جم و جوڵ بەهێنان و بردنی بوختانکردن بەخاتو عائیشە ﵂ هاتنە خوارەوەی نیگا دواکەوت، کێشەو تەنگژەکە درێژەی کێشا، خەڵك کەوتنە ناو قسەو باس و روچۆن و بیروڕا دەربڕین و رۆژ بەڕۆژ خانەوادەی پێغەمبەر بەو روداوە هەڵبەستراوە دڵتەنگ تر دەبوون، بەتایبەتی خودی پێغەمبەر زۆری پێ ناڕەحەتبوو، هەر دەیتوانی ئەوەندە بڵێ: «اني لا أعلم منها الا خيراً» من هەر خێرو چاکەم لە عائیشە بینیوە. ئەمجار پێغەمبەر دوای ئەوەی هێزو توانای خۆی خستە گەڕو پرسیاری لەم و لەوکردو راوێژی بەهەندێ لە هاوەڵانی کردو مانگێك بەسەر بوختان کردنەکەدا تێپەڕی و هەموو خەڵکی باوەڕ پێکراو دەیانگوت: «ما علمنا عليها من سوء» پێغەمبەریش دوای ئەو هەموو پرسیارو لێکۆڵینەوانە فەرمووی:

{يَا عَائِشَةُ أَمَّا إِنَّهُ بَلَغَنِي كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ، وَإِنْ كُنتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ}.

ئەمە قسەی پێغەمبەر بوو: کە هەڵقوڵاوی ناخ و ویژدانی بوو، وەکوو دەبینی قسەی کەسێکە هیچ لە غەیب و نهێنی پاش پەردە نازانێ. قسەی پیاوێکی راستگۆی دامەزراو: کە شوێن گومان ناکەوێ و لەخۆوە قسە ناکاو هەرچی زانیاری دەربارەی نەبێ نایڵێ. وێڕای ئەوە لەشوێنی خۆی نەجوڵا و زۆری پێ نەچوو کە سەرەتای سوورەتی «النور» نازڵ

بوو، پاکداوێنی خاتو عائیشەی چەسپاندو بڕیاری یەکالا کەرەوەی دەربارەی شەرەف و کەرامەتی ئەو خاتونە راگەیاند!!

ئەگەر نازڵبوونی وەحیی بەدەست پێغەمبەر خۆی بوایە چی مەنعی دەکرد: کە چەند رستەو وشەیەکی یەکالا کەرەوە هەڵبەستێ و لە یەکەم ساتە وەختی بلاوبوونەوەی پیلانەکەو بوختانەکە رایبگەیەنێ و بە وەحیی و نیگای لە قەڵەم بداو داکۆکی لە شەرەف و ناموسی خێزانی بکاو دەمکوتی بوختانچیان بکا!! وەلێ ئەوە هەرگیز رەوشتی حەزرەتی موحەممەد نیەو نەیکرد، چۆن دەبێ ئەو درۆ لەگەڵ ئادەمیزاد نەکاو درۆ لەگەڵ خودا بکا!!

{وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ – الحاقة/ ٤٤ - ٤٧}«١».

بێگومان خاتو عائیشە «خوای لێ رازی بێ» یەکەم کەس بوو کە ئەم دوو حەقیقەتەی لەلا بەرجەستە بوو، تەنانەت تووشی زێدەڕۆیی بوو لە یەکتا پەرستی و عوبودییەتدا بەجۆرێك جگە لەخودا هەموو شتێکی لەیادچوو، بۆیە کاتێك دایکی داوای لێ کرد کە هەڵسێ بچێ بۆلای پێغەمبەر سوپاسی بکا، لە وەڵامی دایکیدا وتی: نەخەیر نەدەچم بۆلای و نە سوپاسی دەکەم جگە لەخودا سوپاسی کەس ناکەم. خودا نیگای نازڵ کردو بەرائەتی منی راگەیاند. بێگومان ئەم قسەیەی خاتو عائیشە تا ئەندازەیەك نالایەقی بەرامبەر پێغەمبەر تێدایە، بەلام بارودۆخەکەی کە ئەوماوە دورو درێژە بەسەر ئەو خاتوونەدا تێپەڕی ئەم قسانەی پێکردن. ئەو لەژێر کاریگەری بارو دۆخەکەداو بەوەحیی ئەو حاڵەتەی کە ویستی خودا هێنایە دی بۆ چەسپاندنی بیرو باوەڕی

---

١ - بڕوانە: کتێبی ـالنبأ العظیم. دانراوی د. محمد عبدالله دراز، ص١٧.

موسوڵمانانو پوچەڵکردنەوەی پیلانی بوختان چیەکانو بێباوەڕەکانو دەرخستنی مانای راستی یەکتا پەرستیو ملکەچ کردن بۆ خوداو بەرجەستە بوونی کەماڵی عبودییەت بۆ خودا.

بەم جۆرە چیرۆکی بوختان حیکمەتێکی یەزدانی لەپشتەوە بوو ئامانجی چەسپاندنی عەقیدەی ئیسلامی بوو لە دڵو دەروونداو رەتکردنەوەی هەموو تەمو مژو چەواشە کارییەك کە ئاڕاستەی دەکرێ. بەڵێ ئەمە ئەو خێرو فەرەیە کە قورئان ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ:

{لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ – النور/١١}.

پێنجەم: لە چیرۆکی بوختاندا ئەوە هەیە کە شارەزاییمان دەکا بۆئەوەی کە لێدانی داری حەد بۆ بوختانچی مەشروعەو چەسپاوە، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بۆ هەموو ئەوانەی بە ئاشکرا هاوبەشی بوختانەکەیان کردبوو هەریەکەیان هەشتا داری حەدی لێدرا ئەمە هیچ ئیشکالێکی تێدا نییە.

ئەوەی جێگای ئیشکالە ئەوەیە کە ئەو کەسەی سەروکاری ئەو پیلانەی کردو ماکی فیتنەو بوختانەکە بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بوو داری حەدی لێ نەدرا، هۆی ئەوە وەکوو ئیبنولقەیم دەڵێ: عەبدوڵڵا سەروکاری پرۆژەی بوختانەکەی بە شەیتەنەتو وریاییەوە دەکرد، قسەی لەمو لەو کۆدەکردەوە بۆ خەڵکی تری دەگێڕایەوە بەڵام بەجۆرێك قسەکانی بڵاو دەکردەوە کە نیسبەتیان بۆلای ئەو نەدرێ، ئاشکراشە کە حەدی بوختان دەکەوێتە سەر کەسێك بە ئاشکرا بوختانەکە هەڵبەستێ و بەدەمی خۆی بڵاوی بکاتەوەو خۆی لێ بەرپرسیار بکا.

ئێستا باكۆتایی بە چیرۆكی بوختان بهێنین و هەر «دە» ئایەتەكەی سوورەتی «ألنور» راگوێزی ئێرە بكەین كە بەرونی و بێ پێچ و پەنا بەرائەتی عائیشە دەچەسپێنن و تاوانی ئەو بوختانە دەخاتە ئەستۆی دوو رووەكان و موسوڵمانە بەهەڵە چووەكان. دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ، لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ، لَوْلَا جَاؤُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاء فَأُوْلَئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ، وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ، إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ، وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ، يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ، إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ، وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ – النور/ ١١-٢٠}.

## غەزای «الخندق»

پێشی دەگوترێ غەزای ئەحزاب. ئەم غەزایە بەگوێرەی قسەی ئیبنو ئیسحاق و عوڕوەی كوڕی زوبەیرو قەتادەو بەیهەقی لە مانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی كوچی رویداوە، جەماوەری زانایانی سیرە ئەمەیان پەسەند كردووە. گوتەیەك هەیە دەڵێ ساڵی چوارەمی كۆچی رویداوە. ئەم قسەیە تەنیا موسای كوڕی عوقبە وتویەتی و بوخاری لێیەوە ریوایەتی كردووەو ئیمام مالیكیش لەوەدا هاوڕایەتی «١».

---

١ - بروانە: فتح الباری ٢٧٥/٢ والفتح الربانی بترتیب الامام احمد ٧٦/٢١.

هۆی ئەم غەزایە ئەوەبوو کۆمەڵێك لەڕیش سپی و سەرانی جولەکەی بەنو نەضیر سەردانی مەککەیان کردو لەگەڵ قورەیشدا کۆبوونەوە داوایان لێکردن بەهەموو لایەکیان گەلە کۆمەکی لە موسوڵمانەکان بکەن، پێیان وتن: ئێمە یارمەتیتان دەدەین و تا ریشەکێشیان نەکەین وازیان لێ ناهێنین، پێشیان گوتن: ئەو بیرو باوەڕەی ئێوە پەیڕەوی دەکەن زۆر لەو ئایینە باشترە کە موحەممەد هێناویەتی!! دەربارەی ئەوان ئایەتی:

{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللّهُ وَمَن يَلْعَنِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا – النساء/ ٥١-٥٢}. نازڵ بووە.

جا جولەکەکان لە مەککە لەگەڵ قورەیشییەکان پەیمانیان بەست کە شان بەشانی یەك دژی موسوڵمانەکان جەنگ بکەن و کاتی دیاریکراویان بۆ خۆیان دانا.

ئەمجار ئەو کۆمەڵە جولەکە لە مەککەوە رۆیشتن بۆلای هۆزی غەطەفان هەمان پێشنیارو داوایان ئاڕاستەکردن و لەگەڵیان خەریکبوون تا رازییان کردن بۆئەوە هاوکارییان بکەن بۆ شەڕ دژی موسوڵمانەکان. ئەمجار لەگەڵ هۆزی فزارەی کوڕی موڕڕە کۆبوونەوە رازییان کردن بە هاوبەشیکردن بۆشەڕ دژی پێغەمبەر. لەگەڵ هەموانیاندا شوێن و کاتیان دیاری کرد بۆ دەست پێکردنی شەڕو پەلاماردانی پێغەمبەرو هاوەڵانی.

## خۆئامادەکردنی موسوڵمانان بۆ شەڕ:

کە ئەو هەواڵانە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتن و بیستی کە قورەیشییەکان لەمەککە دەرکەوتون، بە تەفصیل ئاگاداری پیلان و گەلە کۆمەکییەکە بوون، ئیتر کەوتە خۆو هەواڵی لەشکر کێشی دوژمنی بە

هـاوەڵانی راگەیانـدو کەوتـە راوێـژکردن لەگـەڵیان. سـەلمانی فارسـی پێشنیاری هەڵکەندنی خەندەقی کرد بەدەوری مەدینەدا. موسوڵمانەکان ئەم پێشنیارەیان بەلاوە سەیر بوو، چونکە خەندەق لای عەرەبەکان باو نـەبوو لـەوەپێش بـەکاریان نـەهێنابوو، موسـوڵمانەکان لـە مەدینـە هاتنـەدەرو پێغەمبـەر ﷺ لـەبناری کێـوی «سـەلع» لەشـکری بـەزی پێکردن، کێوەکەیان خستە دواخۆیان و هەموویان تێکڕا دەستیان کرد بـە خەنـدەك لێـدان لـەنێوان خۆیـان و نێـوان دوژمنـدا. ئـەو رۆژە موسـوڵمانەکان سـێ هـەزار کـەس بـوون، ژمـارەی دوژمـن کـە لێیـان کۆبوونەوە بە قورەیش و ئەحزاب و هۆزەکانی تر دەهەزار بوون[١].

## چەند دیمەنێکی موسوڵمانەکان لەکاتی خەندەك لێداندا:

ئیمـامی بوخـاری لـە «ألـبراء»ەوە ریوایـەتی کـردووە دەڵـێ کـە رۆژی غەزای ئەحزاب هات، پێغەمبەر فەرمانی دا بـە لێدانی خەنـدەك بـەدەوری مەدینـەدا، بەچـاوی خـۆم پێغەمبـەرم دی گڵـی دەردەدا، تـەپ و تـۆز کـەوتبووە سـەر جەسـتەی، تەنانـەت مـووی ورگـی داپۆشـرابوو بـەگڵ و خـۆڵ، هەرچـەند ورگـی زۆر تـوکن بـوو بـەڵام مـن هیـچم نـەدەبینی. لـە ئەنەسـەوە ریوایـەت کـراوە کـە موهـاجیرو ئەنـصار لـەکاتی هەڵکەنـدنی خەندەکـدا شـیعری حەماسـییان دەخوێندنـەوەو گڵیـان بـە کـۆڵ دەگواستەوە دەیانگوت:

نحـــن الـــذين بـــايعوا محمـــداً
علـــى الإســـلام مـــا بقينـــا أبـــداً

---

١ - سيرة ابن هشام وطبقات ابن سعد باختصار.

ئێمەین بەڵێنمان بە موحەممەد داوە لەسەر پابەندبوون بە ئیسلام تا گیانمان لە جەستەدابێ لەسەر ئەم ڕێبازە بەردەوام دەبین.

پێغەمبەر ﷺ وەڵامی بۆ دەستاندنەوەو دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ إِنَّهُ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ فَبَارِكْ فِي الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ}.

واتە: خودایە خێرو بێری بەڕاستی خێرو بێری قیامەتە هەر ئەو خانوی مانەوەو جاویدانییە، بەرەکەتو فەڕ بخەرە کارو کردەوەی ئەنصارو موهاجیرەکانەوە.

ئیمامی بوخاری دووبارە لە صەحیحەکەیدا ریوایەتێك لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئێمە ڕۆژی هەڵکەندنی خەندەك بەردێکمان هاتە پێش، چەندێك هەوڵماندا بۆمان نەشکا، عەرزی پێغەمبەریان کرد کە دەمارە شاخێك هاتۆتە بەرمان هەرچی لێی دەدەین بە کوێن‌و چەکوچ ناشکێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بۆی دەچمە خوار، کە هەڵسایە پێ دیتم لەبەر برسیەتی بەردی لەسەر ورگی بەستبوو، سێ ڕۆژ بوو زەوادمان نەخواردبوو. ئیتر پێغەمبەر ﷺ پیکەکەی هەڵگرت‌و بە بەردەکەی کێشاو وردو هاڕی کرد. عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیزنم بدە تا مالەوە دەچم، کە چوومەماڵەوە بەخێزانم گوت: شتێکم بە پێغەمبەرەوە بینی ئارامم لێ براوە، ئایا هیچ خواردنێکمان هەیە، شتێکت لایە پێغەمبەر بانگ بکەم بۆ ماڵەوە بیخوا؟ وتی: جۆمان هەیە لەگەڵ کوێشتیریك. هەر خێرا کویشێرەکەم سەربڕی‌و جۆیەکەم هاڕی‌و گۆشتەکەمان خستە ناو مەنجەڵەوەو ئاگرم ژێردا. هەویر سازکرابوو گۆشت لەسەر ئاگربوو نزیکبوو بکوڵێ.

هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزم کرد: خواردنێکمان هەیە تەشریفت لەگەڵ یەکێك یان دوو کەس لە هاوەڵان بفەرموون بۆ ماڵی خۆمان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردنەکە چەندە؟ عەرزم کرد:

ئەوەندەیە. فەرمووی: زۆرو بەرەکەت ئامێزە، بچۆ بەخێزانت بڵێ: گۆشتەکە لە مەنجەڵەکە دەرنەکاو نانەکەش دەرنەکا تاخۆم دێم، ئەمجار بانگی لە موهاجیرینو ئەنصار کرد هەڵسن بابچین بۆ ماڵی جابیر. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە فەرمووی: ئەی ئەهلی خەندەك جابیر خواردنی ئامادە کردووە بابچین بیخۆین. کە جابیر گەیشتە ماڵەوە چووە لای خێزانی وتی: ماڵ وێران پێغەمبەر بەخۆیو هەموو موهاجیرو ئەنصارەوە هاتوون بۆ ئەو تۆزە خواردنەی ئێمە!!... خێزانی پێی گوت: باشە پێغەمبەر لێی پرسی خواردنەکە چەندە؟ وتی: بەڵێ لێی پرسیمو منیش عەرزم کرد ئەوەندەیە، وتی: دە خەمت نەبێ.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆنە ژوورو پاڵە پەستۆ مەکەن بەدەستی موبارەکی نانەکەی کەرت دەکردو گۆشتاوی بەسەردا دەکرد دەیدا بە هاوەڵانی، بەم جۆرە نانی دەردێناو وردی دەکردو گۆشتاوی بەسەردا دەکردو دەیدا بە هاوەڵان تا هەموویان تێریان خواردو هێشتا لێی مابووەوە. بەخێزانی جابیری فەرموو: ئەمە بخۆنو چی مایەوە بۆ کەسانی تری بنێرن چونکە خەڵك تووشی برسیەتی هاتوون. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە جابیر دەفەرموێ: سوێندم بەخودا هەموویان تێریان خواردو ڕۆیشتن، گۆشتاوەکە وەکوو خۆی مابوو هەویرەکەمان وەکوو خۆی مابووەوە«[1]».

## هەڵوێستی دووڕووەکان لەکاتی خەندەك لێدان دا

ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە: کە چەند کەسێك لە دووڕووەکان تەمبەڵییان دەکرد لە هەڵکەندنی خەندەکدا، دەگەڕان بیانوێکی پچوك بدۆزنەوە تا خۆیان بدزنەوەو بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە بەبێ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیزنیان بداو ئاگاداری چونەوەیان بێ. بەڵام هاوەڵان: کە ئیشێکی

---

١ صحیح بوخاری ٤٦/٦، بڕوانە: فتح الباری ٧/ ٢٧٩ — ٢٨٠.

زەروریيان بويايەو ناچاربونايە بچن ئيزنيان لە پێغەمبەر دەخواستو ئيزنى دەدان. كە ئيشەكەيان جێبەجێ دەكرد خێرا دەگەڕانەوە بۆ خەندەك لێدان، دەربارەى ئەمانە ئايەتى:

{إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - النور/٦٢} نازڵ بوون!.

## پەشيمان بوونەوەى بەنو قورەيظە لە عەهدو پەيمان

حويەى كوڕى ئەخطەبى «النضرى» هاتە لاى كەعبى كوڕى ئەسەدى «ألقرظى» هەڵينا بۆ ئەوەى پەيمانى خۆيان لەگەڵ پێغەمبەر هەڵوەشێننەوە پێى گوت: من هەموو قورەيشم هێناوە بە پياو ماقوڵو ريش سپيانەوە لە «مجتمع الأسيال» دام بەزاندونو لەشكر بەزيیان كردووە. هۆزى غەطەفانم هێناوە بەهەموو پياوى ناودارو سەرەك هۆزو قسە رۆيشتويانم لە تەنيشت كێوى ئوحود لە «ذنب نقى» لەشكر بەزيم پێ كردون، هەموويان وادەو بەڵێنيان پێداوم: كە نەگەڕێنەوە هەتا موحەممەدو هاوەڵانى لە رەگو ريشە وەدەردێنن. كەعب پێى گوت: سوێندم بەخودا خوێڕىو هەتيومچەى رۆژگارت بۆ هێناوين. ماڵوێران! ئەى حويەى! وازم لێ بێنە، با لەسەر بارودۆخى خۆم بەردەوام بم، چونكە تا ئێستا جگە لەڕاستىو وەفادارى هيچى ترم لە موحەممەد نەبينيوە.

حويەى وازى لە كەعبى كوڕى ئەسەد نەهێنا تارازى كرد خيانەت بكاو وادەو پەيمانەكەى هەڵوەشێنێتەوە. ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەيشت، سەعدى كوڕى مەعاذى نارد بۆئەوەى لەم هەواڵە بكۆڵێتەوە، ئەگەر هەواڵەكە راست بوو بە ئاماژە پێغەمبەر تێبگەيەنێ، خۆئەگەر

هەواڵەکە درۆ بوو با بەئاشکراو دەنگی بەرز هەواڵەکە پوچ بکاتەوە. کە سەعد چوو لە هەواڵەکەی کۆڵیەوەو بۆی دەرکەوت کە راستە، گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر عەرزی کرد: بەڵێ جولەکە پەیمانیان شکاندووە وەکوو «عضل» و «قارە»ن واتە: ئەمانیش پەیمان شکێنییان کردووە. عەضل و قارە ئەوانە بوون کە خیانەتکاری «رەجیع»یان ئەنجامدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {اللهُ أَكْبَرْ أَبْشِرُوا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ}.

## ئەو بارودۆخەی لەوساتە وەختەدا موسوڵمانەکان تێی کەوتبوون

هەواڵی پەیمان شکێنی بەنو قورەیظە بە موسوڵمانەکان گەیشت، دووڕووەکان دەستیان کرد بە پڕو پاگەندەو بڵاوکردنەوەی ترس و دڵە راوکێ و پشت سارد کردنەوەی موسوڵمانان. لەهەموو لایەکەوە دوژمن گەمارۆی دان، لەسەرەوە، لە خوارەوە دوژمن پەلاماری دان. دووڕووەکانیش کەوتنە خۆ بۆ بڵاوکردنەوەی ترس. تەنانەت هەبوو بە تەوسەوە دەیگوت: موحەممەد وادەی ئەوەی پێداین لە گەنج و خەزینەی کیسراو قەیصەر بخۆین، کەچی ئێستا یەکێکیان لەخۆی ئەمین نیە بچێ بۆ شوێنی مێزکردن و ئاودەست. کە دەچێ بۆ شوێنی قەزای حاجەت بە ترس و لەرزەوە دەچێ. پێغەمبەر ﷺ کە بەم شێوە وەزعەکەی بینی و بۆی دەرکەوت بەڵاو کارەساتەکە زۆر کاریگەرەو موسوڵمانەکان ترسیان لێ نیشتووە، ناردی بەدوا سەعدی مەعاذو سەعدی کوڕی عوبادەو راوێژی پێ کردن دەربارەی ئەوەی لەسەر سێیەکی میوەی مەدینە صوڵح لەگەڵ هۆزی غەطەفاندا بکاو دەست لەشەڕکردن دژی موسوڵمانەکان هەڵبگرن. وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کارە خۆت حەزت لێیەو بەلاتەوە پەسەندەو دەتەوێ ئێمە پابەندی بین، یان شتێکە خودا فەرمانی پێ کردوی؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناوەڵڵا بەڵکوو ئەوە شتێکە دەیکەم بۆ بەرژەوەندی ئێوەو بۆئەوەی کەمێك دوژمن بێ

هێـز بکـەین. لەوکاتـەدا سـەعدی کـوڕی موعـاذ وتـی: بـەخودا ئێمـە پێویستمان بەوە نییە سەرانەو بەرتیل بدەین بەوان، نەبەخوا جگە لە شمشێر بەهیچ شتێکی تر قسەیان لەگەڵ ناکەین، هەتا خودا حوکمی نێـوان ئێمـەو ئـەوان دەکـا. ئـیتر بـەم قـسانەی سـەعد پێغەمبـەر ﷺ روخساری گەش بۆوە پێی فەرموو: هەرئەوە لەئێوە چاوەڕوان دەکراو ئێوە شیاوی ئەون.

ئیبنو ئیسحاق لە عاصیمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادەو محمدی کوڕی شیهابی «الزهري»یەوە دەڵێ: لەنێوان موسوڵمانانو غەطەفاندا نە شەڕ نە صوڵح هیچیان نەبوون، تەنها تەنگژەو راسانو لێك مۆڕ بوونەوە رویدا[١] موشریکەکانیش کەهاتن روبەڕوی خەندەق بوونەوەو لەوەپێش شتی وایان نەبینیبوو، وتیان: ئەمە نەخشەو پلانێکە عەرەب تائێستا نەیانزانیوە. ئەمجار لەدەوری خەندەك لەشکربەزییان کردو دەورەیاندا. شـەڕ روینـەدا، جگـە لـەوەی هەنـدێ لـە موشـریکەکان ویـستیان لـە شوینێکی تەسکی خەندەکەوە بپەڕنەوە، موسوڵمانەکان لەو شوێنەدا پێشیان پێ گرتن، هەندێکیان گەڕانەوەو هەندێکیشیان کوژران. یەکێك لەوانەی کوژران عەمری کوڕی ودد بوو عەلی کوڕی ئەبو تالیب کوشتی.

## شکانی موشریکەکان بەبێ شەڕ

پەروەردگار دوو هۆکاری رەخساندن بۆ روخانی ورەی موشریکەکان موسوڵمانەکان چ دەورێکیان تێیاندا نەبوو.

هۆکـاری یەکـەم: پیـاوێکی موشـریك بـوو نـاوی «نوعـەیم»ی کـوڕی مەسعود بوو هاتە لای پێغەمبەرو موسوڵمان بوو ئەمجار عەرزی کرد چ ئەرکێکی پێ دەسپێرێ جێبەجێی دەکا. پێغەمبـەر ﷺ پێـی فـەرموو:

---

١ - بڕوانە: سیرەی ئیبنو هیشام ٢٢٣/٢ وتاريخ الطبرى ٥٧٣/٢.

ئەتۆ ئێستا یەکێکی لەئێمە، بەڵام تۆ خۆت لەئێمە دابڕەو خۆت لێمان نزیك مەکەرەوە، چونکە شەڕ پیلان‌و فڕوفێڵە.

نەعیمی کوڕی مەسعوود چووە لای بەنو قورەیظەو «وایان زانی ئەو تائێستا موشریکە» پێی گوتن: ئێوە تا بارمتە لە قوڕەیشییەکان وەرنەگرن هاوبەشی شەڕکردن شان بەشانی ئەوان دژی موسوڵمانەکان مەکەن. نەوەکوو پشتتان تێ بکەن‌و بەتەنیا جێتان بێڵن‌و ئەوکاتە بکەونە بەر حەملەی موسوڵمانەکان، وتیان: راست دەکەی رایەکەت پەسەندە. ئەمجار چووە لای قوڕەیشییەکان‌و هەواڵی پێدان کە بەنو قوڕەیظە لە پەیمانەکەیان پەشیمان بوونەوە، بەنهێنی لەگەڵ موحەممەد رێك کەوتوون: کە ژمارەیەك لەپیاو ماقوڵانی قوڕەیش بڕفێنن‌و تەسلیمیان بکەن بە موسوڵمانەکان بۆئەوەی بیانکوژن، پێی گوتن: ئەگەر جولەکەکان ناردیان بۆلای ئێوەو داوایان لێ کردن بارمتەیان بدەنێ، نەخەڵەتابن یەك کەس بکەنە بارمتە لایان. ئەمجار چووە لای هۆزی غەطەفان هەمان قسەی بە قوڕەیشییەکانی گوتبوو بەوانیشی گوت. بەمجۆرە هەموو لایەنەکانی لەیەکتر هانداو بتمانە لەناویاندا نەما، هەریەکە لەلایەنەکان لایەنەکەی تری تۆمەتبار دەکردو غەدرو خیانەتیان پاڵ یەکتر دەدا.

**هۆکاری دووەم**: بۆ شکانی ئەحزاب رەشەبا و گێژەڵوکەیەکی بەهێزو ترسناك لە شەوێکی زۆر تاریك‌و تۆنەك دا هەڵی کرد، بەجۆرێك هەرچی خێمەیان هەبوو هەڵی کەند، مەنجەڵ‌و دیزەی هەموو سەرەو نقون کردنەوەو پشێوی خستە ناو لەشکرەوە، ئەمەش دوای زیاتر لە پانزە رۆژێك گەمارۆدان‌و دەورەدان رویدا.

ئیمامی موسلیم بە سەنەدی خۆی لە حوذەیفەی کوڕی «الیمان»ەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: شەوی ئەحزاب زریان‌و رەشەبایەکی سارد لێی

داین پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێك پچویایە هەواڵی وەزع و حاڵی دوژمنی بۆ بهێنامایەوە بمانزانیایە بەم سەرما و زریانە چییان لێ هاتووە؟ ڕۆژی قیامەت لەگەڵ خۆم دەبێ، کەسمان وەڵامی نەدایەوەو هەمووومان بێدەنگ بووین، سێجار ئەم فەرموودەی دووبارە کردەوە کەس ئامادە باشی دەرنەبڕی. ئەمجار فەرمووی: ئەی حوذەیفە هەڵسە بڕۆ بزانە سوپای دوژمن چی بەسەرهاتووە؟ هەواڵی روداومان بۆ بێنەوە، ئیتر چونکە بە تەحدید ناوی منی هێنا و فەرمانی بەمن کرد چارم نەماو نەمتوانی نەچم. فەرمووی: بچۆ هەواڵی سوپای دوژمنم بۆ بێنەوە بەڵام مەیان وروژێنە. دەڵێ: کە هەڵسام بەڕێ کەوتم هەستم بەهیچ سەرما و زریان نەکرد، دەتگوت بەناو گەرماودا دەڕۆم. هەتا لێیان نزیك بوومەوە، ئەبو سەفیانم بینی پشتی خۆی بەئاگر گەرم دەکردەوە، تیرێکم خستە کەوانەوە ویستم تێی بگرم، بەڵام ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەرم هاتەوە یاد کە فەرمووی: مەیان وروژێنە. ئەگەر تێم بگرتایە دەم هەنگاوت.

ئیتر بەڕێی خۆمدا گەڕامەوە، هەواڵ و بارودۆخی دوژمنم بۆ گێڕایەوە، کە لێ بوومەوە، عەبایەکی زیادەی هەبوو نوێژی پێوە دەکرد، کردیە بەرم. ئیتر خەوم لێ کەوت تا بەیانی، لەدەنگی پێغەمبەر بەخەبەر هاتم کە بانگی لێ کردم «قم یا نومان!» هەڵسە زۆر نوستو، کونە خەو!

ئیبنو ئیسحاق بە زیادەیەکەوە ریوایەتی کردووە کە حوذەیفە گوتویەتی: چوومە ناو خەڵکەکەو ڕەشەباو زریان سوپای پەروەردگار کارێکی پێ دەکردن «کوردی گوتەنی ڕەشەبا بە دەواری شڕی نەکا». نە مەنجەڵ و دیزەو مەرکانەیان بەپێوە دەوەستا و نە ئاگریان بۆ هەڵدەگیرسا، نە ڕەشماڵ و خێمەیان بۆ هەڵدەدراو نە رادەوەستا. گوێم لێ

بوو ئەبو سەفیان کەوتە هاوارو جاڕدان ئەی هۆزی قوڕەیش با هەرکەسە بزانێ کێ لە پەناوەیەتی.؟

حوذەیفە دەڵێ: دەستی ئەو پیاوەم گرت کە لەپەنامەوە بوو، وتم: ئەتۆ کێی؟ وتی: فلانی کوڕی فلان.

ئەمجار ئەبو سەفیان وتی: ئەی هۆزی قوڕەیش! وەڵلاهی ئێوە کەوتوونە حاڵێکەوە لە شوێنێکدان بە کەڵکی تێدا مانەوەمان نایە. ئەسپ‌و حوشترمان هەمووی فەوتا. بەنو قوڕەیظە خیانەتیان لێ کردین، هەواڵی زۆر نا خۆش‌و خیانەتکاری ئەوانمان پێ گەیشتووە، دەشزانن ڕەشەبا‌و زریان چی پێکردوین، خێرا خۆتان بپێچنەوەو باربکەن‌و بڕۆن من ئەوا خۆم ئامادە دەکەم بۆ ڕۆیشتن«١».

لە بەیانی ڕۆژی دووەمدا موشریکەکان هەموویان گەڕابوونەوە بەرەو مەککە قاچاندبویان. پێغەمبەرو هاوەڵانی گەڕانەوە بۆ مەدینە.

پێغەمبەر ﷺ ماوەی ئەو گەمارۆدانەی ئەحزاب بەشەوو بەرۆژ خەریکی پاڕانەوەو دوعا کردن بوو، داوای لەخودا دەکرد: کە سەرکەوتن بە موسوڵمانان ببەخشێ، بەشێك لەدوعاو پاڕانەوەکەی ئەوەبوو دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ ، اللَّهُمَّ اهْزِمِ الأَحْزَابَ ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ }«٢».

لەم غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خۆیدا نەیتوانی نوێژ بکا. لەدوای تێپەڕبوونی کاتەکەی بە قەزا گێڕایەوە.

---

١ - رواه مسلم ١٧٧/٥ ورواية البخارى توهم ان الذى خرج انما هو الزبير غير ان ذلك يتعلق بحادثة أخرى، فقد أرسله النبي ليعلم له علماً عن بنى قريظة اما الذى خرج الى الأحزاب فهو حذيفة.

٢ - رواه البخارى.

لە صەحیحەیندا هاتووە: کە عومەری کوڕی خەتاب دوای نوێژی شێوان لەکاتی غەزای خەندەکدا هات و جوێنی بەکافرەکانی قوڕەیشدا. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نوێژی عەصرم بۆنەکرا تا خۆرئاوا بوو! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەخودا منیش نوێژی عەصرم نەکردووە، عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێ: ئەمجار هەڵساین چوین بۆ «بطحان» پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و ئێمەیش دەستنوێژمان گرت، نوێژی عەصری کرد دوای خۆرئاوا بوون. ئەمجار نوێژی شێوانی کرد«[١]».

ئیمامی موسلیم لەسەر ئەمەوە فەرموودەیەکی زیادکردووە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی ئەحزاب فەرمووی: قوڕەیشییەکان ئێمەیان بێ ئاگا کرد لەبەر مەشغوڵیمان نوێژی عەصرمان لەبیرچوو خودا ماڵ و گۆڕیان پڕبکا لەئاگر. ئەمجار نوێژی عەصری بەقەزا لەنێوان نوێژی شێوان و نوێژی عیشادا گێڕایەوە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەم غەزایە دووبارە وەکوو دەبینی هۆکارەکەی غەدرو خیانەتی جولەکە بوو، ئەوان بوون خەڵکیان ووروژاندو خەڵکیان کۆکردەوەو هانیاندان بۆ هێرش بردن و گەمارۆدانی موسوڵمانەکان، خەڵکیان کۆکردەوە، ئەم جم و جوڵانە تەنها پەیوەست نەبوون بەهۆزی بەنی نەضیرەوەو بەس، بەڵکوو بەنو قوڕەیظەش هاوکاری بەنو غەطەفانیان کرد لە هەڵوەشاندنەوەی عەهدو پەیمان لەگەڵ موسوڵمانەکان هەرچەندە هیچ بیانوێکیان لە موسوڵمانەکانەوە دەست نەکەوتبوو بیکەنە پاساو بۆ پاشگەزبونەوەکەیان. ئێمە پێویستمان بە تەعلیقدان لەسەر ئەمەنیەو

---

١ - متفق علیه واللفظ للبخاری.

پێویست ناکا پەندو ئامۆژگاری لێ دەربێنین، غەدرو خیانەتی جولەکە بەرامبەر موسوڵمانان شتێکی بەڵگە نەویستو حاشا هەڵنەگرەو مەقولەیەکی مێژوویی مەشهورو بەرچاوەو لەهەموو شوێنێكو لەهەموو رۆژگارێك دووبارە بۆتەوە.

با ئێستا بگەڕێینەوە بۆ ئەو روداوانەی لەم غەزایەدا رویانداو لێیان وردبینەوەو بزانین پەندو ئامۆژگارییو حوکمو یاسای چی لێ هەڵدەگوازین.

یەکەم: لە تێکڕای ئەو وەسائیلە جەنگیانەی موسوڵمانەکان لەم جەنگەدا بەکاریان هێنا هەڵکەندنی خەندەك بوو بەدەوری مەدینەدا. غەزای ئەحزابیش یەکەم غەزابوو لە مێژووی عەرەبو موسوڵماناندا خەندەکی تێدا لێ بدرێ. چونکە هەڵکەندنی خەندەك لای عەرەب باونەبوو، لەلای نەتەوەی ناعەرەب «الأعاجم» پەیڕەو دەکراو بەکاردەهات. ئەوەشمان زانی ئەو کەسەی پێشنیاری ئەوەی کرد لەم غەزایەدا سەلمانی فارسی بوو، ئەوەشت زانی پێغەمبەر ﷺ بە پێشنیارەکەی سەلمان موعجەب بوو، خێرا بانگی هاوەڵانی کرد بۆئەوەی دەست بەکاربنو ئەو مەشروعە جێبەجێ بکەنو بەزوترین کات خەندەك لێ بدرێ.

ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەرو قبوڵکردنی پێشنیارەکەی سەلمان بەو شێوەی لەوەپێش باسکرا بەڵگەیەکە لەو حەمکە بەڵگانەی ئەوەمان پێنیشان دەدەن کە حیکمەتو عەقڵ بەکارهێنان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ تەنگژەو چورتم چەند شتی بەنرخو لێ گومبوی موسوڵمانانو دەبێ هەمیشە بەدویاندا بگەڕێنو هەر لەگەڵ دۆزیانەوە خێرا هەڵی بگرنو لە شوێنی شیاوی خۆی دای بنێنو نەهێڵن لە کیسیان بچێ. بەڵکوو موسوڵمان لەهەموو کەس شیاوترە بەوەی چی

باشە بۆ ژیانو بەرەو پێشەوە چوونیو فێربوونی نەخشەو پیلانی شەڕو بەرگری بیانقۆزێتەوەو سودیان لێ وەربگرێ. شەریعەتی ئیسلامی چەندێك دژی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی بێگانەیە، ئەوەندە بەلایەوە پەسەندە موسوڵمانان هەموو هۆکارێکی خێرو سەرکەوتنو مەبادیئو فیکرەی بەسوود بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

قاعیدەی ئیسلامی گشتی لەمبارەوە ئەوەیە: کە پێویستە موسوڵمان بەهەموو شێوەیەك عەقڵی ئازادی خۆیو بیری وردی لەسلوكو هەموو کاروبارێکیدا بخاتە گەڕو هیچ کاتێك لەکاریان نەخا، کۆتو زنجیرو خەفەیان نەکا. جا ئەگەر موسوڵمان بەم شێوە جوڵایەوەو ئاوا هەڵسو کەوتی کرد ئەوە بێگومان رێگە بەخۆی نادا پەتێك لەملی خۆی بخاو سەرەکەی بداتە دەست کەسانی تر بۆ کوێیان بوێ رایکێشنو کوێرانە دوایان بکەوێ!! هەروا مومکین نیە موسوڵمان خۆی لەئاست هەر مەبدەئو عەمەلو یاسایەك گێل بکا کە عەقڵی سەلیمو مونەوەرو فیکری ئازاد پەسەندی بکەنو لەگەل شەریعەتی ئیسلام بگونجێو یەکبگرێتەوە، نابێ موسوڵمان بەبێ تێفکرینو وردبوونەوە بەسەر ئەوشتانەدا رابورێو ئەرکی ماندوبوونێك نەخاتە ئەستۆی خۆی لە بەهرەو کاری باشی کەسانی دی سود وەرنەگرێ.

ئەم سلوکە پەسەندە ئەو سلوکەیە کە خودا بۆ موسوڵمانی بەڕەوا داناوەو بۆی تەشریع کردوو. لە بنەمایەکی سەرەکی مرۆڤەکە ئەو کەرامەتو رێزەیە خودا ئاوێتەی ئینسانی کردووەو فیترەتی ئەوی لەسەر دارشتووەو حیکمەتی وا داخواز بووە کە بیکاتە گەورەی مەخلووقاتی خۆیو هەموو بونەوەری بۆ سوودی ئەو رامکردووە. پابەندبوون بە بەندایەتیکردن بۆ خوداو پەیڕەوکردنی شەریعەتی پیرۆزی، زامنو بەرعودەیە، پارێزگاری ئەو کەرامەتو سیادەتە دەکا.

**دووەم:** لەو مەشهەدو نمایشەی رامانئواند لە کارکردنو هەوڵو تێکۆشانی هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا لەماوەی هەڵکەندنی خەندەقدا، عیبرەتو پەندی گەورەی لێ وەردەگیرێ، کە حەقیقەتی یەکسانیو هەمئاهەنگییەکی تێدا رەنگ دەداتەوە: کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەناو تاکەکانیدا دەیچەسپێنێ، عەدالەتو یەکسانیەکمان بۆ رووندەکاتەوە کە لە ئیعتیباری ئیسلامیدا تەنیا شیعارو رەمزێك نیە بەڕواڵەت کۆمەڵگەی پێ جوان بکرێ، یان بخرێتە ناو چوارچێوەیەکی بریقەدارو بەس! بەڵکوو عەدالەتو یەکسانی دوو بنەمای واقیعی ئەوتۆن: کە قییەمو مەبادیئی ئیسلامی بەگشتی لەوانەوە سەر هەڵدەدەن، ماکی رەوشتە بەرزەکانن بە ئاشکراو بەنهێنی.

ئەتۆ بڕوانە پێغەمبەر نەهات فەرمان بە موسوڵمانان بکا بەهەڵکەندنی خەندەقو ئەوان بخاتە کارو بۆ خۆی بڕوا لە قەصرو باڵەخانەیەکی بەرزەوە چاودێرییان بکاو بۆ خۆی پاڵی لێ بداتەوەو پاروی چەور بگلێنێ!!

یان نەهات لە ئیحتیفالو کۆبوونەوەیەکی بەرفراواندا پاچو خاکەنازی یەکێك لە هاوەڵان بەسەری پەنجەی بگرێ، گوایە دەستکرا بە هەڵکەندنی خەندەكو واخۆ دەربخا کە هاوبەشی ئیشەکەی کردووە، ئەمجار پاچو چەکوچەکە دابنێو خۆی بتەکێنێو تەپو تۆز لەخۆی بکاتەوە. نەخەیر وای نەکرد، بەڵکوو پێغەمبەر ﷺ هاوکاری هەڵکەندنی خەندەکی کرد وەکوو هەریەکێ لە هاوەڵانو بەوپەڕی هێزو تواناو خاکییانە شانی بەر ئیشکردندا، تاوای لێهات تەپو تۆز هەموو جەستەی داپۆشیو کەس لە هاوەڵانی تر جیای نەدەکردەوەو زۆر لەوان برسی تررو ماندوتر بوو، شیعری رەجەزو حەماس ئامێزیان دەخوێندنەوە بۆئەوەی نیشات پەیدابکەن پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیان

نیوە شیعری رەجەزی بۆ دەگوتنەوە. هاوەڵانماندو دەبوون برسیان دەبوو پێغەمبەر ﷺ لەهەمووان ماندوترو برسی تربوو، ئەوەیە حەقیقەتی یەکسانیو دادپەروەری: کە شەریعەتی ئیسلام لەنیوان فەرمانڕەواو خەڵکدا، لەنێوان دەوڵەمەندو هەژارو ئەمیرو صەعلوکدا چەسپاندویەتی. ئەتۆ نابینی فەرعێك لە فەرعەکانی شەریعەتو حوکمەکانی، ئیللا لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوەو بەرعودەی ئەم مافەیە.

پەنا دەگرم بەخودا: کەتۆ هەڵەی وابکەیو ئەم هەڵسو کەوتەی پێغەمبەرو هاوەڵانی کە ئاماژەی بۆکرا ناوبنێی دیموقراتی لە سلوکدا یان لە فەرمانڕەواییدا! چونکە نێوان ئەو دابو نەرێتەی پێغەمبەرو هاوەڵانی پەیڕەویان دەکردو ئەوەی ناوی لێ نراوە دیموقراتی عاسمانو رێسمانەو «قیاسی کەشکێیە لە مەشکێ»!!

سەرچاوەی ئەو یەکسانیو عەدالەتەی لە ئایینی ئیسلامیدا هەیە بەندایەتیکردنو ملکەچییە بۆ خودا. ئەوەش صیفەتێکی عامو گشتگیرە بۆ ئادەمیزاد هەموویان، یاسای ئیسلام هەموو مرۆڤەکان دەخاتە یەك ریزو یەك ئیعتیباریان بۆ دادەنێ. سەرچاوەی دیموقراطیەت بەرچاو گرتنی رای زۆرینەیە. واتە: ملکەچکردن بۆرای زۆرینە، جا تەبیعەتو نیازی ئەو زۆرینەیە هەرچییەك بێ.

لەسەر ئەم بنەماو قاعیدەو یاسایە شەریعەتی ئیسلام ئیمتیازاتو چینایەتی تێدانیە، کۆمەڵێك حەصانەو پاریزراوی نیەو کۆمەڵێك نەیانبێ. هیچ بیانوو پاساوێك نیە بۆ دروستبوونی چینایەتی کوتلەبازی، چونکە صیفەتی بەندایەتیو ملکەچکردن بۆ خودا، هەموو جوداوازیو فەواریقێك دەتوێنێتەوەو ئیعتیباری بۆ دانانێ.

سێیەم: هەر لەم مەشهەدە خۆیدا پەندو ئامۆژگاری تر هەن دیاردەی پێغەمبەرایەتی لە کەسایەتی موحەممەدا خۆی دەنوێنێو دەتخاتە

بەردەم حاڵەتێك كە ئەندازەی خۆشویستنی پێغەمبەر بۆ هاوەڵانی دیاری دەكاو لێیەوە دەزاندرێ كە تەشریفی چەند دڵسۆزی هاوەڵانی بووەو ئەوانیش چەند ئەو زاتەیان خۆشویستووە. لەمەشەوە بەنموونەی موعجیزەیەكی تری ئەو پێغەمبەرەمان ئاشنا دەبین كە پەروەردگار بۆ رێزنان لە پێغەمبەرەكەی رەخساندونی.

ئەو دیاردەی لە كەسایەتیە پێغەمبەرایەتیەكەوە بەرچاومان دەكەوێ بریتییە لە روبەڕوبوونەوەی ئەو برسیاتیە كوشندەیەی ناچاری كردبوو بەرد لەسەر وەرگی خۆی ببەستێ و ئازاری برسیایەتی بەهۆی ئەو بەردەوە كەمێك سووك بكا. دەیباشە چی پێغەمبەری وا لێكرد تەحەمولی ئەو جۆرە برسیاتیە بكاو بەو برسیاتیە هاوكاری هەڵكەندنی خەندەك بكاو كام كارەی قورس و گرانە لە ئەستۆی بگرێ؟ ئایا بەتەمای زەعامەت و پاشایەتی ئەوەی كرد؟! یان حەزی لە كۆكردنەوەی ماڵ و سامان بوو!... یان ویستی شوێنكەوتەو هەوا خواهان بۆ خۆی زۆربكا؟ هەموو ئەو شتانەو تەماعكاری تێیانا دژایەتیەكی ئاشكرایان هەیە لەگەڵ ئەو ماندوبوون و برسیایەتیەی پێغەمبەر ﷺ لەپێناو بڵاوكردنەوەو گەیاندنی ئایینی ئیسلامدا دەیچەشتن. چەند دوورو عەقڵ نەگرە پیاوێك تەماعی لە جاهو شكۆمەندی و مڵك و دەسەڵاتداریدا هەبێ و بۆ بەدەستهێنانیان صەبرو تەحەمولی لەسەر ئەو ئازارو ماندوبوونە هەبێ!!

بێگومان ئەو شتەی هەڵی دەنێ بۆ تەحەمولكردنی ئەو جۆرە ئازارو نارەحەتیە، بەرپرسیاریەتی پێغەمبەرایەتی و ئەمانەتی ئەو پەیامەی خراوەتە ئەستۆی و گەیاندنی بە خەڵك و تێكۆشانی بێ وچان و دڵسۆزانە تا ئەوپەڕی سنوور بۆ گەیاندنی پەیامەكەی بووە. ئائەم كەسایەتیە پێغەمبەریەتیەیە: كە لە هاوبەشیكردنی هەڵكەندنی خەندەكدا بەوجۆرە ڕەنگی دایەوەو خۆی نواند.

ئەوەی لەو میانەدا دەردەکەوێ لە خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ هاوەڵانی و بەزەیی هاتنەوە پێیان، ئەوەیە کە بەئاشکرا لە هەڵوێستی ئەو زاتەدا خۆی دەنوێنێ کاتێك جابیر دەیەوێ بەوتۆزە خۆراکەی لە ماڵیاندا هەیە کەمێك ئازاری برسیایەتی لەسەر پێغەمبەرو بڕێ لە هاوەڵانی لابەرێ. بێگومان ئەوەی جابیری هەڵنا بۆ دەعوەتکردنی پێغەمبەر ﷺ ئەو دیمەنەبوو کەبینی پێغەمبەر لەبەر ئازاری برسیایەتی بەردی لەسەر سکی خۆی بەستووە. دەشیزانی: کە لەماڵیدا ئەوەندە خواردنە هەیە بەشی شەش حەوت کەس بکا، ناچاربوو دەعوەتەکە بە ئەندازەی ئەو خواردەمەنییەبکا کە هەیەتی. بەڵام چۆن تەصەور دەکرێ پێغەمبەر ﷺ لەو گەرمەی ئیشکردنەدا بۆ هەڵکەندنی خەندەك هاوەڵانی بەبرسیایەتی جێ بێڵێ و لەگەڵ سێ چوار کەسدا بڕوا بۆ ماڵی جابیر بۆ حەسانەوەو خواردنی ئەو خۆراکەی بۆی ئامادەکراوە!؟ لەکاتێکدا ئەو خۆشەویستی بۆ هاوەڵانی زۆر لە خۆشەویستی دایك بۆ رۆڵەی زیاترە.

جابیر ناچاربوو دەعوەتکردنەکەی سنووردار بکا و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆتو چەند کەسێك بفەرموون بۆ ماڵی ئێمە، ئەمە شتێکی سروشتی بوو چونکە ئەو بەپێی ئەندازەی ئەو خواردنەی لەماڵیدا بوو دەعوەت بکا. بەدیدی ئەو خواردنەکە بەشی ژمارەیەکی کەم دەکا، کەوابێ پێغەمبەرو چەند هاوەڵێکی بانگهێشتی خواردنەکە بکا.

وەلێ پێغەمبەر ﷺ بە دیدو تێڕوانینی جابیر نەیدەڕوانییە شت. یەکەم مومکین نیە لەوساتە وەختەدا خۆی لەهاوەڵانی جیابکاتەوەو خواردن و حەسانەوە بۆ خۆی و چەند هاوەڵێکی دەستەبەر ببێ و هاوەڵانی تری بە برسیایەتی و ماندویی لەسەر ئیشەکە جێ بێڵێ. لەلایەکی ترەوە ناگونجێ پێغەمبەر ﷺ خۆی قەتیس بکا لەژێر

دەسەڵاتی مادەو سنورە خوو پێوەگیراوەکانیدا، خودا بۆ خۆی بەدیهێنەری سەبەب و موسەبەب و رەخساندیانە، بۆ خودا زۆر ئاسانە خواردنی کەم زۆربکا و ئەوەندەی بەرەکەت تێ بخا بەشی هەموو هاوەڵان بکا و زیادیش بمێنێتەوە.

هەرچۆنێك بوو پێغەمبەر ﷺ وای بەباش زانی خۆی و هاوەڵانی پێکەوە خواردنەکە بخۆن و نیعمەتەکە چەندێك کەمبێ لەناو خۆیاندا بەشی بکەن، وەکوو چۆن بەیەکەوە میحنەت و ناخۆشییەکە چەندێك قورس و گرانە تێکڕا شانیان بەرداوە و بەیەکەوە دەیچێژن. بۆیە جابیری ناردەوە بۆ ماڵەوە خواردنەکە ئامادەبکا و بۆ خۆشی بەناو هاوەڵاندا جاڕیدا کە هەمووومان لەماڵی جابیر دەعوەتین بۆ نانخواردن.

موعجیزەو شتی سەرئاسا لەم چیرۆکەدا ئەوەیە: کە گۆشتی مەڕێکی پچوك و چەند مستە جۆیەك سەدان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لێی تێر بخۆن و لێشیان بمێنێتەوە، بەجۆرێك پێغەمبەر پێشنیاری بۆ ماڵی جابیر کرد: کە بەسەر دەرو جیراندا دابەشی بکەن... بێگومان ئەم رووداوە سەر ئاسایە سەرسوڕهێنەرە کە بۆ پێغەمبەر دەستەبەر بوو، رێزلێنانێکی خودایی بوو بۆ ئەندازەی خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ هاوەڵانی و گوێ نەدانی بە هۆکارە ماددییەکان و کاریگەرییان لەئاست دەسەڵاتی خودادا.

ئەوەی دەمەوێ لەخوێنەر کە بەوردی سەرنجی خۆی بداتە نموونەی ئەم جۆرە موعجیزانەی کەخودا پشتگیری پێغەمبەری خۆی پێ دەکردو هۆکارە ماددییەکانی وەلادەنان. ئەم موعجیزانە گرنگتر شتێکن کە مەعالیمی کەسایەتی پێغەمبەرایەتی ئەوزاتە دەخەنە ڕوو بۆ کەسێك بەوردی لێکۆڵینەوەیان تێدابکا.

دەمەوێ خوێنەر بەفیکری وردی سەرنج بداتە ئەم حەقیقەتە، لێی وردبێتەوە، بە ئەندازەی ئەوەی کەسانی دی زێدە ڕۆیی دەکەن لەپشت تێکردن و گوێ پێنەدان.

**چوارەم:** دەبێ حیکمەت لەوەدا چیبێ: کە پێغەمبەر ڕاوێژی لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی کرد؟ لەوەدا کە ئاشتەوایی لەگەڵ هۆزی غەطەفان بکا و سێیەکی میوەو بەروبومی مەدینەیان بداتێ لەپێناو ئەوەدا ئەو هۆزە پشتگیری قورەیش و هاوپەیمانانیان نەکەن و لەشەڕکردن دژی موسوڵمانەکان پاشگەز ببنەوە.

دەبێ چ دەلالەتی تەشریعییەك لەم ڕاوێژو پێشنیارانەدابێ؟ حیکمەتەکە ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ دەیەویست دڵنیابێ ئاخۆ تاچ ئەندازەیەك هاوەڵانی ئامادە باشی بەرگرییان تێدایە. هێزی مەعنەوی و پشت بەستنیان بەخودا لە چ ئاستێکدایە؟ وێڕای ئەوەی لەنکاوو چاوەڕوان نەکراو ئەو هەموو ئەحزاب و خێڵ و لایەنە موشریکانە گەمارۆی مەدینەیاندا، ویستی بزانێ هاوەڵانی ورەیان تا چەندەو نیازیان چییە، بەتایبەتی کە بەنو قورەیظە نیشانەی پاشگەزبونەوەیان لێ دەرکەوت و عەهدو پەیمانی خۆیان لەگەڵ موسوڵمانەکان هەڵوەشاندەوە.

داب و نەرێتی پێغەمبەریش وەهابوو هەرگیز نەیدەویست هاوەڵانی ڕاپێچی شەڕو جەنگێك بکا یان بیانخاتە موغامەرەیەکەوە: کە لەناخی خۆیاندا ئامادە باشییان نەبێ، یان بڕوایان بە سەرەنجام و سودو ئاکامی نەبێ. بێگومان ئەم شێوازە لەدیارترین ئوسلوبی پێغەمبەر بوو لەگەڵ هاوەڵانی. بۆیە ئەو پێشنیارەی خستە بەردەم هاوەڵانی و ویستی ڕای ئەوان وەربگرێ. ئەوەشی پێڕاگەیاندن: کە ئەو پێشنیارە نیگا و تەبلیغی خودایی نیەو ڕاو بۆچونێکی زاتی خۆیەتی دەیەوێ شەوکەتی

موشریکەکانی پێ بشکێنێ لە حاڵێکدا هاوەڵانی توانای بەرگریو روبەروبوونەوەی موشریکەکانیان نەبێ.

دەلالەتی تەشریعی لەم راوێژکردنەی پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵانی لەوەدا کورت هەڵدەهێندرێ کە راوێژو راگۆڕینەوە «لە شتێکدا کە نەصصی تێدا نەهاتبێ» مەشروعە جگەلەوە هیچ دەلالەتێکی ئەوتۆی تێدانییە کە بۆ موسوڵمانان رەوابێ کاتێك وڵاتیان دەورەدرا بەشێك لەزەوی خۆیان یان بەروبوومی زەویو زاریان بدەن بە دوژمن لەپێناوی وازهێنانیان لەگەمارۆدان.

چونکە ئەوە شتێکی چەسپاوە لە ئوصولی شەریعەتی ئیسلامیدا کە ئەوەی دەبێتە بەڵگە لە هەڵسو کەوتی پێغەمبەر ﷺ گوفتارو کرداریەتی بەمەرجێك ئایەتی قورئان نازڵ نەبووبێ. رەخنەی لێ گرتبێ. وەلێ ئەو شتانەی کە لەسنووری راوێژو راگۆڕینەوەدا پێغەمبەر ﷺ تاووتوێی کردبێ ئەوە نابێتە بەڵگەو بەهیچ حاڵێك بەدەلیل حسێب ناکرێ. چونکە راوێژ سەرەتا وێدەچێ مەبەست لێی دەرخستنی رای ناو دڵو دەروونی جەماوەربێو راوێژی لەوجۆرەش مومارەسەکردنی عەمەلییەی پەروەردەییەو بەس!

دووبارە ئەو راوێژکردنە ئەگەر بکەوتایە بواری تەنفیزکردنەوە لەوانەبوو نیگای ئاسمانی نازڵ بویایەو رەخنەی لێ بگرتایە. ئیتر ئەوکاتە هیچ دەلالەتێکی تەشریعی تێدا نەدەبوو. وێڕای ئەوەش زانایانی سیرە ئەوەیان چەسپاندووە کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هۆزی غەطەفان نە صوڵحی کردووە، نەنیازی صوڵحیشی هەبووە، بەڵکوو کارەکە تەنها تاوتوێ کردنو پرسو رایەکی سەر سەرەکی بووەو بەس!

ئەمەم بۆیە بەوجۆرە درێژە پێدا چونکە تاقمێکی نەناسراو لەم رۆژگارەی ئێمەدا پێیان وایە «تاخواش حەزبکا رایەکەیان نامۆیە» ئەم

تاقمە دەڵێن: پێویستە موسوڵمانان سەرانە بدەن بە ناموسوڵمان لەکاتێك دا پێویستییەك داخوازی ئەوەبوو، بەڵگەشیان ئەوەیە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لە غەزای ئەحزابدا راوێژی بەهاوەڵانی کرد بۆئەوەی سەرانەو بەرتیل بدا بەهۆزی غەطەفان!!

بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەوەی رونمان کردەوە: کە ناوەڕۆك‌و مانای رایەك کە بخرێتە بەر راوێژو تاوو توێ کردن نابێتە دەلیل‌و بەڵگەی تەشریعی نازانین چ پەیوەندییەك هەیە لەنیوان سەرانەدان‌و شتێك کە دوو لایەنی بەشەڕهاتوو صوڵحی لەسەر بکەن!؟

ئەگەر بڵێی تۆ وایدابنێ موسوڵمانان بەهۆی زەعیفی‌و بێدەسەلاتییان ناچاربوون کەمێك لە ماڵ‌و سامانیان بدەن بۆ پارێزگاری لەژیانی خۆیان‌و بۆئەوەی قەلاچۆ نەکرێن، ئایا بۆیان رەوانیە ئەم هەڵوێستە بنوێنن؟؟ ئەم سیاسەتە پەیڕەو بکەن؟

وەلامی ئەم پرسیارە ئەوەیە دەگوترێ زۆر حالاتی واهەن ماڵ‌و سامان لە موسوڵمانان زەوت دەکرێ‌و ماڵ‌و مڵکیان دەبێتە غەنیمەو دەستکەوتی دوژمنانیان‌و کافر دەستدرێژی دەکەنە سەر وڵاتی ئیسلام‌و خێرو خێراتیان بەتالان دەبەن‌و دەستی بەسەردا دەگرن. ئاشکرایە موسوڵمانان بە ئارەزوی خۆیان‌و لەڕێگەی فتوای ئیسلامی ملکەچی ئەو حاڵەتانە نابن بەڵکوو بەزۆرو ناچاری پەنا بۆ حاڵەتی وادەبەن‌و لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕوانی هەلی رەخساون بۆئەوەی مافی خۆیان وەربگرنەوەو خۆیان لەژێر دەستەیی‌و چەوسانەوە رزگار بکەن. ئەتۆ ئاگاداری‌و دەزانی: کە ئەحکامی شەریعەی ئیسلامی خیطابی خۆی ئاراستەی کەسێك دەکا کە ناچارو زۆر لێکراو نەبێ، منداڵ نەبێ، شێت‌و خەرەفاو نەبێ.

کەوابوو کارێکی نەگونجاوو بێهودەیە بێین حاڵەتێکی ئاوا داتاشین و لەدەرەوەی چوارچێوەی تەکلیف کێشی بکەین بۆئەوەی حوکمێکی تەکلیفی دابڕێژین لەسەر ئەساسی رەئی و بەرژەوەندی و خۆگونجاندن.

پێنجەم: موسوڵمانان چۆن لەم شەڕەدا سەرکەوتن و چۆن و بەهۆی چییەوە توانییان موشریکەکان بشکێنن.؟ بێگومان ئێمە بینیمان ئەو وەسیلەو هۆکارەی پێغەمبەر لە غەزای بەدردا پەنای بۆبرد هەمان هۆکارو وەسیلەبوو کە لەغەزای ئەحزابدا پەیڕەوی کرد ئەویش پاڕانەوەو لالأنەوەی زۆرو بەکوڵ بوو لە بارەگای پەروەردگار.

بەڵکوو ئەم حاڵەتی پاڕانەوەو لالأنەوەیە کارێکی هەمیشەیی پێغەمبەر بوو، هەرکاتێ روبەروی دوژمن ببوایەوە یان بچویایە بۆ جیهاد ئەم حاڵەتەی پتر چڕ دەکردەوەو زۆرتر لێ دەبڕا بۆ پاڕانەوە. بێگومان ئەم هۆکارو وەسیلەیە کاریگەری لەهەموو هۆکارێکی مادی زیاترەو هۆکارو وەسیلەیەکە بەبێ گرتنەبەری و رەچاوکردنی بەشێوەی راست و دروست بارودۆخی موسوڵمانان باش نابێ و لەهیچ شەڕو ئاشتییەکدا سەرکەوتوو نابن.

بەڵام چۆن موشریکەکان بەو زۆری و بەهێزییەوە شکان؟ دوای ئەوەی موسوڵمانەکان خۆیان گرت و صەبرو ئارامیان تێدا بەرجەستەبوو بەڕاستی پەنایان بۆ خودا بردو بەدڵ لێی پاڕانەوە پەروەردگار رەشەباو زریانێکی وای بۆ کافرەکان نارد: کە بەتەواوی ورەیان بڕوخێ و سوپاو لەشکری خودایی هاتە سەریان و تێکی شکاندن. پەروەردگار لە قورئاندا ئەو حاڵەت و چۆنیەتیەی بەسەر کافرەکاندا هات رادەنوێنێ و دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا، إِذْ جَاءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ

مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا، هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا، وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا، وَإِذْ قَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا، وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا، وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْؤُولًا، قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا، قُلْ مَن ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُم مِّنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا، قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا، أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَاء الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَى عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ أُوْلَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا، يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا وَإِن يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنبَائِكُمْ وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلًا، لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا، وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا، مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا، لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاء أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا، وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا – الأحزاب/ ٩-٢٥}.

**ئەم مانایە کە لەغەزاکانی پێغەمبەردا دووبارە دەبێتەوە، مانای ئەوە نییە موسوڵمانان هەڵنێ بۆ موغامەرەو جیهاد بەبێ خۆ ئامادەکردنو دابینکردنی پێداویستی شەڕو جەنگ. بەڵکوو ئەمە ئەوەمان پێنیشان**

دەدا: کە پێویستە ئەو حەقیقەتە بزانێ: کە بەڕاستی و دڵسۆزی پشت بەستن بەخودا لەپێشەوەی هەموو هۆکارو وەسیلەی سەرکەوتنە جیاجیاکانی گۆڕەپانی روبەڕوبونەوەی دوژمنە. هیچ کام لە وەسیلەو هۆکارەکانی هێز سود بەخش نابن ئەگەر وەسیلەی پشت بەستن بەخوداو پاڕانەوە لێی بە دڵسۆزیو بەکوڵی لەگەڵدا نەبێ. هەرکاتێ لە کردارو گوفتاری موسوڵمانانندا ئەو هۆکارە گرنگە رەنگی دایەوە ئیتر چاوەڕوانی موعجیزاتی سەرکەوتن بە، سەرکەوتنی بەرچاو، سەرکەوتنی پیرۆز.

ئەگینا ئەم زریانو رەشەبا ترسناکە لەکوێوە هاتو کێ رەخساندی ئاوا سەربازخانەی موشریکەکان خاپور بکا، خێمەو کوڵەکەو سنگی داکوتراوی رەشماڵ پێوەبەستراو هەڵکەنێ و لولی بدا، بەبێ ئەوەی موسوڵمانان لەنزیکیانەوە هەستی پێ بکەنو کاریگەریی هەبێ لەسەریان؟ لەوێ زریانو لولدان کوڵەکەو سنگی رەشماڵی داکوتراویانی هەڵکەندو ترسی خستە دڵی موشریکەکان ورەی روخاندن، لەکاتێکدا موسوڵمانەکان لێیانەوە نزیك بوونو بۆئەوان کزەبایەکی فێنکی نەرمو خۆش بوو هیچ پێی ناڕەحەت نەبوون.

**شەشەم:** پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەصری فەوتا، لەبەر زۆر مەشغوڵی ئاگای لەوەنەبوو کاتی نوێژ هاتووە، تا خۆر ئاوانەبوو بەخۆی نەزانی کە نوێژی نەکردووە، دوای نوێژی شێوان بەقەزا نوێژی عەسری گێڕایەوە. لەهەندێ ریوایاتدا هاتووە: نوێژە چووەکە زیاد لە نوێژێك بوو، چەند نوێژێك بوون. کاتێ خۆرئاوا بوو، دەستی بەرخۆ کەوتەوەو کارە زۆر پێویستەکانی ئەنجام دان. یەك بەدوو یەکدا نوێژە فەوتاوەکانی گێڕانەوە.

ئەمە دەلالەت لەسەر مەشروعیەتی گێڕانەوەی نوێژی چواو دەکا.
ئەم حوکمو یاسایە بەوە هەڵناوەشێتەوە کە هەندێك بۆئەوە چوون گوایە دواخستنی نوێژ بۆ مەشغەڵەتی پێویست ڕەوابووەو دوایی کە نوێژی ترس تەشریع کرا نەسخ بۆتەوە. چونکە نەسخی ئەم حوکمە – ئەگەر ڕاستیش بێ ڕوناکاتە مەشروعیەتی گێڕانەوە، بەڵکوو ڕودەکاتە ئەوە ئایا دروستە نوێژ دوابخرێ لەبەر مەشغەڵەتی پێویست، واتە: نەسخ بوونەوەی ڕەوایی دواخستنی نوێژ نەسخ نیە، چونکە گێڕانەوەی نوێژ مەشروعیەتیەکەی چەسپاوە، لەلایەکی ترەوە ئەوەی دەلیلی قەطعیو چەسپاو دەیگەیەنێ ئەوەیە کە دەگوترێ: نوێژی ترس پێش ئەم غەزایە تەشریع کراوە، وەکوو لەباسی غەزای «ذات الرقاع»دا ئاماژەمان پێکرد.

یەکێك لە بەڵگەی مەشروعیەتی گێڕانەوەی نوێژ ئەو فەرموودەیە: کە لە صەحیحەیندا هاتووەو چەسپاوە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی لە غەزای ئەحزاب گەڕایەوە ناو مەدینە فەرمووی:

{لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ «أو الظُّهر» إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ}. واتە: هیچ کام لەئێوە نوێژی عەصر «یان نیوەڕۆ» نەکا تا نەچێتە ناو بەنو قورەیظە.

هەندێ لە هاوەڵان لەڕێگای چوون بۆسەر بەنو قورەیظە کاتی نوێژیان لێ هات، بڕێکیان وتیان: نوێژ ناکەین تا نەچینە ئەوێ، هەندێکیشیان وتیان: نا نوێژەکەمان دەکەین، فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە، تا نەچینە ئەوێ نوێژ نەکەین، بەڵکوو مەبەستی ئەوەبوو ئێمە پەلەبکەین. ئیتر هەندێکیان لەڕێگا نوێژیان کردو. هەندێکیشیان دوای گەیشتنیان بۆ ئەو شوێنە بەقەزا نوێژەکەیان گێڕایەوە.

کە واجب بوونی گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو چەسپا، ئیتر چوون یەکە هۆکاری نوێژ چوونەکە نوستن بێ، یان کەمتەرخەمی بێ یان نەکردنی

نوێژەکە بە ئەنقەست بێ، چونکە «دوای چەسپاندنی بەڵگەی گشتی لەسەر واجب بوونی گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو» هیچ بەڵگەیەك نیە مەشروعیەتیەکە تایبەت بکا بەهەندێ هۆکاری فەوتاندنەوەو بە هەندێکیانەوە نا. خۆ ئەوانەی لەرێگای چوون بۆسەر بەنو قورەیظە نوێژەکەیان چوو، هۆکاری نوێژ چوونەکەیان نەنوستن بوو نە لەبیرچوونەوە بوو. کەوابوو هەڵەیەکی گەورەیە: کە رەوایی گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو تایبەت بکەین بە نوێژە فەوتاوێك کە بە ئەنقەست نەفەوتابێ، ئەمە دەق وەکوو ئەوە وایە: تایبەتی شتێك بکەی بەبێ هەبوونی مخصصی شەرعی، ئەمەش شتێکی نەگونجاوو نەشیاوە وێدەچێ برێ کەس واگومان بەرن و بڵێن: بەڵگەو دەلیلی چەسپاو هەیە تەخصیصی ئەو بەڵگە گشتیانەی مەشروعییەتی گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو دەکا. ئەویش مەفهومی موخالیفی حەدیثی {مَنْ نَامَ عَنْ صَلاَةٍ أَوْ نَسِيَهَا حَتَّى ذَهَبَ وَقْتُهَا وَعَلَيْهِ قَضَاؤُهَا إِذَا ذَكَرَهَا}یە.

مەفهومی موخالیفی ئەم دەقە ئەوەیە نوێژ ئەگەر بەهۆی غەیری نوستن و لەبیرچوونەوە فەوتا گێڕانەوەی مەشروع نیە.

وەڵێ ئەمە وەهم و خۆخەڵەتاندنە، نابێ بەسەر فێرخوازی زانا و بەرچاو روونـدا تێپەڕێ، چونکە مەبەست بە فەرموودەکە ئەوەنییە فەرمان بە مرۆڤی نوێژ فەوتاو بەهۆی نوستن یان لەبیرچوونەوە کرابێ: کە نوێژەکەیان بگێڕنەوەو جگە لەم دوو پێڕە، فەرمانەکە شمولی کەسی تر ناکا. بەڵکوو مەبەست جەختکردنەوەیە لەسەر قەیدی «إِذَا ذَكَرَهَا» ئەمەیش بۆ ئاگادار کردنەوەیە: کە مەرج نیە کەسێك نوێژی فەوتا چاوەڕوان بکا تا لەرۆژی دووەمدا کاتی ئەو نوێژە دێ ئەمجار قەزای بکاتەوە. بەڵکوو پێویستە لەگەڵ بیری کەوتەوە خێرا هەوڵ بدا بگێڕێتەوە، جا کەتۆ ئەمەت زانی و زانیت: کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ

ئەوەبوو: کە ئاماژەمان پێ کردو صیغەی فەرموودەکەش خۆی ئەوە دەگەیەنێ و ئەوانەی راڤەی فەرموودەیان کردووە زاناو شارەزان لەبواری حەدیثدا هەروایان فەرمووە، دەزانی کە هیچ دەلالەتێکی تەشریعی نیە پەیوەندی بە مەفهومی موخالیف بۆ نوستن و لەبیرچوونەوە هەبێ لە فەرموودەکەدا.

## غەزای بەنو قورەیظە

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە دەفەرموێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ لەغەزای خەندەق گەڕایەوەو چەکی داناو خۆی شت و چڵک و پیسی لەخۆی کردەوە حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای و فەرمووی: ئەوە تۆ چەکت داناوەو خۆت کردۆتەوە؟ بەخودا ئێمەی فریشتە هێشتا چەکمان دانەناوە، هەستە خۆت ببەستەو چەك هەڵبگرەوەو بۆیان بچۆ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ کوێ بچم؟ حەزرەتی جوبرائیل فەرمووی: بۆ ئەوێ ئاماژەی بۆلای هۆزی بەنو قورەیظە کرد، ئیتر پێغەمبەر ﷺ سوپای سازداو چووە سەریان«١».

بەناو موسوڵمانەکاندا جارِیدا: {أَلاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ} کەس نوێژی عەصر نەکا تا نەچێتە ناو بەنو قورەیظە.

خەڵکەکە خێرا خۆیان سازداو کەوتنەڕێ، هەندێکیان لەڕێگا کاتی نوێژی عەصریان لێ هات، کەوتنە راجیاییەوە هەندێکیان وتیان نوێژەکە ناکەین تا نەچینە ناو بەنو قورەیظە. چونکە پێغەمبەر ﷺ وای فەرموو: بڕێکیان وتیان نەخەیر ئێمە نوێژی خۆمان ەکەین، پێغەمبەر داوای ئەوەی لێ نەکردوین نوێژەکەمان دوابخەین، هەریەکەیان پەیڕەوی

---

١ - بروانە: فتح الباری ٤٧/٢ ونیل الأوطار ٢٧/٢.

رای خۆی کرد، دوایی بۆ پێغەمبەریان باسکرد هیچ لایەکیانی بەهەڵە دانەنا[١].

پێغەمبەر ﷺ بە لەشکرێکەوە گەمارۆی بەنو قورەیظەیدا. ئەوان لە قەڵاکانیاندا خۆیان قایم کردبوو. ماوەی گەمارۆدانەکە بیستو پێنج شەو یان بیستو پێنج رۆژی خایاند[٢].

گەمارۆدانەکە تینی بۆهێنان، خودا ترسی خستە دڵیانەوە. ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە دەڵێ: کەعبی کوڕی ئەسعەد کاتێ زانی پێغەمبەر سوورە لەسەر گەمارۆدانەکەیانو وازیان لێ ناهێنێ: بە جولەکەکانی گوت: ئەی هۆزی جولەکە! ئێوە بۆخۆتان دەزانن چتان بەسەرهاتووەو روبەڕوی چی بوونەوە. من سێ رێگاتان بۆ دادەنێم یەکێکیان بگرنەبەر، وتیان ئەوسێ رێگایانە چین؟ وتی: با بەڕاستی بێ پێچو پەنا شوێن ئەو پیاوە «واتە: پێغەمبەر» بکەوین، سوێندم بەخودا هەمووتان بۆتان دەرکەوتووە کە پێغەمبەری خودایە، ئەمە ئەو زاتەیە لە تەوراتو ئینجیلدا باسی کراوەو نیشانەکانی دیاری کراون. ئەگەر ئیمانی پێ بێنن ئەوکاتە ئەمین دەبن لە کوڕو خوێنو ئافرەتتان هەموویان سەلامەت دەبن. وتیان وەڵڵا واز لە حوکمو ناوەڕۆکی تەوراتو ئایینی خۆمان ناهێنین. وتی: کەواتە باپێش وەخت منداڵو ئافرەتی خۆمان بکوژینو ئەمجار بە شمشێری روتەوە بڕۆینە دەری قەڵا، شەڕ لەگەڵ موحەممەدو هاوەڵانی بکەین، هەتا لایەکمان بەلایەکدا ساغ دەبێتەوە، ئەوکاتە ئەگەر ئێمە تیاچووین ئەوە تێدا دەچینو نەوەو ژنو منداڵمان نەماوە پەرۆشمان بنو بڵێین: ئاخۆ دوا ئێمە چییان لێ

---

١ - ئەم فەرموودەیە موتەفەقی بوخاریو موسلیمە.

٢ - ئیبنو هیشام دەڵێ ماوەی گەمارۆدانەکە بیستو پێنج رۆژ بووە. ئیبنو سەعد لە طەبەقاتدا دەڵێ پانزە رۆژ بووە.

دێ. وتیان: جابۆ ژن و منداڵمان بکوژین ئەوان تاوانیان چییە؟ وتی: دەیباشە ئەگەر ئەوەشیان ناکەن بڕۆینە دەرەوە خۆمان تەسلیم بکەین سا بەڵکوو موحەممەد ئەمانمان بداتێ. بەوەش رازی نەبون و هەرسێ پێشنیارەکانی کەعبیان رەتکردەوە.

پاشان کە تینیان بۆهات و ناچاربوون وتیان: لەسەر حوکمی پێغەمبەر ﷺ ئێمە لە قەڵاکانمان دێینە دەرەوەو خۆمان تەسلیم دەکەین. بەنو قورەیظە هاوپەیمانی هۆزی ئەوس بوون. پێغەمبەر ﷺ وای بەباش زانی حوکمدان دەربارەیان حەواڵەی یەکێك لە ئەوسییەکان بکا. ئەوەبوو بڕیارەکەی دایە دەست سەعدی کوڕی مەعاذ، سەعدیش لە غەزای خەندەقدا تیرێکی لێدرابوو بریندار بوو بوو، لەژێر خێمەیەك تیمار دەکرا، جا کە پێغەمبەر حوکمی بەنو قورەیظەی خستە لای سەعدی کوڕی مەعاذو ئەو هەواڵەی بۆ سەعد نارد، سەعد بەسواری گوێ درێژێك هات: کەنزیك بۆوە لەو مزگەوتەی کە پێغەمبەر رەنگی بۆ رشتبوو لەناو بەنو قورەیظە[١]، بۆ رێزلێنانی، پێغەمبەر ﷺ بە ئەنصارەکانی فەرمووی: {قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ أَوْ خَيْرِكُمْ}. لەبەر گەورەکەتان یان پیاو چاکتان هەڵسنە حەوا. ئەمجار بە سەعدی فەرموو: ئەوانە لەسەر حوکم و بڕیاری تۆ لە قەڵاکانیان دابەزیون. سەعد وتی: بڕیاری من دەربارەیان شەڕکەریان بکوژرێن، باقی منداڵ و ئافرەتیان بکرێن بە کۆیلەو سەبایا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی بە گوێرەی حوکمی خودا بڕیارت بۆدان[٢].

---

١ - واتە: مەبەست بەو مزگەوتە مزگەوتی پێغەمبەر نیە کە لەمەدینەدایە.

٢ - متفق علیە. ئەو مەشهورە بە ،مسجد الرسول،.

ئەمجار سەعد وتی: خودایە تۆ ئاگاداری هیچ شتێکم ئەوەندە پێ خۆش نیە کە لەپێناو رەزامەندی تۆدا جیهاد دژی نەتەوەیەك بکەم: کە پێغەمبەرەکەتیان بەدرۆ خستۆتەوە! لە زێدو نیشتمانی خۆی دەریان کردووە. خودایە! من واگومان دەبەم شەڕت لەنێوان ئێمەو ئەواندا کۆتا پێ هێناوە، ئەگەر شەڕکردن لەگەڵ قورەیش ماوە، خودایە تەمەنم درێژبکە تا لەپێناو رەزامەندی تۆدا جیهاد بکەم، خودایە ئەگەر شەڕت لەنێوان ئێمەو ئەوان کۆتا پێ هێناوە برینەکەم بتەقێنەو خوێنم بەربێ و بەو برینە بمرم. ئیتر خوێنی برینەکەی بەربوو، پێغەمبەر ﷺ لەنزیك مزگەوتەکەوە خێمەیەکی بۆ سەعد هەڵدابوو چاودێرێکی تەرخان کردبوو زوو زوو سەری لێ بدا: کە کێشەی بەنو قورەیظە تەواو بوو برینەکەی سەعد کولایەوە، لەخوار خێمەکەی سەعدەوە خێمەی بەنو غەفار هەبوو، کە سەعد خوێنی برینەکەی بەربوو لافاوی خوێنەکە رۆیشت بۆناو خێوەتی بەنو غەفارو ئەوان هاواریان لێ هەڵساو وتیان: ئەم خوێنە چیە لەلای ئێوە جۆگەلەی بەستووە دێ بۆلای ئێمە؟ کە سەیریان کرد خوێنی سەعدە لە برینەکەی دەچۆڕێ، لەئاکامی ئەم خوێن بەربوونە سەعد کۆچی دوایی کرد»[١].

لە ریوایەتێکی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە دەفەرموێ: برینەکەی سەعد لەوکاتەدا کە خوێنی لێ بەربوو بە ئەندازەی شوێنی گوارە لە گوێچکەدا دەبوو واتە: تەواو سارێژ بوو بوو گۆشتەوە زونی هێنابوەوە تۆزێکی مابوو.

ئەمجار بەپێی بڕیارەکەی سەعد جولەکەکان لە قەڵاکانیان هێندرانە دەرەوە راپێچ کران بۆلای خەندەکەکانی مەدینەو پیاوەکانیان لە ملیان دراو ژن و منداڵیان کران بە سەبایا و کۆیلەو دابەشکران، یەکێك لەوانەی

---

١ - متفق عليه واللفظ للبخاري.

راپێچی شوێنی کوشتن کراو لەملی درا حویەی کوڕی ئەخطەب بوو ئەو پیاوەی هەوڵیدا بەنو قوڕەیظە رازی بکا پەیمان هەڵوەشێننەوەو غەدرو خیانەت بکەن، ئیبنو ئیسحاق ریوایەتی کردووە دەڵێ: حویەی هێندرا بۆلای پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بە ملیەوە بەسترابوون، کە سەیری پێغەمبەری کرد، وتی: وەڵلاهی من سەرزەنشتی خۆم ناکەم لەوەدا کە دوژمنایەتی تۆم کردووە، بەڵام کەسێك خودا ریسوای بکا ریسوا دەبێ. پاشان لەملیاندا.

## پەندو ئامۆژگاری:

زانایانی حەدیثو سیرە لەئەم رووداوەی بەنو قوڕەیظە چەند حوکمێکی گرنگیان دەرهێناوە، ئێمە لەم خاڵانەی دوایی‌دا چڕیان دەکەینەوە.

**یەکەم:** دروستە شەڕ لەگەڵ ئەوانە بکرێ کە پەیمان دەشکێننو لە بەڵێنو وادەی خۆیان پاشگەز دەبنەوە. ئیمامی موسلیم ئەو حوکمەی کردووە بە عینوانی غەزای بەنو قوڕەیظە.

ئاشتیو صولحو بەڵێنو داوای ئەمانو گیان پاراستن لەنێوان موسوڵمانانو ناموسوڵماندا چەند شتێکن پێویستە موسوڵمانان رێزیان لێ بگرنو پێیانەوە پابەندبن، هەتا لایەنی بەرامبەریان پێیانەوە پابەندبن دەبێ ئەمان رێزیان لێ بگرن. هەرکاتێك لایەنی بەرامبەریان پێیانەوە پابەند نەبوونو شکاندیان رەوایە بۆ موسوڵمانان شەڕیان لەگەڵ بکەن.

**دووەم:** دروستە حەکەم دانانو دیاریکردنی یەکێك بۆ بڕیاردان لە کاروباری موسوڵمانان. نەوەوی دەفەرموێ: لەم حەدیثەی بەنو قوڕەیظەدا ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە تەحکیمو حەکەم دانان لە کاروباری گرنگی موسوڵماناندا دروستە، فەرمانڕەوا دەتوانێ بڕیاردان دەربارەی کارێکی گرنگ بداتە دەست موسوڵمانێکی عادڵو لێزانو گونجاو بۆ

بڕیاردانو یەکالاّ کردنەوە. زانایان کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە کە حەکەم دانانی حەزرەتی عەلی کارێکی ڕەوابووە، کە خەواریجەکان ناڕەزاییان دەربڕیو بە ناشەرعییان لە قەڵەمدا، حەزرەتی عەلی بە بەڵگەی بەهێزو ڕەوا بۆری دان. هەروا حەدیثەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە دروستە موصالەحەو ئاشتەوایی لەگەڵ دانیشتوانی گوندێك یان قەلاّو دژێك بکرێ بەپێی ڕاوو بڕیاری حەکەمێکی موسوڵمانی عادڵی لێزان. پێویستیشە ئەو حەکەمە حوکمێك دەربکا کە بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابێ، کە بڕیاریشیدا دەبێ موسوڵمانان پابەندی حوکمەکەی بن، بۆ موسوڵمانانو بۆ فەرمانڕەوای موسوڵمانیش ڕەوانییە لەو حوکمەی دەیدا پاشگەزببنەوە. بەلاّم پێش حوکمدانەکە دەتوانن حەکەمەکە لە مەسئولیەت بخەن»[1].

سێیەم: ڕاجیایی لە فروعاتی دینداو ئیجتیهاد تێداکردنی، کارێکی زەرورییە. پەیدابوونی ئیختیلاف لەناو صەحابەدا دەربارەی تێگەیشتن لەو فەرموودەی کە ئاڕاستەی کردنو فەرمووی: {أَلاَ لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ} بەو شێوەی باسمان کردو بێدەنگ بوونی لە پێغەمبەر ﷺ لە کارەکەیانو سەرزەنشت نەکردنی هیچ لایەکیان بەڵگەیەکی بەهێزەو دەلیلێکی گرنگە لەسەر بنەمایەکی شەرعیو چەسپاندنی بنەمای ڕاجیایی لە فروعیاتی دینداو ئیعتیبار کردنی هەردوو لای ڕاجیاواز بەکار ڕەواو کردەوە دروستو ثەواب ئامێز «جا یەکسانە ئێمە: بڵێین: لەبواری ئیجتیهاددا موصیبیەکە یەکێکە یان زیاترە» هەروا ئەوەشی تێدایە کە هەوڵدان بۆ دەرهێنانی حوکمو دۆزینەوەی ڕێگا چارە بۆ مەشاکیل. هەروا ڕیشەکێش کردنی هەر خیلافو ڕاجیاییەك لە فروعی ئاییندا کە لە دەلالەتی «ظنی»یەوە سەر هەڵدەدا کارێکە ڕەنگە

---

١ - النووی علی مسلم ٩٢/١٢.

ئەنجامدانی نەكرێ یان تەصەور نەكرێ. پەروەردگار بەندەكانی خۆی بەدوو جۆر عیبادەت موكەللەف كردوون.

یەكەمیان: جێبەجێ كردنی فەرمانی دیاریكراوو ئاشكراو رون‌و پەیوەندیدار بەبواری عەقیدەو سلووكەوە.

دووەمیان: لێكۆڵینەوەو خۆماندو كردن‌و تێكۆشان بە مەبەستی تێگەیشتن لە بنەماو ئەحكامی فەرعی كە دەرهێندراون لە بەڵگەی گشتی جیاجیا. كەسێك لە چۆڵەوانیدا كاتی نوێژی لێ هات‌و نەیزانی لای قیبلە كوێیە، هەر ئەوەندەی لەسەرە بەپێی توانای خۆی هەوڵبدا بۆ دۆزینەوەی قیبلە، دڵی لەسەر چ لایەك دامەزراو بە قیبلەی دانا روی تێ بكاو نوێژەكەی بكا ئیتر گرنگ نیە ئیجتیهادەكەی پێكاویەتی‌و بە واقیعی قیبلەی دۆزیوەتەوە یان نا؟

ئەمجار لێرەدا چەند حیكمەتی بەرزو بەنرخ هەن لە هەبوونی ئەو هەموو بەڵگەو نەصە شەرعیانەی كە دەلالەت كردنەكەیان ظەننییەو قەطعی نیە، دیارترین حیكمەتی بەرچاو ئەوەیە ئیجتیهادات‌و بۆچونەكان لە مەسەلەیەكدا «هەر مەسەلەیەك بێ» ئاكامەكەیان یەك نەگرنەوە سەرەنجامی جوداوازیان لێ بكەوێتەوە، هەمووشیان پشت بەستووبن بە بەڵگەی موعتەبەرو دان پێدانراوی شەرعی. ئەمەش دەبێتە هۆی بەرفراوانی‌و دەست كراوەیی موسوڵمانان بۆئەوەی بە ویستی خۆیان‌و بارو دۆخ‌و بۆ رەخسان‌و بەرژەوەندییان رێبازێك لەو رێبازانە بگرنەبەر، دەی ئەمە گەورەترین نیعمەتی خودایە بەسەر بەندەكانیدا لەهەموو سەردەم‌و شوێنێكدا. كە ئەم شەریعەتە بەرفراوان‌و ئاسان خوازەی بۆ داناون.

ئەگەر تۆ بەوردی سەرنج بدەیە ئەم واقیع‌و حاڵە. دەزانی كە كۆشش‌و هەوڵدان بۆ قەلاچۆكردنی خیلاف‌و راجیایی لە مەسائیلی فروعیدا، بەربەرەكانی حیكمەتی خودایی یە، دژایەتیكردنی رێكخستن‌و

تـەدبیری یەزدانییە لـە بـواری تەشـریعیدا. جگەلـەوە هـەر هەوڵـدانێکی لەوجۆرە خۆماندوکردنی بێهودەیەو کاری مایە پووچە چونکە تۆ چۆن بـەرعودەی قەڵاچـۆکردنی راجیـایی دەبـێ لـە مەسـەلەیەکدا بەڵگەکـەی «ظنـی» بـێ و ئیحتیمـالی ئـەم مانایـەو ئـەو مانایەشـی هـەبێ. ئەگـەر لەسەردەمی ئێمەدا ئەوەبکرێ دەبوایە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا راجیایی لـە فروعدا نەبوایە، هـەروەها شیا وترین کۆمـەڵ و تاقمێك کـە راجیاییان تێدا بەرجەستە نەبێ هاوەڵانی پێغەمبەرن، دەی بۆ راجیاییان تێکەوت و مانـای جیـا جیایـان لـە نەصـەکان دایـەوە؟ وەکـوو دیمـان و ئاماژەمـان پێکرد.

چـوارەم: جولەکـە دڵنیـابوون لەڕاسـتی پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ. بێگومـان لەمیانـەی قسـەکانی کـەعبی کـوڕی ئەسـەد لەگـەڵ براجولەکـەکانی ئـەوە دەردەکـەوێ کـە جولەکـەکان دڵنیـابوون لـە پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی موحەممـەدو بـاش ئاگـاداری ئـەو بـاس و خواسانە بوون کە تـەوڕات چەسپاندبوونی دەربارەی پێغەمبـەری ئاخیر زەمـان و نیـشانەکانی و کـاتی رەوانـەکردنی. بـەڵام ئـەوان کۆیلـەی دەمارگیری و لوتبەرزی خۆیان بوون و ملیان بۆ حەق و راستی نـەدا، هـەر ئەو هۆکارانەشن «واتە: دەمارگیری و لوتبـەرزی» دەبنـە لەمپـەڕ لەبـەردەم ئیمانهێنانی زۆرێك لەوانـەی لافی بـێ ئیمانی و تێنەگەیشتن لـە ئایین لێ دەدەن.

هـەر ئـەم دان پیانانـەی جولەکـە لـەناو خۆیانـدا نیشانەی ئەوەیـە ئایینی ئیسلام ئایینی فیترەت و سروشتی ئادەمیزادە لـەبواری عەقیدەو حوکمە گشتییەکانیدا. لەبواری عەقیدەدا گونجاوە لەگەڵ عەقڵدا لەبواری تەشـریعات و ئەحکامـدا گونجـاوە لەگـەڵ پێویـستیاتی ئـادەمیزاد و بەرژەوەندییەکانیدا، نەبیندراوە عاقڵمەندێك ئیسلامی بیستبێ و بەباشی حەقیقـەت و جەوهـەری ئـەو ئایینـەی ناسـیبێ و دوایـی لەناخـەوەو بـە

قەناعەتی تەواوە کافر بووبێ. ئەگەر کەسێکت لەوجۆرە بینی ئەوە لەدوو شت بەدەر نییە، یان وەکوو پێویستو حەقیقەتو واقیع ئیسلامی نەبیستووەو ئەوەی بیستویەتی کەلامی پوچو بەتاڵو ئەفسانە ئامێز بووە، یان حەقیقەتی ئیسلامی پێگەیشتووەو باش باش لێی حاڵی بووە وەڵێ ئەو گرێی دەروونی بەرامبەر ئیسلام هەیە رقو کینەو حەسودیو لەدەستدانی بەرژەوەندی تایبەتی دەبنە رێگر لەبەردەم پابەندبوونی بەرێبازی ئایینی.

پێنجەم: حوکمی هەڵسان لەکاتی هاتنی یەکێك بۆ رێز لێگرتنی.

کاتێك سەعد هات بۆلای بەنو قورەیظەکان بەسواری گوێ درێژێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئەنصارەکان کرد کە لەبەری هەڵسن عیلەتو هۆکاری لەبەر هەڵسانەکەشی بە وشەی «لسیدکم» یان «خیرکم» دیاریی کرد. زوربەی زۆری زانایان ئەم حەدیثو روداوەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر مەشروعیەتی رێزگرتنی زاناو پیاوچاکان بە لەبەر هەڵسان بەبۆنەی هاتنیان بۆلای کۆڕو کۆمەڵێكو موناسەباتی وا داوای رێز لێگرتنیان بکا بە گوێرەی عورفو عادەت.

ئیمامی نەوەوی لەمیانەی تەعلیقدان لەسەر ئەم حەدیثە دەفەرموێ: حەدیثەکە ئەوەی تێدایە: کە ئیکرامو رێزی ئەهلی فەضلو زانست بگیرێ بەوەی ئەگەر هاتن بۆ شوێنێك لەبەریان هەڵسیو بە ئەدەبەوە روبەرویان ببیەوە. بەم جۆرە جەماوەری زانایان بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەرئەوە کە هەڵسان لەبەر رێز لێگرتنی یەکێك کەدێ بۆلات سونەتە. قاضی عەیاض دەڵێ: ئەم جۆرە هەڵسانو رێز لێگرتنە ناچێتە چوارچێوەی ئەو هەڵسانەی پێغەمبەر ﷺنەی لێ کردووە، چونکە ئەو هەڵسانو راوەستانەی نەی لێکراوە ئەوەیە خەڵکەکە بەپێوە دەستەو نەزەر راوەستنو ئەو دابنیشێ، ئیتر تا کابرا دانیشتبێ ئەوانیش بەپێوە راوەستابن، ئەمجار نەوەوی کۆتایی بە قسەو فتواکەی دەهێنێو دەڵێ:

«دەڵێم هەڵسان لەبەر مرۆڤێکی خاوەن فەضلو رێز کاتێ کەدێ بۆلات موستەحەبو باشە، زۆر فەرموودە هەن ئەوە دەچەسپێننو هیچ حەدیثیك نەچەسپاوە کەنەی لەوجۆرە لەبەر هەڵسانە کردبێ»[١].

ئەو حەدیثانەی ثابیتو چەسپاون بەڵگەن لەسەرئەوە هەڵسان لەبەر رێز لێنان شتێکی باشو موستەحەبە. ئەو بڕگەیەی لە حەدیثی کەعبی کوڕی مالیکدا هاتووەو «متفق علیە»یشە. کەعب لە فەرموودەکەدا چیرۆکی نەچوونی خۆی بۆ غەزای تەبووك دەگێڕێتەوە دەڵێ: «رۆیشتم دەمەویست بەخزمەت پێغەمبەر بگەم، پۆل پۆل خەڵك توشم دەبوونو پیرۆزباییان لێ دەکردم بەبۆنەی تۆبە لێ قبوڵکردنمو دەیانگوت: خودا تۆبەی لێ وەرگرتیو پیرۆزباییت لێ دەکەین. هەتا چوومە ناو مزگەوتەوە بینیم پێغەمبەر دانیشتووەو خەڵکی لەخزمەتیدا بەدەوریدا رۆنیشتبوون، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بە پەلە بەرەو پیرم هات تۆقەی لەگەل کردمو پیرۆزبایی لێکردم. وەڵلاهی جگە لەو کەسی تر لە موهاجیرین لەبەرم هەڵنەستا، ئیتر لەوەدوا کەعب ئەم پیاوەتیو رێزگرتنەی طەلحەی لەبیر نەدەچۆوە». هەر لەو فەرموودانەی لەو بارەوە ریوایەت کراون ئەو فەرموودەی تیرمیذیو ئەبو داودو بوخاری لە «أدب المفرد»دا لە عائیشەوە ریوایەتیان کردووە، دەفەرموێ: «کەسم نەبینیوە هێندەی فاطیمە بشوبهێتە پێغەمبەر لە قسەو گفتو گۆو دانیشتندا». عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر هەرکاتێ فاطیمەی ببینیایە لەبەری هەڵدەستاو ماچی دەکردو بەخێرهاتنی دەکرد، ئەمجار دەستی دەگرتو دەیهێنا لەشوێنی خۆی دای دەنیشاند. فاطیمەیش هەرکاتێ پێغەمبەری بدیایە پێشوازی لێ دەکردو لەبەری هەڵدەستاو ماچی دەکرد»[٢].

---

١ - شەرحی نەوەوی بەسەر موسلیمەوە ج١٢/٩٣.

٢ - ئەم ریوایەتە هی بوخارییەو لە ریوایەتەکانی تر جوداوازی کەم نەبێ نیەتی.

ئەمجار پێویستە ئەوە بزاندرێ کە ئەم ریوایەتانە هەموویان دژی ئەوەنین کە لە پێغەمبەرەوە چەسپاوە: کە فەرموویەتی: {مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ النَّاس قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ}. کەسێك پێی خۆشبێ خەڵك دەستە نەزەری راوەستن و ئەو بۆ خۆی دابنیشێ با جێگای خۆی لەناو دۆزەخدا خۆش بکا.

چونکە مەشروعیەتی رێزگرتنی رێزداران، داخوازی ئەوەنیە خۆیان هەوڵی بۆ بدەن یان بەدڵ پێیان خۆشبێ. بەڵکوو دیارترین رەوشتی پیاو چاکان و رێزداران ئەوەیە سادەو موتەواضیع بن. خۆیان ئەوەیان نەوێ. ئەتۆ نابینی هەژاری خاوەن ئاتاج؟ ئەدەبی ئیسلامی ئامۆژگاری ئەوەی دەکا خۆ لەسواڵکردن بپارێزێ و دەست لە خەڵك پان نەکاتەوەو خۆی بەهەبوو بێ ئاتاج نیشانبدا. کەچی لەهەمان کاتدا هەر ئەدەبی ئیسلامی ئامۆژگاری دەوڵەمەندان دەکا بەوەی کەبەدوا هەژاری بە شەرم و حەیادا بگەرێن و یارمەتییان بدەن و رێزیان لێ بگرن و لە زێدەی ماڵی خۆیان بەشیان بدەن. بۆ هەموو ئەدەبێك ئەرك و وەظیفەی تایبەتی هەیەو نابێ تیکەڵاویان بکەین، یان لایەکیان بسرینەوەو لایەکیان پەروەردە بکەین ئەمە ناشیرینتر دیاردەی نەزانی و پەلەکردنە.

وەلێ گرنگتر شتێك کە پێویستە لەم بارەوە بیزانین ئەوەیە، ئەم رێزلێنان و رێزگرتنی پیاو چاك و رێزداران سنورو ئەندازەی خۆی هەیە، لەگەڵ لەسنور تێپەری دەبێتە حەرام و یاساغ و تاوان، ئەوەی دەیکا و ئەوەی بۆی دەکرێ و لێی بێدەنگە هاوبەشن لە تاوانەکەدا.

بۆ نمونە ئەوەی کەتۆ لە مەجلیس و خانەقای برێ لە صوفیاندا دەیبینی: کە مورید بەپێوە دەوەستن و جەنابی شێخ دانیشتووە یان موریدێك لەبەر شێخیدا زەلیل ملکەچ رادەوەستێ تا شێخ پێی نەڵێ دانیشە دانانیشێ، چاو سەریەك دەنێ و دەست دەخاتە سەردەستی و هەناسە لەخۆی دەبڕێ.

یان هەندێك مورید لەكاتی گەیشتنیان بەشێخ سوژدە دەبەنە سەر ئەژنۆی شێخ یان سەر دەستی. یان كاتێك شێخ تەشریفی دێتە ناو كۆڕو مەجلیس تانزیك ركوع بردن خۆیان لەبەردەم شێخدا نەوی دەكەن. تۆ بەوە هەڵمەخەڵەتێ، كەبۆ بەرەوا زانینی ئەو حاڵە دەگوترێ ئەو تەربیەتدادانی موریدەو ڕێبازی ڕاهێنانیەتی!!!

ئیسلام مەنهەج و ئەسالیب و پرۆگرامی تەربیەی داناوەو چوار چێوەی بۆ دیاری كردووەو مەنعی لە موسوڵمانان كردووە، كە لێی بچنەدەر، جگە لە ئوسلوب و شێوازی پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ هەموو ئوسلوب و شێوازی پەروەردەی تر پەیڕەوی كردنیان هەڵەیەو بە كەڵكی مرۆڤایەتی نایە.

## شەشەم: چەند تایبەتمەندی سەعدی كوڕی مەعاذ:

تۆ دەتوانی لەمیانەی دیراسە كردنی ئەم غەزایە ئاگاداری چەند تایبەتمەندی سەعدی كوڕی مەعاذ ببی «خودا لێی رازی بێ». سەرەتا ئەوەی سەرنجی تۆ رادەكێشێ، ئەوەیە: كە پێغەمبەر ﷺ صەلاحیەتی رەهای دا بەسەعد بۆئەوەی بڕیاری دەربارەی بەنو قورەیظە بدا، هەڵوێستی خۆیشی یەكسان كرد بە هەڵوێستی سەعد، واتە: هەر لەسەرەتاوە ئەوەی راگەیاند: كە سەعد چی بڵێ و بڕیاربدا ئەو پێی رازییە.

دووەم شت كە جێگای سەرنجە، فەرمانكردنی پێغەمبەر بوو بە كۆمەڵی ئەنصار كەبۆ رێزلێنانی سەعد هەڵسنە حەوا، ئەمە تایبەتمەندییەكەو رێز لێنانێكە گرنگی خۆی هەیە، بەتایبەتی كە فەرمانەكە لەخودی پێغەمبەرەوە دەرچوو.

پاشان تۆ لەچیرۆكی ئەو برینەی لە جەستەی كەوتبوو لە غەزای خەندەكدا، دەبینی سەعد هەردوو دەستی هەڵبڕین بەكوڵ لەخودا

پاڕایەوە، وتی: خودایە تۆ خۆت ئاگاداری، کەمن هیچ شتێکم هێندەی ئەوە پێ خۆش نیە کە جیهاد بکەم دژی ئەوانەی پێغەمبەرەکەتیان بەدرۆ خستۆتەوەو لە زێدو نیشتمانی خۆی دەریان کردووە. خودایە ئەگەر شەڕکردن لەگەڵ قورەیش ماوە تەمەنم درێژبکە تا جیهاد بکەم لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی تۆدا. دوعای سەعد گیرابوو، برینەکەی گۆشتەوەزونی هێنایەوە ساڕێژبوو، تا ڕۆژگاری غەزای بەنو قورەیظەو پێغەمبەر کردی بە حەکەم بۆ بڕیاردان دەربارەیان. خودا شەڕو خیانەتو غەدری جولەکەی لە موسوڵمانان دوورخستەوە. شاری مەدینەی لێ پاککردنەوە، ئەمجار سەعد جارێکی دی دەستی بەرزکردنەوە وتی: خودایە من واگومان دەبەم تۆ شەڕو جەنگت لەنێوان ئێمەو قورەیش بەکۆتا هێناوە، خودایە ئەگەر گومانەکەم ڕاستەو شەڕی نێوان ئێمەو قورەیش تەواو بووە، برینەکەم وەخوێن بێنەو مردنم بەم برینەبێ. دوعاکەی گیرابوو خوێنی برینەکەی بەربوو پێی شەهیدبوو.

ئیبنو حەجەر لە فەتحولباریدا دەڵێ: ئەوەی بۆم دەرکەوتووە گومانی سەعد لەجێگای خۆیدا بوو، دوعاکەشی گیرابوو، ئەوەبوو لەدوای غەزای خەندەك شەڕ لەنێوان موسوڵمانانو موشریکە عەرەبەکاندا نەما، بەم مانایە موشریکەکان دەست پێشخەربن، هەتا ئەوکاتەی پێغەمبەر خۆی سازدا بچێ بۆ عەمرەو قورەیش پیشیان پێ گرتو نەیانهێشت بچێتە ناو مەککەوە. خەریك بوو شەڕ لەنیوانیاندا هەڵگیرسێو بەڵام نەبوو، وەکوو قورئان ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ:

{وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا – الفتح/٢٤}.

پاشان ئاگربەست ڕاگەیەندرا ساڵی دوایی پێغەمبەر ﷺ عەمرەی بەجێ هێنا، ئەم ئاگر بەستە بەردەوام بوو تا قورەیش هەڵیان

وەشاندەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ سوپای رێکخستو بەرەو مەککە کەوتەڕێو فەتحی مەککەی کرد.

پێغەمبەر ﷺ کە لەغەزای ئەحزاب گەڕایەوە فەرمووی: لە ئێستا بەولاوە ئێمە دەچینە سەریان، ئەوان ناتوانن بێنە سەرمان، «ألبزار» بە ئیسنادی حەسەن لە حەدیثی جابیر دەری هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژی ئەحزاب کە لەهەموو لایەکەوە پەلامار درابوون فەرمووی: {لا یغزونکم بعد هذا أبداً ولکن أنتم تغزونهم}.

لەکۆتاییدا لە ئەم چیرۆکەی سەعددا بەهەموو لایەنێکیەوە ئەوەمان دەخاتەوە یاد کە لەوەپێش ئاماژەمان بۆکرد، کە شەڕی بەرگری لە ئیسلامدا قۆناغێك بوو لە قۆناغەکانی بانگەوازی ئیسلامی: کە پێغەمبەر ﷺ پێیاندا تێپەڕی. دوای ئەوە قۆناغی بانگەوازی گشتی داهات، بەجۆرێك لەم قۆناغەدا لە بتپەرستو موشریکەکان جگە لە موسوڵمان بوون هیچی تریان لێ قبوڵ نەکرا. لەوانەی ئەهلی کیتابیش بوون دەبوایە یان موسوڵمان بن یان جیزیەو سەرانە بدەن ملکەچی دەسەڵاتی ئیسلام بن. هەرکەسێکیش ببێتە کۆسپ شەڕی لەگەڵ دەکرا واتە: تەنها دوو رێگە لەبەردەم عەرەبە بتپەرستەکان هەبووە یان موسوڵمان بوون یان شەڕکردن، بە نیسبەت خاوەن نامەکانەوە سێ رێگەیان لەبەردەم دابوو «موسوڵمانبوون، سەرانەدان، شەڕکردن».

دوای تەکامولی حوکمی ئیسلامی دەربارەی جیهادو بانگەوازی هیچ مانایەك بۆ مانای شەڕی دیفاعی نامێنێو نەماوە. چونکە ئەگەر وانەبێ هیچ مانایەك بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بەدی ناکرێ کە دەفەرموێ: {ولکن أنتم تغزونهم}.

### بەشی شەشەم

# فەتحی مەککە، سەرەتاکانی‌و ئاکامەکانی
# سەردەمێکی تازەی بانگەوزایی

## صوڵحی حودەیبییە:

ئاشـــتەوایی حودەیبییـــە لـــەمانگی ذیلقەعیـــدەی کۆتـــایی ســـاڵی شەشەمی کۆچی، مۆرکراو کەوتە بواری جێ بەجێ کردنەوە، هۆکاری صوڵحەکە ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بەناو موسوڵمانان دا بڵاوی کردەوە: کەنیازی هەیە بچێ بۆ مەککە عومرە بەجێ بێنێ. ژمارەیەکی زۆر لە موهاجیرین‌و ئەنصار خۆیان سازکردو لەخزمەتیدا کەوتنە ڕێ، ژمارەیان نزیکەی هەزارو چوارسەد صەحابی بوو. لەڕێگا پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بەعەمرە بەست‌و لەگەڵ خۆی دا ئاژەڵی هەدی‌و قوربانی برد، بۆئەوەی خەڵك دڵنیا بن: کە نیازی شەڕو هەرای نیەو مەبەستی بەرو دوای زیارەتی کەعبەیەو ڕێز لێگرتنیەتی.

کە تەشریفی گەیشتە «ذولحولەیفە» پیاوێکی لەهۆزی خوزاعە نارد ناوی «بشر بن سفیان»بوو، بۆئەوەی بزانێ هەڵوێستی دانیشتوانی قوڕەیش چیەو چۆنە بەرامبەر ئەم کارو نیازە. ئیتر پێغەمبەر ﷺ ڕۆیی هەتا گەیشتە «غدیر الأشطاط» لەوێ پیاوەکەی ناردبووی بۆناو مەککە بۆگوێ هەڵخستن‌و هەواڵ زانینی هەڵوێستی مەککەییەکان. هاتەوە

خزمەتی عەرزی کرد «قورەیشییەکان هەموویان خۆیان سازداوە ئەحابیشیشیان کۆکردونەوە»[١] سورن لەسەر ئەوە شەڕت لەگەڵ دا بکەن‌و نەهێڵن بچیە ناو مەککەوە. پێغەمبەر ﷺ کەوتە راوێژکردن‌و راگۆڕینەوە ئاخۆ چی بکەن‌و چ بڕیارێك بدەن. حەزرەتی ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەتۆ بەنیازی ئەنجامدانی عەمرە هاتووی‌و دەتەوێ زیارەتی کەعبە بکەیت‌و ناتەوێ شەڕ لەگەڵ کەس دا بکەی‌و کەس بکوژی. بڕۆ بەرەو ماڵی خودا، هەرکەسێ رێگری لێ کردین شەڕی لەگەڵ دەکەین. پێغەمبەر فەرمووی دەبا بڕۆین بەناوی خودا.

پاشان فەرمووی: کێ شارەزایە بە رێگایەك دا بمانبا جگە لەو رێگایەی ئەوان لێیان گرتوین. پیاوێکی هۆزی «بەنو ئەسلەم» هەڵیدایە وتی: من ئەی پێغەمبەر! بەرێگایەکی ناخۆش‌و سەخت‌و کوێرە ڕێ دا بەناو شیوو دۆڵ دا چاوساغی کردن، پێغەمبەرو هاوەڵانی بەدوی دا رۆیشتن تا گەیشتنە شوێنێك پێی دەگوترێ «ثنية المرار» رێگایەکە بەناو ئەو کێوەدا ڕەت دەبێ کەبەسەر حودەیبییەدا دەڕوانێ. لەوێ حوشترەکەی پێغەمبەر ییخی خواردو پاڵ کەوت خەڵکەکە کەوتنە «حەل حەل» لێکردنی، واتە بەو وشانە تێیان ڕاخوڕی بۆ ئەوەی بڕوا بەڵام جوڵەی لەخۆی بڕی. خەڵکەکە وتیان: قەصواء «ناوی حوشترەکەی پێغەمبەرە» مانی گرتووە پاشەو پاش دەکشێتەوەو ناڕوا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نا «قەصواء» مانی نەگرتووە پاشەو پاش ناکشێتەوە ئەوە ڕەوشتی ئەو نییە، بەڵام ئەو کەسەی فیلی ئەبرەهەی مەنع کرد لەڕۆیشتن ئەمیشی مەنع کردووە پاشان فەرمووی: سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە داوای هەر خیطەو پلانێکم لێبکەن رێزو شکۆمەندی پیرۆزیەکانی پەروەردگاریی تێدابێ دەیاندەمێ. پاشان لە «قەصواء»ی خوڕی‌و دەنگی دا ئەویش هەڵسا. لە ڕێگە لایان داو رۆیشتن لەژوور حودەیبییە لەسەر بیرێکی کەم ئاو بارو بارگەنەیان

خست، خەڵکەکە کەم کەم ئاویان لێهەڵێنجا، هێندەی پێ نەچوو ئاوی تێدا نەماو هاواریان بۆ پێغەمبەر برد شکوای تینوایەتی خۆیان کرد، پێغەمبەر تیرێکی لە هەگبەکەی خۆی دەرهێناو فەرمووی بیبەن بیخەنە ناو بیرەکەوە، ئیتر ئاوەکەی زۆر بوو هەتا لەوێ بوون بەرەهایی بەشی کردن و تینوویان نەبوو.

لەوکاتەدا کە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەوێ جێگیر بوون، بەدیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێك دا هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من کەهاتم دیتم کەعبی کوڕی «لؤی» بە ژمارەیەکی زۆرەوە هاتوونە سەر ئاوی حودەیبییەو هەرچی حوشتری شیردەرو بێچوداریان هەیە لەگەڵ خۆیان هێناویانەو بەنیازن شەڕت لەگەل بکەن و نەهێڵن زیارەتی کەعبە بکەی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکوو هاتووین عەمرە بکەین، شەڕو کوشتار قوڕەیشی ماندو شەکەت کردوەو بڕستیان لێ بڕاوە، ئەگەر ئارەزویان هەبێ ماوەیەکیان بۆ دیاریی دەکەم بۆ گفتوگۆ. پەیوەندییان بەنێوانی من و خێڵە عەرەبەکانی ترەوە نەبێ. ئەگەر ویستیان بابچنە ناو ئەو پەیمانەی خەڵك دەچێتە ناوی، ئەگینا با بۆخۆیان ئیسراحەت بکەن. خۆ ئەگەر بەم پێشنیارە رازی نەبوون سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، شەڕیان لەگەڵ دەکەم تا لەپێناو ئەم پەیامەدا تێدادەچم، یان خودا سەرم دەخا بەسەریان دا. شتێکی ئاشکراو نمایانیشە خودا فەرمان و ویستی خۆی جێ بەجێ دەکا.

«بدیل» وتی: ئەم قسەیەی تۆیان پێ دەگەیەنم، چو بۆلای قوڕیش و ئەوەی لەپێغەمبەری بیستبوو راست و ڕەوان بۆی گێڕانەوە. عوروەی کوڕی مەسعود پێشنیاری بۆ قوڕەیش کرد: کە بێتەلای پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو ڕاسپاردەی «بدیل» قسەی لەگەڵ بکا. وتیان دەبڕۆ بزانە چۆن لەگەڵی دەدوێی؟ عوروە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو قسانەی

بە «بدیل»ی گوتبوو بۆ ئەمیشی دوبارە کردنەوە. عوروە وتی: نازانم تۆ بەچ بیانوو پاساوێك گەل و نەتەوەی خۆت ریشە کێش دەکەی. ئایا بیستوتە لەوەپێش یەکێك لەعەرەب خزم و کەس و کاری خۆی قەڵاچۆ کردبێ. خۆ ئەگەر بەشێوەیەکی تریش بێ. وەڵڵاهی من کۆمەڵێك دەم و چاو هەرچی و پەرچی دەبینم لەدەورو بەرت کۆبونەوە هەر لەگەڵ لێت قەوما هەڵدێن و دەورت چۆڵ دەکەن، بێ کەس دەمێنیتەوە، ئەبوبەکر هەڵیدایەو وتی: خاك بەسەری خۆت و بتی «لات» ئێمە پێغەمبەر بەجێ دێڵین و هەڵدێین؟؟

عوروە ئاوڕی دایەوە وتی: ئەوە کێ بوو؟ وتیان: ئەبوبەکر بوو وتی سوێندم وابێ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە چاکەی بەسەرمەوە هەیەو تائێستا پاداشی چاکەکەم نەداوەتەوە، دەمزانی چۆن وەڵامم دەدایەوە«[١]».

پاشان کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵ پێغەمبەر دا، لەگەڵ قسەکانی دا دەستی دەبرد بۆ ریشی پێغەمبەر ﷺ موغەیرەی کوڕی شوعبە بەسەر سەری پێغەمبەرەوە بەشمشێرەوە وەستا بوو، هەر لەگەڵ عوروە دەستی بۆ ریشی پێغەمبەر دەبرد موغەیر بەکلکی شمشێرەکەی دەیدا بەدەستی عوروەداو دەیگوت دەستت دوورخەرەوە لەریشی پێغەمبەر! عوروە سەری هەڵبڕی وتی ئەوە کێیە؟ وتیان موغەیرەی کوڕی شوعبەیە، عوروە وتی: ئەی پەیمانشکێن! ئەرێ من نەبوم پینەو پەرۆم بۆ کردی و پاساوم بۆ پەیمانشکێنییەکەت دەهێناوە؟؟«[٢]».

---

١ دەڵێن: کاتی خۆی عوروە خوێنی چووەتە سەرشان ئەبوبەکر یارمەتی داوە.

٢ لەسەردەمی نەزانی دا موغەیرە ببوە هاوڕێی چەند کەسێك هەموویانی کوشتبوو، ماڵ و سامانەکەشی بردبوون. پاشان چووە خزمەت پێغەمبەرو موسوڵمان بوو، پێغەمبەر پێی فەرموو موسوڵمانبوونەکەت قبوڵ دەکەین وەلێ ماڵ و سامانەکەتمان ناوێ، .موغەیرە برازای عوروە بوو..

پاشان عوروە بەوردی دەیڕوانییە هاوەڵانی پێغەمبەرو لێیان ورد دەبووەوەو سەرنجی هەڵس و کەوتی دەدان. دەڵێ: وەڵڵاهی پێغەمبەر تف و چڵمێکی لەدەم و لوت نەدەهاتە خوار ئیللا دەکەوتە سەردەستی یەکێك لەهاوەڵان و خێرا دەم و چاوو پێستی خۆیانیان پێ دەهەنوو. ئەگەر فەرمانیان پێ بکا یەکسەر جێ بەجێی دەکەن، ئەگەر دەستنوێژ بگرێ خەریکە ببێتە شەڕیان لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی. ئەگەر قسەی لەگەڵ دا بکەن بەدەنگی نزم ئاخاوتنی لەگەڵ دەکەن و ئەوەندەیان بەلاوە بەڕێزە زات ناکەن پڕ بەچاوانیان سەیری بکەن.

ئیتر عوروە گەڕایەوە بۆلای قوڕەیشییەکان و وتی ئەی گەل و عەشرەت! بەخودا من چوومە لای مەلیك و پاشایان و کیسراو نەجاشی. بەخودا هیچ پاشاو مەلیکێکم نەدیوە هێندەی موحەممەد هاوەڵانی ڕێزی لێ بگرن. بێگومان ئەو پیاوە واتە: موحەممەد پێشنیارێکی زیرەکانەو باشی بۆ کردوون قبوڵی بکەن. ئەمجار قوڕەیشییەکان سوهەیلی کوڕی عەمریان بەنوێنەری خۆیان نارد بۆلای پێغەمبەر بۆئەوەی لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا نامەی صوڵح و ئاشتەوایی بنووسێ. جاکە سوهەیل لەلای پێغەمبەر دانیشت وتی: بێنە لەنێوان ئێمەو ئەوان دا قەواڵەیەك بنووسە. پێغەمبەر نووسەری بانگ کرد «نووسەرەکە عەلی کوڕی ئەبوطالیب بوو» پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بنووسە «بسم الله الرحمن الرحيم» سوهەیل وتی من نازانم «الرحمن» چییەو کێیە.. دەبێ بنووسێ «باسمك اللهم»موسوڵمانەکان وتیان بەخودا جگە لە «بسم الله الرحمن الرحيم» هیچی تر نانووسین. پێغەمبەر فەرمووی: قەیناکە بنووسە «باسمك اللهم». ئەمجار فەرمووی: بنووسە: «هذا ما قاضى عليه محمد رسول الله» سوهەیل وتی: ئەگەر ئێمە بزانین تۆ پێغەمبەری خودای بۆچی ناهێڵین بچیە ناو کەعبە، بۆ پەیامەکەت ڕەتدەکەینەوە؟ بۆ شەڕت دژ

دەکەین؟ بەڵکوو بنووسە: «محمد بن عبدالله» پێغەمبەر فەرمووی: وەڵڵاهی من پێغەمبەری خودام هەرچەند بڕوام پێ نەکەن و بەدرۆم بخەنەوە!! قەیناکە بنووسە «محمد بن عبدالله» فەرمانی بەئیمامی عەلی کرد وتی ڕەشی بکەرەوە، ئیمامی عەلی وتی بەخودا ڕەشی ناکەمەوە. پێغەمبەر فەرمووی شوێنەکەم نیشان بدە، نیشانی داو ئەویش سڕیەوە. ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی بنووسە «ڕێگامان بدەن بچینە ناو کەعبەوەو تەوافی بکەین». سوهەیل وتی: وەڵڵاهی: نابێ، نامانەوێ عەرەب بڵێن: ئەوە قورەیش ئەوەیان بەزەخت قبوڵ کردوە. بەڵکوو ئێمە ساڵی داهاتوو ڕێگاتان پێ دەدەین بەمەرجێ موسوڵمانەکان شمشێریان لەکالان دا بێ. ئەو خاڵەش بەدڵی سوهەیل نووسرا. ئەمجار سوهەیل وتی: هەرپیاوێك لەئێمەوە هاتەلای تۆ ئەگەر لەسەر ئایینی ئێوەش بێ دەبێ بیگەڕێننەوە بۆلای ئێمە. ئەگەر یەکێك لەئێوە هاتە لای ئێمە نایگێڕینەوە. موسوڵمانەکان کەوتنە دەربڕینی ناڕەزایی وتیان: چۆن دەبێ کابرای موسوڵمان ڕادەستی موشریکەکان بکەینەوە. ڕویان کردە پێغەمبەرو عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا ئەو خاڵەش بنووسین؟ فەرمووی: بەڵێ، هەرکەسێك لەئێمەوە بڕواتەوە بۆ ناوموشریکەکان ئەوە خودا لەڕەحمەتی خۆی دوری خستۆتەوە. کەسێکیش لەوانەوە بێتەلای ئێمە ئەوە خودا دەرووی لێ دەکاتەوە.

ماوەی صوڵح و ئاشتەواییەکە بەپێی قسەی ئیبنو ئیسحاق و ئیبنو سەعدو حاکم دە ساڵ بووە بەبێ زیادو کەم. ئەوەشی تێدا هاتبوو هەر هۆزو خێڵێك بیەوێ بچێتە ناو عەهدو پەیمانی لایەکیانەوە دەتوانێ بچێ و ئازادە. ئیتر خێڵی خوزاعە وتیان: ئێمە لەهاوپەیمانی و سوێندخۆری موحەممەد داین، بەنوبەکر وتیان ئێمە لەهاوپەیمانی قورەیش داین.

کــە قەواڵــە نامــەی صــوڵحەکە نووســراو مــۆرکرا چــەند پیاوێــك لەموســوڵمانەکان و لەموشــریکەکان بــوون بەشــایەد بەســەر نــاوەرۆکی صوڵحەکەدا.

لەصــەحیحەین دا هــاتووە عومــەری کــوڕی خــەتاب دەڵــێ: پــاش مۆرکردنی قەواڵەکە هاتمەلای پێغەمبەر ﷺ عەرزیم کرد ئەرێ بەڕاستی ئەتۆ پێغەمبەری خودانی؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنمان لەسەر بەتاڵ نیە؟ فەرمووی: بەڵێ: وتم: ئایا ئەگەر شەڕبکەین کوژراوی ئێمە لەبەهەشتانین و کوژراوی ئەوان لەناو دۆزەخ؟ فەرمووی: بەڵێ: وتم دەی باشە لەپای چی ئێمە ئەم پەستی و لاوازییە لەئایینی خۆمان دا قبوڵ بکەین؟ دەڵێ: پێغەمبەر وەڵامی دامەوە فەرمووی: من پێغەمبــەری خــودام سەرپێــچی ناکــەم پابەنــدی فــەرمانی ئــەوم و ئــەو یارمەتیم دەدا، وتم: باشە تۆ نەتفەرموو ئێمە دەچینە ماڵی کەعبەوەو تــەوافی دەکــەین؟ فــەرمووی: بــەڵێ، بــەڵام ئایــا مــن وتم: ئــەم ســاڵ ئــەوە ئــەنجام دەدرێ؟ وتــی نــەخێر. فــەرمووی: دڵنیابە دەچیە نــاو کەعبــەوەو تــەوافی بــەیت دەکــەی. ئەوەنــدەی پــێ نەچوو حــەزرەتی ئەبوبــەکر هــات، عومەر هەمان پرسیاری ئاڕاستەی ئەویش کرد. ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی کوڕی خەتاب، ئەو پێغەمبــەری خودایە سەرپێچی فــەرمانی خــودا ناکــا، هــەرگیز خــوداش ئــەو ناهومێــد ناکــا. ئــیتر ئەوەنــدەی نــەبرد ســورەتی «فــەتح» نــازڵ بــووە ســەردڵی پێغەمبــەرو نــاردی بــەدووی عومــەرداو سورەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، ئیمــامی عومــەر وتــی: ئــەی پێغەمبــەری خودا! ئەوە مانای رزگار کردنی مەککەیــە؟ فــەرمووی: بــەڵێ، ئــیتر عومــەر دڵی ئاوی خواردەوە«١».

---

١ متفق علیه.

پاشان پێغەمبەر ﷺ روی کردە هاوەڵانی و پێی فەرموون: هەڵسن قوربانییەکانتان سەر ببڕن و مووی خۆتان بتاشن، سێ جار ئەم فەرموودەیەی دووبارەکردەوە. خەڵکەکە سستیان تێدا کردو هیچیان پابەندی فەرمانەکە نەبوون، چووە لای ئوممو سەلەمەی خێزانی و ئەوەی بۆباسکرد، خاتوو ئوممو سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەتەوێ هاوەڵان ئەوکارە ئەنجام بدەن؟ بڕۆ قسە لەگەڵ کەس مەکە تاقوربانییەکەی خۆت سەر دەبڕی و بانگی سەرتاشەکەت بکە سەرت بۆ بتاشێ. پێغەمبەر چووە دەرو بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکا کوشتی خۆی سەربڕی و سەری تاشی. کە هاوەڵان ئەوەیان بینی خێرا پەلاماری قوربانی سەربڕین و سەرتاشینیان دا. لەپەلە پەلیان خەریك بوو هەندێکیان هەندێکیان بریندار بکەن.

پاش گەڕانەوەیان بۆ مەدینە کۆمەڵێك ئافرەت کۆچیان کردبوو موسوڵمان ببون. لەناویان دا ئوممو کولثومی کچی عوقبەیان تێدا بوو. ئیتر ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ} «الممتحنة/١٢» ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئەم ئافرەتانەی نەگێڕانەوە بۆلای کافرەکان«١».

## پەیمانی ژێردرەختی ریضوان:

پێغەمبەر ﷺ عوثمانی کوڕی عەففانی نارد بوو بۆلای قوڕەیشییەکان پێش نووسینی ئاشتینامەی حودەیبییە، بۆئەوەی قسە لەگەڵ قوڕەیشییەکان بکا، قوڕەیشییەکان ماوەیەك لای خۆیان بەندیان

---

١ صحيح البخاري.

کرد، هەواڵ وا بەپێغەمبەر گەیشت: کە عوثمان کوژراوە، فەرمووی: لەم شوێنە ناجوڵێین تا لەگەڵ قورەیش ئەمە یەکالا نەکەینەوە. پێغەمبەر بانگی هاوەڵانی کرد کەبێن پەیمان ببەستن. بەیعەتی ریضوان لەژێر درەختێك لەوشوێنەدا بەسترا.

پێغەمبەر ﷺ یەکە یەکە دەستی دەخستە ناو دەستی هاوەڵانییەوەو بەیعەتی لەگەڵ دەبەستن. پێغەمبەر ﷺ لەبەیعەتکردنەکەدا ئاماژەی بۆ دەستی خۆی دەکردو دەیفەرموو: ئەمە عوثمانە. دوای تەواو بوونی بەیعەتەکە هەواڵی راستی بە پێغەمبەر گەیشت کە هەواڵی کوژرانی عوثمان درۆ بووە.

## پەندو ئامۆژگاری:

وشەیەکی کورت دەربارەی حیکمەتی صوڵحی حودەیبیە:

پێش ئەوەی بچینە ناو تەفاصیلی ئەوشتانەی کە پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکەین لەوانەکانی ئاشتی حودەیبیەو پەندو ئامۆژگاریو حوکمەکانی بەچەند وشەیەکی کورت دەڵێین: روداوی ئەم صوڵحە مەظهەرێك بوو بۆ پلانێکی یەزدانی پوختو بێ خەوش، کرداری پێغەمبەر تێیدا دەرکەوتو رەنگی دایەوە، بەجۆرێك کرداری پێغەمبەر لەهیچ پلانێکی تردا ئاوا رەنگی نەداوەتەوە. بێگومان سەرکەوتنی ئەم پلانە نهێنییەك بوو پەیوەست بوو بەشاردراوەیەکی غەیبی پێچراوە لەزانیاری خودا خۆی دا. بۆیە صوڵحەکە بووە جێی مقۆمقۆی موسوڵمانەکانو سەرسامی کردنو دەهشەت گرتنیو بیریان لەشتەکە نەکردەوە، لەم روەوە روداوی ئەم صوڵحە بەسەرەتاو ئاکامیەوە بنەمای گرنگ سەرنج راکێشن بۆ راستکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامیو جێگیرکردنی.

باسەرەتا باسی لایەنی ئەو حیکمەتە گەورەو پرفەرەی خودا بکەین کە ئەم صولحە لەخۆی گرتبوو دوایی بۆ هەموو کەس دەرکەوت و بوو بەنیشانەیەك لەنیشانە گەورەکانی پەروەردگار. ئەمجار باسی ئەو ئەحکامە شەرعیانە بکەین کەڕوداوی صولحەکە رایان دەگەیەنن.

بەشێك لەو حیکمەتە پڕ خێرو فەرەی صولحی حودەیبییە ئەوەیە پێشەتای رزگارکردنی مەککە بوو، بێگومان ئەم صولح و هودنەیە «وەکوو ئیبنو قەییم دەڵێ: دەرگاو کلیلی رزگار کردنی مەککە بوو» ئەمە داب و نەریتی پەروەردگارە، رێگا خۆش دەکا بۆ هەر کارێ بیەوێ بێتەدی، پێشەتاو رێخۆشکەرەی بۆ دەرەخسێنێ و نیشانەو عەلاماتی پەی پێ بردنی بۆدادەنێ.

جائەگەر موسوڵمانان لەساتە سەرەتاییەکانی صولحەکەدا ئاگاداری ئەم لایەنە نەبوبن ئەوە هۆکارەکەی ئەوەیە داهاتولێیان نادیار بووە، ئەوە زانیاری غەیب و پەنهانی بووەو ئەوان لەکوێ ئاگاداری غەیب بوون؟ چۆن لەپەیوەندی ئەو واقیعەی بینیان و ئەو غەیبەی کەهێشتا تەصەوریان نەکردبوو حاڵی بن؟

وەلێ هێندەی پێ نەچوو، موسوڵمانان بەئاشکرا هەستیان بەگرنگی ئەم صولح و هودنەیە کردو زانییان چەند پڕ خێرو فەرە بۆیان و چ سەرکەوتنێکیان بەدەست هێناوە؟! لەسایەی ئەم صولحەدا خەڵك لەیەکتری دڵنیابوون، موسوڵمانان توانییان تێکەڵ بەکافرەکان ببن و بانگەوازییان بکەن بۆ ئیمان هێنان، قورئانیان بۆ بخوێنن و بەگوێیان دا بدەن، موناقەشەو حیوار دەربارەی ئیسلام بەئاشکراو عەلەنی ئەنجام بدەن، ئەوانەی موسوڵمانێتی خۆیان شاردبۆوە ئاشکرای بکەن و خۆیان دەرخەن.

ئیبنو هیشام لە ئیبنوئیسحاق و ئەویش لە «الزهری» ریوایەت دەکاو دەڵێ: هیچ فەتحێك لەئیسلام دا پێش فەتحی مەککە نەکراوە لەصوڵحی حودەیبییە گەورە تربێ. لەوەپێش موسوڵمان و کافر بەیەك گەیشتبان دەبوو بە شمشێر لێك راکێشان. بەڵام کە صوڵحی حودەیبییە مۆرکراو هودنە راگەیەندرا، شەڕ نەما، خەڵکی لەیەکتر دڵنیابوون، پێك گەیشتن و دان وسانیان کرد راو بۆچونی خۆیان گۆڕیەوە، هەرکەسێ دەربارەی ئیسلام ژیرانە قسەی لەگەڵ بکرایە موسوڵمان دەبوو لەماوەی ئەو دوو ساڵەی بەسەر سوڵحەکەدا تێپەڕی ئەوەندە خەڵك موسوڵمان بوون، لەو هەموو ساڵەی پێشودا ئەوەندە موسوڵمان نەبو بوون.

بۆیە قورئانی پیرۆز ئەم صوڵحەی «کە بەڕواڵەت موسوڵمانەکان بە تێشکانیان لەقەڵەم دەدا» ناو ناوە فەتح. دەفەرموێ: {لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا} «٢٧» سورة الفتح

هەر لەحیکمەی بەرزو پڕ فەڕی صوڵحی حودەیبییە، ئەوەیە پەروەردگار ویستی لەمیانەی ئەو صوڵحەدا جودا وازی نێوان وەحیی پێغەمبەرایەتی و پلانی فیکری ئادەمیزادیی لێك جیابکاتەوە. جودا وازیی نێوان تەوفیقی پێغەمبەری ڕەوانەکراوو هەڵس و کەوتی مرۆڤی لێهاتوی بیردۆز دەربخا، جوداوازیی نێوان ئیلهامی خودایی کەلە ژوور جیهانی ئەسباب و دیاردەکانییەوە دێ و ڕەوکردن و شوێنکەوتنی ئاماژە پێکردنی ئەو ئەسبابانەو حوکمەکانیان. پەروەردگار ویستی پێغەمبەرەکەی، پەیامی پێغەمبەرەکەی یارمەتی بداو سەری بخاو لەپێش چاوی هەموو عاقڵ و بیرکەرەوەو ورد خوێنەوەدا تای تەرازوی کێشەی نێوان ئیمان و کوفرو حەق و ناحەق یەکالا بکاتەوە.

وێدە دەچێ ئەم ئاماژەکردنە بڕێك بێ لەتەفسیری رستەی «وینصرك الله نصراً عزیزاً» واتە: خودا سەرکەوتنێکت بۆ دەستەبەر بکا نمونەی سەرکەوتن بێ و بارو دۆخەکان بەلای حەق دا وەرچەرخێنێ، فیکرو عەقڵ و هەستەکان بهەژێنێ. لەم ڕوانگەوە بوو کەپێغەمبەر ﷺ هەرچی موشریکەکان داوایان کرد پێی رازی بوو، هەر مەرجێکی دایاننا ئەو قبوڵی کرد، ئاسانکاری لەگەڵ موشریکەکان کرد، لە شتی وادا کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر بۆیان قوت نەدەچوو!! بڕوانە ئیمامی عومەر چۆن تەنگە تاوی و قەلەق و ناڕەحەتی دایگرت. تەنانەت دەربارەی خۆی «وەکوو ئیمام ئەحمەدو هی تر ریوایەتیان کردوە» دەڵێ: من ڕۆژو دەگرم و نوێژدەکەم و زەکات و صەدەقە دەردەکەم، کۆیلە ئازاد دەکەم لەترسی ئەو قسانەی ئەو ڕۆژە کردمن. هەروا تۆدێت چۆن خەڵکەکە ڕەنگیان ڕەش داگیرساو جۆش دامان کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن بەسەربڕینی کوشتییەکانیان و بەتاشینی سەریان و بەبێ ئەنجامدانی عەمرە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە. هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرمانەکەی دوبارە کردەوە بەڵام هاوەڵان تا پێغەمبەر بەفیعلی کوشتی خۆی سەرنەبڕی و سەری نەتاشی، ئەوان هەر بەهیوای چونە ناو کەعبە بون و ئیحرامیان نەشکاند!!.

بێگومان نهێنی لەئەوەدا ئەوە بوو هاوەڵان لەهەڵس و کەوتی پێغەمبەر ورد دەبوونەوە، ئەوان لەسەر زەمینەیەکی ئادەمیزادانەو بەدیدی ئادەمیزادانەی خۆیان دەیانڕوانی، بینین و تێگەیشتنیان بەئەندازەی دیتن و تێگەیشتنی خۆیان و ئەزمونە ئادەمیزادییەکەیان لەشتەکان حاڵی بون. بەدیدی ئادەمیزادانەی خۆیان شتەکانیان دەبینی. لەکاتێك دا پێغەمبەر ﷺ لەهەڵس و کەوتەکانی دا لەژوور ئاستی ئادەمیزادی و ئەزمونی ئادەمیزادی و هۆکارەمادییەکان وەستا بوو،

پێغەمبەرایەتی ڕەهاو وەحیی ئاسمانی ئاڕاستەی دەکردو ئیلهامی پێ دەبەخشی. جێ بەجێ بوونی فەرمانی یەزدانی لەپێش چاوی ئەو لەبواری پراکتیزەبون دا بوو، ئەو بەحوکمی پێغەمبەرایەتیەکەی مەودایەکی دەبینی هاوەڵانی نەیاندەدی.

ئەمە بەڕونی و بەئاشکرایی لەوەڵامەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ عومەری کوڕی خەتاب دەردەکەوێ، ئەوەتا کە عومەر سەرسامی خۆی بەرامبەر ئەم تەنازولکردنەی پێغەمبەر بۆ موشریکەکان دەربڕی، یان بلێ ناڕازی بوو، پێغەمبەر لەوەڵامی داو لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی عومەردا وتی: {إني رسول الله ولست أعصيه وهو ناصري}.

هەروا لەئامۆژگاری و وەصییەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ حەزرەتی عوثمان کاتێك ناردی بۆ مەککە بۆئەوەی وت و وێژ لەگەڵ قوڕەیش دا بکاو مەبەستی هاتنی پێغەمبەریان بۆ ڕون بکاتەوە. وێڕای ئەوە فەرمانی پێکرد کە لەگەڵ چەند پیاوو ئافرەتێکی موسوڵمان دا کۆببێتەوەو مژدەیان بداتێ بە ڕزگارکردنی مەککەو بڵاو بوونەوەی ئایین و باڵادەستبوونی ئایین لەناو مەککەو دەرەوەی مەککە، هەتای وای لێ دێ هەموو کەس بەئاشکرا موسوڵمانیەتی خۆی رادەنوێنێ و کەس لەترسان ئیسلامەتی خۆی ناشارێتەوە. هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ بەچاوێکی پێغەمبەرانە داهاتووی بینیوەو خودا بەسەر هەندێ لەو غەیبەدا ئاگاداری کردوە. بەڵام هاوەڵان ئەو دیدو بۆچونەیان بۆدەستەبەر نەبوو.

کەوابوو هیچ جێی سەرسوڕمان نییە: کە هاوەڵان بکەونە دەهشەت و سەر سوڕمانەوە لەهەڵوێستی پێغەمبەر کە ئاوا نەرمکێشی لەگەڵ قوڕەیشییەکان دا کردو چییان گوت: لەصوڵحەکەدا ئەو پێی رازە بوو. چونکە ئەوان لەوکاتەدا هەڵوێستی پێغەمبەریان بەسەنگ و تەرازوی

ئادەمیزادیانەی خۆیان تاوو توێ کردو لێک دایەوە. وەلێ زۆری پێ نەچوو ئەو دەهشەتەیان کۆتایی هاتو غەمو خەفەتیان ڕەوییەوە، شتی نەزاندراویان بۆ ڕون بووە. ئەمەش کاتێک پێغەمبەر دوای مۆرکردنی قەواڵەی صولحەکە سورەتی «الفتح»ی بەسەر دا خوێندنەوە. ئەوکاتە هاوەڵان بۆیان دەرکەوت کە پابەندبوون و قبوڵ کردنی مەرجەکانی ناو قەواڵەکە سەرکەوتنە بۆیان، یان بڵێین دەرگای چونە ناو گۆڕەپانی سەرکەوتنە، موشریکەکانیش: کە بەتەمای شکۆمەندی و سەرکەوتن بوون، کەوتوونە چاڵی زەلیلی و تێشکانەوەو بەخۆیان نەزانیوە. ئەوان لەو شوێنەی کەبەتەما سەرکەوتن و زاڵبون بون زەلیل داماو کران. لەئاکامی صولحەکەدا سەرکەوتنی گەورەو بەرچاو بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان بەرجەستە بوو، بەبێ ئەوەی چ دەورێکی عەقڵ و فیکری ئادەمیزادی تێداهەبێ.

ئایا لەبواری عەقیدەدا هیچ بەڵگەیەک هەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد لەم بەڵگەیە بەرچاو تربێ؟

بێگومان موسوڵمانەکان سەرەتا زۆر دڵتەنگ بوون بەڕازی بوونی پێغەمبەر ﷺ بەومەرجەی نوێنەری موشریکەکان، «سهیل»ی کوڕی عەمر، داینا کەبریتی بوو لەوەی «هەرکەسێ لەقوڕەیش بەبێ ئیزنی وەلی و سەرپەرشتیاری بێتە لای موحەممەد دەبێ بەبێ چەندو چون پێغەمبەر ئەو کەسە ڕادەستی ئەوان بکاتەوە».

موسوڵمانەکان خەمیان زیادی کردو پتر ناڕەحەت بوون کاتێک بینیان ئەبو جەندەل «کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر» لەدەست موشریکەکان هەڵاتبو بەزنجیرکراوی، باوکی هەڵسا قژی گرت لەگەڵ خۆی بردی و دەیگوت: ئەی موحەممەد! پێش ئەوەی ئەمە بێ بۆ لای تۆ ئێمە قەواڵەو ڕێککەوتنی خۆمان بڕاندۆتەوە، پێغەمبەر فەرمووی:

ڕاستە، ئیتر کابرا کوڕەکەی خۆی پەلکێش کردو رایدەکێشا دەیبردەوە بۆلای قوڕەیش، ئەبو جەندەلیش بەهەموو دەنگی خۆی هاواری دەکردو دەیگوت: ئەی کۆمەڵی موسولمانان! ئەوە من دەگێڕنەوە بۆلای موشریکەکان، بۆئەوەی توشی فیتنەم بکەن لەئایینەکەم دا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو جەندەل صەبر بگرەو داوای پاداش لەخودا بکە، بێگومان خودا بۆ تۆو ئەمثالی تۆ دەراوی خێرو رزگاربون دەکاتەوە. ئێمە لەگەڵ قوڕەیشییەکان رێك کەوتووین پەیمانمان داونێ و پابەندی بەڵێنی خۆمان دەبین. بێگومان هاوەڵان دەیانڕاوانییە ئەم دیمەنەو خەمی گەورە سەرو دڵی دەگرتن.

دەی بابزانین دوای ئەمە چی ڕویدا؟

بێگومان دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە کابرایەکی تر موسڵمان بو بوو، لەدەستی قوڕەیش هەڵاتبوو ناوی «ئەبو بەصیر»بوو، قوڕەیش دوو پیاویان ناردن بەشوێنیا بۆئەوەی بیگێڕنەوە بۆ مەککە، پێغەمبەر ﷺ بەپێی ناوەرۆکی پەیمانەکە ناچار بوو رادەستیان بکاتەوە. دوو پیاوە موشریکەکە ئەبو بەصیریان لەگەڵ خۆیان بردو ڕۆیشتن تای گەیشتنە «ذوالحليفة» لەوێ ئەبو بەصیر یەکێکیانی خافڵاند تا شمشێرەکەی لێ وەرگرت و خێرا کوشتی، ئەوی تریان هەڵات و قاچاندی، ئەبو بەصیر گەڕایەوە بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەر ﷺ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ منت رادەستی ئەوان کردەوە ذیممەی خۆت پاك کردەوە، بەڵام خودا ئەوا منی لەدەست ئەوان رزگار کرد. ئەمجار ئەبوجەندەل لەمەدینە نەمایەوە بەرەو «سیف البحر»، شوێنێکە لەقەراخ دەریا رۆیی قاچاغ بوو خەڵکی تری پێوە نیشت، ئەو دەڤەرە بوو بەلانەی موسوڵمانانی مەککە، هەر پیاوێکی قوڕەیش موسوڵمان بوایە پەیوەندی دەکرد بەتاقمی ئەبو بەصیرەوە، ئەم

کۆمەڵە موسوڵمانە بوونە جێگای مەترسی بۆ قورەیشییەکان هەرکە بیانبیستایە کاروانێکی قورەیش بەرەو شام دەچێ، ئەمان رێگایان پێدەگرتن و موشریکەکانیان دەکوشت و ماڵەکەیان چەپاو دەکرد. تاوای لێهات قورەیشییەکان بەناچاری و پاڕانەوە، داوایان لە پێغەمبەر کرد، بیانباتەوە کن خۆی و کۆنترۆڵیان بکا، ئیتر لەسەر داوای پێغەمبەر هاتنەوە مەدینە.

کە فەتحی مەککە کرا، ئەبو جەندەل ئەمانی بۆ باوکی وەرگرت و ژیا هەتا لەشەڕی یەمامەدا شەهید بوو«١».

بەم جۆرە رۆژ بەرۆژ دەرکەوت صوڵحی حودەیبییە چەند کاریگەریی ئیجابی هەبوو بۆ موسڵمانەکان و بەتەواوی خەم و خەفەتی پێشوویان ڕەوینەوە پتر بڕوایان زیادی کرد بەحیکمەتی خودایی و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد.

لەحەدیثی صەحیح دا ریوایەتکراوە: کە «سهیل»ی کوڕی «سعید» لەرۆژ ی «صفین»دا وتی: {أيها الناس اتهموا رأيكم لقد رأيتني يوم أبي جندل، ولو استطيع أن أرد أمر رسول الله «صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ» لرددته}.

جارێکی تریش ئەوە دوبارە دەکەینەوەو دەڵێین: ئایا لەبەڵگەکانی عەقیدەدا بەڵگەیەکی بەهێز تر لەمە هەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد؟!.

هەروا بەشێك لەحیکمەتە گەورەکانی صوڵحی حودەیبییە ئەوەبوو پەروەردگاری خاوەن توانا و دەسەلات ویستی فەتحی مەککە بکاتە فەتحی رەحمەت و فەڕو خێر بۆ پێغەمبەرەکەی نەك بیکاتە فەتحی تێکڕژان و شەڕو کوشتار. فەتحی مەککەی کردە فەتحێك خەڵك بەپەلە پڕوزەو خێرا خێرا و پۆل پۆل موسوڵمان بن، ئەوانەی لەوەپێش

---

١ الإصابه في تمييز الصحابه، ٤م٢٤.

ئەزیـــەتی پێغەمبـــەرو موســـوڵمانانیان دەداو لەزێـــدی خۆیـــان دەریـــان کردبوون، ئێستا وادەستی ئاشتییان بۆڕادەدێرن‌و دێنە ژێر خێمەی ئایینەوەو لەجیاتی بتپەرستی دەبنە خودا پەرست‌و یەکتاپەرست.

خــودا صــوڵحی حودەیبییــەی ڕەخــساند، تــا ببێتــە ڕێخۆشــکەرەو پێشەتای فەتحی یەکجاری‌و رزگاری سەر تاسەری. لەماوەی صوڵح‌و ئاشــتەوایی دا، قــوڕەیش بــەخۆیان دا چــوونەوەو موحاســەبەی نەفــسی خۆیان تێداکرد، ئەوانیش وێڕای هاوەڵان پەندو ئامۆژگارییـان لەهودنـەو شەڕ ڕاگـرتن وەرگـرت سـەرەتاو کۆتاییـەکانیان بـەراورد کـردو بەیـەکیان گرت.

بیرو بۆچونەکان لەمێشك‌و دەماغ دا کـامڵ بـون‌و پێگـەیین‌و مێشك‌و دڵ‌و دەرونــەکان ئامــادە بــاش بــوون بــۆ قبــوڵی حــەق‌و راســتی. بــەو شێوەکارەکە بەسەر چوو بەرێوە چوو وەکوو لە شوێنی خۆی دا بە دورو درێژی لێی دەدوێین.

## ئەو حوکمانەی پەیوەستن بەصوڵحی حودەیبییەوە

ئـەوەی لـەوەپێش ئامـاژەی بـۆکرا هەنـدێ حیکمـەتی یـەزدانی بـوون دەربارەی صوڵحی حودەیبییـە، ئـەمما ئـەوەی پەیوەسـتە بـەو صـوڵحەوە دەربارەی دەلالەت‌و ئەحکام زۆرو زەبەندەن. بەکورتی لەچەند خاڵێك دا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین.

### یەکەم: ئیـــستیعانەو کۆمـــەکی وەرگـــرتن لەناموســـوڵمان لـــەبواری ئاسەربازیی دا:

لەوەپێش وتمان: پێغەمبەر بیشری کوڕی سەفیانی بەنهێنی نارد بۆ ناو قورەیش بۆئەوەی هەواڵی ئەوانی بۆ بێنێ، ئاخۆ نیازیان چیەو هێزو توانایان لەچ ئاستێك دایە. بیشری کوڕی سەفیان ئەوکاتە موشریك بوو،

لە هۆزی خوزاعەیە. ئەمەش جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی لەوەپێش ئاماژەمان پێکرد کە کاری ئیستیعانەو کۆمەکی داواکردن لەناوموسولْمان، بەگوێرەی بارو دۆخ و حالەتی ئەوکەسەی داوای یارمەتی لێدەکرێ دەگۆڕدرێ. ئەگەر کابرا لەوانە بوو لێی دلنیا دەبووین و ترسی ئەوەی لێنەدەکرا غەدرو خیانەت بکاو فێلْ و تەڵەکەبازی ئەنجام بدا، ئەوە دروستە داوای کۆمەکی لێ بکرێ، ئەگینا نا. هەرچۆنێك بێ، پێغەمبەر ﷺ لەهەموو حالەکان دا: کە پێویست بووبێ داوای کۆمەکی لە ناموسولْمان بکا بۆکاری ناسەربازیی داوای یارمەتی لێ کردون، وەکوو ئەوە ناردبنی بۆ هەوالْزانی و چۆنیەتی بارو دۆخی هێزی دوژمن. یان چەك و سیلاحی لێ خواستون هەرواشتی لەو جۆرە. ئەوەی کە بۆ ئێمە دەردەکەوێ ئەوەیە ئیستیعانە بەناموسولْمان لەبواری سیلمی دا زیاتر مەجالی ڕەوایی و جەوازی تێدا بەرجەستە دەبێ تا بواری سەربازی.

**دووەم: تەبیعەتی شورا لەڕوانگەی ئیسلامەوە:**

«لەوەپێش ئێمە لەگشت تەصەروفات و هەڵس و کەوتی پێغەمبەردا ئەوەمان بەدی کرد: کە راوێژکردن کارێکی مەشروعەو پێویستە فەرمانڕەواو حاکم پەنای بۆ بەرێ و بەکاری بێنێ، کرداری پێغەمبەر ﷺ لێرەدا دەلالەت دەکا لەسەر تەبیعەتی ئەم شوراو راوێژەو ئەو مانایەی بۆی تەشریع کراوە. شورا لەشەریعەتی ئیسلام دا ڕەوایەو باشە، بەلاّم مەرج نییە بەقسەی راوێژپێکراوان بکرێ. عەرەب وتەنی «شورا مەشروعە بەلاّم مولزەم نیە» حیکمەتیش لەراوێژ دەرخستنی رایەکانەو بۆئەوەیە بزانرێ موسولْمانان چۆن بۆئەو کارە دەچن و چ چارەسەرێکیان بۆئەو کارە هەیە. باسی دۆزینەوەی بەرژەوەندییەکان بکەن و بزانن کامەیان باشەو کامەیان باشترە، وێدەچێ هەندێ

لەموسولْمانەکان لەهەندێکیان باشتر پەی بە بەرژەوەندییەکان بەرن. هەروا جەماوەرەکە دڵیان بەوە خۆش دەبێ کەڕایان وەرگیراوەو حیسابیان بۆکراوە. جا کەفەرمانڕەواو حاکم لەئاکامی راوێژەکە شتێکی بۆ دەرکەوت کەدڵی پێی ئاو بخواتەوەو بەلایەوە پەسەند بوو، دەتوانێ کاری پێ بکا بەمەرجێ لەچوار چێوەی شەریعەتی ئیسلامو ئەحکامەکانی دابێ، دەشتوانێ کار بەئەنجامی راوێژەکە نەکا، بەشێوەیەکی تر هەڵسو کەوت بکا، بەمەرجێ پێچەوانە دەقێکی قورئان یان فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ یان کۆڕای موسولْمانان نەبێ.

بێگومان ئێمە زانیمان پێغەمبەر ﷺ لەحودەیبییە راوێژی بەهاوەڵانی کرد، حەزرەتی ئەبوبەکر رای خۆی دەربڕیو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ هاتوی بۆ ئەنجامدانی عەمرەو زیارەتی ماڵی کەعبە، نەهاتوی بۆ شەڕ. کەوابێ بڕۆ مەوەستە بەرەو کەعبە بکەوەڕێ، هەرکەسێ رێی پێ گرتین شەڕی لەگەڵ دەکەین. پێغەمبەریش لەسەرەتا دا رایەکەی پەسەند کرد، لەگەڵ هاوەڵانی بەرەو کەعبە کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە ئەو شوێنەی حوشترەکەی چۆکی داداو لەڕۆیشتن وەستا، ئیتر زانی ئەو هێڵی سوورەو نابێ سوور بێ لەسەر ڕۆیشتن بەرەو کەعبە، ئیتر وازی لەپەیڕەوی کردنی ئەو رایە هێنا کەلەوەو پێش لەئاکامی راوێژەوە پەسەندی کردبوو، ئەوە بوو وتی: {والذي نفسي بيده لايسألوني خطة يعظمون فيها حرمات الله الا أعطيتهم اياها} ئیتر کارەکە سوڕاو واز لەپەیڕەوکردنی ئەو ڕایەی حەزرەتی ئەبوبەکر هێندراو کرایەوە پڕۆژەی صوڵحو ئاشتەوایی و رازیبوون بەهەموو مەرجەکانی قوڕەیش. پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی راوێژ بەکەس بکا، نەك هەرئەوە، بەڵکوو بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ناڕازیبونی هاوەڵان، هەموو مەرجی موشریکەکانی قبوڵ کرد.

ئەمەش مانای ئەوەیە کەکاری شورا دوا حوکمی وەحیی دێ: کەئەمڕۆ بریتییە لە «کیتاب‌و سوننەت‌و کۆڕای زانایانی ئوممەت». هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ: کە شوڕاو راوێژ بۆ بەرچاو ڕونی تەشریع کراوە نەك بۆ ئیلزام‌و پێویستبوونی‌و پابەندبوون پێیەوە.

## سێیەم: تەوەسسول‌و تەبەڕوك بەئاثاری پێغەمبەر درودی خوای لێبێت

لەوەپێش وتمان: عوڕوەی کوڕی مەسعود سەرنجی دەدایە هاوەڵانی پێغەمبەرو دەڵێ: {فوالله ماتنخَّمَ رسول الله نخامه الا وقعت في كف رجل منهم فدلك بها وجهه وجلده} هەرتف‌و چڵمێکی پێغەمبەر کەدەری دەدا، هاوەڵان نەیان دەهێشت بکەوێتە سەر زەوی، بەڵکوو هەر جارە دەکەوتە ناو لەپی دەستی یەکێکیان‌و دەم‌و چاوو پێستی خۆیان پێ دەهەنوو، ئەگەر فەرمانی پێ بکردنایە خێرا جێ بەجێیان دەکرد، کەدەستنوێژی دەشت دەیانکردە سمڕ سمڕ لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی. ئەگەر لەخزمەتیا ئاخاوتنیان بکردایە دەنگیان بەرز نەدەکردەوە. هەرگیز پڕ بەچاویان لەبەر ڕێز لێگرتنی سەیریان نەدەکرد.

بێگومان ئەوە وێنەیەکی زیندوو بەرچاوە عوڕوەی کوڕی مەسعود بۆمان نمایش دەکاو ئەندازەی خۆشویستنی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر دەردەخا. ئەمەش بۆخۆی چەند دەلالەتێکی گرنگ‌و پڕ بەهای لەخۆ گرتون، پێویستە هەموو موسوڵمانێك هەڵوێستەیان لەسەر بکاو لێیان ورد بێتەوە.

یەکەمیان ئەوەیە بەبێ خۆشەویستی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت ئیمان نایەتە دی. کەسێك پێغەمبەری خۆش نەوێ ئیمانیشی نییە باخۆی بەموسوڵمان حسێب بکا، مەبەستیش بەخۆشەویستی مانا عەقڵانییە روتەکەنییە، بەڵکوو ئەو ئەثەرو کاردانەوەیە: کە کۆنترۆڵی دڵ دەکاو

**خاوەنی دڵەکە والێدەکا رام ببێ و بەو تەبیعەت و سروشتەکار بکا. کە هاوەڵانی پێغەمبەر بەرامبەری دەیانکرد.**

**دووهەمیان ئەوەیە: کە تەبەروك بەئاثاری پێغەمبەر ﷺ کارێکە مەندوب و ڕەوایە، مەشروع و پەسەندە. زۆر فەرمودەی صەحیح و چەسپاو ریوایەتکراون دەربارەی ئەوە: کە هاوەڵان تەبەڕوکیان کردووە بەموی پێغەمبەرو بەئارەق و ئاوی دەستنوێژی و ئەو پیاڵەی ئاوی تێدا دەخواردەوە، لەوەپێش بڕێ فەرمودەمان لەم بارەوە هێناون. پێویست ناکا لێرە دوبارەیان بکەینەوە«١».**

---

١١١ بگەڕێرەوە بۆ لاپەڕە () لەم کتێبەدا.

براده‌رێکم ‌.ڕێزم بۆی هەیە. بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێك ئەم باسەی عوروەی لەم کتێبەی من دا بەرچاو کەوتووە، ژمارەیەکی زۆری لەو لاپەڕەی باسەکەی تێدایە ڕەسم گرتووە، دابەشی کردوە بەسەر خەڵك داو داوای لێکردون بیخوێننەوەو بزانن پێغەمبەر چەند خۆپەرست بووە، مەبەستی کابرای بلاو کەرەوەی ئەوباسە تۆمەتبار کردنی پێغەمبەر بووە بەوەی پیاوێکی خۆپەرست و چەوسێنەرەوە بووە پیاوێك بووە ویستوویەتی یارەکانی ملکەچ و ژێر دستە بکا!! دەڵێم: ئەوەی ئەو پیاوە پێی هەڵساوەو ئەو هەموو پەڕەیەی لەو باسە بەناو خەڵك دا بلاو کردۆتەوەو سەرنجی بۆلای ڕاکێشاون کارێکە سوپاسی لەسەر دەکرێ و بەگوێرەی نیەت و نیازی خۆی پاداشتی خۆی وەردەگرێ. چونکە کردەوەکەی جەختکردنەوەی حەقیقەتێکی چەسپاوە ئەمڕۆ زۆرکەس لێی بێ ئاگان، ئەویش زۆر ڕێزلێگرتنی هاوەڵان بۆ پێغەمبەرو زۆر خۆشویستنیەتی بەئەندازەیەك کە جێگای سەر سوڕمانە!! چەند زۆرن ئەو لوغەزو گرێکوێرکانەی لەمیانەی مەعالیمی فەتحی ئیسلامی و روداوەکانی دا خۆیان دەنوێنن و تەحەدای عەقڵی مرۆڤ دەکەن، ئەگەر ئەو خۆشەویستییە گەورەو سەر سوڕهێنەرە نەبێ کەدڵ و دەروونی هاوەڵانی پێغەمبەری داگرتبوو چوو بووە ناخی دڵیانەوەو لەوەوە سەری هەڵدابوو کە بڕواو یەقینیان پەیدا کردبوو کە موحەممەد پێغەمبەری خودایەو ڕەحمەت و هیدایەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتی. دەڵێم ئەگەر ئەو خۆشەویستییە سەر سوڕهێنەرە بەرچاو نەگرین و لەوێوە دەرگا نەکەینەوە ئەو لوغزو گرێ کوێرانە تەفسیر

ناکرێن‌و شی ناکرێنەوە. بەڵام ئەوەی ئەو کابرایە مەبەستی بووە لەڕەسم گرتنەوەی ئەو باسەو بڵاو کردنەوەی بەو شێوە فراوانە، کەنیازی لەکەدار کردنی مەکانەی پێغەمبەرو تەشویهی کەسایەتی پیرۆزی لەناو دڵان دا. وێنا کردن‌و ڕانواندنی لەپێش چاوی خەڵك دا لەشێوەو مەظهەری کەسێکی خۆسەپێنەر بەسەر هاوەڵانی دا. لەزەت بین‌و چەشەکەری خۆشی بەدیتنی ئاپورەی هاوەڵانی کە ئاوا پاڵەپەستۆو سمڕ سمڕیانە بۆ گەیشتن بە خزمەتی‌و دەستکەوتنی پڕیشکێك لەئاوی دەستنوێژی یان مویەکی جەستەی یان ڕەشفەیەکی ئاوی زاری. دەیەوێ پێغەمبەر وابخاتە ڕو کە گەورەو ڕابەرێکی قورس‌و بارگرانەو پیشەی ئەوەیە وا خۆنیشانی خەڵکی بداو شتی وایان بخاتە بەرچاو کە حەق وایە لێیان بشارێتەوە، بەم کارەشی دەیەوێ هاوەڵانی وارام بکا خۆشیان بوێ‌و ئولفەت‌و خۆبگرن بەهەر شتێك پەیوەندی بەئەوەوە هەیە یان لێی دەبێتەوە، واتە: هاوەڵانی وا ڕابێنێ نەك هەر خۆی بەپیرۆز بزانن، بەڵکوو موو تفو ئاوی دەستنوێژیشی بە موتفەرك‌و پیرۆز بزانن. دەڵێم: ئەوەی ئەو پیاوە لەبڵاو کردنەوەی ئەو لاپەڕە فۆتۆ کۆپیانەی نیازو مەبەستی بووە، نەی پێکاوەو ڕێگای هەڵە کردەوە، لەئامانج‌و هەدەف لایداوە.

زۆرن ئەوانەی ئەم هەوڵە پوچانەیان داوە، بیرو بۆچون‌و هێزی خۆیان گوشیوەو لەمێژوو پاڕانەووە بۆئەوەی هەلیان بۆ بڕەخسێ وێنەی مرۆڤێکی وا بۆ پێغەمبەر داتاشن‌و وای وێنا بکەن پیاوێکی خۆپەرست‌و حەزکردو لەوەی هاوەڵانی ملکەچی بن‌و هێندەی ڕێز لێبگرن چڵك‌و عەرەق‌و توك‌و تفی بەپیرۆز بزانن، بەڵام هەوڵەکانیان پوچ بونەوە. بەدەست بەتاڵی‌و مایە پوچی گەڕانەوە. هەریەك لەعەقڵ‌و مێژوو ئازادو دەستپاك‌و ئەمین بوون لەسەر ئەو وتە جامیعەی پەروەردگار وەصفی حەزرەتی موحەممەدی پێ کردوە لەکتێبی پیرۆزو خالیدی خۆی دا دەربارەی فەرموویەتی .وإنك لعلى خلق عظيم..

لەهەر کتێبێکی شەمائیلی حەزرەتی موحەممەد بڕوانی‌و هەرباسێکی ڕەوشت‌و ئەخلاقی ئەو زاتە بخوێنیەوە، خۆت لەبەرامبەر زاتێك دەبینی نمونەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتییە، نمونەی ئینسانی کامڵ‌و بێ عەیب‌و خەوشە بەتەواوی ماناو تا ئەو پەڕی سنووری مرۆڤایەتی. لەهەمان کات دا نمونەی زەوقی بەرزو ناسك بووە بەپێوەری مامەڵەو سلووك. هەروەکوو چۆن نمونەی هەستی ناسك بووە لەبواری ڕیعایەتکردنی

کەسانی بەرامبەرو گرنگیدان پێیان. تا خودا حەزبکا گرنگی بە پاكو خاوێنیو ڕێكو پێككردنی دیمەنو مەظهەری خۆی داوە، تا ئەو پەڕی سنوور لەگەڵ هاوەڵانی دا تەواضوعی نواندوەو وەکوو مرۆڤێکی سادە لەگەڵ هەموو چینو توێژێکی موسوڵمانان دا هەڵسو کەوتی کردوە.

بەپاکترین پۆشاكو خاوێن ترین دیمەنو جوانترین شێوە پێشوازیی لەو شاندانە کردوە کە هاتوونە خزمەتی.

لەهەموو کەس سورتر بوو بۆئەوەی خەڵکی ئەو دیمەنانەی لێ ببینن: کەچاویان پێی فێنك ببێتەوە. پێی خۆش بوو کەسانی بەرامبەری جگە لەبۆنی خۆش بۆنی تری لێ نەکەن، بەڵکوو ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەری خودا زوربەی ماڵو سامانی لەخۆ بۆنخۆشکردن دا خەرج کردوە.

قەت ڕێگەی بەخۆی نەداوە سیرو پیازو هەر خواردنێکی تر کەبۆنی ناخۆش لەهەناسەی دا پەیدا بکا، بخوا. هەر خواردنێك بۆنی ناخۆشی لێ کەوتبێتەوە ئەو نەیخواردوە. کاتێك کە لەسەرەتای کۆچکردنی بۆ مەدینە لەماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری دا بووە سێنییە خواردنەکەی بەدەست لێ نەدراوی گێڕایەوە بۆلای ئەبو ئەیوب، ئەبو ئەیوب بە پەشۆکاویو سەر سوڕمانەوە چووە لای پێغەمبەرو پرسیاری لێ کرد بۆچی سینییە خواردنەکە دەستی لێ نەدراوە، فەرمووی: «لقد شممت فیه رائحة تلكم الشجرة» بۆنی سیرم لەخواردنەکە کردو .وأنا أناجي. منیش خەڵك دێ بۆلامو قسەیان لەگەڵ دەکەم نامەوێ بۆنی ناخۆشم لەدەم بێ. .أما أنتم فكلوا. بەڵام ئێوە چاو لەمن مەکەن بیخۆن.

ئەگەر بیویستایە .قەضای حاجەت بکا. ئەوەندە لەخەڵك دوور دەکەوتەوە، هیچ ئەثەرو بۆنێکیان لێیەوە بۆنەچێ.

هەمیشە سەری بەشانەدەکردو دەمو دانی دەشتو سیواکی دەکرد. ئەگەر زەردیو تەڵخییەکی بەدەمو دانی یەکێك لە هاونشینانی بدیایە ئامۆژگاری دەکرد بە ئامۆژگاری کردنێکی گشتیو ڕەخنە لێگرتنێکی ناسكو نەرمو دەیفەرموو: «مالكم تأتوني قَلْحاً لاتتسوكون؟» ئەوە چیە هەندێکتان دێنە لام دەمو ددانتان زەردیو تەڵخی دای پۆشیونو سیواك ناکەنو دەمو ددانتان پاك ناکەنەوە؟

ئائەوەیە حەزرەتی موحەممەد لەمیانەی برێك لەشەمائیلو رەوشتی بەرزی دا. كە تەعبیر لەئەخلاقی بەرزو هەستی ناسكو زەوقی شەفافو ئیحساسی پیرۆزو بەرزی دەكەن. ئایا تۆ لەئەم لەوحە مرۆڤایەتییە نمونەییە دا پانتاییەك دەبینی بۆ شێواندنو تەزویرو چڵكن كردن؟ كەوابوو لەحەدیثی عوروەی كوڕی مەسعود دا دەربارەی باسی خۆشویستنی هاوەڵان بۆ پێغەمبەریان شتێك بەدی ناكرێ كە لەكەو ڕەخنەی تێدابێ بۆ تەبیعەتو خولقو خوی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) یان مۆری دڵڕەقیو توند تەبیاتی پێوە بنێ لەبواری مامەڵەكردنیو سلووكی لەگەڵ هاوەڵانی دا. هەروا ئەوەی لێ دەرنایەندرێ كە پێغەمبەر وا دەربخا كە مرۆڤێك بووە هەوڵی داوەو پێی خۆش بووە كە هاوەڵانی ئاوا شاكە شاكی بۆبكەنو بەو هەڵوێستەیان لەخۆی بایی بووەو بەخۆی نازیوە.
جا ئەگەر كابرای -كۆپیكەر- دوای ئەم رونكردنەوانە بیەوێ ڕەخنەو گلەییەكانی بگۆڕێو لەجیاتی ئەوە ئاڕاستەی كەسایەتی پێغەمبەریان بكا ئاڕاستەی ئەو هاوەڵانەی بكا كە خۆشەویستنی پێغەمبەر وای لێ كردون ئەو كارانە بكەن كە عوروە كوڕی مەسعود گێڕاویەتییەوە ئەوە پێویستە لەسەری پێش هەموو شتێك ركابەری خۆی دیاریی بكاو بزانێو بۆمان رون بكاتەوە كێ لەناخی دا ئەم ڕەخنەو پێناخۆشبوونەی زیتو زەق كردەوە. بۆئەوەی بێتا وان بەزوڵمو ستەم تۆمەت بارنەكرێ.
هەڵبەتە خەصمو ركابەری كابرای كۆپیكەرو هاوشێوەكانی لەم جۆرە داوایە دا خودی خۆشەویستییەكەیە.
خۆشەویستی بوو ئەو هاوەڵانەی هەڵنا بۆ هەڵسو كەوتكردن بەرامبەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەو شێوەی عوروە بۆمانی باس دەكا. خۆشەویستی كاری لەوەش گرنگتر دەكاو كردویەتی.
خۆشەویستیە كە لە ژێر دەسەڵاتی دا ئاسن نەرم دەبێ.
خۆشەویستی بوو ئاسنی لەژێر دەسەڵاتیان دا نەرم كرد، دووری لێ نزیك كردنەوە. كاری مەحاڵی لەژێر دەستیان دا خستە بواری مومكیناتەوە. شتی ناشیرینی جوانكرد، ئاوی تفتو سوێری بۆ شیرینو گوارا كردن.
ئەوە وەزعو حاڵی خۆشەویستییە، ئەو دەسەڵاتو جەبەڕوتیەتی.
جا ئەگەر ئەو كابرایە -كابرای كۆپیكەر- پێی وایە یاساو قانونێك هەیە لەم ژیانەدا لەخۆشەویستی بەهێزتربێ، دەست ڕۆیشتوتربێتو باشترو زیاتر كار لەنەفسو دەرون

بکاو کۆنترۆڵی دڵو دەرون بکا دەسەڵاتی خۆی فەرز بکا، بابچێ شیکایەت لەوبکا، یا دەستدرێژی بکاتە سەر ئەوو نارەزایی خۆی بەرامبەر دەربڕێ. بابچێ پێناخۆشبوونی خۆی بەرامبەر ئەم کاریگەرییەی خۆشەویستی دەر بڕێو بڵێ تۆ بۆچی وا لەدڵو دەروونی خەڵك دەکەی؟ بۆچی هەڵیان دەنێی بۆکاری ئاوا!!.

وەلێ بەڕاستی جێگای سەر سوڕمانە!... ئەم پیاوەو ئەمثالی ئەو، بەچاوی خۆیان دەبینن بەعەقڵو هۆشی خۆیان دەزانن، مێژووش زۆری بۆ باسکردوین، خۆشەویستی ئەرعەنو نالەبار چ کارێك بەوانە دەکا کە گیرۆدەی ئەو جۆرە خۆشەویستییە دەبن مەبەستم ئەو خۆشەویستییەیە کە بەبێ ئاگاداریی عەقڵ دزە دەکاتە ناو دڵەوە، یان تەحەدای عەقڵو حوکمەکانی دەکاو بەزۆرە ملێ خۆ دەکا بە ناودڵو دەروون داو ئەمجار ئەو دڵە هەوسار دەکاو کێشی دەکا بۆ ناو هەڵسو کەوتی نەشازی وەها تابڵێ سەیرو سەمەرەیەو سەر سوڕهێنەرە، سلووکی وای پێ ڕەچاو دەکاو دەیخاتە قوڕو لیتەی زەلیلی واوە بەزمان ناگوترێو گوتن پێی شەرمەزارە، کەچی بابای کۆپیکەرو هاوشێوەکانی ئەمەیان بەلاوە گەورە نیەو بەناموی نازانن و نەفسی هەستیاریان بەتاوانی نازانن و نارەزایی بەرامبەر دەرنابڕن! بەڵکوو زۆرجار نوسەرو ئەدیبو شاعیرەکان، پیرۆزبایی لەم جۆرە شزوزە وەردیە دەکەنو زۆر ئاسانو ئاساییە بەلایانەوە کە تەصەورو وێنای بکەن بەهەیەجانو وروژانێکی خەمری رزگار کەر!!.

کەچی کە دیمەنێکی ئەو خۆشەویستییە بەرزەی کە لەعەقڵو دڵەوە دەرژێتە ناو مەشاعیرو هەستەکان دەجوڵێنێو شتێکی لەئاثاری ئەو خۆشەویسییە پاکە بینی لەحەیاتی خاوەنەکەی دا .واتە حەیاتی خاوەنی خۆشەویستییەکەو سلووکی.. سەر سوڕمان دەیگرێ بەلایەوە شتێکی غەریبەو دەست دەکا بە ئاخو ئۆفکردنو نارەزایی دەربڕین. نودبەو هاوار دەکاتە کاری خۆیو بۆنەمانی لەباقەتو زەوقی بەرز دەگریو دەیانلاوێنێتەوە!!.

بەڵام باکاکی کۆپیکەرو هاوشێوەکانی بزانن هەموو شتێك لەم جیهانەدا ملکەچی قانونێکە لەدەرەوەی خۆی. جگە لەخۆشەویستی، ئەتۆ نابینی خۆشەویستی ملکەچی هیچ قانونێکی دەرەوەی خۆی ببێ، ئەو هەر ملکەچی قانونی زاتی خۆیەتی!!

هاوار صەد هاوار بۆ کەسێك خۆشی ناو دڵی لەعەقڵی یاخی بێ! خۆشبەختی بۆ ئەوکەسەی خۆشەویستی ناو دڵی ئاشناو گونجاوە لەگەڵ بڕیاری عەقڵی!.

**جائەگەر تۆزانیت تەبەڕوك بەشتێك داواكردنی خێرو فەڕە بەو شتەو بەهۆی ئەوەوە دەزانی كە تەوەسسول بە ئاثاری پێغەمبەر ﷺ كارێكی ڕەوایەو مەشروعە، چ جایی تەوەسسول بەزاتی پیرۆزو موبارەكی. هیچ فەرق‌و جودا وازیش نیە لەنێوان ئەوەدا تەبەروك پێكردنەكە لەحاڵی**

---

بەسە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەڕوی شەرەف‌و شانازییەوە كەئەو خۆشەویستییەمان بۆ پێغەمبەر كەدڵ‌و دەروونی داگرتبون لەبیرو باوەڕی قوڵ‌و هەڵقوڵاو لەعەقڵ‌و ویژدانەوە بەڕاستی پێغەمبەرایەتیەكەی سەرچاوەی گرتبوو، دڵنیابوون لەشكۆمەندی‌و پلەو پایەی بەرزی لای پەروەردگار، ئیتر ئەو خۆشەویستییە چییان پێ دەكاو چۆنیان ئاراستە دەكا بابیكا، باهەڵیان بنێ بۆ بەتەبەروك زانینی ئارەقی جەستەیی تفی دەمی‌و هەرمویەكی جەستەی كە هەڵدەوەرێ‌و پریشكی ئاوی دەستنوێژی كەدەكەوێتە خوار... بابەموتفەڕكیان بزانن‌و بەڕوخساری خۆیانیان دابهێنن‌و جەستەی خۆیانیان پێ مەسح بكەن. ئەوە زمانی خۆشەویستییە زمانی خۆشەویستی لەبۆتەی خۆی دانەبێ قاڵب ناگرێ‌و لەبۆتە نادرێ‌و هیچ شتێكی تر تەحەكومی تێدا ناكا.

ئەمن دڵنیام لەوەی لەناو ئادەمیزاد دا كەسانێك هەن ئەگەر ئەمڕۆ بەچاوی خۆیان حەزرەتی مەحەممەدیان بدیایە بەسەر زەوی دا بڕوا، خۆشەویستی سەركەشیان بۆی وای دەوروژاندن بێ موحابا روخساریان بخەنە سەرزەوی‌و ئەو گڵە ماچ بكەن كە پێغەمبەر قاچی پێدا دەنێ‌و بەهۆی قاچ پیانانی ئەو بەرزو پیرۆز دەبێ.

دژایەتی مەنطیقی ئەم جۆرە خۆشەویستییە ناكا مەگەر كەسێك بەمەنطیقی رق لێبونەوەو بوغض‌و كینە شەڕی لەگەڵ بكا. كێشەیەكیش لەو جۆرەبێ مەنطیق نایسەلێنێ‌و عەقڵ پشتگیری ناكا. چونكە شتێكی ئاشكراو بەڵگە نەویستە جەدەل‌و كێشە لەسەر شتێك ئەنجام نادرێ بەبێ هەبوونی زەمینەیەكی دڵنیا بوون بەحەقیقەتێكی هاوبەش لەنێوان هەردو لایەنی بەكێشە هاتوودا حیكمەتی رۆژگار وتەیەكی مەجنونی كوڕی عامیری بۆ هەڵگرتوین كاتێك بیستییەوە كە واخەڵك لۆمەی دەكەن‌و ڕەخنەی لێدەگرن لەسەر ئەوەی كە بەوجۆرە عاشقی لەیلا بووەو لەیلایەكی ناشیرینی ڕەش پێست، وتی: ئەگەر بەچاوی من بۆیان بڕوانیایە دەیانزانی كە خۆیان هەڵەن. ئەوان جێگەی ڕەخنەو سەر زەنشتن كەبەناحەق لۆمەم دەكەن!

ژیانی دا بێ یان لەدوا وەفاتی بێ. ئاثاری پێغەمبەرو دەرهاویشتە «فضلات»ەکانی پەیوەست ناکرێن بەحاڵەتی ژیان بەهیچ جۆرێك، جا تەبەروك‌و تەوەسسول پێیان لەحاڵەتی ژیانی دابێ یان لەدوا وەفاتی بێ. ئەمە لەصەحیحی بوخاری دا لەباسی «شیب رسول الله» چەسپاوەو سەلمێنراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەس گومڕابون‌و سەریان لێ شێواوە ئەوانەی دڵیان خۆشەویستی پێغەمبەری تێدا نیە، دەڵێن: دوای مردنی پێغەمبەر تەوەسسول بەزاتی پیرۆزی ناکرێ، بەبەڵگەی ئەوەی کاریگەری پێغەمبەر بەلەدونیا دەرچوونی کۆتایی هاتووە، کە مادام وابێ تەوەسسول پێکردنی لەوحاڵەدا تەوەسسول کردنە بەشتێك کاریگەریی نیەو نەماوە.

لەڕاستی دا ئەمە بەڵگەیەکە «وەکوو دەبینی» نیشانەی جەهل‌و نەدانییەکی سەر سوڕهێنەرە تا ئەو پەڕی سنوور!! ئایا پێغەمبەر لەحاڵی ژیانی دا چ کاریگەرییەکی زاتی لەسەر شتەکان هەبووە، تا باسی ئەوەبکەین ئاخۆ دوا وەفاتی ئەو کاریگەرییە ماوە یان نا؟! بێگومان هیچ کام لە موسوڵمانان ناتوانێ‌و ڕێگە بەخۆی نادا هیچ کاریگەرییەکی زاتی لەسەر شتەکان بۆ پێغەمبەر بچەسپێنێ. کاریگەری زاتی تەنها پاڵ خودا دەدرێ‌و ئەو تەئثیری زاتی هەیەو بەس! هەرکەسێك پێچەوانەی ئەو باوەڕەبێ بەکۆڕای موسوڵمانان کافر دەبێ.

سەرچاوەو بنەمای تەبەروك‌و تەوەسسول بەخودی پێغەمبەر ﷺ یان بە ئاثارەکانی، مانای ئەوە نییە کاریگەرییەکە پاڵ ئەو بدرێ‌و بگوترێ تەئثیری زاتی هەیە. پەنا بەخوا بەڵکوو سەرچاوەو «مەناطەکە» ئەوەیە پێغەمبەر گەورەترین مەخلوقە لای خوداو ڕەحمەت‌و فەڕە لەخوداوە بۆ بەندەکانی. بوونی بەوەی: کە لەخودا نزیکەو ڕەحمەتی

پەروەردگارە بۆ مەخلووقات ئەو بریتییە لەتەوەسسول. بەم مانایە بوو کە کوێرێك تەوەسسولی پێکرد بەوەی خودا چاوەکانی بۆ بگێڕێتەوە، پێغەمبەر بۆی پاڕایەوەو خودا ڕۆشنایی خستەوە چاوەکانی«١».

بەم مەعنایە هاوەڵان تەوەسسولیان بەئاثاری‌و هەندێ دەرهاویشتەی جەستەی وەکوو تف‌و ئارەق‌و موی دەکردو بەبێ ئەوەی پێغەمبەر هیچ ناڕەزاییەك دەربڕێ بەرامبەر کارەکەیان. لەوەپێش‌و لەم کتێبەدا باسی ئەوە کرا کە ڕەوایە ئەهلی صەلاح‌و پیاو چاك‌و ئەهلی خانەوادەی پێغەمبەر بکرێن بەشەفاعەتکار بۆ داوای بارانبارین‌و شتی تر، ئەمەش کۆڕای زانایانی ئیسلام‌و فوقەهای شەریعەتی لەسەرە، کەلەناویان دا ئیمامی شەوکانی‌و ئیبنو قودامەی حەنبەلی‌و ئیمامی صەنعانی‌و هی تریش هەن.

دوای ئەم شیکردنەوە جیاوازیکردن لەنێوان حاڵی حەیاتی‌و حاڵی دوا وەفاتی تێکەڵ‌و پێکەڵکردنێکی سەیرو هەڵەیەکی زەقە لە بواری باس‌و لێکۆڵینەوە دا جێگای نابێتەوەو پاساوی بۆ ناهێندرێتەوە.

---

١ حديث توسل الأعمى برسول الله -ص- ورجوع بصره اليه حديث صحيح رواه الترمذي والنسائي والبيهقي وغيرهم. عن عثمان بن حنيف رضي الله عنه أن رجلاً اعمى جاء الى النبي -ص- وهم جلوس معه، فشكا اليه ذهاب بصره فأمره بالصبر، فقال ليس لي قائد وقد شق علي فقد بصري فقال: إئت الميضأة فتوضأ ثم صل ركعتين ثم قل اللهم إني أتوجه اليك بنبيك محمد بني الرحمة يا محمد اني توجهت بك الى ربي في حاجتي لتقضي لي اللهم فشفعه فيَّ. عوسمانی کوڕی حەنیف دەڵێ سوێندم بەخودا ئێمە لەمەجلیسەکە دەرنەچوین کابرا هاتە لامان چاوی چاك ببونەوە.

**چوارەم: حوکمی شەرعی دەربارەی ئەوەی کەسێك دانیشێ و خەڵك دەستەو نەظەر بەدەوری دا رابوەستن:**

لەوەپێش زانیمان کە موغەیرەی کوڕی شوعبە لەسەر سەری پێغەمبەر ﷺ راوەستابوو شمشێری بەدەستەوە، هەر لەگەڵ عوروەی کوڕی مەسعود دەستی بۆ ریشی پێغەمبەر دەبرد، بەدەسکی شمشێرەکەی لەدەستی دەداو دەیگوت: دەستت لەڕوخساری پێغەمبەر دووربخەرەوە.

لەوەپێشیش لەباسی غەزای بەنو قورەیظەدا وتمان نابێ و ڕەوانیە یەکێك دابنیشێ و خەڵك لەدەوری بەپێوە بوەستن. وتمان: ئەوە مەظاهیرو دیاردەی بەگەورە زانین و تەعظیمە کەداب و نەریتی پاشاو قەیصەرو کیسراکان بووەو ئیسلام بەناپەسەندی لەقەڵەم دا. ئەو دیاردە ئەو دەستەو نەظەر وەستانەیە کە پێغەمبەر نەهی لێ کردووەو فەرموویەتی: {من أحَبَّ أن يتمثل له الناس قياماً فليتبوأ مقعده من النار} کەسێك پێی خۆشبێ خەڵکی دەستەو نەظەر لەبەردەمیا بوەستن باجێگای خۆی لەناو دۆزەخ دا ئامادەبکا. دەی باشە بۆچی لێرەدا کارەکە بەپێچەوانە بووە؟

لەوەڵامدا دەگوترێ: نمونەی ئەم حاڵەتانە لەقاعیدەی عامەکە چەرت دەکرێ بەتایبەتمەندی خۆیەوە واتە هەندێ حاڵەت هەن لەیاسا گشتییەکەیەوە دەردەهاویژرێ وەکوو ئەوە کەشاندێکی بێگانەو دوژمن بێنە لای خەلیفەو فەرمانڕەوا، لەوکاتەدا هیچ خراپەیەك نابینرێت کە حەرەس و سەرباز بەدەوری خەلیفەدا ڕابوەستن، شکۆمەندی ئیسلام و هێزو توانای خۆیان نیشان بدەن، پارێزگاری خەلیفەو فەرمانڕەوا بکەن نەوەکوو خوانەخواستە روداوێك و دیاردەیەکی ناخۆش ڕووبدات«[١]».

---

١ بڕوانە: زاد المعاد لإبن القيم ج٢م١١٤.

بەڵام بەگشتی و لەزوربەی حاڵ و بارو دۆخ دا ئەوکارە ناڕەوایەو پێچەوانەی چەمکی یەکتا پەرستی و عەقیدەی ئیسلامییە. بەمەرجێ زەرورەت ئەوە نەخوازێ.

ئەمە دەق دەشوبهێتە ئەو حاڵەتەی لەوەو پێش لەباسی غەزای ئوحوددا دەربارەی خۆبادان و لارو لەنجەکردنی ئەبو دوجانە ئاماژەمان بۆکرد گوتمان هەرشتێك دەلالەت بکا لەسەر تەکەبورو خۆبەزل زانین لەڕۆیشتن دا لەشەریعەتی ئیسلام دا یاساغە، بەڵام هەمان ئەو حاڵەتانە لەکاتی شەڕ دا لەپێش چاوی دوژمن ڕەوایەو پەسەندە ئاماژە بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر دەربارەی شێوە ڕۆیشتنەکەی ئەبو دوجانە کە دەفەرموێ: {إنها مشية يكرهها الله الا في هذا الموضع}.

**پێنجەم: هودنەو شەڕ ڕاگرتن لەنێوان موسوڵمان و دوژمنانیان دا کارێکی ڕەوایە:**

زانایانی ئیسلام و شەرع زانان پەیمانی حودەیبییەیان کردووە بەبەڵگە لەسەر ڕەوایی پەیمانی شەڕ ڕاگرتن بۆ ماوەیەك لەنێوان موسوڵمانان و ئەهلی حەرب جا ئەو هودنەو شەڕ ڕاگرتنە لەبەر تەقای پارەیەك بێ کە وەری دەگرن یا بەبێ عیوەض بێ ئەگەر بەبێ باربەهایێ ئەوا چونکە صوڵحی حودەیبییە بەبێ باربەها بوو ئەگەر لەبەرتەقای هودنەکەدا موسوڵمانان شتێك وەربگرن ئەوە دیارە دروست ترەو باشترە.

وەلێ ئەگەر صوڵح کردنەکە ئەوەی تێدا بوو موسوڵمانان ماڵ بدەن بەدوژمن ئەوە بەلای جەماوەری زانایانەوە دروست نییە، چونکە سوکایەتی تێدایە بۆ موسوڵمانان. هەروەها لەقورئان و فەرموودەدا دەقێك دەست ناکەوێ ئەوە بەڕەوا بزانێ، بەڵام وتویانە: ئەگەر

زەرورەتێك داخوازی ئەوە بوو هیچ چاری تر نەبوو جگە لەماڵ پێدان بەدوژمن، ئەوا ڕەوایە، واتە کاتێ موسوڵمانان کەوتنە حاڵەتێکەوە لەتێدا چونی خۆیان یان ئەسیر بونیان دەترسان تەنها چارەسەریش بۆئەوەی لەوە ڕزگاریان بێ تەنها پارەدان بوو بەدوژمن ئەوە دروستە، وەکوو چۆن دروستە بۆ ئەسیر بەپارە خۆی بکڕێتەوە.

**شەشەم:** ئیمامی شافیعی و ئەحمەدو زۆری تر لەپێشەوایانی ئیسلام پێیان وایە صوڵح کردن لەگەڵ کافران دەبێ بۆماوەیەکی دیاری کراوبێ و نابێ لە دە ساڵ تێپەڕبکات. چونکە پێغەمبەر ﷺ لەصوڵحی حودەیبییەدا بۆ ئەو ماوەیە صوڵحی لەگەڵ کافرەکان دا کرد.

**حەوتەم:** دیاری کردنی مەرج لەپەیمانی شەڕ ڕاگرتن و هودنەدا دوو جۆر هەیە، هەندێ مەرج صەحیح و دروستن، هەندێ بەتاڵ و پوچە. مەرجی صەحیح ئەوەیە پێچەوانەی دەقێکی قورئان یان فەرمودەی پێغەمبەر نەبێ، وەکوو ئەوە بەمەرج بگیرێ ماڵ و یارمەتی بدەن بەموسوڵمانان لەکاتی پێویست دا. یان بەمەرج بگیرێ هەرکەسێ موسوڵمان بوو هات بۆ ناو وڵاتی ئیسلام ڕادەستی کافرەکان بکرێتەوە زانایانی ئیسلام ئەم مەرجانەیان بەلاوە صەحیح و دروستن، دەڵێن: پێغەمبەر لەصوڵحی حودەیبییەدا بەم مەرجانە ڕازی بوو، شافیعی دەفەرموێ مەرجە بۆ ڕادەست کردنەوەی موسوڵمان بەکافر دەبێ لە ناو وڵاتی کوفر دا ئەو کابرا موسوڵمانە ڕادەست کراوە عەشیرەتێکی هەبێ بتوانێ بیپارێزێت«١».

مەرجی بەتاڵ و پوچ ئەوەیە کە دژی بڕیارێکی شەرعی چەسپاوو نەگۆڕ بێ، وەکوو مەرجی گێڕانەوەی ئافرەتی موسوڵمان بۆناو کافرەکان

---

١ بڕوانە باسی هودنە لەکتێبی مغنی المحتاج ج/٤/٢٤٠ و المغنی لإبن قدامە ج٩م٢٩٠ الهدایە ٢م١٠٣ بدایە المجتهد١م٣٧٤.

یا ڕادەست کردنەوەی مارەییەکەیان بۆ ئەوان. یان پێدانی چەکی موسوڵمانان یا ماڵو سامانیان بەدوژمن. بناغەی ئەم حوکمە شەرعییە عەمەلی پێغەمبەرە کەڕازی نەبوو ئافرەتە کۆچکردووە موسوڵمانەکان ڕادەستی قورەیشییەکان بکاتەوە قورئانیش بەصەراحەت نەهی لە ڕادەست کردنەوەیان کرد، وەکوو لەوەو پێش ئاماژەمان پێکرد، لەوانەیە تۆ بڵێی: ئایا پێغەمبەر ﷺ بەم کارەی موخالەفەی پەیمانو بەڵێنێکی نەکرد کەخۆی لەوەو پێش پێی ڕازی بوو بوو واژۆی کردبوو؟ لەوەڵام دا دەگوترێ: بەندەکەی ناو پەیمانی صوڵحی حودەیبییە تایبەت نەبوو بە ئافرەتانەوە بەڵکوو وادیارە بەندەکەی صوڵحی حودەیبییە تەنها بۆ پیاو بوو ئافرەتی تیا باس نەکراوە هەرچۆنێك بێ «وەکوو لەوەپێش زانیمان» تەصەروفاتی پێغەمبەر ﷺ کەسبی قووەتی حوکمی شەرع ناکا مەگەر قورئان لێی بێدەنگ بێ یاخود جەختی لەسەر بکاتەوەو پشتگیری لێبکات بێگومان قورئان هەموو بەندەکانی صوڵحی حودەیبییەی پەسەند کرد جگە لەوەی کە پەیوەندی هەبوو بەڕادەستکردنەوەی ئافرەتی موسوڵمان بۆ وڵاتی کوفر. ئەوەی تەقریر نەکرد. ئەمە ئەگەر بیسەلمێنین کە ڕادەست کردنەوەی ئافرەت لە خاڵەکانی صوڵح دا ئاماژەی پێکرابێ.

**هەشتەم: حوکمی ڕێگە لێگیران لەحەجو عومرەدا:**

ئەو کارەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دا لەدوای واژۆ کردنی صوڵحەکە کە بریتی بوو لەئیحرام شکاندن بەسەربڕینی ئاژەڵی هەدیو سەرتاشین بەڵگەی ئەوەیە کە کەسێك ئیحرام بە عەمرە یان بەحەج ببەستێو ڕێگەی لێبگیرێ دەتوانێ ئیحرام بشکێنێو سەربتاشێو نییەتی شکاندنی ئیحرام بێنێ. هەروەکوو ئەم کارەی حەزرەتی ڕەسوڵ

ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر «حەجەکە یان عومرەکە» سوننەت بوو ڕێگەی لێگیرا، قەزا کردنەوەی لەسەر پێویست نییە، بەڵام بەلای زانایانی حەنەفییەوە قەزاکردنەوەی حەج و عومرە یەك ئیحرامی بۆ بەسرابێ و ڕێگەی لێبگیرێ ناچار ئیحرام بشکێنێ پێویستە لەگەڵ هەلی بۆ ڕەخسا یەکسەر قەزای بۆبکاتەوە بەڵگەی حەنەفییەکان ئەوەیە: دەڵێن: هەموو ئەو هاوەڵانەی لەتەك پێغەمبەر دا بوون و عومرەیان بۆنەکراو صوڵحی حودەیبییە هاتە کایەوە ساڵێ دوایی هەموو ئەوانە لەتەك پێغەمبەر دا بۆ گێڕانەوەی عومرەکەیان بەقەزا لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەبوون جگە لەوانەی لەغەزای خەیبەردا شەهید ببوون.

## غەزای خەیبەر

پێغەمبەر لەکۆتایی مانگی موحەررەمی ساڵی حەوتەمی کۆچی بەرەو خەیبەر ڕۆیی. خەیبەر شارێکی گەورەو فراوان بوو، زۆر قەڵاو دژو زەوی کشتوکاڵی تێدا بوو، سەد میل لەشیماڵی مەدینە بەلای شام دا دوور بوو، لەم غەزایەدا هەزارو چوارسەد جەنگاوەر بەسوارو پیادەوە لەخزمەت پێغەمبەر دا بوون، ئیبنو هیشام دەڵێ کاتێ پێغەمبەر خەیبەری لێدەرکەوت بەهاوەڵانی فەرموو ڕاوەستن، ئەمجار فەرمووی: ئەی خودای ئێمە خاوەنی ئاسمانەکان و ئەوەی دایان پۆشیوە، خاوەنی هەموو چینەکانی زەوی ئەوەی هەڵیان گرتووە، خاوەنی پەرییەکان و ئەوەی گومڕایان کردووە، خاوەنی بایەکان و ئەوەی بڵاوی دەکەنەوە لەتەپ و تۆز، داوات لێدەکەین خێرو فەڕی ئەم شارەمان بدەیە خێرو چاکەی دانیشتوانی و خێری ئەوەی لەم شارەدا هەیە هەموو ڕادەستی ئێمەی بکەو پەنا دەگرین، بە زاتی پاکت لەشەڕو نەگبەتی ئەم شارەو شەڕی دانیشتوانی و شەڕی ئەوەی تێیدایە، بەناوی خودا بەرەو پێش بڕۆن.

پێغەمبەر داب‌و نەریتی وەها بوو ئەگەر غەزای نەتەوەیەکی بکردایە، تادەمەو بەیان پەلاماری نەدەدان، جا ئەگەر لەبەرەبەیان دا گوێی لەبانگ بوایە وازی لێدێنان، ئەگەر گوێی لەبانگ نەبوایە پەلاماری دەدان، جا پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە لەدەوری خەیبەر بەلەشکرەکەیەوە مایەوە، چاودێری هەڵس‌و کەوتی دانیشتوانی شاری کرد، بەرەبەیان وەرزێرو فەلایان بەبێڵ‌و پێمەرەکانیانەوە ڕویانکردە زەوییەکانی خۆیان: کە پێغەمبەرو سوپای ئیسلامیان بینی هاواریان لێهەڵساو بەدەنگی بەرز وتیان: «موحەممەدو لەشکرەکەی» ئیتر قاچاندیان‌و بەرەو ماڵەکانیان گەڕانەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «الله أكبر» خەیبەر وێران بوو، ئێمە هەرکاتێ لەبەرەبەیان دا هێرشمان کردە سەر گەل‌و نەتەوەیەك بەڕاستی توشی بەرەبەیانێکی ڕەش‌و نەگبەت دەبن.

ئیبنوسەعید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری هاوەڵانی کردو سوپاکەی کردە چەند تاقم‌و پێڕ، هەرتاقمەو ئاڵایەکی دایە، شەڕ لەنێوان پێغەمبەرو ئەهلی خەیبەر دا دامەزرا ئەهلی خەیبەر خۆیان لەناو قەڵاکانیان دا دامەزرابوون، موسوڵمانەکان بەیەکەوە قەڵاکەیان فەتح کرد تەنها دوو قەڵا مابووەوە نەگیران ناویان «الوطيح» و «السلالم» بوو، پێغەمبەر ﷺ حەقدە شەو دەورەی گرتن.

ئەحمەدو نەسائی‌و ئیبنو حیبان‌و حاکم لە حەدیثی بورەیدەی کوڕی «الخطيب» ریوایەت دەکەن، دەڵێن: کە ڕۆژی خەیبەر شەڕ دامەزراو حەزرەتی ئەبوبەکر لیوای لەشکرەکەی ئیسلامی وەرگرتوو هەوڵی گرتنی ئەو دوو قەڵایەی داو گەڕایەوەو بۆی نەگیرا بۆ سبەینێ ڕا حەزرەتی عومەر ئاڵای هەڵگرت پاشان گەڕایەوەو بۆی نەگیرا، پێغەمبەر فەرمووی: {لأدفعن لوائي غداً الى رجل يفتح الله على يديه يحب الله ورسوله}

وەڵڵاهی بەیانی ئاڵاکەم دەدەمە دەست پیاوێك خودا لەسەر دەستی ئەو فەتحەمان بۆ دەستەبەر دەکا، ئیتر خەڵکەکە کەوتنە سرکەسرك و پرسیارو وەڵام، ئاخۆ ئەو پیاوە کێیە؟ ئەم فەتحەی پێغەمبەر باسی دەکا بەنسیبی دەبێ، کەبەیانی ڕۆژ بۆوە هەموویان لەدەوری پێغەمبەر خڕبونەوە، هەر یەکەیان پێی خۆش بوو ئەو سەروەرییەی دەست بکەوێ و پێغەمبەر ئاڵاکەی بداتە دەست، فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو طالب لەکوێیە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو چاوی دەهێشان نەهاتووە بۆ ئێرە، بەدوایدا چون و هێنایان، پێغەمبەر ﷺ تفی کردە ناوچاوییەوەو دوعای چاکبوونەوەی بۆ کرد، چاك بووەوە دەتگوت: قەد چاوی ئازاری نەبووە، ئەمجا ئاڵاکەی دایەو ئەرکی گرتنی قەڵای خرایە ئەستۆ ئیمامی عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! شەڕیان لەگەڵ دەکەم تا ئیمان دەهێنن و وەکوو ئێمە دەبنە موسوڵمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەهێواشی بچۆرە گۆڕەپانی شەڕیانەوەو خۆتان دابمەزرێنن، ئەمجار بانگیان بکەن بۆ موسوڵمان بوون، پێیان بڵێن: ئەرکی سەرشانیان چییەو مافی خودا چییە لەسەریان، سوێند بەخودا ئەگەر خودا بەهۆی تۆوە یەکێکیان هیدایەت بدا ئەوا بۆ تۆ لەڕانە حوشتریَ زۆر باشترە. ئیتر ئیمامی عەلی کەوتە شەڕ لەگەڵیان و خودا لەسەر دەستی ئەو فەتحی قەڵای خەیبەری بۆ موسوڵمانەکان هێنایە دی، موسوڵمانەکان هەرچی ماڵ و سامانی ناو قەڵاکان بوو، گرتیان و کردیانە دەستکەوتی جەنگ، بەڵام ئەو دوو قەڵایە «الوطیح والسلالم» نەگیران، موسوڵمانەکان بەردەوام بوون لەگەمارۆدانیان و تەنگیان پێ هەڵچنین هەتا ئەوانەی لەناویاندا بوون تینیان بۆهات و دڵنیا بوون لەتیاچون و فەوتان ئەمجار داوایان لەپێغەمبەر کرد، کە ڕێگایان بدا بێنە دەرەوەو ژیانیان پارێزراوبێ و بەسەڵتە خێزانی قەڵا بەجێ بهێڵن و ماڵ و سامانیان بۆ موسوڵمانەکان بێ، پێغەمبەر ڕازی بوو.

پاشـان داوایـان لەپێغەمبـەر ﷺ کـرد کـە خەیبـەر لـەژێر دەسـتی خۆیـان بمێنێتـەوەو کـاری تێـدا بکـەن‌و کشتوکاڵی تێـدا پـەرە پێبـدەن، چـونکە ئـەوان باشـتر شـارەزایی زەوی‌و باخـەکانیانن دەزانـن چـۆن ئاوەدانی بکەنەوە، هەموو ساڵێکیش نیوەی بەروبووم‌و داهاتیان بدەنە پێغەمبەرو موسوڵمانەکان، پێغەمبەر لەسەر ئەو پێشنیارەیان پەیمانی لەگەڵ دا بەستن‌و پێـی فـەرموون: بەمـەرجێ هـەرکاتێ بمانـەوێ دەرتـان بکەین دەرتان دەکەین«[١]».

ئیبنـو ئیسحاق دەڵـێ: کـە پێغەمبـەر ﷺ پـەیمان‌و صـوڵحی تـەواو کرد، زەینەبی کچی «الحارث» خێزانی صەلاّحی کوڕی مەشکەم مەڕێکی برژاوی بۆ پێغەمبەر نارد، لەوەو پێش زەینـەب پرسیاری کردبوو ئاخۆ پێغەمبـەر حـەزی لـەکوێی ئاژەڵـە بـۆ خـواردن؟ پێیـان وتبـوو حـەزی لەگۆشتی دەستە، ئەویش ژەهرێکی زۆر بەو شوێنە دەکات پاشان باقی جەسـتەی مەڕەکـەی زەهـراوی کـرد، ئـەمجار هێنـای بیخاتـە بـەردەم پێغەمبەر، جا لەبەردەم پێغەمبـەر دا داینـا، ئیتر تەشریفی دەسـتی بـرد، پارچـەیەکی لەدەسـتی ئاژەڵـە سـورەوەکراوەکەی لێکـردەوەو خـستییە دەمیـەوە بیجـوێ بـەڵام تـامی خـۆش نـەبوو بـۆی قـوت نەچـوو، بیـشری کـوڕی «البراء» کـوڕی مەعروشـی لەخزمـەت دا بـوو ئـەویش پارچـەیەک گۆشتی لەوشوێنەی کـە پێغەمبـەر لێـی کردبۆوە لێـی کـردەوە قـوتی دا، وەلێ پێغەمبەر پارووەکەی تف دایەوە، پاشـان فـەرمووی ئـەم ئێسقانە پێم دەڵێ من ژەهرم پێوە کراوە، پاشان بانگی ئافرەتەکەی کـردو دانـی بەتاوانەکـەی دا نـا، فـەرمووی: چـی هـەڵی نـای بـۆ ئـەم تاوانـە؟ وتـی نەتەوەکەم بەو حاڵە گەیشتووە کەدەبینی، وتم ئەگـەر موحەممـەد مـەلیک بێ ئەوا لـەکۆڵمان دەبێتـەوەو ئیسراحەت دەکـەین، ئەگـەر پێغەمبـەریش

---

١ سیاقی چیرۆکەکە بەو شێوازە هی ئیبنو ئیسحاقەو موتەفەقی بوخاری‌و موسلیمە.

بێ ئەوا خەبەردار دەکرێ‌و خۆی لێدەپارێزێ، پێغەمبەر لێی خەلست بەڵام بیشری کوڕی «البراء» بەخواردنی ئەو گۆشتە ژەهراوییە وەفاتی کرد.

ئەوەی «الزهري»و سولەیمانی «التیمیمي» لەکتێبی «المغازي» دا چەسپاندویانە دەڵێن ئەو ئافرەتە موسوڵمان بوو، ئەمجار سیرە نوسان کەوتونە ڕاجیاییەوە هەندێك گوتویانە پێغەمبەر ئەو ئافرەتەی کوشتووە لەتۆڵەی بەشیر دا هەندێکیش گوتویانە مەرەخەسی کردووە، ئیبنو سەعد بەچەند سەنەدێکی جیاجیا هێناویەتی‌و دەڵێ پێغەمبەر ئافرەتەکەی دایە دەست خزمەکانی بەشیرو ئەوانیش کوشتیانەوە، ڕای صەحیح‌و ڕاست ئەوەیە، کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: {ما کان الله لیسلطك علی ذاك} خودا دەسەڵاتی ئەوەی نەداویە تۆ بتوانی من لەناو بەری. هاوەڵانی پێغەمبەر وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ نەیکوژین؟ فەرمووی: نا.

ئەمجا پێغەمبەر دەستکەوتی خەیبەری بەسەر موسوڵمانەکان دا دابەش کرد بۆ پیادە بەشێك‌و بۆ ئەسپ دوو بەش. نافیع ئەم کارەی پێغەمبەری وا لێکداوەتەوە وەکوو بوخاری ڕیوایەتی کردووە ئەگەر پیاوێك ئەسپی پێ بوو سێ بەشی دەدرێتێ ئەگەر هەرخۆی بوو بەشێك وەردەگرێ.

«صفیة» کچی حویەی کوڕی ئەخطەبی سەرۆکی جولەکەکان لەنێوان دیلەکانی خەیبەر دا بوو پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد موسوڵمان بوو، مارەی کرد مارەکردنەکەی ئازاد کردنی بوو.

## گەڕانەوەی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبو هاوەڵەکانی:

هێشتا پێغەمبەر ﷺ هەر لە خەیبەر بوو جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبو هاوەڵەکانی لەحەبەشەوە گەڕانەوەو هاتنە خزمەتی، ژمارەیان شانزە پیاوو ئافرەت بوون، پێغەمبەر ﷺ دوای ئیزن وەرگرتنی لە موسوڵمانەکان لەدەستکەوتی خەیبەر بەشی بۆ ئەوانیش دانا، ئیبنو هیشام دەڵێ: کە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب هاتە لای پێغەمبەر، پێغەمبەر ناوچەوانی ماچ کردو بەخۆیەوە گوشی فەرمووی: نازانم بەچی کەیف خۆش بم، بەگرتنی خەیبەر یان بەهاتنەوەی جەعفەر؟

جا کە پێغەمبەر لەخەیبەرەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە پیاوێکی ئەنصاری بەسەر خەیبەرەوە دانا، ناوی «سەوادی کوڕی غَزِيَّة» بوو، پاش ماوەیەك هەندێ خورمای «جنیب»ی بۆهێنا، پێغەمبەر فەرمووی: ئایا خورمای خەیبەر هەمووی ئاوا باشە؟ وتی: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خودا ڕبەیەك لەم خورمایە بە دوو ڕبە دەگۆڕینەوە، وادەبێ سێ ڕبە لەخورمای تر دەدەین بەربەیەك لەم خورمایانە، فەرمووی: مامەڵەی وامەکەن خورما خراپەکە بەپارە بفرۆشن ئەمجا بەپارەکە خورمای جەنیب بکڕن[١].

## پەندو ئامۆژگاری:

یەکەم شتێك کە سەرنجمان ڕادەکێشێ لەکاروباری ئەم غەزایە، جوداوازی نێوان تەبیعەتی ئەم غەزایەو غەزاکانی تر کە لەوەپێش ڕوی داوە، بێگومان غەزاکانی تر هەمویان شەڕی بەرگری بوون پێویست بووە

---

١ بوخاری ریوایەتی کردووە، بڕوانە: فەتحی باری ٣٤٧م٧ جەنیب واتە خورمای باش.

موسوڵمانان بەرگری لەبونی خۆیان بکەن‌و هێرشی دوژمنانیان بەپاش دا بەرنەوە. وەکوو ئاماژەمان بەو حاڵەتانەکرد لەکاتی باسکردنی هەموو غەزایەك داو هۆکارەکانی. بەڵام ئەم غەزایە، کەیەکەم غەزایەکە دوای روداوی بەنو قورەیظەو صوڵحی حودەیبییە روی داو، تایبەتمەندییەکی تری هەیە. جوداوازییەکی بنەڕەتی‌و جەوهەری هەیە لەگەڵ غەزایەکانی پێشو. لەهەمان کات دا نیشانەی ئەوەیە: کە بانگەوازیی ئیسلامی کەوتۆتە قۆناغێکی تازەوە، لەدوای پەیمانی حودەیبییە.

غەزای خەیبەر یەکەم غەزایە کە پێغەمبەر ﷺ دەست پێشکەر بوو تێیدا، بەناگەهان‌و لەناکاو هێرشی بردە سەر ئەو جولەکانەی لەدەڤەری خەیبەر دا نیشتە جێ بوون. بەبێ ئەوەی ئەوان دەست پێشخەربن بۆ شەڕ.

بێگومان هۆکاری سەرەکی بۆئەم غەزایە ئەوەبوو جولەکە بانگەوازیی کران بۆ ئیمان هێنان‌و ئیمانیان نەهێنا شەڕ لەگەڵ کردنیان لەسەر کوفرو عینادیان‌و قبوڵ نەکردنیان بوو بۆ بانگەوازییەکەو دڵ پیسی‌و حیقدو کینەو رقیان لەئیسلام‌و موسوڵمانان‌و گوێ پێنەدانیان بەبانگەوازی ئاشتیخوازانەی ئیسلام بۆ ماوەیەکی دورو درێژ، لەکاتێك دا بانگەوازیی ئیسلام پشت بەستو بوو بەبەڵگەو دەلیلی بەهێز. بۆیە پێغەمبەر ﷺ شەوی یەکەم کەدەورەی خەیبەری دا و نەیهێشت کەس لە دانیشتوانی خەیبەر پێی بزانن‌و هەروا بەبێ ئەوەی شەڕ لەگەڵ کەس بکا، چاوەڕوانی کرد تا بەیانی بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ بانگی تێدا دەدرێ. کە دونیا روناك بوو بانگی گوێ لێ نەبوو هێرشی کردنە سەرو شەڕی لەگەڵ دامەزراندن، چونکە بانگ شەعیرەو نیشانەی ئەنجامدانی تاعەتێکی گەورەیە کە نوێژەو برپرەی ئایینە. ئێمە لەوەپێش وتمان: پێغەمبەر داب‌و نەریتی وابوو کە غەزای نەتەوەیەکی بکردایە تا ڕۆژ

نەبوایەوەو کاتی بانگی بەیانی تێپەڕ نەبوایە هێرشی نەدەکردنە سەر، جا ئەگەر ڕۆژ ببوایەوەو بانگی نەبیستایە پەلاماری دەدان.

ئەم هۆکارە باشتر خۆی دەنوێنێ و ئاشکرا دەبێ لەپرسیارەکەی ئیمامی عەلی دا کە ئاراستەی پێغەمبەری کرد دوای ئەوەی ئاڵاکەی لێ وەرگرت، ئەوەبوو عەرزی کرد «شەڕیان لەگەڵ بکەم تاوەکوو ئێمە موسوڵمان دەبن؟» لەوەڵام دا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەپارێزو بەهێدی بڕۆ تا دەگەیە نزیکیان، بانگەوازییان بکە بۆ ئیمانهێنان و پێیان بڵێ: مافی خودا چیە لەسەریان و چی پێویستە بیکەن.

بێگومان زانایان لەرووداوی غەزای خەیبەردا چەند حوکم و یاسایەکیان دەرهێناوە لەمە بەولاو بەکورتی ئاماژە بەبڕێکیان دەکەین.

یەکەم: دروستە هێرش بکرێتە سەر هەرکەسێك بانگەوازیی ئیسلامی پێ بگاو حەقیقەتی ئایینی ئاراستە کرابێ و ئیمان نەهێنێ ڕەوایە بەبێ ئینزاری پێشوەخت و بانگەوزای کردنی سەر لەنوێ گەمارۆ بدرێ و هێرشی بکرێتە سەر. ئەمە مەزهەبی شافیعیەو جەماوەری فوقەهاش هاوڕان لەگەڵی دا، وەکوو چۆن پێغەمبەر لەخەیبەر لەنکاوو بێ ئینزاری پێشوەخت گەمارۆی جولەکەکانی خەیبەری دا. وەلێ بەکۆڕای هەموو فوقەهای ئیسلام پێگەیشتنی بانگەوازیی و تێگەیشتنیان لەئیسلام بەشێوەی صەحیح و ڕاست مەرجەو دەبێ پێش هێرش کردن بۆسەریان ئەنجام درابێ.

دووەم: دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ بەسەر جەنگاوەران دا بەوشێوەی لەوەپێش باس کرا، واتە: چوار بەش لەپێنج بەش دابەش دەکرێ بەسەریان دا بۆ پیادە بەشێك و بۆ سوار سێ بەش، بەشێك هی جەنگاوەرەکەو دوو بەشیش بۆ ئەسپەکەی[1]. پێنج یەکی کەدەمێنێتەوە

---

[1] ئەبو حەنیفە دەڵێ: سوار دووبەشی دەدرێتێ بەشێك بۆ خۆی و بەشێك بۆ ئەسپەکەی.

دەکرێتە پێنج بەش‌و بەگوێرەی ئایەتەکە کەئاماژەی پێکردوە دابەش دەکرێ وەکوو دەفەرموێ: {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ} «سورة الأنفال، ٤١» بەشی پێغەمبەر ﷺ لەم پێنج یەکە «دوا وەفاتی خۆی» دابەش دەکرێ بەسەر بەرژەوەندی موسوڵمانان دا، وەکوو فوقەهای شافیعی‌و حەنەفی فەرموویانە، هەندێك لەو ماڵە، تایبەتە بە فەرمانڕەواوە ئەو صەرفی دەکا لەو شوێنانەی بەلایەوە پەسەندە.

سێیەم: دروستە کەسانێك بکرێنە هاوبەشی دەستکەوتی جەنگ‌و بەشیان بدرێ هەرچەندە هاوبەشی شەڕیان نەکردبێ، بەڵام دوای وەرگرتنی ئیزن لە جەنگاوەرانی بەشداربوو لەشەڕدا. ئامارژە بەو کارەی پێغەمبەر ﷺ کە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب‌و ئەوانەی هاتبوونەوە کردنیە هاوبەشی دەستکەوتی خەیبەر هەرچەندە هاوبەشی شەڕیشیان نەکردبوو.

لەڕیوایەتی بوخاری دا ئەوەی تێدانییە: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئیزنی لە جەنگاوەرانی خەیبەر وەرگرتبێ ئەمجار بەشی جەعفەرو هاوەڵانی جەعفەری دابێ، بەڵام ئیمامی بەیهەقی لەریوایەتەکەی دا ئەوەی زیادکردووە: کە پێغەمبەر ﷺ پێش دابەشکردنی غەنیمەتی خەیبەر قسەی لەگەڵ موسوڵمانە جەنگاوەرەکان کردوە ئەمجار جەعفەرو ئەوانەی لەگەڵی بوون کردنی بەهاوبەشی دەستکەوتەکە. ئەم زیاد کردنە لەسەر ریوایەتی بوخاری لەلایەن موسوڵمانی عادلەوە کراوە، زیادکردنی راوی موسوڵمانی عادلیش مەقبوولەو نرخی خۆی هەیە، ئەوەی کە زێدە نرخ‌و بەها دەدا بەم زیادکردنەی بەیهەقی ئەوەیە: کە پێغەمبەر «إبان»ی کوڕی «سەعید»ی بەسەر دەستەیی پۆلێك لەهاوەڵان نارد بوو بۆلای نەجدو گەڕایەوە

پێغەمبەر هێشتا لەخەیبەر بوو غەنیمەتی بەش نەکردبوو، بەڵام شەڕ تەواو بو بوو «إبان» داوای لێ کرد لەدەستکەوتی خەیبەر بەشیان بدا، وەلێ پێغەمبەر بەشی نەدا. دەی بۆ بەشی جەعفەرو تاقمەکەی دا، بەشی «إبان»ی کوڕی سەعیدو تاقمەکەی نەدا؟ بۆ کۆکردنەوەی هەردو ریوایەتەکەو وەرگرتنیانو ڕەت نەکردنەوەیان دەبێ بڵێین: هاوەڵانی بەشدار بوو لەجەنگی خەیبەر دا ڕێگەیان داوە جەعفەرو تاقمەکەی ببنە هاوبەشیانو رازی نەبوون «إبان»و تاقمەکەی بەشیان بدرێ«١».

وێدەچێ ئەتۆ پرسیارێك بکەی بڵێی: ئەمڕۆ کە تەکنۆلۆجیای شەڕو وەزعو حاڵی سەربازو موچەو بەراتیان گۆڕاوە، دەستکەوتی جەنگ چۆن دابەش دەکرێ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە: دەڵێین: ئەتۆ لەوەپێش زانیوتە کە ماڵی «غیر منقولة» بەسەر جەنگاوەران دا دابەش ناکرێ، وەکوو ئیمامی مالیكو ئەبو حەنیفە فەرموویانە، مەگەر بەرژەوەندی وابخوازێو زەرورەت بێ. ماڵی مەنقولەش ئەوە بەسەر جەنگاوەران دا بەو شێوەیەی پێغەمبەر دابەشی کردوە دابەش دەکرێ، لەگەڵ تێبینی کردنو بەرچاوگرتنی ئەو تەطەوراتو پێشکەوتنەی ئەمڕۆ بەسەر بارودۆخی شەڕو چۆنیەتی چەكو جوداوازی پلەی جەنگاوەران دا هاتووە.

هیچ مانیعێکیش نییە کە بەشێوەی «عەلاوە سەنەوی» یان موچەی ئیضافی ئەو دەستکەوتانەیان بەسەردا دابەش بکرێ. ئەوەی کە گرنگە بزاندرێ دەوڵەت بۆی نییە هیچ لەو دەستکەوتانەی بەشی جەنگاوەرانە بۆخۆی قۆرغ بکا.

---

١ بڕوانە: فتح الباری، ٧م٢٤٠ — ٢٤٩.

## چوارەم: گرێبەستی موساقات مەشروعو ڕەوایە:

ئەم جۆرە مامەڵەیە بەو جۆرەیە: خاوەنی زەوی زەوییەکە بدا بە یەکێك بە زەویو ئاوو درەختەوە بۆئەوەی سەروکاری زەویو زارەکە بکاو بەخێوی بکاو ڕەدامی بێنێ. دوایی بەروبوومەکەی بەنیوەیی یان نیسبەتێکی تر بێ لەنێوانیان دا.

ئیمامی شافیعیو مالیكو ئەحمەد فەرموویانە ئەم گرێبەستە دروستە، بەڵگەیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ ئەهلی خەیبەر دا کردوەو ڕازی بوو کە دانیشتوانەکەی، زەویو باخی خەیبەر بەخێو بکەنو بەشێکی بەرو بوومو داهاتی بۆ ئەوان بێ. وەلێ ئەبو حەنیفە پێی وایە ئەم مامەڵەیە دروست نییە، دەڵێ: لەحەدیثەکەدا هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ ئەم مامەڵەیە، چونکە خەیبەر بەزۆر فەتح کراوەو دانیشتوانەکەی حوکمی عەبیدو کۆیلەیان هەیە، هەرچی پێدابن یان پێی نەدابن هی خۆی بووە خۆی بەویستی خۆی پێیی داون نەك لەڕوی مامەڵەوە. هەردوو قوتابیەکانی «ئەبو یوسفو موحەممەد» پێچەوانەی رای مامۆستاکەیان فتوایان داوەو کەوتوونە گەڵ ڕای جەماوەر. ئەمجار فوقەها کەوتوونە راجیاییەوە لەوەدا ئایا صیحەتی گرێبەستی موساقات هەر شموولی دارمێوو دارخورما دەکا؟ یان هەموو دارو درەختێك دەگرێتەوە؟ هەندێك دەڵێن: هەر دارمێوو دار خورما دەگرێتەوەو، ئەمەش بەپێی مەوریدی دەلیلەکە کە زوربەی درەختەکانی خەیبەر دارمێوو دارخورما بوون.

جەماوەری فوقەها پێیان وایە: هەموو دارو درەختێك دەگرێتەوە. بەلاّم گرێبەستێك کەپێی دەگوترێ: موزارەعە، ئەوە زۆرێك لەو فوقەهایانەی گرێبەستی موساقاتیان بەلاوە دروستە «کە شافیعییەکان بەشێکن لەوان» گرێبەستی موزارەعەیان بەلاوە نادروستە.

موزارەعـە ئەوەیـە: خـاوەن زەوی مامەڵـە لەگـەڵ یـەكێك بكـا بڵـێ زەوییەكـەم بـۆ بكـە بەنـەمامو درەخـتو ڕووەكـی تێـدا بڕوێنـە، بەشێك لەبـەروبوومی زەوییەكـە بـۆ تـۆ بـێ. جـەماوەری فوقـەهای شـافیعی فەرموویانـە ئـەم جۆرە مامەڵەیـە دروسـت نییـە، چونكە لـە صـەحیحی موسـلیم دا ریوایـەتێك چەسـپاوە دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ نـەهی كـردووە لەموزارەعـەو فـەرمانی كـردوە بـە موئاجـەرە، شافیعییەكان وتویانـە: ئـەم مامەڵەیـە ناردروسـتە مەگـەر لەگـەڵ موسـاقات دا بـێ، بـەم جۆرە لـەنێوان ریزی درەختـەكان دا مـەودای ئەوەهـەبێ هـەردو لایـان ڕێك بكـەون لەسـەر كشتوكاڵ تێدا كردنی لەچوارچێوەی گرێبەستی موساقات دا.

رای صـەحیح‌و پەسـەند ئەوەیـە: كـە هـەردوو گرێبەسـتی موزارەعـەو موسـاقات دروسـتن، لەرونكردنـەوەی ئـەم رایـەدا گوتویانـە: نـەیكردن لـە موزارەعـە لەسـەرتای ئیـسلام دا بـووە، لەبـەر زۆر پێویـستی‌و نـەبوونی زەوی بـۆ كۆچـكارەكان، لەبـەر ئـەوە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی بەئەنصارەكان كرد كە یارمەتی‌و دڵنـەوایی كۆچكارەكان بكـەن، بەڵگـەی ئەمـە ئـەو فەرموودەیەیـە: كـەئیمامی موسـلیم لەحـەدیثی جـابیرەوە هێناویـەتی، دەفـەرموێ: هەنـدێ لـەپیاوانی ئەنـصار زەوی زیادەیـان هـەبوو، بـەكرێ دەیـان دا بەسـێیەك‌و بەچـواریەك. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: كەسـێك زەوی هەیـە بـابۆخۆی كـشتوكاڵی تێـدابكا، یـان رادەستی برای موسوڵمانی بكا، ئەو كشتوكاڵی تێدا بكا. جا ئەگـەر ئـەو زەوییەكەی لـێ وەرنەگرت بابۆخۆی سەروكاریی بكا.

پاشان كە موسوڵمانان گوزەرانیان خۆشبوو، پانتایی وڵاتـی ئیسلام بەرفراوان بوو ئاتاجیان نـەما، ڕێگە بەموسـوڵمانان درا موزارەعـە بكـەن‌و خاوەن موڵك چی دەوێ لەموڵكی خۆی دا بیكا بابیكا، بەڵگەی ئەمـە ئـەو

گرێبەستە موزارەعەو موئاجەرانەیە کەلەسەردەمی پێغەمبەر خۆی داو سەردەمی خولەفای راشیدین لەدوا پێغەمبەر ئەنجام دران.

**پێنجەم: ماچکردنی گەڕاوە لەسەفەرو شتی وا دروستەو بەخۆوە گوشینیشی ڕەوایە:**

ئەمە وەکوو ئێمە بزانین هیچ خیلافێکی تێدا نییە، ئەگەر سەفەرەکەی دورو درێژ بێ. فوقەها بەڵگەیان لەسەرئەوە کردەوەی پێغەمبەرە ﷺ کە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب هاتە خزمەتی بەخۆیەوە گوشی و ماچی کرد. ئاشکراشە جەعفەر زۆر لەمێژ بوو هیجرەتی کردبوو بۆ حەبەشەو لەوێ مابوەوە. حەدیثەکە ئەبوداود بە سەنەدێکی صەحیح ریوایەتی کردوە. هەروا تیرمیزیش لە عائیشەوە ریوایەتی کردوە، دەفەرموێ: زەیدی کوڕی حاریثە گەیشتە مەدینە پێغەمبەر لەماڵی من بوو زەید هاتە خزمەتی «دەقولبابی» کرد پێغەمبەر بەپیریەوە چوو لەباوەشی گرت و ماچی کرد.

بەڕواڵەت ئیشکالێك دێتە پێشەوە، ئەویش لەفەرموودەکەوە سەرهەڵدەدا، کە تیرمیزی لەئەنەسەوە ریوایەتی دەکا دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، یەکێك لەئێمە توشی براکەی دەبێ یان برادەرەکەی دەبینێ ئایا سەری بۆ دانەوێنێ؟ فەرمووی: نا، وتی: ئەی بەخۆیەوە بگوشێ و ماچی بکا؟ فەرمووی: نەخەیر، وتی: ئەی تۆقەی لەگەڵ بکا؟ فەرمووی: بەڵێ.

بۆ وەڵامی ئەم ئیشکالە دەڵێین: پرسیاری پیاوەکە کەلەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێکرا، دەربارەی بەیەکگەیشتنی عادەتی و رۆژانەی پیاوە لەگەڵ خزم و برادەری دا، کە زو زوو بەیەك دەگەن و یەکتر دەبینن. ماچکردن و دەست لەمل کردن و بەخۆوە گوشین لەم حاڵانەدا

کارێکی باش نییە. بەڵام ئەوەی پێغەمبەر کردی بەنیسبەت جەعفەرو زەیدەوە، ئەوە لەبەر ئەوە بوو لەمێژ بوو یەکتریان نەدی بوو، ماوەی لێك جیابوونەوەیان زۆری درێژە کێشا بوو. کەوابوو حاڵەتەکان جوداوازن.

## شەشەم: ریبای فەضل لەخواردەمەنی دا حەرامە:

«ربا الفضل» ئەوەیە: دوو جۆر خواردەمەنی لەیەك جینس بن بەیەکیان بگۆڕیەوە، یەکێکیان زێدەی هەبێ. بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەزۆر فەرموودەدا نەهی لەو جۆرە مامەڵەیە کردووە. یەکێك لەو فەرمودانە ئەوەیە کە ئیمامی موسلیم لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: ژنەوتم پێغەمبەر نەهی کردوە لەفرۆشتنی زێڕ بەزێڕو زیو بەزیو، خورما بەخورما، گەنم بەگەنم، جۆ بەجۆ. خوێ بەخوێ. مەگەر بەئەندازەی یەکتربن‌و دەستاو دەست بن. کەسی زیاد بدایان داوای زێدە بکا ئەوە ریبایە.

هەروا بەڵگەیەکی تر ئەوەی بوخاری ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر نەی کردووە لەوە خورمای خراپ بفرۆشرێ بەخورمای باش بەڵام خورما خراپەکە زێدەبێ. واتە حوققەیەك خورمای باش بە دوو حوققە یان بە حەوققەو نیوێك بێ.

هەڵبەتە ئێرە شوێنی ئەوە نییە باسی حیکمەتی حەرامبوونی ئەم جۆرە مامەڵە سود ئامێزە بکەین‌و شیکردنەوەی تێدا بکەین شوێنی ئەو باسە کتێبی بەرفراوانی شەریعەت‌و فیقهن وەلێ ئەوەی کە پێویستە سەرنجی بدەینێ لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئەو کابرایەی خورمای باشی بە خورمای خراپ کڕی بوو زێدەی سەر ڕا دابوەوەو مامەڵەکەی بو بوە ریبا، شارەزای کرد بۆ شێوەیەك کە ریبای تێدانەبێ، بەوە پێی فەرموو: خورما خراپەکان بە پارە بفرۆشەو بەپارەکەی خورمای باش بکڕە، ئەم

شـێوەیە ریبـای تێدانیـەو حەڵاڵـە. کـابرا دەیـەوێ بـەم مامەڵەیـەی مامەڵەیەکی تر بکا، کە بەهۆی فرۆشتنی خورمای خراپ خورمای چاك بکـڕێ، هەرچـەندە خورمـا خراپەکـە لەبەرامبـەر دا زیـاتر بـێ، وەلـێ بەوشـێوەیەی لـەوەپێش دەکـرا حـەرامو ریبـەوی بـوو، پێغەمبـەر چارەسەری بۆ دۆزینەوەو هەمان مامەڵەو مەبەستی بۆ هێنانەدی.

ئەو حوکمەی لەم رێنماییەی پێغەمبەر وەردەگیرێ ئەوەیە: دروستە مامەڵەیەکی لەبنەڕەت دا حەرامبێ و حەڵاڵ بکرێ بەوەسیلەو هۆکارێکی مەشـروع، ئەمـە بەحیلـە شـەرع نـاژمێردرێ. کـەوابوو دروسـتە پیـاو ئـافرەتێکی تەڵاقـدراو مارەبکـا بەمەبەسـتی ئـەوەی حـەڵاڵ ببێتـەوە بـۆ مێردی پێشووی مارەی بکاتەوە، بەمەرجێك لەگرێبەستی مارەکردنەکەدا باسی ئەو مەرجە نەکرێو تەڵاقدانەوەکە بەمەرج نەگیرێ. هەروا دروستە خـاوەن قـەرز زەکـاتی مـاڵی خـۆی بـدا بەقـەرز دارەکـەی کـەناتوانێ قەرزەکەی بداتـەوە. کە زەکاتەکەی دایـە ئـەمجار لـەباتی قەرزەکەی لێـی وەرگرێتـەوە. ئیعتیبـار بەقـسەی ئیبنوقـەییم نـاکرێ کـەلێرەدا ڕای جیـاوازی هەیـە بەڵگـەی بـەوە هێناوەتـەوە دەڵـێ کـردەوە بـەگوێرەی نیازەکـەی حیـسابی بـۆ دەکـرێ، ئەوکەسـەی شـتێك دەفرۆشـێ و نیـازی شـتێکی تـری هـەبێ کـە مامەڵەکـەی بـۆ ئـەنجام دەدرێ، هـەروا کەسـێك ئافرەتێك مارە دەکا بۆ مەبەستێك کەغەیری ئەو مەبەستەیە کە نیکـاحی بۆ تەشریع کراوە. ئەم دوو جۆرە عەقدە کـردەوەی بـەتاڵو پوچیان پێوە لکاوە چونکە لەهەردوو عەقدەکە حوکمەکە لەمەبەستی خۆی لادراوە بۆ مەبەستێك کە حوکمەکە بۆ ئەو تەشریع نەکراوە. دەڵێین: چ ئیعتبارێك بۆ بۆچونەکەی ئیبنو قەیم ناکرێ چونکە فەرمودەی صـەحیحی بوخـاری هەڵدەوەشێنێتەوە، بەصـەراحەت پێچەوانەی نـاوەرۆکی ئـەو حـەدیثـەیە قەواعیـدی فیقهـی لەدەقـەکان دەردەهێنـدرێنو لـەژوور دەقەکانـەوە نـابن.

هــەروا چــونکە ئیبنــو قــەیم بۆخــۆی دژی خــۆی دەوەســتێتەوەو بەشـێوەیەکی سـەر سـوڕهێنەر بۆچـونەکەی خـۆی هەڵدەوەشـێنێتەوە. ئـەوەتا لـەکتێبی «أعـلام المـوقعین»دا زۆر درێـژە بـە زەمکردنـی هەنـدێ حیلە شەرع دەداو بەکارێکی حەرامو یاساغیان دادەنێ و راوبۆچونی ئەو فوقەهایانـە پـوچ دەکاتـەوە کـە ئەوحیلـە شـەرعییانە بـەڕەوا دەزانـن و هەڕەشـەی ئـەوەیان لـێ دەکا، کە ئەوانـە رۆژی قیامـەت لەبـەردەم خـودا موحاسەبەی توندیان لەگەڵ دەکرێ.

کەچی پاش چەند لاپەڕەیەك بۆخۆی حیلە شـەرع بەڕەوا دەزانـێ و نمونـەی حیلـە شـەرعی ڕەوا دەهێنێتـەوە. هـەردەڵێی ئـەو نـەبوە پـێش چەند لاپەڕەیەك هێرشی کردونە سەرو دژیان دواوە!! [١].

ئەمجار ماوەتەوە ئەوە بڵێین: لەم غەزایەدا دوو ڕوداو هـەن، هەریـەك لـەو ڕوداوانـە بەحـەدیثـی صـەحیح چەسـپاون و بـەموعجیزەی گـەورە دەژمێردرێن و خودا پشتگیری پێغەمبەرەکەی خۆی پێ کردون.

**ڕوداوی یەکـەم:** ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر تفـی خـۆی لەچاوی ئێشاوی عـەلی کـوڕی ئـەبوطـالیـب داو چـاوی چـاکبۆوەو هـەردەتگوت لـەوەپێش چاوی ئازاری پێوە نەبوەو نەهێشاوە.

**ڕوداوی دووەم:** ئەو هەواڵە بوو: کە خودا بەپێغەمبـەری ڕاگەیانـد، کە ئەو مەڕەی لەلایەن ئافرەتە جولەکەکەوە بۆی برژاوە ژەهـری پێـوەکراوە، لەوکاتەدا پێغەمبەر برێك لەگۆشتەکەی خستبووە دەمیەوە دەیجو. لەبەر حیکمەتێك کە هەر خودا خۆی دەزانێ، پێش ئەوەی پێغەمبەر بفەرموێ: ئـەم گۆشتە ژەهـری پێـوەکراوە «بشر»ی کـوڕی «البـراء» پـاروە گۆشـتی قـوت داو دوایـی بـەهۆی ئـەو گۆشـتە ژەهـر پێـوەکراوە، شـەهید بـوو.

---

١ بڕوانە .اعلام الموفعین. ج٣م٢٩٢ و ج٤م١١٠.

وێدەچێ ئەمە زیاتر نیشانەی ئەوەبێ کە خودا پارێزگاری پێغەمبەری کردووەو لەدەستدرێژی ناحەزان و فێڵی دوژمنانی پارستویەتی و وادەی خۆی کە فەرموویەتی: {وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ} «سورة المائدة، ٦٧» بەجێ هێناوە.

لەوەپێش وتمان راوییەکان کەتوونە راجیاییەوە لەوە دا ئاخۆ ئافرەتە جولەکەکە موسوڵمان بوو یان نا؟ واپێدەچێ موسوڵمان بووبێ بۆیە پێغەمبەر ﷺ نەیکوشتەوە، وەکوو ئیمامی موسلیم باسی کردوە.

ناگوترێ حەق وابوو پێغەمبەر تۆڵەی تاوانەکەی لێ بستاندایەو بیکوشتایەوە، چونکە قاعیدەی چەسپاوی فیقهی ئەوەیە «الإسلام يجب ماقبله» موسوڵمانبوون تاوانی پێشەوەی دەسڕێتەوە، تاوانی کوشتنێك کە بکوژی پێ دەکوژرێتەوە، ئەوەیە تاوانەکە دوا موسوڵمانبوون ئەنجام بدرێ، بەڵام هەر تاوانێك پێش موسوڵمانبوون ئەنجام درابێ بە موسوڵمانبوونی تاوانکار، تاوانەکە دەسڕێتەوە، ئەمما پێش موسوڵمانبوون ئەوە تاوانەکە پەیوەندی هەیە بەدژایەتی و دوژمنایەتییەوە، ئاشکراشە دوژمنایەتی ئەو بەموسوڵمانبوونی کۆتایی پێ دێ.

پاشان جولەکەکانی خەیبەر لەسەر زەوی خەیبەر بەر بەنیوەیی مانەوە، کشتوکاڵی خەیبەریان ڕەدام دێنا. تا سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەر. لەسەردەمی ئەودا جولەکەکان پیاوێکی ئەنصارییان کوشت و دەستدرێژیشیان کردە سەر عەبدوڵلای کوڕی عومەرو دەستی توشی شەلەل بوون، حەزرەتی عومەر بەخەڵکەکەی فەرموو: خەڵکینە! پێغەمبەر وا لەگەڵ جولەکەکان رێك کەتبوو هەرکاتێ ویستی، لەخەیبەر دەریان بکا، ئێستا وا دەستدرێژییان کردۆتە سەر عەبدوڵلای کوڕی عومەر هەردو دەستیان لەئیش خستون. لەوەپێش دەستدرێژییان

کردۆتە سەر موسوڵمانێکی ئەنصاری. ئێمە جگە لەئەوان کەسی ترمان دوژمن نییە. کەسێك ماڵو سامانو قەرزو قۆڵەی هەیە لەخەیبەر بابچێ وەری بگرێتەوە، چونکە جولەکەکانی لێ وەدەردەنێم. بەم جۆرە بڕۆسەی وەدرەنانی جولەکە لەنیوە دورگەی عەرەب ئەنجام دراو دەرکران. فەرمانی پێغەمبەر کە فەرموو بووی: {لا تبقَيَنَّ في الجريرة دينان} بەتەواویی تەنفیذ کرا. خۆئەگەر سەرکەشیو یاخی بوونی خۆیان نەبوایەو لوتبەرزیو سەر ڕەقی سروشتی خۆیان نەبوایە لەخەیبەر دەرنەدەکران. بەڵام بەهۆی تاوانی خۆیان دەرکران زەوی زەوی خودایە بەویستی خۆی دەیدا بەکەسانێك خۆی مەیلی لێبێ.

## ناردنی سەرایا بۆ سەر هۆزەکانی ناو جەزیرەو دەوروبەری مەدینە نامە ناردن بۆ مەلیكو پاشاکانی ئەو ڕۆژگارە:

پێغەمبەر دوای غەزای خەیبەر دەستی کرد بەناردنی سەرایا لەهاوەڵانی بۆ هۆزە جیاجیاکانی ئەعرابی بڵاوە بوو بەناو نیوە دورگەی عەرەبی دا. بۆ ئەوەی ئەرکی بانگەوازیی ئیسلامی ئەنجام بدەنو داوای موسوڵمانبوونیان لێ بکەن ئەگەر نەهاتنە پێشەوە شەڕیان لەگەڵ بکەن.

ناردنی ئەم دەستەو تاقمو سیریانە لەساڵی حەوتەمی کۆچی دا بوو، ژمارەیان «دە» سیریە بوو، پێغەمبەر بەسەرکردایەتی چەند هاوەڵێکی ناردنی.

هەر لەم سەرو بەندەدا پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەناردنی چەند نامەیەك بۆ مەلیكو پاشاکانی جیهانی ئەو ڕۆژگارە، داوای موسوڵمانبوونی لێ کردنو هەڵینان بۆ دەستبەردار بوون لەئایینی پوچی خۆیان.

ئیبنو سەعد لەطەبەقاتەکەی ریوایەتی کردوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر لەصولحی حودەیبییە گەڕایەوە مانگی ذیلحیجەی ساڵی شەشەمی کۆچی، دەستی کرد بەناردنی نوێنەری خۆی بۆلای مەلیكو پاشاکان، نامەی بۆ نوسین داوای ئیمانهێنانی لێکردن. عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا مەلیكو پاشاکان نامەی مۆرکراو نەبێ نایخوێننەوە. ئیتر هەنگوستیلەیەکی زیوی دروستکرد سێ دێری تێدا نووسین «محمد رسول الله» بەو مۆرە نامەکانی مۆردەکردن. لە ڕۆژێك دا شەش کەسی ناردن، هەریەکەیان زمانی ئەو نەتەوەیەی دەزانی کە نێردرابوو بۆلایان، ئەو ڕۆژە لەمانگی موحەرەمی ساڵی حەوتەمی کۆچی دا بوو.

یەکەم کەس کە پێغەمبەر ﷺ ناردی عەمری کوڕی «أمية الضمري» بوو ناردی بۆلای نەجاشی، نەجاشی نامەکەی پێغەمبەری وەرگرتو خستیە سەرچاوی و لەسەر تەختەکەی دابەزیو لەسەر زەوی دانیشتو تەواضوعی نواند، پاشان شادەو ئیمانی هێناو موسوڵمان بوو، وتی: ئەگەر بمتوانیایە بچمە خزمەتی دەچوم»[١].

هەروا پێغەمبەر «دحیە»ی کوڕی «خليفة الكلبي» نارد بۆلای هیرقەل پاشای ڕۆم، دوحیە نامەکەی پێغەمبەری رادەستی گەورە پیاوی «بصری» کرد ئەویش بەدەوری خۆی نامەکەی گەیاندە هیرقەل، هیرقەل نامەکەی خوێندەوە تێیدا نوسرابوو «بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد رسول الله الى هرقل عظيم الروم، سلام على من اتبع الهدى، أمّا بعد فإني أدعوك بدعاية الإسلام أسلم تسلم، وأسلم يؤتِك الله أجرك مرتين. وان توليت فانّ عليك اثم الأثيين. ويا أهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا وبينكم ان لا نعبد الا الله ولانشرك به شيئا ولايتخذ بعضنا بعضاً ارباباً من دون الله فإن تولوا فقولوا اشهدوا

---

١ طبقات ابن سعد، ٢م٢٣ه بەکورتکراوەیی.

بأنا مسلمون» بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان لە موحەممەدەوە کە پێغەمبەری خودایە بۆلای هیرقەل پاشاو گەورەی رۆم، سڵاو لە سەر کەسێك بێ شوێن هیدایەت دەکەوێ، پاشان من بانگەوازیت دەکەم بەبانگەوزایی ئیسلام موسوڵمان ببە خۆت دەپارێزی، موسوڵمان ببە خودا دوو جار پاداشتت دەداتەوە. ئەگەر پشت هەڵبکەی ئەوە تاوانی موسوڵمان نەبوونی فەلاو وەرزیرەکانیشت لەئەستۆیە. ئەی خاوەن نامەکان! وەرن هەمومان بچینە ژێر پەیمانێك لەسەر بیرو باوەڕێك کۆببینەوە هەمووومان ببینە خودا پەرست جگە لە خودا بەندایەتی بۆ کەسی تر نەکەین، هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدەین کەسمان کەسمان نەچەوسێنینەوە، کەسمان ئەوی تر نەکا بەخودای خۆی‌و بەندایەتی بۆ بکا جگە لەخودا کەس خودا نییەو کەس شیاوی پەرستش بۆ کردن نییە. ئەگەر پشت هەڵبکەن ئێوە بڵێن بەشایەت بن‌و بزانن ئێمە موسوڵمانین.

ئیبنو سەعد لە طەبەقات دا دەڵێ: هیرقەل کە نامەکەی پێغەمبەری بۆ هەندێ لە ریش سپی‌و ماقوڵانی خوێندەوە، وتی: ئەی نەتەوەی رۆم! ئایا دەتانەوێ سەرفرازو سەرکەوتو بن؟ مڵك‌و سەڵتەنەتتان پایەداربێ، شوێن وتەو ئامۆژگاری عیسا بکەون! رۆمەکان هاتنە دەنگ‌و وتیان: پاشا! ئەم قسانە چین دەیانفەرموی؟ وتی: شوێن ئەم پێغەمبەرە عەرەبی نەژادە بکەون. ئیتر کەوتنە غەڵبە غەڵب‌و فیشکەو قیڕەو هەڵسڵەمینەوە وەکوو کەرە کێوی، صەلیبیان بەرز کردەوەو کەوتنە نارەزایی دەربڕین. جاکە هیرقەل ئەم هەڵوێستەی لێ بێنین‌و نائومێد بوو لەموسوڵمانبونیان‌و ترسا لەوەی مڵك‌و دەسەڵاتی لەدەست دەرچێ. بێدەنگی کردن‌و هێواشی کردنەوە، ئەمجار وتی: ئەوە من بەتاقیم کردنەوە، ویستم بزانم خۆڕاگریتان تا کوێیەو چەند پابەندی ئایینی

خۆتـانن؟ بـاش بـوو لەتاقیکردنەوەکـە سـەرکەوتوو بـوون و هەڵوێستتان بەدڵی من بوو، ئەوانیش سوژدەیان بۆ برد.

هەروا پێغەمبەر عەبدوڵڵای کوڕی حوذافەی «السهمی» نـارد بۆ لای کیسرا، بانگەوازیی کـرد بـۆ موسـوڵمان بـوون، نامەیەکیشی پێدا نـارد بـۆی، نامـەی پێشکەش کـراو بـۆی خوێندرایـەوە، پاشـان نامەکـەی وەرگـرت و دڕانـدی، کـە هـەواڵی نامـە دڕاندنەکـە بەپێغەمبـەر ﷺ گەیشتەوە، فـەرمووی: خـودا مڵك و دەسـەڵاتی شـەق و پـەق بکا. ئـەمجار کیسرا نامەیـەکی نووسـی بـۆلای «بـازان» کـە سـەروکارو وەکیلـی بـوو بەسـەریەمەنەوە، فـەرمانی پێکردبـوو کـە دوو پیـاوی چـاپوك بنێـرێ بـۆ پێغەمبـەرو قۆڵبەسـتوی بکـەن و بیبـەن بـۆلای کیـسرا! بـازان لەسـەر فـەرمانی کیسرا دوو پیـاوی چـاپوکی نـاردن بـۆ مەدینـەو نامەیەکیشی پێدا ناردن، دوو پیاوە کـە گەیشتنە مەدینـەو چوونـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ نامـەی «بـازان»یـان دایـە دەسـت، پێغەمبـەر ﷺ زەردەخەنەیـەکی کـردو فـەرمووی ئێستا بـڕۆن بەیانی وەرنـەوە ئـەوەی دەمـەوێ پێتـانی بڵـێم: بـەیانی پێتـان رادەگەیـەنم، بـەیانی کـە هاتنـە خزمـەتی، پێیـانی فـەرموو: بـچنەوە بـۆلای بـازانی فـەرمانڕەواتان پێـی بڵـێن خـودای مـن خـودای ئـەوی لـەناوبرد کـەناوی کیـسرایە ئەمـشەو دوای تێپـەڕبوونی حەوت سەعات لەکاتی شەو کسیرا لەناو چوو.

ئیبنو سەعد دەڵێ: شەوی سێ شـەممە دەی مـانگی جیمـادی یەکـەم ساڵی حەوتەمی کۆچی کوڕەکەی کەناوی «شێرەوەیهی» بوو، دەستی لـێ وەشـاندو کوشـتی. دوو پیاوەکـە گەڕانـەوە بـۆلای بـازان و ئـەو هەواڵەیان پێدا، ئیتر بازان موسـوڵمان بوو، هـەموو ئەوانـەش کەلەیەمەن لەگەڵی دا بوون موسوڵمان بوون.

هەروەها پێغەمبەر «الحارث»ی کوڕی عومەیری «الأزدي» نارد بۆلای گەورە پیاوو فەرمانڕەوای «بوصرا» کەناوی شورەحبیل کوڕی عەمری «الغساني» بوو والی و بریکاری رۆمەکان بوو لەسەر ئەو دەڤەرە. ئیتر شورەحبیل نێردراوی پێغەمبەری قۆڵبەست کردو کوشتی. گوتراوە: جگە لە ئەم پیاوە نێردراوەی پێغەمبەر هیچ نێردراوێکی تری پێغەمبەر نەکوژراوە«١».

هەروا پێغەمبەر ﷺ پیاوو نامەی تری زۆری ناردن بۆ زۆر لەسەرەك خێڵ و هۆزە عەرەبەکان زۆریان موسوڵمان بوون و هەندێکیان ملیان نەدا.

هەر لەم سەرو بەندەدا کۆمەڵ کۆمەڵ لەهەموو لایەکەوە خەڵك دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرو موسوڵمانبوونی خۆیان رادەگەیاند، لەوانەی لەم ماوەیەدا لە گەورە پیاوانی عەرەب و ناودارەکانیان موسوڵمانبوون خالیدی کوڕی وەلیدو عەمری کوڕی عاص بوون.

ئیبنو ئیسحاق لەعەمری کوڕی «العاص»ەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عەمر گوتی: لەمەککە دەرچوم بەنیازی چونم بۆلای پێغەمبەر ﷺ توشی خالیدی کوڕی وەلید بووم، لەمەککە بەڕێ کەوتبوو وتم: ئەوە بۆکوێ دەچی ئەی ئەبو سلێمان؟! وتی: وەڵڵاهی دەچم ئیمان دێنم، تاکەی ئاوا بمێنینەوە؟! منیش پێم وت دەی باشە منیش هەر بۆ ئەوە دەرچومو نیازم موسوڵمانبوونە بەیەکەوە رۆیشتین، خالید پێش من چووە خزمەت پێغەمبەرو موسوڵمان بوو بەیعەتی کرد، پاشان منیش چوومە خزمەت پێغەمبەرو ئیمانم هێناو بەیعەتم پێدا.

---

١ واقیدی لەعومەری کوڕی «الحکم»ەوە ریوایەتی کردوە، ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئیبن شاهین لەرێگەی موحەممەدی کوڕی یەزیدەوە ریوایەتی کردوە.

## پەندو ئامۆژگاری:

دیاردەی ئەم قۆناغە تازەیەی بانگەوزایی ئیسلامی، ئەوە بوو خەڵك بەبەربڵاوی باسی ئەم سیریەو شاندو نامەو نوێنەرانەی پێغەمبەریان دەكرد: كە بەشێوەیەكی بەرفراوان ئەنجامی دان. ئەوەبوو سیریەو دەستە جەنگاوەری ناردن بۆسەر هۆزە عەرەبەكانی دەوروبەرو داوای موسوڵمانبوونی لێكردن نامەو نوێنەری خۆی ناردن بۆلای پاشاو قەیصەرو كیسراو فەرمانڕەوایانی جیهانی ئەو سەردەمە. ئەم دیاردەی سیریە ناردن‌و نامە نووسین‌و نوێنەر ناردنانە دیاردەیەكن ئەم قۆناغەی بانگەوازیی ئیسلامی لەقۆناغەكانی پێشەوە جیادەكاتەوە.

بێگومان ئەو قۆناغەی بانگەوازیی ئیسلامی پێیدا تێپەڕی لەسەرەتای كۆچكردنەوە تا پەیمانی حودەیبییە، قۆناغی بەرگری‌و دیفاع بوو، وەكوو لەوەپێش ئاماژەمان پێكرد، وێڕای بانگەوزایی كردنی ئاشتیانەو بێ شەڕو هەرا. ئەوەبوو لەو قۆناغەدا پێغەمبەر دەست پێشخەری نەكرد بۆهیچ هێرش بردن‌و شەڕ هەڵگیرسانێك، تەنانەت لەوماوەیەدا سیریەیەكیشی نەنارد بۆسەر هۆزە عەرەبێك داوایان لێ بكا موسوڵمان بن ئەگینا شەڕیان لەگەڵ دەكا!! بەڵام كاتێك پەیمانی حودەیبییە مۆركرا لەنێوان موشریكە قوڕەیشییەكان‌و موسوڵمانانی مەدینەدا موسوڵمانەكان دڵنیابوون لەهێرش‌و گەمارۆی قوڕەیش‌و گڕو گێچەڵیان، پێغەمبەر دەستی كرایەوەو كەوتە قۆناغێكی تازەوە، قۆناغەكە واخوازیار بوو حوكم‌و فەرمانی شەریعەتی خودا بگەیەنێ‌و تەطبیقی بكا، كەوا بوو ئەم قۆناغە قۆناغی شەڕكردنە لەگەڵ هەموو ئەوانەی بانگەوازیی ئیسلامیان پێ گەیشتوەو سەر ڕەقی‌ولوتبەرزی دەنوێنن‌و بەئەنقەست موسوڵمان نابن! ئەم قۆناغە قۆناغی ئەوەیە پێغەمبەر بانگەوازیی خودای تێدا جێ بەجێ بكا.

قۆناغێکە بەکردەوەو بەگوفتار بووەتە حوکمێکی شەرعی پەیڕەوکراو لەهەموو چەرخەکانی ڕۆژگاردا تا ڕۆژی قیامەتو سڕینەوەی نیەو چەسپاوە. ئەم قۆناغە قۆناغێکە ئەوانەی ئەرکی غەزو فیکریی جیهانی ئیسلامییان لەئەستۆ گرتووە هەوڵ دەدەن پەردە پۆشی بکەن لەمێشکی موسوڵمانان دا بیسڕنەوەو لەپێش چاوی موسوڵمانان گومی بکەن، وا گومانبەرن هەرچی جیهاد هەیە لەشەریعەتی ئیسلامی دا لەسەر بەرگریو ڕەتکردنەوەی دەستدرێژیکردن دامەزراوە، ئەوەتا ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی بۆیە دامەزراوە بەرگری لەبێ دەسەڵات بکا ئیتر پێویست بەهێشتنەوەی بنەمای شەڕی بەرگری نیە.

نهێنی نیەو ئاشکرایە ئەوەی ئەوان هەڵدەنێ بۆ ئەم هەموو فرتو فێڵو چاوو ڕاوەی لەموسوڵمانانی دەکەن ترسانیانە لەوەی موسوڵمانان بەهۆش خۆیان بێنەوە، هەبوونی ترسو بێمی زۆرە لەلای دەوڵەتە بێگانەکانەوە بەخۆر ئاوایی و خۆرهەڵاتیانەوە لەوەی موسوڵمانان بە ئاگابێنەوەو لەناخیان دا مانای جیهاد سەر هەڵبداتەوە، ئەمجار ئەم مانایە پەیوەست ببێ بە بڵێسەی ئیمانی ناو دڵیان، ئەوان دڵنیان هەرکاتێ ئەم حاڵەتە لەلای موسوڵمانان پەیدا ببێو گەشە بسێنێ ژیاری خۆرئاوا تێکدەڕوخێو نامێنێ.

بێگومان عەقڵیەتی مرۆڤی ئەورووپی ئامادەباشی تێدایە بۆ موسوڵمانبونو باوەش بەئیسلام دا کردن، هەرئەوەندە بانگەوازییەکی دڵسۆزانەو زانستیانە بکرێ بۆ ئیمان هێنان ئامادەیە بەپیر بانگەوازییەکەوە بێ، دەی ئەگەر وێڕای بانگەوازی دڵسۆزانە فیداکاریو جیهادیش لەئارادابێ دیارە بەپیرەوەهاتنەکە بەرفراوانو گشتگیر دەبێ.

## حیکمەتی مەشروعیەتی ئەم قۆناغە:

لەوانەیە تۆ ئێستا پرسیاربکەی، بڵێی ئەرێ حیکمەت چیە؟ کابرای موشریك یان بێدین بەزۆر ملکەچی ئایین بکرێ؟ عەقڵیەتی سەدەی بیستەمو بیستو یەك چۆن ئەم شەریعەتو یاسایەی پێ قبوڵ دەکرێ؟!

لەوەڵام دا دەڵێین: ئێمە پرسیار دەکەین ئەرێ چۆن ڕەوایەو بەچ یاساو شەریعەتێك دەوڵەت یان حیزب کابرایەك ملکەچ دەکا بۆ پەیڕەوو پرۆگرامێك کەخۆی دەیەوێو دانیشتوانی وڵات بەگوێرەی نیظامو فەلسەفەی خۆی ئاراستە دەکا؟ کابرا ئازادو سەربەستو مافی خۆیەتی بەیەکسانی لەگەڵ هەموو دانیشتوانی وڵات دا کاربەدەستو رەعایا، تاكو کۆمەڵ ژیان بگوزەرێنن، کەچی بەزۆر یاساو نیظامی دەستکردی ستەمکارانەی خۆیانی بەسەردا دەسەپێنن؟!!

بێگومان مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە بۆیە دروستکراوە حوکمو یاسای خودا پەیڕەو بکاو دەوڵەتی پەسەندی خودایی دابمەزرێنێ. ئەوەیە حیکمەتی وجودی لەسەر زەویو مەعنای خەلیفایەتیو جێ نشینی لەناو زەوی دا. کەلەئایەتی: {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً} «سورة البقرة ٣٠». ئاماژەی پێکراوە.فەلسەفەی ئەم دەوڵەتە خوداییە لەسەربنەمای حەقیقەتی عبودیەت بۆخودای تاكو تەنها دادەمەزرێ، یاساو نیظامیشی لەسەر ئەساسی ئیزعانو گەردنکەچی بەوەی حاکمیەت هەربۆخودایە، سەرچاوە دەگرێ. چونکە هەر خودا بۆخۆی خاوەنو بەدیهێنەرو بەخێوکاریی مرۆڤو هەرچی لەبونەوەردایە، هەرئەو راگرو هەڵسوڕێنەری ئاسمانو زەویو هەرچی تیایاندایە.

چۆن تەصەور دەکرێ دەوڵەتو نیظامو حیزبێك کە بەندەو عەبدانی خودا بەڕێوەی دەبەن بۆیان هەبێ دانیشتوانی وڵاتیان ملکەچو فەرمانبەرداری یاسای دەستکردو ستەمکارانەی خۆیان بکەن، کەچی

بۆخودای بەدیهێنەرو خاوەنی ئەوان ڕەوا نەبێ مرۆڤەکان ملکەچی یاساو حوکمی خۆی بکاو لەبیرو باوەڕی پوچ و بەتاڵەوە بیانخاتە سەر ڕێبازی ڕاستەڕێ و ئایینی حەق و دروستی خۆی؟!

جاکە مرۆڤ جێ نشینی خودا بێ لەجێ بەجێ کردن و تەطبیقی فەرمان و ئەحکامی خودا لەسەر زەوی، ئایە تەصەور دەکرێ ئیلزام و ملکەچکردنی مرۆڤەکان بۆ حوکمی خودا بەبێ هۆکارو واسیتەی مرۆڤ و هەوڵ و تێکۆشانی، مرۆڤەکە بۆخۆی دەچێتە ناو ئایینی خوداوەو بەیعەت لەگەڵ خودا دا دەکا بۆ خۆبەختکردن و ماڵ خەرج کردن لەپێناو بەرپابوونی حوکم و شەریعەتی خوداو دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی. کەلەڕاستی دا ئادەمیزاد بۆیە دروستکراوە شەریعەتی خودا پەیڕەو بکاو کۆمەڵگەی ئیسلامی دابمەزرێنێ.

جا کە تۆ لەم وردکردنەوەو شیکردنەوەیە حاڵی بوی، ئیتر گرنگ نییە لەسەدەی بیستەم و دواتریش دا کەسانێك هەبن نەیانەوێ لەئەمە حاڵی بن، چونکە خەڵکانێکی جۆراو جۆر هەن ئەرکی غەزوی فیکری جیهانییان لەئەستۆ گرتووە و دەیانەوێ بەهەرجۆرێك بۆیان بلوێ دەرزی سڕکەر لەموسوڵمانان بدەن. دەرمانی بێهۆشییان بدەنێ و خەویان لێ بخەن. ئەوانە بەهیچ جۆرێ دڵسۆزی ئازادی و مرۆڤایەتی نین، مەبەستی تایبەتییان هەیەو بۆ بەرژەوەندیی خۆیان کاردەکەن.

ئاخۆ دەبێ چ نرخ و بەهایەك بۆ حورییەت و ئازادی هەبێ لەلای ئەوانەی درۆ لەگەڵ خۆیان و نەتەوەکەیان دەکەن.

ئایینی ئیسلام بۆ نەتەوەکەیان بەوێنەی ناڕاست و قێزەون وێنا دەکەن، موسوڵمانانیان وابۆ وێنا دەکەن تێکدەرو دڕندەو نەزان و شوانەویلەو وشکە تەبیات و ڕەوشت ئاژەڵ. ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی بەر بەتێڕوانینی فیکری موسوڵمانان بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام بگرن و

دەوافیعی باس و لێکۆڵینەوە لەلایان لەچوار چێوەی چەند هێڵێکی جاڵجاڵۆکە ئاسادا بەند بکەن. بۆئەوەی ئاگاداریی حەقیقەتی ئیسلام نەبن و بڕوایان پێی پتەوبێ، بەمەش دەسەڵاتی داگیرکەرو چەوسێنەرەوەی مرۆڤ قەڵاچۆ دەکرێ و دەخرێنە زبڵدانی مێژووەوە.

لەگەڵ ئەمەش دا پێویستە ئەوەمان لەکیس نەچێ، کەبانگەوازیی ئاشتیيانەی پشت بەستو بەحیکمەت و موناقەشەو ئامۆژگاری جوان و رێك و پێك لەهەموو شوێن و سەردەمێك دا گرنگی خۆی هەیەو نابێ پاشگوێ بخرێ و دەبێ تابتواندرێ و بۆماوەیەکی درێژ پەیڕەو بکرێ. جا کە موسوڵمانان بەشێوەیەکی رێك و پێك توانییان ئەم بانگەوازییە لەسەر حەقیقەتی خۆی وەکوو پێویست ئەنجام بدەن، دڵنیایی لەوەی ئایینی ئیسلام ئایینی فیترەتەو ئادەمیزادەکان لەهەرنەتەوەو هۆزێك بن لەم ئایینەدا شتی لێ گومبووی خۆیان دەدۆزنەوە، جگە لە دڵپیس و کینە لەدڵ ئەوانی تر هەموویان دێنە ژێر ئالای ئیسلامەوە، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر دوژمنایەتی پەنگ خواردوی ناو دڵیان دژی ئیسلام و بانگخوازیی.

هەروەکوو چۆن پێویستە ئەوەش بزانی ئەم زۆر لێکردن و بەزۆر موسوڵمان کردنە تایبەتە بە مولحیدو بتپەرستەکان و شوێنکەوتوانیان. ئەگینا ئەهلی کیتاب تەنها ناچاری ئەوە دەکرێن ملکەچی یاسای کۆمەڵگەی ئیسلامی بن، ئەمەش بەهومێدی ئەوەی هەبوونی ئیمانیان بەخوداو تێکەڵییان بە موسوڵمانان و گوزەران لەناویان دا هەڵیان بنێ بۆ موسوڵمانبوونیان بە ئیختیاری و قبوڵکردنیان بۆ عەقیدەی راست.

ئەمجار لەحیکایەتی ئەو نامانەی پێغەمبەر ناردنی بۆ پاشاو مەلیکەکان دەلالەت و ئەحکامی زۆر وەردەگیرێن. لەم چەند خاڵەی دوایی دا کۆیان دەکەینەوە.

**یەکەم:** ئەو بانگەوازییەی پێغەمبەر ئاڕاستەی کرد بانگەوازیکردنی هەموو ئادەمیزاد بوو، تایبەت نەبوو بەگەلو نەتەوەیەکی تایبەتەوە. پەیامەکەشی پەیامێکی ئینسانی بوو، سروشتو طابیعی دەمارگیریو نەتەوایەتیو کوتلەییو تاقمچیەتی تێدا نەبوو، بۆیە پێغەمبەر دەعوەو بانگەوازییەکەی ئاڕاستەی هەموو پاشاو فەرمانڕەوایانی جیهان کرد.

لەئەنەسەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نامەی نووسی بۆ کیسراو بۆ قەیصەرو بۆ نەجاشیو بۆ هەموو فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارێك، بانگی کردن بۆ ئیمانهێنان بەخوداو بەپێغەمبەری ئیسلام.

**دووەم:** لە هەڵوێستی هیرقەل لەگەڵ ئەوانەدا کە پێیان وابوو ئەوان لەسەر ئایینی حەزرەتی عیسان، لوتبەرزیو فیزو سەر ڕەقی بەرامبەر حەقو راستیمان بۆ دەردەکەوێ دەزانین چەند دەمارگیرو رۆچو لەبەتاڵو بەتاڵخوازی دا بوون، ئەوانە بوون: کە ئایین لەدیدو بۆچونیان دا ببوە تەقلیدو چاولێکەریو دەمارگیری. ئەوان نەیاندەڕوانییە ئایین لەو ڕووەوە ئاخۆ حەقە یان بەتاڵە، بەئەندازەی پابەند بوونیان لەم ڕووەوە بەشێکە لە لاسایی کردنەوەیانو دیاردەو مەظهەری دەمارگیرییانو کەسایەتییان.

بێگومان هیرقەل سەرەتا هەڵوێستی ژیرانەو ورد بۆوە لەحەقائیق روداوەکانی نواند، وەلێ وادیارە دەیەویست بزانێ دارو دەستەکەی چ هەڵوێستێکیان دەبێو چییان دەوێ، بۆئەوەی دڵنیا بێو بزانێ چی بکا باشە بۆ پارێزگاریی لەموڵكو سەڵتەنەتی.

**سێیەم:** کردەوەی پێغەمبەر ﷺ کە هەنگوستیلەی بۆخۆی پەیدا کردو سێ دێڕی لەسەر نووسرابوون...، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەلەپەنجەکردنی هەنگوستیلە ڕەوایەو مەشروعە. هەنگوستیلەکەشی

لەزیو بوو. هەروەکوو چۆن ئەم کردەوەیەی ئەوە دەگەیەنێ دروستە لەسەر هەنگوستیلە ناوی خاوەنی بنووسرێ. بێگومان زۆرێك لەعولەما ئەم کارەی پێغەمبەریان کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە مرۆڤ هەنگوستیلە بکاتە ئەو پەنجەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەنگوستیلەکەی تێکردبوو، کە پەنجەی «براتوتە»بوو.

**چوارەم:** هەروا کردەوەکەی، بەڵگەی ئەوەیە پێویستە موسوڵمانان خۆیان ئامادەبکەن بۆ جیهادو دەعوە لەهەموو شوێنێکی جیهانو ئەسبابی پێویستی بۆ بڕەخسێنن. هۆکاری هەرە گرنگیش فێربوونی زمانی ئەو گەلو نەتەوانەیە کە بانگەوازیی دەکرێن بۆ ئیسلامبون، بۆئەوەی بانگخوازەکان بتوانن ئیسلامو حوکمو یاساکانی بەوان بناسێننو فێریانبکەن. ئەوەتا ئێمە زانیمان پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژێك دا شەش کەسی لەهاوەڵان ناردن نامە بگەیەنن بەپاشاو مەلیکەکانی جیهانی ئەو سەردەمە، هەریەك لەو هاوەڵە نێردراوانە زمانی ئەو نەتەوەیان دەزانی کە نامەکەیان بۆ دەبردن.

**پێنجەم:** ئەم کردەوەیەی پێغەمبەر ﷺبەلەبەر چاوگرتنی ڕۆژگاری ڕەوانەکردنی ئەو نامەبەرو نوێنەرانە ئەوە دەگەیەنێ کە موسوڵمانان پێویستە پێویستیاتی بانگەوزای نێو خۆیان تەواو بکەن، خۆیان ڕێك بخەنو ناوخۆیان تۆکمە بکەن، جا کەئەم قۆناغەیان بڕیو لەناو خۆیان دا بەتەواویی تەطبیقی ئایینی ئیسلامیان کردو لەژیانو سلوکیان دا ڕەنگی دایەوە، ئەمجار دەست بکەن بە قۆناغی دووەم.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی زووتر ئەو پیاوانە بنێرێو ئەونامانە بنووسێ، دەیتوانی زۆر پێش ئەو مێژووە ئەوکارە ئەنجام بدا، بەڵام پێش ئەوکاتە ڕیزەکانی ناو کۆمەڵگای ڕێك نەخستبوون، خۆی ئامادەنەکردبوو بۆ قۆناغی دووەم. پێویستە ئەوە بزانین کە چاکسازی

کردنـــی موســـوڵمانان بـــۆ دڵو دەروونو نـــاخی خۆیـــان کـــارێکی زۆر پێویستو زەروورییەو بەشێکی گرنگی بانگەوازیکردنی غەیری خۆیانە بـــۆ موســـوڵمانبون. خـــەڵك لـــەوەپێشو ئێـــستاشی لەگـــەڵ دا لەنمونـــەو پێشەوای صالحو چاولێکراو گەڕاونو دەگەڕێن بۆئەوەی بیانکەن بەچاو لێکراوی خۆیانو شوێنیان بکەون. ئەگەر ئەمڕۆ موسوڵمانان شانازییان بـەئایینو بەرنامـەی خۆیـان بکردایـەو بنـەماکانی ئیـسلامیان تـەطبیـق بکردایـەو پابەنـدی حـوکمو یاسـاکانی ئـاییـنی پـیرۆزی خۆیـان بونایـە، دەتبینی ئێستا تیشکی ڕێ نیشاندەری ئیسلام کونو قوژبنی ئەفەریقاو شوێنی دووری ئەوروپای روناك دەکردەوە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ ناردنی ئەم نوێنەرو نامانەی پێغەمبەر ﷺ ڕێکـەوتی سـاڵی حەوتـەمی کۆچـی کـردووە، واتـە پـێش ڕزگـارکردنی مەککـە، کـۆڕای سـیرە نووسـان لەسـەرئەمە دامـەزراوە، ئـیتر ئـەوەی لەبوخاری دا واریدە بووەو هەواڵی نامەناردنی پێغەمبـەری خستۆتە دوا غـەزای تـەبوك، واتـە لەسـاڵی نۆیـەم دا پێغەمبـەر نامـەی ناردبـێ. کـۆڕای سـیرە نووسـان هەڵناوەشـێنێتەوە. چـونکە وێدەچـێ بـۆ هەنـدێ شـوێن دوجار نامەو نوێنەری ناردبێ، جـاری دووەمیـان کەوتبێتە دوای غـەزای تەبوك.

ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی دەفـەرموێ کۆکردنـەوەی ئـەو دوو ڕایـە بەوە دەبێ کە دەگوترێ پێغەمبەر دووجار نامەی بۆ قەیصەر نووسیبێ، ئەونامـە نووسـینەی جـاری دووەمـی لـە موسـنەدی ئیمـام ئەحمـەددا چەسـپاوە. نامـەی بۆنەجاشـی موسـوڵمان نووسـی، کـەمردیش نوێـژی مردوی لەسەر کرد، پاشان نامەی بۆئەو نەجاشییەش نوسـی کەشوێنی گرتەوە، ئەمیان ئیمانی نەهێنابوو.

**قەزاكردنەوەی عەمرە «عمرة القضا»:**

پێغەمبەر ﷺ مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی حەوتەمی كۆچی لەمەدینە دەرچوو بەنیازی چون بۆ مەككەو قەزاكردنەوەی عەمرەی ساڵی پێشوو، كە موشریكەكان نەیان هێشت عەمرە بكاو هەمان مانگ پێشیان پێ گرت، ئیتر ئەو ساڵە عەمرەكەی بەقەزا گێڕایەوە.

ئیبنو سەعد لەطەبەقاتەكەی دا دەڵێ: ئەوانەی لەخزمەت پێغەمبەر دا عەمرەیان بەقەزا گێڕایەوە دوو هەزار كەس بوون. هاوەڵانی حودەیبییەو خەڵكی تریشیان لەگەڵ كەوتبوو، لەوانەی ساڵی پێشوو ئامادەی حودەیبییە بوون كەسیان خۆی پاش نەداو هەموویان ئامادەی عەمرە بوون مەگەر ئەوانەی لەخەیبەر شەهید بوون یان مردبوون«١».

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: قوڕەیشییەكان لەناو خۆیان دا باسی ئەوەیان كردبوو، كە موحەممەدو هاوەڵانی كزو لاوازو بێ هێزن.

دەڵێ: موشریكەكان لەلای «دار الندوة» بەڕیز وەستا بوون بۆئەوەی بڕواننە پێغەمبەرو هاوەڵانی، جاكە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی چوونە ناو مزگەوتی كەعبەوە ریدایەكەی راستو چەپ بەسەر شانی خۆی دا داو قۆڵی راستی بەڕوتی دەرهێناو فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لەوكەسەی خۆی بەهێزو توانا نیشانی ئەوان دەدا. ئەمجار چووە ناو مزگەوتەوە لەلای روكنەوە دەستی كرد بەهەروەڵە كردنو هاوەڵانیشی لەگەڵی دا بەگورگە لوقە هەتا سێ «شەوط»ی یان تەواو كرد، ئەمجار بەڕۆیشتنی عادەتی.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ئیبنو عەبباس دەیگوت: خەڵك وایان دەزانی ئەم هەروەلەكردنە سوننەتی گشتی نییە، پێغەمبەر ﷺ بۆیە وایكرد

---

١ طبقات ابن سعد ٢م١٦٧.

چونکه ئەو قسەیەی قورەیشی بیستبووەوە، هەتا حەجی ماڵئاوایی کرد، لەوێش دا هەمان هەروەلەی کردو ئیتر لەوەدوا بوو بە سوننەتو پەیرەو کرا.

لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ مەیمونەی کچی «الحارث»ی مارەکرد. گوتراوە: لە ئیحرام دا بووە کەمارەی کردوە، هەندێکیش گوتوویانە دوای ئیحرام شکاندن مارەی کرد، ئەوەی گرێبەستەکەی لەگەڵ دا کردو لێی مارەکرد عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب بوو. کە مێردی خوشکی بوو[١].

جا کە سێ شەو بەسەر چوونە ناو مەککەی دا تێپەڕی «ئەو ماوەیەی کە لەگەڵ قورەیش دا رێك کەوتبوون لەمەککەدا بمێنێتەوە» قورەیش هاتنە لای عەلی کوڕی ئەبوطالیب پێیان گوت بەخزمو هاوەڵەکەت بڵێ ماوەی دیاریکراو تەواو بووە ئیتر با مەککە جێ بێڵێ بڕواتە دەر، پێغەمبەر خۆی پێچایەوەو دەرچوو[٢].

پێغەمبەر ﷺ لەرێگەی گەڕانەوەی دا بۆ مەدینە لەشوێنێك کەپێی دەگوترێ «سَرِف» نزیك «التنعیم» خاتو مەیمونەی گواستەوە، ئەمجار لەمانگی ذیلحیجە دا گەڕایەوە بۆ مەدینە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەنجامدانی ئەم عومرەیە وادە بەجێهێنانێکی خودایی بوو کەلەوەپێش پێغەمبەر وادەی بەهاوەڵانی دابوو: کە بەدڵنیاییەوە دەچنە ناو مەککەوەو تەوافی کەعبە دەکەن. لەوەپێش زانیمان چۆن ئیمامی

---

١ بڕوانە عیون الأثر ٢م١٤٨.

٢ رواه البخاری ٨٥٥.

عومەر لەکاتی بەستنی پەیمانی حودەیبییە پرسیاری لەپێغەمبەر کردو وتی ئایا تەشریفت بەئێمەت نەگوت دەچینە ناو مەککەو تەوافی کەعبە دەکەین؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، من وام پێ گوتن، بەڵام ئایا من گوتم ئەمساڵ؟ عومەر فەرمووی: نەخەیر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە دڵنیابە دەچیە ناو مەککەوەو تەوافی کەعبەش دەکەی.

ئەوەیە میصداقیەتی وادەی پێغەمبەر ﷺ پەروەردگار بەندەکانی خۆی ئاگاداری ئەم بەڕاست گێڕانەکردو فەرمووی: {لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا} «سورة الفتح،٢٧».

ئەمجار ئەنجامدانی ئەم عەمرەیە مانای ئامادەباشی بۆ فەتحی مەککەو رزگاری گەورە لەخۆ گرتبوو. بێگومان دیمەنی ئەو ژمارە زۆرە لەئەنصارو موهاجیرەکان کەلەتەوافی کەعبەدا یان لەکاتی راکردن و هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەڕوەدا، یان لەکاتی بەجێهێنانی مەناسیکەکانی تردا ئاوا بەحەماسەت و نیشاتەوە بەدەوری پێغەمبەرەوە بون و هەموویان چاپوك و پتەوو زیت و وت و وریا. هیواو ئاواتی موشریکەکانیان پوچاندنەوەو هیوا بڕاویان کردن، ئەو تەصەورو وێناکردنەی لەلایەن موشریکەکانەوە بەرجەستە بو بوو پێچەوانە بۆوە. دیتنی ئەو دیمەنە تۆکمەیەی موسوڵمانەکان لەلایەن موشریکەکانەوە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر دڵ و دەروونیان و ترس و خۆفێك چووە ناخیانەوە ورەی روخاندن، چونکە پێچەوانەی ئەوەی لەدڵی خۆیان دا وێنایان کردبوو دییان، ئەوان وایان موسوڵمانەکان وێنا کردبوو: کە لاژگ و لاوازو بێ وەج و تەمبەڵن، خراپی ئاوو هەوای مەدینە توشی لەرزو تای کردون و بڕستییان لێ بڕاوە، کەچی وانیە!!

ئیمامی موسلیم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: کە موشریکەکان گورج و گۆڵی و چوست و چالاکی موسوڵمانەکانیان بینی کە بەدەوری کەعبەدا هەڵدەسوڕان و لەنێوان تەپۆڵکەی صەفاو مەڕوەدا رایان دەکرد، هەندێك لەموشریکەکان بەهەندێکیانیان گوت ئادەمیزاد ئەوانەن کە پێتان وابوو لەرزو تا بڕستی لێ بڕیون؟! ئەوانە لەپڵنگ و بەور گورج و گۆڵ ترن«[١]».

کەوابوو شك و گومان لەوەدا نییە ئەنجامدانی ئەم عەمرەیە بەو شێوەیەی ئەنجامیان دا کاریگەرییەکی قوڵی لەناخی موشریکەکان کردو ڕێی خۆشکرد بۆ ڕزگارکردنی مەککە بەشێوەی ئاشتی و بێ شەڕو هەرا وەکوو لەوەدوا دەزانین.

ئەمجار ئێمە لەم «عمرة القضاء»ە چەند حوکمێك دەخەینە ڕو:

**یەکەم:** «إضطباع» کردن واتە ناوەڕاستی ریداکە بخەیە ژێرشانی ڕاست و هەردو سەرەکانی بخەیە سەرشانی چەپ. هەروا گورگەلۆقە کردن لەسێ شەوتی پێشەوەدا بەمەبەستی شوێنکەوتنی پێغەمبەرو چاو لەئەو کردن، ئەم ئیضطیباع کردنەو گورگە لوقە ڕۆیشتنە لەتەوافێك دا کە بەدوای دا سەعی نێوان صەفاو مەڕوە هەبێ سونەتە چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کرد. هەروا سونەتە لەنێوان هەردو میلی صەفاو مەڕوەدا ئەو شێوە ڕاکردنە گورگە لۆقەیە ئەنجام بدرێ، چونکە پێغەمبەر وای کرد.

**دووەم:** هەندێ لەفوقەهاو شەرعزانان پێیان وایە دروستە لەکاتی ئیحرام بەستن بەحەج یان بەعەمرە. بابای ئیحرام بەستو ژن مارە بکا، بەبەڵگە ئەو ریوایەتەی کەئەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ لەئیحرام دا بوو کەخاتو مەیمونەی مارە کرد.

---

١ موسلیم ٥م٦٥.

وەلێ جەماوەری فوقەها پێیان وایە کەسێك لەئیحرام دا بوو دروست نییە عەقدی نیکاح بکا بۆ خۆی یان ببێتە وەکیلی یەکێکی تر بۆژن مارەکردن«١».

حەنەفییەکان پێیان وایە بۆ مرۆڤی ئیحرام بەستو یاساغ نییە لەکاتی ئیحرام دا ژن مارەبکا بۆخۆی یان بۆیەکێ تر، چونکە ئەوان واتە حەنەفییەکان وشەی «نیکاح» لەفەرمودەی {إن المحرم لا يَنكِحُ ولا يُنكَحُ له}«٢». بەمانا «جیماع» مانا دەکەن نەك بەمانا گرێبەستی مارەکردن.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ چوار عەمرەو حەجێکی کردوە. ئیمامی موسلیم بەسەنەدی خۆی لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر چوار عەمرەی کردون هەموویانی لەمانگی ذیلقەعیدەدا ئەنجام داون، جگە لەو عەمرەیەی لەگەڵ حەج دا کردویەتی، عەمرەیەك لەحودەیبییە لەمانگی ذیلقەعیدەدا، عەمرەیەك لەساڵی دوایی دا لەمانگی ذیلقەعیدەدا، عەمرەیەك لە جەعرانە کەدەستکەوتی غەزای حونەینی دابەشکرد لەمانگی ذیلقەعیدەدا، عەمرەیەکیش لەگەڵ حەجکردنەکەی ئەنجامی داوە.

## غەزای موئتە

ئەم غەزایە لەمانگی جیمادیل ئەوەڵی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا ڕوی دا. «موئتة» گوندێکە لەسەر لێواری وڵاتی شامو ئەمڕۆ پێی دەگوترێ «الكرك».

---

١ بڕوانە مغنی المحتاج ٢م٢١٨.

٢ رواه مسلم.

هۆی ئەم غەزایە وەکوو لەوەپێش باسمان کرد کوژرانی «الحارث»ی کوڕی عومەیری «الأزدي» نێرراوی پێغەمبەری خودا بۆلای مەلیکی بوصرا بوو، تەنیا ئەم نامەبەرو نێرراوەی پێغەمبەر کوژراوە. ئیتر لەدوای کوژرانی ئەم هاوەڵە نێرراوە نامەبەرە کە بەناحەق و خیانەت شەهید کرا، پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هەڵنا بۆ خۆسازدان و چون بۆ غەزا بەرەو شام. زۆر بەخێرایی و بەپەلە سێ هەزار موسوڵمان کۆبونەوەو سازو ئامادە بوون بۆ چون بۆ غەزاو بەرەو «موئتە» کەوتنە ڕێ. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان نەچوو، بۆیە لەڕاستی دا ئەمە بەغەزا ناژمێردرێ، بەڵکوو سیریە ناردن بوو، وەلێ زوربەی زانایانی سیرە ناوی غەزایان لێ ناوە، لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان هاوبەشییان کرد تێیداو شەڕەکە گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو. کەلەشکرەکە بەڕێ کەوت پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: فەرماندەی سوپا زەیدی کوڕی حاریثەیە، ئەگەر ئەو شەهید بوو، جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب ببێ بەفەرماندە، ئەگەر ئەویش شەهید بوو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ببێتە فەرمانڕەوا، ئەگەر ئەویش شەهید بوو باموسوڵمانە جەنگاوەرەکان بۆخۆیان یەکێك هەڵبژێرن و بیکەنە فەرماندەی سوپا. ئەمجار ئامۆژگاری کردن بانگەوازیی خەڵك بکەن بۆ ئیمانهێنان و موسوڵمانبون، ئەگەر ملیان داو بەپیر بانگەوازییەکەتانەوە هاتن ئەوە باشە ئەگینا پشت بەخودا ببەستن و شەڕیان لەگەڵ دا بکەن.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی بەڕێ کرد لەوساتە وەختەدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە گریا، پێیان گوت: چی تۆ دەگرێنێ؟ وتی: وەڵڵاهی من دونیام خۆش ناوێ، وەلێ من گوێم لێ بوو پێغەمبەر ئایەتێکی قورئانی دەخوێندەوە ئەم ڕستانەی تێدا بوون {وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا

وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ «سورة مريم،٧١» نازانم من کە چوومە ناو دۆزەخەو چۆن دێمەوە دەر؟!

ئەمجار موسوڵمانەکان لەشکرەکەیان بەڕێ کردو دوعای بەسەلامەت هاتنەوەیان بۆکردن و وتیان: خوداتان لەگەڵ بێ و دەستی دوژمنتان لێ دوور بێ و بەسەلامەتی بگەڕێنەوە.

جا کە لەشکرەکە لەمەدینە دەرچوو دوژمن هەواڵی بەرێکەوتنی ئەوانی پێگەیی، شەڕکەرێکی زۆریان کۆکردەوە بۆ بەرەنگار بوونەوەیان. هیرقەل زیاد لەسەد هەزار شەڕکەری کۆکردبووەوە، شورەحبیلی کوڕی عەمر سەد هەزار شەڕکەری تری گرد کردبووەوە لەهۆزەکانی «لەخم و جوزام و القین و بەهراء».

موسوڵمانان بەو سوپا کۆکردنەوەی هیرقەل و شورەحبیلیان زانی، لەشوێنێك کەناوی «معان» بوو دوو شەومانەوە بیریان لەداهاتووی خۆیان دەکردەوە چی بکەن و چی نەکەن هەندێکیان وتیان با نامە بنووسین بۆلای پێغەمبەرو ژمارەی لەشکری دوژمنی بۆ ڕون بکەینەوە، بزانین چی دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە وڕەی بەرزکردنەوەو تەشجیعی کردن و پێی گوتن: خەڵکینە! ئەوەی ئێستا ئێوە رقتان لێیەتی ئەوەیە کە بۆی هاتوون، ئێوە هاتوون شەهید بن کەچی لەشەهید بون دەترسن!! ئێمە شەڕ لەگەڵ دوژمن بەهێزو بەژمارە ناکەین، ئێمە بەم ئاییینەی خودا ڕێزی پێ لێناوین شەڕیان لەگەڵ دەکەین، بڕۆن بەرەو پێشەوە یەکێك لەم دوو سەروەرییەمان بەنسیب دەبێ، یان سەرکەوتن یان شەهید بوون.

موسوڵمانەکان لەنزیك «الكرك»ەوە کەوتنە جەنگەوە لەگەڵ دوژمن، لەکاتێك دا بەهیچ تەرازوویەك هاوکێشەی لەشکری دوژمن نەبوو، زۆری ژمارەی دوژمن لەسنور تێپەڕی بوو، لەڕوی چەك و ئەسبابی شەڕیشەوە

دوژمن تەیارو موسوڵمانەکان کەم چەك و کەم دەرامەت. شەڕ دامەزرا، زەیدی کوڕی حایثە ئالاکەی هەڵگرت و کەوتە شەڕ لەگەڵ دوژمن و موسوڵمانان لەتەکیا شەڕیان کرد، زەید بەڕمب شەهید کرا. ئەمجار جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ئالاکەی هەڵگرت و شەڕێکی مەردانەی کرد، شەڕ گەرم بوو، لەئەسپەکەی دابەزی و سەری بڕی، زیاتر گوڕی دا بەخۆی بۆ شەڕو ئەم نەشیدەی دەخوێندەوەو بەدەنگی بەرز دەیگوت:

يـا حبـذا الجنـة واقترابهـا   طيبـة وبـارداً شـرابها

والـروم روم قـددنا عـذابها   كـافرةٌ بعيـدة أنـسابها

علـيّ اذ لاقيتهـا ضـرابها

ئیتر بەدردەوام بوو لەشەڕکردن دا تا شەهید بوو، پیاوێکی ڕۆمی فرسەتی لێ هێناو زەبرێکی لێ دا کردی بە دووکەرت. لەوەدوا سەیری جەستەیان کرد بەنجا زەبری تری پێوە بوو، هەموو زەبرەکان لەپێشەوەی جەستەی درابوون«١».

ئەمجار عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ئالاکەی هەڵگرت و پەلاماری دوژمنی داو ئەم نەشیدەی دەخوێندەوە:

أقـسمت يـا نفـسٌ لتنزِلنّـه   لتنـزلن أو لتكرهِنّـه

إن أجلب الناس وشدوا الرنّة   ما لي أراك تكرهين الجنة

قد طال ما قد كنت مطمئنة   هل أنت إلا نطفة في شنّة

ئیتر کەوتە شەڕەوەو شەڕی کرد تا شەهید بوو، ئەمجار موسوڵمانەکان بەکۆڕا خالیدی کوڕی وەلیدیان کردە فەرماندەی سوپاو ئەویش ئالاکەی بەدەستەوە گرت و شەڕی لەگەڵ موشریکە ڕۆمەکان

---

١ رواه البخاري.

کردو شکاندنی، بەڵام بەرەو پێش نەچوو بەڵکوو وای بەباش زانی جەیشەکە بکێشێتەوەو بەرەو مەدینە بگەڕێتەوە.

بوخاری لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر هەواڵی شەهید بوونی زەیدو جەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی راگەیاند بەناو خەڵکی مەدینە دا پێش ئەوەی بەئاسایی هەواڵەکەیان پێ بگا، فەرمووی: زەید ئاڵاکەی بەدەستەوە گرتو پێکرا، پاشان جەعفەر ئاڵاکەی بەدەستەوە گرتو ئەویش پێکرا، پاشان کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی بەرز کردەوە ئەویش شەهید بوو، پێغەمبەر چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت، ئەمجار شمشێرێك لەشمشێرەکانی خودا ئاڵاکەی هەڵگرتو شەڕی کرد تا خودا سەری خست.

ئەم فەرمودەیە بوخاری ریوایەتی کردوە وەکوو دەبینی ئەوە دەگەیەنێ کە موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوەو لەو غەزایە دا خودا یارمەتی داونو سەری خستون. نەك وەکوو هەندێ لەسیرە نووسان دەڵێن موسوڵمانەکان تێشکاونو پەرتەوازە بوون بەرەو مەدینە گەڕانەوە. لەوانەیە مەبەستی ئەوانەی ئەم قسەیان کردوە ئەوەبێ بڵێن: موسوڵمانەکان کە بەسەرۆکایەتی خالید رۆمەکانیان شکاند دوایان نەکەوتنو بەرەو پێش نەڕۆیشتن، زیاتر زەبری گورچکبڕیان لێ بدەنو شوێنیان لێ بگرن، هەرکە لەشوێنی شەڕەکە هەڵیان کەندنو راویان نان ئیتر دوایان نەکەوتن، ترسان زیاتر بڕۆنە قولایی خاکی دوژمنەوە دەوریان بگیرێو تێدا بچن، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەیان دا بۆ مەدینە. ئاشکراشە ئەم تاکتیکە جەنگییە سەرکەوتووە تاکتیکی خالیدی کوڕی وەلید بوو.

ئیبنو حەجەر دەڵێ: لەکتێبی مەغازی موسای کوڕی عوقبەدا کەڕاستترین مەغازییە نوسراوە «پاشان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە

ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش شەهید بوو، ئەمجار موسوڵمانەکان بەکۆڕا خالیدی کوڕی وەلیدیان کردە فەرماندە، ئیتر پەروەردگار دوژمنی شکاندو موسوڵمانەکانی سەرخست» «العماد»ی کوڕی کەثیر دەڵێ: «دەتواندرێ ئەم دوو راو ریوایەتە پێکەوە کۆبکەینەوە بڵێین: خالید کە بوو بە فەرماندەی لەشکرەکەو شەو بەسەردا هات بۆ بەیانی پێکهاتەی سوپاکەی گۆڕی، جێگۆڕکێی بە مەیمەنەو مەیسەرەی سوپاکە کرد، ئەوانەی لەلای راستەوە بوون هێنانیە لای چەپ، ئەوانەی لەلای چەپەوە بوون بردنیە لای راست، بۆ ئەوەی دوژمن وابزانێ کە یارمەتیدەری تازەیان بۆ هاتووەو جەنگاوەری ئیضافی هاتووە بۆ هاریکارییان، ئەمجار خالید هێرشی کردە سەریان و شکاندنی و هەڵاتن بەڵام خالید دوایان نەکەوت، وای بەباش زانی چیتر درێژە بەغەزایەکە نەداو بگەڕێتەوەو موسوڵمانەکان لەمەترسی رزگار بکا دەستکەوتێکی گەورەیە»[١].

جا کەسوپای ئیسلام لەمەدینە نزیکبوونەوە پێغەمبەر ﷺ پێشوازیی لێ کردن، منداڵی مەدینە بەپیریانەوە هاتن. پێغەمبەر فەرمووی: هەرکەسەو منداڵێك هەڵگرێ کوڕەکەی جەعفەریش بدەنە من! عەبدوڵڵایان بۆهێناو خستیە باوەشی خۆیەوە. خەڵکەکە کەوتنە هوتاف کێشان بەلەشکرەکەو دەیانگوت هەڵاتو، تێشکاو لەغەزاو هەڵاتوون. پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: نا، ئەوانە هەڵاتوو نین خودا یاربێ هێرش بەرن.

---

١ بڕوانە فتح الباری، ج٧م٣٦١-٣٦٢.

**پەندو ئامۆژگاریی:**

گرنگتر شتێك کەلەم غەزایە دا مرۆڤ سەرسام دەکا، ئەو نیسبەتە گەورەیەی جوداوازیی نێوان ژمارەی کەمی موسوڵمانەکان‌و ژمارەی شەڕکەرانیان بەرامبەر ئەو ژمارە زۆرو سوپا زەبەلاحەی رۆمەکان‌و موشریکەکانە!! ئەوەبوو ئەتۆ لەوەپێش زانیت ژمارەی موشریکەکان‌و ئەو رۆمانەی لەگەڵیان بوون نزیکەی دووسەد هەزار شەڕکەر بوون! ئەمەش بەگوێرەی ریوایەتی ئیبنو ئیسحاق‌و ئیبنو سەعدو زوربەی سیرە نووسان«١». لەکاتێك دا ژمارەی موسوڵمانەکان لەسێ هەزار کەس تێ نەپەڕیبوو، مانای ئەمە ئەوەیە ژمارەی موشریك‌و رۆمەکان پەنجا هێندەی موسوڵمانەکان بوون!!.

ئەمەش رێژەیەکە ئەگەر وێنای بکەی وادێتە بەرچاو پانتایی سوپای ئیسلام لەبەرامبەر رەشایی سوپای رۆمی دوژمن دا وەکوو کوپە ئاوێکی بچوك بەرامبەر دەریایەکی پان‌و پۆڕی شەپۆل هاوێژ. لەگەڵ ئەوەش دا سوپای دوژمن پڕچەك‌و کەرەستەی زۆرو بێ شمارو تەیارو ساز لەهەموو پێداویستییەکی جەنگ دا، لەکاتێك دا موسوڵمانەکان کەم چەك‌و هەژار لەپێداویستی جەنگ دا تائەوپەڕی سنور. شوێنی سەرسوڕمان لەم غەزایەدا ئەوەیە ئەتۆ دەبینی موسوڵمانەکان سیریەیەکن‌و پێغەمبەریان لەگەڵ نیە، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا بەرەوپێش دەڕۆن‌و بەرەو دواوە ناگەڕێنەوە. هیچ حیسابێك بۆ ئەو هەموو سوپا زەبەللاحەی دوژمن ناکەن‌و چاو نەترس‌و ورەبەرز بەرەو روی دوژمن بوونەوە، ئەمە ئەگەر سوپای دوژمن دەورەی بدانایەو چوار لای لێ بگرتنایە، وەکوو خاڵێکی نێو قەتعەزەوییەکی رەش دەهاتنە

---

١ بڕوانە طبقات ابن سعد، ج٣م١٧٥ وسيرة ابن هشام ٢م٣٧٥.

بەرچاو. ئەمجار جێگای سەر سوڕمانی زیاتر ئەوەیە کە ئەوژمارە موسوڵمانە کەم‌و بێ کەرەستەیە لەبەرامبەر ئەو سوپا گەورەو تەیارەدا خۆ ڕاگربن‌و بەرەنگاری ئەو دەریا زەبەللاحەببنەوە. فەرماندەی شەهید دەبێ‌و بەو حەماسەت‌و ورە بەرزییە بەرەو ڕوی شەهادەت دەچنە پێش‌و بەچاوی خۆیان مەرگ دەبینن‌و سڵی لێ ناکەن. هەتا وای لێ دێ خودا ترس‌و بیم دەخاتە دڵی موشریکەکانەوە، هیچ هۆکارێکی ظاهیر بۆشکانی ئەو سوپا زەبەللاحە نابیندرێ، کەچی سەنگەری شەڕ چۆڵ دەکەن‌و پشت دەکەنە گۆڕەپانی جەنگ هەڵدێن‌و ئەو حەمکە خەڵکەشیان لێ بکوژرێ!!

بەڵام سەرسامی نامێنێ‌و دەهشەت‌و سەرسوڕمان لادەچێ ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە کە ئیمان بەخودا چەند کاریگەرەو پشت بەستن بەخودا چ ڕۆڵێکی هەیە، دڵنیابوون لەوادەی خودا چ وزەو هێزێك دەدا بەخاوەنی!

بەڵکوو جێگای سەرسوڕمان بەنیسبەت موسوڵمانەوە «ئەگەر موسوڵمانبن» ئەوەیە کەوانەبن، جێگای سەرسوڕمان لەوان دا بەڕاستی ئەوەیە موسوڵمانبن‌و کەچی حیساب بۆ ژمارەو کەرەستەو هێزی دوژمن بکەن، وێڕای ئەو وادەو بەڵێنەی خودا پێی داون لەکۆمەکی پێکردن‌و سەرخستنیان بەسەر دوژمن دا یان شەهید بوون‌و شادبونیان بەبەهەشت! حیساب بۆ زۆری‌و چەکی دوژمن بکەن. موسوڵمانان وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەڵێ: بەهێزی ژمارەو زۆری چەك‌و کەرەسە شەڕ لەگەڵ دوژمن ناکەن، بەڵکوو بەهێزی ئەو ئایینە شەڕدەکەن کەخودا ڕێزی پێ لێناون. پاشان ئەم غەزایە پەندو ئامۆژگاریی‌و دەلالاتی زۆری لەخۆگرتون، لێرەدا هەندێکیان لێ باس دەکەین.

یەکەم: تەوصییەکردنی پێغەمبەر بۆ موسوڵمانەکان کە بەڕێی کردن بەڵگەی ئەوەی تێدایە: کە دروستە بۆ خەلیفە یان بۆ سەرۆکی

موسوڵمانان کە بوونی یەکێك بە فەرماندەو فەرمانڕەوا پەیوەست بکا بە مەرجێکەوە، یان چەند فەرماندەیەك تەعین بکا بە تەرتیب و یەك لەدوایەك. وەکوو چۆن پێغەمبەر فەرمووی: زەید فەرماندەی سوپاکەبێ، دوا ئەو جەعفەر بێ پاشان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بێ، زانایان فەرموویانە: رای صەحیح و راست ئەوەیە هەرکاتێ خەلیفە فەرمانی لەوجۆرەی کرد ویلایەتی هەموویان دادەمەزرێ لەیەك کات دا وەلێ تەنفیذ کردنەکەی بەقۆناغ و یەك لەدوایەك دەبێ[١].

**دووەم:** تەوصیەی پێغەمبەر بۆ جەنگاوەرەکان دوبارە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەموسوڵمانان بۆیان هەیە ئیجتیهاد بکەن بۆ هەڵبژاردنی فەرماندە هەرکاتێ ئەمیریان نەما.

هەروا بۆیان هەیە ئەگەر خەلیفە رایسپاردن بۆ دیاریکردنی کەسێك بیکەن بەفەرماندە، بۆخۆیان کێیان پێ باش بوو هەڵیبژێرن. ئیمامی طەحاوی دەڵێ: ئەمە ئەصڵ و بنەمایەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە پێویستە لەسەر موسوڵمانان ئەگەر فەرماندەیان لێ دوورکەوتەوە، لێیان غائیب بوو بۆخۆیان فەرماندەیەك هەڵبژێرن، کاروبارەکانیان بەڕێوەبەرێ، تا ئیمام «خەلیفە» پەیدا دەبێتەوە، وەکوو چۆن ئەم تەوصیەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەش دەگەیەنێ کە دروستە موسوڵمانان لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەریش دا ئیجتیهاد بکەن.

**سێیەم:** تۆ ئەوەت زانی کە پێغەمبەر ﷺ خەبەری شەهید بوون و مەرگی زەیدو جەعفەرو عەبدوڵڵای راگەیاندو دووچاوی فرمێسکی دەڕشتن، لەنێوان پێغەمبەرو ئەو شەهیدانە دا مەسافەیەکی زۆر دوورو درێژ هەبوو، ئەمەش ئەوەدەگەیەنێ کە پەروەردگار ڕێگای دووری بۆ

---

١ بڕوانە: فتح الباری ج٧م٣٦١.

پێغەمبەر پێچاوەتەوەو لەو مەسافە دوورەوە چاوی لەموسوڵمانەکان بووە: کە چۆن لەسەر سنووری شام جیهاد دەکەن و چی بەسەر ئەو سێ فەرماندە تێکۆشەرانەدا هاتووە. دیارە ئەمە یەکێکە لەو موعجیزە گەورانەی کە خودا ڕێزی پێ لەپێغەمبەری خۆشەویستی ناوە.

هەروەها ئەم حەدیثە ئەوەدەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ چەند هاوەڵەکانی خۆشویستووە، چونکە شتێکی وا کەم نییە پێغەمبەر بگرێ، دیارە رووداوەکە گەورە بووەو سۆزی پێغەمبەریش بۆ بۆهاوەڵانی بێ سنوور بووە، بۆیە لەوکاتەدا کە هەواڵی شەهید بوونی ئەو سێ فەرماندەی بۆ هاوەڵانی ڕاگەیاند فرمێسکی بەخوڕی ڕشتن. ئەتۆ ئەوەش دەزانی کە گریانی ئەو بۆ ئەوان ئەوەناگەیەنێ کە پێغەمبەر بەو قەزاو قەدەرە ناڕازی بووبێ، گریانەکەی بۆ لەدەستدانی ئەو هاوەڵانە چ دژایەتییەکی نییە لەگەڵ ڕازی بوون بەقەزاو قەدەری خودا، بێگومان چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ خەمبار دەبێ وەکوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دیارە ئەوە دیاردەیەکی دڵنەرمی و سۆزو بەزەییە خودا سروشتی ئادەمیزادی لەسەر داڕشتووە.

**چوارەم:** حەدیثی ڕاگەیاندنی مەرگی ئەو سێ فەرماندەیە ڕێزو فەضڵێکی تایبەتی بۆ خالیدی کوڕی وەلید لەخۆگرتووە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لەکۆتایی حەدیثەکەدا دەفەرموێ: {حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله حتى فتح عليهم}. ئەو غەزایەش یەکەم غەزایەك بوو کە خالید لەڕیزی موسوڵمانان دا بەشداربێ، چونکە ئەوکاتە زۆر نەبوو موسوڵمان بو بوو، کەوابوو ئەو نازناوە پێغەمبەر خۆی بەخالیدی داوە.

بێگومان خالید لەم شەڕەدا زۆر لێهاتوانە فەرماندەیی کردو تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆی بەباشی لێی دەرچوو، بوخاری ریوایەتێك لەخالیدەوە ریوایەت دەکا کە گوتویەتی: لەڕۆژی غەزای

موئتەدا نۆ شمشێر لەدەستم دا شکاون، لەئاکام دا جگە لەدەمە شمشێرێکی یەمانی هیچم بەدەستەوە نەما. ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەم حەدیثە دەلالەت دەکا لەسەر ئەوە کە موسوڵمانەکان زۆریان لە موشریکەکان کوشتووە.

هۆکاری ئەوەش کە خەڵك لەکاتی گەڕانەوە بۆ مەدینە بەلەشکرەکەیان گوت هەڵهاتو هەڵهاتو، لە گۆڕەپانی جەنگ راتان کردوەو خۆ گر نەبوون لەغەزادا. مەبەستیان ئەوە بووە کە رۆمەکان شکاون دوایان نەکەوتون و سەرکەوتنی گەورە تر بەدەست بێنن. ئەو شوێنەی شەڕیان تێدا کردووە جێیان هێشتووە، ئەمەش لەغەزاکانی تردا وانەبووە. خالید لەلێزانی و کارامایی خۆی لەشەڕدا وای بەباش زانی ئیتر بەرەو مەدینە لەشکرەکە بگێڕێتەوە نەك بەدوا لەشەکری شکاوی رۆم بکەوێ و بچێتە قولایی خاکی دوژمنەوە. هەڵبەتە ئەمە تەگبیرێکی حەکیمانە بوو خالید پەی پێ بردو پەیڕەوی کرد بۆ پارێزگاری لەو سام و هەیبەتەی موسوڵمانەکان خستبوویانە دڵی رۆمەکانەوە. بۆیە پێغەمبەر رەدی خەڵکە سەرزەنشتکەرەکەی دایەوەو فەرمووی: {لیسوا بالفرار ولكنهم الكرار ان شاء الله}.

# ڕزگارکردنی مەککە

ئەم ڕوداوە گرنگە لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا بووە. هۆکارەکەی ئەوە بوو کەسانێك لەهۆزی بەنی بەکر لەگەڵ پیاو ماقوڵانی قورەیش دا قسەیان کرد: کەیارمەتیان بدەن بەپیاوو بەچەك لەدژی هۆزی خوزاعە. «هۆزی خوزاعە چووبونە ناو عەهدو پەیمانی موسوڵمانەکانەوە» قورەیشییەکان بەڵێنیان پێدابوون، کۆمەڵێکی زۆر لەقورەیشییەکان بەدزیو خۆ نەناسکردن چوّن بۆ یارمەتیدانیان، لەناویان دا صەفوانی کوڕی ئومەییەو حووەیطیبی کوڕی «عبدالعزی»و موکەرەزی کوڕی «حەفص»یان تێدابوو. لەگەڵ پیاوانی بەنی بەکردا لەشوێنێك کەناوی «الوتیر» بوو بەیەك گەیشتن.

هۆزی خوزاعە شەو بەدڵنیاییو ئارامی نوستن، ئەمان گەمارۆیان دانو بیست کەسیان لێ کوشتن. ئیتر کەئەمە قەوما عەمری کوڕی «سالم الخزاعی» لەگەڵ چل پیاوی خوزاعی دا هاتنە خزمەت پێغەمبەرو هەواڵی کارەساتو بەسەرهاتیان بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر هەڵسایە حەواو فەرمووی: «لا نُصِرتُ ان لم أنصر بني كعب، مما أنصر منه نفسي»[١].

قورەیشییەکان لەکارەکەیان پەشیمان بوونەوە، ئەبو سوفیانی کوڕی حەربیان نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی هودنەو شەڕ ڕاگرتنەکە تازە بکەنەوە، ئەبو سوفیان هاتە خزمەت پێغەمبەر قسەی لەگەڵ دا کرد، بەڵام پێغەمبەر هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئەمجار چو بۆلای ئەبوبەکر کەوتە قسەکردن لەگەڵیو داوای لێ کرد لەوبارەوە قسەی بۆ لەگەڵ پێغەمبەر بکا، ئەبو بەکر فەرمووی من شتی واناکەم.

---

١ ئیبنو سەعدو ئیبنو ئیسحاق ئەمەیان ریوایەت کردووە، ئیبنو حەجەر دەڵێ: .البزارو والطبراني وموسى بن عقبة. ریوایەتیان کردووە.

ئەمجار هاتەلای عومەری کوڕی خەطاب و قسەی لەگەڵ دا کردو داوای لێ کرد قسەی بۆ لەگەڵ پێغەمبەردا بکا، عومەر فەرمووی: «من شەفاعەتت لەلای پێغەمبەر بۆ بکەم؟» هەرگیز کاری واناکەم سوێند بەخودا ئەگەر تەنها مێرویەکم دەست بکەوێ بۆئەوەی شەڕتان لەگەڵ دا بکەین شەڕتان لەگەڵ دەکەین.

ئەبو سوفیان بە نائومێدی گەڕایەوە بۆ مەککەو هیچی دەست نەکەوت. پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی خۆی ئامادەکرد بۆ رزگارکردنی مەککە، جم و جۆڵەکانی خۆی بەنهێنی ئەنجام دەدا، فەرمووی: «اللهم خذ على أبصار قريش فلا يروني الا بغتة». خودایە! قوڕەیش پێم نەزانن تا بەناگەهان گەمارۆیان دەدەم.

جا کە پێغەمبەر ﷺ لەشکری ئامادەو تەیارکرد بچێ بۆ رزگارکردنی مەککە، حاتەبی کوڕی ئەبوبەلتەعە نامەی نووسی بۆ قوڕەیشییەکان بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە، کە هێرشی موسوڵمانەکان بەڕێوەیە بۆسەریان.

عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ من و زوبەیرو «المقداد»ی نارد، پێی فەرموین: بڕۆن تا دەچنە «روضة خاخ» لەوێ ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە، نامەکەی لێ وەربگرن. جا عەلی دەفەرموێ: بەهەڵەداوان رۆیشتین، ئەسپەکانمان تەنگەتاو کردبوو، هەتا گەیشتینە «الروضة»، لەوێ کەژاوەی ژنەکەمان بینی، پێمان گوت: ئەو نامەیەی لاتە بماندەرێ، وتی هیچ نامەم لانیە، وتمان یان نامەکەمان بدەرێ یان ئێستا ڕوت و قوتت دەکەینەوە نامەکە دەدۆزینەوە. ئیتر کەوای زانی نامەکەی لەژێر قژی سەری دەرهێناو ئافرەتەکەمان هێنایە خزمەت پێغەمبەر: کەسەیری نامەکە کرا دەرکەوت نامەکە لە «حاطب»ی کوڕی ئەبو بەلتەعەوە نوسرابوو بۆهەندێ خەڵکی مەککە، هەواڵی

ئەوەیان دەداتێ بەهەندێ نهێنی پێغەمبەر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە یانی چی ئەی «حاطب»! بۆچی ئەمەت کرد؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا پەلەم لێ مەکە، ئەمن کابرایەکم ماڵو منداڵم لەناو مەککەدایە من هاوپەیمانی ئەوانمو لەوان نیم. ئەو کۆچکەرانەی لەگەڵ تۆن هەموویان لەناو قورەیشییە موشریکەکان دا خزمایەتیان هەیە، لەوێ ماڵو منداڵیان دەپارێزن، پێم خۆش بوو کە مادام من لەڕوی خزمایەتیەوە لەوان نیم پیاوەتیەکم بەسەریانەوە هەبێ ماڵو منداڵم بپارێزن. ئەگینا من لەئایین هەڵنەگەڕاومەتەوەو بەکوفرو بتپەرستی رازی نیم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: راست دوای، راستیت گوت، ئیمامی عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لێم گەڕێ بائەم دوو ڕووە بکوژم، لەگەردنی بدەم، پێغەمبەر فەرمووی: ئەو هاوبەشی غەزای بەدر بڕیاری دەرکردووە، ئەتۆ چوزانی رەجام وایە خودا بۆ بەشدارانی غەزای بەدری کردبێ، پێی فەرموون چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بوم. ئیتر دوا بەدوای ئەم روداوە پەروەردگار ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاء مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاء السَّبِيلِ} «سورة الممتحنة،١» نازڵ کرد.

ئیتر دوای خۆئامادەکردنو سوپاسازدان پێغەمبەر ﷺ کولثومی کوڕی «حسین»ی بەسەر مەدینەوە داناو رۆژی چوارشەممە دەیەمی مانگی رەمەزان دوانوێژی عەصر لەمەدینە دەرچوو، جوابی نارد بۆعەرەبەکانی دەوروبەری مەدینە لەهۆزی ئەسلەمو غەفارو موزەینەو جوهەینەو هی تریش. کە پەیوەندی بەسوپاوە بکەن، هەموویان لە «الظهران: شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینە» بەیەك گەیشتن، ژمارەی

موسوڵمانەکان گەیشتە «دە هەزار» جەنگاوەر، تا ئەوکاتە موشریکەکان بەمەیان نەزانی بوو، بەڵام چاوەڕوانی شتێکی لەوجۆرەیان دەکرد، بەهۆی سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی ئەبوسەفیان کەلەوەپێش نێردرابوو بۆ تازەکردنەوەی هودنەکە. ئیتر قورەیشییەکان ئەبوسەفیان و حەکیمی کوڕی حیزام و «بدیل»ی کوڕی وەرقایان ناردن بۆئەوەی هەواڵێکی راست و دروست هەڵکرێنن و بزانن نیازی پێغەمبەر چیە؟ ئیتر سێ بەسێ کەوتنەڕێ: کەلە «مرالظهران» نزیکبوونەوە روانیان ئاگرێکی گەورە هەڵگیرساوە، ئیتر کەوتنە پرسیار کردن لەناو خۆیان دا ئاخۆ ئەم ئاگرە چیەو نیشانەی چیە، کاتێکیان بەخۆزانی هەندێك لەحەرەسەکانی پێغەمبەر بینیان و هێنایانن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەبوسەفیان ئیمانی هێنا«[1]».

ئیبنو ئیسحاق لە عەبباسەوە بەدرێژی باسی چۆنیەتی موسوڵمانبوونی ئەبوسەفیان ریوایەت دەکا، دەڵێ: «بۆ سبحەینێ کە رۆژ بوەوە ئەبو سەفیانم برد بۆلای پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ ئەبوسوفیانی بینی، فەرمووی مالۆێران ئەی ئەبوسەفیان! ئەوەکاتی ئەوە نەهاتووە کە بڕوابکەی بەوەی جگە لەخودا هیچ خودایەکی تر نییە؟ ئەبوسەفیان وتی: بەباوك و دایکەوە فیدات بم، چەند بەحیلم و بەرێزو خزم دۆستیت پێم وایە ئەگەر خودایەکی تر ببوایە جگە لەخودا دەستبەرداری من نەدەبوو. ئەمجار فەرمووی: مالۆێران ئەی ئەبوسەفیان! ئەرێ کاتی ئەوەنەهاتووە بڕوا بەوەبکەی کەمن پێغەمبەری

---

١ تائێرە ریوایەتی بوخاری بوو وەکوو دەبینی باسی موسوڵمانبوونی دووهاوەڵەکەی ئەبوسەفیان ناکا، بەڵام زانایانی سیرە لەپێش هەموشیانەوە موسای کوڕی عوقبە دەڵێن: حەکیم و بەدیل هەر کەچوونەلای پێغەمبەر موسوڵمان بوون بەڵام ئەبوسەفیان تا رۆژ نەبۆوە ئیمانی نەهێنا.

خودام؟ ئەبوسەفیان وتی بەدایك و باوكەوە فیدات بم چەند بەحەوصەڵەو ڕێزدارو خزم دۆستیت! بۆ ئەمەیان شتێك لەناخم دا هەیەو تا ئێستا یەكلایی نەبوومەوە. عەبباس پێی گوت كوڕە هاوار بۆ تۆ موسوڵمانبەو شایەتوئیمان بێنەو بڵێ: «أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله» پێش ئەوەی لەملت بدرێ. عەبباس دەڵێ ئیتر ئەبوسەفیان شایەتومانی هێناو موسوڵمان بوو.

عەبباس دەڵێ: بە پێغەمبەرم گوت: ئەبوسەفیان پیاوێكە حەزی لەناوو شۆرەتە، پشكێكی بدەرێ، فەرمووی: بەڵێ باشە، ئەمجار فەرمووی: هەركەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسەفیان ئەمین دەبێ. هەركەسێ بچێتە ماڵی خۆیەوەو دەرگا پێوەبدا ئەمین دەبێ. كەسێكیش بچێتە مزگەوتەوە ئەمین دەبێ.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ كەویستی بەرەو مەككە بكەوێتە ڕێ بەعەبباسی مامی فەرموو: ئەبوسەفیان بەرە لەتەنگەلانەكەی ناو شیوەكەدا ڕایبگرە بابەچاوی خۆی هەموو لەشكرەكە ببینێ، عەبباس دەڵێ: ئەبوسەفیانم بردە تەنگەلانەكەو لەوێ ڕامگرت، ئیتر هۆزو تیرەكان یەكە یەكە بەئالاكانیانەوە بەبەردەمیان دا تێپەڕین، هەركە هۆزێك دەهاتو تێدەپەڕی ئەبوسەفیان دەیپرسی ئەی عەبباس! ئەو هۆزە كێ بوون! منیش دەمگوت ئەوە هۆزی سولەیم بوون. دەیگوت باشە من چ پەیوەندییەكم بەهۆزی سولەیمەوە هەیە؟ بەمجۆرە تا هەموو هۆزەكان بەئالاكانیانەوە تێپەڕین. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ بەكەتیبەیەك لەموهاجیرین و ئەنصار تێپەڕی، تەنیا چاویان و چەكەكانیان دەبینران. ئەبوسەفیان وتی: «سبحان الله» عەباس ئەوانەكێ بوون؟ وتم: ئەوە پێغەمبەربوو لەگەڵ موهاجیرین و ئەنصارەكان! ئەبوسەفیان وتی: وەڵڵاهی ئەوانە كەس دەرەقەتیان نایە، وەڵڵاهی ئەی ئەبولفەضل مڵك و

دەسەڵاتی برازاکەت زۆر پەرەی سەندو گەورە بووە! عەباس وتی: ئەی ئەبوسەفیان ئەوە روتبەی پێغەمبەرییە، وتی: ئەوە شتێکی فرە مەزنە«١».

ئەمجار عەبباس بەئەبوسەفیانی گوت: خێرا بڕۆ فریا بکەوە قەومەکەت توشی شەڕو شۆڕنەبن، ئیتر ئەبوسەفیان بەپەلە رۆیی تا گەیشتەوە مەککە پێش ئەوەی پێغەمبەر بگاتە ئەوێ. بەهەموو هێزی هاواری کرد ئەی هۆزی قورەیش! ئەوە موحەممەدە بەسوپایەکی زەبەلاحەوە هاتووە، ئێوە دەرەقەتی نایەن و هیچتان بۆ لەگەڵ ناکرێ، هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسەفیانەوە ئەمین دەبێ و هیچی لەگەڵ ناکرێ.

ژنی ئەبوسوفیان «هیندی کچی عوتبە» هاتە دەرەوەسمێڵی ئەبوسوفیانی گرت و وتی: ئەم پیاوە بێ چاوو رووە پێپەتیە بکوژن، خودا لەناوت بەرێ بۆ چ پیاو ماقوڵێکی؟!! ئەبوسەفیان وتی: هاوار بۆ ئێوە لەخۆتان بایی مەبن موحەممەد سوپایەکی هێناوە کەس دەرەقەتی نایە.

هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسەفیانەوە ئەمین دەبێ. قورەیشییەکان پێیان گوت خودا بتکوژێ جا خانوی تۆ چ سودێکمان پێ دەگەیەنێ؟ وتی: هەرکەسێ بچێتە ماڵی خۆی و دەرگا لەسەر خۆی پێوەدا ئەمین دەبێ. هەرکەسێ بچێتە ناو مزگەوتەوە ئەمین دەبێ. ئیتر خەڵکەکە هەرکەسە بەرەو ماڵی خۆی یان بەرەو مزگەوت رۆیشتن.

---

١ ئیبنو سەعدو ئیبنو ئیسحاق و ئیبنوحەریر ریوایەتیان کردوە هەروا بوخاریش ریوایەتی کردوە.

هەواڵی ئەوە بەپێغەمبەر گەیشتەوە کە سەعدی کوڕی عوبادە کە ئەبوسەفیانی لەتەنگە بەراییەکەدا بینی پێی گوت: ئەمڕۆ ڕۆژی شەڕی گەورەیەو کوشتار لەکەعبەدا ڕەوایە. پێغەمبەر بەوە ڕازی نەبوو قسەکەی سەعدی پێ ناخۆش بوو، فەرمووی: ئەمڕۆ ڕۆژی ڕەحمەتو بەزەییە ڕۆژێکە خودا ڕێزی کەعبە زیاتر دەکا. فەرمانی بە فەرماندەکانی سوپاکەی کرد کە شەڕ لەگەڵ کەس نەکەن، مەگەر کەسێ شەڕیان پێ بفرۆشێ. جگە لەشەش پیاوو چوار ئافرەت فەرمانی دا لەهەر کوێ ئەمانەیان دەست کەوت بیانکوژن. ئەوانیش «عکرمة»ی کوڕی ئەبوجەهلو «هبّار»ی کوڕی «الأسود»و «عبدالله»ی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرحو «مقیس»ی کوڕی صەبابەی «اللیثي»و «الحویرث» کچی عوتبەو «سارة» مەولاتی عەمری کوڕی هیشام «فرتنی و قرینة» دوو گۆرانی بێژبوون هەمیشە بەگۆرانی جنێویان بە پێغەمبەر دەدا[١].

ئیتر موسوڵمانەکان بەو شێوەی پێغەمبەر فەرمانی پێ کردبون چوونە ناو مەککەوە، کەسیان ڕێگیری و بەرەنگار بوونەوەی توش نەبوو، جگە لە خالیدی کوڕی ئەبو جەهلو صەفوانی کوڕی ئومەییەیان تێدابوون بەرەنگاریان بونەوە، خالید شەڕی لەگەڵ کردن بیستو چوارکەسی لە قورەیشییەکان کوشتو چوار کەسیشی لەهۆزی هوزەیل کوشت. پێغەمبەر ﷺ لەدورەوە بریسکەی شمشێرەکانی بینی، پێی ناخۆش بوو، عەرزیان کرد خالیدە شەڕیان پێ فرۆشتووەو شەڕی لەگەڵ کردون. فەرمووی: قەزاو قەدەری خودایەو خێردەبێ.

ئیبنو ئیسحاق لەعەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرەوە، «الحاکم» لە ئەنەسەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێن: کاتێک پێغەمبەر ﷺ گەییشتە

---

١ رواه ابن سعد وابن اسحاق وقال ابن حجر وقد جمعت اسماء هؤلاء الرجال والنساء من متفرقات الأخبار.

«ذوطوی» بەسەر ولاخەکەیەوە وەستا پارچە قوماشێکی کردبووە مێزەرە، بەسواری حوشترەکەیەوە سەری نزم کردبۆوە، تەنانەت ئەوەندە سەری خۆی نزم کردبۆوە خەریکبوو چەناگەی لە زینی ولاخەکەی بدات.

بوخاری لە معاویەی کوڕی «قرّە» ریوایەت دەکا دەڵێ گوێم لێ بوو عەبدوڵڵای کوڕی مەغفەل دەیگوت: رۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەرم بینی بەسەر حوشترەکەیەوە سورەتی «فەتح»ی دەخوێند بەدەنگی بەرزو دوبارەی دەکردەوە، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خەڵکی لێم کۆدەبونەوە ئێستا دەق لاسایی قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەرم دەکردەوەو وەکوو ئەو تەرجیعم دەکردەوە.

پێغەمبەر چووە ناو مەککەوە روی لە کەعبە کرد بەدەوری دا سێصەدو شەصت بت ریزکرابوو، دارێکی بەدەستەوە بوو، یەکە یەکە بەدارەکە بتەکانی دەخستنە خوارەوەو دەیفەرموو: {جاء الحق وزهق الباطل}. {جاء الحق وما يبدئ الباطل ومايعيد} لەناو کەعبەش دا بتی تر هەبوون، ئیتر پێغەمبەر نەچوە ژوری کەعبەوە تا بتەکانیان توڕدانە دەرەوە، فەرمانی کرد بتەکانیان فڕێدانە دەرەوە، هەروا وێنەی حەزرەتی «ئیبراهیم و ئیسماعیل»یش خرانە دەرەوە، هەریەکە یان ئەزلامی قومار کردنی بەدەستەوە بوو. پێغەمبەر فەرمووی خودا بتپەرست لەناو بەرێ، خۆئەم قوڕەیشییە بتپەرستانە زانیویانە کەئەم دووزاتە پیرۆزە قەت تیروپشکی شت بەشکردنیان بەئەزلام نەکردوە. ئەمجار چووە ناو کەعبەوە نوێژی تێدانەکرد، لەئەملاو ئەولای کەعبەدا «الله أكبر»ی کرد. لەوەپێش فەرمانی بە عوسمانی کوڕی طەلحە «کەمجەوری کەعبە بوو» کردبوو کە کلیلەکانی دەرگای کەعبەی بۆ بێنێ، عوسمان کلیلەکانی بۆ هێنان، دەرگای کەعبەی کردەوە ئەمجار پێغەمبەر چووە ناو کەعبەوە، ئەمجار بانگی عوسمانی کوڕی طەلحەی کردو کلیلەکانی تەسلیم کردن،

پێـی فـەرموو: بـۆ هـەتا هەتایـە بـالای تـۆ بـن. ئـەمن بەرپرسـیاریەتی خزمەتکردنی کەعبەم نەداوە بەئێوە خودا پێی داون. کەسێك ستەمکار نەبێ لێتان ناسێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەم فەرمودەی ئاماژە بۆ ئایـەتی قورئان دەکا کەدەفـەرموێ: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَـاتِ إِلَـى أَهْلِهَـا} «سورة النساء، ٥٨».

ئـەمجار پێغەمبـەر فـەرمانی بـە بـیلال کـرد، بـیلال چـووە سـەربانی کەعبـەو بـانگی دا بـۆ کـاتی نوێـژو ئەنجامـدانی. ئـیتر خـەڵك پـۆل پـۆل دەهاتنـە ژێـر ئـاڵای ئیـسلامەوەو موسـوڵمان دەبـوون. ئیبنـو ئیـسحاق دەڵێ: پێغەمبەر دەستی بە لاشیپانەی دەرگـای کەعبـەوە گرتبوو، خـەڵك دەورەی دابوو، نەیاندەزانی پێغەمبەر هەڵس و کـەوتی بەرامبـەریان چۆن دەبێ و چییان لـێ دەکا. ئیتر وتارێکی بۆدان، فەرمووی: «هیچ خودایـەك نییـە جگـە لـە الله، تـاك و تـەنیاو بـێ هاوەڵـە، وادەی خـۆی بـەجێ هێنـا، یارمەتی بەندەی خۆی دا، هەرئەو ئـەحزابی تێك شـکاندن، بزانن هـەموو داب و نـەریتێکی سـەردەمی نـەزانی، هـەموو داب و نـەریتێك و هـەڵس و کەوتێکی پەسەند کراوی پێشوو دەربارەی ماڵ و سامان و خوێن رێژی و خوێنبەسـتن بەتاڵـەو کـاری پـێ نـاکرێ، ئـەی مەعـشەری قـورەیش پەروەردگار داب و نـەریتی سـەردەمی نـەزانی لـێ قەدەغەکردون، فـەخرو شـانازییکردن بـەباوك و بـاپیرەوە خۆهەڵنانـەوە پێیـان یاسـاغەو پوچـە. ئادەمیزاد هەموویان لەئادەم کەوتوونـەوە ئـادەمیش لـەگڵ دروسـتکراوە، ئەمجار ئایـەتی {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّـن ذَكَـرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُـعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَـاكُم} «سـورة الحجـرات، ١٣» پاشـان فـەرمووی: ئـەی هـۆزی قورەیش! چـی لـەمن چاوەڕوان دەکـەن لەگـەڵتان

بکەم؟ وتیان: چاوەڕێی پیاوەتی و خێرو فەڕین. «أخ کریم وإبن أخ کریم». پێغەمبەریش فەرمووی: دەبڕۆن هەمووتان ئازادو سەرفرازبن«[١]».

موسلیم و بوخاری لەئەبو شورەیحی العدوی یەوە ریوایەتیان کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ برێ لەوقسانەی ئاڕاستەی قورەیشییەکانی کردن رۆژی رزگارکردنی مەککە. ئەوە بوو فەرمووی: «خودا بۆ خۆی رێزی داوە بەمەککەو حورمەتی داوەتێ خەڵك ئەو حورمەتەی نەداوەتێ. حەلاڵ نیە بۆ کەسێك ئیمانی بەخودا هەبێ. بڕوای بە زیندووبونەوەی رۆژی قیامەت هەبێ، خوێن رێژی لەحەرەمی مەککەدا بکا، یان درەختی ببڕێ، ئەگەر کەسێك ئەوکارە یاساغانەی تێداکردو وتی: پێغەمبەریش وەهای کردوە لەناومەککەدا شەڕو کوشتاری کردوە، بڵێن: خودا ئیزنی بەپێغەمبەرەکەی داوە، ئیزنی بەئێوە نەداوە، بۆئەو سەعاتێك لەرۆژدا ئەوکارە حەلاڵ کرا، دوای ئەوە مەککە وەك جاران حورمەتی تایبەتی خۆی بۆگەڕایەوە، ئەوکارانەی لەوەپێش تێیدا حەرام بوون دوای تێپەڕبوونی ئەوساتە سەرلەنوێ حەرامبونەوە. جا بائەو کەسەی ئێستا لێرە ئامادەیە بائەم ئامۆژگاری و ئەحکامانە بگەیەنێ بەوانەی لێرە نین.

پاشان خەڵك لەناومەککەدا کۆبونەوە بۆ بەیعەتکردن بە پێغەمبەرو گوێڕایەڵییان بۆخوداو بۆ پێغەمبەرەکەی. جا کە لەبەیعەتکردنی پیاوەکان بووە، ئافرەتی قوریش و هی تریش لێی کۆبونەوە بۆ بەیعەتکردن، لەناویان دا هیندی کچی عوتبە روپۆشێکی پۆشیبوو خۆی وا لێ کردبوو نەناسرێتەوە چونکە خۆی بەتاوانبار دەزانی بەوەی لەغەزای ئوحود دا ئەتکی جەستەی حەزرەتی حەمزەی کردبوو، جا کە لەپێغەمبەر نزیکبوونەوە بۆ بەیعەتکردن، پێغەمبەر پێی فەرموون: بەیعەتم بدەنێ، کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدەن، هیند وتی: بەخودا تۆ

---

١- وروی ابن سعد نحوه ایضا في طبقاته.

بـەڵێنیێکمان لــێ وەردەگــری لــەپیاوەکانت وەرنــەگرتووە. پێغەمبــەر فـەرمووی: بەیعـەتم بـدەنێ کـە هـەرگیز دزی نەکـەن. هینـد وتـی: بـەخودا ئەگەر بۆم رێ بکەوێ لەماڵی ئەبو سـەفیان قاچ و قوچ بکـەم دەیکـەم، جا نازنم ئاخۆ بۆم ڕەوایە یان نا؟ ئەبوسەفیان کەلەوێ ئامادەبوو ئاگای لـەم وت و وێژە بوو، وتی: ئەوەی لەوەپێش هەڵت گرتووە ئەوە ئازادی و بۆت حەڵاڵ بێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەتۆ هینـدی کچی عوتبـەی؟ وتـی: بـەڵێ، من هیندم، چاوپۆشی بکە لەڕابردوم خـودا لێت ببورێ. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: داوێـن پیسی مەکـەن هینـد وتـی: ئایـا ئـافرەتی ئازاد داوێـن پیـسی دەکـا؟ پێغەمبـەر فـەرمووی: منداڵـەکانتان مـەکوژن، هینـد وتـی: ئێمە بەزارۆکی و بەمنداڵی بەخێومان کردن، ئەتۆ رۆژی بـەدر بەگـەورەیی کوشـتتن ئێــوەو ئــەوان بــاش دەزانــن. حــەزرەتی عومــەر بــەم قــسەیە پێکــەنینی زۆری هــات. پێغەمبــەر فــەرمووی: بوختــان بۆیــەکتر هەڵمەبەستن، هیند وتـی: وەڵڵاهـی بوختـان هەڵبەسـتن کـارێکی قێزەونـە، چاوپۆشی هەندێ جار باشە.

پێغەمبـەر فـەرمووی: سەرپێـچی مـن مەکـەن لـەکاری چـاکەدا، هینـد وتـی: کەهاتین بـۆ خزمـەتت بۆیـە نـەهاتوین سەرپێـچیت بکـەین. ئـەمجار پێغەمبەر بەعومەری فەرموو ئـەتۆ بەیعـەتیان لەگـەڵ بکـە، پێغەمبـەر ﷺ دوعــای لێخۆشــبوونی بــۆکردن، عومــەر بەیعــەتی لەگــەڵ دا کــردن«١».

پێغەمبـەر بۆخـۆی جگـە لەحـەڵاڵی خـۆی دەسـتی لـەئافرەتی تـر نـەداوە. بوخـاری لەعائیـشەوە ریوایـەتی کـردووە کـە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر ﷺ بەقسە بەیعەتی لەگەڵ ئافرەتان دەکردو داوای لـێ دەکـردن پابەنـدی ئـەم ئایەتەبن، کە دەفەرموێ: {أَلَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا}.

---

١ رواه ابن اسحاق وابن جرير.

عائیشە فەرموویەتی دودەستی پێغەمبەر قەت لەدەستی ئافرەتی نامەحرەم نەکەوتووە، ئیمامی موسلیمیش لەخاتوو عائیشەوە هەمان ریوایەتی هێناوە.

ئوممو هانی کچی ئەبوطالب رۆژی فەتح پەیمانی جیواری دابوو بە پیاوێکی موشریك، حەزرەتی عەلی دەیەویست ئەو پیاوە بکوژێ. ئوممو هانی دەڵێ هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر دیتم خەریکی خۆشتنە، فاطیمەی کچی پەردەیەکی بۆ گرتبووەوە، دەڵێ: سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ عەرزم کرد «ئومموهانی کچی ئەبوطالیب»م فەرمووی بەخێرهاتی یاخوا ئومموهانی بەخێر هاتبی. کە لەخۆشتنەکە بۆوە هەڵسا هەشت رکات نوێژی کرد قوماشێکی لەخۆوە پێچابوو، دوایی روی بولا وەرگێرام، عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا عەلی برام دەیەوێ پیاوێك بکوژێ، کەمن جیوارم داوەتێ پیاوەکە فلانی کوڕی هوبەبڕەیە، پێغەمبەر فەرمووی: ئێمە جیواردەدەین بەکەسێك کە تۆ جیوارت داوەتێ. ئەی ئومموهانی«١».

ئەو نەفەرانەی کە پێغەمبەر ﷺ خوێنی حەلاڵ کردبوون، هەندێکیان کوژران و هەندێکیان موسوڵمان بوون «الحویرث»و عەبدوڵلای کوڕی خەطل و «مقیس»ی کوڕی حەبابە کوژران. یەکێك لەو چەتیوە گۆرانی بێژانە کوژراو یەکێکیان موسوڵمان بوو. بۆ عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح شەفاعەت کراو موسوڵمان بوو، بوو بە پیاوی چاك. «عکرمە»و «هبار»و هیندی کچی عوتبە موسوڵمان بوون.

ئیبنو هیشام ریوایەتی کردووە دەڵێ: «فضالة»ی کوڕی عومەیری اللَیثـي ساڵی رزگارکردنی مەککە ویستی لەکاتی تەواف کردن دا

---

١- متفق علیه.

پێغەمبەر بکوژێ. کەلێی نزیك بۆوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی فوضالە؟! وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا من فوضالەم، فەرمووی: چیت لەدڵ دا بوو؟ وتی: هیچ، خەریکی ذیکری خودا بووم. پێغەمبەر پێکەنی، پاشان فەرمووی: «أستغفر الله» بکە داوای لێخۆشبون لەخودا بکە. پاشان دەستی موبارەکی خستە سەردڵی و دڵی هێواش بۆوە، لەوەداو فوضالە دەیگوت: سوێندم بەخودا پێغەمبەر دەستی لەسەر سینگم لانەبردبوو وام لێ هات کەسم هێندەی پێغەمبەر خۆش نەدەویست. فوضالە لەگەڕانەوەی دا بۆ ماڵەوە ئافرەتێکی بینی لەوەپێش حەزی لێ دەکردو خوا خوای بوو بیدوێنێ، ئافرەتەکە پێی گوت: وەرە با قسەت بۆبکەم ئیتر دەستی کرد بەخوێندنەوەی ئەم شیعرانە:

| | |
|---|---|
| قالت هَلُمَّ الي الحديث فقلت لا | يأبى علي الله والإسلامُ |
| لو مارأيت محمداً وقبيله | بالفتح يوم تكسر الأصنامُ |
| لرأيت دين الله أضحى بَيّناً | والشرك يغشى وجهه الأظلامُ |

پێغەمبەر ﷺ وەکوو بوخاری ریوایەتی کردوە نۆزدە رۆژ مایەوە لەوماوەیەدا نوێژی بەکورتکراوەیی دەکرد، لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکاتی دەکرد.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئێستا تۆ روداوی ئەو فەتحە گەورەیە دەبینی، کەخودا کردی بەخەڵات و رێزی پێ لەپێغەمبەرو هاوەڵانی نا، دەتوانی نرخی بانگەوازی و کاریگەری ئەو بانگەوازییەو روداوەکانی ببینی. نهێنی و حیکمەتی خودایی لەو شێوە بانگەوازیەدا بەچاوی خۆت بدینی.

ئێستا کە تۆ بەسەر چیرۆکی فەتحی مەککەدا ئاگادار بووی دەتوانی بەباشی نرخی هیجرەت، کە لەپێش فەتح دا ئەنجام درا هەست پێ بکەی. دەتوانی نرخی خۆبەختکردن و فیداکاریی و بەجێ هێشتنی ماڵ و سامان و خێزان و خزم و کەس و کار لەڕێگەی ئیسلام دا، هیچ کام لەوانە بەفیڕۆ ناڕوا ئەگەر ئیسلام بەرقەرار بێ، وەلێ هیچیان سودیان نییە ئەگەر ئیسلام بەرقەرار نەبێ.

ئێستا ئەتۆ سەرنجی فەتحی گەورە بدە، «ڕزگارکردنی مەککە» بەئاسانی دەتوانێ بەتەواوی نرخی جیهاد و خۆبەختکردن بزانی. دەتوانی هەست بەو سەربەرزی و شکۆمەندییە بکەی. کەپاش ئەو ناڕەحەتی و میحنەتەی توشی پێغەمبەر و هاوەڵانی بوو لەقۆناغەکانی پێش فەتحی مەککەدا، بێگومان هیچ کامێ لەو دەربەدەری و ناڕەحەتی و مەینەتییانە بەفیڕۆ نەچوو، دڵۆپە خوێنێکی موسوڵمانان و قەترە عارەقێکیان بەخۆڕایی نەڕۆیی، موسوڵمانان ئەوەی توشیان هات لە غەزاو سەفەر و ناڕەحەتی و ترس و برسییەتی...هتد، هەموی بەگوێرەی حیساب و پلان بووە... هەموو ئەوانە بەگوێرەی خۆیان بەشێك بوون لە نرخ و بەهای سەرکەوتن و فەتحی گەورە. ئەوە سوننەت و داب و نەریتی خودایە بەرامبەر بەندەکانی، ئاشکرایە سەرکەوتن بەبێ ئیسلامی راستەقینە نابێ، ئیسلامیش بەبێ بەندایەتیکردنی راست بۆخودا پەیدا نابێ، بەندایەتی و ملکەچی بۆخودا بەبێ بەخشینی ماڵ و گیان و پاڕانەوەو لالانەوە لەبەر دەرگای پەروەردگار و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، بەرجەستە نابێ.

ئێستا، کە تۆ هەواڵی ئەم فەتحە گەورەیەت بیست و بەسەری دا ئاگادار بویت ئەمجار دەتوانی نرخ و بەهای لەبن نەهاتوی صوڵحی حودەیبییە هەڵبسەنگێنی، ئەو سیڕو نهێنیە یەزدانییە هەست پێ بکەی

کە ظاهیرو ڕواڵەتیەکەی حەزرەتی عومەرو زۆر لە هاوەڵانی سەرسام کردبوو، خستبوونیە دڵەڕاوکێ و حیرەتەوە. بەدڵنیاییەکی تەواوەوە لەسەر ئەو مەعنایە بوەستی کە پەروەردگار ئەو صوڵحەی ناونا فەتح. وەکوو دەفەرموێ: {فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا}. جا کە تۆ ئەمەت زانی، زیاتر حەقائیقی «نبوة»و پێغەمبەرایەتیت بۆ دەردەکەوێ: کە لەواقیع دا ژیان و هەڵس و کەوتی حەزرەتی موحەممەدی ئاڕاستە دەکرد. ئایا تۆ لەیادتە ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر لەزێدی خۆی «=مەککەی پیرۆز» دەرچوو، خۆی لەناو ئەشکەوت و شیوو دۆڵەکانی دا دەشاردەوە، بەڕێوە بوو بەرەو مەدینەو کۆچی دەکرد، پێش خۆی چەند هاوەڵێك کۆچیان کردبوو دوا هیجرەتی خۆیشی هاوەڵانی پەیوەندییان پێوەکرد، ژمارەیان کەم و برسی و هەژارو نەدارا، ماڵ و سامان و خێزان و منداڵیان جێ هێشتبوو وازیان لەزێدو نیشتمان هێنابوو بۆئەوەی ئایینەکەیان پارێزراوبێ؟!.

ئێستا وائەوانە بەسەر بەرزی و شکۆمەندیی گەڕاونەوە بۆ زێدو نیشتمانی خۆیان، بۆسەر ماڵ و حاڵی خۆیان، لەوەپێش کەم بوون ئێستا زۆر بوون، لەدوای لاوازی بەهێزو بەدەسەڵات بوون، ئەوانەی دوێنێ بەناحەق دەریان دەکردن ئەمڕۆ بەملکەچی و چاوشۆڕی پێشوازییان لێ دەکەن.

خەڵکی مەککە دەستە دەستەو پۆل پۆل دێنە ژێر خێمەی ئیسلام و موسوڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن! بیلالی حەبەشی «کەماوەیەکی زۆر لەناو لمبەلانی مەککەدا بەدەستی بتپەرستەکان سزای سەخت دەدراو کەس نەبوو دادی بپرسێ و سزای لەسەر سوك بکا، ئێستا وا دەچێتە سەربانی کەعبەو بەدەنگی بەرزی بانگی «الله أكبر، الله أكبر، ...» بەگوێچکەی خەڵك دادەداو، جاڕی کۆتایی هاتنی سەردەمی نەزانی و

هاتنە کایەی سەردەمی ئازادیو یەکتاپەرستی هەڵدەدا. ئەو دەنگەی دوێنێ لەژێر ئازاری شۆڕکی لێدانو سزادا لەناو کۆتو زنجیردا بەهەناسە سواریو دەنگی کپکراوی دا دەیگوت: «أحد، أحد، أحد» ئەوەتا ئەمڕۆ بەدەنگی بەرزو ئازادو سەربەست لەسەربانی کەعبە بەهەموو هێزی خۆی دەڵێ: «لا إلە إلا الله محمد رسول الله» هەموو خەڵکەکە بەخوشوعو خضووعەوە گوێچکەیان بۆ ئەم بانگە پیرۆزە کلۆر کردوە. بێدەنگ وەستاون!! ئائەمە تاکە حەقیقەتێکەو دووەمی نیە، ئەوە حەقیقەتی ئیسلامە، ئای مرۆڤ چەند گێلو نەفامە، کە لەغەیری ڕێگەی ئیسلام دا هەوڵو تەقەڵلا بدا، ئەوکەسەی لەپێناو ڕێبازی غەیری ئیسلام دا تێدەکۆشێ ئەوە شوێن وەهمو خەیاڵ کەوتووەو سەرەنجامی تێداچونو مایە پوچییە.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین: کە ڕوداوی ئەم فەتحە چەند دەلالاتو ئەحکامی زۆری لەخۆ گرتون، پێویستە بیانزانینو هەڵوێستە یان لەسەربکەین. ئێستا لێرە بەولاوە ئەوەی بۆمان بکرێ بەگوێرەی زنجیرەی ڕوداوەکان دەیانخەینە ڕو.

## یەکەم: ئەوەی پەیوەندی بەهودنەو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانو عەهدەوە هەیە:

أ- هۆکاری فەتحی مەککە ئەوەمان بۆ ڕون دەکاتەوە کەئەهلی عەهدو هودنە ئەگەر شەڕیان لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە لەگەڵ موسوڵمانان پەیمانی «ذمّە»و جیواریان هەیە، ئەوە بەشکاندنی پەیمانو شەڕ هەڵگیرسان دەژمێردرێو هیچ عەهدو پەیمانێکیان لەگەڵ موسوڵمانان نامێنێو هودنە کۆتایی پێ دێ. ئەمە کۆڕای زانایانی ئیسلامەو هەموویان لەسەری کۆکن.

ب- ئەو شێوازەی پێغەمبەر ﷺ بۆ فەتحی مەککە گرتیە بەر ئەوەمان نیشان دەدا کە بۆ ئیمامو پێشەوای موسوڵمانان دروستە بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت هێرشی لەناکاو غافڵگیر بکاتە سەر دوژمنی پەیمانشکێنو پێویست ناکا پێش وەخت ئاگاداریان بکاتەوە. ئەوە تۆ بینیت پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆی ئامادەکرد بۆ گرتنی مەککە لەخودا پاڕایەوە، کە قورەیشییەکان بەخۆیان نەزانن تائەم غافڵگیریان دەکاو لەناکاو پەلاماریان دەدا، فەرمووی: «اللهم خذ على أبصار قريش فلا يروني إلا بغتة». ئەمەش کۆڕای زانایانی ئیسلامی لەسەرە. بەڵام ئەگەر دوژمن خیانەتی نەکردبوو هودنەی نەشکاندبوو، تەنها ترسی ئەوەیان لێ دەکرا هودنە بشکێننو شەڕ هەڵگیرسێننەوە تەنانەت ئەگەر بەڵگەو نیشانەی بەهێزیش هەبن لەسەر ئەو نیازەیان، هەر بۆئیمامو پێشەوای موسوڵمانان ڕەوانییە عەهدو پەیمانیان رادەست بکاتەوەو لەناکاو هێرشیان بکاتەسەرو شەڕیان لەگەڵ بکا. بەڵکوو پێویستە پێشوەخت پێیان ڕابگەیەنێ، کە هودنەو شەڕ ڕاوەستان کۆتایی پێ هاتووە، خۆیان ئامادە بکەن بۆ پەلاماردان. ئاماژە بەبەڵگەی ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: {وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاء إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ} «سورة الأنفال، ٥٨». ئەگەر ترسان لەوەی دوژمن هودنە بشکێنێو شەڕتان لەگەڵ بکاو بەڵگەی بەهێزتان لەسەر نیازی خراپی ئەوان لاهەبوو ئەوە پێشوەخت پێیان رابگەیەنن کە عەهدو پەیمانو هودنە کۆتایی پێ هاتووەو شەڕیان لەگەڵ دەکەن.

ج- لەم کردارەی پێغەمبەردا بەڵگەی ئەوە هەیە کە هەڵوەشاندنەوەی هودنە لەلایەن هەندێ ئەفرادی دوژمنەوە وەکوو ئەوە وایە هەموویان ئەو خیانەتەیان کردبێ، مەگەر بەئاشکرا ناڕەزایی بەرامبەریان دەربڕنو خۆیانیان لێ بێ بەری بکەن. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ بێدەنگی

قورەیشییەکانی بەرامبەر ئەو تاقمەی هێرشیان کردبووە سەر هاوپەیمانانی موسوڵمانەکان کردە بەڵگەو نیشانەی ئەوەی کە قورەیشییەکان هەموویان هاوبەشی ئەو تاوانەن و بەشەڕ هەڵگیرسێن حیسابن. چونکە مادام لەوەپێش هەموو قورەیش چوونە ناو هودنەو پەیمانی شەڕ ڕاوەستانەوە لەڕێگەی واژۆکردنی پەیمانەکەی لەلایەن هەندێ پیاو ماقوڵ و سەرانیانەوە. کارەکە وادەخوازێ کەهەموویان بەپەیمانشکێن حیساب بکرێن بەهۆی پەیمانشکێنی هەندێکیانەوە.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەموو پیاوەکانی بەنو قورەیظەی کوشتن بەبێ ئەوەی پرسیار لەهەموویان بکا ئایا پەیمانی هەڵوەشاندۆتەوە یان نا؟ هەروا هەمان هەڵوێستیشی نواند بەرامبەر بەنو نەضیر، ئەوە بوو هەمووی دەرکردن بەهۆی ئەو خیانەتەی کردیان و پابەندی پەیمانی بەستراوی نێوان خۆیان و موسوڵمانەکان نەبوون، دەی خۆئەوانەی خیانەتەکەیان کرد هەموویان نەبوون هەندێکیان بوون.

**دووهەم: «حاطب»ی کوڕی بەلتەعەو کردەوەکەی:**

أ- ئێمە لە خوێندنەوەو تێڕوانینی ئەم روداوەدا خۆمان لەبەرامبەر دیمەنێکی تازەدا دەبینینەوە، دیاردەیەکی تری «نبوة»ی حەزرەتی موحەممەد دێتە بەرچاومان. جۆرێکی تر لەپشتگیری پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی دەبینین، ئەوەبوو بەهەندێ لەهاوەڵانی فەرموو: «بڕۆن تا دەگەنە روضة خاخ» لەوێ ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە، نامەکەی لێ بستێنن، کێ هەواڵی ئەوەی پێدا کە ئەوژنە نامەی «حاطب»ی کوڕی بەلتەعەی پێیە دەیبا بۆ قورەیشییەکان؟ کێ حەزرەتی موحەممەدی ئاگادار کرد بەسەر گفتوگۆی نێوان «حاطب»ی کوڕی بەلتەعەو ئافرەتەکەدا؟ بێگومان ئەوە نیگای خودایی بوو، ئەوە دیاردەی

پێغەمبەرایەتی بوو، پشتگیری پەروەردگار بوو بۆ پێغەمبەری خۆی، بۆئەوەی نەخشەو پلانی پەروەردگار بۆ رزگار کردنی مەککە بێتە جێ و بەئاکام بگاو رێزلێنانی خودا بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان بێتە دی و جێ بەجێ بێ.

ب- ئایا دروستە تۆمەتبار سزابدرێ بۆئەوەی دان بە تاوان دا بنێ. بێگومان برێ لەزانایان بەڵگەیان بەوتەکەی ئیمامی عەلی هێناوەتەوە کە بەئافرەتەکەی گوت یان بەخۆشی نامەکەمان بدەرێ یان پۆشاکەکەت لەبەردادەکەنین و نامەکە دەدۆزینەوە، ئەم روداوەیان کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە رەوایە بۆ ئیمام و خەلیفەو ئەوکەسەی بەسەرکاری ئەوان دا رادەگا، کە وەسیلەو هۆکاری وابگرێتە بەر کە بتوانێ لەرێیەوە کەشفی تاوان بکاو جەریمەکە دەبخا، هەروا بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کە ریوایەتکراوە جولەکە لەغەزای خەیبەردا هەندێ ماڵی حویەی کوڕی ئەخطەبیان شاردبۆوە، پێغەمبەر ﷺ بەمامی حویەی گوت: ئەوە کوا ئەوکیسە پارەی حویەی لە «النضیر»ەوە هێنابووی؟ وتی هەمووی لە مەسرەفی شەڕو هەرادا خەرج کرا. پێغەمبەر فەرمووی: ماوەیەك لەوەپێش بوو زۆری بەسەردا نەرۆیشتووە ماڵەکەش زۆربوو بەوماوە کەمە ئەو ماڵە زۆرە خەرج ناکرێ، ئیتر پێغەمبەر کابرای دایە دەست «الزبیر»و هەندێ سزای دا، وتی: سزام مەدەن من تاوێ لەوەپێش حویەیم بینی لەوکەلاوە کۆنەدا دەهات و دەچوو کە چۆن بۆناو کەلاوەکە هەمبانە پارەکەیان لەوێ دییەوە.

برێ لە لێکۆڵەرەوانی سەردەم ئەم رایە پاڵ ئیمام مالیك دەدەن. ئەوەی کەڕاست و حەقە پێشەوایانی چوار مەزهەبەکان لەسەرنی و جەماوەری زانایانیش هەر رایان ئەوەیە کە سزادانی تۆمەتبارێك کەتاوانی لەسەر نەچەسپابێ بەبەڵگەی شەرعی دروست نییە، نابێ

بۆئەوەی هەڵ بندرێ بۆ داننان بەتاوان دا سزابدرێ بۆئەوەی ئیعتیراف بەتاوان بکا چونکە تۆمەتبار بەبەریئو بێ تاوان حسێب دەکرێ، تا تاوانی لەسەر دەچەسپێ.

خەبەری ئەو ئافرەتەی کە حاطەبی کوڕی ئەبولتەعە ناردی بۆ مەککەو بەشوێن دا چونی ئیمامی عەلیو هەڕشە لێکردنی کە ئەگەر نامەکەیان نەداتێ روتی دەکەنەوە ناچێتە ئەم خانەیەوەو لەم بابەتە نییە. بەدوو بەڵگە:

١- ئەم ئافرەتە تەنها تۆمەتبارێك نەبوەو تۆمەتی ئاڕاستەکرابێ، بەڵکوو تاوانبار بووەو تاوانەکەی حەقیقەتێکی چەسپاوە. هەواڵی راستگۆترین ئادەمیزاد لەسەری چەسپاندووە، هەواڵدانی پێغەمبەر بەهێزترین بەڵگەیە، لەدان پیانانو ئیعتیرافو ئیقرار بەهێزترە، چۆن شتێك قیاس دەکرێ بۆسەر ئەوە کەتەنها تۆمەتو گومان بێو ئاڕاستەی ئادەمیزادی نامەعصوم بکرێن، هەروا بەنیسبەت مامی حویەی کوڕی ئەخطەبیشەوە هەمان بەڵگەو دەلیل دەهێندرێنەوە.

٢- داڕنینی پۆشاك لەئافرەتە نامەبەرەکە بەمەبەستی گەڕان بەدوانامەکە دا، کەی بەتەعزیبو سزا دەژمێردرێ. جوداوازیی نێوان ئەو دوحاڵەتە ئاشکراو عەیانە. جا ئەگەر بچەسپێ کە نامەکە بەئافرەتەکەیەو بەئاسانی نامەکە نادا بەدەستەوەو هیچ رێگا چارەی ترنین بۆ دۆزینەوەی نامەکە جگە لەپشکنینو داڕنینی پۆشاکەکانی ئەوە کارێکی مەشروعەو گومانی تێدانیە، بەڵکوو ئەوە واجبەو فەرمانی پێغەمبەر واجبی کردوە.

سزادانی «الزبیر» بۆمامی حویەی کوڕی ئەخطەب، ئەوە یەکەم وەکوو لەوەپێش گوتمان حەقیقەت بووە تۆمەت نەبووە، پاشان روداوی ئافرەتەکەی «حاطەب» کاغەزی پێدانادبوو هەروا روداوی مامی

«حویەی کوڕی ئەخطەب» مەوزوعێکن پەیوەندییان بەکاری جیهادەوە هەیەو بارودۆخەکە بارودۆخێکی نائاساییەو شەڕ لەنێوان موسوڵمانان ناموسوڵمانان دا هەیە. دەی چۆن مامەڵەکردنی موسوڵمانان لەناو خۆیان دا قیاس دەکرێ بۆ سەر ئەو دوحاڵەتە؟!.

ئەوانەیش کەپێیان وایە ئەوە رای ئیمام مالیکەو مەزهەبی ئەو رێگای ئەوەی داوە تۆمەتبار سزابدرێ تادان بەتاوانەکەی دا بنێ بیرو بۆچونەکەیان بەتاڵەو پێچەوانەی ئەو حوکم و یاسایانەیە کەلەکتێبی «المدونة» دا تۆمار کراوە کەسەرچاوەیەکی بڕوا پێکراوی مەزهەبی ئیمام مالیکەو «سحنون» لەئیمام مالیکەوە ریوایەتی کردوە. دەڵێ: «وتم: ئایا ئەگەر دانی بەشتێك دا نا دوای هەڕەشە لێکردن و لێدان و بەندکردن ئایا حەدی شەرعی لەسەر ئەو کابرایە تەنفیز دەکرێ یان نا؟! ئیمام مالیك لەوەڵام دا وتی: کەسێك دوای هەڕەشە لێکردن و زنجیرکردن و بەند کردن و لێدان، دانی نا بە تاوانێك دا ئەوە بەتەهدید حیساب دەکرێ و وای بۆ دەچم دان پیانانەکەی وەرناگیرێ». پاشان دەفەرموێ: «دەڵێم، ئەگەر لێی دراو هەڕەشەی لێ کرا بەو لێدان و هەڕەشەیە شتە دزراوەکەی دەرخست ئایا حەدی شەرعی لەسەر تەنفیز دەکرێ و ئیقرارو دان پیانەکەی موعتەبەرە؟ دەفەرموێ: نەخەیر حەدی لەسەر تەنفیز ناکرێ مەگەر دان پیانانەکەی بەبێ هەڕەشەو لێدان بووبێ و لەهیچ نەترسابێ»[١].

٢- حەدیثی پێغەمبەر ﷺ بۆ حاطەب و وەڵامی حاطەب بۆ پێغەمبەرو ئەمجار ئەو بەشەی قورئان کەلەوبارەوە نازڵبوو، ئەوەمان بۆ ڕون دەکاتەوە، کە دروست نییە بۆ موسوڵمانان لەهیچ بارودۆخێك دا کە دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆ دوژمنانی خودا پەیڕەو بکەن، نابێ

---

١ المدونة ٩٣/١٦.

لەدوژمنانی خودا دۆستو ئەولیا بۆخۆیان پەیدا بکەن، دەستی یارمەتیو برایەتییان بۆ درێژ بکەن. ئەمە هەرچەند «حاطب» عوزری بەوە هێنایەوە کە ئەوکارەی لەڕوانگەی ئەوەوە ئەنجام داوە کە ئەو بۆخۆی لەهۆزی قورەیش نیەو لەکاتی تەنگانە بەهانایەوە بێنو یارمەتی بدەن، ئەو ویستویەتی بەم کارەی پیاوەتی بەسەر قورەیشەوە هەبێ، ئەگەرشتێك بوو ماڵو منداڵی بۆ بپارێزن.

بێگومان ئایەتەکانی قورئان بەصەراحەت فەرمان بە موسوڵمانان دەکەن کە وەلائیان تەنها بۆ خودابێ، پەیوەندییان بەئادەمیزادی ترەوە «هەرکەسێك بێ» لەسەربنەمای وەلائو خۆشەویستی ئایینی ئیسلام بێو دڵسۆزی بێ بۆ ئایین. ئەگینا ئەگەر وانەبن چۆن تەصەور دەکرێ موسوڵمانان گیانو ماڵی خۆیان لەڕێبازی خوادا بەخت بکەن!!.

ئەوە موشکیلەو کێشەی زۆرینەی ئەوانەیە کەلەم سەردەمو رۆژگارە دا خۆیان بەموسوڵمان حسێب دەکەن. هاموشۆی مزگەوتەکان دەکەن بۆ نوێژ، زۆر ویردو ئەزکار دەخوێنن، تەزبیحی سەد دەنکی بەدەستەوەو دەم بە ویردو صەڵەوات بەڵام پەیوەندی لەگەڵ خەڵك دا لەسەر ئەساسی «ولاء» بۆ عەشیرەتو حیزبو بەرژەوەندی ماڵو دونیا یان وەحیی ئارەزۆو مەبەستو مەرامی دونیاییە، بەلایەوە گرنگ نییە حەق بەبەتاڵ بفرۆشێو ئایینی خودا بکاتە پەردەو دیوجامە بۆ بەدەستهێنانی مەبەستی دونیایی پڕو پوچ!!.

بەڕاستی ئەوانە مونافیقو دووڕوون ئەو مونافیقانەن موسوڵمانان بەدەستیانەوە دەناڵێننو لەسەر دەستی ئەوان توشی جۆرەها دواکەوتوویی و پەرتەوازەییو لاوازیی بوون، ئەوانە داردەستی داگیرکەرو واجیهەو رێخۆشکەرن بۆ هەموو پیلانو موئامەرەیەك

کەلەدژی ئیسلام‌و موسوڵمانان ڕێك دەخرێ. گیا کەڵەی ناوکشتوکاڵن. مۆرانەو خمخۆرکەی ناو گەل‌و کۆمەڵگان.

## سێیەم: ئەبوسەفیان‌و هەڵوێستی پێغەمبەر بەرامبەری:

بەڕاستی کاری ئەبو سەفیان لەڕۆژی فەتحی مەککەدا جێگای سەرنج‌و تێڕامانە، سەیرە ئەوەتا ئەو یەکەم کەسە قەومەکەی دەترسێنێ لەوەی شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر بکەن، لەریزی پێشەوەی ئەوانەیە کە لەورۆژەدا موسوڵمان دەبن، لەکاتێك دا لەوەپێش هیچ لەشکرو هێزێك لەمەککە دەرنەچووە بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەر مەگەر بەئیشراف‌و ڕێنومایی‌و وروژاندنی ئەو نەبووبێ. هۆکاری سەرەکی بۆ هەموو شەڕو غەزاکانی پێش ئەو رۆژە ئەبوسەفیان بووە، کەچی ئەمڕۆ دەست پێشخەر بۆ موسوڵمانبون‌و هاندانی خەڵك بۆئەوەی دژی پێغەمبەر نەجەنگن!!.

وێدەچێ حیکمەتی یەزدان ویستبێتی مەککە بەبێ شەڕی قورس رزگار بکرێ، خەڵکەکەی ملکەچی فەرمانی پێغەمبەر بن ئەو خەڵکەی لەوەپێش لەمەککە دەریان کرد ئەزیەتیان دا شەڕیان لەدژ کرد ئێستا بەبێ شەڕو هەراو ماندوبوونی موسوڵمانان، بۆخۆیان پۆل پۆل بێنە ژێر ئالای ئیسلامەوە لەپێش هەمووشیانەوە هۆکاری ئیسلامبوونی ئەبوسەفیان ڕەخساو موسوڵمان بوو، ئەمەش لەو بەیەکگەیشتنەی کەهاتەدی لە نێوان پێغەمبەرو ئەودا لەلای «مرالظهران» بۆ ئەوەی دوای موسڵمانبوونی بگەڕێتەوە بۆناو مەککەییەکان‌و فیکرەی شەڕو بەرەنگار بوونەوەی پێغەمبەریان لەمێشك دەربهاوێ، زەمینە سازییەك بۆ ئاشتی لەمەککەدا بخولقێنێ سەرەنجامەکەی لەگۆڕانی ژیانی بتپەرستی‌و

داب و نەریتی جاهیلی بێ و لەشوێنی ئەوە هەڵاتنی خۆری ئیسلام و یەکتا پەرستی بێ.

بێگومان یەکێك لەدیاردە گرنگەکانی ئەم ڕێخۆشکردنە بۆ ئەو فەتحە گەورەو سەرکەوتن و پیرۆزییە ئەو فەرمانە بوو کە پێغەمبەر بڵاوی کردەوەو فەرمووی: «هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسەفیانەوە ئەمینەو هیچی لەسەر نامێنێ، هەڵبەتە ئەمە دوای موسوڵمانبوونی بوو، ئەم ڕێزەی پێدرا بۆ ئەوەی بەباشی ئاایینی ئیسلام لەدڵی دا شیرین بێ و ئولفەتی پێوەبگرێ. تۆ دەزانی ئیسلام بەواتای ملکەچبوونە بۆ روکنە عەمەلی و عەقیدەییە، ئەمجار پێویستە دوای ئەو تەسلیم بوونە بیرو باوەڕ لەدڵ و دەروونی دا جێگیرببێ و گەشەبکا. ئەمەش بەبەردەوامبون لەسەرئەنجامدان و پابەندبوون بەمەبادیئو ئەرکانەکانیەوە دەستەبەر دەبێ. گرینگتر هۆکار کە مرۆڤ هەڵنێ بۆ بەردەوامبوون لەسەر پەیرەویکردنی بەرنامەی ئیسلام و جێ بەجێ کردنی روکنەکانی پێکەوە بەستنی دڵی موسوڵمانانە بەیەکترییەوە بەجۆرەها هۆکارو ئەسبابی مەشروع. بۆئەوەی ئیمان و باوەڕ لەدڵی هەرتاکێکیان دا ڕەگ دابکوتێ و خۆبگرێ و زریان و ڕەشەبا نەیجوڵێنێ.

بێگومان ئەم حیکمەتە لەزەینی هەندێ لە هاوەڵانی ئەنصار دا نەبوو لەوکاتەدا کە گوێیان لێ بوو پێغەمبەر دەیفەرموو «من دخل دار أبي سفيان فهو آمن» وایان گومان برد کە پێغەمبەر هەستی بەسۆزو ئەندێشە کردوە بەرامبەر زێدو هۆزو خزم و کەس وکاری و بۆیە ئەم وتەی فەرموو: لایەنی لێبوردن و هەڵدانەوەی پەڕەی سپی ڕەچاو کردوە.

ئیمامی موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ئەو وتەیەی فەرموو، ئەنصارەکان هەندێکیان بەهەندێکیان گوت: «جەنابی حەزو ئارەزوی زێدو نیشتمانی خۆی و خۆشەویستی

هۆزو عەشیرەتەکەی هاتۆتەوە ڕێ‌و ئەو سۆزو عاطیفەیە پاڵی پێوە نا ئەو هەڵوێستە بنوێنێ».

ئەبو هورەیرە دەڵێ: نیگا بۆ پێغەمبەر هات، هەرکاتێکیش نیگای بۆ بهاتایە ئێمە دەمانزانی‌و لێمان شاراوە نەبوو. ئەگەر نیگای بۆ بهاتایە کەس زاتی نەبوو تەماشای پێغەمبەر بکا تاوەحیەکە کۆتایی دەهات. ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی: ئەی هۆزی ئەنصار! وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی: ئەوە ئێوە بوون وتتان پیاوەکە ڕەغبەت‌و خۆشەویستی شارو زێدی خۆی توش بووەو بەخزم‌و کەس‌و کاری خۆی شاد بۆتەوە؟! وتیان: بەڵێ قوربان قسەیەکی لەوشێوە کرا. فەرمووی: بۆچونەکەتان هەڵەبوو، من بەندەی خوداو پێغەمبەری خودام، کۆچم کرد بۆلای خوداو بۆلای ئێوە. ژیانم لەگەڵ ژیانی ئێوەیەو مردنم لەگەڵ ئێوەیە! ... ئیتر هەموو ئەنصار رویان تێکردو دەستیان کرد بەگریان‌و دەیانگوت ئێمە ئەوەمان لەڕوی خۆشەویستی‌و پەرۆشیمان بۆتۆ گوتووە.

ئەمەی گوتمان‌و ئاماژەمان پێکرد لەجوداوازی نێوان ئیمان‌و ئیسلام ئەوەیە ئەو ئیشکالەی تۆ هەستی پێ دەکەی لەشێوەی ئیمانهێنانی ئەبوسەفیان روون دەکاتەوە! بێگومان ئەتۆ ئاگاداری ئەوەی کاتێک پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەئەبوسەفیان کردو فەرمووی: «ألم یأن لك ان تعلم انني رسول الله؟» وەڵامی ئەبوسەفیان ئەوەبوو وتی: بەخوا ئەمەیان تائێستا لەدڵم دا شتێکی ماوە! عەبباس پێی گوت: کوڕە هاوار بۆتۆ ماڵوێران موسوڵمان ببەو شایەتی بدە هیچ خودا نین جگە لەپەروەردگارو موحەممەد پێغەمبەرو ڕەوانەکراوە، موسوڵمان ببە پێش ئەوەی لەگەردنت بدرێ. ئیتر ئەبوسەفیان ئیمانی هێناو شایەتومانی بەحەق هێنا.

ئیشکالەکە ئەوەیە، دەگوترێ: نرخی ئەو موسوڵمانبوونە چییە کە بەهەڕەشەو گوڕەشە هاتبێتە دی؟! چونکە پێش ساتەوەختێك دەیگوت: دەربارەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد شتێك لەدڵم دا هەیە.

وەلێ ئیشکالەکە دەپوچێتەوە بەوە کەزانیوتە ئەوەی مەطلووبە لەموشریك و کافر لەسەرەتادا جێگیربوونی ئیمانی تەواو نیە لەدڵی دا، بەڵکوو لەوکاتەدا داوای لێ دەکرێ بێتە ریزی موسوڵمانانەوە هەرئەوەندەی لێ داوادەکرێ بەکیان و زمانی ملکەچی ئایین بێ و دان بەتاك و تەنهایی خودادا بنێ و بڕوای بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد هەبێ و پابەندی فەرمان و نەهیەکانی بێ، پەیڕەوی پەیامی پیرۆزی بێ. ئەمجار دوای ئیسلامبوون ئیمان لەدڵی دا چەکەرە دەکاو وردە وردە لەئاکامی بەرداوامبوونی لەسەر ئیسلام ئیمانەکەی بەهێز دەبێ.

بۆیە پەروەردگار لەقورئان دا دەفەرموێ: {قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ} «سورة الحجرات،١٤». بۆیە ڕەوانییە بۆهیچ موسوڵمانێك لەکاتی شەڕو ڕوبەڕوبوونەوەدا کە موسوڵمانبوونی یەکێك لەکافرو بێ بڕوایان حەمل بکاتە سەر ترسان لەچەك یان حەزو ئارەزو لەدەستکەوت و غەنیمەت. یان حەملی بکاتە سەر ئەوە کە بەدرۆو سیاسەت موسوڵمان بووە، چەندێك بەڵگە هەبن لەسەر ئەوە کە موسوڵمانبوونەکەی لەناخەوە نیەو بۆمەبەستی جۆراو جۆری دونیاییە، دەبێ سەیری ڕواڵەت و ظاهیری حاڵ بکرێ و موسوڵمانبوونەکەی بەڕاست دابندرێ. چونکە ئەوەی مەطلوب و پێویستە ئیعلانکردنی موسوڵمانبون و چاکسازیکردنە لەمەظاهیرو ڕواڵەت دا، قوڵبوونەوە بەناخ و دەرون دا، هەوڵدان بۆئەوەی بزانین ئاخۆ ئیمانهێنانەکەی لەناخەوەیە یان نا، پێویست نییە.

دەربارەی ئەوحاڵەتەی لەهەندێ لەهاوەڵانەوە روی دا کە پێغەمبەر سیریەیەکی نارد، وارێکەوت کابرایەکیان کوشت کە ئیعلانی موسوڵمانی خۆی کرد، کوشتنەکەشی لەم ڕووەوە بوو کە موسوڵمانەکان گومانی ئەوەیان لێ کرد موسوڵمان بوونی لەترسان بووەو لەناخەوە نەبوەوە، دەی قورئان نازڵ بوو دژی ئەو هەڵوێستە وەستاو فەرمووی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِندَ اللّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُواْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا} «سورة النساء، ٩٤».

بڕوانە قورئان چۆن باسی حاڵو وەزعی ئەوانەی کرد لەوکاتەدا کە تازە موسوڵمان بوون، بێگومان زۆربەی ئەوانەی موسوڵمان بوون لەوانە بوون کە ئەمڕۆ بتمانە بەموسوڵمانبوونەکەیان نەکرێ، بەڵام دوای موسوڵمانبوونیان وردە وردە خودا بەفەضلو ڕەحمەتی خۆی ئیمانی لەدڵ دا چەسپاندنو بیرو باوەڕیان چاکو بێ خەوش بوو ئولفەتیان پێوەگرت.

بێگومان پێغەمبەر بەحیکمەتی ژیرانەی خۆی دوا بەدوای موسوڵمانبونی ئەبوسەفیان، فەرمانی بەعەبباسی مامی کرد کە ئەبوسەفیان بباتە تەنگەبەرایی ئەو شیوەی کەسوپای ئیسلام پێیدا تێدەپەڕی، بۆئەوەی بەچاوی خۆی ئەو هێزو توانایەی ئیسلام ببینێو بزانێ موسوڵمانان بەچ ئاستێك گەیشتون؟ چۆن ئەوانەی دوێنێ لەمەککەوە کۆچیان کردوە کەمو لاوازو پەرتەوازەو بێ دەسەڵات، ئەمڕۆ حاڵو وەزعیان گۆڕاوەو بوونە ئەو هێزە تۆکمەو سوپا جەڕڕاە. بۆئەوەی ئەودیمەنە ببێتە عیبرەتو چەسپێنەری عەقیدەو خاڵی وەرچەرخان لەهەڵوێستو بیرو باوەڕی دا.

ئەوەبوو، کە ئەبوسەفیان لەوتەنگەبەرەدا راوەستاو سەرنجی لەو کەتیبە جەنگاوەرانە دەدا کە بەبەردەوامی تێدەپەڕین و دەهەشەت و سەرسامی زەین و سەرنجی کۆنترۆڵ کردبوو، ئەو لەو نماییشە گرنگە سەربازییەدا رودەکاتە عەبباس و هێشتا لەژێر کاریگەریی فیکری جاهیلی دایەو پێی دەڵێ: «لقد أصبح ملك ابن أخيك الغداة عظيما!».

عەبباس هۆشیاری کردەوە لەوپاشماوە بێهۆشی و نەفامییەی لەکەللەی دا مابوو، پێی گوت: ئەبوسەفیان! ئەوە شکۆمەندیی پێغەمبەرایەتییە، مەلیکایەتی چی؟ ئەوەتۆ دڵێی چی؟ ئەو مەلیکی و جاهو ماڵ و سامانی خستۆتە ژێر پێیەوە، ئەورۆژەی ئێوەپێشنیازی ئەوەتان بۆکرد بیکەنە پاشاو مەلیکی خۆتان یان ئەوەندەی ماڵ بۆکۆبکەنەوە ببێتە دەوڵەمەندترین کەسی قورەیش، ئەو ڕەتی کردەوە، ئەو هەموو سزاو ناڕەحەتیەی لەئێوەوە پێگەیی چونکە مەلیکایەتی قبوڵ نەکرد، ناچارتانکرد کۆچ بکا بۆ وڵاتی غەریبی و زێدی خۆی جێ بێڵێ چونکە رەفضی کرد ئەو پێغەمبەرایەتییەی بانگەوازیی ئێوەی کرد ئیمانی پێ بێنن بیگۆڕێتەوە بەو پاشایەتی و مەلیکایەتیەی ئێوە پێشنیارتان بۆکرد.

ئەوە پێغەمبەرایەتییە پێغەمبەرایەتی!....

ئەوە وشەیەك بوو حیکمەتی خودایی، بەسەر زوبانی عەباس دا هێنای، بۆئەوەی ئەو ڕەتدانەوە باقی و نەمربێ تا رۆژی قیامەت، ڕەتدانەوە بێ بۆ هەموو ئەوانەی واگومان دەبەن بانگەوازی پێغەمبەر بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایەی مەلیکایەتی و پاشایەتی بووە، یان زیندووکردنەوەی داب و نەریتی نەتەوایەتی و دەمارگیری بووە. ئەو کەلیمەیەی عەبباس بەئەبوسەفیانی گوت عینوان و کەتەلۆك و ئاوێنەی بالانوما بوو بۆژیانی پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتاوە بۆکۆتایی، بێگومان

چرکە ساتەکانی ژیانی، قۆناغەکانی تەمەنی، بەڵگەیەکی گۆیا بوون لەسەرئەوەی کە حەزرەتی موحەممەد تەنها بۆئەوە نێردراوە پەیامی پێغەمبەریەتی بگەیەنێ بەخەڵك. پەیامی خوداو شەریعەتی خودا بەخەڵك بگەیەنێو بۆیان رون بکاتەوە، نەك خۆبکا بە مەلیكو پاشا لەسەر زەوی.

**چوارەم: تێفکرینو ورد بوونەوە لەچۆنیەتی چونە ناو مەککەیەوە:**

أ- بێگومان ئێمە دیتمان «وەکوو بوخاری ریوایەتی کردوە لەعەبدوڵڵای کوڕی المغفل»ەوە ئەوکاتەی تەشریفی لەسەر سنووری مەککە بوو لەقەراخی شاربوو سورەتی «الفتح»ی بەشێوەی تەرجیع دەخوێند، «تەرجیع شێوە خوێندنێکی قورئانە خوێنەرەکە وشەکان بەتەرەننوم دەخوێنێتەوە». ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر سەرگەرمی حاڵەتی شهود بووە لەگەڵ خواداو لەکاتی چونە ناو مەککەوە نقومی ئەوحاڵەتە موشاهەدەیە بووە، نەشوەی سەرکەوتنو باڵا دەستبوونی لەدڵو دەروونی دا نەبووە، هیچ شتێك لەخۆ بەگەورەزانینو دوژمن پروێنیو زاڵبون بەسەر نەیاردا لەهەستو شعوری دا نەبووە، ئەو لەوکاتەدا دڵو دەروونو هەستو شعوری پەیوەست بووە بەخوداوەو لەحاڵەتی شهود دا بووە لەگەڵ خوداو شوکرو سوپاسی زاتی بێچونی کردوە لەسەر ئەو یارمەتیو سەرکەوتنو فەتحە گەورەی بۆی رەخساند.

ئەوەی ئەم دیمەنەمان زیاتر بۆ وێنا دەکا ریوایەتی ئیبنوئیسحاقە، کەدەڵێ پێغەمبەر ﷺ کاتێ گەیشتە «ذی طوی» لەبەر تەواضوعو گەردنکەچی بۆخودا سەری خۆی داخستبوو، ئەو دەمەی دیتی خودا

بەوفەتحە گەورە چەند ڕێزی لێ ناوە، ئەوەندە سەری نزم کردەوە موی چەناگەی لەناوەڕاستی ڕەحلەکەی دەدا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە پێغەمبەر ﷺ کەوتبووە حاڵەتێکی بەندایەتی تەواوەوە: کەبەروبومی تێکۆشانیو پابەند بوونی بەفەرمانی خودای خۆی بینیو دەیڕوانییە ئاکامی ماندو بوونو دەربەدەریو سزاو مەینەتی خۆیو هاوەڵانی. بەچاوی خۆی دەی بینی چۆن پەروەردگار بەسەربەرزی گەڕاندییەوە بۆ زێدو نیشتمانی خۆی کەهەشت ساڵ لەوەبەر ناچار کرابوو جێی بێڵێ!!... ئەوساتە وەختە ساتە وەختێك بوو دەبوایە تەنها بە سوپاسکردنی خودا بەسەر ببرێ، پێویست بوو هەمووی بەمەعنای بەندایەتیکردنی تەواوو خالص بۆخودا بگوزەرێ.

پێویستە هەموو کاتێ حاڵو وەزعی موسوڵمانان بەوجۆرە بێ بەندایەتی موطلەقو ڕەها بۆخودا، بەندایەتیکردن بۆخودا لەخۆشیو ناخۆشی دا، لەکاتی هەرزانیو گرانی دا، لەکاتی بێهێزیو بەهێزی دا، بەڕاستی ئەوە دیاردەی موسوڵمانەتی نییە لەکاتی بەڵاو کارەسات دا خودا بناسێو ملکەچی بنوێنێو دوعاو پاڕانەوە ئەنجام بدەی، کە ناخۆشیو نەخۆشییەکە نەما کەیفخۆشی سەرمەستت بکاو خودات لەبیر بچێتەوە، بوغرابیو لەخۆت بایی ببێ. نابێ موسوڵمانان وەهابن لەکاتی بەڵاو کارەسات دا بکەونە پاڕانەوەو ملکەچی بۆخوداو هەر لەگەڵ ناخۆشیو بەڵایان لەسەر لاچوو لەخۆیان بایی بنو لەبەرامبەر فەرمانو ئەحکامی خودا دا بێ موبالاتو کەمتەرخەمو غافڵ بن، وەك لەوەپێش ئەوان نەبووبن پاڕابنەوە خودا بەڵایان لەسەر لابەرێ.

٢- ئەو فەرمودەی بوخاری ریوایەتی کردوە دەبێتە بەڵگەی ئەوە: کەخوێندنی قورئان بەشێوەی «تەڕەننومو تەغەننی» مەشروعەو ڕەوایە. «ڕاوی حەدیثەکە کە عەبدوڵلای کوڕی «المغفل»ە «تەرجیعی»

بەکارهێناوە لەجیاتی «تەڕەننوم» بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی خوێندنی قورئان بەشێوەی «تەڕەننوم = تەرجیع»، ئەمە ڕەئیی زانایانی شافیعی و حەنەفی و زوربەی فوقەهای مالیکی و کەسانی تریشە.

بێگومان فوقەهاو زانایان هەموویان، ئەو ریوایات و فتوایانەی لەزۆرێك لە هاوەڵان و لە تابعین ریوایەت کراون کەئەوە دەگەیەنن نەهیان کردوە لەخوێندنی قورئان بەدەنگی بەرزو شێوە گۆرانی، هەموو ئەو ریوایات و رەئیانەیان حەمل کردون بۆسەر شێوە خوێندنێکی گۆرانی ئاسای وەها: کە وشەو رستەکان وادەربڕێن: کە خوارو خێچ بن و مەخرەجی پیتەکان بگۆڕدرێن و لەشێوە عەرەبییە راستییەکەیان لابدرێن. ئەگینا خوێندنی قورئان بەدەنگی بەرزو شێوە ترەننوم و تەرجیع بەکۆڕای زانایان دروستە.

٣- بێگومان بەشێك لەپلانی حەکیمانەی پێغەمبەر ئەوەبوو فەرمانی بەهاوەڵانی کرد: کەلەچەند رێگاو شوێنێکەوە بچنە ناو مەککەو لەیەك رێگاو مەدخەلەوە نەچنە ژوورەوە، بۆئەوەی هەلی بەرگریکردن و شەڕکردن لەکیس دانیشتوانی مەککە بچێ و نەتوانن بەرگری بکەن، چونکە ئەگەر نیازێکی لەوجۆرەیان هەبێ دەبێ هێزەکەیان دابەش بکەن بەسەر چەند مەدخەل و رێگایەك دا، بەم دابەشبوون و پەرتەوازەبوونەیان ئەسبابی دیفاع و مقاوەمەیان لاواز دەبێ و ئەونیازەیان وەلادەنێن. پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەو پلانەی داناو پەیڕەوی کرد بۆخۆ پاراستن لەخوێنرێژی و شەڕ تا بۆی بلوێ. هەروا پارێزگاریی مەعنای «سلامەت و ئەمن» لە «بلد الحرام»دا، بۆئەم مەبەستە فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە شەڕ لەگەڵ کەس نەکەن مەگەر شەڕیان پێ بفرۆشرێ، ئەوەشی راگەیاند هەرکەسێ بچێتە ناو ماڵی خۆیەوەو دەرگای ماڵی پێوەداو دایخا ئەوە ئەمین بێ و کەس دەخڵی ناکا.

**پێنجەم: ئەو حوکمانەی تایبەتن بە حەرەمی مەککەوە:**

**ا- شەڕکردن تێیدا یاساغە:**

بێگومـان ئێمـە بینیمـان پێغەمبـەر ﷺ نـەهی کـرد لـەوەی هـاوەڵانی لەناو مەککەدا شەڕ لەگەڵ کەس بکەن، جگە لەشەش کەس کە خوێنیـان حەڵاڵ کرابوو لەهەر شوێنێك بەردەست بکەون بکوژرێن.

ئەوەشمان بینی، کە پێغەمبـەر ﷺ پێی نـاخۆش بـوو: کـە خالیـدی کوڕی وەلید شەڕی لەگەڵ هەندێ لەمەککەیەکان کرد، کاتێك لـەدوورەوە بریـسکەی شمـشێرەکانی بینـیو عـەرزیان کـرد شـەڕی پـێ فرۆشـراوەو ئەویش ناچار شەڕی کردوە فەرمووی: قەزاو قەدەری خودایە.

جگە لەوحاڵەتە هیچ حاڵەتی شەڕی تر لەناو مەککەدا رویان نەدا.

وەکـوو بینیمـان پێغەمبـەر ﷺ لـەو فەرموودەیـەی لـەناو وتارەکـەی رۆژی فـەتحی مەککـەدا دای، فـەرمووی: مەککـە خـودا رێـزی داوەتـێ و خەڵك ئەو پیرۆزیەیان نەداوەتێ. ڕەوانیە بۆ هیچ کەسێك بڕوای بەتاكو تەنهایی خوداو رابوونی رۆژی قیامەت هەبێ «لەوخاکـەدا خـوێن بڕێـژێ، درەختی ببڕێ ئەگەر یەکێك بڵێ شەڕکردن تێیدا ڕەوایە چونکە پێغەمبەر شەڕی تێداکردووە، وەڵامی بدەنەوە، بڵێن: خودا ساتەوەختێك ئیزنی بە پێغەمبەرەکـەی دا شـەڕی تێـدا بکـا، ئیزنـی بـەئێوە نـەداوە، سـەعاتێك رێگای پێغەمبـەر دراوەو دوایـی حـەرام بۆتـەوەو شـەڕکردن تێیـدا یاسـاغ کراوەتەوە وەکوو پێشوو.

ئـەمجار زانایـان کەوتوونـە توێژینـەوەو شـیکردنەوەی چـۆنیەتی تەطبیق کردنی ئەم فەرمانەو گونجاندنی لەگەڵ ئەو ئایەتە قورئانییانەی فـەرمان دەکـەن بەشـەڕکردن لەگـەڵ موشـریكو یـاخی بـوانو کوشـتنی هەرکەسێك تۆڵەی کوشتنی لەسەر بچەسپێ.

زانایان فەرموویانە بەنیسبەت شەڕكردن دژی موشریك‌و مولحید چ ئیشكالێك نایەتە پێشەوە، چونكە لەشەریعەتی ئیسلامی دا ئەوە چەسپاوە: كە دروست نییە ڕێگا بدرێ بەناموسوڵمان لەمەككەدا نیشتەجێ ببێ. هەركەسێك موسوڵمان نەبێ نابێ لەناو مەككەدا نیشتەجێ بێ ئەمەش بەكۆڕای زانایانی ئیسلام چەسپاوە، تەنانەت بەلای شافیعییەكانەوەو زۆرێك لەموجتەهیدەكانی تر چونە ژوورەوەش بۆ ناموسوڵمان یاساغە. ئەمەش بەنەصصی ئایەتی {إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلاَ يَقْرَبُواْ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذا وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ إِن شَاء إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ} «سورة التوبة،٢٨». پێویستە لەسەرئەوانەی لەناو مەككەدان شەڕ لەگەڵ موشریك‌و مولحیدەكان بكەن‌و نەهێڵن بگەنە سنووری مەككەو بچنە ناوی. وێڕای ئەوە خودا بۆخۆی بووەتە كەفیل‌و بەرعودەی پاراستنی حەرەمی خۆی‌و ناهێڵێ خاكی پیرۆزی مەككە بەتێدانیشتەجێ بوونی كافرو موشریك پیس ببێ. ئەمەش دیاردەیەكە لەدیاردەكانی ئیعجازی ئەم ئایینەو لەڕاستی ئەو وادەیەی خودا لەقورئان دا داویەتی‌و پێغەمبەر فەرموویەتی، خۆی دەنوێنێ.

بەنیسبەت یاخی بوانیشەوە، ئەوانەی ئیعلانی یاخی بوونی خۆیان لەئیمام‌و فەرمانڕەوای صالح‌و راستاڵ رادەگەیەنن، ئەوە جەماوەری زانایان‌و فوقەهای ئیسلام پێیان وایە ئەگەر نەدەكرا بەرێگاچارەی تر جگە لەشەڕ لەیاخی بوونەكە یان پاشگەز ببنەوە، ئەوە شەڕیان دژ دەكرێ، چونكە شەڕكردن لەگەڵ یاخی بوان بەشێكە لە «حقوق»ی خوداو نابێ پێشێل بكرێ، پاراستنی مافی خودا لەبەستی «حەرەم»دا لەپێشترە لەبەزایەچوونی‌و گوێ پێنەدانی، ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ ئەم فتواو راو بۆچوونەی لەجەماوەری فوقەهاوە نەقڵ كراوەو رایەكی

پەسەندو حەقە. ئیمامی شافیعی لەکتێبی «اختلاف الحدیث»دا ئەم فتوایەی چەسپاندوە.

ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: وەڵامی ئەو حەدیثانە دەدرێتەوە کە بەظاهیرو رواڵەتی ئەوە دەگەیەنن شەڕ لەحەرەم دا بەهەموو جۆرێك حەرامو یاساغ بێ و تەنانەت لەگەڵ یاخی بوانیش نابێ شەڕ لەئەو شوێنە پیرۆزەدا بکرێ! وەڵامەکە ئەوەیە دەڵێین مەبەست بەشەڕێك کەلەحەرەم دا مەمنوع بێ ئەوە شەڕەیە هێرشیان بکرێتە سەرو بەچەکی دوور هاوێژی وەکوو مەنجەنیق و شتی وا لێیان بدرێ و گشتگیری تێدابێ لەهەمان کاتیشدا بتواندرێ بەرێگاچارەی تر موشکیلەی یاخی بووەکان چارەسەربکرێ. وەلێ ئەگەر کافرو مولحید لەشارێکی تردا خۆیان قایم کرد ئەوە بێ شك شەڕکردن دژ یان دروستەو بەهەموو شێوەیەك لێیان دەدرێ.

هەندێ لەفوقەها بۆئەوە چون کەشەڕ دژی یاخی بوان لەناو حەرەم دا یاساغەو حەرامە. بەڵکوو لەهەموو لایەکەوە گەمارۆ دەدرێن تاناچار دەکرێن بۆئەوەی لەحەرەم دەرچن یان خۆیان تەسلیم دەکەن و تۆبەی خۆیان لەو یاخی بوونە رادەگەیەنن«[1]».

ئەمما جێ بەجێکردنی «حەد» لەبەستی حەرەم دا ئەوە راجیایی تێدایە. ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی پێیان وایە «ئیقامەی حدود» تۆڵەی تاوان لەحەرەمی مەککەدا تەنفیز دەکرێ، ئاماژە بەئەو حەدیثەی بوخاری ریوایەتی کردوە، کە دەڵێ پێغەمبەر فەرموویەتی: {إن الحرم لایعیذ عاصیاً ولا فاراً بدم ولا فاراً بخربة} بێگومان حەرەم پەنا نادا بەیاخی بوو هەروا بەبکوژی هەڵاتو بەکەسێکیش شتێك برفێنێ بۆ ئەوەی

---

[1] ١- بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر موسلیم ج٩م١٢٤-١٢٥ هەروا الإحکام السلطانیة لوردی ١٦٦.

لەحەرەم دا دەستی بەسەرا بگرێو هەر بۆ خۆی بەکاری بێنێو شەریعەت ڕێگای پێ نەدا.

ئیمامی ئەبوحەنیفە لەریواتێکیش دا ئیمام ئەحمەد پێیان وایە تاوانبار تا لە حەرەم دا بێ حەدی لێ نادرێو تۆڵەی لێ ناسەندرێ، بەڵام گەمارۆ دەدرێو تەنگی پێ هەڵدەچندرێو ناچار دەکرێ حەرەم جێ بێڵێ کەلەحەرەم چووە دەر، ئەوکاتە تۆڵەی لێ دەسەندرێ. تۆڵەکە قیصاص بێ یان حەدی تربێ. بەڵگەی ئەمان عومومی فەرموودەکەی پێغەمبەرە: کە لەڕۆژی فەتح دا ئاڕاستەی ئامادەبوانی کرد.

ئیمامی زەرکەشی دەفەرموێ: تایبەتمەندی حەرەمی مەککە ئەوەیە ئەگەر کافرو یاخی بوو لەغەیری مەککەدا چونە سەنگەرو قەڵاوە، خۆیان قایم کرد دروستە بۆ موسوڵمانان هێرشیان بکەنە سەرو بەچەکی قورسو چەکی سوك لێیان بدەنو بەرژەوەندی چۆن دەخوازێ، ئاوا هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بکرێ. بەڵام ئەگەر ئەم یاخی بوونو سەنگەر گرتنە یان لەناو بەستی حەرەم دا بوو نابێ بەو شێوە گشتگیرییە شەڕیان لەگەڵ دا بکرێ، دەڵێم: ئەمە وێڕای ئەوەی کە خودا پەیمانی داوەو فەرمانی کردوە کە ئەم حەرەمە تەنیا جێگای مانەوەو ئارام تێداگرتنی موسوڵمانانەو جێگای کەسی تر نییە. جا ئەگەر واقیعەکە ئاوابێ، هۆکاری شەڕکردن تێیدا لەکوێ دەبێ؟ مەگەر بڵێین شەڕ بۆ ئیقامەی حدود یان رەتکردنەوەی دەستدرێژیو پەلاماری ناڕەوا. ئەویش لەوەپێش باسی ئەحکامە کانیان کرا.

## ٢- ڕاوکردن تێیدا حەرامە:

ئەمە بەکۆڕای زانایانی ئیسلام چەسپاوە ئاماژە بەو فەرمودەیەی کە موتەفەقی بوخاریو موسلیمەو تێیدا هاتووە: «لایعضد شوکه ولاینفر

صیده» نەدرەخت و روەکی دەبڕدرێ نە نێچیری دەرەتێندرێ. جا ئەگەر رەتاندنی ئاژەڵ و پەلەوەر تێیدا یاساغ بێ، فەوتاندنی دیارە حەرامترە. هەرکەسێ لەحەرەم دا نێچیری گرت پێویستە لەسەری بەرەڵڵای بکا، ئەگەر نێچیرەکە لەدەستی دا فەوتا دەبێ قەرەبوو بدا «کەفارەتی تاوانەکەی بدا» لەکۆی گیانلەبەرانی ناو حەرەم پێنج جۆر حەیوانات چەرتکراون و کوشتنیان دروستە پێغەمبەر لەو حوکمە وەدەری ناون و ناوی ناون «الفواسِق» ئەمانەش قەلە رەشەو کوڵارەو دوپشك و مشك و سەگی هار. زانایانی شەریعەت هەر گیاندارێکی زێنە خرۆ بێ قیاسیان دەکەنە سەر ئەو پێنج گیاندارە زێنە خرۆیانەو کوشتنیان بەحەلاڵ دەزانن.

### ٣- حەرامە گژوگیای حەرەم ببڕدرێ:

بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەرە، کە دەفەرموێ «لا یعضد شوکه» قاعیدەکە ئەوەیە بڕینی هەموو روەکێکی خۆرسك بێ و کەس نەیڕواندبێ تا تەڕایی تێدابێ بڕینی حەرامە. وەلێ ئەوەی ئادەمیزاد دەیڕوێنن حەرام نییە ببڕدرێ، وەکوو سەربڕینی ئاژەڵی تێدا حەرام نیە. هەروا حەرام نیە بڕینی هەر روەك و درەختێك کە وشك بووبێ.

ئیمامی زەرکەشی لەئەبوحەنیفەو ئیمام ئەحمەدەوە ریوایەت دەکا: کە لەوەڕاندنی ولاخ لەحەرەم دا مەمنووعە. واتە نابێ حەیواناتی تێدا بلەوەڕێندرێ«١».

جەماوەری زانایانی ئیسلام هەندێ روەکیان چەرت کردون ئەگەر زیانبەخشبن، ئەمەش بەقیاس بۆسەر «الفواسق الخمسة» پێنج ئاژەڵە

---

١ بڕوانە اعلام الساجد للزرکشي/١٥٧.

زێنــە خرۆکــان. کــە پێغەمبــەر ﷺ چــەرتی کــردن. ئەمــە لــەجۆری تەخصیصی نەص بەقیاسە«١».

**٤- پێویستە بە ئیحرام بەستویی بچیە ناو مەککەوە:**

کەســێك ویــستی بــچێتە نــاو مەککــە یــان بــچێتە شــوێنێکی نــاو حەرەمەوە «وەکوو ئەوەوی دەڵێ» لەوکەسانەش نەبوو کە زو زو دەبوایە بچێتە ناو مەککە، وەکوو بازرگانو درافرۆش ئەوکەسانەی لەوجۆرەن کە بەحوکمی ئیشەکەیان زۆر دەچنە ناو حەرەمو دێنە دەرەوە. ئەوە دەبێ بۆچوونە ناو حەرەم ئیحرام ببەستێ یان بەحەج یان عومرە.

زانایــانی ئیــسلام راجیاییــان هەیــە لــەوەدا ئــاخۆ فــەرمانی بــەئیحرام چوونە ژوورەوە بۆناو حەرەم بۆ وجوبە یان بۆ ئـەدەبو سوننەتە؟ ئەوەی مەشهوورە لـەلای ئیمـام مالیكو ئـەبو حەنیفـەو ئیمام ئەحمـەدو لـەئیبنو عەباسیش ریوایەتکراوەو لە حەنەفییـەکان فتـوای پـێ دراوە ئەوەیـە: کـە فەرمانەکە بۆ وجوبە. جەماوەری فوقەهای شافیعی پێیان وایە فەرمانەکە بۆ ئەدبو سوننەتە.

هۆی راجیاییەکە ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك رۆژی فەتحی مەککە داخڵـی مەککـە بـوو، ئیحرامـی نەبەسـتبوو، بـەگوێرەی ئـەو حـەدیثـەی موسلیمو هی تریش ریوایەتیان کردووە: کەپێغەمبەر رۆژی فـەتح چـووە ناو مەککەوە مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو ئیحرامی نەبەستبوو.

ئەوانـەی دەڵـێن: ئیحـرام بەسـتن بۆچـونە نـاو مەککـە سـوننەتە ئـەو حـەدیثـەیـان کـردوە بەبەڵگـە ئەوانـەیش دەڵـێن: ئیحـرام بەسـتن واجبـە دەڵـێن: پێغەمبـەر بەترسـەوە چـووە نـاو مەککـەو ترسـی ئـەوەی هـەبوو

---

١ بروانە ضوابط المصلحة في الشريعة الإصلاحية/ص٢٠٠.

توشی شەڕببێ لەگەڵ کافرەکانی قوڕەیش‌و ئامادەباشی هەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەرکەسێك شەڕی لەگەڵ بکا، ئەمەش حاڵەتێکە لەحالاّتی وجوب چەرت دەکرێ.

**٥- حەرامە ڕێگەبدرێ ناموسوڵمان لەمەککەدا نیشتەجێ بێ:**

لەوەپێش ئەم حوکمەمان ڕون کردەوەو بەڵگەکەیشمان هێنایەوە، نامەوێ دوبارەی بکەمەوە.

**شەشەم: ورد بوونەوە لەوکردەوانەی پێغەمبەر لەلای کەعبەی پیرۆز ئەنجامی دان:**

**١- نوێژکردن لەناو کەعبەدا:**

لەوەپێش ئەو ڕیوایەتەی بوخاری لەئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەتی کردبوو، باسمان کرد، کە تێیدا هاتبوو «پێغەمبەر نەچووە ناو کەعبەوە تا بتەکانیان لێ دەرهێنان، دوو وێنەی حەزرەتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی تێدا بوون دەریان هێنان، لەوێنەکەدا ئیبراهیم‌و ئیسماعیل «أزلام»یان بەدەستەوە بوو. پاش ئەوەی ناوکەعبە لەبتەکان پاك کرایەوە ئەمجار تەشریفی چووە ناو ماڵی کەعبەوە، بە ناویدا گەڕاو «الله أكبر»ی کردو نوێژی تێدا نەکرد. ئیمامی موسلیم لەئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردوە، کە پێغەمبەر چووە ناو کەعبەوە لەگەڵ ئوسامەو بیلال‌و عوسمانی کوڕی طەلحەی «الحجبي»، دەرگاکەی لەسەر پێوەدا، پاشان ماوەیەك تێیدا مایەوە. ئیبنو عومەر دەڵێ: کاتێك بیلال هاتەدەر پرسیارم لێ کرد، ئاخۆ پێغەمبەر لەناو کەعبەدا چی کرد؟ لەوەڵام دا وتی: دوو کۆڵەکەی خستنە لای چەپی‌و کۆڵەکەیەك لای ڕاستی‌و سێ کۆڵەکەشی خستنە دواخۆیەوە «ئەو ڕۆژە کەعبە لەسەر شەش کۆڵەکە دامەزرابوو» پاشان

نوێــژی کــرد. بوخــاریش ریوایــەتێکی لەوشــێوەی لــەئیبنو عومــەرەوە ریوایەت کردوە.

فوقەهای ئیسلام فەرموویانە: هیچ دژایەتییەك لەنێوان حەدیثەکان دا نییە، چونکە ئیبنو عەبباس کە ڕاوی ئەو حەدیثەیە کە نوێژی نەکردوە، ئەوکاتە لەناو حەرەم دا لەگەڵ پێغەمبەر نەبووە، ئەو حەدیثەکە «وەکوو ئیبنو حەجەر دەڵێ» جارێك ئیسناد دەدا بۆلای ئوسامەو جارێك بۆلای «الفضل»ی برای، وێڕای ئەوەش «الفضل» لەناو کەعبەدا لەگەڵیان نەبوە، بەڵام بیلال کە نەقڵی ئەو حەدیثەی کردوە: کە ئیثباتی نوێژکردنەکەی تێدایە، ئەو لەخزمەت پێغەمبەر دا بووە. کەوابوو دەبێ حەدیثی ئیبنو عومەر کەلەبیلالەوە ریوایەتی دەکا پێشی بخەین لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: ئەو «مثبت»ەو زێدەزانیاری لەگەڵ دایە، هەموو کاتێکیش ئەوەی «مثبت»بێ پێش ئەوە دەکەوێ کە «نافی»یە.

دووەم: ریوایەتی بیلال هەڵقوڵاوی بینین و موشاهەدە بووە، چونکە خۆی لەتەك پێغەمبەردا بووە لەناو کەعبەدا، بەڵام ریوایەتی ئیبنو عەبباس وەکوو زانیمان پشتی بەستووە بەنەقڵ و گێڕانەوە نەك دیتن و موشاهەدە. ئەوەتا ئیبنو عەبباس جارێك حەدیثەکە لەئوسامەوە نەقڵ دەکاو جارێکی دی لە «الفضل»ی برایەوە دەیگێڕێتەوە، وێڕای ئەوەش «الفضل» لەگەڵ پێغەمبەر نەبووە.

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: زانایانی عیلمی حەدیث لەسەر ئەوە کۆکن کە ریوایەتی بیلال وەردەگیرێ. چونکە ریوایەتی ئیثباتی کردنی نوێژەکە دەکاو زێدەزانیاری لەگەڵ دایە پێویستە تەرجیح بدرێ«١».

---

١ بڕوانە: فتح الباري ٣م٣٠٤ وشرح مسلم للنووي: .م٨٢.

ئیمامی شافیعی و ئەبوحەنیفەو ئەحمەدو جەماوەری زانایان پێیان وایە نوێژکردن لەداخڵی کەعبەدا دروستە ئەگەر روبکاتە دیوارێك لەدیوارەکانی. جا نوێژەکە فەرزبێ یان سوننەت بێ فەرقی نیە. مالیك دەفەرموێ نوێژی سوننەتی موطڵەق دروستە تێیدا بەڵام نوێژی فەرزو نوێژی سوننەتی رەواتیب نا"[١].

## حوکمی وێنەو پەیکەرو هەڵگرتنیان:

ئەتۆ لەوەپێش ئاگاداری حەدیثەکەی بوخاری بووی، زانیت پێغەمبەر ﷺ نەچووە ناو کەعبەوە هەتا پاککرایەوە لەهەرچی تێدابوو لەبت و صەنەم و وێنە. ئەبوداودیش لەجابیرەوە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر فەرمانی بە عومەری کوڕی خەطاب کرد، ئەوکاتە عومەر لە «البطحاء» بوو فەرمانی پێکرد بچێتە ناو کەعبەوە چی وێنەی تێدایە هەمووی بکوژێنێتەوە، پێغەمبەر نەچووە ناو کەعبە تا هەموو وێنەکان سڕدرانەوە. بوخاریش لە «کتاب الحج»دا لە ئوسامەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر چووە ناو کەعبەوە وێنەی حەزرەتی ئیبراهیمی تێدا بینی، داوای ئاوی کرد بەئاوەکە کوژاندیەوە.

ئەم حەدیثانە تێکرا ئەوە دەگەیەنن: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد ئەو وێنە کێشراوەی سەر دیواری کەعبە بکوژێندرێنەوە، سڕێندرانەوە، وەکوو چۆن فەرمانی کرد هەموو پەیکەرە بت و صەنەمەکان لەکابە وەدەرنرێن و توڕدرانە دەر. وادیارە پێغەمبەر کاتێك چووە ژوورەوە هەندێ شوێنەوارو ئاثاری ئەو وێنە کێشراوانەی سەر دیوارەکانی بینی،

---

١ بڕوانە: النووي على المسلم وطرح التثريب للحافظ العراقي. ٥م١٧٥.

داوای کرد، ئاویان بۆهێنا بەزەخت پاشماوەی وێنەکانی سڕینەوەو کڕاندنی.

ئەمە بۆخۆی بەئاشکرا حوکمو بڕیاری ئیسلام دەگەیەنێ دەربارەی وێنەگرتنو پەیکەرتاشینو وێنەی موجەسەمو ناموجەسەم. با ئێستا دەقی فتوای ئیمامی نەوەوی کەلەشەرحی موسلیم دا نوسیویەتی راگوێزی ئێرەی بکەین. دەڵێ: هاوەڵانمان لەفوقەهای شافیعی فەرموویانە: رەسمکردنی حەیوانات حەرامە، «زۆر حەرامە» لەتاوانە گەورەکانە، چونکە هەڕەشەی لەسەر کراوە، لەفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی توندو تیژ لەوانەکراوە: کەئەوکارە دەکەن، جارەسمکردنەکە بۆ شێواندنو سوکایەتی پێ کردنی بێ یان بەمەبەستی تر بێ.

بەهەموو شێوەیەك ڕەسمکردنو پەیکەر تاشین حەرامە چونکە لاسایی کردنەوەی خودای تێدایە بۆخەڵق کردن، ئەمجار وێنە دروستکردنەکە لەسەر قوماش یان بەڕەو فەڕشو راخەر بێ، یان لەسەر دینارو دیرهەمو فلس بێ یان لەسەر دیوارو قاپو مەنجەڵو شتی وابێ.

وەلێ رەسمکردنی دارو درەختو بارو بارگنەی حوشترو شتی تر: کەوێنەی گیانلەبەری تێدا نەبن، ئەوە حەرام نییە. ئەمە حوکمو بڕیاری شەرعە دەربارەی رەسمکردنو وێنەکێشان. بەڵام حوکمی کڕینو هەڵگرتنی کاڵایەك کەوێنەی حەیوانی تێدا کێشرابێ ئەوە ئەگەر بەدیواردا هەڵواسرابوو یان قوماش بوو لەبەر بکرێ، یان مێزەر بوو یان هەرشتێکی تر کە بەڕواڵەت نیشانەی سوکایەتی پێکردنیان نەبوو، ئەوە حەرامە. ئەگەر لەسەر راخەرو شتی وا بوو پێی لێ دەندرا یان کرابوو بەبەرگی سەرینو شتی واو بەڕواڵەت سوکایەتی پێکردنیانی تێدا بوو ئەوە حەرام نیە. ماوەتەوە بزانین ئاخۆ وێنەو ڕەسمێکی لەو جۆرە دەبنە

هۆی ئەوەی فریشتەی رەحمەت رولەو ماڵە نەکەن کە ئەوجۆرە وێنانەی تێدابن؟ ئەوە باسێکی ترە خودا یاربێ لەمەوداو رونی دەکەینەوە.

هیچ جوداوازیی نییە لەنێوان رەسمێك سێبەری هەبێ و رەسمێك سێبەری نەبێ. ئەمجار نەوەوی کۆتایی بەڕای خۆی دێنێ و دەفەرموێ: ئەمە پوختەی مەزهەبی ئێمەیە لەم مەسەلەیەدا. هەربەم مانایە جەماوەری فوقەهای صەحابەو تابیعین و زانایانی دوا ئەوان فتوایان داوە، هەروا مەزهەبی ئیمام مالیك و «الثوری» و ئەبو حەنیفەو هی تریشە. هەندێ لەزانایانی ئیسلام فەرموویانە: ئەوەی نەهی لێ کراوە لەڕەسم رەسمێکە قەبارەو سێبەری هەبێ، بەڵام رەسمێك قەبارەو سێبەری نەبێ هیچ خراپیەکی تێدانیە. ئەمە ڕایەکی بەتاڵەو هیچ بنەمایەکی ئاییینی نیە. چونکە ئەو پەردەیەی پێغەمبەر لەوێنەکانی ناڕازی بوو کە لەسەری نەخشێندرابوون وێنەکانی سێبەریان نەبوو کەچی بەدیتنیان ناڕازی بوو روخساری گۆڕاو پێناخۆشبونی خۆی دەربڕی[١].

پاشان نەوەوی فەرموویەتی: زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوەی وێنە ئەگەر سێبەری هەبێ حەرامەو واجبە مەنع بکرێ. مەگەر وێنەو پەیکەرێك منداڵ یاری پێ دەکەن. وەکوو بوکی بچکۆلەی کچۆڵەی بچوك یاری پێ دەکا، لەوەدا روخصەت دراوە[٢].

دەڵێم: ئەمڕۆ خەڵك ئیشکالی وێنەی فوتۆغرافیان بۆ پەیدابووە. کەوتوونە پرسیاری ئەوەوە ئاخۆ وێنەی فۆتۆغرافی حوکمی ئەو وێنەو

---

١ دەقی فەرموودەکە ئیمامی موسلیم لەخاتوو عائیشە ریوایەتی کردوە دەڵێ: دخل عليَ رسول الله وأنا متسترة بقرام فيه صور .واتە پەردەی تەنکم هەبوون پەردەکان وێنەیان لەسەر نەخش کرابوو. فتلون وجهه ثم تناول الستر فهتكه ثم قال: ان من أشد الناس عذاباً يوم القيامة الذين يشبهون بخلق الله.

٢ النووي على صحيح مسلم ٨١/١٤.

ڕەسمانەی هەیە کە شەریعەت مەنعی کردون؟ یان حوکمێکی تری هەیە. هەندێ لەزانایان وا لەعیلەت و بایسی ئەو وێنەو ڕەسمانەی نەوەوی باسی کردون و لەوەپێش ئاماژەمان بۆکرد، تێگەیشتون کەوێنەی فۆتۆغرافی حوکمەکەی وەکوو حوکمی وێنەکێشانی دەست نیە، چونکە کاری فۆتۆغرافی، پێویستی بەکارامایی و دەستڕەنگینی نیە تا نیازی ئەوەی تێدابێ بلێی لاسایی خەڵقکردنی خودا دەکاتەوە، وێنە گرتنی فۆتۆغرافی پێویستیەکی کەمی بەجولاندنی ئامێری وێنە گرتنەکە هەیەو بەس، ئیتر بەهۆی هەندێ ترشەلۆکی تایبەتییەوە، سێبەری وێنەکە دەگیرێ. تەنانەت منداڵیش دەتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدا. ئەوەی کە حەقیقەت و راستە ئەوەیە ڕەوانیە خۆمانماندو بکەین بۆ جوداوازیی نێوان جۆری وێنەکان پێویستە لەوبارەوە ئیحتیات بکەین، دەقی حەدیثەکەش بەڕەهایی هاتووەو دەبێ وەرع بکرێ و خۆلەفتوادانی خێرا بپارێزین. رۆچون و توێژینەوە دەربارەی حوکمی شەرعی لەو بوارەدا پێویستی بەباس و لێکۆڵینەوەی درێژو قوڵ هەیە.

ئەمە دەربارەی وێنەکێشان و ڕەسم کردن و وێنەگرتن، ئەگینا بۆ کڕین و هەڵگرتن و هەڵواسین ئەوە جوداوازیی لەنێوان وێنەی فۆتۆغرافی و جۆری تری دا نیە، خوداش بۆخۆی باشتری لێ دەزانێ.

وەلێ هەرچۆنێك بێ، جۆری وێنەکە کاریگەری خۆی هەیە لەسەر حوکمەکە چ بۆ وێنەگرتن یان بۆ هەڵگرتن، ئەگەر شتە وێنە گیراوەکە لەوشتانە بوو تەماشا کردنی حەرام بوو، وەکوو وێنەی ئافرەت و شتی وا، ئەوە بەبێ شك حەرامە. ئەگەر وێنە گرتنەکە بۆ بەرژەوەندی و پێویستی بوو ئەوە روخصەتی تێدایە. «والله أعلم».

ئەمجار هەندێ کەس ئەمڕۆ بەلایانەوە سەیرە کەوێنەکێشان و پەیکەر تاشی لەئایینی ئیسلام دا حەرام بن، لەکاتێك دا دووپایەی سەرەکی و گەورەی هونەرن لەلای گەلەپێشکەوتووەکانی سەردەم!!

نهێنی سەرسوڕمانەکە لای ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە ئەوانە واگومان دەبەن و پێیان وایە ئیسلام هاوڕایە لەگەڵ ژیاری خۆرئاوای ئەمڕۆ، لەهەندێ جوزئیات دا جوداوازی هەیە، بۆیە توشی سەرسوڕمان دەبن، دەکەونە ناو تەناقوضەوە لەکاتێك دا ئایینی ئیسلام کەئەم دیاردەو مەظاهیرەی قبوڵ نییەو بەحەرامی دەزانێ، هۆکارەکەی ئەوەیە ئیسلام مونطەلەقێکی حەضاری تری هەیەو سەربەخۆیەو بەهیچ کلۆجێك لەگەڵ «منطلقات»ی ئەو ژیاری خۆرئاواییە یەکدگیر نابێ کە لەڕێگای موحاکەمەی عەقڵی صاف و بێ گەردەوە وەرمان گرتووە ئەوان بەڵگە دەهێننەوەو دەیانەوێ ڕەوایی ئەو جۆرە فەننە بەسەر ئیسلام دا فەرزبکەن، بڵێن: مادام کارەکە فەننە، نابێ ئیسلام مەنعی بکا! بەڵام ئەوانە نازانن، یان خۆیان نەزان دەکەن، کەبۆچەمکی فەن لەحوکمی ئیسلامی مەعنایەکی تر هەیە جیاوازە لەم مەعنایەی ئێمە لەفەلسەفەو ژیارێکەوە پێمان گەیشتووە هیچ پەیوەندی بەعەقیدەی ئێمەوە نییە.

## ٢- مجەوەری و حیجابەی کەعبە:

بەگوێرەی ئەو حەدیث و ماجەرایەی باسمان کرد دەربارەی ئەوەی پێغەمبەر کلیلەکانی کەعبەی تەسلیم بەعوسمانی کوڕی طەلحە کردەوەو پێی فەرموو بۆ هەتاهەتایی کلیلەکان وەربگرەوەو ئەو ئەرك و وەظیفەیە هی ئێوەیە «مەبەستی بنەماڵەی «عبدالدار» و بنەماڵەی شەیبەیە» ستەمکار نەبێ کەسی تر لێتان وەرناگرێتەوە. لەسەر ئەم بناغەیە زوربەی زانایانی ئیسلام فەرموویانە دروست نییە بۆهیچ کەس کە حیجابەو مجەورێتی کەعبە لەوبنەماڵەیە داگیر بکا تا ڕۆژی قیامەت. نەوەوی نەقڵ لەقاضی عەیاضەوە دەکاو دەفەرموێ: ئەوە دامەزراندن و خستنە ئەستۆی ئەو ئەرکەیە بۆ ئەو بنەماڵەیەو ڕاستەوخۆ لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەو ئەرك و سەروەرییەیان پێدراوە، بەردەوام ئەوکارە نەوە

دوا ئەوە لەئەستۆی ئەوان دایە بۆ هەتا هەتایە، کەس بۆی نییە لێیان بستێنێتەوە یان ببێ بەهاوبەشیان مادام ئەوان هەبن و گونجاو بن بۆ ئەوکارە! دەڵێم ئەو وەظیفە تا ئەمڕۆ لەدەست ئەوان دایە بەگوێرەی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەوان پێی هەڵدەستن و ئەنجامی دەدەن.

### ٣- شکاندنی بت و صەنەم:

بێگومان دیمەنێکی شکۆدارو سەرنج ڕاکێشە ئەو یارمەتی و سەرکەوتنەی خودا بەپێغەمبەری خۆی بەخشی، کە پێغەمبەر ﷺ بێ ترس، بەڕاشکاوی بەبەرچاوی قوڕەیشییەکانەوە بەعەصایەك یەکە یەکە لەوبتانەیەوە دەژنی کە بەدەوری کەعبەدا ڕیزکرابون، بەسوکایەتی پێکردنەوە بە نوکی عەصاکەی لێی دەدان و دەیفەرموو: {جاء الحق وزهق الباطل جاء الحق ومايبدئ الباطل ومايعيد} حەق هات و بەتاڵ پوچایەوە ڕۆیی بەسەرچوو، حەق هات بەتاڵ سەرهەڵدانەوەو گەڕانەوەی نیەو نابێ.

ئیبنو ئیسحاق و هی تریش ریوایەتیان کردوە دەڵێن هەموو بتێك بە قورقوشم لای خواروی بەشوێنەکەوە چەسپێندرابوو بۆئەوەی نەکەوێ و ثابیت بێ. بەڵام کە پێغەمبەر بەعەصاکەی تێوەی دەژەنی بەرەو دەم یان بەسەر پاش دا تڕێڵ دەبوو دەبوە پارچە پارچە. چۆن وایان لێ نایەو بە تێوەژەنینی پێغەمبەر ناشکێن و ناکەونە خوار؟! ئەوە خودا زەبرو زەنگ و جەبەروت و سەر ڕەقی قوڕیشی وەرگەڕاندوە بەملکەچی و زەلیلی و بێدەسەڵاتی، هەموو مەککەو دانیشتوانەکەی والێ کردوە بەپیر ئایینی تازەوە بێن ملکەچی ئەو حەق و ڕاستیە بن کە ئەو دینە هێناویەتی و بانگەوازیی بۆدەکا.

**حەوتەم: تێفکرین و ورد بوونەوە لەوتاری پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) لەرۆژی فەتح دا:**

ئێستا ... ئەوەتا مەککە، ئەو شارەی پێش هەشت ساڵ پێغەمبەر بەناچاریی جێی هێشت، ئەوەتا لەژێر دەستی ئەودایە، دانیشتوانی هەموو ملکەچ و بڕوا هاوەر بە پەیام و هیدایەتی. ئەوەتا هەموو ئەو قورەیشییە سەر ڕەقانەی لەوەپێش و زۆر لەمێژ دوژمنایەتیان کردبوو، جۆرەها سزاو نارەحەتییان پێ چەشتبوو ئەنواعی درۆو دەلەسەو بوختانیان بۆ هەڵبەستبوو، ئێستا وا لەدەوری پێغەمبەر بەملکەچی و بێدەنگی بەخوشوع و خضوعەوە گوێچکەیان کلۆرو سەریان نزم کردوە چاوەڕوانن پێغەمبەر ئەمڕۆ چیان پێ دەڵێ و چ بڕیارێك دەربارەیان دەردەکا؟!

بێگومان پێش هەموو شتێك پێغەمبەر دەبێ شوکرو سوپاسی خودا بکا، کەیارمەتی داوەو سەری خستووەو وادەی خۆی بۆ بەندەی بەجێ هێناوە. بۆیە بەم جۆرە دەستی کرد بەوتارە مێژوییەکەی و فەرمووی: {لا إله إلا الله وحده لا شريك له صدق وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده} ئەمجار پێویستە لەبەردەم قورەیش و هەموو خەڵکی دا، ئەوە ڕابگەیەنێ کۆمەڵگەی ئیسلامی چییەو ئارم و شیکاری دیاری بکا، کەبەڕونی و ئاشکرا لەئایەتی {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} «سورة الحجرات، ١٣». ڕەنگ دەداتەوە. ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێیەك دروست کردوە، کردومانن بەچەند نەتەوەو هۆزو قەبیلە، بۆئەوەی یەکتر بناسن و هاریکاریی یەکتر بکەن، کێتان تەقواو خودا پەرستی زۆرترو باشترو دڵسۆزانەتر بێ ئەوە بەڕێزترتانە.

کەوا بوو پاشماوەی بابەتی خۆهەڵنانەوەو بەخۆشایی بون و دیاردەی ڕێزلێنانی سەردەمی نەزانی بخرێتە ژێرخاکی پێی

موسوڵمانانەوە، ئەو داب و نەریت و مەئاثیرە کۆن و رزیوو بۆگەنانە ژێر خاك بکرێن، شانازی کردن بەباوك و باپیرو خۆهەڵنانەوە بەنەتەوەو هۆزو عەشیرەت لەبیر بچنەوە، لەخۆبایی بون و رێزداری بەبۆنەی شێوەو زمان و نەژادەوە بخرێتە زبڵدانی مێژووەوە. ئادەمیزاد هەموویان لەئادەم کەوتوونەوەو ئادەمیش لەگڵ دروستکراوە.

بێگومان لەم ساتەوەختەوە سەردەمی نەزانی و دەمارگیری بەسەر چوو پێچراوەتەوە، بالەگەڵی دا هەموو داب و نەریتێکی نەزانی بەسەربچێ و قەڵاچۆ بکرێ، بابخرێتە رابردووی لەبیرکراوو بەسەر چوو، با قورەیش چڵك و دژوێنی رابردوی لەخۆی بکاتەوەو خۆی بشواو بکەوێتە گەڵ کاروانی ئیسلام و لەگەڵی دا رەوبکا.. چونکە کاری گرنگ لەپێشەو زۆری پێ ناچێ وادەی ڕوبەڕوبوونەویەو مەوعید لەوێیە... لەلای تاقی کیسڕاو ناوجەرگەی وڵاتی رۆم و فتوحاتی گەورەو رزگار کەری نەتەوە چەوساوەکان و روخێنەری زلهێزەکان. لەم رۆژە بەولاوە مەککە دەبێتە شوێنی لێ هەڵاتنی ژیارو شارەستانیەتی تازەو هەموو جیهان لەگەڵی دا خشڵی بەختەوەری و مرۆڤایەتی سەرتاسەری لەبەر دەکا. بەڵێ لەم ساتەوەختەوە بەکردەوە هەموو مەئاثیری سەردەمی نەزانی خرایە ژێر قاچەوەو زیندە بەچاڵ کرا.

قورەیش تێکڕا بەیعەتیان بە پێغەمبەر کرد لەسەر ئیسلام، لەسەر یاسای «لافضل لعربي على عجمي إلا بالتقوى» هیچ عەرەبێك فەضل و رێزی بەسەر کابرایەکی نا عەرەب دا نیە مەگەر بەهۆی تەقواو خوداپەرستی. رێزو گەورەیی نیە مەگەر بەخشڵی ئیسلام، خۆهەڵنانەوە نیە مەگەر لەرێگەی پابەندبوون بەیاساو نیظامی ئیسلام. لەسەر ئەم بنەمایانەو پابەندبوون پێیانەوە خودا جڵەوی فەرمانڕەوایی جیهانی بە موسوڵمانان بەخشی، هەموو جیهانیان بۆ گەردنکەچ بوو، سەربەرزی و بەختەوەری سەرنجڕاکێشیان بۆدەستەبەر بوو!!

ئەمجار دوای ئەم سەروەرییە ئەتۆ پێویستە سەرت سوڕبمێنێ لە لاکە بۆگەنێك کەئەمڕۆ دوای تێپەڕبوونی زیاد لەچوارده سەده بەسەر لەگۆڕنانی دا دەری دێننەوەو بانگەشەی بۆدەکرێ ئەو بۆگەنە بون بکەین!!

**هەشتەم: بەیعەت کردن لەگەڵ ئافرەتان داو ئەو حوکمانەی پەیوەندن بەوجۆرە بەیعەتەوە:**

لێرەدا دەتوانین ئامارژە بۆ هەندێ حوکم بکەین:

١- هاوبەشیکردنی ئافرەت لەگەڵ پیاودا لەسەربنەمای یەکسانی تەواو «لەهەموو بەرپرسیاریەتیەکی وەها کەپێویست بێ موسوڵمان ئەنجامی بداو کاری تێدابکا. بۆیە پێویستە لەسەر خەلیفەو فەرمانڕەوای موسوڵمان کە بەیعەتو عەهدو پەیمان لەئافرەتان وەربگرێ بەوەی تێبکۆشنو رۆڵی خۆیان بگێڕن بۆ پێکەوەنانی کۆمەڵگەی ئیسلامیو هەموو وەسیلەو هۆکارێکی مەشروع بگرنە بەر بۆ دروستکردنی، وەکوو چۆن هەمان عەهدو پەیمان لەپیاوان وەردەگیرێ. هیچ جوداوازیو بەرزیو نزمییەك لەنێوانیان دا نیە.

لێرەوە پێویستە لەسەر ئافرەتی موسوڵمان کە کاروباری ئایینی خۆی فێرببێ، وەکوو چۆن لەسەر پیاو پێویستە. هەروا پێویستە لەسەر ئافرەت، کەهەموو رێگایەکی مومکینو مەشروعو ڕەوا بگرێتەبەر بۆ خۆچەکدار کردن بەچەکی عیلمو زانستو هۆشیارییو ئاگاداربوون بەسەر کانگاو شوێنی دانانی پیلانی دوژمنانو شێوازی جیاجیان دژی ئیسلامو موسوڵمانانو پوچەڵ کردنەوەی پیلانو نەخشە کانیان. پێویستە فێری زانست ببێ هەتا بتوانێ ئەو وادەو بەڵێنانە بەجێ بێنێ کەلەسەر خۆی پێویست کردونو پابەندی ئەو بەیعەتەبێ کە خستویەتە ئەستۆی خۆی. ئاشکراو رونیشە کە ئافرەت ناتوانێ هیچ ئەرکێك لەو

ئەرکانەی سەرشانی جێ بەجێ بکا ئەگەر حەقائیقی ئایینی خۆی نەزانێ و ئاگاداری فرت و فێڵی بێگانەی دەوروبەری نەبێ. کەوابوو ئەو زانستانەی پێویستە ئافرەت فێریان ببێ زۆرو هەمە جۆرن.

٢- لەوەی بۆمان باسکردی لەچونیەتی بەیعەتکردنی پێغەمبەر لەگەڵ ئافرەتان، ئەوەت زانی کە بەیعەتکردنەکە موصافەحەو دەست خستنە ناو دەستی تێدانەبوو، هەربەقسە بووە، ئەمەش بەپێچەوانەی بەیعەتکردن لەگەڵ پیاوان دا: کەدەست خستنە ناو دەستی تێدا بووە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دروست نیە پیاو دەست لە پێستی ئافرەتی بێگانە بدا، بڕوا ناکەم هیچ راجیاییەك لەنێوان زانایانی ئیسلام دا هەبێ، هەموویان پێیان وایە حەرامە پیاو دەستی لە ئافرەتی نامەحرەم بکەوێ. مەگەر پێویستی و زەروری داخوازی ئەوەبێ وەکوو دەرمانکردن و دەست لێدانی پزیشك بۆنەخۆشی کەڵەشاخ لێگرتن و ددان هەڵکێشان و ئەوجۆرە شتانە. داب و نەریتی خوپێوەگیراوو عورفی شائیع بۆ تۆقەکردن لەگەڵ ئافرەتان نابێتە بەڵگەی حەڵاڵی و ڕەوایی ئەو دیاردەیە. چونکە عورف و عادەت چ دەسەلاتێکی نیە بۆ گۆڕینی حوکمێك کە بەقورئان و سوننە ثابیت بووبێ. عورف دەتوانێ حوکمێك بگۆڕێ: کە لەبناغەدا لەسەر عورفێکی بڵاو دامەزرابێ. چونکە لەڕاستی دا گۆڕانی عورف و عادەت لەوانەیە کاریگەریی هەبێ بۆ گۆڕینی ئەوحوکمە، لەم ڕووەوە کە حوکمێك لەسەر عورف دامەزرابێ، حوکمێکی مەرجدارەو پەیوەستە بەحاڵەتێکی دیاری کراو. باسەکەشمان ئەم باسەنیەو نامانەوێ چیدی لەسەری بڕۆین.

٣- ئەو حەدیثانەی لەبارەی بەیعەتەوە ریوایەتکراون و ئێمە ئاماژەمان پێ کردن، ئەوە دەگەیەنن، کە دروستە گوێگرتن لەقسەی ئافرەتی بێگانەو بیستنی قسەی لەکاتی پێویستیداو ئافرەت دەنگی

بەعەورەت ناژمێردرێ. ئەمە مەزهەبو رای جەماوەری فوقەهای ئیسلامە بەشافیعیەکانیشەوە. بڕێ لەفوقەهای حەنەفییەکان پێیان وایە: دەنگی ئافرەت بۆ پیاوی نامەحرەم حەرامەو عەورەتە. بەلام ئەوان بەلگەی لاوازیان هەیەو خۆلەبەر بەلگەی بەهێزی بەرامبەریان ناگرنو بۆڕ دەدرێن بەو حەدیثە صەحیحانەی دەربارەی بەیعەتی پێغەمبەر لەگەل ئافرەت دا ریوایەتکراون. هەروا حەدیثی تریش.

## نۆیەم: ئایا مەککە بەزۆر فەتح کرا یان بەصولحو ئاشتی؟

زانایانی سیرەو شارەزایانی مێژوو فوقەهای ئیسلام لەم بارەوە کەوتوونە راجیاییەوە، ئیمامی شافیعیو ئیمام ئەحمەدو هی تریش پێیان وایە مەککە بەئاشتی فەتح کراوەو نوێنەری قوڕیش لەم دانوسانەدا ئەبوسەفیان بووە، رێککەوتنو مەرج لەم صولحەدا ئەوەبووە هەرکەسێ بچێتە مالی خۆیەوەو دەرگا دابخا ئەمینە، کەسێك ئیمان بێنێو موسولمان بێ ئەمینە. کەسێك بچێتە مالی ئەبو سەفیانەوە ئەمینە. جگە لەشەش کەس کەئەوانە خوێنیان بەفیڕۆ دراوەو دەکوژرێن.

ئەبو حەنیفەو ئیمام مالیك پێیان وایە مەککە بەزۆر فەتح کراوە، بەلگەشیان شێوەی چوونە ناوەوەی مەککەیە لەلایەن موسولمانەکانەوە. کە بەچەکەوەو بەشێوەی ئامادەباشی بۆشەڕکردن چوونە ناو مەککەوە.

هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن: کە پێغەمبەر ﷺ لەفەتحی مەککەدا غەنیمەتی نەگرتووەو ژنو مندالی داگیرنەکردونو نەیکردون بە «سبایا». جا ئەوانەی کە دەلێن بەصولحو ئاشتی فەتح کراوە، ئەوە هۆکاری غەنیمەت نەگرتنو داگیر نەکردنی ژنو مندال ئاشکرایە. بەلام ئەوانەی کە دەلێن بەزۆر فەتح کراوەو غەنیمەتیشی تێدا نەگیراوە هۆکارەکەی دەگێڕنەوە بۆ تایبەتمەندیی خودی مەککە. گوتویانە: ئەوەی پێغەمبەری مەنع کرد لەوەی غەنیمەت لە مەککە

بگرێ‌و دابەشی بکا شتێکەو مەککە لەباقی وڵاتانی ترجیا دەکاتەوە، بێگومان مەککە شاری خوداپەرستی‌و نوسوکە شوێنی عیبادەتی حەقە، حەرەمی خودایە. هەردەڵێی خودا خاکی مەککەی لەسەر خەڵك وەقف کردوە، بۆیە ئەبوحەنیفەو بڕێ عولەمای تر بۆئەوە چون کەخانوو زەوی‌و زاری مەککە نافرۆشرێن‌و فرۆشتنیان مەمنووعە«١».

ئەمە پوختەیەك بوو دەربارەی بڕێ ئەحکام‌و عیبرەت کە لەروداوەکانی فەتحی مەککە وەردەگیرێ‌و بەم ئەندازە کیفایەت دەکەین.

## غەزای حونەین

ئەم غەزایە لەمانگی شەشەڵانی ساڵی هەشتەمی کۆچی روی دا. هۆی سەرەکی ئەم غەزایە ئەوەیە: کاتێك خودای مەزن ئەو فەتحە گەورەو پیرۆزەی بۆ پێغەمبەری خۆی ڕەخساند، قوڕیش دوای ئەو هەموو سەر ڕەقییەی نواندیان گەردنکەچ بوون‌و ملیان شۆڕکرد. پیاو ماقوڵانی هۆزی هەوازین‌و ثەقیف کەوتنە خۆو هاتوچۆکردنی یەکتری‌و دڵیان پڕبوو بوو لەڕق‌و کینە بەرامبەر پێغەمبەرو موسوڵمانان لەئاکامی ئەو سەرکەوتن‌و سەروەرییەی خودا بەپێغەمبەرو موسوڵمانانی بەخشیبوو، هێزێکی زۆریان کۆکردەوەو خۆیان ئامادەکرد بۆهێرش هێنان بۆسەر موسوڵمانان. ئەوەی سەروکاری ئەم لەشکر کۆکردنەوەی کرد، مالیکی کوڕی عەوف بوو «سەرۆك هۆزی هەوازین». خۆی کرد بەرابەرو فەرماندەی سوپاکە، فەرمانی پێ کردن بە خۆیان‌و ماڵ‌و سامان‌و ژن‌و منداڵیانەوە بێن، هاتن تاگەیشتنە شوێنێك لەنێوان مەککەو طائیف دا کەپێی دەگوترێ «ئەوطاس» لەوێ لەشکر بەزییان کرد. بۆیەش مالیك فەرمانی پێ کردن ماڵ‌و سامان‌و ژن‌و منداڵیان

---

١- بڕوانە: الأحكام السلطانية ١٦٤ وزاد المعاد لإبن القيم ٢م١٧٤.

لەگەڵ خۆیان بێنن تاپیاوەکانیان بەهیچ جۆرێ خەیاڵی هەڵاتن نەکەن. بۆ پارێزگاری لەماڵو منداڵیان مەیدانی شەڕ جێ نەهێڵن. هەموویان بڕیاریان دا پەلاماری پێغەمبەرو موسوڵمانان بدەن، پێغەمبەر ﷺ شەشی شەشەلانی ساڵی هەشتەمی کۆچی بەلەشکرێکی دوانزە هەزارکەسییەوە بەرەو ڕویان لەمەدینە دەرچوو. لەشکرەکە دەهەزار جەنگاوەریان خەڵکی مەدینە بوون دووهەزاریان خەڵکی مەککە بوون«١».

پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوحەدرەدی «السلمي» نارد بۆناو سوپای کافرەکان بۆئەوەی لەناویان دا بمێنێتەوەو هەواڵی تەواو دەربارەی ژمارەو هێزو نیازیان بۆ پێغەمبەر بهێنێتەوە، عەبدوڵڵا رۆیی چووە ناویانەوەو بەناویان دا گەڕاو زانیاری تەواوی هێنا. لەوەپێشیش بۆ پێغەمبەر باسکرابوو کە صەفوانی کوڕی ئومەییە زرێو چەکی هەیە، پێغەمبەر ناردی بۆلای «ئەو دەمە موشریك بوو» داوای لێ کرد زرێو چەکی بداتێ، صەفوان وتبوی ئایا بەزۆر لێم دەستێنیو داگیری دەکەن؟ پێغەمبەر فەرموو بووی نەخەیر بەئەمانەت بماندەرێو پاشان بۆت دەگێڕینەوە، صەفوان سەد زرێو چەکی پێویستی پێدا«٢».

مالیکی کوڕی عەوف بەلەشکر هێنانی پێغەمبەری زانی، لەدوڵی حونەین دا پیاوەکانی خۆی ئامادەو تەیار کردو بەناو کونو کەلەبەرو پەناوپاساری دۆڵەکەدا بڵاو بوونەوەو سەنگەریان گرت، فەرمانی پێ کردن کەلەکاتی شەڕدەست پێ کردن دا هەرموویان لەهەر چوارلاوە پەلاماری پێغەمبەرو هاوەڵانی بدەنو قەلاچۆیان بکەن.

لەشکری موسوڵمانەکان گەیشتە دۆڵی حونەینو کازو کوزی بەیانی بەناو دۆڵەکەدا شۆڕبوونەوە، کاتێکیان بەخۆزانی گۆزو گوممەت

---

١ طبقات ابن حسن. ٤م٢٠٠. وسيرة ابن هشام.

٢- رواه ابن اسحاق بسند صحيح ورواه عن طريق ابن جرير وابن سيد الناس.

لەهەموولایەکەوە، لەپەنا پاسارو کەندرو تەنگەبەرو بەرزو نشێوییەوە پەلاماردران و کەوتنە بەر حەملەو تیر باران و شمشێر لێ وەشاندن، موسوڵمانەکان شڵەژان ئەسپەکانیان هەڵسڵەمینەوە، خەڵکەکە پەرتەوازەبوون، هەریەکە بەلایەکداو کەس لەسەر کەس هەڵ نەدەگەڕایەوە! پێغەمبەر ﷺ کەوتە لای راستی دۆڵی حونەینەوە هاواری لەموسوڵمانەکان کردو فەرمووی: {إليَّ يا عباد الله أنا النبيّ لاكذب انا ابن عبدالمطلب} ئەی بەندەکانی خودا بگەڕێنەوە بۆلای من و لەدەوری من کۆببنەوە، من پێغەمبەرم و درۆی تێدانیە من کوڕی عەبدولموطەلیبم.

ئیمامی موسلیم لە «العباس» وە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ من رۆژی شەڕی حونەین لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەبوم، من و ئەبوسەفیانی کوڕی «الحارث»ی کوڕی عبدالمطلب لێی جیانەبووینەوەو ئەملاو ئەولامان بەرنەدا، ئەو رۆژە پێغەمبەر ﷺ سواری هێسترە سپیەکەی بوو، کە شەڕدامەزراو لەشکری موسوڵمانان و لەشکری کافرەکان لێکیان دا، سەرەتا موسوڵمانەکان شڵەژان و شەپرزە بوون هەڵاتن، پێغەمبەر ﷺ بەرەو روی کافرەکان هێسترەکەی تاودەداو دەچوە پێش. عەبباس دەڵێ من لغاوی هێسترەکەی پێغەمبەرم گرتبو بۆئەوەی پەلەنەکا بۆ پێشەوە چون بەرەو روی دوژمن، ئەبوسەفیانیش ئاوزەنگی پێغەمبەری گرتبوو، لەوکاتەدا پێغەمبەر فەرمووی ئەی عەبباس! هاوار لەهاوەڵانی پەیمانی ژێردرەختی «السمرة» بکە، واتە: هاوەڵانی «بيعة الرضوان» «عەباس دەنگی گەورە بوو» دەڵێ بەهەموو هێزی خۆم هاوارم کرد «يا أصحاب السّمرة» عەباس دەڵێ: کە هاوەڵانی پەرتەوازەبوو، گوێیان لەدەنگم بوو، سوێندم بەخودا ئەوەندە بەگورجی و بەخێرایی دەهاتن بەپیر دەنگەکەمەوە دەتگوت: گەڕانەوەی مانگایە بۆسەر بێچوەکەی. بەهەڵەداوان دەگەڕانەوە بۆلام و دەیانگوت: «يالبيك، يالبيك». هەموویان

گەڕانــەوەو کەوتنــە شــەڕ لەگــەڵ کافرەکــان، هوتــافی جــەنگاوەرانی موسـوڵمان «یاللأنـصار» بـوو، پێغەمبـەر ﷺ سەرپەرشـتی شـەڕەکەی دەکردو دەیڕوانییـە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی و فەرمووی ئێستا واشەڕ گەرم بوو، ئەمجار مشتێك وردە بەردی هەڵگرتن و بەرەو روی کافرەکان هاویشتنی و پاشان فەرمووی: سوێندم بەخودای موحەممەد، لەشكری کوفر شکا«١».

پـەروەردگار ترسـی خسـتە دڵـی موشـریکەکانەوە، شـکان، هـەڵاتن، کەسیان لەسەر کەسیان هەڵنەدەگەڕایەوە، موسوڵمانان بەشوێنیانەوە راویــان دەنــان و لێیــان دەکوشــتن و لێیــان بــەدیل دەگــرتن، کاتێــك موسوڵمانەکان لەڕاونان و بەدیل گرتنی کافرەکان گەڕانەوە دیتیان بەدیل گیراوانـی دوژمـن ریزکـراون لـەلای پێغەمبـەر! لـەم غەزایـەدا پێغەمبـەر ئیعلانـی کـرد هەرکەسـێك کافرێـك بکـوژێ و بەڵگـەی هـەبێ ئـەو کوشتویەتی، هەموو چەك و پێداویستی کوژراوەکە بۆ بکوژەکەیە«٢».

پیبنوئیسحاق و غەیری ئەویش ریوایەتیان کردوە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێ: ئەبوطەلحە بەتەنیا لەرۆژی شەڕی حونەین دا چەك و پێداویستی بیست کوژراوی کافرەکانی پێدرا کە کوشتبونی.

هەروەها ئیبنوئیسحاق و ئیبنو سەعد بەسەنەدی صەحیح و راست ریوایـەتیان کـردوە، دەڵـێن: پێغەمبـەر ئـاوڕی دایـەوە، ئوممـو سولـەیمی کچی «ملحان»ی بینی لەگەڵ ئەبوطەلحەی مێردی دابوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «ئوممو سولەیم...!» وتـی بەڵێ: بەدایك و باوکەوە فیدات بم ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەوانـە بکـوژم کـە لەدەوروبـەرت هەڵـدێن و مەیدانی شەڕ جێ دێڵن وەکو کوشتنی ئەوانەی شەڕت لـەدژ دەکـەن؟

---

١ رواه مسلم، وروى نحوه باختصار البخاري ايضا. وترويه بتفصيل كل كتب السيرة.

٢ متفق عليه.

ئەممو سولەیم خەنجەرێکی پێ بوو، ئەبوطەلحە پێی گوت: ئەم خەنجەرە چیە پێتە ئەی ئوممو سولەیم! وتی: ئەوە خەنجەرێکە هەڵم گرتووە ئەگەر یەکێك لەموشریکەکان لێم نزیك بۆوە بەم خەنجەرە لێی دەدەم.

پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێك دا تێپەڕی خالیدی کوڕی وەلید کوشتبوی، خەڵك لێی کۆبوونەوە، فەرمووی: ئەوەچیە؟ عەرزیان کرد ئافرەتێکە خالیدی کوڕی وەلید کوشتویەتی، پێغەمبەر ﷺ بەهەندێ لەوانەی لەخزمەتی دابوون فەرمووی: بڕۆ بگەرە خالیدو پێی بڵێ: پێغەمبەری خودا نەهیت لێ دەکا لەوەی منداڵو ئافرەتو کرێکارو کۆیلە بکوژی«١».

مالیکی کوڕی عەوف کە فەرماندەی لەشکری موشریکەکان بوو هەڵاتو چەند کەسێکیش لەپیاوی عەشیرەتەکەی لەگەڵی دا بوون، هەڵاتن تاگەیشتنە طائیفو چونە قەڵایەکەوە خۆیان قایم کرد. کەلو پەلو غەنیمەتێکی زۆریان لەدوا خۆیان جێ هێشتبوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد هەموو دەستکەوتەکەیان خڕکردەوە لە «الجعرانة»دا دایان ناو مەسعودی کوڕی عەمری «الغفاري» بەسەرەوە داناو بۆخۆی تەشریفی لەگەڵ هاوەڵانی بەرەو طائیف کەوتە ڕێو دەورەی دا، هۆزی ثەقیف لەقەڵاکەوە تیرەبارانی موسوڵمانەکانیان دەکرد بەم هۆیە چەند کەسێکیان لێ شەهید بوون. پێغەمبەر ﷺ لەدەورەی طائیف مایەوەو گەمارۆکەی لەسەر هەڵنەگرتو گەمارۆ دانەکە زیاد لەپانزە ڕۆژی خایاند، هەندێکیش دەڵێن: بیستو ئەوەندە ڕۆژە درێژەی کێشا.

پاشان وای بەباش زانی وڵاتی طائیف جێ بێڵێو بگەڕێتەوە. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر لەناو

---

١ اخرجه أبوداود وابن ماجه، وروى الشيخان بمعناه.

هـاوەڵانی دا بـڵاوی کـردەوە فـەرمووی: خـودا پـشتیوان بـێ ئێمـە دەگەڕێینەوە. بڕێ لەهاوەڵانی وتیان: چۆن بەبێ ئەوەی فەتحی بکەین بگەڕێینەوە؟ پێی فەرموون: جائەگەر حەزتان لێیە بەردەوام بن لەسەر شەڕ، بەردەوام بوون لەسەر شەڕ، هەندێکیان بریندار بوون، پێغەمبەر پێی فەرموون: ئێمە بەیانی دەگەڕێینەوە، هاوەڵان پێیان خۆشبوو پێغەمبەر زەردەخەنەی هاتێ«١».

جا کەپێغەمبەر ﷺ کەوتەڕێ بەرەو مەدینە بەهاوەڵانی فەرموو: بیڵێن: {آیبون، تائبون، عائدون، عابدون لربنا حامدون}. هەندێ لەهاوەڵان عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا! دوعا لەهۆزی ثەقیف بکە خودا لەناویان بەرێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {اللهم اهدِ ثقيفاً وأتِ بهم} خودایە هیدایەتی هۆزی ثەقیف بدەو وایان لێ بکە بەپێی خۆیان بێن موسوڵمان ببن«٢».

دەڵێم دوعاکەی پێغەمبەر گیرابوو دوای ماوەیەکی کەم شاندیان هاتە خزمەت پێغەمبەر لەمەدینە بۆئەوەی موسوڵمانبوونی هۆزەکەیان رابگەیەنن.

## دەستکەوتی غەزای حونەین و چۆنیەتی دابەشکردنی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ

پێغەمبەر ﷺ لە طائیفەوە گەڕایەوە بۆ «الجعرانة»، کە دەستکەوتی شەڕی حونەینی تێدا خڕکرابۆوەو هەڵگیرابوو. هەموو ئەو

---

١ متفق عليه.

٢ رواه ابن سعد في الطبقات، وأخرجه الترمذي في سننه وقد رواه ابن سعد عن عاصم الكلابي عن الأشهب عن الحسن.

غەنیمەتەی لەهۆزی «هەوازین» گیرابوو لە «الجعرانە» دا کۆکرابۆوە، پێغەمبەر ﷺ لەوێ هەموو «سەبایا»ی دابەش کرد. دوایی شاندێکی هەوازینی موسوڵمانبوو هاتنە خزمەتی، داوایان لێ کرد ماڵو ئافرەتو منداڵی دەست بەسەراگیراویان تەسلیم بکاتەوە. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئێوە دەزانن من چیم لەگەڵدایە، من قسەی راستو بێ پێچو پەنام پێ خۆشە. ئێوە یەکێ لەم دووشتە هەڵبژێرن، یان ژنو منداڵتان دەدەینەوە یان ماڵو سامانەکەتان. جا کامیانتان پێ خۆشە خۆتان سەرپشك بن. ئەمن ماوەیەکی زۆر غەنیمەتو سەبایای ئێوەم دابەش نەکرد بەهیوای ئەوەی موسوڵمان بن، پێغەمبەر ﷺ زیاد لەپانزە رۆژ مۆڵەتی دابوونێ، ئەوکاتەی لە طائیفەوە گەڕابۆوە شاندەکەی هەوازین وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ ئێمەت سەرپشك کرد لەنێوان خێزانو منداڵەکانمانو ماڵو سامانمان. هەڵبەتە ئێمە هیچ شتێك بەناموسو جگەر گۆشەکانمان ناگۆڕینەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەناو هاوەڵانی دا هەڵسایە سەرپێو شوکرو سوپاسی خودای کردو پاشان فەرمووی: موسوڵمانینە! ئەم برایانەتان لەهەڵوێستی پێشویان پەشیمان بوونەوەو موسوڵمان بون، ئێستا هاتوونە لاتان داوای ژنو منداڵی خۆیان دەکەنەوە، منیش پێم خۆشە بیاندەنەوە، جاهەرکەس حەز دەکا بابیانداتەوە، ئەوەی ناشیەوێ بەخۆڕایی بیانداتەوە بابەقەرز بیاندەنە مـن، لەمەودوا مـن لەیەکەم دەسکەوتی جەنگی تردا قەرەبووی بۆدەکەمەوە. هەرخێرا کۆچکەرەکانو یاریدەدەران وتیان: ئەوەی بەشی ئێمەیە ئەوا دامانەوە بەپێغەمبەر ﷺ خۆی سەرپشك بێ چۆنیان دەداتەوە بابیان داتەوە. ئێمە پێمان خۆشە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بەو شێوە نازانم کێ رازییەو کێ ناڕازییە، باهەر کۆمەڵە نوێنەرێك دیاریی بکاو بێ تێم بگەیەنێ، هەر کۆمەڵەو نوێنەری خۆی دیاریی کردو

ناردیاننە خزمەت پێغەمبەرو هەموویان رازی بوون بەگێڕانەوەی ژن و منداڵە دەست بەسەرا گیراوەکان بۆلای هەوازینیەکان«١».

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەشاندی هەوازین کرد دەربارەی مالیکی کوڕی عەوف ئاخۆ چی بەسەر هات؟. وتیان: لەطائیفە لەناو هۆزی ثەقیف دایە. پێی فەرموون هەواڵی بدەنێ ئەگەر بێ خۆتەسلیم بکاو موسوڵمان ببێ ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەکەی دەدەمەوەو سەدحوشتریشی پێ دەدەم. ئەم هەواڵە بەمالیك راگەیەندرا، هات بۆخزمەت پێغەمبەر ﷺ لەنێوان «الجعرانة»و مەککەدا بەخزمەتی گەیشت، ماڵ و منداڵ و خێزانی بۆ گێڕایەوەو سەد حوشتریشی دایە، موسوڵمان بوو موسوڵمانبوونەکەشی زۆر رێك و پێك بوو.

پێغەمبەر ﷺ هەندێ زیادەی لەغەنیمەت و بەخششی تایبەت کرد بۆئەوانەی تازە موسوڵمان بوون لەئەهلی مەککە ئیسلام بەباشی لەدڵ و دەرونیان دا جێگیر نەبو بوو، بۆیە هەندێ لەیارمەتیدەران ئەمەیان بەلاوە ناخۆش بوو، وتیان: پێغەمبەر «خودا پایەداری بکا»، بەشی قوڕیش دەداو ئێمە پاشگوێ دەخا لەکاتێك دا شمشێرەکانمان ئێستاش خوێنی ئەوانی لێ دەتکێ«٢».

ئەم گلەییە بەپێغەمبەر گەیشتەوە، ناردی بەدوا ئەنصارەکان دا لەشوێنێك کەبۆیان دیاریکرابوو لەگەڵیان کۆبوەوە، نەیهێشت کەسی تریان لەگەڵ دابێ. ئەمجار هەڵسایە سەرپێ و وتارێکی بۆدان، شوکرو سوپاسی خودای کردو پاشان فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار! ئەو قسەیە چیە لەئێوەوە پێم گەیشتووە؟ ئەرێ مـن نەهاتمە لای ئێوە

---

١ رواه البخاري، ورواه الطبري والبيهقي وابن سيد الناس كلهم عن طريق ابن اسحاق بمزيد من التفصيل.

٢ متفق عليه.

لەحاڵەتی گومڕاییدا بوون و خودا بەهۆی منەوە هیدایەتی دان؟ ئێوە کۆمەڵێکی پەرتەوازەو یەك نەگرتوو بوون خودا بەهۆی منەوە یەکی خستن؟ هەژارو نەدارا بوون، خودا بەهۆی منەوە دەوڵەمەندی کردن؟ هەرقسەیەکی لەم جۆرەی ئاراستە دەکردن، هەموویان تێکڕا دەیانگوت بەڵێ وایەو خوداو پێغەمبەر فەضلی زۆریان بەسەر ئێمەوە هەیە. پاشان فەرمووی ئەرێ ئەی مەعشەری ئەنصار ئەوە بۆ وەڵامم نادەنەوە؟ وتیان وەڵامی چیت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەضل و منەت بۆخوداو پێغەمبەرەکەیەتی، هیچمان نیە بیڵێین. پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ ئەگەر حەزتان لێ بێ دەتوانن بڵێن: ئەگەر بشڵێن وەڵڵاهی راست دەکەن وەڵڵاهی راستە. دەتوانن بڵێن: هاتیەلامان بەدرۆ خرابویە لەلایەن خەڵکەوە ئێمە پێمان باوەڕ کردی، دەریان کردبووی ئێمە یارمەتیمان دای، راوەدو نرابووی ئێمە تۆمان حەواندەوە. سەڵت و بێلانەو غەمبار بووی، دڵخۆشیمان دایەوە، دووبارە دەنگیان هەڵبڕی و هاواریان کرد: فەضل و منەت بۆخوداو بۆ پێغەمبەرە بەسەر ئێمەوە.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ درێژەی بەوتارەکەی داو فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار! ئەوە چیتان لەدڵی خۆتان گرتووە؟ چی وای لێ کردون لەبەر خاتری دونیای بێ بەقا لەدڵی خۆتان دا شتێکی ئاوا دروست بکەن؟ ئەوە ئێوە بەوە دڵگران بوون، کەبەهەندێ پڕو پیتاڵی دونیایی تاقمێکم دڵخۆش کردوە، بۆئەوەی ئیمان و باوەڕ لەدڵیان دا دابمەزرێ، دڵنیام لەوەی کەبیرو باوەڕی ئێوە دامەزراوەو چەسپاوەو ئێوەم بەئاییینی خۆتان سپاردوە.

ئەوە ئێوە بەوە ڕازی نابن ئەی کۆمەڵی ئەنصار کەکەسانی دیکە دینارو درەم و مەڕو ماڵات ببەنەوە بۆماڵەوەیان و ئێوە ڕەزامەندیی خوداو پێغەمبەر لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆماڵەوە؟ سوێندم بەخودا

ئەوەی ئێوە دەیبەنەوە زۆر باشترە لەوەی ئەوان دەیبەنەوە. سوێندم بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر کۆچکردن نەبوایە من یەکێك دەبوم لەئێوەی ئەنصارو خۆم بەیەکێك لەئێوە حیساب دەکرد. ئەگەر هەموو خەڵك بەرێگایەك دا بڕوا، بەشیوێکدا بڕۆن و ئەنصار بەرێگایەکی تردا بڕۆن، ئەمن دەکەومەگەڵ ئەنصارەکان و بەرێبازی ئەوان دا دەڕۆم. ئێوە دوامن، دەکەونە حاڵەتی «أثرە»و خۆویستی و خۆپەرستییەوە، کەسانێك پەیدا دەبن بەرژەوەندی خۆیان پێش دەخەن، ئێوە لەسەر حاڵەتی «ئیثار»و خۆنەویستی خۆتان بەردەوام بن. تا لەسەر حەوزی کەوثەر بەیەك دەگەینەوە، توشم دەبنەوە، خودایە ڕەحم بەئەنصار بکە، ڕەحم بەکوڕەکانیان بکە، ڕەحم بەکوڕی کوڕەکانیان بکە.

ئیتر هەموو ئامادەبوان دەستیان کرد بەگریان، ئەوەندە فرمێسکیان رشتن هەتا ریشیان تەڕبوو، بەیکدەنگ هاواریان کردو وتیان رازین خوداو پێغەمبەر بەشمان بن و هیچی ترمان ناوێ.

هەندێ لەعەرەبە سارانشینەکان کەوتنە دوای پێغەمبەرو داوای زیاتریان دەکرد بیانداتێ، ئەوەندەیان پاڵەپەستۆ لێ کردو تەنگیان پێ هەڵچنی ناچاریان کرد بەبن درەختێکی سومرەدا بڕوا ریدایەکەی لەلقی درەختەکە گیرا، روی کردە خەڵکەکە فەرمووی: خەڵکینە ریدایەکەم پێ بدەنەوە سوێندم بەخودا ئەگەر بەئەندازەی ژمارەی درەختی کێوی توهامە ئاژەڵی دەستکەوتم لابێ هەموویتان بەسەردا دابەش دەکەم، ئێوە قەت منتان دەست ناکەوێ رژدو چروك بم، یان درۆزن بم یان ترسنۆك «رواه البخاري». ئەی خەڵکینە وەڵلاهی بەشی من لەدەستکەوت تەنها پێنجیەکە ئەویش بەسەر ئێوەدا تەوزیع دەبێتەوە. پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی توش بوو بەهەموو هێزی لکی عەباکەی راکێشا لەوکاتەدا عەبایەکی نەجرانی ئەستوری لەبەردابوو «قەراخی عەباکە لاملی روشاندو ئازاری پێگەیاندو پێی گوت: فەرمان بکە لەماڵی لەژێر

دەستت دایەو هی خودایە بەشم بدەن، پێغەمبەر ئاوڕی لێ دایەوەو زەردەخەنەیەکی هاتێ، پاشان فەرمانی کرد بەشی بدرێتێ«١».

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ لە «الجعرانة»وە ئیحرامی بەعەمرە بەست تەشریفی عەمرەی کرد کەلێ بۆوە گەڕایەوە بۆمەدینەو «عتاب»ی کوڕی ئوسەیدی بەسەر مەککەوە دانا.

## پەندو ئامۆژگاریی:

غەزای حونەین بەدەرسێکی بواری بیرو باوەڕی ئیسلامی دەژمێردرێو بەر چاوگرتنی یاسای ئەسباب و موسەبەباتی لەخۆ گرتووەو لەجۆری دەرس و وانەی غەزای بەدرە، بەڵکوو تەواوکەری ئەوە.

جائەگەر روداوی غەزای بەدر ئەوەی سەلماند بەموسڵمانان کە کەمی ژمارەیان چ رۆڵێکی زیانبەخشانەی نیە بەرامبەر زرۆیی دوژمنانیان بەمەرجێ صابیرو خوداپەرست بن، ئەوە غەزای حونەین ئەوەی پێ سەلماندن کەزۆری ژمارەیان دووبارە سود ئامێز نابێ ئەگەر صەبرو خۆگرو تەقوا کارنەبن!! جاوەکوو ئایەتی قورئان نازڵبوون بۆچەسپاندنی وەرگرتنی عیبرەت لەڕوداوی بەدر لەهەمان کات دا ئایەتی قورئان نازڵ بوون بۆ چەسپاندنی ئەوە کەپێویستە عیبرەت لەغەزای حونەین وەربگرن وەکوو غەزای بەدر، ئەم لەرویەکەوەو ئەو لەڕویەکەوە، موسوڵمانەکان لەغەزای بەدردا کەمتر بوون لەژمارەی دوژمنانیان لەبەرامبەر دوژمن دا، لەگەڵ ئەوەش دا کەمی ژمارە زیانی لێ نەدان چونکە موسوڵمانەتی و بۆخوداچارانیان بەڕاستی بوو وەلائو خۆشەویستیان بۆخوداو پێغەمبەری خودا زۆر بەهێزو پتەو بوو،

---

١ متفق علیه.

موسـولمانەکان لەغـەزای حونـەین دا ژمارەیـان لەهـەموو ژمـارەی لەشـکرەکانی شـەڕەکانی لەوەپێـشیان زیـاتر بـوو، لـەهیچ غەزایـەك دا لـەوەپێش ژمارەیـان نەگەیشتۆتە ئـەو ژمارەیـە، لەگـەڵ ئـەوەش دا زۆری ژمارەی سودی پێ نەگەیانـدن، چونکە جەماوەرە بەشداربووەکە هێشتا ئیمـان لـەناخیان دا جێگیر نـەبو بـوو، مانـای ئیسلام لـەقولایی دڵیـان دا خۆی نەچەسپاندبوو.

بێگومان ئەو جەماوەرە تازە موسوڵمانبوە، بەجەستەو بەشێوە پاڵی دابوە سـوپای ئیسلام، هێـشتا دونیاویستی و هـەواو ئـارەزو سـەرودڵی گرتبـون و هێـشتا لەناخیانـەوە ملکەچـی بەنـدەکانی ئـایین نـەبو بـوون، حـوبی شـەهیدبون و جیهـاد لـەدڵ و دەرونیـان دا نەڕسـکابوو جێگیرنـەبوبوو. ئـیتر زۆری جەسـتەو شـێوە چ کاریگەریـەکی هەیـە لەسەرکەوتن و بالادەستی دا.

بۆیـە ئـەم جـەماوەرە زۆرەی هاوبەشـییان لەغـەزای حونـەین داکـرد، خۆیـان نـەگرت و پەرتـەوازە بـون و هەریەکـەیان بەلایـەك دا پاشـەوپاش هەلاتن و خۆیان کوتا بۆ کەندڕو شیوو پەناپاساری نـاو دۆڵـی حونـەین. هەرلەگەڵ کەمین و سەنگەر گرتووەکـانی دوژمـن لێیـان راپـەڕین شڵەژان و سـەریان لـێ شـێواو دەسـتیان پـێ نەکرایـەوەو قاچـاندیان. تەنانـەت سـێبەری ئـەم هەلـەع و تـرس و لـەرزە سـەرەتا خـۆی هاویـشتە نـاو دڵ و دەروونی زۆرێك لەموسوڵمانە راستەقینەکانیش!!

بەلام زۆری نەخایاند، هەر لەگـەڵ موهـاجیرین و ئەنصارەکان گوێیـان لەبانگـەوازیی پێغەمبـەر بـوو: کـەبانگی دەکـردن بـۆ خـۆگری و هەڵمـەت بـردن و گردبوونـەوە لـەدەوری پێغەمبـەر، گەڕانـەوە بـۆلای پێغەمبـەرو لەدەوری گردبوونەوەو کەوتنە شەڕێکی مەردانەو دوژمن بەزینەوە، باری شـەڕەکەیان گـۆڕی و لاتـەرازوی لاسـەنگیان راسـت کـردەوە. ئەمانـەی

گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەرو ئەو سەروەرییانەیان تۆمارکرد، ژمارەیان لەدووسەد جەنگاوەر تێپەڕ نەدەبوو!!.

وەلێ بەدڵسۆزیو ورە بەرزی ئەو دووسەد جەنگاوەرە لەموهاجیرینو ئەنصار، سەرکەوتنو بالادەستی لەگۆڕەپانی شەڕدا هاتەوە دەست موسوڵمانەکانو دڵیان ئارامی گرتو داسەکناو خودای بالادەست دوژمنی سەرسەختی موسوڵمانانی بەخراپترین شێوە شکاند، ئەمە دوای ئەوەی لەسەرەتاوە ژمارەی لەشکری موسوڵمانان دوازدە هەزار کەس بوو، بەلام ئەم زۆری ژمارەیە چ سودێکی پێ نەدانو سەرەتا ئەوشکانەیان توشبوو کە توشیان بوو. قورئانی پیرۆز وێنەی ئەو شەڕەمان بۆدەکێشێو دەفەرموێ: {وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ، ثُمَّ أَنَزلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ، ثُمَّ يَتُوبُ اللّهُ مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَلَى مَن يَشَاء وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} «سورة التوبة، ٢٥-٢٧». ئێستا ئەو حوکمو پەندو ئامۆژگارییانەی لەم غەزایە وەردەگیرێن رونیان دەکەینەوە.

**١. بلاو کردنەوەی هەوالگرو جاسوس بەناو دوژمن دا بۆ زانینی چۆنیەتیو چەندییەتی دوژمنو بارو دۆخو وەزعو حالیان:**

لەوەپێش ئاماژەمان بۆئەوەکرد کە ئەوە کارێکی ڕەوایە، بەڵکوو ئەگەر پێویستی کرد واجبەو دەبێ ئەنجام بدرێ. پێغەمبەر ﷺ لەم غەزایە دا بەکردەوە ئەنجامی داوە، ئەوەبوو عەبدوڵلای کوڕی ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی نارد بۆئەوەی هەواڵی دوژمنی بۆبێنێ، بەوردی لە ژمارەی شەڕکەرانو چەكو سیلاحو نیازو مەبەستیان ئاگاداری بکا، لەم بارەوە هیچ خیلافو راجیاییەك لەناو فوقەهای ئیسلام نیە.

**٢. دروسته بۆ ئیمام کەچەك و پێداویستی شەڕ لەناموسوڵمانان وەربگرێ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنی موسوڵمانان:**

هەرچی پێداویستی شەڕو جەنگ بێ لەچەك و تفاق و دراوو دەرمان و شتی تر دروستە بەئەمانەت یان بەکڕین یان بەخۆڕایی لەناموسوڵمان وەربگیرێ بۆ شەڕی دوژمن. پێغەمبەر بەفیعلی لەم غەزایەدا چەك و پێداویستی لەصەفوانی کوڕی ئومەییە «کە ئەوکاتە موشریك بوو» وەرگرت. ئەمە دەچێتە چوارچێوەی عەمومی حوکمی وەرگرتنی یارمەتی لەناموسوڵمان. لەکاتی تەعلیقدانمان لەبارەی غەزای ئوحودەوە ئەم باسەمان رون کردەوە. ئێستا بۆت دەرکەوتووە کە ئیستیعانەکردن بەکافر دابەش دەبێ بۆ دوو جۆر:

جۆری یەکەم: یارمەتی وەرگرتن و داوای کۆمەکی لەئەشخاصی ناموسوڵمان بۆئەوەی ببنە هاوکاریان بۆشەڕ کردن دژی کافران. قسەکردن دەربارەی ئەم حوکمە لەباسی غەزای ئوحوددا تێپەڕی و لەوێ گوتمان ئەوە دروست و ڕەوایە بەمەرجێك پێویستی هەبێ و موسوڵمانەکان دڵنیابن لەڕاستی و دڵسۆزی و ئەمینی ئەو ناموسوڵمانانەی دەبنە هاریکاریان و شان بەشانی ئەوان شەڕدەکەن.

جۆری دووەم: ئیستیعانە بەهەندێ چەك و تفاقی ناموسوڵمان لەمەدا هیچ راجیاییەك نیەو هەموو فوقەها هاوڕان: کەئەوە دروستە، بەمەرجێك سوکایەتی تێدانەبێ بۆموسوڵمانان و کەرامەتیان پێی نەڕوشێ. هەروا نەبێتە هۆکاری ئەوەی موسوڵمانان کێش بکا بۆئەوەی بکەونە ژێر دەسەڵاتی ناموسوڵمانەوە، یان وایان لێ بکا واز لەهەندێ ئەرکی پێویستی سەرشانیان بێنن فەرزە ئایینییەکانیان پاشگوێ بخەن. ئەتۆ ئەوەش دەزانی کەصەفوانی کوڕی ئومەییە ئەوکاتەی چەك و پێداویستی

جەنگی بەئەمانەت دا بەپێغەمبەر ﷺ لەپلەی بالاّ دەستی دا نەبوو لاوازو بێ دەسەلاّت بوو، پێغەمبەر ﷺ لەپلە بالاّدەستی دا بوو«[١]».

### ٣- بوێری و ئازایەتی پێغەمبەر لەشەڕدا:

ئەتۆ وێنەیەکی ناوازەو سەرسوڕهێنەردەبینی کاتێك بیر لەبوێری و ئازایەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەیەوە، لەوکاتەدا جەماوەری سوپای ئیسلام لەسەرەتای دەست پێکردنی شەڕی حونەین دا توشی شەپرزەیی و شلەژان و هەلاّتن و خۆشاردنەوە هاتن، لەمەیدانی شەڕدا تەنها پێغەمبەر لەناو ئاپۆڕای دوژمن دا مابۆوە، لەهەموو لایەکەوە کەمینی دوژمن دەوریان دابوو، لەو ئاگربارانەدا خۆی ڕاگرت و نەلەرزی و نەبەزی، وەکوو کێوی پتەو چەسپی، کاریگەری ئەم خۆڕاگری و ئازایەتییەی پەلی هاویشت بۆناو دڵ و دەرونی هاوەڵە هەلاّتووەکانی و وایان لێ هات بەورەیەکی بەرزەوە بگەڕێنەوە بۆلای پێغەمبەرو شەڕەکە بەرنەوە!!

**ئیبنو کەثیر لەشیکردنەوەی غەزای حونەین دا دەڵێ:**

«وتم: بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی ئازایەتی و مەردایەتییە، ئەو لەوڕۆژەدا لەناوەڕاستی گەمارۆی دوژمن دابوو، سوپای شکاوو پەرتەوازە بوو، لەهەموو لایەکەوە مەرگ ددانی لێ جیڕکردۆتەوە، بەتاقەسوارە سواری هێسترێك بووە، خێرا نییە بۆ ڕۆیشتن، نەبەکەڵکی هەلاّتن دێ نەبەکاری هێرش بردن دێ. وێڕای ئەوەش هێسترەکەی هەلینگ دەدا بەرەو ڕوی دوژمن و بەدەنگی بەرز هاواردەکا دەڵێ من پێغەمبەرم و درۆی تێدانییە! بۆئەوەی ئەوانەی نایناسن بیناسن «صەلات و سەلامی خودای لێ بێ». ئەمە هەمووی لەبتمانە بەخوداو پشت بەستن بەخوداو دڵنیایی لەسەرکەوتنی و تەواوکردنی پەیامی

---

١ بڕوانە زاد المعاد ج٢م١٩٠ ومغنی المحتاج ج٤م٢٢١.

پـیرۆزیو باڵادەسـتبوونی ئایینەکـەی بەسـەر هـەموو ئاینـەکان دا سەرچاوەی هەڵگرتبوو».

**٤. دەرچوونی ئافرەت لەگەڵ پیاوان دا بۆ جیهاد:**

هاوبەشـیکردنی ئـافرەتو دەرچـوونی بۆجیهـاد بەمەبەسـتی دەرمـانکردنی برینـدارو ئـاودان بـەتینوان کـاری لـەو جـۆرە لەصـەحیحی سـوننەتی پێغەمبـەر دا چەسپاوەو لەچـەند غەزایـەك دا بەشـداریکردنیان ریوایـەتکراوەو سـەلمێندراوە، بـەڵام دەرچـوونی ئـافرەت بۆجیهـاد بەمەبەستی شـەڕکردن ئـەوە لەسـوننەتی پێغەمبـەردا ریوایـەت نـەکراوە، هەرچـەندە ئیمـامی بوخـاری لەصـەحیحەکەی دا، لـەکیتابی جیهـاد دا «باب»ێکی جیاکردۆتەوە عینوانی بۆداناوە بەم شێوە «باب غـزو النسـاء مع الرجال». وەلـێ ئـەو حـەدیثانـەی بۆئـەم بابـەی هێنـاون هیچیان ئـەوە ناگەیەنن: کەبـەفیعلی ئافرەت بەشـداری شـەڕی کردبـێ لەگـەڵ پیـاوان دا دژی کـافران. ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی دەڵـێ: مـن لـەو بـارەوە هـیچ شتێکم نەبینیوە. واتە فەرموودەیەکی پێغەمبـەرم نـەدیوە تەصـریح بـەوە بکا ئافرەت لەغەزاکان دا شان بەشانی پیاو شەڕی کردبێ«[١]».

ئـەوەیش کـە فوقـەها باسـیان کـردوە دەربـارەی دەرچـوونی ئـافرەت بۆشـەڕ، ئـەوە بۆئـەو حاڵەتەیـە دوژمـن پـەلاماری وڵاتـی ئیسـلام بـدا، ئەوکاتـە واجبـە لەسـەر هـەموو دانیشتوانەکەی بەپیاوو ئافرەتـەوە شـەڕ لەگـەڵ دوژمـن بکـەنو داگیرکـەر بـەپاش دا بـشکێنن، ئەمـە ئەگـەر لەئافرەتەکان چاوەڕوان دەکرا دەتوانن دیفاع بکەنو خۆڕابگرن، ئـەگینا ئەوکاتەش رێگا نادرێ ئافرەت هاوبەشی شەڕ بکا«[٢]» ئـەو خـەنجەرەی بە

---

١ فتح الباري ٢/٤٥.

٢ بروانه مغنى المحتاج ٤/٢١٩.

ئوممو سولەیم بوو، ئەوە تەنها بۆ دیفاع کردن لەخۆی هەڵی گرتبوو وەکوو خۆی وتی.

بەم بۆنەوە ئەو حەدیثەی کە بوخاری‌و هی تریش لەخاتو عائیشەوە ریوایەتیان کردوون: کە گوایە داوای ئیزنی لەپێغەمبەر کردوە رێگای بدا بچێ بۆ غەزاو پێغەمبەریش فەرموویەتی: «جهادكن الحج» جیهادی ئێوە حەجکردنە. ئەوە دەبێ وای ئاراستە بکەین بڵێین: مەبەستی خاتو عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) بەشداریکردن لەشەڕ بووە نەك ئامادە بوون بۆ تەداوی‌و دەرمانکردن‌و ئەو جۆرە شتانە چونکە ئامادەبوونی ئافرەت لە غەزادا بۆئەو جۆرە خزمەتانە مەشروع‌و رەوایە بەکۆڕای فوقەهاو زانایانی ئیسلام، ئەگەر مەرجەکانی هاتنەدی. هەرچۆنێك بێ دەرچوونی ئافرەت بۆ جیهادو بەمەبەستی شەڕکردن پێویستە بەتەواوی داپۆشراوو خۆپارێزبێ دەرچوونەکەشی پێویست بێ، ئەگەر دەرچوونی پێویست نەبوو یان دەرچوونەکەی لەوانە بوو بیخاتە ناو شتی حەرام‌و نەشیاو بۆمەکانەتی ئافرەت، ئەوە نابێ بچێ‌و نابێ رێگای پێ بدرێ.

گرنگ ئەوەیە ئەتۆ بزانی کە ئەحکامی ئیسلامی هەندێکیان پەیوەستن بەهەندێکیانەوە، نابێ بەگوێرەی هەواو ئارەزوو بەهۆی چەند هۆکارێکەوە هەڵبژاردنی حوکمێك‌و پشتگوێ خستنی حوکم‌و واجباتێکی تری پەیوەست بەهەمان شتەوە پەیڕەو بکرێ رەچاوکردنی کارێکی لەوجۆرە بەبێ گومان نمونەی وێنەیەکە کە قورئان ئاماژەی پێ‌دەکاو دەفەرموێ: {أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ} «سورة البقرة،٨٥».

بەڕاستی فرت‌و فێڵێکی ناشیرینە لەئایینی خودا ئەنجام دەدرێ کەهەندێ کەس پەنای بۆدەبەن، بۆمەبەستێکی پوچی دونیایی کاتێك

داوایان لێ دەکرێ فتوایەك هەڵکرێنن دەچن هەرچی قەیدو شروطی بەرچاو گیراو هەیە وەلایان دەنێن و هەرچی دەقی تەواکەرو پەیوەست هەن بەمەوزوعەکە دایانقرتێنن تاوای لێ دەکەن بەرگێکی شەرعی بەناڕەوا بەبەرفتواکەدا دەکەن بۆئەوەی بەدڵی جەنابی کاربەدەست و قسە رۆیشتووەکان بێ، ئایین دەگۆڕن بۆ ڕەزامەندی هەندێ کەس، خودا لەخۆیان دەڕەنجێنن بۆ دڵخۆشی ئەم و ئەو.

**٥. کوشتنی ئافرەت و منداڵ و کرێکارو کۆیلە لەغەزادا یاساغە:**

بێگومان وەکوو لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە: پێغەمبەر کاتێك ئەو ئافرەتەی بینی کە خالیدی کوڕی وەلید کوشتبووی، یەکسەر فەرمانی دەرکرد بەوەی کوشتنی ئافرەت و منداڵ و کرێکارو کۆیلە حەرامە، ئەو حوکمە چەسپاوەو هیچ کەس لەفوقەهاو زانایان شتێکی موخالیفی ئەوەیان ذیکر نەکردووە.

بەڵام ئەگەر ئەمانە لەشەڕدا هاوبەشی شەڕکەرانی کوفریان دەکردو شەڕیان دژی موسوڵمان دەکردو هێرشیان دەهێنا ئەوە دەکوژرێن، ئەگەر لەحاڵەتی هەڵاتن و پاشەکشەدا بوون ئەوە حەرامە بکوژرێن.

هەروەها ئەگەر ئافرەت و منداڵیان کردبوون بەمەتاڵ و هێرشیان دەهێناو نەدەتواندرا هێرشەکەیان بشکێندرێ مەگەر بەکوشتنی ئەو ئافرەت و منداڵانە نەبێ، ئەوە کوشتنیان دروستە بەکورتی پێویستە سەرکردەو فەرمانڕەوای موسوڵمان لەم جۆرە حاڵانەدا چی بە مەصلەحەت و بەرژەوەندی بزانێ ئەوە بکا»[١].

---

١ الأحكام السلطانية ص٤ ومغني المحتاج ٤/٢٢٣.

**٦. حوکمی کەل‌و پەلی کوژراو:**

لەوەپێش وتمان پێغەمبەر ﷺ لەم غەزایەدا ئیعلانی ئەوەی کرد هەر موسوڵمانێك کافرێك بکوژێ ئەوە کەل‌و پەلی کوژراوەکە بۆ خۆیەتی. ئیبنو «سید الناس» دەڵێ ئەم حوکمە بووەتە حوکمێکی بەردەوام‌و چەسپاو.

دەڵێم: ئەمە حوکمێکە ئیتفاقی زانایانی لەسەرە، وەلێ راجیایی لەنێوان زانایانی ئیسلام دا هەیە دەربارەی جۆری حوکمە چەسپاوە بەردەوامەکە ئایا لەجۆری ئەحکامی ئیمامەیە یان لەجۆری ئەحکامی فتوایە؟

واتە: ئایا پێغەمبەر ﷺ کە ئەو ئیعلانەی کرد بەوەظیفەی پێغەمبەرایەتی‌و بەشێوەی راگەیەنەر لەخوداوە ئەوەی راگەیاند وەکوو چۆن ئەحکامی نوێژو رۆژووی راگەیاندوە؟ یان ئیعلان‌و جاڕدانەکەی حوکمێکی مەصلەحەت ئامێزو سیاسی بووەو بەصیفەتی ئەوە ئەوجاڕەی داوە کە ئیمام‌و سەرکردەی سوپا بووەو وای بەباش زانیوەو بەرژەوەندی لەوەدا دیوە کە ئەو ئیعلانە بکا؟

ئیمامی شافیعی بۆئەوە چووە کە ئەوە حوکمێکە لەسەربنەمای تەبلیغ‌و فتوا دامەزراوە. کەوابوو دروستە بۆ موجاهید لەهەموو چەرخ‌و رۆژگارێك دا کە کەل‌و پەل‌و چەکی کوژراو بەدەستی خۆی، بۆخۆی هەڵبگرێ‌و پێویست ناکا ئیمام‌و سەرکردەی شەڕ ئیزنی بدا.

ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئیمام مالیك بۆئەوە چون: کە ئەوە حوکمێکی دادوەریی بووەو لەسەر بنەمای ئیمامەت راگەیەندراوە. کەوابوو تا ئیمام‌و سەرکردە ئیزن نەدا موجاهیدی موسوڵمان بۆی رەوانیە چەك‌و کەل‌و پەلی کوژراوی خۆی بۆخۆی بەرێ. ئەگەر ئیمام ئیزنی نەدا کەل‌و پەل‌و چەکی کوژراوەکە دەخرێتە پاڵ دەستکەوتی شەڕو حوکمی غەنیمەتی بەسەردا دەدرێ«١».

---

١ انظر الأحكام السلطانية. ١٣٩ والأحكام للقرافي ٣٨.

### ٧. جیهاد بەمانا ئەوەنیە موسوڵمان حیقدو کینەی هەبێ بەرامبەر کافر:

ئەوەی دەلالەت لەسەر ئەم حوکمە دەکا ئەو روداوەیە کە گێرامانەوەو گوتمان برێ لەهاوەڵان لەکاتی گەڕانەوەیان لەگەمارۆدانی طائیف بەپێغەمبەریان گوت: پێغەمبەری خودا دوعای شەڕ لەهۆزی ثەقیف بکە. پێغەمبەر لەجیاتی ئەوەی دوعای شەڕیان لێ بکا، فەرمووی: {أللهم اهد ثقيفاً وأت بهم} خودایە هیدایەتی هۆزی ثەقیف بدەو دڵیان نەرم بکە بێن ئیمان بێنن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە جیهاد جگە لە مومارەسەی وەظیفەی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە چی ترنییە. ئەوەش ئەرکێکی هەمیشەیی سەرشانی ئادەمیزادە بەگشتی هەندێکیان بەرامبەر هەندێکیان بەمەبەستی هەوڵدان و تێکۆشان بۆ ڕزگار کردنیان لەسزای هەتا هەتایی ڕۆژی قیامەت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە دوعاکردنی موسوڵمان کەئاڕاستەی دەکەن بۆ غەیری خۆیان دەبێ دوعای هیدایەتدان و ئیصلاح ئامێزبێ، چونکە ئەم مەبەستەیە حیکمەتی مەشروعیەتی جیهادو ڕەوابوونی.

### ٨. چ کاتێك جەنگاوەر دەبێتە خاوەنی دەستکەوتی شەڕ؟

ئێمە لەوەپێش باسی ئەوەمان کرد، کە شاندی هۆزی «هەوازین»ی هاتن موسوڵمان بوون، پێغەمبەر پێی فەرموون: ئەمن دابەشکردنی دەستکەوتم دواخست و وەغراندم بەهیوای ئەوە بێن موسوڵمان بن و ماڵ و سامانەکەتان بدەمەوە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە جەنگاوەرانی غەزا کاتێك دەبنە خاوەنی بەشی خۆیان لەدەستکەوتی شەڕ: کە فەرمانڕەوا یان سەرکردەی جەنگەکە غەنیمەتەکەیان بەسەردا دابەش بکا، ئەگینا پێش دابەشکردن چەندێك ئەو غەنیمەتە بەکۆکراوەیی بمێنێتەوە بەموڵکی ئەوان حسێب

ناکرێ، ئەمەیە سودو فائیدەی دواخستنی پێغەمبەر بۆدابەشکردنی غەنیمەتەکە بەسەر موسوڵمانەکان دا.

هەروەکوو چۆن دەلالەت دەکا لەسەر ئەوەش کەدروستە بۆئیمامو سەرکردە، غەنیمەتەکە بگێڕێتەوە بۆخاوەنەکانی ئەگەر ئیمانیان هێناو هێشتا ماڵە دەست بەسەرا گیراوەکە یان دابەش نەکرابوو، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ئەمەی پێ خۆش بوو.

هەروا هەڵوێستی پێغەمبەر بەرامبەر وەفدی هەوازینو ماڵو سامانە دەست بەسەرا گیراوەکەیان لەلایەن موسوڵمانەکانەوە ئەوە دەگەیەنێ کەهەرچی دابەشکرا لە دەستکەوتی شەڕ بەسەر جەنگاوەران دا بۆ ئیمامو سەرکردە ڕەوا نیە بەپێخۆشبوونی خۆیان نەبێ هیچیان لێ وەربگێرێتەوە، دەبێ جەنگاوەرەکان بەڕەزامەندیی خۆیانو بەبێ هیچ لەڕوودامانو زۆرە ملێیەك دەسکەوتە دابەشکراوە کە بگێڕنەوە. ئەتۆ لەدوور بینی پێغەمبەر ورد بەرەوە دەربارەی ئیزن وەرگرتنی بۆ گێڕانەوەی غەنیمەتە دابەشکراوەکە بەسەر جەنگاوەرەکان دا!! ئەوە بوو نەیەویست کیفایەت بەو ڕازیبوونە جەماوەرییە بکا کە دوا بەدوای وتارەکەی هاواریان کردو وتیان «قد طبنا ذلك يا رسول الله» بەوە ڕازین ئەی پێغەمبەری خودا ماڵەکەیان دەدەینەوە! بەڵکوو پێکێشی لەسەر ئەوە کرد کەدەبێ یەکە یەکە بەدەمی خۆیان ئەم ڕەزامەندییە رابگەیەننو لێیان ببیسێ یان هەر کۆمەڵەو نوێنەرێکی خۆیان دابنێنو لەوان ڕەزامەندی ببیسێ.

ئەمە نیشانەی ئەوەیە: کە حاکمو فەرمانڕەوا بۆیان نیە هیچ شتێك لە صەلاحیەتو دەسەلاتی خۆیان بەکاربێنن بۆئەوەی خەڵك هەڵبنێن کە تەنازول بکەن لەبەشێك لەمافو ملكو ماڵی خۆیان. بەڵکوو خودا لەم

بـارەوە هـیچ جـۆرە صـەلاحیاتو ئیمتیـازاتێکی نـەداوە بەفـەرمانڕەواو حاکم، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش بێ.

ئەوەیە عەدالەتکاریو یەکسانی حەقیقی! دەی با هەموو بانگەشەو هاشو هوشێکی ناو بۆشو پوچو رازاوە بەوشەو ڕستەی بریقەدار کە دەکرێنە ئاڕمو شیعاری ئەم حیزبو ئەو حیزب، خۆیان ژێرخاك بکەنو رویان نەیە سەردەربێنن لەبەرامبەر ئەم قییەمو موثولە خودایییەدا.

**٩. سیاسەتی ئیسلام بەرامبەر کەسانی دین دانەمەزراو:**

بێگومـان ئـەتۆ دیـت پێغەمبـەر بۆئـەو مەککەییانـەی سـاڵی فـەتحی مەککـە موسـوڵمان بـوون هەنـدێ دەسـتکەوتی زیـادەی پێـدان، لـەم دابەشـکردنەدا یاسـای موسـاوات و یەکسانی ڕەچـاو نـەکرد بەنیـسبەت جەنگاوەرەکانـەوە. ئـەم کـردەوە کـە پێغەمبـەر پـەیڕەوی کـرد یەکێکـە لەوبەڵگـە گرنگانـەی زوربـەی فوقـەهاو زانایـانی ئیـسلام کردویانـە بەبەڵگەی ئەوە کە دروستە بۆئیمام بەگوێرەی پێویستو بەرژەوەندیی، زێـدە بـەش بـدا بەکەسـانێك بەمەبەسـتی کێـشکردنیان بـۆ ئیـسلامو دامـەزرانی دڵو دەروونیـان لەسـەری. بـەڵکوو هەنـدێ جـار لەبـەر بەرژەوەندیی دەچێتە خانەی واجب بوونەوەو پێویستە زێدەیان بداتێ. هیچ مانیعێکیش نیە کەلەخودی غەنیمەتەکە زێدە بدا.

هەربۆیەشـە بۆئـەو جـۆرە کەسـانە کـەتازە موسـوڵمانبونو دڵو دەروونیـان لەسـەر ئـایین دانەمـەزراوە بەشـێکی تایبـەتی دانـراوە بۆیـان بەناوی بەشی «المؤلفة قلوبهم». ئـەو بەشـە زەکاتـە دەخرێتـە ژێردەسـتی حاکمو فەرمانڕەواوە بۆئەوەی بەگوێرەی پێویستو بەرژەوەندی لێی بدا بەهەندێ کەس!.

**١٠. فەضڵو ڕێزی ئەنصارو ئەندازەی خۆشەویستی پێغەمبەر بۆیان:**

پێغەمبەر ﷺ چەند قسەکەی بەجێ بوو ئەوکاتەی فەرمووی: {إن الشيطان ليجري من ابن آدم مجرى الدم} بێگومان شەیتان وەکوو خوێن بەناو جەستەی ئادەمیزاددا دەسوڕێتەوە. بەڕاستی شەیتان ویستی مانای ڕەخنەگرتنو سەرزەنشت کردنی سیاسەتی پێغەمبەر بخاتە ناودڵو دەروونی ئەنصارەکانەوە، ویستی زمانی ڕەخنەیان درێژبکاو بەرامبەر ئەو سیاسەتەی پێغەمبەر گرتیە بەر بۆدابەشکردنی دەستکەوت، واپێدەچێ شەیتان ویستبیەتی واتەصەور بکەن کە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستی قەومەکەیو خەڵکی زیدو نیشتمانی بەسەری دا زاڵ بووەو خۆشەویستی ئەنصارەکانی لەیاد کردوە.

کاتێك هەواڵی ئەم گلەیی کردنەیان بەپێغەمبەر گەیشتەوە چی پێ فەرموون؟!

بێگومان ئەو وتارەی بۆی دان وەڵامی ئەو وەسوەسەو دڵ ختوکە دانەیان بوو، وەڵامێك بوو پڕبوو لەمانای ناسكو زەوقی بەرزو هەستی خۆشەویستیو سۆزی بێ ئەندازە بۆ یارمەتیدەران. لەهەمان کاتیش دا ئازارو ناڕەحەتی خۆی دەردەبڕێ لەوەی لەلایەن خۆشەویستانیەوە تۆمەتبار بکرێ بەوەی بڕوی ناونو لەبیریان دەکا.

جارێکی تر بگەڕێرەوە بۆ وتارەکەی پێغەمبەرو لێی وردبەرەوە، دەبینی جوانترین سۆزی دڵو ناسکترین هەستی خۆی بۆ دەربڕیون!

بێگومان هەستو شعوری ئەنصارەکان ئەم مانا جوانانەو سۆزو خۆشەویستییەیان هەست پێ کردو وتارەکەی هەژاندنی چۆن هەژاندنێك هەرچی وەسوەسەو خەیاڵو خەتەرەی ناشایستە کە بەدڵیانەوە نووسابوو هەمووی لێتەکاندنو کەوتنە هوتاف کێشانو

دەنگ بەرزکردنەوەی ڕەزامەندیی و گریانی خۆشی و شانازی کردن بە پێغەمبەری خۆیان و بەبەش و باری بۆیان دیاریی کراوە.

چۆن کەیفخۆش نابن پێغەمبەر بەشی ئەوانە، ماڵ و مەڕو بزن و غەنیمەت چ نمودێکیان هەیە لە بەرامبەر ڕەزامەندی پێغەمبەر ﷺ ؟ ئەوان دەگەڕێنەوە پێغەمبەر بەشیانە، پێغەمبەریش لەگەڵیان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ژیان و مردنی لەگەڵ ئەوان بێ. دەبێ چ بەڵگەو نیشانەیەك هەبێ لەمەزیاتر وەفاو سۆزو خۆشەویستی پێغەمبەر بگەیەنێ بۆئەوان: کەبڕیار بدا واز لەزێدو نیشتمانی خۆی بێنێ و باقی ژیانی لەگەڵ ئەوان بەسەر بەرێ؟

لەلایەکی ترەوە کەی ماڵ و سامان لەتەرازوی پێغەمبەردا نیشانەی ڕێزو خۆشەویستی بووە؟

بێگومان پێغەمبەر ﷺ ماڵ و سامانی زۆری دا بەقوڕەیشییەکان ئایا هیچی بۆخۆی بەتایبەتی دانا؟ یان بەشی خۆی وەکوو بەشی ئەنصارەکان دانا؟ ئەوە بوو دەستی خستە ناو ئەو پێنج یەکەی: کەخودا دایناوە بەشی پێغەمبەر بێ و بۆخۆی چۆنی خەرج دەکا بیکا، دەی پێغەمبەر ﷺ دابەشی کرد بەسەر ئەو عەرەبە دەشتەکییانەی لەدەورو بەری بوون.

تێفکرە لەو فەرموودەیەی ئاڕاستەی کردن لەوکاتەدا کەدەوریان دابوو داوای بەخششی زیاتریان دەکرد. پێی فەرموون: «أیها الناس، والله مالی من فیئکم إلا الخمس والخمس مردود علیکم». ئەی خەڵکینە! سوێندم بەخودا من لەودەستکەوتە پێنجیەکم هەیە، ئەو پێنجیەکەش بەسەر ئێوەدا دابەش دەکرێتەوە صەلات و سەلامی خودا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر! لەسەرخۆت هاوەڵانت لەموهاجیرین و ئەنصار، هیوادارین داواکارین خودا بەدیداریی پیرۆزت شادمانمان بکاو کۆمان بکاتەوە

لەژێر ئاڵای پیرۆزت، بمانخاتە گەڵ ئەوانەی بەخزمەتت دەگەن بەدیدارت شاد دەبن لەسەر حەوزی کەوثەر لەڕۆژی رستاخیز دا.

## غەزای تەبوك

هۆکاری ئەم غەزایە وەکوو ئیبنو سەعدو هی تریش ریوایەتیان کردوە ئەوەیە: کە بەهۆی «الأنباط»ەکانەوە کەلەنێوان شامو مەدینەدا بازرگانییان دەکرد، هەواڵ بەپێغەمبەر گەیشت کە ڕۆمەکان لەشکرێکی گەورەیان کۆکردۆتەوە، هۆزەکانی لەخمو جوذامو هی تریش لەو عەرەبە مەسیحیانەی وڵاتی شام کەلەژێر دەسەڵاتی رۆمەکان دا بوون، ئەوانیشیان لەگەڵ خۆیان کێش کردووەو هێناویانن‌و پێشەتایان گەیشتۆتە خاکی «البلقاء». پێغەمبەر ﷺ دوا بەدوای بیستنی ئەم هەواڵە موسوڵمانەکانی هەڵنا بۆ چون بۆغەزا. طەبەرانی لەحەدیثی ئیبنوحوصەین دا ریوایەتی کردوە دەڵێ: ژمارەی سوپای رۆم چل هەزار شەڕکەربوو، چون بۆئەم غەزایە رێکەوتی مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی بووە، وەرزەکە وەرزی هاوین‌و تریَ گەنان بوو، تینی گەرما گەیشتبووە ئەوپەڕی‌و خەڵك گوزەران تەنگ بوون. میوەی مەدینە لەوکاتەدا خەریك بوو پێ دەگەیی‌و دەهاتە بەرهەم. بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئیعلانی ئەو لایەی کرد کەسوپای ئیسلام روی تێدەکا. لەغەزاکانی تردا پێشوەخت جیهەتی روتێکردنی سوپای دیاریی نەدەکرد، بەڵام لەم غەزایەدا لەکاتی خۆئامادەکردن دا لایەنی مەبەست بەشەڕی راگەیاندو موسوڵمانانی هەڵنا کەئامادەباشی تەواوی بۆبکەن.

کەعبی کوڕی مالیك دەڵێ: لەوەپێش پێغەمبەر بۆهەر غەزایەك بچوایە سەرنجی خەڵکەکەی بۆلای جێگەیەك رادەکێشا. کەجودا بوو لەو شوێنەی بەفیعلی جەنگاوەرانی بۆدەبرد. بەڵام کە غەزای تەبوك روی دا

پێغەمبەر ﷺ لەوەرزێکی زۆرگەرمو ناخۆش دا کەوتەڕێ بۆ سەفەرێکی درێــژو بڕینــی مەســافەیەکی زۆرو شــەڕکردن لەگــەڵ دوژمنێکــی زۆرو بەهێزدا، پێشوەخت غایەو نیازی خۆی بۆ هاوەڵانی درکاندو دوژمنی شەڕ لەگەڵ کراوی داهاتوی دیاری کرد، مەبەستو رێڕەوی غەزاکەی راگەیاند، بۆئەوەی باش خۆی بۆئامادە بکەنو ئەسبابی پێویست لەگەڵ خۆیان بەرن!.

ئاوا بەو جۆرە ئەم سەفەرە سەفەرێکی قورسو گران بوو لەسەر نەفسو دەروون، تاقیکردنەوەیەکی توندو تیژبوو تابڵێی پڕ چورتمو ناڕەحەتی بوو، بۆقو زوڕنای دوو ڕووەکان لێرەو لەوێ کەوتنە خۆو، هەوڵیان دەدا جەنگاوەران لەچون بۆئەو غەزایە پشت ساردبکەنەوە، لەهەمان کات دا ئیمانی راستەقینەی ئیمانداران لەدڵی خاوەنەکانیان دا ڕەنگی دەدایەوە. دوو ڕووەکان کەوتنە خۆ بۆئەوەی موسوڵمانان لەچون بۆئەو غەزایە پەشیمان بکەنەوە، ئەوەبوو هەندێکیان بەهەندێکیان دەگوت: کاتەکە کاتی سەفەر کردن نیەو وەرزی گەرمایەو مەچن بۆغەزاو خۆتان بەفەتارە مەدەن. یەکێکی تریان هاتە خزمەت پێغەمبەرو عەرزی کرد رێگام بدە بامن نەیەمو توشی فیتنەیی کاری خراپ نەبم، سوێندم بەخودا من زۆرم ئارەزو لەژنەو خزمەکانم شاهیدن، من ترسی ئەوەم هەیە چاوم بەئافرەتی ڕۆمی بکەوێ خۆڕانەگرمو نەتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم، پێغەمبەر روی لێ وەرگێڕا ئیزنی دا کەنەچێ.

سەرۆکی دووڕووەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبوسەلول لەقەراخ مەدینەدا لەگەڵ چەند تاقمێ: لەهەوا خواهانی خڕبوونەوە، کەپێغەمبەر ﷺ بەرەو دەڤەری تەبوك کەوتەڕێ عەبدوڵڵاو هەموو ئەوانەی لەگەڵی بوون خۆیان پاش داو نەچون بۆغەزاکە. قورئانی پیرۆز دەربارەی هەوڵو تێکۆشانی دووڕووەکان بۆ پشت سارد کردنەوەی جەنگاوەران لەچون بۆشەڕ دەفەرموێ: {فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ

رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ} «سورة التوبة،٨١».

یان دەفەرمویٚ: {وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلاَ تَفْتِنِّي أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُواْ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ } «سورة التوبة،٤٩».

لەهەمان کات دا موسوڵمانە دڵسۆزو فیداکارەکان لەهەموو لایەکەوە لەپێغەمبەر خڕبوونەوەو ئامادەباشی خۆیان ڕاگەیاند. پێغەمبەر ﷺ دەوڵەمەندەکانی هەڵنا بۆ پێشکەشکردنی ماڵو سامان و ولاخی سواری و چەك و پێداویستی جەنگی چاوەڕوانکراو. زۆر لەموسوڵمانە خاوەن سامانەکان چی لەتوانایان دا بوو پێشکەشیان کرد. عوسمانی کوڕی عەفان سێ سەد حوشتری بەسەر جل و گوریس و قەیاسەوە هێناو خستیە بەردەستی پێغەمبەرو هەزار دیناریشی کردە کۆشی پیرۆزیەوە، پێغەمبەر کەئەمەی دی، فەرمووی: «لايضر عثمان مافعل بعدها». لەئێستا بەولاوە عوسمان چی بکا زیانی پێ ناگا«[١]».

حەزرەتی ئەبوبەکر هەرچی هەیبوو هێنای، ئیمامی عومەر نیوەی ماڵو سامانی خۆی هێنا. تیرمزی لەزەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لەباوکییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: لەعومەری کوڕی خەطابم ژنەوت دەیفەرموو: پێغەمبەر فەرمانی پێ کردین و هەڵی ناین کەهاوکاریی ماڵی بکەین و چەندێك لەتوانام دا هەیە ماڵو سامانی خۆمان ببەخشین، لەوکاتەدا وارێ کەوت من ماڵێکم لەدەست دا بوو بڕیارم دا گوژمەی خۆم بوەشێنم وتم: ئەمڕۆ پێش ئەبوبەکر دەکەوم، بۆم ڕێ کەوتووە دەڵێ رێك چیم هەبوو کردم بەنیوە، نیوەی سامانم هێنا پێغەمبەر فەرمووی: چەندت بۆماڵو منداڵت گل داوەتەوە؟ عەرزم کرد بەئەندازەی ئەوەی هێناومە، حەزرەتی ئەبوبەکر هات هەرچی هەیبوو هەمووی هێنابوو،

---

١ رواه الترمذي في سننه، والإمام أحمد في مسنده.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت بۆماڵو منداڵت بەجێ هێشتووە ئەی ئەبوبەکر؟ وتی: خوداو پێغەمبەرم بۆجێ هێشتون. ئیتر وتم: لەهیچ شتێك دا من پێش ئەبوبەکر ناکەوم.

کۆمەڵێك پیاوی موسوڵمان هاتن داوایان لەپێغەمبەر کرد وڵاخی سوارییان بۆ دەستەبەربکا بۆئەوەی بچن بۆغەزا پێغەمبەر پێی فەرموون: وڵاخم نیە بتاندەمێ و ناتوانم بتانکەم بەسوارە. بەنائومێدی و چاوپڕلەگریان گەڕانەوە خەمبارو نارەحەت بەوەی کەپێداویستی چون بۆ غەزایان بۆدەستەبەر نەبوو، ئەم کۆمەڵە نازناوی «البکائون»یان بەسەردا بڕاوە.

پێغەمبەر ﷺ بەنزیکەی «٣٠»سی هەزار جەنگاوەرەوە لەموسوڵمانان لەمەدینە دەرچوو بەرەو تەبوك. کۆمەڵێك موسوڵمان بەهۆی تەمبەڵی و کەمتەرخەمییەوە دواکەوتن. لەوانە کەعبی کوڕی مالیك و «مرارە»ی کوڕی «الربیع»و هیلالی کوڕی ئومەییەو ئەبوخەیثەمە بوون. ئەمانە وەکوو ئیبنوئیسحاق دەڵێ: کۆمەڵێکی موسوڵمان بون و تۆمەتی دوو روییان لێ ناکرێ. ئەبو خەیثەمە دوایی شوێن لەشکرەکە کەوت توانی لەتەبوك بەپێغەمبەر بگاتەوە، بەڵام ئەوانی تر بەتەمبەڵی و کەمتەرخەمی خۆیان پاش داو نەچون.

طەبەرانی و ئیبنوئیسحاق و واقیدی ریوایەتیان کردوە دەڵێن: ئەبوخەیثەمە دوای ئەوەی پێغەمبەر لەمەدینە دەرچوو بوو چەند رۆژێکیشی بەسەردا تێپەڕی بوو لەڕۆژێکی گەرمادا هاتەوە بۆماڵەوە هەردو خێزانەکەی هەریەکەیان لەناو باخەکەی دا خێمەو ساباتێکی رابەستوو ناو ماڵەکەیان رازاندبوەوە، ئاورشێنیان کردبوو ئاوی ساردو خواردنی خۆشیان ئامادەکردبوو، کەهاتە ژورەوە لەدەرگای ساباتەکە راوەستاو سەیری خێزانەکانی کردو روانییە رێکخستنی ماڵو ناو

ماڵیـان و خۆئامادەکردنیـان بـۆ پێـشوازیی لـێ کردنـی!! وتـی: ئێـستا پێغەمبەر لەناو گەرماو بەرخۆر دا بێ و ڕەشەبا لێی بداو ئەبوخەیثەمە لـەژێر سـێبەر دابـێ و ئـاوی سـاردو خـواردنی خـۆش و سفرەو خـوان ئامادەکرابـێ ژنـی جـوانی خزمـەتی بکـا؟! بـەخودا ئەمـە ویـژدان نیـە، ئەمجار وتی: وەڵڵاهی نایەمە ژێر خێمەی هیچ کامتان تاخۆم نەگەیەنمە خزمـەت پێغەمبـەر هـەدانادەم. خێزانـەکانی تێـشوویان بـۆ ئامـادەکرد، حوشـترێکی هێنـاو سـواری بـوو، کەوتـە شـوێن پێغەمبـەر ﷺ هـەتا لەتـەبوك بەخزمـەتی گەیـشت. کەئەبوخـەیثـەمـە لەسـوپای موسـوڵمانان نزیـك بـۆوە، وتیـان: ئـەوە لـەدوورەوە سـوارێك دیـارە بـەرەو ئێمـەدێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوابکا ئەبوخەیثەمە بێ! تۆزێك نزیك بۆوە، وتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـودا! وەڵـلا ئـەوە ئەبوخـەیثـەمە بـوو. جاکـە حوشـترەکەی یـیخ دا، بـەرەو پێغەمبـەر ڕۆیـشت و بەخزمـەتی گـەیی. پێغەمبەر فەرمووی: ئەم هاتنەت باشبوو. ئەمجار بەسەربوردەی خۆی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، پێغەمبەریش دوعای خێری بۆکرد.

موسوڵمانان لـەم سـەرەفەرەدا توشـی مەینـەتی و ناخۆشـی و چورتم و ماندوبوونی زۆربوون.

ئیمـام ئەحمـەدو هـی تـریش ریوایـەتیان کـردووە کەلـەو سـەفەرەدا وڵاخی سواری زۆرکەم بوو، موسوڵمانەکان بەنۆرە سواری وڵاخ دەبوون، وادەبـوو بەدووکـەس یـان سـێ کـەس حوشـترێکیان بەرکـەوتبوو. تینوایەتیـەکی زۆر تـەنگی پـێ هەڵـچنین، تاوایـان لێهـات ناچـاربن حوشترەکانیان سەببڕن ئاوی ورگیان بۆخواردنەوە بەکاربێنن«١».

---

١ رواه ابن سعد في طبقاته ٣م٢٢٠.

هەروەها ئیمام ئەحمەد لەموسنەدەکەی دا لەئەبوهورەیرەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: لەغەزای تەبوك دا خەڵکەکە توشی برسییەتی بوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر ئیزنمان بدەی حوشترەکانمان سەربڕینو بیانخۆین، پێی فەرموون: باشە سەریان بڕن. عومەری کوڕی خەطاب وتی: ئەی پێغەمبەر ئەگەر بەردەوام بن لەسەر حوشتر سەبڕین، ولاخی سوارییان کەم دەبێ. باباقی ماندەی توێشوەکانیان بهێنن تێکەڵاوی بکەنو دوعای بەرەکەتیان بۆبکە، بەڵکوو خودا بەرەکەتی تێبخاو برسیایەتی لەسەرمان بڕەوێنێتەوە. پێغەمبەر ﷺ داوای کرد چارەکەیەکیان راخستو فەرمووی چیتان پێ ماوە لەخواردەمەنی بیخەنە سەر ئەو چارەکەیە هەبوو لویچێکی گەنمەشامی پێ مابوو، هەیانبوو چنگە خورمایەکی پێ بوو، هەبوو چەند گوێچکە نانی پێ بوو، هەرکەسە لەعاست خۆیەوە چی لامابوو خستیە سەرچارەکەو کەمێك خۆراك لەسەر چارەکەکە کۆبۆوە، پاشان پێغەمبەر دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێندو ئەمجار فەرمووی هەرکەس هەمبانەو تێشودانەکەی لێ پڕبکا. هاوەڵان توێشودانی خۆیان لێ هاخنین، تەنانەت لەسەربازخانەکەدا توێشودانێك نەما پڕنەکرێ، هەرکەسەو تورەکە خواردنی خۆی پڕکردو تێریشیان لێ خوارد، زیادەش مایەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لايلقى الله بهما عبد غيرشاك فتحجب عنه الجنة}«١» شایەتی دەدەم هیچ خودا نین جگە لە «الله»و منیش پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام، ئەو دوو کەلیمەی شایەتومانە هەرکەسێك لەسەریان بەردەوام بێو بەو بڕوایەوە بگەڕێتەوە بۆلای خودا بەهەشتی لێ یاساغ نابێ.

---

١ رواه أحمد في مسنده وأورده الحافظ ابن كثير في تأريخه، ثم قال وراه مسلم عن أبي كريب عن أبي معاوية عن الأعمش.

جا کەسوپای ئیسلام گەیشتە تەبوك کەسیان نەبینی بەرەنگاریان بێتەوە چ شەڕو هەرایان توش نەبوو، ئەوانەی کۆبوونەوە بۆشەڕو پەلامار دان بڵاوەیان کردبوو هەرتاقمەیان بەلایەك دا ڕۆیشتبوو. پاشان یوحنە حاکمی «أیلە» هاتە خزمەت پێغەمبەرو صوڵحی لەگەڵ کرد لەسەر ئەوە سەرانە «جزیە»بدا. دانیشتوانی حەرباءو ئەزروح هاتن بۆ خزمەتی و بەڵێنی ئەوەیان دا سەرانە بدەن، پێغەمبەر گرێبەستێکی بەو ڕێککەوتنە بۆ نووسین.

سوپای موسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا بەوڵاتی حیجردا تێپەڕین کە شوێنەواری قەومی ثەموود بوو، پێغەمبەر بەهاوەڵانی فەرموو: مەچنە ناو خاكو کەلاوە کۆنی کەسانێك کەستەمکار بونو ستەمیان لەخۆیان کردوە، نەبادا ئەو عەزابەی توشی ئەوان بوو توشی ئێوەش بێ. مەگەر بەگریانەوە پێیدا بڕۆن، پاشان سەری خۆی داپۆشی و بەپەلە پێیدا تێپەڕی[1].

پاشان پێغەمبەر بەرەو مەدینە گەڕایەوە. کەتەشریفی شاری مەدینەی لێ دەرکەوت بەهاوەڵانی فەرموو: ئەوە مەدینەیە «طابەیە»، ئەوە کێوی ئوحودە خۆشمان دەوێو خۆشی دەوێین«[2]». ئەمجار بەهاوەڵانی فەرموو: لەمەدینەدا کەسانێك هەن لەگەڵ ئێوە نەبوون، ئێوە هەر ڕێگاو شیوو دۆڵێکتان بڕیبێ ئەوانیش بەدڵ لەگەڵ ئێوە بوونو خێری ئێوەیان دەگاتێ. وتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەوانە لەمەدینەدا ماونەوەو عوزریان هەبوو بۆنەهاتنو هاوبەشی نەکردن«[3]».

---

١ متفق علیه .

٢ متفق علیه.

٣ متفق علیه.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دا لەڕەمەزانی هەمان ساڵ دا گەیشتەوە مەدینە، نزیکەی دوومانگ بوو لەمەدینە دەرچوو بوو.

## کاری ئەوانەی لەچون بۆ غەزا دواکەوتبون:

کاتێك پێغەمبەر هاتەوە ناو مەدینە، سەرەتا چووە مزگەوتو دوو ڕکات نوێژی کرد. پاشان دانیشت بۆ حەلکردنی کێشەی خەڵك، ئەوانەی دواکەوتبوون لەچون بۆغەزا هاتنە خزمەتیو عوزریان بۆهێنایەوەو سوێندیان بۆخواردو کەوتنە کڕوزانەوە، ژمارەیان هەشتاو ئەوەندە پیاوە بوون. پێغەمبەر ﷺ بەڕواڵەت عوزرەکانیانی لێ قبوڵ کردنو داوای لێخۆشبوونی بۆکردن. ئیشی کەعبو دووهاوەڵەکەی دواخست تائایەتی قورئان نازڵ بوو بەقبوڵکردنی تۆبەو پەشیمانبوونەوەیان.

کەعب بۆخۆی سەرگوزشتەی خۆی دەگێڕێتەوە، لەحەدیثێکی دورو درێژ دا بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردوە، تێیدا هاتووە دەڵێ: «سەرگوزشتەی من ئەوەیە، من هەرگیز لەژیان دا لەوکاتە بەهێزترو دەوڵەمەندتر نەبووم، کەخۆم لەغەزا دواخست...، کەبانگی غەزا هەڵدرا من خەریکی خۆئامادەکردن بووم بۆئەوەی لەگەڵ موسوڵمانان بچم بۆغەزا، هەردەهاتمو دەچوومو هیچم حازرنەدەکرد، لەدڵی خۆم دا دەمگوت: من توانام هەیە هیچ شتێك نیە ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم چونم دا، ئیتر هەرکەمتەر خەمیم کردو ئیشی ئەمڕۆم خستە سبەینێ، هەتاماوە تەنگ بوو، خەڵك خۆیان حازرکردو من هیچ، خەڵك پەلەیان کردو من تەمبەڵی، تاکاتێکم زانی خەڵك کەوتنە سەر سەفەرو لەمەدینە دەرچوونو بەڕێ کەوتن، ویستم دوای ئەوان خۆم حازربکەمو بیانگەمێ خۆزگە وام بکردایە بەڵام نەمتوانیو بۆم نەگونجاو دواکەوتم، لەوەدوا

کەدەچـوومە ناوخـەڵك دوای ڕۆیـشتنی پێغەمبـەر ﷺ دەسـوڕامەوە، خەمو خەفەت دایدەگرتم، چونکە هەر پیاوی پەککەوتەو پیاوی دووڕووم دەدیتن، کەهەواڵی گەڕانەوەی پێغەمبەرم بیست، خەمی ئەوەم لـێ پەیدا بـوو، چ درۆیـەك بکـەمو چـۆن خـۆم لـەتوڕەیی پێغەمبـەر ڕزگـار بکـەم؟! راوێـژو پـرس و رام بەعاقڵمەنـدانی ناسـیاوو خـزمم کـرد. کەهـەواڵی گەیشتنەوەی پێغەمبەرم پێگەیی بۆمەدینە، بڕیارم دا پشت بەشتی پـوچ نەبەستمو چی راستە ئەوە بڵێمو عوزری بەدرۆنەهێنمەوە. ئیتر چوومە خزمەتی، کەسەلامم لـێ کرد زەردەخەنەیەکی رق هەڵساوانەی بەرامبـەرم کرد، پاشان فەرمووی: وەرە چومە بەردەمی چۆکم دادا، فـەرمووی: چـی تۆی لەچون بۆ غـەزا دواخست؟! ئـەتۆ لای خـۆی وڵاخـی سواریت کـڕی بـوو، وتم بـەڵێ. سـوێندم بـەخودا مـن ئەگـەر لـەلای یـەکێکی تـر جگـە لەجەنابت دابنیشتمایە دەمتوانی عوزری بۆبێنمەوەو خۆم لەتوڕەیی ئەو ڕزگـار بکردایـە، ئـەمن دەمو لـەفظـێکـی وام پێوەیـە دەتـوانم قەناعـەت بەبەرامبـەرم بکـەم، بـەلام سوێندم بـەخودا مـن دەزانمو دڵنیـام ئەگـەر مـن ئەمڕۆ بەدرۆ عوزرو بیانوو بۆجەنابت بێنمـەوەو پێـی رازی بـێ، لەوانەیە دوایی خودا درۆیەکەم دەربخاو رقی تۆم لـی هەڵسێنێ، ئەگـەر بە‌ڕاسـتی وەلامت بدەمەوەو لێم توڕەبی ڕەجام وایـە خـودا لـێم ببـورێو بەرعـەفوی خـودا بکـەوم. بەخودا مـن هـیچ عـوزرم نـەبوون، وەڵڵاهـی هـیچ کاتـێ مـن لەوکاتـە بـەهێزترو دەوڵەمەنـدتر نـەبووم کەلەغـەزا دواکـەوتم، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئەم راست ڕۆیی و پێچو پـەنای لـەعوزر هێنانەوەکـەی دا نەکرد، هەڵسە بڕۆ تاخودا بڕیار دەربارەی تۆ دەردەکا. هەڵسام کۆمەڵێك پیـاوی بـەنو سـەلەمە شـوێنم کـەوتن سەرزەنـشتیان دەکـردم، پـێم گـوتن: ئایا کەسی تر وەکوو منی لـێ بەسەرهاتووە؟ وتیان بەڵێ، دووپیـاوی تـر وەکوو تۆ عوزریان هێنایەوەو پێغەمبەر ﷺ چی بەتۆ فەرموو بـەوانیش

هەروا. وتم ئەو دووپیاوە کێن؟ وتیان مورارەی کوڕی «الربیع»و هیلالی کوڕی ئومەییە، ناوی ئەو دووپیاوە صالحە یان هێنا، کە هاوبەشی غەزای بەدریان کردبوو، من زۆر ڕەوشتی باش و کاری جوان لەوان فێربوم. پێغەمبەر ﷺ نەهی لەموسوڵمانان کرد کەقسەمان لەگەڵ دا بکەن، واتە زێدە لەو هەموو خەڵکەی لەغەزا دواکەوتبوون تەنها فەرمانی کرد دەنگ لەم سێ کەسەمان دابڕن، خەڵك دەنگی لێ دابڕین، لێمان دوورە پەرێز دەوەستان، هەتا دونیام لەپێش چاو گۆڕا، زەوی لەپێش چاوم ئەو زەوییەی لەوەپێش نەبوو، پەنجا شەو بەوحاڵەماینەوە، دوو هاوەڵەکەم لەماڵ دانیشتن و دەستیان کرد بەگریان و گۆشەگیر بون، بەڵام من دەهاتمە ناو خەڵکەوەو موناقەشەو دەمە دەمێم لەگەڵ دەکردن.

دەچومە دەرەوە حازری جومعەو جەماعەت دەبووم، بەبازاڕدا دەسووڕامەوە، کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم. دەچومە خزمەت پێغەمبەرو سڵاوم لێ دەکرد، ئەو لەشوێنی خۆی لەمیحراب دانیشتبوو دوای نوێژ، لەدڵی خۆم دا دەمگوت: دەبێ پێغەمبەر لێوی جوڵاندبن بۆ وەڵامدانەوەی سڵاوەکەم، پاشان وام دەکرد لەنزیکیەوە نوێژبکەم و تیلەی چاوم دەدایە ئاخۆ بۆم دەڕوانێ، دەمدی کە خەریکی نوێژەکەم دەبووم روی تێدەکردم، کەسەیرم دەکرد روی لێ وەردەگێڕام. لەکاتێك دا من بەناو بازاڕی مەدینەدا دەسوڕامەوە، کابرایەکی نەبەطی لەنەبەطییەکانی شام ئەوانە خواردنیان دەهێنا بۆمەدینە بۆفرۆشتن، گوێم لێ بوو دەیگوت: کەعبی کوڕی مالیك کێیەو لەکوێیە؟ خەڵکەکە منیان پێ نیشان داو هات بۆلام نامەیەکی مەلیکی غەسانی دایە دەستم، تێیدا نوسرابوو بیستومانە برادەرەکەت واتە «پێغەمبەر» ستەمی لێ کردوی و دەنگی لێ دابڕیوی، ئەتۆ پیاوی ئەوەنیت سوکایەتیت پێ بکرێ و مافت پێشێل بکرێ. پەیوەندی بەئێمەوە بکە دڵخۆشیت

دەدەینەوە ڕێزت لێ دەگرین. کەعب دەڵێ: کەنامەکەم خوێندەوە ڕقم هەڵساو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرو ئیسلام هەژاندمی و وتم: ئەمەش بەڵایەکەو جۆرێکە لەتاقیکردنەوە، ئیتر یەکسەر نامەکەم خستە ناو تەندورەوەو سوتاندم. ئیتر چل شەو تێپەڕی لەپەنجا شەوەکە، کاتێکم بەخۆزانی هاوەڵێکی ڕەوانەکراو لەلایەن پێغەمبەرەوە هاتە لام وتی: ئەوە پێغەمبەری خودا فەرمانت پێ دەکا کە لەخێزانت دابڕێی، وتم: ژنەکەم تەڵاق بدەم یان چی؟ وتی، نا، بەس لێی دووربکەرەوە، هەمان فەرمانیشی بەدوو هاوەڵەکەم کردبوو، پیاوی ناردبوونەلایان کەلەخێزانەکانیان دووربکەونەوە. ئیتر منیش ناچار بەخێزانم گوت بڕۆرەوە بۆماڵی باوانت و لای ئەوان بمێنەوە بابزانین خودا چیمان لێ دەکا. خێزانم ڕۆیشتەوە بۆماڵی باوانی «دە» ڕۆژی تر بەو حاڵە مامەوە، تا پەنجا شەو تەواو بوو واتە پەنجا شەو تێپەڕی بەسەر دەنگ لێدابڕانمان لەلایەن پێغەمبەرو هاوەڵانەوە. کەبەیانی پەنجایەمین شەو نوێژی بەیانیم لەماڵەوە کردو لەسەربانی ماڵەوەمان بەخەمباری و شپرێوی دانیشتبوم، لەو حاڵەدا بوم کە خودا دەربارەمان دەفەرموێ: {حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ} «١١٨» سورة التوبة. گوێم لەدەنگی بانگکەرێك بوو لەسەر تەپۆڵکە «سلع» بەهەموو دەنگی هاواری دەکرد ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدەت لێ بێ، چومە سوژدەو سوژدەی شوکرم بۆخودا برد، زانیم کە دەرگای خێرم لێ کراوەتەوەو پێغەمبەر لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی ئیعلانی قبوڵبوونی تۆبەمانی لەلایەن خوداوە، کردبوو، خەڵکەکە هاتبوون بۆلام موژدەم بدەنێ و هەندێکیشیان چوبوون بۆلای دووهاوەڵەکەم موژدەیان بدەنێ. جا کەئەوکەسەی هاتبوو موژدەم بداتێ و گوێم لەدەنگی بوو

گەیشته لامو مـوژدەی دامـێ پۆشـاکەکەم داکەنـدو کردمـە بـەری ئـەو بـەناوی موژدانـەوە. سـوێندم بـەخودا ئـەو رۆژە جگـە لـەو دووپارچـە پۆشاکە هیچی تـرم نـەبوو، دوایـی دووپارچـە قوماشـی تـرم بەئەمانـەت وەرگرت کردمە بەرمو هاتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ خەڵکەکە کۆمەڵ کۆمەڵ بەپیرمەوە دەهاتنو پیرۆزباییان لـێ دەکردم کەوا تۆبـەم لـێ وەرگیراوە. چـومە نـاو مزگەوتـەوە روانـیم: پێغەمبـەر ﷺ دانیـشتبوو خـەڵك بەدەوریيەوە بوون طەلحەی کوڕی عەبدوڵلا بەڕاکردن بەرەو پیرم هاتو تۆقـەی لەگـەڵ دا کـردمو پیرۆزبـایی لـێ کـردم، سـوێندم بـەخودا جگـە لەئەوکـەس لـەموهاجیرو ئەنـصار هەڵنەسـتا. بۆیـە مـن هـەرگیز ئـەو هەڵوێستەی طەلحەم لەیاد ناچێتەوە.

کـەعب دەڵـێ: کـە سـلاوم لەپێغەمبـەر کـرد روخـساری لەخۆشـیان دەدرەوشـایەوە، فـەرمووی: مـوژدەت لـێ بـێ بەخۆشـترین رۆژێـك کەبەسەرت دا هاتووە، لەوەتای لەدایك بووی رۆژی وا پیرۆزت نەهاتۆتە ڕێ.

کەعب دەڵێ: وتم: ئایا ئەم لێخۆشبوونو عەفوە لەلایەن تۆوەیە ئەی پێغەمبـەری خـودا یـان لەخوداوەیـە؟ پێغەمبـەر فـەرمووی: لەلایـەن خوداوەیە. دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبـەری خـودا! هەرچی ماڵو سامانم هەیە دەیکەمە خێرو صەدەقە لەخۆشی ئەم تۆبە قبوڵ بوونەم. پێغەمبـەر فـەرمووی نـا هەنـدێ مـاڵو سـامانت بۆخـۆت بهێڵـەوە هـەمووی مەکـە بەخێر. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەی کەمنی رزگار کرد راستگۆیی بـوو، بەشێك لەتۆبـەم ئەوەیـە کـە جگـە لەراسـتی قسەی ترنەکـەم هـەتا لەژیاندابم.

ئـیتر پـەروەردگار ئـەم ئایەتـەی نـازڵ کـردە سـەر دڵو دەروونـی پێغەمبەرو فەرمووی: {لَقَد تَّـابَ اللهُ عَلَـى النَّبِـيِّ وَالْمُهَـاجِرِينَ وَالأَنـصَارِ ....

تادەگاتە .... {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ} «سورة التوبة، ١١٧-١١٩».

**پەندو ئامۆژگاریی:**

**یەکەم: وتەیەك لەپەراوێزی ئەم غەزایەدا:**

ئایینی ئیسلام هەنگاو بەهەنگاو قۆناغ بەقۆناغ لەناو نیوە دوورگەی عەرەبی دا جێگیر دەبوو، دەسەڵاتی لەسەر دڵو دەروونەکان پەیدا دەکردو جەماوەری زۆر دەبوو، پەناگرتن بەخودا پەلو پۆی دەکردنو ڕەگی دادەکوتا، ئەمەش دیاردەیەك بوو ڕۆمەکان بەدڵەراوکێو حەزەرەوە لەدوورەوە چاودێرییان دەکرد.

ڕۆمانەکان ئایینی نەصرانییان بەقەناعەتەوە وەرنەگرتبوو، هەر بۆیە ببونە مەسیحی بۆئەوەی ئایینەکە بکەنە کوتەکی دەستیان بۆچەوساندنەوەی نەتەوەکانی ئەو ناوچەو هەرێمە. لەبەر ئەوە تەلاعوبیان بەو ئایینە کرد، بەویستی خۆیان گۆڕانکارییان تێداکرد، زۆریان لێ لابرد، زۆریان پێوەنا، هیدایەتو ئامۆژگارییەکانی ئەو ئایینە پیرۆزەیان تێکەڵاوی بتپەرستی خۆیان کرد، زۆریان یاساو دابو نەریتی بەتاڵو پوچی خۆیان خستبوە پاڵ ئەو ئایینە پیرۆزەو شێواندبوویان.

ئایینی ئیسلام کە ئایینێکە بانگەوازیی بۆکردنی لەسەر زوبانی هەموو پێغەمبەران دوبارەو سێبارە بۆتەوە، هەموو پێغەمبەران ئاماژەیان بەناوەڕۆکی کردوە. پوختەو کرۆکی ئایینی ئیسلامیش بۆئەوە هاتووە خەڵك لەژێر دەسەڵاتو بەندایەتی مرۆۆ ڕزگاربکاو بیانکاتە بەندەی ڕاستاڵی خوداپەرست. ملکەچی کەس نەبن جگە لەخودا، کەس دەسەڵاتی ئەوەی نەبێ خۆبکاتە ملهوڕو بەئارەزۆی خۆی

بیانچەوسێنێتەوە. بەئاشکرا بانگەوازیی ئەو ئایینە ئەوەیە دەسەڵاتی حەقیقی هی خودایە، بەندایەتی هەربۆ ئەو دەکرێ، حوکمو بڕیار هی ئەوەو هەربۆئەو ئادەمیزاد ملکەچی دەنوێنێ.

ئەو رۆمانە لەئایینی نەصرانی ئەم حەقیقەتانەیان زانیبوون و دەیانزانی بڵاو بوونەوەو گەشەسەندنی ئیسلام چەند خەتەرە بۆسەر دەسەڵاتی ئەوان. دەیانزانی ئایینی ئیسلام دوا پەیامی ئاسمانییەو لەناوەرۆکی خۆی دا هەڕەشەو خەتەری هەڵگرتووە دژی فەرمانڕەوایی هەموو ملهوڕو دەسەڵاتی بوغڕاو خۆبەخودا زانان.

کەوابوو جێگای سەرسوڕمان نییە ئایینی ئیسلام «کە لەجەزیرەی عەرەبی دا جێگیر بووە» ببێتە سەرچاوەی دڵە ڕاوکێ و ترس وبیم بۆ ملهوڕەکانی رۆم و دارودەستەو یاساوڵەکانیان. ئەوانەی هەر بەڕواڵەت بوونە نەصرانی و هەربۆئەوە ئەو ئایینەیان وەرگرتووە ببێتە ضەمان بۆ فراوان بوونی دەسەڵاتیان و درێژە دان بە ملهوڕی و چەوساندنەوەی چینی هەژارو بێ دەسەڵات. بۆیە هەواڵی فەتحی مەککەو سەرکەوتنی موسوڵمانەکان و باڵادەستییان بەسەرخاکی نیوە دوورگەی عەرەبی دا، وەکوو بومەلەرزە هەژاندنی و بەترس و راچڵەکینەوە ئەو هەواڵەیان وەرگرت. پاشان کەوتنە خۆو دەستیان کرد بەجم و جوڵ و تەگبیرو ڕاو کۆکردنەوەی هێزو ئامادەکردنی هەموو پێداویستییەکی روبەڕوبوونەوە، بەڵکوو خۆیان رابگرن لەبەردەم تەوژمی ئەو ئایینەی دڵنیان ئەگەر سەربکەوێ و بڵاوببێتەوە تەخت و بەختیان ژێرەو ژوور دەکاو دەسەڵات و فەرمانڕەواییان قەڵاچۆ دەکا. بێگومان ئەم گرنگیدانەی رۆمەکان بەڕوداوەکانی ناو جەزیرەو چاودێریکردنیان بۆ جم و جۆڵی موسوڵمانەکان داخوازی ئەوەبوو کە تێکهەڵچون و شەڕی نێوان ئەوان و موسوڵمانەکان شەڕێکی گەورەو خەتەرو خوێناوی بێ.

بـەڵام حیکمــەتی خــودا وای ویــست کەلــەم غەزایــەدا کیفایــەت بــەو ئامادەباشــی و مانــدوبون و ڕێگـای دووربــڕین و تەحــەمولکردنی برســی و تینویەتیـە بکـرێ و شـەڕ رونـەدا. سـوپای ئیـسلام ئـەو مەسـافە دوورو درێـژەی نێـوان تـەبوك و مەدینــەی بــڕی و گەڕایــەوە، بەڕاسـتی وەکـوو لـەوەپێش ئامـاژەی پـێ کـرا سـەفەرێکی پڕمەینـەتی و عـەزاب و ناخۆشـی بوو، موسوڵمانان زۆریان برسیایەتی و تینوایەتی تێداچەشت!!

ئەو جیهادەی خودا فەرمانی بەئەنجامدانی کردوە چییە؟

ئایـا جیهـاد بریتـی نییـە لەبـەختکردنی گیـان و مـاڵ و هێـزو توانـا لـەپێناو بەرقـەرار بـوونی شـەریعەت و ئـایینی خـودادا؟ بێگومـان ئـەوە هەموو ئەوشتانەیە خودا لەبەندەکانی داوای کردووە، پاك و بێ عـەیبی بۆ خودایەو خودا زۆر بـەرزترە لـەوەی پێویـستی بەیارمـەتی بەنـدەکانی هـەبێ، بـۆ بەرپەرچـدانەوەی پـیلان و فـرت و فێڵـی کـافرو ملـهوڕان، یـان پێویستی بەوە هەبێ مـەعنای هیدایـەت و ئیمـان بەزۆرەملـێ بخرێتـە نـاو دڵ و دەروونی مولحیدو بێ بڕوایانەوە!!

بێگومـان سـوپای ئیـسلام «جـیش العـسرە» لـەم غـەزا پـڕ چـورتم و ناخۆشــەدا مــاڵ و هێــزو توانــای خۆیــان بەخــشی، ئیــسراحەت و حەسـانەوەی خۆیـان وەلانـاو هێـزو توانـای خۆیـان بـەجوانترین شـێوەو بەئەو پەڕی لەخۆبردویی و فیداکاریی خستە گەڕ. لـەجیاتی حەسانەوەو کـات بەسـەربردن لـەناو مـاڵ و منـداڵ داو خۆدزینـەوە لەگـەرمای خـۆری هاوین، خۆیان خستە ناو عەزاب و ماندو بون و بڕینـی ڕێگـەی دوورو پـڕ مەترسـی و مەینـەتی، لەناخۆشـترین وێنـەو شـکڵ و شـێوەی دا. بەمـەش موســـوڵمانان ســـەلماندیان کــە بیروباوەڕیــان چەســپاوو دامــەزراوە، ڕاستگۆن لەگەڵ خودای خۆیان، خۆشەویستی خوداو پێغەمبـەری خـودا لــەناخی دڵیــان دا جــێگیرە، کــەوابوو شــیاوی ئــەوەبوون خــودا

سەرکەوتوویان بکا، پشتگیرییان بکا، شەڕو ڕووبەڕو بوونەوەیان لێ لادا، لەلایەن خۆیەوە ترس بخاتە دڵی دوژمنانیانەوەو بڵاوەی لێ بکەن و ملکەچی سەرانەدان بن.

بەم جۆرە رۆمەکان بەئاسانی ملکەچی یاسای سەرانەدان بوون لەبەرامبەر ئەو ماندوبون و ناڕەحەتی و برسی و تینوەتییەی موسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا چەشتیان بۆ ڕەزامەندی خودا.

**دووەم: پەندو ئەحکام:**

لەم غەزایەدا چەند وانەو ئەحکامی لێ وەردەگیرێن وا لەچەند خاڵێك دا چڕیان دەکەینەوە:

**١. گرنگی جیهاد کردن بەماڵ و سامان:**

جیهادکردن دژی دوژمنانی ئیسلام کورت هەڵنە هێندراوە لەچون بۆغەزاو بەس، بەڵکوو هەرئەوە کیفایەت نییە بەتەنیا. لەهەرکات و شوێنێك دا کاری جیهادو تێکۆشان بەشەڕو چەك راوەستاو پێویستی بەماڵبەخشین و نەفەقات هەبوو پێویستە موسوڵمانان کۆمەکی بکەن و ئەوەندە ماڵ و سامان پێشکەش بکەن کاروباری جیهادی پێ بەڕێ بکرێ. بەمەرجێ بەگوێرەی دەوڵەمەندی و هەژاری ئەو ئابوونەیە پێشکەش بکەن.

بێگومان فوقەهای ئیسلام بڕیاری ئەوەیان داوەو ئەو حوکمەیان راگەیاندووە، کە هەرکاتێ دەوڵەتی ئیسلام پێویستی بەنەفەقەو پێداویستی جیهاد هەبوو، بۆی ڕەوایە بەشێکی دیاریکراو بەگوێرەی دەوڵەمەندی و هەژارییان بخاتە سەر موسوڵمانان، بەڵام ئەو فوقەهایانە فەرموویانە: ئەو باربوو وەرگرتنەو باج خستنە سەر خەڵکە کاتێك ڕەوایە کەماڵ و سامانی دەوڵەت بۆنەفەقاتی کەمالیات یان بۆکاری

ناشەرعی خەرج نەکرێ. چونکە ماڵو دارایی هاو وڵاتیان لەماڵو دارایی دەوڵەت لەپێشتر نییە بۆئەوەی بۆ پێداویستی سەربازو غەزا خەرج بکرێ.

بێگومان ئەتۆ دیتت چۆن عوثمانی کوڕی عەفان خودای لێ ڕازی بێ لەو رۆژە تەنگانەیەدا هاتە خزمەت پێغەمبەرو ﷺسێ سەد حوشتری بەکورتانو گوریسو قەیاسەوە لەگەڵ دووسەد ئۆقیە زیو هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ سازدانی سوپاکە «جیش العسره». کارەکەی ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بوو پێغەمبەر دەربارەی فەرمووی: {ماضرّ عثمان مافعل بعد الیوم} عوسمان لەم رۆ بەدواوە چی بکا زیانی پێ ناگا! بەڕاستی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺگەورەیی عوسمان دەردەخا. بەڵکوو ئەم فەرموودەیە سەرزەنشتکردنو تەمبێ دادانی هەموو ئەوانەیە کەدیانەوێ زمانیان درێژ بکەنو ڕەخنەی نەشیاو لەو زاتە «واتە: عثمان» بگرن، دەمکوتکردنی هەموو ئەوانەیە زماندرێژی دەکەنو ڕەخنە لەسیاسەتو هەڵسو کەوتی رۆژانی خەلافەتو فەرمانڕەوایی دەگرن. لاپەڕەی زۆرو درێژ پڕدەکەنەوە بەنووسینی باسێك: کەناوی دەنێن دیاردەو دیمەنی لاوازیی لەبەڕێوە بردنی کاروباردا یان لادان لەڕێبازی ڕاستو خزم خزمێنە کردن لەسیاسەت دا، لەمەدا شوێن هەواو هەوەسی خۆرهەڵاتناسەکان کەوتونو مێژوو پڕدەکەن لەڕەخنەو درۆو دەلەسەو سەر لێ شێواندن بۆ هێنانەدی ئامانجێکی نەخشە بۆ کێشراوی پێشوەخت زانراو، کەشەوو رۆژ هەوڵی بۆ دەدەنو گوڕ دەدەنە خۆیان بۆئەوەی بیگەنێو بەدەستی بێنن! بێگومان ئەوانەی کەخۆیان دادەنێن لەناو بورجی بەرزی پاكو خاوێنیو نەزاهەتی ناوازەو خۆیان بەپەیڕەو کاریی سیاسەتی حەکیمانەو کار دروستو لێزان دەزاننو لەوێوە حوکم بەسەر عوسمانو سیاسەتو فەرمانڕەوایی دا دەدەن، ئەوانە بۆخۆیان لەهەموو کەس زیاتر پێویستیان بەوە هەیە نەخۆشییە جۆراو جۆرەکانی

خۆیـان بدۆزنـەوەو دەسـت نیـشانیان بکـەن، ئـەمجار بەلێکۆڵینـەوەو دیراسەی بەشێك لەسەروەری و مەناقیبی ئەم خەلیفە گەورەیەی ئیسلام نەخۆشـیەکانی خۆیـان چارەسـەر بکـەن و بەکـەڵك وەرگـرتن لـە سـیرەو سـوولوکی ئـەو پیـاوە گەورەیـە ڕێبـازی چـەوت و خـواری خۆیـان ڕاسـت بکەنەوە.

خەلافەت و فەرمانڕەوایی ئیمامی عوسمان هەرچۆنێك بووبێ، دەبێ چ تـۆز قاڵـە ئـەدەبێك هـەبێ لای کەسـێك ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەر دەبیسێ کە فەرموویەتی: {ماضرّ عثمان مافعل بعد اليوم} ئەمجار سـەرباری ئـەوەش دەمدرێـژی دەکـاو دەکەوێتـە ڕەخنـەگرتن لـەئیمامی عوسمـان و سیاسەت و فەرمانڕەوایی بەنەزان و نەشیاو لەقەڵەم دەدا!!؟

**٢. وشەیەك دەربارەی حەدیثی ئەبوبەکرو ئەو زیادە هەڵبەستراوەی؟**

بـڕێ خـەڵك بـەو حـەدیثـەیانـەوە لکانـدووە بۆئـەوەی بیدعەیـەکی حەرامی زۆر حەرام بەڕەواج بدەن و بەڕەوای نیشان بدەن.

ئێمـە لـەوەپێش ئـەو حـەدیثـەمـان هێنـا کـە تیرمیـزی و ئـەبوداود ریوایەتیان کردوە دەربارەی پێشکەشکردنی حـەزرەتی ئەبوبـەکر هـەموو مـاڵ و سامانی خـۆی بۆسـازدانی سوپای غـەزای تـەبوك و وەڵامدانـەوەی ئەبوبـەکر کاتێـك پێغەمبـەر لێـی پرسـی چـیت بۆمـاڵ و منـداڵت جـێ هێشتووە؟ وتی: «أبقيت لهم الله ورسوله» خـوداو پێغەمبـەری خـودام بـۆ بەجێ هێشتون.

ئـەمجار بـڕێ خـەڵك هـاتوون زیادەیـەکیان هەڵبەسـتووەو بـەم حـەدیثـەیانـەوە نـاوە، گوایـە پێغەمبـەر ﷺ لەوکاتـەدا بەئەبوبـەکری فـەرمووە: {إنّ الله راض عنـك فهـل أنـت راضٍ عنـه؟} ئـەی ئەبوبـەکر خـودا لەتۆڕازییە ئایا تۆ لە خودا ڕازیت؟

ئەبوبـەکر وەجـدو کەیفخۆشـی دەیگـرێو هەڵدەسـتێ لەبـەر دەم پێغەمبەر دا دەست دەکا بەڕەقص‌و سەماکردن‌و دەڵێ: «کیف لا أرض عَـنْ الله؟» چـۆن لـەخودا ڕازیـی نـابم؟! ئـەمجار هـاتوون ئـەم زیـادە هەڵبەستراوەیان کردوە بەدەلیل کە ڕەقص‌و سەماو خۆبادان لەزیکرکردن دا دروسـتە، وەکـوو ئـەو حاڵـەت‌و دیـاردەی لەدەروێـشانی ڕێبـازی «المولویـة»و دەروێـشەکانی ڕێبـازی «قـادری»و ڕێبازەکـانی تـری «صۆفی»و دەروێشان دەبیندرێ!.

بێگومـان ئـەو بەڵگەیـەی ئەوانـە پـشتی پێـوە دەدەن بەڵگەیـەکی هەڵبەستراوە وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان بۆکرد، نەلە حەدیثی صەحیح دا نەلەحـەدیثـی زەعیـف دا نـەهاتووە حـەزرەتی ئەبوبـەکر لەبـەردەم پێغەمبەردا ڕەقصی کردبێ.

هەرچی لەم بارەوە ریوایەتکراوەو چەسپاوە ئەوەیە ئێمە نوسیومانە کە لەدەقی تیرمیزی‌و حاکم‌و ئەبوداودەوە رامان گواستووە. هەرچەندە ئـەوەش وێدەچێ لاوازیی پێوەبێ. ئـەمما خودی هەڵبـەزو دابـەزکردن‌و سەماو ڕەقصەکە نابێ بڵـێین بەڵگەی لەسـەر نەهاتووە، بـەڵکوو ئـەوەی حـەق‌و چەسپاوە ئەوەیـە کـە حەرامـە. وەکـوو ئێـستا رونـی دەکەینـەوەو ئاماژەی پێدەکەین.

جـەماوەری زانایـان پێیـان وایـە رەقـص‌و سـەما حەرامـە ئەگـەر خـۆ چـەمانەوەی تێـدابوو، ئەگـەر خۆچـەماندنەوەی تێـدا نـەبوو مەکروهـە. کـەوابوو داخـڵ کردنـی مـادەی رەقـص‌و سـەماو تێکـەڵاو کردنـی بەعیبادەت‌و زیکری خودا داخڵ کردنی شتی حەرام یان مەکروهـە بۆنـاو عیبـادەتێکی مەشـروع، گۆڕانـدنی رەقـص‌و سـەما کەشـتێکی حەرامـە بەعیبادەت‌و خودا پەرستی بەهیوای نزیکبوونـەوە لـەخودا بـەبێ بەڵگـەو دەلیـل. یـان بانگەشـەی ئـەوە کـە ئـەو ڕقص‌و سـەمایە لەچوار چێوەی کەراهەت‌و حەرام چۆتە دەرو بووەتە کارێکی مەشروع!.

سەرباری ئەوەش ئەوحاڵ و وەزعەی ئەوانە تێی دەکەون لەکاتی زیکر کردن بەسەماو رەقصەوە کەوایان لێ دێ وشەکانی زیکرو تەسبیحاتە کە بەشێوەیەك دەردەبڕن لەوشەی زیکر ناچن. بەڵکوو حەمحەمات و هەمهەمات و حینکە حینکێکە لەگەرویان دێتەدەر بۆئەوەی لەحن و صەدایەکی گونجاو لەگەڵ وەقع و شێوە هەڵسوڕان و سەماکەدا بگونجێ، بەوەش زێدە نەشوەو کەیفخۆشی لەدەروون دا پەیدادەبێ و دەکەوێتە حاڵەتی جەزبە لێهاتن و کوردی گوتەنی گەرم دەبێ و حاڵی لێ دێ!!

دەی چۆن ئەمە دەبێتە زیکری خوداو بەزیکر حیساب دەکرێ؟ کەی ئەوە ئەو زیکرەیە خودا فەرمانی بەکردنی کردوەو پێغەمبەرو هاوەڵانی کردویانە؟! کەی ئەو رەقص و سەماو لرفە لرف و حینکە حینکە عیبادەت و خوداپەرستییە؟ خۆ عیبادەت وەکوو دەزانی ئەوەیە: کەخودا لەقورئانی خۆی دا تەشریعی کردوە، پێغەمبەر لەسوننەت دا رونی کردۆتەوەو فەرموویەتی نابێ ئەم ئایینە زیادو کەمی تێدا بکرێ.

بزانە ئەوەی ئێمە گوتمان ئەوەیە کە عولەمایانی شەرع و ئایین لەسەری کۆك بون و بەدرێژایی رۆژگار راجیایی تێدا پەیدانەبووە، راستە رێگای شەریعەتەو زانایانی ئیسلام پەیڕەوییان کردووەو پابەندی بوون، کەسیان لەو شەقامەڕێیە لای نەداوە جگە لەکەمینەیەکی بیدعەچی و دونیا خۆر کەلەئایین دا شتی وایان داهێناوە. خودا فەرمانی پێ نەکردوە، ئەوانە بەناوی دینەوە زۆر شتی حەرامیان حەڵاڵ کردووە، زۆر تاوانیان ئەنجام داوە جارێك بەناوی وەجدو عیشقی ئیلاهی و دەمێك بەناوی رزگار بوون لەکۆت و زنجیری تەکالیف!!

ئێستا گوێم بۆرابگرە بافتوای یەکێك لەگەورە زانایانی ئیسلام، زانایەکی بەناو بانگ و خودا ناس و کامڵ لەڕوی دین و عیلم و وەرع و

تەصەوفەوە بۆتۆی بەیان بکەم، ئەویش زانای پایە بەرز «العز»ی کوڕی «عبد السلام»ە. ئەم زاتە دەفەرموێ: «ڕەقص و سەماو چەپڵەو سوکایەتی و نزمی و لارو لەنجە کردنی شێوە ژنانەیە جگە لەبێ عەقڵ و خوێڕی و درۆزن «کەسی تر نایکا!»، بڕوانە چۆن ڕەقص و سەمای ڕێك و پێك لەسەر شێوەی کێشی گۆرانی لەلایەن مرۆڤی بێ عەقڵ و ساویلکە ئەنجام دەدرێ. بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خير القرون قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم» باشترین مرۆڤی چاخەکان ئەو مرۆڤانەن لەسەردەمی مندان، پاشان ئەوانەی بەشوێن ئەوان دا دێن، ئەمجار ئەوانەی بەشوێن ئەوان دا دێن. دەی هیچ کامێ لەمرۆڤی ئەو چاخانەی کەئەوان بە پێشەوای خۆیانیان دەزانن ئەو ڕەقص و سەمایەیان نەکردووە[1].

ئیبنو حەجەر لەکتێبی «كف الرعاع» داو ئیبنو عابدین لەکتێبە کەی بەناوی «حاشية ابن عابدين» هەمان ڕاوو بۆچونیان هەیەو جوداوازیی دیاریی دەکەن لەنێوان وەجدی قاهیرو لەناخ هەڵقوڵاو لەگەڵ وەجدو عیشقێکی دروستکراو «مصطنع».

ئیمامی قورطوبیش ئەوە زۆر هەڕەشە لەوانە دەکا کە ئەوکارە پەیڕەو دەکەن. زۆر دواوە لەو بیدعەیەو بەحەرامی داناوە. ئەگەر دەتەوێ ئاگاداری ڕای قورطوبی بی بگەڕێوە بۆ تەفسیرەکەی و سەیری ئایەتی: {الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ} «سورة آل عمران،١٩١» یان ئایەتی {وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً} «سورة الإسراء،٣٧».

---

١ بڕوانە: قواعد الأحكام في مصالح الأنام ١٨٦/٢.

ئەگەر لەبەر درێژدادڕی نەبوایە، دەقی زۆرم لەڕاو فتوای ئەو زانایانە ڕاگوێزی ئێرە دەکردن، بۆئەوەی بزانی ئەمەی من ڕونم کردەوە زوربەی زۆری زانایانی ئیسلام بەسەلەف و خەلەفیانەوە لەسەر ئەوە کۆکن و هیچ خیلاف و ڕاجیاییەکیان نیە«[١]».

---

١ وێدەچێ بڕێ کەس توشی سەرسوڕمان بن لەڕوی ئەوەوە من لەزۆر شت دا دژی وەهابیانم هاوڕایان نیم، بەڵام لێرەدا لایەنگیری ئەوان دەکەم، چونکە دژی بۆچونی کەسانی دیکەم. بێگومان سەرسوڕمانی ئەوانە ئاکامی تەصەورێکی هەڵەیەو پێچەوانەی ئەومیە کەدەبوایە موسوڵمانان پەیڕەویان بکردایە، هەرگیز لەئیسلام دا ئەوەنیە بەحث و لێکۆڵینەوەی زانستی لەعەقڵ دا بسوڕێ بۆ دەمارگیری ڕەگەداکوتراو لەنەفس دا.

قد يعجب البعض من أني أنكر على الوهابية الكثير من آرائهم، مع ما أفعله هنا من الإنحياز إليهم، لاستنكار ما يراه الآخرون.

ولا ريب أن هذا العجب إنما هو نتيجة تصور خاطئ لما ينبغي أن يكون عليه حال المسلم. فليس من الإسلام في شيئ أن يتحول لدينا البحث العلمي في العقل الى العصبية مستحكمة في النفس. وهيهات أن يكون من الإسلام في شيئ ما يفعله بعضهم من الإنتصار لما عرف به من مذهب ورأي، مصطنعاً بذلك الإنتصار لإسلام، وهو يعلم في قرارة نفسه أنه إنما ينتصر للرأي الذي أصبح جزءاً من شخصيته وكيانه بين الناس.

لاينبغي للمسلم .لدى البحث العلمي،، أن يضع أي شيئ نصب عينيه إلا كتاب الله وسنة رسوله، ولايجوز له أن يدع أي سلطان من دون سلطانهما يتسلل للتأثير على نفسه وفكره.

ولا ينبغي، إذا إلتزم هذا المسلم الحق، أن يضيق أحد من المسلمين بكلامه، أو أن يغضب لأحكامه. وإذا كنت قد بحثت في هذا الكتاب مسائل إنتهيت فيها إلا مخالفة بعض الناس، فليس ذلك -يشهد الله- حباً بمخالفته ولكن حباً بإلتزام كتاب الله وسنة رسوله، وربما أخطيئ في الحكم والإستنتاج ولكن هذا هو الدافع.

وإذا كنت أبحث الآن في مسألة إنتهيت فيها الى موافقة أولئك البعض ومخالفة كثير من العوام المسلمين أو المتصوفة فيهم، فليس ذلك أيضا حباً بمخالفتهم أو شهوة بنقده، ولكن رغبة خالصة في أن لا أحيد عن كتاب الله وسنة رسوله، مع تقديري لكثير من هؤلاء

ئاشکراشه لەهەموو ئەوەی باسمان کرد، حاڵەتێك چەرت دەکرێو لەو یاسایە دەردەهێندرێو دەخرێتە لاوە. ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە مرۆڤە زیکرکەرەکە حاڵێکی بەسەردابێ دەسەڵاتی شعوری خۆی نەمێنێو جڵەوی نەفسی خۆی لەدەست بدا. لەو حاڵەدا حوکمی تەکلیفی لەسەر نامێنێو ئیختیار لەدەست دەدا، ئەوەی کەلەزانای پایە بەرز «العز بن عبدالسلام» دەگێڕدرێتەوە گوایە جارێك لەکاتی زیکر کردن دا دەرروونی دەخرۆشێو هەڵدەچێو هەڵدەستێ دەکەوێتە بازدان، بۆسەر ئەوحاڵە حەمل دەکرێو بەوشێوە تەفسیر دەکرێتەوە. چونکە ناگونجێ عیززی کوڕی عەبدوسەلام بۆخۆی بەئیختیارو لەحاڵی ئاسایی خۆی دا هەڵسو کەوتی ئاوابکاو خاوەنی ئەم فتوایەش بێ کەئێمە دەقەکەیمان لەکتێبی خۆیەوە راگواست بۆ ئێرە.

### ٣. دوو ڕووەکان سروشتیان، ئەندازەی خەتەریان لەسەر ئیسلام:

قورئانی پیرۆز ئەوەندەی گرنگی بەم غەزایە داوەو باسی کردوە، گرنگی لەوجۆرەی بەهیچ غەزایەکی تر نەداوە. ئەتۆ دەربارەی ئەم غەزایە

---

السادة، ويقيني بصلاحهم وصفاء نياتهم. وعذري أن هذا التقدير لايسوغ تجاوز النصوص القواعد أو التأويل لها.

ولو بحث المسلمون عن الحق الذي يجب إتباعه، عن طريق هذا الميزان، لما قامت فيئات تتخافوا وتتجافى عن بعضها رغم ما قد يقع بينها من خلاف في الرأي والإجتهاد، ولكن العصبية والغلو هما اللذان أوديا من المسلمين إلا هذا الذي نراه.

يحاسب المتصوفة خصومهم على مايرونه عندهم من طرف وغلو، ولا يحاسبون أنفسهم على ما يتلبسون به هم من الغلو والبدع التي لاوجه في الإسلام يسوغها!. أفهذا هو الحق الذي ينبغي أن يكون؟..

إن الغلو في الأمر لايأتي إلا من غلو آخر يقابله فمن أراد الإنتصار لدين الله وهدي رسوله فليقطع دابر كل غلو واختراع البدعة، فإن ذلك خير علاج لما قد يوجد من غلو معاكس لدى الآخرين.

لەسورەتی تەوبەدا چەند ئایات بەڵکوو چەند لاپەڕەیەك دەخوێنیەوە زوربەی زۆریان جەخت لەسەر گرنگی جیهاد بەگیان و بەماڵ دەکەنەوە، ئەوە دەگەیەنن کە جیهاد بەگیان و بەماڵ تاکە بەڵگەی بەهێزە لەسەر ڕاستی بڕوای موسوڵمان و گرنگترین خاڵی جیاکەرەوەیە لەنێوان ئیمانداری ڕاستەقینەو دوو ڕوودا، پێویستە موسوڵمانان ئەگەر بەڕاستی موسوڵمان بن، رونەکەنە رابواردن و پاڵدانەوەو بێ موبالاتی. دەبێ هەرچی دێتە پێشیان لەچورتم و بەڵاو ناڕەحەتی لەڕێبازی خودادا بەهیچی بزانن و خۆی بۆڕاگرن و هەوڵ بدەن بەسەری دا زاڵ بن، هەروەها ئایەتەکان درێژەیان داوە بەباسی دوو ڕووەکان و هەڵوێست و نیازی شاردراوەیان دەخەنە ڕوو ریسوایان دەکەن. ئەو وانەی لەو ئایەتانە وەردەگیرێ، رونکردنەوەی خەتەری دووڕوویی و دوو ڕووەکانە لەسەر موسوڵمانان لەهەموو چاخ و رۆژگارێك دا. ئەوە رون دەکەنەوە کە ئیسلام هەر بەقسە نابێ بەڵکوو دەبێ جیهادو رووبەڕووبوونەوەی تەنگانەو چورتم و عەزاب و ئێش و ئازار تەصدیقی بکاو بەڕاستی دابنێ. ئیمان و باوەڕی موسوڵمانان جیا بکاتەوە لەدەجەل و فێڵی دوو ڕووەکان. بێگومان غەزای تەبوك گەورەترین مادەو روداوە بۆئەم وانە قورئانییە. تاقیکردنەوەی بیرو باوەڕی موسوڵمانان بەو غەزایەی گەورەترین تاقیکردنەوەی خودایی بوو کەپەردەی لەسەر چینی دوو ڕووەکانی شاری مەدینە هەڵدایەوەو موسوڵمانی راستەقینەی لەمرۆڤی دووڕوو بەڕواڵەت موسوڵمان هەڵاواردو بەباشترین شێوەو گەورەترین جیاکردنەوە لێکی جوداکردنەوە، ئەمجار ئایەتی قورئان یەك لەدوایەك نازڵبون و بەتاوانەوە گرتنی و جەرائیمەکانیانی خستنە رو، نهێنی ناو دڵیانی ئاشکرا کردو موسوڵمانانی لێ ئاگادار کردنەوە لەهەموو چاخ و زەمانێکا. بڕوانە قورئان چۆن پەردە لەسەر دوو ڕووەکان هەڵدەداتەوەو دەفەرموێ:

{فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ، فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ، فَإِن رَّجَعَكَ اللّهُ إِلَى طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُواْ مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَاتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُواْ مَعَ الْخَالِفِينَ}«سورة التوبة، ٨١-٨٣».

ئەتۆ ئەگەر بگەڕێیەوە بۆ قورئانو بڕوانییە پێش ئەم ئایەتانەو دواوەیان دەبینی گرنگی زۆریان تێدا دراوە بەدووڕوو باسو خواس دەربارەیانو ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان لێیان، ئەوە هەموو ئاماژەیە بۆئەوە کە موسوڵمانان زوربەی زۆری ئەو بەڵاو کارەساتانەی بەسەریان دێ لەلایەن دوو رووەکانەوەیە. هەرگیز دوژمن ناتوانێ دزەبکاتە ناویانەوەو زەفەریان لێ بێنێ ئەگەر لەڕێگەی ئەوانەوەو بەیارمەتیو چاوساغی ئەوان نەبێ. موسوڵمانان بەهیچ کەس هەڵناخەڵەتێن ئەوەندەی بەدووڕووەکان لەخشتە دەبرێن، توشی ئافاتی لاوازیو تەمبەڵیو خۆدزینەوە لەجیهادو پەرتەوازە بوون نابن هێندەی بەهۆی دووڕوو چاوساغیو خوتەخوتی ئەوان توشی ئەو دەردانە دەبنو لەوانەوە ئەو بەڵاو نەخۆشیانەیان بۆ دەگوازرێتەوە. بەڕاستی ئەوانە گیاکەڵەی ناوکشتوکاڵو مۆرانەی ناو قوماشو کاغەزو کتێبن.

چەند راستو دروستە کە خودا وێنەیانمان بۆ دەکێشێو دەربارەیان دەفەرموێ: {لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلاَّ خَبَالاً ولأَوْضَعُواْ خِلاَلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ} «سورة التوبة، ٤٧».

سەنگەری خەتەرو ترسناك لەو دوو رووانە ئەوەیە ئەوان بەناوی ئیسلامەوە دژایەتی ئیسلام دەکەن، بەچەکی ئایین لەئایین دەدەن، بەناوی ئیسلامەوە گۆڕانکاریی لەئیسلام دا دەکەن، ئەحکامو یاسای

دەگۆڕن بەناوی چاکسازیی و گونجاندنی ئایین لەگەڵ ڕۆژگاردا، پابەندبوون بەگیانی تەشریع و ڕۆحی ئیسلام، لەم ڕوانگەوە فتوای داتاشراوو بێ بنەما دەردەکەن بۆ وەدەستهێنانی ئامانج و هیوایان، یان کلکە سونەو نزیکبوونەوە لەئاغاو وەلی نیعمەتیان.

ئەو پەندەی پێویستە موسوڵمانان لەم وانە وەری بگرن، ئەوەیە: تاجارێك حەزەرو وریایی لەدوژمنی دەرەکی وەردەگرن دەبێ هەزار جار لەدوژمنی ناوخۆ «مونافقین» حەزەر بکەن، دەبێ یەکەم کەسێك کە موسوڵمانان شەڕی دژدەکەن ئەوانەبن کە نیفاق و ڕەوشتی ناشیرین لەناویان دا بڵاو دەکەنەوەو دەبنە خمخۆرکەی ناویان.

٤. سەرانەو ئەهلی کیتاب:

ئەم غەزایە بەڵگەی ئەوەی تێدایە: کە سەرانە وەرگرتن لەوانەی ئەهلی کیتابن و لەسەر ئایینی خۆیان دەمێننەوە ڕەوایە، ئەوانە بەو سەرانەدانەیان ماڵ و سامان و گیانیان پارێزراو دەبێ، ئەتۆ دیتت کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە تەبوك ڕۆمەکان خۆیان شاردەوەو بڵاوەیان لێ کردو پەرتەوازە بوون، عەرەبە مەسیحییەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرو صوڵحیان لەگەڵ کرد لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن، پێغەمبەر ﷺ نوسراوی بۆمۆر کردن.

سەرانە باجێکی سامانە بۆ ئەهلی کیتاب «جولەکەو مەسیحی» لەشوێنی زەکاتدانی موسوڵمانان دادەنرێ، جوداوازیی نێوان زەکات و سەرانە ئەوەیە سەرانە لەسەر بنەمای دادوەری دادەنرێ، لەکاتێك دا مەشروعیەتی زەکات لەسەر بنەمای دیانەت و قەضاء دادەبەسترێ.

ئەوانەی پابەندی سەرانەدان دەبن دەچنە ژێر خێمەی ئیسلامی دادوەریی لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی دا، هەرچەندە لەڕوی ئایینیەوە بڕوایان بەئیسلام نەبێ و ئەرکە ئایینیەکان جێ بەجێ نەکەن، بۆیە

پێویستە لەسەریان بەئاشکراو عەلەنی سەرپێچی شتێك لەئەحکام و قەوانینی ئیسلام نەکەن، مەگەر شتێك کەلەئایینی خۆیان دا ڕەوایەو پێچەوانەی ئیسلامە ئەوە دەتوانن بیکەن بۆنمونە وەکوو مەیخواردنەوە.

جوداوازیی نێوان ئەهلی کیتاب و بێ بڕوایانی تر لە مولحیدو بتپەرست لەبواری سەرانەدا، ئەوەیە ئەهلی کیتاب دەتوانن لەگەڵ کۆمەڵگەی ئیسلامی خۆیان بگونجێنن و یاسا گشتیەکانی ئیسلام جێ بەجێ بکەن وێڕای پارێزگاریکردن لەئایینی خۆیان. بەڵام مولحیدەکان و بتپەرستەکان و ئەوانەی وەکوو ئەوان وان، ئەوە لەنێوان ئەوان و کۆمەڵگەی ئیسلامی دا هیچ پەیوەندییەك نیە بەرعودەو ضامنی گونجاندنیان بێ. چونکە ناگونجێ فیکرەی ئیلحادو بتپەرست لەگەڵ حوکم و نیظامی ئیسلامی دا لەهیچ بوارێك دا هەڵبکا، لەم ڕووەوە نەناسیاوی و جوداوازیی نێوانیان تا ئەو پەڕی سنوورەو موخالەفەکەیان لەڕەگ و ریشەوەیە.

**٥. ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی رابوردنیدا بەلای شوێنەواری قەومی ئەموددا فەرمووی:**

ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە مەکروهە بۆ موسوڵمان لەکاتی داخڵبوونی بۆ وڵاتی گەل و نەتەوەی لەناوچوو بە عەزابی خودا، یان رابوردنی بەسەر شوێنەوارو کەلاوە کۆنەکانیاندا بەهەوانتەو بێ تێفکرین گوزەر بکا. دەبێ هەرکاتێ بەلای کەلاوە کۆنی نەتەوەی غەزەب لێگیراو دا تێپەڕی، سەرنج بدا لەحاڵ و وەزع و رابردوو داهاتووی ئەو گەلە بەدبەختانەو لەخودا بپاڕێتەوە کە لە عەزابی خۆی بیپارێزێ و موسوڵمانان لەسزای لەو جۆرەو سزای تری بپارێزێ و رەحمەت و سۆزی خۆی بەسەر بەندە خاوەن باوەڕەکانی دا بڕژێنێ. چونکە ئەو شوێنەوارو کەلاوە کۆنانە مەنزڵ و جێگایەکن عەزەبی خودایان لێ باریوەو دیمەنی قارو

قینی خودایان بینیوە. دیاردەی بڕێك لە غەزەبی خودای بالا دەستیان لەسەر تۆمارکراوە، ئەو غەزەبو قارە بە درێژایی رۆژگار بەسەریەوە دەمێنێتەوە. گومانیش لەوەدانیە پەروەردگار بۆیە شوێنەواری ئەو غەزەبو قارەی لەسەر ئەو پارچە زەوییە هێشتۆتەوە تا ببێتە عیبرەتو ئامۆژگاری بۆ هەموو ئەوانەی خاوەنی عەقڵو فامنو پەند لە رابوردوو سەرەنجامی گەلو نەتەوەی ستەمکار وەردەگرن. وەکوو پەروەردگار لەزۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەو راستییەی روون کردۆتەوە، کەوابوو هەڵەیەکی گەورەیە مرۆڤ بەسەر کەلاوەو شوێنەواری لەو جۆرەدا بە غافڵیو لاساریو بێ موبالاتی گوزەرکاو جگە لە دیمەنی شکڵو مەظهەری بیناو نەقشو نیگار گرنگی بەهیچی ترنەدا!!

ئای کە لەسەر زەویدا پەندو ئامۆژگاری لەوجۆرە زۆرو زەبەندەن! بەردەوام بەسەر گوێچکەی ئادەمیزادەکاندا بەزمانی حاڵ بانگ هەڵدەداو دەڵێ: «أعتبروا يا أولي الأبصار» ئەی خاوەن عەقڵو دڵە زیندووەکان پەندمان لێ وەرگرنو بەخۆتاندا بچنەوەو بیر لە سەرەنجامی خۆتان بکەنەوە. وەلێ خەڵکەکە هەرئەوە لەو بانگو صەدا بەردەوامە دەبیسن: کە شەیتانەکانیان وەسوەسەیان بۆ دەکەن لەسەر زوبانی ئەو شوێنەوارانە، تەنها سەرنجی خۆیان ئاڕاستەی دیمەنی فەنو نرخی ئەثەریو مێژوویی ئەو شوێنەوارانە دەکەنو بەس! پەندو عیبرەتیان لێ وەرناگرن!

### ٦. پێویستە ئێمە وردبینەوە لە جوداوازی سیاسەتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دوو رووەکانو سیاسەتی لەگەڵ هاوەڵە ئیمانداراەکانی:

بێگومان «وەکوو زانیت» زۆر لەدوو رووەکان لەم غەزایە دواکەوتنو خۆیان دزیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە هاتنە خزمەتیو عوزری جۆراو جۆریان بۆ هێنایەوە، وێڕای ئەوە: کە ژمارەیان زۆر بوو

عوزرەکانیشیان بەهێز نەبوون، کەچی چاو پۆشی لێ کردن و عوزرو قسە ئاشکراکانیانی بیستن و نهێنی ناو دڵیانی حەواڵەی خودا کرد. لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆر کەم لە موسوڵمانە راستاڵەکان دوا کەوتبوون لە چوون بۆ غەزا، نەچوونەکەشیان لەرووی نیفاق و شك و ریبە نەبوو، پاشان هاتنە خزمەتی، عوزرو بیانوی درۆو دەلەسەیان نەهێنایەوە، داوای عەفوو چاو پۆشییان لێ کرد، کەچی سزای دان و چاو پۆشی لێ نەکردن، بێگومان ئەتۆ بینیت پێغەمبەر ﷺ چ سزایەکی دەروونی ئەو سێ چوار کەسەی داو چۆن پەنجا شەو دەنگی لێ دابڕین و فەرمانیشی کرد هەموو موسوڵمانان دەنگیان لێ دابڕن. ئەم سیاسەتە دووفاقە بۆ؟ ئەم «بانێکەو دوو هەوا»یە بۆ؟! بۆچی بۆ دوو ڕووەکان لێبوردن و چاوپۆشی هەڵبژاردو بۆ موسوڵمانە راستاڵەکان توندو تیژی و سزا؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە بەجێیانە ئەوەیە: دەگوترێ توندو تیژی لەم مەقامەدا دیاردەو مەظهەرو نیشانەی ئیکرام و رێز لێنانە، ئەمەش شیاوی دوو رووەکان نیە، کەی گروپی دوو رووەکان شیاوی ئەوەن ئایاتی قورئان نازڵ ببێ قبووڵی تۆبەی ئەوان و لێبوردنی خودای لەخۆ گرتبێ بۆ ئەوان؟!

ئەمجار دوو رووەکان «لەهەموو حاڵێکدا» حوکم بە کوفریان بەسەردا سەپاوەو کافرن، ئەوانە شوێنیان بنکڵی دۆزەخەو رۆژی قیامەت «الدرك الأسفل» جێگایانەو هیچ شتێ لەو خۆبە موسوڵمان زانینەی دەری دەخەن و لافی پێوە لێ دەدەن رۆژی قیامەت دادیان ناداو لەو عەزابە سەختە رزگاریان ناکا. پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین کە ئێمە وازیان لێ بێنین و ئەو خۆبە موسوڵمان حسێب کردنەیان لێ قبوڵ بکەین و بە گوێرەی ظاهیرو رواڵەتییان ئەحکامی دونیاییان بەسەردا تەنفیذ

بکەین، لەپاش پەردەی عوزرەکانیان‌و نهێنی ناو دەروونیان نەکۆڵینەوە. هیچ پێویست ناکا ناوەرۆکی عوزرەکانیان بزانین‌و بچینە بنج‌و بناوانی قسەکانیان. ئێمە بە ظاهیر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین‌و لەو روانگەوە ئەحکامی ئیسلامییان لەدونیادا بەسەردا دەدەین‌و تەنیا دەڕوانینە ظاهیری حاڵ‌و بیرو باوەڕیان‌و ناچینە ناو وردەکاری ژیانیانەوە.

ئیبنو قەییم دەفەرموێ: پەروەردگار ئاوا مامەڵە لەگەڵ بەندە خۆشەویستەکانی دەکا، ئاوا سزای تاوانەکانیان دەداتەوەو تەمبێی بەندەی موسوڵمان‌و خۆشەویستی ئاوا دادەدا. چونکە بەلایەوە رێزی هەیە لەسەر پچوکترین لادان‌و کەمترین سەرپێچی تەمبێی دەکا. دەبێ هەموو دەم هۆشیارو ئاگادارو وریابێ‌و نەکەوێتە هەڵەوە.

بەڵام کەسێك لەپێش قاپی خودا سوك‌و ریسوا بووبێ‌و رێزی نەبێ‌و بێ نرخ بێ، ئەوە خودا ئیهمالی دەکا‌و رێگای تاوانی لێ ناگرێ‌و هەرکە گوناهێکی کرد نیعمەتێکی بەسەردا دەڕێژێ«[١]».

بێگومان لە روداوو سەرگوزشتەی کەعب دا پەندو ئامۆژگاری زۆرو زەبەندە هەن دەلالات‌و نیشانەی گرنگ خۆیان دەنوێنن ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:

**یەکەم: دەنگ دابڕین لەبەر هۆیەکی ئایینی:**

ئەوەبوو پێغەمبەر نەهی لە موسوڵمانان کرد کە ئاخاوتن لەگەڵ کەعب‌و هاوەڵانیدا بکەن، فەرمانی پێکردن بەدرێژایی ئەو ماوە دەنگیان لێ دابڕن!

---

١ - زاد المعاد ٢/٢٠.

ئیبنولقەیم دەڵێ: ئەمە بەڵگەی ئەوەیە: کە وەڵامدانەوەی سڵاو بۆ کەسێك شیاوی دەنگ لێ دابڕین بێ واجب نیە«١».

ئەوەتا کەعب دەگێڕێتەوە دەڵێ: «دەچووم بۆ مزگەوت بۆ نوێژو لەگەڵ موسوڵمانان ئامادەی جەماعەت دەبووم، دەهاتمە خزمەت پێغەمبەرو سڵاوم لێ دەکرد تەشریفی دوای نوێژ لە شوێنی خۆی دادەنیشت، لەدڵی خۆمدا دەمگووت دەبێ پێغەمبەر ﷺ لێوی جوڵاندبێ و وەڵامی سڵاوەکەی دابمەوە یان نا؟! جا ئەگەر وەڵامدانەوەی سڵاوی مرۆڤی لەو جۆرە واجب بوایە، دەبوایە کەعب گوێی لە وەڵامدانەوەکەی پێغەمبەر ببوایە.

**دووەم: بە تاقیکردنەوەیەکی خودا کەعبی پێ بە تاقیکردەوە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین بۆئەوەی بزانین بیرو باوەڕی موسوڵمان دەبێ چۆن بێ بەرامبەر بە خودای مەزن؟**

بێگومان ئەتۆ زانیت مەلیکی غەسان چۆن نامەی بۆناردو چ ڕێزو شکۆمەندێکی پێدابوو چەند، تەماع و پلەو پایەیەکی بۆ دیاری کردبوو، بانگەوازی کردبوو بۆئەوەی واز لەوانە بێنێ: کە ئەزیەتی دەدەن و بەجێیان بێڵێ و پەیوەندی بکا بە وڵاتی ئەوەوە تا لەوێ ڕێزو شکۆمەندی شیاوی خۆی بدرێتێ، بکەوێتە ناو بەختەوەرییەوە. لەو کاتەشدا کەعب گەیشتبووە ئەوپەڕی ناڕەحەتی و دەنگ لێ دابڕان، بەڵام ئەم بەڵاو بەتاقیکردنەوەیە زیاتر کەعبی لەبۆتە داو بڕوای پتەوی بەخوداو زێدە ئیخلاص و خۆشەویستی بۆ ئایین زیادی کرد.

---

١ - هەمان سەرچاوە.

ئای ئەمڕۆ چەند قاچ هەڵدەخلیسکێ و چەند کەس پشت هەڵدەکا لە تاقیکردنەوەو جێگا خلیسکی کە وەکوو تەڵە بۆ کەعب نرایەوەو پێی بە تاقی کرایەوەو لەبۆتە دراو بەسەر بەرزی لێی دەرچوو، دڵ دامەزراو لەسەر ئیسلام مایەوە هەڵنەخلیسکا.

**سێیەم: سوژدەی شوکر بردن بۆ خودا عیبادەتە:**

بەڵگە لەسەر ئەوە سوژدە بردنەکەی کەعب بوو، کاتێ دەنگی موژدەرەکەی بیست بە قبوڵبوونی تۆبە لێی خێرا سوژدەی شوکری بۆخودا برد. ئیبنولقەیم دەڵێ: بێگومان حەزرەتی ئەبوبەکر کاتێك هەواڵی کوژرانی موسەیلیمەی درۆزنی پێگەیی سوژدەی شوکری برد، حەزرەتی عەلی سوژدەی شوکری برد کاتێك کوژرانی «ذالثدیة»ی خاریجی پێگەیی. پێغەمبەر ﷺ سوژدەی شوکری برد کاتێك حەزرەتی جوبرائیل موژدەی پێدا بەوەی هەرکەسێك یەك جار صەڵاواتی لەسەر لێدا خودا دەجار صەڵاواتی لەسەر لێدەدا»[١].

**چوارەم:** حەنەفییەکان جگە لەئیمامی زوفەر، پێیان وایە ئەگەر مرۆڤ هەمووماڵی خۆی نەذر کرد بیکاتە صەدەقە بەسەر هەژاراندا، پێویست ناکا هەمووی ببەخشێ بەڵکوو تەنها ئەو ماڵە دەبەخشێ کە زەکاتی تێدا واجبە. بەڵگەشیان لەسەر ئەمە زۆرن، وێدەچێ یەکێك لەوانە ئەو وەڵامەی پێغەمبەر بێ بۆ کەعب کاتێك عەرزی کرد کە هەموو ماڵ و سامانی خۆی کردووە بەخێرو صەدەقە بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا لەخۆشی قبوڵبوونی تۆبەکەی. پێغەمبەریش پێی فەرموو: «اَمْسِكْ علیك

---

١ - زاد المعاد ٢/٢٢.

بعض مالك». هەموو ماڵو سامانەکەت مەبەخشە هەندێکی لای خۆت بێڵەوە.

ئەوانەی پێیان وایە: هەموو ماڵەکەی دەبێتە صەدەقەو خێر ئەگەر هەمووی نەذر کرد، دەڵێن: کەعب کە ئەو قسەیەی بە پێغەمبەر ﷺ گوت: راوێژو پرس پێکردن بووە نەك نەذر کردن، واتە پرسی پێ کردووە ئاخۆ هەموو ماڵو سامانی بکا بە نەذر لەخۆشی ئەوەی تۆبەی لێ وەرگیراوە؟

پێغەمبەر یش پێی فەرمووە کە بڕێك لە ماڵەکەی کیفایەتە[١] پێویست ناکا هەمووی بکا بە صەدەقە. واپێدەچێ ئەم ڕایە وێچوتر بێ لە ڕوانگەی تێگەیشتن لە قسەکەی کەعب کە ئاڕاستەی پێغەمبەری کردو وەڵامی پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئەو.

## حەجکردنی حەزرەتی ئەبوبەکر ساڵی نۆیەمی کۆچی

کە پێغەمبەر ﷺ لە تەبووك گەڕایەوە، نیازی حەجی هەبوو، پاشان فەرمووی: موشریك ئامادەی حەجکردن دەبنو بەڕوتی تەوافی کەعبە دەکەن، لەبەرئەوە ئەمساڵ پێم خۆش نیە حەج بکەم بۆئەوەی ئامادەی ئەو جۆرە حەجکردنە نەبمو ئەو حاڵەتە نەبینم. ئیتر ئەبوبەکری صەدیقی کردە ئەمیری حەجو ناردی بۆئەنجامدانی، دوابەدوای ڕۆیشتنی موسوڵمانان بە سەرۆکایەتی ئەبوبەکر بۆ حەج، عەلی کوڕی ئەبو طالیبی ڕەوانەکرد بۆئەوەی بگاتە حەزرەتی ئەبوبەکرو لە ڕۆژانی دوا حەجدا بەخەڵك ڕابگەیەنن کە لەدوا ئەمساڵ ئیتر ڕێگا نادرێ

---

١ - بڕوانە: المبسوط للسرخسی ٩٢/١٢ وزاد المعاد ٢٢/٢ وضوابط المصلحة للمؤلف ٢٤٤ – ٢٨٤.

موشریك حەج بكاو نابێ ساڵێكی تر كەسیان ئامادەی حەج ببێ، هەروا چوار مانگ مۆڵەت بدەن بە موشریكەكان بۆئەوەی موسوڵمان بىن، پاش تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە هیچ ڕێگایەكی تریان لەبەردەمدا نیە جگە لەشەڕ.

ئیمامی بوخاری لە كتێبی «ألمغازی»دا لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتی كردووە دەڵێ: حەزرەتی ئەبوبەكر لەو حەجەدا كە حەجی پێش حەجیماڵئاواییە، كرا بە ئەمیری حەج بۆئەوەی لە ڕۆژی جەژندا بانگ هەڵبدا بەناو خەڵكدا كە ئیتر لەمەدوا نابێ هیچ كەسێكی موشریك ئامادەی حەجكردن بێ، نابێ هیچ كەس بەڕوتی تەوافی كەعبە بكا.

موحەممەدی كوڕی كەعبی «ألقرظی»و هی تریش ریوایەتیان كردووە، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی ئەبوبەكری كردە ئەمیری حەج لەساڵی نۆیەمی كۆچیدا. دوا بەدوای بەڕێكەوتنی ئەبوبەكر بۆ حەج حەزرەتی عەلی كوڕی ئەبو طالیبی بەسی چل ئایەتی سورەتی «براءة» نارد بۆئەوەی لە وەرزی حەجدا بەسەر حاجیانیدا بخوێنێتەوە، ئەویش بەسەر خەڵكەكەدا ئایەتەكانی خوێندنەوەو چوار مانگ مۆڵەتی دا بە موشریكەكان لەو ماوەیەدا چی دەكەن بیكەن. لەڕۆژی عەرەفەدا ئایەتەكانی بەسەردا خوێندنەوە، لە بیستی مانگی ذیلحیجەوە مۆڵەتی دانی تا ڕۆژی دەیەمی رەبیعولئاخر واتە: مۆڵەتەكە «بیست ڕۆژی ذیلحیجەو مانگی موحەرەمو صەفەرو رەبیعولئەوەلو دە ڕۆژی رەبیعولئاخر» بوو، لە مەنزڵەكانی خۆیاندا ئایەتەكانی بەسەردا خوێندنەوە، ئەمجار پێی ڕاگەیاندن كە لەدوا ئەمساڵ ئیتر نابێ موشریك حەج بكاو روتو قوت تەوافی كەعبە نەكەن. ئیمام ئەحمەد لە موحریزی كوڕی ئەبو هورەیرەوە لە باوكییەوە ریوایەتی كردووە، دەڵێ لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبو طالیب بووم كاتێك پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای دانیشتوانی مەككە بۆئەوەی سورەتی «براءة»یان بەسەردا بخوێنێتەوە، عەلی پێی

گوتین ئێوە چیتان بەخەڵك دەگوت؟ بانگەوازی چیتان دەگوت؟ دەڵێ: دەمانگوت: ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە مرۆڤی موسوڵمان، نابێ کەس بەروتی تەوافی کەعبە بکا، هەرکەسێ لەگەڵ پێغەمبەردا عەهدو پەیمانی هەبێ ئەوە بۆماوەی چوار مانگ مۆڵەتی دەدرێ، کە چوار مانگەکە تێپەڕی ئەوە خوداو پێغەمبەری خودا بەریئن لە موشریکەکان‌و لەمساڵ بەدواوە رێگا نادرێ موشریکەکان حەج بکەن. دەڵێ بەهەموو هێزی خۆم هاوارم دەکرد هەتا دەنگم نووسا.

ئەمە مەبستە لەمانای ئایەتی: {وَأَذَانٌ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللّهَ بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ – التوبة/٩}.

ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە حەزرەتی ئەبوبەکری کردە ئەمیری حەج سێسەد پیاوی مەدینەیی لەگەڵدا بوو بۆ حەجکردن، بیست حوشتریشی پێدا نارد بە نیشانەکراوی‌و دیاریکراوی

## پەندو ئامۆژگاری:

### ١- موشریکەکان‌و داب‌و نەریتیان لە بەجێهێنانی مەراسیمی حەجدا:

بێگومان ئەتۆ لەوەپێش ئەوەت زانی کە حەجکردن‌و کۆبوونەوەی عەرەبەکان لەشاری مەککە داب‌و نەریتێکی عەرەبەکان بوو لە ئاینی حەزرەتی ئیبراهیمەوە بۆیان مابوەوە، دیاردەیەکی جێماوی «حەنەفییە» بوو ئەنجامیان دەدا بە درێژایی ئەو ماوە درێژە ئەوان ساڵانە حەجیان دەکرد، بەڵام زۆر چڵك‌و پوخڵاواتی سەردەمی جاهیلی تێکەڵاو بوو بوو، هەتا وای لێ هاتبوو بوو بووە مەظهەرێك لە مەظاهیری شیرك‌و بتپەرستی

نەك عیبادەتێك بێ لەسەر بنەمای بیرو باوەڕی یەكتا پەرستی دامەزراوو ئەنجامدراو بێ.

ئیبنو عائیذ دەڵێ: موشریكەكان لەگەڵ موسوڵمانەكان حەجیان دەكرد، جا موشریكەكان دژایەتی موسوڵمانەكانیان دەكردو لە ذیكرو تەلبییە كردندا دەنگیان بەرز دەكردەوە بۆئەوەی لە موسوڵمانەكانی تێكبدەن‌و هەڵەیان پێ بكەن، دەیانگوت: {لا شريك لك الا شريكا هو لك تملكه وما ملك}:

پیاوە موشریكەكان بەروت‌و قوتی تەوافیان دەكردو هیچیان لەبەردا نەبوو، ئەمەیان بەرێز گرتنی كەعبە دادەنا. هەیانبوو دەیگوت: چۆن لەدایك بووم ئاوا تەوافی كەعبە دەكەم‌و نابێ لەكاتی تەواف كردنمدا هیچم لەبەردا بێ"[١].

ئەم شێوە تەواف‌و حەجكردنەی موشریكەكان بەردەوام بوو تا ساڵی نۆیەمی كۆچی، كە حەزرەتی ئەبوبەكرو عەلی كوڕی ئەبو طالیب حەجیان كردو بەناو خەڵكەكەدا جاڕیان دا كە ئیتر لە ئەمساڵ بەولاوە موشریك ڕێگای نادرێ حەج بكاو نابێ كەس بەروت‌و قوتی تەوافی كەعبە بكا. ئیعلانی پاككردنەوەی مەسجیدولحەرام كرا لەو پیس‌و پۆخڵاواتەی تێكەڵاوی كارەكانی حەج ببوو بۆ هەتا هەتایی.

### ٢- هەڵوەشاندنەوەی عەهدو ژیمە بە ڕاگەیاندنی شەڕ:

ئەمجار ئەتۆ بزانە موشریكەكان ئەوكاتە دوو تاقم‌و پێڕ بوون. وەكوو موحەممەدی كوڕی ئیسحاق‌و هی تریش دەڵێن: موشریكەكان: دوو تاقم بوون. تاقمێكیان لەنێوان ئەوان‌و پێغەمبەردا عەهدو پەیمان

---

١ - بروانە: عیون الأثر لابن سید الناس ٢٣١/٢.

هەبوو، ئەو عەهدو پەیمانە بۆماوەی کەمتر لە چوار مانگی مابوو. ئەم تاقمەی مۆڵەت دا تا تەواوبوونی ماوەکە. تاقمی دووەمیان لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا عەهدو پەیمانی کراوە هەبوو، ماوەکەی دیاریکراو نەبوو. قورئانی پیرۆز ماوەکەی کورت کردەوە بۆ چوار مانگ. دوای تێپەڕبوونی ئەو چوار مانگە ئیتر هەر کەسێکیان موسوڵمان نەبێ شەڕی لەگەڵ دەکرێ و لەهەر شوێنێك بەردەست بکەوێ دەکوژرێ، سەرەتای ئەم ماوەی مۆڵەتە چوار مانگییە لەرۆژوی عەرەفەی ساڵی نۆیەمی کۆچی دەست پێ دەکا و درێژە دەکێشێ تا رۆژی دەیەمی مانگی رەبیعولئاخر.

کولەبی دەڵێ: ماوەی چوار مانگەکە بۆ ئەوانە بوو: کە لەنێوان ئەوان و پێغەمبەر ﷺ پەیمانی کەمتر لە چوار مانگ هەبوو. وەڵێ ئەوانەی عەهدو پەیمانی زیاتریان هەبوو، ئەوە بەنیسبەت ئەوانەوە خودا فەرمانی پێ کردن تا ماوەی عەهدو پەیمانەکەیان تەواو دەبێ لێیان بگەڕێن. ئەوەیە: پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: {إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ – التوبة/٤}.

رای یەکەم راستترو وێچو ترە، چونکە بە قسەی کولەبی لە سورەتی «براءة»دا شتێکی تازە نیە، هەرچی تێیدا هاتووە جەختکردنەوەی عەهدو پەیمانەکانی پێشووە: کە لەنێوان پێغەمبەرو موشریکەکاندا دامەزرابوون، هیچ حوکم و یاسایەکی نەگۆڕیوەو هیچی تازەی تێدا نەهاتووە، دەی ئەگەر ئەمە راست بێ ئیتر چ مەعنایەك بۆ خوێندنەوەی سورەتی «براءة» لەلایەن عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە دەمێنێتەوە؟ چ پێویست بوو دوا بەدوای بە رێکەوتنی حەزرەتی ئەبوبەکر، ئیمامی عەلی بنێرێ بۆئەوەی ئەو سورەتەیان بەسەردا بخوێنێتەوە؟!

**جەختکردنەوەیەکی تر بۆ مانای جیهاد:**

ئەتو لەم ئایەتانەی سورەتی «براءة» جەختکردنەوەیەکی تری تازە لەسەر سەر جیهاد تێبینی دەکەی‌و ئەوە دەزانی کە جیهاد لە شەریعەتی ئیسلامیدا شەڕی بەرگری نیە وەکوو خۆرهەلآت ناسەکان وێنایان کردووەو دەیکەن.

ئەتۆ لەو ئایەتانە وردبەرەوە: کە هەڕەشە لە دەستەو تاقمی لێرەو لەوێی موشریکەکان دەکا: کە لە دەوروبەری مەککە مابوونەوەو موسوڵمان نەبوو بوون، لە دانیشتوانی وڵاتی نەجدو شوێنەکانی دیکە. کە دەفەرموێ:

{بَرَاءةٌ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ، فَسِيحُواْ فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَأَنَّ اللّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ، وَأَذَانٌ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللّهَ بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ، فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – سورة براءة/ ١-٥}.

بێگومان ئەم ئایەتە مانا رون‌و ئاشکرایانە، بەشێوەیەکی یەکالآ کەرەوە هیچ مەجالێك لە زەیندا ناهێڵنەوە بۆ وێناکردنی ئەوەی پێی دەگوترێ شەڕی بەرگری‌و کردنیان بە بنەماو قاعیدە بۆ مانای جیهاد لە ئیسلامدا.

ئەتۆ دەزانی سورەتی «براءة» لەو بەشانەی قورئانە. کە لەکۆتاییدا نازڵ بوون. حوکمەکانی ئەم سورەتە زوربەی حوکمەکانی پەیوەندییان بە جیهادەوە هەیە، جێگیرن و بەردەوامن و گۆڕانکارییان بەسەردا نەهاتووە. ئەمن هیچ بەڵگەو نیشانەیەك نابینم کە پاڵم پێوە بنێ بۆئەوەی بڵێم: ئەم ئایەتانە ئایاتی پێش خۆیان سڕیونەوە کە شەڕی بەرگرییان چەسپاندووە، وەکوو ئایەتی:

{أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ – الحج/٣٩}.

چونکە جیهاد لە بنەڕەتدا کە دانراوەو تەشریع کراوە نە ڕوانیویەتە لایەنی هێرش نە بەرگری. ئەو هەدەف و ئامانجی بەرزکردنەوەی وشەی «لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ محمد رَسُولُ الله»یە، دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامییە لەسەر زەوی. جا هۆکارو وەسیلەکە بۆ ئەو ئامانجە شەڕی بەرگری بێ یان هجومی...... پێویستە پەیڕەو بکرێ.

وادەبێ هۆکارو وەسیلەی بڵاوکردنەوەی ئیسلام ئاشتیخوازی و ئامۆژگاری و فێرکردن و ڕێ نیشاندان و ئیرشادە لەو کاتەدا جیهاد بەوە تەفسیر دەکرێ.

وادەبێ هۆکارو وەسیلەکە بۆ کاتێکی تر شەڕی بەرگرییە لەگەڵ ئامۆژگاری و ئیرشادو ڕێنمونی لەوکاتەدا جیهاد بریتییە لەوەو بەوە مانای دەکرێ و ئەوە جیهادی مەشروع و ڕەوایە.

وادەبێ هۆکاری دیاریکراو لە ڕۆژگارێکی تردا شەڕی هجومییە، ئەوە ئەوکاتە بەرزترین شێوەی جیهادە. ئەوەی تەقدیری «ظروف»و هۆکارەکان دەکاو دیارییان دەکاو جیایان دەکاتەوە فەرمانڕەوای موسوڵمانی لێزانی هۆشیارو زیرەك و دڵسۆز بۆ خوداو بۆ پێغەمبەرو بۆ موسوڵمانانە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەرسێ هۆکارو وەسیلەکان مەشروعن بۆ بەجێهێنانی جیهاد، بەمەرجێك کامەیان بەرژەوەندی بەرچاو گیراوی تێدابێ ئەوە پەیرەو بکرێ، بەکارهێنانی جۆرێکیان نابێتە سڕینەوەی جۆرەکانی تر، هەرسێ جۆرە جیهادەکە مەشروعن، فەرمانڕەواو حاکم دەتوانێ هەرکاتەو جۆرێکیان پەیڕەو بکا.

ئەمجار حەجکردنی ئەبوبەکر لەپێش حەجیماڵئاواییدا پراوەو فێرکردنی موسوڵمانان بوو بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی حەج لەسەر شێوەی راستو بە پێی شەریعەتی ئیسلامو چۆنیەتی ئەنجامدانی. رێ خۆشکەرە بوو بۆ حەجی ماڵئاوایی کە بە ڕابەرایەتی پێغەمبەر ﷺ ساڵی دەیەمی کۆچی ئەنجام درا.

## مزگەوتی ضرار

ئیبنو کەثیر لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو عورووەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: لە مەدینەدا پیاوێکی خەزرەجی هەبوو ناوی «ئەبو عامر الراهب» بوو، لەسەردەمی نەفامیدا چوو بووە سەر ئایینی مەسیحیو لەناو هۆزی خەزرەجدا پلەو پایەی تایبەتی هەبوو، جا کە پێغەمبەر ﷺ چووە مەدینەو موسوڵمانان لێی کۆبوونەوەو ئیسلام هێزو توانای پەیداکردو دەنگی بەرز بۆوە، ئەبو عامیر تەنگەتاو بوو کەڵبەی شەڕو دوژمنایەتی لە پێغەمبەر جیڕ کردنەوەو دەستی کرد بە دژایەتی کردنی. دوایی هەڵات بۆ مەککەو خۆی خستە پەنا موشریکە قورەیشییەکانەوەو دەستی کرد بە هەڵنانیان بۆ شەڕکردن دژی پێغەمبەر، پاشان کە پێغەمبەر ﷺ بەهێز بوو ئیسلام بەرەو پێش چوو، لە مەککە خۆی نەگرت چو بۆلای هیرقەل پاشای «رۆم»، داوای یارمەتی لێکرد دژی پێغەمبەر ﷺ ئەویش وادەی پێدا یارمەتی بداو دڵخۆشی دایەوە، لای

هیرقەل مایەوە، ئەمجار نامەی نووسی بۆ هەندێ لە خزمە دوو رووەکانی لە مەدینە، وادەی دانێ بەوەی هیرقەل وادەی پێدابوو، داواشی لەو خزمە دوو رووانەی کرد: کە شوێنێك بۆ خۆیان پێك بهێنن بۆ کۆبوونەوەی نهێنی خۆیان و بیکەنە بنکەی دانانی نەخشەو پیلانیان، هەرکەسێك لەلایەن ئەوەوە نێردرا بۆ لایان لەو شوێنەدا بییان بینێ و نامەو فەرمانی ئەو لەو بنکە جاسوسییەوە بڵاو بکرێنەوەو لە داهاتوشدا کە هیرقەل سوپای دایەو هاتە سەر مەدینە ئەو شوێنە ببێتە مەرصەدو چاودێری بۆی.

بۆ ئەو مەبەستانە ئەو دوو روانە دەستیان کرد بە دروستکردنی مزگەوتێك لە نزیك مزگەوتی قوباوە. مزگەوتەکەیان بە شێوەیەکی قاییم و پتەو دروست کردو پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێ بۆ تەبووك ئەوان لێ بوونەوە. هاتنە خزمەت پێغەمبەرو داوایان لێ کرد تەشریفی بچێ لە مزگەوتەکەدا نوێژ بکا بۆئەوەی نوێژ تێدا کردنەکەی پێغەمبەر ﷺ بکەنە بەڵگەو دەلیل لەسەر شەرعییەتی مزگەوتەکە، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر باس کرد کە ئەوان ئەو مزگەوتەیان بۆ پیرو پەککەوتەو نەخۆش و شەوی ساردو سەرما دروست کردووە، بەڵام خودا پێغەمبەری پاراست لەوەی نوێژی تێدابکا، پێیانی فەرموو: من ئێستا لەسەر سەفەرم ئەگەر گەڕاینەوە خوابکا دێم. جا کە پێغەمبەر ﷺ لە تەبوکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە هێشتا رۆژە رێیەکی مابوو بگاتەوە ناو مەدینە جوبرائیل نازڵ بوو بۆ لای و هەواڵی مزگەوتی ضیراری بۆ روون کردەوە، مەبەست و نیازی دروستکەرانی بۆ شیکردەوە. پێغەمبەر ﷺ لەپێش خۆیەوە بە پەلە خەڵکی نارد بۆ روخاندنی مزگەوتەکە پێش ئەوەی بۆ خۆی بگاتەوە ناو شار «١».

---

١ - تفسیر ابن کثیر ٣٨٧/٢ — ٣٨٨ سیرەی ئیبنو هیشام ٣٢٢/٢.

ئایەتی: {وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ وَلَيَحْلِفَنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى وَاللّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ، لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ – التوبة/ ١٠٧ – ١٠٨} ئاماژە بەو ڕوداوە دەکا.

کە پەروەردگار وشەی «ضِرار»ی بۆ مزگەوتەکە کردووە بە ئاوەڵناو مەبەست ئەوەیە ئەوان ئەو مزگەوتەیان بە مەبەستی زیانگەیاندن بە مزگەوتی قوباء دروست کردووە. کە دەش فەرموێ: { لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ} مەبەستی مزگەوتی قوبایە.

## پەندو ئامۆژگاری:

سەر گوزەشتەی مزگەوتی ضیرار بە پیلانی هەرە گەورەو خەتەری دوو ڕووەکان دەژمێردرێ: کە دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی دایان ڕشتبوو ئەوە هەر نیفاق و دوو ڕوویی نەبوو ئەمجارە، بەڵکوو موئامەرەو پیلان بوو داڕێژرابوو دژی موسوڵمانەکان، بۆیە هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەم کارە ئەوە نەبوو پاش گوێیان بخاو چاویان لێ بپۆشێ وەکوو لەوەپێش بەرامبەریان هەڵوێستی نەرمی دەنواندن.

بەڵکوو ئەمجارە هەڵوێستێکی تری نواندو بە نیگا خرایە ناو زەینیەوە. ئەم هەڵوێستەی بریتی بوو لە دەرخستن و ڕوتکردن و پەردە هەڵدانەوە لەسەر دوو ڕووەکان و ڕونکردنەوەی نیازە گڵاوەکانیان و لابردنی دەمامکی سەر ڕوخساریان و سەرەنجام ڕوخاندنی مزگەوتی ناوبراوو سوتاندنی دارو پەردوی بوو. ئەوان ئەو خانوەی ناوی مزگەوتیان لێ نابوو بۆیە دروستیان کردبوو بیکەنە مەڕصەدو شوێنی

جاسوسی دوو رووەکان و پەناگەیەك بۆ رێکخستنی پیلان و پاشقول گرتن دژی موسوڵمانەکان و هۆکاری پەرتەوازە بوون.

بێگومان سەر گورشتەی ئەم پیلانەی دوو رووەکان لەگەڵ چیرۆکە دوو روویيەکانی تریان وێنەیەکی تەواومان دەدەنە دەست دەربارەی حوکمی شەریعەتی ئیسلامی دەرحەقیان. ئەوانە هەرچی لێیان دەردەکەوێ لەدرۆو فرت و فێڵ و دەرخستنی شتێك کە پێچەوانەی ناو دڵیانە، ئەوە بە پێی ظاهیر مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ و نهێنییەکانیشان حەواڵەی خودا دەکرێ بۆ ئەوەی رۆژی قیامەت بەویستی خۆی دادگاییان بکا. وەلێ ئەوان دەربارەی ئەوەی لێیان دەردەکەوێ لە موئامەرەو جم و جوڵی خییانەت کارانەیان دژی موسوڵمانان ئەوە کونترۆڵ دەکرێن و چی بنیات بنێن دەڕوخێندرێ و هەموو موئامەرەو فرت و فێڵیان پوچەڵ دەکرێنەوە. بێگومان ئەوە دەلالەت لەسەر تێکڕای سیاسەتی پێغەمبەر دەکا دەربارەی مامەڵەی لەگەڵ ئەو دوو رووانەو هەموو زانایانی ئیسلامیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەو بەڵگەشیان هەڵس و کەوتی پێغەمبەرە. ئەتۆ ئەگەر لە هەنگاوو قۆناغەکانی ئەو فێڵ و پیلانە خەتەرەی دوو رووەکان وردبییەوە، سەرنج بدەیە چۆنیەتی ئەنجامدانی و هۆکارەکانی، دەزانی: کە سروشتی نیفاق لەهەموو چەرخ و رۆژگارێکدا یەکێکەو ناگۆڕێ. وەسیلەو هۆکارێك کە ئەوان دەیگرنە بەر بۆ دەستەبەربوونی نیازو مەبەستەکانیان گۆڕانی بەسەردا نایە، ئەوان هەمیشە بە ترس و زەلیلییەوە بە پیلانی پوچ و هەوڵی ناکامیان و دوورکەوتنەوەیان لە نورو نزیك بوونەوەو پەیوەندی توندو تۆڵیان بە تاریکییەوە، شەمشەمە کوێرەن! ئەوانە هەموو کاتێك بەناو چاوانی خۆیان سوژدە دەبەن بۆ ژێر قاچی داگیرکەری بێگانە بۆئەوەی یارمەتییان بدا بۆ شەڕ دژی ئیسلام و موسوڵمانان لە زێدو نیشتمانی خۆیاندا، جا کە دەشکەڕێنەوە بۆ ناو گەل و نەتەوەی خۆیان لە

موسوڵمانان بە رواڵەت خۆیان بە موسوڵمان نیشان دەدەن و بە درۆو نیفاق بەرگی دەعوەو بانگخوازی ئیسلامی دەپۆشن و دەبنە مەڕ لە پێستی گورگدا. هەر هەلیان بۆ هەڵبکەوێ بۆ دەست وەشاندن لەم دینەو خنکاندنی حەقیقەتێك لە حەقیقەتەکانی و لەناوبردنی بانگخوازە راستگۆیەکانی ئەوە هەل لەکیس خۆیان نادەن، لەهەمان کاتدا ئیعلانی ئەوە دەکەن کە ئەوانە بەم هەڵوێستو کارانەیان گەشە بە ئیسلام دەدەن و قەڵاچۆی ئەوانە دەکەن ئیستیغلالی ئایین دەکەن و دژی گەل و نیشتمانن!!

دوای ئەمە، بێگومان ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺکردی لە روخاندنی مزگەوتی ضیرارو سوتاندنی دارو پەردوی دەلالەت دەکا لەسەر ئەوە کە پێویستە شوێنی گوناە تێداکردن بروخێندرێن و بسوتێندرێن و لەکار بخرێن.

هەر شوێنێك سەرپێچی ئایینی تێداکرا، لەخودا یاخی بوونی تێدا ئەنجام درا، دەبێ موسوڵمانان هەوڵی لەکار خستن و وێرانکردنیان بدەن، نەهێڵن گەشە بکەن، هەرچەند حەقیقەتی ئەم جۆرە شوێنانە خۆیان بشارنەوە لەژێر پەردەی خێرو بەرەکەتدا.

جا کە ئەمە کردەوەی پێغەمبەر بێ بەرامبەر بە مزگەوتی «ضیرار»؟ دەبێ هەڵوێستی تۆی موسوڵمان چی بێ بەرامبەر شوێنی گوناە تێداکردن و فەساد بڵاوکردنەوەو فاحیشە ئەنجامدان بە ئاشکراو بێ پەردە؟! ئەوەتا حەزرەتی عومەر گوندێکی سەرلەبەر سوتاند چونکە شەرابی تێدا دەفرۆشرا. هەروا دوکانی «رویشد»ی ثەقەفی سوتاندو ناوی نا «فویسق»[1] ئەمە هیچ خیلافێکی تێدا نییەو زانایان لەسەری کۆکن.

---

١ - زاد المعاد لابن القیم ٣/١٧.

## هاتنی وەفدی ثەقیفو موسوڵمان بوونیان:

ئیبنو ئیسحاق ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەمانگی رەمەزاندا لە تەبوکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، لەو مانگەدا شاندی ثەقیف هاتنە خزمەتی لەوەپێش لەناو خۆیاندا راوێژیان کردبوو، بۆیان دەرکەوتبوو: کە ناتوانن شەڕ لەگەڵ عەرەبەکانی دەوروبەریان بکەن، بۆیە هەموویان تێکڕا بەیعەتیان کردبوو موسوڵمان بوو بوونو شاندێکیان ناردبوو بە سەرۆکایەتی کەنانەی کوڕی عەبد یالیل. کە لە مەدینە نزیك بوو بوونەوە تووشی «المغیرة»ی کوڕی شوعبە بوو بوون، کە لە هۆزی خۆیان بوو، ئەویش زۆر باش پێشوازی لێ کردبوونو فێری کردبوون لەکاتی چوونە لای پێغەمبەر چۆن سڵاوی لێ دەکەن، بەڵام ئەوان کە چوبوونە خزمەتی بە دابو نەرێتی سەردەمی نەزانی سڵاویان لێ کردبوو.

پێغەمبەر ﷺ ئەم وەفدەی لە نزیك مزگەوتەوە نیشتەجێ کردنو خێمەو چادری پێویستی بۆ هەڵدان، بۆئەوەی لە نزیکەوە گوێیان لە قورئان بێو چاویان بە هاوەڵان بکەوێ، چۆن هەڵسو کەوت دەکەنو چۆن نوێژ دەکەن، وەفدەکە چەند رۆژێك مایەوە رۆژانە دەچوونە خزمەت پێغەمبەرو ئەویش تەشریفی دەچووە لایانو ئایینی ئیسلامی فێر دەکردن«١».

ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێ دوای نوێژی عیشا دەچووە لایان بە پێوە وتاری بۆ دەخوێندنەوەو ئامۆژگاری دەکردن، ئەوەندە رادەوەستا هەرجارە قورسایی خۆی دەخستە سەر قاچێکی«٢».

---

١ - سیرة ابن هشام: ٢/٣٢.

٢ - طبقات ابن سعد: ٢/٧٨.

موسای کوڕی عوقبە لە کتێبی «مغازی»دا ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: عوثمانی کوڕی ئەبولعاص لەو وەفدەدا بوو، پچوکترین کەسی شاندەکە بوو. کە دەچوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویان جێ دەهێشت ئاگاداری شتو مەکەکانیان بێ، جا: کە وەفدەکە لەلای پێغەمبەر ﷺ دەگەڕانەوە پێش نیوەڕۆ قەیلولەیان دەکردو پشوویان دەدا، عوثمان دەچووە خزمەت پێغەمبەرو لەبارەی ئایینەوە پرسیاری لێ دەکردو داوای لێ دەکرد قورئانی بۆ بخوێنێ. چەند جارێك عوثمان ئاوا بەتەنیا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشت تا باش لە ئایین شارەزابوو، جاری واهەبوو کە دەچوو دەیدی پێغەمبەر نووستووە، دەچوو بۆلای حەزرەتی ئەبوبەکر فێری ڕێو ڕەسمی ئایین ببێ. عوثمان ئەم هەڵسو کەوتەی خۆی بەدزی هاوەڵەکانی دەکرد. پێغەمبەر خۆشی دەویست پێی موعجەب بوو. سەرەنجام شاندەکە ئیسلام چووە ناو دڵیانەوە، وەلێ کەنانەی کوڕی عەبد یالیل بە پێغەمبەری گوت: دەربارەی زیناکردن چی دەڵێی؟ ئێمە قەومو هۆزێکین کەم دەکەوینە ماڵەوەو ناچارین زینا بکەین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زیناکردن حەرامەو بۆ کەس حەڵاڵ نییە ئەوەتا پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً – الإسراء/٣٢}.

وتیان: ئەی دەربارەی «ریبا» دەڵێی چی؟ هەرچی ماڵو سامانمان هەیە ریبایە. فەرمووی: ئێوە بەس دەسمایەکە هی خۆتانەو زیادەکەی واز لێ بێنن پەروەردگار دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ – البقرة/ ٢٧٨}.

ئەمجار عەرزیان کرد ئاخۆ دەربارەی شەراب دەفەرموێ چی؟ خۆشەراب عەصیری زەویو زاری خۆمانەو بێ شەراب ناژین. فەرمووی

شەراب خودا یاساغی کردووە، ئەمجار ئایەتی قورئانی بەسەردا خوێندنەوە کە باسی حەرامی شەراب دەکا.

ئەمجار داوایان لێ کرد کە نوێژیان لەسەر لابەرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {لا خير في دين بلا صلاة} هیچ خێرێك لە ئاییندا نییە بەبێ نوێژ. هەر ئاینێك نوێژی تێدا نەبێ ئایین نیە. ئەمجار هەندێکیان کەوتنە مشتو مڕ لەگەڵ هەندێکیانو هەندێ راو بۆچونیان گۆڕینەوە، دوایی هاتنە خزمەت پێغەمبەرو ملکەچی خۆیان راگەیاند، ئەمجار داوایان لە پێغەمبەر کرد بتەکەیان کە ناوی «اللات» بوو بۆیان بهێڵێتە تا سێ ساڵ نەیڕوخێنێ.

پێغەمبەر ﷺ رازی نەبوو، دوایی وتیان: دوو ساڵ ئەمجار وتیان: ساڵێك مەیڕوخێنە. بەلام پێغەمبەر بەهیچ شێوەیەك رازی نەبوو تەنانەت وتیان: تەنیا مانگێك روخانەکەی دوابخە، پێغەمبەر بەهیچ ماوەیەك رازی نەبوو. ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: ئەم پێشنیارو داواکارییانەیان بۆیە بوو لە ئەزیەتی ژنو هەتیو مچەو شەلاتیو بێ عەقڵەکانیان رزگاریان بێو دەشترسان بەروخاندنی بتەکەیان قەومەکەیان «رەدفیعل» بیانگرێو تووشی کێشە بن، دەیانەویست هەرچۆنێك بێ روخاندنی بتەکەیان دوابخەن تا بەباشی ئیسلام دەچێتە ناو دڵیانەوە.

ئەمجار بە پێغەمبەریان گوت: دەتۆ بۆ خۆت بیڕوخێنە. بەلام ئێمە هەرگیز نایڕوخێنین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بۆ خۆم کەسانێك دەنێرم ئەوکارە لە ئەستۆ بگرن، ئەمجار مۆڵەتیان لە پێغەمبەر خواستو ئەویش ئیزنی دانو بە رێزەوە بەڕێی کردن. کە دیتی عوسمانی کوڕی ئەبو لعاص ئەوەندە سوورە لەسەر ئیسلامو هەوڵی فێربوون دەدا، کردی بە ئەمیر بەسەریانەوە، عوسمان پێش ئەوەی بڕواتەوە چەند سورەتێك لە قورئان فێربو بوو.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ بە شوێن وەفدەکەی ثەقیفدا شاندێکی بە سەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید نارد بۆ ناویانو یەکێکیش لە ئەندامی شاندەکە موغەیرەی کوڕی شوعبە بوو، کە لە هۆزی ثەقیف بوو، کە گەیشتنە ئەوێ چوون بتەکەیان روخاند، ئافرەتەکانی هۆزی ثەقیف هەموو لە هۆبەو ماڵەکانیان هاتنە دەرو بۆ بتەکە دەگریانو دەیان لاواندەوە، هەر کە موغەیرە پاچێکی لێ دەدا ئەبو سەفیان دەیگوت: ئەی هاوار بۆ تۆ. گاڵتەی بە بتەکە دەهاتو بە رواڵەت هاوخەمی بۆ ئافرەتەکان دەردەبڕیو لە دڵیش دا قەشمەری پێ دەهات.

ئیبنو سەعد لە طەبەقاتەکەیدا لە موغەیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: هۆزی ثەقیف موسوڵمان بوون، بڕوا ناکەم هیچ بنەماڵەو هۆزێکی عەرەب بە ئەندازەی ئەوان موسوڵمان بوونەکەیان راستو صەحیح بووبێ. هیچ هۆزو بنەماڵەیەك بە ئەندازەی ئەوان بێ غەلو غەشو پابەندبوو بە ئیسلامەوە نەبوون»[١].

## هاتنی وەفدە عەرەبەکان یەك بەدوو یەکداو موسوڵمان بوونیان

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککەی کردو لە غەزای تەبوك گەڕایەوە، هۆزی ثەقیف موسوڵمان بوونو بەیعەتیان کرد، لەهەموو لایەکەوە وەفدە عەرەبەکان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەرو موسوڵمان بوون، بێگومان عەرەبەکان چاوەڕوانی رۆژێکی ئاوایان دەکرد بۆ ئیسلام چاوەڕوانی ئەوەبوون ئاخۆ سەرەنجامی هۆزی قورەیش لەگەڵ ئیسلام بەچی دەگا، چونکە قورەیشییەکان پێشەوای خەڵكو خاوەنی کەعبەو حەق نەوەی ئیسماعیلو پێشەوای هەموو عەرەبەکان

---

١ - طبقات ابن سعد: ٢/٧٨.

بوون، جا: کە مەککە فەتح کراو قورەیش ملکەچ بوونو ئیسلام بەسەریاندا زاڵ بوو، عەرەبەکانی تر بۆیان دەرکەوت کە توانای ئەوەیان نیە لەگەڵ پێغەمبەر بجەنگنو بەر بەرەکانی بکەن، ئیتر پۆل پۆل هاتنە ناو ئایینی خوداوە، وەکوو قورئان دەربارەیان دەفەرموێ:

{إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا. فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا – سورة النصر}.

ئێمە لێرەدا بە پێویستی نازانین بە درێژی باسی هاتنی ئەو وەفدو شاندانە بکەین. چونکە لەم درێژەدانە چ فائیدەو مەبەستێکی گەورەی تێدا نیە بۆ باسەکەمان.

## پەندو ئامۆژگاری:

لە یادتە ئەوانەی پێشوازییان لە پێغەمبەر کرد ئەو رۆژەی: کە تەشریفی کۆچی کرد بۆ طائیف زانیتان بە چ شێوەیەکی ناشیرینو نەشیاو پێشوازییان لێ کرد، چۆن دەریان کردو منداڵە وردکەو هەتیوو خوێرییان تێ بەردانو بەردە بارانیان کردو ئەزیەتیان داو گاڵتەیان پێ کردن؟

ئەوە هۆزی ثەقیفە ئەمڕۆ خۆیان بۆلای پێغەمبەر دەکوتنو بە دڵسۆزیو ملکەچی دێنە ناو ئایینەوەو موسوڵمان دەبن. ئایا لەیادتە کاتێك زەیدی کوڕی حاریثە عەرزی پێغەمبەری کرد، لەو دەمەیدا بە دڵ شکاوی لە طائیفەوە دەگەڕایەوە بەرەو مەککە عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەتوانی بچیەوە ناو مەککە خۆئەوان دەریان کردوی؟. پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە فەرمووی: ئەی زەید بێگومان خودا دەروی خێر دەکاتەوەو تەنگانە لادەباو خودا یارمەتی ئایینی خۆی دەداو پێغەمبەری خۆی باڵا دەست دەکا.

ئه‌وه‌ی ئه‌مڕۆ ڕویدا ده‌ق مانا و میصداقی ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌: که‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ زه‌یدی فه‌رموو. ئێستا ئه‌وه‌ طائیفه‌و ئه‌وه‌ش مه‌ککه‌یه‌، ئه‌وه‌ هۆزو بنه‌ماڵه‌ی عه‌ره‌به‌ پێشبڕکێیانه‌ بۆ ئیمانهێنان، پۆل پۆل دێنه‌ ناو ئایینه‌وه‌و موسوڵمان بوونی خۆیان راده‌گه‌یه‌نن.

پاشان وه‌ره‌و تێبفکره‌، ورد به‌ره‌وه‌ له‌و هه‌موو ئه‌زیه‌تدان‌و سوکایه‌تی پێکردنه‌ی له‌ هۆزی ثه‌قیفی بینی‌و ئه‌و نائومێدی‌و ره‌تکردنه‌وه‌ی بانگه‌وازییه‌ی به‌ره‌و رووی بۆوه‌ دوای ئه‌وه‌ی به‌پێ «نه‌ك به‌ سواری» کۆچی کرد بۆ لایان‌و ئه‌و هه‌موو شیوو دۆڵ‌و ڕێگه‌ دووره‌ی بڕی به‌هیوای ئه‌وه‌ی به‌پیر بانگه‌وازییه‌که‌یه‌وه‌ بێن‌و پێشوازی لێ بکه‌ن‌و میوانداری بکه‌ن‌و ماندوی بحه‌سێننه‌وه‌، که‌چی ئه‌وه‌یان له‌گه‌ڵ کرد که‌ کردیان. بێگومان که‌مترین هه‌ڵوێست‌و ئه‌زیه‌تدانێك که‌ هۆزی ثه‌قیف به‌رامبه‌ر پێغه‌مبه‌ر کردیان ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ هه‌ر که‌سێکی تر بکرایه‌ بیری له‌ تۆڵه‌ کردنه‌وه‌و ئه‌زیه‌تدانه‌وه‌ به‌ میثل ده‌کرده‌وه‌!!.

به‌ڵام کوا ئه‌وه‌ له‌ ده‌روونی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ جێی ده‌بێته‌وه‌! ته‌نانه‌ت تارمایه‌کیش له‌و بیرکردنه‌وه‌ له‌ نه‌فسی پێغه‌مبه‌ردا به‌رامبه‌ر هۆزی ثه‌قیف بوونی نیه‌. بێگومان ئه‌وه‌تا پێغه‌مبه‌ر گه‌مارۆی شاری طائیفی داو چه‌ند ڕۆژێك ده‌وره‌یدا، پاشان فه‌رمانی به‌ هاوه‌ڵانی کرد گه‌مارۆکه‌ هه‌ڵگرن‌و بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ مه‌ککه‌.

عه‌رزیان کرد: دوعای شه‌ڕ له‌ هۆزی ثه‌قیف بکه‌، دوعای شه‌ڕی لێ نه‌کردن به‌ڵکوو ده‌ستی به‌رزکردنه‌وه‌ بۆ ئاسمان‌و ده‌یفه‌رموو: {اللَّهُمَّ اهد ثقيفاً وأتِ بهم مؤمنين} خودایه‌ هیدایه‌تی هۆزی ثه‌قیف بده‌، دڵیان نه‌رم بکه‌ بێن موسوڵمان بن! کاتێکیش په‌روه‌ردگار دوعای خێری پێغه‌مبه‌ری قبوڵ کرد، شاندی ثه‌قیف هاتن بۆ مه‌دینه‌، حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کرو موغه‌یره‌ی کوڕی شوعبه‌ پێشبڕکێیان کرد بۆلای پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌

مەبەستی موژدە پێدانی بە هاتنی وەفدی ثەقیف، چونکە هەردوکیان زۆر باش دەیانزانی پێغەمبەر ﷺ چەند بەم هاتنە کەیف خۆشە! چەند بە موسوڵمان بوونی ئەو هۆزە شادمان دەبێ. هەر کە هەواڵی هاتنیانی بیست دەرچوو بۆ پێشوازی لێ کردنیان بەڕوی خۆش و ڕێز لێگرتنەوە. ئەو ماوەیەی شاندەکە لە مەدینە مایەوە زوربەی کاتی خۆی بۆ تەرخان کردبوون، ئامۆژگاری دەکردن، قورئانی بەسەردا دەخوێندن، فێری ئایینی دەکردن.

ئای کە لەوەپێش ئەوان چەند جار ویستویانە فێڵی لێ بکەن لەناوی بەرن. چەند بە ئەزیەتدانی و سوکایەتی پێکردنی رقی خۆیان پێ رشتووەو حیقدو کینەی خۆیان پێ شیفا داوە، بەڵام پێغەمبەر جگە لە خێرو خۆشی و بەختەوەری دونیاو قیامەت هیچی تری بۆ ئەوان ناوێ، ئەوان چەند دڵخۆش و تەڕ دەماخ بوون بە دیمەنی نەکبەو زیان و ناخۆشی کە تووشی پێغەمبەر ببێ. وەلێ ئەو بە هیچ شتێ بۆ ئەوان کەیف خۆش نەدەبوو جگە لە نیعمەتی ئیسلام کە خودا بە هۆیەوە ڕێزی لێ نان!

ئایا ئەتۆ پێت وایە ئەوە هەمووی سروشتی ئادەمیزادییەتە لە ئادەمیزادێکدا بانگەوازی بکا بۆ بیرو باوەڕێك کە خۆی پەسەندی کردووە؟! نەخەیر سروشتی ئادەمیزاد نییە. ئەوە سروشتی «نبوة»و پێغەمبەرایەتییەو بەس. ئەوە ئەثەرو دیاردەی چاوەڕوانی پێغەمبەرە بۆ یەك ئامانج ئەویش ئەوەیە ئەم بانگەوازییە بەروبوومی خۆی بداو دوا ڕۆژ کە بۆلای خودا دەگەڕێتەوە خودا لێی رازی بێ. ئیتر هەموو ئەزیەت و کوێرەوەری و بەڵا و کارەسات و چورتمێك کە لەم پێناوەدا دێنە پێشی ئاسانەو نموودیان نیە. ئای چ کەیف خۆشی و سەر بەرزییەکە بەندە بە سەرکەوتوویی ئەم هەموو کۆسپ و تەگەرانە بخاتە دواوەو بەم ئامانجە گەورە بگات؟!

بەڵێ ئەوە ئیسلامە: کە نازانێ حیقدو کینە چییە، شەڕو ناخۆشی بۆ هیچ کەسێك ناوێ.

فەرمان بە جیهاد کردن دەکا بەڵام لەڕوی حیقدو کینەوە نا، هێزو توانا فێردەبێ بەڵام لە غەیری بواری خۆبەزل زانی و خۆپەرستی، بانگەوازی دەکا بۆ بەزەیی و ڕەحم بەڵام لە ڕوانگەی سوکایەتی و لاوازییەوە نا. خۆشەویستی فێری مرۆڤ دەکا بەڵام لە ڕێگای خوداداو بەس!

کەوابوو هاتنی وەفدی ثەقیف و هەموو ئەو وەفدانەی لەوەدوا زنجیرەیان بەست و یەك لەدوای یەك لەهەر چوار لاوە بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە هەموو ئەمانە هاتنە دی وادەی خودا بوو، هاتنە دی وادەی «النصر العزیز» بوو کە خودا دابووی بە پێغەمبەر!

ئەمە ئەو پەندو عیبرەتانە بوون کە دەبێ لەسەر گوزشتەی ئەو وەفدانە وەربگیرێ. ئەو وانەو حوکمانەن لە هاتنی ئەو وەفدانە وەردەگیرێ، لەمە بەولاوە ئاماژەیان پێ دەکەین.

**١- دروستە موشریك ببەیە ناو مزگەوت ئەگەر هیوای ئەوەی لێ دەکرا ئیمان بێنێ.**

بێگومان ئەتۆ لەوە پێش ئەوەت زانی کە پێغەمبەر ﷺ پێشوازی وەفدی ثەقیفی لە مزگەوتەکەیدا دەکرد بۆئەوەی ئامۆژگارییان بکاو فێری ئایین بین. جا کە ئەوە بۆ موشریك ڕەوابێ، دیارە بۆ ئەهلی کیتاب ڕەواترە. پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لە وەفدی مەسیحییەکانی نەجران کرد کە هاتبوون بۆ خزمەتی بۆئەوەی گوێیان لە ئامۆژگاری حەق بێ و فێری بنەماکانی ئیسلام بن.

ئیمامی زەرکەشی دەفەرموێ: ئیمامی رافیعی و نەوەوی فەرموویانە دروستە بۆ کافر بچێتە ناو هەموو مزگەوتێکەوە جگە لە کەعبە، بەڵام بە ئیزنی موسوڵمانان بە مەرج و قیود:

یەکەم: نابێ لە گرێبەستی ذیمەدا ئەوە بەرمەرج گیرابێ نەچێتە ناو مزگەوتەوە. ئەگەر لە عەقدی ذیمە بەستندا ئەوە کرابووە مەرج، نابێ رێگای پێ بدرێ بچێتە ناو مزگەوتەوە.

دووەم: دەبــێ ئــەو موســوڵمانەی ئیزنــی دەدا موکەلــەف و ئــەهلی تەکلیف بێ.

سێیەم: دەبێ چوونی کافرەکە بۆ ناو مزگەوت بۆ گوێ گرتن لە قورئان و فێربوونی ئایین بێ و هیوای موسوڵمان بوونی لێ بکرێ. یان بچێتە ژوورەوە بە مەبەستی بینا سازی و چاکسازی کردن لە بیناکەیدا، یان هەر شتێکی لەو جۆرە. قسەو فتوای قازی ئەبو عەلی «الفارقي»: کە دەڵێ: ئەگەر کافر چووە ناو مزگەوتەوە بە مەبەستی گوێ گرتن لە قورئان یان فێربوونی زانست، لەوانەش نەبوو هیوای موسوڵمان بوونی لێ بکرێ، ئەوە مەنع دەکرێ و ناهێڵدرێ بچێتە ناوی و بۆ موسوڵمان نیە ئیزنی بدا. دەبێ فتواکەی وا ئاراستە بکەین بڵێین: مەبەستی ئەوەیە ئەگەر حاڵەکە وابوو هەست دەکرا چوونە ژوورەوەکەی بۆ سوکایەتی پێکردن و گاڵتە جاڕی بوو، یان بۆ موجامەلەی سیاسی و بەدەست هێنانی مەبەستێکی تایبەتی بوو، وەکوو ئەوەی ئەمڕۆ لە زوربەی بێگانەکان دەبینـدرێ: کە دیدەنی مزگەوتەکان دەکەن!. وەلێ ئەگەر ئیزنی وەرگرت بۆ تێدا نوستن یان نان خواردن و شتی وا، نەوەوی لە کتێبی «الروضة» دەڵێ: پێویستە رێگایان نەدرێ بچنە ناو مزگەوتەوە. ظاهیری شەرع ئەوەیە دروست بێ. غەیری نەوەوی دەڵێن: دروست نیە بۆ ئێمە بۆ ئەو کارانە ئیزنیان بدەین. ئیمامی فاریقی دەڵێ: دەچێتە

چوار چێوەی نووستن و نان خواردنەوە ئەگەر موشریك ویستی بۆ فێربوونی زانیاری حیساب و زمانەوانی و زانیاری لەو جۆرە بچێتە ناو مزگەوتەوە. ئاشکرایە کاتێك دروستە ڕێگایان پێ بدرێ بچنە ناو مزگەوتەوە ئەگەر لەوە دڵنیا بووین زیان بە مزگەوتەکە ناگەیەنن و پیسی ناکەن و تەشویش و غەوغا بەرپا ناکەن لەسەر نوێژ خوێنەکان«[1]».

دەڵێم لە زیانی تەشویش و شتی وا خراپتر زیانی ئەو فیتنەو ئاشوبەیە: کە نوێژ خوێنەکان توشیان دی بە چوونە ناو مزگەوتەوە لەلایەن ئافرەتی کافر بە پۆشاکی سفورو بێ حەیایی خۆیان. هەروا چوونە ناو مزگەوت لەلایەن موشریکەوە بە مەبەستی سەیرکردنی مەعالیمی بینا و نەقش و نیگاری.

**دووەم**: ڕەفتار جوانی لەگەڵ شاندی موشریك و کەسێك پەنای هێنابێ بۆ ناو موسوڵمانان. واتە: موستەئمەن بێ. هەڵبەتە وەفد ئەو کەسەیە بە نوێنەرایەتی قەومەکەی دێ و عادەتەن لە چەند کەسێك پێك دێ. بەڵام موستەئمەن کەسێکە بۆ خۆی هاتبێ و پەنای بۆ وڵاتی ئیسلام هێنابێ داوای ئەمان بکا بۆئەوەی فێری عیلم و زانست بێ دەربارەی ئیسلام.

بە نیسبەت موستەئمەنەوە ئەوە خودا فەرمانی کردووە بەوەی ڕێزی لێ بگیرێ و پاشان بگەیەندرێتەوە شوێنی خۆی بە سەلامەتی ئەگەر ویستی بگەڕێتەوە.

ئەمە بە صەراحەت قورئان ئاماژەی پێ کردووە وەکوو دەفەرمویٚ: {وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ — التوبة/٦}.

---

١ - اعلام الساجد للزركشی ٣١٩ — ٣٢١ باختصار

بە نیسبەت وەفدی موشریکانەوە ئەوە حوکمەکەیان لە قیاس بۆسەر موستەئمەنو کردەوەی پێغەمبەرو ﷺ کە بە سیاسەتی جوانو مامەڵەی باش پێشوازی لێ کردون. ئەتۆ دیتت پێغەمبەر ﷺ چۆن پێشوازی لە شاندی ثەقیف کرد لەکاتی هاتنیانو مانەوەیان.

سێیەم: شیاوترین مرۆڤ بۆ والیەتیو ئیمامەتو فەرمان ڕەوایی ئەو کەسەیانە شارەزایی لە قورئان زیاتربێ.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ عوسمانی کوڕی ئەبولعاصی کردە ئەمیری هۆزی ثەقیف، بێگومان سوور بوونی لەسەر فێربوونی قورئان سەرنجی پێغەمبەری بۆلای خۆی ڕاکێشا، ئەو ماوەیەی لە مەدینەدا لەگەڵ هاوەڵەکانی مایەوە لەهەموو ئەندامی شاندەکە زیاتر شارەزای قورئان بوو، لە هەمووان پتر فێری فیقهی ئیسلامیو دابو نەریتی ئایین بوو، ئەمیریو والیەتیو فەرمانڕەوایەتی خۆی بەر پرسیاریەتی ئایینییەو دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی دامو دەزگای ئیسلامییە، بۆیە مەرجە دەبێ هەرکەس ئەو پلەو پایەی بدرێتێ دەبێ پێش وەخت ئەو مەرجەی تێدا بێتەجێ.

چوارەم: پێویستە بتو پەیکەر بشکێندرێنو دیاردەیان نەمێنێ. مەرجیش نیە بۆ واجب بوونی شکاندنەکەیان ئەو بتو پەیکەرانە پەرستشیان بۆ بکرێو بە پیرۆز بزاندرێن. بەڵکوو حوکمەکە گشتگیرەو عامە بۆ هەموو حاڵەتێك، چونکە بەڵگەکە لێرەدا عامەو تایبەت نییە بە حاڵەتێكو بۆ حاڵەتێك نەبێ. هەم ئاماژە بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەدەرکردنی هەموو بتو پەیکەرەکانی ناو کەعبەو شکاندنیان. هەرچەندە ئەو بتانە وەکوو بتەکانی تر پەرستشیان بۆ نەدەکرا. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە پەیکەر دروستکردن حەرامە بە هەموو شێوەو جۆرەکانیەوە، هەروا کڕینو دانانو هەڵگرتنو «إقتناء»

کردنیان حەرامە بە هەموو شێوەو بەهەر هۆکارێك بێ. ئێستا با ئێمە بەمەندەی باسمان کرد دەربارەی وەفدی ثەقیف کۆتایی بێنین، باسی وەفدەکانی تریش ناکەین کە زۆرو زەبەندەن، چونکە ناو هێنانیان‌و باسکردنیان لەم شوێنەدا مەبەستێکی ئەوتۆی لەدواوە نیە.

وەلێ ئەوەی کە لێرەدا پێویستە فێری بین‌و بیزانین، ئەم وەفدانە کە دەهاتن تێکڕا نوێنەری دوو جۆر ئادەمیزاد بوون جۆرێکیان تاقمی موشریکەکان بوون، جۆری دووەمیان تاقمی ئەهلی کیتاب بوون.

موشریکەکان زوربەیان موسوڵمان بوو بوون، هەر شاندێکیان بهاتایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە ئیمانداری‌و دڵی پڕ لە نوورەوە گەڕاوەتەوە بۆ ناو هۆزو عەشیرەتی. ئەهلی کیتاب زوربەیان لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە، یان بە گاوری یان بە جولەکەیی ماونەوە.

ئەو شاندە گاورەی هاتنە خزمەت پێغەمبەرو نوێنەری نەصرانییەکانی نەجران بوون، پێك هاتبوون لە شەصت پیاو، چەند رۆژێك لای پێغەمبەر ﷺ مانەوە موجادەلەی لەگەڵ کردن موجادەلەیان لەگەڵ کرد دەربارەی حەزرەتی عیسا و تاك‌و تەنهایی خودا.

دوا وتارێك کە پێغەمبەر ﷺ ئاڕاستەی کردن ئەوەبوو ئەو دوو ئایەتەی قورئانی بەسەردا خوێندنەوە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ، الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ، فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةُ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ - آل عمران/ ٦٠-٦١}.

جا کە تەسلیم نەبوون و سەر رەقییان نواند، داوای لێ کردن ئامادەبن بۆ موباهەلە کردن[١] وەکوو خودا فەرمانی پێ کرد. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ پارچە قەطیفەیەکی لە حەسەن و حوسەینەوە پێچابوو فاطیمە لە دوایەوە دەڕۆیشت تەشریفی هات بۆ موباهەلە کردن.

سەرۆکی وەفدەکە کە ناوی «شرحبیل»ی کوڕی «وداعة» بوو، ئامادە نەبوو موباهەلە بکا، هاوەڵەکانیشی ترساند لەوەی موباهەلە بکەن، ئەمجار رویان کردە پێغەمبەر ﷺ داوایان لێ کرد جگە لە موسوڵمان بوون و موباهەلە، هەر حوکمێکی تریان بۆبدا پێی رازین. پێغەمبەر ﷺ لەسەر «جیزیە» صوڵحی لەگەڵدا کردن و نووسراوێکی بۆ نووسین و بۆی واژۆکردن، پێغەمبەر ﷺ چووە ژێر باری ئەوە ئەگەر سەرانەی بڕیار لەسەر دراو بەرێك و پێکی بدەن ئەوە هیچ پەرستگایەکیان ناروخێندرێ و غەدرو خیانەتیان لێ ناکرێ بە مەرجێ ئاژاوەو ئاشوب بەرپا نەکەن، ریبا نەخۆن[٢].

## هەواڵی موسوڵمان بوونی عەدی کوڕی حاتەم

عەدی کوڕی حاتەم نەصرانی بوو، کوڕی حاتەمی «طیی» بەناوبانگ بوو، کە بە نموونەی سەخاوەت و مرۆڤ دۆستی ناوبانگی لە مێژوودا تۆمارکراوە. عەدی بۆ خۆیشی پیاوێکی رێزدارو شەریفی ناو گەل و هۆزی بووە. چواریەکی دەستکەوتی شەڕی لە قەومەکەی وەردەگرت. عەرەبەکانی پێش ئیسلام داب و نەریتیان وابوو لە غەنیمەی جەنگ

---

١ - موباهەلە ئەوەیە: هەردوو لایەنی بە کێشە هاتوو دوعا بکا لەو لایەنەی درۆ دەکا.

٢ - حاکم و بەیهەقی لە کتێبی .دلائل النبوة.دا بە درێژی باسیان کردووە. ئەبو داود لە کتێبی .ألخراج.دا باسی کردووە. هەروا بڕوانە چیرۆکی وەفدی نەصرانییەکان لە تەفسیری ئیبنو کەثیردا.

«مِرباع» واتە: چواریەکیان دەدا بە سەرۆکی هۆز. جا «عەدی» کە هەواڵی دەعوەی ئیسلامی پێگەیی زۆری رق لێ بوو، قەومەکەی خۆی بەجێ هێشتو پەیوەندی کرد بە نەصرانییەکانی شام.

ئەمجار عەدی بۆ خۆی چیرۆکی موسوڵمان بوونی خۆی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: «شوێنەکەم لە وڵاتی شام زۆر لا ناخۆش بوو، چەندم رق لە پێغەمبەر بوو زۆر زیاتر رقم لەو شوێنەم بوو، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر بچم بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر مەلیکایەتی بکا یان درۆزن بێ ئەوە من دەزانمو شتی وا لەمن گوم نابێ، خۆئەگەر پێغەمبەر بوو بەڕاستی، ئەوە ئیمانی پێ دێنمو شوێنی دەکەوم».

لە ماڵی خۆم دەرچووم رۆیشتم تا گەیشتمە مەدینەو چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی مەدینە. سڵاوم لێ کرد فەرمووی: کێی؟ وتم: عەدی کوڕی حاتەم!

ئیتر پێغەمبەر ﷺ هەڵساو بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی، سوێندم بەخودا لە رێگا کەمنی دەبردەوە بۆ ماڵ، ئافرەتێکی زەعیف کارەی بەساڵا چوو پێشی پێگرتو رایوەستاند. زۆر راوەستا، باسی حاڵو وەزعی خۆی بۆ دەکرد، لە دڵی خۆمدا وتم: وەڵلاهی ئەمە مەلیكو پاشا نیە!

پاشان منی برد هەتا گەیاندمیە ماڵی خۆیو بردمیە ژوورەوە سەرینێکی بەرگ چەرمینی ھاخنـدراو بەلیفی بۆ هەڵدام فەرمووی: دانیشە ئانیشکی لەسەردادە. وتم: نەخەیر جەنابت ئانیشکی لەسەردادە، فەرمووی: نا ئەوە شوێنی تۆیەو بۆ تۆیە، ئیتر لەسەری دانیشتمو پێغەمبەریش ﷺ لەسەر زەوی دانیشت!

لە دڵی خۆمدا وتم: بەخوا ئەمە هەڵسو کەوتی مەلیكو پاشا نیە. پاشان فەرمووی: دەی ئەی عەدی کوڕی حاتەم! ئایا تۆ هیچ خودای تر

دەناسی جگە لە «الله»؟ وتم: نەخەیر. فەرمووی: ئایا کەس هەیە لە خودا گەورەتر بێ؟ وتم: نەء. فەرمووی: ئەتۆ لەسەر ئایینی «رکوسی» بووی؟«[١]» وتم: بەڵێ. فەرمووی: ئەوە تۆ کاتی خۆی لەناو قەومەکەتدا یاسای «ألمرباع» = «چواریەکی غەنیمەت»ت پەیڕەو دەکرد؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: خۆئەوە لە ئایینی تۆدا ڕەوا نەبووە، وتم: بەڵێ وایە.

پاشان فەرمووی: وادیارە ئەی عەدی! تۆ بۆیە تا ئێستا موسوڵمان نەبووی وادەزانی موسوڵمانان هەژارو لاوازن، سوێندم بەخودا نزیکە ئەوەندە دەوڵەمەند بـبن و سـامانیان بەسـەردا بـڕژێ کـەس نـەمێنێ پێویستی بە ماڵ و سامان بێ. یان لەوانەیە بۆیە تا ئێستا موسوڵمان نەبووی، کە دەبینی موسوڵمانان ژمارەیان کەمەو دوژمنیان زۆرە، سوێندم بەخودا لەوانەیە ڕۆژێک دابێ ئەتۆ ببیسی ئافرەتێک لە قادسیەوە بە سواری حوشترێك بێ بۆ زیارەتی ماڵی خوداو حەج و عومرە دەکا، لە خودا نەبێ لە کەس ناترسی، وێدەچێ ئەوە مەنعی تۆی لە موسوڵمان بوون کردبێ کە دەبینی مەلیکایەتی و پاشایەتی لە ناویاندا نیە. سوێندم بەخودا نزیکە ئەتۆ ببیسی قەصرە سپییەکان لە وڵاتی بابل بە دەستی موسوڵمانان فەتح بکرێ!

عەدی دەڵێ من بۆخۆم بەچاوی خۆم دوو لەو وادانەی پێغەمبەرم بینی. ئافرەتی تەنهام بینی بە سواری حوشتر لە وڵاتی دوورەوە هاتبوو بۆ زیارەتی ماڵی خودا. بۆ خۆشم یەکەم دەستەی سوارە بووم کە هێرشمان کردە سەر گەنج و خەزینەکانی کیسرا، سوێندم بەخودا وادەی سێیەمیش دێتەجێ.

---

١ - نەتەوەیەك بوون ئایینەکەیان تێکەڵاو بوو لە ئایینی نەصرانی و صابیئە.

## پەندو ئامۆژگاری:

هـاتنی عـەدی کـوڕی حاتـەم بـۆلای پێغەمبـەر ﷺ و هـەواڵی موسوڵمان بوونی لەو سەرو بەندەدا بوو: کە لێکدان لێکدان لە هەموو لایەکـەوە شـاندی عـەرەب دەهـاتن بـۆ مەدینـەو موسـوڵمان دەبـوون. دەتـوانین هـاتنی عـەدی کـوڕی حاتـەمیش بـۆ مەدینـە بـە یـەکێك لـەو وەفدانـەی بـژمێرین: کـە بـە پەلـە پـەل پـێش بڕکێیـان دەکـرد بـە خزمـەت پێغەمبەر بگەن‌و موسوڵمان بن.

بەڵام وامان بەباش زانی کەمێك بە درێژی‌و بە تایبەتی باسـی هـاتنی عەدی‌و موسوڵمان بوونی بکەین، چونکە پەندو ئامۆژگاری گرنگی لـەخۆ گرتـوون: کـە پەیوەنـدییان بـە بنـەمای بـیرو بـاوەڕەوە هەیـە. هـەروەها چـونکە تـەحلیل‌و شـیکردنەوەیەکی زۆر وردی تێدایـە بـۆ کەسـایەتی پێغەمبـەر ﷺ ئەو کەسایەتیە سـەرنج ڕاکێشـەی بۆ عـەدی دەرکـەوت‌و پێی سەرسام بوو، کەسایەتیەکی پاڵفتەو پاڵێوراو لە هەموو شەوائیب‌و خـۆش ویـستنی پلـەو پایـەی زەعامـەت‌و موڵـك‌و پاشـایەتی‌و خـۆش ویستنی فەرمانڕەوایی‌و خۆبەزلزانی‌و نـاوو شۆرەت، کە هەرچەند لێـی ورد بۆوەو سەرنجی دایە هەموو دیاردەکانی نیشانەی ئەوە بـوون: کە ئەم زاتە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی پەروەردگارە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد، بینینـی ئـەم دیاردانـە لـە پێغەمبـەر ﷺ لەلایـەن «عـەدی»یـەوە بـوو بـە بناغەی ئیمان هێنانی‌و نهێنی هیدایەت وەرگرتنی!!

دەی بـا ئێمـە سـەرنج بدەینـە ئـەو ڕەوشـتانەی پێغەمبـەرو لـەو دیاردانـەی وردبینـەوە کـە عـەدی لێیـان وردبـۆوە. بـا پەنـدو عیـبرەت وەربگرین لەو دیاردەو تایبەتمەندیانەی عەدی عیبرەتی پێ وەرگرتن. بۆئەوەی ئیمـان‌و یـەقینمان بـە پێغەمبـەرێتی حـەزرەتی موحەممەد زیـاد بکا، بۆ ئەوەی بۆمان دەربکەوێ‌و یـەقینمان زیاد ببێ بە مانـای پـیلان‌و

فرتو فێڵی زۆرو هەمە جۆری کە خۆیان حەشارداوە لەپشت دیراساتو لێکۆڵینەوەکانی ئەو قەڵەم بەدەستانەی ئەرکی غەزوی فیکری جیهانی ئیسلامییان لە ئەستۆ گرتووە، دەی با کەمێك هەڵوێستە بکەین لەبەردەم ئەو سیماو نیشانەی: کە عەدی کەسایەتی پێغەمبەری پێ وێنا کردو سەرنجی دایەو پێی کاریگەر بوو، سەرەنجام ئەو سەرنجدانو لێ وردبوونەوەیە بوو بەهۆی ئیمانهێنانی.

عەدی دەڵێ: سوێندم بەخودا تەشریفی: کەمنی دەبردەوە بۆ ماڵی خۆی لە رێگا ئافرەتێکی کزی بەساڵاچوو پێشی رێگای پێ گرتو رایوەستاند، زۆر لەگەڵی وەستا، پیرێژنەکە دەربارەی پێداویستیو کەمو کورتی خۆی قسەی لەگەڵ دەکرد. لەدڵی خۆمدا وتم بەخودا ئەمە مەلیكو پاشا نییە. بەڵێ زۆر دوورە کەسێك تەماعی پاشایەتیو موڵكو سەڵتەنەتی هەبێ، حەزی لە پلەو پایەی دونیایی بێ، ئەوەندە صەبر بگرێ لەسەر راوەستان لەگەڵ پیرێژنێکی ئاوادا. خۆئەگەر صەبر گرتنەکەی سروشتی نەبوایەو دەستکردو زۆر لەخۆکردن بوایە بێگومان زوو نیشانەی ئەو زەمانە سازیو زۆرە ملێ لەخۆ کردنە دەردەکەوت، روو گرژیو ئۆف کردنێکی لێ بەدی دەکرا. بەڵێ گومان لەوەدا نیە: کە ئەوە رەوشتی سروشتی پێغەمبەر بووە لە هەموو حاڵو وەزعێکیدا. هەرگیز لە مەجلیسو جلو بەرگو گوزەراندا لە هاوەڵانی جیا نەبۆتەوە، لەبارەی گوزەرانو شێوەی ژیانی رۆژانەیدا لە ژوور ئاستی هەژارو نەداراکانا نەبووەو ژیانی لەوان خۆشتر بۆ نەرەخساوە، نەبیستراوەو نە گێردراوەتەوە رۆژێك لە رۆژان لەسەر سفرەو خوان نانی خواردبێو خواردنی بەریز بۆ دانرابێ. نەبیندراوە هاوەڵانی خەریکی کارێکی قورسو گران بووبن ئیللا پێغەمبەر ﷺ شان بەشانی ئەوان بەڵکوو لەپێش ئەوانەوەو زیاد لەئەوان بە کارەکەوە خەریك دەبوو ماندو دەبوو، ئەمە رەوشتی هەمیشەیی بوو تا وەفاتی کردو گەڕایەوە بۆلای خودا!

دەی باشە چ نهێنییەك وای لێكرد لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بێ و ئەم ڕەوشتە جوانانەی تێدا بەرجەستە بن «لە كاتێكدا ئەوەندە تایبەتمەندیو خیصالی تێدا بوون ئەگەر بیویستایە بەكاریان بێنێ پێیان بەرز دەبۆوە بۆ پلەو پایەی دونیایی وەها كەس نەیتوانیایە بەدەستی بێنێ» جگە لە نهێنی پێغەمبەرایەتی كە خودا پلەو پایەی پێ بەرز كردبوەوە.!؟!

عەدی دەڵێ: كە تەشریفی چووە ماڵەوە دەستی برد بۆ دوشەكەڵەیەكی بەرگ چەرمینی ھاخندراو بەلیف و بۆی ھەڵدام و فەرمووی: لەسەر ئەو پارچە راخەرە دانیشە، .... منیش لەسەری دانیشتم و بۆ خۆی لەسەر زەوی رۆنیشت. لە دڵی خۆمدا وتم وەڵڵاھی ئەوە ھەڵس و كەوتی مەلیك و پاشا نیە.

وێدەچێ عەدی «كە لەناو گەل و ھۆزەكەیدا خاوەن پلەو پایە بووە» وای زەین بۆ چوبێ كە لەناو ماڵی پێغەمبەردا جۆرێك لەو كاڵا و گوزەرانە ھەبێ كە خۆی ھەی بووە. وەلێ بە شێوەیەكی لەنكاوو چاوەڕوان نەكراو پێچەوانەی ئەوەی بینی كە لەزەینی خۆیدا ھەڵی چنیبوو. سەرسام بوو كاتێ دیتی پێغەمبەر ﷺ لە بەردەمیدا لەسەر زەوییەكی وشك رۆنیشت. سەیری ماڵی پێغەمبەری كرد، بۆی دەركەوت ماڵ و ناو ماڵی پێغەمبەر بە زمانی حاڵ دەیانگوت: عەدی ماڵ و حاڵی پێغەمبەر لەو دیاردەو مەظاھیرە نین كەتۆ لە زەینی خۆتدا وێنات كردبوو!.... ئایا دەگونجێ وێڕای ئەم حاڵ و وەزعە پێغەمبەر ﷺ لەپشت بانگەوازییەكەیەوە بە تەمای پاشایەتی و سامان و پلەو پایەی دونیایی بێ.!!؟

ئەمجار عەدی باسی فەرموودەكەی پێغەمبەر دەكا و چۆن داھاتوی پەیوەست بە ئیسلام و موسوڵمانان روون دەكاتەوەو نهێنی ژێر پەردەی

غەیب ئاشکرا دەکا. ئەوەبوو بە عەدی فەرموو: نزیکە موسوڵمانان ئەوەندە دەوڵەمەند ببن هەموو کەس بێ ئاتاج بن، ئەگەر یەکێك پارەیەکی هەبێ ببیەخشێ کەس نەبێ لێی وەرگرێ. ئەم هەواڵەی پێغەمبەر ﷺ لە داهاتوودا بەڕاست گەڕا، ئەوەبوو لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە فەرمانبەری تایبەت بەزەکات دابەشکرندا خەلیفە ماڵو سامانی کۆکراوە لە زەکاتی نارد بۆئەوەی دابەشی بکا بەسەر موستەحەقاندا لە دەڤەری ئەفەریقا، کەچی کابرا پاش سوڕانەوەیەکی زۆر ماڵو سامانەکەی هێنایەوە کەس نەبوو بوو لێی وەربگرێ، بۆیە خەلیفە عومەر بە ماڵەکە کۆیلەی کڕینو ئازادی کردن.

هەروا بە عەدی فەرموو: نزیکە ئەتۆ ببیستی ئافرەتێك لە «ألقادسیة»وە بە تەنیا سواری حوشترەکەی ببێو بێ بۆ زیارەتی ماڵی خوداو لەخودا نەبێ لەکەس نەترسێ.

پێغەمبەر ﷺ راستی فەرموو، بێگومان ئەمنو ئاسایش باڵی خۆی بەسەر ئەو دەڤەرو وڵاتەدا کێشاو دونیا بوو بە شامی شەریفو هەموو رێبوارێك جگە لەخودا لەکەس نە دەترساو لەماڵو گیانو ناموسی خۆی ئەمین بوو. هەروا بە عەدی فەرموو: سوێندم بەخودا نزیکە ئەتۆ بە گوێچکەی خۆت ببیسی باڵەخانە سپیەکانی بابل لەسەر دەستی موسوڵمانان فەتح بکرێن! پێغەمبەری راستی فەرموو: سوپاس بۆ خودا، ئەمەمان بە گوێی خۆمان بیستو بەچاوی خۆمان دیمان سوپاسو ستایش بۆ ئەو خودایەی وادەی خۆی بۆ پێغەمبەری خۆی هێنایە دی.

بێگومان عەدی نیشانەی پێغەمبەرێتی راستەقینەی لە مەظهەرو دیاردەی گوزەرانو ژیانی حەزرەتی موحەممەددا بینی ئەم دیاردانەی لە شێوە قسەو گفتو گۆیدا بەدی کرد، راستی ئەوەش هەموو لەوەدوا

هاتەدی، لەرووداوی ڕۆژگارو مێژوودا خۆیان تۆمار کرد. ئەو دیاردەو دیمەنانە بوونە هۆکاری موسوڵمان بوونی عەدیو خۆ داڕنینی لەهەموو دیمەنو مەظهەرێکی ژیانی نەرمو خۆش ڕابواردن کە گەلو نەتەوەکەی بۆیان بەرجەستە کردبوو. عەدی تێفکریو گەیشتە قەناعەتو موسوڵمان بوو!

هەرکاتێ عەقڵ کراوە بوو، سەرنجی داو بیری کردەوە، ئازادی بیرکردنەوە دەستەبەر بوو بوو، هیچ مەفەرێك نیە دەبێ قبووڵی حەق بکرێو ئیمانی پێ بهێندرێ، چەندێك کۆسپو تەگەرە لەبەر دەمیابنو ڕێگای گەییشتن پێی سەختو دژواربێ. وەلێ ئەگەر ئازادیی بیروڕا نەبوو، ڕێزو قودسیەتی عەقڵ فەوتا، لە شوێنی ئەو گیاکەڵەی حیقدو هەواو ئارەزۆ ڕواو بنجی داکوتا، ناچار دەبێ لەسەر بەتاڵ خۆت قەتیس بکەی بە شانو باڵیدا هەڵبلێی. ناچاری دەبێ دەست لە ملی نەزانی بکەی یان خۆت گێلو نەزان نیشان بدەی. ئەو دەمە پیرۆزت بێ نیعمەتی کوێری یان چاو قوچاندنو خۆکوێرکردن، چ نیعمەتێکی دەگاتێ؟! ئای چەند ڕاستو بەجێیە فەرموودەی «ڕەبولعالەمین» کە ڕەوشتی ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ – فصلت/٥}.

## وەفدو نێردراوەکانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) بۆلای خەڵك بۆئەوەی فێری بنەماکانی ئیسلامیان بکەن.

جا وەکوو شاندو نوێنەری هۆزە عەرەبەکان پەیتا پەیتا دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرو ئیعلانی موسوڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند، بە

پێچەوانەشەوە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەناردنی هاوەڵانو بەهەموو لایەکدا بڵاوی کردنەوە بەتایبەتی لە باشووری جزیرەدا بۆئەوەی خەڵکی فێری بنەماکانی ئیسلامو ئەحکامەکانی بکەن، عەقیدەو شەریعەتیان بۆ روون بکەنەوە، زۆری پێ نەچوو ئایینی ئیسلام لەسەران سەری جەزیرەو دەوروبەریدا بڵاو بۆوە، داخوازی لەسەر مامۆستاو بانگ خوازان پەرەی سەند، خەڵکی تازە موسوڵمان پێویستیان بە مورشیدو شارەزایانی ئایین هەبوو، بۆئەوەی ئاییینی ئیسلامیان بۆ شی بکەنەوە حەقائیقەکانی ئاییینیان بۆ روون بکەنەوە تا لەدڵو دەروونیاندا بچەسپێ.

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ «نەجران» بۆئەوەی بانگەوازی بکا بۆ ئیسلام دانیشتوانەکەی فێری بنەماو ئەحکامەکانی ئایین بکا، لەهەمان کاتداو بۆ هەمان مەبەست عەلی کوڕی ئەبو طالیبی نارد بۆ وڵاتی یەمەن. ئەبو موسای ئەشعەریو مەعازی کوڕی جەبەلیشی هەر نارد بۆ یەمەن بۆئەوەی هەر یەکەیان لە شوێنێکی ئەو وڵاتە دەست بکەن بە بانگەوازی بۆ ئیسلامو فێرکردنی خەڵك. ئامۆژگاریشی کردن کە لە بانگەوازییەکەیاندا توندو تیژ نەبن، پێی فەرموون:

{يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا ، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا}. واتە: ئاسانکاربن توندرەو مەبن، مـوژدەدەر بنو خەڵکی کەوی بکەنو لە خۆتانی کۆبکەنەوە، خەڵکی مەڕەتێننو تەرەیان مەکەن، لەگەڵیاندا هەمئاهەنگ بن[١].

بە معاذی فەرموو: ئەتۆ دەچیە لای گەلو نەتەوەیەك لە ئەهلی کیتاب. کە چوویە سەریان داوایان لێ بکە شایەتی بدەن: کە جگە لە

---

١ - متفق عليه.

«الله» هیچ خودایەکی تر نییە شیاوی پەرستیش بۆکردن بێ و مافی خودایەتی هەبێ. هەروا شایەتی بدەن: کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە، جا: کە ئەوان ئەوەیان بەجێهێنا و شایەتومانیان هێنا، هەواڵیان پێ بدە: کە خودا لە شەوو رۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر پێویست کردوون، جا کە ئەوەیان بەگوێ کردی هەواڵیان بدەرێ: کەخودا زەکاتی لەسەر پێویست کردوون، ئەو بەشە دیاریکراوەی زەکات لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و بەسەر هەژارەکاندا دابەش دەکرێتەوە. جا کە ئەوەشیان بەگوێ کردی، لەکاتی زەکات لێ وەرگرتندا نەچی کام ماڵی باش و پەسەندە ئەوەیان لێ بسێنی.

خۆ بپارێزە لەوەی ستەم بکەی و ستەم لێکراو دوعات لێ بکا، چونکە لەنێوان دوعای ستەم لێکراوو خودادا پەردە نیە»[١].

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ «معاذ»دا تا دەرەوەی مەدینە رۆیشت و ئامۆژگاری مەعاذی دەکرد، مەعاذ سواربوو، پێغەمبەر پیادە، پێغەمبەر ﷺ لە تەنیشت رەحلەکەی مەعاذەوە دەڕۆیشت و مەعاذ سواربوو! پاشان فەرمووی: ئەی مەعاذ ئەتۆ لەوانەیە دوا ئەمساڵ نەم بینییەوە، لەوانەیە دوا ئەمساڵ بەلای مزگەوتەکەمدا تێپەڕێ و گۆڕەکەم لەوێ بێ. ئیتر مەعاذ تێکەیی و لە مەبەستی پێغەمبەر حاڵی بوو دەستی کرد بەگریان»[٢].

مەعاذ لە یەمەن مایەوە تادوا لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر چۆنی فەرموو بوو ئاوا هاتە دی.

---

١ - متفق علیه.

٢ - متفق علیه.

## پەندو ئامۆژگاری:

گرنگترین شتێك: كە پێویستە موسوڵمان لێی حاڵی ببێ دەربارەی كاری ئەو شاندو نێردراوانەی: كە پێغەمبەر ﷺ دەیناردن بۆ ئەركی دەعوەو بانگەوازی بۆ ئیسلام‌و فێركردنی بنەماو ئەحكامەكانی، ئەوەمان تێدەگەیەنێ: كە بەر پرسیاریەتی ئیسلام‌و بلاوكردنەوەو پارێزگاری لێ كردنی ئەركێكە لە ئەستۆی موسوڵمانان دایە لە هەموو چەرخ‌و رۆژگارێكدا، ئەم ئەركە تا بڵێی قورس‌و گرانەو پێویستی بە ماندوو بوون‌و فیداكاری هەیە. ئەركێكی ئاسان نیە وەكوو زوربەی خەڵك وێنای دەكەن.

هەر ئەوەندە بەس نیە لافی موسوڵمانیەتی لێ بدەین‌و بە رواڵەت خۆمان بە موسوڵمان بزانین، هەروا كیفایەت نیە ئیسلام بەشێكی كەم لە ژیانی ئێمە داگیر بكاو ئەركی سەرشانی ئێمە چەند كردارو گوفتارێكی ئاسان‌و كەم وەزن بێ. لە راستیدا ئەركی سەر شانمان بەرامبەر ئیسلام تا بڵێی ئەركێكی پیرۆزو گەورەو گرانە لە واقیعدا وەهایە وەڵێ لە ژیانی ئێمەدا بووەتە داب‌و نەرێت‌و لاسایی كردنەوە. بەڵكوو كیفایەت نیە: كە یەكێك لە ئێمە پەیوەست بێ بە ئیسلامەوەو ئیتر خەمی كەسی تری نەبێ‌و لە كەس نەپرسێ‌و بەر پرسیاری هیچ شتێك نەبێ!!

بەر پرسیاریەتی ئیسلام لە ئەستۆی موسوڵمانان لاناچێ‌و ئەركی سەر شانیان جێ بەجێ ناكەن هەتا وێڕای موسوڵمان بوونیان ئەركی بانگەوازی‌و دەعوە لە ئەستۆ نەگرن‌و لە پێناو بلاوكردنەوەی ئایینی پیرۆزیاندا سەفەر نەكەن بۆ ئەملاو ئەولاو گوندو هۆبەو دەڤەر، بە مەبەستی بلاوكردنەوەی ئایین‌و شیكردنەوەی بۆ خەڵك.

ئەوە ئەو ئەمانەتەیە پێغەمبەری خودا خستۆیەتیە ئەستۆی ئێمەو ئەرکێکی ئیسلامییەو دەبێ جێ بەجێی بکەین‌و لەهیچ کات‌و شوێنێکدا خۆ دزینەوەی لێ ناکرێ.

بێگومان زانایانی ئیسلام‌و ئیمام‌و سەر مەذهەبی هەموو مەذهەبە فیقهییەکان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە: کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئایین‌و شیکردنەوەی بۆ خەڵك لە ناوەوەی وڵات‌و دەرەوەی وڵات فەرزی کیفایەیە لەسەر هەموو موسوڵمانان‌و ئەم ئەرك‌و واجبەیان لە ئەستۆ لاناچێ هەتا کۆمەڵێکیان پێی هەڵنەستن‌و جێ بەجێی نەکەن، دەبێ هەموو کاتێك کۆمەڵێك لە موسوڵمانان بە وڵاتدا بڵاو ببنەوە بۆ دەعوەی ئیسلامی‌و شیکردنەوەی عەقیدەو شەریعە بۆ خەڵك‌و هەوڵ بدەن بە بەڵگەو بورهان ئەفکاری پوچ‌و وەسوەسەو خەڕافات لە زەینی خەڵکی دەربهاون‌و شوبهەو گومان بڕەوێننەوە، بە جۆرێك کردەوەو شوێن دەستی ئەم بانگخوازو مورشیدانە وابێ کیفایەت بکاو ئەو واجبە بەجێ بگەیەنن‌و کەمتەرخەمی نەکەن، ئەگەر لەهەموو شارو گوندو دەڤەرو وڵاتی موسوڵماناندا تاقمێکی لەو جۆرە نەبن‌و ئەو ئەرکە بە گوێرەی پێویست ئەنجام نەدەن ئەوە هەموو دانیشتوانی گوندو شارو وڵات گوناهبارن.

ئەوەی صەحیح‌و ڕاست‌و دروستەو جەماوەری زانایان لەسەری کۆکن ئەوەیە: کە ئەم ئەرکە پێویست‌و گرنگە تەنها لە ئەستۆی ڕەگەزی نێردا نیەو بەس. بەڵکوو ئەرکێکە لە ئەستۆی پیاوو ئافرەتدایە هەرکەسە بە گوێرەی خۆی‌و لە چوار چێوەی دەسەڵات‌و توانای خۆیدا«[١]».

---

١ - بڕوانە: مغنی المحتاج: ٢١١/٤ و الاحكام السلطانية للماوردي.

ئەمجار ئەو نەصیحەت و ئامۆژگاریانەی پێغەمبەر ﷺ ئاراستەی مەعاذو ئەبو موسای ئەشعەری کردن، ئەوە دەگەیەنن: کە هەندێ ئاداب و رەوشت هەن پێویستە بانگخوازی ئیسلامی خۆی پێیان برازێنێتەوە بەتایبەتی لەکاتی بانگخوازیو دەعوە کردن و رێنمویی کردنی خەڵکدا.

لەو ئاداب و رەوشتانە: کە پێویستە لە بانگخوازدا رەنگ بداتەوە دەبێ میانەرەو بێ و هەموو کاتێ هەوڵ بدا لایەنی ئاسانکاری تێیدا زاڵ بێ بەسەر لایەنی توند رەویدا، تا بتوانێ شت ئاسان بکا و خۆ لە قورسکردنی ئایین بەدوور بگرێ. زیاتر موژدە دەربێ تا ترسێنەرو هەڕەشەکار. پێغەمبەر ﷺ بە نموونەیەکی تەطبیقی شێوەی بانگخوازی بۆ مەعاذ روون کردەوە: ئەوە بوو فەرمانی بە مەعاذ کرد کە سەرەتا و یەکەمجار بانگی خەڵك بکا بۆ داننان بە تاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەریێتی حەزرەتی موحەممەد. پێی فەرموو: داوا لە خەڵك بکا شایەتومان بهێنن، جا کە ئەوەیان جێ بەجێ کرد نوێژیان فێربکا و پێیان بڵێ: نوێژەکانیان بە رێك و پێکی بکەن، جا کە ئەوەشیان ئەنجامدا داوایان لێ بکا زەکاتی ماڵی خۆیان بدەن. بەم جۆرە دەبێ داعی ئیسلامی پلە بە پلەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ئەوانەدا بڕوا کە قسەیان بۆ دەکا، تا بتوانێ ئایینی ئیسلامیان لەلا خۆشەویست و ئاسان بکا.

وەلێ پێویستە مەظاهیری ئاسانکاریو موژدەدان لە سنووری شەرع و حاڵەتی موباح و رەوا دەرنەچێ. ئەوە بە ئاسانکاریو موژدەدان ناژمێردرێ: کە بڕی ئەحکام بگۆڕێ یان تەلاعوب بە چمکەکانی ئیسلام بکا بەناوی ئاسانکاری بۆ خەڵك، رازیبوونیش بە تاوان هەرگیز رەوانیەو ناچێتە چوار چێوەی ئاسانکارییەوە.

لە داب و نەریتی بانگەوازی بۆلای خودا «کە ئاداب و رەوشتی ئەمارەت و ویلایەتیشە» خۆپاراستن لە ستەمکردن بەرامبەر هەر مرۆڤێك

بێ، بەتایبەتی وەرگرتنو داگیرکردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا، جۆرە ستەمێکە خەتەرناکەو زۆر جار بانگخوازان تێی دەکەون ئەگەر لە حەقیقەتی بەر پرسیاریەتی خۆیان غافڵ بنو چاودێری خودایان لەبیر بچێتەوە. وەکوو بەزۆری دەسەلاٌتدارو فەرمانڕەوا تێوەی دەگلێن. جا چونکە مەعاذ: کە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ یەمەن دوو ئەرکی هەبوو «ئەرکی بانگخوازیو ئەرکی فەرمانڕەوایی» بۆیە پێغەمبەر ﷺ زۆری جەخت لەسەر کردەوە بۆئەوەی نەکەوێتە هیچ شتێکی نەشیاوو ستەمەوە. پێی فەرموو: {اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ}: خۆبپارێزە لە دوعای ستەم لێکراو، بێگومان لەنێوان دوعاکەیو خودادا هیچ پەردەیەك نیە.

## حەجی ماڵئاواییو وتارە بەناوبانگەکەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) لەو حەجەدا

ئیمامی موسلیم بە سەنەدی خۆی لە جابیرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نۆ ساڵ لە مەدینەدا مایەوە حەجی نەکرد. پاشان ساڵی دەیەمی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ بەناو موسوڵمانان بلاٌوی کردەوە کە ئەمساڵ نیازی بەجێهێنانی حەجی هەیە. ئیتر لەهەموو لایەکەوە موسوڵمانان رژانە ناو مەدینەوە بۆئەوەی لەخزمەت ئەودا حەج بکەنو چاو لە ئەوبکەن لە چۆنیەتی بەجێهێنانی مەراسیمەکانی حەجو عومرەدا.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو حەمکە موسوڵمانانەدا لە مەدینە دەرچوو پێنج رۆژی مابوو مانگی ذیلقەعیدە تەواو ببێ[١] جابیر دەڵێ: کە

١ - راوییەکان راجیاییان هەیە دەربارەی ئەو رۆژەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) تێیدا کەوتەرێ بۆ حەج. ئیبنو حەزم دەڵێ: رۆژی پێنج شەممە بوو. کەسانی دیکە دەڵێن: رۆژی هەینی بوو. ریوایەتی ئیبنو سەعد لە طەبەقاتەکەیدا کە دەڵێ:

پێغەمبەر ﷺ لە «ألبیداء» سواری حوشترەکەی بوو، روانیم لەهەر چوار لایەوە تا چاوبڕبکا بە دەوری پێغەمبەردا خەڵك کەوتبوونە جمبوش و رەو، بەسواری و بە پیادەیی. هەتا چاو هەتەر بکا لەپێش پێغەمبەرەوە لەدوایەوە لەلای راستییەوە لەلای چەپیەوە موسوڵمانان جمەیان دەهات و. پێغەمبەر ﷺ لەناوماندا نیگای بۆسەر نازڵ دەبوو.

ئەمجار راوییانی ئەم روداوە کەوتوونە راجیاییەوە، دانیشتوانی مەدینە پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بە حەج بەستووە «واتە: بەشێوەی ئیفراد». غەیری ئەهلی مەدینە پێیان وایە: پێغەمبەر ئیحرامی بە حەج و بە عومرە بەیەکەوە بەست «واتە: بەشێوەی قیران». هەندێکیش دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ سەرەتا ئیحرامی بە عومرە بەست «واتە: بەشێوەی تەمەتوع» ئەمجار پاشان دەستی کرد بە کاروباری حەج.

پێغەمبەر ﷺ لەلای ژوورووەوە داخڵی مەککە بوو، لە رێگەی «کداء»وە هاتە ناو مەککە تا گەییشتە دەرگای «بنی شیبة». جا کەچاوی بە کەعبە کەوت فەرمووی: {اللّٰهُمَّ زِدْ هَذَا الْبَيْتَ تَشْرِيفًا وَتَعْظِيمًا وَتَكْرِيمًا وَمَهَابَةً وَزِدْ مَنْ عَظَّمَهُ مِمَّنْ حَجَّهُ وَاعْتَمَرَهُ تَشْرِيفًا وَتَكْرِيمًا وَمَهَابَةً وَتَعْظِيمًا وَبِرًّا}«١».

پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە ئەنجامدانی کارەکانی حەجکردنەکەی، خەڵکی فێری چۆنیەتی مەناسیکەکانی حەج کرد شێوەی ئەنجامدانی حەج و عومرەی بۆ رون کردنەوە«٢».

---

رۆژی شەممە بووە لە ریوایەتەکانی تر راستترە. ئیبنو حەجەر لە فەتحولباریدا پشتگیری ئەم رایەی کردووە. رۆژی پێنج شەممە لەو ساڵەدا یەکەم رۆژی مانگی ذیلحیجە، کەوابێ مانگی ذیلقەعیدە لەو ساڵەدا کوڵە مانگ بووەو سی پڕ نەبووە.

١ - رواه الطبراني وابن سعد.

٢ - انظر حديث حجة رسول الله -صلى الله عليه وسلم- من رواية جابر في صحيح مسلم: ٣٧/٤.

**پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی عەرەفەدا وتارێکی گشتگیری لەناو ئاپۆرای موسوڵمانأندا خوێندەوە ئەمە تەرجەمەی دەقی وتارەکەیەتی:**

«ئەی خەڵکینە: گوێ بگرن و قسەکانم ببیسن، من نازانم لەوانەیە دوا ئەمساڵ ئیتر من ئێوە نەبینمەوە لەم جێگەیەو ئیتر تا دونیا دونیایە یەکتر نەبینین. ئەی خەڵکینە! بزانن بێگومان خوێنتان ماڵ و سامانتان، لە یەکتر حەرامە وەکوو حورمەت و ڕێزی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەداو لەم شارەتاندا، ئاگاداربن و بزانن هەموو داب و نەریتێکی سەردەمی نەزانی پاش گوێ دەخرێ و خراوەتە ژێر قاچمەوە، شێوەی خوێن بەستنی سەردەمی نەزانی وەلا نراوەو کاری پێ ناکرێ. یەکەم خوێنێك کەوازی لێ دەهێندرێ و بەدوادا چوونی بۆ ناکرێ خوێنی کوڕی رەبیعەی کوڕی «الحارث»ە ریبا و سودی سەردەمی جاهیلی پوچەڵ دەکرێتەوە، یەکەم رێبا و مامەڵەی سود ئامێز ریبای عەباسی کوڕی «عبدالمطلب»ە هەمووی پوچەڵە» .

ئەی خەڵکینە! دڵنیابن شەیتان نائومێد بووە لەوەی: کە لە خاکی ئێوەدا بە گوێی بکرێ، وەلێ ئەگەر ئیطاعە بکرێ لە غەیری ئەوەدا ئەوە ئەو رازی دەبێ بەوەی ئێوە کردەوەی خراپی خۆتان بە سوك و بێ نرخ سەیر بکەن. وریابن شەیتان کارتان تێ نەکا، هەمیشە حەزەری لێ بکەن.

ئەی خەڵکینە! جێ گۆڕکێ و دواخستنی مانگە شەڕ تێدا حەرام کراوەکان، زێدە کوفرو تاوان زیادکردنە. ئەوانە کافرو بێ بڕوان پتر پێی گومڕا دەبن، ساڵێك مانگەکە دەکەنە غەیری مانگی «أشهر الحرم»و ساڵێکی تر هەمان مانگ دەکەنە مانگی «أشهر الحرم» بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان، ئەوەی خودا بە حەرامی داناوە ئەوان حەلاڵی دەکەن و ئەوەی خودا بە حەلاڵی داناوە حەرامی دەکەن. بێگومان چەرخی ڕۆژگار لەو ڕۆژەوە خودا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردون وەکوو خۆی

هەڵدەسوڕێ‌و گۆڕان‌و پاش‌و پێشی تێدا نیە، ساڵ دوانزە مانگەو چواریان «أشهر الحرم»ن لەو چوار مانگە سێ مانگیان بە شوێن یەکدا دێن «ذولقەعیدە، ذولحیجە، موحەرەم» ئەوی تریشیان «رجب مضر»ە کە دەکەوێتە نێوان «جمادى»و «شعبان».

لەخودا بترسن دەربارەی ئافرەت، ئێوە بە ئەمانی خودا ئەوانتان وەرگرتووەو کردوتانن بە حەڵاڵی خۆتان‌و داوێنیانتان ڕەوا کردووە. ئێوە مافتان بەسەر ئەوانەوە هەیەو ئەوانیش مافیان بەسەر ئێوەوە هەیە، مافی ئێوە بەسەریانەوە ئەوەیە کەسێك نەهێننە سەر جێگاتان‌و ناو ماڵتان کە ئێوە رقتان لێ بێ، ئەگەر ئەوەیان کرد تەمێیان بکەن بە لێدانێك ئازاری جەستەیان نەبێ. مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەوەیە بە رێك‌و پێکی بژێوو پۆشاك‌و شوێنی نیشتەجێ بوونیان بۆ دابین بکەن. خەڵکینە لە قسەکانم تێبگەن ئەوە من پەیامی خۆمم گەیاندو ئەرکی سەر شانم بەجێ هێنا. شتێکم لەناو ئێوە جێ هێشتووە ئەگەر دەستی پێوە بگرن‌و پابەندی بن گومڕانابن‌و سەرتان لێ ناشێوێ نامەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی.

خەڵکینە: گوێ لە فەرمانی فەرمانڕەوا بگرن‌و ئیطاعەی بکەن با ئەو فەرمانڕەوایە قولە ڕەشێکی حەبەشەیی بێ بەمەرجێك بە گوێرەی نامەی خودا کە قورئانە کاربکا.

ئاگاداری بەندەو کۆیلەکانتان بن، لەو خواردنەی خۆتان دەیخۆن بەشی ئەوان بدەن، لەو پۆشاکەی خۆتان لەبەری دەکەن پۆشاك بۆ ئەوان بکەن، ئەگەر تاوانێکی وایان کرد بۆتان هەزم نەدەکراو دڵتان بڕوای نەدەدا لێیان ببورن بیان فرۆشن سزایان مەدەن»[١].

---

١ - ئەم دوو فەقەرانە لە ریوایەتی ئیبنو سەعددا هاتوون.

خەڵکینە گوێتان لە قسەی من بێ و تێی بگەن. بزانن: هەموو موسوڵمانێك برای موسوڵمانە، موسوڵمانان هەموویان بران، حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەس شتێك لەبرای موسوڵمانی وەربگرێ ئەگەر بە ڕەزامەندی و طیبی نەفس نەبێ و بۆ خۆی لەناخەوە پێی خۆش نەبێ. ستەم لە خۆتان مەکەن، خودایە ئەرێ من پەیامی خۆم گەیاند؟

خەڵکینە ئێوە لەوەدوا بەخودای خۆتان دەگەنەوە، لەدوای من گومڕا مەبنەوە، نەکەن دەست بکەنەوە بە یەکتر کوشتن هەندێکتان هەندێکتان بکوژن. با ئەوەی لێرەیە ئەم پەیامە بگەیەنێ بەوانەی ئامادەنین، وێدەچێ هەندێ لەوانەی پەیامی پێ دەگا باشتر تێی بگا لەو کەسەی یەکەمجار دەیبیسی، ئێوە پرسیارتان دەربارەی من لێ دەکرێ چی دەڵێن؟

هەموو وتیان شایەتی دەدەین کەتۆ پەیامی خۆت گەیاندووە لە پێناو پەیامەکەت ئەزیەت و ناڕەحەتیت کێشاوە، ئەرکی سەر شانی خۆت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خۆت ئاراستە کردین، ئەمجار پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و ئاماژەی بۆ ئەوان پێ کردەوە سێ جار فەرمووی: «خودایە بەشایەت بە»[١].

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات مایەوە تا خۆر ئاوابوو، دوایی کەوتە ڕێ و هاتنە خوار بۆ موزدەلیفە لەگەڵ جەماوەرەکەدا، بەدەستی ڕاستی ئاماژەی دەکردو بە خەڵکەکەی دەگوت: خەڵکینە لەسەرەخۆ بن، لەسەرەخۆ بن. لە موزدەلیفە نوێژی مەغریب و عیشای بە جەمع و تەئخیر کرد، ئەو شەوە لە موزدەلیفە مایەوە پاشان پێش خۆرهەڵاتن بەرەو مینا

---

١ - دەقی ئەم وتارە لە صەحیحی موسلیم وەرگیراوە، هەندێ زیادەی لە صەحیحی بوخاری پێوە نراوە هەندێ تێکەڵکێش و ناواخنی لە ئیبنو ئیسحاق و طەبەقاتی ئیبنو سەعد بۆ هێندراوە.

بەرێ کەوت لە «جمرة العقبة» ڕەجمی شەیتانی کرد حەوت بەردی هاویشت لەگەڵ هاویشتنی هەموو بەردێکدا «الله أكبر»ی دەکرد، ئەمجار چووە شوێنی قوربانی سەربڕین شەصت و سێ حوشتری سەربڕی، ئەمجار کێردەکەی دایە دەست عەلی، باقی قوربانییەکانی سەربڕی بۆئەوەی «سەد» تەواوبکا. ئەمجار سواربوو بۆلای کەعبەو «طواف الافاضة»ی بەجێ هێنا. نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد، پاشان هاتە لای نەوەی «عبد المطلب» لەسەر ئاوی زمزم خەریکی ئاو هەڵگواستن بوون. فەرمووی: ئاو بۆ «بنی عبد المطلب» هەڵگوازن، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خەڵك قەرەباڵغی دەکەنە سەر ئاو هەڵێنجانەکەتان ئاوم لەگەڵ هەڵدەگواستن. دۆڵچە ئاوێکیان دایە دەستی لێی خواردەوە، ئەمجار گەڕایەوە بۆ مەدینە.

## پەندو ئامۆژگاری:

**یەکەم: ژمارەی ئەو حەجانەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داون زەمانی مەشروعیەتی حەج:**

زانایان کەوتونە ڕاجیاییەوە لەوەدا ئاخۆ پێغەمبەر ﷺ جگە لەم حەجە حەجی تری کردووە؟؟

تیرمیذی ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردووە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کۆچ بکا بۆ مەدینە سێ حەجی کردووە.

ئیبنو حەجەر لە فەتحولباریدا دەڵێ: ئەم ڕایە لەسەر ژمارەی شاندەکانی ئەنصار بنیات نراوە: کە هاتوون بۆ «ألعقبة» لەمینا دوای تەواوکردنی حەج، لەم ڕوەوە مەدینەییەکان یەکەمجار هاتن وادەو بەڵێنیان گۆڕینەوە، ساڵی دووەم بەیعەتی عەقەبەی یەکەمیان بەست، جاری سێیەم کە هاتنەوە بەیعەتی دووەمیان بەست لەهەرسێ مەوسیمەکەدا پێغەمبەر ﷺ ئامادە بووە.

هەندێ وایان ریوایەت کردووە: کە پێغەمبەر ﷺ پێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە هەموو ساڵێ حەجی کردووە. هەرچۆنێك بێ گومان لەوەدا نیە: کە واجب بوونی حەج ساڵی دەیەمی کۆچی بووە، پێش ئەو مێژووە واجب نەبووە. پێغەمبەریش دوای واجب بوونی یەك حەجی کردووە، بۆیە زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە حەجی ماڵئاواییان گوتووە حەجی ئیسلام. یان حەجی پێغەمبەر. ئیمامی موسلیم عینوانی بۆ ئەم فەرموودەیە بە «حجة رسول الله» داناوە.

بەڵگە لەسەر ئەوە ئەو فەرموودەیە کە شەیخان لە هەواڵی هاتنی شاندی «عبد القیس»دا ریوایەتیان کردووە دەفەرموون شاندی ناوبراو هاتنە خزمەت پێغەمبەرو عەرزیان کرد ئەمرمان پێ بکە بە فەرمانێکی یەکالا کەرەوە، پابەندی دەبین و فەرمان دەکەین بەوانەی کە لەگەڵمان نین بۆئەوەی ئەوانیش تەنفیذی بکەن و هەموومان بچینە بەهەشتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت و نەهیتان لێ دەکەم لەچوار شت. چوار فەرمانەکەی بۆ دەست نیشان کردن و فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم ئیمان بەخودا بێنن نوێژ بکەن، زەکات بدەن، رۆژوی رەمەزان بگرن. لە دەستکەوتی غەزادا پێنج یەك بدەن. وادیارە فەرمانکردنی بە ئیمان هێنان بەخودا زیاد لەچوار شتەکە، چونکە ئەمە لای ئەوان زاندراوو مەعلوم بوو بەلام بۆیە ئەوەی بۆ دووبارە کردنەوە بۆ جەختکردنەوەو رونکردنەوەی ئەوە کە ئیمان بەخودا بناغەی چوار فەرمانەکەیە کە بەدوا ئیمان بەخودا باسی کردن. بێگومان هاتنی ئەم وەفدە لەساڵی نۆیەمی کۆچیدا بوو.

ئەگەر حەج ئەوکاتە فەرز بوایە پێغەمبەر ﷺ لە جوملەی ئەو فەرمانانەی ئاراستەی کردن باسی حەجیشی دەکرد.

**دووەم: مانای گەورەو بەنرخ بۆ حەجی پێغەمبەر ﷺ**

بێگومان بۆ ئەم حەجەی پێغەمبەر ﷺ مانایەکی گەورە هەیە پەیوەندی بە دەعوەی ئیسلامییەوە هەیە پەیوەستە بە ژیانی پێغەمبەرەوەو پەیوەندی بە پەیڕەوو پرۆگرامی گشتی یاسای ئیسلامەوە هەیە.

بێگومان موسوڵمانان لە پێغەمبەرەوە فێری نوێژو رۆژوو شێوەی زەکات دان بوون، هەموو کاروبارێکی ئایینی لە عیباداتو واجباتو رەوشتو ئەخلاق لەوەوە فێربوون. ئەوەندە مابوو موسوڵمانان ئەنجامدانی مەناسیکی حەجو عومرەیان فێربکا، تێیان بگەیەنێ چۆن شەعائیری حەج جێ بەجێ دەکەن، دوای ئەوەی: کە ئەو دابو نەریتەی سەردەمی نەزانی لە فیکە لێدانو قاوو قیژو خۆ روتکردنەوە لەکاتی طەوافدا، لەگەڵ لەناوبردنی بتپەرستی چووە زبڵدانی مێژووەوەو ماڵی خودای لێ پاک کرایەوە.

بانگەوازی بۆ حەج کردنو زیارەتی ماڵی خودا بەردەوام دەبێ هەتا دونیا دونیایە. حەج دەعوەو بانگەوازی حەزرەتی ئیبراهیمە بە فەرمانی خودا ئەو بانگەوازییەی کردوەو ئەو ئەرکو مەناسیکانەی ئەنجامداوە، وەلێ گومڕا بوونو سەر لێ شێواویی سەردەمی نەزانی، بتپەرستیو دابو نەریتی بەتاڵو پوچی تێکەڵاوی مەناسیکو ئەعمالی حەج کردو بە مەظاهیری کوفرو شیرک رەنگ کراو چڵکن بوو، ئیسلام هات بۆئەوەی ئەم عیبادەتە پیرۆزە لەم چڵکو رەنگو پۆخڵاواتە پاک بکاتەوە، بیگێڕێتەوە سەر ئەصڵو بنەمای خۆیو پاکو خاوێنی بکاتەوە، نوری تەوحیدو یەکتا پەرستی بڵاو بکاتەوە، لەسەر بنەمای عوبودییەتی بۆ خودا رەها ئەنجام بدرێ.

بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەو سـاڵە بـەناو خەڵکـدا بـڵاوی کـردەوە کـە حەجی ماڵی خودا دەکا. ئیتر لە هـەموو لایەکـەوە موسـوڵمانان ڕژانـە نـاو مەدینەوەو ڕوویان کردە ئەو دەڤەرە بە مەبەستی ئەوەی پێغەمبەر بکەنە ئیمامو مامۆستای ئەنجامدانی مەراسیمی ئـەو ئەرکە پیرۆزە، بۆئـەوەی لێیەوە فێری ئەعمالی حەج بن، بە شێوەیەکی صـەحیحو دوور لـە هـەموو پۆخلاواتی چاو لێکەری سەردەمی نەزانی.

وادیـارە پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی خراوەتـە دڵـەوە یـان بڵـێین دڵـی خەبەری داوە کە موهیمـەو ئـەرکی ئـەو لەسـەر زەوی خەریکـە تـەواوبێو ژیـانی دونیـای بـەکۆتا بـێ، ئـەوەتا ئـەو ئـەرکی سـەر شـانی جـێ بـەجێ کـردووەو زەوی جزیـرة هـەمووی نـەمامی یـەکتا پەرسـتی تێـدا ڕواوەو ئایینی ئیسلام لە دڵو دەروونی دانیشتوانیدا خۆی دادەکوتێو چەکەرە دەکاو دەپشکوێ.

موسـوڵمان هـەموو لەسـەر تاسـەری وڵاتـی جـەزیرەدا شـەوقو ئارەزۆیان هەیە بەخزمەت پێغەمبەری خۆیـان بگـەنو سـوود لـە هـەدییو ئامۆژگارییـەکانی وەربگـرن، پێغەمبـەریش بـۆ خـۆی ئارەزۆمەنـدە بـە هـاوەڵانی بگـا، بـە تایبـەتی ئـەو حەمکـە خەڵکـەی تـازە هاتوونـە نـاو ئیسلامەوە لەهـەموو شـوێنو کونو کەلەبـەری جـەزیرەدا، کـەس نـەماوە موسـوڵمان نـەبووبێ بـەڵام هـەلی بەخزمـەت گەیـشتنی پێغەمبـەریان بـۆ نەڕەخساوە، یـان وەکوو پێویست بۆیـان دەستەبەر نـەبووە. ئاشکراشـە باشـترین هـەلو فرصـەت بـۆ ئـەو بەیـەك گەییـشتنو سـودبینینە لـە خزمەتیـدا هـەلی بەیـەك گەییـشتنی پێغەمبـەرو موسـوڵمانانە لـە چـوار چێوەی بـەجێ هێنـانی حـەجی مـاڵی خـوداداو کۆبونـەوەی پێدەشـتی کێـوی عەرەفاتـە. کۆبونـەوەو بەیـەك گەییـشتنی نێـوان موسـوڵمانانو پێغەمبەریانـە لـە سـایەی ئەنجامـدانی شـەعیرەیەك لـە گـەورەترین

شەعائیری ئیسلام، کۆبوونەوەو لیقایەك بوو دەرکەوت کە لەزانیاری خوداداو لە ئیلهامی پێغەمبەرەکەیدا بەیەك گەییشتنی ئامۆژگاری خودا حافیزییە.

پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ لەگەڵ ئەو جەماوەرە زۆرەی موسوڵمانان دا کۆببێتەوە: کە بەروبوومی تێکۆشان و ئەرك و ماندویەتی بێ وچانی بیست و سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی و بانگخوازییەتی دەیەوێ لەگەڵیان کۆببێتەوە تا بەکورتی و پوختی تەعالیمی ئیسلام و نیظام و یاسای لەچەند وشەو رستەیەکدا پێ رابگەیەنێ، ئامۆژگارییەکی کورت: کە تێیدا هەست و ویژدانی و خۆشەویستی و دڵسۆزی خۆی دەربڕێ بۆیان، لەهەمان کاتدا لە «إستطلاعی» روخساری ئەوانەوە وێنەو روخساری وەچەو نەوەی داهاتوویان بزانێ و ئامۆژگاری و تەوصییاتی دڵسۆزانەی خۆی ئاڕاستەی هەموو ئەو چین و توێژانەی داهاتوو بکا کە لەپشت پەردەی زەمەن دان، لەدوا دیواری چەرخەکانی رۆژگارەوە خۆیان حەشارداوە.

ئەوە بڕی مەعانی حەجی پێغەمبەرو حەجیماڵئاوایی بوون، دەبینی هەموو ئەو مانایانە لە وتارە مەشهورەکەیدا کە لەشێوی «عُرْنە» لە رۆژی عەرەفەدا ئاڕاستەی جەماوەری موسوڵمانانی کرد، خۆیان دەنوێنن.

### سێیەم: وردبوونەوە لە وتاری حەجی ماڵئاوایی:

ئای خودایە ئەو چەند وشانەی پێغەمبەر ﷺ چەند بەرزو بەنرخن لە پێدەشتی کێوی عەرەفاتدا ئاڕاستە ئاپۆڕای جەماوەری موسوڵمانانی کردن. چ ساتێکی پیرۆزو بەنرخ بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەمیانەی ئەو وتارەیدا خیطابی ئاڕاستەی چینەکانی ئادەمیزاد دەکرد لە داهاتوودا

لەگەڵ مێژوو ئاخاوتنی دەکردو ئامۆژگاری مێژوو ئادەمیزادی دەکرد دوای ئەوەی ئەمانەتو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا، ئامۆژگاری گەلو نەتەوەی کرد بیستو سێ ساڵی تەواو جیهادی کردو ماندوو بوو، ئەرکی کێشا وتارێکی کورت، بەڵام تا بڵێی پڕ ماناو سەرنج راکێشی ئاراستەی جەماوەر فەرموو: ئای: کە ساتە وەختێکی پیرۆز بوو: کە لە دەوری پێغەمبەر ﷺ تا چاو هەتەر بکا ئاپۆرای موسوڵمانان بە خوشوعو دڵ ئاگاییەوە کۆبوبوونەوەو گوێی خۆیان کلۆر کردبوو بۆ بیستنی وتارە مێژووییەکەی، کە ئەوان لەوەپێش هەموویان کەمێکی کەمیان نەبێ – دوژمنو نەیاری بوونو لە هەل دەگەڕان بۆیان رێ بکەوێو دەستی لێ بوەشێنن، دەیان هەزار موسوڵمان تا چاو هەتەر بکا لەهەر چوار لاوە جمەیان دەهاتو بەزمانی حاڵ چمکی {إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ}«سورة غافر/٥١»یان دەخوێندەوەو دوبارەو سێبارەیان دەکردەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە روانگەو پەنجەرەی روخساری ئەوانەوە دەیڕوانییە چینەکانی ئادەمیزاد لە رۆژگارو چەرخە داهاتووەکان دا، دەیڕوانییە پانتایی جیهانی گەورەی ئیسلامی بە خۆرهەڵاتو خۆرئاوایەوە، ئەو حەشاماتو نەتەوە موسوڵمانانەی هێنابوونە بەرمەددی نەظەری پێغەمبەرانەی خۆیو وتارەماڵئاواییەکەی بە گوێچکەیاندا دەداو دەیفەرموو: {أيها الناس اسمعوا قولي فأني لا أدري، لعلي لا ألقاكم بعد عامي هذا بهذ الموقف أبداً}.

هەموو بونەوەر گوێچکەی خۆی کلۆر کردبوو بۆئەوەی فەرمایشتەکانی ببیسن. بەردو دارو گڵو روەك تێکڕا گوێیان راگرتبوو بۆ ئەو وتە خودا حافیزیو ماڵئاواییەی: کە بەسەر دەمو زوبانی پێغەمبەردا رادەبورد، دوای ئەوەی جیهان پێی بەختەوەر بوو ماوەی

شەصت و سێ ساڵ بەسەریدا هات و چوو هەناسەی هەڵکێشا. ئەوا ئەمڕۆ ئامارەی ماڵئاوایی دەکا، دوای ئەوەی فەرمانی خودای بەجێ هێنا، ئیمان و باوەڕی لەسەر زەوی چاندو رواندی و وەبەرهات، ئەوا پوختەی ئەو بنەماو مەبادیئانەی هێناونی و لە پێناویاندا هەوڵ و تێکۆشانی ئەنجامداوە لەچەند رستەیەکی کورت و پڕ ماناو چەند بەندو خاڵێکی بە پەنجە ئەژمار کراو رادەگەیەنێ و بە گوێچکەی بونەوەریدا دەدا!

دەی بابزانین یەکەم خاڵی ئەم وتارە مێژووییە چییە؟

سوبحانەڵڵا! چەند وتارێکی بەرزو سەرنجە راکێش و بەنرخە! هەر دەڵێی پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگارییەکانی لەو واقیعە خلیسکە هەڵدەگواست: کە بە نیگای پێغەمبەرانەی خۆی دەیڕوانییە ئەو گەل و نەتەوانەی سەر لێ شێواوو شوێنکەوتەی ئایدۆلۆجیای بەتاڵ و پوچ و دابڕاو لە روناکی ئەو پەیام و چرا رۆشنەی بۆیان جێ دێڵێ و پێوەی پابەند نابن، بۆیە یەکەم خاڵی وتارە مێژووییەکەی ئەوەبوو کە فەرمووی:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ إِلَى أَنْ تَلْقَوْا رَبَّكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا وَ كَحُرْمَةِ شَهْرِكُمْ هَذَا}.

لە کۆتایی وتارەکەیدا هەمان ئامۆژگاری دووبارە کردەوە جەختی لەسەر گرنگی پێدانی کردەوە: کە فەرمووی:

{تَعْلَمُنَّ أن كل مسلم اخ للمسلم وان المسلمين اخوة فلا يحل لامرئ من أخيه الا ما أعطاه عَنْ طيب نفس منه. فظى تَظْلَمُنَّ أنفسكم ألا هل بلغت}؟

ئێمەیش لەلایەن خۆمانەوە دەڵێین:

بەڵێ ئەی پێشەواو گەورەو پێغەمبەرمان! پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانی خۆت بەجێ هێنا. ئێمەی موسوڵمان ئەمڕۆ لەهەموو کەس زیاتر لەسەرمان پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارەی جەنابت بدەینەوەو بڵێین: بەڵێ خودا شاهیدە ئەتۆ پەیامی خۆت گەیاند!... هەرچەندە ئێمە بەم شایەتی دانەمان بەر پرسیاریەتییەك لەسەر خۆمان تەسجیل دەکەین: کە تا بینە قاقامان کەمتەر خەمیمان تێداکردووە.

**خاڵی دووەم:** تەنها ئامۆژگاری روت نییە، بەڵکوو پێش ئەوەی ئامۆژگاریی بێ، قەرارێکە ئیعلانی دەکا بۆ جەماوەرەکە هەمووی. بۆ ئەوانەی ئاپۆڕایان داوە بە دەوریداو، بۆ هەموو ئەو گەلو نەتەوانەی لەوەدوا دێنە سەر گۆڕەپانی ژیان.

ئەمەیش دەقی قەرارەکەیە: دەفەرموێ: {ألا كل شيء من أمر الجاهلية، تحت قدمي موضوع ... دماء الجاهلية موضوعة وربا الجاهلية موضوع}. ئەم قەرارە پیرۆزە چ مانەیەکی لەخۆ گرتووە؟؟...

قەرارەکە مانایەکی یەکالا کەرەوەی زۆر گرنگی لەخۆ گرتووە. دەفەرموێ: هەر بەهایەك: کە لەسەردەمی نەزانیدا جێگای شانازی بووە، هەر دابو نەریتێك باو بووەو خویان پێوە گرتووە لە دابو نەریتی دەمار گیریو هۆز گەرایی، جوداوازی زمانو نژادو چینایەتی، بە کۆیلە کردنی مرۆڤ لەلایەن برای خۆیەوە بە زنجیرو پێوەندی زوڵمو ستەمو مامەڵەی سوودو ریبا، هەموو بەتاڵەو دەچێتە زبڵدانی مێژووەوە، هیچ بەهاو ئیعتیارێکی نەماوەو پوچەڵ کرایەوەو کاری پێ ناکرێو وەکوو لاکە تۆپیو فڕێ دەدرێو ژێر خاك دەکرێو شەریعەتی خودا جێگای دەگرێتەوە، هەموو ئەو بەهاو دابو نەریتانەی سەردەمی نەزانی ئەمڕۆ لە ژیانی موسوڵماندا جێگەیان ژێر قاچەو پیسنو بەسەر چونو باویان نەما. کوێریو بێ عەقڵییەك بوو تێپەڕیو هەورێکی تاریكو تەپو تۆزێکی چڕو پڕبوو رەوییەوەو ئاسەواری نەما.

ئاخۆ کێ دێ دوای ئەمە خۆڵ هەڵدەداتەوەو ئەو لاکە تۆپیوە بۆگەنە دەر دێنێتەوەو باوەشی تێ وەردێنێ؟ دەبێ چ عاقڵ مەندێك ئەو چڵك و پیس و پۆخەڵەی رزگاری لێی بووە سەر لەنوێ لەخۆی هەڵسوێتەوەو خۆی پێ چڵکن و دزێو بکاتەوە. دەبێ مرۆڤێکی ئازادو ئازا هەبێ ئەو زنجیرو پێوەندەی لێی رزگار بووە جارێکی تر جەستەی بخاتەوە ناویانەوە؟ ئەو کەلەبچەو زنجیرەی دوێنێ شکاندی و توڕیدا، ئەمڕۆ چاکی بکاتەوەو خۆی پێ پێوەندو کەلەبچە بکاتەوە؟!

پیسی و پۆخڵاوتی سەردەمی نەزانی، پێغەمبەر ﷺ لە خەڵکی دوور خستەوە، لە روانگەی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی فیکرو ژیارەوە شۆڕشێکی بەرپا کردو ئیعلانی ئەوەی کرد داب و نەریتی جاهیلی ژێر خاك کراون لەژێر قاچیدان. بۆئەوەی بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنێ و بە هەموو چین و توێژو جیلەکانی ئادەمیزادی بزانێنێ و ببیسێنێ کە هەر سەر لێ شێواو گومڕایەك بەناوی پێشکەوتن خوازی و رۆشنبیرییەوە بێ زەوی لەسەر ئەو لاکە تۆپیوە ژێر خاك کراوە کۆنە هەڵبداتەوە، ئیللا ئەو کەسە پاشەو پاش دەگەڕێتەوە بە پەلە کوتە مەلە لە دەریای بێ بنی مێژوویی تاریکی کۆندا دەکا. هەرچەندە بە خەیاڵی خۆی پێشکەوتن خوازەو بەرەو سەرکەوتن و پێشکەوتن هەنگاو دەنێ.

خاڵی سێیەم: لەم بەندەدا پێغەمبەر ﷺ ئیعلانی ئەوەی کرد کە لەو رۆژەوە خودا ئاسمان و زەوی دروست کردون ساڵ بەسەر دوانزە مانگدا دابەشکراوەو نەگۆڕاوەو ناگۆڕێ، ئەمەش دوای ئەوەی عەرەبەکان تەلاعوبیان پێ دەکردو جێ گۆڕکێیان بە مانگەکان دەکرد. موجاهید دەڵێ: عەرەبەکان هەر دوو مانگ جارێك لە مانگێکی دیاریکراودا حەجیان دەکرد. ئەوەبوو دوو ساڵ لە مانگی ذیلحیجەدا حەجیان دەکرد، دوایی دوو ساڵ لەسەریەك لە مانگی موحەرەمدا حەجیان

دەکرد.... ئاوا بەمجۆرە، جا ئەو ساڵەی پێغەمبەر ﷺ حەجی ماڵئاوایی کرد حەجکردنەکەی ڕێکەوتی مانگی ذیلحیجەی کرد. ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ ئیعلانی کرد کە زەمانەو ڕۆژگار لەو ڕۆژەوەی خودا ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە وەك خۆی هەڵدەسوڕێ ناگۆڕێ، کەوابوو جێگۆڕکێ بە مانگەکان مەکەن، پاشو پێشیان مەخەن، لەمڕۆ بەدواوە حەجکردن لەم ڕۆژو مانگەدا نەبێ دروست نیە، حەج هەردەبێ لە ڕۆژی دەیەمی مانگی ذیلحیجەدا بکرێ.

هەندێ لە مێژوو نووسان باسی ئەوەیان کردووە: کە موشریکەکان پێش ئیسلام ساڵیان بە دوانزە مانگو پانزە ڕۆژ حیساب دەکرد، جا وادەبوو حەج دەکەوتە مانگی ڕەمەزانەوە، یان ڕێکەوتی مانگی شەشەلانی دەکرد، یان مانگی ذیلقەعیدە دەبووە کاتی حەجکردن....... هەروا هەموو مانگەکانی دەگرتەوە. ئەمەش بەهۆی زیادکردنی ئەو پانزە ڕۆژەی لە ساڵیان زیاد دەکرد.

حەجکردنی حەزرەتی ئەبوبەکر لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا ڕێکەوتی مانگی ذیلقەعیدەی کرد. کە ساڵ تێوەر سوڕایەوەو پێغەمبەر ﷺ حەجی ماڵئاوایی کرد حەجەکەی ڕێکەوتی دەیەمی مانگی ذیلحیجەی کرد. زێدەی مانگەکانی لابردوو ئیعلانی کرد: کە حیسابی عەرەبە موشریکەکان پوچەڵەو لەمڕۆ بەدواوە ساڵ هەر دوانزە مانگەو بەس! لەمڕۆوە مانگەکان تێك ناترنجێندرێن، قورطوبی دەڵێ: ئەم قسەیە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەچێ: کە دەفەرموێ: { إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ ....}. واتە: کاتی ئەنجامدانی حەج گەڕایەوە بۆ سەر حاڵو وەزعی خۆی: کە پەروەردگار لە بنەڕەتدا دیاری کردووە لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی، بەو شێوەی کە لە زانیاری خۆیدا چەسپاند بوونیو بەو شێوەیەی کە مەشروعە.

لە خاڵی چوارەمدا: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد بەوەی کە مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتدا باش بێ و ستەمی لێ نەکرێ. لە وشە گەلێکی کورتدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە: کە ئەو زوڵم و ستەمەی لە سەردەمی نەزانیدا ئاڕاستەی ئافرەت دەکرا نەمێنێ و چیتر ئافرەت نەچەوسێندرێتەوە، ناهەقی بەرامبەر نەکرێ. ئەو داب و نەریتەی سەردەمی نەزانی پەیڕەو دەکرا بەرامبەر ئافرەت قەڵاچۆ بکرێ. مافی رەوای خۆوی بدرێتێ و رێزی مرۆڤانەی بگیرێ ئەو مافەی شەریعەت بۆی دەست نیشان کردووە لێی زەوت نەکرێ و ضەمانەتی تەواوی هەبێ.

بێگومان ئەم حەقیقەتە شیاوی ئەوە بوو جەختی لەسەر بکرێتەوە و ئاماژەی بۆ بکرێ و ئەوە بەهۆی هەڵس و کەوتی ئەو موسوڵمانانەی تازە ئیمانیان هێنابوو، هێشتا بە تەواوی لە داب و نەریتی سەردەمی نەزانی دانەبڕا بوون، هێشتا دەمارگیری و ئەو تەقالیدانەیان تێدا مابوون: کە داخوازی ئەوە بوون ئافرەت مافی پێشێل بکرێ و هیچ رێزێکی لێ نەگیرێ، وێدەچێ حیکمەتێکی تریش لەم ئامۆژگارییەدا خۆی بنوێنێ، ئەویش ئەوەیە پێویستە موسوڵمانان لەهەموو سەردەم و رۆژگارێکدا بەرچاو روون بن و بزانن: کە فەرق و جوداوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان کەرامەتی ئافرەت و مافی سروشتی ئەو رەگەزە: کە ئیسلام بۆی بڕیارداوە. لەگەڵ ئەوەی هەندێك کەس و لایەن هەموو وەسیلە و هۆکارێك بەرەوا دەزانن بۆ ئەوەی ئافرەت بکەنە کاڵای رابواردن و لەزەت بینین: کە ئەمە لە ئیسلامدا رەوانیە و ئیسلام بە توندی دژی دەوەستێ و رەتی دەکاتەوە.

لە خاڵی پێنجەمدا: پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هەموو خستە حاڵ و وەزعێکی وەها: کە بۆ حەجکردنی هەموو تەنگژە و چورتمێك کە دێتە

پێشیان لە ژیاندا پەنا بەرنە بەر دوو سەرچاوەو بەس: کە ئەگەر پەنا بەو دوو سەرچاوە بەرن هەرگیزاو هەرگیز تووشی گومڕابوون و شەقاوەت نابن، ئەو دوو سەرچاوەش قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

بێگومان تۆ حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ دەبینی ئەم تەعەهودو بەرعودە بوونە دەداتە هەموو چینەکانی ئادەمیزاد یەك لەدوایەك تا کۆتایی دونیا. بۆئەوەی بۆ خەڵکی روون بکاتەوە کە دەستگرتن بەو دوو سەرچاوانە تایبەت نیە بە سەردەمێکەوەو بۆ چاخێکی تر نەبێ. بەڵکوو بۆ هەموو کات و شوێنێکەو گشتگیرە، هەروا نابێ هیچ تەطەورێکی ژیاری و عورفێکی زەمەنی و ناوچەیی باڵا دەستیان هەبێ بەسەریاندا.

لە خاڵی شەشەمدا: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی تێدا روون کردەوە: کە پێویستە عەلاقەو پەیوەندی حاکم و خەلیفەو سەرۆك لەگەڵ رەعیەت و جەماوەریدا پەیوەندی سەمع و بە گوێکردن بێ، دەبێ پەیوەندییەکە گوێڕادێری بێ لەلایەن شەعبەوە بۆ سەرۆك و فەرمانڕەوا بەمەرجێك بە گوێرەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر رەفتار بکا، جا کوڕی کێیەو لەچ رەگەزو نەژادێکە یان تەمەن و شکڵ و شێوەی چۆنەو چۆن نیە ئەوە گرنگ نیە. هەرکاتێ خەلیفەو فەرمانڕەوا لەو دوو سەرچاوانە لایانداو کاریان پێ نەکردن ئەوە نە قسەیان دەبیسرێ و نە بە گوێیان دەکرێ. هیچ شتێك نیە گەل و نەتەوە ناچاربکا شوێن حاکم و فەرمانڕەوا بکەوێ جگە لە پابەند بوونیان بە ناوەڕۆکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر. گرنگ ئەوەیە فەرمانڕەوا حوکم بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر بکا، ئەمجار ئەو حاکم و فەرمانڕەوایە بەندەیەکی حەبەشییە، فارسە تورکە کوردە عەرەبە ئارییە، سامییە، ..... هتد. ئەوە هیچ لە پلەو پایەی ناهێنێتە خوارێ.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ روون کردینەوە: کە هیچ ئیمتیازو تایبەتیەك نیە بۆ حاکم لە دەرەوەی سنووری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمانڕەوایی و حاکمییەتیەکەی نایخاتە ژوور ئاستی مەنهەج و حوکمی ئیسلامی، چونکە لە حەقیقەتدا ئەو فەرمانڕەواو حاکمە، حاکم و فەرمانڕەوا نیە بەڵکوو ئەمینداره لەسەر جێ بەجێ کردنی حوکمی خودا لەسەر زەوی، لێرەوە دەزانین کە لە شەریعەتی ئیسلامیدا شتێك نیە پێی بگوترێ حەصانە یان دەستەبەر بوونی ئیمتیازات بۆ چینێك لەناو موسوڵمانانیدا دەربارەی کاروباری حوکم و قانون و قەزا.

لە کۆتایی دا پێغەمبەر ﷺ وای دەردەخا ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە بەر پرسیاریەتی دەعوەو بانگەوازی لە ئەستۆی خۆی داڕنیوەو تەواو کاری بەجێ هێناوە. ئەوەتا ئیسلام بڵاوبۆتەوە، ئەوە گومڕاو ضەلالاتی شیرك و جاهیلیەت پوچاونەوە. ئەوەتا ئەحکامی شەریعەتی یەزدانی بە خەڵکی گەیەندراوە، ئەوەتا نیگای ئاسمانی نازڵ بووەو بڵاو کراوەتەوە دەفەرموێ:

{الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا – المائدة/٣}.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەم پرسیارەی دەیەوێ دڵنیابێ لەوەی کە ئوممەتەکەی رۆژی قیامەت لەبەردەم پەروەردگارا لەکاتی پرسیار لێکردنیاندا شایەتی بۆ دەدەن بەوەی کە بە ئەو پەڕی بەر پرسیارییەتییەوە پەیامی خۆی گەیاندووە، ئەوەبوو داوای ئاراستەکردنی ئامۆژگارییەکانی، بانگی هەڵدا بە ناویاندا فەرمووی: {إنكُمْ سَتُسْأَلُونَ عَنِّي فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ}. ئێوە دەربارەی پرسیارتان لێ دەکرێ چی دەڵێن و چۆن وەڵام دەدەنەوە؟. لەهەموو لایەکەوە دەنگ بەرز

کرایەوەو بوو بە هاوارو هوتاف کێشان، دەیانگوت: ئێمە شایەتی دەدەین کەتۆ پەیامی خۆت گەیاندووە، ئامۆژگاری پێویستت ئاراستە کردووە، ئیتر ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ دڵی داسەکناو بێ خەم بوو!

بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەیەویست ئەم شایەتیدانە بکاتە وەثیقەو عەهدو پەیمان و بەو وەثیقەوە بگەڕێتەوە بۆلای خوداو ئیطمئنانی دڵی بۆ پەیدابێ، بەڵێ: دڵنیابوو ڕەزامەندی لەدوو چاوەکانیەوە دەردەکەوت و بەهەردوو چاوی بەرەو ئاسمان دەیڕوانی و بە پەنجەی شایەتومانی ئامارەی بۆ ئاسمان دەکردو ئەمجار بۆلای خەڵکەکەو دەیفەرموو: {اللّٰهُمَّ اشْهَدِ، اللّٰهُمَّ اشْهَدِ، اللّٰهُمَّ اشْهَدْ}. ئای کە پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا خۆی بە بەختەوەر دەزانی!

بەختەوەری پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە گەنجیەتی خۆی و تەمەنی خۆی لەپێناو ڕەزامەندی خوداو بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بەسەر بردووە. بەختەوەر بوو کە دەیڕوانی و بەرهەمی تێکۆشانی خۆی، مایەی تەمەنی: کە خەرجی کردووە کۆبونەوەی ئەو هەموو حەشامەتەیە کە دەنگ بەرزدەکەنەوەو هاوار دەکەن و بانگی یەکتا پەرستی هەڵدەدەن، دەیبینی ناو چاوانەکان دەکەونە سەر زەوی و سوژدە دەبەن بۆ خوداو دڵەکان بە خۆشەویستی خودا لێ دەدەن. ئای کە پێغەمبەرو خۆشەویستی خودا ئەوکاتە کەیف خۆش و بەختەوەر بوو: کە یادی ئەو ناخۆشی و ماندوبوونەی دەکردەوە لە تینوایەتی، کاتی گەرمای نیوەڕۆ، سەفەری بە تەنیایی ناو چۆڵەوانی و عەزابی گاڵتە پێکردن و ئەزیەتدان و بەدرۆ خستنەوە کە هاتبوونە ڕێگایی و پێیاندا تێپەڕی، لەپێناو ئەو ئایینەی بڵاوی کردەوە لەسەر زەوی خودا.

دەی با دوو چاوت ئەی پێغەمبەری ئاخیر زەمان! بە بەختەوەری‌و کەیفخۆشی بڕێژیی‌و خودای خۆت پیرۆزباییت لێ بکاو دڵت ئاوەدان بکاتەوە، لە سوپاس گوزاری‌و کەیفخۆشیدا نقوم بی.

ئەی پێغەمبەری شیرین کردەوە، سوێندمان بە خودا شایەتیدان بە گەیاندنی پەیامەکەت وەنەبێ هەر لەلایەن ئەو دەیان هەزار موسوڵمانەوە بووبێ‌و بەس! بەڵکوو ئەوە شایەتی دانی موسوڵمانانە لە هەموو سەردەم‌و چینێکدا تا دونیا دونیایە. هەموویان بەزمانی حاڵ‌و بە زمانی مەقال، شایەتی دەدەن‌و دەڵێن: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە شایەتی دەدەین کە تەشریفت پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانی خۆت بەجێ هێناو ئامۆژگاریت کرد، خودا باشترین چاکەت بداتەوە بە باشترین چاکەیەك کە پێغەمبەرێك پاداشی دەدرێتەوە لەجیاتی ئوممەتەکەی.

وەلێ ئەرك‌و بەر پرسیارێتی دەعوەو بانگخوازی دوای وەفاتت کەوتۆتە ئەستۆی ئێمەو پەرەپێدانی پەیامی پیرۆزت ئەرکی ئێمەیە! ئای کە ئێمە ئەمڕۆ دوورین لە بەجێ هێنانی ئەو ئەرکەو چەند تەمبەڵ‌و کەمتەرخەمین لەو بارەوە!!!

ئای چەند پەشیمان دەبینەوە سبحەینێ کە ئێمە بە خزمەت جەنابت دەگەینەوە؟ ئای چەند تاوانبارو کوڵ گرانین بە کەمتەرخەمی‌و تەمبەڵیمان‌و پاشگوێ خستنی قیامەت‌و روکردنمان لە بەرق‌و زەرەقی جیهان‌و گوڵی رازاوەی دونیا. لە کاتێکدا بە دەورتدا دەبینین هاوەڵانت لێت گردبوونەوە سەر بەرزو دڵخۆش‌و تەڕ دەماخ، خوێنی شەهیدییان پێوەیەو شوێن دەستیان دیارە کە خوێنی کافرانیان رشتووە بە جەستەیانەوە هەوڵ‌و تێکۆشانی ماندو نەناسانەیان دیارە، بە سیماو روخساریانەوە دیارە دونیایان روخاندووە خستویانەتە ژێر خوڵی

قاچیانەوە بۆ یارمەتیدانی شەریعەتی پیرۆزت، بۆ بەرگری لە دەعوەت و بانگەوازیت و چاو لێکەری جیهادو تێکۆشانت.

خودایە وەزع و حاڵی ئێمەو هەموو موسوڵمانان باش بکەو هۆشیاری ئایینیمان پێ ببەخشی، لە مەستی گیرۆدەبونمان بە دونیاوە هۆشیارمان بکەرەوەو وازبێنین لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزۆ بە لوطف و کەرەمی خۆت دامانپۆشە.

پێغەمبەر ﷺ حەجی تەواوکردو لە ئاوی زمزمی خواردەوە خەڵکی فێری کاروباری حەج کرد پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە بۆئەوەی پەرە بە کۆشش و جیهاد بدا لەپێناو ئایینی خودا.

## نەخۆشکەوتنی پێغەمبەر ﷺ گەڕانەوەی بۆلای خودا

**ڕەوانەکردنی ئوسامەی کوڕی زەید بۆ بەلقاء:**

پێغەمبەر ﷺ هەر کە گەڕایەوە بۆ مەدینە فەرمانی بە موسوڵمانان کرد خۆ ئامادە بکەن بۆ غەزای ڕۆم. بۆ فەرماندەی ئەم غەزایەش ئوسامەی کوڕی زەیدی هەڵبژارد، ئوسامە ئەوکاتە گەنجێك بوو تازە پێدەگەیشت«١». پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد کە سوپاکە بەرەو ئەو جێگایە بەرێ کە باوکی واتە: «زەیدی کوڕی حاریثە»ی لێ شەهید کرابوو، بە سمی ئەسپ سوارانی موسوڵمان خاکی «البلقاء» و «الداروم» لە خاکی فەلەستین بشێلێ، ئەمەش لەکاتێکدا بوو: کە هەستی بە ئازاری ئەو نەخۆشییەی کرد: کە سەرەنجام وەفاتی پێکرد.

لەوکاتەدا کە سوپا خۆی ساز دەکردو موسوڵمانان خەریکی خۆسازدان بوون بە فەرماندەیی ئوسامە. دوو ڕووەکان کەوتنە

---

١ - ئوسامە ئەوکاتە تەمەنی ١٨ یان بیست ساڵ بوو.

بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندەو ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕی‌و دەیانگوت: ئەو هەموو پیاوە لێهاتوو بە ئەزمونە هەن لەناو موهاجیرو ئەنصاردا بۆ فەرماندەیی سوپا کەسی لەوان دەست نیشان نەکردووە، هاتووە گەنجێکی تازە پێگەیشتووی کردووە بە ئەمیرو فەرماندە بەسەر ئەو هەموو پیاوە بە ئەزمون‌و ئازاو دلێرانەی موهاجیرو ئەنصاردا. ئیتر پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە بۆناو خەڵکەکەو لەبەر ئازار، سەری خۆی پێچابوو، وتاری بۆ دان‌و فەرمووی: «ئەگەر ئێوە تانە لە فەرماندەیی بدەن بەلاتانەوە بۆ ئەو کارە نەشیاوبێ ئەوە تانە لە فەرماندەیی باوکی دەدەن، لەوەپێش کە لە غەزای «موتە»دا فەرماندەیی سوپا بوو شەهیدکرا. سوێندم بەخودا زەید شیاوی ئەو پلەی فەرماندەییە بوو: کە پێی درابوو، سوێندم بەخودا زەید خۆشەویستترین کەس بوو لای من، سوێندم بەخودا ئوسامە شیاوی ئەو سەرکردایەتیەیە کە دەست نیشانم کردووە بۆی. سوێندم بەخودا ئێستا ئوسامە لەدوای باوکی خۆشەویستترین کەسە لای من، ئامۆژگاریتان دەکەم بچنە ژێر فەرماندەیی ئەوەوەو بە ئەمیری خۆتانی بزانن، بێگومان یەکێکە لە پیاوە صاڵحەکانی ئێوە»[١].

ئیتر خەڵکەکە خۆیان سازداو هەموو موهاجیرو ئەنصار لەگەڵ ئوسامەدا کەوتنە ڕێ. ئوسامە سوپاکەی لە دەرەوەی مەدینە لە شوێنێك کەناوی «الجرف» بوو چەند فرسەخێك لە مەدینە دوور بوو، لەشکر بەزی پێ کرد.

---

١ - متفق علیه واللفظ لمسلم.

## نەخۆشیو ئازاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

ئالەم کاتەدا نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ پەرەی سەندو ئازارەکەی توند بوو، سوپاکەی ئوسامەش لە شوێنی خۆی وەستاو چاوەڕوانی ئاکامی نەخۆشییەکەی پێغەمبەر بوون، دەیانەویست بزانن: خودا چی دێنێتە دی.

سەرەتای نەخۆشی پێغەمبەر وەکوو ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو سەعد ریوایەتیان کردووە لە ئەبو مووەیهیبە «کە مەولای پێغەمبەر بوو» دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نیوە شەودا هەڵیساندمو فەرمووی: ئەی ئەبو مووەیهیبە فەرمانم پێ کراوە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەم ئەهلی بەقیعە بکەم، وەرە لەگەڵمدا، منیش لە خزمەتیدا رۆیشتم، کە گەییشتینە گۆڕستانی بەقیع، فەرمووی: «السلام علیکم یا اهل المقابر» سڵاوی خوداتان لێ بێ ئەی ئەهلی گۆڕستان! ئەو ژیانەی ئێوەی تێدان زۆر خۆشترە لەو ژیانەی خەڵکی سەر زەوی تێیدان، فیتنەو ئاشوب وەکوو پارچە شەوی تاریک یەك بەدوا یەك دێن، بەشوێن کۆتایی هەر بەڵایەکدا سەرەتای بەڵایەکی سامناکتر دەردەکەوێ. بەڵای دووەم لە بەڵای یەکەم دژوارترە. ئەبو مووەیهیبە دەڵێ: ئەمجار پێغەمبەر ﷺ روی تێکردمو فەرمووی: کلیلی خەزینەی دونیام دراوەتێ لەگەڵ ژیانی هەتا هەتایی، سەرپشك کراوم لە نێوان ئەوەو گەیشتن بەخوداو ژیانی بەهەشت. وتم: دایكو باوکم بە قوربانت بن، کلیلی خەزینەی دونیاو مانەوە تێیدا وەربگرە، پاشان بەهەشت. فەرمووی: نەخەیر ئەی ئەبو مووەیهیبە من گەڕانەوە بۆلای خوداو بەهەشتم هەڵبژاردووە. پاشان داوای لێ خۆشبوونی بۆ ئەهلی بەقیع کرد ئەمجار بەرەو ماڵ گەڕایەوە، ئیتر

لەڕێگە ئەو سەر ئێشەو نەخۆشییەی تێیدا وەفاتی کرد دەستی پێکرد«١».

سەرەتای نەخۆشییەکەی سەر ئێشەیەکی توندو دژوار بوو، هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد لەسەریدا. لە خاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە پێغەمبەر ﷺ لە بەقیع گەڕایەوە پێشوازیم لێکرد پێمی فەرموو: ئەی عائیشە من سەرم زۆر ئازاری هەیە. پاشان سەر ئێشانەکەی لێ توندبوو، لەرزوتای توندی دەهاتنێ. پەیدابوونی ئەم ئازارو سەر ئێشانە لە کۆتایی مانگی صەفەرو لە ساڵی یانزەهەمی کۆچیدا بوو.

خاتو عائیشە لەماوەی نەخۆشی پێغەمبەردا بە مەبەستی شیفا ئایەتی قورئانی بەسەردا دەخوێند.

بوخاریو موسلیم لە عوڕوەوە ریوایەتیان کردووە: کە خاتو عائیشە هەواڵی پێداوەو بۆیگێڕاوەتەوە: کە هەرکاتێك پێغەمبەر ئازارێکی توندی بووبێ ئایەتی قورئانی بەسەر خۆی دا دەخوێندو فوی بەسەر جەستەی خۆیدا دەکردو بە دەستەکانی مەسحی جەستەی خۆی دەکرد، بەڵام کاتێك ئەو نەخۆشییەی تێیدا وەفاتی کرد تینی بۆ هێناو بڕستی

---

١ - روان ابن اسحق وابن سعد في سنده، و روى نحوه أبو داود والنسائى وابن ماجة من حديث عائيشة وابى هريرة وذلك كله غير الحديث الذى رواه مسلم ومالك في الموطأ في باب الطهارة عن ابي هريرة -رضيَ اللهُ عنهُ- أنه -صلى اللهُ عليهِ وسلم- خرج الى المقبُرة فقال: -السّلامُ عليكُمْ دارَ قومٍ مؤمنين وإنّا إن شاءَ اللهُ بكُمْ لاحِقُون ودِدتُ أنّا قدْ رأينا إخواننا، فقالُوا يا رسُول اللهِ ألسنا إخوانك؟ قال: -أنتمْ أصحابي .... الحديث.. وربما توهم البعض ان هذا الذي رواه مسلم ومالك، هوما رواه الآخرون عند قرب وفاته -صلى اللهُ عليهِ وسلمَ- ورويا على نحو آخر. وثبت أنه -صلى اللهُ عليهِ وسلمَ- كان من عادته أن يذهب كل ليلة الى البقيع لدعو ويستغفر الله منه.

لێ بڕی، من دوعاو ئایەتەکانی: کە لەوەپێش خۆی دەیخوێندن، بۆم دەخوێندن‌و فوم بەسەر جەستەی پیرۆزیدا دەکرد بە دەستی خۆی مەسحی دەم‌و چاوو سینگ‌و بەرۆکیم دەکرد.

خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەستیان کرد کە پێغەمبەر پێی خۆشە لە ماڵی خاتو عائیشە بۆ نەخۆشییەکەی بکەوێ، چونکە دەیانزانی چەندی خۆش دەوێ‌و چەند مورتاحە بە مانەوە لای ئەو.

ئیتر پێغەمبەرلەو بارەوە ئیزن دراو لە ماڵی مەیمونەی خێزانیەوە گواستیەوە بۆ ماڵی عائیشە «فەضلی» کوڕی عەباس‌و عەلی کوڕی ئەبو طالب چوو بوونە ژێر باڵیەوە. لەماڵی عائیشەدا نەخۆشییەکەی لێ توندبوو، هەستی کرد هاوەڵانی زۆر بۆی بە پەرۆشن‌و لە لەقە لەق دان، فەرمووی: لە حەوت کوندە ئاو ئاوم پێدابکەن کە زارکیان نەکرابێتەوە، بەڵکوو بتوانم بچم بۆلای خەڵکەکەو قسەیان بۆ بکەم، عائیشە دەفەرموێ: لە سوێنەیەکدا دامان نیشاندو لەو کوندە ئاوانە ئاومان پێداکرد تا بەدەستی ئامارەی کرد کە ئیتر بەسە. ئەمجار چووە ناو خەڵکەکەو نوێژی بۆ کردن‌و پاشان وتارێکی بۆدان«١».

کە چووە ناو خەڵکەکە سەری خۆی پێچابوو، لەسەر مینبەر دانیشت، یەکەمجار کە کەوتە ئاخاوتن داوای رەحمەت‌و لێخۆشبوونی بۆ هاوەڵانی غەزای ئوحود کرد، پاشان فەرمووی: بەندەیەك خودا سەرپشکی کردووە لەنێوان گوڵ‌و جوانی دونیاو ئەو نازو نیعمەتەی لای خۆی هەیە، بەندەکە نازو نیعمەتی لای خودای هەڵبژارد. حەزرەتی ئەبوبەکر لە پرمەی گریانیدا چونکە لە قسەکەی پێغەمبەر ﷺ حاڵی بوو، زانی مەبەستی چیە. بانگی کردو وتی بە دایك‌و باوکمەوە

---

١ - رواه البخاري.

بەقوربانت بم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی ئەبوبەکر لەسەرە خۆبە. ئەمجار فەرمووی: خەڵکینە! بێگومان کەسێك کە زۆر پیاوەتی بۆ من هەبووە لە ماڵو سامانو لە هاوڕێیەتیدا ئەبوبەکری صدیقە. خۆئەگەر جگە لەخودا خۆشەویستێکم هەڵبژاردایە ئەبوبەکرم دەکردە خۆشەویست، بەڵام ئەمە برایەتی ئیسلامییە... هەموو ئەو دەرگایانەش دابخەن کە دێنە سەر مزگەوت جگە لە دەرگای ئەبوبەکر ئەو بەکراوەیی بهێڵنەوە. ئەمن پێشەنگو پەزمەندەم بۆ ئێوە، شایەتم بەسەرتانەوە، ئەمن سوێندم بەخودا لەوە ناترسم دوامن ببنەوە بە موشریكو بتپەرست، بەڵکوو دەترسم روبکەنە دونیاو پێشبڕکێی تێدا بکەنو قیامەتتان لەیاد نەبێو کار بۆ ئەو نەکەن«١».

پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو نەخۆشییەکەی لێی توندبوو ئازاری زیادی کردو دەردەکەی گران بوو.

خاتو عائیشە ریوایەتی کردووەو دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا کە نەخۆشییەکەی زیادی کردبوو، فەرمووی: بۆم بانگی ئەبوبەکری باوکتو براکەت بکە، هەتا شتێکتان بۆ بنووسم، ئەمن ترسی ئەوەم هەیە یەکێك لە خۆیەوە بێو بڵێ: من لە ئەبوبەکر لە پێشترم، ئێمە لە ئەبوبەکر شیاو ترین بەو کارە! خودا بەوە رازی نیەو موسوڵمانانیش بەو هەڵوێستە رازی نین«٢».

ئیبنو عەبباس گێڕاویەتیەوە دەفەرموێ: کە ئازارو نەخۆشی لەسەر پێغەمبەر ﷺ قورس بوو، بە هەندێ لەو پیاوانەی لە دەوری بوون فەرمووی: ئادەی خۆتان ئامادە بکەنو قەڵەمو کاغەز بێنن نامەیەکتان بۆ بنووسم با دوای من سەرتان لێ نەشێوێ، هەندێکیان وتیان: پێغەمبەر

---

١ - متفق علیه.

٢ - رواه مسلم في باب فضل ابی بکر: ١١٠/٧ وروی البخاری نحوه.

ئازاری زۆرەو قورئانتان لایە، قورئانمان بەسە. ئیتر ئامادەبووان کەوتنە کێشەو مقۆ مقۆوە، هەبوو دەیگوت: دەوەرنە پێشەوە با تەشریفی نامەکە بنووسێ و دوایی سەرمان لێی نەشێوێ، هەشبوو دەیگوت: قورئانمان لایەو بەسمانە، جا کەزۆر لەغوەو مقۆ مقۆیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە هەڵسن دەورم چۆڵ بکەن«[١]».

ئیتر نەخۆشییەکە بڕستی لە پێغەمبەر بڕی و نەیتوانی لەماڵ دەربچێ بۆ نوێژ کردن لەگەڵ موسوڵماناندا، فەرمووی: بە ئەبوبەکر بڵێن: با پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکا، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبوبەکر پیاوێکی عاتیفی و دڵنەرمە، ئەگەر چووە شوێنی تۆ بۆ ئیمامەت لەوانەیە لەبەرگریان نەتوانێ دەنگی خۆی والێ بکا خەڵکەکە بیبیسێ. فەرمووی: ئێوەی ئافرەت زۆرزان و مەکر بازن دەزانم مەبەستت چیە.

بە ئەبوبەکر بڵێن: با پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکا«[٢]» هەڵبەتە خاتو عائیشە مەبەستی ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانەکەی دووبارە بکاتەوەو جەخت لەسەر وەصیەتەکەی بکاتەوەو بیچەسپێنێ.

ئیتر لەوەدوا هەر حەزرەتی ئەبوبەکر پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد. لەم ماوەیەدا جارێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ مزگەوت هەستی بەوە کردبوو کە نەخۆشییەکەی کەمێ سووك بووە: کە چووە ژوورەوە ئەبوبەکری بینی بە پێوەیەو پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان دەکا، ئەبوبەکر کە پێغەمبەری بینی ویستی بچێتە دواوە پێغەمبەر ئیشارەی بۆکرد کە لە شوێنی خۆی بێ، ئیتر پێغەمبەر ﷺ هاتە تەنیشتی ئەبوبەکر دانیشت، ئەبوبەکر بە گوێرەی نوێژی پێغەمبەر نوێژی کرد واتە:

---

١ - رواه البخاري في باب مرض النبيﷺ و وفاته: ١٣٨/٥.

٢ - متفق عليه.

پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی ئەبوبەکر بوو، ئەبوبەکریش پێش نوێژی خەڵکەکەی دەکرد»[١].

خەڵکەکە ئەوکاتە بەهاتنە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ کەیف خۆش بوون و هیوای چاکبوونەوەیان لێ دەکرد، بەڵام تایەکەی توندتر بوو، ئەوە دواجار بوو پێغەمبەر ﷺ بێتە ناو مزگەوتەوە.

ئیبنو مەسعود ریوایەتی کردووە دەڵێ: لەو سەرو بەندەدا: کە پێغەمبەر ﷺ نەخۆش بوو، چوومە خزمەتی، تایەکی توندی لێ بوو دەستم لە جەستەی پیرۆزیدا زۆر گەرم بوو، وتم ئەی پێغەمبەری خودا! تایەکی زۆر بەهێزت لێیە. فەرمووی: بەڵێ، منیش تام لێ دێ وەکوو چۆن دوو پیاو لە ئێوە تایان لێ دێ. دەڵێ: وتم: کەوابێ جەنابت دوو پاداشت هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: هەر موسوڵمانێك ئەزیەت و ئازارێکی تووش بێ، نەخۆش بێ، ماندو بێ ئیللا بەو ئەندازە گوناهەکانی لێ هەڵدەوەرن، خودا گوناهی لێ دەتەکێنێ وەکوو چۆن درەخت لەوەرزی پایزدا گەڵاکەی هەڵدەوەرێنێ»[٢].

---

١ - رواه البخاري في كتاب الصلاة باب من أقام الى جنب الامام لعلة و مسلم في كتاب الصلاة باب استحلاف الامام، و مالك في الموطأ كتاب صلاة الجماعة باب صلاة الامام وهو جالس، وغيرهم، ومن العجب أن الشيخ ناصراً أخرج هذا الحديث في تخريجه لاحاديث كتاب فقه السيرة للغزالي فعزاه الى الامام أحمد وابن ماجة فقط وزاد على هذا أن أخذ يحقق في نسبة ضعف اليه بسبب ان فيه أبا اسحق السبيعي، مع ان الحديث متفق عليه وله طرق غير هذا الذى اهتم بتحقيقه: اللهم الا أن رواية أحمد وابن ماجة فيها .واستفتح من الأية التي بلغها أبوبكر. وليس في رواية الشيخين هذه الجملة. وعلى كل حال فالحادثة واحدة والحديث واحد ولا ينبغى عند التخريج الاقتصار على ذكر الطريق الضعيف والسكوت عن الطريق الصحيح أو المتفق عليه السلام لما في ذلك من الايهام الواضح الذى يتحاشاه علماء الحديث.

٢ - متفق عليه.

لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ پارچە قوماشێکی بەسەر دەمو چاوی خۆیدا دەدا، کە دڵی تەنگ دەبوو ئازاری زیادی دەکرد پارچە قوماشەکەی لادەدا. فەرمووی: نەفرینی خودا لە جولەکەو مەسیحی بێ گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردون بە مزگەوت[١]، وەکوو ئەوە پێغەمبەر ئوممەتەکەی بترسێنێ لەوەی موسوڵمانان لاسایی جولەکەو گاور بکەنەوەو چاو لە ئەوان بکەن.

## پێغەمبەر دەکەوێتە حاڵەتی گیانەڵاوە

ئەوە بڕیاری پەروەردگارە دەربارەی بەندەکانی هەموویان: {إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ – الزمر/٣٠}.

ئەوەبوو تەشریفی کەوتە بەرە بەیانی رۆژی دوو شەممەی دوازدەی مانگی رەبیعول ئەوەلیساڵی یانزەهەمی کۆچی، لە کاتێکدا خەڵك لە مزگەوت لەپاش حەزرەتی ئەبوبەکرەوە نوێژیان دەکرد، لەپڕێکا ئەو پەردەی دادرابوەوە لە نێوان مزگەوتو ماڵی عائیشەدا لادرا، پێغەمبەر ﷺ لەدوا پەردەکەوە بیندراو دەیڕوانییە موسوڵمانەکان کە لەپشت حەزرەتی ئەبوبەکرەوە ریزیان بەستبوو بۆ نوێژکردن پێغەمبەر ﷺ خەنەیەکی هاتێ، ئەبوبەکر کشایەوە بۆئەوەی بێتە ناو ریزی دواوەی، وای گومان برد پێغەمبەر دەیەوێ بێتە مزگەوت بۆ نوێژ، موسوڵمانەکان لەخۆشیان خەریکبوو نوێژەکەیان لێ تێك بچێ، پێغەمبەر بەدەستی ئاماژەی بۆ کردن: کە نوێژەکەیان تەوابکەن، پاشان چووەوە ژوورەکەی خۆیو پەردەکەی دادایەوە.

خەڵکەکە نوێژەکەیان تەواوکرد هەریەکەیان بۆکاری خۆی رۆیشت، وایان دەزانی پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەکەی سووك بووەو بەرەو

---

١ - متفق علیە.

چاکبوونەوە دەچێ. بەڵام دوایی دەرکەوت ئەوە تێڕوانینی ماڵئاوایی‌و خودا حافیزی بوو لە هاوەڵانی.

ئەوەبوو تەشریفی گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خاتو عائیشەو لەسەر جێگاکەی ڕاکشا. عائیشە سەری پێغەمبەری بەسینگی خۆیەوە نا ئیتر باری تەندروستی بەرەو خراپی ڕۆیی‌و کەوتە حاڵەتی گیانەڵاو سەکەراتی مردن دایان پۆشی. عائیشە دەفەرموێ: لەوکاتەدا جامە ئاوێك لەبەردەم پێغەمبەردا بوو، هەرتاوە ناتاوێك دەستی دەخستە ناو ئاوەکەوەو دەستی تەڕی بەدەم‌و چاوی خۆیدا دەهێناو دەیفەرموو: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ}«[1]».

فاطیمە کە ئەم حاڵەتانەی لەپێغەمبەر دەبینی دەیگوت: ئای لەکۆست کەوتوویی خۆم! لەو نارەحەتیەی باوکم تێیدایە. پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: لەمڕۆ بەولاوە باوکت ناخۆشی نابینێ. «رواه البخاری».

دایکی موسوڵمانان خاتو عائیشە دەفەرموێ: لەکاتی گیان دەرچوونی پێغەمبەردا خودا تفی من‌و تفی ئەوی تیکەڵاو کرد، ئەوەبوو لەوکاتەدا «عبدالرحمن هاتە ژوورەوە سیواکێکی بەدەستەوە بوو پێغەمبەر پاڵەو پشتی بەمنەوە دابوو، بینیم سەیری سیواکەکەی دەکرد، زانیم حەزی لەوەیە سیواك بکا، عەرزمکرد: سیواکەکەت بۆ وەربگرم؟ ئەویش بەسەری ئاماژەی بۆ کردم، کە بەڵێ حەزم لە سیواك کردنە. سیواکەکەم بۆ وەرگرت بە دەم‌و پوکی ناخۆش بوو، عەرزم کرد: بۆت نەرم بکەم؟ بەسەری ئاماژەی کرد: کە ئا، بۆم نەرم بکەرەوە. بۆم نەرم

---

١ - رواه البخاری في باب مرض الرسول الله -صلى الله عليه وسلم- ووفاته وفي باب سكرة الموت من كتاب الرقاق: ١٩٢/٧ ورواه الترمذی والنسائی واحمد بطريق آخر بلفظ -اللهم أعنی على سكرات الموت-.

کردو دامە دەستی، ئەویش لەناودەمی خۆی رادا. لەبەر دەستیدا جامە ئاوێك هەبوو تاوە ناتاوێك دەستی دەخستە ناو ئاوەکەو دەمو چاوی خۆی پێ مەسح دەکرد. دەیفەرموو: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ}. پاشان دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: «في الرفيق الأعلى» تا گیانی پاکی دەرچوو دەستی شل بوو کەوتە خوار«[١]».

هەواڵی جەرگبڕی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بەناو موسوڵماناندا بڵاوبۆوە. حەزرەتی ئەبوبەکر لە ماڵی خۆیەوە کە لە «السَّنح» بوو بە سواری ئەسپێك هات «لەوەپێش چوبووەوە بۆ ماڵەوە، بەو هیوایە: کە پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەکەی سوك بووە» هات دابەزی‌و چووە ناو مزگەوتەوە، لەگەڵ کەس قسەی نەکرد تاچووە ژوورەکەی خاتو عائیشەو لە پێغەمبەر نزیك بووە: کە بە قوماشێکی «حبرة» داپۆشرابوو. لەسەر روخساری هەڵدایەوەو خۆی بەسەردا داو ماچی کردو گریا. پاشان فەرمووی: «باوك‌و دایکم بە قوربانت بن» خودا دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە، ئەو مردنەی کە خودا لەسەری واجب کردبووی ئەوە بەجێت هێنا«[٢]».

ئەمجار چووە دەرەوە بۆناو خەڵکەکە، لەوکاتەدا عومەری کوڕی خەطاب قسەی بۆ خەڵکەکە دەکردو دەیگوت: پێغەمبەر نەمردووە، بەڵکوو چووە بۆلای خودا، وەکوو چۆن حەزرەتی موسای کوڕی عیمران چوو بوو بۆلای خودا، پێغەمبەر نامرێ هەتا ئەو رۆژەی خودا دوو رووەکان لەناو دەبا.

حەزرەتی ئەبوبەکر رووی تێکردو پێی فەرموو: عومەر لەسەرخۆبە ئەو قسانە مەکە، ئەو قسانە قسەی کردن نین، بەڵام عومەر لە قسەکردنی

---

١ - رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري.

٢ - رواه البخاري.

خۆی نەکەوت بە رق هەڵساوی و تورەیی سوور بوو لەسەر وتەکانی و دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ نامرێ. جا کە حەزرەتی ئەبوبەکر بینی عومەر بێدەنگ نابێ، حەزرەتی ئەبوبەکر روی لە خەڵکەکە کردو خەڵکەکەش هەموویان رویان کردە ئەوو وازیان لەوە هێنا گوێ بۆ حەزرەتی عومەر بگرن. ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر وتارێکی کورتی بۆدان! فەرمووی: دووای سوپاس و ستایش بۆ خودا: ئەی خەڵکینە! ئەو کەسەی بەندایەتی بۆ موحەممەد دەکرد ﷺ ئەوە موحەممەد ﷺ مرد، کەسێکیش عیبادەتی بۆ خودا کردووەو خودا دەپەرستێ ئەوە خودا زیندووەو نامرێ، هەر بووەو هەر دەبێ، خودا بۆ خۆی فەرموویەتی:

{وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ ؟ - آل عمران/ ١٤٤}.

هەر دەتگوت: لەوەپێش ئەو خەڵکە نەیانزانیوە کە خودا ئەم ئایەتەی نازڵ کردووە تا حەزرەتی ئەبوبەکر خوێندییەوە، دەتگوت: یەکەم جارە ئەم ئایەتە دەبیسن و هەموویان لەدەمی ئەبوبەکر وەریان گرتووە، هەر کەبیستیان خێرا خێرا هەریەکەلە عاست خۆیەوە دەیخوێندەوە. حەزرەتی عومەر دەڵێ: سوێندم بەخودا کاتێك گوێم لێ بوو ئەبوبەکر ئەو ئایەتەی خوێندەوە قاچم بەستران و لە شوێنی خۆم جوڵەم بۆ نەکراو نەمتوانی بە پێوە بوەستم و کەوتمە سەر زەوی. کە گوێم لە ئایەتەکە بوو زانیم کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە"[١].

بێگومان سیرە نووسان و زانایانی مێژوو کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی شەصت و سێساڵیدا وەفاتی کردووە. چل ساڵی پێش پێغەمبەرێتی و بیست و سێ ساڵیش بە پێغەمبەرێتی. سیانزە ساڵ لە مەککەدا بانگەوازی کردووە بۆ یەکتا پەرستی، دە

---

١ - رواه ابن اسحاق وغيره، كما رواه البخارى أيضا مع فرق بسيط في بعض الألفاظ.

ساڵیش لە مەدینە لەدوای کۆچکردنی بۆ ئەوێ بە جیهادو خودا پەرستی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و چەسپاندنی شەریعەت و عەقیدە بێ وچان و ماندو نەناس، بەسەری برد. وەفاتی پیرۆزی لە سەرەتای ساڵی یانزەی کۆچی دابوو.

بوخاری لە عەمری کوڕی «الحارث»ەوە گێڕاویەتیەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە وەفاتی کرد نە دینار نە دیرهەم نە کۆیلەو نە کەنیزەکی لەدوا خۆی بەجێ نەهێشتبوو، جگە لە هێسترە سپییەکەی کە سواری دەبوو، لەگەڵ سیلاحەکەیداو زەوییەك کە کردی بە خێرو صەدەقە بۆ ڕێبواران.

## پەندو ئامۆژگاری:

لەنێو روداوەکانی ئەم بەشەی کۆتایی ژیانی پێغەمبەر ﷺ چیرۆکی حەقیقەتێکی گەورە لە بونەوەردا خۆی دەنوێنێ!! حەقیقەتێك کە لە ئاستیدا هێزو توانای جەبابیرەو سەر رەقی مولحیدەکان پوچ دەبێتەوە، بوغڕاو طوغیانی یاخی بووان و خۆ بەخودا زانان دەپوکێنەوە. حەقیقەتێکە هەموو روبەری بونەوەر دەگرێتەوە و دایدەپۆشێ بە هەوری لەناوچون و فەوتاندن. هەموو ژیانی مرۆڤایەتی بەرەنگی بەندایەتی و ژێر دەستەیی رەنگ دەگا بۆ خودایەك قەهارو باڵا دەستی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بوونەوەرە. حەقیقەتێکە «بەخۆشی یان بە ناخۆشی» یاخی و گوێ رادێر، سەرۆك و خۆ بەخودا زان، پیاو چاك پێغەمبەران، مرۆڤەکان هەموو، هەموو زیندووەکان دەیکەنە پۆشاك و لەبەری دەکەن! پیاڵە ژەهرێکە دەبێ بیچێژن.

حەقیقەتێکە بە درێژایی رۆژگارو دووبارە بوونەوەی شەوو رۆژ بانگ دەدا بە گوێی هەموو بیسەرێك و عەقڵ و هۆشی هەموو خاوەن فیکرو

بیرو هزرێکدا: کە خودایەتی راستی هەر شیاوی «الله»یەو بەس. حاکمییەتو فەرمانڕەوایی تەنها بۆ ئەو خودایەیە کە هەر خۆی باقی و بەردەوامە. هەر ئەو قەضاءو بڕیاری رەت ناکریتەوە، پانتایی دەسەڵاتی بێ ئەندازەو سنوورە، کەس ناتوانێ لەژێر حوکمو دەسەڵاتی رەهای دەربچێ، کەس نیە باڵا دەست بێ بەسەر فەرمانو بڕیاریدا.

دەبێ چ حەقیقەتێك هەبێ نوطق بەم دەلالەتو نیشانانە بکا بەجۆرێك باشتر بێ لە حەقیقەتی مردنو سەکەراتی مردن؟! کە پەروەردگار دانیشتوانی دونیای پێ دەجەڕێنێو لەبەرە بەیانی ژیانو وجودەوە هەموو زیندویەکی پێ سەر نگون دەکاو دەیخاتە تونی فەناوەو ئەم یاسایە پایەدارە تا دونیا دونیایەو خۆر لە ئاسماندا بێو بچێ.

بێگومان لە رێڕەوی ئەم جیهانەدا زۆر کەس هاتنو رۆیشتن لەو خۆ بەخودا زانانەی بە کەمێك دەسەڵاتو هێزو توانا لە خۆیان بایی بونو نقومی تۆزە هێزو وزەیەك بون: کە پێیان درابوو یان کەمێك زانست: کە لێی حاڵی بوو بوون، یان داهێنانو ئیختیراعێك: کە کەشفیان کردبوو، لوت بەرزییان نواندو لەخۆیان بایی بوونو سەر رەقییان نواندو خۆیان بەخودا زانی تا لەنکاوێك ئەم حەقیقەتە گەورەیە: کە مردنە تێکیەوە پێچانو لوولی دانو فرێی دانە سارای بەندایەتیو لە خەوی غەفڵەت راستی کردنەوە، خستنیە حاڵەتی ملکەچی بۆ خودای باڵا دەستو راگری ئاسمانو زەوی، خاوەنی مڵکی حەقیقیو دەسەڵاتی رەهای بێ سنوور، گەڕانەوە بۆ لای خودا بە زەلیلیو ملکەچیو ناچاری!!

بەڵێ بڕیاری «کل نفس ذائقة الموت» بڕیارێکی گشتیو بێ قەیدو شەرتە، بڕیارێکی رەهایەو هەموو زیندەوەرێك دەگرێتەوە، گشتگیرییەکە هەموو دونیا ناتوانێ سنووری بۆ دانێو چەند کەسێکی لێ چەرت بکا، دەی با ئەوانەی لافی زانستی تازە لێ دەدەنو بە

پێشکەوتن و زانستی سەردەم دەنازن، ئەوانەی چوونە سەر مانگ و کەشفی فەزاو سەر ئەستێرەکان دەکەن، یان بنکی دەریاکان دەگەڕێن و ناخی زەوی دەپشکنن، با هەموویان کۆببنەوەو یەك بگرن و یارمەتی یەکدی بدەن و هەموو هێزو توانای خۆیان بخەنە گەڕ، هەموو کەشتییە ئاسمانیەکانیان و موشەك و فرۆکە تیژ ڕەوو دوور هاوێژەکانیان ئامادە بکەن، هەموو فەنن و زانیاری پزیشکی و تەندروستییان بکەنە هۆکارو وەسیلە بۆئەوەی دەسەڵاتی مردن لە خۆیان دوور بخەنەوە، هێزو قووەتی ئەو حەقیقەتەی کە دەیان جەڕێنێ و ملکەچیان دەکاو رایان دەڕفێنێ بۆ تونی فەناو تێداچوون، بەر پەرچ بدەنەوەو، بەهەموو ئیمکاناتی ژێر دەستیان بتوانن: ئەم تەحەدا خوداییە، ئەم قانونە ڕەهایە «كل نفس ذائقة الموت» بەتاڵ بکەنەوە. ئەگەر توانییان ئەوە بکەن ئەوکاتە بۆیان هەیە باڵە خانەی بەرزو پتەوی جەبەروت و بەخۆبایی بوون و خۆ بەخودا زانین کوفرانی نیعمەت رابیەستن! ئەگینا واچاکە بۆیان تەفەروغ بکەن بۆ بیرکردنەوە لەو گۆڕانەی لەناویاندا گوم دەبن و ئەو گڵ و خاکەی لەژێری دا درێژدەبن، بترسن لەو دەست و بازوو دەسەڵاتەی تێکیانەوە دەپێچێ و لە حوکم و بڕیاری رزگاریان نابێ.

بێگومان لە ئاسان ئاسانتر بوو بۆ پەروەردگار: کە پلەی پێغەمبەر ﷺ بخاتە ژوور ئاستی مردن و ئازارەکانی. وەلێ حیکمەتی وا داخواز بووە کە بڕیارو حوکمی بەوەی هەموو کەس پیاڵە ژەهری مردن بە هەموو ئێش و ئازارێکیەوە بچێژێ، چەندێك لەخودا نزیك بێ و خۆشەویستی بێ لەم حوکمە رزگاری نەبێ. بۆئەوەی ئادەمیزاد هەموویان لەگەڵ مانای یەکتا پەرستیدا بژین حەقیقەتەکەی هەزم بکەن. هەموویان باش تێبگەن: کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بەندەو ملکەچی خودایە، بۆ کەس نیە لوت بەرزی بنوێنێ و لە ئاستی بەندایەتی بۆ خودا خۆی زیاتر بگرێ. مادام پێغەمبەر ﷺ دوای تەواو

بوونی تەمەنی دیاریکراوی ملکەچی ئەو حوکمە ئیلاهییە بوو، پیاڵەی مردنو ئازارەکانی چەشتو دونیایی بەجێ هێشت. پێویستە هەموو کەس لە عاست خۆیەوە بیر لەمردنو ئازارەکانی بکاتەوە.

ئەمەش ئەو مانایەیە کە قورئان رونی دەکاتەوەو دەفەرموێ: {إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ – الزمر/٢٠} یان کە دەفەرموێ: {وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ؟! كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ – الأنبياء/ ١٣٤ ء ١٣٥}.

کەوابوو ئێمە لەم بەشەی کۆتایی سیرەی پێغەمبەر ﷺ لەبەردەم دوو حەقیقەت داین: کە بەدوو کۆڵەکەی ئایین دەژمێردرێن. دوو کۆڵەکەی بڕوا بەخودا، بەڵکوو دوو کۆڵەکەی حەقیقەتی بونەوەرن. «حەقیقەتی تاکو تەنهایی خوداو حەقیقەتی بەندایەتی بۆ خودا کە لە سروشتی هەموو ئادەمیزادێکدا هەیەو ئاوێتەی بووە، بڕیاری خوداش پاشگەز بوونەوەی نیە».

دەی با ئێستا ئەو وانەو ئەحکامانە رابنوێنین کە لەدوو توێی ئەم باسەدا هەیە:

## یەکەم: بەرزیو رێزداری لە حوکمی ئیسلامیدا بە کردەوەی چاك دەبێو بەس:

بێگومان زەیدی کوڕی حاریثە کۆیلە بوو ناوبراو باوکی ئەم کوڕە گەنجەیە کە ناوی «أسامة»یەو پێغەمبەر ﷺ کردی بە سوپا سالاری موسوڵمانان کە هێشتا تەمەنی لەنێوان هەژدە تا بیستساڵیدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆیلەیی باوکیو کەم تەمەنی خۆی نەبوونە لەمپەر لەبەردەم ئەوەدا کە پێغەمبەر بیکاتە سوپا سالار لە غەزایەکی زۆر گرنگو گەورەدا. جا ئەگەر دوو رووەکان لەمەدا تووشی سەر سوڕمان

بوون و کردویانە بە جێگەی ناڕەزایی، ئەوە شەریعەتی ئیسلام ئەو حاڵەتە بە جێگای سەر سوڕمان و ناڕەزایی دەربڕین نازانێ و بەلایەوە شتێکی ئاسایی و یاساییە. شەریعەتی ئیسلام بۆئەوە هاتووە تەرازوو پێوەری سەردەمی جاهیلی لەناوبەرێ، ئەو مەقاییس و پێوەرانەی لەپێش ئیسلام کردبوویاننە هۆکاری بەرزی و نزمی لایان بەرێ. لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ لە ئوسامەدا میزەو تایبەت مەندییەکی دیبێ وای لێ کردبێ لە کەسانی دی شیاوتر بووبێ بۆ سوپا سالاری جەیشی ئیسلامی لەو غەزایەدا. ئەوەی لەسەر موسوڵمانان پێویستە لەم حاڵەتەدا گوێ رادێرێ و بە قسەکردنە، هەرچەندە کۆیلەیەکی رەشی حەبەشی بکرێتە سەرکردەیان. بۆیە یەکەم کارێك: کە حەزرەتی ئەبوبەکر گرنگی پێداو ئەنجامیدا «دوای ئەوەی کرا بە جێنشین»، بەڕێ کردنی سوپای ئوسامە بوو. تەشریفی چووە دەری مەدینەو بۆ خۆی سوپاکەی بەڕێ کردو ماوەیەك لەگەڵیان رۆیشت بە پیادەیی و ئوسامە بەسواری. ئوسامە عەرزی کرد ئەی خەلیفەو جێنشینی پێغەمبەر! یان دەبێ تەشریفت سواربێ یان منیش دادەبەزم، ئەبوبەکر فەرمووی: وەڵلاهی نە دادەبەزی و نە سواردەبم! چ دەبێ ئەگەر سەعاتێك لە رێگای خودادا قاچم تۆزاوی بن؟ بێگومان ئوسامە لەم غەزایە بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە، رەوانەکردنی ئەو سوپایە لەوکاتەداو بەو شێوە سودو قازانجێکی زۆری بۆ موسوڵمانان هەبوو»[١].

---

١ - تاريخ الطبرى: ٣/٢٢.

**دووەم: مەشروعیەتی دعاو رقیەو گەورەیی دوعا:**

دوعا خوێندن بۆ لاچوونی ئازارو فوکردن بە جەستەدا رەوایە، بەڵگەشمان ئەو فەرموودەیە کە ریوایەتمان کرد لە حەدیثی بوخاری‌و موسلیم، کە تێیدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ ئازارێکی ببوایە دوعای دەخوێندن‌و فوی بە جەستەی خۆیدا دەکردو بە دەستەکانی مەسحی روخسارو شوێنی تری جەستەی خۆی دەکرد.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار دوعای بەسەر هاوەڵانیدا دەخوێند بە قورئان، هەندێ جاریش بە غەیری قورئان.

ئیمامی موسلیم لە خاتو عائیشەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ یەکێ لە موسوڵمانان ئازارێکی لە جەستە بووایە دەستی راستی پێدا دەهێناو دەیفەرموو ئەی خودای ئادەمیزاد! نەخۆشی لاببە. شیفای بدە هەرتۆ شیفا بەخشی. هیچ شیفایەك نیە جگە لە شیفای تۆ: کە نەخۆشی لابەرێ.

بوخاری‌و موسلیم لە عائیشەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ کە ئازارێکی هەبوایە بۆ خۆی بەسەر خۆیدا «قل أعوذ»وەکان‌و «قل هو الله»و ئایەتی تری قورئان‌و دوعای دەخوێندن‌و فوی بەخۆیدا دەکرد. کە دوایی نەخۆشییەکەی لێ توند بوو، ئەمن ئایەت‌و دوعاکانم بەسەردا دەخوێندو بە دەستی خۆی مەسحی جەستەییم دەکرد بەهیوای بەرەکەت‌و پیرۆزی دەستی.

رونترین بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دوعاو روقیە خوێندن بە ئایاتی قورئان رەوایە ئەو ئایەتەیە: کە دەفەرموێ:

{وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَارًا – الإسراء/ ٨٢}.

جوداوازی نێوان دوعاو روقیە ئەوەیە کە لەگەڵ دوعا خوێندنەکەدا بەدەست مەسحی شوێنە ئازاراویەکە دەکرێ‌و بە دەمیش فوی پێدا بکا بەبێ تف.

ئەمجار بەلای ئیمام مالیك‌و شافیعی‌و ئەحمەدو ئیسحاق‌و ئەبو ثەورەوە دروستە کرێ لەسەر دوعاو روقیە وەربگیرێ. ئەبو حەنیفە دەڵێ: لەسەر قورئان فێرکردن پارە وەرگرتن دروست نیە، بەڵام لەسەر دوعاو روقیە خوێندن دروستە پارە وەربگیرێ. بەڵگە لەسەرئەوە ئەو فەرموودەیە بوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردووە: کە چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکیاندا بەلای خێڵێکی عەرەبدا رۆییشتن داوایان لێ کردن میوانداریان بکەن بەڵام ئامادە نەبوون ببنە خانە خوێیان، دوایی پێیان گوتن: ئەرێ کەستان تێدایە روقیە بخوێنێ؟ ئەوە سەرۆکی خێڵەکەمان مار پێوەی داوە یان نەخۆشە، یەکێك لە هاوەڵەکان وتی بەڵێ من روقیە دەزانم، هاتە لای نەخۆشەکەو فاتیحەی بەسەردا خوێندو کابرا شیفای هات، سەرۆکی هۆزەکە لە پاداشی ئەو روقیە خوێندنەدا جەڵەبێك مەڕو بزنی پێدا، ئەویش رەتی کردەوە ئەوە وەربگرێ، وتی هەتا پرس بە پێغەمبەر نەکەم ئاخۆ حەڵاڵە یان نا وەری ناگرم. هاوەڵەکە هاتە خزمەت پێغەمبەرو سەر گوزشتەکەی بۆ گێڕایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا تەنها فاتیحەم بەسەردا خوێند. پێغەمبەر ﷺ زەردە خەنەیەکی هاتێ‌و فەرمووی: تۆ چۆنت زانی سورەتی فاتیحە روقیەیە؟ پاشان فەرمووی: بچۆ جەڵەبە مەڕو بزنەکان وەربگرەو بەشێکی لێ بۆ من دابنێ.

ئیمامی نەوەوی‌و ئیبنو حەجەری عەسقلانی‌و هی تریش دەڵێن: ئیجماع هەیە لەسەر ئەوە کە روقیە خوێندن بەسەر نەخۆشدا دروستە بەسێ مەرج، دەبێ بە قورئان یان بەناوە جوانەکانی خودا یان

صیفاتەکانی بێ. دەبێ بە زمانی عەرەبی یان بە زمانێك بێ مەعنای بزاندرێ، دەبێ بیرو باوەڕی وابێ کە روقیەکە بۆ خۆی کاریگەر نیە، خودا کاریگەری تێدا دەخوڵقێنێ.

بێگومان زۆر حەدیثی صەحیح هەن ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە ئەو سێ شەرتە دەبێ هەبن ئەمجار روقیە دروستە. یەکێ لەو حەدیثانە ئەوەیە کە ئیمامی موسلیم لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعییەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێ ئێمە لەسەردەمی جاهیلیدا روقیەمان بەکاردەهێنا، لەو بارەوە عەرزی پێغەمبەرمان کرد ئاخۆ رای چۆنە؟ فەرمووی: ئادەی بزانم روقیەکانتان چۆن دەخوێندو دەتانگوت چی؟ پاشان فەرمووی: روقیە خوێندن ئەگەر شیرکی تێدا نەبوو قەیناکا.

## سیحرو جادو خوێندنی روقیە بۆ پوچەڵ کردنەوەی

بێگومان گرنگتر شتێك: کە پێغەمبەر ﷺ روقیەی بۆ نەفسی خۆی بەکار هێنابێ خوێندنی «قل أعوذ»وەکان بوو بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو سیحرو جادوەی لەبیدی کوڕی ئەعصەم لێی کردبوو، لەو حەدیثەدا باسکراوە: کە هەردوو شەیخی فەرموودە ریوایەتیان کردووە.

زانایانی ئیسلام فەرموویانە جەماوەری موسوڵمانان پێیان وایە سیحر بوونی هەیەو حەقیقەتێکی هەیە وەکوو هەموو ئەو حەقیقەتانەی بۆ شتە چەسپاوەکان ثابیتە. بەڵگەش ئەم حەدیثەیەو ناو هێنانیەتی لە قورئانداو شتێکە بە هەوڵدان فێری دەبێ، ئەمەش بۆ شتێك دەبێ: کە حەقیقەتێکی هەبێ. ئەوەتا قورئان دەفەرموێ:

{فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ – البقرة/١٠٢}.

جیاکردنەوەی ئافرەت لە مێردەکەی شتێکی حەقیقیو هەبووە وەکوو

ئاشکرایە. ئەوەی ئێمە دەیڵێین: هەندێ کەس ئیشکالی لێ هەڵدەستێنن لەبەر دوو هۆ.

یەکەمیان: سیحر خودی خۆی حەقیقەتێکە لە حەقیقەتەکان ئەمەش وادەخاتە وەهمی هەندێ کەسەوە: کە ئەوە کارێکە دژی قەضیەی یەکتا پەرستی و چەسپاندنی کورت هەڵهێنانی کاریگەری لەشتدا بۆ خودا.

دووەم: ئەگەر بگوترێ: پێغەمبەر ﷺ سیحری لێ کراوە، ئەوە لە دیدو بۆچوونی ئەواندا لە پلەو پایەی پێغەمبەر کەم دەکاتەوە خەڵکی دەخاتە گومانەوە دەربارەی ئەو پلەو پایە.

لە راستیدا ئەوە هیچ ئیشکال و تەم و مژێکی تێدانیەو نابێتە جێگای شێواوی. جارێ دەربارەی وەلامی وەهمی یەکەم دەڵێین: ئیعتیبار کردنی سیحر بەوەی حەقیقەتێکەو چەسپاوە ئەوە ناگەیەنێ: کە بۆ خۆی کاریگەر بێ و کاریگەریەکەی زاتی بێ. بەڵکوو ئەوە وەکوو ئەوە وایە: کە بڵێین ژەهر کاریگەرییەکی حەقیقی هەیەو چەسپاوە. بێگومان ئەم قسەیە صەحیحەو ئینکار ناکرێ، وەلێ کاریگەری ئەو شتانە بەدەست خودایە ئەو کاریگەریان دەکا. ئەوە نیە پەروەردگار دەربارەی سیحر دەفەرموێ:

{وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ – البقرة/١٠٢}. ئەوەتا پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەوەمان پێ دەفەرموێ: کە سیحر کاریگەری زاتی نیە، لەهەمان کاتیشدا ئەوەی چەسپاندووە: کە سیحر کاریگەری و مەفعوولی خۆی هەیەو پەیوەستە بە ئیزنی خودا!!

وەلامی وەهمی دووەم ئەوەیە دەڵێین ئەو سیحرەی لە پێغەمبەر کرابوو هەر کاریگەری لەسەر جەستەو ئەندامە ظاهیرەکانی هەبووە، چ کاریگەرییەکیان لەسەر عەقڵ و دڵ و عەقیدەی نەبووە، موعاناتی لە

کاریگـەری سـیحرەکە وەکـوو موعانـاتی ئاثـاری هـەر نەخۆشـییەك لـە نەخۆشـییەکان بـووە: کـە تووشـی جەسـتە دەبـێ، ئاشکراشـە: کـە عیـصمەتو پـارێزراوی پێغەمبـەر ﷺ مانـای ئـەوە نییـە لـە نەخۆشییەکانو شتە عاریضەکان سەلامەت بێ. هیچ پێغەمبەرێك لە ئەمراضو ئەعراضی ئادەمیزادانە پارێزراو نەبووە.

قازی عەیاض دەڵێ: ئەوەی: کە لە حەدیثدا هاتووە گوایە: پێغەمبەر ﷺ لە ئاکامی ئەو سیحر لێکردنە وادەهاتە خەیاڵییەوە شتێك دەکاو لە واقیعیشدا نەیدەکرد، ئەمە هیچ ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەوەی تووشی پێغەمبەر بووە نەقصو عەیبێکی لە تەبلیغو شەریعەتیدا پەیدا کردبێ. چونکە بەڵگەی بەهێزو «ئیجماع» کۆڕای زانایان لەسەر ئەوە هەیە: کە پێغەمبەر ﷺ لەهەر شتێك کە بچێتە چوار چێوەی نەقصو عەیب بۆ تەبلیغو پەیامەکەی پارێزراو بووە. ئەمەی کە تووشی پێغەمبەر هاتووە بەشێکە لەوشتانەی کە دروستە تووشی بێن لە کارو باری دونیا کە هیچ پەیوەندییان بەلایەنی پێغەمبەرێتییەوە نیە، نە بەهۆیانەوە کراوە بە پێغەمبەرو نە لەبەر خاتری ئەوانە ریزی دراوەتێ. تەشریفی لە دونیادا وێدەچێ وەکوو هەر ئادەمیزادێکی تر تووشی ئافاتو نەخۆشی ببێ، زۆر دوورو نەگونجاوە: کە پێغەمبەر شتێکی کەوتبێتە خەیاڵەوە لە شتەکانی دونیاو حەقیقەتی نەبێ پاشان لەسەری لاچێو نەمێنێو چۆن پەیدا بووە ئاوا بڕوا[١].

دەڵێم: ئەوە وەکوو ئەو حاڵەتە وایە: کە بۆ نەخۆش پەیدا دەبێ لەکاتی پەرەسەندنی «تا»یەکەیدا. بەشێك لەو عەرەضە سروشتییانە بەهۆی بەرز بوونەوەی گەرمی جەستە هەندێ واهیمەو خەیالات دەورەی زەینی مرۆڤ بدەنو لە واقیعیشدا حەقیقەتیان نەبێ، ئەم جۆرە

١ - شرح الشفا للقاضي عياض: ٢٧٨/٤ — ٢٧٩ وانظر أيضا شرح النووي على مسلم: ١٧٤/١٤.

دیاردانەش بەشێکن لە ئەعراضی ئادەمیزادانەو پێغەمبەرو غەیری پێغەمبەر تێیدا یەکسانن. لەلایەکی ترەوە هەواڵی سیحر کردن لە پێغەمبەر ﷺ دەچێتە چوار چێوەی تێکڕای ئەو موعجیزەو خەواریقانەی پەروەردگار ڕێزی پێ لە پێغەمبەر ناوەو نیشانەی عەیب و لەککە نین بۆ پێغەمبەر، بەڵکوو ئەوە بەڵگەیەکی تازەیە لە بەڵگەکانی ڕێز لێنانی پەروەردگار لە پێغەمبەرو پاراستنی لە سیحرو جادو بازی، بێگومان حەزرەتی پێغەمبەر دوعای کردو کەوتە دوعا کردنی زۆرو پاڕانەوە لەوکاتەدا کە هەستی بەم ئەعراضانە کرد لە جەستەیدا، هەتا پەروەردگار ئاگاداری کرد بەسەر ئەو فێڵ و سیحرەی کە لەبیدی کوڕی «الأعصم» بە پەنهانی لێی کردبوو، تەشریفی چوو بۆ ئەو جێگایەی کە توك و قژو ئەسبابی سیحرەکەی لێ شاردبۆوە، پێغەمبەر ﷺ سیحرەکەی پوچ کردەوە، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

بوخاری و موسلیم لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموون: پیاوێك لە خێڵی زورەیق پێیان دەگوت: لەبیدی کوڕی «الأعصم» سیحری لە پێغەمبەر کردبوو، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ کەوتبووە حاڵەتێکەوە وای دەهاتە خەیاڵەوە شتێکی کردووە نەشی کردبوو، تا وای لێهات ڕۆژێك یان شەوێك تەشریفی لەلای من بوو، هەر پاڕایەوەو دوعای کرد، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە وام هەست کرد خودا ئاگاداری کردم لەو شتەدا کە داوام لێکرد ئاگادارم بکا، دوو پیاو هاتنە لام، یەکیان لەلای سەرمەوە دانیشت ئەوی تریان لەلای قاچم. یەکێکیان بە هاوەڵەکەی گوت: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ وتی: سیحر لێکراوە، وتی: کێ سیحری لێ کردووە؟ وتی: لەبیدی کوڕی «الأعصم»، وتی: سیحرەکەی لەچیدا ئەنجامداوە؟ وتی: سیحرەکەی لە شانەو قژی هەڵکەندراو بەشانەو تویکڵی طەلعی دارخورما. وتی: ئەو شتانە

لەکوێن؟ وتی: لە بیری «ذروان»ن. پێغەمبەر لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی چووە سەر بیرەکە .... فەرمووی: ئەی عائیشە ئاوی ئەو بیرە دەتگوت خەناوە، پرژی دار خورماکە دەتگوت سەرو قژی شەیاتینییە! دەفەرموێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ دەرت نەهێنا؟ فەرمووی: خودا شیفای دام لەو نەخۆشییە خەلەستم، پێم ناخۆش بوو: کە شەڕو نەگبەتی هەڵایژێنم بەسەر خەڵکدا، فەرمانی کرد بیرەکەیان پڕکردەوە.

ئەتۆ دەبینی ئەم حەدیثە زۆرتر بەڵگەی ڕێز لێنان و پاراستنی خودایە بۆ پێغەمبەر ﷺ تا بەڵگەی ئەوەبێ کە بەو سیحرە جەستەی تووشی ئازار بووبێ، یان هەر سەلبیاتێکی تری پەیوەست بەلایەنی ئادەمیزادیەتی ئەوی تێدابێ.

ماوەتەوە ئەوە بگوترێ و کابرا ئیشکالێك بخاتە روو بڵێ: کە مادام وابێ سیحر حەقیقەتی هەبێ. ئەدی چۆن و بەچی موعجیزەی خودایی لە سیحرو دیاردەکانی جیا بکەینەوە؟

وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە: دەڵێین: موعجیزە ئەوەیە لەسەر دەستی پێغەمبەر دێتە دی و موقتەرین و هاو جوتە بە دەعوای پێغەمبەرێتی و تەحەدا کردن و بەڵگە لەسەر راستی دەعواکەی، بەڵام سیحر وانیە و مومکین نیە لەسەر دەستی ساحیر بێتە دی«١».

لەلایەکی ترەوە سوڵتانی سیحر سنووردارە، سیحر هەرچەندە حەقیقەتی هەیە وەکوو گوترا، وەلێ حەقیقەتەکەی لە سنوورێکی دیاریکراو تێناپەڕێ، مومکین نیە بتوانێ بچێتە ناو کرۆکی حەقیقەتەکانەوە و جەوهەرەکانیان بگۆڕێ، هەرگیز سیحر ناتوانێ خۆڵ بکا بە زێڕ یان بە مەعدەنێکی تر. بۆیە پەروەردگار ئەو سیحرەی

---

١ - بڕوانە: شەرحی نەوەوی بەسەر صەحیحی موسلیم: ١٤/١٧٧.

ساحیرەکانی فیرعەون کردیان بە تەخەیول و چاو بەست ناو دەبا و دەفەرموێ:

{قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى – طه/٦٦}.

ئەوەتا ئەو دیمەنەی حەزرەتی موسا بینی بە خەیاڵ تەعبیری لێ دەکا و ئەوە دەچەسپێنێ کە حەبل و گوریسەکانیان نەگۆڕاون بە ماری حەقیقی و ساحیرەکان نەیان توانیوە گوریسەکان لە حەقیقەتی خۆیانەوە بگۆڕن بۆ حەقیقەتی مار. بەڵکوو ئەوەی توانییان بیکەن هەر ئەوەندە بوو دیمەنێکیان نیشانی ئامادەبووانـدا چاو بەستیان لێ کردن و هەڵیان خەڵەتاندن، حەبلەکان نەبوونە مار. ئەوەتا لە ئایەتێکی تردا ئەم مەعنایە پتر روون دەکاتەوە و دەفەرموێ:

{سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ – الأعراف/ ١١٦}.

جا ئەگەر تۆ لەم قسەی ئێمە وردبیتەوە دەزانی هیچ مونافات و دژایەتی نیە لەنێوان ئەوەی ئێمە گوتمان: لەوەی کە سیحر حەقیقەتێکی چەسپاوە، لەگەڵ ئەوەی ئایەتەکە ئاماژەی بۆ دەکا و دەفەرموێ:

{يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى – طه/٦٦}. لەم رووەوە گۆڕانی حەبلەکان بە ماری زیندو جم و جوڵکەر خەیاڵ و چاو بەست بووە وەلێ کاریگەر بوونی چاوی حەزرەتی موسا و بینەران بەم خەیاڵ و چاو بەستە و بێ هێزی چاو لە بینینی حەقیقەت ئەوە مەفعول و کاریگەری سیحرەکەیە و حەقیقەتی ئەوەیە کە تووشی چاوەکە بووە و وای بینیوە. ئەم تەحقیق و رونکردنەوەیە ئەوەت بۆ دوپات دەکاتەوە کە مەناطو شوێن و جێگای تێدا وەدی هاتنی سیحر هەمیشە جەستەی مرۆڤە یان هەست و حەواس و جەواریحەکانیەتی، بەهۆی سیحرەکەوە برێ دیمەن و

بینراوو هەست پێکراو دەردەکەون بەشێوەی خەیاڵو ناحەقیقی، واتە: شتەکە لەسەر غەیری حەقیقەتی خۆی دەردەکەوێ.

**سێیەم: هەندێ دیاردە لە ڕێزو فەضلی حەزرەتی ئەبوبەکر:**

لەو چیرۆكو بەسەر بردانەی لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کردن دەربارەی نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ چوار بەڵگەو دەلیل هەن لەسەر فەضلو ڕێزداری حەزرەتی ئەبوبەکرو تایبەتمەندی ئەو لە دڵی پێغەمبەردا:

یەکەم: ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە وتارەکەی و فەرمووی: «بەندەیەك خودا سەر پشکی کردووە لەنێوان ئەوەی دونیای بداتێ و ژیانی خۆشی بۆ دەستەبەربێ، یان ئەوەی لای خودا بۆی ئامادە کراوە، ئەویش ئەوەی لای پەروەردگاری هەڵبژارد» زێدە لەهەموو هاوەڵان تەنیا حەزرەتی ئەبوبەکر لە مەبەستەکەی پێغەمبەر حاڵی بوو، بۆیە دەستی کرد بە گریانو هاواری لێ هەڵساو وتی: هەموومان بە باوكو دایکمانەوە بەقوربانت بین. ئەوەتا لەبڕێ ڕیوایەتی ئەم حەدیثەدا لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: کە ئەبوبەکر بە بیستنی وتارەکەی پێغەمبەر ﷺ لە پرمەی گریانیدا، لە دڵی خۆم دا وتم: ئەو پیرە مێردە بۆچی گریاو چی گریاندی؟ بۆ بەو قسە دەستی بە گریان کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەندەیەك خودا سەر پشکی کردووە ئەویش ئەوەی هەڵبژاردووە؟

جا ئەبو سەعید دەڵێ: دەرکەوت بەندە سەر پشککراوەکە پێغەمبەر ﷺ خۆی بوو، حەزرەتی ئەبوبەکر ئەوەی پێ زاناندین.

دووەم: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: لەهەموو کەس زیاتر کەسێك پیاوەتی بەسەر منەوە هەبێ و چ بە ماڵو سامان، چ بە

هاوڕێیەتی، ئەبوبەکرە. بێگومان ئەوە چەند وشەیەکی نەمرو پیرۆزن تەنها بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر گوتراون بۆ کەسی تر تۆمار نەکراون.

سێیەم: ئەوەی باسمان کرد لە ریوایەتی موسلیم: کە لەخاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم فەرمووی: بۆم بانگی ئەبوبەکری باوکت و براکەت بکە هەتا نووسراوێك بنووسم، چونکە من دەترسم منەتکارێك یەکێك راست بێتەوە بڵێ من لە ئەبوبەکر لە پێشترم. خوداو موسوڵمانان بەوە رازی نابن و کەسیان پێ لە ئەبوبەکر لەپێشتر نیە. بێگومان ئەم فەرمووده بە نەصێکی قەطعی دەژمێردرێ لەسەر ئەوەی: کەدوا پێغەمبەر حەزرەتی ئەبوبەکر جێ نشینەو هەر دەبێ ئەو خەلیفەی یەکەم بێ. جا ئەگەر حیکمەتی یەزدانی واداخواز بووبێ: کە پێغەمبەر ﷺ عەهدو پەیمان لە هاوەڵانی وەرنەگرێ بەوەی کەدوا خۆی خەلیفەی موسوڵمانان و جێنشین ئەبوبەکرە. بە نووسین ئەوەی تۆمار نەکردووە، ئەوە هەمووی لەبەرئەوە بووە تا دوا پێغەمبەر خەلافەت و فەرمانڕەوایی نەبێتە میراتی و کەلەپورو رێبازی نەخشە بۆ کێشراوو پەیڕەوی کراو. ئاشکراشە ئەو داب و نەریتە ئەگەر پەیڕەو بکرێ چەند مەفسەدەو گەندەڵی دەخاتەوە، مەرجی صەلاح و گونجاو بۆ فەرمانڕەواو حاکم بەرچاو ناگیرێ.

چوارەم: کردنی ئەبوبەکر بە پێش نوێژ لەلایەنی پێغەمبەرەوە بۆئەوەی لەجیاتی خۆی ئیمامەت بۆ موسوڵمانان بکا، ئەتۆ دیتت چەند بە جەختەوە ئەو ئەرکەی پێ سپاردو بە چ توڕەیی و رستەو عیبارەتێك وەڵامی عائیشەی دایەوە!!

جا ئەگەر ئێمە بڵێین: ئەم رەوشت و زێدە مەزایا و تایبەت مەندییانەی لە حەزرەتی ئەبوبەکردا بەرجەستە بوو بوون، ئەوانە بوون کەتای تەرازووی حەزرەتی ئەبوبەکری قورس کرد بۆئەوەی بەیعەتی پێ

بکرێ بۆ خەلافەت لەدوای پێغەمبەر ئەمە لە تایبەت مەندیو مەزایای هاوەڵانو جێنشینەکانی تر کەم ناکاتەوە، بەتایبەتی هی عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ، ئەوە دیت پێغەمبەر ﷺ لە غەزای خەیبەردا فەرمووی: {لأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ غَدًا لِرَجُلٍ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ}.

ئیتر خەڵکەکە کەوتنە پرسیار ئەو شەوە هەر دەیان پرسی ئاخۆ دەبێ کێ بێ بەیانی ئەو ئاڵایەی دەدرێتێ. ئەوەبوو بەیانی ئەوەی ئەو ئاڵایەی درایە عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو.

بێگومان کاری جێنشینی تەواو بوو، موسوڵمانەکان دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بەبێ خیلافو دژایەتیو ناڕەزایی قەضییەی خەلافەتیان یەکالا کردەوەو ئەبوبەکر کرا بە خەلیفەی یەکەمو هەموو موسوڵمانان «بە حەزرەتی عەلیشەوە» بەیعەتیان پێ کرد، هەر لە یەکەم ڕۆژیشەوە هەریەك لە حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عەلی دیاردەو مەظهەرو زمانی گۆیا بوون بە فەضلو ڕێزی ئەویتر، هیچ کامێکیان نە بەکەمو نە بەزۆر دژی ئەوی تریان نەدواوە. بێگومان قسەی بێ ماناو کرداری پوچەو هەڵوێستی نەشیاوە: کە ئێمە بێین دوای تێپەڕبوونی چواردە سەدە بەسەر ئەو مێژووەدا کاتی خۆمان بەفیڕۆ بدەینو قینو قارو بوغزو کینە بخەینە ناو موسوڵمانانەوە لە ڕێگەی ئەوەوە تۆ بڵێی: فلان شیاوتر بوو بە خەلافەتو من بڵێم: نەخەیر فلان لایەقتر بوو بەو پلەو پایە. لەکاتێکدا ئەوانەی خاوەن عەلاقە بوون بەو مەوزوعەو لەناویدا ژیاون خۆیان بڕیاری خۆیان داوەو ڕێك کەوتونو بە پرۆسەکە ڕازی بوونو هیچ ناڕەزاییو کێشەو دووبەرەکیو ململانێیکیان لەم بارەوە نەبووەو بەرەو بارەگای خودای خۆیان گەڕاونەوەو دڵیان بە خۆشەویستی یەکترو ڕێزگرتنی یەکتری لێی دەداو بەیەکەوە هاریکارو هەمئاهەنگو لێك ڕازیو پێکەوە گونجاو بوون.

**چوارەم: نەهی کردن لەوەی گۆڕستان بکرێ بە مزگەوت:**

بێگومـان ئـەتۆ دیتـت لـە چـوار چێوەی مـەعنای ئـەو حـەدیثـەی کـە ئامـاژە بـۆ ئـەو نەهیـە دەکـا، چـەند بـە تونـدیو موبالەغـە کردنـەوە موسـوڵمانان لـە پڕکێـشی کـردن بـۆ کـاری ئـاوا دەترسـێنێو ئاگاداریـان دەکاتەوە!

زانایـانی ئیـسلام فەرموویانـە: بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ نـەهی لـەوە کردووە گۆڕستان بکرێتە مزگەوت «گۆڕی خۆی یان گۆڕی کەسانی تـر بکرێنـە سـوجدەگاه، ترسـی ئـەوەی هـەبووە زێـدەڕۆیی لـە بەگـەورە زانینیانـدا بکرێو خەڵك تووشـی فیتنـەیی ئایین ببێو سـەرەنجام سـەر بکێشێ بۆ گۆڕ پەرستیو بتپەرستی، وەکوو بۆ زۆرێك لـە گـەلو نەتـەوە رابوردوەکان رویداوە.

ئەو شێوە گۆڕەی نەهی لێ کراوە بکرێتـە شوێنی نوێژ بەم جۆرەیـە: بەسەر گۆڕەکـەوە مزگـەوتێك رابـبەسترێ، دەوران دەوری گۆڕەکـە بکرێتـە شوێنی نوێژو سوژدەی خەڵك، یان لەلای گۆڕەکە نوێژ بکەی، یان خودی ئارامگاکە بکرێتە شوێنی نوێژ.

ئـەمجار زانایـان دەربـارەی حـوکمی نوێـژکردن لـەلای گـۆڕ راجیاییـان هەیە، هەیانە دەڵێ حەرامە، هەیە دەڵێ مەکروهو ناپەسـەندە. ئەوانـەیش کە دەڵێن: مەکروهە، کەڕاهەتەکەی دەگەیەننە ئەندازەی حەرام، ئەگـەر وا رێ بکـەوێ لـە نوێژکردنەکـەدا روبکرێتـە خـودی گۆڕەکـە واتـە: گۆڕەکـە بکەوێتـە نێـوان نوێژکـەرو قیبلـەوە، لەگـەڵ ئەوەشـا نوێژەکـە دروسـتە. چـونکە حـەرامی شـت نابێتـە هـۆی بـەتاڵیو پوچـی، حوکمەکـەی، دەق وەکوو حوکمی نوێژ وایە لە زەوی داگیر کراودا.

ئیمـامی نـەوەوی دەفـەرموێ: کاتێـك هـاوەڵانو دوایـی تـابیعین پێویستیان بەوە بوو، لە مزگەوتی پێغەمبەر زیاد بکەن بەهۆی زۆربوونی

موسوڵمانانەوە، زیادکردنەکە ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەریشی گرتەوە بە ژوورەکەی خاتو عائیشەشەوە: کە شوێنی تێدا بەخاك سپاردنی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەرە، ئارامگایانە. هاوەڵان بەدەوری گۆڕەکە دیوارێکی دەوران دەوری بەرزیان دروست کرد بۆئەوەی لە مزگەوتەوە گۆڕەکە دیار نەبێ و نەخوێندەوارو نەزان، لە نوێژەکانیاندا روی تێبکەن، کرداری حەرام بقەومێ. پاشان بۆ زێدە حەزەرو خۆپارێزی، هاتوون لە هەردوو سوچی باکوری گۆڕەکەوە دوو دیواریان رابەستون و خواریان کردونەوە تا بەیەك گەیشتونەوە، ئەمەش بۆئەوەی کەس نەتوانێ لەکاتی نوێژدا روبکاتە مەرقەدەکە»[١].

**پێنجەم: هەستی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی گیانەڵاودا:**

ئێمە دەتوانین دەرك بە هەستی پێغەمبەر ﷺ بکەین بزانین لەوساتەدا: کە کەوتۆتە گیانەڵاوەوە هەست و شوعوری چۆن بووە، ئەوە بوو دیمان لەوکاتەدا: کە موسوڵمانان رۆژی دوو شەممە بۆ نوێژی بەیانی ریزیان بەستبوو، لەناکاوێك پەردەی دادراوە لەنێوان مزگەوت و حوجرەی عائیشەدا لادراو لەدواوە پێغەمبەر دەرکەوت و سەیری ریزی موسوڵمانانی کرد: کە بۆ نوێژ صەفیان بەستبوو، دوایی زەردەخەنەیەکی کردو پێکەنی، تەنانەت پێکەنینەکەی وابوو حەزرەتی ئەبوبەکر کشایەوە بۆ دواوە بۆ ناو صەفی نوێژکەرەکانی دواوەی، خەڵکەکە لە خۆشیاندا خەریك بوو نوێژەکەیان لێ تێك بچێ و نوێژەکەیان ببڕن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەدەست ئامارەی بۆ کردن: کە نوێژەکەیان تەواوبکەن، ئەمجار چووەوە ناو ژوورەکەو پەردەکەی دادایەوە.

---

١ - النووی علی مسلم: ٥/ ١٣ — ١٤.

بێگومـان لەوسـاتە وەختـە ناسكو حەساسـەدا پێغەمبـەر ﷺ بیرو فکری خۆی ئاڕاستەی ئوممەتەکەی کردبوو، بیری لـەوە کردبـوەوە ئـاخۆ دوا لەدونیا دەرچوونی حاڵو وەزعی ئوممەتەکەی چۆن دەبێ؟ ئەتۆ لە تێڕوانینـی تێکـەڵ بـە زەردەخەنـە بـۆلای هـاوەڵانی لەوکاتـەدا کـە بـە خوشوعو گـەردن کەچی رویـان لـەخودا کـردووەو ریزیـان بەسـتووە، لـە تێڕوانینەکـەی هەسـت بـە خۆشەویـستییەکی زۆرو هـەڵقوڵاو لـە دڵێکـی گەورە دەکەی: کە دڵێ پڕ لە خۆشەویستی پێغەمبەرە بەرامبەر هاوەڵانی. بەڵکوو ئەتۆ لە زەردەخەنەکەیەوە بەرامبەر هاوەڵانی هەست بەوە دەکەی کە دڵی پیرۆزی بە خۆشەویستی هاوەڵانی لێ دەدا، دوعایـان بـۆ دەکاو روی لەوانـەو خۆشەویـستی خـۆی بۆیـان دەردەبڕێ. بێگومـان پێغەمبـەر «بـە دایـكو باوکمـەوە فیـدای بم» ویـستی لەوکاتـەدا کەبـەدوا سـاتو چرکەکانی تەمەنیدا تێپەڕ دەبێ، بە دیمـەنی هـاوەڵانی تێشو هـەڵگریو بۆ دواجار تێیان رابمێنێو نیگای ماڵئـاواییو خـودا حافیزییـان لێ بکـا، دڵنیابـێ بـۆ ئـەو ئایینـە حەقـەی خـستونیە سـەریو ئـەو هیدایـەتو رێنمونیـەی نیـشانی داون. پـەروەردگار لـە هاوەڵانیـەوە ئـەو دیمەنـەی نیشاندا کە دڵو دەروونـی ئـارامی پـێ بگرێو چاوی پـێ فێنك بێتـەوە. تەنانـەت ئـەو دیمەنـەی هێنـدە پـێ خـۆش بـوو، ئـازاری مردنـی لـەبیر بـردەوە، کـەیف خۆشـیو فـەرەحو سـرورو رەزامەنـدی لـە هەڵوێـستی هـاوەڵانی لەسـەر روخـساری بـەزەقی ئاشـکرا بـوو، بـە جۆرێـك هـاوەڵان وایان خەیاڵ بۆ چوو کە نەخۆشییەکەی سوك بووەو بەرەو چاکبوونەوە دەچێو ئازاری نەماوە!!

وەڵێ ئەوان تا دوایـی نـەیانزانی: کە پێغەمبـەر ﷺ ئـەو راوەسـتانو تێڕوانینـەی بـۆ هـاوەڵانی وەکـوو خـاڵێکی وەرچـەرخان بـووە بۆئـەوەی بکەوێتـە حاڵـەتی گیانـەڵاوو سـەکەراتی مردنـەوە، ئـەو سـەیرکردنو

تێڕوانینەی دوا لەوحەو دیمەنێك بوو، کە لە ذیهنی خۆیدا تەسجیلی کرد لە دیمەنی هاوەڵانی، بەڵکوو لە دیمەنی ئوممەتی هەموو. بۆئەوەی ئەو دیمەنە ببێتە عەهدو پەیمانی باقیو بەردەوام لەنێوان ئەوانو پەروەردگاردا بۆئەوەی ئەو تێڕوانینو سەیرکردنە هەمزەی وەصڵ بێ لەنێوان ساتە وەختی خوا حافیزی لە ئوممەتەکەیو ساتە وەختی پێشوازی کردنی لێیان لەسەر حەوزی کەوثەر!

حیکمەتی خودا وا داخواز بوو: کە ئەو مەشهەدو دیمەنەی خودا حافیزی لە ئوممەتو هاوەڵانی دەکا دیمەنی نوێژو صەفی جەماعەتی نوێژ بێ.

ویستی خودا وابوو، ئەو دیمەنە عەهدو پەیمانی کۆتایی بێ. کەوابوو ئەی برای موسوڵمان ئاگاداری ئەو عەهدو پەیمانەبەو لەیادت نەچێتەوە، هەمیشە ئاگاداری ئەو عەهدو پەیمانە بە: کە پێغەمبەر لەسەری لە ئوممەتەکەی جیابۆوەو رازی بوو لە خۆشیاندا زەردە خەنەی هاتێ.

## كۆتاييەك دەربارەی بڕێ ڕەوشتی پێغەمبەرو فەضلی زيارەتی مزگەوت گۆڕی پيرۆزی

پێغەمبەر ﷺ لە سێ پارچە قوماشدا كفن كرا كراس و مێزەری تێدا نەبوو، كە كفنەكەی تێوە پێچرا لەسەر تەختەيەك لەلای لێواری گۆڕەكەيەوە داندرا. ئەمجار موسوڵمانان كۆمەڵ كۆمەڵ دەچوون نوێژيان لەسەر دەكرد بەبێ ئەوەی كەس ئيمامەتيان بۆ بكا. يەكەم كەس كە نوێژی لەسەر كرد «العباس» بوو، ئەمجار بەنو هاشم پاشان كۆچكاران دوايی يارمەتيدەران، ئەمجار باقی خەڵكی تر. كە مەراسيمی نوێژ لەسەر كردنی تەواو بوو، هەر لەو شوێنەی وەفاتی تێدا كردبوو كە ژووری عائيشە بوو گۆڕی بۆ هەڵكەندرا بوو نێژراو بەخاك ئەسپەردە كرا.

پێغەمبەر ﷺ كە وەفاتی كرد نۆ ژنی لەدوا بەجێ ما، ئەوانيش سودة، عائيشة، حفصة، أم حبيبة، أم سلمة، زەينەبی كچی جەحش، جووەيرييە، صفية، ميمونة بوون. پێغەمبەر ﷺجگە لە خاتو عائيشە كە بەكچی هێناويەتی ئەوانی تر هەموويان بێوەژن بوون.

سێ كوڕی بوون «القاسم» كە بەناوی ئەوەوە كونيەی دەكرێ دەگوترێ «أبو القاسم». پێش پێغەمبەرێتی لەدايك بووەو لە تەمەنی دوو ساڵێدا مردووە. دووەم كوڕی «عبدالله»يە، بەناوی «الطيب» و «الطاهر»يش بانگ كراوە. ئەم كوڕەی دوای پێغەمبەرێتی هاتۆتە ژيانەوە. سێيەم: ئيبراهيم ساڵی هەشتەمی كۆچی لە مەدينە هاتۆتە جيهانەوەو ساڵی دەيەمی كۆچی لە مەدينە مردووە.

چوار كچيشی بوون: زەينەب، فاطمة، رقية، ئوممو كولثوم. خاتو «رقية» لە ڕۆژی بەدر ساڵی دووەمی كۆچی لە مانگی ڕەمەزاندا وەفاتی

کردووە، ئوممو کولثوم لە مانگی شەعبان ساڵی نۆیەمی کۆچی وەفاتی کردووە ئەم دوو کچەی بەدوا یەکدا خێزانی حەزرەتی عوسمان بوون.

پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەس سەخی تربووە، لە مانگی رەمەزانیشدا لەهەموو کاتەکانی تر زیاتر سەخی بووە. لەهەموو کەس جوانترو رەوشت جوانتر بووە، لەهەموو کەس زیاتر دەستو پەنجە نەرمو بۆن خۆشتر بووە، کەس بە ئەندازەی ئەو موعاشەرە خۆشو هاورێیەتی خۆش نەبووە. لەهەموو کەس زیاتر لەخودا ترساوە، هەرگیز لەسەر خۆی رقی هەڵنەساوەو لەسەر ئەزیەتدانی خۆی تۆڵەی نەکردۆتەوە، کاتێك رقی هەڵساوە: کە سنووری خودا شکێندرابێ، ئەوکاتە رقی هەڵساوەو تاحەقی سەر نەخستبێ وازی نەهێناوە، رەوشتی قورئانی بووە، لەهەموو کەس پتر «متواضع»و نیك نەفس بووە، ئیشی ناو ماڵی کردووە، باڵی رەحمو بەزەیی بۆ زەعیفو لاواز کردۆتەوە، لەهەموو کەس زیاتر بەحەیاو شەرم بووە، قەت رەخنەی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر حەزی لێ بووبێ خواردوویەتی، ئەگینا وازی لێ هێناوە، هەرگیز لەکاتی نان خواردندا لەسەر سفرەو خوان شانی دانەداوە. حەزی لە حەڵواو هەنگوین بوو، خواردنی کولەکەی پێ خۆش بوو. مانگو دوو مانگ تێپەڕیوە لەهیچ ماڵێك لە ماڵەکانیدا ئاگری کێشت لێنان نەکراوەتەوە. ئەگەر شتێکیان بە دیاریی بۆ هێنابێ لێی خواردووە، بەڵام قەت لە ماڵی صەدەقەی نەخواردووە، نەعلەکانی پینەکردون پۆشاکی پینە کردووە، دیدەنی نەخۆشی کردووە، هەرکەسێ دەعوەتی کردبێ دەوڵەمەند بووبی یان هەژار چووە بۆ دەعوەتەکەی، راخەری چەرمێك بووە بە لیف هاخندراوە، کالای دونیای زۆر کەم بووەو هەمیشە هەژار بووە، لە کاتێکدا خودا کلیلی خزێنەکانی زەوی پێداوەو وەری نەگرتووە، لایەنی قیامەتی هەڵبژاردووە، زۆری

یادی خودای دەکردەوەو هەمیشە لە فیکرو ئەندێشەدا بووە. زۆربەی پێکەنینی زەردەخەنە بووە. یاری و سوحبەتی کردووە، بەڵام هەر حەقی گوتووە. هەمیشە لەگەڵ هاوەڵانیدا گونجاوو دڵنەرمو مەشرەب خۆش و رووگوشاد بوو، رێزی هەموو رێزدارێکی گرتووە، پیاوی نەجیب و وەجاخ زادەی کردونە ریش سپی هۆزو خێڵەکانیان لە حەدیثی صەحیحدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریواتکراوە کە فەرموویەتی: دەستم لەهیچ حەریرو دیباجێك نەداوە بە ئەندازەی بەری دەستی پێغەمبەر نەرمو نۆڵ بووبێ. بۆنی هیچ بۆنێکی خۆشم نەکردووە بە ئەندازەی بۆنی پێغەمبەر خۆش بووبێ. دە ساڵی رەبەق خزمەتم کرد قەت وشەی «ئۆف»م لێ نەبیست، هەر شتێکم کردبێ نەیفەرمووە بۆچی ئەوەت کرد، هەر شتێکیشم نەکردبێ نەیفەرمووە ئەوە بۆ ئەوەت نەکرد.؟

بزانە زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەرو گۆڕی پیرۆزی لە کردەوە باشەکان و خێرە گەورەکانە، جەماوەری زانایان و موسوڵمانان لەهەموو چاخ و رۆژگارێکدا کۆڕایان هەیە لەسەری و کەس دژیان نەوەستاوە جگە لە ئیبنو تەیمیە «خودا لێی خۆشبێ». ئەم بەتەنیا رای وایە کە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی غەیر مەشروعە. بەڵگەی جەماوەری موسوڵمانان لەچەند رویەکەوەیە:

یەکەم: دەڵێن: زیارەتی گۆڕستان بەگشتی مەشروعەو سوننەتە. ئەوە بوو ئێمە لەوەپێش باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك دەچوو بۆ گۆڕستانی بەقیع و سڵاوی لە مردووەکانی دەکردو دوعای بۆ دەکردن، داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکردن. لەم بارەوە فەرموودەی صەحیح زۆرو چەسپاون، ئاشکراشە زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەچێتە چوار چێوەی زیارەتی گۆڕستان بە گشتی و ئەو حوکمەی هەیە.

**دووەم:** ئەوەی بە کۆڕا چەسپاوە «کۆڕای صەحابەو تابیعین» کە ئەم دوو چینە لە ڕۆژگاری خۆیاندا هەر کاتێ بەلای گۆڕەکەیدا ڕەت بووبن زیارەتی گۆڕەکەیان کردووە. ئەم ڕاستییە زانایانی پایە بەرزو جەماوەری زانایان بە ئیبنو تەیمییەشەوە ڕیوایەتیان کردووەو بەلایانەوە چەسپاوە.

**سێیەم:** ثابیت بووە: کە زۆرێك لە هاوەڵان زیارەتی گۆڕی پیرۆزیان کردووە، لەوانە بیلال ﷺ. ئیبنو عەساکیر بە ئیسنادی باش‌و ئیبنو عومەر وەکوو مالیك لە «ألموطأ»دا ڕیوایەتی کردووە ئەبو ئەیوب وەکوو ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. بەبێ ئەوەی کەسیان ڕەخنە یان ناڕەزاییان بەرامبەر ئەو زیارەت‌و دیدەنییەی هاوەڵان دەربڕی بێ.

**چوارەم:** ئەو حەدیثەی ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە بە سەنەدو ڕشتەی صەحیح دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ مەعاذی کوڕی جەبەلی بەڕێ دەکرد بۆ یەمەن پێی فەرموو: ئەی مەعاذ! لەوانەیە ساڵێکی تر تۆ من نەبینیەوە، لەوانەیە بەلای مزگەوت‌و گۆڕەکەمدا ڕابوری. پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا وشەی «لعلّ»ەی بەکارهێناوە، ئەم وشەیەش بۆ ڕەجا و هومێدە، کە وشەی «أن» چووە سەر خەبەرەکەی بۆ عەرض‌و ڕەجایە، کەوابێ ڕستەکە: کە دەفەرموێ: {لعلّك أن تمر بمسجدی وقبری} بە صەراحەت‌و بێ پێچ‌و پەنا ئامۆژگاری مەعاذ دەکا بەوەی کە گەڕایەوە بۆ مەدینە بچێتە مزگەوتەکەی‌و زیارەتی گۆڕی بکا و سلاوی لێ بکا[١].

---

١ - هنالك ایضا طائفة من الاحادیث الواردة عنه -صلى الله علیه وسلم- في فضل زیارة قبره، لا یخلو معظمها من ضعف أولین وهی وان کانت ترتقی في مجموعها الی درجة القوة فقد آثرنا ان لا نسوقها مع هذه الدلائل التي ذكرناها حتى لا يتعلق المخالفون بما قد يطيب لهم التعلق به من لين وضعف فيها فيجدو بذلك منفذا للانتصار لرأى ابن تيميه.

کە ئەمە رون بۆوە، ئیتر بزانە: کە هیچ وەجهو راستیەك بۆ ئەو رایە نیە کە تەنها شێخی ئیبنو تەیمیە فەرموویەتی. ناکرێ بە رەئیو بۆ چوونی ئەو زاتە راو بۆچونی هەموو زانایانی ئیسلام وەلا بنێین و بڵێین: زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر کارێکی ناڕەوایە! بەڵگەی بەهێزی ئیبنو تەیمیە: کە پشتی پێ بەستووە حەدیثی: {لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إلَى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ، ومسجدي هذا، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى}. هەروا حەدیثی: {لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ}. هەروا حەدیثی: {لاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا}. دەی هیچ کامێ لەم حەدیثانە ناگونجێن بکرێنە بەڵگەی ئەوە: کە زیارەتی قەبری پێغەمبەر ﷺ ناڕەوایە.

١- فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: {لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ .... هتد} ئیستثنایەو «موستەثنا منە» ذیکر نەکراوە واتە: ئیستیثنائی موفەررەغە. «مستثنى» لە جینسی «مستثنى منە»یە، ئەگینا «ئیستیثناء»ەکە دەبێتە «استثناء منقطع». ئەوەش «استثناء»ی مەجازییە. زەرورەت نەبێ پەنا بۆ مەجاز نابرێ، هەتا حەقیقەت بگونجێ مەجاز رەچاو ناکرێ. کەوابوو رستەی فەرموودەکە ئاوا تەقریر دەکرێ {لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَى المَسَاجِدَ إلاَّ إِلَى ثَلاثَةِ منها: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ، ومسجدي هذا، ومسجدي الأَقْصَى}. «مستثنى منە» لە فەرمودەکە «المَساجِدَ»ە واتە: هەموو مزگەوتەکان لە فەضل و گەورەیی دا چون یەکن جگە لەم سێ مزگەوتە. هیچ وەجهو بەڵگەیەك نیە بۆ تەفضیل دانی مزگەوتێك بەسەر مزگەوتێکی تردا جگە لە مزگەوتی کەعبەو مزگەوتی پێغەمبەرو مزگەوتی قودس. لە روانگەی کارکردن بەم فەرموودە زانایانی شەرعزان فەرموویانە ئەگەر کەسێك لەسەر خۆی نەذرکرد ئیعتیکاف بکا لە مزگەوتێك جگە لەو سێ مزگەوتانە، لەسەری پێویست نیە سەفەر بکا

بچێ بۆ ئەو مزگەوتەی لە نەذرەکەیدا ناوی هێناوە، بەڵکوو لەهەر مزگەوتێکی جیهاندا ئیعتیکاف بکا نەذرەکەی بەجێ هێناوە.

دەی قسەی ئێمە دەربارەی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرە ﷺ ئەوەش نە «مستثنی»یە، نە «مستثنی منە»وەو حەدیثەکە بەهیچ شێوەیەك باسی ئەو مەوزوعەی لەخۆ نەگرتووە. ئەمە دەق وەکوو ئەوە وایە بڵێی {لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَى زيارة الأرحام أو إِلَى العلماء لتعلّم منهم}. نەچن بۆ دیدەنی خزمو کەسو کار یان نابێ بچین بۆلای زانایان فێری زانست بێن لەلایان، لەبەر حەدیثی {لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ منها: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ، ومسجد هذا، ومسجدى الأَقْصَى}.

ئەمجار ئێمە پرسیار دەکەین ئایا شێخی ئیبنو تەیمییە لە کەلیمەی «شَدُّ الرِّحَالُ» مانای حەقیقی مەبەستە یان مانای مەجازی: کە قەصدو عەزم لەسەر شت دەگەیەنێ؟! جا ئەگەر مەعنای حەقیقی لێ فەهم بکا، ئەوە نابێ زیارەتی غەیری ئەم سێ مزگەوتەی بەلاوە حەرام بێ. مەگەر شەددی ریحالی بوێو پێویست بکا بە واسیتەی ئامێری سواری بۆی بچێ. جا مەسافەکە نزیك بێ یان دوور بێ. ئەگەر بۆی چوو بەبێ شەددی ریحال ئەوە حەرام نابێ، ئایا کەسێك عەقڵی هەبێ قسەی ئاوا دەکا؟

ئەگەر لە کەلیمەکە مانای مەجازی فەهم بکا «مانای مەجازیش بۆ ئەو کەلیمەیە ئەوەیە بۆ شت بچێو مەبەستت ئەونەبێو شتی ترت مەبەست بێ» ئەوە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ رەتی دەکاتەوەو دژی ئەو لێ تێگەییشتنەیە. چونکە پێغەمبەر ﷺ هەموو حەفتەیەك زیارەتی مزگەوتی قوبای دەکرد، لە ریوایەتێکدا هەموو رۆژی شەممەیەك زیارەتی کردووە، مزگەوتی قوباش لە دەرەوەی مەدینە بووە.

بە کورتی و پوختی «مستثنی منه» لە حەدیثەدا وشەی «المساجد» زیارەتی کەس و کارو بەجێ هێنانی صیلەی رەحم و زیارەتی شوێن و نزرگەو مەعالیم ناچنە چوار چێوەی «مستثنی منه»وە حەدیثەکە بەهیچ مانایەك نە لەنزیك و نە لەدوور ئامارژەی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرو شوێنی تری لەخۆ نەگرتووە. مانای حەدیثەکە ئەوەیە شیاو ترین مزگەوتانێك کە گرنگییان پێ بدرێ و لەهەموو لایەکەوە شەددی ریحالیان بۆ بکرێ ئەو سێ مزگەوتەن....

٢- فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ}. هیچ پەیوەندییەکی بە زیارەتی گۆڕەوە نیە نەکەم و نەزۆر. چونکە حەدیثەکە نەهی لەوە کردووە کە گۆڕی پێغەمبەران و ئەملاو ئەولای بکرێ بە شوێنی نوێژ، وەکوو لەوەپێش ئامارژەی پێ کرا، ئەمەش لە وشەی «مساجد» وەردەگیرێ چونکە «مساجد» یانی شوێنی نوێژ. جا ئەگەر ئەوە راست دەرچێ تەنها زیارەتی گۆڕ، شوێنەکە بکاتە مزگەوت، ئەوە داخوازی ئەوەیە: پێغەمبەر هەموو خاکی «بەقیع»ی کردبێتە مزگەوت، چونکە بەردەوام زیارەتی گۆڕستانی بەقیعی کردووە.

٣- ئەو فەرموودەی کە دەفەرموێ: {لاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا}. مانای ئەوەیە کاتێکی دیاریکراو بۆ زیارەتی گۆڕەکەم بڕیار مەدەن، وا مەکەن هەر لەکاتێکی دیاریکراودا دیدەنی گۆڕەکەم بکەن، وەکوو چۆن جەژن لە کاتێکی دیاریکراودا ئەنجام دەدرێ. حافیظی «المنذری» و زانایانی تری فەرموودە مانای ئەو فەرموودەیان ئاوا کردووە.

هیچ مانیعێکیش نیە: کە نەهی لە دیاردەی لەهوو لەعب و هەراو هۆریا و قاوو قیژیش بخرێتە پاڵ مەعنای فەرموودەکە، وەکوو باوە لە جەژندا ئەو دیاردانە روو دەدەن. یان فەرموودەکە دەلالەت دەکا لەسەر نەهی لە زیارەتی گۆڕەکەی، ئەمەش ناگونجێ و ئەو مەعنایە ناگەیەنێ،

چونکە ناگونجێ پێغەمبەر ﷺ نەهی لە خەڵك بکا: کە گۆڕەکەی بکەن بە جەژن بەم مەعنا مەزعومە، کەچی بۆ خۆی هەموو ڕۆژێ سەردانی گۆڕستانی بەقیع بکاو هەموو ڕۆژێ بیکاتە جەژن!!

ئەمجار پێویستە تۆ بزانی: کە بۆ زیارەتی گۆڕی چەند ئاداب‌و یاساو ڕێسایەك هەیە پێویستە پەیڕەوییان بکرێ.

جا ئەگەر خودا ئەو بەرەکەت‌و فەرەی پێ بەخشی‌و چووی بۆ زیارەتی گۆڕی پیرۆزی، ئەوە یەکەم جار قەصدی زیارەتی مزگەوتەکەی بکە پاشان نیازی زیارەتی گۆڕی پیرۆزی بکە، پێش ئەوەی بچیتە ناو مەدینە غوسڵ بکە پاکترین پۆشاك بپۆشە ڕێزو شەڕەفی مەدینە بێنە ناو دڵ‌و دەرونتەوەو وابزانە تۆ لە پارچە زەوییەکی پیرۆزدای، خودا پیرۆزی کردووە، بەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی بۆ کردووەو تێیدا ژیاوەو لەوێ وەفاتی کردووەو گۆڕی پیرۆزی لەوێیە. جا کە چوویە ناو مزگەوتەوە قەصدی ڕەوضەی پیرۆز بکە، دوو رکات نوێژی «تحیة المسجد» لە نێوان گۆڕی پیرۆزی‌و مینبەرەکەیدا بکە. هەرکاتێ لە گۆڕی پیرۆزی نزیك بوویەوە، ئاگات لەخۆبێ پەلاماری گۆڕەکە مەدەو خۆ لە پەنجەرەو محەجەرەی هەڵمەسوو وەکوو جاهیل‌و نەزان دەیکەن. ئەو هەڵس‌و کەوتانە بیدعەتن لەوانەیە حەرام بن. بەڵکوو چوار ذیراع دوور لە گۆڕی پیرۆزی ڕابوەستەو بڕوانە لای خواروی دیواری گۆڕەکەو چاو دابخەو هەست بەڕێزو شکۆداریی ئەو زاتە بکە. ئەمجار بە دەنگێکی نزم سلاو لە پێغەمبەری خودا بکەو بڵێ: {أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ} ئەمجار بڵێ: من شایەتی دەدەم: کەتۆ ئەی پێغەمبەری خودا! پەیامی خودات گەیاند، ئامۆژگاری ئوممەتت کرد، بانگەوازیت کرد بۆ ڕێبازی خودا بەو پەڕی حیکمەت‌و مەوعیظەی حەسەنە، عیبادەتی خودات کرد تا ئەو کاتەی لە دونیا دەرچووی.

سڵاوى خودات لێ بێ سڵاوى خودا لە ئال و هاوەڵانت ئەوەندەى خودا پێى خۆشەو پێى رازييە.

ئەمجار روبكەرە قيبلەو كەمێك بەلاى راستدا بسوڕێ بۆئەوەى بكەويە نێوان گۆڕەكەو ئەو كۆڵەكەيەى لەپێش گۆڕەكەيە. دەست بەرز بكەرەوە بە خشوع و خضوعەوە لەخودا بپاڕێوە، وامەزانە ئەمە بێ ئەدەبييە لەگەڵ پێغەمبەرداو دەبێ دوعا كردن لەگەڵ روكردنت بێ لە گۆڕەكە، نەخەير وامەزانە. چونكە دوعا خيطابە لەگەڵ خودا، خيطابيش لەگەڵ خودا دروست نيە كەسى بكەيە شەريك. باشترين شوێنێك لەكاتى دوعا كردندا روى تێ بكەى لاى قيبلەيە. گوێ مەدەرە هەڵس و كەوتى زۆرێك لەوانەى نەزان و بيدعە چين، پەيڕەوى ئەو ئاداب و ياساو رێسايە ناكەن. ئەمجار دەست بكە بە دوعا كردن و بڵێ: «اللهم» خودايە تۆ فەرمووتە فەرمايشتەكەشت حەقە {وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا – النساء/٦٤}.

ئەمجار بڵێ: خودايە من پەنام بۆ قاپى تۆ هێناوە داواى لێ خۆشبوونت لێ دەكەم، لە تاوانەكانم ببورى، پێغەمبەرەكەت دەكەينە تكاكار. خودايە داوات لێ دەكەم و لێت دەپاڕێمەوە: كە لێ خۆشبوونى خۆتم پێ ببەخشى وەكوو چون لەوانە خۆش بووى كە لەكاتى ژيانى پێغەمبەردا هاتوونە خزمەتى و تكاى لێ بووردنى بۆ كردون. ئەمجار چەندێك دەتوانى دوعاو پاڕانەوە بۆ خۆت و كەس و كارت و موسوڵمانان بەگشتى بكە، لەبيرت نەچێ ئەى براى خوێنەر! بەتايبەتى دوعام بۆ بكەى و بڵێ: خودايە ئەو كاتەى رۆژى قيامەت دادێ هەوەڵين و ئاخرين كۆ دەكەيتەوە، پەردەى لێ خۆشبونت بەسەر بەندەى تاوانبارت «محمد سعيد»ى كوڕى مەلا رەمەزاندا بدە بە فەضل و منەتى خۆت بيخەرە پێڕى بەندە لێ خۆشبوەكانت، لە پيالە ئاوى حەوزى پێغەمبەرەكەت: كە

حەوزی کەوثەرە بەشی بدە، لەو رۆژەدا: کە لەسەر حەوزەکە رادەوەستێ روخسار گەشاوەو دەم بەزەردە خەنە پێشوازی لە هاوەڵانی دەکا، ئەوانەی دەیانناسیێ و ئەو برایانەی کە نەیدیون و حەزی لە دیتنیانە، خودایە نا ئومێدو مەحرومی مەکە، لە قاپی رەحمەتی خۆت دەری مەکە.

عەهدو پەیمانە ئەی برای موسوڵمانم هەر کەسێك هەیت. خودا رۆژی قیامەت لێ پرسینەوەت لەسەر دەکا. داوات لێ دەکەم لەکاتی تەواوکردنی ئەم کتێبە دوعاو پاڕانەوە داوای لێخۆشبونم بۆ بکەی، ئای چەند ئاتاجم بۆ دوعای دڵسۆزانەی برای موسوڵمانم بە پاش ملەو بە نەدیدەیی.

سوپاسی خودا دەکەم لەسەر ئەوەی تەوفیقی دام ئەم کتێبەم تەواوبکەم، دەپاڕێمەوە دەلاڵێمەوە لە خودای بالاَّ دەست: کە شەرەفی ئەوەم پێ ببەخشێ پابەندو پەیڕەوکاری سوننەتی پێغەمبەر بم، رێبازی خۆشەویستی خۆی حەزرەتی موحەممەد «المصطفى» بەرنەدەم. داوا دەکەم خودا قەڵەمی لێبوردنی خۆی بەسەر تاوانەکانمدا بێنێ و لەو هەڵەو زەلانەم خۆش ببێ کە نەم زانیوەو تێیان کەوتوم، شەفاعەتکارم لەوەدا نیاز پاکی و هەوڵ و تێکۆشانم بێ.

وَصَلَّى اللهُ على سيدنا محمد النَّبِيِّ الأمي وعلى آله وصحبه أجمعين وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# کورتەیەك لە مێژووی خەلافەی راشیدە

## جێنشینی ئەبوبەکری «الصدیق»

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانان لەژێر ساباتی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە، راو بۆچونی خۆیان گۆڕیەوە، موشاوەرەیان کرد ئاخۆ کێ بکەنە جێنشینی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرکردایەتی کردنی موسوڵمانانو بەڕیوە بردنی کاروباریان. لەدوای موذاکەرەو موشاوەرەو تاوو توێکردنی بارو دۆخەکەو رانواندنی کۆمەڵێك پێشنیارو هەڵسەنگاندن، هاتنە سەر ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکر بکەنە خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ بە کۆڕای دەنگ بڕیاریاندا یەکەم جێنشین دوای پێغەمبەر ئەو زاتەبێ، لەم روەوە ئەو لە حاڵی ژیانی پێغەمبەردا جێنشینی بووە بۆ پێش نوێژی کردنی موسوڵمانان، بۆ خۆی لە نەخۆشییەکەیدا فەرمانی کردووە ئەو ئیمام بێ، دۆستو خۆشەویستی گەورەی بووە، هاوەڵی بووە لە ئەشکەوتی ثەوردا، هاوڕێی بووە لە کۆچکردندا.

حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو طالیب هیچ بیرو رایەکی دژ بەم کۆڕایەی هاوەڵانی نەبوو، ئەگەر بەیعەتکردنەکەی بە ئەبوبەکر بۆ ماوەیەك دواکەوت، ئەوە بەهۆی خیلافو راجیاییەك بوو کەوتە نێوان حەزرەتی ئەبوبەکرو خاتو فاطیمەوە دەربارەی میراتگرتنی فاطیمە لە باوکی«١»: فاطیمە داوای میراتی پێغەمبەری کرد، حەزرەتی ئەبوبەکریش فەرمووی: پێغەمبەران میراتیان لێ ناگیرێ، بەڵگەی بەهێزیشی هەبوو.

---

١ - بڕوانە: البدایة والنهایة لابن کثیر: ٢٠١/١.

## گرنگترین ئەو شتانەی لە ماوەی خەلافەتیدا ئەنجامی دان:

یەکەم: کارێك کە حەزرەتی ئەبوبەکر دوای بوون بە جێنشین ئەنجامیدا، ئامادەکردنی سوپای ئوسامەو بەڕێکردنی بوو، ئەوەبوو هەر کەکرا بە خەلیفە، سوپای ئوسامە «کە لە دەرەوەی مەدینە لە شوێنێك کە پێی دەگوترێ: «ذوخشب» حەوق بوو بەهۆی نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ»، بەڕێی کرد.

حەزرەتی ئەبوبەکر هیچ گوێی بەو راو بۆچونانە نەدا کە داوای راگرتن و تەجمید کردنی سوپای ئوسامەیان کردو دەیانگوت پاشگەزبوونەوە بلاوبۆتەوە لەناو خێڵە عەرەبەکاندا، هەروا گوێی بەو رایانەش نەدا کە دەیانەویست لە شوێنی ئوسامە یەکێکی تر بکرێ بەسوپا سالار.

حەزرەتی ئەبوبەکر سوپای ئوسامەی بەڕێ کردو ماوەیەك لەگەڵ ئوسامەدا رۆیشت بە پیادەیی و ئوسامە سوار، کە ئوسامە ویستی دابەزێ و ئەبوبەکر سواربێ وتی: «والله» نە دادەبەزی و نە سوار دەبم .... ئامۆژگاری سوپاکەی کرد: کە خیانەت و غەدر نەکەن، زێدەڕەوی نەکەن، کوژراو هەتك نەکەن، منداڵ و ئافرەت و پیر نەکوژن، درەختی خورما نەسوتێنن درەختی تر نەبڕن، مەڕو بزن و حوشتر بۆ خواردن نەبێ سەر نەبڕن و ماڵ و سامان بە ضاییع نەدەن. ئەمجار پێی فەرموون: ئەگەر بەلای قەومێکدا رۆیشتن لە دێرو کەنیشتەو ئەشکەوتدا خۆیان بۆ خودا پەرستی تەرخان کردبوو لێیان بگەڕێن با طاعەتی خۆیان بکەن.

پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر بە ئوسامەی فەرموو: ئەگەر یارمەتیم بدەی و ئیزن بدەی عومەری کوڕی خەتاب لای من بێ بۆئەوەی لە بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانانندا یارمەتیم بداو ئیستیعانەی پێ بکەم!!. ئوسامە پێی وت: فەرمان فەرمانی خۆتەو بڕیار بەدەست خۆتە.

پاشان ئوسامە بە سوپایەکەوە بەڕێ کەوت، بەلای هەر هۆزو خێڵێکدا بڕۆییشتایە کە خەڵکی هەڵگەڕاوە لە ئیسلامیان تێدا بوایە، موسوڵمانی دەکردنەوە، هەموو هۆزو خێڵەکان: کە سوپای ئوسامەیان دەدی سام دەیگرتن، دڵنیا دەبوون لەوەی: کە ئەگەر موسوڵمانەکان زۆر بەهێزو توانا نەبوونایە، لەم کاتەدا بەم سوپایەوە دەرنەدەکەوتن بۆ غەزای ڕۆم، بە تایبەتی ئوسامە بە سوپاکەیەوە نەدەگەیشتە ولاتی ڕۆم بەتایبەتی ئەو باوکی لەوێ شەهید بوو بوو. بەڵێ ئوسامە بە سوپاکەیەوە گەیشتە ولاتی ڕۆمو شەڕی لەگەڵ ڕۆمەکان کردو خودا سەرکەوتنی پێ بەخشینو پاشان بە سەرکەوتویی گەڕانەوە«١».

**دووەم**: کاری ئەبوبەکر ئەوەبوو چەند هێزێکی ئامادە کردنو ناردنی بۆسەر ئەو هۆزو خێڵانەی لە ئیسلام پاشگەز بوو بوونەوەو زەکاتیان نەدەدا. یانزە لیوای پێك هێنان، فەرمانی کرد بە فەرماندەی هەر لیوایەك بچێ بۆ شوێنێکی دیاریکراو، بۆ خۆشی بە فەرماندەی لیوایەك بەرەو «ذی القصة» کەوتە ڕێ. بەلام ئیمامی عەلی پێشی پێگرتو لێی پاڕایەوە: کە نەچێو لە مەدینەدا بمێنێتەوە. ڕێشمەی ولاخەکەی گرتو عەرزی کرد: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ من ئەوەت پێ دەڵێم کە ڕۆژی ئوحود پێغەمبەر فەرمووی: «لُمْ سیفك وأمتعنا بنفسك» شمشێرەکەت وێك نێو خۆتمان لەپێش چاو گوم مەکە. سوێندم بەخودا ئەگەر خوا نەخواستە موسوڵمانان لەم کاتەدا تۆیان لەکیس بچێو بەهۆی نەمانی تۆ بشکێن هەرگیز هەڵناستنەوە، ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر یەکێکی تری کردە فەرماندەی لیوایەکەو بۆ خۆی گەڕایەوە بۆ مەدینە«٢».

---

١ - البداية والنهاية ٣٠٤/٦ وما بعد.

٢ - رواه ابن كثير في البداية والنهاية من حديث عبدالله بن عمر ومن حديث عائيشة.

خودا لەهەموو جەبهەکاندا موسوڵمانەکانی سەرخستن، دیاردەو بنکەکانی پاشگەزبووەکان قەڵاچۆ کران، ئایینی ئیسلام لەسەر تاسەری جەزیرەدا جێگیر بوو، هۆزو خێڵە پاشگەز بووەکان ملیان کەچ کرد بۆ زەکاتدان و گەردن کەچی بۆ ئیسلام و ئەحکامەکانی.

سێیەم: حەزرەتی ئەبوبەکر سوپایەکی بە فەرمانەدەیی خالیدی کوڕی وەلید بەرەو عێراق رەوانە کرد «ألمثنی»ی کوڕی حاریثەی لەگەڵدا نارد، وڵات و دەڤەرو ناوچەیەکی زۆریان فەتح کرد بە سەرکەوتوویی و دەستکەوتی زۆرەوە گەڕانەوە.

چوارەم: حەزرەتی ئەبوبەکر بیرۆکەی فەتحکردنی وڵاتی رۆمی کەوتە دڵەوە، بۆ ئەم مەبەستە کۆبوونەوەی بە هاوەڵان کردو راوێژی پێ کردن و نیازی خۆی لەلا درکاندن، هاوەڵان راو بۆچونەکەیان پەسەند کرد، لەو دەمەدا روی کردە ئیمامی عەلی و پێی فەرموو: ئەبولحەسەن تۆ رات چیەو چی دەڵێی. ئیمامی عەلی فەرمووی: وای دەبینم راو بۆچونەکەت پیرۆزەو سەرکەوتوو دەبی ئینشائەڵڵا ئەبوبەکر بەو قسە کەیف خۆش بوو، خودا دڵی فراوان کرد بۆئەوەی باش ئیشەکان جێ بەجێ بکا. خەڵکەکەی کۆکردەوەو هەڵسایە سەرپێ وتاری بۆ دان و هەڵینان بۆ جیهادو جەنگان دژی موشریك و بێ بڕوایان، نامەی نووسین بۆ سەرەك هۆزو والی هەرێمەکان، داوای لێکردن ئامادەبن بۆ کۆبوونەوە، جەماوەرێکی زۆر لەهەر چوار لای وڵاتی ئیسلامی ئەوکاتەوە کۆبوونەوە، هۆزو خێڵەکان کۆمەڵ کۆمەڵ هاتن بۆ پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی «مەدینەی منەوەرە». ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر لیوای سوپاکانی رێکخستن و فەرماندەی بۆ دیاری کردن، وەجبە دوا وەجبە رەوانەی وڵاتی شامی کردن، ئەبو عوبەیدەی کردە سوپا سالاری هەموو لیواکان پلەی فەرماندەی گشتی پێدا، ئەبوبەکر هەر کە لیوایەکی بەڕێ دەکرد ئامۆژگاری دەکرد بە تەقوای خوداو یارمەتیدانی هاوەڵانی و

مامەڵە کردنی جوانو هەڵوێست نواندنی پەسەندو بەردەوام بوون لەسەر نوێژی بە جەماعەت لەکاتی خۆیدا، داوای لێ کردن هەرکەسە لە عاست خۆیەوە رەفتاری جوان بنوێنێو خۆی چاك بکا بۆئەوەی خوداش خەڵکەکە بۆ ئەو باش بکا. داوای لێ کردن رێزی نێردراوو وەفدی دوژمن بگرن، ئەگەر هاتن بۆلایان هەوڵ بدەن زۆر لە ناویاندا نەمێننەوەو چی زووە وڵامیان بدەنەوەو بەرێیان بکەنەوە، بۆئەوەی زانیاری لەسەر سوپاو هێزی موسوڵمانان وەرنەگرنو شارەزای شوێنی حەساسو نهێنی موعەسکەری موسوڵمانان نەبن.

سوپای موسوڵمانان بە لێشاو بەرەو شام کەوتە رێ، هەموویان لە «الیرموك» کۆبوونەوە، خەبەریان بۆ خەلیفە «ئەبوبەکر» نارد کە ژمارەی سوپای دوژمن زۆرە، رۆمەکان سوپایەکی بێ شماریان کۆکردۆتەوە. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر بەپەلە نامەی بۆ خالیدی کوڕی وەلید نووسی: کە لە عێراق بوو فەرمانی پێ کرد بە خۆیو هێزێکەوە بەرەو شام بکەونە رێ سوپاکەی عێراق بکاتە دوو بەش بەشێکی لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ یارمەتیدانی سوپای ئەبو عوبەیدە، «المثنى»ی کوڕی حاریثە بکاتە فەرماندەی ئەو بەشەی سوپا کە لە عێراق بەجێیان دێڵێ: هەروا فەرمانی بە خالیدکرد: کە گەیشتە شامو سوپاکەی تێکەڵ بە سوپای ئەبو عوبەیدە بوو خۆی ببێتە فەرماندەی گشتی سوپاو ئیدارەی جەنگەکە بدا!

خالید بە نیوەی سوپای کە لە عێراق بوو بەرێ کەوت تا گەیشتە سوپای موسوڵمانان لە شام. ئەمجار نامەیەکی بۆ ئەبو عوبەیدە نووسی تێیدا دەڵێ: لەپاش حەمدو ثەنا بۆ خوداو سڵاو بۆ بەرێزتان. ئەمن داواکارم هەردوکمان بخاتە ژێر ئاشتیو ئارامی لە رۆژی ترسو بیمدا، داوا دەکەم خودا لە دونیادا لەهەموو خراپەیەك بمانپارێزێ، ئەمجار دەمەوێ ئەوەتان پێ رابگەیەنم: کە نامەیەکم لە خەلیفەوە بۆ هاتووە

فەرمانم پێ دەکا روبکەمە شام و ببمە فەرماندەی گشتی سوپای ئیسلام و سەروکاری جەنگ بکەم، سوێندم بەخودا داوام نەکردووە و نەمویستووە، ئەتۆ لە پلەو پایەی خۆت بمێنەوەو سەرپێچی فەرمانەکانت ناکەین و دژت ناوەستین و بێ ئاگاداری تۆ هیچ بڕیارێك نادەین و هیچ شتێك یەکالا ناکەینەوە. جا: کە ئەبو عوبەیدە نامەی خالیدی خوێندەوە، وتی: خودا خێرو فەڕ بخاتە کارو فەرمانی خەلیفەی پێغەمبەرەوە، خودا چاکی بێنێتە رێ بۆ ئەو راو بۆچونەی، ئافەرین بۆ خالید بۆ ئەو پیاوەتیەی کردی و ئەو هەڵوێستەی نواندی.

حەزرەتی ئەبوبەکر لەهەمان کاتدا نامەی بۆ ئەبو عوبەیدەش نووسیبوو تێیدا دەفەرموێ: دوای سڵاو ئەوە من فەرمانم دەرکردووە بەوەی خالید پەیوەندی بە سوپای ئێوەوە بکاو ببێتە فەرماندەی گشتی سوپاو سەروکاری شەڕکردن بکا دژی دوژمن لە وڵاتی شامدا. کە ئەم نامەیەت پێگەیشت سەرپێچی مەکەو گوێ ڕادێربەو بە فەرمانی خالید هەڵس و کەوت بکە. بڕوا بکە برای خۆشەویستم من بۆیە خالیدم نەکردۆتە فەرماندە بەسەر تۆوە لەبەرئەوەی بەلای منەوە ئەو لەتۆ باشترە. بەڵام من وادەزانم خالید لە شەڕدا زیرەکی و لێهاتوییەکی هەیە، پێویستە ئێمە لەم شوێنە حەریجەدا کەڵکی لێ وەرگرین، خودا باش بۆ هەموو لایەکمان بکاو خێر بێنێتە رێگەمان و والسلام.

دوایی لەشکری موسوڵمانان و لەشکری روم بە یەك گەیشتن و شەڕ لە نێوانیاندا گەرم بوو، زنجیرەیەك پێکدادان و تێکڕژان رویانداو ماوەیەك بەردەوام بوون، سەرەنجام سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان بوو، لە سوپای رۆم ژمارەیەکی بێ شمارو زۆر کوژران، ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گیران.

لەم سەرو بەندەدا هەواڵێك «نامەیەك» بۆ خالید هات كە ئەبوبەكر وەفاتی كردووەو موسوڵمانان بەیعەتیان بە عومەری كوڕی خەتتاب كردووەو كردویانە بە خەلیفە. هەروەها نامەكە ئەوەشی تێدا بوو: كە خالید لە فەرماندەی گشتی سوپا عەزڵ بێ و ئەبو عوبەیدە بچێتە شوێنی. خالید ئەم هەواڵەی بڵاو نەكردنەوەو بە نهێنی لای خۆی هێشتنیەوە بۆئەوەی چەواشەیی نەكەوێتە ناو سوپاوە، ئەبو عوبەیدەش لەلایەن خۆیەوە كە هەواڵەكەی پێگەیی لەبەر هەمان هۆ بە نهێنی هێشتیەوە«١».

## وەفاتی ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ)

حەزرەتی ئەبوبەكر ﷺ ساڵی سیانزەی كۆچی شەوی سێشەممە لە مانگی جیمادی «الآخرة» حەوت ڕۆژ مابوون، لە تەمەنی شەصت و سێ ساڵیدا وەفاتی كرد، ماوەی خەلافەتی دوو ساڵ و سێ مانگ و سێ ڕۆژ بوو، لە تەنیشت گۆڕی پێغەمبەر ﷺ لە حوجرەكەی خاتو عائیشەدا نێژرا.

## حەزرەتی ئەبوبەكر خەلافەتی بە عومەری كوڕی خەتتاب سپارد:

حەزرەتی ئەبوبەكر پێش لە دونیا دەرچوونی ڕاوێژی بە كۆمەڵێك لە ریش سپی و دونیادیدەو شارەزاو ڕادروستی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ كرد ئاخۆ بەڕای ئەوان كێ شیاوی خەلافەتە. هەموویان ڕایان هاتە سەرئەوە: كە پیاوی شیاوو گونجاو بۆ جڵەو بەدەستەوە گرتنی خەلافەت دوا خەلیفەی یەكەم، حەزرەتی عومەری كوڕی خەتتابە، لەسەر

---

١ - باختصار عن الطبری: ٣٤٢/٣ وما بعد والبدایة والنهایة لابن كثیر: ٣٤٣/٦ وتاریخ الخلفاء للسیوطی: ٦٧.

ئەم بنەمایە حەزرەتی ئەبوبەکر دەسەڵاتی خەلافەتی رادەستی عومەر کرد، بەمەش حەزرەتی ئەبوبەکر یەکەم کەس بوو کە بە رەسمی پلەی خەلافەتی دوا خۆی رادەستی پیاوێکی دیاریکراو کردو خەلیفەی دامەزراند.

بە پێویستی دەزانم لێرەدا کەمێك ئەم بابەتە شی بکەمەوە. طەبەری‌و ئیبنو جەوزی‌و ئیبنو کەثیر دەڵێن: حەزرەتی ئەبوبەکر ترسی ئەوەی هەبوو دوا خۆی موسوڵمانان کێشەیان تێبکەوێ‌و لەسەر دانانی خەلیفە رێك نەکەون. جا: کە نەخۆشی لەسەری گران بوو، بانگی پیاو ماقوڵ‌و قسە رۆیشتوی موسوڵمانانی کرد، بۆئەوەی لەژێر چاودێری خۆیداو بە ئاگاداری ئەو، کەسێك دیاری بکەن دوا ئەو ببێتە خەلیفە.

وەلێ موسوڵمانان لەناو خۆیانداو لەو ماوە کورتەدا نەگەییشتنە ئەوەی لەسەر دیاریکردنی یەکێك لە هاوەڵان بۆ ئەو پلەو پایە یەکدەنگ بن. بۆیە کارەکەیان حەواڵەی خۆی کردەوەو عەرزیان کرد: رای ئێمە رای جەنابتە، ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر دەستی کرد بە راوێژ لەگەڵ پیاوە ناودارەکانی هاوەڵان، یەکە یەکە پەیوەندی پێوەکردن. جا کەبۆی دەرکەوت هەموویان کۆکن لەسەر شیاوی‌و لێهاتوویی عومەری کوڕی خەتتاب بۆ ئەو مەنصەبە، هەموویان ئیشادە بە فەضلی ئەو دەدەن. ئەوەبوو پاش ماوەیەك کۆبوونەوەی بە خەڵکەکە کردو پێیانی فەرموو، من زۆر هەوڵمداو زۆر وردبومەوە بۆئەوەی کەسایەتیەکی گونجاو ئەصلەح بۆ ئێوە دەست نیشان بکەم بۆ پلەی خەلافەت. گەیشتومەتە قەناعەت‌و دڵنیایی تەواو کە شیاوترین کەس عومەرە بۆیە بڕیارم داوە عومەر ببێتە خەلیفە. ئیتر خەڵکەکە هەموو گوتیان: رازین‌و پێمان باشەو گوێ رادێری دەبین«[1]».

---

١ - انظر تاريخ الطبري: ٤٢٨/٣ وسيرة عمر بن الخطاب لابن الجوزي: ٣٦.

## لەسەر چ بنەمایەك عومەری كوڕی خەتتاب بوو بە خەلیفە؟!:

وێدەچێ هەندێك وابزانن ئەو شێوەیەی عومەری پێ بوو بە خەلیفە بشوبهێننە تەعین كردن لەلایەن یەكێكەوەو بەشێوەی راوێژ نەبووە. ئەهلی حیلل و عەقدو زوربەی موسوڵمانان دەنگیان بۆنەداوە.

وەلێ ئێمە كە لەروداوەكە ورد دەبینەوە، دەبینین تەعین بوونەكەی عومەری كوڕی خەطاب لەسەر بنەمای مەشورەت و پرس كردن بە ئەهلی حیلل عەقد دامەزراوە، چونكە حەزرەتی ئەبوبەكر لە خۆیەوە نەیكردە خەلیفەی موسوڵمانان تا راوێژی بە پیاو ماقوڵانی صەحابە كردو هەموویان تەزكییەیان كردو بە پەسەندیان زانی بۆ ئەو مەنصەبە. لەگەڵ ئەوەشدا بوونی بە خەلیفە دوای ئەبوبەكر نەچووە بواری دامەزران و جێگیربوون ئیللا دوای ئەوەی هاوەڵانی كۆكردەوەو وتەی بۆ دان و داوای لێكردن رەزامەندی بەوكارە دەرببڕن و گوێ رادێری عومەر بكەن، ئەوەبوو هەموو هاوەڵان بە دەنگی بەرز وتیان: «سمعنا وأطعنا» ئەمجار دوا وەفاتی حەزرەتی ئەبوبەكر موسوڵمانان بە ئیجماع و كۆڕا بڕیارو دیاریكردنەكەی حەزرەتی ئەبوبەكریان بە صەحیح و راست دانا شەرعییەتیان دا بە خەلیفایەتیەكەی، ئەوەش بەڵگەیەك بوو لە ئیجماع لەسەر دامەزراندنی حەزرەتی عومەر بە ئیمام و خەلیفەی موسوڵمانان، لە رێگەی عەهدو راسپێری و بوونی بە خەلیفەی دووەم بە مەرج و شروطی شەرعی.

## نامەی تەكلیف و عەهد بۆ عومەری كوڕی خەتتاب:

دوای ئەوەی حەزرەتی ئەبوبەكر رازی بوونی هەموو هاوەڵانی بینی و بۆی دەركەوت: كە هاوەڵان یەك دەنگن لەسەر بوونی عومەری كوڕی خەتتاب بە خەلیفەی موسوڵمانان بانگی عوثمانی كوڕی عەفانی

کرد ئەم نووسراوەی دوایی بەسەردا خوێندەوە: «بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان، ئەمە ئەو عەهدو پەیمانەیە: کە ئەبوبەکر «خەلیفەی پێغەمبەری خودا» لە کۆتایی ژیانیداو ئاخر عەهدی بە دونیاو یەکەم عەهدی بە ژیانی قیامەت، لەو حاڵەدا کە کافر ئیمانی تێدا دێنێ و فاجرو بێ بڕوا قەناعەت دەکاو یەقینی بۆ پەیدادەبێ، ئەمن ئەی موسوڵمانینە عومەری کوڕی خەطابم کردە خەلیفەو فەرمانڕەوای ئێوە، جا ئەگەر صەبری کردو بە عەداڵەتکاری جوڵایەوە ئەوە ئەو حاڵەیە: کەمن هیوای لێ دەکەمو وا دەزانم وادەکا، ئەگەر ستەمی کردو ڕێبازی گۆڕیو وەکوو پێویست هەڵسو کەوتی عادڵانە نەبوو، ئەوە من زانیاری غەیبیم نیە، من بە دیاریکردنی عومەر خێرم بۆ ئێوە ویستووە. هەموو مرۆڤێك چی دەکا ئەوەی دێتەوە ڕێ».

ستەمکارانیش لەوە بەولاوە دەزانن سەرەونگون دەکرێن. پاشان نامەکەی مۆر کرد، عوثمان نامەکەی لەگەڵ خۆی بردو بەسەر موسوڵماناندا خوێندییەوە. خەڵکەکە بەیعەتیان بە حەزرەتی عومەر کرد، ئەم بەیعەتکردنە ڕێکەوتی مانگی «جمادی الآخرة»ی ساڵی سیانزەی کۆچی کردووە.

## پەندو ئامۆژگاری:

ئەو ڕوداوانەی لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی ئەبوبەکردا ڕویان داو ئێمە ئاماژەمان پێ کردن، دەلالەت دەکەن لەسەر چەند بنەماو کاروبارێکی زۆر، لێرە بەولاوە بە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەین:

یەکەم: خەلافەتی حەزرەتی ئەبوبەکر لە ڕێگەی ڕاوێژەوە دامەزرا، هەموو ئەهلی حیلو عەقد لە هاوەڵان «بە ئیمامی عەلیشەوە» هاوبەشی ئەو هەڵبژاردنەیان کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە دەقێك لە قورئانو

سوننەتدا دەست ناکەوێ ئاماژە بۆئەوە بکا: کەدوا پێغەمبەر ﷺ مافی خەلیفایەتی بۆ فلان یان بۆ فیسارە. چونکە ئەگەر لەوبارەوە دەقێك هەبوایە، شوراو راوێژو هەڵبژاردن هیچ رۆڵێکیان نەدەبوو، هەروا دروست نەدەبوو بۆ هاوەڵان باز بەسەر دەقەکەدا بدەن و پەنا بۆ راوێژ بەرن و لەو رێگەوە خەلیفە هەڵبژێرن.

**دووەم:** ئەو نیزاع و کێشەو دووبەرەکییەی لەژێر ساباتی بەنو ساعیدەدا بەڕێوە چوو لەنێوان گەورە گەورەی هاوەڵاندا دەربارەی راوێژو کێ شیاوی ئەوەیە بکرێتە جێنشینی پێغەمبەر ﷺ کارێکی سروشتی بوو، داخوازی ئەوەبوو بخرێتە سەر مێزی دانوسان و لێکۆڵینەوەو راوێژ، ئەمەش بەڵگەیەکی رون و ئاشکرایە: کە شاریع «شەرع دانەر» پارێزگاری راو بۆچون و پێشنیاری جیاواز دەکا و بەرەهایی گوێیان لێ دەگرێ و سانسۆر ناخاتە سەر هیچ راو بۆچونێك، بەمەرجێ دژی دەقێکی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر نەوەستێ. ئاشکراشە رێبازی گەیشتن بەحەق لەهەر شتێکدا شاریع لێی بێدەنگ بووبێ رانواندنی راو بۆچوونی جیا جیا و تاوو توێکردنی راو بۆچونەکانە بەشێوەی مەوضوعی و سەربەستانەو راستگۆیانە. بێگومان بەڵاکە گەورەو موشکیلەکە قوڵ و ناهەموار دەبوو ئەگەر هاوەڵان تەنها یەك کاندیدیان هەبوایەو بیانخستایە دەنگدانەوەو لەسەری رێك بکەوتنایەو بڵاوەیان لێ بکردایە. بەڵام کاندیدەکان زۆربوون و راو بۆچوون و موناقەشەکان زۆریان خایاندو ئازادانەو مەوضوعیانە دانوسانەکە ئەنجام درا.

ئەگەر وانەبوایە شوراکە پوچ و نا ئەصڵ دەبوو، تەزویر دەبوو رێککەوتن و دانانی خەلیفە بە نایاسایی و بەزۆرە ملێ و بەزەختی دەرەکی دەژمێردرا.

سەیرە ئەوانەی داوا لە ئیسلام دەکەن راوێژ بەکاربێنێ تۆمەتباری دەکەن بە گوێ نەدان بەڕای بەرامبەرو پەیڕەوکردنی تاکڕەوی، هەرکاتێکیش دیاردەی راوێژو شوڕا بەڕاستی بێتە بەرچاویان بە نەفامی یان بەخۆ گێل کردن بەدوو بەرەکی صیراع و دژ بەیەك وەستان ناوی دەبەن!! دەی دەبێ شوڕا لەدیدو زەینی واندا چی بێ و چۆن بێ؟ وێنەو دیمەنی شوڕا چۆن وێنا دەکەن و پێیان وایە دەبێ راوێژو شورا چۆن بێ و چۆن بکرێ؟

سێیەم: ئامۆژگاری حەزرەتی عەلی بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر: کە بۆ خۆی نەچێ بۆ شەڕی پاشگەز بووەکان، مەبادا خوا نەخواستە موسوڵمانان بەهۆی شەهیدبوونی خەلیفەوە کۆستیان بکەوێ، ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە ئیمامی عەلی حەزرەتی ئەبوبەکری خۆشەویستووە. هەروا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی ئیمامی عەلی قەناعەتی تەواوی بە خەلیفایەتی ئەبوبەکر بووەو پێی وابووە شیاوترین کەس بووە بۆ ئەو مەنصەبە لەوکاتەدا. نیشانەی ئەوەیشە زۆر هاریکاری و دڵسۆزییان بۆ یەکتری هەبووە.

چی بگوترێ: دەربارەی دواکەوتنی بەیعەتکردنی ئیمامی عەلی بە حەزرەتی ئەبوبەکر «خودایان لێ رازی بێ». چەندێك بگوترێ دەربارەی ماوەی دواکەوتنی بەیعەتەکە. دژایەتی ئەم حەقیقەتە چەسپاوە ناکاو ئەو عەلاقە ئیمانییە لێڵ ناکا.

ئاشکراشە دواکەوتنی بەیعەتکردنی ئیمامی عەلی موسایەرەو موجامەلە کردنی فاطیمەی خێزانی بووە، هەڵبەتە فاطیمە بە ئیجتیهادی خۆی پێی وابوو مافی ئەوەی هەیە میرات لە باوکی «کە حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ» دەگرێ، وەکوو هەر کچێکی تر کە میرات لە باوکیان دەگرن. حەزرەتی ئەبوبەکرو زوربەی هاوەڵان قەناعەتیان وابوو پێغەمبەر

ﷺ میراتـی لێ نـاگیرێ‌و بەڵگـەی بەهێزیـشیان پـێ بـوو. کـەوابوو دواکـەوتنی بەیعـەتکردنی ئیمـامی عـەلی بـە حـەزرەتی ئەبوبـەکر بـەهۆی بـوونی «تەحـەفـوظ»ێـك نـەبووە لـەدڵی عەلیـدا بەرامبـەر ئەبوبـەکر. چۆن دەگونجێ تەحـەفوظی هـەبووبێ‌و ئـەم هەڵوێـستە مەردانـەو هاریکارییـە بـەردەوام‌و دڵـسۆزانەو خۆشەویـستییەی بەرامبـەر ئەبوبـەکر هـەبووبێ؟!

هەرکەسـێ، هـەر موسـوڵمانێ لـەو هەڵوێـستە وردبێتـەوە کـە حـەزرەتی ئەبوبەکر گرتیە بەر بەرامبەر هۆزە پاشگەزبووەکان‌و زەکات نـەدەرەکان، هەروا وردبێتەوە لـەو عەزیمـەت‌و حەزمـەی لـە بەگـژا چوونی ئـەو هـەموو هۆزو خێڵە هەڵگەڕاوانە تێیدا بەرجەستە بوو، دەری خـست ئەبوبـەکر لـە وەضع‌و پلەو پایەکی تایبەتی دایە لەروی دوور بینی‌و مەردایەتی‌و چاو نەترسییەوە: کە لەو کاتـەدا زوربـەی هـاوەڵانی پێغەمبـەر، یـان بڵـێ: هـەر هـەموویان ئـەو دوور بینـی‌و سـوور بونـەیان لەسـەر بەگـژا چـوونەوەی هەڵگـەڕاوەکان تێدانـەبوو، هەرکەسـێ لـەو هەڵوێـست‌و ڕەوشـتانەی ئەبوبەکر وردبێتەوە، دەگاتـە یـەقین: کـە حیکمـەتی خـودا واداخـواز بـوو: کە پیـاوی شیـاو بخرێتـە شـوێنی شیاوەوەو ئـەرك‌و موهیمـەی شـیاوی خـۆی پـێ سپێردرا، کـێ لـە ئێمـە پێـی وانیـە لەناو هاوەڵانـدا حـەزرەتی ئەبوبەکر لە هـەموانیان شیاوتر نـەبێ بـۆ بـەر پەرچدانـەوەی ئـەو ڕەشـەبا شـومەی لـەو سـاتە وەختـە ناسـکەدا تووشـی موسـوڵمانان بـوو؟ کـێ لـە هـاوەڵان لـەو بەتواناتر بـوو بـۆ ڕەتکردنـەوەی ئـەو گێژەڵوکـە ناهـەموارەو پوچەڵکردنەوەی ئەو پیلانەو لە گۆڕنانی لەشوێنی خـۆی؟.

تەنانـەت حـەزرەتی عومـەر کـە لـەنێو هاوەڵانـدا بـەوە ناسـراوە زۆر تونـدو ئـازاو خـاوەن عـەزم‌و حـەزم بـووەو دوور بین‌و بەرچـاو کـراوەبـوو، کەچـی لـە ئاسـت ئـەم ڕەشـەبا بـەهێزەی هەڵگەڕانـەوەی زۆرێـك لـە خێڵـە عەرەبەکان عەزیمـەت‌و توندییەکـەی زۆر لـەهی ئەبوبـەکر کـەمتر بـوو، کـێ

هەیە ئەم حیکمەتە یەزدانییە ببینیٚ، پاشان لۆمەی مێژوو هاوەڵان بکا بڵێ بۆچی ملکەچی ئەم حیکمەتە بوون؟! یان بۆ فلان یان فیسار نەکرا بە جێنشین و خەلیفەی یەکەم؟!

پێنجەم: لەوانەیە هەندێ کەس واگومان بەرن تەنها عەهدو کردن بە خەلیفە لەلایەن خەلیفەی پێشووەوە بە شێوەیەك لە شێوەکانی تەعین بوون و دامەزرانی ئیمامەت و خەلیفایەتی دەژمێردرێ، بەڵگەشیان ئەوەیە: کە ئەبوبەکر کردی دەربارەی دانانی عومەری کوڕی خەتتاب بە خەلیفە.

وەلێ لە واقیعدا وانیە، بەڵکوو چەسپانی ئیمامەت و خەلیفایەتی نایەتەجێ تا مەوضوعەکە رانەنوێندرێ بەسەر موسوڵماناندا و رەزامەندی ئەوان وەرنەگرێ. هەتا کۆمەڵی موسوڵمانان رەزامەندی خۆیان دەرنەبڕن بەرامبەر خەلیفەو فەرمانڕەوای تازە، خەلافەت و فەرمانڕەواییەکەی دانامەزرێ، دامەزران و بوون بە خەلیفە بە ئیعلانکردنی ئەو رەزامەندییە دێتەجێ. واتە: ئەگەر حەزرەتی ئەبوبەکر عەهدو پەیمانی خەلافەتی بدایە بە ئیمامی عومەرو موسوڵمانان رەزامەندییان بەرامبەر ئەو فەرمانە دەرنەبڕیایە، ئەوە هیچ نرخێك بۆ ئەو عەهدو پەیمانە نەدەبوو.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ «وەکوو لەوەپێش وتمان» خەلافەتی ئیمامی عومەر بە راوێژێکی مەیلەو نهێنی هاتۆتە جێ و چووەتە ژێر چەتری کۆڕای هاوەڵان و دەستەبەر بوونی رەزامەندی ئەوان لەسەر ئەو خەلیفەیەی ئەبوبەکر بۆی دیاری کردبوون.

# خەلافەتی عومەری کوڕی خەطاب

عومـەری کـوڕی خـەتتاب «ئـەمیری موسـوڵمانان». پێغەمبـەر ﷺ نازناوی «الفاروق»ی لێ ناوە، چونکە حەق و بەتاڵی لێك جیاکردەوە. ئەو ڕۆژەی حـەزرەتی ئەبوبـەکر وەفـاتی کـرد ئـەو کـرا بـە خەلیفـەی موسـوڵمانان، لەسـەر نـەهج و سـیرەو جیهـادو صـەبری خەلیفـەی یەکـەم ڕۆیشت، پەروەردگاریش بەهۆی ئەوەوە ئیسلامی بەهێز کرد.

یەکـەم ئیـشێك ئـەنجامی دا خالیـدی کـوڕی وەلیـدی لـە فەرمانـدەی گشتی سـوپای ئیـسلامی ڕەوانـەکراو بـۆ غـەزای ڕۆم عـەزڵ کـردو ئـەبو عوبەیدەی خستە شوێنی.

ئامادەی فـەتحی بەیتولمەقدیس بـوو، دە ڕۆژ لـەوێ مایـەوە، دوایـی گەڕایـەوە بـۆ مەدینـەو خالیدیـشی لەگـەڵ خـۆی هێنایـەوە بـۆ مەدینـە. کاتێك خالید گلەیی لە خەلیفە عومەر کرد لەسـەر عـەزڵ کردنـی، خەلیفە لـە وەڵامـدا پێـی گـوت: وەڵڵاهـی ئـەی خالیـد! ئـەتۆ لای مـن کـەریم و خۆشەویستی«١».

ئەمجار نامەی نووسی بۆ شارو هەرێمەکان دەفەرموێ: من خالیـدم بۆیە عەزڵ نەکردووە کە ڕقم لێی بووبێ، یان خوا نەخواستە خیانـەتی کردبـێ. وەلێ بۆیـە عـەزڵم کـردووە چـونکە لەشـەڕو هێرشـەکاندا زۆر تونـدڕەوەو چـاو نەترسـە، جـەنگاوەرانی موسـوڵمان زۆر بـە کوشـت دەدا«٢».

خالیـد کـوڕی پـوری خەلیفـە عومـەرە «واتـە: کـوڕی خوشـکی بـاوکی خەلیفە عومەر بووە». خالید لە ڕۆژگـاری خەلافـەتی خەلیفـە عومەردا لـە

---

١ - البداية ظوالنهاية: ٨١/٧، والطبرى: ٤٣٥/٣.

٢ - تاريخ الطبرى: ٥٩٨/٣ و ٦١٣.

«حمَص» کۆچی دوایی کردووە. بێگومان دیمشق بە نیوە صوڵح و نیوە عنوة فەتح کراوە. «حمص»و «بعلبك» بە صوڵح فەتح کران، بەصرەو «أبلة» بە زۆرو بە شەڕ فەتح کران، ئەمانە هەموویان ساڵی چواردەی کۆچی رویانداوە.

هەر لەم ساڵەدا حەزرەتی عومەر خەڵکی کۆکردەوە بۆئەوەی لە رەمەزاندا شەوانە بیست رەکعات نوێژی تەراویح بە جەماعەت بکەن.

لە ساڵی پانزەی کۆچیدا وڵاتی ئەردەن جگە لە طەبەرییە هەموو بە شەڕو زۆرە ملێ فەتح کرا، بەڵام طەبەرییە بە صوڵح و ئاشتەوایی رزگارکرا. هەر لەم ساڵەدا شەڕی یەرموك و شەڕی قادسیە رویاندا. ئیبنو جەریر لە کتێبە مێژووییەکەی دا دەڵێ: لەم ساڵەدا سەعد کۆفەی کرد بەشار، هەر لەو ساڵەدا حەزرەتی عومەر لە بواری ئیدارەدا دەواوینی دامەزراندن، موچەی بۆ هەندێ کەس بڕیەوە بڕی موچەکە بە گوێرەی زوو موسوڵمان بوونی ئەو کەسە دیاریی کراوە«[١]».

لە ساڵی شانزەی کۆچیدا ئەهوازو مەدائین فەتح کران. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە ئەیوانی کیسرادا جومعەی کرد. ئەوە یەکەم جومعە بوو کە لە عێراق ئەنجام درا.

حەزرەتی عومەر راوێژی بە هاوەڵان کرد «لە ناویشیاندا حەزرەتی عەلی» دەربارەی ئەوەی بۆ خۆی بچێ بۆ شەڕ دژی فارس و رۆم. یەکێك لەوانەی: کە ئەوەی بەلاوە پەسەند نەبوو ئیمامی عەلی بوو: فەرمووی: «ئەم ئایینە سەرکەوتن و تێشکان تێیدا بەزۆری و کەمی نیە، ئەوە ئایینی خودایە سەری خستووە، ئەوە سوپای ئیسلامە ئامادەی کردووەو یارمەتی داوە هەتا گەیشتۆتە ئەم حاڵەی گەیشتویەتێ

---

١ - البداية والنهاية: ٨١/٧، والطبرى: ٤٣٥/٣.

دەرکەوتووە بەو شێوەی دەرکەوتووە. شوێنی فەرمانڕەواو کاربەدەستی وڵات وەکوو دەزووی تەسبیح وایە کۆیان دەکاتەوەو دەیانخاتە پاڵ یەکەوە، ئەگەر بەنەکە پچڕا دەنکەکان بڵاو دەبنەوەو هەریەکەیان بەلایەکدا دەڕۆن و ئیتر هەرگیز هەموویان کۆنابنەوە. کەوابوو ئەی خەلیفەی موسوڵمانان تۆ بۆخۆت مەرکەزی فەرمانڕەوایی بەجێ مەهێڵە، ببە بە قوطبی ئاش و ئاشەکە بە عەرەب هەڵسوڕێنە، ئەوان بنێرە بۆ شەڕو خۆت نزیك مەبەرەوە، چونکە ئەگەر تۆ لەم خاکە بڕۆیە دەر عەرەب لە هەموو لایەکەوە لێت هەڵدەگەڕێنەوە، ئەوەی: کەتۆ لەدوای خۆت جێی دێڵی لە عەورات و کاری وا کە پێویستە پارێزگارییان بکەی، زۆر گرنگترە لەوەی بۆی دەچی«١».

هەروا لەو ساڵەدا جەنگی جەلەولا رویداو سوپای ئیسلام یەزدو جوردی کوڕی کیسرای شکاندو بەرەو «ڕەی» بە تێشکاوی هەڵات. هەر لەو ساڵەدا تکریت فەتح کرا. لەو ساڵەدا خەلیفە عومەر رۆیی بەیتولمەقدیسی فەتح کردو لە جابیە وتارە مەشهورەکەی دا، هەر لەو ساڵەدا «قنسرین» بەشەڕ فەتح کرا، حەڵەب و ئەنطاکیە بە صوڵح و ئاشتەوایی فەتح کران. لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی ئەو ساڵەدا سەرەتای تاریخی کۆچی بەڕاوێژ لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بڕیاردرا پەیڕەو بکرێ و ببێتە مێژوو بۆ موسوڵمانان.

لە ساڵی حەڤدەی کۆچیدا لە مزگەوتی مەدینە زیادکرا. هەر ئەو ساڵە وشکە ساڵی بوو، بە «عام الرمادة» ناوی دەرکردووە، ئیمامی عومەر نوێژە بارانەی بە موسوڵمانان کردو عەبباسی کرد بە وەسیلەو تکاکار، زۆری پێ نەچوو گرانی و وشکە ساڵییەکە لاچوو. ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە دەڵێ: ئیمامی عومەر: کە چووە دەری مەدینە بۆ

---

١ - البداية والنهاية: ١٠٧/٧، نهج البلاغة: ٢٠٣.

نوێژە بارانە، بوردەی پێغەمبەری لەبەر کردبوو، لەم ساڵەدا ئەهوازیش بە صوڵح و ئاشتی گیرا«[1]».

## تاعونی عەمواس

لە ساڵی هەژدەی کۆچیدا تاعونێک لەشام بڵاوبوٚوە، زۆر لە جەنگاوەرانی ئیسلامی پێ مردن. هەواڵی ئەم تاعونە لە کاتێک دا بە خەلیفە عومەر گەیشت: کە بۆ دووەم جار بەرەو شام کەوتبووە ڕێ، بۆیە ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد ئاخۆ چی بکەن، سەرەتا کەوتنە ڕاجیاییەوە، دوایی «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوف هات هەواڵی ئەوەی پێدان: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {اذا سمعتم بالوباء ببلد فلا تقدموا عَلَيْهِ واذا وقع ببلد وانتم فيه فلا تخرجوا فراراً منه}. ئەگەر بیستتان تاعون لە وڵاتێکدا بڵاو بۆوەتەوە مەچنە ناویەوە، ئەگەر تاعون لە شارێکدا بڵاو بۆوەو ئێوە لەناویدا بوون لێی مەچنە دەرەوەو بتانەوێ لێی هەڵێن. ئیتر حەزرەتی عومەر بەخۆی و ئەو خەڵکەی لەگەڵیدا بوون گەڕایەوە بۆ مەدینە.

لە ساڵی نۆزدەی کۆچیدا «قيسارية» بەشەڕ گیرا.

لە ساڵی بیستەمی کۆچیدا میصر بەشەڕ فەتح کرا. هەندێ لە مێژوو نووسان دەڵێن: وڵاتی میصر هەمووی بە صوڵح و ئاشتی فەتح کراوە جگە لە ئەسکەندەرییە ئەو بەزۆرو بەشەڕ گیراوە. هەر لەو ساڵەدا وڵاتی مەغریب بەشەڕ فەتح کراو قەیصەرو گەورەی «ڕۆم»یش لە دونیا دەرچوو. هەروا حەزرەتی عومەر ڕەوی بە جولەکەی خەیبەرو نەجران کردو وەدەری نان.

---

١ - تاريخ الخلفاء: ١٢٣ وما بعد.

لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا ئەسکەندەرییەو نەهاوەند بەشەڕ رزگارکران. ئیتر لەدوا شەڕی نەهاوەند، فارسەکان بێگەیان نەماو نەیانتوانی سوپا کۆبکەنەوەو ببنە مەترسی بۆ موسوڵمانان.

لە ساڵی بیست و دووی کۆچیدا ئازەربایجان بە شەڕ گیرا. هەندێك دەڵێن بە صوڵح و ئاشتی گیراوە، هەمەدان بەشەڕ گیرا، طەڕابولسی خۆرئاواو وڵاتی «الرَّيْ»یش هەروا.

لە ساڵی بیست و سێی کۆچیدا باقی وڵاتی فارس فەتح کرا، کرمان، سەجستان و ئیصفەهان و دەوروبەری. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا حەزرەتی عومەر فەریضەی حەجی بەجێ هێنا. سەعیدی کوڕی موسەیەب دەفەرموێ: کە خەلیفە عومەر لە میناوە ڕۆیی لە «الأبطح» حوشترەکەی ییخدا. پاشان روی لە ئاسمان کردو دەستەکانی بەرزکردنەوە بۆ حەواو فەرمووی: خودایە! پیربوم و لاوازو بێ هێز بووم رەعیەتم زۆرو بەربڵاو بووە. خودایە بمبەرەوە بۆلای خۆت و سەر بەسەر دەربچم مەمنونم. مانگی ذیلحیجەی ئەو ساڵە کۆتایی نەهات شەهید بوو»[1].

## شەهیدبوونی حەزرەتی عومەر:

شەهیدبوونی حەزرەتی عومەر بەدەستی غولامێکی مەجوسی بوو، ناوی «عبدالمغيرة»و نازناوی ئەبو لوئلوء بوو، دەربارەی هۆی کوشتنەکەش، دەڵێن: ئەبو لوئلوء هاتووە بۆلای خەلیفە عومەر شکاتی ئەوەی کردووە کە ئەو خەراجەی لەسەری دانراوە زۆرەو بۆی هەڵناسوڕێ، حەزرەتی عومەر کە پرسیاری کردووە بۆی مەعلووم بووە خەراجەکە زۆر نیە، بۆیە فەرموویەتی: خەراجی لەسەرت دانراوە زۆر

---

١ - البداية والنهاية: ١٣٧/٧، وتاريخ الخلفاء: ١٢٤.

نیە، ئەویش بەرق هەڵساوی ڕۆیشتووەو وتویەتی: عەداڵەتی تۆ هەموو کەسی گرتۆتەوە جگە لەمن. بڕیاریدا حەزرەتی عومەر شەهید بکا. خەنجەرێکی هەڵگرت و تیژی کردو ژەهری پێ کرد چونکە «ئەبو لوئلوءة» بۆ خۆی دەست ڕەنگین بوو زۆر صەنعاتی دەزانین». لە سوچێکی مزگەوتدا خۆی شاردەوە، جا کە حەزرەتی عومەر هات بۆ نوێژی بەیانی «وەکوو عادەتی هەمیشەیی» ئەبو لوئلوء هێرشی کردە سەرو سێ خەنجەری لێ دان و خستی، ئەمجار هەرکەسێ لێی نزیک بووایە زەبری لێ دەدا تا موسوڵمانێك بەڕەیەك پارچە قوماشێکی بەسەردا داو لە پەل و پۆ کەوت، کاتێك زانی دەست و مەچەکی خەریکە ببەسترێن بە خەنجەرەکەی خۆی کوشت[١].

ئەمە بە کورتی ئەوەیە: کە راویانی سیرە دەربارەی کوژرانی عومەر باسیان لێ کردووە. بەڵام وێدەچێ لەپشت ئەمەوە پیلان و موئامەرە هەبووبێ و زۆر لایەن دەستیان تێیدا بووبێ. داوێك بووبێ جولەکەو مەجوسی و زەنادیقە پێکەوەو بە هاوکاری و هەماهەنگی چەند کەسانێکی بێدینی تر نرابێتەوە. زۆر دوورو نەگونجاوە ئەم تاوانە ئاکامی تەصەروفێکی شەخصی بووبێ و هۆکارەکەی زۆری خەراج لەسەر دانان بووبێ؟! خودا بۆ خۆی دەیزانێ.

کاتێ هەواڵیان بە خەلیفە عومەر دا: کە بکوژەکەی ئەبو لوئلوئەیە، فەرمووی: سوپاس بۆ خودا کە مردنی منی بەدەستی کەسێك نەهێنایە دی کە خۆی بە موسوڵمان بزانێ. ئەمجار بە عەبدوڵڵای کوڕی فەرموو: بزانە قەرزی خەڵکم چی لایە، ئەژماریان کرد هەشتا و شەش هەزار دیرهەم قەرزدار بوو، ئەمجار فەرمووی: ئەگەر ماڵ و سامانی خانەوادەی عومەر بەشی قەرزەکانی کرد ئەوە باشە، ئەگینا لە بەرەبابی عەدی

---

١ - أنظر تفصيل ذلك في تاريخ الطبرى: ١٩٠/٤ والبداية والنهاية: ١٣٧/٧.

قەرزەکە تەواو بکەن، ئەگەر ماڵو سامانی خێڵی «عدی» بەشی نەکرد، لە ماڵو سامانی قورەیش بیدەنەوە. ئەمجار بە عەبدوڵڵای فەرموو: بچۆ بۆلای دایکی موسوڵمانان، خاتو عائیشە عەرزی بکە بڵێ: عومەر داوات لێ دەکا: کە رێگە بدەی لە حوجرەکەی تۆدا لەگەڵ دوو هاوەڵی خۆشەویستی بنێژرێ، کە عەبدوڵڵا چووە خزمەتی فەرمووی: ئەو شوێنە گۆڕەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئەوە بۆ ئەوی دادەنێمو بابۆ ئەوبێ. کە گەڕایەوەو رازیبوونی عائیشەی پێگەیاند، عومەر سوپاسی خودای کرد: کە ئەو شوێنەی بۆ دەستەبەر بوو.

## حەزرەتی عومەر رایسپارد دوای خۆی بە راوێژ یەکێك لە شەش کەس بکەن بە خەلیفە:

هەندێ لە هاوەڵان داوایان لە حەزرەتی عومەر کرد کە کێی بەلاوە گونجاوە بیکاتە جێنشین بۆیان بەڵام عومەر ئەوەی بۆ نەکردن، بەڵکوو رایسپاردن دوای خۆی بەڕاوێژ خەلیفە هەڵبژێرن، شەش کەسی دیاری کردن: «عثمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبو طالیب، طەلحەی کوڕی عەبدوڵڵا، زوبەیری کوڕی عەوام، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوف» فەرمووی: لە رێگەی راوێژەوە یەکێکیان هەڵبژێرن بە خەلیفە. حەزرەتی عومەر خۆی لەوە پاراست یەکێك لەو شەش کەسە دیاریی بکا بۆ جێنشینیو فەرمووی: نەبە زیندویی نەبە مردویی تەحەمولی ئەوە ناکەم، ئەگەر خودا خێری بۆ ئێوە بوێ واتان لێ دەکا بە تێکڕا باشترینیان هەڵبژێرن، وەکوو چون لەوەپێش دوا پێغەمبەر ﷺ خودا وای لێ کردن باشترین کەستان بکەنە فەرمانڕەوای خۆتان.

ئاوا بەو جۆرە ئیمامی عومەر یەکەم کەس بوو: کە لیژنەیەکی لە هاوەڵان دیاریکرد بۆئەوەی لەناو خۆیاندا یەکێك دیاری بکەن بۆ مەنصەبی جێنشینی، ئەم لیژنەیە ناونرا ئەهلی شورا، دیاریکردنی جێنشین بەوان سپێردرا، واتە: وەکوو بالاترین لیژنەی سیاسەتو حوکم.

حەزرەتی عومەر ئەو شەش کەسەی راسپارد کە لەکۆبونەوەو مەجلیسەکانیاندا عەبدوڵلای کوڕی عومەریان لەگەڵدا بێ وەکوو راوێژکارو ئامۆژگاریکار نەك وەکوو کاندیدو هەڵبژێراو بۆ جێنشینی. هەروا رایسپارد تاسێ رۆژ صوهەیبی رۆمی پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان بکا، تا ئەهلی شورا خۆیان یەکلایی دەکەنەوەو موسوڵمانان پێکدێن لەسەر دانانی خەلیفە.

## حەزرەتی عوسمان چۆن کرا بە خەلیفە:

بە گوێرەی راسپاردەی حەزرەتی عومەر ئەو شەش کەسەی دیاری کردبوونو بە ئەهلی شوڕا ناو دەبرێن. لە ماڵێکدا کۆبوونەوە بۆ موشاوەرەو وتو وێژو راوێژ، طەلحە بوو بووە دەرگەوانو نەیدەهێشت کەس بچێتە لایان، سەرەنجام سێ لەو هاوەڵانە کارەکەیان دایە دەست سێ کەسەکەی تریان. زوبەیر دەسەڵاتو رای خۆی دایە ئیمامی عەلی. سەعد کارو رای خۆی دایە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف. طەلحە وازی لە حەقی خۆی هێنا بۆ عوثمان. ئەمجار عەبدوڕەحمان روی کردە ئیمامی عوسمانو ئیمامی عەلی پێی گوتن: کێتان واز لە حەقی خۆی دەهێنێ تا کارەکە بەوی ترتان بسپێرێن؟ هەردوکیان بێ دەنگ بوون. ئەمجار عەبدوڕەحمان فەرمووی: من واز لە مافی خۆم دێنم، خوداو ئیسلام لەسەریان فەرز کردوم کە باشترینتان هەڵبژێرم بە حەق. دوایی لەگەڵ

هەردوکیان دواو بەڵێنی لێ وەرگرتن ئەگەر هەرچیان کرا بە خەلیفە بە عەداڵەت کاروبار هەڵسوڕێنێ، ئەگەر ئەوی تریان کرا بە خەلیفەی ئەم گوێ رادێرو ملکەچی فەرمانی بێ، هەردوکیان بەوە رازی بوونو ئەم بەڵێنەیان داو بڵاوەیان لێ کرد.

ئەمجار عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کەوتە خۆ، راوێژی بە موسوڵمانان دەکرد، راوێژی بەریش سپیو پیاو ماقوڵان کرد، بە کۆمەڵو بە جیا جیا دوو دوو سێ سێو تاك تاك بەنهێنیو بە ئاشکرا، تەنانەت راوێژی بە ئافرەتانیش کرد لەدوا پەردەکانیانەوە، ئەمجار راوێژو پرسی بەقوتابیانی ناو قوتابخانەش کرد، تەنانەت پرسی بەکاروانچیو ئەوانەیش کرد کە رۆژانە دەهاتنە ناو مەدینە. سێ رۆژو سێ شەو بێ هەدادان دوو کەسی نەبینی عوسمان پێش عەلی نەخا تەنها عەمماری کوڕی یاسرو ألمقداد نەبێ ئەوان سەرەتا رایان وابوو ئیمامی عەلی بکرێ بە خەلیفە، بەڵام دوایی ئەوانیش هاتنە سەر رای زۆرینەی موسوڵمانان.

ئەمجار لەرۆژی چوارەمدا «عبدالرحمن» کۆبوونەوەی بە حەزرەتی عوسمانو حەزرەتی عەلی کرد لە ماڵی «ألمسور»ی کوڕی مەخرەمەدا: کە خوارزای بوو، لەو کۆبوونەوەدا روی تێکردنو پێی فەرموون: ئەمن لەبارەی ئێوەوە پرسیارم لە موسوڵمانان کردووە کەسم نەدی ئێوە بەشیاوترینی ئەو مەنصەبە نەزانێ. ئەمجار بردنی بۆ مزگەوتو بەدوا پیاو ماقوڵو ریش سپییەکانیدا نارد لە ئەنصارو موهاجیرین، مزگەوت پڕبوو هەتا وای لێ هات سیخناخ بوو لە خەڵکی بانگکراو، ئەمجار عەبدوڕەحمان چووە سەر مینبەری پێغەمبەرو دەستی کرد بە وتاردان، زۆری دوعاو پاڕانەوە کرد، ئەمجار فەرمووی: ئەی خەڵکینە! من بە نهێنیو بە ئاشکراو بە ویستو خواستی ئێوە پرسیارم کردووە لە

ئێوەو لە کەسانی تریش، نەمدی کەسێك جگە لەم دوو پیاوە کەسێکی تر دەست نیشان بکا، ئەی عەلی هەستە وەرە نزیکم، عەلی هەڵسا چوو بۆ لای و عەبدوڕەحمان دەستی خستە ناو دەستییەوە وتی: ئەی عەلی ئایا ئەتۆ بەیعەتم دەدەیە بە گوێرەی کیتابی خوداو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەی و هەڵس و کەوتت وەکوو ئەبوبەکرو عومەر وابێ و بە ڕێبازی ئەواندا بڕۆی؟ عەلی وتی: نەخەیر، خودا شاهیدە وام پێ ناکرێ، بەڵام بە گوێرەی هێزو توانای خۆم کەمتەرخەمی ناکەم. عەبدوڕەحمان دەستی بەرداو، وتی: ئەی عوثمان هەڵسە وەرە نزیکم، کە چووە لای دەستی خستە ناو دەستیەوەو پێی وت: ئایا ئەتۆ بەیعەتم پێ دەدەی بە گوێرەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کاربکەی، چاو لە ئەبوبەکرو عومەر بکەی و ڕێبازی ئەوان بەرنەدەی، وتی: بەڵێ. ئەمجار عەبدوڕەحمان سەری بۆ لای هەلاشی مزگەوتەکە بەرز کردەوەو دەستیشی لە دەستی عوسمان دابوو، وتی: «أللهم اسمع واشهد، اللهم اسمع وأشهد» خودایە بۆ خۆت دەبیسی و ئاگات لێیە، خودایە بۆ خۆت دەبیسی و ئاگات لێ یە خودایە ئەوەی لە ئەستۆی مندا بوو ئەوا دامکەندو خستمە ئەستۆی عوسمان، ئیتر خەڵکەکە ورووژمیان هێنا و لەلای خواروی مینبەرەکەوە بەیعەتیان بە عوسمان کرد. عەلی یەکەم کەس بەیعەتی پێکرد یان دوا کەس بوو.

## پەندو ئامۆژگاری:

یەکەم: ئێمە زانیمان یەکەم کارێك خەلیفە عومەر ڕەچاوی کرد عەزڵکردنی خالید بوو، لە فەرماندەی گشتی سوپای شام لای بردو ئەبو عوبەیدەی خستە شوێنی.

بێگومان زۆر لە نووسەرانی سەردەم قسەی پڕو پووچیان لەبارەی عەزڵکردنی خالیدەوە گوتووەو نووسیوە. هەوڵیان داوە ڕێبازێک کەلێنێک بدۆزنەوە بتوانن لەککەو عەیب و هەڵە پاڵ خالید بدەن و لە پلەو پایەی کەم بکەنەوە.

وەلێ هۆکارو شیکردنەوەی ئەم عەزڵە ئاشکراو روونەو کردەوەی هەڵوێستی عومەر بەرامبەر خالید بەجوانی رون دەکاتەوە، هەروا ئەو قسەو گفت و گۆیەی عومەر دەربارەی و ئەو مەدح و ثەنایەی کردی، ئەوەبوو وەکوو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد پێی گوت: «بەخودا قەسەم خالید تۆ لای من خۆشەویست و ڕێزداری، نامەی رونکردنەوەی بۆ شارەکان نووسی ئەوەی تێدا رونکردەوە کە عەزڵکردنی خالید لەبەرئەوە نەبووە رقی لێی بێ، یان خوا نەخواستە خالید خیانەتی کردبێ، بەڵکوو هۆیەکەی ئەوەیە خالید زۆر چاو نەترس و ئازایە لە هێرش و پەلاماردانەدا گەڕانەوەو راوەستانی نیە، بەم هۆیە زۆر لە جەنگاوەرانی سوپاکەی شەهید دەبن»[١].

کاتێک عومەر بیستی کە خالید نەخۆشە، سێ ڕۆژە ڕێ لێی دوور بوو، بە پەلە لەماوەی شەوێکدا ئەو مەسافەی بڕی کە گەیشتە لای، خالید گیانی دەرچوو بوو «انا لله وانا الیه راجعون»ی گوت و کوڵی گریانی بۆی هەڵسا، لە دەرگایماڵەکەی دانیشت تا شتن و کفن کردنی تەواو بوو: کە ئافرەت و دەرو جیران بۆی دەگریان بە عومەریان گوت: گوێت لێیە چۆن شین و شەپۆڕیان بۆ گێڕاوە ئەوە بۆ لێیان مەنع نەکەین؟ عومەر فەرمووی: با ئافرەتی قورەیش بۆی بگرین بەمەرجێ لە خۆدان و یەخە دادڕینی تێدا نەبێ قەیناکە بابۆی بگرین.

---

١ - البدایة والنهایة: ٨١/٧.

کاتێ خەلیفە عومەر لەگەڵ جەنازەکەی ڕۆیشت ئافرەتێکی بینی بەکوڵ بۆی دەگریا، فەرمووی: ئەوە کێیە وا بە کوڵ بۆی دەگری؟ عەرزیان کرد: دایکیەتی، فەرمووی: دایە! حەیف و مخابن بۆ ئەو پاڵەوانە، دەبێ تا ئێستا دایکێکی تر هەبێ لە داوێنی پیاوی وەکوو خالیدی لێ کەوتبێتە خواری؟»[١]

دووەم: ئەمەی ئێمە ریوایەتمان کرد ئەوە دەگەیەنێ خالید لە مەدینە مردبێ و لەوێش دفن کرابێ. هەندێ مێژوو نووس بۆ ئەمە چوون و وایان چەسپاندووە، بەڵام جەماوەری زانایانی مێژوو بڕوایان وایە خالیدی کوڕی وەلید لە «حمص»ی مردووەو دفن کراوە، ئیبنو کەثیریش لە کتێبی «البدایة والنهایة»دا ئەم رایەی پەسەند کردووە. چونکە ئەوە چەسپاوە: کە خالید دوای عەزڵ کردنی هاتۆتە مەککە عەمرەی کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ شام و لەوێ ماوەتەوە تا وەفاتی کردووە لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا.

هەرچۆنێك بێ زوبانی حەزرەتی عومەر دەربارەی خالید زوبانی مەدح و ثەنابوو لەسەردەمی ژیانی خالیدداو لەدوا مردنیشی. ئیبنو کەثیر لە واقیدییەوە ریوایەتی کردووە: کە حەزرەتی عومەر حاجی شاری «حمص» ببینین، پرسیاری لێ کردن ئاخۆ دەنگ و باس چیەو چی نیە؟ وتیان: خالیدی کوڕی وەلید کۆچی دوایی کردووە. ئیتر حەزرەتی عومەر «انا لله وانا الیه راجعون»ی گوت. پاشان فەرمووی: بەڕاستی خالید سەددو بەربەستێکی بەهێز بوو بەرامبەر دوژمن، رابردو پاك و کار دروست بوو، وەلێ مەدحکردنی حەزرەتی عومەر بۆ خالید چ دژایەتی نیە لەگەڵ ئەوەدا کە هەندێ هەڵوێستی بەرامبەر ئەو بووبێ، یان

---

١ - المرجع ذاته.

هەریەکە لە خالیدو عومەر هەڵوێستی ئیجتیهادییان هەبووبێ، هەریەکەیان کاری بەرای خۆی کردبێ.

خۆزگە ئەوانەی لە پلەو پایەی خالید کەم دەکەنەوە بەهۆی هەڵوێستی عومەر بەرامبەری، یان لە مەکانەتو پلەو پایەی عومەر کەم دەکەنەوە لەبەر هەمان هۆکار، خۆزگە تفەنگیان بە تاریکە شەوەوە نەنایەو لەهەموو بوارێکەوە لە کارەکەیان بکۆڵیایەوەو جودا وازییان بکردایە لەنێوان هەڵوێستی ئیجتیهادی کە پاداشی لەسەرە، لەگەڵ لادانی فیکریو سلووکی: کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لێی دوورە پەرێز بوونو هەرگیز ئەو نەخۆشییەیان تێدا نەبووە.

سێیەم: دیارترین شتێك کە لە خەلافەتی حەزرەتی عومەردا تێبینی دەکرێ، ئەو تەعاونو هاریکارییەی نێوان حەزرەتی عومەرو ئیمامی عەلییە «رەزای خودایان لێ بێ». بێگومان ئیمامی عەلی راوێژکاری یەکەمی خەلیفە عومەر بوو، لە هەموو چورتمو قەضایاو مەشاکیلدا، هەروا راو پێشنیارێك ئیمامی عەلی بۆ حەزرەتی عومەری دەربڕیبێ، حەزرەتی عومەر هەوڵی داوە تەنفیذی بکا، کیفایەتە بۆ راستی ئەو حەقیقەتە قسەی حەزرەتی عومەر کە فەرمووی: «لولا علي هلك عمر».

ئیمامی عەلی بە دڵسۆزی رەهنومایی خەلیفە عومەری دەکرد لە هەموو کاروبارێکدا، ئەتو دیتت خەلیفە عومەر راوێژی بە ئیمامی عەلی کرد بۆئەوەی بۆ خۆی بە فەرماندەی سوپایەك بچێ بۆ شەڕ لەگەڵ فارسەکاندا، دەی ئیمامی عەلی ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەی خۆشەویستانەی بۆ دەربڕی. داوای لێ کرد بۆ خۆی نەچێ بۆ مەیدانی شەڕو لە شوێنی خۆی نەجولێ، شەڕەکە بە عەرەبەکان هەڵسوڕێنێ، ترساندی لەوەی ئەگەر بۆ خۆی بچێ بۆ جەبهەی شەڕ، لەوانەیە لەدوا ئەوەوە شتی وا پەیدابێ، کەلێنو کەلەبەری وا لە جەستەی وڵاتدا

پەیدابن زۆر لەوانە خەتەرو سامناکتربێ: کە بەرەو رویان دەچێ. ئایا تۆ پێت وایە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئیعلانی ئەوەی بکردایە کە خەلافەت لەدوا خۆی بۆ عەلی کوڕی ئەبو طالیبە. ئایا بۆ عەلی رەوا دەبوو فەرمانی پێغەمبەر ﷺ پاشگوێ بخا و پشتگیری ئەوانە بکا کە خەلافەتیان لێ داگیر کردووە؟ ئایا چاوەڕوان دەکرێ عەلی بەو شێوە دڵسۆزانە هاریکاری داگیرکەر بکا ئەوانەی مافی ئەویان پێشێل کردووە؟

یان بڵێ: ئایا هاوەڵان سەرجەم فەرمانی پێغەمبەریان پاشگوێ دەخست؟ ئایا دەگونجێ و تەصەور دەکرێ هاوەڵان هەموویان «لەپێش هەموشیانەوە عەلی کوڕی ئەبو طالیب» کوك بن لەسەر گوێ نەدان بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ؟.

**چوارەم:** هەر وەکوو چوون خەلافەتی حەزرەتی ئەبوبەکر لەکاتێکی وادابوو جگە لە حەزرەتی ئەبوبەکر کەسی تر بە کەڵکی خەلیفایەتی نەدەهات. هەروا خەلافەتی عومەر لەکاتێکدا بوو، جگە لەو کەسی تر نەیدەتوانی کارەکە ئاوا رابپەڕێنێ. بێگومان گرنگترین کار: کە حەزرەتی ئەبوبەکر ئەنجامیدا سەر لەنوێ دروستکردنەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، چەسپاندنی بوو لە دڵانا، دوای ئەو کێشەو نیزاعەی لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ سەریان هەڵداو پاشگەز بوونەوەی زۆر هۆزو خێڵی عەرەبی لێ کەوتەوە.

هەروا گرنگترین کارو فەرمان کە حەزرەتی عومەر ئەنجامی داو لە رۆژگاری ئەودا هاتنە دی، ئەو هەموو فوتوحاتە ئیسلامیە بوو کە ئەنجام دران تا ئەوپەڕی وڵاتی فارس و شام و مەغریب هەروا بنیاتنانی شارو شارۆچکەو سەربازخانەو دامەزراندنی فەرمانگەو دەواوینی دەوڵەت، زۆر بە لێهاتوویی بنەماو پایەکانی دەوڵەتی دامەزراندن و چەسپاندنی، گەیاندییە پلەیەك وەکوو گەورەترین و پێشکەوتوترین دەوڵەتی ئەو

ڕۆژگـارە لەسـەر زەوی. ئەمـە بـە ئاشـكرا دەلالـەت لەسـەر ئەو حیكمەتـە خوداییە دەكا كە هەمیشە ڕیعایەتی بەندەكانی پێ دەكاو هۆكاری خێرو سەعادەتیان بۆ دەستەبەر دەكا بـە تـاكو كۆمەڵیانـەوە. بـۆ ژیـانی تـاكو كۆمەڵگایان.

پێنجـەم: هـەمان ڕێبـازو ڕێو شـوێن: كـە گیرایـە بـەر بـۆ دامەزرانـدنی خەلافەتی حەزرەتی عومـەر، بۆ خەلافـەتی حـەزرەتی عوسمـانیش گیرایـە بەر، بێگومان عەهدو پـەیمانی موسـوڵمانانو ڕازی بوونیـان بـەوەی ببنـە خەلیفـە بـۆ هـەردوكیان هاتـەدی، وەلێ جـوداوازی نێوانیـان ئەوەیـە بـە نیسبەت حەزرەتی عومەرەوە ئەوەبوو خەلیفە ئەبوبەكر تـەنها حـەزرەتی عومەری بۆ موسوڵمانان دەست نیشان كرد تا عەهدو پـەیمانی پـێ بدەن بەلام حـەزرەتی عومـەر بـۆ دواخـۆی شـەش كەسـی دەسـت نیشـان كـردن عەهدی خەلافەتی دا بە یەكێك لەو شەش كەسە: كـە ئەهلی شـوڕا بـوون، موسـوڵمانانی سەرپـشك كـرد لـەوەی بـە ویـستی خۆیـان یـەكێكیان هەڵبژێرن.

ئەتۆ بینیـت هەڵبـژاردنی حـەزرەتی عوسمـان بەراوێـژ بـوو لـەناو ئـەو شەش كەسە خۆیاندا، پاشان بەراوێژو موبایەعـەی تێكـڕای موسـوڵمانان یـا ئـەهلی حیلـلو عەقـدیان هاتـەدی، یەكـەم كەسـیش كـە بەیعـەتی بـە حەزرەتی عوسمان كرد ئیمامی عەلی بوو.

كەوابوو ئێمـە دەتـوانین بڵێینو دڵنیـاش بین كـە موسـوڵمانان تـا ئـەم كاتـە، بـەڵكوو تـا كۆتـایی سـەردەمی خەلافـەتی حـەزرەتی عـەلیش هـەموویان یـەك كۆمـەڵو هەمئاهـەنگو هاریكـارو یـەك جەماعـەت بـوون، لەزەینی هیچ كام لە موسوڵماناندا ئیشكالو كێشەیەك نـەبووە لـە بـواری خەلافەتـدا یـان دەربـارەی ئـەوە ئـاخۆ كێیـان شیاوترە بۆ ئـەو مەنـصەبە جگە لەوەی كە بە سروشت كاری بوون بـە خەلیفە پێویستی بە ڕاوێژو

راپرسی و دانوسان هەبوەو موسوڵمانان وەکوو بەجێهێنانی فەرمانێکی ئایینی پەیڕەوی ئەو یاساو رێسایەیان کردووە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە بەڕێگە شەرعییەکەی خۆی: کە هەڵبژاردن بووە.

ئەتۆ چەندێك گوێت هەڵبخەی، نابینی کێشەو جەدەلێك یان حیوارو وت و وێژێك رویدابێ دەربارەی ئەوەی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ دوا وەفاتی پێغەمبەر جێنشینیان دیاری کردووە یان لێی بێدەنگ بوون. هەروا رەخنەو بەهەڵە دانان نابینی لەو رێ و شوێنەی هاوەڵان گرتیانە بەرو خەلیفەیان بۆ خۆیان پێ دامەزراند، چ بۆ خەلیفەی یەکەم یان دووەم یان خەلیفەی سێیەم حەزرەتی عوسمان ﷺ.

کەوابێ کەی و بە چ بیانوێك ئەم درزە گەورە لە قەڵای موسوڵمانانندا پەیدابوو؟ چ هۆکارێك هاتە کایەوە موسوڵمانانی واڵێ کرد «دوای ئەو یەکیەتی و تەباییەی لەناویاندا بەرجەستە بوو بوو لەسەردەمی هەرسێ خەلیفەکاندا» ببنە دوو کۆمەڵی لێك جیاو دژ بەیەك دەربارەی خەلافەت؟!

خودا یاربێ لە شوێنی موناسیبی خۆیدا، لەکاتی تەعلیقدان لەسەر خەلافەتی حەزرەتی عەلی و ئەو روداوانەی رویاندا کەمێك لەو بارەوە توێژینەوە دەکەین.

# خەلافەتی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەفان

لە ساڵی یەکەمی خەلافەتی عوسماندا «کە ڕێکەوتی ساڵی بیست‌و چواری کۆچییە»، وڵاتی «ألرّی» فەتح کرا، ئەم دەڤەرە لەوەپێش فەتح کرابوو، پاشان هەڵگەڕانەوەو عەهدو پەیمانی خۆیان شکاند، خەڵك لەو ساڵەدا تووشی لووت پڕژان بوون، یەکێ لەو تووش بوانەش حەزرەتی عوسمان خۆی بوو، تەنانەت بەهۆی ئەو خوێن بەربوونەوە حەزرەتی عوسمان ئەو ساڵە لە چوون بۆ حەج دواکەوت، هەر لەو ساڵەدا حەزرەتی عوسمان سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی کردە والی کوفەو «المغیرة»ی کوڕی شوعبەی عەزڵ کرد.

لە ساڵی بیست‌و پێنجی کۆچیدا، حەزرەتی عوسمان سەعدی لە والیەتی کوفە عەزڵ کرد «ألولید»ی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبو میعیەطی کردە والی لە جێگاکەی سەعد. شایانی باسە «ألولید»ی ناوبراو برای دایکی حەزرەتی عوسمان بوو، ئەم والی دانانەی، یەکەم کاری حەزرەتی عوسمانە کە تۆمەتبار کرا بەوەی خزم‌و کەس‌وکاری خۆی دەکاتە کاربەدەست‌و والی. لە ساڵی بیست‌و شەشەمی کۆچیدا حەزرەتی عوسمان لە مزگەوتی «ألحرام»ی زیادکردو فراوانی کرد. لە دەورووبەری مزگەوتەکە چەند پارچە زەوییەکی لە خاوەنەکانی کڕی‌و خستیە سەر مزگەوت. لە ساڵی بیست‌و حەوتی کۆچیدا معاویە قوبڕوصی فەتح کرد. سوپاکەی بەناو دەریادا برد، عوبادەی کوڕی «ألصامت»و خێزانەکەی «أم حرام»ی کچی میلحانی ئەنصاری لەگەڵدا بوون «أم حرام» لە وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە وەفاتی کردو لە قوبروص دفن کراوە. پێغەمبەر ﷺ هەواڵی چوونی ئەو سوپایەی ڕاگەیاندووەو دوعای بۆ خێزانی عوبادە کردووە: کە یەکێك بێ لەو سوپایە[١].

---

١ - تاریخ الخلفاء: ١٤٥ — البدایة والنهایة: ١٣٥/٧.

هەر لەو ساڵەدا حەزرەتی عوسمان عەمری کوڕی «العاص»ی لە والیەتی میصر عەزڵ کردو عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرحی خستە شوێنی، ئەم والییە غەزوی ئەفریقیای کردو بە دەشتایی و چیایەوە هەمووی فەتح کرد. هەر ئەو ساڵە ئەندەلوسیش رزگار کرا.

لە ساڵی بیست و نۆی کۆچیدا زۆر شارو شاروچکەو دەڤەر فەتح کران. هەر لەو ساڵەدا حەزرەتی عوسمان مزگەوتی مەدینەی پیرۆزی فراوان کردو لێی زیادکرد، دیوارەکانی بە بەردی نەخش کراو بنیات نان، کۆڵەکەو پایەی بە بەرد بۆ دروست کردن، سەقفەکەی بە ساج نەخشاند. درێژییەکەی کردە سەدو شەصت ذیراع و پانیەکەی سەدو پەنجا ذیراع.

لە ساڵی سی کۆچیدا زۆر وڵات و دەڤەرو شاری تر لە خاکی خوراسان فەتح کران، خەراج و داهاتی دەوڵەتی ئیسلامی بەهۆی ئەو فتوحاتە زۆرانە زۆری زیادکردو لەهەموو لایەکەوە ماڵ و سامان رژایە بەیتولمال و باخەڵی موسوڵمانانەوە، خودا هەرزانی خستە وڵاتەوەو لەهەموو ئاقارێك موسوڵمانان سامانیان زیادی کرد.

لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا «العباس»ی کوڕی «عبدالمطلب»و «عبدالرحمن»ی کوڕی عەوف و «عبدالله»ی کوڕی مەسعودو ئەبو دەرداء وەفاتیان کرد. ئەبو دەرداء قاضی وەڵاتی شام بوو. هەروا لەو ساڵەدا، ئەبو ذەڕ جوندوبی کوڕی جەنادە «الغفاری»و زەیدی کوڕی عەبدوڵلا وەفاتیان کرد، خودا لە هەموانیان خۆش بێ.

لە ساڵی سی و سێ دا عەبدوڵلای کوڕی ئەبو سەرح غەزوی وڵاتی حەبەشەی کرد.

**سیاسەتی حەزرەتی عوسمان دەربارەی هەڵبژاردنی والیو پارمەتیدەرانیو ئەو کێشەو نیزاعەی لەوە پەیدابوو:**

ئاشکرایە حەزرەتی عوسمان لە دامەزراندنی والیو کار بەدەستی دەوڵەت دا خزمو کەسی نزیکی خۆی هەڵدەبژاردن، تا بۆی بکرایە خزمەکانی لە بنەماڵەی بەنو ئومیە دادەمەزراندن، ئەمەش وایکرد ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە مەنصەبو بەر پرسیاریەتی عەزڵ بکاو خزمەکانی خۆی جێیان بگرنەوە، ئەم سیاسەتەی حەزرەتی عوثمان کێشەو نیزاعی زۆری بۆ نایەوەو خەڵکی لێی عاجز بوون، ئەمە وایکرد جولەکەی ناسراوو فیتنە جۆ، عەبدوڵلای کوڕی سەبەئو دارو دەستەکەی بیکەنە بنەماو قاعیدە بۆ بڵاوکردنەوەی هۆکاری فیتنەو خۆشکردنی ئاگری ئەو شەڕو خوێن ڕژانەی بە ناحەق ڕژا!! ئیبنو کەثیر ئەو روداوو هۆکارانەی باسکردونو پوختەکەی ئەمەیە: دەڵێ جەماوەرێکی بەرچاو شۆڕشیان لە سەعیدی کوڕی «ألعاص» ئەمیری کۆفە کردو لە دژی وەستان، شاندێکیان نارد بۆلای حەزرەتی عوسمان، موناقەشەی لەگەڵ بکا دەربارەی ئەو سیاسەتەی گرتویەتیە بەرو ئەو هەموو هاوەڵانەی پێغەمبەری لە فەرمانڕەوایيو کاربەدەستی عەزڵ کردووە، لە شوێنی ئەوان کەسانی خزمی خۆی لە بەنو ئومەیە داناوە. شاندەکە چوونە خزمەتیو قسەی توندو ناشیرینیان لەڕویدا کرد، ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو، لەسەر ئەمە بەدوای فەرماندە عەسکەرییەکانی ناردو لەلای خۆی کۆی کردنەوە بۆ راوێژو موشاوەرە، ئیتر معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان «ئەمیری شام»و عەمری کوڕی عاص «ئەمیری میصر»و عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح «ئەمیری مەغریب»و سەعیدی کوڕی «ألعاص» «ئەمیری کوفە»و عەبدوڵلای کوڕی عامیر «ئەمیری بەصرە» هەموویان گەڕانەوە بۆ مەدینەو چوونە

خزمەتی و راوێژی پێ کردن و دەربارەی روداوو دووبەرەکی و ناڕەزایی «کە بە زەقی دەبیندران و هەستیان پێ دەکرا». وت و وێژو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردن و هەریەکەیان راو بۆچوونی خۆی دەربڕی، سەرەنجام حەزرەتی عوسمان گەیشتە ئەو قەناعەتە کە هەموو فەرمانڕەواو والیەکانی لە شوێنی خۆیان بمێننەوەو کەس لە شوێنی خۆی نەجولێنی. دڵی ئەوانەش کە شۆڕشیان دژ بەرپا کردووەو لێی ناڕازین بە ماڵ و سامان رازی بکا، ناردنی بۆ غەزاو بۆ بەرەکانی جەنگ و فتوحات«[1]».

سەرەنجام لە میصر کۆمەڵێك لە کوڕی هاوەڵان کەوتنە ناڕەزایی دەربڕین و هەڵنانی خەڵك بۆ بەر پەرچدانەوەو دژایەتیکردنی سیاسەتەکانی حەزرەتی عوسمان و نارەزایی دەربڕین بەرامبەر زۆر لە کردارەکانی. ئەمەش دوای ئەوەی کە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئی جولەکە نەژاد، تۆوی فیتنەیی و فەسادی لەناودا چاندبوون، ئیتر نزیکەی شەش صەد سوار لە میصرەوە بە ناوی بەجێ هێنانی عومرە بەرەو مەدینە کەوتنە رێ، مەبەستیان بەرپاکردنی ئاژاوە بوو لەناو خودی مەدینەدا، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، حەزرەتی عوسمان فەرمانی بە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کرد پێش ئەوەی بگەنە ناو شار، بچێ بۆلایان و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکاو قەناعەتیان پێ بکا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. حەزرەتی عەلی چووە دەر بۆلایان لە «ألجحفة» کۆبوونەوەی پێ کردن، زۆر تورەو رق هەڵساو بوون و زۆر زێدە رۆییان دەکرد دەرحەقی حەزرەتی عوسمان، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء زۆری مێشك هاخنیبون و بە تەواوی پڕی کردبوون. زۆر بوختان و درۆی بۆ کردبون و حەزرەتی عوسمانی لەپێش چاویان تاوانبار کردبوو، چی گەندەڵی و خراپەو

---

١ - البداية والنهاية: ١٦٧/٧ وتاريخ الطبري: ٣٣٢/٤.

فەساد هەیە پاڵ حەزرەتی عوسمانی دابوو قەناعەتیشی بەوان کردبوو.
بەڵام حەزرەتی عەلی بەرپەرچی دانەوەو سەر زەنشتی کردن و جنێویشی پێدان، وای لێ کردن لە هەڵوێستیان پەشیمان ببنەوە، سەرەنجام گەڕانەوە بەبێ ئەوەی هیچیان دەست بکەوێ.

کاتێك حەزرەتی عەلی گەڕایەوە بۆ لای عوسمان و هەواڵی گەڕانەوەی شۆڕش گێڕە میصرییەکانی پێ ڕاگەیاندو گلەیی و گازەندەکانیانی بۆ باس کرد. ئەمجار پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کە وتارێك بۆ جەماوەر بداو عوزرو خواهیشتیان بۆ بێنێتەوە دەربارەی ئەوەی: کە هەندێ لە خزمەکانی دامەزراندون و پلەو پایەی دەوڵەتی پێداون و ئیعلانی ئەوەش بکا: کە ئیتر لەمەدوا کاری واناکاو لێی پەشیمانە.

حەزرەتی عوسمان راوێژو راسپاردەکانی ئیمامی عەلی قبوڵ کردن و لە وتاری رۆژوی هەینیدا عوزر خواهی بۆ جەماوەر هێنایەوە، لەهەندێ لە فەرمایشتەکانیدا وتی: «خودایە من داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و پەشیمانم لە کردەوە خراپەکانم. خودایە! من یەکەم تۆبە کارێکم و پەشیمانم لەوەی لەمنەوە رویداوە، ئەمجار کوڵی گریانی هەڵساو لە پڕمەی گریانیداو موسوڵمانانیش دەستیان کرد بە گریان، ئیتر سەر لەنوێ ئەوەی بۆ دووبارە کردنەوەو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە وازدێنێ لەو هەڵوێست و کردەوانەی بوونەتە جێگای ناڕەزامەندی خەڵکی و جارێکی تر پەیڕەویان ناکاتەوە. هەروا وادەی بە موسوڵماناندا: کە مەڕوان و خزم و کەس و کاری لەبەر پرسیاریەتی دوور بخاتەوەو عەزڵیان بکا. بەڵام مەڕوانی کوڕی حەکەم دوایی چووە لای حەزرەتی عوثمان، سەرزەنشتی کرد، دژایەتی و ناڕەزامەندی خۆی ئاڕاستەی حەزرەتی عوسمان کردو پێی گوت: پێم خۆش بوو ئەو وتارەت لە حاڵ و کاتێکدا بویایە بتوانیایە پارێزگاری لەخۆت بکەی و

کەسانی دیش بپارێزی. ئەوکاتە من یەکەم کەس دەبووم بە ناوەڕۆکی وتارەکەت رازی دەبوم و یارمەتیم دەدای لەسەر جێ بەجێ کردنی، بەڵام تۆ کاتێ ئەم قسانەت کردن کار لەکار ترازا، سوێندم بەخودا، بەردەوامبون لەسەر هەڵەو داوای لێ خۆشبوون لێی، زۆر باشترە لەوەی لە ترسان تۆبە لە هەڵە بکەی. ئەتۆ ئەگەر حەزت لێ بوایە عەزمت لەسەر تۆبەکردن دەبوو دانت نەدەنا بە هەڵەی ئێمە دا!!.

پاشان مەڕوان خەبەری بە حەزرەتی عوسمان دا: کە لەبەردەرگا کۆمەڵێك خەڵك خڕبوونەوە. حەزرەتی عوسمان رایسپارد بچێ قسەیان لەگەڵ بکاو بڵاوەیان پێ بکا. مەڕوان چووە دەر، لەجیاتی قسەی باش قسەی ناشیرینی پێ گوتن، ئەوەی: کە لەوەپێش حەزرەتی عوسمان بە وتارەکەی دڵی جەماوەرەکەی چاك کردبووەوە مەڕوان بەوتە ناشیرینەکانی تێکی دایەوەو، هەندێ لە قسەکانی ئەوەبوو پێی گوتن: ئەوە چییە دەتانەوێ دەسەڵاتو فەرمانڕەواییمان لەدەست دەربێنن؟ بەرۆکمان بەربدەنو لێمان دوور بکەونەوە، ئەگینا سوێندمان بەخودا ئەگەر نیازی خراپتان هەبێ، ئەوە دەکەونە حاڵەتێکەوە سەرەنجامەکەی باش نابێ بۆتانو خۆتان پەشیمان دەبنەوە.

کاتێك حەزرەتی عەلی بەم کەینو بەینەی زانی، بەرق هەڵساویو تووڕەیی هاتو چووە لای حەزرەتی عوسمانو پێی گوت: ئەوە تۆ لە مەڕوان رازی نابیو ئەویش لەتۆ رازی نابێ تا عەقڵو ئایینت لەدەست نەدەی. سوێندم بەخودا مەڕوان بۆ ئەوە ناشێ رای هەبێ لەبارەی ئایینی خۆیو گیانی خۆی! بەخودا قەسەم من وای دەبینم مەڕوان دەتبا بۆ شوێنێك بەڵام دوایی ناتهێنێتەوە، ئیتر لە ئێستا بەولاوە من جارێکی تر نایەمەوە بۆئەوەی رەخنەت لێ بگرمو یارمەتیت بدەم. کە ئیمامی عەلی رۆیشت، خاتو نائیلە چووە لای حەزرەتی عوسمان «نائیلە

گوێی لە قسەکانی ئیمامی عەلی بوو» عەرزی کرد: ئەرێ قسە بکەم یان بێدەنگ بم؟ فەرمووی: بڵێ، قسە بکە. وتی: گوێم لێ بوو عەلی بڕیاریدا جارێکی دیکە نەیەتەوە بۆلات، مەڕوان چی پێ گوتی بەقسەت کرد. عوسمان وتی: دەتۆ پێم بڵێ چی بکەم؟ وتی: بەتەنیا خودا بپەرستەو شوێن ڕێبازی دوو جێنشینەکانی پێش خۆت بکەوەو وەکوو ئەوان رەفتار بکە. ئەتۆ هەرکاتێ بەگوێی مەڕوان بکەی بەکوشتت دەدا، مەڕوان لای خودا هیچ ڕێزو قەدرو خۆشەویستی نیە. بنێرە بۆلای عەلیو ئاشتی بکەرەوە، خزمایەتی لەگەڵ تۆ هەیەو لێت یاخی نابێ. حەزرەتی عوسمان ناردی بەدوو عەلیدا، ئیمامی عەلی نەهات، وتی: من پێم گوتووە جارێکی تر نایەمەوە بۆلای.

ئەم هەڵوێستە سەرەتای ئەو گرێو گرژیانە بوو: کە بووە هۆی ئەوەی ئاگری فیتنەکە خۆش ببێ. بۆ چڵکاو خۆرو هەلپەرستان ڕێگا ئاچۆخ بێ بۆ فیتنە گێڕیو گەییشتن بە ئامانجی پیسی خۆیان.

## سەرەتای فیتنەو کوشتنی حەزرەتی عوسمان:

حەزرەتی عوسمان دوانزە ساڵ خەلافەتی کرد، کەس رقی لێ نەبوو، کەس گلەیی لێ نەکرد، بەڵکوو لای زوربەی قوڕەیشییەکان لە عومەری کوڕی خەتتاب خۆشەویست تر بوو، چونکە عومەر لەگەڵیان توند بوو بەڵام عوسمان نەرمو نیان بوو .... وەلێ کاتێك کەوتە دانانی خزمەکانی لە پلەو پایەی دەوڵەتدا «وەکوو لەوەپێش گوتمان» لێی کەوتنە گلەییو گازندە، حەزرەتی عوسمان لەوەدا بیانووی ئەوەبوو صیلەی رەحم رەچاو دەکاو خودا فەرمانی کردووە بە بەرچاو گرتنیو نەپچڕاندنی. سەرەنجام کوشتنی حەزرەتی عوسمانی لێ کەوتەوە.

ئیبنو عەساکیر لە «الزهری»یەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێ: بە سەعیدی کوڕی «المسیب»م گوت: ئەوە پێم ناڵێی حەزرەتی عوسمان چۆن شەهید کرا؟ ئەوە هۆکارەکانی چی بون و بۆچی کوژرا؟ لە وەڵامدا سەعید فەرمووی: حەزرەتی عوسمان بە ناحەق شەهید کرا. ئەوەی شەهیدی کرد ستەمکار بوو، ئەوانەی یارمەتییان نەداو پشتیان نەگرت و پارێزگارییان لێ نەکرد عوزریان هەبوو، ئەمجار سەعیدی کوڕی «المسیب» سەر گوزشتەی کوژرانەکەی بۆ «الزهری» گێڕایەوە و هۆکاری کوشتنەکەی و چۆنیەتییەکەی بۆ روون کردەوە. ئێمە لێرەدا بە کورتی ئاماژەی پێ دەکەین.

ئەهلی میصر هاتن بۆلای عوسمان شکاتیان لە کوڕی ئەبو سەرح کرد، حەزرەتی عوسمان نامەیەکی بۆ نووسی و ئامۆژگاری کردو هەڕەشەی لێ کرد، بەڵام کوڕی ئەبو سەرح بەگوێی نەکردو سزای ئەوانەشی دا کە چوو بوون شکاتیان لێ کردبوو!! پاشان کۆمەڵێك لە گەورە گەورەی هاوەڵان، وەکوو عەلی و طەلحەو عائیشە پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە کوڕی ئەبو سەرح عەزڵ بکاو یەکێکی تر بکاتە والی میصر، حەزرەتی عوسمان فەرمووی: دە یەکێکم بۆ دیاری بکەن بیخەمە جێگای کوڕی ئەبو سەرح، خەڵکەکە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکریان دەست نیشان کرد، حەزرەتی عوسمان فەرمانێکی بەو عەزڵ و دانانە دەرکردو موحەممەدی کردە والی میصر، لەگەڵ موحەممەد کۆمەڵێك لە یاریدەدەرو موهاجیرین رۆیشتن بۆ میصر بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانە، سێ رۆژە رێ لە مەدینە دوور کەوتبونەوە، روانییان وا غولامێکی رەش پێست بە سواری حوشترێك دێ و حوشترەکەی تاوداوەو دەیەوێ خێرا بڕوا، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ رایان گرت و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵیا و وتیان: بۆ کوێ دەچی و ئیشت چیە؟ هەڵاتوی

یان شوێن هەڵاتو کەوتویت؟ وتی من نۆکەری خەلیفەی موسوڵمانانم ناردومی بۆلای والیو کار بەدەستەکەی لە میصر، کە پێی گوترا: تۆ غولامی کێی؟ زمانی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو، دەمێ دەیگوت غولامی خەلیفەی موسوڵمانانمو دەمێ دەیگوت غولامی مەڕوانم. پاشان شتو مەکەکانیان پشکنین نووسراوێکیان دۆزییەوە. موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر، هاوەڵەکانی کۆکردنەوە لە ئەنصارو موهاجیرو کەسانی تریش، دوایی نامەکەیان کردەوە بە ئاگاداری هەموویان، روانییان تێیدا نووسرا بوو، ئەگەر موحەممەدو فلانو فلان هاتن پیلانێك رێکبخە بۆ کوشتنیانو نووسراوەکەی هەڵوەشێنەوەو لەسەر کاری خۆت بەردەوام بە تا رەئیی منت پێ دەگاو تەوجیهاتت دەدەمێ، هەرکەسێکیش دێ بۆلای من شکاتت لێ بکا بەندی بکە، بیخەرە کونە رەشی بەندیخانەوە.

ئیتر ئەو هاوەڵانە بە نووسراوەکەوە گەڕانەوە بۆ مەدینەو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیان کرکردنەوەو نامەکەیان نیشانداندو سەر گوزشتەی نۆکەرە نامە پێ گیراوەکەیان بۆ گێڕانەوە، ئیتر کەس نەما لە مەدینەدا رقی لە حەزرەتی عوسمان نەبێ.......

کە حەزرەتی عەلی بەو حاڵو وەزعەی زانی هەندێ لە گەورە هاوەڵە بەدرییەکانی بانگ کردو لە گەڵیان کۆبۆوە لە نێویاندا طەلحەو زوبەیرو سەعدو عەممار هەبوون. ئەمجار بە کۆمەڵو بە کاغەزەکەوە چوون بۆلای حەزرەتی عوثمانو غولامەکەشیان بە حوشترەکەیەوە لەگەڵ خۆیان برد، حەزرەتی عەلی بە خەلیفەی گوت، ئەم نۆکەرە نۆکەری تۆیە؟ وتی: بەڵێ، ئەمجار ئەی ئەم حوشترە حوشتری تۆیە؟ وتی: بەڵێ. وتی ئەم نامە جەنابت نوسیووتە؟ وتی نەخەیر سوێندم بەخودا من ئەم نووسراوەم نەنوسیوەو ئاگاشم لێ نیەو فەرمانیشم بە نوسینی نامەی وانەکردووە. ئەمجار عەلی پێی گوت: ئەم مۆرە مۆری تۆیە؟ وتی: بەڵێ. ئەمجار

ئیمامی عەلی پێی گوت: چۆن دەبێ غولامی تۆ سواری حوشتری تۆ بێ و نامەی مۆرکراو بە مۆری تۆی پێ بێ بڕوا بۆلای عامیلی تۆ، تۆ ئاگات لێ نەبێ؟! حەزرەتی عوسمان سوێندی گەورەی خواردو وتی وەڵڵاهی ئەم نۆکەرە من نەم ناردووە بۆ میصر. دوایی سەیری نامەکەیان کردو زانییان دەستخەتی مەڕوانە داوایان لێ کرد مەڕوانیان تەسلیم بکا، ئیمامی عوثمان بەوە رازی نەبوو، لەو کاتەشدا مەڕوان لەماڵی حەزرەتی عوسماندا بوو، ئیتر بەرق هەڵساوی لەلای عوسمان هاتنە دەر، لەوەش دڵنیا بوون: کە ئیمامی عوسمان سوێندی بەدرۆ ناخوا، بەڵام بەوە رقیان هەڵسابوو: کە حەزرەتی عوثمان ئامادە نەبوو بۆئەوەی مەڕوانیان تەسلیم بکا.

ئەم هەواڵانە بەناو مەدینەدا بڵاوبوونەوەو خەڵك لەهەموو لایەکەوە رویان کردە خانووی عوسمان و گەمارۆیانداو ئاویان لێ قەدەغە کردو نەیان هێشت ئاو ببرێ بۆ ناو ماڵی حەزرەتی عوسمان، کە تینوایەتی تینی بۆ هێنان حەزرەتی عوسمان لەسەر دیوارەوە روی کردە خەڵکە گەمارۆ دەرەکەو فەرمووی: ئایا یەکێك لە ئێوە ویژدانی ئەوەندە زیندووە هەواڵ بەرێ بۆ عەلی کوڕی ئەبو طالیب و ئاوی خواردنەوەمان فریابخا؟

هەواڵەکە بە ئیمامی عەلی گەیی سێ کوندە ئاوی پڕی بۆ ناردن زۆر بە ناڕەحەتی تواندرا ئاوەکە ئاودیوی ناو ماڵ بکەن. ئەمجار هەواڵی ئەوە بە ئیمامی عەلی گەیشت: کە لەناو ئەو جەماوەرە گەمارۆ دەرەدا کەسانێك هەن دەیانەوێ ئیمامی عوسمان بکوژن، فەرمووی: ئێمە داوامان لێ کردووە مەڕوانمان رادەست بکا، بەڵام هەرگیز کوژرانی حەزرەتی عوسمانمان ناوێ ئەمجار حەسەن و حوسەینی ناردن بۆ ماڵی عوسمان و پێی فەرموون: بە شمشێرەکانتانەوە بڕۆن بۆ بەردەرگای ماڵی

عوسمان و مەهێڵن کەس بچێتە ژورەوە بۆلای. هەندێکی تریش لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەوتنە خۆ بۆ پارێزگاری کردن لە حەزرەتی عوسمان، غەوغاو ژاوە ژاو لە دەرگای ماڵی حەزرەتی عوسمان پەرەی سەندو دەیانەویست دەستیان بیگاتێ و شەهیدی بکەن. حەسەن و حوسەین و هاوەڵانی هاوکارییان بەرگرییان لێ دەکرد، ئالەوکاتەدا کۆمەڵێك لە فیتنە خوازو داخ لەدڵ بەسەر دیواردا خۆیان هەڵدایە سەربان و لەوێوە بۆی دابەزینە ناو ماڵەوەو بە شمشێرەکانیان پرکێشیان کردێ و شەهیدیان کرد. هەواڵی شەهیدبوونی خەلیفە بە حەزرەتی عەلی گەیشت، بەهەڵە داوان و بەرق هەڵساوی هات، بە تورەیی و بە پەرۆشەوە روی کردە کورەکانی و وتی چۆن دەبێ ئێوە لێرەبن و پارێزگاری لە خەلیفە بکەن کەچی خەلیفە بکوژرێ؟! دەستی بەرزکردەوە شەبلاغەیەکی لە حەسەنی کوری داو مستە کۆڵەیەکی ئاراستەی حوسەین کرد قسەی ناخۆشی بە موحەممەدی کوری طەلحەو عەبدوڵلای کوری «الزبیر» وتن.

ئابەوجۆرە کوژرانی حەزرەتی عوسمان دەرگایەك بوو کرایەوە بۆ زنجیرەیەك لە فیتنەو ئاشوب کە حەلەقەو روداوەکانی کۆتاییان نەهات.

## بەیعەتکردن بە حەزرەتی عەلی و گەڕان بەدوا بکوژانی عوسماندا:

حەزرەتی عەلی بە رق هەڵساوی لەماڵی حەزرەتی عوسمان دەرچوو زۆری ئەو روداوە پێ ناخۆش بوو، بەلایەوە کارەسات بوو، خەڵك لێی کۆبوونەوەو خەڵکی تریش بە هەڵە داوان بۆلای دەهاتن و دەیانگوت چی زووە دەبێ خەلیفە دابندرێ، کەسێکمان بۆ دیاریی بکەن بەیعەتی پێ بکەین، حەزرەتی عەلی پێی فەرموون: ئەوە ئیشی ئێوە نیە، ئەوە پەیوەندی بە ئەصحابی بەدرەوە هەیە. هەرکەسێك بەشدار بووانی

غەزای بەدر پێی رازی بن ئەوە دەبێتە خەلیفەی موسوڵمانان. ئیتر کەس نەما لە ئەهلی بەدر ئیللا هاتە لای عەلی و پێیان گوت: کەس لەتۆ شیاوتر نیە بۆ خەلافەت، دەستت بێنە بەیعەتت پێ بکەین، هەموویان بەیعەتیان پێ کرد.

تاکار بۆ حەزرەتی عەلی رەخساو ئەمن و ئاسایش دامەزراو خەڵك بەیعەتی پێدا. مەروان و کورەکەی هەلاتن، حەزرەتی عەلی هات بۆلای خێزانی حەزرەتی عوسمان و پرسیاری لێ کرد دەربارەی بکوژانی عثمان، کێ بون و چۆن بوون و چۆنیان ئەو کارو تاوانە گەورەیە ئەنجامدا؟ وتی: نازانم دوو پیاو لەنکاو وەژوور کەوتن نایان ناسم، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکریان لە تەکدا بوو، حەزرەتی عەلی بانگی موحەممەدی کردو دەربارەی قسەکانی خێزانی حەزرەتی عوسمان پرسیاری لێ کرد، موحەممەد وتی: وەڵڵا خێزانی عوسمان راستی کردووە من چوومە ژوورەوەو دەمەویست بیکوژم. باوکمی بیر هێنامەوەو کشامەوە من تۆبە دەکەم بۆ لای خوداو داوای لێ خۆشبوون دەکەم، سوێندم بەخودا من نەم کوشتووە، پەلامارم نەداوەو نەم گرتووە. خێزانی عوسمان وتی: راست دەکا ئەو بکوژ نیە، بەڵام ئەو لەگەڵ بکوژەکان بوو ئەو هێنانیە ژوورەوە.

ئیبنو عەساکیر لە کەنانەوە «مەولای صفیەو هی تریش» ریوایەتی کردووە دەڵێ: وتوویانە: پیاوێکی چاو شینی شلە لە خەڵکی میصر حەزرەتی عوسمانی کوشت.

دووبارە ئیبنو عەساکیر لە ئەبو ثەوری «الفهمی»یەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێ: چومە لای حەزرەتی عوسمان لەوکاتەدا: کە دەورەی ماڵەکەی درابوو، فەرمووی: من لای خودای خۆم دە رەوشتی بەرزو سەروەریم پەزمەندە کردووە، من چوارەم فەرمانڕەوای موسوڵمانانم،

جەیشی عوسرەم ئامادە کرد. پێغەمبەر ﷺ کچی خۆی لێ مارە کردم، پاشان کە ئەو وەفاتی کرد کچێکی تری لێ مارە کردم، قەت گۆرانیم نەگوتووە. قەت درۆم نەکردووە، هەرگیز دەستی راستم نەخستۆتە سەر عەورەتی خۆم لەوەتای بەو دەستە بەیعەتم لەگەڵ پێغەمبەر کردووەو ئەو دەستەم خستۆتە ناو دەستییەوە. لەوەتای موسوڵمان بووم هەموو حەفتەیەك کۆیلەیەکم ئازاد کردوە، نە لەسەردەمی جاهیلی داو نە لەسەردەمی موسوڵمانیمدا زینام نەکردووە، نە لەپێش موسوڵمان بوونمداو نە لەدوا موسوڵمان بوونم دزیم نەکردووە، لەسەردەمی پێغەمبەریشدا قورئانم کۆکردەوە.

ئەوەی راستو چەسپاوە کوژرانی عوسمانی لە ناوەڕاستی «أیام التشریق» = سێ رۆژەی دوا جەژنی قوربان ساڵی سی و پێنجی کۆچی رویداوە.

## پەندو ئامۆژگاری:

یەکەم: گرنگترین فەضائیلو سەروەریی: کە سەردەمی حەزرەتی عوسمانیان پێ رازابوەوە، فتوحاتی زۆرو بەرفراوانی فتوحاتەکانە، ئەوەبوو لەسەردەمی ئەم خەلیفە بەرێزەدا هەموو وڵاتی خوراسانو ئەفریقیا فەتح کران، فەتحی ئیسلامی گەیشتە ئەندەلووس، ئەمە وێڕای کردەوەی گەورەو ئیشی باش کە حەزرەتی عوسمان پێیان هەڵساو ئەنجامی دان، وەکوو کۆکردنەوەی خەڵك لەسەر یەك شێوە رەسمی موصحەفو بەدیکۆمێتکردنی، دوای دیاردەی عوجمەیی و نا فەصاحەتی لەسەر زمانی قورئان خوێنەکان دەرکەوتو ترس لەوە پەیدابوو قورئان بەواسیتەی ئەم زمان خوارییە شێوەی رەوانیی و رەوانبێژی خۆی لەدەست بدا. یەکێکی تر لە شاکارەکان خەلیفەی زوڵم لێکراوو بەناحەق کوژراو فراوانکردنی مزگەوتی مەدینە بوو.

ئەوەش نابێتە جێگای لەککەو عەیبە: کە عوسمان لە زۆر فتوحاتدا پشتی بەستووە بە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح و وێنەو ئەمثالی ئەو، چونکە ئیسلام پێش خۆی دادەبڕێ و خراپەی پێش موسوڵمان بوون زیان بە کردەوەو هەڵوێستی دوا موسوڵمان بوون ناگەیەنێ. بەڵکوو کوڕی ئەبو سەرح بەم سەرکەوتن و فتوحاتە بەرچاوانەی کەفارەتی تاوانی پێش موسوڵمان بوونی دابێ. ئەوەی زانراوو مەعلومە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەرح لەوەدوا پیاوێکی راستاڵ و دینداری هەرە باشی لێ دەرچوو.

**دووەم:** چەندێك رەخنە ئاڕاستەی حەزرەتی عوسمان بکرێ، بەهۆی ئەوەی کە خزمەکانی هەڵدەبژاردن بۆ پڕکردنەوەی پۆستە گرنگەکانی دەوڵەت، هەمیشە سیاسەتی وابوو زۆرینەی والی و کار بەدەستەکانی دەوڵەت لە خزمەکانی خۆی بن لە بەنو ئومەییە، دەبێ ئەوە بزانین: کە ئەو بڕیارو هەڵوێستانەی حەزرەتی عوثمان هەمووی لە روی ئیجتیهادەوە بووە، حەزرەتی عوثمان زۆر بە سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆی بەرگری لەخۆی کردو، لەبەردەم کۆمەڵێك لە هاوەڵان دیفاعی شێلگیرانەی لەخۆی کرد. جا هەڵوێستی ئێمە لە بەرامبەر راو بۆچوون و ئیجتیهادەکانی هەرچۆنێك بێ، نابێ ئێمە رەخنەی ئاڕاستە بکەین یان خوا نەخواستە بێ ئەدەبی بەرامبەر بنوێنین، نابێ لە فەرزی ئەوەدا ئەگەر بە هەڵەشی بزانین. پلەو پایەی بەرزی ئەو لای پێغەمبەر ﷺ لەیاد بکەین. نابێ ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە ئەو زاتە چەند لای پێغەمبەر خۆشەویست و رێزدار بوو، چەند رۆڵی جوانمێرانەی گێڕاوە لە خزمەتی ئیسلام، نابێ ئەو فەرموودەی پێغەمبەرمان لەبیر بچێ کە لەرۆژی تەبوکدا دەربارەی ئەو «ما ضرّ عثمان ما صنع بعد اليوم».

دەبێ ئەوە بزانین موناقەشەی هاوەڵان لەگەڵیداو ئاراستەکردنی رەخنەو گلەیی بۆی، لەلایەن هاوەڵانەوە دەربارەی هەڵوێستو بڕیارەکانی شتێکەو کاوێژ کردنەوەی ئەو رەخنانە لەلایەن ئێمەوە بە مەبەستی رەخنە لێ گرتنو کەم کردنەوە لە شانی ئەو زاتە، شتێکی ترە.

رەخنە گرتنی هاوەڵان لە حەزرەتی عوثمان موعالەجەو هەوڵدان بووە بۆ کارێك مومکین بووە گۆڕانکاری تێدا بکرێو چاکسازی تێدا بێتە دی. باسو لێکۆڵینەوەی هاوەڵان هەرچەندە لەسەر بنەمای رەخنەو بە هەڵە دانان بوو بۆ ئەو کاتە کارێکی بەسودو ئەرێنی بوو، وەلێ باسکردنی ئێمە دەربارەی ئەو روداوانە کەچوونە دەریای مێژووەوەو تێپەڕیون چ سودێکی نیە جگە لەدەم درێژی کردن بەرامبەر هاوەڵانو وتەی هەرزان بەها دەربارەیان هیچی تر نیە، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وەسفو ثەنای کردونو موسوڵمانانی لەوە ئاگادار کردۆتەوە: کە خراپەیان بەرامبەر بکرێ، بەتایبەتی خولەفای راشیدین.

کیفایەتە بۆ کەسێك دەیەوێ ئەمانەتی زانستی پەیڕەو بکا لە ریوایەتکردنی روداوەکانیدا، سنوورشکێنی نەکاو لەو ئاستە رابوەستێ: کە نووسەرو مێژوو نووسی بڕوا پێکراو لە نموونەی طەبەریو ئیبنو کەثیرو ئیبنولئەثیر پەیڕەویان کردووە.

سێیەم: لەگەڵ پەیدابوونی سەرەتای فیتنەو ئاشوب: کە لە کۆتایی سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عوسماندا هاتنە دی ناوی عەبدوڵلای کوڕی «سبأ» لەسەر شانۆی روداوەکان دەردەکەوێو رۆڵی نەرێنیو فیتنە جۆییو خراپەکاری ئاشکراو عەیانە.

عەبدوڵلای کوڕی «سبأ» لە بنەڕەتا جولەکە بووە لەسەردەمی عوثماندا لە یەمەنەوە هاتووە بۆ میصر، دەستی کرد بەخڕ هەڵدانی خەڵكو راپەڕاندنیان دژی حەزرەتی عوسمان، بەڕواڵەت خۆی وانیشان

دەدا کە حوببی عەلی و ئال و بەیتی هەیە، هەندێ لەو قسانەی کە دەیپڕماندن دەیگوت: ئایا موحەممەد لە عیسا گەورەتر نیە؟ دەی: کە موحەممەد گەورەتر بێ، دەبێ موحەممەد شیاوتربێ بە گەڕانەوە بۆلای خەڵك باش مردنی، جا کە موحەممەد دەگەڕێتەوە لە کەسایەتی و شێوەی عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا دەگەڕێتەوە بۆ لایان، چونکە عەلی نزیکترین کەسە بە پێغەمبەر ﷺ «١».

عەبدوڵڵای کوڕی «سبأ» توانی بە فرت و فێڵ و چاو بەست، چەند کەسێك لە میصردا هەڵبخەڵەتێنێ. دوایی لە یەمەن ئەم پڕو پاگەندەو دەجەل و فرت و فێڵەی بەکارهێنابوو، بەڵام کەس بەرەو پیری نەهاتبوو بۆی هەڵنەخەڵەتابوو. ئەو میصرییانەی بە قسەکانی هەڵخەڵەتابوون ئەوانە بوون: کە رویان کردە مەدینە بۆئەوەی شۆڕش دژی عوثمان بەرپا بکەن. بەڵام ئەوانە پێش ئەوەی بگەنە ناو مەدینە حەزرەتی عەلی قەناعەتی پێ کردن بەوەی بگەڕێنەوە، وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان پێ کرد.

لێرەوە دەزانی کە لەدایکبوونی دوولەتبوونی موسوڵمانان بۆ دوو بەشی گەورەو بەربلاو «سوننی و شیعی» لەم سەرو بەندەدا دەستی پێکرد، بە هەوڵ و کۆششی عەبدوڵڵای کوڕی «سبأ» هاتەدی. ئەمە بەدەر لە تێڕوانین و بەرچاو گرتنی ئەو هەموو ئەزیەت و ستەمەی لە ئال و بەیتی پێغەمبەر ﷺ یان لە شیعەو هەوا دارانی ئال و بەیت لەوەدوا لەسەر ئەمەوییەکان بەرامبەریان کرا. گرنگ ئەوەیە هەریەك لەم دوو روداوە دڵتەزێنانەی چوونە ناو ئەلف و بێی مێژووەوە واقیعەی ترمان لەبیر نەباتەوە.

---

١ - البداية والنهاية ج ١٦٧/٧.

**چوارەم:** جارێکی تر پێویستە ئێمە حەقیقەتو کرۆکی پەیوەندی نێوان حەزرەتی عوسمانو ئیمامی عەلی لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا بزانین. حەقیقەتی هەڵوێستی ئیمامی عەلی بەرامبەر خەلیفە عوثمان بێنینە بەر چاومانو دەرکی بکەین.

ئەوەبوو ئێمە دیمان حەزرەتی عەلی لەگەڵ هەڵبژاردنی حەزرەتی عوسمان پەلەی کرد بۆ بەیعەت پێکردنی، بەڵکوو زۆر لە مێژوو نووسان پێیان وایە عەلی یەکەم کەس بووە کە بەیعەتی پێ کردووە، ئەمجار تۆ ئەوشت زانی چۆن لەو کاتەدا کە میصرییەکان بە فیتی عەبدوڵلای کوڕی «سبأ» بەرەو مەدینە دەهاتنو ئەم هەواڵە گەیشتە مەدینە دیمان چۆن عەلی بە عوثمانی گوت ئەمن لە عودەیان دێمو ناهێڵم هیچ روبدا، ئەمجار بەرەو رویان چو تا لە «ألجحفة» پێیان گەییو لێیان تورە بوو، هەڕەشەی لێ کردنو گێڕانیەوە پەشیمانی کردنەوە لە هەڵوێستیان، بەجۆرێك بۆ خۆیان سەر زەنشتی خۆیان دەکردو دەیانگوت: ئائەو زاتە بەرێزەیە ئێمە دژی وەستاوینو هاتوین شۆڕشی لێ بکەین؟!؟«١».

هەروا بینیت چۆن ئیمامی عەلی دۆستانەو دڵسۆزانە ئامۆژگاری حەزرەتی عوسمانی کرد بۆ حەلکردنی کێشەکە، هەروا دیتت چۆن حەسەنو حوسەینی کوڕی ناردن بۆئەوەی بەرگری لە حەزرەتی عوسمان بکەنو نەهێڵن ئاژاوە گێڕان فرسەتی لێ بێنن.

کەوابوو حەزرەتی عەلی باشترین پاڵپشتو یارمەتیدەری خەلیفە عوسمان بوو لەهەموو ماوەی خەلافەتیدا. باشترین یارمەتیدەرو بەهاناوە هاتووی بوو لەکاتی تەنگژەو میحنەتیدا کە لە کۆتاییش دا کەمێ لێی عاجز بوو، لەبەر زۆر خۆشەویستیو لسۆزی بوو بۆی.

---

١ - البداية والنهاية: ٧/١٧١.

پێویستە تۆ ئەوە باش بزانی: کە پیاوێکی گەورەی وەکوو ئیمامی عەلی، پێویستە گلێنەی چاوی هەموو موسوڵمانێك بێ، هەروا پێویستە شوێنی ئیمامی عەلی لە دڵی هەموو مرۆڤێکی خاوەن هەستو شعوردابێ. بەڵگەی خۆشویستن، شوێنکەوتنو پەیڕەوکردنی ڕێبازی ئەو کەسەیە: کە خۆشت دەوێو بەردەوامبوونە لەسەر شوێنکەوتنی، بێگومان ئەوە سیرەو هەڵوێستی ئیمای عەلی بوو لەگەڵ هەرسێ خەلیفەکانی پێش خۆی. دەی با سیرەو هەڵسو کەوتی ئەو زاتە سەر مەشق بێ بۆ ئێمەو بەرونی ڕەنگدانەوەی خۆشەویستی ئێمە بێ بۆ ئەو.

## خەلافەتی عەلی رضي الله عنه

لە ناوەڕاستی مانگی ذیلحیجەی ساڵی سیو سیی کۆچیدا لە ئێوارەی ڕۆژی شەهیدبوونی عوثماندا، بەیعەت بە ئیمامی عەلی کرا. کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە بەیعەت کردن پێی دواکەوتن، لەوانە سەعدی کوڕی وەقاصو ئوسامەی کوڕی زەیدو «ألمغيرة»ی کوڕی شوعبەو «ألنعمان»ی کوڕی بەشیرو حەسسانی کوڕی ثابیت بوون. بێگومان ڕۆژگاری خەلافەتی عەلی زنجیرەیەکی نەپساوەی فیتنەو شەڕو هەرابوو، لەهەموو ئاقارێکی جیهانی ئیسلامیدا ئاژاوەو ناسەقام گیری بوو، سەرەتای زنجیرەی شەڕەکان بە «حەربی جەمەل» دەستی پێکرد، دوا بەدوای ئەوە شەڕی «ألصفين» رویدا، ئەمجار کێشەو نیزاعی نێوان حەزرەتی عەلیو معاويه: کە زوربەی جەماوەری موسوڵمانان لایەنگری حەزرەتی عەلی بوون، ئەمجار بەشوێن ئەو شەڕە برا کوژییەدا فیتنەو ئاشوبی خەواریجەکان بەرپابوو: کە بە شەهیدبوونی حەزرەتی عەلی کۆتایی هات. ئێمە لێرە بەدواوە بە کورتی باسی ئەو روداوانە دەکەین.

## تۆڵە سەندنەوە لە بکوژەکانی عوسمان و روودانی شەڕی جەمەل:

ئەوەی گومانی تێدا نیە عوسمان بەدەستی تاقمێکی باغی و لەڕێ دەرچوو شەهید بوو، دەستێکی جولەکەش لەپشت ئەو تاوانبارانەوە هەبوو، پیلانەکە جولەکە دایڕشتبوو بەدەستی کەسانی بەناو موسوڵمان ئەنجام درا.

بێگومان شتێکی ئاسایی بوو کە بکوژە تاوانبارەکان سزای تاوانەکەیان لێ بسەندرێ. پەلکێشی بەردەم دادگای شەرعی و دەسەڵاتی تۆڵە لێ ستاندنەوە بکرێن. لێرەوە هەموو جەماوەری موسوڵمانان و لەپێش هەمووشیانەوە حەزرەتی عەلی کەوتنە خۆ بۆ گرتنە بەری رێگای زامن بۆ تۆڵە کردنەوە لە بکوژانی عوسمان. وەلێ حەزرەتی عەلی دەیەویست کارەکە بە کاڵە خۆ ئەنجام بدرێ و پەلەی تێدانەکرێ، چاوەڕوانی بکەن تا هەندێ بارودۆخەکە ئارام دەبێتەوە، پلان دابندرێ بۆ گرتن و ئەمجار تۆڵە لێ کردنەوەیان و بەجۆرێك کارەکە بکرێ، سەر نەکێشێ بۆ بەرپابوونی فیتنەو ئاشوب، بێگومان مێژوو نووسان کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە کە حەزرەتی عەلی یاخی بوو بکوژانی حەزرەتی عوسمانی خۆش نەویستون و بۆ هەل و فرسەت دەگەڕا بیانگرێ و قیصاصی شەرعییان لێ بستێنێ. پێی خۆش بوو بەزوترین کات حەقی خودایان لێ وەربگرێ و بە سزای خۆیان بگەن. وەلێ کارەکە بەو شێوەی ئەو تەمەننای دەکرد بەڕێوە نەچوو«١».

پوختەی روداوەکە ئەوە بوو هەریەك لە طەلحەو زوبەیرو کۆمەڵێك لە هاوەڵان: کە لەتەکیاندا بوون، رایان وابوو: کە پەلە بکرێ لە دەسگیرکردنی بکوژەکان و تۆڵە لێ ستاندنیان، پێیان وابوو چەند پەلە

---

١ - البداية والنهاية: ٢٣٤/٧.

بکرێ بۆ دەسگیرکردنیان ئەوە دەبێتە زامن و بەر عودەی دوور خستنەوەی فیتنەو ئاشوب، ئامادە باشی خۆشیان بۆ هاریکاری کردن لەو بوارەدا بۆ حەزرەتی عەلی دەربڕی، داوایان لێ کرد حەزرەتی عەلی هەندێك لە سوپای موعەسکەری بەصرەو کوفە سەحب بکاتەوە بۆ یارمەتی و هاریکاری خەلیفە لەو ئەرکەدا وەلی حەزرەتی عەلی داوای مۆڵەتی لێ کردن تا پلانێك دادەڕێژێ بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بەشێوەی شەرعی[١].

بەڵام ئەوەی دوایی رویداو هاتە کایەوە ئەوەبوو هەریەك لەم دوو لایەنە پەیڕەوی رێبازی پەسەند کراوی خۆیان کرد دەربارەی تۆڵە ستاندنەوە لە بکوژانی عوسمان. ئەوەبوو ئەوانەی داخوازی پەلەکردن بوون لە بەدوادا چوون و دەسگیر کردنی بکوژانی عوسمان لە بەصرە یەکدیگیر بوون، لەناو ئەم تاقمەدا دایکی موسوڵمانان خاتو عائیشەو طەلحەو زوبەیرو کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵان دەبینران. لە واقیعدا کارو نیازی ئەوانە تەنیا بۆ ئەوە بوو بە ئەهلی بەصرە رابگەیەنن: کە پێویستە هاریکاربن بۆ گەمارۆ دانی بکوژان و تۆڵە لێ ستاندنەوەیان.

لەو سەرو بەندەدا لەلایەن حەزرەتی عەلییەوە سوپایەك نێردرا بۆ بەصرە بۆ ئارام کردنەوەی بارو دۆخەکەو چەسپاندنی تەبایی و یەکڕیزی موسوڵمانان، هەردوو هێزەکە لەسەر خاکی بەصرە کەوتنە بەرامبەری یەکترو لە خەیاڵی هیچ لایەکیاندا نەبوو پێکەوە شەڕبکەن و فیتنە بەرپا بکەن. «ألقعقاع»ی کوڕی عەمر وەکوو نوێنەری ئیمامی عەلی رۆیشت بۆ خزمەت خاتو عائیشەو پێی گوت: ئەی دایکی موسوڵمانان! چی وایکرد جەنابت بێیە ئێرە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: هاتووم ئیصلاحی نێوان خەڵك بکەم.

---

١ - البداية والنهاية: ٢٣٥/٧ وفتح الباری لابن حجر: ٤٦/١٣.

ئەمجار چوو بۆلای هەر یەك لە طەلحەو زوبەیر هەمان پرسیاری ئاراستە كردن ئەوانیش وتیان ئێمەیش هاتووین بۆ چاكسازی كردن لەناو خەڵكدا، هەموویان كەوتنە قسەو گفتو گۆو راگۆڕینەوەو سەرەنجام لەسەر ئەوە پێكهاتن كارەكە بخەنە بەردەستی ئیمامی عەلی بە مەرجێك ئیمامی عەلی هەرچی توانای هەیە بیخاتە گەڕ بۆ جێ بەجێكردنی حوكمی خودا بەسەر بكوژەكاندا. قەعقاع گەڕایەوە بۆلای حەزرەتی عەلی و شێوەی رێك كەوتنەكەی پێ راگەیاند، موسوڵمانان بەگشتی لەوە نزیك بوونەوە صوڵح بكەن و فیتنەیان لێ دوور بكەوێتەوە. حەزرەتی عەلی وتارێكی بۆ خەڵكەكە داو سوپاسی خودای كرد كە ئاشتەوایی خستە نێوان موسوڵمانانەوەو رێك كەوتن و توشی شەڕ نەبوون. ئیعلانی ئەوەشی كرد: كە لە بەیانییەوە دەكەوێتە رێ بۆ دەڤەری بەصرەو دەستگیر كردنی بكوژەكان»[١].

بەڵام با بزانین دوایی چی رویدا؟

ئەوەبوو هەر لەگەڵ حەزرەتی عەلی ئیعلانی ئەوەی كرد كە موصالەحە كراوەو رێك كەوتون و بە خەڵكی راگەیاند كەهەر لە بەیانییەوە دەكەوێتە رێ بۆ دەسگیركردنی بكوژەكان. دەسبەجێ سەرانی فیتنە گێڕ، كۆبوونەوە بۆ راوێژو خۆش كردنی ئاگری فیتنە، لە ناویاندا «الأشتر النخعي»و شورەیحی كوڕی ئەوفاو عەبدوڵلای كوڕی «سبأ» ناسراو بە «ابن السوداء» سالمی كوڕی ثەعلەبەو غولامی كوڕی «الهیثم» دەبیندران. سوپاس بۆ خودا هیچ كام لەم فیتنە گێڕانە صەحابی نەبوون و بە موسوڵمانی بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ نەگەیشتبوون. ئەم فیتنە گێڕانە كەوتنە وتو وێژو باسی خەتەری صوڵح و ئاشتەوایی لەسەریان و پێیان وابوو كە رێككەوتنی صەحابەو

---

١ - البداية والنهاية: ٢٣٩/٧.

بەر قەراربوونی ئاشتەوایی دەبێتە خەتەر بەسەریانەوە، یەکێکیان پێشنیاری ئەوەی کرد: کە حەزرەتی «عەلی»ش وەکوو حەزرەتی عوسمان لەناو بەرن!

بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی «سبأ» ئەم رەئیەی بەلاوە ناپەسەند بوو وتی: بیر لەوە مەکەنەوە، پاشان پێی گوتن رزگار بونتان لەوەدایە تێکەڵی خەڵکەکە ببن، کە کۆبونەوەو بەیەك گەیشتن شەڕ لەناو خەڵکەکەدا بەرپا بکەن‌و مەهێڵن کۆببنەوەو ئاشتەوایی بکەن! ئەوانەی لەگەڵ ئێوەن بەشەڕ دیفاع لەخۆیان دەکەن. لەسەر ئەم بڕیارە سەرانی فیتنە بڵاوەیان لێ کردو هەریەکەیان روی کردە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی.

رۆژی دووەم حەزرەتی عەلی لەسەر وادەو بەڵێنی خۆی کەوتەڕێ. بە شوێنیدا هەریەك لە طەلحەو زوبەیر رۆییشتن، صولح‌و ئاشتەوایی بوو بەشتێکی چاوەڕوان کراو. خەڵکەکە ئەو شەوە لە خۆشی‌و ئارامیدا بوون بکوژانی حەزرەتی عوسمان لە ترس‌و بیمدا تا بەیانی خەویان لێ زڕا.

عەبدوڵڵای کوڕی «سبأ»و هاوەڵانی لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە بەیانی زوو شەڕ هەڵگیرسێنن‌و خەڵك بەرەو شەڕ بەرن‌و ئاکامی چی دەبێ بابێ.

ئاژاوە چی‌و فیتنە جۆیەکان پێش بەرە بەیان‌و فەجر، کەوتنە خۆ، ژمارەیان نزیکەی دوو هەزار کەس بوو، بوونە گرۆ گرۆو هەر گرۆیەکیان پەلاماری نزیك خۆیانداو بە شمشێر هێرشیان کردنە سەر، هەر تایفەو هۆزێك راپەڕین بۆ یارمەتیدانی قەومەکەیان‌و پارێزگاری کردن لێیان، خەڵکەکە لەخەو راپەڕین‌و پەلاماری چەکیاندا، وتیان: ئەهلی کوفە بەشەو پەلاماریان داوین غەدریان لێ کردین، پێیان وابوو ئەوە پیلانێکەو

لەژێر سەری حەزرەتی عەلییەوەیە. ئەم هەواڵە بە حەزرەتی عەلی گەیشتەوە، فەرمووی: ئەوە ئەو خەڵکە چییان لێ قەوماوە؟ خەڵکەکە لە دەوروبەری کەوتنە هاوارو دادو فیغان، وتیان تۆ ئاگات لەچییە ئەهلی بەصرە بەشەو پەلاماریان داین‌و غەدریان لێ کردین، هەر تاقمەو پەلاماری سیلاحی داو زرێی لەبەرکردو خۆیان هەڵدایە سەر ئەسپەکانیان، بەبێ ئەوەی هیچ کامێکیان بزانێ واقیع‌و حەقیقەتی روداو چۆنەو چۆن نیە، ئیتر شتێکی سروشتی بوو بەرامبەر یەك بوەستن، حەزرەتی عەلی بیست هەزار کەسی لێ کۆبۆوە، نزیکەی سی هەزار کەس لە دەوری خاتو عائیشەو ئەوانەی لەگەڵی بوون کۆبۆوە. هاوەڵانی عەبدوڵلای کوڕی «سبأ» هەر بۆیان بکرایە لێرەو لەوێ لە کوشتنی موسوڵمانان سڵیان نەدەکردەوە، بانگبێژی حەزرەتی عەلی هەردەم جاڕی دەداو هاواری دەکرد کە دەست لە کوشتن هەڵگرن‌و دەستتان نەچێتە خوێنی یەکترەوە. بەڵام کەس نەیدەبیست‌و گوێیان بە بانگەواز نەدەدا»[١].

ئالەو کات‌و ساتە ناسك‌و هەستیارەدا، وێڕای بەرزبوونەوەی ئاستی توندو تیژی‌و کوشت‌و کوشتیارو بەرپا بوونی شەڕی سەر تاسەری، کاتێك دەم‌و چاوەکان یەکتریان دی‌و روبەڕوی یەکتر راوەستان لەژێر چەتری ئیمان‌و پەیوەست بە هەواڵی بوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستیان لەشەڕ هەڵگرت‌و هەریەکەیان لە ئاست خۆیەوە دانی بەخۆیا گرت‌و بەخۆیدا چۆوە.

بەیهەقی بە ریوایەتێکی پەیوەست «موصول» هێنایەوە دەڵێ: ئەبوبەکر، موحەممەدی کوڕی «ألحسن القاضی» بە رشتەی خۆی لە حەربی کوڕی «الأسود الدؤلی»یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: کاتێك عەلی‌و

---

١ - تاریخ الطبری: ٥٠٦/٤ والبدایة والنهایة: ٢٤٠/٧.

هاوەڵانی لە طەلحەو زوبەیر نزیك بوونەوە، ریزی جەنگاوەران لە هەردوو لا لێك نزیك بوونەوە، حەزرەتی عەلی بەسواری هێسترەکەی پێغەمبەر ﷺ خۆی دەرخستو هاواری کرد، ئادەی زوبەیری کوڕی عەوامم بۆ بانگ بکەن، زوبەیریان بۆ بانگ کرد، ئەویش خێرا بۆ لای هاتو لە حەزرەتی عەلی نزیك بۆوە، تا ملی ئەسپەکانیان لێك کەوتن، ئەمجار عەلی فەرمووی: ئەی زوبەیر بەخودات سوێند دەدەم، ئایا لەیادتە ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ بەلاتدا تێپەڕیو ئێمە لە فلان شوێن بووینو پێی فەرمووی: زوبەیر! ئەوە تۆ عەلیت خۆش ناوێ؟ ئەتۆش لە وەڵامدا وتت: چۆنم خۆش ناوێ، کوڕی خاڵو پورمە لەسەر یەك ئاییینین؟ ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێندم بەخودا ئەی زوبەیر ئەتۆ شەڕ لەگەڵ عەلی دەکەیو ستەمکار دەبیو حەقی ئەوەت نیە شەڕی لەگەڵ بکەی. زوبەیر وتی: بەڵێ «والله» ڕاست دەکەی من لەبیرم نەمابوو، لەوکاتەوە لە پێغەمبەرم بیست لەیادم چوبوەوە ئەوا ئێستا کەوتەوە بیرم. وەڵڵاهی ئیتر من هەرگیز شەڕ لەگەڵ تۆ ناکەم. زوبەیر بە سواری وڵاخەکەی خەڵکەکەی دڕداو ڕۆیی. کاتێکیش حوشترەکەی عائیشە کەوتە سەر زەوی، کەژاوەکەی تێیدا بوو لە گۆڕەپانی تێکرو تێکوشیوی دوور خرایەوە، حەزرەتی عەلی هاتە لایو پرسیاری حاڵو وەزعی لێ کردو پێی گوت: دایە حاڵت چۆنە؟ وتی: حاڵم باشە، وتی: خودا لێت خۆشبێ. ئەمجار یەکە یەکە هاوەڵان دەهاتن سڵاویان لێ دەکردو لە حاڵو وەزعیان دەپرسیو دڵنیا دەبوون لە تەندروستیو حاڵو وەزعی«١».

١ - البداية والنهاية: ٧/٢٤١.

# سەرگوزشتەی معاویەو شەڕی صەفین

حەزرەتی عەلی گەڕایەوە بۆ کوفە: کە کردبویە پایگای خەلافەتی خۆی، هەر لەگەڵ گەرایەوە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای ألبجلی نارد بۆلای معاویە لە شام داوای لێ کرد بەیعەتی پێ بکا، وەکوو ئەو خەڵکەی تر کە بەیعەتیان پێ کردووە، ئەوەشی پێڕاگەیاند: کە موهاجیرو ئەنصار بەیعەتیان پێ کردووە. بەڵام معاویە پێی وابوو بەیعەتکردن بە حەزرەتی عەلی شەرعی نیەو ئەوانەی بەیعەتیان پێ کردووە بەیعەتەکەیان دانەمەزراوە، چونکە ئەهلی حیلل و عەقد لە هاوەڵان تێکڕا هەموویان لەسەر بوون بە خەلیفەی کۆك نەبوون و هەموویان ئامادەی بەیعەت پێکردنەکەی نەبوون. هەمووشیان کۆك نەبن بەیعەت پێکردنەکە دانامەزرێ. بۆیە ئامادە نەبوو بەیعەتی پێ بکاو بەپیر بانگ کردنەکەیەوە نەهات. وتی: دەبێ ئیمامی عەلی بکوژانی عوسمان بکوژێتەوە، پاشان موسوڵمانان بۆ خۆیان ئیمامێ هەڵبژێرن.

حەزرەتی عەلی لەلای خۆیەوە یەقینی هەبوو کە بەیعەتەکە بە کۆڕای ئەهلی مەدینە تەواو بووە، بەیعەتکردنی ئەهلی مەدینە بە موهاجیرو ئەنصارەوە دەبێتە بەڵگەو پێویست دەکا هەموو ئەو موسوڵمانانەی لە خاریجی مەدینەن چاو لە ئەهلی مەدینە بکەن و یەکسەر بەیعەتی پێ بکەن، دەربارەی تۆڵە ستاندن لە بکوژانی عوسمان، ئەوە وەکوو وتمان: حەزرەتی عەلی لەهەموو کەس سوورتر بوو بۆ تۆڵە لێ ستاندنەوەیان، وەلێ دەیەویست نەخشەو پلانێك دابڕێژی بۆیان ئاکامەکەی سەلامەت بێ و بێ کێشە تۆڵەی شەرعییان لەسەر تەنفیذ بکا.

کە حەزرەتی عەلی لە معاویەوە رەفزی پێگەیی، معاویەی بە باغی و دەرچوو لە جەماعەتی موسوڵمانان و سەرپێچی کردن لە ئیمام لە قەڵەمدا، ئیتر رۆژی دوانزەی مانگی رەجەبی ساڵی سی و شەشی کۆچی

بە سوپایەکەوە دەرچوو، لە شوێنێك بەناوی «النخیلة» لەشکر بەزیی کرد، ئیبنو عەبباس هاتە لای، ئەوکاتە کردبوویە والی بەصرە، حەزرەتی عەلی سوپایەکی پێکەوە بەرەو شەڕکردن لەگەڵ ئەهلی شام‌و ناچار کردنیان بۆئەوەی بێنەژێر رکێفی خەلیفەی بەیعەت پێکراوە وە لەشکرەکەی ئاڕاستە کرد«[١]».

کاتێك معاویە بەمەی زانی، سوپایەکی لە ئەهلی شام پێکەوە ناو بەرەو روی سوپای ئیمامی عەلی کەوتە ڕێ. هەردوو سوپاکە لە دەشتی «صفین» لەسەر روباری فرات روبەڕوی یەکتر وەستان. بۆماوەی زیاد لە دوو مانگ ناو بڕیوان‌و نێردراوی ئەوو ئەم هاتوچۆیان کردو هەوڵی رێکخستن‌و رەواندنەوەی شەڕیاندا، عەلی داوای لەمعاویەو هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەکرد بێن بەیعەتی پێ بکەن، دڵنیای دەکردن کەدوا بەیعەت پێکردنی تۆڵەستاندنەوە لە بکوژانی عوسمان لەکاتێکی نزیکدا ئەنجام دەدرێ. معاویە لەلایەن خۆیەوە داوای لە ئیمامی عەلی ئەوەبوو کە پێش هەموو شتێك بکوژانی عوسمان بگیرێن‌و بە سزای خۆیان بگەیەندرێن، دەیگوت عوسمان کوڕی مامەمەو من لەهەموو کەس شیاوترم بۆئەوەی داوای تۆڵەو خوێن ستاندنی بکەم. لەو ماوەیەشدا جار جار وردە شەڕو موناوەشات دروست دەبوو.

هەردوولا بەم حاڵە مانەوە، تا مانگی موحەرەمی ساڵی سی‌و حەوتی کۆچی، لەو سەروبەندەدا حەزرەتی عەلی‌و معاویە رێك کەوتن، هودنەو شەڕ راگرتنێك رابگەیەنن بۆ ماوەی مانگێك، بە هیوای ئەوەی ئاشتەوایی‌و صوڵح بکەن. بەڵام مانگەکە تێپەڕی‌و هیچ ئاسۆیەکی رون بۆ ئاشتەوایی دەرنەکەوت، ئیتر حەزرەتی عەلی فەرمانیدا بە وتە بێژی رەسمی خۆی، جاڕبداو بانگ هەڵدێری: ئەی ئەهلی شام ئەمیری

---

١ - البداية والنهاية: ٧/٢٥٤.

موسوڵمانان پێتان دەڵێ: ئەو ماوەیەمان پێدان بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ حەق و ملکەچی فەرمانی خەلیفەی بەیعەت پێکراو بن، بەڵام وا ماوەکە تێپەڕی و ئێوە وازتان لە طوغیان و سەرکەشی خۆتان نەهێنا، بەپیر حەق و راستییەوە نەهاتن، ئەوا من راستەوخۆو بێ پێچ و پەنا عەهدو پەیمانی شەڕ راوەستانم هەڵوەشاندەوەو کۆتاییم بەماوەی هودنە هێنا، هەرگیز خودا خائین و لەحەق لادەری خۆش ناوێن»[١].

ئەو کاتە معاویەو عەمری کوڕی «ألعاص» کەوتنە خۆو خۆئامادە کردن و سوپایان پێك هێنا، مەیمەنەو مەیسەرەیان بۆ سوپاکە دیاری کرد. حەزرەتی عەلی لەلای خۆیەوە سوپای پێك هێنا، هەر ئەو شەوە سوپاکەی ڕێکخست ئەشتەری نەخەعی کردە سەر لقی ئەهلی کوفەو سەهلی کوڕی حەنیفی کردە سەر لقی ئەهلی بەصرە، ئەمجار حەزرەتی عەلی ئامۆژگاری سوپاکەی کرد بەوە دەست نەکەن بە شەڕو شەڕ لەوانەوە هەڵنەگیرسێ، تا ئەهلی شام شەڕ دەست پێ نەکەن ئەوان شەڕ نەکەن، بریندار نەکوژرێ، کەسێك هەڵهات دوای نەکەون، پەچەو عەبای ئافرەت لانەدرێ و سوکایەتی بە ئافرەت نەکرێ.

شەڕ دامەزرا، هەردوو لا کەوتنە شەڕێکی خوێناوی، ڕۆژی دووەمیش هەر بەهەمان دەستوور شەڕ بەردەوام بوو، حەوت ڕۆژ شەڕ درێژەی کێشا و هیچ لایەکیان بەسەر لاکەی تردا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام سەرەنجام قورسایی شەڕ بەلای معاویەدا لەنگ بوو، سوپای حەزرەتی عەلی خەریك بوو لەسەرکەوتن نزیك دەبوەوە سات لەدوا سات بەرەو پێشەوە چوونی بەخۆیەوە دەبینی.

معاویە هەستی بەو خەتەرە کردو خێرا لەگەڵ عەمری کوڕی «ألعاص»دا کەوتنە گفت و گۆو راوێژ، سەرەنجام عەمر وای بە باش زانی

---

١ - البداية والنهاية: ٧/٢٦٠.

داوا لـه ئـەهلی عێـراق و سـوپای عـەلی بکـرێ بـۆ ئـەوەی قورئـان بکرێتـه حەکـەم، ئـیتر معاویـه فـەرمانی بـه خەڵکەکـه کـرد: کـه قورئـان بـه سـەرە رمبەوە بکەن و بەرزی بکەنەوە، بانگکـەر بـانگ هەڵدا بـەناوی معاویـەوەو بڵێ: ئەمە کتێبی پەروەردگارە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا. جا کە ئەصحابی عەلی ئەمەیان بینی «لە حاڵێکدا خەریك بوون سەرکەوتن بەدەست بێنن» کەوتنـه راجیاییـەوە، کۆمـەڵێك وتیـان: پابەنـدی تـەحکیمی نامـەی خـودا دەبـین، کۆمـەڵێکی تریـان دەیـانگوت: نەخـەیر ئێمـە شـەڕ رانـاگرین و لەوانەیە ئەمە فێڵ بێ. ئەمە رای ئیمامی عەلی خۆی بوو، وەلێ ناچار بوو: کە شوێن رای موخالیفەکان بکەوێ چونکە زۆر بوون، ئەشعەثی کوڕی قەیسی نارد بۆ لای معاویە بۆئەوەی پرسیاری لێ بکا ئاخۆ چی دەوێ، وەڵامی معاویە ئەوەبوو وتی: با ئێمەو ئێوەش بگەڕێینـەوە بـۆ حوکمی قورئان، ئێمە پیاوێك هەڵدەبژێرین کە جێگای رەزامەندیمان بێ، ئێوەش پیاوێك هەڵبژێرن کە پێی رازی بن، ئـەمجار هـەردولامان عەهـدو پـەیمانی خۆمـان بخەینـه ئەستۆی ئـەوان و ئـەوانیش بـه پێـی قورئـان بجولێنـەوەو حـوکم و بڕیـاری خۆیـان بەرامبـەرمان دەربـڕن، چییان بڕیـاردا ئێمـە پابەندی بن، ئـەهلی شـام عـەمری کـوڕی «العاص»یـان هەڵبـژارد، ئـەهلی عێراق ئەبو موسای ئەشعەری، هەردو لایان لەسەر ئەم دوو حەکەمە رێك کەوتن و نووسراوێکی فەرمییان لەناو خۆیاندا نووسی، کە بڕیـاردان لـەم بـارەوە دوابخـرێ بـۆ مـانگی رەمـەزان، ئەوکاتـه هـەردوو حەکەمـەکان لـه «دومة الجندل» کۆببنەوەو بڕیار بدەن، لەسەر ئەم ئەساس و رێککەوتنـه خەڵکەکە بڵاوەی لێ کرد.

حـەزرەتی عـەلی لـه «صـفین»ەوە گەڕایـەوە بـۆ کوفـه. دوبەرەکییـەکی سـامناك کـەوتبووە نـاو سـوپاکەیەوە، کـه تەشـریفی گەیـشتەوە کوفـه، کۆمــەڵێك لەوانــەی پێیــان وابــوو تــەحکیم گــومڕایی و لادانــە، لێــی هەڵگەڕانەوەو لە «حروراء» کۆبوونەوە، ژمارەیـان نزیکـەی دوازدە هـەزار

کەس بووە، حەزرەتی عەلی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی بۆلا ناردن، قسەیان لەگەڵ بکاو ئامۆژگارییان بکا، بەڵام ناوبراو چی هەوڵی لەگەڵ دا، بێ سوود بوو، هیچی بۆ جێبەجێ نەبوو. ئەمجار حەزرەتی عەلی بۆ خۆی چوو بۆلایان، کە لەگەڵیان کۆبووە پێی گوتن: بۆچی لەژێر فەرمانڕەوایی من چوونە دەر؟ وتیان: چونکە لە «صفین» رازی بووی بە حەکەم دانان. فەرمووی: بەڵام من لەو رێککەوتنەدا لەسەر هەردو حەکەمەکانم بە مەرج گرتووە: کە بە گوێرەی قورئان رەفتار بکەن، قورئان چی بڕیاربدا ئەوان وابکەن، هەرچی قورئان بەباشی بزانێ ئەوان بەباشی بزانن، هەرچی قورئان بە خراپی بزانێ ئەوان بیمرێنن. دوایی وتیان: ئایا تۆ پێت وایە دانانی حەکەم دەربارەی خوێنی پیاو عەدل و رەوایە؟ فەرمووی: ئێمە مرۆڤمان نەکردووە بە حەکەم، قورئانمان کردووە بە حەکەم، قورئانیش لەنێو دوو بەرگدا نووسراوەتەوە و بۆ خۆی نوطقی نیە مرۆڤ قسەی پێ دەکەن و بە زمان دەگوترێ و بەگوێ دەبیسرێ. وتیان: ئەدی بۆچی ماوەتان داناوە لەناو خۆتاندا؟ فەرمووی: بۆئەوەی زانا دڵنیابێ و نەزان بزانێ. بەڵکوو خودا بەم هودنەو ئاشتەواییە ئیصلاحی ئەم نەتەوە بکاو فیتنەو ئاشوبیان لێ دوور بخاتەوە.

ئیتر یاخی بووەکان بە خۆیاندا هاتنەوەو گەڕانەوە بۆسەر رای حەزرەتی عەلی و وتیان بگەڕێنەوە بۆ ناو شارو بچنەوە ژێر حوکمی خەلیفە، دوا بەیەکیان گەڕانەوەو وازیان لەیاخی بوون هێنا.

کە ماوەی دیاریکراو تەواو بوو، مانگی رەمەزانی ساڵی سی و حەوت، ئیمامی عەلی ئەبو موسای ئەشعەری نارد لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵان و ئەهلی کوفە، معاویە لەلایەن خۆیەوە عەمری کوڕی «العاص»ی لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەهلی شام نارد، هەردوو شاندەکە لە

شوێنی دیاریکراو «دومة الجندل» کۆبوونەوە. دوای ئەوەی هەریەك لە سەرۆکی شاندەکان سوپاس و ستایشی خودایان کرد، ئامۆژگاری پێویستیان ئاڕاستە کرد، لەسەر ئەوە رێك کەوتن کاغەزێك دابنێن و نووسەرێك دیاری بکەن چی لەسەر رێك دەکەون لەسەر کاغەزەکە بینووسێ بەڵام لە ئاکامدا لەسەر ئەوە رێك نەکەوتن کێ ببێتە خەلیفەی موسوڵمانان، ئەبو موسای ئەشعەری رازی بوو: کە هەردووك لە ئیمامی عەلی و معاویە عەزڵ بکرێن، بۆ خەلافەتیش تەنها بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رازیبوون، بەڵام عەبدوڵڵا نەویست خۆبخاتە ناو ئەو گۆبەندەوە.

ئیتر ئەوکاتە هەردوو حەکەمەکە لەسەر ئەوە رێك کەوتن: کە عەلی و معاویە عەزڵ بکەن و دوایی موسوڵمانان بە شوراو راوێژ خەلیفەیەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئەمجار حەکەمەکان هاتنە لای جەماوەرەکەی هەردوو لا. عەمری کوڕی عاص ئەبو موسای پێش خۆی خست بۆئەوەی رێك کەوتنەکە بۆ جەماوەرەکە ئیعلان بکا، ئەبو موسا هاتە پێشەوەو حەمدو سوپاسی خودای کردو صەلات و سەلامی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردن و ئەمجار وتی: خەڵکینە ئەگەر سەیری کاری ئەم ئومەتە بکەین نابینین رێگا چارەیەك گونجاوترو لەبار تربێ لەو رێك کەوتنەی من و عەمر لەسەری رێك کەوتووین ئەویش ئەوەیە عەلی و معاویە هەردوکیان عەزڵ بکرێن. ئەمجار هاتە دواوەو عەمر هاتە شوێنی وتاردان و حەمدو ثەنای خودای کردو پاشان وتی: خەڵکینە گوێتان لێ بوو ئەوەی پێش من چی گوت: ئەوە بەدەمی خۆی خەلیفەکەی عەزڵ کرد، وامنیش عەزڵم کرد. لە عەینی کاتدا من ئەوا بڕیارمدا معاویە ببێتە خەلیفەی موسوڵمانان، هەر ئەویش خوێنگرو حەق وەستێنی حەزرەتی عوسمانە، ئەو لەهەموو کەس شیاوترە بە شوێنی عوسمان.

دوای ئەمە خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو هەریەکە گەڕایەوە بۆ شارو وڵاتی خۆی. بەڵام عەمرو هاوەڵانی چون بۆلای معاویە سڵاویان لێ کردو

بەیعەتی خەلافەتیان پێ کرد. بەڵام ئەبو موسا شەرم گرتی و روی نەهات بچێ بۆلای عەلی و رۆیی بۆ مەککە. ئیبنو عەبباس و «شورەیح»ی کوڕی هانی رۆیشتن بۆلای حەزرەتی عەلی و روداویان بۆ گێڕایەوە[1].

## خەواریج و کوشتنی حەزرەتی عەلی:

کاتێک حەزرەتی عەلی ئەبو موسای ئەشعەری لەگەڵ کۆمەڵێك لە سوپا نارد بۆ «دومة الجندل» بۆ دانوسان و بڕیاردانی حەکەمەکان، خەواریجەکان زۆر بەوە شێلگیر بوون و دژایەتییان بۆ حەزرەتی عەلی پەرەی سەند، بەڵکوو بە صەراحەت و بێ پێچ و پەنا بە کافریان دانا، وتیان: مادام قبووڵی تەحکیمی کردووە لە ئایین دەرچووە، لە کاتێکدا ئەوان لەوەپێش زۆر سوور بوون لەسەر تەحکیم و بانگەشەیان بۆ دەکرد.

هەرچەندە عەلی گفت و گۆی لەگەڵ کردن و ئامۆژگاری کردن سودی نەبوو، لە کۆتاییا پێی گوتن: مافی ئێوە لەسەر ئێمە ئەوەیە کە لە مزگەوتی خۆمان مەنعتان نەکەین، بەمەرجێ لێمان یاخی نەبن. بەشە دەستکەوتی شەڕو غەنیمەتتان بدەینێ، بە مەرجێ هاریکارمان بن و لەگەڵمان بن بۆ غەزاو فتوحات. تا شەڕمان لەگەڵ نەکەن شەڕتان لەگەڵ ناکەین.

ئەمجار حەزرەتی عەلی بە سوپایەکی گەورەوە روی کردە وڵاتی شام بۆ شەڕ لەگەڵ معاویە، ئەمەیش دوای ئەوەی رەفضی بڕیاری حەکەمەکانی کرد... بەڵام لەوکاتەدا خەبەری پێ گەیی: کە خەواریجەکان دەستیان کردووە بە ئاشوب نانەوە و غەوغاو فەسادو خوێن رشتن و رێگاگرتن و هەرچی حەرامە حەڵاڵیان کردووە، خەڵکێکی

---

١ - البداية والنهاية الاختصار ج ٢٨٢/٧ — ٢٨٤.

زۆریـان کوشـتووە لەوانـەی کوشـتویانن عەبـدوڵڵای کـوڕی خـەبابو خێزانەکەیەتی بە حامیلەیی. ئیتر ئیمامی عەلی کەوتە بەردەم دوو ڕێگا، ئایا بچێ بۆ شەڕ لەگەڵ معاویە یان ئەم خەواریجانە تەمبێ بکا؟ لەوە ترسا ئەگەر بچێ بۆ شامو بکەوێتە شەڕ لەگەڵ معاویەدا، خەواریجەکان دەست بگرن بەسەر ماڵو منداڵو کاری ناشیرینیان بەرامبەر ئەنجام بدەن، سەرەنجام خۆیو ئەوانەی لەتەکیا بوون وایان بە پێویست زانی جارێ دەست بکەن بەشەڕ لەگەڵ خەواریجەکانو کاری ئەمان یەکالا بکەنەوە.

ئیتر حەزرەتی عەلی بە سوپاکەیەوە روی کردە ئەو دەڤەرو ناوچانەی خەواریجەکان خۆیان تێدا کۆکردبوەوە. کە نزیک مەدائین بووە، جوابی نـارد بـۆ خەواریجـەکان لـە دەڤـەری نـەهرەوانو داوای لێکـردن کـە ئاژاوەچـیو بکـوژانی هـاوەڵانی عـەلی تەسـلیم بکـەن بۆئـەوەی تۆڵـەی شەرعییان لێ بسەندرێ ئەمجار ئێمە وازتان لێ دێنین دەچین بۆ شام بۆ شەڕ لەگەڵ معاویە، بەڵکوو خودا هیدایەتتان بداو بگەڕێنەوە بۆسەر حاڵی باشی پێشووتان. ئیتر ئەوانیش لە وەڵامدا جوابیان دایەوە پێیان گوت: ئێمە هەموومان بکوژی هاوەڵەکانتین، ئێمە خوێنی ئەوانو خوێنی ئێوەش بە حەلاڵ دەزانین. ئیتر ئەوکاتە حەزرەتی عەلی چوو بۆلایان هەرچەند ئامۆژگاری کردنو هەڕەشەی لێ کردن بێ سوود بوو، وەڵامیان ئەوە بوو یەکتریان هاندەدا بۆ فیداکاریو شەڕ کردن لەگەڵ سوپای حەزرەتی عەلیداو گەیشتن بەخودا بەپلەی شەهید.

پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکا حەزرەتی عەلی فەرمانی بە ئەبو ئەییوبی ئەنصاری کرد: کە ئالای «الأمان» بۆ خەواریجەکان هەڵبکاو پێیان بڵێ: هەر کەسێ بێتە ژێر ئەم ئالایەوە ئەوە ئەمین بێو موحاسەبە ناکرێ. هەرکەسێ بڕوا بۆ کۆفەو مەدائین ئەمین بێ. زوربەی هەرە

زۆریان لە بیرو باوەڕی خۆیان لایانداو ریزی خەواریجیان جێ هێشت. نزیکەی هەزار کەسێکیان لێ مایەوە بە سەرۆکایەتی «عبدالله»ی کوڕی «وهب»ی راسبی، خەواریجەکان دەس پێشخەر بوون بۆشەڕ دامەزراندن، سەرەنجام هەموویان یان زوربەیان کوژران، لە سوپای حەزرەتی عەلی حەوت کەس کوژران.

پاشان کاروباری سیاسی و عەسکەری لەسەر حەزرەتی عەلی ئالۆز بوون، سوپاکەی خەلەلی تێکەوت و ئاژاوەی تێدا پەیدابوو، زۆر لە ئەهلی عێراق دەستیان کرد بە دژایەتیکردنی کەس لە ئەهلی شام لایەنگیری نەما، بە راست و بە چەپدا کەوتنە دژایەتیکردنی و دڵنیابوون لەوەی بە گوێرەی حوکمی حەکەمەکان دەسەڵات بۆ معاویە دەستەبەر بووە، ئەمە لە کاتێکدا چەندێك ئەهلی شام بەهێز بوونایە ئەهلی عێراق لاواز دەبوون، ئەمە لە حاڵێکدا دڵنیا بوون و دەیانزانی: کە حەزرەتی عەلی لەو رۆژگارەدا باشترین مرۆڤی سەر زەوییە، عابیدترین کەس و زاهیدترین مرۆڤ و زاناترین ئادەمیزادو لەهەموو کەس زیاتر لەخودا ترسە، کەچی پشتیان لێ هەڵکردو وازیان لێ هێناو پشتیان بەردا.

تەنانەت حەزرەتی عەلی وای لێهات مردنی خۆی بە ئاوات بخوازێ، زۆرجار ئەم رستەیەی دووبارە دەکردەوەو دەیگوت: {والذي فلق الحبة وبرأ النسمة لتُخضبَنّ هذه من هذه}. سوێندم بەو کەسەی دەنکەم تۆم دەقلشێنێ و مەردوم دروست دەکا ئەم ریشەم بە خوێنی ئەم سەرەم رەنگ دەکرێ.

عەبدورەحمانی کوڕی مەلجەم یەکێك لەسەرانی خەواریج، خوازبێنی ئافرەتێکی جوانی کرد ناوی «قطام»ی بوو ئەم ئافرەتە باوکی و برای لە شەڕی «النهروان»دا کوژرابوون، مەرجی بۆ «عبدالرحمن» دانا: کە دەبێ عەلی بکوژێ ئەمجار شوی پێ دەکا، «عبدالرحمن» وتی: بەسەر چاو،

سوێندم بەخودا من تەنیا بۆ کوشتنی عەلی هاتوومە ئەم شارە، ئافرەتەکەی شوی پێ کردو گواستییەوە، ئیتر ئافرەتەکە رۆژ بەرۆژ هەڵی دەنا بۆ کوشتنی عەلی.

شەوی هەینی رێکەوتی حەڤدەی مانگی رەمەزان ساڵی چلی کۆچی، عەبدورەحمان بۆسەیەکی بۆ دانا و دوو کەسی تریش یارمەتییان دا، لەبەرامبەر ئەو سەکۆیەی کە بەعادەت عەلی هەموو رۆژی لێیەوە دەردەچوو بۆ مزگەوت، وەکوو داب و نەریتی هەمیشەیی چووە دەر بۆئەوەی خەڵکی راست بکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی، «عبدالرحمن»ی کوڕی مەلجەم لەنکاوێك بە شمشێر پەلاماریدا و زەبرێکی لە تۆقە سەری داو خوێن بەسەر ریشیدا هاتە خوارێ.

بە هاوەڵانی فەرموو: کە «عبدالرحمن»ی کوڕی مەلجەم کوشتوویەتی، زانی کە ئەو تاوانە تاوانی ئەوە. وتی ئەگەر مردم بیکوژنەوە، ئەگەر نەمردیشم ئەوە بۆ خۆم دەزانم چی لێ دەکەم. کاتێ کەوتە گیانەڵاوەوە هەر دەیگوت: {لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـهُ}. لە تەمەنی شەصت ساڵیدا وەفاتی کرد ماوەی خەلافەتی چوار ساڵ و نۆ مانگ بوو.

ئەوەی ئیبنو کەثیر بەراستی داناوە گوایە لە «دار الأمارة» نێژراوە، ترسی ئەوەیان هەبووە خەواریجەکان لاشەکەی بدزن، ریوایەتێکیش هەیە دەڵێ گواستراوەتەوە بۆ گۆڕستانی «البقیع» لەوێ نێژراوە، هەروا چەند شوێنی تریش دەست نیشان کراوە بۆ شوێنی دفن کردنی.

«عبدالرحمن»ی کوڕی مەلجەم لەلایەن حەزرەتی حەسەنەوە کوژرایەوە و دوایی لاشەکەی سوتێندرا«[١]».

---

١ - تاریخ الطبری: ١٣٣/٥ وما بعدها و البدایة والنهایة: ٢٨٥/٧ وما بعدها.

**پەندو ئامۆژگاری:**

یەکەم: ئایا لەنێوان حەزرەتی عەلی و ئەوانەی داوای پەلەکردنی دەسگیرکردن و تۆڵە ستاندن لە بکوژانی حەزرەتی عوثمانیان دەکرد چ خیلاف و راجیاییەکی ریشەیی هەبوو لەم بارەوە؟ وادیارە ئەتۆ لەو رونکردنەوانەی پێشوو ئەوەت بۆ دەرکەوتووە: کە بەدوادا چوون و هەوڵدان بۆ دەسگیرکردنی بکوژانی حەزرەتی عوسمان قەت جێگای راجیایی نەبووە، هیچ لایەکیان ئامادە نەبوون بکوژەکان بەبێ تۆڵە ستاندن وەك «بەرزەکی بانان» بۆی دەربچن، نیزاعەکە لەوەدا خۆی دەنواند هەرچی عائیشەو طەلحەو جەماعەتەکەیان بوون سوور بوون لەسەرئەوە کە تۆڵە ستاندن لە بکوژەکان یەکەم کارو یەکەم ئەرکی سەرەکی بێ کە عەلی ئەنجامی بدا پێیان وابوو حەزرەتی عەلی نابێ هیچ ئیشێك بکا پێش بەسزا گەیاندنی بکوژەکان. ئەمما حەزرەتی عەلی پێی وابوو جارێ موسوڵمانان بەیعەتی پێ بکەن و خەلافەتەکەی بچەسپێ و نیظام و یاسای فەرمانڕەوا جێ گیربێ و بارو دۆخەکە ئاسایی بێتەوە، ئەمجار هەوڵ بدا بکوژەکان بگرێ و تۆڵەی شەرعییان لێ بستێنێ بە شێوەیەك ئاژاوە گێڕان نەتوانن لەئاوی قوڕاودا ماسی بگرن.

هەڵبەتە ئەم رایەی حەزرەتی عەلی رایەکی پەسەندو ژیرانە بوو، بۆیە لایەنەکەی تر پێی رازی بوون و کردیانە بنەمای صولح و رێککەوتنەکەو هەموویان «بە عائیشەو طەلحەو زوبەیریشەوە» پێی رازی بوون و بەهەموو بتمانەو دڵنیاییەکەوە ئیشەکەیان دایە دەست حەزرەتی عەلی، بەپێی بۆ چوون و حیکمەتی خۆی چارەسەری بکا، هەموویان کۆك بوون لەسەرئەوەی پێویستە هەوڵی جیدی بدرێ بۆ راوەدونان و دەسگیرکردنی بکوژەکان و بە سزا گەیاندنیان، لەسەر ئەم بنەمایە هەموو لایەنەکان رێك کەوتن: کە ئەم کارە گرنگەی خستبویانە ئەستۆیان جێ

بەجێی بکەن‌و بیدەنە دەست حەزرەتی عەلی‌و ئەو تەنفیذی بکا لە باروددۆخی لەباردا، هەروا بڕیاریاندا هەریەکە بگەڕێتەوە بۆسەر ماڵ‌و حاڵ‌و شوێنی خۆی‌و وڵاتی خۆیان.

**دووەم:** کەوابێ چ شتێك بووە کۆسپ‌و تەگەرەو نەیهێشت ئەم بڕیارو پلانە جێ بەجێ بکرێ؟ بێگومان ئەتۆ زانیت ئەوەی بووە لەمپەر لەبەردەم جێبەجێ کردنی ئەم پلانە ئەو فرت‌و فێڵە بوو کە پاڵەوانانی ئاشوب گێڕ «لەپێش هەمووشیانەوە عەبدوڵڵای کوڕی سبأ» نەخشەیان بۆ کێشا بوو، ئەوە بوو بە ڕێککەوتنەکەی موسوڵمانان تەواو تەنگەتاو بوون‌و ترسیان لێ نیشت، بۆیە بڕیاریاندا زەلامی خۆیان بخزێننە ناو ریزەکانی هەردولاو لەنکاو ئاژاوە هەڵگیرسێنن، هەریەکەیان کێی بەردەست کەوت بیکوژن، بۆئەوەی بتمانەیان بەیەکتر نەمێنێ‌و فیتنە بەرپا ببێ، هەر لایەنێکیش وابزانێ لایەنەکەی تر پەلاماری داوەو لەژێر پەردەی صولح‌و ئاشتەواییدا خیانەتی لێ کردوەو پەیمان شکێنی رەچاو کردووە.

هەڵبەتە ئەم پیلانە بە وردی‌و بێ ویژدانانە تەنفیذکرا. جێبەجێ کردنی پیلانی گڵاوی ئاوا کارێکی سوك‌و ئاسانەو پێویستی بە تەبیعەتی لەئیم‌و مرۆڤی بێ رەوشت‌و دەروون پیس‌و بێ ویژدان هەیە.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین: ئایا ئەو ئەصحابە بەڕێزانەی دڵپاك‌و رەوشت بەرزو دڵسۆز بۆ ئیسلام چی کەیان دەتوانی بیکەن جگە لەوەی بە شمشێرەکانیان ئەو هێرشە لەنکاوو خیانەتکارانە بگێڕنەوە، چیکەیان بە خەیاڵدا بهاتایەو چۆن تەفسیری ئەو هێرشانەیان بکردایە: کە کرایە سەریان جگە لەوەی کەوای تێگەیشتن ئەو هێرشانە هێرشی پیلان بۆ داڕێژراون لەلایەن لایەنەکەی ترەوە.؟! وێڕای ئەوەش ئەتۆ ئەوەت زانی: کە ئەگەر یەکێك بیزانیایە کێ بەرەو رویەتی‌و لەگەڵ کێ شەڕ دەکاو

بیناسیایە یەکسەر دەستیان لەیەکتر دەکێشایەوەو عوزریان بۆ یەکتر دێنایەوەو پەشیمانیان دەردەبڕی.

کەوابوو ئەم فیتنەو ئاشووبە سەرچاوەکەی رەقیو توندو تیژییەك نەبووە دڵی هاوەڵانی داگرتبێو لەوانەوە سەری هەڵدابێ. جالەم تەرەفە بن یان لەو تەرەفە بن، بەڵکوو سەرچاوەکەی لەو فیتنە جۆو ئاشوب گێرانەوە کە خۆیان خزاندبووە ناو ریزەکانی هاوەڵانو حیقدو کینەیان بەرامبەر هەموو هاوەڵان هەبوو بە جوداوازی لەنێوان ئەم لایەنە یان ئەو لایەن.

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە: کەتۆ دوای خوێندنەوەی زۆرو توێژینەوەی قوڵ دەربارەی ئەم فیتنەو ئاشوبەیە شتێك نابینی ئاماژە بۆ جێگە پەنجەی فیتنە جۆیان بکاو رۆڵی گرنگیان دەربخا لەناو ئەو روداوە خەتەرو سامناکانەی رویانداو بوونە بنەمای شەقبوونی عالەمی ئیسلامی بۆ دوو تاقمی سەرەکی دژ بەیەکی مەذهەبگەرایی، بەڵکوو هەموو نووسینەکان دەربارەی ئەو فیتنەو ئاشوبە باسی روکەشو سەطحە ظاهیرییەکە دەکەنو شۆڕ نابنەوە بۆ دیاریکردنی ریشەو بنجو بناوانی فیتنەکەو هۆکارەکانی...! بە نارەوا چی هێرشو رەخنەو بریندار کردن تۆمەت هەیە ئاراستەی قوربانیانی فیتنەو ئاشوب دەکەنو بە وشەیەکیش ئامازە بۆ هەڵگیرسێنەری فیتنەو ئاشوبو ئاگر خۆش کەرەکان ناکەن، دەبوایە لەباتی ئاراستەکردنی تانەو تەشەرو رەخنە بۆ قوربانییەکانی فیتنەکە، هەموو نوسینو وتەو رەخنەکانیان ئاراستەی فیتنە هەڵگیرسێنەرەکان بکرایە هەر لەو کەسانەوە کە سەرەتا پیلانی شەهیدکردنی حەزرەتی عوسمانیان دارشت تا دەگاتە ئەوانەی حەزرەتی عەلییان شەهید کرد خودا لە هەردوکیان رازی بێ.

دەیباشە ئایا نووسین دەربارەی ئەو فیتنەو ئاشوبە بەو ئوسلوبو شێوازەی ئەو نووسەرە بێ ویژدانانە نووسیویانەو دەینووسن نابێتە بەشێك لەو پیلانو فرتو فێڵو خیانەتکارییەی هەوادارانی عەبدوڵڵای کوڕی «سبأ» ئەنجامیاندا.؟

سێیەم: دڵنیایی و یەقینمان هەیە بەوەی حەزرەتی عەلی دڵسۆزو حەق ویست بووە لە هەرچی کردویەتی یان وازی لێ هێناوە، هەروا بڕوای تەواومان بەوە هەیە کە مەرجیعو راوێژ پێکراوی هەرسێ خەلیفەکەی پێش خۆی بووەو هەمیشە دڵسۆزانە بۆ ئیسلام هاریکاری کردون، ئەمجار تێڕوانینمان بۆئەوەی کەدوا شەهیدبوونی حەزرەتی عوسمان قبوڵی کرد خەڵکی بەیعەتی پێ بکەنو بە خەلیفەی بزانن. هەروا ئیعتیبار کردنی و بڕیاردانی بەوەی کە معاویە بەیعەتی پێ نەکا باغی و یاخی بووە، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش جیدالو نیقاشی لەگەڵ معاویەدا کردو لەو مەبدەئە نەهاتە خوارەوە، بۆیە ئێمە بەبێ پەروا دان بەوەدا دەنێین کە جەماوەری زانایانو ئیمامانی موسوڵمانان چەسپاندویانەو دانیان پێداناوە: کە معاویە باغی بووە لەژێر چەتری فەرمانڕەوایی حەزرەتی عەلی دەرچووەو حەزرەتی عەلی دوای خەلیفە عوسمان، خەلیفەی بەیعەت پێکراوی موسوڵمانانەو خەلیفەی شەرعییە. بەڵام ئێمە پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێ: کە «باغی» واتە: معاویە ئیجتیهادی کردووەو بە ئەنقەست دژی ئیمامی عەلی نەوەستاوە، جا ئەگەر بۆ لایەنی بەرامبەر: کە حەزرەتی عەلییە دروست بووبێ ئاگاداری بکاتەوەو هۆشداری بداتێ هەڕەشەی لێ بکاو ئەمجار شەڕی لەگەڵ بکا، ئەوە بۆ ئێمەی موسوڵمان دوای تێپەڕبوونی هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵە تەنانەت بۆ کەسانی پێش سەردەمی ئێمەیش دروست نیە لە شانو شەوکەتی حەزرەتی معاویە کەم بکەینەوەو هەڵوێستی دژو

ناشیرینی بەرامبەر بنوێنین، بەبێ ئەوەی سودێکمان لەو دژایەتیکردنە دەست بکەوێ.

لە بواری عەقیدەشدا ئێمە ئەوەندەمان لەسەر پێویستە کە بە گوێرەی داخوازی قاعیدەو یاسای تەشریح، ئەوە بزانین کە خەلیفەی شەرعی دوای شەهیدبوونی حەزرەتی عوسمان، حەزرەتی عەلییەو بەس، حەزرەتی معاویە کە بەیعەتی پێ نەکردو دژی وەستا بەباغی لە قەڵەم دەدرێ‌و ئەمجار حیساب‌و کیتابی حەواڵەی خودا بکەین. {تلك أمة قد خلت لها ما كسبت وعليها ما اكتسبت}.

**چوارەم:** هەرکەسێك توێژینەوە لە هەڵوێستی خەواریجەکان بکاو لە هەڵگەڕانەوەیان لە ئیمامی عەلی، بەوردی بکۆڵێتەوە سەیری ئەو هەڵوێستەیان بکا: کە لە ئەوپەڕی پلەی پشتگیری‌و تەئییدو بەرگری کردنیان لە ئیمامی عەلی، وەرگەڕان بۆ ئەو پەڕی پلەی دژایەتی کردنی‌و یاخی بوون لێی‌و دەست درێژی کردن بۆ سەری‌و ناخۆشویستنی، هەرکەسێ بەوردی لەم واقیع‌و روداوە وردبێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە ئەوانیش قوربانی‌و ضەحییەی توندرەوین.

بێگومان ئەوەشت زانیوە: کە ئیسلام لەروی عەقیدەو سلووکەوە میانەڕەوی بەلاوە پەسەندەو دژی «ئیفراطو تەفریطە»، سنووری میانەڕەوی‌و ئاستەکانی بە یاساو تەرازووی عیلم‌و زانست دیاری دەکرێت، جا هەرکەسێك عیلم‌و زانیاری لە سەرچاوەی خۆی هەڵبگوازی‌و ملکەچ‌و پابەندی قاعیدەو داخوازی قاعیدەی زانست بێ، بەرچاو روون هەنگاو بنێ‌و صەبرو پشوو درێژی بۆ خۆی دەستەبەر بکا لە هەڵخلیسکان‌و گیرۆدە بوون بە «ئیفراطو تەفریط» رزگاری دەبێ‌و ئەو نەخۆشییە سامناکەی تووش نابێ. بێگومان زوربەی خەواریجەکان لە عەرەبی دەشتەکی توند تەبیعەت‌و دڵرەق پێك هاتبوون، چرای عیلم‌و زانیاری‌و

صەبرو حیلمو لەسەر خۆیی و تێفکرینو هەڵسەنگاندن لە دەرگای عەقڵو دڵو دەروونی ئەوانی نەدابوو، مێشك وشكو رەوشت زبرو كورت بینو كاڵفام بوون، ملكەچی دڵرەقی و سەر رەقی توند سروشتی خۆیان بوو بوون، ئەمەش بە ئاشكرا لەو هەڵوێستەیان دەردەكەوت كە حەزرەتی «عەلی»یان بە كافر دادەناو دەیانگوت: عەلی چونكە قبووڵی تەحكیمی كردووە كافرە، هەر لەم روانگەشەوە پێیان وابوو هەر كەسێ گوناهی گەورەی لێ روبدا كافر دەبێ، بەڵكوو زوربەیان پێیان وابوو هەر كەسێ گوناهی لێ روبدا گوناهەكە گەورەبێ یان پچوك كافر دەبێو كوشتنی دروستە.

هەتا ئەم رۆژگارەی ئێمەیش ئاساری ئەو توند رەویو تەطەروفە هەرماوەو بۆتە خمخۆركەی ناو كۆمەڵگای ئیسلامیو جیهانی ئیسلامی پێوەی گیرۆدە بووەو دەتلێتەوە، هیواو ئارەزو بازی بە كافر دانانی ئەمو ئەو بە سادەترین هۆكار نمونەی عەقڵیەتی ئەو زێدە رۆییو لە سنور دەرچونەیە، ئاشكراشە توند رەوی لەهەر شتێكدا بێ عەقڵیەتێكە عیلمو زانست رەفضی دەكاو بە قەواعیدو تەرازوی زانست ناكێشرێ.

# فەهرەستی سەرەبابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

سوپاس بۆ خودا لە رۆژی ٢٠١٠/١٢/٧ لە پاکنووسکردنی ئەم کتێبە بوومەوە

خودا بۆم بکاتە پارسەنگی قورسی تەرازوی کردەوەم و

بە عەمەلی سالح بۆم بنووسێ و

جێی رەزامەندی خۆی بێ.

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

٢٠١٠/١٢/٧